منتدى إقرأ الثقافي

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك

www.iqra.ahlamontada.com

## بیلۆگرافیای ناوداران و ڕۆشنبیرانی کەرکوك

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی چوارەم

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی چوارەم

## ببیلۆگرافیای ناوداران و ڕۆشنبیرانی کەرکوک


نووسین و ئامادەکردنی:
سمکۆ بەهرۆز



٢٠٢٣

بڵاوكراوەكانی دەزگای رۆشنبیریی
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
زنجیرە: (١٤١)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

**ناوی كتێب: ئینسایكلۆپیدیای كەركوك- بەرگی چوارەم: - بیبلۆگرافیای ناوداران و ڕۆشنبیرانی كەركوك**
**نووسین و ئامادەكردنی: سمكۆ بەهرۆز**
**سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمكۆ بەهرۆز (ئەژی)**
**سەرپەرشتیاری زانستی و ئەكادیمی: د. یوسف گۆران**
**سەرپەشتیاری كارگێڕی: زاهیر شكور**
**دیزاینی ناوەوە: ئەنجام سەعید**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**تایپ: زەینەب حەمید**
**نۆرەی چاپ: چاپی یەكەم: ٢٠٢٣**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**چاپ: چاپخانەی تاران**

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی كتێبخانەكان ژمارە سپاردنی**
**(٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

*** (ئاراس فارس):-**

- ساڵی ١٩٨١ له كەركوك لەدایكبووه.
- سەرەتایی و ناوەندی له كەركوك و پەیمانگای تەكنیكی بەشی كارەبا له كەركوك له ساڵی ٢٠٠٢ تەواو كردووه.
- ساڵی (١٩٩٨)ەوه له بواری خەت و خەت سازیدا بەشداری گەلێك پێشانگای كردووه له هەولێرو ئەستەمبوڵ و له ناوخۆی وڵاتیشدا له گەلێك پێشانگا بەشداری كردووه.
- ساڵی ٢٠٠٠ بەشداری پێشانگای هەولێری كردووەو خەڵاتی دووەمی وەرگرتووه.
- ساڵی ٢٠٠٤ بەشداری پێشانگای نێودەوڵەتی (لێكۆڵینەوەی مێژووی هونەرو ڕۆشنبیری ئیسلامی) كردووه له ئەستەمبوڵ.
- ساڵی ٢٠١٢ بەشداری پێشانگای (الرواد)ی كردووه له هەولێر.

*** (ئاری بابان):-**

- ناوی تەواوی (عومەر عوبێد)ە.
- ساڵی (١٩٥٣) له گەڕەكی (ئیمام قاسم) لەكەركوك لەدایكبووه.
- ساڵی (١٩٧٦) كۆلیژی ئەدەبیاتی بەشی (مكتبات) ی تەواو كردووه.
- لەسەرەتای حەفتاكانەوه دەستی بەهونەری وێنەكێشان كردووەو یەكەمین پێشانگا كەبەشداری تێدا كردووه له ساڵی (١٩٧٢) له كەركوك له هۆڵی ئامادەیی ئیمام قاسم لەگەڵ هونەرمەندان گارا ڕەسوڵ و ئەیوب شەریف.
- بەشداری چەندین پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی سلێمانی كردووه له ساڵانی (١٩٨٥، ١٩٨٩، ١٩٩٠).
- بەشداری كردووه لەگەڵ چواردە هونەرمەند لەپێشانگایەكی تایبەت بەكاره هونەرییه بچوكەكان ساڵی (١٩٩١).
- پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەندان ئازا حەسیب قەرەداغی و سوعاد ستار لەهۆڵی نووسەران له سلێمانی له ساڵی (١٩٨٩) كردووەتەوه.
- پێشانگایەكی هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەندان سالار مەجیدو وەهبی ڕەسوڵ له هۆڵی پەیمانگای تەكنیكی سلێمانی له ساڵی (١٩٩٢) كردووەتەوه.
- بەشداری كردووه له ڤیستیڤاڵی شانۆو شێوەكار له هۆڵی میدیا له هەولێر له ساڵی (١٩٩٤).
- بەشداری كردووه له پێشانگایەكی هاوبەش له ئەڵمانیا له شاری فرانكفۆرت له (١)ی تەمموز تا (٢١)ی تەمموزی ساڵی (١٩٩٥) بەردەوام بوو.
- بەشداری كردووه له پێشانگای هونەرمەندانی كورد له .SPACEلەندەن له ساڵی (١٩٩٦) له گەلەری
- بەشداری كردووه له گەلێك پێشانگا لەدوای پرۆسەی ڕزگاری عێراقەوه له شاری كەركوك و شارەكانی تر.
- تا ئێستا بەشداری له (٢١) پێشانگای هاوبەش و تایبەتی لەشارەكانی كوردستاندا كردووه.
- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی كوردی لەلەندەن كردووه.
- بەشداری لەپێشانگای هونەرمەندانی كورد لەئەڵمانیا كردووه كه له ساڵی (١٩٩٢-١٩٩٤) لەچەند شارێكی ئەڵمانیا پێشكەش كران.
- بەشداری لەپێشانگای (شەوی هونەرمەندان) له ڤینلەندا كردووه.
- كتێبێكی هەیه بەناونیشانی (سەمای باڵندە ڕەنگاڵەییەكان) كه له ساڵی (٢٠١١) گەیاندوویەتی به چاپ.

*** (ئاری قادر فارس شوانی):**

- ساڵی (١٩٨١) له كەركوك لەدایكبووه.
- دەرچووی پەیمانگای تەكنیكی كەركوكه بەشی كارەبا.
- بەشداری پێشانگای نێودەوڵەتی و ناوخۆیی كردووه.

*** (ئاری محەمەد نوری):**

- ساڵی (١٩٨٦) له كەركوك لەدایكبووه.
- ماوەی ساڵێك له پەیمانگای هونەره جوانەكانی كەركوك خوێندویەتی.
- ساڵی (٢٠٠٥) له یەكەم فیستیڤاڵی ساڵانەی پەیمانگای هونەره جوانەكانی كەركوك بەشداری كردووه.
- لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٧) بەشداری هەموو پێشانگاكانی سەنتەری گەنجانی كەركوكی كردووه.
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی (منظمة

السلم والتسامح) کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری فیستیڤاڵی ساڵانەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) بەشداری فیستیڤاڵی ساڵانەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) بەشداری پێشانگای (ئەمنە سوورە)کەی کردووە لە سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠٨) دیواربەندێکی درێژی بۆ قوتابخانەیەکی دروست کردووە لە تورکیا.

* (ئازاد ئەحمەد ئەسوەد):-

- ساڵی (١٩٦٠) لە گەڕەکی شۆریجەی کەرکوك لەدایکبووە.
- هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لە وەرگێرانی عەرەبی و ئینگلیزی لە زانکۆی سالفۆرد، مانچستەر، بەریتانیا، ساڵی ٢٠٠٨.
- وەرگێری زمانەکانی ئینگلیزی و تورکییە.

- بەرهەمەکانی:-
- دیوانە شیعرییە چاپکراوەکانی (بۆنی ئەم خاکەت لێ دێت)، بەغدا، ١٩٨٩.
- هاورێیانی شەقامی جمهوری، ٢٠١٥.

* (ئازاد ئەنوەر ساڵح ڕەسوڵ):-

- ساڵی (١٩٧٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٣) پێشانگای تایبەتی خۆی لە مەڵبەندی لاوانی ئەندەلوس لە کەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٤) پێشانگای تایبەتی خۆی لە سەندیکای هونەرمەندانی کەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩١) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی چەمچەماڵ کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٣) پێشانگای تایبەتی خۆی لە ناوەندی ڕۆشنبیری سەردەم لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٤) پێشانگای تایبەتی خۆی لە ناوەندی ڕۆشنبیری سەردەم لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٥) پێشانگای تایبەتی خۆی لە ناوەندی ڕۆشنبیری سەردەم لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٦) پێشانگای تایبەتی خۆی لە گەلەری میدیا لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٧) پێشانگای تایبەتی خۆی لە خوێندنگای حاجی قادر لە کۆیە کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٧) پێشانگای تایبەتی خۆی لە گەلەری سلێمانی کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٠) پێشانگای گەڕۆکی تایبەتی خۆی لە پێنجوێن و گوندەکانی دەوروبەری کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە پەروەردەی کەرکوك کردووە.
- ساڵی (١٩٨٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە هۆڵی (الفن الحدیث) لە کەرکوك کردووە.
- ساڵی (١٩٨٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە ناحیەی شوان کردووە.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە هۆڵی (الفن الحدیث) لە بەغدا کردووە.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی سوپای عێراقی کردووە لە بەغدا.
- ساڵی (١٩٨٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی سوپای عێراقی کردووە لە بەسرا.
- ساڵی (١٩٩١) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە پێنجوێن کردووە.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە چەمچەماڵ کردووە.
- ساڵی (١٩٩٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە هەڵەبجە کردووە.
- ساڵی (١٩٩٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە ناوەندی ڕۆشنبیری سەردەم لە هەولێر کردووە.
- ساڵی (١٩٩٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی سەر شۆستەکانی کردووە لە بن قەڵا لە هەولێر.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە هۆڵی سەردەم کردووە لە هەولێر.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە یادی هەڵەبجەدا کردووە.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە گەلەری (ئەربیلا) لە هەولێر کردووە.
- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە گەلەری (ئەربیلا) لە هەولێر کردووە.

- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە ناوەندی ڕۆشنبیری سەردەم لە هەولێر کردووە.
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ دوو

هونەرمەند لە گەلەری سلێمانی کردووە.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە ناوەندی هونەری لە هەولێرو ڕانیەو کۆیە کردووە.
- ساڵی (١٩٩٩) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە کارەهونەرییەکانی تیپی میللی سلێمانی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠١) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە ناوەندی هونەری هەولێرو سلێمانی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کردووە لە ئەستەمبول لە تورکیا.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە گەلەری زاموا کردووە لە سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی سەندیکای هونەرمەندانی کووردستان لقی کەرکوکی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لقی کەرکوکی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی ڕێکخراوی (RTI)ی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی ڕێکخراوی گەشەپێدانی ئاشتی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی ڕێکخراوی ئازادی ئافرەتانی عێراق لقی کەرکوکی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کۆمەڵەی هونەری دیجلەی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە چەمچەماڵ کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کەرنەڤاڵی ئەنفال لە کەرکوك کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی ڕۆشنبیری گەرمیانی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی ڕێکخراوی گەشەپێدانی ئاشتی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی ڕێکخراوی (CDO)ی کردووە.

*** (ئازاد ئەمین باخەوان - دکتۆر ئازاد ئەمین باخەوان):-**

- ساڵی (١٩٦٤) لە شاری کەرکوك گەڕەکی شۆڕیجە هاتووەتە دونیاوە.
- ساڵی (١٩٨٨)، بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زمان و ئەدەبی کوردی لە (زانکۆی سەلاحەدین) بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٩٨)، لە زانکۆی (بەغداد-ئیبن ڕوشد-بەشی زمانی کوردی) بڕوانامەی ماجستێری لە زمانی کوردی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٣)، لە زانکۆی (بەغداد-ئیبن ڕوشد-بەشی زمانی کوردی) بڕوانامەی دکتۆرای لە زمانی کوردی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٤) لە زانکۆی دهۆك کۆلێژی ئاداب دامەزراوە.
- ساڵی (٢٠٠٥) لە زانکۆی کەرکوك تەنسیب کراوو بووە بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی بەشی زمانی کوردی.
- ساڵی (٢٠٠٧) بوو بە سەرۆکی بەشی زمانی کوردی-کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی کەرکوك، تا ئێستاش سەرۆکی ئەو بەشەیە.

- بەرهەمەکانی:
- (لە ڕوانگەی زمانناسیەوە)، ٢٠٠٥.
- (گەشەکردنی زمانی منداڵ)، ٢٠١١.
- نامەی ماستەر (مۆرفیمەکانی (ە) لە دیالێکتی کرمانجی خوارووی زمانی کوردیدا).
- نامەی دکتۆرا (پێشبەند و پاشبەند لە هەردوو دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژووروی زمانی کوردیا).

*** (ئازاد حەمە ئەحمەد شێخانی-دکتۆر ئازاد حەمە ئەحمەد شێخانی):-**

- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی وئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- خوێندنی بەکالۆریۆرس لە ئەندازیاری تەلارسازی لەزانکۆی ڤینیسیا (ئیتالیا) تەواو کردووە
- بڕوانامەی دکتۆراو پۆست دکتۆرای (Post-doctorate) لە پلاندانانی شارو هەرێمدا وەرگرتووە لەزانکۆی ڤینیسیاو هەر لەوێدا تۆێژەرو وانەبێژ بووە.
- بەڕێوەبەری ڕێکخراوی ناحکومی ئیتالی و بەریتانی بووە لە هەرێمی کوردستان و لە بۆسنیا
- بەڕێوەبەری مەڵبەندی ڕۆشنبیری کورد بووە لە لەندەن
- ساڵی ٢٠٠٤ تا ساڵی ٢٠١٠ ڕاگری کۆلێژی تەکنیکی سلێمانی بووە و مامۆستا بووە لە بەشی ئەندازیاری پلاندانسازی شار.
- خاوەنی چەندەها بلاوکراوە و نووسینی ئەکادیمییە بە زمانی ئیتالی و ئینگلیزی و کوردی سەبارەت بە پلاندانانی شارو تەلارسازی و پرسی کەرکووك و کاری ڕاوێژکاری ئەکات لە بواری پلاندانانی شاردا بۆ کۆمپانیا بیانی و فەرمانگە حکومییەکان.
* بەرهەم و لێکۆڵینەوەکانی:
- (الجوانب العمرانية والإجتماعية للمدن الإسلامية)، بە زمانی ئیتالی، بلاوکراوەتەوە لە گۆڤاری جیۆرناڵ ژمارە٢، لە بلاوکراوەکانی زانکۆی (ڤینیسیا)ی ئیتالی، ١٩٩٢.
- (المستوطنات العشوائية في الدول النامية)، بە زمانی ئیتالی، فرانکۆ ئینجلی، لە بلاوکراوەکانی گۆڤاری: Archivio di studi Urbani e regionali، ژمارە ٤٧ میلانۆ، ئیتالیا، ١٩٩٣.
- (المستوطنات الريفية في العراق)، لە بلاوکراوەکانی گۆڤاری (ژمارە ٧٤، میلانۆ، ئیتالیا، ١٩٩٦.Space & Society)
- (تقييم مشروع انمائي في كوردستان العراق)، بە زمانی ئینگلیزی و ئیتالی، لە بلاوکراوەکانی زانکۆی (ڤینیسیا)ی ئیتالی، ١٩٩٧.

- (هل ينتسب المعرفة إلى المختصين فقط؟ عبرة ودرس عن تجربة تقييم اشتراك القرويون في عملية التنمية)، بە زمانی ئیتالی، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری کاترۆن کرۆناکای زانکۆییە کە سەر بە کۆلێژی (نەخشەدانانو ئاوەدانکردنەوەیە) لە زانکۆی (ڤینیسیا)ی ئیتالی، ١٩٩٨.
- (الهجرة المعاكسة الصعبة إلى القرى الكوردية والإعتماد على الإغاثة)، بە زمانی ئینگلیزی، گۆڤاری (زاگرۆس)، ژمارە ١، لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگای کوردی لە واشنتۆن، ١٩٩٨.
- (عملية تدمير النسيج العمراني لمدينة كركوك)، بە زمانی ئینگلیزی، لە بڵاوکراوەکانی (مركز كربلاء للبحوث والدراسات)، لەندەن، چاپی یەکەم، ٢٠٠٢.
- (تقييم مشاريع منظمات غير حكومية في كوردستان العراق ١٩٩١-١٩٩٦)، بە زمانی ئینگلیزی، گۆڤاری (زانکۆ)، زانکۆی سلێمانی، ژمارە (١٦)، کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٦).
- (قەڵای کەرکووك لەنێوان رابردوو و ئێستاو داهاتوودا)، لێکۆڵینەوییەکی مێژوویی و تەلارسازی بیناو فەزاکانی، پێشنیارێك بۆ پاراستنو زیندووکردنەوەی)، ئینستتووتی کەلەپووری کورد، سلێمانی، ٢٠١٣.

*** (ئازاد حەمە عەبدوڵڵا - دکتۆر ئازاد حەمە عەبدوڵڵا):**

- ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- کۆلێژی بەڕێوەبەری و ئابووری تەواو کردووە.
- ماستەری لە رووسیا و دکتۆرای لە سوید تەواو کردووە.
- لە بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی:
- (ویستی فەلسەفاندن).
- (بادیو فیتگنشتاین).

*** ئازاد حوسێن تۆفیق (ئاسۆ سوور):-**

- ساڵی ١٩٦٦ لە گوندی (شەوگێڕ)ی ناوچەی شێخ بزێنی لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨١ پەیوەندی بە رێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە کردووە.
- ساڵی ١٩٨٢ بووەتە پێشمەرگە لە دەشتی هەولێر، هەمان ساڵ گوازراوەتەوە بۆ تیپی بیست و یەکی کەرکوك، لە کەرتی یەکی (ساڵەیی).
- لەبەر دڵسۆزی و لێهاتووی پلەی فەرماندەی مەفرەزەی وەرگرتووە لە کەرتی (١) ساڵەیی تیپی بیست و یەکی کەرکوك.
- ساڵی ١٩٨٦ گوازراوەتەوە بۆ تیپی بیست و پێنجی خاڵخاڵان و ئەرکی لێپرسراوی کەرتی (٢)ی شیوەسووری وەرگرتووە، تاکو ساڵی ١٩٨٨ لەم تیپە ماوەتەوە.
- بەشداری ئەم شەڕانەی کردووە:-
- شەڕی ناو گوندی (ئۆمەر گومەت، شەڕی کۆزە بۆرە، شەڕی قەرەبەگ).
- شەڕی شیوە سوور، شەڕی چیمەن، شەڕی گوندی تولکی، شەڕی گوندی حەسار، شەڕی بانی کانی ڕەش، شەڕی دابان هەڵاج.
- شەڕی گۆپتەپە، شەڕی شیوە سوور بۆ جاری دووەم.
- شەڕی شیوە سوور بۆ جاری سێیەم.
- شەڕی ناو دێی ئەسکەندەر بەگی، شەڕی بێتواتە.
- شەڕی کێوە ڕەش (لەم شەڕەدا بە خەستی بریندار بووە).
- شەڕی دۆڵە ڕەقە، شەڕی جادەی کۆیە، شەڕی ناو سوورکەل.
- شەڕی حەسار بۆ جاری دووەم، شەڕی سەفرە و زەنوون.
- شەڕی گرتنی قەڵاتە و تەق تەق، شەڕی لێدانی بیرە نەوتەکانی کەرکوك.
- شەڕی لێدانی سەیتەرەی کەرکوك، ناوشار، گرتنی ڕەبیەی کەلی سێکانیان.
- شەڕی گوندی شەوگێڕ، شەڕی گوندی قەرەسالم.
- شەڕی لێدانی قافڵەی شیوەسوور، شەڕی ناو دێی ئیلنجاخ.
- شەڕی داستانی ڕزگاری، شەڕی خەجە لەرزۆك.
- لە کاتی ڕزگارکردنی کەرکوکدا، یەکێك بووە لەو فەرماندانەی پێشمەرگە بووە لە گەڕەکی (ڕەحیماوا) و ڕێگای دوو سایدی (عەرەفە) کە ڕۆڵی جوامێرانەیان گێڕا لەتێکشکاندنی هەموو هێرشەکانی قۆڵی فەیلەق.
- ڕۆژی (٢٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٩١) لە کاتی کشانەوە لە شاری کەرکوك دوا کەس دەبێت کە شاری کەرکوك بەجێدەهێڵێ و لە کاتی کشانەوەدا لەنێوان شوێنی ئێستای گوندی (گورگەچاڵ) و (سێکانیان) دەکەوێتە بۆسەی (قوات خاصە) و لە ئاسمانەوە هەلیکۆپتەرەکان، لە شەڕێکی دەستەویەخەدا تا دوای خۆرئاوابوون دەخایەنێت، بەدەیان سەربازی دوژمن دەکوژێ لەو نەبەردییەدا ئەم پێشمەرگانە شەهید دەبن:-
ئەحمەد عوسمان، دڵشاد ئەحمەد، سەعید سەعدی.

*** (ئازاد سوبحی):**

- ساڵی (١٩٦١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و پیشەسازی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- شاعیرو ڕەخنەگرو وەرگێڕ بووە، ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) و (هاووڵاتی) کاری کردووە.
- لە (٢٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٤) لە تەمەنی (٥٣) دا کۆچی دوای کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- باخچەکانی باوکم.
- دەنگ و سێبەر.
- ئاگرەکەم مەسڕنەوە.

* ئارام ئەحمەد محەمەد

پێشمەرگەی دێرین‌و کادیری پێشکەوتوو، ناوی تەواوی سەباح ئەحمەد محەمەد، لەدایکبوی سالی (١٩٥٨)ی شاری کەرکوك، خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندیی لە کەرکوك تەواو کردووە، سالی (١٩٧٤) لەگەل دەستپێکردنەوەی شەر لە نێوان کوردو حکومەتی عێراقدا، پەیوەندیی بەشۆرشەوە کردووە پاش هەرەس هێنانی شۆرش لە سالی (١٩٧٥)، ئاوارەی ئێران بووەو دواتر گەراوەتەوە بۆ عێراق‌و خوێندنی لە خانەی مامۆستایانی سلێمانی تەواو کردووە.
سالی (١٩٧٧) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە، سالی دواتر لە گوندی دالاوە کوردانی ناحیەی ئاغجەلەر بە مامۆستا دامەزراوە، سالی (١٩٨٢) بۆتە پێشمەرگە لە هەرێمی ٢ی کەرکوك‌و وەك کادیرێکی رێکخستن لە سنووری هەرێمەکەوە پاشان لە سنووری تیپی ٢١ی کەرکوك بەپلەی ئەندامی پۆل‌و کەرت کاری کردووە.
لە سالی (١٩٨٦)دا لێپرسراوتیی کەرتی رێکخستنی کۆیەی گرتە ئەستۆ، لەو ماوەیەدا بەشدار بووە لە چەندین چالاکیی هێزی پێشمەرگەدا لەوانە شەرەکانی کانی بۆ گەنەو تەکباسان‌و دالاوە روتەو قەلاچۆغە لە سالی (١٩٨٢)و شەری چیمەن (١٩٨٤)و ئۆپەراسیۆنی گرتنی رەبیەی شێخ مەنسوریانی دۆلی خەلەکان (١٩٨٦).
لەو ماوەیەدا دوو بەرهەمی لە خولی سێیەمی گۆڤاری (کۆمەلە)دا بلاوکردۆتەوە، یەکێکیان بەناونیشانی (کورتە باسێکی زەمینەی خەباتی چەکداری‌و جەنگی پارتیزانی لە کورستاندا) کە بەدوو بەش لە ژمارە (١٤و ١٥)دا بلاوکراوەتەوەو ئەوی تر بەناونیشانی (جەنگی سایکۆلۆژی‌و شۆرشی کوردستان) کە لە ژمارە (١٦)دا بلاوکراوەتەوە، سالی (١٩٨٧) بۆ دەزگای ناوەندیی رۆشنبیریی کۆمەلەی رەنجدەران گوێزرایەوەو لەوێ بووە ئەندامی دەزگا.
سالی (١٩٨٩) لە سەقز لێپرسراوەتیی ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانی گرتە ئەستۆ، لە سالی (١٩٩٠)دا کتێبێکی بەناونیشانی (شەپۆلی نوێی دیموکراسی) بلاوکردووە، تێیدا سروشتی پەیوەندیی نێوان سیاسەتی پریسترۆیکای سەرۆکی ئەوسای یەکێتیی سۆڤێت میخائیل گۆرباچۆڤ و دیموکراسی‌و سۆسیالیزمی تاوتوێ کردو رەنگدانەوەی شەپۆلی نوێی دیموکراسیی لەسەر کوردو بزوتنەوەی کوردایەتی شرۆڤە کرد، هەر ئەو سالە لە رێی ئێرانەوە چوو بۆ بەریتانیا لەوێ گیرسایەوە.
سالی (١٩٩٥) لە بەریتانیا دیپلۆمی بالای لە زانستی کۆمپیوتەر بەدەست هێناو وەك مامۆستای کۆمپیوتەرو شارەزا لە سیستمی سیسکۆ کاری کرد، سالی (٢٠١٠) گەرایەوە بۆ کوردستان‌و پلەی ئەندامی لیژنەی بالای مەکتەبی رێکخستنی پێ درا، لە ماوەی نێوان (٢٠١١ - ٢٠١٤)دا وەزیری کاروباری شەهیدان‌و ئەنفالکراوان بوو لە حکومەتی هەرێمی کوردستان.

* ئازاد کەرکوکی:-

- سالی ١٩٦٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی ١٩٩٦ ماستەری بەدەستهێناوە لە بواری سینەما لە مۆسکۆ.
- بەرهەمەکانی:-
- چۆن سیناریۆ دەنووسی، ٢٠١١.
- پەیڤین لەسەر دەرهێنەری سینەمایی، ٢٠١١.
- ماوەیەك لە بەشی هونەریی کەنالی ئاسمانی کەرکوك کاری کردووە.
- ئێستا لە کەنالی گەلی کوردستان لە بەشی هونەریی کار دەکات.

* ئاراز رەئفەت سابیر:-
- سالی (١٩٧٣) لە کەرکوك لە ناحیەی (شوان) لەدایکبووە.
- پیشەی میوزیك ژەنە بە ئامێری (کیستورد رادیگ)
- هەر لە سالی (١٩٩٠)ەوە لە بواری هونەری کاردەکات لە (تیپی مۆسیقای شوان)، کە لە سالی (١٩٩٢) ٨تراکی بۆ هەردوو گۆرانیبێژ تۆمار کردووە بەناوەکانی:- (ئیحسان خانەقینی)، (سیروان شوانی).
- هەر لە سالی (١٩٩٤)ەوە تا (٢٠٠٨) وەکو ژەنیار لە تیپە مۆسیقییەکان بەرهەمی هونەری تۆمارکردووە.
- هەر لە سالی (٢٠٠٩)ەوە کاری کردووە لە بواری ستۆدیۆی مۆسیقی و ستۆدیۆی داناوە بەناوی (دانا، شەپۆل).
- قوتابی بەشی هونەرە جوانەکانی کەرکوکە لە بەشی (مۆزیك).

* (ئازاد عەبدولواحید کەریم عەبدولرەحمان - دکتۆر ئازاد عەبدولواحید کەریم عەبدولرەحمان):-

- سالی (١٩٦٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٨٦-١٩٨٧) بەکالۆریۆسی لە زمان‌و ئەدەبی کوردیدا لە زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێژی ئاداب بەدەستهێناوە.
- ماستەری لە ئەدەبی کوردی لە بەغدا لە کۆلێژی پەروەردە لە سالی (١٩٩٤-١٩٩٥) بەدەستهێناوە.
- دکتۆرای لە ئەدەبی کوردیدا لە سالی (٢٠٠٥) لە بواری رەخنەی سۆسیۆلۆژیای ئەدەبی وەرگردووە.
- کتێبە چاپکراوەکانی:
- (سۆسیۆلۆژیای شیعری کوردی)، ٢٠٠٥.
- (نوێکردنەوە لە شیعری کوردیدا دوای جەنگی جیهانی یەکەم تا سالی ١٩٧٠)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (تیۆری ئەدەب)، لێکۆلینەوەو رەخنەیی، ٢٠٠٧.
- (بنیاتی زمانی شیعری)، (٢٠٠٨).
- (رێبازە ئەدەبییەکان)، لێکۆلینەوەو رەخنەیی، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (کەرکوك لە روانگەی مێژووەوە)، ٢٠٠٧.
- (بنیاتی زمانی شیعری)، جابەکۆمین، وەرگێران، هاوبەش، کەرکوك، (٢٠٠٨).

ئازاد سوبحی

( ئازاد عەبدولواحید کەریم عەبدولڕەحمان -
دکتۆر ئازاد عەبدولواحید کەریم عەبدولڕەحمان )

( ئازاد حوسێن تۆفیق ( ئاسۆ سوور

- (نوێخوازی لە شیعری کوردیدا، لە ڕووناکبیرییەوە بۆ ڕوانگەییەکان)، ٢٠١٠.
- (ڕەنگاڵەکانی دەق)، ٢٠١١.
- (ڕەخنەی ئەدەبی)، ٢٠١٣.
- ماوەیەك مامۆستا بووە لەزانکۆی سلێمانی، کۆلێژی پەروەردەی چەمچەماڵ، زانکۆی کەرکوك.

* (ئازاد گەرمیانی):-

- ناوی (ئازاد محەمەد ئەحمەد)ە.
- ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٦) ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی زانکۆی موستەنسریەی تەواو کردووە.
- دیوانە چاپکراوەکانی:
- (سیمفۆنیای نامۆیی)، کەرکوك، ٢٠٠٤.
- (ماڵئاوا جوانی گەشاوە، دوو دەقی شانۆیی جەلیل قەیسی)، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٧.

* (ئازاد گەرمیانی - دکتۆر ئازاد گەرمیانی):

- ساڵی (١٩٥٥) لە کەرکوك لە لەیلان لەدایکبووە.
- بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زمانی ئینگلیزیدا لە ساڵی (١٩٧٨) بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٨٠) چووەتە کەنەداو بڕوانامی ماستەری لە بواری زانستی رامیاریدا وەرگرتووە، دووبارە ماستەری لە کەنەدا لە بواری (ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و ئیسلام) وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٨٩) گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام)ی بڵاوکردووەتەوەو پتر لە دە ساڵ سەرنووسەری ئەم گۆڤارە بووە.
- ساڵی (١٩٩٣) بڕوانامەی دکتۆرای لە کەنەدا وەرگرتووە لە بواری مێژووی هاوچەرخی کورد لەنێوان ساڵی (١٩٣٣-١٩٤٦) زایینیی.
- ئێستا لە کەنەدا مامۆستای زانکۆی (ڕایەرسۆن) لە شاری (تۆرنتۆ).
- بەرهەمەکانی:
- (الشرق الاوسط والإسلامية)، ١٩٨٥، نامەی ماستەر.
- (دراسة في الحركة الكردية المعاصرة ١٨٣٢-١٩٤٦)، نامەی دکتۆرا.

* (ئازاد محەمەد عەبدولڕەحمان شوانی):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (اثر التطور السياسي في الشعر العراقي الحديث ١٩١٤-١٩٣٩)، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٩.

* (ئازاد مەحموود شەوقی):-

- یەکێك بووە لە شێوەکارەکان کە ماوەیەکی زۆر لە کەرکوك ژیاوە.

* (ئازاد مستەفا-ئازادە ڕەش):-

- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك کە لە سەرەتادا کۆمەڵێك تابلۆی هەبوو لە ماوەی نێوان حەفتاکان و بەشداری شێوەکاری هەبووە تا ناوەراستی هەشتاکان.
- ساڵی (١٩٧٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە بارەگای لقی کەرکوکی حیزبی شیوعی عێراقی لەگەڵ هونەرمەندی شێوەکار (ئاری بابان).
- (٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٦) بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی (التأميم للفن الحديث) لەگەڵ هونەرمەندان: (محەمەد سالەیی، ئاشتی مەهدی، فەلاح عومەر، سەلاح حەمە ئەمین، ئەحمەد کاکە سوور، موعتەسەم سالەیی، ئەحمەد فایق، سەنا جاسم، خالید حوسێن).

* (ئازاد هەورامی):

- ناوی تەواوی ئازاد عەبدولمەجید عەبدولغەفار جەعفەر. بەرەچەڵەك دەچێتەوە سەر ناوچەی هەورامان و نازناوەکەشی هەر لەوەوە هاتووە.
- لە (٣١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٤) لە هەمان گەرەکی کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٣) بنەماڵەکەی لەتەوێڵەوە بۆ کەرکوك کۆچی کردو لە گەرەکی ئیمام قاسم گیرسایەوە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکوك تەواو کرد، بەڵام لەبەر هەڵسووڕانی سیاسیی نەیتوانی پۆلی شەشی ئامادەیی تەواو بکات.
- لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٠)، بووە ئەندام لە یەکێتی قوتابیانی کوردستان.
- ساڵی (١٩٧٢)دا پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٧٤) پاش هەڵگیرسانەوەی شەر لەنێوان کوردو حکومەتی عێراقدا، بوو بە پێشمەرگە. پاش هەرەسهێنانی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥) گەڕایەوە بۆ کەرکوك و بەردەوام بوو لەسەر هەڵسووڕانی سیاسیی لەناو کۆمەڵەدا.
- دوا بەدوای ئاشکرابوونی بەشێکی زۆری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەو دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆری ئەندامان، خۆی لە دەزگا ئەمنییەکان شاردەوەو لە کۆیە گیرسایەوە. پاشان،

دوابەدوای گیرانی هەموو سەرکردەکانی کۆمەڵە، لەگەڵ هەر یەك لە شاسوار جەلال (ئارام)و حیکمەت محەمەد کەریم (مەلا بەختیار)و سالار عەزیزدا بەشدار بوو لە دامەزراندنی کۆمیتەی هەرێمەکان و سەرکردایەتیی دیفاکتۆی کۆمەڵە لە کاتی تەنگانەدا.
– ساڵی (١٩٧٦) بوو بە پێشمەرگەو مەفرەزیەکی سەرەتایی لە ناوچەی چەمی رەزان دروستکرد.
– ساڵی (١٩٧٧) پاش ئەوەی کە لە کۆبوونەوەکانی برادۆست بڕیار درا کۆمیتەیەکی سەرکردایەتی لە نوێنەرانی کۆمەڵەی رەنجدەران و بزووتنەوەی سۆشیالیست و هێڵی گشتی بۆ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان پێك بهێنرێ، یەکێ لەو شەش نوێنەرەی کۆمەڵە بوو لە کۆمیتەی سەرکردایەتیی یەکێتیدا.
– لە کۆبوونەوەی ساڵی (١٩٧٨)ی نۆکانیش بە ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتی دانرایەوەو دواتریش خۆی و سالار عەزیز کران بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
– هەروەها لە نۆکان، لە کۆبوونەوەی کادیرە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵەدا سەرکردایەتییەکی کاتی بۆ کۆمەڵە دیاری کراو ناوەندێکی سێ کەسیش بۆ راییکردنی کاروبارەکان دانرا کە لە هەردووکیاندا هەورامی ئەندام بوو.
– لە کارەساتی ساڵی (١٩٧٨)ی هەکاریدا کاتێك هێزەکانی یەکێتی رووبانکردە برادۆست بۆ دانانی بنکەو دواتریش چوونە ناو خاکی تورکیا بۆ وەرگرتنی ئەو برە چەکەی نیاز وابوو لە سووریاوە بگات، لە (١٩ی) حوزەیراندا کەوتە بۆسەی چەکدارە خێڵەکییەکانی ناوچەکە کە شێخموس کەرڤان سەرکردایەتیی دەکردن و پاش شەڕێکی سەخت کە چەند سەعاتێکی خایاندو ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگەی تێدا شەهید بوو، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کادیرو لێپرسراودا بەدیل گیراو پاش چەند رۆژێك رادەستی تاقمی سەرکردایەتیی کاتیی پارتی دیموکراتی کوردستان کرا. هاوینی هەمان ساڵ توانی لە زیندان رابکات و خۆی بگەیەنێتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی.
– لە کۆبوونەوەی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٨)ی کادیرە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵە لەشێنێ، بەئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە هەڵبژێردرایەوە.
– ساڵی (١٩٨٠) کرا بەلێپرسراوی لقی ٢ی کەرکوکی یەکێتی.
– ساڵی (١٩٨١) پاش ئەوەی کە لە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە، بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵنەبژێردرایەوە، کرایە ئەندامی مەکتەبی رێکخستنی کۆمەڵە.
لە کۆنفرانسی ٢ی کۆمەڵە کە ساڵی (١٩٨٢) لەناوزەنگ بەسترا، بەئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراو
– ساڵی (١٩٨٤)یش لە کۆنفرانسی ٣ی کۆمەڵە لە مێرگەپان، هەڵبژێردرایەوە بە ئەندامی سەرکردایەتی.
– ساڵی (١٩٨٥) پاش ئەوەی کە دەزگای ناوەندیی رۆشنبیریی کۆمەڵە دامەزرا، کرایە لێپرسراوی دەزگاکە کە بارەگاکەی لەکانی توو بوو لەناوچەی مەرگە. پاش ئەوەی تۆپباران کردنی بارەگاکانی مەرگە رووی لە زیادبوون کرد، بارەگای دەزگاکە برایە دۆڵی جافەتی و هەوەڵ جار لە گوندی هەڵەدن دانراو لە پاییزدا بارەگاکە بۆ گوندی چالاوا گواسترایەوە.
– دوای ئەوەی کە لە ٨ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٦) دا رێککەوتنی ئاشتی لەنێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستاندا بۆ هەردوولا هاتە ئاراوە. بەم پێودانگە یەکێتی مەڵبەندی ٤ی بادینانی دامەزراندو لێپرسراوەتییەکەی بە هەورامی سپارد. ئەویش تا ساڵی (١٩٨٨) بەرپرسی مەڵبەند بوو.
– پاش گەڕانەوەی لە بادینان، بۆ ماوەی مانگێك لە دۆڵە کۆگە مایەوەو دواتر بۆ گوندی کونەکۆتری دۆڵی باڵەیان نێردرا بۆ پاراستنی رێگای نێوان دۆڵی باڵەیان و شوێنی گردبوونەوەی هێزەکانی مەڵبەندی ٣ی هەولێر کە سوپای عێراق هەڕەشەی گەمارۆدانی لێدەکرد.
– لە ٣٠ی ئابی ساڵی (١٩٨٨)دا فڕۆکەیەکی پیلاتۆز گوندەکەو بنکەکانی هێزی پێشمەرگەی دایە بەر موشەك و لە ئاکامدا هەورامی بەسەختی بریندار بوو. بەیانیی رۆژی دواتر، لە کاتی گواستنەوەی لە شێخ ئایشەوە بۆ ئالوەتان، لە رێگا شەهید بوو.
– لە (٢٦)ی شوباتی ساڵی ١٩٨٦ لەگەڵ خاتوو (شنۆ شاسواری) دەبنە هاوسەر.
– ساڵی (١٩٨٦) وەك بەپرسی مەڵبەندی بادینان لەگەڵ هێزەکەیدا چووە بۆ ناوچەی بادینان تا ساڵی (١٩٨٨).
– لە ژیانیدا نووسەرێکی بە توانا و مۆسیقازانێکی لێهاتوو بوو.

* (ئازاد هیدایەت دەلۆ):-

– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (دیداری رۆشنبیری و رۆژنامەگەری کوردی)، هەولێر، ١٩٩٩.
– (دیداری رۆشنبیری)، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
– (یانەی سەرکەوتنی کوردان ١٩٣٠، ١٩٦٢ مستەفا نەریمان)، ئامادەکردن و پێداچوونەوە، کەرکوك، ٢٠٠٦.

* (ئاسۆ گەرمیانی):-

– بەرهەمەکانی:-
– (رێزمانی کوردی بۆ قوتابخانەکانی سەرەتایی لە دەرەوەی وڵات)، بەرگی یەکەم، سوید، ٢٠٠١.
– (رێزمانی کوردی بۆ قوتابخانەکانی ئامادەیی لە دەرەوەی وڵات)، بەرگی دووەم، سوید، ٢٠٠١.

* (ئاسۆس نەجیب عەبدوڵڵا):

– ساڵی (١٩٧٤) لە خورماتوو لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٩٥) کۆلێژی یاسای لە زانکۆی سەلاحەددین تەواو کردووە.
– هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لە بواری یاسای گشتی.
– ساڵی (٢٠٠٩) لە کابینەی شەشی حکومەتی هەرێمی کوردستان بووەتە وەزیری کارو کاروباری کۆمەڵایەتی.

ئاسۆس نەجیب

ئاسۆ مامەند

ئاشتی گەرمیانی

ئالا تاڵەبانی

*** ئاسۆ مامەند ئیسماعیل (ئاسۆ ئەڵمانی):-**

– لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٣)ی گوندی قەرەبەگ لەناوچەی سەرگەران.
– ساڵی (١٩٧٠) لە گوندەکەی خۆی چووەتە خوێندنگەی سەرەتایی و ساڵی (١٩٧٧) لە شارۆچکەی پردێ دەستی بەخوێندنی دواناوەندی کردو هەر لەوێ تا شەشی ئامادەیی خوێند.
– ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کرد.
– ساڵی (١٩٨٢) لە دەشتی هەولێر پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد. لەکەرتی ٦ی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر ئەرکەکانی پێشمەرگایەتیی جێبەجێکردو بۆ ساڵی دواتر بووە فەرماندەی مەفرەزە.
– ساڵی (١٩٨٥) بەپلەی فەرماندەی مەفرەزە بۆ تیپی تایبەتی مەڵبەندی ٣ی هەولێر لەوەرتێ گوێزرایەوە.
– ساڵی (١٩٨٧)دا بووە جێگری فەرماندەی تیپی ٨٥ی بەرانەتی. ساڵی (١٩٨٨) بووە فەرماندەی تیپ.
– ساڵی (١٩٨٩) بۆ ماوەی شەش مانگ بەپارتیزانی لە سنووری بەرانەتی و هەولێر مایەوە. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی دەیان چالاکی و نەبەردی پێشمەرگانەی کردووە لەناوچەکانی دەشتی هەولێر، باڵەکایەتی، دەشتی قەراج و کەندینانەوەو لەو ماوەیەدا ٦ جار بەسەختی بریندار بووە.
– ساڵی (١٩٩٠) لە ئەڵمانیا گیرسایەوەو پاش راپەڕینی ساڵی (١٩٩١) گەرایەوە بۆ کوردستان. لە کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە سلێمانی لە ساڵی (٢٠٠١)، بەئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردرا.
– لە ماوەی نێوان (٢٠٠٢ – ٢٠٠٣) لێپرسراوی مەڵبەندی رێکخستنی گەرمیان بوو. لە ساڵانی (٢٠٠٦و ٢٠٠٧) لێپرسراوی مەڵبەندی موسڵ بوو.
– ساڵی (٢٠٠٧)ەوە تا کۆتایی ساڵی (٢٠٠٩) لێپرسراوەتیی مەڵبەندی دووبزی گرتە ئەستۆ.
– لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی بەئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی هەڵبژێردرایەوەو دواتر کرا بەئەندامی یەدەگی مەکتەبی سیاسی و لەمانگی نیسانی (٢٠١٠)کرا بەلێپرسراوی مەڵبەندی ٣ی رێکخستنی هەولێر. ساڵی (٢٠١٢) لێپرسراوەتیی مەڵبەندی ٢ی کەرکوکی پێ سپێردرا.

*** (ئاشتی مەهدی محەمەد-ئاشتی گەرمیانی):-**

– ساڵی (١٩٦٥) لە قادر کەرەم لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
– دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانییە لەنێوان ساڵانی ١٩٨١-١٩٨٦.
– پێشانگا هونەرییەکانی:
– ساڵی (١٩٨٥) یەکەم پێشانگای هونەری لە شاری کەرکوك کردەوە.
– ساڵی (١٩٨٥) دووەم پێشانگای تایبەتی لە شاری کەرکوك کردەوە.
– ساڵی (١٩٨٩) سێیەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی ئەلرەشید کردەوە.
– ساڵی (١٩٩٠) چوارەم پێشانگای تایبەتی (گەلەری ئاری) لە هەولێر کردەوە.
– ساڵی (١٩٩١) پێنجەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی قەڵا چۆلان کردەوە.
– ساڵی (١٩٩٢) شەشەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی میدیا لە هەولێر کردەوە
– ساڵی (١٩٩٣) حەوتەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی عەرەبی لە دیمەشق لە سووریا کردەوە.
– پێشانگا هاوبەشەکانی:
– ساڵی (١٩٨٦) هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە.
– ساڵی (١٩٨٦) هاوبەشی پێشانگای رۆژی هونەری کردووە لە بەغدا.
– ساڵی (١٩٨٧) هاوبەشی پێشانگای هاوینەی گەلەری ئۆرفەلی کردووە لە بەغدا.
– ساڵی (١٩٨٨) هاوبەشی پێشانگای رۆژی هونەری کردووە لە بەغداو سلێمانی.
– ساڵی (١٩٨٩) هاوبەشی پێشانگای (الواسطي) کردووە لە بەغدا.
– ساڵی (١٩٩٠) هاوبەشی پێشانگای رۆژی هونەری کردووە لە بەغداو سلێمانی.
– ساڵی (١٩٩١) هاوبەشی پێشانگای هونەمەندانی کوردی کردووە لە گەلەری ئاری لە هەولێر.
– ساڵی (١٩٩٢) هاوبەشی پێشانگای کردووە لەگەڵ هونەرمەندان فەلاح عومەرو بژار کەریم لە هۆڵی میدیا لە هەولێر.
– ساڵی (١٩٩٣) هاوبەشی پێشانگای کردووە لەگەڵ هونەرمەندان فەلاح عومەرو غازی محەمەد لە شاری حەلەب لە سووریا.
– ساڵی (١٩٩٤) هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندانی عێراقی کردووە لە سەنتەری عەرەبی لە دیمەشق لە سووریا.
– ساڵی (١٩٩٥) هاوبەشی پێشانگای کردووە لەگەڵ چوار هونەرمەندی عێراقی لە سەنتەری هونەری رووسی لە دیمەشق.
– ساڵی (١٩٩٦) هاوبەشی پێشانگای خاچی سووری کردووە لە کتێبخانەی گشتی ئەسەد لە دیمەشق لە سووریا.
– پێشانگاکانی لە هۆڵەنداو ئەوروپا:
– ساڵی (١٩٩٧) بەشداری پێشانگای رۆژی پەنابەران لە شاری ئەپل دۆرن کردووە.
– ساڵی (١٩٩٧) پێشانگای تایبەتی لە شارەوانی شاری بیرخت ئۆپ زۆم لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٨) پێشانگای تایبەتی لە چالاکی قوتابخانەکانی شاری رۆندال لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٨) پێشانگای تایبەتی (Art in Action) لە گەلەری (١٩)ی شاری رۆتردام لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٨) بەشداری پێشانگای هاوبەشی رێکخراوی ئایدا لە شاری ئەمستردام و هۆرن و لایدن کردووە.
– ساڵی (١٩٩٩) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەند سوعاد ستار لە زانکۆی ڤاخینیکن لە گەلەری جیهان لە شاری ڤاخینیکن کردووە.

- ساڵی (۱۹۹۹) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی شارەوانی ئاودنپووش بە ناوی ڕەنگەکان لە کوردستانەوە کردووەتەوە.
- ساڵی (۱۹۹۹) پێشانگای تایبەتی بە (۲۵) کاری هونەری لە گەلەری واتەر ئۆرتی شاری ڕوزندال کردووەتەوە.
- ساڵی (۱۹۹۹) هاوبەشی پێشانگای ڕۆژی پەنهاندەکان لە شاری (ئەپل) دۆرن کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۰) پێشانگای تایبەتی لە سەنتەری کەلتووری کوردی شاری دەنهاغ کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰۰) هاوبەشی پێشانگای ڕێکخراوی بابل لەگەڵ (۲۸) هونەرمەندی عێراقی لە شارەوانی دەنهاغ لە هۆڵەندا کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۰) هاوبەشی پێشانگای هونەری لەگەڵ دوو هونەرمەندی هۆڵەندی کۆری فەنهەلوف و هونەرمەندی فەرەنسی نایلی لە هۆڵی نەخۆشخانەی شاری ڕۆزندال لە هۆڵەندا کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۰) هاوبەشی پێشانگای ڕۆژی پەناهەندەیی لە شاری ئەپل دۆرن کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۱) پێشانگای تایبەتی لە گەلەری سولو کتێبخانەی گشتی شاری برێدا لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰۱) پێشانگای هاوبەشی بە ڕێکخستنی ڕێکخراوی K.I.A ڕۆژێك بۆ کەلتوور لە شاری برێدا لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰۱) هاوبەشی پێشانگای K.I.A جێگای خالی کەلتووری شاری برێدا لە هۆڵەندا کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۱) هاوبەشی پێشانگای سەنتەری کەلتووری کوردی لە شاری ئەمستردام لە هۆڵەندا کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۱) هاوبەشی پێشانگای ڕێکخراوی K.I.A لە کتێبخانەی گشتی شاری ڤالڤایك کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۱) هاوبەشی پێشانگای ڕێکخراوی K.I.A لە هۆڵی لیین باکر لە شاری بیرخن ئۆپ زووم لە هۆڵەندا کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۲) هاوبەشی پێشانگای ڕێکخراوی پەناهەندەیی لە شاری فۆرسخوتن لە هۆڵەندا.
- ساڵی (۲۰۰۲) پێشانگای تایبەتی لە گەلەری واتر ئۆردن لە شاری ڕۆزندال کردووەوە.
- ساڵی (۲۰۰۲) پێشانگای هاوبەشی ۳۰ هونەرمەندانی عێراقی لە شاری دەنهاغ لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰۳) پێشانگای تایبەتی لە کتێبخانەی گشتی شاری ڕۆزندال کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰۳) پێشانگای هاوبەشی ڕێکخراوی (K.I.A) لە شارەوانی دۆنگن لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰٤) پێشانگای ڕێکخراوی هونەری هونەرمەندانی ڕۆژئاوای هۆڵەندا لە شارۆچکەی واو شارەوانی ڕۆزندال لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰٤) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی بەرەمودا لە شاری کەلمهاوت لە بەلجیکا کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰٤) پێشانگای ڕێکخراوی ئایدا نیدەرلاند لە ئازەربایجانەوە تا دەنهاغ لە شارەکانی (ئەمستردام، دەنهاغ، ئوتریخت).
ساڵی (۲۰۰٤) پێشانگای ڕێکخراوی (K.I.A) بۆ پێنج هونەرمەندی جیا لە وڵاتانی (بۆسنیاو هیرکوفینیا)و هۆڵەندا.
- ساڵی (۲۰۰۵) پرۆگرامێکی هونەری ئامادە کراو بۆ پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە شاری کەرکوك بۆ خوێندکاران خوێنرایەوە بە پیشاندانی وێنەی هونەری.
- ساڵی (۲۰۰۵) بۆ ڕۆژنامەی باسەرە حەوت بابەتی هونەری زنجیرەیی بڵاوکراوەتەوە دەبارەی خەونەکان زۆر کورتن، ڕۆژنامەی باسەرە لە شاری کەرکوك دەردەچێت.
- ساڵی (۲۰۰۵) هاوبەشی پێشانگای ڕۆژی (٥)ی مایی لە شاری دەنبووش بە ئامادە بوونی سەرۆك وەزیرانی هۆڵەنداو شازادە کوری شای هۆڵەندا ولیەم ئەلکسەندەر بەشداری کردووە.
- ساڵی (۲۰۰۵) هاوبەشی پێشانگای هونەر لە شەقامی (بەنکن)ی شاری ئیتن لوور لە هۆڵەندا.
- ساڵی (۲۰۰۵) کۆمەڵێك لە کاری هونەری یەك مەتر بە هەشتا لە کاری ووردیلانە بۆ پێشانگای هاوینەی شەقامی بەنکن لە شاری ئیتن لوور ئامادە کرد.
- ساڵی (۲۰۰٦) پێشانگای تایبەتی لە شاری دورن لە هۆڵی رابۆ بانك.
- ساڵی (۲۰۰٦) پێشانگای ڕۆژی کەلتووری لە شاری (ئێمن)ی باکووری هۆڵەندا.

* ( ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی - دکتۆر ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی ):

- یەکێکە لە نووسەرە بە تواناکانی کەرکوك و لە بواری مێژوو و لێکۆڵینەوەی سیاسی گەلێك بابەتی بە پێزی هەیە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی کوردستان.
- (شاری سلێمانی ۱۹۱۸-۱۹۳۲)، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، سلێمانی، ۲۰۰۲.
- (شاری سلێمانی ۱۹۳۲-۱۹٤٥)، سلێمانی، (۲۰۰۸).

* ( ئاکۆ محەمەد شوانی ):-

- ساڵی (۱۹۸۳) لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- قوناغی خوێندنی ئامادەیی تەواو کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ئەنفال لە دیدی ئەوانی ترەوە)، ۲۰۱۱.
- (ژیاننامەی چوار پێشەواکەی ئیسلام)، ۲۰۱۲.
- (چیرۆکنامە)، ۲۰۱۲.
- (شەهید گەرمیان)، ۲۰۱۲.
- (بیبلۆگرافیای کتێبەکانی ئەنفال)، سلێمانی، ۲۰۱۳.
- ماوەیەك سەرنووسەری گۆڤاری (مانەوە) بووە.
- ماوەیەك سەرنووسەری ڕۆژنامەی (چەرموو) بووە.
- ماوەیەك سەرنووسەری گۆڤاری (کتێبنامە) بووە.

* ( ئالان نەجدەت عەبدولڕەحمان ):

- ساڵی (۱۹۷٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدای بەشی سیرامیك تەواو کردووە.
- بەشداری پێشانگای ساڵانەی پەیمانگا هونەرییەکانی کردووە لە موسڵ و بەغداو کەرکوك.

*** ئالا تالەبانی:-**

- ناوی تەواوی ئالا تەحسین شێخ حەبیب تاڵەبانی.
- لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٦)ی گەڕەكی بەرتەكیەی شاری كەركوك. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و پەیمانگای تەكنیكیی لە كەركوك تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٧٥) خێزانەكەی، هاوشێوەی چەندین خێزانی تری دانیشتوی كەركوك، لەسۆنگەی فاكتەری سیاسییەوە، بۆ شارۆچكەی ڕیفاعیی سەر بەپارێزگای زیقار بۆ ماوەی چەند ساڵێك دوور خراوەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٦) لە كەركوك پەیوەندیی بە ڕێكخستنەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستانەوە كردووە.
- ساڵی (١٩٨٨)، كاتێك كارمەند بوو لە بەڕیوەبەرایەتیی ڕێگاوبانی كەركوك، لە سۆنگەی هۆی سیاسییەوە لەسەر كار لابراو دوای ئەویش كە گەڕایەوە سەر كارەكەی. ساڵی (١٩٩٠)دا لەسۆنگەی هەمان هۆوە لەسەر كار لابرا.
- ساڵی (١٩٩١) وەك ئەندامێكی ڕێكخستنەكانی كۆمەڵە بەشدار بوو لە ڕاپەڕینداو هەر ئەو ساڵە، دوای ئەوەی هێزەكانی عێراق كەركوكیان گرتەوەو ڕاپەڕینیان خامۆش كرد، فەرمانی دەستگیركردنی لە دەزگای ئەمنی كەركوك بۆ دەرچوو. لەم سۆنگەیەوە ماوەیەك بە خێزانەوە لە ئێران مایەوەو پاش هێوربوونەوەی بارودۆخی هەرێم، لە ئێران گەڕایەوەو لە كۆیەو دواتر لە هەولێر گیرسایەوە. لەو ماوەیەدا چالاكیی زۆری لە بواری ڕێكخستن و كاروباری ژناندا نواند.
- ساڵی (١٩٩٢)بووە ئەندامی كەرتی ڕێكخستنی ژنانی كۆمیتەی كۆیەو لە كۆتایی هەمان ساڵ بووە بەرپرسی لقی كۆیەی یەكێتیی ژنانی كوردستان. ساڵی دواتر، لە پلینۆمی یەكێتیی ژنان بە ئەندامی سكرتاریەتی یەكێتیی ژنان هەڵبژێردرا.
- لە كۆتایی هاوینی ساڵی (١٩٩٦) هەولێری بەجێهێشت و چوو بۆ سووریا دواتریش بۆ بەریتانیا.
- ساڵی (١٩٩٨) بووە جیگری لێپرسراوی كۆمیتەی ڕێكخستنی بەریتانیای یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان و ئەندامی مەكتەبی پەیوەندییەكانی دەرەوە لە شاری لەندەن. لەو ماوەیەدا چەند بڕوانامەیەكی لە بواری زمانی ئینگلیزی و ماف مرۆڤ و ڕێكخراوەكانی كۆمەڵەی مەدەنی بەدەستهێنا.
- ساڵی (٢٠٠٣)دوا بەدوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە عێراق، گەڕایەوە بۆ كوردستان و دواتر لە بەغدا لە چوارچێوەی پرۆژەیەكی وەزارەتی كاروباری ژنانی بەریتانیا سەرپەرشتیی پێكهێنانی ڕێكخراوەكانی كۆمەڵی مەدەنی و بزووتنەوەی ژنانی عێراقی كرد لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق و لەم سەروبەندەشدا بەهاوكاریی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا ڕێكخراوی ناوەندیی بەهێزكردنی توانای ژنانی دروست كرد.
- ساڵی (٢٠٠٥) لە هەڵبژاردنی خولی دووەمی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، لەسەر لیستی هاوپەیمانیی كوردستان بەئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران هەڵبژێردراو لە ساڵی (٢٠١٠)دا لە هەڵبژاردنی خولی دووەمی ئەنجوومەنی نوێنەراندا، وەك نوێنەری شاری كەركوك بە ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێنەران هەڵبژێردرایەوە.
- لە كۆنگرەی سێیەمی ساڵی (٢٠١٠)ی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستاندا بەئەندامی ئەنجوومەنی سەركردایەتی هەڵبژێردرا.

*** (ئامانج شاكەلی):-**

- ناوی (جەمیل محەمەد شاكەلی).
- ساڵی (١٩٦٢) لە دێی (شاكەل) لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٨٢) ئامادەیی پیشەسازی لە سلێمانی تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٨٩) چیرۆكی (زەردەخەنە)ی بۆ منداڵان نووسیوە.
- ساڵی (١٩٨٩-٢٠١٠) وەكو پەنابەرێكی سیاسی لە بەلیجكا ژیاوە.
- ساڵی (١٩٩٣) یەكەم بەرهەمی بە زمانی ئێرلاندی بڵاوبووەتەوە كە وەرگێڕاوی چیرۆكی (زەردەخەنە) بووە، ئەم كتێبە لە ساڵی (٢٠٠١) بۆ سەر زمانی ژاپۆنی وەرگێڕاوە.
- ساڵی (١٩٩٦-١٩٩٧) چیرۆكی (پەپولەیەك بەسەر پەرنجەرەكەوە) بە زمانی ئێرلاندی نووسیوەو بڵاویكردووەتەوەو خەڵاتی (بێچووە شێری زیوینی پێ بەخشراوە.
- ساڵی (١٩٩٨) چیرۆكی (خەونی گوڵە شەوبۆ)ی نووسی.
- ساڵی (٢٠٠٣) چیرۆكی (سەما لەگەڵ مناگدا) نووسی.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٩٩-٢٠٠٤) سەرجەم كتێبەكانی لە بەلجیكا چاپ و بڵاوكراوەتەوە، هەر یەكە لە پۆلۆنیا و ئیتالیا و ئەلمانیا كتێبەكانی نمایش كراوە.
- لە پاڵ كتێب و چیرۆكەكانیدا گەلێك بابەتی ئەدەبی لە گۆڤاری (بوكی بوكی) هۆلەندی و بەلجیكی بڵاوكردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠١) یەكەمین كتێبخانەی (كوردی، عەرەبی) لە شاری (لوێڤن) دامەزراندووە، كە نزیكەی پێنج سەد كتێب و ڕۆژنامەی كوردی و چوار سەدو پەنجا كتێب و ڕۆژنامەی عەرەبی لە خۆ گرتووە.
- ماوەیەك سەرنووسەری گۆڤاری (بانەڕۆژ) بووەو ئێستا خاوەن ئیمتیازی گۆڤارەكەیە.

* (ئامینە مەحموود):-

- ساڵی (١٩٧٤) لەدایکبووە.
- گەلێك لێکۆڵینەوەو بابەتی ڕەخنەیی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ناوخۆو دەرەوە بڵاوکردۆوەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (فراشات آمنة)، کۆمەڵێك بەرهەمی شیعریە.
- (الحمامة المتوحشة)، کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەیە.
- (کتاب الحب)، کۆمەڵێك پەخشانە شیعریە.

* (ئاوارە - مەلا ئاوارە):-

- ناوی (کەریم کوڕی ئیبراهیم حەیدەر)ە.
- ساڵی (١٩٦٣) لە گوندی (بان میل) لەدایکبووە.
- شاعیرو پێشمەرگەیەکی هەست ناسك بووە، لە سەردەمی شاخ دوو کۆمەڵە شیعری چاپ کردووە.
- لە (٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئاوێزان نوری):-

- ساڵی (١٩٨١) لە شاری سلێمانی لەدایکبووە.
- لەدوای پرۆسەی ئازادی بەرهەمەکانی بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (پیاسەیەك بە کووچەکانی قەدەردا)، ٢٠٠٥.
- (بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا)، ٢٠٠٥.
- (نامەکانی نامۆ)، ڕۆمان، بەشی یەکەمی چاپکردووە.
- (لە بەرگی گەڵایەکدا دەمرم)، ٢٠٠٩.
- (لە جەستەی گەڵایەکدا دەمرم)، ٢٠١٣.
- بێجگە لەشیعر چیرۆکیش دەنووسێتو لە بواری ڕۆژنامەوانیشدا کاردەکات.
- خەڵاتی (پێشڕەو بۆ ژنی سەرکردە)ی وەرگرتووە.

* (ئایدن شاکیر ئەلعێراقی):

- ساڵی (١٩٣٦) لە گەڕەکی مەیدان لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کردووە لە هۆڵی ئەلتەئمیم بۆ هونەری نوێ.

- ساڵی (١٩٩٩) شەهید کراوە.
- یەکێکە لە دامەزرێنەرەکانی شانۆ لە پەنجاکان لە کەرکوك.

* ئایدن ئاقسو:-

- ساڵی ١٩٥٦ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- قرية المتنازع عليها.
- مشاركة التركمان في الانتخابات ٢٠٠٥.
- السطوح المتصدعة، ٢٠٠٦
- كركوك صراع النفط ورحلة البقاء ٢٠٠٧.
- البدع الكردية، ٢٠٠٩.

* ئایدن کرکوك:-

- ساڵی ١٩٥٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- فتح القسطنطينية، نووسینی ئەحمەد ڕەفیق، وەرگێڕانی لە تورکییەوە، ٢٠٠٩
- دور الشباب في النزاع من أجل بناء السلام في كركوك، منظمة الرافدين لتطوير المجتمع والإعمار، وەرگێران، ٢٠١٢

* ئایدن ئەلنەقیب:-

- ساڵی ١٩٤٦ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- الباب الذي أطرقه الجدار، شيعر ٢٠١٢

* (ئەبو بەکر دەروێش):-

- ناوی تەواوی (بەکر عوسمان دەروێش)ە ناسراوە بە (بەکر دەروێش).
- ساڵی (١٩٦٧) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- یەکێکە لە چیرۆك نووسەکانو خەڵکی خورماتووەو گەلێك بابەتی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان بڵاوکردووەتەوە تاکوو ئێستاکە پێنج کتێبی چاپکراوی هەیە.
- چیرۆکە چاپکراوەکانی:-
- (ڕموزنەکان)، چیرۆك، چاپی یەکەم، کەرکوك، ٢٠٠١، چاپی دووەم، کەرکوك، ٢٠٠٩.
- (ماچ)، کۆمەڵە دەق، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (ژیان عادەتێکی بێ تام)، چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (باخەکانی ئاوات)، کۆمەڵە چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (گەورەم جەنەڕاڵ)، سێ کورتیلە چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٧.

* (ئەبو بەکر شێخ محێدین-سەقمی):-

- ئەبو بەکر کوڕی شێخ محێدین شێخ قادری کوڕی شێخ حەسەنی کوڕی شێخ نیزامەدین شێخ مەحموودەو ئەچێتەوە سەر بنەماڵەی (پیرخدر شاهۆ).
- ساڵی (١٩١٠) لە کفری لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شاعیرە چاکەکانی (کفری) تا ڕادەیەك ناوبانگی هەبووە لە بواری شیعردا، شێخ، محێدین شاعیرە وەمەلایش بووە، هەوەها شێخ جەباری مامشی شاعیر بووە، لەگەڵ شێخ

ئایدن شاکر

مەلا ئاوارە

ئاوێزان نووری

ئارام پەشێو، یەکێکە لە شاعیرە لاوەکانی ئەمڕۆی کەرکوک

عومەر برای شێخ ئەبوبەکر شاعیر بووە.
– ئەم چوار برایانە (ئەبوبەکر، عومەر، فەتاح، عەلی) هەر چواریان بەرگدووری بەناوبانگی کفری بوونە، فەتاحیان لە کەرکەوك و عەلیان لە قەرەتەپە و تەنها شێخ ئەبوبەکری براگەورەیان لە هەمان دوکانی پەنجا ساڵ پتر لەمەوپێش بە خەیاتییەوە خۆی سەرقاڵی کردووە و ماڵ و منداڵی خۆی بەخێو دەکات.
– شێخ ئەبوبەکر لە سییەکانەوە دەستی شیعر نووسینی هەبووە، وەکەمو زۆر شیعری بڵاوکردووەتەوە و نووسیوویە.
– ساڵی (١٩٩٧) لە تەمەنی (٨٧) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

*** (ئەبو بەکر محەمەد):-**

– ساڵی (١٩٥٦) لە گەڕەکی **تەپەی شاری کەرکوك** لەدایکبووە.
– بەشداری لە چیرۆکی تەمسیلی: (من **شێت نیم**)، (**کێ** تاوانبارە)، (پەشیمانی)، (هاواری نامۆیی)، (**پوولەکی**). چوار گۆرانی تۆمارکردووە: (دادە یان)، (**نەلی نەنێ**)، (من جوتیارم)، (دەمەگری مەگری).

*** (ئەبو بەکر موفتی کەرکوکی):-**

– **ناوی** (ئەبو بەکر ئەفەندی کوڕی ئیسماعیل ئەفەندی کەرکوکی)یە.
– ساڵی (١٧٦٠) لە دێی (پڵاوە) لەدایکبووە، **بەڵام هەندێك** سەرچاوە ساڵی (١٧٦٨)یان بە دانەوە.
– شاعیرێکی بەناوبانگ بوو، دەستنووسێکی **شیعری لێ بە** جێماوەو نزیکەی (١٨٠) لاپەڕەیە، نازناوی شیعری (**موفتی**) بووە.
– ساڵی (١٨١٨) بووەتە موفتی بەغدا لەلایەن والی (**داود** پاشا)وە.
– ساڵی (١٨٣٠) کۆچی دوایی کردووە بە نەخۆشی (**کولێرە**) و لە مزگەوتی (پیر داود) نێژراوە.

*** ئەبوبەکر محەمەد حاجی قادر (مەلا شاخی):-**

– ناسراو بە مەلا شاخی.
– ساڵی (١٩٥٣) لە گوندی **بیرەسپانی ناحیەی پردێ** لەدایکبووە.
– خوێندنی ئایینیی تەواو کردووە.
– ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندیی **بە شۆڕشە کردو پاش** هەرەسهێنانی شۆڕش گەڕایەوەو بۆ باشووری **عێراق دوور** خرایەوە.
– ساڵی (١٩٧٥) پەیوەندیی **بە** یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردو ساڵی (١٩٨١) بوو بە پێشمەرگە لە هەرێمی ٢ی کەرکوك.
– لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، پێشمەرگایەتیی لە تیپی ٢١ی **کەرکوك و تیپی ٩٣ی کۆیە کرد.**
– **لە قۆناغی دوای ئەنفالەکان، بەشدار بوو لە یەکە پارتیزانەکان.**

– ساڵی (١٩٩٠) **بووە بە ڕابەری سیاسی بەتالیۆنی نۆ لە دۆڵەکۆگە.**
– لە ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)دا بەشدار بوو لە ڕزگارکردنی ڕانیەو چوارقورنەو کۆیەو هەولێرو پردێو کەرکوك و دواتر بووە لێپرسراوی بەرەی کوردستانی لە ئۆردوگای بنەسڵاوە لە هەولێر.
– لە نیسانی ساڵی (١٩٩١)ەوە تا حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٣) لێپرسراوی کۆمیتەی یەکێتی بوو لە بنەسڵاوە.
– ساڵی (١٩٩٣) بووە ئەندامی فەرماندەیی ناوچەی کەرکوك لە وەزارەتی پێشمەرگە.
– لە ماوەی (١٩٩٤– ٢٠٠٤) ئەندامی خولی یەکەمی ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستان بوو.
– لە ماوەی (١٩٩٦– ٢٠٠٤) سکرتێری کۆمەڵەی ڕووناکبیریی و کۆمەڵایەتیی کەرکوك بوو. لە ماوەی (٢٠٠١– ٢٠١١) جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی ٢ی ڕێکخستنی کەرکوك بوو.
– لە خولی یەکەمی ئەنجوومەنی ناوەندا بە ئەندامی ئەنجوومەن دانراو **لە** کۆنگرەی سێیەمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان **لە ساڵی** (٢٠١٠)، **بە ئەندامی ئەنجوومەن هەڵبژێردرا.**
– **وتارو نووسینی لە ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا هەیەو ماوەیەکیش سەرنووسەری گۆڤاری کەرکوك بوو.**

*** (ئەتێلا - دکتۆر ئەتێلا):-**

– **ناوی** دکتۆر (ئەتێلا سەعدوڵڵا خەلیل ئیبراهیم وەنداوی) **یە.**
– **لە** (١)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٦) لە گەڕەکی نەورۆزی شاری کفری لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٦٣) بۆ خوێندنی سەرەتایی چووەتە خورماتوو لەوێ خوێندنی تەواو کردووەو پاشان دەگەڕێتەوە کفری بۆ خوێندنی قۆناغی ناوەندیی، درێژە بە خوێندن دەدات لە بەغدا.
– ساڵی (١٩٧٣) برایەکی بە ناوی (تەیمور) شەهید دەکرێت
– پەیمانگای تەندروستی ئاژەڵ تەواو دەکات، پاشان **لە** هەمان ساڵدا وەکو فەرمانبەر دادەمەزرێت **دواتر** دەگوازرێتەوە بۆ (سەر قەڵا).
– ساڵی (١٩٨٠)ەوە پەیوەندی دەکات بە ریزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و لەو ساڵە دەگەڕێتەوە بۆ (کفری) و لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستگیر دەکرێت و ڕەوانەی بەغدا دەکرێت بۆ ماوەی شەش مانگ بەند دەکرێت و دواتر حوکمی ئیعدامی بۆ دەردەچێت، بەڵام ئازاد دەکرێت و دەگەڕێتەوە بۆ گوندی (بنەکەو) دەست دەکات بە کاری پزیشکی بۆ خەڵکی گوندەکە.
– لە (**٥**)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩١) لەگەڵ **سێ هەڤاڵی** تردا لەلایەن فرۆکەکانی ڕژێمی بەعسەوە بۆردومان **دەکرێت و** هەرچواریان شەهید **دەبن.**

* (ئەحمەد برایمی حەمرە):-

- یەکێکە لە شاعیر و مەقامزانەکانی ناوچەی گەرمیان لە گوندی بانشاخ لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٨)ەوە شیعری نووسیوە و تاکو ئێستاکە بەردەوامە لە شیعر نووسین.
- دیوانێکی شیعری هەیە.

* ئەحمەد حەسەن محەممەد عەزیز جاف:-

- ساڵی ١٩٦٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٥ کۆلیژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە بە ناونیشانی (قوات خاصە).
- ساڵی ٢٠٠٥ خانەنشین کراوە.

* (ئەحمەد ئەسوەد ئەحمەد):-
- ساڵی (١٩٣٥) لە کۆیە لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٧) هاتووەتە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٠) یەکەمین پەیکەری (کەو)ی لە دار دروست کردووە.
- ساڵی (١٩٨٦) لە مۆزەخانەی قەڵای هەولێر بەهاوبەشی لەگەڵ (ئەرمین)ی کچی پێشانگای کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٩) پێشانگای تایبەتی پەیکەری دارینی لە هۆڵی میدیا لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٠) پێشانگای تایبەتی پەیکەری دارینی لە هۆڵی میدیا لە هەولێر کردووەتەوە کەبریتی بووە لە ٥٧ پەیکەر.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان لقی کەرکوك.
- لە ساڵی (٢٠٠٨) پێشانگای تایبەتی خۆی لە کەرکوك کردووەتەوە.
- لە ٢٤ی ئاداری ساڵی ٢٠١٥ کۆچی دوایی کردووە.

* (ئەحمەد ئەفەندی قوتب - مەلا ئەحمەد ئەفەندی قوتب):-

- ناوی تەواوی (ئەحمەد حەمدی قوتب)ە.
- ساڵی (١٨٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە زاناو مەلا بەناوبانگەکان، ماوەیەك قازی بووە لە موسڵ، باوکی (بەهائەددین قوتب)و (دکتۆر رەفعەت قوتب)و (عەبدولخالق قوتب).
- چوار زمانی زانییوە بۆ قسە کردن و نووسین.
- ساڵی (١٩٤٣) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئەحمەد ئاغا):-

- ناوی (ئەحمەد ئاغا کوڕی مەردان)ە.
- ساڵی (١٨٩٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لەوانەی چایەخانەیەکی بەناوی چایەخانەی ئەحمەد ئاغاوە دامەزراندوە لە گەرەکی (ئەحمەد ئاغا).
- لەدوایدا چایەخانەکەی گواستۆتەوە بۆ شەقامی ئەوقاف دوای ئەوەی خاوەنەکەی شوێنی (سینما الوطن)ی بەکرێ گرتووە کە تاکە شوێنی بووەو لە کەرکوك فیلمی سینەمای لێ پیشان دراوە، بۆیە بەرۆژ چایەخانەبووە بەشەو فیلمی لێ نمایش کراوە، هەر لەو ماوەیەدا لە چایەخانەکە تیپی (فاطمة رشدي) هاتووەتە چایەخانەکە بۆ پێش کردنی کاری هونەری کە هونەرمەندێکی میسری بووە لە جاری دووەم چایەخانەکە گواسترایەوە بۆ نیۆ دارستانی زەیتونەکانی تەنیشت سینەما (صلاح الدین)، بەڵام لە سیبەکان خاوەن چایەخانەکە هەستا بە دروستکردنی شوێنێکی تازە بۆ چایەخانەکەو بۆ یەکەم جار یاری (بلیارد)ی هێنایە نێو چایەخانەکە.
- ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.

* ئەحمەد هاشم:-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی.
- نوارس هائمة، کورتە چیرۆك.
- الموت ونصف مجنون، کورتە رۆمان.
- لا أدري، دیوانە شیعر.
- إعترافات الأماكن، رۆمان

* ئەحمەد ئاغا (سەید ئەحمەد ئاغا):-
- دەڵێن گوایە شاعیر بووە و شیعری هەبووە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە، کە گوایە باپیری رەهبەری شاعیرە لە دایکەوە، کە بە سەید ئەحمەد ئاغا بەناوبانگ بووە، ماوەیەکی کەم رەهبەری شاعیر لە مالیان بووە، بەڵام نەیتوانیوە بەردەوام بێت لەگەڵیاندا.

* (ئەحمەد ئاغای کەرکوکی زادە):-

- لە بازرگانە ناسراوەکانی شاری بەغدا بووە بەرەسەن دەگەرێنەوە سەر خێزانێکی بە ناوبانگی کورد، لە ساڵی (١٨٨١) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٣٧)ەوە بە ئەندامی لیوای کەرکوك هەڵدە بژێردرێ بۆ پەرلەمانی عێراق و بۆ جارێکی دی لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵ دووبارە هەڵدەبژێردرێتەوەو شوێن و پایەیەکی بەرزی لە ناو کۆڕو ئەنجوومەنی بازرگان و کۆمەڵایەتییەکاندا هەبووە.
- لە (٢٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧١) لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە.
- خۆی لە بنەرەتدا خەڵکی سلێمانییەو باپیرە گەورەیان یونس ئاغایە، بەڵام دایکی منداڵی نەبووەو هاتووەتە (بابە گورگور) بۆ منداڵ، بۆیە دوای ماوەیەك منداڵێکیان بووە کە ناویان ناوە (محەمەد)و بە (حەمە کەرکوکی) ناوبانگی دەرکردووە.

* (ئەحمەد سەید ئیسماعیل جەباری - سەید ئەحمەد):-

- ساڵی (١٧٧١) لە دێی بانگۆل لەدایکبووەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.
- ناوی سەید ئەحمەد کوڕی سەید ئیسماعیل کوڕی سەید جانی جەبارییە.

- کوڕی (سەید ئیسماعیل)ەوە مامی شاعیری بە ناوبانگ (مەلا سەید فەتاحە)و خەڵکی جەبارییە، لە سەرەتاى سەدەی سیانزەهەمی کۆچیدا ژیاوە، لە گوندی (بانگۆل) کۆچی دوایکردووە.
- سەپد ئەحمەد نەخوێندەوار بوو کەچی سەلیقەی شیعری زۆر دل تەڕانە بووە.

* (ئەحمەدی بەرزاوی- مەلا ئەحمەدی بەرزاوی):-

- ئەم مەقام زانە خەڵکی بە (بەرزاوی) ناویان دەبرد کە لە گەڕەکی (ئاخوڕ حوسێنی) لە چایخانەی (سەیگوڵ) دادەنیشت ومەقامی (بەرزاوی) دەخوێند، بۆیە هەربەوە ناوبانگی دەرکرد، جا ئەم بەرزاویە بە شەوان کتێبی (یوسف و زولێخا)ی بەکوردی و تورکی و جار بەجاریش مەقامی بە عەرەبی و تورکی خوێندووە، بەڵام لەوانەیە ناوەکە لە مەقامی (بوهرزاوی)یەوە هاتبێتوو گۆڕانی بەسەردا هاتبێت.
- قۆڕیاتیشی وتووە، بە کوردیش مەقامی نیوەشەوی بۆ دانیشتوانی ئەو چایەخانەیە خوێندووە.

* ئەحمەد بەهجەت ئیبراهیم:-

- ساڵی ١٩٣٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەچاپکراوەکانی:-
- تاريخ التركمان قبل ٤٠٠٠ سنة، ٢٠٠٤
- التركمان في وادي الرافدين، ٢٠٠٤
- مشاركة التركمان في الانتخابات، ٢٠٠٥
- طريق السيادة، ٢٠٠٩.
- الإستراتيجية التركمانية، ٢٠١٠
- الدفاع القومي التركماني، ٢٠١٢
- الجغرافية القومية التركمانية، ٢٠١٤

* (ئەحمەد تاڵەبانی):-

- (شێخ ئەحمەد کوری شێخ مەلا مەحموودی تاڵەبانیی)ە.
- لە دێی تاڵەبان لە قەزای چەمچەماڵ لە ساڵی (١٧٣٦) لەدایکبووە.
- خوێندنی زانستی قورئان (فقە)و تەسەوف لەسەر رێگای قادری لەلای باوکی خوێندووە.
- لە دوای ماوەیەك هاتووەتە کەرکوك و لەوێدا نیشتەجێ بووەو هەر لەوێ مزگەوتێکی بنیات ناوە.
- لە دوای خۆی ئەم کوڕانەی بە جێ ماوە: عەبدولرەحمانی خاڵس، عەبدولغەفور، عەبدولفەتاح، عەبدولکەریم، محێدین، عەبدولعەزیز، محەمەد سالح، حوسێن، محەمەد عارف، عەبدولقادر.
- ساڵی (١٨٤١) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئەحمەد بەگ جەمیل بەگی بابان):-

- (ئەحمەد کوری جەمیل بەگی بابان کوری مەجید پاشا)یە.
- ساڵی (١٩٨١) لە (کنگربان) لەدایکبووە.
- ئەم زاتە هەر بە منداڵی تووشی نەخۆشی ئاوڵە دەبێت و لە نیعمەتی چاو بێبەش بوو، چووە بەغدا لەوێ لە خانووەکەی خۆیان لە (عیوازییە) دانیشت.
- ساڵی (١٩٤٢) گەڕاوەتەوە کفری و لە (کنگربان) دانیشت.
- هەر لە سەرەتاوە چووە ڕیزی حیزبی هیواوە و لە کفریش خەڵکی هان ئەدا کە بچنە ڕیزی کۆمەڵەوە.
- ئەحمەد بەگ یەکەم کەس بووە کە جەژنی نەورۆزی لە کفری ئاشکرا پێکرد لە ساڵی (١٩٤٥)وە تا نیوەی پەنجاکان هەمووساڵێك شەوی نەورۆز ئەینارد و لە سەر لووتکەی چیای (باوە شاسوار)و شاخەکانی تر ئاگری نەورۆز دەکرایەوە.
- لە (٢٢)ی ئابی ساڵی (١٩٧٥) لە بەغدا کۆچی دوایی کردو تەرمەکەی برایەوە کفری لە تەنیشت باوکییەوە لە (باخی پاشایان) بەخاك سپێردرا.

* ئەحمەد بەکر شەریف شوانی:-

- ساڵی ١٩٥٣ لە گەڕەکی ئیسکانی کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٨ کۆلێژی سەربازی بەغدای لە خولی ٥٧ تەواو کردووە بە ناونیشانی (الإداري).
- دوا کاری لە سوپادا (ضابط قسم الميزانية في مديرية المشاة)
- ساڵی ٢٠٠٧ خانەنشین کراوە.

* (ئەحمەد باوەڕ- مەلا ئەحمەد باوەڕ):-

- ناوی ئەحمەد حەمە ئەمین شەریفە.
- ساڵی ١٩٥٨ لە کەلاری کۆن لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٦٤ لە گوندەکەی خۆیان خراوەتە بەر خوێندن، تا پۆلی سێی پیشەسازی خوێندووە.
- ساڵی ١٩٧٩ پەیوەندی دەکات بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە، دوا پلەی فەرماندەی تیپی ٥٥ی قەرەداغ بووە.
- لەکاتی شاڵاوی ئەنفالدا لە ساڵی ١٩٨٨ یەکەم دەستەی پارتیزانی بووە لە گەرمیان مایەوە.
- لە ٢٩ی شوباتی ساڵی ١٩٨٩ لەناو حەشارگەی ئەشکەوتی داری خلە شەهید دەبێت کاتێك ئەشکەوتەکە دادەرووخێت.
- بەرهەمێکی بڵاوکردووەتەوە بەنازناوی ئەحمەد باوەڕ، بەڵام لەناوچووە.

* (ئەحمەد باوەڕ):-

- بەرهەمەکانی:-
- (کۆمەڵە ڕێکخراوە کوردییەکان لە ساڵانی ئینتدابی بەریتانیدا ١٩٢٠-١٩٣٢)، سلێمانی، ١٩٩٨.
- (ئۆزدەمیرو کورد)، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- (جولەکەکانی کوردستان)، سلێمانی ٢٠٠٠.
- (کۆمەڵەی یانەی سەرکەوتن)، کەلار ٢٠٠٤.
- (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی هاوچەرخی کورد)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (دیاری کوردستان لاپەڕەیەکی پرشنگدار لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- شاعیری جوانەمەرگ فەریق ئەمین و دەنگی ڕەسەنی شیعر.
- شاعیری شەهید محەمەد پەژار، ٢٠٠٣
- ئۆزدەمیر و کورد، ٢٠١٨

*** ( ئەحمەد بەرزنجی - شێخ ئەحمەد بەرزنجی ):-**

- سالّی ١٩٣٢ لە شۆڕیجەی ناوچەی قەرەحەسەن لەدایکبووە.
- سالّی ١٩٥٠ پەیوەندی دەکات بە ئیخوان موسلیمینەوە و یەکێك دەبێت لە دامەزرێنەری ئەو بزووتنەوەیە.
- سالّی ١٩٥٤ دواناوەندی لە کەرکوك تەواو دەکات و دواتر کۆلێژی پەروەردە بەشی بیرکاری لە زانکۆی بەغدا تەواو دەکات.
- سالّی ١٩٥٩ دوای کودەتاکەی عەبدولوەهاب شەواف وەکو پەنابەر دەچێتە سووریا، دواتر بۆ وڵاتی میسر.
- سالّی ١٩٦٠ لە سوریا ئێزگەیەك دادەمەزرێنن پەخشی بەرنامەکانی رووە و عێراق دەبێت و بە سێ زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی دەبێت، شێخ ئەحمەد هەر خۆی ئامادەکار و پێشکەشکاری بەرنامەکانی دەبێت.
- سالّی ١٩٦٢ گەرایەوە بۆ بەغدا و هەر لەوێ جێنشین دەبێت، نزیکەی ٢٥ سالْ وانەی بیرکاری وتووەتەوە لە ناوەندی غەربییە لە (باب المعظم) لە بەغدا.
- سالّی ١٩٦٨ خێزان پێکەوە دەنێت.
- سالّی ١٩٧٢ لەلایەن دەسەڵاتی عێراقەوە، بۆ ماوەیەك بەند دەکرێت لەبەر جموجوڵی سیاسی.
- سالّی ١٩٨٤ خانەنشین دەکرێت.
- سالّی ٢٠٠٧ ماڵەکەی دێتەوە بۆ کەرکوك.
- زمانەکانی کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی، تورکی، فارسی، فەرەنسی، ئۆردوی زانیوە.
- بەرهەمەکانی:-
- صفات الداعين إلى الله، ١٠ پارچە شیعر بە زمانی عەرەبی، ٢٠٠٩
- الإشرافية، وەرگێران لە زمانی فارسییەوە.
- الجمهورية التركية الأولى، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە.
- امریکا تدعو إلى إشعال النار، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە.
- محاضرة، کۆمەڵێك وتاری جۆراجۆر.
- دانانی کتێبی بیرکاری بۆ قۆناغەکانی ناوەندی بە هاوبەشی.
- لە ٨ی تشرینی دووەمی سالّی ٢٠٠٧ کۆچی دوایی کردووە.

*** ( ئەحمەد جەواد ئەحمەد ):-**

- سالّی (١٩٥١) لەدایکبووە.
- سالّی (١٩٧٧) دەرچووی کۆلیژی ئاداب بەشی زمانی کوردی تەواو کردووە.
- هەر لە (١٩٦٠)وە بایەخی بە هونەرو وێنەکێشان داوەو گەلێك پێشانگای لە قوتابخانەکان کردووەتەوە، بەڵام بەردەوام نەبووە لە سەرکارەکەی.

*** ( ئەحمەد حەکیم - مەلا ئەحمەد حەکیم ):-**

- ناوی (ئەحمەد کوری مەلا حەکیم کوری مەلا ئیسماعیل)ە.
- سالّی (١٨٨٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالّی (١٩١٠) بەهۆی تووشبوونی بە نەخۆشی چاوی بۆ چارەسەی چووەتە ئێران‌و لەوێ خوێندنی ئایینی تەواو کردووەو زانیاری وەرگرتووە لە ئەستێرە ناسی‌و ئەدەبی فارسی‌و زانستی شەریعەت.
- لە کاتی دەمەزراندنی (المدرسة الدينية العلمية) لە کەرکوك دامەزراوە بە مامۆستاو بەرێوەبەر لەو قوتابخانەیە، بەردەوام بووە تاوەکو سالّی (١٩٥١).
- ماوەیەکیش سەرۆکی زانایانی ئایینی کەرکوك‌و سەرۆکی ئەنجوومەنی زانستی کەرکوك بووە، ماوەیەکیش مامۆستا بووە لە قوتابخانەی (الغوثية).
- لە ماوەی نێوان سالّانی (١٩٥٨-١٩٥٩) تووشی گەلێك گرتن‌و ئازاردان بووەو لەلایەن دامودەزگا سەربازییەکانی ئەو کاتەی حکومەت‌و بەو هۆیەوە تووشی گەلێك نەخۆشی درێژخایەن بووە.
- لە ئابی سالّی (١٩٦١) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( ئەحمەد حەمدی قوتب ):-**

- ناوی (ئەحمەد کوری حەمدی ئەفەندی قوتب)ە.
- سالّی (١٨٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- حاکم بووە لە کەرکوك لە ماوەی نێوان دەسەڵاتی عوسمانییەکان‌و دەسەڵاتی پاشایەتی.
- لە (٧)ی کانوونی یەکەمی سالّی (١٩٤٣) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی: (الرسالة الوزيرية)، بەغدا، ١٩٢٨.

*** ( ئەحمەد حەمید گەرمکی پیر خدری ):**

- سالّی (١٩٥٩) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- دەرچووی هەر یەکە لە کۆلیژی یاسا، کۆلیژ سەربازی بووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (سەیدەکانی هۆزی گەرمکی گەرمیان)، سلێمانی، ١٩٩٠.
- (تیشکی قورئان).
- (رسالة مختصرة عن سيرة واحفاد السيد محمد الزاهد الملقب بظهر الدين والمشهور ب(بير خضر شاهو)، بە بەشداری، بەغدا، ٢٠٠٢.
- (شاری خورماتوو، کورتەیەکی جوگرافی، مێژوویی، ئیداری)، ٢٠٠٥.

* ( ئەحمەد حوسێن ڕۆستەم ):

- ساڵی (١٩٤٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ئەکادیمیایی هونەرە جوانەکانی بەشی شێوەکاری لە ساڵی (١٩٧٤) تەواو کردووە.
- ماوەیەکی چاك لە بەشی هونەری شێوەکاریدا جێ پەنجەی دیار بوو.

* ( ئەحمەد خانەقا - سەید ئەحمەد خانەقا ):-

- ناوی (سەید ئەحمەد کوڕی شێخ حوسێنی کوڕی شێخ قادری سوور کوڕی شێخ ئەحمەد سەرداری بەرزنجی کوڕی شێخ یوسف کوڕی شێخ عەلی حاجی کوڕی شێخ یوسف کوڕی شێخ شەمسەددین کوڕی شێخ عەبدولسەمەدی سەرگەڵو کوڕی شێخ بابا ڕەسوڵی گەورە)یە.
- لە ماوەی ژیانیدا چەند نازناوێکی هەبووە، لەوانە (سەید ئەحمەدی عەلە غێری)، (سەید ئەحمەدی حوسێنی)، (سەید ئەحمەدی خانەقا) بەڵام ئەمەی دواییان زیاتر پێی بە ناوبانگ بووە.
- ساڵی (١٨٦٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە سەردەستی (مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی) خوێندنی ئایینی فێربووە، تا (جەمع ئەلجەوامعی) خوێندووە، لەلای (مەلا مستەفای ژێ)ش ماوەیەك خوێندوویەتی.
- زمانی (فارسی، تورکی، عەرەبی، هیندی) بە باشی زانیبوە بە نووسین و قسەکردن، چەندین شێوە زمانی کوردی زانیبوە وەکو (زەنگنەیی، گۆرانی، لوڕی، شوانی، ڕۆژبەیانی، کێشك، کاکەیی).
- دیارترین کەسایەتی کوردی شارەکەیەو لە بنەماڵەی بەرزنجەکانە، بەڵام ئەمان بە پێچەوانەی زۆرینەی بەرزنجییەکان ڕێبازی نەقشبەندییان هەڵبژاردووە.
- لە ماوەی شەڕی جیهانی یەکەم لەگەڵ تورکەکاندا شەڕی کردووە لە (شعێبە)و (ناسریبە) لە ساڵی (١٩١٥)و لەکاتی کێشەی ویلایەتی موسڵ پشتگیری تورکەکانی کردووەو لە ساڵی (١٩٢٣) بۆ بەغدا دوور خراوەتەوە.
- جێی باسە نووسراوێکی دەسخەتی (شێخ حوسامەدینی شێخ قادری عەودالان) بۆ بەرپرسانی تورك لە سلێمانی نووسراوە، ناوی ئەو لایەنگرانەی شێخانی عەودالانی تێدا تۆمارکراوە کە بە سەرۆکایەتیی (شێخ حوسێن)ی برای نێردراون بۆ ئەو شەڕە، هەروەها نامەیەکی دەستخەتی (شێخ عومەری سەید ئەحمەدی شێخ ڕەسوڵی بەرزنجی) باسی چوونی شێخ مەحموود و هەندێ سەرۆکی جاف و هەمەوەندو (سەید ئەحمەدی خانەقا)ی تێدا کراوە کە گەیشتوونەتە شارەکانی (حلەو دیوانییەو سەماوەو ناسرییە)و (سەید عومەر) خۆیشی لەگەڵیاندا بووە، هەردوو بەڵگەنامەکە لەلای مامۆستا (عەبدولڕەقیب یوسف) پارێزراون، شایانی باسە (سەید ئەحمەد بەشداری کردووە لە شەڕی عورووس (ڕووسیا) تا (سابلاغ - مەهاباد) چووە.
- لە (١٨)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٢) لە تەمەنی (٨٤) ساڵیدا لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

* ( ئەحمەد دامرچی ):-

- (ئەحمەدی کوڕی عەباس دامرچی)یە.
- ساڵی (١٩٥٩) لە گەڕەکی گاورباغی لەدایکبووە.
- زیاتر لە ٢٣ بەرهەمی شانۆیی هەیە لەوانە: (الأيام السماقية)، (الثعلب)، (علو جلو)، (البيت المسكون)، (مقهى الكذابين)، (توفان)، (ساحن گوجزە)، (دکتور دایی باقر).

* ( ئەحمەد داوود - ئەحمەد داودە ):-

- ناوی تەواوی (ئەحمەد محەمەد سەلیم)ە، لەناو خەڵکدا بە ئەحمەد داودەی نایژەن ناسراوە.
- ساڵی (١٩٢٦) لە ئاوایی (ئەلبو سەباح)ی سەر بە خورماتوو لەدایکبووە.
- هەر لە تەمەنی منداڵیدا شەیدای ئامێری (باڵەبان) بووە ئینجا شارەزای لە شمشاڵ وزوڕنا و دهۆڵ وتەپڵیشدا پەیدا کردووە.
- ساڵی (١٩٥٣) بۆ ماوەی دووسەعات نەی ژەنیووە لەگەڵ گۆرانی بێژ حەسەن زیرەك لە ماڵی سابیر چایەچی لەسەر قەڵا.
- ساڵی (١٩٥٧) کاتێك سەلاح داودە چەند گۆرانییەکی لە ئێستگەی کوردی لە بەغدا تۆمار کردووە ئەم نەی بۆ ژەنیووە.
- ساڵی (١٩٥٨) ماڵی هاتووەتە کەرکوك ولە گەڕەکی شۆریجە نیشتەجێ بوونە.
لە گوندو ناوچەکاندا، لە ناو خزم و ئەندامانی هۆزەکەی خۆی (داووده)دا گەلێ مۆسیقا ژەنی میللی بەهرەدارو بلیمەتی، بەرچاوکەوتووە، ئەوانە چرۆی حەزی مۆسیقایان لە دڵدا ئاو داوەو بۆیە هەوڵی داوە ئامێری (نەی واتە باڵە بان)ی پەیدا کردووەو هەر لە مۆسیقا ژەنانی ناو هۆزو دەوروبەرو خزمەوە فێری ژەنینی ئەم ئامێرەو ئامێری دیکەی وەك (دەمبەرەك و زوڕناو.. ئی دیکەش) بووە.
- زۆر جار لەگەڵ سەرۆکی هۆزەکەیاندا (دارا بەگ) بۆ بەغدا چووەو لەوێ چاوی بە گۆرانی بێژی ناوداری وەك

عەلی مەردانو حەسەن زیرەك وگەلێکی دیکەش کەوتووەو ئەوانەیش هانیان داوە کە لەوکارەی دا بەردەوام بێت.
- ناوبراو مەقامەکانی ناوچەی گەرمیانو زۆربەی مەقامەکانی رۆژهەڵاتیش بەم ئامێرە ساکارە واتە بە (باڵە بان) لێداوە ئەمە جگە لە بەستەکان لە شاییەکاندا توانیویەتی بەردەوام مۆسیقا چ بە باڵەبان یان زورنا بژەنێ، لەگەڵ زۆر گۆرانی بێژی کورد بە ئامێری باڵەبان بەشداری کردبوو وەك:- حوسێن عەلی، شوکور خەیات، حەسەن سیساوەیی، فایق وسەلاح داوودە، هەروەها لەگەڵ گۆرانی بێژ (عەلی مەردان) لە بەغدا لە ماڵی خۆیاندا بەشداری کردووەو لەگەڵ گۆرانی بێژان (تایەر تۆفیق وحەسەن زیرەك)یش بەشداری بووە.
- ئەحمەد داوودە ئاهەنگی لە زۆربەی شارەکانی وولات، بۆ نموونە لە بەغدا وسلێمانیو هەولێرو چەمچەماڵ وقەرە حەسەن، هەروەها کەرکوكو گوندەکانی دەوروبەری گێراوە، بەرێکەوت زانیم ئەو بلیمەتە بۆ دەرەوەی وڵاتیش داوەت کراوە، چونکە کاسێتێکی (حەسەن سیساوەیی) هەیە لەسەری نووسراوە (حەبیب ئاغاو مامەند ئاغای زراری) ئاهەنگی بەیروت، گوتنی سیساوەیی ومۆسیقای ئەحمەد داوودە.. ناوبراو جگە لە مۆسیقاژەنی خۆیشی فیقنەکانی بۆ ئامێری باڵە بان دروست کردووە.
- ساڵی (١٩٧٩) لە نەخۆشخانەی گشتی کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

*** (ئەحمەد مەلا رەسوڵ-فائز):-**

- ناوی (مەلا ئەحمەد کوری مەلا رەسوڵ)ەو لە ناوچەی قادر کەرەم لە کەرکوك لەدایکبووەو نازناوی شیعری (فائیز) بووە.

*** (ئەحمەد سپی سەری زەنگنە - مەلا ئەحمەد سپی سەری زەنگنە):-**

- شاعیر لە ساڵی (١٨٨٤) لەدایکبووە.
- ناوی (مەلا ئەحمەد کوری سەمین کوری فەتاح)ە لە بەرەی (سپی سەرە)ی زەنگنەیە کە پشتا وپشت ئەچنەوە سەر (میر سمایل)، لای مەلا باشەکانی کفری وخانەقی وسلێمانی خوێندویەتی، کە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت گەرایەوە ناو خزمانی خۆیو لە ناو دێهاتەکانی هەردەی زەنگنەو لە (کوردەمیر)ی ناو جافو لە (سۆفیوەند)ی حەمەی نامق دانیشتووە.
- لە هەر شوێنێکدا بووە، لە رێی خوا مەلایەتی کردووەو لە پاڵ ئەوەشدا دەرسی بە قوتابی وتووەو لە شەوەزەنگی نەزانینی دەری هێناون هەروەها وەکو جوتیارێك کشتوکاڵی خۆی کردووە.
- شیعرەکانی مەلا ئەحمەد لەسەر رێبازی کلاسیکی ئەرواو بابەتەکانیشی ئایینی ولایەنی شەریعەتی گرتووەو لەگەڵ تەریقەتدا بەرامبەر وەستاوەو لە کاروباری ناهەمواری هەندێ لە شێخەکان دواوە.
- ساڵی (١٩٥٨) کۆچی دوایی کردووە.

*** (ئەحمەد بەگی زەنگەنە):-**

- ناوی (ئەحمەد کوری میر سمایلی زەنگنە)یە.
- ساڵی (١٦٨٠)ی زایینیی لە ئاوایی قەیتول لە نزیك (قادر کەرەم) لەدایکبووە.
- زمانەکانی فارسیو عەرەبی بە باشی زانیووە.
- هەر چەندە یەکێك بووە لە سەرۆکەکانی ئیمارەتی زەنگەنە بەڵام توانایەکی ئەدەبیو شاعیرێکی بە توانا بووە.
- ساڵی (١٧٥٠) کۆچی دوایی کردووە.

*** ئەحمەد سەبری:-**

- ناوی ئەحمەدە، لە شیعردا نازناوی (سەبری)یە، بەم نازناوە هەندێك جار رووبەرووی شاعیری دیکەی کەرکوکی دەبینەوە، ئێمە لەبارەی ئەمانەوە لەم کارەماندا بەشێوەی جیاجیا لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین و بەپێی بەڵگەی شیعرەکانیان جیایان دەکەینەوە (واتا لێکۆڵینەوەمان لەسەر ئەوەیە، بەپێی بەڵگەی شیعرەکان، ئەو شاعیرانەی نازناویان سەبرییە لە یەکدی جیا دەکەینەوە - وەرگێر).
- باپیرە گەورەی ئەحمەد سەبری لە سەردەمی سوڵتان مورادی چوارەمدا لەگەڵ خانەوادەکەی هاتوون بۆ کەرکوك، و لە گەرەکی حەمامی قەڵای کەرکوك نیشتەجێبوون.
- ساڵی ١٢٨٦ی هیجری حەسەن ئەفەندیی کوری ئەحمەد ئەفەندیی باوکی شاعیرمان مردووە کە لە شاری کەرکوك موتەسەلیم (وەکیلی موتەسەریف)بووە، لەبەر ئەوەیە کە شاعیرمان سەبری و ئەندامانی خانەوادەکەی بە حەسەن ئەفەندی زادە ناوبانگیان دەرکردوە و ئێستایشی لە گەڵدا بێت بەشێکیان لەقەبی حەسەنی بەکاردەهێنن.
- لەبارەی رۆژی لە دایکبوون و قۆناغەکانی خوێندنی سەبری شاعیر هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە.
- ساڵی ١٢٧٥ی هیجری وەکو شاعیرێکی پێگەیشتوو بەدەردەکەوێت، چونکە لەم مێژووەدا شیعرێکی مولەمەعی(تێکەڵە)ی بە زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی بە بۆنەی کۆچی دوایی موتەسەوفی بە ناوبانگ شێخ عەبدولرەحانی تاڵەبانییەوە هۆنیوەتەوە.
- ساڵی ١٢٨٨ی هیجری موتەسەریفی کەرکوك محەمەد سابیت پاشا بە بۆنەی دروستکردنی کارێزێك سەبری شیعرێکی هۆنیوەتەوە و ئیتر لەو سەروبەندەدا لەناو شاعیرانی کەرکوکدا بەدەردەکەوێت، لە لایەکی دیکەوە وەکو نووسەرێکی بە هەیبەت بەهۆی هەندێك نووسراوی ئەدەبییەوە دەیناسین.
- لەو کاتەدا لەگەڵ شاعیرانی هەرە پێشەوەی کەرکوك وەك فایز و سافی لە زۆر موناسەبەتدا سەروبەند و موساحەبەی ئەدەبی هەبوو. هەروەك لەو شیعرەی فایز بەدەردەکەوێت کە تیایدا ستایشی عەلی ئەفەندی برای دەکات (بەم شێوەیە نووسراوە، دیارە مەبەستی برایەکی سەبرییە بەناوی عەلی ئەفەندی، نە شێخ عەلی برای شێخ عەبدولقادری تاڵەبانی کە

نازناوی (فایز بووە – وەرگێر).
– سەردەمێك بە سیفەتی ئەندام لە شوورای بەڕێوەبەرایەتیی سەرۆکایەتیی شارەوانی (مەجلیسی ئیدارەی ریناسەتی بەلەدیيە) کاری کردووە.
– ساڵی ١٢٩٨ی هیجری ١٨٨١ز شاعیرمان مردووە و لە قەڵای کەرکوك لە مەزاری پێغەمبەر دانیال بە خاك سپێردراوە، رێککەوتی مردنەکەی هاوسێ و هاوەمەسلەکی ساقی شاعیر بە پارچەیەك شیعر هۆنیویەتییە و لە کێلی گۆڕی شاعیردا هەلکۆڵدراوە ئەمەیش شیعرەکەیە:–

صبری احمد افندی کیم او ادیب
مونشی و شاعریدی بی همتا
یکدیگرله انیس و مونیس ایدك
قلدی گرچی او عزم ملك بقا
یاکتی نار فراق جان و دلی
اتش اوزره قالان کباب اسا
اغلایوپ سافیا دیدم تاریخ
جنت ایتسون مقامنی مەولا
واتاکەی:–
سەبری ئەحمەد ئەفەندی کێیە ئەو ئەدیبە
موێنیس و شاعیرێکی بێ هاوتا بوو
لەگەڵ یەك ئەنیس و موئنیس بووین
گەرچی ئەو عەزمی موڵکی بەقای کرد
ئاگری فیراق گیان و دڵی سووتاند
لەسەر ئاگر مانەوە (یان مامەوە) هەروەکو کەباب
بە گریانەوە ئەی ساقی مێژووەکەم وت
مەولا(خوا) مەقامەکەی بکاتە بەهەشت
– لە پاش خۆی خەیروڵڵا ئەفەندی کوڕی لە کەرکوك ناوێکی زۆر مەشهوور و ناسراو بوو، ئەمیش دوو کوڕی هەبوو کە زۆر خۆشەویست بوون لای خەڵك بە ناوی، موقەدەمی خانەنشین: عەتا و عەقید ئیحسان کە لە تەمووزی 1959ز لە قەتلوعامی کەرکوکدا کوژران.

* (ئەحمەد زیائەددین کەرکوکی):–

– لە کەرکوك لەدایکبووە.
– پارێزەر بووەو گەلێك کتێبی چاپکراوی هەیە، وەکو:
– (مجموعة مباحث لغوية)، بە زمانی تورکی، ئەستەمبوڵ، ١٩٠١.
– (اصول المحاكمة، حقوقية، قانونية، شرحية)، بەرگی یەکەم، بە زمانی تورکی، ئەستەمبوڵ، ١٩٠٨.
– (اصول المحاكمة، حقوقية، قانونية، شرحية)، بەرگی دووەم، بە زمانی تورکی، ئەستەمبوڵ، ١٩٠٨.
– (يكي ومكمل اصول محاكمة، حقوقية قانوني شرحي)، بە زمانی تورکی، ئەستەمبوڵ، ١٩٠٨.
– (مفصل عملي ونظري قانون جزا وتفرعاتي شرحي)، بە زمانی تورکی، ئەستەمبوڵ، ١٩١٢.
– (يكي قوانين عدلية شرحي)، بە زمانی تورکی، ئەستەمبوڵ، ١٩١٨.
– (رهبر)، بە زمانی تورکی، ئەزمیر، ١٩١٩.
– (امايس انقلاب عدليسي)، بە زمانی تورکی، ئەزمیر، ١٩٢٤.
– (يكي حقوق تجارت، تجارت قانوني شرحي)، بە زمانی تورکی، ئەستەمبوڵ، ١٩٢٨.
– (خاطرات سياحت)، بە زمانی تورکی.
– (حريت شخصية قانوني شرحي).

* ئەحمەد رۆستەم:–

– ناوی (ئەحمەد رۆستەم محەمەد)ە.
– ساڵی ١٨٨٢ لە گوندی گامەخەڵی گەرمیان لەدایکبووە.
– کەسایەتی ناودار و سەرۆکی تیرەی رۆغزایی هۆزی جافە.
– ساڵی ١٩٨٥ کۆچی دوایی کردووە

* (ئەحمەد سەردار):–

– (ئەحمەد کوڕی سەید عەبدولسەمەد کوڕی سەید بابا رەسوڵی گەورە)یە.
– لە ساڵی (١٧٨٥) لە گوندی سەرگەڵو لەدایکبووە.

* (ئەحمەد سەعاتچی – حاجی ئەحمەد سەعاتچی):–

– یەکێکە لە حەیرانزان ولاوك زانەکانی شاری کەرکوك.
– شارەزایی هەیە لە دووجۆر حەیران، حەیرانی (سەر چپایی) و (مەجلیسی).
– شارەزایی هەیە لە لاوکەکانی:–
حەلیمی، هاوار وەلال، سالحۆ، سێوێ، دیاربەکر، غەزال، بەفریاری، عەیشانێ عەلی، فلیتمێ.
– زۆربەی ئاهەنگەکانی لە ئاوایی (ئۆمەربەگ) و (گۆگجە) و (شوان) و (رێدار) ووتووە لەگەڵ گۆرانی بێژ (نەجات خەیات).

* (ئەحمەد سەلمان ئەحمەد – ئەحمەد تاڤانە):–

– ساڵی (١٩٤٤) لە گەرەکی (بەگلەر)ی کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵانی (١٩٦٩–١٩٧٠) لە کۆلیژی (الدراسات الإسلامية) دەرچووە.
– ساڵی (١٩٧١) مامۆستا بووە لە چوارقورنە.
– ساڵی (١٩٧٣) فەرمانبەر بووە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی.
– تاکو ئێستاکە گەلێك لێکۆڵینەوەو کتێبی بە چاپ گەیاندووە:
– (چوارین)، ١٩٧٥ بەغدا.
– (جەلالە دینی ڕۆمی و سیمفۆنیای نەی)، جەلالە دینی ڕۆمی، وەرگێران.
– (شێخ رەزای تاڵەبانی)، کە لە شاعیری خۆرهەڵاتی ناوەراست.
– (بەیادی تیتراوسکەوە)، کۆمەڵێك شیعر، ١٩٩٠.

- (تۆفیق فیکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد).
- (شیرین و فەرهاد)، شانۆگەری نازم حیکمەت، وەرگێران.
- (رۆژمێری رۆمی).
- (کوردەکانی ئەستەمبوڵی کۆن)، رۆهان ئەلاکۆم، وەگێران.
- (سولتان سولەیمانی قانوونی بۆ گرتنی بەغدا)، وەرگێران.
- رۆژنامەی (کەرکوك)ی کوردی ساڵی (١٩٣٠).
- (کورد و کوردستان لە یەکەم ئەنسیکلۆپیدیای تورکی لە مێژوودا)، قامووسولئەعلامی شەمسەدین سامی، (٢٠٠٨).
- (ئۆرهان پامۆك، رووخساری بە نهێنی سیناریۆ)، وەرگێرانی لە تورکییەوە.
- (رۆچوون بە ناخی هەڵبەستدا)، ٢٠١٢.
- بەیتی سیامەند و خەجێ، ٢٠١٥.

*** (ئەحمەد سلێمان):-**

- یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی کەرکوك لە سەردەمی عوسمانییەکان و دەسێکی باڵای هەبووە لە شیعرداو باپیری شاعیر (سابیر سەعاتچی)یە.

*** ئەحمەد شەربەت:-**

- (ناوی ئەحمەد ئەمین قادر)ە.
- ساڵی ١٩٠٧ لەدایکبووە.
- سەرەتای ساڵی پەنجاکانی سەدەی رابردوو ماڵی هاتووەتە کفری.
- کۆنترین شەربەت فرۆشی شاری کفری بووە، بۆخۆی شەربەتی لە ماڵەوە دروستکردووە، لەلایەکەوە بە قامیش بەلووعەی بۆ دروستکردبوو دوو جامی زەردکی نەخشداری هەبوو.
- ساڵی ١٩٨٢ لە کفری کۆچی دوایی کردووە.

*** (ئەحمەد مەلا شەریف - مەلا سەید ئەحمەد مەلا شەریف):-**

- ناوی مەلا سەید ئەحمەد کوری مەلا شەریفە
- ساڵی (١٨٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩١٥) کۆچی دوایی کردووە.
- بە زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی شیعری هۆنیوەتەوە.

*** (ئەحمەد شەریف ئەفەندی - مەلا ئەحمەد شەریف ئەفەندی):**

- ناوی (حاجی مەلا ئەحمەدی کوری مەلا شەریفی کوری ئەحمەدی ناسراو بە مەلا ئەحمەدە کوردەی کوری مەلا محەمەدی ناسراو بە مەلا محەمەدی کوردی کوری مەلا قادر)ە.
- ساڵی (١٩١٥) هاتووەتە دنیاوەو لە بنەماڵە کۆنەکانی کوردی گەرەکی زێوییەی ژوورووە.
- ساڵی (١٩٣٤) بە دواوەوە بووە بە وانە خوێن لە مزگەوتی (ئۆغلو جامع).

- ساڵی (١٩٨٤) خانەنشین کراوە.

*** (ئەحمەد شەریف - مەلا ئەحمەد شەریف):-**

- ساڵی (١٨٠٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شاعیرێکی کورد بووەو گەلێك شیعری نووسیوە.
- ساڵی (١٨٧٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** (ئەحمەد شەریف):-**

- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بروانامەی ماستەری لە زانکۆی سلێمانی بە دەستهێناوە.
- لە دوای راپەرینی ساڵی (١٩٩١) گەلێك پلەی فەرمانی حکومی وەرگرتووە.
- بەرهەمەکانی:
- (گفتوگۆیەکی ئەدەبی)، ١٩٧٣.
- (ژین و بەهرەو داهێنانی)، ٢٠٠٢.

*** (ئەحمەد شەریف جەباری):-**

- ساڵی (١٨٥١) لە دێی (پاریاوڵە) لەدایکبووە.
- ناوی (مەلا ئەحمەد مەلا شەریف جەباری)ە.
- ساڵی (١٩١٥) کۆچی دوایی کردووە.
- گەلێك شیعری هەیە بە زمانەکانی (کوردی و فارسی و عەرەبی).

*** (ئەحمەد عەزیز):-**

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (راستی شاری کەرکوك لەنێوان رابردوو و باری ئەمرۆدا)، کەرکوك، ٢٠٠٧.

*** ئەحمەد عارف:-**

- ئەحمەد عارف مەعرووف شۆراوی یەکێکە لە هەرە شاعیرە لە بیر کراوەکانی شاری کەرکوك. بەپێی ئاگاداریمان تەنها شیعرێکی لە رۆژنامەی کوردستانی تاران بلاوکراوەتەوە و گوایا مامۆستای مەقاماتی کوردی، عەلی مەردان پارچە شیعرێکی کردووە بە گۆرانی کە بە داخەوە ئێمە ئەو پارچە شیعرەمان دەست نەکەوت.
- ئەحمەد عارف لە ساڵی (١٩٣٢)زاییینی لە گوندی شۆراوی نزیك شاری کەرکوك لە دایك بووە، لەگەڵ خاتوو بەدیعە سەید حوسێن شۆراوی هاوسەرگیریی کردووەو سێ کوری لێ بەجێماوە بە ناوی ئەرشەد تەمەن (٤٤ساڵ) و ئاری تەمەن (٤٢ ساڵ) و ئومێد تەمەن (٤٠ساڵ).
- شاعیرمان سەرەتا لە شارەوانیی کەرکوك کرێکاری کارەبا بووە، دوایی لە کۆمپانیای نەوت دامەزراوە بە(مساعد براد)، دوایی لەبەر ئەوەی کوردزوان بووە لە کۆمپانیای نەوت

دوورخراوەتەوەو لە کارگەی جگەرەی هەولێر دامەزرێنراوە، بەڵام کەی و چ ساڵێك لەم کارانە دامەزراوە و گواستراوەتەوە تەنانەت خانەوادەکەیشی نازانن، چونکە لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستدا هاوسەرگیریی کردووە و لەناکاو بە هۆی رووداوی هاتوچۆ لەنێوان رێگەی هەولێر قوشتەپەی کۆن ساڵی ١٩٧٥زایینی گیانی لەدەست داوە.

– شاعیرمان بەپێی وتەی خانەوادەکەی نەخوێندەوار بووە، بەڵام چۆن توانیوییەتی پارچە شیعرێك بنووسێت و رەوانەی تارانی پایتەختی ئێرانی بکات و هەروەها دەنگۆی ئەوە هەیە کە شیعری بە فارسیش وتووە و بێجگە لە زمانی زگماکی خۆی کە کوردییە، عەرەبی و فارسی و تورکی و ئینگلیزیشی زانیوە. بەپێی وتەی کورەکەی (ئاری ئەحمەد عارف) دیوانێکی شیعری هەبووە، بەڵام ئەمان کاتێك کە باوکیان کۆچی دوایی کردووە لەبەر ئەوەی زۆر منداڵ بوون، کەوتە دەست هەندێك لە خزمانی باوکی و ئەوانیش ساڵانێکی زۆرە لە هەندەران دەژین و بەم شێوەیە ئەو دیوانە تائێستا گۆڕی ونە.

– ئەم پارچە شیعرەی شاعیرمان ئەحمەد عارف کە وەك سروودێکی نیشتیمانی دێتە پێش چاو، بریتییە لە شەش کۆپلە شیعر بەشێوەی چوارینە، لە سەردەمانێکدا وتراوە کە جۆش و خرۆشێکی نەتەوەیی لە ئارادا بووە و سەردەمی پێشبرکێی شاعیران بووە بۆ هۆنینەوەی سروودی حەماسی، ئەوەی گرووپی رەهەندییەکان بە قۆناغی سادەگۆیی ناودێری دەکەن، بەڵام ئەم جۆرە ستایلە شیعرییە زەروورەت و حەتمییەتی مێژوویی دایدەسەپێنێت بەسەر هەر میللەتێك کە تازە پێی نابێتە ناو قۆناغی هەستی نەتەوایەتییەوە.

لەژێر ئەم سروودە شیعرییەی ئەحمەد عارف لەلایەن ستافی رۆژنامەی کوردستانەوە نووسراوە:–

(ئەم سروودە جوانە هۆنراوەی کاك ((ئەحمەد عارف)) دانیشتووی گوندی ((شۆراو)) لیوای کەرکوکی کوردستانی عێراقە کە بۆی ناردووین، ئێمە بەم جۆرە لە هەستی خاوێن و خوێن خاوێنی ئەوان قەدرزانی، وە لە هاوکارییان سپاس ئەکەین).

دەقی سروودەکە:–

کوردین
کوردین دڵپاکین ئێمە
بێ ترس و باکین ئێمە
خوێن گەرم و گەشین ئێمە
رۆڵەی شۆڕشین ئێمە
کوردین
کوردێکی کوردستانین
کەرکوکی و کرماشانین
دەرسیمی یا بارزانین
زازۆیی یا سۆرانین
کوردین
هەموو لاوی کوردانین
پێشمەرگەی کوردستانین

یەك یەك هەموو ئەزانین
گەریەك بگرین ئەتوانین
کوردین
ئەمجا یەکتر ئەدوێنین
جەرگی دوژمن دەردێنین
تەوقی دیلی ئەشکێنین
زەنگی کوردی ئەزرێنین
کوردین
ئەوکاتەی کە راپەرین
بە تاقەت و هێزو تین
بێ ترس و بیم و لەرزین
بۆ سەرکەوتن هەرئەچین
کوردین
سەرلوتکەی شاخی بەفرین
بە بێگانەی نافرۆشین
لە پێناوی ئەجۆشین
بەراستی تاکو ئەمرین
کوردین

ئەحمەد ئاغا

ئەحمەد تاقانە
ئەحمەد عارف

ئەحمەد شەربەت

ئەحمەدی مەلا

*** (ئەحمەد عارف - ئەحمەد زامدار):**

- ناوی (ئەحمەد عەبدولکەریم عارف)ە.
- لە هاوینی ساڵی (١٩٥٣) لە گوندی حەساری گەورە لەدایك و باوکێکی ڕەنجدەر لەدایکبووە.
- قۆناغی سەرەتایی لە حەساری گەورە تەواو کردووە.
- هەموو تەمەنی لەگەڵ ڕەوتی کوردایەتی و نیشتیمان پەروەریدا بەسەر بردووە.
- نزیکەی (١٢) ساڵی تەمەنی بە پێشمەرگایەتی و وڵاتەکەی بەخشیوە.
- زیاد لە (٣) سێ ساڵی تەمەنی لە زیندانە ڕەش و تاریکەکانی بەعسی خوێن ڕێژدا بۆ نیشتیمانەکەی کردووەتە قوربانی.
- ساڵانی (١٩٧٦ - ١٩٧٨) دبلۆمی ئیدارەی بەدەستهێناوە.
- ساڵانی (١٩٩٩ - ٢٠٠١) دبلۆمی ڕۆژنامەوانی بەدەستهێناوە.
- ساڵانی (٢٠٠٤ - ٢٠٠٥) بەکالۆریۆسی ڕاگەیاندنی بەدەستهێناوە.
- ئێستا خوێندکاری ماستەرە لە زانکۆی (جینان) لە وڵاتی لوبنان.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (کودەتایەك لەپایتەختی دڵێکی شێتا)، شیعر، سلێمانی، ١٩٧٩.
- (مەرگی مەزن)، ١٩٨٣.
- (چەپکێ خەمی کەسك)، ١٩٨٥.
- (هەلوەرینی رووح)، ١٩٩٥.
- (قەقنەس)، کۆمەڵە چیرۆك، سلێمانی، ١٩٩٥.
- (گەرانەوە بۆ حەیفا)، وەرگێران، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (ئێوارەیەکی شەرابی)، کۆمەڵە چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (گەرانەوە بۆ حەیفا)، ڕۆمانی غەسان کەنفانی.
- (دڵی داگیرساوی دانکۆ)، کۆمەڵە چیرۆکی وەرگێردراو.
- (بارین)، کۆ چیرۆك.
- (ئێوارەیەکی شەرابی)، کۆ چیرۆك.
- (هاوار لە سێبەری گۆرانییەکدا)، کۆ چیرۆك.
- (بەسەرهاتەکانی ڕۆبنسن کرۆسۆ)، شیعرو چیرۆکی منداڵان.
- (نیگەرانی و چاوانی تۆ)، شیعر.
- دیوانێکی شیعری لەژێر چاپدایە.
- ماوەی زیاد لە (٣٥) ساڵە هاوڕێی قەڵەم و کاغەزە بێ دابڕان و سەدان و هەزاران ووتاری لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردووەتەوە چ سیاسی و چ ئەدەبی و چ کۆمەڵایەتی.
- لە دەیان ڕێکخراوی خێرخواز کاری کردووەو ئێستاش سەرۆکی سەنتەری (بەگژداچوونەوەی سیاسەتی ڕاگواستن و بەعەرەبکردن)ە.

*** ئەحمەد عەبدوڵڵا قەساب - ئەحمەد خورشید قەساب:-**

- ساڵی ١٩٥٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- Irakta Turkmen Tarihi ٢٠٠٤.

*** ئەحمەد فەتاح عەبدولڕەحمان ئاغا:-**

- ناوی ئەحمەد فەتاح عەبدولڕەحمان ئاغای زەنگنەیە.
- ساڵی ١٩١٧ لە گوندی گۆپتەپەی دەیم لە ناوچەی سەنگاو لەدایکبووە.
- باپیرە گەورەی سەرۆکی زەنگنەکانی بناری سەنگاو بووە.
- ساڵی ١٩٦٨ لە کفری کۆچی دوایی کردووە.

*** (ئەحمەد فەخری):-**

- ساڵی (١٩١٧) لە گوندی (شۆریجە)ی قەرەحەسەن لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٩) کۆچی دوایی کردووە.
- ماوەیەك ئەندامی حیزبی هیوا بووە.
- گەلێك شیعری نیشتمانی و دەستنووسی هەیە.

*** ئەحمەد فایەق (نامۆ):-**

- ساڵی ١٩٦٤ لە گەرەکی ئەڵماس لەدایکبووە.
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٥ پیشانگای تایبەتی (سۆلۆ) لە شاری کەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی ١٩٨٦ بەشداری لە پیشانگایەك لە شاری کەرکوك کردووە.
- ساڵی ١٩٨٨ بەشداری لە پیشانگای نیشتمانی لە بەغدا کردووە.
- ساڵی ١٩٨٨ بەشداری لە پیشانگایەك کردووە بۆ یادکردنەوەی ٣٠٠ سەد ساڵ بەسەر دامەزراندنی شاری سلێمانیدا.
- ساڵی ١٩٩٣ بەشداری پیشانگایەکی کردووە لە شاری کەرکوك.
- ساڵی ١٩٩٣ بەشداری لە پیشانگای وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان لە شاری سلێمانی کردووە.
- ساڵی ١٩٩٦ بەشداری پیشانگایەکی کردووە لە ئەستەنبوڵ.
- ساڵی ١٩٩٧ بەشداری لە پیشانگای سێنتەری شارەوانی دارین بۆ هونەر لە ماڵبۆرن کردووە.
- ساڵی ١٩٩٨ پیشانگای تایبەتی خۆی (سۆلۆ) لە شاری ماڵبۆرن کردووەتەوە.
- ساڵی ٢٠٠١ بەشداری لە پیشانگای ئینستیوتی کوردی بۆ لێکۆڵینەوە لە شاری ماڵبۆرن کردووە.

- ساڵی ٢٠٠٤ بەشداری لە پیشانگای ئینتستیوتی کوردی بۆ لێکۆڵینەوە لە فیستڤاڵی کوردیدا لە شاری مالبۆرن کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٥ بەشداری لە پیشانگای هەفتەی پەنابەران (M.R.C.) کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٨ بەشداری لە پیشانگای A.D.E.C لە مەیدانی فیدراڵی لە مالبۆرن کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٨ بەشداری لە پیشانگایەکدا بەناونیشانی (لە شوێنێکەوە بۆ ئێرە) لە زانکۆی مالبۆرن کردووە.
- ساڵی ٢٠١٠ بەشداری لە پیشانگای لە داربین ئارت شۆ لە مالبۆرن کردووە.
- ساڵی ٢٠١١ بەشداری لە پیشانگای لە داربین ئارت شۆ لە مالبۆرن کردووە.
- ساڵی ٢٠١٣ بەشداری لە پیشانگای خەونبینین لە شاری مالبۆرن کردووە.

*** ( ئەحمەد فەرەج ):-**

- هونەرمەند لە ساڵی (١٩٥٥)ی زایینی لە ئاوایی (میلناسن) ی شێخانی لە ناوچەی گەرمیان لە شارۆچکەی (نەوجوول) کەسەر بە قەزای (خورماتوو)ە لەدایك وباوکێکی هونەر دۆست هاتووەتە دونیا. هەر لە تاقی لاوێتییەوە شەیدای ئاوازو مەقام وگۆرانی بووە، دەنگ وئاوازی خوالێخۆشبووی باوکی ئەو مقام بێژە میللییانە کاریان تێ کردووەو هەر لە وانیشەوە ئاشنایی لە مەقامەکان پەیداکردووە.

*** ( ئەحمەد فائیز بەرزنجی - شێخ ئەحمەد فائیز بەرزنجی ):-**

- یەکێکە لەو ئاوارانەی کە حاکم بووە لەسەردەمی عوسمانییەکانو خاوەنی کتێبی (الشهير كنز اللسن) بووە، لەگەڵ چەند بەرهەمێکی تر وەکو (نزهة الناظرين، السحر الحلال، خلاصة العقيدة في شرح الدرة الفريدة، تحفة الاخوان، خير الأثر، الدر المنظوم في إيضاح ما اشتمل عليه سبعة علوم)، هەروەها بە تورکی و فارسیش بەرهەمی هەیە.

*** ( ئەحمەد فایق سەعید ):-**

- ساڵی (١٩١٦) لە کفری لەدایکبووە.
- کتێبە چاپکراوەکانی:
- (قصة المجرم المتنكر)، بەغدا، ١٩٥٠.
- (مجمل القانون الروماني)، بەغدا، ١٩٥٩.

*** ( ئەحمەد قوشچی ئۆغلو ):**

- ناوی تەواوی (ئەحمەد نوری مەحموود ئەحمەد قوشچی زادە)یە.
- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە بواری شیعری تورکمانیو عەرەبیدا کاری کردووەو لێکۆڵینەوەی هەیە لە بواری راگەیاندنندا.
- لە بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (جيجكلر ارجاكن) بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الجمهورية)، کەرکوك، ١٩٦٨.
- (اودينجيلك قيزى)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الجمهورية)، کەرکوك، ١٩٧١.
- (كرجكجيلك شاعري فلك اوغلو)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (شفيق)، بەغدا، ١٩٨٤.
- (شاعر عمر اغانر جيللي)، بە زمانی تورکی، کەرکوك، ١٩٩٩.
- (دليل الصحافة في كركوك عبر القرن ١٩٠٠-٢٠٠٠ ميلادية)، بە زمانی عەرەبی، کەرکوك، ٢٠٠١.
- (كركوكلى شاعر فاتح شاكر ساعتچي)، بە زمانی تورکی، دیوانی شیعر، ٢٠٠٣.

*** ئەحمەد کرێکار**

- ناوی تەواوی حەمە کەریم عەلی رەزا.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٤١)ی گوندی هەمزەی سەر بە قەزای چەمچەماڵ.
- لە ماوەی نێوان (١٩٤٦- ١٩٤٨) بنەماڵەکەی بەمەبەستی کارکردن، لە حەویجە نیشتەجێ بوو، دواتر حەویجەی بە جێهێشتو لە گوندی هەمزە گیرسایەوە، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٦) بەیەکجاری لە گەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك نیشتەجێ بوو.
- لە کەرکوك خوێندنی سەرەتایی تەواو کردو لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا ژیانی سیاسیی دەستپێکرد.
- ساڵی (١٩٥٨) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد.

- ساڵی (١٩٦٠) لە کاتی خزمەتی سەربازیی لە بەسرە، لێپرسراوەتیی بەڕێوەبردنی ڕێکخستنی پارتیی لە چەند سەربازگەیەك تا ساڵی (١٩٦٢) گرتە ئەستۆ.
- ساڵی (١٩٦٥) پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردو تا پلەی سەرپەلی بڕی، پاش بەیاننامەی (١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠)، وەك کرێکار لە فەرمانگەی کارەبای کەرکوك دامەزرا.
- ساڵی (١٩٧١) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردو لە ساڵی (١٩٧٤)دا بوو بە ئەندامی لیژنە لە ڕێکخستنەکانی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٥)، دوابەدوای نسکۆی شۆڕش، ڕێکخستنەکانی شارو شاخ تێکەڵ کرانەوەو سیروان تاڵەبانی کرایە لێپرسراوی ڕێکخستنی کەرکوك، ئازاد هەورامی کرایە یەکەمی و ئەحمەد کرێکار جێگری دووەمی.
- ساڵی (١٩٧٦) کۆمیتەی ڕێکخستنی کەرکوك کە دواتر ناوەکەی کرایە کۆمیتەی ئاگر، ڕادەستی ئەو و حەمید محەمەد کاکەمەند کرا. بۆ ساڵی دواتر بوو بە لێپرسراوی کۆمیتەکە.
- ساڵی (١٩٧٨) لە یەکەم کۆبوونەوەی فراوانی کادیرە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە نۆکان، سەرەڕای ئەوەی کە هێشتا نەهاتبووە دەرێ بۆ پێشمەرگایەتی و بەشداریی لە کۆبوونەوەکەشدا نەکردبوو، بە ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە هەڵبژێردرا.
- ساڵی (١٩٨٠) دوا بەدوای پەرەسەندنی فشاری دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێمی بەعس لەسەر کۆمیتەی ئاگر، پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد لە هەرێمی دوو. ساڵی دواتر بووە لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵ.
- لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٨)دا بووە لێپرسراوی ئیدارەی مەڵبەندی ٢ لە گوندی بلەکێ و تا کۆتایی ساڵی (١٩٩٠) لەوێ مایەوە. پاش ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١).
- ساڵی (١٩٩٢)دا بووە لێپرسراوی کۆمیتەی یەکی ڕێکخستنی کەرکوك لە چەمچەماڵ و ساڵی (١٩٩٤)دا بووە کارگێڕی مەڵبەندی ٢و تا ساڵی (١٩٩٨) لەوێ مایەوە.
- شوباتی ساڵی (١٩٩٨) بوو بەئەندام لە مەکتەبی کۆمەڵایەتی و پاش دامەزراندنی کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکان لێپرسراوەتیی بەڕێوەبردنی لقی کەرکوکی گرتە ئەستۆ.

* **(ئەحمەدی کەرکوکی - ئیمام ئەحمەدی کەرکوکی - خان ئەحمەد):-**

- ناوی (ئەحمەد کوڕی میرە بەگ کوڕی سەید شا ئیبراهیم کوڕی سەید محەمەد گەورە سواری کوڕی سوڵتان ئیسحاق کوڕی شێخ عیسای بەرزنجی)یە.
- لە چاخی هەشتەمی کۆچی لە کەرکوك لەدایکبووە.
- باوکی ئیمام ئەحمەدو مامەکانی لە کاتی خۆیدا لەبەر هۆی بزووتنەوەو بڵاوکردنەوەی ڕێبازی کاکەیی شاروورباتی بەجێهێشتووەو لە شاری کەرکوکدا نیشتەجێ بوونە.
- ئیمام ئەحمەد بە شێوەیەکی گشتی بەناوبانگە بە (ئیمام ئەحمەد) بەڵام لای زۆربەی کاکەییەکان بە (خان ئەحمەد) ناسراوە.
- لە سەدەی هەشتەمی کۆچی کۆچی دوایی کردووە و لە گەرمکی (موسەڵلا) نێژراوە، کە بە گۆڕستانی کاکەییەکانی کەرکوك بەناوبانگەو گۆڕی گەلێ پیاوی ناوداری کاکەیی تێدایە.

* **(ئەحمەد کەرکوکی):-**

- (ئەحمەد کوڕی سلێمان کەرکوکی)یە.
- ساڵی (١٨٤٩) دەستنووسێکی بە ناوی (سعد الله الكبير) بە جێماوە.

* **(ئەحمەد کەرکوکی):-**

- (ئەحمەد کوڕی ئەلواعیز کوڕی مستەفای کەرکوکی)یە.
- ساڵی (١٨٧٤) دەستنووسی (سعدینی) لێ بە جێماوە.

* **(ئەحمەد سەید کەریم بەرزنجی - سەید ئەحمەد سەید کەریم بەرزنجی):-**

- یەکێکە لە مەقام خۆینە بەناوبانگەکانی کەرکوك.
- پیاوێکی قسە خۆش و ئازا بووە.

* **(ئەحمەد کەمال قادر):-**

- ساڵی (١٩١٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لە ئەفسەرەکانی سوپای عێراق.
- دەرچووی کۆلێژی سەربازی بەغدایە لە ساڵی ١٩٣٦.
- ساڵی ١٩٦٢ خانەنشین کراوە بە پلەی عەمید.
- کتێبێکی هەیە بە ناوی (الحروب الجبلية) ساڵی (١٩٤٣-١٩٥٠).
- دوا پلەی ئامر لیوا بووە لە ساڵی ١٩٥٩
- لەنێوان ٩ی ئابی ساڵی ١٩٦٦ تا ٩ی مایسی ساڵی ١٩٦٧ وەزیری دەوڵەت بووە بۆ کاروباری سەروو.
- ساڵی ١٩٨٦ کۆچی دوایی کردووە.

* **(ئەحمەد کەنووش):-**

- شاعیرێکی کوردەو زانیاریمان دەربارەی نییە.

* **(ئەحمەد کاکە سوور):**

- ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٠-١٩٧١)، پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە بەغدا تەواو کردووە، بەشی شێوەکاری، هەر لەو ساڵەدا بووەتە مامۆستا لە (هەڵەبجە) ئینجا گواستراوەتەوە بۆ کەرکوك.

- مامۆستای (سەرپەرشتیاری هونەری) بووە لە مەڵبەندی (اعمال یدویة) لە کەرکوك.
- یەکەم پێشانگای تایبەتی لە ساڵی (١٩٧١) کردووەتەوە، ئەو کاتە قوتابی بووە لە دوا پۆلی پەیمانگای هونەرەجوانەکان لە بەغدا.
- ساڵی (١٩٧٢) دووەم پێشانگای لە شاری هەڵەبجەی شەهید کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٣) سێیەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە کەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٧) چوارەم پێشانگای لە هۆڵی (التأمیم للفن الحدیث) کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٣) پێنجەم پێشانگای لە کتێبخانەی گشتی شاری (هودیکسڤال-Hudiksvail) لە وڵاتی سوید کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٥) شەشەم پێشانگای لە گەلەری (ناکینی) شاری (هودیکسڤال) لە وڵاتی سوید کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٥) حەوتەم پێشانگای لە هۆڵی ناوەندی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان کردووەتەوە.
- هەشتەم پێشانگای لە ساڵی (٢٠٠٧ لە هۆڵی ڕێکخراوی هونەرمەندانی کوردستان کردووەتەوە.
- پیشانگا هاوبەشەکانی ئەمانەن:
- ساڵی (١٩٧٣) لەگەڵ هونەرمەند (ئازاد شەوقی).
- ساڵی (١٩٧٦) لە هۆڵی (بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر) لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٨٦) پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوك لە هۆڵی (التأمیم للفن الحدیث).
- ساڵی (١٩٩٣) پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوك لە هۆڵی (ئەفراندن-قشلە).
- ساڵی (١٩٩٤) لە هۆڵی چالاکی هونەری کەرکوك.
- ساڵی (١٩٩٦) پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوك لە هۆڵی نەقابەی هونەرمەندان.
- ساڵی (٢٠٠٦) پێشانگای هاوبەشی لە هۆڵی ناوەندی کەرکوکی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان.
- ساڵی (٢٠٠٦) لە (گەلەری کۆیە).
- هونەرمەند ئەحمەد کاکە سوور یەکێکە لەو هونەرمەندانەی کە هەر لە ساڵی (١٩٧١)ەوە کاری کردووە بە ڕەنگی ئاوی و دەورێکی باڵای هەبووە لە سەرەتای حەفتاکان لە بواری شێوەکاری بە ڕەنگی ئاوی و لەوەودوایش لەو بوارەدا جێ پەنجەی دیارەو تاکو ئێستاکە کار دەکات لە بواری شێوەکاری.
- ئێستا لە تەراوگە دەژێت.

*** (ئەحمەد گەراوی):**

- (ئەحمەد کوری ڕەسوڵ گەراوی)یە.
- یەکێکە لە زانا ئاینییەکانی کەرکوك.

*** (ئەحمەدی گەورەی فەرقان - مەلا ئەحمەدی گەورەی فەرقان):-**

- باوکی (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی)یە.
- یەکێکە لە زانا گەورەکانی کوردستان، ماوەیەکی زۆر مودەریس دەبێت لە مزگەوتی سلێمانی لە حکومەتی شێخ مەحموودی نەمر.
- ساڵی (١٩٢٢) لەسەر داوای شێخ مەحموود دەچێتە سلێمانی.
- دوای هەرەسهێنانی حکومەتەکەی شێخ مەحموودی نەمر لە ساڵی (١٩٢٤) دەگەڕێتەوە بۆ گوندی (بادەوا) سەر بە ناوچەی قەرە حەسەن.
- ساڵی (١٩٢٥) دەبێتە مودەریس و وتاربێژ لە مزگەوتی فەرهاد (منارە نەخشینە) لە کەرکوك.
- لێپرسراوانی کەرکوك دەکەونە سەر مەلا ئەحمەد بە فەرمانی پارێزگای (متصرف اللواء) دەڵێن کە تۆ سەر بە شێخ مەحموودی دەبێ کەرکوك بە جێ بهێڵیت بۆیە دەگەڕێتەوە بۆ (بادەوا) وقوتابخانە دەکاتەوە بۆ قوتابییەکانی.
- ساڵی (١٩٢٨) مەلا ئەحمەدی گەورە دەگەڕێتەوە بۆ گوندی فەرقان بۆ سەر زەوی وزاری خۆی.
- کێشەیەکی عەشایەریدا لە شەوی (١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٤) بە گوللە لە ماڵی خۆیدا بریندار دەکرێت وپاش شەش ڕۆژ لە نەخۆشخانەی کۆماری کەرکوك لەبەر سەختی برینەکەی لە (٧)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٤) یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان گیانی لەدەست دەدات.

*** (ئەحمەد مەدەنی):-**

- ناوی (ئەحمەد مەدەنی کوری عەبدوڵڵا قودسی زادە)یە لە ساڵی (١٨٩٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لەلای زانایانی مزگەوت و قوتابخانە حکومییەکان تەواو کردووەو لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا بە فەرمانبەر دامەزراوە بە ناوی (کاتب تحریرات)و (رئیس ملاحظین).
- ساڵی (١٩١١) چاپخانەی (حوادث) دادەمەزرێنێت، کە ئامێرەکانی لە وڵاتی بەلجیکا هێنرابوون.
- یەکێکە لە دامەزرێنەرەکانی بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەری لە کەرکوك، یەکەم ڕۆژنامەی بڵاوکردووە بە ناوی ڕۆژنامەی (حوادث)ی لە (٢٤)ی شوباتی ساڵی (١٩١١) بە زمانی تورکی عوسمانی، تاوەکو داخستنی لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئینگلیزەوە لە ساڵی (١٩١٨).
- ساڵی (١٩١٣) گۆڤاری (معارف)ی بڵاو کردووە.
- ساڵی (١٩١٩) بووەتە مامۆستای مێژوو و جوگرافیا لە قوتابخانەی (العلمیة) لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٢٠) ڕۆژنامەی (تجدد)ی بڵاوکردووە.
- لە بواری شیعر نووسینی و ڕۆماننووسیندا وەکو یەکێکی دیاری سەدەمی خۆی ناسراوەو کاریگەری باوکی بە سەرەوە دیاربووە کە یەکێك بووە لە شاعیرەکان.

- زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە بنەڕەتدا لە هۆزی جەبارییەو بنەچەی کوردە.
- لە (٢٤)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٠) کۆچی دوایی کردووە لە گۆڕستانی (مێلی) لە کەرکوك نێژراوە.

*** ئەحمەدی مەلا:-**

- ساڵی ١٩٥٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨١-١٩٨٢ لە پەیمانگای نەوتی کەرکوك دەرچووە.
- ئێستا لە تاراوگە لە ئیسپانیا نیشتەجێیە، لە سەرەتای هەشتاکانەوە کەرکوکی بەجێهێشتووە.
- خولیای ئەدەب و هونەرو شیعر و شانۆنامەی هەیە.
- ساڵەکانی ١٩٨٤-١٩٨٧ دەستی کردووە بە نووسینی گەلێك شیعر، بەڵام لەو ماوەیەدا دیوانێکی شیعری خۆی سووتاندووە.
- بەرهەمەکانی:-
- زەردك، بەرهەمی شیعری، سوید، ١٩٨٩.

*** (ئەحمەد محەمەد ئەمین):**

- ساڵی (١٩٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- چیرۆکە چاپکراوەکانی:
- (ممرات في دفاتر الطفولة)، ١٩٩٣.
- (طائر الليل)، ١٩٩٦.

*** ئەحمەد محەمەد حاجی سەمین:-**

- ناوی (ئەحمەد محەمەد سەمین حەسەن)ە، ناسراوە بە ئەحمەد حاجی سەمین.
- ساڵی ١٩٢٩ لە شاری کفری لە دایکبووە.
- کۆمەڵێك ئاکاری جوانی هەبووە، یەك لەوانە گورگێك و بەرخێکی هەبوو پێکەوە پەروەردەیانی کردبوو بەناو بازاڕ و کووچە و کۆڵانەکانی شاری کفریدا دەسووڕایەوە.
- ساڵی ١٩٥٨ لە کفری چاپەخانەیەکی کردبووەوە بەناوی چاپخانەی کوردستان
- لە کاتی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول لە ساڵی ١٩٦١ لەلایەن دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێمی ئەو سەردەمە گیراوە و ڕەوانەی دادگای عورفی کەرکوکی دەکەن پاشان بە بەندی دووری دەخەنەوە بۆ گرتووخانەی بەسرە و کووت.
- ساڵی ١٩٦٤ هێزێکی زەعیم سدیق سەعات ١٢ شەو لە ماڵەکەی خۆی دەچنە سەری و خۆی نادات بەدەستەوە و دەبێت بە پێشمەرگە.
- لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٥ لە شەڕێکی نابەرامبەردا لە چەمی پەڵکی ناوچەی زەنگنە شەهید دەکرێت.

*** ئەحمەد محەمەد حەمە ئەمین:-**

- ناسراوە بە مەلا ئەحمەد کەلاری.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٨)ی کەلاری کۆن.
- دەرچووی ساڵی (١٩٧٧)ی ئامادەیی سلێمانی.
- ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٧٩) دوای ئاشکرابوونی لەلای دەزگا ئەمنییەکان، خۆی دەرباز کردو پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە ناوچەی سەرکردایەتی گیرسایەوە. لەبارەگای ناوەندی کۆمەڵە ماوەیەك بووە پێشمەرگەو پاشان بۆ کەرتی ١ی هەرێمی پارێزگاری گوێزرایەوە.
- ساڵی (١٩٨٠) بەشداریی لە خولی کادیرانی کۆمەڵە کردو ساڵی دواتر بووە کادیر لە ناوچەی سەنگاو.
- ساڵی (١٩٨٢) بووە ئەندامی کەرتی ڕێکخستنی کفریو دووز.
- ساڵی (١٩٨٣) بووە لێپرسراوی کەرتەکە.
- ساڵی (١٩٨٤) بووە لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی دەربەندیخانو دواتر بووە فەرماندەی تیپی ٥٥ی قەرەداغ. پاش شاڵاوی ئەنفالەکان لە ناوچەکە مایەوەو یەکەم مەفرەزەی پارتیزانیی لە قەرەداغو گەرمیان دروستکرد.
- لە ١٩ی شوباتی ساڵی (١٩٨٩) لە کاتی خۆپەنادان لە ئەشکەوتی داری خلە، ئەشکەوتەکە بەسەر مەفرەزەکەدا ڕووخاو بەهۆی ئەمەوە خۆیو شەش پێشمەرگەی تر بە ناوی نوری قادر ڕەحیم (پۆڵا)، دارا قادر سەمین، حەیدەر محەمەد کەریم، حەمید قادر کەریم، سەلام محەمەد حوسێنو ڕەحیم ڕەشید ئەحمەد شەهید بوون.

* ( ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل ):-

- ساڵی (١٩٤٣) لە یەكێك لە دێیەكانی كەركوك لەدایكبووە.
- چیرۆك و وەرگێڕانی هەیە لە زۆربەی بوارەكاندا.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (دارەكەی بەر ماڵمان)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٦٨.
- (دەستی ئۆخەی)، چیرۆك، سلێمانی، ١٩٧٣.
- (ئەسپ)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٧٨.
- (چاوەڕوانی)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٢.
- (یاخی بوونی ئافرەتان)، نازم حیكمەت، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٥.
- (باڵندەكانیش كۆچیان كرد)، یەشار كەمال، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٧.
- (بەردی سەبر)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٩.
- (بەهاری ڕەش)، ڕۆمان، هەولێر، ٢٠٠٣.
- (گەمییەكەی نوح)، یەشار كەمال، وەرگێڕان، سالێمانی ٢٠٠٦.
- (هەڵبژاردەیەك لە ئەدەبی كوردی)، هەولێر، (٢٠٠٨).
- (فرینەكان)، كۆمەڵە چیرۆك، هەولێر.

* ( ئەحمەد محەمەد شاكەل - شێخ ئەحمەد محەمەد شاكەل ):-

- ناوی (ئەحمەدی كوڕی شێخ محەمەدی كوڕی شێخ سەعیدی شاكەل)ە.
- ساڵی (١٩٠٤) لە دێی (شاكەل) هاتووەتە دنیاوە.
- هەر لە منداڵییەوە خراوەتە بەر خوێندن لای مەلای ئاوایی و سمایل نامەو ناگەهان و گوڵستانی پێ خوێندراوە.
- بۆ ماوەیەك ئەندامی حیزبی هیوا بووەو كاری كردووە.
- پاشان واز لە كاری دونیایی دینی و خەریكی خواپەرستن و تەكیەو بیروباوەڕی سۆفیگەری دەبێت و شێخ عوسمان و شێخ عەلائەددین زۆر كاریان تێكردووە، دۆستایەتیەكی بێ وێنەی هەبووە لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەی بیارە.
- بەرهەمە شیعرییەكانی لە دوای خۆی چەند جارێك چاپ كراوە، بەڵام لە ساڵی (٢٠٠٩)دا بە شێوەیەكی رێكوپێك و فراوان هەموو بەرهەمە شیعرییەكانی چاپكراوەتەوە.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (دیوانی شێخ ئەحمەد محەمەد گەرمیانی شاكەلی)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (دیوانی عارف ڕەبانی شێخ ئەحمەد شاكەلی)، چاپی دووەم، تەورێز، ئێران، ١٩٩١.
- (دیوان و یاداشتی شێخ ئەحمەدی شاكەلی)، چاپی چوارەم، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (دیوانی شاكەلی)، ئەستەنبول، چاپی سێیەم.
- لە (١٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٨٢) كۆچی دوایی كردووە لە دێی سەیدەی ناوچەی شاكەل.

* ( ئەحمەد محەمەد كەركوكی ):-

- ساڵی (١٩٤٧) لە گەڕەكی بەگلەر (مەلا قاون) لەدایكبووە.
- سەرەتاكانی لە ساڵی (١٩٦٢)ەوە دەست پێدەكات لە بواری ڕۆژنامەوانی كاری كردووە لە ئێستگەو تەلەفیزیۆن.
- یەكەم كاری لە ڕۆژنامەی (كەركوك)، گۆڤاری (پنار)، ڕۆژنامەی (آینا) كە بەزمانی كوردی و عەرەبی دەرچووە.
- بەرهەمەكانی:
- (إلى صديقي)، ١٩٦٤.
- (محمد علي كلاي)، ١٩٦٧.
- (مهرجان القلب)، ١٩٦٨.
- (ظنون)، ١٩٧١.
- (في ظلال الشعر)، ١٩٧٢.

- (افكار)، ١٩٩١.
- (تسع شعراء كركوك)، ٢٠٠٠.
- (خويرات پيناري)، ٢٠٠١.
- (نبضات تركمانية)، ٢٠٠٢.
- (اسماء في الذاكرة)، ٢٠٠٢.
- SEVGI SINFONISI، ٢٠٠٥
- آفاق الصحفة التركمانية في كركوك حتى سنة ٢٠٠٣، ٢٠١٣
- (الحب يرسم خارطة كركوك)، ٢٠١٤.
- (الحب يرسم خارطة كركوك)، چاپی دووەم، ٢٠١٥

* (ئەحمەد کوڕی شێخ نەجمەددین - شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ نەجمەددین):-

- ناوی (شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ نەجمەددینی سابری کوڕی شێخ عەبدولرەحمان کوڕی شێخ مەحموودی قوتب)ە.
- ساڵی (١٩٣١) لە گوندی شۆڕیجەی ناوچەی قەرەحەسەن هاتووەتە دنیاوە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو دەکات و لە ساڵی (١٩٥٤-١٩٥٥) لە کۆلێژی (دار المعلمين العالية) لە بەغدا وەرگیراوە، لە ساڵی (١٩٥٨) کۆلێژ تەواو دەکات.
- ساڵی (١٩٥٩) دوای جولانەوەکەی شەواف کەرکوك بەجێ دەهێڵێت و دەچێتە سووریا و رادیۆیەك دادەمەزرێنێت بە زمانی کوردی و عەرەبی و تورکمانی.
- ساڵی (١٩٦٢) دەچێتە (میسر) لە هەمان ساڵ دەگەڕێتەوە بەغدا و دەبێتە مامۆستا لە ناوەندی (الغربية) لە (باب المعظم)، لە ساڵی (١٩٨٢) خانەنیشن دەبێت.
- یەکێکە لە دامەزرێنەرانی حیزبی ئیسلامی عێراقی.
- زمانی عەرەبی و کوردی و ئینگلیزی و فەرەنسی و تورکی و ئۆردوی زۆر باش زانیوە.
- بەرهەمەکانی:
- (أمريكا تدعو إلى إشعال النار).
- (بیرکاری).
- (دیوانی شیعری).
- (تلخيص ابن خلدون).
- (أهل البيت).
- (صفات الداعين إلى الله)، ٢٠٠٩
- (خصائص الداعين إلى الله)، دوو بەرگ دەستنووس.
- وەرگێڕانی کتێبی (بحر الأنساب للشيخ محمود القطب)، لە فارسییەوە بۆ عەرەبی.
- (تفسير مختصر في بعض السور والآيات).
- لە (٩)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئەحمەد ئاویرکی):-

- ساڵی (١٩٠٩) وانەی زانستی ئایینی ووتووەتەوە لە قوتابخانەی مزگەوتی (ئەحمەد ئاغای کەرکوکی)، گەلێك حاشییەی زانستی ئایینی نووسیوەتەوە لەسەر کتێبی زاناکانی کوردستان.

* (ئەحمەد وەهبی قوتب):

- ناوی (ئەحمەد کوڕی وەهبی کوڕی عەبدولمەجیدی قوتب) ە.
- ساڵی (١٩٣٤) لە خێزانێکی ئایینیی لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٠)ەوە شیعرو لێکۆڵینەوەی ئایینیی هەیە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان.
- ساڵی (١٩٦٠) بەکالیۆریۆسی لە زانکۆی بەغدا لە کۆلێژی شەریعەت بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٦١) بووتە مامۆستا لە قەزای چەمچەماڵ و کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئەحمەدی وِن - مەلا ئەحمەدی وِن):-

- ساڵی ١٩٥٥ لە گەرەکی شۆڕیجە لەدایکبووە.
- بەشداری شۆڕشی ئەیلوول کردووە.
- ساڵی ١٩٧٥ پەیوەندی بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە کردووە.
- ساڵی ١٩٨١ لە گەرمیان بووە بە پێشمەرگە.
- لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ لە قۆڵی (گەرمیان-لەیلان-کەرکوك)ەوە لەگەڵ دەستەیەك لە هەڤاڵەکانی دەوری کاریگەری دەبینن لە ڕاپەڕین لە گەرەکی شۆڕیجەدا.

* (ئەحمەد یەعقوبی):

- ئەحمەد یەعقوبی کوڕی (عەبدولمەجید یەعقوبی)یە.
- ساڵی (١٩٠٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٧) هەڵبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك، هەروەها لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٨) دووبارە هەڵبژێردراوەتەوە.
- لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٥٧) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئەدوەر یوحەنا - دکتۆر ئەدوەر یوحەنا):-

- ساڵی (١٩٣٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەهەمە چاپکراوەکانی:
- (اصوات وإشارات، دراسة في علم اللغة)، وەزارەتی ڕاگەیاندن، بەغدا، ١٩٧١.

* (ئەدیب شێخ حەسیب تاڵەبانی - شێخ ئەدیب شێخ حەسیب تاڵەبانی):-

- برای شێخ قابیلی هونەرمەندە.
- لەمەقامو ئاوازی کوردی دا ئاشنایی هەبوو، پیاوێکی خۆش مەشرەب و ڕوو خۆش بوو.

* (ئەدیبە خان):-

- (ئەدیبە خان کچی شێخ عەبدوڵلا کوڕی شێخ عومەری خانەقا)یە.
- ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شێخ عەزیز شێخ یوسف خواستوویەتی، خاوەنی موڵك و ماڵێکی زۆرە لە کەرکوك و دەرەوەی.
- ساڵی (١٩٩٥) کۆچی دوایی کردووە.

* ئەدیب نادر:-

- ناوی تەواوی فەخرەدین محێدین نادرە
- ساڵی ١٩٦٠ لە گەڕەکی تەپەی مەلا عەبدوڵلا لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٢ پەیمانگای تەکنیکی کەرکووك تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٩ ڕووی لە بەریتانیا کردووە.
- یەکەم بەرهەمی لە ساڵی ١٩٧٨ لە هەفتەنامەی پاشکۆی عێراق بلاوکردووەتەوە.
- بەرهەمەکانی:-
- کۆچی بێ وادە، شیعر، تاران، ١٩٨٦
- ئێستا مەنگ و بێ گیانە، شیعرو پەخشان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- لەمپەرێك لە ئاسماندا، چیرۆك، جێمس سێربەر، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- مەزرای ئاژەڵان، ڕۆمان، جۆرج ئۆرووێل، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- هێوری، ڕۆمان، بیلان کۆندێرا.
- مشك و بنیادەم، ڕۆمان، جۆن شتانیەك.
- کتێبی بۆشاییەکان، کۆشیعر.
- ئاوری دەمامکە دوورەکان، کۆچیرۆك.
- گەڕانەوە بۆ ماڵی یەکەم.
- کۆمەڵێ وتاری ئەدەبی.

* (ئەریا ئەمین زادە ساقی):-

- یەکێکە لەو شاعیرانەی کە لە سەدەی هەژدەدا لە کەرکوك ژیاوەو گەلێك بەرهەمی شیعری بەجێماوە بە تورکمانی.

* ئەرشەد ئەلهورمزی:-

- ساڵی ١٩٤٣ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- رسالة مفتوحة إلى الشباب التركماني في العراق، ٢٠٠٤
- حقيقة الوجود التركماني في العراق، ٢٠٠٥
-The Turkmen Reality in Iraq, 2005
- تركمان والوطن العراقي ٢٠٠٥
- المدخل إلى التأريخ التركي، وەرگێڕان، ٢٠٠٥
-IRAKTA TURKMEN GERCEGI 2006
- النثر الفني وادباءه لدى تركمان العراق، وەرگێڕان، ٢٠٠٧.
- القبائل والعشائر التركمانية في العراق ومناطق سكناهم، وەرگێڕان، ٢٠١٠

* (ئەرجومان یونس):-

- ناوی (ئەرجومان یونس خەلەف محەمەد مەفرەجی)یە.
- ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.

* (ئەرخەوان محەمەد عوبێد):

- ساڵی (١٩٨٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠٠٦) زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێژی زمانی بەشی زمانی کوردی تەواو کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ڕەمزو نووسینی سەر گۆڕەکان).
- ئاوێتە بوون و لێدانەوە.. ناڵی بە نموونە)، نامەی ماستەر، ٢٠١٣.

* (ئەروان میدحەت-ئەریوان میدحەت):-

- ساڵی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەکالۆریوسی لە ئەکادیمای بەغدا لە بەشی (کۆتەڵ) لە

زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
- دبلۆمی لە پەیمانگای فنون جمیلە لە هونەری شێوەکاری بەدەستهێناوە.
- بەشداری لەکۆمەڵێك پێشانگا لە بابل و کەرکوکدا کردووە.

*** (ئەسعەد شێخ تالیبی کەرکوکی - شێخ ئەسعەد شێخ تالیبی کەرکوکی):-**

- (کوری عەبدوڵلا حەکیم کوری شوکرەڵلا)یە کە لە شاری دیار بەکر دکتۆرێکی گەرۆك بووەو بە سواری ئەسپ ئەم دێو ئەو دێی کوردستانی کردووە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش.
- بە بنەچە دەچنەوە سەر عەشیرەتی (لەك).
- بە ناوبانگەی بە (ئەسەد) و لە کەرکوك دوکان و گەرماو و ئاسیاوی هەبووەو براکانی لە کرمانشا و بەغدا نیشتەجێ بوونە.

*** (ئەسعەد جەباری):**

- ساڵی (١٩٦٩) لە کەرکوك دایك بووە.
- یەکێك لە رۆژنامەنووسەکانی کەرکوك.
- کتێبە چاپکراوەکانی: (سەرەتایەك بۆ مێژووی ئامێری چاپ).

*** ئەسعەد کەوەڵە:-**

- هەندێك لە زانیارییەکان ئەوە دەخەنە روو کە شاعیر بووە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی نییە.

*** ئەسعەد نائیب:-**

- وا دەگێرنەوە کە گوایە بنەماڵەی نائیب لە رەچەڵەکدا دەگەرێنەوە بۆ ئەمەوییەکان، لەبەر ئەوەی عەلی ئەفەندی باوکی ئەسعەد نائیب بۆ ماوەیەکی زۆر لە کەرکوك نائیب بووە یان نائیبێتی کردووە، لای عەرەب بە (ابن النائب) و لای تورك بە نائیب ئۆغلو ناسراوە.
- ناوی تەواوی محەمەد ئەسعەدە و نازناویی شیعریی ئەسعەدە.
- لە کەرکوك چۆن ژیانی بردووەتە سەر ئاگاداری تەواومان نییە، تەنها یەکێك لە مزگەوتە گەورەکانی گەرەکی ئاخور حوسێنی شاری کەرکوك بە ناوی ئەوەوە ناسراوە و مزگەوتەکە خۆی دروستی کردووە، شاعیری کەرکوك (قاسمی) بەهۆی سەرلە نوێ دروست کردنەوەی مزگەوتەکە لە ساڵی ١٢٤٢کۆچی قەسیدەیەکی هۆنیوەتەوە تیایدا ئاماژەی بە مێژوو و بەڵگەی وەقفی مزگەوتەکە کردووە، کە محەمەد ئەسعەد لە ساڵی ١٢٣١ بینای کردووە، لە چامەکەی قاسمی ئەوەیشمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەوکاتە حاجی بووە.
- دانەری کتێبی(مطالع السعود) دەڵێت:- ئەسعەد نائیب ئۆغلو لە ساڵی ١٢٣٧کۆچی دەبێتە لایەنگیری داود پاشا و لەوەوە فێری دەرس دەبێت واتا دەبێتە قوتابی داود پاشا.
- ئەسعەد نائیب لەنێو زانایان و میراندا دیار و بەرچاو بووە و لە دواییدا بووە بە (سێر کاتیب)ی داود پاشا. لە ساڵی ١٢٣٧کۆچی محەمەد بەگی کویخا(کتخدا، وکیل امور)یاخی دەبێت و سەودای داگیرکردنی بەغدا. و بە والیی بوون دەدا لە کەللەی، لەگەڵ گرووپێك سەرباز پەلاماری (کەرکوکی) دەدات، پاش بەرەنگاربوونەوەیەکی توندی خەڵکی شاری کەرکوك ناچار قەڵای کەرکوکی بەجێدەهێڵێت و بەرەو بەغدا بەرێدەکەوێت، وەلێ لەبەر ئەوەی ناتوانێ مەساریف و خەرجی سەربازەکانی بکات داوای ئاشتی لە داود پاشا دەکات. والی پاشایش ئەسعەد نائیبی قوتابیی رەوانە دەکاتە لای بۆ بەرێوەبردنی کاروباری ئاشتەوایی.
- بەپێی زانیارییەکانی خاوەنی (مرآة الزوراء) لە کۆتایی مانگی رەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٤٧کۆچیدا عەلی رەزا پاشای والی عەبدولرەحمان ئورفەلی دەفتەرداری بەغداً لە کارەکەی لادەبات و شاعیرمان (ئەسعەد نائیب) لەجیاتی دادەمەزرێنێت.
- لە سەرەتای مانگی (جمادی الاخر) ی هەمان ساڵدا، تاخمێك لە عەشیرەتە عەرەبەکان یاخی بووبوون، والی عەلی رەزا پاشا بەشێك لە هێزەکەی رەوانەی دەورووبەری شامیە کرد، لەبەرئەوەی لەنێوان سەرکردەکانی ئەو هێزە ناکۆکی دروست بووبوو بۆ یەکلایی کردنەوەو ناوبژی کردن، والی ئەسعەد نائیبی رەوانە کرد بۆیان.
- شاعیرمان ئەم کارەی بەوپەری سەرکەوتوویی بردەسەرو بۆ پاداشی ئەمە لە ناوەراستی مانگی شەعبانی هەمان ساڵدا، لە گەورەترین وەزیفەی پاش والێتی، واتا وەك کەتخدا(وکیل امور) دامەزرێنرا.
- شاعیرمان لەم وەزیفە نوێیەدا کاروباری خەڵکی بەوپەری سەلاحییەتەوە بە باشی بەرێوەدەبرد، بۆیە بووە جێی ئیعتیمادی پتری والی، وردە وردە وای لێهات هەموو سەلاحیات و ئیختیساسێکی والیی گرتە دەست و بەکاری دەهێنا تا وای لێهات بوونی والی گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو، لەبەر ئەوەی مامەڵەی توندی لەگەڵ موراجیعینی دام و دەستگای دەوڵەت دەکرد، زۆر لای والی شکایەتی لێکرا، بەڵام والی بە هیچ شێوەیەك گوێی بۆیان هەڵنەدەخست، والی بەوپەری هێزییەوە لایەنگیری دەکرد، ئەسعەد نائیب گشت مەئموورانی دەوڵەت و میرانی عێراق و نفووزی شێخەکانی لە ژێر دەستدا بوو، چوار سەد سەربازی تورك لەژێر فەرمانیدا بوون.
- تا دەهات نەفرەت و تووڕەیی خەڵك لە زیادبووندا بوو، لە بەرامبەر سەرۆکایەتیی قازیی بەغدا (تاکی چەلەبی) رێپێوانێك سازکرا، لە ئاکامدا لە شەوی جومعەی 27ی مانگی رەمەزاندا دوای نوێژی تەراویح وەك ئوسوولێك بارەگای والی بەجێدەهێڵێت و بە دەمانچە دەکوژرێت، لاشەکەی پاش بیست و چوار سەعات مانەوە ئینجا دەبرێت بۆ مزگەوتی عەلی پاشاو لەوێ بە خاك دەسپێردرێت.
- (مرآة الزوراء)مردنی ئەسعەد بە ساڵی ١٢٤٧ دیاری

دەکات، بەڵام حەق لای عەباس عەزاوییە کە بە ساڵی ١٢٤٨ مردنەکەی دیاری دەکات، بەراستی(مرآة الزوراء) کە مێژووی لەسەر کار دامەزراندنی وەك کتخدا لە ناوەراستی مانگی شەعباندا دیاری دەکات، بەپێی وتەکانی نەك مانگێك لە وەزیفەکەی بەڵکو زۆر ماوەتەوە، لەبەر ئەوە دەبێت ساڵی مردنەکەی هەر ١٢٤٨ بێت، هۆکاری ئەم هەڵەیەش هەرچۆنێك بێت دەگەرێتەوە بۆ چەند جار نووسینەوەی نوسخەی کتێبەکە بە شێوەیەکی پەرش و بڵاو.

– لە چامەیەکی عەرەبیی شێخ هەمزە مەریزی هاوچەرخییەوە، لە کاتی وەفاتی شاعیرماندا بۆمان دەردەکەوێت کە کورێکی هەبووە بەناوی مستەفاوە.

– ئەسعەد بە یەکێك لە شاعیرە گەورەکانی کەرکوك دەژمێردرێت، ئەو چەند پارچە شیعرەی شاعیر کە لەبەر دەستماندایە بەشێکی لەلایەن شاعیرانی دیکەوە تەخمیس (پێنج خشتەکی) و تەنزیر(لاسایی)کراوە، وە شاعیرمان لە هەموو کاتێکدا بە تەقدیرەوە یادکراوەتەوە. بە هەر حاڵ ئەویش لەژێر کاریگەریی نفووزی سیاسی و کەسایەتییەکەی.

– شیعرە عەرەبییەکانی ئەسعەد بەهێزو جوانن، لەم بارەیەوە مێژوونووسی بەناوبانگ عەباس عەزاوی، لە گۆڤاری (الثقافة الحديثة)بەم شێوەیەی نووسیوە:–

ئەسعەد نائیب بە هەوڵ و کۆشش و (تشویق) تەشویقییەوە بزاڤێکی ئەدەبی خوڵقاندووە، بە شەرە شیعرو حیوارەکانی لەگەڵ زۆرێك لە شاعیر و ئەدیبە ناسراوەکان ناوی دەرکردووە. لەسەرووی هەمووان:–عومەر رەمەزان، شێخ سالح تەمیمی، هەمزە مەریزە، هەموو هاوچەرخانی توانایی زانستی و قابلییەتی ئەدەبی ئەویان نرخاندووە.

داود پاشا کە رووباری عیسای زیندوو کردەوە کە ئێستا ناوی رووباری ئەبووغەریبە، بەو بۆنەیەوە ئەسعەد چامەیەکی درەوشاوەی هەیە بە زمانی عەرەبی.

– شاعیر ئەم رووبارەی لەسەرووی رووباری نیل داناوە و لە بەرامبەر ئەم شیعرەی ئەسعەد، شاعیر هەمزە مەریزە بە پێچەوانەوە ستایشی رووباری نیلی کردووە و رووباری عیسای زەم کردووە ئەم چامەیەیشی بەناوبانگە، بەڵام لە دواییدا پەشیمان دەبێتەوەو دەست دەکات بە پیاهەڵدانی رووباری عیساو لە نیلی بەسەرووتر دادەنێت و عوزرخواهی لە ئەسعەد نائیب دەکات بە درێژی بە شان و باڵیدا هەڵدەدات.

– ساڵی ١٢٤٣ی کۆچی لەسەر داوای داود پاشا ئەسعەد نائیب بە هاوەڵێتی شێخ سالح تەمیمی رەوانەی بەسرە دەکرێت و لەوێدا لەگەڵ شاعیر سەید عەبدولجەلیل چاویان بەیەك دەکەوێت و بەم دێرە شیعرە ئەسعەد ستایش دەکات:–

هاج شوقي إلى الحبيب المفدى

منذ رأيت الركب العراقي يحدى

– زۆربەی شیعرەکانی ئەسعەد کە بەزمانی تورکی هۆنیوییەتییەوە، لەلایەن شاعیرانی عەرەبەوە بەگەن کراون، شاعیرمان بێجگە لە زمانی تورکی و عەرەبی بەپێی وتەی عەباس عەزاوی بە زمانی فارسیش خاوەن قەڵەمی خۆی بووە.

* (ئەسەد نائیب- ئەسعەد نائیب):–

– باپیرە گەورەی ئەسەد نائیب محەمەد ئەفەندی کەرکوکی ساڵی ١٢٣٨کۆچی ١٨٢٢زایینی بۆ تەواو کردنی خوێندنی بەرەو بەغدا رۆیشتووەو لە قوتابخانەی (سوهرەت وێردی یان سوخرەت وێردی) دەوامی کردووە، لێرە رووبەرووی کارەساتێکی سەیر دەبێت، لە دوا بەدوای قوناغی خوێندنیدا لە شەوێکی زستانی باراناویدا دوو پاسەوانی شەو واتا دوو حەسحەس، بۆ گوێراگرتن مۆڵەت لە قوتابیان وەردەگرن و لەو کاتەدا یەکێك لە پاسەوانەکان پرسیاری زانستی لە قوتابیان دەکات و موحەمەد ئەفەندی بە راست و دروستی وەڵامی دەداتەوە، ئەم گەنجە بۆ بەیانی بۆ بارەگای والی بانگهێشت دەکرێت و لەبەرئەوەی هۆی بانگهێشتەکە نازانێت ترس دەیگرێت، لەوێ بۆی روون دەبێتەوە کە ئەو کەسەی بە عینوانی پاسەوان پرسیارەکانی لێکردبوو خودی داود پاشای والی بووە و چونکە داود پاشا شەوان بە جلوبەرگ و قیافەتێکی جیاوازەوە لە شەوانی شاری بەغدا دەگەرا بۆ ئەوەی لە دەردو شیکایەتەکانی خەڵکی راستەوراست ئاگادار بێت، هەر لەبەر ئەم زیرەکییەی داود پاشا ئیلتیفاتی زۆری بۆ محەمەد ئەفەندی دەبێت و دوای تەواو کردنی خوێندن لەسەر داوای خۆی لە قەڵای کەرکوك لە مزگەوتی (منارەی یکك یان یقق - یکك منارەلی) وەك مامۆستا و پاشان لە

شاردا بە عینوانی نائیبی قازی دایدەمەزرێنێت.
– جا لەبەر ئەمەیە بنەماڵەی ئەسات نائیب نازناوی نائیب ئۆغلو وەردەگرن[1]، دەنگۆی ئەوە هەیە کە محەمەد ئەفەندی لەگەڵ کچێکی بنەماڵەی (گیدەك) هاوسەرگیری کردبێت. دوو کوڕیان دەبێت بە ناوی سالح و حوسێن، حوسێن ئەفەندی دەکاتە باپیرەی شاعیرمان و لە کەرکوك مامۆستایەتی کردووەو لە سەنجاغی سلێمانی مودەعی عام بووە و دوابەدوای ئەوە لە قەزاکانی ڕەواندز و کۆیە سەنجەغ و ئەربیل و جەزیرە قازێتی کردووە.
– ساڵی ۱۳۱۳ی کۆچی لە تەمەنی هەفتاو دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.
– نائیب زادە سەعید ئەفەندی کوڕی حوسێن ئەفەندیش دەکاتە باوکی شاعیرمان و لە زەمانی عوسمانییەکاندا مامۆستایەتی و نائیبێتی کردووە، و ماوەیەکیش لە کەرکوك لەو ئەنجوومەنانەی لەبابەت قەزایای فەسڵی(دعوالر فصلی – مەسلەتی کردن و چارەسەرکردنی کێشە) کە پەیوەندی بە کاروباری بازرگانی و حوقووقی و سیاسییەوە هەیە تەشکیل کراوە باوکی شاعیرمان وەکو یەکێك لە ئەشرافەکان هەڵبژێردراوە و ئەندام بووە تیایدا. لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێنیش بووەتە خاوەنی دیوەخان و دیوەخانەکەیش بووەتە شوێنی هەواداران و ئەحبابانی زانست و ئەدەبیات.
– ئەسەدی شاعیر لەلایەن ڕەچەڵەکی دایکیشییەوە لە کەرکوك لەو چەند بنەماڵەیەیە کە بە موفتی ناسراون و کچی یەکێکیانە بە ناوی حاجی دەروێش ئەفەندی.
– ناوی ئەحمەد ئەسەد و ناوێکی مورەکەبە، لە پێشدا لە ژێر شیعرەکانیدا (ا –نەجدەت) هەندێك جار (نائیب زادە ئەسەد) و هەندێك جاریش ( نائیبزادە ئەسەد نەجدەت)، دوا بەدوای ئەوە (نائیبزادە ئەحمەد ئەسەد) وە( ئەسەد نائیب ئۆغلو)، دوا ناویش(ئەسەد نائیب)ی بەکارهێناوە. ئەمانە هەمووی بەپێی ئەو گۆڤار و رۆژنامانەی لە بەردەستماندایە.
– لە شیعریشدا نازناوی هەندێ جار (نەجدەت) و هەندێك جاریش (ئەسەد)ی بەکارهێناوە و لە دواییدا وازی لە بەکارهێنانی نازناو هێناوە.
– لە بارەی مێژووی لەدایکبوونی، پارچە کاغەزێك لە باوکییەوە ماوەتەوە بەم شێوەیە روونی کردووەتەوە:–
– ((رۆژی سیانزەی کانوونی ئەوەلی ۱۳۱۳ی سەنەی مالییە (واتا سەنەی ڕۆمی) موسادیفی ۱۳۱۵ی سەنەی هیجری رۆژی شەمەی یەکەمی مانگی شەعبان، (بعد طول الشمس مخدومی احمد اسد گهوارەیی وجودە قدم باسمشتر) دوای درێژەی خۆرەتاو بێشکەی یان لانکی ئەحمەد ئەسەدی مەخدوومم واتا کوڕە خزمەتکراو و رێزلێنراوەکەم بۆ جیهانی وجود و بوون هەنگاوی دانا))، بە گوێرەی ئەمە رۆژی لە دایکبوونی شاعیرمان دەکاتە ۲۵ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۸۹۷ی زایینی.
– لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێنی شاری کەرکوك ئەسەد چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، وەك لەسەروە باسمان لێوە کرد کوڕی مامۆستا و نائیب سەعید ئەفەندییە، هەر لەم شارەیشدا گەورە بووە و پێگەیشتووە.

– سەرەتای خوێندنی لای مەلا سەمەد لە مزگەوتی نائیب ئۆغلو دەستپێکردووە، دوای ئەوە لە مزگەوتی قازی لای مەلا محەمەد قورئانی خەتم کردووە، دوای ئەوە بە زمانی تورکی کتێبگەلی مەولوود، ئینشای بچووك و گولدەستەی خوێندووە، ماوەیەکیش کتێبی گولستانی بە زمانی فارسی لای باوکی خوێندووە و بەشێوەیەکی جیایش کتێبگەلی ئەدەبی بە هەوڵ و کۆششی خۆی تەواو کردووە.
– ساڵی ۱۳۲٤ی رۆمی لە کەرکوك چووەتە مەکتەبی روشدییە، ساڵی ۱۳۲٦یش ئیعدادییەو دوایش ساڵی ۱۳۳۰چووەتە مەکتەبی سوڵتانی، لەم مەکتەبانە بەهۆی داخستنیان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لە ساڵی ۱۳۳٤ی رۆمی ناچار بووە وازی هێناوە.
– شاعیر لەم مەکتەبە(وادەڵێت بەڵام وادیارە مەبەستی لەم مەکتەبانەیە_وەرگێر) بەپێی بەرنامە دەرسی ئەدەبیات و عیلمی عەرووز لای مامۆستا ئەحمەد کەماڵ بەگ فێر بووە لە هەمان کاتدا لەلایەن باوکیشییەوە یارمەتی دراوە(بۆ دەرس فێر بوون).
– لە ۱ی نیسانی ساڵی۱۹۲٤ لە قوتابخانەی سەرەتایی ئاوچی وەك مامۆستا دامەزراوە، دوای ئەوەی لە زۆر شوێندا وەزیفەی بینیوە لەم شارەدا لە قوتابخانەی سەرەتایی غەربییە مودیر بووە و تا لە ۱ی تەمووزی ساڵی۱۹٦۳ خانەنشین بووە.
– لە ۱۹٦٤ لە وەزیرییەی شاری بەغدا خانوویەکی بۆخۆی کڕیوەو بۆ ئەوێ گواستوویەتییەوە و ماڵی بار کردووە، سەرەرای مووچەی خانەنشینی، لەگەڵ واریداتی ئەو عەقارانەی لە شاری کەرکوك هەیبووە بە مانە هەموو ژیانێکی خۆش و ئاسوودەی بردووەتە سەر.
– لە بەرواری ۱۹ی ئاداری ساڵی ۱۹۹۲ کۆچی دوایی دەکات و بەپێی وەسیەتی خۆی تەرمەکەی دەهێنرێتەوە بۆ کەرکوك و لە مەزارگەی بنەماڵەکەیاندا دەنێژرێت.
– ئەسەد نائیب لەگەڵ کچی مودیری تەحریراتی کۆنی کەرکوك بەهادین ئەفەندی هاوسەرگیری کردووە،... خاوەنی سێ کوڕە بە ناوەکانی سامی و فەهمی و ئیبراهیم و بێجگە لە دوو کچ، لەمانە فەهمی لە باوکییەوە شاعیرێتی بە میرات بۆ ماوەتەوە و جاربەجار لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا شیعرەکانی بڵاودەکاتەوە.
– بەرهەمەکانی:–
– لە ۱۹۲۰ەوە شیعرەکانی لە چاپەمەنییەکانی کەرکوك وەك (نەجمە، ئیلەری، کەرکوك، ئافاق) بڵاوکردووەتەوەو لە بەغدایش لە گۆڤاری (قەرداشلیك)، لە بارەی کتێبیشەوە بەرهەمە شیعری و پەخشانییەکانی بەم شێوەیەیە:–
۱–زەمانن ئەڵی( دەستی زەمانە):–
لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندنەوە لە ساڵی ۱۹۸٥ لە چاپخانەی حورییەت بە چاپ گەیەندراوە و بریتییە لە هەشتا و هەشت لاپەرە، بەشێك دوایین شیعرەکانی شاعیر خۆیەتی تیایدا لاسایی ستایلی کلاسیکی کردووە و بە ئیملایەکی نوێ نووسراوەتەوە.
۲– یاپراقلار(گەڵاکان):– ئەم کتێبە بریتییە لە ۱٦۸ لاپەڕە

لە بڵاوکراوەکانی یانەی برایانی تورکمانی (نادي الأخاء التركماني) بەغدایە لە ساڵی ١٩٨٦لە بەغدا لە چاپخانەی شەفیق بە چاپ گەیەندراوە. کتێبەکە بریتییە لە بەشێك لە شیعرە سەرەتاییەکان و ناوەنجییەکانی سەردەمی ژیانی و بە کێشی عەرووزی هۆنراوەتەوە.

٣- ئارمەغان(دیاری - خەڵات):-

- بەرهەمێکی شیعرییە بۆ قوتابیان هۆنراوەتەوە، بریتییە لە :-

لەو بەسەرهاتانەی بەسەر شاعیرمان هاتووە

هەندێك لە حیکایەتەکانی بەگداش و نەسرەدین هۆجە(مەلای مەزبوورە).

هەندێك حیکایەت لە زمانی ئاژەڵانەوە.

هەندێك لە نوکتەکانی کەرکوك

کتێبەکە هەشتا لاپەڕەیە و دوای مردنی شاعیر لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە لە ساڵی ١٩٩٨لە چاپ درا.

٤- کرکوك نوکتەلەری (نوکتەکانی کەرکوك):-

ئەم کتێبەی کۆمەڵێك حیکایەت دەگرێتە خۆی کە لە زاری خەڵکەوە وەریگرتووە، لە دوو بەرگدایە، بەرگی یەکەم ١١١ لاپەڕەیە لە ساڵی ١٩٧٣لە بەغدا لە چاپخانەی تەزامون لە چاپ دراوە، بریتییە لە ٩٩ حیکایەت، لە دوای هەر حیکایەتێك لەلایەن نووسەرەوە تاکە بەیتێك شیعر هۆنراوەتەوە، بەرگی دووەمیش بۆ چاپ ئامادەیەو بەندە (عەتا تەرزی باشی) لەلایەن خۆمەوە پێشەکیم بۆ نووسیوە.

بێجگە لە بەرهەمە چاپکراوەکانی، بەشێك لە چوارینەکانی عومەر خەیامی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی و هێشتا چاپ نەکراوە، بێجگە لەوەیش بە ناوی کەشکۆڵەوە کۆمەڵێك شیعری هەیە بڵاونەکراوەتەوە.

* پەراوێز:-

١-عەتا تەرزی باشی لەم پەراوێزەدا دەڵێت بنەماڵەی ئەم شاعیرەکە بە (نائیب ئۆغلو) بەناوبانگن، هیچ بەڵگەیەکمان لانییە بیسەلمێنێت کە هەمان ئەو بنەماڵەیەن کە ئەوانیش بە (نائیب ئۆغلو) بە ناوبانگن و ئەسعەد نائیبیان تیا هەڵکەوتووە، کە پیاوی والی داود پاشا بووە و دروستکەری مزگەوتی نائیب ئۆغلووە لە گەڕەکی ئاخور حوسێن.

- تێبینی(نزار کەکوکی):-

بەندە شاعیرانی کەرکوك(کرکوك شاعرلری) نوسخە لاتینییەکەم لایە و شاعیری یەکەم وەك ئاماژەم پێداوە ناوی ئەسعەدە، شاعیری دووەمیش هەر بەپێی نوسخە لاتینییەکە ناوی ئەسەدە. جا نازانم لەو نوسخەیەی کە بە ئیملای عەرەبی نووسراوەتەوە چۆنە!؟

* (ئەسعەدی چەمچەماڵ - مەلا ئەسعەدی چەمچەماڵ):-

- (مەلا ئەسعەد کوڕی گەورەی مامۆستا مەلا سەید محەمەد)ە ناسراو بە (شێخە زەرد)ە، لە ساڵی (١٩٥٠) لە گوندی (گۆڕان)ی ناوچەی جەباری نزیك بە قەزای چەمچەماڵ لە بنەماڵەیەکی ئیسلامپەروەر ونیشتیمان پەروەر چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.

- خوێندنی سەرەتایی لە گوندی (گۆڕان)ی جەباری و، پاشان قورئانی پیرۆزی لەخزمەتی باوکی ودواتر فەقێیەتی لەلای مامۆستا سەید ئەحمەدی فەیلەسوف و مامۆستا مەلا عەباس ومامۆستا مەلا عەبدوڵڵای ڕیش و مامۆستا مەلا ڕەشیدی واعیز خوێندووە.

- بڕوانامەی زانستی شەرعی وئیجازەی مەلایەتی لەلایەن گەورە زانای کورد (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)ەوە پێدراوە.

- ساڵی (١٩٧٩) لە گوندی (تاڵەبان) ی سەر بە قەزای چەمچەماڵ وەکو پێشنوێژو وتارخوێنی گوندەکە دامەزراوە، پاشان لەسەر دژایەتی کردن وهاوکارینەکردنی ڕژێمی بەعس لەسەر کارەکەی لابراوە.

- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٢-١٩٩٥) لە مزگەوتی (حاجی حەمید) لە قەزای چەمچەماڵ وەکو پێشنوێژو وتارخوێنی ئەهلی وبەبێ وەرگرتنی مووچەی حکومەت دامەزراوە (ئامادە نەبووە لەبەرامبەر دامەزراندنی لەمزگەوتی فەرمی حکومەت پەیوەندی بەحیزبی بەعسەوە بکات).

- لە ساڵانی ناوبراودا بەبەردەوامی وانەی قورئانی پیرۆزو تەجوید وشەریعەتی وتۆتەوەو لەو ماوەیەدا بەوردی وبەبەردەوامی لەلایەن دەزگای ئەمن و ئیستخباراتی ڕژێم و سیخوڕەکانیەوە چاودێری کراوە و یەکەم مەلا بووە کە لەکاتی ئەنجامدانی هەردوو پرۆسەی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو ئەنفالکردنی ناوچەی گەرمیان لەلایەن ڕژێمەوە هەڵوێستی بوێرانەی هەبووەو لەمیانەی پێشکەشکردنی وتاری ڕۆژی هەینیدا لە ساڵی (١٩٨٨) دژی ڕژێمی درندەو خوێنمژی بەعس و سیاسەتە چەپەڵەکانی وەستاوەتەوە.

- هەر لەو سەردەمەدا وەکو کەسایەتییەکی خەمخۆر وخێرخواز وێڕای شاردنەوەی چەندین خێزانی پاشماوەی ئەنفال لە نێو ماڵەکەی خۆیداو دەربازکردنی دەیان خێزانی تر، یارمەتی دەیان خێزانی تری پاشماوەی ئەنفال ولێقەوماوانی داوە.

- سۆزی خەڵکانی دەوڵەمەندو خێرخوازی بۆ یارمەتی دانی هەژارو لێقەوماوانی پرۆسەی ئەنفال جوڵاندووەو بەشداری لەچەندین پرۆسەی کڕین ودابەشکردنی خۆراك وکەلوپەل و پێداویستیی هەمەجۆرودابەشکردنی هاوکاری ماددی بەسەر خێزان وکەسووکاری پاشماوەی ئەنفالدا کردووە.

- مامۆستا مەلا ئەسعەد وەکو کەسایەتییەکی ئیسلامیی بێلایەن و چاکسازو نیشتمانپەروەر ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە لە ناوبژی و ئاشتەوایی و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی ودەروونییەکاندا لەناوچەکە چ لەسەر ئاستی تاك وخێزان بووبێت یان لەنێوان هۆز وبنەماڵە وعەشیرەتەکانی چەمچەماڵ ودەوروبەری بەتایبەتی و، سەرجەم شارو ناوچەکانی تری هەرێمی کوردستان بەگشتی و هەمیشە لە هەوڵی یەکخستنی ڕیزەکانی گەلەکەیدا بووە.

- لە ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی (٤)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٥)

بەهۆی وەرگەرانی ئۆتۆمبێلەوە لەسەر پردی (تەینال)ی سەر رێگەی سلێمانی-چەمچەمال لە تەمەنی (٥٥) سالیدا کۆچی دوایی کرد.

* (ئەسعەد محەمەد عەلی):

- سالی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانە، بەشێك لە خوێندنی لە هەنگاریا و ئەلمانیا.
- سالی (١٩٩٧) کۆچی دوایی کردووە.
- چاپکراوەکانی:
- (الوجه الغائب)، ١٩٧٠.
- (مدخل إلى الموسيقى العراقية)، ١٩٧٤.
- (في أصول الموسيقى الفولكلورية)، ١٩٧٦.
- (الستارة المسدلة)، ١٩٧٧.
- (الضفة الثالثة)، ١٩٨٢.
- (بين الأدب والموسيقى، دراسة مقارنة في الفن الموسيقي)، ١٩٨٥.
- (الفنون والشعر)، ١٩٨٦.
- (الموسيقى والطفل)، ١٩٨٦،
- (مكانة الشعر في الثقافة العربية المعاصرة)، ١٩٨٧.
- (الصوت والدوي)، ١٩٩٢.

* (ئەسیری):-

- ناوی (عەبدولخالق کوری شێخ حوسێن نەقشبەندی)ە.
- لە هۆنینەوەی شیعردا نازناوی (ئەثیری-ئەسیری) بۆخۆی داناوە.
- برای (نەجمەددین ئەفەندی)ی نیشتمان پەروەری بە ناوبانگی کوردە وباوکی شێخێکی رابەری تەریقەتی نەقشبەندی بووە لە گەرەکی (ئاخور حوسێن).
- خاوەنی تەکیەی نەقشبەندییە بەپێی ئەو دەفتەر نفوسەی کە لە رۆژی (٢٧)ی ئەیلولی سالی (١٩٣٩)دا دەری هێناوە
- سالی (١٨٩٠)دا لە شاری کەرکوك لە گەرەکی (ئاخور حوسێن) لەدایکبووە.
- بەمەبەستی زانست فێربوون چەندان شارو دێی کردووە لە هاوینی سالی (١٩١٣)دا بەپێی ئەو ژیاننامەیەی کە خۆی لە دەورووبەری سالی (١٩٥٠)دا وەك یاداشتێك نووسیوویەتیەوە باسی کردووەو لە دوای دا گەراوەتەوە شارە خنجیلانەکەی خۆی (کەرکوك) لەم هاتوچۆ کردنەیدا فێری گەلێ جۆرە زانیاری وەك رێزمان، رەوانبێژی، منطق، اصول الکلام) بووە. ئیجازەی زانستی لە مەلا حیکمەت سیامەنسووری) (١٨٤٤-١٩٢٤) وەرگرتووەو هەر لە سەرەتای زستانی هەمان سالدا بە نیازی دیدەنی (نەجمەدین ئەفەندی)ی برای خۆی گەیاندووەتە ئەستەمبول و بە چاوپێکەوتنی (شێخ عەبدولقادری شێخ عوبێدوللا) بەلام بە بیستنی هەوالی کۆچ کردنی باوکی لەگەل برانەوەی جەنگی یەکەمی جیهان لە سالی (١٩١٨)داو لەسەر داخوازی (نەجمەدین ئەفەندی) برای گەراوەتەوە کەرکوك بۆ سەرپەرشتی کاروباری تەکیە و مال و خێزانەکەیان.
- ئەسیری بە ناچارییەوە دەستیداوەتە هەلسووراندنی کارووباری ئەو جوتیارییەی کە لە دەورووبەری شار هەیانە بووە لە دێی (جەوەل بۆر)و (سێ کانیان)، جگە لە سەرپەرشتی کردنی ئەوخێزانەی کە باوکی بەجێی هێشتووە، خەریکی رێکخستنی ئیش و کاری تەکیەکەیان بووە. کە لە رۆژی (٢٣)ی ئایاری سالی (١٩١٩)وە بە شێوەیەکی رەسمی لە شوێن باوکی کراوە بە پۆستەنشین.
- لە (٣٠)ی تەمموزی سالی (١٩٣٥) بە کۆششی مەعروف جیاووك (١٨٨٥-١٩٥٨) لە کەرکوك بووەتە جێگری سەرۆکی دادگای تێهەلچوونەوە (ئیستیئناف) لە دادگای شەرعیەی کەرکوك بەنووسەری یەکەم دامەزراوەو لە پاش بیست و سێ سال خزمەت لە رۆژی (١)ی تشرینی دووەمی سالی (١٩٥٨) خانەنشین کراوە ئیتر لە تەکیە ژیانی بردووەتە سەر.
- ئەوەی شیاوی باسە شاعیر، ژنی نەهێناوەو هەر بە تەنیایی ژیانی بردووەتە سەر لە خێرو خۆشی مال و خێزانداری بێ بەش بووە لە رۆژی (١٨)ی حوزیرانی سالی (١٩٦٢) کۆچی دوایی کردووەو لە گردی گۆرستانی (شێخ محێدین) لە کەرکوك نێژراوە.

ئەسیری پیاوێکی بالا بەرزی چوارشانەی تێك سمراو بووەو خاوەنی بەژن وبالایەکی رێك و پێك و بەشەوکەت بووە، زۆر لە سەرخۆ و هێمن و زمان پاراوو رووخۆش و قەلەندەر مەشرەب بووە دژی فیزو لە خۆبایی بوون بووە حەزی لە ژیانێکی سادەو رەوان دەکرد، هاتوچۆی کەسی نەدەکردو سەری لە دۆست وبرادەرەکانیدەدا.

- ئەسیری بەلای ئێمە لە ژیانی شاعیرێتی دا بە دوو قۆناغدا رۆیشتووە، قۆناغی پشکوتن قەریحەی شیعری تا سالی (١٩٢٠)ە وەکو هەموو شاعیرانی کورد دەستی لە هەموو چەشن و بابەتەکانی شیعرداوە، لە وەسف و دلداری نیشتمانی ولاواندنەوە. قۆناغی دووەم، لە سالی (١٩٢١) ەوە دەست پێدەکات تاوەکو کاتی کۆچ کردنی، لەم چوون و گەرانەوەی بۆ کەرکوك بیری یەکجاری گۆراو سەودای گەل و

3—٣
التصوير الشمسي – PHOTOGRAPHIE
FEMME وزوجته
توقيع زوجته
Signature de la femme
Signature du porteur

2—٢
SIGNALEMENT — اوصاف
PORTEUR حامله
FEMME زوجته
المرفة
Profession
محل الولادة وتاريخها
Lieu et date de naissance
محل الاقامة الدائم
Domicile
الطول
Taille
لون العينين
Couleur des yeux
لون الشعر
Couleur des cheveux
العلامات الفارقة
Signes particuliers
ENFANTS — الاولاد
Nom الاسم
Age العمر
Sexe الجنس

نیشتمانی کەوتە سەر. لەدوای جەنگی جیهانگیری پێشوو هەرچی هەڵبەستێکی عەشق و ستایش و دەوڵەتی هەبوو کۆی کردەوەو سووتاندنی لە مێژووی (١٩٢١)ی زاینیی تاکو (١٩٣٤) هەڵبەستی نیشتمانی نووسیوە.

– بەر لەوەی ماڵ ئاوایی لە نیشتمان و میللەتەکەی بکات، چوار شاکاری هێناوەتە بەرهەم، یەکەمیان، فەرهەنگێکی کوردی یە، کەووشەکانی هەر بە کوردی لێکداوەتەوە دوومیان: فەرهەنگێکی کوردی عەرەبییە کە بە کوردی و ماناکەی بە عەرەبی وەڵام داوەتەوە.

– سێیەمیان، کتێبێکی بچکۆلەیە لە ٢٩ لاپەرەدا دەربارەی مێژووی ژیانی مرۆڤ لە ساڵی (١٩٣٣)دا نووسیوویەتەوە، چوارەمیان، بەرهەمی شاعیر کتێبێکە بە ناوی (ژمارە نووسین) لە پانزە لاپەرەدا، کە دەربارەی کۆکردنەوەو دەرکردنی ژمارەکانە.

*** (ئەشرەف داغلی):**

– ساڵی (١٩٤٦) لە گەرەکی (ساری کەهیە) لەدایکبووە.

– شیعری هەیە بە زمانەکانی تورکمانی و عەرەبی و لە بواری مامۆستاییدا کاری کردووە.

– بەرهەمەکانی:

– (هجری دەدە)، شیعر، بە زمانی تورکی، ٢٠٠٥

– (رحلة مع الألم)، دیوانی شیعری، ٢٠٠٦

– (بكاء الكائنات)، دیوانی شیعری، ٢٠١٠

*** (ئەکرەم پامبوقچی- دکتۆر):**

– ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.

– قۆناغی خوێندنی لە کەرکوك تەواو کردووە.

– ساڵی (١٩٦٨) چووەتە تورکیاو ماجستێرو دکتۆرای لەوێ تەواو کردووە لە زانکۆی (ئەغازی) دەربارەی مێژووی ئیسلامی.

– ساڵی (١٩٦٨)ەوە بایەخی بە شیعرو ئەدەب داوەو چیرۆك و شیعری لە گۆڤاری (الأخاء)و گەلێك گۆڤاری تر بڵاوکردووەتەوە.

– لە دەستەی نووسەرانی گۆڤار کەرکوك بوو لە تورکیا بە زمانی تورکی.

– ساڵی (٢٠٠٥) کۆچی دوایی کردووە.

– بەرهەمەکانی:

– (الاتراك الاوائل في بغداد)، بە زمانی تورکی، ساڵی ١٩٩٤.

– (یا شباب التركمان)، بە زمانی عەرەبی و تورکی، ساڵی ٢٠٠٤.

– (العشائر التركمانية في العراق)، بە هاوبەشی حەبیب هورمزی، بە زمانی عەرەبی، ساڵی ٢٠٠٤.

*** (ئەکرەم دووزلوو):**

– ناوی (ئەکرەم جەعفەر سەعدوڵڵا حەیات کوڕی سەفەر کوڕی حەبیب کوڕی محەمەد)ە.

– ساڵی (١٩٣٣) لە خورماتوو لەدایکبووە.

– ساڵی (١٩٤٤) سەرەتایی و لە ساڵی (١٩٤٩) ناوەندی تەواو کردووە، بەردەوام بووە لە خوێندن تا ساڵی (١٩٥٤).

– لە ماوەی ژیانیدا تووشی گەلێك گرتن و بەندکردن بووە.

– لە بواری مۆسیقاو مەقامی تورکمانیدا دەورێکی باڵای بینیوە.

– گەلێك رێزلێنان و خەڵات کراوە لەلایەن کەسایەتی و لایەنی پەیوەندیدار لەکەرکوك و کوردستان و دەرەوەی عێراق.

*** ( ئەکرەم سابیر کەرکوکی ):**

- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دیوانێکی شیعری چاپکراوی هەیە بە زمانی عەرەبی.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای ساڵانەی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی ئەلتەئمیم بۆ هونەری نوێ.

*** ( ئەمجەد شاکەلی ):-**

- ناوی ئەمجەد محەمەد سلێمان سەعید شاکەلییە.
- ساڵی ١٩٤٩ لە کەلار لەدایکبووە.
- ساڵانی ١٩٧١-١٩٧٢ کۆلیژی ئابووری و کارگێڕیی زانکۆی بەغدای تەواو کردووە.
- لەنێوان ساڵانی ١٩٧٤- ١٩٧٥ دامەزراوە لە بەڕێوەبەرایەتی ئاماری کەرکوك و لەدواییدا گوازراوەتەوە بۆ هەولێر و سلێمانی.
- لەنێوان ساڵانی ١٩٧٦-١٩٧٧ لەسەر کاری سیاسی زیندانی کراوە.
- ساڵی ١٩٨٠ لە تەراوگە لە ئەورووپا دەژی.
- بەرهەمەکانی:-
- منداڵی کورد و فەرهەنگی کورد، هەندەران، ١٩٨٩.
- زمانی کوردی ئاسنامەو نیشتمانی کوردە، ٢٠١١
- کورد گەلێکی بێ وڵات، وەرگێران، ستۆکهۆڵم،١٩٩٤.
- زێن و خۆناسین لە فارسییەوە، وەرگێران، ١٩٩٧.
- کورد و مەسەلەی کورد، وەرگێران، ٢٠٠٥.
- ئەوەی نابێت بگوترێت دەبێت بگوترێت، ٢٠٠٦.

*** ( ئەمیر خانی زەند ):-**

- ناوی (عەبدوڵئەمیر کوڕی ناسر کوڕی مەنسوور)ە.
- ساڵی (١٨٩٥) لە (لانەوای ماهی دەشت) لەدایکبووە.
- دکتۆرێکی کوردەواری‌و هونەرمەندێکی دەسترەنگین بووە لە هەڵکۆڵین لەسەر مس‌و گەلێك دەستنووسی لێ بەجێماوە، لەلایەن دەزگای ئەمنی جەلەولاوە گیراوە و کتێبەکانیشی دەستی بەسەردا گیراوە و لەناوچوون.
- ساڵی (١٩٨١) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( ئەمین ئەفەندی ):-**

- خەڵکی کەرکوکە، لە شێخەکانی بەرزنجەیە، ڕۆیشتووەتە ئەستانە لە دەوری فەرمانڕەوای سوڵتان سەلیمی سێیەم، لەوێ پێشوزای کراوەو لە ساڵی (١٨٠٧) ڕەوانەی (جروسە) کراوە بۆ ئیرشاد کردن لە دەوڵەتی عوسمانی بۆ کاروبارە ئایینییەکان.
- ساڵی (١٨١٣) کۆچی دوایی کردوو.

*** ( ئەمین باغەوان ):-**

- خاوەنی دەنگێکی تا بڵێی بەرزبوو، دەنگە بەرزەکەی دەبێتە هۆی تێك دان‌و خراپ کردنی ئامێری تۆمارکردن لە بەغدا (لە کۆمپانیای قەوان تۆمارکردن) لەسەر ئەوە دارکاری دەکەن.
- دەڵێن خاوەنی دەنگێك بوو واتا لە (بەر تەکیە) ئەگەر مەقامی بخوێندایە، لە گەڕەکی (قۆریە) گیزەی دەهات.

*** ( ئەمین حەمید ڕەزا - مەلا ئەمین دەلۆیی ):-**

- ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٠ - ١٩٧٥) دەستی هەبووە لە هونەری وێنەکێشاندا، بە تایبەتی لە بواری تابلۆی زەیتیدا، لەو ماوەیەدا بەشداری چالاکی پێشانگای قوتابخانەکانی کردووە.
- ساڵی (١٩٧٩) پێشانگای تایبەتی خۆی لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٠) پێشانگای تایبەتی خۆی لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
- لە دوای قۆناغی ئامادەییەوە دەستی کردووە بە هونەری پەیکەر تاشی.
- ساڵی (١٩٨٣)دا کارگەیەکی دروستی کۆتەڵی لە کەرکوك کردووەتەوە.
- تا ساڵی (٢٠١٢) گەلێك پەیکەری گەورەو گرانبەهای دروست کردووە.

* (ئەمینە خان سەردار):-

- یەكێكە لە ئافرەتە شاعیرەكانی گەرمیان.
- كچی (قادر بەگ كوڕی كەیخەسرەو بەگی جاف)ە برازای (محەمەد پاشای جاف)و خێزانی (بارام بەگ)ە.

* (ئەمین شەوقی):-

- یەكێكە لە شاعیرەكانی ناوچەی گەرمیانو گەلێك پاشماوەی شیعری بە جێماوە كە دەماو دەم لەلایەن خەڵكییەوە باس دەكرێت.

* (ئەمین شوان):-

- لە شاری كەركوك لە ساڵی (١٩٤٣) لەدایكبووە.
- دەرچووی كۆلێژی ئاداب، بەشی زمانی ئینگلیزی.
- فەرمانبەربووە لە هەر یەكە لە (وەزارەتی كارووباری باكوور، دار التضامن للطباعة والنشر الكردية، دار الثقافة والنشر الكردية، ئاودێری كەركوك، پارێزگای كەركوك).
- گەلێك بڵاوكراوەی هەیە لە گۆڤارو ڕۆژنامەكانی كوردی وعەرەبیدا وگەلێك وەرگێڕانی هەیە لە زمانی ئینگلیزیەوە بۆ سەر كوردی.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (مذكرات فيداني اسير)، ١٩٧٦.
- (شيء عن تأريخ الجيش الإيراني)، لە فارسییەوە وەرگێڕاوە، ١٩٧٧.
- (چارلی چاپلن مێژووی ژیانم)، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٧٩.
- (بەفری كلیما نجارۆ)، هەمەنگوای، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٩٠.
- (كوردو كوردستان)، ئەرشاك سافرستیان، وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (تۆپەكە، ڕۆمان، فورستەر)، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (چەردە باسێك لەبارەی كوردانەوە)، میهردا ئێزەدی، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- (دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، ئامادەیە بۆ چاپ.

* (ئەمین فەیزە):

- شاعیر لە ساڵی (١٨٩٠) لە گوندی قوشقایە لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٥٥) لە دێی تۆبزاوای حوسێن كۆچی دوایی كردووە.
- یەكێكە لە شاعیرەكانی ناوچەی گەرمیان.

* (ئەمین قیردار):

- (ئەمین كوڕی محەمەد جەمیل كوڕی مستەفا قیردار)ە.
- ساڵی (١٩٠٠) لە كەركوك لەدایكبووە.
- قوتابخانەی ئامادەیی لە ئەستەمبوڵ تەواو كردووە.
- كۆلێژی یاسای لە بەغدا تەواو كردووە.
- لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٥) بووەتە بەڕێوەبەری مەركەزی ناحیەی كەركوك.
- قائیمقام بووە لە قەزای داقوق و كفری.
- ساڵی (١٩٤٧) هەڵبژێردراوە بە نائیبی كەركوك.
- لە نیسانی ساڵی (١٩٤٩) بووەتە سەرۆكی (تسوية حقوق الاراضي) لە كەركوك.
- ساڵانی (١٩٥٣)، حوزەیرانی (١٩٥٤)، ئەیلولی ساڵی (١٩٥٤-١٩٥٨) هەڵبژێردراوە بە نائیبی كەركوك.
- لە (٣١)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٥٨) كۆچی دووای كردووە.

* ئەمیرە بیت شمونیل:-

ساڵی (١٩٦٠) لە كەركوك لە دایك بووە-
- سەرەتایی لە (عەرەفە)و ناوەندی لە (سەریانی تێكەڵاو)و ئامادەیی لە (جمهوری كچان) تەواو كردووە
-پەیمانگای تەكنەلۆژیایی بەشی رووبەر لە زانكۆی بەغدا تەواو كردووە
- بەشداری چالاكییەكانی یانەی (ڕۆشنبیری ئاشوری) كردووە پێش هەڵوەشانەوەی لەلایەن بەعسەوە.
- ساڵی (١٩٨٠- ١٩٨٥) كاری كردووە لە ڕووپێوی لە (مصلحه مشروع ری كركوك).
- ساڵی (١٩٨٤)ەوە كەركوكی بەجێهێشتووە.
- ساڵی (١٩٨٥) ڕژێمی بەعس براكەی لە سێدارەداوە بەناوی (یوسف تۆما) لەگەڵ كوڕی پوری (یۆخنا ئیشۆ).
- هەموو كارەكانی لە كەركوك قەدەغە كراوەو گوازراوەتەوە بۆ (تكریت)، كە ماوەی دە مانگی خایاندووە.
- ساڵی (١٩٨٦) حكومەتی بەعس باوكی گرتووە (تۆما هورمز ئیشۆ) تا بۆ ئەوەی عێراق جێ بهێڵن، بۆیە دوای ماوەیەك لە ئەمساد لە دوایدا لە كەنەدا گیرساونەتەوە.

- بۆتە شاعیرو نووسەر لە ڕۆژنامەی (ئیماما) لە کەنەدا.
- بەشداری دامەزراندنی کۆمەڵەی خێزانە ئاسورییەکانی کردووە لە کەنەدا.
- بەشداری دامەزراندنی ڕۆژنامەی (نەینەوای) کردووە.
- بەشداری دامەزراندنی تیپی (دیجلە بۆ نواندن) کردووە.
- گەلێك شانۆ نامەی نووسیووە وەکو (القادم الجدید)و (سفینة بابل الفضائیة)
- بەشداری تیپی (گەلگامشی بۆ نواندن) لە شیکاغۆ کردووە لە شانۆی (سفینة بابل الفضائیة)

*** ئەمین کێخوا ڕەشید - مامە پیرە:-**

- ناوی تەواوی (حاجی ئەمین) کوڕی (کوێخا ڕەشید) کوڕی (فەقێ سەعید) کوڕی (کوێخا بەکر)ە.
- ساڵی (١٩١١) لە بنەماڵەی (بێلانسە) لە گوندی (گولدەرەی پاشتەپە)ی دەڤەری هۆزی (بیبانی) سەر بەناحیەی (پردێ) سەر بە لیوای کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لەگەل لە دایك بوونی دایکی کە ناوی (فاتیمەی محێدین) بووە کۆچی دوایی دەکات، پاش ئەوە نەنکی (دایکی دایکی) کە ناوی (ئایشە عەلی) بووە بە هاوکاری کوڕەکەی (ئۆمەر محیەدین)وە دەکاتە خاڵۆی (مامە پیرە) بەخێوی دەکەن.
- لە تەمەنی شەش حەوت ساڵێدا لەلای (ئایشە عەلی) نەنکی کە ژنێکی قورئان خۆێن بووە لەگەڵ چەند منداڵێکی گوندەکەی قورئانی پیرۆز خەتم دەکات.
- وەکو هەر منداڵێکی تری لادێی دەست دەکات بە شوانی و بەرخەوان.
- ساڵی (١٩٣٣) لە زیندانی موسڵ زیندانی دەبێ.
- ساڵی (١٩٣٧) بەهۆی کێشەیەکی کۆمەڵایەتییەوە دووبارە دەستگیر دەکرێ و ئەم جارە لە دادگا فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەردەکرێت، بەڵام بەهۆی پلەو پایەی کۆمەڵایەتی بنەماڵەکەی، بەهاوکاری (شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما) و لەسەر داواکاری (کوێخا ڕەشید گولدەرە)ی باوکی مامە پیرە یەکێك لەمامەکانی شاعیر کە ناوی (کوێخا نوری گولدەرە)بووە سەردانی مەلیکی کوردستان (شێخ مەحمودی حەفید) دەکات و ئەویش دلفراوانانە داوا لە مەلیکی عێراق (مەلیك غازی) دەکات کە حوکمی لە سێدارەدانی هەڵبوشێننەوە، پاشان مەلیك غازی حوکمی لە سێدارەدانەکە هەلدەوەشێنێتەوە، بەڵام بۆ ماوەی ٨ ساڵ حوکم دەدرێ.
- ئەو (٨) ساڵەی زیندانیە لە شاری کەرکوك و دەڤەری حەوێجە بەسەر دەبات.
- یەکێك بووە لە زیندانیانەی کە لە پرۆژەی ئاوی حەوێجە بێگاری پێکراوە.
- لە زینداندا خۆی فێری خوێندنەوە و نووسینی کوردی دەکات.
- لەپاش ئازادبونی کوێخا نوری گولدەرە زۆر دلسۆزانە دەیگرێتەوە خۆی و سەرقاڵی ماڵی ڕەنجبەری و فەلاحەتی دەبێ.
- لەسەرەتای ساڵانی پەنجاکانی سەدەی رابردوودا لەگەڵ (گولبەهار سابیر حەساری) ژیانی هاوسەری پێکهێناوە، لە ژیانی هاوسەریدا چوار کوڕو چوار کچی بووە.
- لە ساڵانی پێش هەلگیرسانی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ هەمیشە شەوان لە دیوەخانی گوندەکەی باسی لایەنە باشەکانی کۆماری بۆ خەلك کردووە بۆ ئەوەی وریایان بکاتەوە، هەروەها زۆر جاریش کتێبی (الف لیلەو لیلە)ی خوێندۆتەوەو کردویەتی بە کوردی.
- ساڵی (١٩٧٦) سەردانی ماڵی خودا دەکات.
- ساڵی (١٩٨٧) بە هۆی ڕاگوێزانی خەلك لە دەڤەرەکەیان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ئاواری ئۆردوگای بنەسلاوە دەبێ.
- ساڵی (١٩٨٨)وە دەست دەکات بە دانانی هۆنراوە تا دوا تەمەنی لە سەری بەردەوام دەبێ و نازناوی (مامە پیرەی لێ قەوماو) بۆ خۆی دادەنێ.
- لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)ی گەلی کوردستانەوە لە زۆربەی کۆڕو کۆمەڵ و بۆنەکاندا هۆنراوەکانی دەخوێندەوە. زۆر ئارەزووی لە شیعرەکانی قانع و بێکەس و هەژارو ئەحمەد موختار جاف و تایەر بەگی جاف بووە.
- هەموو هۆنراوەکانی لەلایەن یەکێك لە خزمەکانی بەناوی (مامۆستا عەبدوڵڵا حاجی خالید) نووسراوەتەوە کە خۆی زۆربەی ڕۆژەکان دەچوو بۆ ماڵیان و بۆی دەوت و ئەویش دلسۆزانە بۆی دەنووسیەوە.

لە شەوی (١٦- ١٧ ئەیلوولی ساڵی ١٩٩٤) کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی بنەسلاوە بە خاك نێژراوە

*** ئەندراوس سەنا:-**

- ساڵی (١٩٢٠) لە (ئەرادن) لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠١٣) لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمەکانی:-
- إستشهاد البطريرك شمعون برصباعي في القرن الرابع الميلادي في عهد سابور-الثاني الفارسي، شانۆ، ١٩٤٧
- الأساليب الكتابية لمار أفرام السرياني، بەغدا ١٩٤٧
- إهتدا مار جرجيس.
- تأريخ المسيحية في كركوك وباجرمي، بغداد، ٢٠٠٦
- تناظر الحروف العربية والسريانية في الصور والصوت، ١٩٨٢.
- الفكر المسيحي في المجمع الفاتيكان الثاني، موسل ١٩٦٣
- المجمع المسكوني الثاني، موسل ١٩٦٦
- ميلاد المسيح
- نشوء التنقيط والتحريك في السريانية، ١٩٨٤.

*** (ئەنومر بابا ئۆغلو):-**

- ساڵی (١٩٤٢) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- گەلێك دیوانی شیعری هەیە.

* (ئەنوەر ئەحمەد شاکەلی):-

- ناوی چیرۆك نووس (ئەنوەر کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ سەعید شاکەلی)یە.
- ساڵی (١٩٥١) لە شاکەل لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لە پێشەنگەکانی چیرۆکی نوێی کوردیو ئاشنایەتی هەبووە لەگەڵ گرووپی شیعری کفری لە بواری چیرۆك نووسیندا.
- لە (١٧)ی تەمموزی ساڵی (١٩٧٥)دا بە ڕووداوی ئۆتۆمبیل لە چالاکییەکی پێشمەرگایەتیدا کۆچی دوایی کردووە.

* (ئەنوەر حەسەن موسا):-

- ساڵی (١٩٤٧) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای ئامادەکردنی مامۆستایان بووە.
- گەلێك شیعرو چیرۆکی کوردی وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی عەرەبی بە تایبەتی دیوانی بورهان بەرزنجی بە ناوی (اوراق الشجر)، هەروەها ڕۆمانی (المدینة الحبلی بالهم)ی ڕۆماننووس (سالار ئیسماعیل سەمین)ی وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی عەرەبی.
- ماوەیەك بەڕێوەبەری نووسین بووە لە بەشی عەرەبی ڕۆژنامەی (ئاق سو).
- گەلێك وەرگێڕانو لێکۆڵینەوەی ئەدەبیو سیاسی لە گۆڤارو ڕۆژنامە ناوخۆییەکان بڵاوکردووەتەوە.
- کتێبێکی هەیە بە ناونیشانی (ازامیل الشعر تحفر في ذاکرة البراءة).
- ئەم بەرهەمانەی خوارەوەی لە تورکییەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی عەرەبی:
- (عصافیر الجنة)، فەوزی ئەکرەم تەرزی، شیعر.
- (قارة الأحلام)، فەوزی ئەکرەم تەرزی، شیعر.
- (انغام قلبي)، سامی یوسف توتونچو، شیعر.
- (الخبز اولا)، نووسەری تورکی ئۆرهان کەماڵ، چیرۆکی دەستنووس.
- (باب الورد) جاسم فەرەج، شیعر، دەستنووس.

* ئەنوەر حەسەن:-

- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٤)ی گەڕەکی سەید سەروەری شاری کەرکوك.
- تاقی مندالیو قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتاییو ناوەندیی لە کوچەی بن کۆلانی ئەو گەڕەکە بردووەتە سەرو پاش قۆناغی خوێندنی ناوەندی، ماڵیان گواستۆتەوە بۆ گەڕەکی ئازادی بەبنەچە لە خێزانێکی دەزیی دەشتی هەولێرە کە لەوێوە کۆچی کردووەو لە کەرکوك گیرساوەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٣) پەیوەندی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. بەهۆی کەم دەرامەتییەوە، کەرکوکی بەجێهێشتو لە شاری بەغدا کرێکاریی دەکرد.
- لەرووی ڕێکخراوەییشەوە بۆ بەغدا گوێزرایەوەو لەوێ لە شانەیەکی سێ کەسیدا ڕێکخرا.
- لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٥)دا بەهۆی ئاشکرابوونی ئەندامێکی شانەکەوە، گیراو بۆ ئاشکراکردنی ناوی ئەندامی سێیەمی شانەکەوە خرایە ژێر ئەشکەنجەوە، بەڵام ئەو خۆی ڕاگرتو هیچ زانیارییەکی لەم بارەیەوە بە دەزگا ئەمنییەکان نەدا، لەدواییشدا بەتۆمەتی شاردنەوەی زانیاری بەحەوت ساڵ زیندانی حوکم درا.
- ساڵی (١٩٧٩) بەر لێبوردنی گشتی کەوتو ئازاد کرا.
- دوای ئازادبوونی بەماوەیەکی کەم، پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردو لە هەرێمی دووی کەرکوك ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد.
- ساڵی (١٩٨٠) لەگەڵ هەر یەك لە شاخەوان عەباس، ئاوات قارەمانی، دانا ئەحمەد مەجید، ئەسکەندەر حاجی ئاغا ئاکرەیی، سەلاح چاوشین، شۆرش ئیسماعیل، حامید حاجی غالی، ڕەفیق سەبریو ئازاد حەمە غەریب بەشدار بووە لە خولێکی عەسکەری لە لوبنان کەبەرەی دیموکراتی ڕزگاریخوازی فەلەستین بەرابەریەتیی نایف حەواتمە بۆ کادیرە عەسکەرییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سازی کردبوو. ئەم خولە ڕۆڵێکی دیاری لە بەرزکردنەوەی ئاستی هەڵسووڕانی پێشمەرگانەی کادیرە بەشداربووەکاندا هەبوو. ماوەیەکی کەم پاش گەڕانەوەی لە لوبنان، بەسوودوەرگرتن لەو زانیاریو شارەزاییەی لە لوبنان بەدەستی هێنابوو، سەرپەرشتیی خولێکی عەسکەریی بۆ هێزی پێشمەرگە کرد لە مالیمۆس لە نزیك گوندی کانی زەرد. لە ڕێگەی ئەم خولەوە زانیاریو شارەزاییەکەی بۆ کادیرە عەسکەرییەکانی هێزی پێشمەرگە گواستەوە.
- ساڵی (١٩٨١) بەشداریی لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا کردو هەر ئەو ساڵە کرایە فەرماندەی هەرێمی دووی کەرکوك.
- لە ٥ی ئازاری ساڵی (١٩٨٣)دا لە شەڕێکدا لە گوندی قازانی نزیك تاسلوجەی سلێمانی، پاش بەرگرییەك کە ١١ سەعاتی خایاندو تێیدا هێزەکانی عێراق زیاد لە ٣٠ کەسیان لێ کوژراو ژمارەیەکی زۆریان لێ بریندار کرا، لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگەدا شەهید کرا.

* (ئەنوەر زۆراب):-

- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٠)ی کەرکوك.
- یەکێك بوو لەلایەنگرانی بیری چەپی کوردستانی لەکاتی شۆڕشی ئەیلولدا لە سەرەتای حەفتاکاندا پەیوەندیی بە کۆمەڵەی مارکسی - لینینی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٧٤) پاش پێکهێنانی کۆمیتەی ئەستێرەی سوور بەسەرکردایەتیی جەعفەر عەبدولواحید، کرایە ئەندامی کۆمیتەو لێپرسراوی ڕێکخستنی بەغداو خانەقین.
- ئەم کۆمیتەیە بەدرێژایی ساڵی (١٩٧٤) وەك کۆمیتەیەکی سەرپەرشتیاری ڕێکخستنەکان هەڵسووکەوتی دەکرد، بەڵام لە ساڵی (١٩٧٥)دا، پاش هەرەسهێنانی شۆڕش،

بەشێوەیەکی کاتی هەموو دەسەڵاتێکی پێ بەخشراو بۆ ماوەیەك وەك کۆمیتەی سەرکردایەتی چالاکیی نواند.
- لە سەردەمی چڕکردنەوەی هەوڵەکاندا بۆ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار، زۆراب چەند جارێك چوو بۆ سووریا بۆ دروستکردنی کۆنتاکت و گۆڕینەوەی بیروڕا لەگەڵ دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی نیشتمانی کوردستاندا. لەم سەروبەندەدا نامەو نامەکاریی نێوان دەستەی دامەزرێنەرو سەرکردایەتیی کۆمەڵە لە ڕێی ئەنوەر زۆرابەوە بەڕێوە دەچوو. ئەو پەیوەندییەش لە ڕێگەی کادیرێکی بزووتنەوەی سۆسیالیستی عەرەبەوە کە ناوی وەلید زەنوون بوو، هەڵدەسووڕا. دەستگیرکردنی کادیرەکەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی عەرەب لەلایەن دەزگای ئاسایشی عێراقەوە، بووە مایەی ئاشکرابوون و دەستگیرکردنی ئەنوەر زۆراب لە ساڵی (١٩٧٥).
- لە کاتی لێکۆڵینەوەدا بەرگەی ئەشکەنجەی گرت و هیچ نهێنییەکی نەدرکاند، بەڵام کۆمەڵێك دیکۆمێنت لە ماڵەکەی گیران کە بوونە مایەی زیانگەیاندن بە ڕێکخستنە نهێنییەکان.
- لە ٢١ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٦) لە زیندانی ئەبو غرێب لەگەڵ شەهاب شێخ نوری و جەعفەر عەبدولواحید لە سێدارە درا.

* ( ئەنوەر غەسانی ):

- ساڵی (١٩٣٥) لە عەمارە لەدایکبووە، هەر لە تەمەنی چوار ساڵییەوە هاتووەتە کەرکوك و سەرەتاکانی قوتابخانەی لەم شارەدا تەواو کردووە.
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی تەواو کردووەو بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەی (الشرقیة) لە ساڵی (١٩٥٩-١٩٦١).
- چووەتە بەغدا بۆ تەواو کردنی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی، بەڵام بەهۆی کودەتاکەی ساڵی (١٩٦٣) دەرکراوەو تەواوی نەکردووە، لە دواییدا چووەتە ئەڵمانیا و دکتۆراو ماجستێری لە ڕاگەیاندن هێناوە.
- یەکێکە لە دامەزرێنەری (کۆمەڵەی کەرکوك) لە پەنجاکاندا.

* ( ئەنوەر مەحمود سامی ):-

- ناوی (ئەنوەر غەسانی)یەو لە ساڵی (١٩٣٥) لە عەمارە لەدایکبووەو لە تەمەنی چوار ساڵییەوە خێزانەکەیان هاتوونە کەرکوك و قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- دەرچووی پەیمانگای هونەر جوانەکانی بەغدایەو بووەتە مامۆستا لە پەروەردەی کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٥٩-١٩٦١).
- یەکێکە لە ئەندامانی (جماعة کرکوك الأدبیة).
- لە ئەڵمانیا ماجستێری بەدەستهێناوە لە بواری ڕۆژنامەگەریدا.
- گەلێك دیوانی شیعری و کتێبی تری هەیە.
- ساڵی (٢٠٠٩) کۆچی دوایی کردووە.

* ( ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان ):-

- ساڵی (١٩٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکەم بەشداری لە ساڵی (١٩٥٧) بوو لەسەر شانۆ کە بەشداری تیپی هونەری شانۆی کرد لەگەڵ عیسمەت نەجاتی هورمزی.
- هەروەها بەشداری دروستکردنی تیپی تەمسیلی کەرکوکی کردووە.
- ساڵی (١٩٦١) بەشداری کردووە لە چالاکی تەمسیلی قوتابخانەکان.

* ( مەلا ئەورەحمان ):-

- ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە چلەکاندا کرێکاری کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بووە بەهۆی ڕاپەڕینەکەی گاوورباغی لە ساڵی (١٩٤٧)دا فەسڵ دەکرێت.
- ئاشنایەتی لەگەڵ محەمەد ئەمینی عەسریدا هەبووە.
- لە سەرەتادا کتێبی فرۆشتووە لەسەر شۆستە لە شەقامی ئەتڵەس، بەڵام لە دواییدا دوکانێك بەرامبەر چاپخانەی مەجیدیە دەگرێت و دەیکات بە کتێبخانە.
- بۆ هێنانی کتێب سەردانی چاپخانەی (ژین) لە سلێمانی و چاپخانەی (کوردستان) لە هەولێرو لە بەغدا لە کتێبخانەی الهاشمي والتحرير والنهضة کردووە.
- زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی و ئینگلیزی بە باش زانیوە.
- ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووەو لە گردی شێخ فەتاح بە خاك سپێردراوە.

* ( ئەیاد چەلەبی ):

- ساڵی (١٩٥٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ناوەندی غەربییەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٩)ەوە چووەتە پاریس لە بەشی ڕەسم دەخوێنێت لە ئەکادیمیایی هونەرە جوانەکان لە (ئەکس بروفانس) لە خوارووی فەرەنسا.
- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك.

* ( ئەیوب ئەحمەد ):-

- ساڵی (١٩٥١) لە گەرەکی بولاق لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێکە لەو نووسەرانەی کە بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی لێکۆڵینەوەی بڵاوکردووە.

* (ئەیوب شەریف):-

- ساڵی (١٩٥٧)دا لە کەرکوك لە گەڕەکی تەپەی مەلا عەبدوڵلا لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٩)دا زانکۆی تەکنۆلۆژیای تەواو کردووە.
- ماوەیەك بەڕێوەبەری ئەشغاڵی چەمچەماڵ بووە.
- ساڵی (١٩٧٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی ئاری بابان و گارا ڕەسوڵی کردووە.
- بەشداری فێستیڤاڵی یەکەم و دووەمی زانکۆکانی کردووە و بەشداری پێشانگاکانی زانکۆی تەکنۆلۆژیای کردووە لە ساڵانی (١٩٧٦-١٩٧٧-١٩٧٨).
- ساڵی (١٩٨٣)دا بەشداری پێشانگای یەکەمی شێوەکارانی کەرکەکوکی کردووە لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.
- ماوەیەکی دیار ئەندازیار بووە لە کەرکوك.
- لە (١٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٨) بە کارەساتی وەرگەرانی ئۆتۆمبێل لەسەر ڕێگای کووت کۆچی دوایی کردووە.

* (نورخان حەسەن حوسێن - دکتۆر نورخان حەسەن حوسێن):-

- ساڵی ١٩٤٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- کرکوك قالەستین، داستانێکی شیعرییە، ٢٠٠٤.
- نوجی ئیلاجیلان، شیعر ٢٠٠٥.
- کرکوکتەن سلاملار، شیعر، ٢٠٠٥.
- ئالەودەن خوریاتلر، شیعر ٢٠٠٥
- خورما خانی، شیعر، ٢٠٠٥
- باشاق تارلالادی، شیعر ٢٠٠٥
- الله کوزهل ادلاری، شیعر، ٢٠٠٥
- بیلمنجلی تانسیون، شیعر کرکوك، ٢٠٠٦
- ایتلرین کولکە سیندە، شیعر ٢٠٠٨
- ایج بمبە دویغویشیل، شیعر ٢٠٠٨.
- KURANI KERIMDE RISIKAYETLERI 2009
- KURANI KERIMDE DUNYDARLIK، 2009
- KURANI KERIMIN YERE BAKISI2010

* (نورخان محەمەد عەلی):

- ساڵی (١٩٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- نووسەر و وەرگێر بووە.
- سەرەتایی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە لە دواییدا ڕۆیشتووە بۆ ئەستەمبوڵ و لەوێ پزیشکی خوێندووە و لە دواییدا چووەتە ئەندازیاری و لە ساڵی (١٩٦٣) تەواوی کردووە لەدوایدا گەڕاوەتەوە وڵات و لە ساڵی (١٩٦٦) دامەزراوە لە وەزارەتی نیشتەجێ کردن و ئاوەدان کردنەوە.

- گەلێك کتێب و لێکۆڵینەوە و وەرگێڕانی هەیە لە بوارەکانی زانستدا وەکو:
- (الإنسان ومعجزة الكون)، ١٩٨٤.
- (اسرار الذرة)، وەرگێڕان، ١٩٨٦.
- (اسرار المادة)، وەرگێڕان، ١٩٨٦.
- (الانفجار الكبير او مولد الحب)، وەرگێڕان، ١٩٨٦.
- (السلطان عبد الحميد الثاني، حياته واحداث مهمة)، ١٩٨٧.
- (تهافت نظرية دارون في التطور امام العلم الحديث)، چاپی یەکەم ١٩٨٨، چاپی دووەم ١٩٩٧.
- (موقف الدين من العلم)، وەرگێڕان، ١٩٨٨.
- (نظرية التطور ليست ثابتة)، وەرگێڕان، ١٩٨٦.
- تراثيم روح واشجان القلب، وەرگێڕان، ٢٠٠٤
- حقيقة الخلق ونظرية التطور، وەرگێڕان، ٢٠٠٤.
- الدولة العثمانية المجهولة، وەرگێڕان.
- من صفات الانبياء.
- الرسول (ص) قائداً.
- روائع من التأريخ العثماني.
- سعيد النورسي، نظرة عامة عن حياته.
- ما وراء الاستار.
- حوار بين المؤمن والكافر.
- الموازين، اضواء على الطريق.
- سعيد النورسي لدى المفكر الغرب.
- معجزة خلق الإنسان.
- عظمة الفطنة في نبوة محمد صلى الله عليه وسلم، وەرگێڕان.
- فن التربية وحل المعضلات، وەرگێڕان.
- العصمة النبوية، وەرگێڕان.
- قصة حزب الرفاء.
- اضواء قرآنية.
- الفرصة الأخيرة، وەرگێڕان.
- النبي المرتقب، وەرگێڕان.
- البابا الذي رجم حتى الموت.
- حوار حول القضاء والقدر، وەرگێڕان.
- مناقضة علم الفيزياء، نظرية التطور.
- اسئلة العصر المحيرة، وەرگێڕان.
- القرآن المذهل، وەرگێڕان.

* (ئیبتیسام عەبدوڵلا):

- ساڵی (١٩٤٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتاکانی خوێندنی لە کەرکوك و موسڵ تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦٤) پەیمانگای مامۆستایانی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- لە بواری ڕۆژنامە و تەلەفیزیۆندا وەکو وەرگێر گەلێك کاری کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (انجيل ديفن)، وەرگێڕان، بەریوت، ١٩٧٠،
- (يوميات المقاومة في اليونان)، وەرگێڕان، بەیروت، ١٩٧٤.

- (فجر نهار وحشي)، ڕۆمان بە زمانی عەرەبی، بەغدا، ١٩٨٥.
- (ممر إلى الليل)، ڕۆمان بە زمانی عەرەبی، بەغدا، ١٩٨٨.
- (مطر اسود مطر احمر)، ڕۆمان بە زمانی عەرەبی، بەغدا، ١٩٩٤.
- (بخور)، کۆمەڵە چیرۆک، بە زمانی عەرەبی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٩٨.
- (ميسو بوتاميا)، ڕۆمان بە زمانی عەرەبی، بەغدا، ٢٠٠١.
- (في انتظار البرابرة)، وەرگێڕان، ڕۆمان، قاهیرە، ٢٠٠٢.

* (ئیبراهیم تاها - دکتۆر ئیبراهیم تاها):-

- ناوی (ئیبراهیم کوڕی تاها حاجی ئەحمەد حەمە سوور)ە کە بنەماڵەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر سوڵتان بەگی جاف.
- ساڵی (١٩٣٢) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندیو ئامادەیی لە کەرکوک تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٤٩) بە پلەی یەکەم ئامادەیی تەواو دەکاتو لە کۆلێژی سەربازی وەردەگیرێت، بەڵام کە دەزانێت ناوی لە کۆلێژی پزیشکی دەرچووە واز لە سەربازی دەهێنێتو لە ساڵی (١٩٥٥) بە سەرکەوتوویی تەواوی دەکات.
- بڕوانامەی (MRCP) و (FRCP) بەدەستهێناوە.
- لە بەریتانیا لە بواری دڵو هەناودا خوێندنی باڵا تەواو دەکات.
- لە (٣٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨) بە نەخۆشی شێرپەنجەی پەنکریاس لە ئوردن کۆچی دوایی کردووە.

* (ئیبراهیم خەلیل سەعید - د. ئیبراهیم خەلیل سەعید):-

- ساڵی ١٩٥٣ لە کەرکوک لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- سيرة القافلي، ٢٠٠٦.
- الطب في كركوك، ٢٠١٠
- كركوك بانوراما التأريخ والإنسان، ٢٠١٢.
- كركوك بانوراما التأريخ والإنسان، ٢٠١٥.

* (ئیبراهیم داقوقلی):-

- ناوی (دکتۆر ئیبراهیم محەمەد خدر)ە.
- ساڵی (١٩٣٤) لە داقوق لەدایکبووە.
- دکتۆرای لە قانونی ڕاگەیاندنن لە زانکۆی ئەنقەرە لە تورکیا بە دەستی هێناوە، بووەتە مامۆستای بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی بەغدا.
- یەکێك لە ئەدیب و نووسەرە تورکمانەکانی شاری کەرکوکو گەلێك کتێبی هەیە لە بوارەکانی وەرگێڕانو ڕاگەیاندندا.
- بەرهەمەکانی:
- (فنون الأدب الشعبي التركماني)، ١٩٦٢.
- (المستدرك على كتاب الاصطلاحات الموسيقية)، ١٩٦٥.
- (قانون الاعلام)، ١٩٦٦.
- (القواعد الأساسية للغة العربية)، ١٩٧٢.
- (النساء الحاكمات في التأريخ)، ١٩٧٣.
- (حلقة دراسية حول آفاق تطوير المرأة العراقية بعد تحررها في اطار التعليم المستمر)، ١٩٨٠.
- (نظرة في اعلام العالم الثالث)، ١٩٨٢.
- (الأدب التركي المعاصر)، ١٩٨٢.
- (القواعد الأساسية للغة التركية)، ١٩٨٤.
- (فلسطين والصهيونية في الصحافة التركية)، ١٩٨٤.
- (الانظمة الاذاعية في العالم)، ١٩٨٥.
- (قانون الاعلام، نظرة جديدة في الدراسات الاعلامية الحديثة)، ١٩٨٦.
- (صورة العرب لدى الاتراك)، ١٩٩٨.
- (اكراد تركيا)، (٢٠٠٨).
- (صورة الاتراك لدى العرب)، ٢٠٠٤.
- (التركمان في العراق، تأريخهم، آدابهم وفنونهم)، ٢٠٠٦.
- (حرية الاعلام سلطة التغيير الديمقراطي في زمن العولمة)، (٢٠٠٨).
- (العلويون أصحاب الدين أم طريقة تصوف أو نظرية سياسية لعصر العولمة)، (٢٠٠٨)، چاپی دووەم ٢٠١٠
- (الأنظمة الإعلامية).
- لە (١٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٨) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئیبراهیم داود ناحوم):-

- دەگەڕێتەوە سەر خێزانێکی جوولەکەی کەرکوك، لە دوایدا کۆچیان کردووە بۆ (بەغدا).
- ساڵی (١٨٨٨)ی زایینی لەدایکبووە.
- خوێندنی لە قوتابخانەی (ئەلبیانس) تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩١٥)دا فەرمانبەربووە لە بانکی عوسمانیو بەردەوام بووە تا خانەنشین کردنی لە ساڵی (١٩٢٩)دا.
- گەلێك قوتابخانەی لە (موسڵ)و (بەسرە)و (کەرکوك)و (ئێران) دروست کردووە.
- هەڵبژێردراوە بەنوێنەری موسڵ لە ساڵی (١٩٣٧) ودووبارە هەڵبژێردراوە لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٩)و تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٣)و ئاداری ساڵی (١٩٤٧) تا

شوباتی ساڵی (١٩٤٨).
– لە (١٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٦٨)دا کۆچی دوایی کردووە.

* (ئیبراهیم سەید ئەحمەد):-

– ساڵی (١٩١٦) لە کەرکوك لەدایکبووەو یەکێکە لە مامۆستا کۆنەکانی کەرکوك‌و تا چلەکانیش لە بواری پەروەردەدا کاری کردووە.
– گەلێك نووسینی لە ڕۆژنامەی (کەرکوك)و (بەشیر) بڵاوکردووتەوە.
– ساڵی (١٩٧٩) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئیبراهیم سەید عەلی):-

– ساڵی (١٩١٨) لە ناوچەی کفری لەدایکبووە.
– شاعیر لە ساڵی (١٩٨٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئیبراهیم عەلی ئەحمەد):-

– ساڵی (١٩٥٩)دا لەکەرکوك لەدایکبووە.
– پەیمانگای هەولێری تەواو کردووە.
– یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك.
– ساڵی (١٩٨٣) بەشداری یەکەم پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.

* (ئیبراهیم کەبابچی):-

– ساڵی (١٩٤٠) لە گەرەکی (موسەڵڵا) لەدایکبووە.
– یەکێکە لەوانەی گەلێك شیعری هەیە بەزمانی تورکمانی.
– لە بەرهەمەکانی: (ظفر بیزم)، بە زمانی تورکی، بەغدا، ١٩٩٦.

* ئیبراهیم قۆریالی:-

– ساڵی ١٩٦٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– بەرهەمەکانی:-
– ادباء عراقیون وإضاءات نقدیة في منجزهم الثقافي، ٢٠١٤.

* (ئیبراهیم مەجید تاڵەبانی):-

– لە شیعرە چاپکراوەکانی:
– (تابلۆی خەم‌و خەندەکان)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٤.
– (سروودی پەپولەکان)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٦.
– (حەسرەتەکانی نامۆیی)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٦.
– (ازاهیر واشواك)، کەرکوك، ٢٠٠٦.

* (ئیبراهیم محەمەد قادر کەرەم بەرزنجی - شێخ ئیبراهیم محەمەد قادر کەرەم بەرزنجی):-

– ناوی شێخ ئیبراهیم کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەبدولکەریمی دووەم بووە.
– ساڵی (١٩٢٠) لە قەڵا میکائیل لە ناحیەی قادر کەرەم لە کەرکوك لەدایکبووە.
– هەر لە سەرەتای ژیانیدا لە بنەماڵەیەکی ئاین پەروەر لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٤٢) بەشی ڕووپێو (مەساح)ی تەواو کردووەو دامەزراوە لە شارۆچکەی مەخمور لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٦-١٩٥٤)، لە ساڵی (١٩٥٤) بووەتە (مفتش مساح).
– ساڵی (١٩٨٨) لە ناحیەی (قادر کەرەم)ەوە هاتووەتە ناوەندی کەرکوك‌و تەکییەکەی لە کەرکوك کردووەتەوە.
– ئەندامی پارتی هیوا بووە.
– لە (٢٤)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (ئیبراهیم بەگ نەفتچی):-

– ناوی (ئیبراهیم بەگ کوڕی حوسێن بەگ نەفتچی زادە)یە.
– ساڵی (١٩٠١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– کۆلێژی یاسای تەواو کردووەو زمانەکانی تورکی‌و عەرەبی‌و کوردی‌و فارسی‌و ئینگلیزی بە باشی زانییووەو شیعری بڵاوکردووەتەوە لە ڕۆژنامەی (کرکوك).
– ساڵی (١٩٦٣) لە ئەستەمبوڵ کۆچی دوایی کردووەو لە کەرکوك بە خاك سپێردراوە.

* ئیبراهیم حەسەن عەزیز داقووقلی:-

– ساڵی ١٩٣٧ لە داقووق لەدایکبووە.
–Atasozlerine Dayanan ibretli Hikayeler، ٢٠١٢
– عراق تورکمانلاری اراسندە سویلەنن خوریات واتاسوزلری، ٢٠١٣

*** ( ئیبراهیم ناشاد ):-**

- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوك لەدایکبووە، کە ناوی (ئیبراهیم جەلال تاها بابان)ە.
- بەرهەمە شیعرییەکانی:
- (خۆری ئازادیو دەستێکی پاك)، چوارینەی شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٤.
- (هەناوە سووتاوەکان)، چیرۆك، (٢٠٠٨).
- لە ڕۆژی (٢٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩) بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

*** ( ئیحسان ئەدهەم ):-**

- ناوی (ئیحسان ئیبراهیم ئەدهەم)ە.
- ساڵی (١٩٣٤) لە کەرکوك لەدایك بوو.
- هەر لە سەرەتاوە بایەخی بە خەتی عەرەبیو وێنەو مۆسیقا داوەو گەلێك لێکۆڵینەوەی خوێندووە لە بواری ڕێساکانی خەتی عەرەبی لەسەر دەستی مامۆستای خەت (ماجد ئەلزوهدی)، کە یەکێك بووە لەو مامۆستایانەی وانەی دەووتەوە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا.
- ساڵی ١٩٦٣ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە بەغدا تەواو کردووەو بڕوانامەی بەدەستهێناوە لە بواری مۆسیقادا.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٦- ١٩٦٨) چووەتە ئەڵمانیا بۆ خوێندن لە بواری هونەریدا لە پەیمانگای باڵای مۆسیقاو هونەری شانۆیی لە شاری (شتۆتکارت) لە ئەڵمانیا.
- دەورێکی باڵای هەبووە لە بواری ووشەو ڕەنگو مۆسیقاکاداو دەوری هەریەکە لە خەملاندنی قوژبنی جوانکارییدا.
- دەورێکی باڵای هەبووە لە ژەنینی فلوت بە شێوەی تاكو کۆ لە گەلێك لە دەزگا ئەکادیمییەکاندا لە ناوەوەو دەرەوەی عێراقدا.

*** ( ئیحسان چەمچەماڵی ):-**

- ساڵی (١٩٧٦) لە گەرەکی (بێ کەس) لەدایکبووە.
- یەکێکە لە گۆرانی بێژە بە تواناکانی ناوچەی گەرمیان.

*** ( ئیحسان سدیق وەسفی ):-**

- ساڵی (١٩٢٣) لە کەرکوك لەدایکبووەو بەشی ئینگلیزی زانکۆی موستەنسریەی تەواو کردووە.
- کتێبێکی چاپکراوی هەیە دەربارەی پەندی پێشینانی تورکمان، لە ئەستەنبول لە ساڵی (١٩٨٥)و (٢٠٠١).
- گەلێك بابەتی کۆمەڵایەتیو فلکلۆری بڵاوکردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

*** ئیحسان فازڵ وەنداوی:-**

- ساڵی ١٩٥٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- تجمع القوميين التركمان، نبذة عن تاريخ التجمع والمؤسسة، ٢٠١٤

*** ( ئیحسان عەبدولحەمید ):-**

- مامۆستاو پەروەردکارێکی دێرینی کەرکوکە.
- ساڵی (١٩٢٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٢) کۆلێژی شەریعەی لە زمانی عەرەبی تەواو کردووەو ماوەیەك مامۆستا بووە لە عێراقو وڵاتی سعودییە.
- یەکێك بووە لەوانەی بەشداری کردووە لە یاداشتی (مذكرة المدرسين الاكراد إلى وزارة المعارف، عام ١٩٥٨، حول مستوى الثقافة في كوردستان خاصة والعراق عامة).
- ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( ئیدریس ئیسماعیل - مەلا ئیدریس ):-**

- ناوی (ئیدریس ئیمساعیل عەزیز داودی)یە.
- ساڵی (١٩٦٧) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەنفال لە ناوچەی گەرمیان گەلێك لێکۆڵینەوەی هەیە.

*** ( ئیسحاق ئەفرایم کەرکوکی ):-**

- دەگەڕێتەوە بۆ خێزانێکی بازرگانی گەورەو لە بنەڕەتدا خەڵکی کەرکوکن.
- لە بەغدا لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٢٤)دا لە (مجلس التأسيس العراقي) بە نوێنەری کەرکوك هەڵبژێردراوە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٢٥-١٩٢٨)و (١٩٣٠-١٩٣٢) دا نوێنەری موسڵ بووە.

*** ( ئیسماعیل ئیبراهیم ):-**

- ساڵی ١٩٤٣ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مختارات من الشعر التركماني العراقي المعاصر)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (اناشيد المياه العذبة)، کۆمەڵێك شیعری بە زمانی تورکمانی، بەغدا، ١٩٨١.
- (ازقة الخوف وقصائد اخرى)، بەغدا، ١٩٩٤.
- برغوث، چیرۆك بە زمانی عەرەبی، ٢٠٠٧
- (عيد جميع الاحزان)، کۆمەڵێك کورتە چیرۆك، بەغدا، ٢٠١٠.
- (ثورة النساء)، کۆمەڵێك کورتە چیرۆك، کەرکوك، ٢٠١٣.

- (هي كل النساء)، کەرکوك، ٢٠١٤.
- (تلك الأيام)، رۆمان، ٢٠١٤.
- (الاستجمام في الموت وقصائد اخر)، کەرکوك، ٢٠١٥.

* (ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ئەدەبی رۆژنامەنووسی کوردی لە بەغدا ١٩٧٠-١٩٧٤)، بەغدا، ٢٠٠٥.
- (شیعرە بڵاوکراوەکانی ئەسیری تا ساڵی ٢٠٠١)، بەرگی یەکەم، (٢٠٠٨).
- (ئەسیری شاعیری نەتەوە خوازی کورد)، کەرکوك، ٢٠٠٦.

* (ئیسماعیل ئیبراهیم غەفور-ئیسماعیل تەرزی):-

- ساڵی (١٩٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ئەندامی تیپی (بيت المقام العراقي) شاری کەرکوکە.
- ساڵی (١٩٨٩) بڕوانامەی خوێندنی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی پێ درا.
- خاوەنی چەندین گۆرانی و مەقامات وبەستەی تورکمانیە لە شارەکەدا.

* (ئیسماعیل ڕەیاشی):-

- ساڵی (١٩٤٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە بواری شیعرو چیرۆکی تورکمانییدا کاری کردووەو گەلێك شیعری بە تورکمانی و عەرەبی هەیە لەوانە:
- (اناشيد المياة العذبة).
- (ازمة الجنون وقصائد اخرى).
- (بنات آوى).

* (ئیسماعیل ڕۆژبەیانی):-

- ناوی (ئیسماعیل عەلی حەسەن)ە.
- ساڵی (١٩٤٢) لە شارە دێی (لەیلان) لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی و خانەی مامۆستایانی لە کەرکوك تەواو کردووە ولە کەرکوك و دەورووبەری بە مامۆستا دامەزراوە.

- لە شەستەکانەوە دێتە جیهانی نووسین و دەست بە نووسینی شیعر دەکات، لە سەرەتادا لەسەر ڕێبازی شیعری کۆن سەروادار شیعر دەهۆنێتەوە.
- لە حەفتاکان لە دوای دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك دەست بەچالاکی و نووسینی دەکات.
- کاتێکیش گۆڤاری گزنگیان دەرکرد پارچە شیعرێکی لەسەر تەوژمی بزووتنەوەی روانگە بڵاوکردەوەو لەوە بەدوا دەستبەرداری شیعری کلاسیکی وسەروادار بوو.
- هەر لەو سەردەمەدا چەند پارچە شیعرێکی خۆی کردە عەرەبی و لەرۆژنامەی (التآخي) بڵاوی کردەوە.
- ساڵی (١٩٩٩) ڕۆمانی (دواپێچی)ی بڵاوکردەوە.
- ساڵی (١٩٧٩) ڕۆمانی (تازە)ی بڵاوکردووەتەوە.
- شەمشەکوێرە (کۆمەڵێك بەرهەم بۆ منداڵان)، ١٩٨٩.
- دەستنووسێکی (٥٠٠) لاپەڕەی دەربارەی بە راووردی ئەفسانەی جیهان وئەفسانەی کوردی بە جێهێشتووە چاوەڕێی چاپە.
- دەستنووسە داستانێکی قارەمانێتی بەناوی (حوسێنی دلبەری) هۆنیوەتەوە.
- لە (٢٩)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٢) لە ئاکامی نەشتەرگەرییەکی سەر نەکەوتوو کۆچی دوایی کرد.

* (ئیسماعیل عەلی مەحموود):-

- ساڵی (١٩٥٧) لە دێی (مەلحە)ی سەر بە ناوچەی دووبز لەدایکبووە.
- خوێندنی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- کۆلیژی راگەیاندنی زانکۆی بەغدای تەواو کردووە.
- لە رۆژنامەکانی هاوکاریو خەباتو برایەتیو بارش کاری کردووەو لێکۆڵینەوەی بڵاوکردووەتەوە.

* (ئیسماعیل نەقاش):-

- ساڵی (١٩٦٨) لە گەرەکی (تسن) لەدایکبووە.
- یەکێکە لە کەمان ژەنەکانی کەرکوك بوو.
- یەکەم بەشداری لە ساڵی (١٩٨٢) لە ئاهەنگێکدا بووە بە (کەمان) لەگەڵ گۆرانی بێژ (حوسێن عەلی).

* (ئینجە ئاغا گەلاڵی):-

- شاعیرێکی کوردەو لە ناوچەی گەرمیان بە ناوبانگ بووە.
- ساڵی (١٩١٤)دا لە ئێران کۆچی دوایی کردووە.

* ئیسماعیل هەنارەیی.

- ناوی ئیسماعیل حوسێن نەجمە.
- ساڵی (١٩٨١) لە گوندی هەنارەی ناوچەی جەباری لە دایکبووە.
- ساڵی (٢٠١٤- ٢٠١٥) کۆلێژی یاسای تەواو کردووە.
- چەندین نووسینو وتارو وەرگێرانی لە زمانی عەرەبییەوە لە زۆربەی گۆڤارو رۆژنامەکانی کوردستان بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- ئەنفال دوای چارەکە سەدەیەك
- رووناکییەکانی نێو شەوە زەنگ، ئەو منداڵانەی لە زیندانی ئەنفال لە دایکبوون.
- تاقانەکانی ئەنفال
- وانەی بەساڵاچوویەك، وەرگێڕانی چیرۆك لە عەرەبییەوە.
- تاقانەکانی جینۆساید لە کوردستان، ٢٠١٦.

ئاوات محەمەد ئەمین
ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك
تاکو ئێستاش بەردەوامە لە پۆستەکەی

* مەلا ئەورەحمانی وەلی:-
- ساڵی ١١٥٦ی کۆچی لە کفری لەدایکبووە. هەر لەو شارەش کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە ناودارەکانی گەرمیان.

* ئەحمەد تەرەزان:-
- ساڵی ١٩٣٥ لەدایکبووە
- ساڵی ١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێك بووە لە یاریزانەکانی کەرکوك کە بەناوبانگ بوو لە لەشجوانی و هێزهەڵگرتن.

* مەلا ئەحمەدی مەلا حەکیم:-
- یەکێکە لە زانا ئاینییەکان و سەرۆکی یەکێتی زانایانی (رئیس علماء)ی شاری کەرکوك بوو.

ئازاد عەبدولمەجید غەفار – ئازاد هەورامی

ئەحمەد تەقی و ڕەفیق حیلمی و فەتاح بەگی ئەمین عەتار

ئەحمەد کەرکوکلی لەگەڵ کۆمەڵێك هونەرمەند

ئەحمەد محەمەد حەمە ئەمین

مەلا ئازاد خورشید

ئیسماعیل بەربەر

ئیبراهیم شاتەری

ئارام کۆنترین سەرتاشی شاری کەرکوك

ئەحمەد بەگی جاف

* د. ئاوات ئەسعەدی:-
- ساڵی ١٩٦٥ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی زانستی سیاسی و ڕۆژنامەوانی تەواو کردووە و دکتۆرای لە زانکۆی (منستر) لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیا بەدەستهێناوە.
- ساڵی ٢٠٠٧ کتێبێکی بە زمانی ئەڵمانی بە چاپ گەیاندووە بەناونیشانی (پرسی کوردستانی-عێراقی ڕێگایەك بۆ ئۆتۆنۆمی هەر لە شەڕی جیهانی یەکەمەوە لە بەرلین.
- پەیوەندی عێراق و ئێران لە ساڵی ٢٠١٤
- العراق الجغرافي مطالعات وافية في الأدب الجغرافي العربي الإسلامي، دار الفارابي، ٢٠١٨.

* ئەحمەد عەبدولکەریم عەلی:-

- ساڵی ١٩٠٨ لە قادر کەرەم لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە کۆلێژی سەربازی ڕۆستەمییە لە بەغدا دەرچووە لە خولی (٧) لە ساڵی ١٩٣٠ بەناونیشانی (المشاة).
- ساڵی ١٩٦٤ خانەنشین کراوە.
- ساڵی ١٩٧٤ کۆچی دوایی کردووە.
- چەندان پلەی سەربازی بینیوە و چەند جارێك گیراوە و لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسم سەرفراز کراوە و بووە بە نوێنەری خودی عەبدولکەریم لە سلێمانی.
- ساڵی ١٩٦٠ سەرۆکی لیژنەی قەرەبووکردنەوە بووە لە ڕانیە و پشدەر.
- ساڵی ١٩٦٣ بەندکراوە لە سەردەمی (زەعیم سدیق) لە سلێمانی.

* ئەیسەر عەبدولوەهاب محەمەد بەیاتی:-

- نووسەر و هونەرمەندی شێوەکار و ڕۆژنامەنووس.
- لە گەلێك لە گۆڤار و ڕۆژنامە عێراقی و عەرەبییەکانی نووسین و بابەتەکانیان بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمەکانی:-
- القلادة
- في رحلة المجد
- ومضات حائرة في النسيان
- قصص وعبر.
- بەشداری ٣٠ پێشانگای تایبەتی و هاوبەشی دەوڵەتی و عەرەبی و ناوخۆیی کردووە. دەستێکی باڵای هەیە لەسەر کێشانی وێنە لەسەر شووشەو کاشی.
- ٢٠٠ بڕوانامە و ڕێزلێنانی بەدەستهێناوە لە ئەدەب و هونەر و ڕۆژنامەنووسی و مافی مرۆڤ.
- ماوەیەك لە ڕۆژنامەی العراق، کاتب التركماني، درة الأدب، کاری جۆراوجۆری کردووە.
- هەروەها گەلێك ڕێزلێنانی فەخری نێودەوڵەتی بەدەستهێناوە.
- ساڵی ١٩٦٤ لەدایکبووە.
- دەرچووی ئامادەیی بەشی وێژەیی تەواو کردووە.

* مەلا ئەحمەدی مەلا قادر:-
- ساڵی ١٩٠٤ لە قادر کەرەم لەدایکبووە.
- ناوی (ئەحمەد قادر مەحموود زەنگەنە)یە.
- لەلای (مەلا محەمەد) لە سێگرتکان قورئانی خەتم کردووە، کتێبە سەرەتاییەکانی خوێندووە، ماوەیەکیش لە ژێر سەرپەرشتی مەلا عەبدولمەجید پێشنوێژی قادر کەرەم

بووە، لە دوایدا هەندێك كتێبی بە فارسی خوێندووە، ڕوو لە شاری كەركوك دەكات و لەسەر خوێندن بەردەوام بووە و لەدوایدا چووەتە لای (مەلا محەمەدی فەرقان) بۆ تەواو كردنی خوێندنەكەی.
– ئەو زاتە لەپاڵ زمانی كوردی، عەرەبی و فارسی و توركی زانیوە، لە نووسەرەكانی بڵاوكراوەی (باسەڕە) بووە.
– لە ساڵی ١٩٧٤دا، كە شەڕ لەنێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد و حكومەت دەست پێدەكاتەوە ماڵەكەی دەباتە كەركوك، تا لە ساڵی ١٩٧٩ كۆچی دوایی كردووە و لە گۆڕستانی قادر كەرەم نێژراوە.
– یەكێكە لە بەشدارەكانی گۆڤاری گەلاوێژ كە بابەتی بڵاوكردووەتەوە.

* ئیسماعیل شێخ عەلی:-
– ساڵی ١٩١٢ لە كەركوك لەدایكبووە، ناوەندی و سەرەتایی لە كەركوك تەواو كردووە و ئامادەیی لە بەغدا.
– ساڵی ١٩٣٩ لە كۆلێژی ماف بە پلەی نایاب دەردەچێت.
– دەچێتە خولی ئەفسەرانی یەدەگەوە و بە پلەی مولازمی دوو دەردەچێت.
– لە وەزارەتی ناوخۆ دەكرێتە بەڕێوەبەری ناحیە و لە چەندین ناحیە كار دەكات بە سەركەوتوویی.
– شارەزایی لە زمانی كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی هەبووە.

ئەحمەد ئۆتراقچی ئۆغلو

د. ئەکرەم بامبوقچی

ئیبراهیم بەرزنجی قەرەچێواری

سەیید ئەحمەدی فەیلەسوف

* (بابان کەرکوکی):-

- پێنج دیوانی شیعری بە زمانی هۆڵەندی بڵاوکردووەتەوە بەناونیشانەکانی:-
- تیشکی بەهار، ساڵی ٢٠٠٢.
- بەرەو ئارارات، ساڵی ٢٠٠٦.
- لە دوورەوە، ساڵی ٢٠٠٩.
- هەرێم، ساڵی ٢٠١١.
- تیشکی نادیار، ساڵی ٢٠١٣.
- ساڵی ٢٠١١ لە هۆڵەندا خەڵاتی (کرۆنەستی پنیدیا)ی پێبەخشرا لەلایەن شارەوانی (ئۆتریخت) لە هۆڵەندا.

* (بارام چاوش):-

- یەکێکە لە شۆرە سوارانی مەقاماتی کوردی وگۆرانی وهۆرەی جاف و ئامێری تەمیرەو زورنا ژەنینی بۆیە ناوی بە (بارام چاوەش) دەکردووە.
- لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم ونیوەی دووەمی سەدەی بیستەم ژیاوە.

* (باقی عەبدولخالق):-

- یەکێکە لە شاعیرە کوردەکان کە دیوانێکی شیعری و کۆمەڵێك هەڵبەستی بۆ منداڵان هەیە.
- لە (١٠)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (باییز تاڵەبانی):-

- ناوی (باییز سەعید محەمەد تاڵەبانی)یە.
- ساڵی (١٩٤٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٨) لە کەرکوك وەکو فەرمانبەر دامەزراوە.
- یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی دیوانی چاودێری و دارایی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بۆ ماوەی شەش ساڵیش سەرۆکی دیوانی دارایی بووە.
- ساڵی (٢٠٠٢) بووەتە وەزیری دارایی و ئابووری حکومەتی هەرێمی کوردستان-سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠٦) بووەتە وەزیری هەرێم بۆ کاروباری دارایی.
- ساڵی (٢٠٠٨) بووەتە وەزیری دارایی و ئابووری هەرێمی کوردستان.
- لە کابینەی شەشەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی (٢٠٠٩) بووەتە وەزیری دارایی و ئابووری.

* (بەختیار ئەبو بەکر):-

- ساڵی (١٩٨٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٦ - ٢٠٠٧) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٨) یەکەم پێشانگای تایبەتی کردووەتەوە.
- لە ماوەی کارکردنیدا بەشداری (٢٥) پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کردووە.

* (بەختیار ئەمین - دکتۆر بەختیار ئەمین):-

- ناوی تەواوی (بەختیار جەبار ئەمین)ە.
- ساڵی (١٩٥٩) لە کەرکوك لە گەرەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- ماجستێری هەیە لە پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی، لە زانکۆی سۆربۆن لە پاریس.
- دکتۆرای هەیە لە جوگرافیای سیاسی لە پاریس.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٢-١٩٨٨) ڕاوێژکاری کۆچ و کۆچبەرانی دەربەدەران بووە لە سووید.
- سکرتێری گشتی پەیمانگای کوردی بووە لە پاریس لەنێوان ساڵانی (١٩٨٨-١٩٩٤).
- ڕاوێژکاری سەربەخۆییەکان بووە لە فەرنسا، لەلایەن دانیال میترانەوە.
- بەڕێوەبەری ڕێکخراوی یەکێتی مافی مرۆڤ بووە لە واشنتۆن لەنێوان ساڵانی (١٩٩٧-٢٠٠٠).
- لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٥) وەزیری مافی مرۆڤ بووە لە حکومەتی عێراقی فیدراڵ.

*** (بەختیار سەعید مەحموود سەعید - دکتۆر بەختیار سەعید مەحموود سەعید):-**

- ساڵی (١٩٨١) لە کەرکوك لە ناوچەی شوان لە گوندی ئیلینجاغ لەدایکبووە.
- لەنێوان ساڵانی ١٩٨٧ -١٩٩٣ خوێندنی سەرەتایی لە شاری هەولێر تەواو کردووە.
- لەنێوان ساڵانی ١٩٩٣ - ١٩٩٩ خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی لە شاری هەولێر تەواو کردووە.
- لەنێوان ساڵانی ١٩٩٩ - ٢٠٠٣ لە شاری هەولێر لە زانکۆی سەلاحەدین بەشی مێژووی تەواو کردووە.
- ماستەرنامەی لە بواری مێژوودا بەدەستهێناوە بە ناونیشانی: (کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا، لێکۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی رامیاری و ئابووری).
- ساڵی (٢٠٠٩) لە بەشی مێژووی کۆلێژی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی کۆیە دکتۆرای بەدەستهێناوە بە ناونیشانی: (لیوای سلێمانی ١٩٢١-١٩٥٨ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە بارودۆخی ئابووری).
- ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی راپەڕین لە شاری رانیە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
-(کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا، لێکۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی رامیاری و ئابووری)، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ٢٠٠٩.
- (لیوای سلێمانی ١٩٢١-١٩٥٨، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە بارودۆخی ئابووری) ئەم کتێبە تێزی دکتۆراکەیەتی، سلێمانی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ٢٠١٣.
- لێکۆڵینەوەیەك لە گۆڤاری (ئەکادیمی) لەژێر ناوی (چالاکی بازرگانی کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەم، توێژینەوەیەکی مێژوویی)، ژمارە ١١، ساڵی ٢٠٠٩ بڵاوکردووەتەوە.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی (هێرشەکانی نادرشا بۆ سەر شاری کەرکوك)، گۆڤاری (مێژوو)، ژمارە ١٣، ٢٠١٠.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی (کەرکوك و ویلایەتی شارەزوور لە سەدەی نۆزدەدا)، گۆڤاری (مێژوو)، ژمارە ١٦، ٢٠١١.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی (رووخانی میرنشینی سۆران و چەند هۆکارێك)، گۆڤاری (هزرین)، ژمارە ٥.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی (بارودۆخی تەندروستی لیوای سلێمانی لە کۆتایی سەردەمی عوسمانییەوە تا کۆتایی سەردەمی پاشایەتی، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی)، گۆڤاری زانکۆی راپەڕین، ژمارە ١، ساڵی ٢٠١٤ بڵاوکردووەتەوە.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی: "پەیوەندی کەرکوك لەگەڵ هەردوو ویلایەتی موسڵ و بەغدا لە سەردەمی عوسمانی)، گۆڤاری (کەلتور)، ژمارە (١٠)، ٢٠١٣.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی: (رۆیشتنی جووەکانی سلێمانی و کاریگەرییە ئابوورییەکانی لە سەردەمی پاشایەتی)، گۆڤاری (کەوانە)، ژمارە ٢٠.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی: (باردۆخی ئابووری سلێمانی لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی عوسمانی و شێخ مەحموودو سەردەمی داگیرکاری ئینگلیز)، گۆڤاری (کەلتور)، ژمارە ١٢، ٢٠١٤.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی: (کاریگەری قەیرانی ئابووری و دارایی جیهانی لە ساڵانی ١٩٢٩-١٩٣٣ لەسەر ئابووری سلێمانی)، گۆڤاری (تاو)، ژمارە ٥٦، ٢٠١٤.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی: (پیشەگەری و پیشەسازی لە لیوای سلێمانی لە سەردەمی پاشایەتی)، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٧٠، ٢٠١٣.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی: (چالاکی بازرگانی لیوای سلێمانی ١٩٢١-١٩٥٨)، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٦٩، ٢٠١٣.

لەگەڵ نووسینی چەندین بابەت و توێژینەوەی تر لە گۆڤارو رۆژنامەکانی تر. هەروەها بەشداری کردن لە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆنفرانس لە ناوەوەی وڵات.

- بەشداریی کردووە لە کۆنفرانسی زانکۆی دهۆك لە شاری ئاکرێ کە تایبەت بوو بە مێژووی ئاکرێ بەبابەتێك لەژێر ناوی: (ئاکرێ لە دوای رووخانی میرنشینی بادینان تا راپەڕینی ساڵی ١٩١٩ دژ بە ئینگلیزەکان).
- چەند بابەتێکی تر ئامادەن بۆ بڵاوکردنەوە:
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی: (بڵاوبوونەوەی رێبازی نەقشبەندی و کاریگەرییەکانی لە سەرەتای سەردەمی مەولانا خالیدەوە تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست".
- پەرتوکێکی لەژێر دەستدایە لەژێر ناونیشانی (دەوڵەتی عوسمانی) کە لە سەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتی عوسمانییەوە تا دەگاتە رووخانی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی باسکراوە.
- پەرتوکێکی تری ئامادەیە بۆ چاپ لەژێر ناونیشانی (مێژووی تورکیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدە تا کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی بیست) کە بەهاوبەشی لەگەڵ بەڕێز دکتۆر سامان حسین ئەحمەد ئامادەیان کردووە.
- لێکۆڵینەوەیەك بەناوی: (خوێندنی فەرمی لە سەنجەقی سلێمانی لە کۆتایی سەردەمی عوسمانییەوە تا کۆتایی سەردەمی ئینگلیزەکان، لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە".

* (بەختیار شەریف):-

- ناوی (بەختیار شەریف کەریم قوربانی)یە.
- ساڵی (١٩٨٤) لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠٠٩) لە بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی سلێمانی بەکالۆریۆسی بەدەستهێناوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (شاکیر فەتاح، چرای ڕۆژنامەگەری چەمچەماڵ)، ٢٠١٢.
- (لەتیف حامید، هەڵوێست و داهێنان)، ٢٠١٣.
- ئێستا بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری و هونەرییە لە چەمچەماڵ.

* (بەدری-مستەفا):-

- (بەدری مستەفا ئەفەندی کوڕی عەلی ئەفەندی کەرکوکی) یە.
- ساڵی (١٧٤٢)ی زاینی لەدایکبووەو نازناوی شیعری (بەدری) بووە وناوی (مستەفا بەدرەدین) بووە.
- یەکێکە لە شاعیرە بە ناوبانگەکانی کەرکوك و شارەزایی لە زمانی عەرەبی و فارسیدا هەبووەو سێ دیوانە شیعری هەیە.
- ساڵی (١٨٢١)ی کۆچی دوایی کردووە لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا.

* (بەدیع باباجان):-

- کوڕی دکتۆر حوسێنی باباجانە.
- خۆشنووس و وێنەکێشێکی بێ وێنە بوو.

- لەم دواییەدا لەو قەڵەندەرخانەیەدا بە خۆشنووسی و نیگارکێشییەوە خەریك بوو پارەی کلێشەی کتێبی لەکەس وەرنەدەگرت، ئەو وێنە قەڵەمیانەی کە بۆ کتێبی مێژوی ئەدەبی کوردی مامۆستا عەلادین کێشابووی هەر بە خەیاڵ بێ ئەوەی کەکەسی ڕێبەدێیی کردبێ گەواهی هونەرمەندی ئەو پیاوەبوو..
- ساڵی (١٩٢٣) لە شاری کەرکوك هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (١٩٤٢) چووەتە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا بۆ خوێندن و لە ساڵی (١٩٥٠) تەواوی کردووە ولە ڕیزی یەکەمەکان بووە.
- ساڵی (١٩٦٧) لەلایەن بانقی سەرەکی عێراقەوە ڕاسپاردراوە کەوێنەی دراوە مەعدەنییەکان بکێشێت وبۆی کێشاون.
- ساڵی (١٩٧٣) لە بەر ئەوەی یەکەمەکانی پەیمانگا بوو، وانەی هێڵکاری و وێنەی لە بەشی خۆشنووسی و زەخرەفە داوەتەوە.
- (٣٥) ساڵ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی (المساحة) خزمەتی کردووە.
- یەکەم هونەرمەندی کوردبووە کە وێنەی شاعیران و کەڵە پیاوانی کێشاوە لەوانە کتێبەکەی:-
- عەلائەددین سەجادی، وێنەی ئیبراهیم خانی دەلۆ، وێنەی سەید ئەحمەدی نەقیب، وێنەی شەرەف خانی بەدلیسی.
- ساڵی (١٩٩٥) لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

* بەرزان محەمەد قادر:-

- ناسراو بە بەرزانی حەمەی مینا.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٨)ی شاری کەلار. قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەلارو ساڵی (١٩٧٨) ئامادەیی پیشەسازیی لە سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردو لەسەر ئاستی مەیدانیی ڕێکخستن لە کەلارو سلێمانی، ڕۆڵێکی گرنگی نواند.
- ساڵی (١٩٨١) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکردو کرایە لێپرسراوی دەزگاکانی بێ سیمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.
- لە ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)دا بەشدار بوو لە ئازادکردنی بەشێکی زۆری ناوچەکانی پارێزگای سلێمانی و بەشێکی زۆری ناوچەی گەرمیان. دوای دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ئاسایشی هەرێمی کوردستان، کرایە لێپرسراوی هۆبەی سیاسیی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی کەرکوك. دوا لێپرسراوەتیی لەناو یەکێتی، ئەندامەتیی خولی دووەمی پەرلەمانی کوردستان بوو.
- لە ٢٥ی ئازاری ساڵی (٢٠١٠) بەهۆی جەڵتەیەکی کتوپڕەوە کۆچی دوایی کرد.

* ( بەرزانە ):-

- یەکێکە لە شاعیرە ئافرەتەکانی کەرکوك کە گەلێك شیعری بە پێزی لە هەموو بوارەکاندا هەیە، هەر چەندە لە هیچ قوتابخانەیەك نەیخوێندووە.

* ( بەرزۆی پەری کەرکوکی ):-

- ناوی شاعیر (رەفعەت کوڕی ئەحمەد کوڕی عەلی جانی)یە.
- لە (١٠)ی تەمموزی سالی (١٩٠٩) لە گەڕەکی موسەللای کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩١٦) لە گوندی (فەسەلییە-عەرەب کۆیی) کاکەییەکانی داقوق دەخرێتە بەر خوێندنی سەرەتایی و لە سالی (١٩٢٠) لە بەغدا لە قوتابخانەی (فەزلی) پۆلی پێنجەمی سەرەتایی تەواو دەکات و لە سالی (١٩٢٢) لە شەشی سەرەتایی دەخرێتە بەر پەیمانگای زانستی.
- سالی (١٩٢٥) چووەتە ریزی سوپای تازە دامەزراوی سەردەمی پاشایەتی لە عێراقی و لە وەزارەتی بەرگی پلەی عەرەریفی هەبووە.
- شارەزایی تەواوی لە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی و ئینگلیزیدا هەبووە.
- دوو دیوانی دەستنووسی بە جێماوە بەناونیشانی:
- (دیوانی مەعشەر).
- (موعەجەمی کوردی).
- سالی (١٩٩٠) کۆچی دوایی کردووە.

* ( بەشیر سەرسەم - دکتۆر بەشیر سەرسەم ):-

- سالی (١٨٨٢) لەدایکبووە.
- خوێندنی لە بواری پزشکیدا لە ئەستەمبول و لە سالی (١٩١٧) لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت تەواو کردووە.
- زمانەکانی تورکی و عەرەبی و کوردی و ئینگلیزی و فەرەنسی بە باشی زانیوەو سەرۆکی تایەفەکانی سریانی ئەرسەدۆکس بووە بۆ ماوەی بیست سال لە کەرکوك.
- ماوەیەك سەرۆکی فەرمانگەی تەندروستی کەرکوك بووە، دوو کتێبی چاپکراوی هەیە لەسەر ئایینی مەسیحی.
- سالی (١٩٧١) کۆچی دوایی کردووە.

* ( بەکر عەلی خۆجە- مەلا بەکر ):-

- (مەلا بەکر کوڕی حاجی عەلی کوڕی خۆجە کوڕی مەلا حوسێن)ە.
- یەکێکە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك.

* ( بەکر ئەحمەد فەقێ ):-

- سالی (١٩٦٥) لە چەمچەمال لەدایکبووە.
- سالی (١٩٨٦) چووەتە ریزی تیپی نواندنی چەمچەمال.
- یەکەم کاری لەو تیپە سالی (١٩٨٧) بوو.
- بەشدارییەکانی:
- شانۆی (چارەنووسی ئادەمیزاد)، ١٩٨٧.
- شانۆی (مامە یارە)، ١٩٨٨.
- شانۆی (خۆراگرتن)، ١٩٩٢.
- شانۆی (بینایی)، ١٩٩٢.
- شانۆی (بێ ناسنامەکان)، ١٩٩٧.
- شانۆی (بە بەرد بوون)، ٢٠٠١.

* بەکر ئەرجان:-

- سالی ١٩٥٥ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- دەییم واتا سوزلو یمیز دایانان خوریاتلار، شیعر، ٢٠٠٥
- خوریات دیوانیم، شیعر، ٢٠٠٦.
- دەییم واتا سوزلر یمیزە دایانان شعرلر، ٢٠٠٦
- نصرالدین خوجابیەس، ٢٠٠٦.
- خوریات باخچەسز، شیعر ٢٠٠٧.
- الکتلة الوطنیة فی سوریا، ٢٠٠٧.
- خوریات دەلیلیم، شیعر، ٢٠١٢.
- deyim ve sozler imize dayanan duetlik ve siir ler، ٢٠١٣

* ( بەکر سدقی ):-

- سالی (١٨٨٧) لەدایکبووە.
- لە بنەڕەتدا ناوی (عەسکەری) دەگەڕێتەوە بۆ ناوی دێی عەسکەر لەلای (ئاغجەلەر).

– یەکێکە لە ئەفسەرە چالاکەکانی عێراق لەنێوان سالآنی سییەکاندا ودەورێکی گەورەی بینیووە لە ڕووداوەکانی ئەو ماوەیەی کە لە عێراقدا ڕوویداوە.
– سالْی ١٩٠٦ لە کۆلیژی قوتابخانەی سەربازی لە ئەستەمبول دەرچووە.
دەرچووی کۆلیژی ئەرکان بووە.
– لە سەرەتای دامەزراندنی سوپای عێراقەوە پلەی مولازمی یەکەم بووە، کە دوا پلەی فەریق ڕوکن بووە و دوا پۆستی سەربازی (قائد الفرقة الثانیة) بووە
– لە (٢٩)ی تشرینی یەکەمی سالْی (١٩٣٦) هەستا بە کوودەتایەك بۆ سەر وەزارەکەی یاسین هاشمیو دروست بوونی وەزارەتێکی تر لەلایەن حیکمەت سلێمان.
– لە (١٢)ی ئابی سالْی (١٩٣٧) لە ڕۆیشتنی لە موسلْەوە بۆ تورکیا تیرۆرکرا لەگەلْ محەمەد علی جەواد.
– لە دوای خۆی ئەم بەرهەمانەی بەجێهێشتووە:
– (الاستطلاع)، ١٩٢٩.
– (الطوبوغرافیا)، ١٩٢٧.
– (دروس تعبویة)، ١٩٣٠.
– (إلی رجال الجیش الاحداث)، ١٩٣٧.

*** بەکر لەتیف (مامۆستا بەکر لەتیف):-**

– لە کادیرە سەرەتاییەکانی ئەلْقە ڕۆشنبیرییەکان بوو، پاشان لە ڕیزەکانی بەرزەدا کادیرێکی هەلْسووڕاو بوو، تا هەلْوەشاندنەوەی یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستی.

*** (بەها- محەمەد بەهائەددین عەبدولکەریم):-**

– سالْی (١٨٨٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– قوتابخانەی ڕوشدی سەربازی لە بەغداو قوتابخانەی جەنگی لە ئەستەمبولْ تەواو کردووەو بە ئەفسەر دامەزراوە لە سوپای عوسمانیداو بەشداری شەڕی جیهانی یەکەمی کردووە.
– گەلێك دیوانی شیعری هەیەو نازناوی شیعری (بەها) بووە.
– سالْی (١٩١٨) کۆچی دوایی کردووە.

*** (بەهائەددین سالْح-بەها):-**

– لە دیوانە شیعرییەکەیدا بە ناوی (ئیبنونووس سەلآح بەها کەرکوکلی) هاتووە، باوی بەناوبانگی بووە بە (سەلآحەددین ئەفەندی) لە بنەڕەتدا خەلْکی (کۆیە) بووەو لە کەرکوك گەورە بووەو نازناوی لە کەرکوك (سالْح ئەفەندی) بووە، باوکی ئەم شاعیرە تێکەلآوی لەگەلْ بنەمالْەی (ساری کەهیە)دا هەبووەو کچی (ئابۆش بەیرەقدار)ی خوازتووە.
– سالْی (١٨٦٤) لە باوکێکی کوردو لەدایکێکی تورکمان لەدایکبووە، بەلآم لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا سالْی لەدایکبوونی بە (١٨٧٦)ی زاینیی داناوەو دەلْێت (زانایەکی بەرزو شاعیرێکی بەدیمەن بووە، لە کەرکوك هاتووەتە دنیاوەو لەوێ کۆچی دوایی کردووە).
– قوتابخانەی (ڕوشدییەی) لە کەرکوك تەواو کردووەو مامۆستای تایبەتی هەبوو بۆ خوێندنی زمانی عەرەبیو فەرەنسی، لە دوای کۆچی دوایی باوکی چووە بۆ ئەستەمبولْو ماوەیەك لەوێش خوێندوویەتی، لە سالْی (١٩٤٧) گەڕاوەتەوە کەرکوك.
– گەلێك شیعری هەیە بە زمانی تورکیو فارسیو کوردیو عەرەبو نازناوی شیعری (بەها) بووە.
– لە ماوەی ژیانیدا گەلێك کاری دامودەزگاکانی دەولْەتی عوسمانیو دەولْەتی عێراقی کردووە لە شارەکانی حیللەو عەمارەو سلێمانیو موسلْو کەرکوك.
– لە تەمەنی هەشتاو چوار سالْیدا لە ڕۆژی (٢٠)ی ئەیلولی سالْی (١٩٤٨) کۆچی دوایی کردووە.

*** (بەهجەت ساکت):-**

– ناوی (بەهجەت کوڕی عەبدوللآ ساقی)یەو لە سالْی (١٨٦٣)ی زاینی لە کەرکوك لەدایکبووە.
– قوتابخانەی ڕوشدییەی تەواو کردووە، گەلێك دیوانی شیعری هەیە.
– سالْی (١٩١٥) کۆچی دوایی کردووە.

*** بەهجەت سادق ئیبراهیم:-**

– سالْی ١٩٤٣ لە خورماتوو لەدایکبووە.
– بەرهەمەکانی:-
– فضائل الاتراك، ٢٠٠٤.

- صفحات من ذاكرة التأريخ، ٢٠٠٦
- شهريار ئيلهام قيناغى، ٢٠٠٦.
- طوز خورماتوو اوزنلار وجداننده، ٢٠٠٧.
- omer Hayyam ve Dortlukleri، ٢٠٠٦
- KOR OGLU، ٢٠٠٨
- PAPATYA، ٢٠٠٨
- KARACA OGLAN، ٢٠٠٩
- جريدة القلعة، تاريخ وابداع، ٢٠١٠

* (بەهجەت غەمگین):-

- ناوی (بەهجەت مەردان عەلی محەمەد غەمگین)ە.
- هونەرمەندو نووسەرو پەروەردەکارە.
- ساڵی (١٩٤٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دبلۆمی لە پەیمانگای هونەرجوانەکان بەشی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی لەنێوان ساڵانی (١٩٦٦-١٩٧٦) لەسەر ئامێری عود تەواو کردووە.
- هەر لە ساڵانی (١٩٦٥)وە نووسینی لە (قارداشلق)و (العراق) و(الوطن)و (صوت التآميم) بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمەکانی:
- (نوتن بليللر)، ١٩٦٩، ژیانی هونەرمەندان.
- (المعركة في الشعر التركماني المعاصر)، ١٩٨٧.
- (سنان سعيد في ضمير الشعراء)، ١٩٩١، هاوبەش.
- (اودو نجيتن قيزى)، چیرۆك، هاوبەش، ١٩٩١.
- (الشاعر عمر آغا ترجيللي)، هاوبەش، ١٩٩١.
- (دليل الصحافة في كركوك عبر قرن ١٩٠٠-٢٠٠٠)، هاوبەش، ٢٠٠١.
- (هابه غاب جسدا حاضر فنانا)، هاوبەش، ٢٠٠٢.
- (كفني حلم هائم)، هاوبەش، ٢٠٠٢.
- (خضر لطفي وقصائده)، هاوبەش، ٢٠٠٢.
- (کرکوکلی شاعر فاتح شاکیر ساعتچی)، هاوبەش، ٢٠٠٣.
- (الفنانة عثمان مظلوم)، (٢٠٠٨).
- کرکوکنا، ٢٠١٠
- كركوك قيثارة الشعراء، ٢٠١٤.

* بەیان سەلمان:-

- بەیان سەلمان کچی شێخ سەلمانە، شێخ حەمەدەمینی مەڵحە مامێتی، کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی حەقە.
- لە (١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٦١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شاعیر، ڕۆماننووس، وەرگێڕە، بە زمانەکانی کوردی‌و عەرەبی‌و ئینگلیزی‌و فەرەنسی بەرهەمەکانی بڵاودەکاتەوە.
- خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨١- ١٩٨٦)، کۆلیژی ئابووری‌و بازرگانی، زانکۆی بەغدای تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٨- ١٩٩١) لە ئامادەیی بازرگانی ڕانیە مامۆستا بووە.
- ساڵی (١٩٩٢- ١٩٩٨) لە ڕێکخراوە مرۆڤایەتییەکاندا کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٩٨) لەگەڵ هاوسەرەکی (فەرەیدون حەسەن) چوونە بۆ هەندەران‌و ئێستا لە پاریس پایتەختی فەرەنسا دەژین.
- ساڵی (٢٠٠٠- ٢٠٠١) دیپلۆمی ئەدەبی هاوچەرخی لە زانکۆی پاریس بەدەست هێناوە.
- ساڵی (٢٠٠١ - ٢٠٠٢) دیپلۆمی لیسانسی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٢- ٢٠٠٤) دیپلۆمی بەکالۆریۆسی لە ئەدەبی هاوچەرخ‌و ئەدەبی فەرەنسی، تایبەتمەندێتی لە ئەدەبی ژیاننامەو خەیاڵ بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٥- ٢٠٠٦) دیپلۆمی ماجستێری لە ئەدەبی هاوچەرخ‌و ئەدەبی فەرەنسی، تایبەتمەندێتی لە ئەدەبی خەیاڵ بەدەست هێناوە.

* بەرهەمەکانی نووسەر:-

- ساڵی (١٩٩٤) یەکەم چیرۆکی درێژی لە گۆڤاری گوتار بڵاوبۆوە.
- ساڵی (١٩٩٦) نامیلکە شیعرێکی کوردی بەناوی "نامۆیی سەرو هەرەسی دیمەنەکان" هاوکات یەکەم خوێنەوەی بۆ کێشەی ژن لە گۆڤاری "دەنگی" بڵاوبووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٧) بەهاوکاریی فەرەیدون حەسەن، لەسەر بیرۆکەی فەریدوون حەسەن، یەکەم مەڵبەندی لاوان بۆ چالاکیی هونەریی‌و ئەدەبی کرایەوە. ئەم مەڵبەندە بەهاوکاریی ڕێکخراوی " تی دی سی" فەرەنسیی بوو. بووە بنکەیەك‌و بنەمایەك‌و بۆ گەنجانێکی زۆر لە شارەکانی سلێمانی‌و هەولێرو دهۆك، کە دواتر ناوی چەندین گەنجیان لە کوردستان درەوشایەوە.
- لە (٢٠٠٢)بۆ (٢٠٠٤) چەند خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی

ئەدەبی بۆ ڕۆمانەکانی سەلیم بەرەکات بە زمانی عەرەبی لە گۆڤاری "الکرمل" و لە ساڵی ۲۰۰۷ بۆ ۲۰۰۸ لە ڕۆژنامەی السفیر والنهار" بڵاوکردووەتەوە.

– ساڵی (۲۰۰٦) دیوانێکی شیعر بەزمانی عەرەبی بە ناونیشانی " انا کما فی حکایات الجنیە" لە چاپخانەی ڕەنج لە کوردستان چاپکراوە. هەمان ساڵ لە گۆڤاری (حجلنامە) کاری کردووەو چەند بەرهەمێکی خوێنەوەی ڕەخنەییو وەرگێڕانی لە ئینگلیزیو فەرەنسییەوە بۆ دەقی محەمەد ئوزۆنو کازم جیهاد کردووە.

– ساڵی (۲۰۰۸) ژیاننامەیەکی کورتی بەزمانی عەرەبی بەناونیشانی (تلك الغیمة الساکنة) لە خانەی چاپەمەنی الزمان لە سوریا چاپکراوە.

– ساڵی (۲۰۰۸) وەرگێڕانی ڕۆمانێکی سەلیم بەرەکات لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی فەرنسی بەناونیشانی (کهوف هایدا، هودا، هوس) لە خانەی چاپەمەنی (Actes sud) لە فەرەنسا چاپکراوە.

– ساڵی (۲۰۰۸) ڕۆمانێك بەزمانی عەرەبی بەناونیشانی (بوراق) لە خانەی چاپەمەنی (الزمان)، لە سوریا چاپکراوە.

– ساڵی (۲۰۰۹) لێکۆڵینەوەیەك بە زمانی فەرەنسیو عەرەبیو کوردی لەژێر ناونیشانی (دەنگی شاراوەی ژن) ئەم لێکۆڵینەوەیە لە زانکۆی ئۆسلۆ لە نەرویژو لە ئەمنیستی ئینتەرناشناڵو شاری بێرگنو ستاڤانگر پێشکەشکرا.

– ساڵی (۲۰۰۹) وەلە ڕۆژنامەو گۆڤاری هەمەجۆری کوردی، بە بەردەوامی دەقی هەمەجۆری فیکریو ئەدەبیو

وەرگێڕانی بڵاوکردۆتەوە.

– ساڵی (۲۰۱۱) چاپکردنی یەکەم ڕۆمانی بە زمانی کوردی" نەوەکانی مادایی" دەزگای کۆنسێپت، چاپخانەی یاد.

– ساڵی (۲۰۱۰ بۆ ۲۰۱۱) لە گۆڤاری کۆنسێپت کاری کردووە.

– ساڵی (۲۰۱۱) تاکو (۲۰۱۳) لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ لاپەرەیەکی ئەدەبو هونەری بۆ تەرخانکرابوو. هاوکات لە گۆڤاری مەدەنییەت کۆمەڵە دەقێکی بڵاوبووەتەوە.

– ساڵی (۲۰۱۲) چاپکردنی ڕۆمانی (بەسەرهاتەکانی خەزنە مەملوك)، دەزگای کۆنسێپت، چاپخانەی یاد.

– ساڵی (۲۰۱۳) چاپکردنی ڕۆمانی (لەبەرزایی شووراکانەوە)، چاپخانەی بەڕێوەبەرایەتی چاپو بڵاوکردنەوەی سلێمانی، وەزارەتی ڕۆشنبیریو لاوان. بە هاوشانی چۆمان هەردیو نەجیبە محەموود، یەکەم گۆڤاری فیمنیستیان دامەزراندو تەنها دوو ژمارەی لێ چاپکرا.

– ساڵی (۲۰۱٤) وەرگێڕانی کتێبی (کاندید) نووسەری فەرەنسیی ڤۆلتێر، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە، دەزگاو چاپی ئەندێشە. کوردستان، سلێمانی.

– ساڵی (۲۰۱٥) چاپکردنی ڕۆمانی (شەوانی ئادەم) دەزگاو چاپی ئەندێشە. کوردستان، سلێمانی هاوکات لە گۆڤاری شیکار چەند دەقێکی بڵاوکردووەتەوە.

– ساڵی (۲۰۱٦) وەرگێڕانی ڕۆمانی (شەقامی دوکانە تاریکەکان)، نووسەری فەرەنسی پاتریك مۆدیانۆ، وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە بۆ دەزگاو چاپی ئەندێشە، سلێمانی.

– بە هاوکاریی حامید دروديو فیلیپ دولارب فەرهەنگۆکی (بە فەرەنسی بدوێ)، چاپو بڵاوکراوەکانی دەزگای ئەندێشە.

– وەرگێڕانی کتێبی میتۆلۆژی (گۆڕانکارییەکان)، ئۆڤید، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە.

– وەرگێڕانی شانۆگەری یەك شاخ (کەرکەدەن)، ئۆژین یونیسکۆ، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە.

– دیوانی شیعری کوردی.

*** (برایم جاف):-**

– ناوی (محەمەد ساڵح)ە ناسراوە بە (برایم جاف).

– ساڵی (۱۹٤۷) لە گوندی (کانی کەوەی باشکی) لە گەرمیان لەدایکبووە.

– لە ماوەی ژیانیدا گەلێك بەرهەمی شیعری بەجێماوە، بە تایبەتی شیعری نیشتیمانی.

*** برایم حوسێن شەریف:-**

– ناسراو بەسەید برایم.

– لەدایکبووی ساڵی (۱۹٦٤)ی شاری چەمچەماڵ.

– ساڵی (۱۹۷۸) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو پاش ساڵێك پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردووەو لە هەرێمی ٥ی قەرەداغ بووەتە

*** برایم حوسێن عەبدوڵلا:-**

- ناسراو بە حاکم برایم.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٨)ی گوندی زەرداو لە قەزای کفری.
- لە قۆناغی ناوەندیدا پەیوەندیی بە یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە کردووە.
- ساڵی (١٩٦٧) دواناوەندیی لە شاری خانەقین تەواو کردو بۆ ساڵی دواتر لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا وەرگیرا، بەڵام دوای سێ مانگ لەبەر هۆکاری سیاسی وازی لە خوێندن هێنا.
- ساڵی (١٩٦٨) بوو بەئەندامی لیژنەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان لە خانەقین و دواتر بووە ئەندامی لقی یەکێتیی قوتابیان لە پارێزگای دیالە.
- ساڵی (١٩٧١) لە کۆلیژی یاسای بەغدا وەرگیراو هەمان ساڵ پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٧٣) بووە ئەندامی لیژنەی شاری بەغدای کۆمەڵە.
- ساڵی (١٩٧٥) کە لەدوا قۆناغی کۆلیژی یاسا بوو، لەگەڵ ژمارەیەك هەڤاڵی تری لەلایەن ئەمنی بەغداوە دەستگیر کراو دواتر بە تۆمەتی ئەندامبوون لە ڕێکخراوێکی نهێنی، بە شەش ساڵ زیندانی حوکم درا.
- لە ئابی ساڵی (١٩٧٩) بەلێبوردنی گشتی ئازاد کرا. دوابە دوای ئەمە، گەڕایەوە بۆ زانکۆو ساڵی (١٩٨٠) خوێندنی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردو بە کالۆریۆسی یاسای بەدەستیهێنا.
- لە ١٦ی ئابی ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردو بووە دادوەر لە دادگای باڵای شۆڕش.
- ساڵی (١٩٨٤) لە کاتی وتووێژی نێوان یەکێتی و حکومەتی عێراق، لێپرسراوەتیی ئیدارەی مەکتەبی سیاسیی لە سووراداش گرتە ئەستۆ. دوای بە ئەنجام نەگەیشتنی وتووێژو دەستپێکردنەوەی شەڕ، بەلێپرسراوی دادگای مەڵبەندی ١ لە قەرەداغ دانرا.
- ساڵی (١٩٨٨) دوای شاڵاوی ئەنفالەکان و کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور. بە خێزانەوە لە سەقز گیرسایەوەو لەوماوەیەدا سەرەڕای کاری وەك دادوەرو سەرەڕای ئەوەی کە ئەندامی لیژنەی ڕێکخراوی ٤ی کۆمەڵە بوو، وەك وەرگێڕو هەواڵساز هاوکاریی دەستەی بەڕێوەبەری ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستانی کرد.
- ساڵی (١٩٨٩) بەشداریی لە دامەزراندنی یەکێتیی مافپەروەرانی کوردستاندا کرد کە کۆنگرەی دامەزراندنی لە ٣و ٤ی ئەیلول لە زەڵێ بەسترا.
- دوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)، گەڕایەوە بۆ کوردستان و دواتر لەشاربازێڕ بوو بەدادوەر لە دادگای بەرەی کوردستانی.
- ساڵی (١٩٩٢) بووە ئەندامی مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی و ساڵی (١٩٩٣) بووە بەڕێوەبەری گشتیی دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری لە هەولێر.

پێشمەرگە. دواتر گوێزرایەوە بۆ ناوچەی سەرکردایەتی و ماوەیەك لە ناوزەنگ گیرسایەوە.
- ساڵی (١٩٨٠) گوێزرایەوە بۆ هەرێمی ٢ی کەرکوك و لەوێ بوو بە فەرماندەی مەفرەزە.
- ساڵی (١٩٨٢) پاش هەڵوەشاندنەوەی سیستمی هەرێمەکان و کارکردن بەسیستمی تیپەکان و پێکهێنانی تیپی ٢١ی کەرکوك، لە سنووری تیپە تازەکە درێژەی بەهەڵسووڕانی خۆیدا.
- ساڵی (١٩٨٣) لەکاتی بەڕێوەچوونی شەڕەکانی قەندیل لە دژی هێزەکانی بەرەی جود لە چیای قەندیل و دۆڵی باڵەییان و دۆڵی شەهیدان و ناودەشت، لەگەڵ هێزەکانی تیپی ٢١ی کەرکوکدا بەشداریی لە ئۆپەراسیۆنەکەدا کردو لە سۆنگەی ئەو دلاوەری و ئازایەتییەی کە لەو ئۆپەراسیۆنەدا نواندی، بەبڕیاری تاڵەبانیی سکرتێری گشتیی یەکێتی پلەی بەرز کرایەوە کرایە فەرماندەی کەرت و دوای تەواوبوونی ئۆپەراسیۆنەکەش دەمانچەیەکی چواردەخۆری پێشکەش کرا. پاش ئۆپەراسیۆنی قەندیل، بە پلەی فەرماندەی کەرت بۆ کەرتی ٣ی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان گوێزرایەوە.
- لە تەمەنی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی دەشتی کەرکوك و سەرجادەی شوان- تەقتەق و چەمچەماڵ و تەکیەو ئاغجەلەرو ئۆپەراسیۆنی هێزی پشتیوانی کوردستانی ئێران و شەڕەکانی بێتواتەوە حەمك و حەیدەر بەگی کردووە.
- شەوی ١٤ لەسەر ١٥ی شوباتی ساڵی ١٩٨٥ لە سەرووبەندی بەڕێوچونی ئۆپەراسیۆنی دابان - هەلاجدا لە کاتی هێرش کردنە سەر ڕەبیەی قوڵە پوشینەی کلکەی چیای پیرەمەگرون لەگەڵ پۆلێك لە هاوڕێکانی شەهید بوو.

- لە ماوەی نێوان (١٩٩٤- ١٩٩٨) کارگێری یاساو ماف مرۆڤ بوو لە مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی و لەو ماوەیەدا، لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی، بەرنامەی یاساو ماف مرۆڤی بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان ئامادە کردو زنجیرە وتارێکیشی بەهەمان ناوەرۆك بۆ ڕادیۆی مەڵبەندی سلێمانی ساز کرد. لە زۆربەی خولەکانی کادیرانی مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی وانەی دەربارەی ماف مرۆڤو هەڵبژاردن و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان وتۆتەوە.

- لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٩٨ - ٢٠٠٥) بەڕێوەبەری گشتی دیوانی وەزارەتی پیشەسازیو وزە بوو لە سلێمانی و دواتر بووە بەڕێوەبەری گشتیی پلاندانان لە وەزارەتی هەرێم بۆ کاروباری دارایی. لە خولی یەکەمی ئەنجوومەنی ناوەند بە ئەندام دانراو لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی.

- ساڵی (٢٠١٠) بە ئەندامی ئەنجوومەنی ناوەند هەڵبژێردراو لەناو ئەنجوومەن لێپرسراوەتیی کۆمیسیۆنی سکاڵاو لێکۆڵینەوەی گرتە ئەستۆ.

*** (برایم حەمە خانی گێژ):-**

- پیاوێکی باڵا بەرزی گەنم ڕەنگی ڕەقیلە بوو.
- ساڵی (١٨٨٠)ی زایینی لەناو هۆزەکەی خۆی چاوی هەڵێناوە.
- لای مەلا خراوەتە بەر خوێندن بەڵام ئەو مەیلی لە ئەسپ سواریو ڕاووشکارو کشتوکاڵ کردن بوو، لە بەشێك لە قورئانی پیرۆز بەو لاوە هیچی دیکەی نە خوێندووەو فێر نەبووە.
- برایم حەمە خان یەکێك بووە لەو شۆڕەسوارانە کە چووە بۆ (شعێبە) بەڵام کە دوایی گەڕاوەتەوە لە ئاوایی (فەککە) دانیشتووە.
- لە نیسانی ساڵی (١٩١٨) هێزەکانی بەریتانیا لە سیروان پەڕینەوەو ڕوویان کردە زەنگابادو ئامانجیشیان گرتنی شاری (کفری) بوو، برایم حەمە خانی داخ لە دڵ لە بەریتانیا بەسێ کەسەوە بەرامبەر ئەو سوپا گەورەیە وەستا لەم لاو لەو لای نارینەوە چوونە پارێزەوە تەقەیان لە ئینگلیز کردو یەك دوویەکیان لێ کوشتن، بۆیە هاوڕێکانیان شەهید کردو برایم حەمە خانی بە برینداریییەوە هەڵاتو لە چاو وون بوو. کە برینەکەی چاك بووەوە باری کردە (حاجیلەر)و لەوێ بوو بە کویخاو وەکیلی جەمیل بەگی بابان.
- لە کاتی شۆڕشەکەی برایم خانی دەلۆدا، کاتێك کە شۆڕشەکە تێکشکا، برایم حەمە خان یارمەتییەکی زۆری شۆڕشگێڕەکانی دەدا لە حەمرینو هەمووردەم هاموشۆیانی دەکرد.
- ساڵی (١٩٦٨) کۆچی دوایی کردوو تەرمەکەی لە گۆڕستانی (برایم سەمین) بە خاك سپێدرا.

*** (برایم خانی دەلۆ):-**

- ناوی (برایم کوڕی ساڵح کوڕی ئەمین کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ئەحمەد بەگ)ە، لە تیرەی (خوبیاری دەلۆ)یە.
- ساڵی (١٨٧٤) لە گوندی هەیەرە کەل لەدایکبووە.
- پیاوێکی ڕۆشنبیرو شیعر دۆست بووە، ئاشنایەتی نزیکی لەگەڵ (شێخ مەحموودی مەلیك) بووە، لەگەڵ شاعیری ناوچەی گەرمیان (خەلیل منەوەر) شیعریان بۆ یەکتری ناردووە.
- ساڵی (١٩٢٠) کاتێ ئینگلیزەکان شاری کفری داگیر دەکەنو ستەمو زۆر لە خەڵکی شارەکە دەکەن، خەڵکی شار هانا بۆ برایم خان دەبەن تا سنوورێك بۆ ئەو زوڵمو ستەمانە دابنێ، بەڵام ئینگلیزەکان بەردەوام دەبن لە ستەمو زۆرداری بۆیە برایم خان بە هێزێکەوە پەلاماری بنکەو پێگەکانی ئینگلز دەداتو شارەکە ئازاد دەکات، پاش چەند ڕۆژێك ئینگلیزەکان بە هێزێکی زۆرو چەکداری کوردی لایەنگری ئینگلیز پەلاماری شاری کفری دەدەن. بۆ ئەوەی خەڵکی شار تووشی زیان نەبن برایم خان هێزەکەی دەکشێنێتەوە بۆ دێهاتەکان، ماوەیەك شەڕی پارتیزانی دەکات، پاشان دەکشێتەوە بۆ ناو هۆزی دەلاڵۆی عەرەب لە حەمرینو لەوێ لە سەرەتای کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢١) بە نەخۆشی کۆچی دوایی دەکات لە گۆڕستانی گوندی (سنێدیچ) بە خاك سپێراوە.

*** (برایمی شاتەری - حاجی برایمی شاتەری):-**

- ناوی (حاجی برایمی کوڕی حاجی محەمەدی مەحموود)ە، لە بنەماڵەی (برایمی)ی تیرەی (شاتەری) هۆزی (جاف)ە.
- ساڵی (١٩١٧)ی زایینی لە (چاڵاونەخشینە) سەر بە

ناحیەی (پێیان)، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی لەدایكبوونی بە (۱۹۱۹)ی زاینیی دادەنێن.
– پیاوێكی گورج و گۆڵی دڵ ساف، بە وەفاو بێ لاف و گەزاف، گفت ولفت شیرنی وزوبان بە ئەدەب و نوكتەزان، پەروەردەی كۆچ وباری گەرمێن و كوێستان، سوارچاك و دلێرو نەبەرد، ڕاست و ڕەوان و بێگەرد و موخلیسی ماڵی خوا.
– لە سییەكانەوە پەیوەندی لەگەڵ شاعیر (شێخ ئەحمەد شاكەل) بەست و شیعرەكانی كاری تێ كرد جگە لەوە ئالودەی شیعرەكانی (نالی وناری ومەحوی وئەحمەد موختارو تایر بەگ و مەلەوی) بوو تا وەكو لە ساڵی (۱۹۵۷) وە دەستی دایە شیعری هەڵبەستن.
– حاجی برایم لە شیعرەكانیدا دەردو ئەندێشەی خۆی تێكەڵ بە كاروباری ڕۆژانەی كردووە، لە قاڵبێكی ڕەواندا پێشكەش خوێنەرانی فەرمووە، پایەیەكی چاكی نووسینی شیعر بووە.
– بەرهەمە چاپكراوەكانی:
– (دیوانی حاجی برایمی شاتەری)، سلێمانی، ۱۹۷۷.
– (كۆچ بارو گەرانەوە)، سلێمانی، ۱۹۹۸.
– (دیوانی جاف).
– لە (۱)ی نیسانی ساڵی (۲۰۰۰) كۆچی دوایی كردووە.

* (بستان پاشا):-

– ساڵی (۱٦۲۳) بووەتە والی كەركوك، لەسەردەمی ئەودا سەفەوییەكان دەستیان گرت بە سەر كەركوكداو قاسم خانیان كردە حاكمی شارەكە، بەڵام لە ساڵی (۱٦۲٤) تا (۱٦۲٦) دووبارە كراوەتەوە بە والی.
– لە سەردەمی ئەودا بشێوی و مانگرتنێكی چەكدارانەی بەكر سوْباشی ڕووی دا كە ڕووداوەكە لە ساڵی (۱٦۲۱) تا ساڵی (۱٦۲۳) بەردەوام بوو، كە گەلێك كاری دڵتەزێنی لێ كەوتەوە.

* (بورهان بەرزنجی):-

– ناوی (بورهان كوڕی محەممەد بەرزنجی)یە.
– ساڵی (۱۹٦۰) لە قەزای خورماتوو لەدایكبووە.
– زانكۆی مووسڵی تەواو كردووەو مامۆستای ئامادەیی پیشەسازی دووزە.
– ساڵی (۱۹۷٤) دەستی بە شیعر كردووە.
– بەرهەمە چاكراوەكانی:
– (نزای زایەڵە)، بەغدا، ۱۹۹۹.
– (ماسولكەكانی جەستەم)، شیعر، بەغدا، ۲۰۰۰.
– (خەمەكانی نیشتیمانی من)، شیعر، بەغدا، ۲۰۰۲.
– (گۆرانییەكانی پەپولەكان)، شیعری فەوزی ئەكرەم تەرزی، وەرگێڕان، بەغدا، ۲۰۰۲.
– (شەش سوارەی گەرمیان)، شیعر، ۲۰۰٤.
– (بانێژەی غەمەكانی شارەكەم)، شیعر، هەولێر، ۲۰۰۵.
– (كركوك، الارض والتأريخ)، ۲۰۱٤.

* (بورهان ئەحمەد):-

– ناوی (بورهان ئەحمەد محەممەد)ە.
– ساڵی (۱۹۵۸) لە كەركوك لەدایكبووە.
– دیوانە چاپكراوەكانی:

– (كۆچی هەورەكان)، شیعر، كەركوك، ۲۰۰۰.
– (ئۆپەرێتەكانی هەزارەی سێیەم)، شیعر، چاپی یەكەم، كەركوك، ۲۰۰۲، چاپی دووەم، كەركوك، ۲۰۰۵.
– (هەرەشەكانی ژنێك)، شیعر، كەركوك، (۲۰۰۸).

* (بورهان جەلال مەعروف بەگ):-

– ساڵی (۱۹۱۲) لە گەرەكی بەگلەر لەدایكبووە.
– قوتابخانەی سوڵتانییەی لە كەركوك تەواو كردووە.
– دیوانێكی چاپكراوی شیعری هەیە.
– ساڵی (۱۹۹۲) كۆچی دوایی كردووە.

* (بورهان حیسامەددین):-

– ناوی (شێخ بورهانەددین كوڕی شێخ محەممەد حیسامەددین قادری)یە.
– ساڵی (۱۹۳۲) لە كەركوك لە خێزانێكی پەروەردەی ئایینی و كۆمەڵایەتی لەدایكبووە.
– ساڵی (۱۹۵٦) زانكۆی بەغدا كۆلێژی شەریعەی تەواو كردووەو بووەتە مامۆستا لە پەروەردەی كەركوك، بووەتە ئەندام لە لیژنەی وەریاكردنەوە لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی كەركوك.
– ساڵی (۱۹۸۸) لە دوای مردنی براكەی بووەتە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی حاجی (كەوسەر) بۆ بڵاوكردنەوەی تەریقەتی قادری.
– گەلێك بەرهەمی ئایینی بڵاوكردووەتەوە لە ڕۆژنامەكانی كەركوك و كتێبێكی مێژووی هەیە بە ناونیشانی (جوامع

کرکوك) کە دەستنووسە.
- لە (٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٤) کۆچی دوایی کردووە.

*** (بورهان کاکەیی - سەید بورهان کاکەیی):-**

- ناوی (بورهان سەید ڕەشید کاکەیی)یە.
- ساڵی (١٩١١) لە گوندی عەلی سەرای لەدایکبووە.
- هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو ئەوسا لەلای حەمە ئاغای خووبیلە فێری ڕێزمانی عەرەبی و وێژەی فارسی بووەو لە پاشا گەلێ مەڵبەندی کوردستان گەڕاوەو لە هەر کوێدا مەلایەکی بینیوە لەلای ماوەتەوەو وانەی خوێندووەو پاشان خەریکی کشتوکاڵ وماڵداری بووە.
- لە هۆنینەوەی هۆنراودا دەستێکی باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ ئاسك و شیرین و ڕەوانن.
- شاعیرێکی بەناوبانگ بووە لە بواری تەسەوفداو شارەزا لە خوێندنی مەقام.
- ساڵی (١٩٧٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** (بێبەش گۆیانی):-**

- ناوی شاعیر (عەبدوڵڵا کوڕی عەزیز کوڕی فەتاح)ە
- ساڵی (١٩٤٧) لە گەرمیان لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٥) لە حوجرەی مزگەوتی گوندی (گۆیان) دەستی بە خوێندن کردووە تا (عوامل، اظهار، تصریف)ی خوێندووە، پاشان چووەتە قوتابخانەو تا پۆلی یەکەمی ناوەندی خوێندووە لە شاری کفری.
- ساڵی (١٩٦٤) بووەتە پێشمەرگەو لە خەباتی چەکداری بەشداری کردووەو لە شیعرەکانیشدا ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکی نیشتمانی دیارە.
- لە (١٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە.

*** (بێبەش-نەجمەددین بەرزنجی):-**

- ناوی (مەلا نەجمەددین کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ حەمزەی بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٩١٥) لە گوندی فەقێ میرزا لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٢١) لەسەر داب و نەریتی ئەو ڕۆژگارە چووەتە حوجرەو فێری خوێندن و نووسین بووە.
- ساڵی (١٩٢٥) کاتێك باوکی کۆچی دوایی دەکات لە تەمەنی ده ساڵیدا مامی دەیباتە لای خۆی و ئەرکی پەروەردەکردنی دەگرێتە ئەستۆی خۆی.
- ساڵی (١٩٣٢) دەستی کردووە بە خوێندنی شیعرو نووسین و نازناوی (بێبەش) بووە.
- ساڵی (١٩٣٥) چووەتە لای (مەلا قادر) لە گوندی (چنگنیان)و هەندێ کتێبە ئایینییەکانی خوێندووەو لە ساڵی (١٩٣٨) بەردەوام بووە لە خوێندن لە گوندی (تلیان) لە ناحیەی (ئاغجەلەر)، زانستەکانی ئایینی لەلای (مەلا محەمەدی تلیانی)و (مەلا مەعسومی مەلا خدری هەورامی) و (مەلا عەزیز شلیەخانی)و (مەلا سەید ئیسماعیل مایلەیی) خوێندووە.
- ساڵی (١٩٤٢) چووەتە لای (مەلا مستەفا) لە هەولێرو ماوەیەکیش لە (کۆیە)و گەلێك شوێنی تری کوردستان دەبێت.
- ماوەیەك دەبێت مەلا لە گوندی (مام ڕەش)و (عەلی موسا) و (داڵاوا ڕووتە).
- لە بواری زانستی ئایینیدا کاری کردووە لە گوندەکانی ناحییەی شوان،
- لە (٣) ئابی ساڵی (١٩٩٠) کۆچی دوایی کردووە لە تەکێی (دەربەند بازیان) بە خاك سپێردراوە.

*** (بێدار):-**

- ناوی (شێخ بابا عەلی کوڕی شێخ لەتیفی شێخ سەلیمی هەنجیران)ە، نازناوی شیعری (بێدار)ە.
- ساڵی (١٨٩٤) لەدایکبووە.
- بەهۆی پەیوەندی بە حیزبی (هیوا)وە مامۆستا ڕەفیق حیلمی نازناوی (بێدار)ی پێ بەخشیوە.
- ساڵی (١٩٤٩) لە تەمەنی (٥٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

*** (بێدەنگ گەرمیانی - مەلا عەلی شێخ لەنگەر):-**

- ناوی (مەلا عەلی کوڕی مەلا ساڵح)ە، لەناو خەڵکیدا بە مەلا عەلی شێخ لەنگەر ناسراوە، نازناوی شیعری (بێدەنگ گەرمیانی) بووە.
- ساڵی (١٩٢٠) لە دێی سماقی گەرمیانی لەدایکبووە.
- لە (٢٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٦) لە تەمەنی ٨٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.
- گەلێك شیعری نیشتمانی و کۆمەڵایەتی هەبووە، بەڵام تاوەکو ئێستاکە بە چاپ نەگەیانراوە.

* ( پاکیزە ئەمین خاکی ):-

- ساڵی (١٩٢٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شاعیرێکی کوردەو بە زمانی عەرەبی شیعری نووسیوەو سێ دیوانی شیعری لێ بە جێماوەو ماوەیەك لە وڵاتی میسر دبلۆمی لە زمانی عەرەبی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە.

* پاکیزە سلێمان سدیق عەلی ئەلعەقار:-

- ساڵی ١٩٥١ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- (دار المعلمات)ی تەواو کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- مجموعة الشعرية باللغة التركمانية.
- مجموعة الشعرية باللغة العربية.
- خواطر ومقالات قصيرية باللغة الكردية.
- نووسینی ئەدەبی و شیعری هەیە بە زمانی عەرەبی و تورکمانی.

* ( پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری - دکتۆر پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری ):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (راپەرینی کەرکوك ساڵی ١٩٩١)، ٢٠٠٣.
- (شاری کەرکوك لەنێوان ساڵانی ١٩١٧-١٩٢٦)، توێژینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، ٢٠٠٧.
- هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفال لە باشووری کوردستان ١٩٨٨، بە هاوبەشی

* ( پۆڵا خانەقا- دکتۆر پۆڵا خانەقا ):-

- ساڵی (١٩٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٩) چووەتە ئەڵمانیا تا ساڵی (٢٠٠٣).
- ساڵی (١٩٨٩) بڕوانامەی ماستەری لە بواری جیۆلۆجیا وەرگرتووە.
- ساڵانی (١٩٩٥-٢٠٠٣) مامۆستای زانکۆی (گۆتن گن)ی ئەڵمانیا بووە.
- ساڵی (١٩٩٧) دکتۆرای لەسەر زانستی سروشتی نەوت بەدەستهێناوە.
- ئێستا سەرۆکی دەزگای تەکنەلۆژیاو توێژینەوەی کوردستانە لە شاری سلێمانی.

* ( پۆلس شلێتا مەلکۆ ):-

- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ذاكرة القصيدة، قصائد من الشعر السرياني المترجم)، چاپخانەی یەرموك، بەغدا، ٢٠٠٠.

* ( پیرەمویس کاکەیی - مام پیرەمویس- سیابیم ):-

- (کوڕی محەمەد کوڕی حەمە ئەمین)ە ناسراوە بە (سیابیم).
- لە بنماڵەی (خوبیلە زادەیە)و لە کاکەییەکانی موسەڵلایە گەلێ هۆنراوەی ئایینیی سۆفیزمی هۆنیوەتەوە.
- ساڵی (١٨١٧) لەدایکبووە، بەڵام هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بە ساڵی (١٨٢١)ی زایینیی بە ساڵی لەدایکبوونی دەکەن.
- لە تاقی جوانیدا چووەتە هەورامان و لەوێدا خەریکی خوێندنی رێزمانی عەرەبی و رەوانبێژی و وێژەی عەرەبی بووە.
- شاعیر سیابیم چەندین پارچە هۆنراوەی ئایینی سۆفیزمی رێورەچەی یارسانی نووسیوەتەوە.

- لە سەردەمی عوسمانیدا بووەتە ئەفسەر لە سوپای تورك بە پلەی سێ ئەستێرە لە ساڵی (١٨٤٧)، پاشان لەسەر داوای خۆی خانەنشین دەکرێت و خەریکی خوا پەرستی دەبێت.
- یەکێ بوو لە هۆنەرانی کوردو هۆنراوەکانی گەلێ تەڕو پاراوو ناسکن و ئەو لە وێژەو زمانی کوردی و عەرەبیدا شارەزا بووەو هەندێ هۆنراوەی لێ بەجێماوە کەلە بەیازو کەشکۆڵەکاندا تۆمار کراوە.
- پیرەویس یەکێکە لە قوتابییەکانی مام نەزەر گەرمیانی و شیعری بەشێوەزاری ماچۆیی نووسیوە.
- ساڵی (١٨٩٤)ی زایینیی کۆچی دوایی کردووە.

* ( پیر ئەحمەد کەرکوکی ):-

- ناوی (پیر ئەحمەد کەرکوکی کوڕی نەسروڵڵای شارەزووری)یە.
- ساڵی (١٠٨٣)ی زایینیی لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لەو شاعیرە کەرکوکیانەی کە لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا ژیاوەو لە ناوەڕاستی هەمان سەدەدا کۆچی دوایی کردووە.

- هەر لە منداڵییەوە فێری زانستە ئایینییەکان بووە، ماوەیەك لەلای باوکی ڕێزمانی عەرەبیو وێژەی فارسی خوێندووەو لە پاشان بە فەقێیەتی بە زۆربەی شارەکانی هەورامانو شارەزووردا گەڕاوەو لە هەر کوێدا مەلایەکی بینیوە لەلای وانەی خوێندووەو هەتا سەرئەنجام لەلای مەلا عەبدولی شارەزووری خوێندنەکەی تەواو کردووەو گەڕاوەتەوە کەرکوكو پاشماوەی ژیانی بە وانە ووتنەوەو ڕێنوێنی خەڵك بردووەتە سەر.

- یەکێك بووە لەو حەفتاو دوو کەسەی شێخایەتی سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی.

- لە تاف جوانیدا لەگەڵ (زەڕێ خانمی کچی قەلەندەربەگ)دا زەماوەنی کردووەو چوار کوڕی لێ بووە بە ناوانی (قانوون بەگ، میرە بەگ، شالی میرزا، دەروێش، کە دەروێشو شالی چوونەتە قەسری شیرینو ئیتر نەگەڕاونەتەوە، قانوون بەگیش چووەتە تەلەعفەرو لەوێدا نیشتەجێ بووەو نەوەکانی لەوێدا بە بنەماڵەی سەی یونس ناسراون.

- لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا دەستێکی بەرزو باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ تەڕو پاراو و ناسکنو زۆربەی هۆنراوەکانی لە پەرتووکی سەرئەنجامدا تۆمار کراوە.

- لەساڵی (١١٦٧)ی زاینیی کۆچی دوایی کردووەو لە گەڕەکی موسەڵلا نێژراوە.

* ( پیرۆز حەسەن کەنووش ):-

- ئافرەتێکی کوردی شاعیرە، کچی شاعیر (حەسەن کەنووش)
ە کە لە بنەرەتدا دەگەڕێتەوە سەر هۆزی دەلۆ.
- ساڵی (١٩١١) کۆچی دوایی کردووە.
- گەلێك بەرهەمی شیعری هەیە بەڵام لە ناوچووە.

* پیرۆت تاڵەبانی:-

- ناوی (پیرۆت شێخ فازڵ کوڕی شێخ محەمەد کوڕی ڕەئوف تاڵەبانی)یە.

- کەسایەتییەکە وەکو:- پارێزەر، سیاسی، وەرزشوان، دۆستی مۆسیقاو مەقامی کوردی.

- ساڵی (١٩٤٣) لە قەڵادزێ لە دایکبووە.

- سەرەتاییو ناوەندییو دواناوەندیی لە کەرکوك تەواو کردووە.

- ساڵی (١٩٥٥- ١٩٥٦) قۆناغی خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە.

- ساڵی (١٩٥٩- ١٩٦٠) قۆناغی ناوەندی دەبڕێت.

- ساڵی (١٩٦٢- ١٩٦٣) قۆناغی دواناوەندی دەبڕێتو دەچێتە کۆلێژی ماف لە بەغدا.

- ساڵی (١٩٨٧) لە سلێمانی دەستگیرکرا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە، دوای ماوەیەك بەر دەبێت.

- ساڵی (١٩٦٨) دەبێتە بەڕێوەبەری ناحیەی (سەنگاو).

- ساڵی (١٩٦٨) بڕیاری دروستکردنی یانەیەکی وەرزشی کرد بەناوی یانەی سۆلاف.

پێشمەرگەکانی ناوچەی کەرکوك لە شۆڕشی ئەیلوولدا

# ئەلبومی پێشمەرگە

ساڵی ١٩٨١ یاسین بێدەریی، نەناسراو، سەرباز مام حوسێن، ڕۆکان، شەهید باپیرە

ساڵی ١٩٨٣ سەرباز مام حوسێن، نەناسراو، ڕۆکان، شەهید مەلا ئاراس

ساڵی ١٩٨٢ ئەحمەد شێخ سەعید، ئەحمەد کرێکار، شەهید شۆڕش، ڕۆکان، رفعەت عەبدوڵڵا

تالب، هیوا رەش، سامان، عەزە سوور (خاڵخالان، ١٩٨٩، پارتیزانی)

چەند پێشمەرگەیەکی کەرکوک

پۆلێک پێشمەرگەی پارتیزانی کەرکوک

تالبو شەهید یونسو پۆلا

سەرباز مام حوسێن، عەلی بچکۆل، وەستا سابیر، مەلا ئاراس

شێخ محەمەد، ئازاد هەورامی

تالب مام فاروق‌و ئاسۆ قەرەناوی‌و عەزە سوور‌و هیوا رەش (پارتیزان)

ساڵی ١٩٨٩ ناسراوەکان (حەسیب حاجی رەزا، رۆکان، سیروان نۆشکە، عەلی حاجی ئەحمەد (تیپی ٢١ی کەرکوک)

رۆکان، فەوزی مەلا عەبدولڕەحمان

شەهید ئاکۆ، چالاک، محەمەد، چەتۆ (پیران، کۆنگرەی یەک)

تالب مام فاروقو ئاسۆ قەرەناویو عەزە سوورو هیوا رەش (پارتیزان)

هیوا ڕەش، شەهید ئاکۆ، شەهید فاقە، سەرکەوت، مەلا شاخی

عەزە سوورو سامانو تالب مام فاروقو ئاسۆ قەرەناویو دڵزار کۆییو شەهید پشکۆ

ساڵی ١٩٨٣ ئازاد گوڵچی، شەهید عارف دالەوا، هاوڕێ کاوە، ڕۆکان

سیروان جەلال، ڕۆکان

تالب مام فاروقو هیوا رەشو عەزە سوور

راوەستاوەکان (چەتو، دلزار، شەهید پشکو، عەزە سوور)،
دانیشتوەکان (تالب، هیوا رەش، محەمەد پەڵادزێی، مام رەسوڵ، سامان چاوڕەش) (خاڵخاڵان، ١٩٨٩، پارتیزانی)

عەزە سوورو هیوا رەشرو شەهید پشکو

ساڵی ١٩٨٣ پیران، رۆکان، هاوڕێ کاوە

رلوەستاوەکان: (رۆکان، سەرباز مام حوسێن، نەناسراو)، دانیشتووەکان: (نەناسرلو، یاسین بێدەریی)

ناسراوەکان ( شەهید یونس، شەهید رزگار چیمەنی، کەریم بیکەیسی)

خەمان گەزلان، شەماڵ، رۆكان

خۆ ئامادەكردنی پارتیزانەكان بۆ دابەزین، رەتڵی سورداشو كۆسرەت (زەڵی)

تالب مام فاروقو هیوا رەشو عەزە سوور

چەند پێشمەرگەیەکی کەرکوک

١٩٨٥ کوڕی شێخ عەزیز حەسەن و کاکە حەمەی شاکەل و شێخ حەسەن، لەگەڵ شێخ سەعید

ساڵی ١٩٨١ ئەحمەد شێخ سەعید، ئازاد گوڵچی، هیوا چاوشین، رۆکان، مام رۆستەم، ئەحمەد رێکار، عەلی حاجی ئەمجەد (تیپی ٢١)

سالّی ١٩٨٣ خەمان گەزلان، خالید عەسکەری، رۆکان

پۆلێک پێشمەرگەی کەرکوک

چەند پێشمەرگەیەکی کەرکوک

ژمارەیەك چەکداری کورد لە سنووری زەنگابات کە بەشداربوون لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠

*** (تاریق کاریزی):-**

- له (٩)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٩) له گوندی کاریزی سەر به تەقتەق لەدایکبووه.
- خوێندنی سەرەتایی له کوت و خوێندنی ناوەندی ئامادەیی له کەرکوك و پەیمانگای تەکنیکی له بەغدا تەواو کردووه.
- ساڵی (١٩٨٥)ەوه ئاوارەیه له هەولێر.
- له گەلێك گۆڤارو ڕۆژنامەی وەکو (برایەتی)و (هاواری کەرکوك)و (پاسەرە)و (نەوشەفەق)و (کشتوکاڵ)و (صوت الآخر)و (بزاو)و (التآخي) کاری کردووه.
- ماوەیەك کاری کردووه له ڕۆژنامەی (پاسەرە).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (کورە کەچەڵەو چەند پارچە شیعرێکی فۆلکلوری)، بەغدا، ١٩٨٣.
- (مافەکانی مرۆڤ)، وەرگێران، بەغدا، ١٩٩١.
- (حەوت هاوکێشەی فەلسەفە)، هەولێر، ١٩٩٤.
- (هاوکێشەکانی فەلسەفە)، وەرگێران، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٧، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (سام و جەمشیر)، هەولێر، ١٩٩٩.
- (ڕێبازە هاوچەرخەکانی فەلسەفە)، هەولێر، ٢٠٠١.
- (ڕۆژنامەگەری کوردی له عێراقدا)، فاروق عەلی عومەر، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠١.
- (نیگار بۆ قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی)، وەرگێران و دارشتنەوه، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٤، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (نیگار بۆ قۆناغی خوێندنی سەرەتایی)، ئامادەکردنی عەبدوڵڵا محەمەد ساڵح، وەرگێران و پێداچوونەوه، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٦، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (هونەری سایکۆلۆژی منداڵ)، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (ستاتیکا و شاکاری کوردی)، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧. بەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (سەربردەی فەلسەفە)، ویل و دیورانت، وەرگێران، بەرگی یەکەم. دهۆك، ٢٠٠٧.
- (بەر له خەزان)، ڕەخنەی شێوەکاری، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (دارو دەوەن له کوردستاندا)، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٩.
- کردنەوەی کتێبخانەی کاریزی له گەڕەکی باروتخانه، ساڵی ٢٠١٥.

*** (تاقی بەگ-مەستی):-**

- ناوی شاعیر (تەقییەدین کوڕی مستەفا ئاغا کوڕی حەسەن ئاغا)یه، نازناوی شیعری (مەستی)یه.
- ساڵی (١٩٣٦) کۆچی دوایی کردووه.

*** (تالیب ئەلماس حوسێن کاکەیی):-**

- ساڵی (١٩٥٤) له کەرکوك لەدایکبووه.
- ساڵانی (١٩٦٥-١٩٧٠) بەشداری پێشانگاکانی قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی له کەرکوك کردووه.
- ساڵی (١٩٧١-١٩٧٧) بەشداری پێشانگای پەیمانگای هونەرەجوانەکانی بەغدای کردووه و تاکو ئێستاکە بەردەوامه له کردنەوەی پێشانگاکان.
- ساڵی (١٩٧٤) بەشداری فیستیڤاڵی هونەری کوردی کردووه له بەغدا.
- ساڵی (١٩٧٦) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوه له بەغدا.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٧-٢٠٠٠) بەشداری پێشانگا هاوبەشەکانی کەرکوك و بەغدای کردووه.
- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری پێشانگایەکی کردووه له هۆڵەندا.
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری پێشانگایەکی کردووه له بەلجیکا.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری پێشانگایەکی کردووه له دیستریبرگن له بەلجیکا.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگایەکی کردووه له ئەڵمانیا.
- ساڵی (٢٠٠٥) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوه له پەیمانگای هونەره جوانەکان له کەرکوك.

*** (تالیب ڕەشید یادگار - دکتۆر تالیب ڕەشید یادگار):-**

- له سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لەسەر کوردایەتی، بەعسیه درندەکان ڕاویان نا، ناچار هەڵات و ڕووی کرده هەندەران تا ئەمڕۆ نه گەڕاوەتەوه.

* (تالیب عەبدولکەریم مستەفا):-

- ساڵی (١٩٦٧) لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٤) دەستی بە کاری شانۆیی کردووە.
- بەشداری ئەم شانۆگەریانەی کردووە:
- (هەڵەشەو تاوان)، ١٩٨٤.
- (دەنگی زەنگۆڵەکان)، ١٩٨٥.
- (مرۆڤ و شارەکەی)، ١٩٨٦.
- (دەریا)، ١٩٨٦.
- (چارەنووسی ئادەمیزاد)، ١٩٨٧.
- (رووبار)، ١٩٨٧.
- (مرۆڤێکی ئاسایی)، ١٩٨٧.
- (وانەیەك لە بێکەسەوە)، ١٩٨٨.
- (مامەیار)، ١٩٨٩.
- (بینایی)، ١٩٩٢.
- (حیزبی سەلامەت و کەرامەت)، ١٩٩٣.
- (تۆ تۆ کێیت)، ٢٠٠٠.
- لەم شانۆگەریانەش وەکو دەرهێنان بەشداری کردووە:
- لە دەرهێنانی (کەرنەڤاڵی ستەم دیدەکان)، ١٩٩٦.
- لە دەرهێنانی (مەرگ و تارمایەکان)، ١٩٩٧.
- لە دەرهێنانی (بێ ناسنامەکان)، ١٩٩٧.
- (کێشەی سێبەری کەرەکە)، ١٩٩٨.
- (کەرنەڤاڵی ماڵئاوایی و فەنابوون)، ٢٠٠١.
- (رۆژگارەکانی رەتدەبن)، ٢٠٠٤.
- (هەناسەیەك بۆ ئەنفال)، ٢٠٠٥.
- (گۆدۆ لێرەیە)، ٢٠٠٥.
- (نیوەکەی تر)، ٢٠٠٦.
- (چی تر چاوەڕوان نابین)، ٢٠٠٧.
- (گەمەی کورسییەکان)، ٢٠٠٧.
- (لیدی ماکبیس)، ٢٠٠٧.
- (رۆحە بێ نازەکان)، ٢٠٠٨.
- (تابوتێك لە ئومێد)، ٢٠٠٩.
- (سەرداب)، ٢٠١٠.
- (کۆڕاڵی چراکان)، ٢٠١٠.
- (خەنجەر)، ٢٠١١.
- (ئەو پیاوەی بوو بە قوربانی)، ٢٠١٢.
- (رۆژی لەدایکبوونم)، ٢٠١٣.
- (ئۆپەرێتی ژیانەوە)، ٢٠١٣.
- (هابیل و قابیل)، ٢٠١٤.

* (تالیب رەئووف وەنداوی):-

- شاعیرو نووسەر لە ساڵی (١٩٤٢) لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٥) زانۆکی بەغدای بەشی زمانی عەرەبی تەواو کردووە، دیوانێکی شیعری چاپکراوی هەیە.
- لە (٢٠)ی ئابی ساڵی (٢٠١٢) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمەکانی:-
- ملاك في الأرض، دیوانه شیعر، ٢٠١١

* (تانی - سانی):-

- ناوی (تانی عەبدولقادر)ە.
- ساڵی (١٩٥٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدایە لە ساڵی (١٩٧٦).
- ساڵی (١٩٩٠)ەوە لە وڵاتی دانیمارك گیرساوەتەوە.
- دبلۆمی لە ئەکادیمیای دانیمارك لە مێژووی هونەر خوێندووە.
- راوێژکاری هونەری مۆزەخانەی (ئاهوس)ە لە وڵاتی دانیمارك.

* (تاهای حەساری گەورە - مەلا شێخ تاهای حەساری گەورە):-

- ناوی (شێخ تاهای کوڕی شێخ قاسمی کوڕی خەلیفە ئەحمەد کوڕی عەلی فەرهاد بەگی گلی)ە لە دێی حەساری گەورە لە ناوچەی بیبانی گەورە لە کەرکوك لە ساڵی (١٩٣١) هاتووەوە دنیاوە.
- ماوەیەك خوێندنی ئایینی لەسەر دەستی شێخ عەبدولحەکیم و شێخ رەئووف خوێندووە و دوای ماوەیەك چووەتە پردێ و خوێندنی (فقه نحو و صرف)ی لەلای شێخ یوسف خوێندووە و لەدوایدا زانستی بەلاغەی لە خانەقای شێخ عومەر گومبەتی تەواو کردووە، هەروەها زانستی فەرائیزی لەلای شێخ ئەحمەدی فەیلەسووف تەواو کردووە.

- ساڵی ١٩٥٦ لەدوای ئەوەی خوێندنی لەلای مەلا عومەر گومبەتی و شێخ عەبدولمەجیدی قوتب بڕوانامەی ئایینی وەرگرتووە.
- ساڵی ١٩٥٧ بووەتە ئیمام خەتیب لە گوندی مام ڕەش.
- ساڵی ١٩٦١ چووەتە بەغدا و بەشداری خولی زانستە شەرعییەکانی کردووە و بڕوانامەی بەرزی بەدەستهێناوە.
- ماوەیەك سەرۆکی لیژنەی فتوا بووە لە پارێزگای کەرکوك.
- ساڵی (١٩٦٥) دامەزراوە بە ئیمامو خەتیب لە ئەوقافی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٨٨) خۆی خانەنشین کردووە.
- لە ٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١١ کۆچی دوایی کردووە.

*** تاها حەمزەلی:-**

- ساڵی ١٩٥٦ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- حمزەلی شهیدلری، ٢٠٠٨
- کویوموزون هواسی، ٢٠٠٨
- شهر یمین سەس، ٢٠١٠.

*** (تاهای کەرکوکی - مەلا تاهای کەرکوکی):-**

- ساڵی (١٨٧٦) لە گەڕەکی موسەڵلا لەدایك بوو.
- برای مەلا (سابیر) بووە کە یەکێك بووە لە مەقام زانەکانی کەرکوك.
- مەلا تاها باوکی (دکتۆر خەلیل تاها)یە کە لە ڕەگەزا کوردی لوڕن، خزمیان زۆرە لە دێی بنگردی لای چەمچەماڵ.
- ساڵی (١٩٢٥) لە بەغدا گەلێك مەقامی عێراقی تۆمار کردووە کە نزیکەی (٤٠) قەوان بووە، نازناوی (بولبولی عێراق) بووە.
- لە (١٣)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٩) کۆچی دوایی کردووە.

*** (تاهیر فوئاد):-**

- ناوی (شێخ تاهیر کوڕی شێخ عەبدوللەتیف بێدەری) یە، ناسراوە بە تاهیر فوئاد کە لە بنەچەدا لە سەیدەکانی بەرزنجەیە.
- ساڵی (١٨٩٢)ی زایینی لە شاری کەرکوك هاتووەتە دنیاوە.
- هەر لە منداڵییەوە چووەتە حوجرەو لای مەلا عەلی حیکمەت بە باشی خوێندوویەتی.
- هەر جەنگی جیهانی یەکەم بەرپابوو (١٩١٤-١٩١٨)، تاهیر فوئاد لە هەڵمەتێکی ڕەشبگیریی عوسمانیدا گیراو بە سەربازی ڕەوانەی هەرێمی ئازربایجانی ئێران کرا، ولەوێ زۆری نەخایاند ئاگری غەریبیو دووره وولاتێ وتاسەی بینینی گەلو نیشتمان ئۆقرەی لێدەبڕن ناچاری دەکەن دەرفەرتێك بقۆزێتەوەو هەڵبێتو خۆی بگەیەنێتەوە شاری کەرکوك.
- ئیدی سەر لە نوێ لەوێندەر ساڵانی تەمەنی دەست پێدەکاتەوە، ئەوجا لە تەمەنی (٣١) ساڵیدا خێزان پێکەوە دەنێتو دەبێتە خاوەن ماڵێکی ئاوەدانو پەرتوکخانەیەکی دەوڵەمەند وپلەو پایەیی کۆمەڵایەتیو شاعیریو ڕۆشنبیریی لە نێو خەڵکدا پترتر دەبێت، بەو هۆیەوە زۆر لە پیاو ماقوولو ئەدیب وزانای ئایینیو نیشتمانپەروەران، ڕۆژانە لە دەوری کۆدەبنەوەو شەوانە تا درەنگ وەخت لەگەڵیدا سەرگەرمی قسەوباس دەبوون.
- تاهیر فوئاد کەسایەتیو شاعیرێکی خۆشەویستی سەردەمی خۆی بوو، ساڵی (١٩٢٥) یا (١٩٢٧) کۆچی دوایی کردووە.
- ئەوەی بڕوانێتە شیعرەکانی تاهیر فوئادو بیانخوێنێتەوە تێدەگات، ئەم شاعیرە تا چ ڕادەیەك شەیداو دڵسۆزی گەل و نیشتمانەکەی بووە.

*** (تەحسین جوامێرد):-**

- ناوی (تەحسین محەمەد خورشید عەباس ئاغا جوامێرد)ە، بەناوبانگە بە (کەرکوك ئۆغلو).
- ساڵی (١٩٤٠) لە گەڕەکی (حەمام) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی (تاهیرە) تەواو کردووەو ناوەندیشی لە (حکمة) بڕیوە.
- ساڵی (١٩٦٣-١٩٦٤) (المعهد المهني للسكرتارية) لە بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٥٩) وەکو هونەرمەندێك لە ڕادیۆو تەلەفیزیون کاری کردووە.
- یەکێکە لەوانەی پێشرەوە لە بواری گۆرانیو موسیقای

تورکمانی.
- نزیکەی ۱٥۰ گۆرانی تۆمارکراوی تورکمانی هەیە.
- ساڵی (۱۹٦٦) زیاتر لە ۲۰ گۆرانی لە ڕادیۆی ئەستەمبوڵ و ئەنقەرە تۆمار کردووە.

* تەحسین نامیق عەبدوڵڵا:-

- لەدایکبووی ساڵی (۱۹٦۰)ی شاری کەرکوك.
- هەر سێ قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (۱۹۷۷) پەیوەندیی بەریزەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردو لە چوارچێوەی کۆمیتەی ئاگر ڕێکخرا. ئەوەی لەناو ڕێکخستنەکانی کەرکوك.
- لە سەرەتای هەشتاکاندا گورزی کاریگەرییان لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانەوە تێسرەوێنرا، لە هەلومەرجێکی سەختدا بەشداریی کارای لە بنیاتنانەوەی تەونی ڕێکخستنەکاندا کرد.
- ساڵی (۱۹۸۲) لێپرسراوەتیی پۆلی شەهید عەلی ساڵحی ڕێکخراوی کەرکوکی پێ سپێردرا.
- ساڵی (۱۹۸۳) بووە ئەندامی ڕێکخراوی کەرکوك و لێپرسراوی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن.
- ساڵی (۱۹۸٤) یەکێ لەو ١٦ ئەندامەی ڕێکخراوی کەرکوك بوو کە لە کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە لە مێرگەپان نوێنەرایەتیی کەرکوکیان کرد.
- ساڵی (۱۹۹۰) خوێندنی ئەکادیمیی لە کۆلیژی کشتوکاڵی زانکۆی بەغدا تەواو کردو بڕوانامەی بە کالۆریۆسی بەدەستهێنا.
- ساڵی (۱۹۹۱) لە ئۆرگانەکانی ڕێکخستنی ناوخۆ، لێپرسراوی کۆمیتەی کۆ - کەرکوك بوو.
- ساڵی (۱۹۹۸) کەرکوکی بەجێهێشت و لە سلێمانی نیشتەجێ بوو. هەر لەو ساڵەشدا کرایە ئەندامی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە.
- سەرباری کارکردنی لە مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە، لێپرسراوەتیی سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنەکانی ناو پارێزگای کەرکوکیشی گرتە ئەستۆ.
- ساڵی (۲۰۰۲) بووە جێگری لێپرسراوی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە. هەر لەو ساڵەشدا بەشداریی لە کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراق لە شاری لەندەن کرد.
- ساڵی (۲۰۰۳) لە میانەی پرۆسەی ڕووخاندنی ڕژێمی عێراقدا، بەهەماهەنگی لەگەڵ سەرکردایەتیی یەکێتیدا، ئەرکی ڕێنمایی کردنی ڕێکخستنەکانی ناو کەرکوك و دروستکردنی شانەی چەکدارو دابین کردنی پێداویستییەکانی جموجۆڵی پێویستی ناو شاری کەرکوکی گرتە ئەستۆ.
- لەماوەی ساڵانی (۲۰۰۳- ۲۰۰٦) بریکاری وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری بوو لە ئیدارەی سلێمانیی حکومەتی هەرێمی کوردستان.
- ساڵی (۲۰۰٦) بووە جێگری یەکەمی لێپرسراوی مەڵبەندی ۲ی ڕێکخستنی کەرکوك.
- ساڵی (۲۰۰۸) کرایە جێگری لێپرسراوی مەکتەبی بیرو هۆشیاری لە سلێمانی و پاش پێکهێنانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران لە ساڵی (۲۰۱۰) وەك یاریدەدەری لێپرسراوی ئەکادیمیا کاری تێدا کردو لەو ماوەیەدا سەرپەرشتیی دەرکردنی زنجیرەی نامیلکەکانی هۆشیاریی کرد کە تایبەت بوون بە تاوتوێکردنی بابەتی سیاسی و فیکری جۆراوجۆر.
- ساڵی (۲۰۱۲) بۆ جاری دووەم کرایەوە جێگری لێپرسراوی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە.
- دیارترین بەرهەمەکانی: " ناوچە جێناکۆکەکان: ئایندەو ئاسۆکانی چارەسەر" (۲۰۱۰).

* (تەحسین شێخ حەبیب تاڵەبانی):-

- ساڵی (۱۹۳۳) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (۱۹٥۷-۱۹٥۸) لە کەرکوك خولێك کراوە بۆ پێگەیاندنی مامۆستا، بەشداری ئەو خولەی کردووە و ساڵی (۱۹٥۸) بووەتە مامۆستای قوتابخانەی ناوچەی (لەیلان) و لە گوندی (یەحیاوە) لە ماڵی شێخ نەجیب تاڵەبانی نیشتەجێ بووە.
- ساڵی (۱۹٦٤) ژنی هێناوە، خێزانەکەی (فەوزیەخان) کچی شێخ حسامەدین تاڵەبانی بووە کە شێخی تەکیەی کۆیە بووە و خوشکی بەڕێز (مام جەلال)ە.
- ساڵی (۱۹٦٥) بە ئینتساب لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت لە کۆلیژی یاسا وەرگیراوە، دوو ساڵ بەردەوام بووە، بەڵام دواتر لەبەر ئاڵۆزی باری کوردستان وکاری سیاسی نەیتوانیوە بەردەوام بێت.
- ساڵی (۱۹٦۱) پەیوەندی کردووە بە پارتی دیموکراتی

کوردستان، له لیژنەی کەرکوك‌و گەرمیان چالاکی زۆری هەبووەو نازناوی (کاوە) بووە.

- سالی (١٩٦٢-١٩٦٦) چەند جارێك لەلایەن حکومەتی بەغداوە دەستگیرکراوە وچەند مانگێك لە گرتووخانەی بەدناوی (سەرای بەغدا) بەند دەکرێت.
- دواتر بە هەولێکی زۆر ڕزگاری بووەو گەراوەتەوە کەرکوك لە قوتابخانەی (نجاح) بووە بە مامۆستاو دواتر یاریدەر بووە.
- لە هەمان سالدا بەشداری خولی بەڕێوەبەردنی کتێبخانەی کردووە لە زانکۆی موستەنسریەیی بەغدا، دواتر لە سالانی نێوان (١٩٦٨- ١٩٨٨) بووەتە ئەمینداری کتێبخانەی گشتی کەرکوك.
- دوای سالی (١٩٧٥) تەرحیلی باشووری عێراق، شارۆچکەی رفاعی کراوە، دواتر گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی بەلام دەوامی نەکردووە، هەتا دواتر گوێزراوەتەوە بۆ پارێزگای کەرکوك بۆ سەرکارەکەی، بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی کەرکوك.
- سالی (١٩٩١) دوای ڕاپەڕینی کوردستان لەبەر باری ئالۆزی کەرکوك، شێخ تەحسینی کەرکوکی بە جێ هێشتووە بە خێزان‌و منالەوە لە کۆیە نیشتەجێ بووە.
- سالی (١٩٩٣) تووشی نەخۆشی دل بووەو لە (٢٩)ی کانوونی یەکەمی سالی (١٩٩٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** (تەحسین شەعبان-شێخ ئۆغلو):-**

- سالی (١٩٤٥) لە گەرەکی (ساری کەمەیە) لەدایکبووە.
- خوێندنی پێنجی ئامادەیی لە سالی (١٩٦١) تەواو کردووە.
- سالانی (١٩٦٤-١٩٦٥)، پەیمانگای هونەرە جوانەکانی، بەشی شانۆی تەواو کردووە.
- سالی (١٩٦٥) لە چالاکی قوتابخانەکان دامەزراوە.
- پێش دامەزراندنی تیپی (المجددون في المسرح العراقي) بەشداری یەکەم فیستیڤالی شانۆی کردووە لە کەرکوك‌و بەیەکەم دەرچووە کە دووشانۆ گەری پێش کەش کردووە لە شانۆی (ناماقوول).
- لەنێوان سالانی (١٩٦٤-٢٠٠٥) نزیکەی (١٥٠) شانۆو تەمسیلی تەلەفیزیۆنی پێشکەش کردووە لە ئامادە کردن‌و دەرهێنان‌و نووسین بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی‌و تورکمانی.
- سالی (١٩٨٢)ەوە کەرکوکی بە جێ هێشتووەو ڕۆیشتووەتە هەولێرو لە سالی (١٩٨٤-١٩٩٩) لە چالاکی قوتابخانەکان دامەزراوە.
- سالی (١٩٩١)ەوە لە سیاسەت کاری کردووەو ئەندامی یەکێك بووە لە حیزبە تورکمانییەکان.
- گەلێك لێکۆڵینەوەی لە ڕۆژنامەکانی (تورکمن ایلی)، (قرداشلو)، (الحقیقة) بلاوکردووەتەوە.
- چەند کتێبێکی هەیە کە ئامادەیە بۆ چاپ:-
- (من الذاكرى التركمانية التاريخية).
- (مسرحية تركمانية للأطفال).
- (تأريخ مسرح كركوك والمسرح التركماني من ١٩١٦-٢٠٠٣).
- سالی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

*** (تەحسین عەسکەری):-**

- ناوی نووسەر (تەحسین کوری مستەفا کوری عەبدولرەحمان عەسکەری)یە، لە بنەڕەتدا خەلکی دێی (عەسکەر)ن.
- سالی (١٨٩٢) لەدایکبووە.
- پاش ئەوەی خوێندنی لە قوتابخانە سەربازییە بالاکان

سالی ١٩٣٠ تەحسین عەسکەری لەگەل کۆمەلێك لە مەلاکانی کەرکوك لە ڕاستەوە مەلا سابیر، مەلا ڕەئووف، مەلا ناسیح، شێخ عەبدولستار ، شێخ محەمەد عەلی تالەبانی، تەحسین بەگ، مەلا ڕەزا، مەلا سلێمان

تەواو کردووە بووەتە ئەفسەر لە سوپاو گەلێك پەلەو پایەی سەربازیی و مەدەنی و کارگێڕی بەدەستهێناوە.
– شارەزایە لە زمانەکانی کوردیی و عەرەبی و ئینگلیزیی و فەرەنسی.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (الثورة العربية الكبرى والثورة العراقية)، لە دوو بەرگدا، ١٩٣٦، ١٩٣٨.
– ساڵی (١٩٤٧) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( تەحسین نورەددین قائیلی ):-**

– یەکێکە لە شاعیرە تورکمانەکانی کەرکوك و لە ساڵی (٢٠٠٥) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( تەلعەت نیعمەت بەیاتی ):-**

– ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوك لە گەڕەکی بەگلەر لەدایکبووە.
– شاعیرو خەت خۆشە، دەستێکی باڵای هەیە لە خۆشنووسی وشیعرو چیرۆك.
– بەکالۆریۆسی لە زمانی عەرەبی لەنێوان ساڵانی (١٩٨٤–١٩٨٥) لە زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
– (بیوت و زخارف)، شیعر بە زمانی عەرەبی، ٢٠٠٢.
– (صبابات)، شیعر بە زمانی عەرەبی، ٢٠٠٣.

*** تەقیەدین ساقی ساڵەیی:-**

– ساڵی ١٩٤٣ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ماستەری لە زانستی قورئان بەدەستهێناوە.
– بەرهەمەکانی:-
– الحكم والأمثال في الاخلاق، ٢٠١٠
– التوسل والوسيلة إلى الله، ٢٠١١
– النساء في القرآن الكريم، ٢٠١٢
– الضمير مكارم الاخلاق، ٢٠١٤

*** ( تەیب نۆغلی-مەلا عەبدوڵڵا ):-**

– ناوی عەبدوڵڵا یە کە نازناوی شیعری (تەیب نۆغلی)یە.
– ساڵی (١٨٣٦) لە گەڕەکی (مەیدانی) قەڵا لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( تەیب جەبار ):-**

– یەکێکە لە نووسەرو ئەندازیارە بەناوبانگەکانی کەرکوك توانای لە گەلێك پرۆژەدا بە دیارە.
– ساڵی (١٩٥٤) لە دێی تەپەلووی قەرەحەسەن هاتووەتەوە دنیاوە.
– ساڵی (١٩٧٢) ئامادەیی تەواو کردووە لە کەرکوك.
– ساڵی (١٩٧٦) کۆلیژی ئەندازیاری سلێمانی تەواو

کردووە.
– گەلێك نووسن و شیعری لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا هەیە.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (لاواندنەوەی خۆڵەمێش)، دیوانی شیعری، ٢٠٠٩.
– (گەڕان بە دوای ئیقاعی ووشەدا)، ٢٠٠٩.
– (چەند پرۆژەیەك بۆ تێکدانی ڕەوشی ئاو).
– گەڕان بەدوای ئیقاعی وشەدا، چاپی دووەم، ٢٠١٥
– سەردەمانێ تاریکی سپی بوو، ٢٠١٥
– ماوەیەك وەکیلی وەزیری ئەشغاڵ بووە.
– ئێستا بەڕێوەبەری کۆمپانیای (نەورۆز)ە لە سلێمانی.

*** ( تەیب غەفور جەژنی ):-**

– ساڵی (١٩٥٢) لەدایکبووە.
– دەنگ خۆش و گۆرانی بێژ.

*** ( تەیفوور فەتاح - مەلا تەیفور ):-**

– ناوی تەواوی (تەیفور فەتاح)ە لە ساڵی (١٩٢٧)ی زایینی لە گوندی (زەنگنە)ی سەر بە ناحیەی (قەرە حەسەن)ی پارێزگای کەرکوك لەدایکبووە.
– بۆ فێربوونی (زانستی شەرع) چووەتە ناو شاری کەرکوك ولە لای مامۆستای پایە بەرز (مەلا عەبدولمەجیدی قوتب) لە مزگەوتی (گڵچییەکان) ئەو زانستەی خوێندووەو زانستی سەرف ونەحو لەگەڵ گوڵستانیشی هەر لە وێ خوێندووە، پاشان بۆ زیاتر زانستی ئایینی وە دەست هێنان چووەتە

* ( تقلی ئەحمەد ئەفەندی ):-

– لە کەرکوك لەدایکبووەو گەورە بووە، ئینجا لە کەرکوك رۆیشتووە، گەلێك کاری بەڕێوەبەری گەورەی بینیووە تا بووە بەپلەی (دیوان افندی) لە ئاقاریَ (ئەفلات)و (بوغدان) لە سەرەتای سەردەمی سوڵتان مەحموود کۆچی دووای کردووە، شاعیرو ئەدیب بووە.

* ( توانا حەمە نوری ):-

– ناوی (توانا محەمەد نوری ستار)ە.
– ساڵی (١٩٨١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (لۆلیتا)، نووسینی: ڤلادیمێر نابۆکۆڤ، وەرگێڕان، ٢٠١٤.

* ( تۆفیق ئەرکان ):-

– ساڵی (١٨٧٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– لەژێر دەستی مەلا محەمەدو مەلا مەحموودی مەزناوەیی زانستەکانی ئایینی خوێندووەو ماوەیەك لەبەغداو ئەستەمبوڵ قوتابخانەی جەنگی سەربازی تەواو کردووە بە پلەی روکن.
– بەرهەمەکانی: (جغرافیای عسکری)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (مکتب الحربي)، ئەستەمبوڵ، ١٩٠٩.
– ساڵی (١٩١٩)دا کۆچی دوایی کردووە.

* ( تۆفیق ئاغای گەلاڵی ):-

– پیاوێکی زیرەك و شاعیریش بوو لە ناوچەی گەرمیان.

* ( تۆفیق ئاڵتونچی - دکتۆر تۆفیق ئاڵتونچی ):-

– ساڵی (١٩٥٤) لە پردێ لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٧٠) بەشداری لە بزووتنەوەی کورد کردووە.

خزمەتی (مەلا عەبدوڵلای لەك) لە گوندی (چیمەنی خواروو) کە ماوەی دوو ساڵیش لەلای ئەو مامۆستایە درێژەی بە خوێندن داوە، پاش ئەوە گەڕاوەتەوە کەرکوك ولە لای (مەلا عومەری گوومەتی) لە مزگەوتی ئیمام قاسم دەستی بە خوێندن کردووەتەوە لەوێ ئیجازەی مەلایەتی لە لای مەلا عومەر وەرگرتوە پاشان بۆ گوندی (زەنگنە) گەڕاوەتەوە.
– ساڵی (١٩٥٦)ی زایینی بە فەرمانبەر لە فەرمانگەی (مەعاریف)ی کەرکوك دادەمەزرێت، هەتا ساڵی (١٩٦١)ی زایینی بەردەوام دەبێت بەڵام بەهۆی تێکچوونی باری سیاسی شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩٦١) دەگەڕێتەوە بۆ گوندی (مووەفەر) بۆ نیشتەجێ بوون بۆ دوور کەوتنەوە لە بارە ناناسابیەکە.
– ساڵانی (١٩٦٣، ١٩٦٥) دوو جار ماڵو خانووی دەسوتێدرێت لەلایەن بەعسییەکانەوە.
– شاعیر لە ماوەی ژیانی خۆیدا لە گوندەکانی (یەنگیجە، عەبدوڵلا غانم، بلاوە، مووەفەر) لە باکووری رۆژئاوای (داقوق-تاوخ) مەلایەتی کردووەو خەڵکەکە زۆر رێزیان گرتووە.
– لە (٢١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٠) بەشداری دامەزراندنی (یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی لە کوردستان) دەکات.
– ساڵی (١٩٧٠) کراوە بەقازی مەحکەمەی شەرعی شۆڕش لە سنووری چالاکی لقی سێ وە دامەزراوە.
– شاعیر لە ساڵی (١٩٧٨) لەگەڵ خێزانەکەی لە لایەن رژێمی بەعسەوە بۆ ماوەیەك دەستگیر دەکرێت ئەویش لەبەر ئەوەی دوان لە کورەکانی لە ریزی پێشمەرگەی کوردستان بوونە.
– شاعیر هەستێکی نیشتمانی گەلێك بەرزی هەبوو، کوردایەتی کردنەکەی لەوپەری بەرزیدا بوو.
– لە (٥)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٣) لەلایەن چەند کەسێکەوە شەهیدکرا.

- ئامادەیی لە ناوەندی (شرقیة) لە بەغدا تەواو کردووە.
- زانکۆی لە ئەنقەرە تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٧) لە بواری ڕۆژنامەگەی کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٨٠) چووەتە نەمسا و دکتۆرای لە ڕۆمانیا تەواو کردووە، لە بابەت (التخطيط والمسابرنتك الاقتصادي نهاية عام ١٩٨٦).
- ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی، ئەنجوومەنی دەستەی ڕۆشنبیری هەڵبژێردراوی شاری (یونشوینك) لە سوید لە دوو خولدا هەڵبژێردراوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (كركوك نامه)، ٢٠٠٧.
- (صخرة تحت اقطاف القلعة)، کۆمەڵە چیرۆك.
- ( تحت ظلال نيران بابا كركر).
- (عرفة - الحد الفاصل).

* مەلا تەهای عەبدولقادر:-
- ساڵی ١٨٧٦ لە گەڕەکی موسەڵڵا هاتووەتە دنیاوە، لە ناوەڕاستی ئەیلوولی ١٩٦٩ کۆچی دوایی کردووە، برای مەلا سابیرە کە ئەمیش لە قورئانخوێنە چاکەکانی سەردەمی خۆیبووە
- دەنگی خۆش و لێزانییەکی لەڕادەبەدەر بوو، بەڵام دەرەنگانێ دەستی دایە گۆرانی، بۆیە درەنگیش لەسەر قەوان بۆی تۆمار کرا.

* (تۆفیق جەلال ئۆرخان):-

- ساڵی (١٩٠٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شێوازێکی تایبەتی هەبووە لە نووسینی شێوازی شیعر کە لە هاوڕێیەکان جیای کردووەتەوە لە بواری زمان و توانای شیعری.
- ساڵی (١٩٨١) کۆچی دوایی کردووە.

* ئۆرهان موفتی:-

- ساڵی ١٩٧٠ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- نصيف الشمس، شيعر،٢٠١٣
- ساحل السكينة، شيعر، ٢٠١٣

* شێخ تاهیر کوڕی شێخ شەریف:-
- ساڵی ١٨٨٧ لە بنەماڵەیەکی ئایینی و نیشتمانپەروەر چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.
- پیاوێکی ناودار و چاوتێر و میوان دۆست و جوامێر بووە.
- ساڵی ١٩٤٩ لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ محێدینی کەرکووك بە خاك سپێردراوە.

تاهیر فوئاد

تابان گەرمیانی
خاوەنی کتێبی (دەستکەوتەکانی ژنانی باشووری کوردستان لەنێوان ساڵانی ١٩٩٢ - ٢٠١٤

**مامۆستا تالیب مەلا داوود جەباری لە کاتی پێشکەش کردن وتارێك لە یەکێك قوتابخانەکانی کەرکوك**

**تالیب ڕەئوف وەنداوی**

**تانیا گلی**

*** تەیفوور عەباس ئەحمەد بەزاز:-**

**- سالی ۱۹۲۳ لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە کەرکوك لەدایکبووە.**
**- سالی ۱۹٤۸ کۆلێژی سەربازی ڕۆستەمییەی لە بەغدا تەواو کردووە بە ناونیشانی (تموین ونقل) دوا پلەی لە سوپا (عمید) بووە.**
**- سالی ۱۹۷۲ خانەنشین کراوە.**
**- سالی ۱۹۸۰ کۆچی دوایی کردووە.**
**- کاری کردووە لە یەکەکانی تیپی دووی سەربازی کەرکوك و لیوای چوار و ئەندامی دادگای سەربازی چواری بەردەوام بووە.**

*** (ثاقب):-**

**- ناوی (ثاقب خدر ئەفەندی کوڕی مەلا یەعقوب ماهونی)یە.**
**- یەکێکە لە شاعیرەکان کە لە ساڵی (١٧٩٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.**
**- برای خاوەنی کتێبی (دوحة الوزراء)یە، کە ناوی (ڕەسوڵ حاوی کەرکوکی)یە.**
**- ساڵی (١٨١٨) کۆچی دوایی کردووە، بە نەخۆشی سیل.**

**ساڵی ١٩١٨ لەو کاتەی کە بەشێك لە سوپای دەوڵەتی عوسمانی بە بەندکراوی لەژێر دەستی سوپای بەریتانیادان، کە لەنێویاندا گەلێك نەخۆشی و پەتای ڕشانەوە بڵاوبووەتەوە**

خەلکی گوندی قەرەدەرە ناوچەی کێلگە نەوتییەکانی کەرکوك ١٩٣٦

خەلکی گوندی قەرەدەرە ناوچەی کێلگە نەوتییەکانی کەرکوك ١٩٣٦

کۆمەڵێك ئەندازیار و کرێکاری کۆمپانیای نەوتی بابە گوڕگوڕ ١٩٣٠

کۆمەڵێك کرێکار و کارمەندی نەوتی کەرکوك ١٩٣٦ - ١٩٣٧

هەندێك لە ئەفسەرانی کەرکوك لە یەکێك لە خولە سەربازییەکانی بەغدادا ١٩٣٩

لە ڕاستەوە بە پێوە نوری مەلا عارف، نایناسم، دانیشتووەکان سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا شەمزینی، خێروڵڵا عەبدولکەریم، ئیسماعیل فەخری، فائیق جەباری و جەلالی ئەمین بەگ لە ساڵی ١٩٣٨ موعەسکەری جولاو

* ( جەباری - مەلای جەباری ):-

- ناوی (فەتاح کوری سەید مستەفا کوری سەید ئیسماعیل کوری سەید جانی)یە لە تیرەی (سەید عەبدولچەباری گەورە) یە لە ساڵی (١٨٠٦)ی زایینی لە دێی (بانگۆل) لەدایکبووە. نازناوی شاعیر (مەلا)یە.

- لە تەمەنی (١٢) ساڵاندا دەنێرێتە لای (مەلا ڕۆستەم) مەلای گوندەکەیان.. لە دوایدا بە فەقێیەتی ئەچێتە شاری کەرکوك لە مزگەوتی (نائیب ئەحمەد) لە گەرەکی ئاخور حوسێن، هەتا ماوەیەك لەوێ دەخوێنێت، لە پاشان لە بەر چەند هۆیەك پەرتەوازە ئەبێ و ڕوو ئەکاتە شاری (سلێمانی) لەوێش ماوەیەك دەمێنێتەوەو دوای هەمدیسان ئەگەرێتەوە بۆ شاری کەرکوك، ئەمجا دەچێ بۆ هەولێر، بۆ ڕەواندوز، بۆ شنۆ، دیسانەوە بۆ کەرکوك.

- لەم هاتوچۆیەدا لەم شار بۆ ئەو شار تا لای (عەبدوڵڵا یەزدی) لە (منطق)دا ئەخوێنێ لەبەر ئەوەی لە ساڵی (١٨٣١) دا باوکی دەمرێ ئیتر پەکی دەکەوێ بەهۆی ئەو خێزانەوە کە دەکەوێت بە سەرباو ئەبێ بە ژێر باری گرانی ژیانی چەرمەسەرییەوە.

- ساڵی (١٨٤٣)دا بۆ سەندنەوەی ئەو زەوییانەی کە لەلایەن پاشای عوسمانییەوە کرابوو بە وەقف بۆ تەکیەی بنەماڵەی جەباری ئەچێ بۆ ئەستەمبول لە ساڵی (١٨٤٦)دا دیسان بۆ دوایی هێنانی بەو دوژمنایەتییەی کە لە بەینی جەباری وهەمەوەندا هەبوو چوونەتە ئەستەمبول کە گەڕاوەتەوە سەر لە نوێ دەکەوێتە ناو جەرگەی ژیانی کشتوکاڵی و مەلایەتی گوندەکەیان لەم ماوەیەدا گەلێك دێی گۆڕیوە تا لە ساڵی (١٨٧٦) لە تەمەنی (٧٠) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە ولە بانگۆل لەسەر وەسیەتی خۆی دەنێژرێت.

- مەلا فەتاح پیاوێکی باڵا بەرزی باریکەلەبووە، دەمو چاوی درێژکارو چاوو برۆی ڕەش بووە، برژانگ کورت وچاوی زۆر گەورە نەبووە، گەنم ڕەنگ و گۆناکانی قوپاوبوو، ڕیشە تەنك و سپییەکەی قەڵەم ئەکرد سمێڵ و چەناگەی درێژ بوون، کەواو سەڵتەو لبادی لەبەردەکردو جامەدانی دەبەست بە سەرەوە عەباشی هەبوو.

- لە قسەکردندا خێرابووە، تووڕە تەبیعەت و زوویش هێمن دەبووەوە هەر چەندە زۆری نەخوێندبوو بەڵام زیرەك و هۆگری دۆست بووە.

- ئەم شاعیرە کوردە بلیمەتە خزمەتێکی ڕاستەقینەی ئەدەبەکەمانی کردووەو بووەتە مایەی سەربەرزی بڵیندێتی ڕادەی هونەری ئەدەبی کلاسیکیمان، خۆی لە هەموو مەیدانەکانی شیعر هۆنینەوەدا داوە سەری لە هەموو کەلێن و قوژبنێکی داوەو تاقیشکردووەتەوە.. بێجگە لە زمانە شیرنەکەی کوردی شیعری بە تورکی و فارسی و عەرەبی هۆنیووەتەوە شارەزاییەکی لەو سێ زمانەدا هەبووە.

- مەلای جەباری شاعیرێکی بە ناوبانگی سەدەی نۆزدەهەمە لەگەڵ مەولەوی هاوڕێ و هارچەرخ و هاوتا بووە هەمیشە هامشۆی یەکترییان کردووە.

* ( جەبار-تاخورما ):-

- یەکێکە لە مەقام زانەکانی کەرکوك.

- بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە و هیچ ئاماژەیەکی ڕوون نییە.

* ( جەبار جەباری-عەبدولجەبار جەباری ):-

- ناوی (عەبدولجەبار کوری محەمەد کوری حەسەن کوری محەمەد -ناسراو بە حەمەزیزی- کوری عەلی کوری خدرە کۆستە کوری میکائیل)ە.

- باپیرەی نووسەرمان کە بە (حەسەن حەمە زیزی) یان (دەروێش حەسەن) بەناوبانگ دەبێت ڕوو لە (حەمك) دەکات کەبە تەنیشت گوندەکەی خۆیانەوە دەبێت وتێیدا نیشتەجێ ئەبێت، جەبار لەوێ چاوی بەژیان هەڵدەهێنێ لە ساڵی (١٩٤٥)دا لەبەر گرانی و لێقەوماوی ناوچەکەو هەژاری خێزانەکەیان ماڵیان گوێزراوەتەوە بۆ گەڕەکی (شۆڕیجە)ی کەرکوك، لە هەمان ساڵدا لەدایکبووە.

- نووسەر لە کۆشی ئەو خێزانە هەژارەدا پەروەردە دەکرێت و ڕووبەڕووی ڕۆژگارە سەختەکانی ژیان دەبێتەوە هەربۆیە لە پاڵ چوونە قوتابخانەو تەواوکردنی خوێندندا

لە کاتی پشووی هاویندا بەکاری کرێکاری وئیش کردنەوە خەریك دەبێت بۆ پەیداکردنی بژێوی وسووك کردنی ئەرکی سەرشانی خێزانەکەی.
- سالی (١٩٥٢)دا چووەتە قوتابخانەی (شۆریجە)، لە سالی (١٩٦٦)دا دواناوەندی (موسەللا) بەشی ویژەیی تەواو دەکاتو لە سالی (١٩٦٨) پەیمانگای ئامادەکردنی ماموستایان لە کەرکوك تەواو دەکات.
- سالی (٩)ی ئاداری سالی (١٩٦٩) وەکو ماموستا لە گوندی (پارەپارە) لە ناوچەی داودە دامەزراوە، لە سالی (١٩٧٢-١٩٧٣) وەکو قوتابی لە بەشی (السیاسة) لە کۆلێژی (القانون والسیاسة) لە زانکۆی (المستنصریة) وەردەگیرێ بە نامەکاری (المراسلة)و لە سالی (١٩٧٢-١٩٧٦) بروانامەی بەکالۆریۆس وەردەگریو دەبێت بە (معلم جامعي).
- سالی (١٩٧٠)دا خێزانی پێکەوە ناوە لەگەل خاتوو (ئەنعام عەبدولرەحمان) ئەلعوبەیدی کە دوو کورو دوو کچی لێی دەبێت بە ناوەکانی شێرکۆ، نزار، جوان، ئالا.
- لەدوا گرتنیدا لە (٢٦)ی ئایاری سالی (١٩٨٢) لەلایەن دەزگا داپلۆسێنەرەکانی رژێمی فاشستییەوە لە شارۆچکەی (دووبز) بەبێ سەرو سۆراخ دەمێنێتەوە لە زینداندا تاوەکو لە (٢٥)ی ئایاری سالی (١٩٨٥)دا خێزانەکەی لەلایەن دەزگای ئەمنی رژێمەوە ئاگادار دەکرێتەوە دەربارەی لە سێدارەدانو قەدەغەکردنی دانانی پرسە بۆی.
- ئەوەی جێگەی بایەخە لە ژیانی نووسەردا، هەر لە سەرەتای ژیانی هەرزەکاریو دواتر لاویدا نووسەر تێکەل بە چالاکی سیاسی وجەماوەریو کاری رێکخستنی حیزبایەتی بووە.
- کاتێك لە قۆناغی ناوەندی دەبێت لە سەرەتای هەلگیرسانی شۆرشی ئەیلولدا دەست بەچالاکی حیزبایەتیو سیاسی دەکات لە ریزەکانی پارتیداو لە سالی (١٩٦٢) بۆ ماوەی زیاتر لە سێ مانگ دەگیرێت.
- لە (١٠)ی حوزەیرانی سالی (١٩٦٣)دا کاتێك لە نێزگەی بەغدا دەقی ئەو بەلاغە سەر بازییەی لەلایەن رژێمی عارف گۆربەگۆر دەرچووە دەربارەی گرتنی (جەبار جەباریو عادل عیزەت) ئەبیستێت ئەو شەوە لە مالی خۆیان نامێنێتەوەو لە جێگەیەکی لە بار خۆی حەشار دەدات لەوێدا دەست بە رێکخستنی دەکات بە (کادیرە بچکۆلەکە) ناوبانگ دەردەکات.
- لەدوای کەوتنەوەی دووبەرەکیو جیابوونەوەی هێلی (مەکتەبی سیاسی) بەسەرکردایەتی سکرتێرەکەی (ماموستا ئیبراهیم ئەحمەد) دەگەرێتەوە بۆ شاری کەرکوكو ئەندامێکی چالاکي ئەم هێلە دەبێت لەناوشاردا.
- سالی (١٩٦٦-١٩٦٧) لەلایەن دەزگا داپلۆسێنەرەکانی رژێمەوە دەسگیر دەکرێت لەدوایدا ئازاد دەکرێت، لە سالی (١٩٦٩) دەبێت بە بێژەر لە تەلەفزیونی کەرکوك، لە سالی (١٩٧٠) نووسەر دوور دەکەوێتەوە لە ژیانی حیزبایەتی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ئافرەتە ناودارەکانی کوردی)، کەرکوك، ١٩٦٩.
- (ئەسیری شاعیرێکی شۆرشگێری قۆناغی دوای حاجی قادر)، هەولێر، ١٩٧٤.
- (دیوانی مەلای جەباری)، کەرکوك، ١٩٦٨.
- (تأریخ الصحافة الکردیة)، بەغدا، ١٩٧٥.

* (جەبار قادر غەفور زەند - دکتۆر جەبار قادر غەفور زەند):-

- سالی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالانی (١٩٥٧-١٩٦٨) خوێندنی سەرەتاییو ناوەندیو دواناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی (١٩٧٢) بەکالۆریۆسی لە زانستی مێژوو بە پلەی یەکەم لە بەشی مێژووی زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
- سالی (١٩٧٢-١٩٧٣) ماموستا بووە لە ئامادەیی کوردستان لە کەرکوك.
- سالی (١٩٧٧) دکتۆرای لە مێژووی نوێی رۆژهەلاتی نزیك لە ئینستیتیوتی رۆژهەلاتناسیی سەر بە ئەکادیمیای زانستی یەکێتی سۆڤییەتی جاران لە مۆسکۆ بەدەستهێناوە، نامەی دکتۆراکەی بە زمانی رووسی بوو.
- دکتۆرای هەیە لە (مێژووی نوێی رۆژهەلاتی نزیك).
- سالی (١٩٧٧) بووە بە پسپۆر لە مێژووی نوێو هاوچەرخی کورد.
- سالانی (١٩٧٨ - ١٩٨١) ماموستای مێژووی نوێی کورد و عێراق و زمانی کوردی بۆ دەسپێکەران لە زانکۆی سلێمانی.
- سالانی (١٩٨١-١٩٨٢) ماموستای مێژووی نوێی کوردو عێراقو ولاتانی عەرەبیو زمانی کوردی بووە لە زانکۆی سەلاحەددین.
- سالی (١٩٨٢-١٩٩٠) ماموستای (مێژووی سەدەکانی ناوەراستو نوێی ئەورووپا، فەلسەفەی مێژوو، رێبازی لێکۆلینەوەی زانستی، مێژووی نوێی ئێرانو تورکیا) لە زانکۆی موسل بووە، هەروەها لەو سالانەداو دوای بەرزکردنەوەی پلەکەی بۆ پرۆفیسۆری یاریدەدەر هەر لەو زانکۆیە، کە وەکو سزایەکی سیاسی لەلایەن رژێمی بەعسەوە دوورخرابووەوە، مێژووی نوێی ئێرانو تورکیای بە قوتابیانی ماستەرو دکتۆرا دەگەوتەوەو سەرپەرشتی نامەی ماستەری دەکرد.
- سالانی (١٩٩٠-١٩٩١) پرۆفیسۆری یاریدەدەر بوو لە زانکۆی سەلاحەددین.
- لە کۆرەوەکەی سالی (١٩٩١)دا کۆچیکرد بۆ تورکیاو لەوێوە بۆ هۆلەندا.
- سالانی (١٩٩٢-١٩٩٣) ماموستا بوو لە بەشی عەرەبی ئینستیتیوتی رۆژهەلاتی نزیکی سەر بە زانکۆی ئەمستردام لە هۆلەندا.

- لە بەهاری ساڵی (١٩٩٣) گەڕایەوە بۆ زانکۆی سەلاحەددین بۆ دەمێکی کورت.
- ساڵانی (١٩٩٤-٢٠٠٥) کاریکرد لە بوارو پیشەی جیاواز وەکو: ڕۆژنامەی لۆکال، تەلەفزیۆن و وەرگێران بۆ ڕێکخراوی (فاو)ی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، هەروەها بەشداری کردن لە چالاکی ڕۆشنبیری و سیاسی دیاسپۆرای کوردی و چەندین پرۆگرام و کۆرسی زمان و کۆمپیوتەر لە هۆڵەندا.
- گەڕانەوە بۆ سەر کاری پێشووی وەکو مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەددین تا کۆتایی ساڵی (٢٠٠٦).
- ساڵی (٢٠٠٧) پلەی زانستی پرۆفیسۆری بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٧) بە ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی هەڵبژێردرا.
- ساڵانی (٢٠٠٧-٢٠٠٩) ئەندامی لیژنەی بەرزکردنەوەی پلەی زانستیی مامۆستایان لە کۆلێژی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە زانکۆی کۆیە بوو، لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (زانکۆی کۆیە) بوو.
- ساڵی (٢٠٠٩) کرا بە ئەندامی تەرخانکراوی ئەکادیمیای کوردی.
- ساڵی (٢٠٠٩) کرا بە ڕاوێژکاری سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ کاروباری خوێندنی باڵاو دۆسیێی کەرکوك.
- ساڵی (٢٠١١)ەوە لە ئەکادیمیای کوردی سەرپەرشتی پرۆژەی ئینسکلۆپیدیای کوردستان دەکات و سەرنووسەری گۆڤاری زانستی ئەکادیمیای کوردییە.
- لە سەرپەرشتی چەندین نامەی ماستەرو گفتوگۆو تێزی دکتۆرای کردووەو لە زانکۆکانی موسل، سەلاحەددین و کۆیە بەشداری کردووە.
- لە بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیا لەنێوان هەردوو شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانیدا)، بە زمانی ڕووسی، مۆسکۆ، ١٩٧٧.
- (تركيا المعاصرة)، بە بەشداری، زانکۆی موسل، ١٩٨٧.
- (دراسات في التأريخ الأوربي الحديث)، بە بەشداری، زانکۆی موسل، ١٩٨٨.
- (کوردو کوردستان)، نووسینی ئەبولقاسمی لاهوتی، وەرگێران لە ڕووسییەوە، ڕۆتردام، ١٩٩٨.
- (چەند بابەتێکی مێژووی کورد)، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (کوردو کوردستان، فاکتەرەکانی دروستبوونی کێشەکە)، نووسینی م. س. لازەریێف، وەرگێران لە ڕووسییەوە، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- (ناعەقڵانییەت لە گوتاری بەرەی تورکمانیدا)، سەباح تاهیر لە عەرەبییەوە کردیوویەتی بە کوردی، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (قضايا كردية معاصرة، كركوك، الانفال والكرد وتركيا)، چاپی بەرلین و هەولێر، ٢٠٠٦.
- (تورکیای هاوچەرخ)، لەگەڵ نووسەرێکدا لە زانکۆی موسل، سلێمانی، (٢٠٠٨).
- (ضرب كردستان بالأسلحة الكيمياوية في عام ١٩٨٧ في ضوء الوثائق الرسمية العراقية)، بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی، ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١١.
- وتارو لیکۆڵینەوەی هەیە کە بڵاوکراوەتەوە لە چەندین گۆڤارو ڕۆژنامەو سایت، لەوانە:
- (ڕۆژنامەی کوردو چەند زانیارییەکی نوێ)، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٣٢)، هەلێر، ١٩٨٥، هەر لە هەمان گۆڤار بە عەرەبیش لە ژمارە (٧٢) ساڵی (١٩٨٩)دا بڵاوکراوەتەوە کە یاسین خدر کردویەتی بە عەرەبی.
- (ڕووناکبیری کورد دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت ١٩٣٢-١٩٦٩)، گۆڤاری (کاروان) ژمارە (٣٧)، هەولێر، ١٩٨٥.
- (دەربارەی سەرچاوە تورکییەکانی مێژووی کورد)، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە (١٠٦)، بەغدا، ١٩٨٥.
- (ژیان و بەرهەمەکانی کوردناسانی یەکێتی سۆڤیەت)، بەشی یەکەم، چەپکی دووەمی، (نێرگز)، کەرکوك، ١٩٨٥.
- (ژیاننامەی شەرەفخان و ئەمری شەرەفنامە)، ئەم باسە لە کۆنفرانسی (شەرەفنامە) لە ئایاری ساڵی (١٩٨٨) لە بەرلین پێشکەش کراو لە گۆڤاری (ڕابوون) ژمارە (٢٧) لە ساڵی (١٩٩٩) لە سوید بڵاوکراوەتەوە.
- (ئیسماعیل بێشکچی، نموونەی زانای خاوەن هەڵوێست)، گۆڤاری (ڕابوون)، ژمارە (٢٠)، سوید، ١٩٩٧.
- (اربيل في السالنامات العثمانية)، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٩١)، هەلێر، ١٩٩٠
- (انقلاب عام ١٩٦٠ في تركيا، تحليل دوافعه السياسية والاقتصادية)، گۆڤاری (دراسات تركية)، ژمارە (١)، ١٩٩٠.
- (كركوك: بين حقائق التأريخ ومزاعم السياسيين)، ١٩٩١.
- (هاوکاری دەوڵەتانی داگیرکەی کوردستان دژی گەلی کورد)، گۆڤاری (ڕابوون)، ژمارەکانی (١٦)و (١٧)، سوید، ١٩٩٦.
- (کوردناسی ڕووس خاتوو ژیکالینا)، لە گۆڤاری (دالانپار)، ژمارە (١)، هێلسنکی، ١٩٩٥.
- (لەیلا زانا هێماو سیمبولی ژنی شۆڕشگێری کورد).
- (الانفال تجسيد لقسوة البعث وعنفه)، لە کۆنگرەیەك لە (لاهای) لە ساڵی (٢٠٠١) پێشکەش کراوە.
- (التكوين الاثني لسكان كركوك خلال قرن-منتصف القرن التاسع عشر ١٩٥٧)، لێکۆڵینەوەیەکە کە لە کۆنگرەی (کەرکوك) لە لەندەن سازکرا لەلایەن (سەنتەری کەربەلا) لە ساڵی (٢٠٠١)، لە دواییدا هەموو لێکۆڵینەوەکان لە شێوەی کتێبێك بڵاوکرایەوە بە ناونیشانی (كركوك مدينة القوميات المتآخية).
- (السياسات الحكومية في كركوك خلال العهد الملكي ١٩٢١-١٩٥٨)، لە هەمان کۆنگرە پێشکەش کراوەو لە هەمان کتێب بڵاوکراوەتەوە.
- (معوقات توطين الديمقراطية في العراق)، لە کۆڕی (معوقات تطبيق الديمقراطية في عراق ما بعد صدام) پێشکەش کراوە لە شاری دیلفت لە هۆڵەندا پێش پرۆسەی ئازادی عێراق.
- (كركوك.. تأريخ عريق وواقع مرير)، پێشکەش کراوە لە کۆنگرەی (کەرکوك) لە لەندەن، ئەیلول، ٢٠٠٥.
- (النظام الفدرالي، تعايش التنوع والوحدة على سطح واحد)، لە کۆنگرەی (دعم الديمقراطية في العراق) لە لەندەن لە (٢٨-٣١)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٥) پێشکەشکرا.
- (ژنانی کورد لە مێژوودا)، گۆڤاری (ئەکادیمیای کوردی)، ژمارە (١٣)، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (دراسات عن الكرد وكوردستان باللغة الروسية ١٧٨٠-١٩٠٠)، گۆڤاری (الأكاديمية الكردية)، ژمارە (١١)، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (لە بارەی دەقە تورکییەکانی پیرەمێردەوە ١٩٠٨-١٩١٩)، گۆڤاری (ئەکادیمیای کوردی)، ژمارە (١٨)، هەولێر، ٢٠١١.
- (خەسڵەتەکانی دەوڵەت و دۆزی کورد لە تورکیا)، گۆڤاری (ئەکادیمیای کوردی)، ژمارە (٢١)، هەولێر، ٢٠١١.

- (حول احداث كركوك الدامية في تموز عام ١٩٥٩).
- (اين الحقيقة في ما يكتب ويقال عن كركوك- قراءة في وثائق رسمية حكومية).
- (غرباء كركوك واصلائها بين المزاعم والاحصاءات الرسمية).
- (السالنامات العثمانية وحكاية الوثائق النادر عن كركوك).
- (في ضوء مذكرات فيرسن، الحقائق والارقام تدحض الادعاءات والمزاعم).
- (سياسات التطهير العرقي بين مباركيها والداعين إلى إزالة آثارها).
- (الانفال: نتائج ايديولوجيا البعث ونامه الشمولي).
- (القضية الكردية في تركيا، محاولة لقراءة جديدة).
- (تطورات القضية الكردية في تركيا من منظور باحث ارمني).
- (اسماعيل بيشكجي، نموذج العالم المنصف).
- (الدستور التركي اداة لقهر الكرد).
- (قراءة في تصريحات اردوغان حول القضية الكردية في تركيا).
- بابەتو وتارەكانی لەسەر تۆری ئینتەرنێتدا:
- (پرۆژەی دەستورو تێبینیە گشتییەكان).
- (عێراقی فیدرال خۆتان خۆش.. لێ سەرۆك بۆش سڵاوی هەیە).
- (شەمسەدین سامیو قاموسی ئەعلامو كاوەی ئاسنگەر).
- (چارەنووسی كەركوك نە لە ماددەی پەنجاو هەشتو نە لە دەستوردایە).
- (لیستی باشترین زانكۆكانی جیهانو پرۆژەی زانكۆی كوردستان).
- (كوشتاری ئەرمەنو باری ئەورۆی كورد لە توركیا).
- (كەركوكو مۆدێلی بۆكسل، ئایە مۆدیلی بۆكسل بەكاری كەركوك دێ).
- (جێگیركردنی سەركەوتنی كورد لە كەركوك).
- (لە ئەزمونی باشووری سودانەوە چی فێر دەبین؟).
- (باقرۆف یاوەری ستالینو جەللادی كوردی قەوقاز).
- (توركیا دەیەوێ پارێزگاری كەركوك بكوژێ).
- (بۆ دەبێ رێگە نەدەین سوپای توركیا بێتە عێراق؟).
- (ریفراندۆمو پرسیارە بێ وەڵامەكان).
- (باشووری كوردستان: نە سەربەخۆییو نە بەشێك لە عێراق).
- (شەری توركیا بەهۆی كوردەوە لەگەڵ دونیادا).
- (زانكۆكانی كوردستانو خوێندن بە كوردی).
- (كەركوكو گێژاوی چاوەروانكراو).
- (كەركوك: لە دڵو قودسێ كوردستانەوە بۆ راپرسی).
- (دوو رەخنەی دۆستانە: میدیای كوردیو رۆشنبیری گەورەو كەسایەتی مەزن).
- (چیرۆكو بەسەرهاتی سیو دوو هەزار توركەكەی سلێمانی).
- (چارەنووسی كورد لە مس بێڵەوە بۆ مستەر بریمەر).
- (لە یادی كۆرەوەكەی بەهاری (١٩٩١)دا، رۆژژمێری رەو: ئەزمونێكی تایبەت).
- (الحديث عن الخزرجي "كارزايا" للعراق دليل على عدم الجدية).
- (الأبعاد الراهنة لمشكلة الاقليات القومية في كوردستان العراق).
- (تركيا منزعجة من إتفاق كرد العراق).
- (مطالب الشعب الكردي في العراق).
- (العروبة ليست الشجرة التي تحتمي بظلالها الاقليات).
- (تصريحات وزير الحرب التركي: عنجهية فارغة وجهل بالتاريخ).
- (من حق موتانا علينا.. ولكن ماذا عن كتاب الكرد في نظر العلم؟).
- (تركيا والكرد: ماذا بعد خسارة الجولة الاولى).
- (الكردوفوبيا).
- (عود إلى موضوعة التركيب الاثني لسكان كركوك).
- (حول قضية نزار الخزرجي).
- (الانفال: تجسيد لسيادة الفكر الشمولي والعنف والقسوة).
- (التهديدات التركية توحد الكرد).
- (محاولات تركيا لزعزعة الاستقرار في كوردستان العراق).
- (هل يصلح الموديل التركي نموذجا للعراق؟).
- (علوجيات.. (١) الصحاف محمد بن سعيد).
- (علوجيات.. (٢) بعثيون يهربوون من الشباك ويعودون من الباب).
- (تركيا والاتحاد الاوروبي: هل سدت أوروبا أبوابها نهائيا بوجه تركيا؟).
- (علوجيات.. (٣) ديناصورات سياسية وافكار محنطة).
- (علوجيات (٤) علوج اكراد).
- (مخاطر الاستعانة بالقوات التركية في العراق).
- (تقاطع المشروعين التركي والامريكي في العراق).
- (عبد الله كيول: صدام اقترح علينا العمل معا لإبادة الاكراد جميعا).
- (الشوفينية والشيفونية الجديدة).
- (نصائح رجل حكيم لم تستمع اليها الحكومات العراقية).
- (فضائح إعلامية في برنامج الحوار المفتوح).
- (القضية الكردية في العراق: عودة إلى التذكير بالبديهيات).
- (في ضوء مذكرات مقرر لجنة مشكلة الموصل والتي تنشر لأول مرة: الارقام والحقائق التأريخية تدحض المزاعم والادعاءات).
- (سر الحملة على الكرد وتطلعاتهم القومية المشروعة).
- (الانفال: نتاج ايديولوجيا البعث ونظامه الشمولي-١).
- (الانفال: نتاج ايديولوجيا البعث ونظامه الشمولي-٢).
- (الانفال: نتاج ايديولوجيا البعث ونظامه الشمولي-٣).
- (قراءة في وثائق حكومية رسمية: اين الحقيقة في ما يكتب ويقال عن كركوك).
- (الإنتخابات والخطاب الإعلامي العراقي).
- (غرباء كركوك واصلائها بين المزاعم والاحصاءات الرسمية).
- (ملكة الكرد تواجه الكراهية بالدعوة إلى المحبة، ليلى زانا، بورتريه إمراة ثورية كوردية).
- (القضية الكردية في تركيا).
- (قطع الرقاب ثقافة بعثية بامتياز).
- (تركيا والإنتخابات العراقية).
- (رائدة اليسار التركي بهجة بوران).
- (سر اقبال الاتراك على كتاب (كفاحي) لأدولف هتلر).
- (هل تأخر حقاً تشكيل الحكومة العراقية الجديدة؟).
- (بوصلة السيد الجعفري).
- (ضرب كوردستان بالأسلحة الكيمياوية عام ١٩٨٧ كما ترويه الوثائق العراقية).

– (وثائق جديدة تدين صدام واعوانه بضرب الكرد بالأسلحة الكيمياوية في عام ١٩٨٧).
– (وثائق جديدة تدين صدام واعوانه بضرب الكرد بالأسلحة الكيمياوية في عام ١٩٨٧، الحلقة الثانية).
– (الجزيرة والقضية الكردية).
– (تسويق الجبهة في الإعلام العروبي، اللاعقلانية في خطاب الجبهة التركمانية).
– (الجبهة والرهان على الحصان الخاسر دوما، اللاعقلانية في خطاب الجبهة التركمانية).
– (الجبهة واكذوبة تكريد كركوك، اللاعقلانية في خطاب الجبهة التركمانية).
– (الجبهة وحكاية مجزرة كركوك، اللاعقلانية في خطاب الجبهة التركمانية).
– (اللاعقلانية في خطاب الجبهة التركمانية).
– (مع الشعلان والزيبار سننعم بالديموقراطية في جمهورية الخوف).
– (الفدرالية: تجسد لتعايش مفهومي الوحدة والتنوع على سطح واحد).
– (قراءة اولية في تصريحات اردوغان حول القضية الكردية في تركيا).
– (راي رئيس الجبهة التركمانية فيها قبل ان يصبح رئيسا لها).
– (كركوك: قرن ونصف من التتريك والتعريب).

*** (جەعفەر پاشای عەسکەری):-**

– ناوی (محەمەد کوری جەعفەر کوری مستەفا عەسکەری) یە، مستەفا بەگ بە ناوبانگ بووە بە (مستەفا پاڵەوان)، کە نەوەی (عەبدولڕەحمان ئەفەندی) گوندی (عەسکەر) بووە لە ناحیەی (ئاغجەلەر) لە قەزای چەمچەماڵ.
– لە ساڵی ١٨٨٦ لە گوندی عەسکەر لەدایکبووە.
– پاش تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە قوتابخانەی سەربازی لە ئەستەمبوڵ ساڵی (١٩٠٤) وەکو ئەفسەر دامەزراوە لە سوپای عوسمانیو لە دواییدا لە سوپای عێراق، بەشداری شەری جیهانی یەکەمی کردووەو وەکو ئەرکانو سەرۆکی سەربازی رۆڵی بینیوە.
– لە کۆتایی ساڵی (١٩٢٠)دا گەراوەتە عێراقو بووەتە یەکەم وەزیری بەرگری دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقی شاهنشایی، ماوەیەکیش بووەتە سەرۆکی وەزیرانو دووەم جاریش بووەتە وەزیری دەرەوەو هەڵبژێردراوە بە سەرۆکی (مجلس النواب)، سێ جار پۆستی وەزیری بەرگری وەرگرتووە لەنێوان ساڵانی ١٩٢٣–١٩٢٨.
– بەرهەمەکانی:
– (معلومات مجملة عن القضاء الانكليزي)، ١٩٣٤.
– (آراء خطيرة في معالجة شؤون العراق العامة)، ١٩٣٥.
– (مذكرات جعفر العسكري).
– ساڵی (١٩٣٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** (جەعفەر پاشای کورجی-گورجی):-**

– والی کەرکوك بووە لە ساڵی (١٦٣٩) کە تاوەکو ساڵی (١٦٤٨) بەردەوام بووە، کە لە دوای ئەودا محەمەد پاشای چاوش زادە بووەتە والی کەرکوك.

*** (جەلال پۆلات-جەلال فەتاح رەفعەت):-**

– ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵانی (١٩٧٦–١٩٧٧) پەیمانگای هونەری جوانەکانی لە بەغدا تەواو کردووە.
– لە بواری وەرگێرانو شیعر دەستی هەبووە.
– بەرهەمەکانی:
– (لماذا قتل بنيرجي نفسه)، وەرگێرانی لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، شیعر، بەیروت، ١٩٨١.
– (الارض حديد.. السماء نحاس)، وەرگێران لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، رۆمان، بەشی یەکەمو دووەم، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا، ١٩٩١.
– (بورەك قيرينتيسي)، کۆمەڵە چیرۆك بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٩٢.
– (یالیملار کولکەسیندە)، رۆمان بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٩٦

*** (جەلال جەوهەر عەزیز):-**

– ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– دەرچووی کۆلێژی زانست بەشی ماتماتیکی زانکۆی سلێمانییە.
– بەرهەمەکانی:
– (کەرکوك لە پاکتاوی رەگەزییەوە بۆ چارەسەری دەستووری)، ٢٠٠٩.
– (هەوڵەکان بۆ چاکسازی لە رابردوودا)، سلێمانی، ٢٠٠٩.

*** ( جەلال رەزا ئەفەندی ):-**

- ساڵی (١٩٠٤) لە کەرکوك لەدایکبووەو قوتابخانەی سوڵتانییەی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- یەکێکە لەو شاعیرانەی لە بواری شیعری کلاسیکیدا جێ پەنجەی دیارە.
- ساڵی (١٩٨١) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( جەلال محەمەد رەشید ):-**

- بەرهەمە چاپکراوەکانی (تابلۆو دیوارێك)، بەغدا، ٢٠٠٢.

*** ( جەلال محەمەد ساڵح جەباری ):-**

- ساڵی (١٩٣٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- مامۆستاو زانای ئایینی بووەو ساڵی (١٩٥٧) بەشی کیمیای تەواوی کردووەو دکتۆرای لە بەشی کیمیا لە بەریتانیا تەواو کردووە، گەلێك لێکۆڵینەوەو کتێبی زانستی هەیە بەربارەی کیمیا و بوارەکانی دیکەی زانست.
- ساڵی (٢٠٠٤) کۆچی دووای کردووە.

*** ( جەلال زەنگابادی - جەلال وەردە ):-**

- ناوی (جەلال کوڕی حوسێن کوڕی محەمەد ئەمین)ە، لە عەشیرەتی (پاڵانی)یە.
- ساڵی (١٩٥١) لە گوندی (قەڵای) سەر بە کفری لەدایکبووە.
- لە بوارەکانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی بە زمانەکانی عەرەبی و کوردی.
- گەلێك لێکۆڵینەوەی هەیەو لە بواری ڕاگەیاندن کاری کردووەو لە گەلێك گۆڤارو ڕۆژنامە کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٥٣) خێزانەکەیان ڕاگوێزراوە بۆ جەلەولا.
- ساڵی (١٩٦٩) (دار المعلمین)ی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (اوتار التنائي او حزن حبة رمل في زوبعة (دیوانی فەرهاد شاکەلی)، وەرگێران، ٢٠٠٤.
- (ظل الصوت وقصص اخرى)، وەرگێران، ٢٠٠٥.
- (قصائد تأبى اي عنوان)، ٢٠٠٩.
- (ها هي معجزتي)، ٢٠٠٩.

*** ( جەلیل زەنگنە ):-**

- ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بۆ یەکەمین جار لە ساڵی (١٩٧١) لە شانۆگەری (کچە ڵاڵەکە) وەك ئەکتەر بەشداری کردووە.
- لەم بەرهەمانە وەك ئەکتەر بەشداریکردووە:

(مەرەزە، برسێتی، خێزانێکی شەڵەژاو، کاوەی ئاسنگەر، مامە ڕیشە، شیرین و فەرهاد، بەهارێکی دزراو، هاوارێکی تاساو.

- دەرهێنەری ئەم شانۆگەرییانە بووە:
- (ڕەورەوەی مێژوو)، ١٩٧٥.
- (نهێنی لە شاری سلێمانی)، ١٩٧٧.
- (پەروانە لە سلێمانی)، ١٩٧٩.
- (هاوارێکی تاساو)، ١٩٨١.
- (مانگی ئاوابوو)، ١٩٨٣.
- (سروودی خۆشنودی)، ١٩٩٠.

- (مۆرانە)، ١٩٩٦.
- بەرهەمە تەلەفیزیۆنییەکانی وەك دەرهێنەر:
- (ژیان)، ئامادەکردن و دەرهێنان، ١٩٧٧.
- (کەژاوەی مەرگ)، ١٩٩٣.
- (خولە پیزە)، ١٩٩٨.
- (مامە ریشە)، ٢٠٠١.
- (گەردەلوول)، بەشی یەکەم، ٢٠٠٥.
- (گەردەلوول)، بەشی دووەم، (٢٠٠٨).
- (گەردەلوول)، بەشی سێیەم، ٢٠١٣.
- جەلیل زەنگنە وەك نووسەرو ئامادەکار لە شانۆو تەلەفیزیۆندا:
- (کچە لاڵەکە)، ئامادەکردن و وەرگێڕان.
- (مەرمزە)، نووسین.
- (ژیان)، ئامادەکردن.
- (کاوەی ئاسنگەر)، ئامادەکردن.
- (هاوارێکی تاساو)، ئامادەکردن.
- (ژاڵە)، نووسین.
- (کەژاوەی مەرگ)، ئامادەکردن.
- (سروودی خۆشنودی)، ئامادەکردن.
- (گالیسکەی مەرگ)، ئامادەکردن.
- (ئاهەنگێکی پیرۆزو ئامێز بۆ ڕوحی ماکبیس)، ئامادەکردن.
- (خولە پیزە)، نووسین.
- (گەردەلوول)، نووسین.
- (برایانی کەرە مازۆف)، ئامادەکردن.

*** جەلیل سادق خورشید (حاجی هەڵەت):-**

- ناسراو بە حاجی هەڵمەت.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٩)ی شاری کەرکوك.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٨) چووەتە ئامادەیی پیشەسازی و لە بەشی دارتاشی وەرگیراوە.
- ساڵی (١٩٧٢)، کاتێك خوێندکار بوو لە ناوەندیی زێوەر لە کەرکوك و تەمەنی ١٣ ساڵ بوو، پەیوەندیی بە یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە کرد.
- هەرەسهێنانی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥) نەبووە مایەی لەدەستدانی متمانەی بە کوردایەتی.
- ساڵی (١٩٧٩)دا پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد. پاش دوو ساڵ پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە هەرێمی ٢ی کەرکوك ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد.
- لە ماوەیەکی کورتدا پلەکانی پێشمەرگایەتیی بڕی. پاش ئەوەی بووە جێگری فەرماندەی کەرت و زۆری نەبرد بووە فەرماندەی کەرت. پاش هەڵوەشاندنەوەی سیستمی هەرێمەکان و کارکردن بە سیستمی تیپەکان و دامەزراندنی تیپی ٢١ی کەرکوك، کرایە جێگری فەرماندەی تیپەکە، لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی بەشێکی زۆری چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی کردووە، لەوانە چالاکییەکانی دەڤەرەکانی پشدەرو ساڵەیی و شوان و شێخ بزێنی و شیوەسووڕو دەشتی هەولێرو ئۆپەراسیۆنی قەیوان- ماوەت و قەندیل و دۆڵی جافەتی و دابان- هەلاج و قەرەهەنجیرو کێوەرەش. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا پێنج جار بریندار بووە، لەوانە دوو جار لە لێواری مەرگ گەڕاوەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٨) لەگەڵ ٦٩ کادیردا بەشدار بوو لە خولێکی فەرماندەییدا کەنزیکەی سێ مانگی خایاندو بەپێی ڕێککەوتنێك لەنێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و قەرارگای ڕەمەزانی سوپای پاسدارانی ئێراندا لە شاری تاران بەڕێوە چوو.
- ساڵی (١٩٩١) لە چوارچێوەی خۆ ئامادەکرندا بۆ ڕاپەڕین، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی ئەرکی دروستکردنی شانە چەکدارەکانی ڕێکخراوی بروسکی لە سنووری ئۆردوگاکانی بنەسڵاوە. دارەتوو، کەورگۆسك، جدیدەو تۆپزاوای پێ سپێردرا. لە کاتی ڕاپەڕیندا بەشداریی کاریگەری لە جێبەجێ کردنی هەموو ئەو ئەرکانەدا کرد کەپێی سپێردران. لە ئۆپەراسیۆنی ڕزگارکردنی شاری کەرکوکدا، لە شەوی ١٨ لەسەر ١٩ی ئازاردا ڕابەرایەتیی هێزێکی کردو توانی لە دەوری پشتێنە ئەمنییەکانی دەوروبەری شارەکە بسووڕێتەوەو دزە بکاتە ناو کەرکوك و لێرە بەدواوە شەڕ کەوتە ناو کەرکوك. لە ١٩ی ئازاردا لە کەناری چەمی خاسە پێکراو شەهید بوو. پاش شەهیدبوونی بە ڕۆژێك، هێزی پێشمەرگە پاش شەڕێکی سەخت دەستی بەسەر شاری کەرکوکدا گرت.

*** جەلیل قازانچی ئۆغلو:-**

- ساڵی ١٩٦٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- ئاقسوو داستانی، شیعر بە زمانی تورکی، ٢٠٠٩.

* (جەلیل قەیسی):-

- یەکێکە لە چیرۆك نووسە بە تواناکانی کەرکوك کە خاوەنی هەلوێستی خۆی بووە بەرامبەر بە کورد.
- سالی (١٩٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە دامەزرێنەری کۆمەلەی ئەدەبی کەرکوك لە شەستەکان لەگەڵ (فازل ئەلعەزاوی، خالید ئەلراوی، ئەنوەر ئەلغەسانی، جان دەمۆ، سەرگۆن پۆلس).
- چیرۆکنووس‌و نووسەری بەرهەمی شانۆیی بووەو چوار چیرۆکی بلاوکردووەتەوە:
- (صهیل المارة حول العالم) ١٩٦٨.
- (زلیخة البعد یقترب) ١٩٧٤.
- (شفاه حزینة)، ١٩٧٩.
- (فراشات ملونة)، ١٩٧٩.
- (غدا یجب ان ارحل)، ١٩٧٩.
- (في زورق واحد)، ١٩٨٥.
- (جیفارا عاد افتحوا ابواب الشفاه الحزینة)، ١٩٧٩.
- (وداعا ایها الشعراء، ومضات من خلال موشور الذاکرة)، ١٩٩٠.
- (مملکة الانعکاسات الضوئیة)، ١٩٩٥.
- لە ٣٠ی گەلاوێژی سالی ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردووە.

* (جەلیل کاکە وەیس):-

- سالی (١٩٤٨) لە ناحیەی شوان لەدایکبووە.
- کۆلێژی ئاداب زانکۆی بەغدا بەشی کوردی تەواو کردووە.
- یەکێکە لە نووسەرو رۆژنامەنووسە بە تواناکانی کەرکوك.

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (میراو)، چیرۆك، سلێمانی، ١٩٨٥.
- (بیبلۆغرافیای سەد ژمارەی یەکەمی ئەدەب‌و هونەری برایەتی)، هەولێر، ١٩٩٩.
- (چرکە زیندووەکان)، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (بەدگۆران-رۆمانی کافکا)، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (بۆنی ئەشکەوت)، چیرۆك، هەولێر، ٢٠٠٣.
- (باخچەی بەردین-کازانتزاکی)، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (رۆمانی کوردی پەرتبوونی رووداو نازیندەیی شاکەس)، خوێندنەوەو لێکۆلینەوە، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (رۆژەکە لە سەدەیەك درێژتر دەبێتەوە)، جەنگیز ئیتماتۆڤ، وەرگێران، ٢٠٠٧.
- (خلتەی دونیا)، کۆمەلە چیرۆك، وەرگێران، ٢٠٠٧.
- (کورد لە سەدەی حەوتەمەوە تا سەدەی دەیەم)، ئارشاك پۆلادیان، وەرگێران، چاپی دووم، (٢٠٠٨).
- (وەچەکانی مەولانا)، چیرۆك، (٢٠٠٨).
- (کوردەکان بە گوێرەی سەرچاوەکانی عەرەبی)، هەولێر، (٢٠٠٨).
- (الساعات المتوقفة)، چیرۆك، ٢٠٠٩.

* (جەلیل محەمەد حوسێن):-

- سالی (١٩٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکەمین پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆلی (الفن المعاصر) لە کەرکوك لە سالی (١٩٨٢) کردووەتەوە.
- دووەمین پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆلی (الفن المعاصر) لە کەرکوك لە سالی (١٩٨٤) کردووەتەوە.
- سالی (١٩٨٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی سلێمانی کردووە.
- سالی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لەگەڵ هونەرمەند بێستون عەبدولقادر لە سووورداش.
- بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە شارەکانی برۆکسل‌و هۆلەنداو ئیسپانیا و ئەلمانیا.

* (جەلیل محەمەد شەریف):-

- سالی (١٩٤٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٦٩) کۆلیژی پەروەردەی بەشی زمانی عەرەبی

تەواو کردووە.
- یەکێکە لە نووسەرو چیرۆك نووسەکانی شاری کەرکوك.
- لە بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (چاوی هەتاو)، کەرکوك، ٢٠٠٠.
- (ناودارانی کورد لە قاموس الإعلامدا)، چاپی یەکەم، کەرکوك، ٢٠٠٠، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (هەوارگەی سێ دەنگ)، چیرۆك هاوبەش، بەغدا، ٢٠٠٠.
- (گولی دەستکرد)، کۆمەلە چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٤.
- (لە هەردەکانی کوردستانەوە بەرەو بیابانی عەرەب)، رۆمان، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (ئەودیوی مانگ تاریکستانە، سێ رۆژ لە مێژووی شارێك)، (٢٠٠٨).
- (شارەکەم لە پەنجەرەی یادگارەکانمەوە)، ٢٠٠٩.
- (اوراق من مرج الأدب الكردي)، ٢٠٠٠.
- (هواجس ملونة)، ٢٠٠٧.
- (المتاهة)، کۆمەلێك چیرۆکی سالار ئیسماعیل سەمینە، (٢٠٠٨).

* ( جەمال ئیبراهیم مەدمد ):-

- سالی (١٩٥٥ )لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لەنێوان سالانی (١٩٧٦-١٩٧٧) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە بەغدا تەواو کردووە.
- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك.

* ( جەمالەددین رەشید بابان ):-

- سالی (١٨٩٣) لە کفری لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لە رۆژنامەنووسە بەناوبانگەکانی کوردستانو یەکەم گۆڤاری کوردی بە ناوی (بانگی کورد-نداء الكورد) لە بەغدا بلاوکردووەتەوە لە سالی (١٩١٤)دا بە زمانی کوردیو تورکی، ماوەیەکیش وەزیر بووە لە بەغدا.
- سالی (١٩٦٦) کۆچی دوایی کردووە.

* ( جەمال مەلا تاها - مەلا جەمال مەلا تاها ):-

- ناوی (مەلا جەمال کوری مەلا محەمەد)ە.
- سالی (١٩٠٩) لە قەزای خورماتوو لەدایکبووە.
- ماوەیەك ئیمامو خەتیب بووە لە خورماتوو و کفریو مەندەلیو کەرکوكو لەیلانو داقوق.
- سالی (١٩٤٩) بووەتە مامۆستا لە ناوەندی خورماتوو، لە سالی (١٩٦٣) بووەتە مامۆستا لە (المعهد الإسلامي) لە کەرکوكو تا سالی (١٩٦٥) بەردەوام بووە لەوێ.
- دەستێکی بالای هەبووە لە شیعرو ئەدیبو شاعیرێکی بە توانا بووە، دیوانێکی دەستنووسی شیعری لێ بە جێماوە.
- لە (٢٦)ی کانوونی دووەمی سالی (١٩٧٩) کۆچی دوایی کردووە.

* ( جەمال رەشید ئەحمەد - دکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد ):-

- یەکێکە لە مێژوونووسە هەلکەوتووەکانی کوردستان لە مێژووی کۆنی کورد.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (دراسات كردية في بلاد سوبارتو)، ١٩٨٤.
- (لێکۆلینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی ولاتی کوردەواری)، بەغدا، ١٩٨٨.

- (بە یەکگەیشتنی کوردو لان لە ولاتی بابو شیروان)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (دراسات لغوية حول تأريخ المناطق الكردية)، ٢٠٠٤.
- (ظهور الكورد في التأريخ)، سێ بەرگ، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (کەرکوك و ناوچەی گەرمیان و ماف کۆنترۆڵکردنیان لەلایەن کوردەوە)، (٢٠٠٨).
- لە ٢٠ی کانوونی یەکەم ساڵی ٢٠١٦ کۆچی دوایی کرد.

*** جەمالەدینی زەنووری:-**

- زانیاریمان دەربارەی زۆر کەمە، بەڵام لە تەمەنی پەنجا سالیدا، واتا لە ساڵی ١٧٤٨ چامەیەکی شیعری هۆنیوەتەوە، کە ئەوسا ئەحمەد بەگی زەنگنەش لە ژیاندا نەماوە، واتە بۆچوونەکەمان لە بارەی سەردەمی ژیانی ئەحمەد بەگەوە کە دیاریمان کردووە (نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەم و سەرەتاکانی نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم). جا بەو شێوەیە بێت تێکرای ژیانی لە سەدەی هەژدەهەم بردبێتە سەر.

*** (جەماڵ عومەر نەزمی):-**

- کوڕی (عومەر نەزمی وەنداوی)یە.
- لە (١٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٩١٤) لە بەغدا لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٣٧) بەکالیۆریۆسی لە هونەر هێناوە لە زانستی سیاسی.
- بەرهەمەکانی:-
- (فكر ساطع الحصري القومي)، ١٩٨٦.

*** (جەماڵ مەلا قادر ئیمام):-**

- کوڕی (مەلا قادری ئیمام)ە.
- یەکەم قائمقامی قەزای حەویجەیە.
- ساڵی (١٩٥٨)دا کۆلیژی یاسای لە بەغدا تەواو کردووە.

*** (جەماڵ کەماڵ ئیبراهیم - زەعیم جەماڵ کەماڵ ئیبراهیم):-**

- ساڵی (١٩١٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە کۆلیژی سەربازی دەرچووە بە پلەی (ملازم ثاني).
- لە (١٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠) کۆچی دوایی کردووە.

*** (جەماڵ محەمەد سالح):-**

- ساڵی (١٩٥٠) لە گەڕەکی ئیسکان لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە تەمەنی هەشت ساڵی و لە ساڵی (١٩٥٨)ەوە کاری وێنەگرتن دەکات.
- ساڵی (١٩٦٣) ستۆدیۆیەکی وێنەگرتنی لە کەرکوك دامەزراندووە لەگەڵ براکەی بە ناوی (ستۆدیۆی حياة).
- خوێندنی ناوەندی تەواو کردووە و لە ساڵی (١٩٧٠)ەوە لە سلێمانی نیشتەجێیە و (ستۆدیۆی هەڵۆ)ی لە شەقامی پیرەمێرد دامەزراندووە.

سێ پێشانگای تایبەتی و سیانزە پێشانگای هاوبەشی لە شارەکانی کەرکوك، بەغدا، ڕومادی، حاجی ئۆمەران، هەولێر، سلێمانی، کۆیە، خانەقین، هەڵەبجە، ئیتالیا کردووەتەوە.

- چەند ڕێزلێنانێکی لە بواری هونەری وێنەگرتندا وەرگرتووە.
- ماوەیەك سەرۆکی وێنەگرانی کوردستانە لقی سلێمانی بوو.

*** (جەمیل ئەمین عەبدولقادر):-**

- ساڵی (١٩٢٦) لە کەرکوك لەدایکبووە، دەچووی (دار المعلمين)ە لە بواری پەروەردەدا کاری کردووە هەتا شەستەکان و لە ساڵی (٢٠٠٩) کۆچی دوایی کردووە.
- گەلێك بەرهەمی وەرگێڕاو و چیرۆکی هەیە لە زمانەکانی ئینگلیزییەوە بەشێکی وەرگێڕاوە.

*** (جەمیل بەگی بابان):-**

- ناوی (جەمیل کوڕی مەجید پاشا کوڕی عەبدولقادر پاشای کوڕی برایم پاشای بابان)ە.
- ساڵی (١٨٨٤) لە شاری کفری لەدایکبووە.
- سەرەتا لای مەلای تایبەت خوێندوویەتی و پاشان لە خوێندنگای عوسمانی دەستی بە خوێندن کردووە.
- ئەندامی پەرلەمانی عێراقی بووە لە خولی پێنجەم و هەشتەم بە نوێنەرایەتی کوردی لیوای کەرکوك هەڵبژێردراوە.
- لە تەمموزی ساڵی (١٩٤٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** (جەمیل حوسێن عەلی جەبووری):-**

- ساڵی (١٩٦٦) لە قەزای حەویجە لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لە هونەرە جوانەکانی بەغدا بەدەستهێناوە لە بواری خۆشنووسیدا.
- لە چاپکراوەکانی:
- (اعلام خطاطي العراق المعاصرين)، بەرگی یەکەم، ٢٠١٣.

*** ( جەمیل ڕۆژبەیانی - مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی ):-**

- (مەلا جەمیل کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە فەرقانی ڕۆژبەپانی)یە لە گوندی فەرقانی سەر بە ناوچەی قەرەحەسەن لە سالی (١٩١٣) چاوی بە ژیان هەلهێناوە.
- لە بنەمالەیەکی خوێندەوار و ئاینپەروەر و کورد پەروەربووە، باوکی یەکێکە لە زانا گەورەکانی کوردستان.
- هەر لە منداڵییەوە خراوەتە بەر خوێندن و لای باوکی قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە، لە تەمەنی شەش سالیدا مەلا جەمیل لای مامۆستاو زانای گەورە مەلا ڕەزای واعیز لە کەرکوك ئیجازەی وەرگرتووە.
- سالی (١٩٤٢) لە هەرەتی لاوێتیدا خۆشەویست بووە لای خەلکی هەستی نەتەوایەتی و کوردایەتی بەرزی هەبووە، چونکە بەلگەمان زۆرە ژیانی لە بەندیخانەکانی نوگرە سەلمان و عیمارە و بەسرە دوور لە وولات بەسەر بردووە.
- مەلا جەمیل زۆر زیرەك و بە بەهرە بوو، زۆر شارەزای زمانی کوردی وفارس وعەرەبی وتورکی بووە، هەربۆیە شاکارەکەی شەرەفنامەی لە بەندیخانەی عیمارە لە سالانی (١٩٤٢-١٩٤٥) لە فارسییەوە وەرگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی.
- سالی (١٩٣٤) لە کاتی کۆچی دوایی باوکی (مەلا ئەحمەدی گەورە) لەو دەمەدا مەلا جەمیل لە هەولێر دەیخوێند لای زانای گەورە (مەلا عەبدوللای بێتواتە)و لە (عوێنە) لای زانا (مەلا عوسمان).
- مەلا جەمیل لە سال (١٩٤٢) دوور خرایەوە بۆ (عیمارە)و (نوگرە سەلمان) لەسەر کوردایەتی.
- پاش تەواو بوونی سێ سال لە دوور خراوەیی و بەندی، گەڕاپەوە گوندی (مەتارە) کە سەر بە ناوچەی قەرەحەسەن لەگەل مەلا محەمەدی ئەمین ڕۆژبەیانی براگەورەی پێکەوە دەژیان، هەر خەریکی نووسین بوو لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە: گەلاوێژ، گێتی و هی تر.
- سالی (١٩٤٦) بۆ دووەم جار لە (مەتارە) وە مالیان چووەتە گوندی (بەیانلو) کە سەر بە ناحیەی قەرەحەسەنە، لەوێ (١٠-١٢) منداڵی هەبوو فێری خوێندن و نووسینی دەکردن و بە شەوانیش شوان وکاسبکارانی فێری قورئان خوێندن دەکرد.
- مەلا جەمیل لە سالی (١٩٤٧ بووە چاودێری کرێکاران بۆ قەلاچۆکردنی کوللە لە گوندی (هەیبە) کە دەرمانیان دەرشت بۆ لە ناوبردنی کوللەو گەراکەی بۆ چەند مانگێك.
- سالی (١٩٤٨) مامۆستا مەلا جەمیل گەشتێك دەکات بۆ دەوروبەر کەرکوك وخانەقین وشارەبان وکەلارو دەوروبەری موسل وهەولێر ودەشتی هەولێر بۆ زیاتر ناسینی عەشیرەتی ڕۆژبەیانی، بەناو خزمانی ڕۆژبەیانی دەگەرا، پێش گەرانەوەی بۆ کەرکوك پۆلیس چاوەروانی گرتنی بوو، کاتێ ئەگاتە کەرکوك دەیگرن و دوور دەخرێتەوە بۆ (نوگرە سەلمان)و (ناسریە) بۆ ماوەی پانزە مانگ.
- سالی (١٩٥٠) حەسەن فەهمی بەگ جاف کە (نووسەرو دانەرێکی کوردە) مەلا جەمیل دەکاتە پێش نوێژکەرو ووتار بێژ لە مزگەوتی گەورەی مەحموود پاشای جاف لە (قزلبات) و (سەعدیە) لەسەر ئەرك و مانگانەی خۆیان.
- سالی (١٩٥٣) سەعید قەزاز موتەسەرف لیوای کەرکوك مەلا جەمیلی لە قزلباتەوە گواستەوە بۆ داقوق بۆ ووتار بێژی لە مزگەوتی گەورە ئەوکاتە داقوق (٥٠٠) مالێك دەبوون.
- سالی (١٩٥٤) دەگوێزرێتەوە بۆ کوت لە ڕۆژنامەی (اهالي) وتارێك بەناوی (التریك لا یزید الشعب الكوردي إلا تمسكا بقومیته وحقدا على المستعمر) مامۆستا (عەباس حەسەن جومعە)و چەند کوردێکی دلسۆز فریای دەکەون بە سزای (٥٠٠) دینار کێشەکە کۆتایی پێدەهێنن، مەلا جەمیل لەسەر ئەو ووتارە دوور دەخرێتەوە بۆ (بەسرە) وپێش گەیشتنی لە کارەکەی دەردەکرێت، خوالێخۆشبوو سەعید قەزار فریای دەکەوێت و دەیگێرێتەوە سەر کارەکەی خۆی لە گوندی (شمرتە)ی خواردووی بەسرەو دەیگێرێتەوە بۆ ناو شاری بەسرە.
- سالی (١٩٥٧) دەگوێزرێتەوە بۆ (مەندەلی) بۆ ماوەی دوو سال لە سالی (١٩٥٨) دوای شۆڕشی عەبدولکەریم قاسم، مەلا جەمیل و شێخ لەتیفی حەفیدو گۆرانی شاعیرو لوقمان بارزانی وعەزاوییەکان بە وەفدێك دەچنە مۆسکۆ.
- دوای گەرانەوەی لە مۆسکۆ داوای گوێزرانەوەی خۆی دەکات بینێرنە کەرکوك داواکەی جێ بەجێ دەکرێت و لە مزگەوتی (نائیب) دەبێتە وتاربێژ لەسەر ووتاری ڕۆژی هەینی چەند جارێك گیراوە.
- سالی (١٩٥٩) ووتارێك دەنووسێ بە ناوی (سیدي لقد حسبتك ساهرا فنمت) ئاراستەی سەرۆك زەعیم قاسمی دەکات، لەسەر ئەم ووتارە دەگیرێت و دوور دەخرێتەوە بۆ ناسریەو دەخرێتە بەندیخانەوە بۆ ماوەی پانزە مانگ و لە سەر کارەکەشی دەردەکرێت.
- لەگەل (عەلی کەمال) پەیوەندی هەبووە، زۆریشی باوەری بە (مەلا جەمیل) بووە، دوای دەرچوونی لە بەندیخانەی ناسریە ماوەیەك بێ ئیش دەبێت وعەلی کەمال وەك جێگری خۆی لە پرۆژەکەی لە (بەغدا) دایمەزراندووە ومانگی بە (٤٠) دینار.
- مەلا جەمیل لە لای تالەبانییەکان خۆشەویست دەبێت لەوانە (شێخ حەبیب شێخ عەلی)و (شێخ قادر شێخ وەهاب سیامەنسووری)و چەندین کەسی تر کە تێکەلاوییەکی زۆریان هەبووە.
- سالی (١٩٦٣) گەیشتە ڕیزی شۆڕشی کورد لە (چەم ڕێزان) لەوێشەوە چووەتە (ماوەت) دەبێتە قازی کوردستان و ئەندامی تەمیین، کاتێ ناکۆکی دەکەوێتە نێو شۆڕش، لە سالی (١٩٦٤ مامۆستا مەلا جەمیل لەگەل کۆمەلێکی جیابووواندا دەچێتە ئێران و ماوەی (١٥) سال پەنابەر دەبێت.
- سالی (١٩٧٩) لە ئێران گەرایەوە بۆ وولات لەگەل سەید حوسێن سەید ئەحمەدی خانەقاو چەند کەسێکی تر ولە (بەغدا) جێگربوو.
- سالی (١٩٨١) لەسەر داوای برازاکانی کە تکایەکی زۆری لێدەکەن بۆ ئەوەی ژن بهێنێ، ئەویش ڕازی دەبێت و ژنێکی خەلکی کەرکوك دەهێنێ بەناوی (مەلیحە شاکر) دوای (١٤) سال بێ ئەوەی منداڵی بێت لە یەکتر جیابوونەوە.
- بەرهەمەکانی:
- (تاریخ السلیمانیة وانحائها-محمد امین زکي)، وەرگێران لە کوردییەوە، چاپی یەکەم بەغدا، ١٩٥١، چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٢.
- (حەکایەتی مەلای مەشهور)، وەرگێران، چاپی یەکەم، کەرکوك، ١٩٥٣، چاپی دووەم، ١٩٨٥.
- (الشرفنامة في تأریخ الدول والامارات الکردیة-شرف خان البدلیسي)، وەرگێران لە فارسییەوە، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٥٣، چاپی دووەم هەولێر ٢٠٠١، چاپی سێیەم دیمەشق ٢٠٠٧.

- (مذكرات رفيق حلمي)، وەرگێران لە کوردییەوە، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٥٧.
- (الرسائل المقدسة-سليمان فائق)، لێکۆڵینەوە، بەغدا، ١٩٦٣.
- (وتەکانی شاهنشاه ئاریا میهر)، وەرگێران، هاوبەش، تەهران، ١٩٦٨.
- (المعروفون من الروزبيانية -الروزبهانية- في الكتب التاريخية)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٨٤، چاپی دووەم هەولێر ٢٠٠١ بە ناونیشانی: (نبذة عن العشيرة الروزبيانية والمعروفين من الروزبيانية في الكتب التاريخية).
- (فەرمانڕەوای موکریان)، بەغدا، ١٩٩٢.
- (شۆڕشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا)، ئیحسان نوری، وەرگێران، بەغدا، ١٩٩٣.
- (اثران تاريخيان عن الكرد)، لێکۆڵینەوەو وەرگێران لە عەرەبییەوە، بەغدا، ١٩٩٥.
- (مێژووی حەسەنوەیی و عەییاری)، بەغدا، ١٩٩٦.
- (بغداد الجنة العامرة)، بەغدا، ١٩٩٨.
- (سراج السالكين-حسين قاضي)، وەرگێران، هەولێر، ١٩٩٨.
- (مدن كوردية قديمة تاريخها-جغرافيتها-رجاله-علماؤها-ادباءها)، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (اصل الأسرة النسوية في العراق-آية الله مردوخ)، لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (چوار دەوڵەتی کورد)، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (عێلی لە یاد کراوی جاوان)، وەرگێران، سلێمانی، ٢٠٠١.
- (کورتەیەك لە مێژووی تیرەی ڕۆژبەیانی)، هەولێر، ٢٠٠١.
- (مندلي في التأريخ قديماً وحديثاً)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٨٠، چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٤.
- (داقوق -دقوقاء- في التأريخ)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٨٣، چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٤.
- (وڵاتەکەت بناسە)، هەولێر، ٢٠٠٤.
- (وڵاتگیری ڕەشە خاکی عێراق)، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (وڵاتەکەت باشتر بناسە)، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (کوردو ڕەگەزی ئاری)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (کەرکوك.. ناوی.. مێژووی کۆنی.. دانشتوانی.. دەسەڵاتەکانی)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (چەپکێ ڕەخنە لە کتێبی ئوستاد)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (خانقين في التأريخ).
- لە (٢٧/٢٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠١) دەستێکی ڕەش تیرۆری کرد.
- لە (٢٨)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠١) لە قەبرستانی شۆڕیجە بەخاك سپێردرا.

*** ( جەمیل موفتی ):-**

- ناوی (مەلا جەمیل کوڕی حاجی ئیبراهیم)ە.
- ساڵی (١٩١٧) لە کفری لەدایکبووە.
- ئیمامو خەتیبی مزگەوتی کفری بووەو بابەتو لێکۆڵینەوەکانی لە گۆڤاری (گەلاوێژ) لە چلەکان بڵاوکردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٢) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( جەواد خانەقا - شێخ جەواد خانەقا ):-**

- شێخ جەواد کوڕی شێخ عەبدولقادری سوورە.
- ساڵی (١٨٣٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شاعیرو ئەدیبێکی باڵا بووەو بە زمانی کوردی وعەرەبی وتورکی وفارسی بەرهەمی نووسیووە.

*** ( جەودەت حەسەن خانەقا - شێخ جەودەت حەسەن خانەقا ):-**

- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٠) پەیوەندی کردووە بە کۆلیژی هێزی ئاسمانی و پلەی (ملازم)ی فرۆکەوان دەرچووە.
- ساڵی (١٩٨٥) سەرۆکی هێزی ئاسمانی بنکەی سەربازی کوت بووە.

*** جەودەت دووبزی:-**

- ناوی تەواوی جەودەت حەسەن یابە ناسراو بە جەودەت دووبزی.

- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٣)ی شارۆچکەی دووبز، لە بنەماڵەیەکی هەژارو کوردپەروەرە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە دووبز تەواو کردووەو پاشان چووەتە دهۆك و لەوێ خوێندنی ئامادەیی بازرگانیی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی دواتر بووەتە پێشمەرگە لە سنووری مەڵبەندی ٣و لەم سەروبەندەدا لە دۆڵی بالیسان بووەتە کادیری کۆمەڵایەتی.
- ساڵی (١٩٨٤) بۆ تیپی ٢١ی کەرکوك گواسترایەوەو لە سنووری ئەم تیپەدا وەك کادیرێکی کۆمەڵایەتی سەرقاڵی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکە بووە.
- ساڵی (١٩٨٥) گوێزرایەوە بۆ تیپی ٩٣ی کۆیەو لە تیمی تەقاندنەوە لەمەڵبەندی سێ کاری کرد. سەرەڕای بەشداربوونی لەژمارەیەکی زۆری چالاکی و ئۆپەراسیۆنەکانی هێزی پێشمەرگە لە سنووری تیپی ٢١ی کەرکوك و سنووری مەڵبەندی سێ، لە ئۆپەراسیۆنە گەورەکاندا کاتێك هێزی پێشمەرگە دەستی بەسەر شارۆچکەو سەربازگەکاندا دەگرت، وەك شارەزا لەتیمی تەقاندنەوەدا ئەرکی تەقاندنەوەی بیناو بارەگاکانی لە ئەستۆ دەگرت و لەم سەروبەندەدا چەند تەقاندنەوەیەکی گرنگی ئەنجام داوە وەك تەقاندنەوەی بارەگای حیزبی بەعس لەدارەتوو و تەقاندنەوەی کۆشکەکانی سەددام حوسێن لە پیرمام و سەری رەش.
- لە ٢٨ی شوباتی ساڵی (١٩٨٨) لەگەڵ هاورێیەکی خۆی لەدەستەی تایبەتی مەڵبەندی ٣ بەناوی سلێمان عومەر مەولود، ناسراو بەسولە قۆریتانی، هەوڵیاندا تاوەرێکی سەر رێی هەولێر- موسڵ بتەقێننەوە کەبۆ تەشویش خستنە سەر پەخشی رادیۆی دەنگی گەلی کودستان لەسەر رێی موسڵ دانرابوو، بەڵام بەهۆی هەڵەیەکی تەکنیکییەوە کەرەستەی تەقینەوەکە بە خۆیاندا تەقییەوەو بووە هۆی شەهید بوونی هەردووکیان.

* ( جەوهەر نامیق )؛-

- ساڵی (١٩٤٦) لە کەلار لەدایکبووە.
- دەرچووی کۆلێژی ئابووری سیاسی زانکۆی موستەنسریە لە بەغدا.
- باوکی یەکێك بووە لە دامەزرێنەرەکانی حیزبی هیوا.
- لە (٤)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٢) دەبێتە یەکەمین سەرۆکی هەڵبژێردراوی پەرلەمانی کوردستان تاکو ساڵی (٢٠٠٠).

* جەوهەر لەتیف محەمەد:-

فەرماندەی پێشمەرگە، ناسراو بەسەید جەوهەر، لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٢ی گوندی لەك لە ناوچەی قادر کەرەم، ساڵی ١٩٨١ پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردوەو لە هەرێمی ٥ی قەرەداغ پێشمەرگایەتیی کردوە، ساڵی ١٩٩١ کرا بە فەرماندەی لیوای سێی فەرماندەیی ناوچەی کەرکوك و دواتر کرا بە جێگری فەرماندیی ناوچەی کەرکوك و دواتر کرا بە جێگری فەرماندەی فەرماندەیی ناوچەی کەرکوك. لە ١٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ لە ئۆپەراسیۆنی گەردەلولی دووەمی تۆڵەدا، لەسەری شەکرۆك شەهید بوو.

* چەتۆ سالح سەعید

پێشمەرگەی دێرین و پارتیزان. لە دایکبوی ساڵی ١٩٦٨ی گەڕەکی ڕەحیماوای شاری کەرکوك، قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکوك تەواو کردووەو لە ساڵانی دواتردا خوێندنی دواناوەندیی لە دەربەندیخان تەواو کردووە.

ساڵی ١٩٨٤ پەیوەندیی بەکەرتی ڕێکخستنی بنگردی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو لە شانەی شەیدای پۆلی چەمی ڕێزان ڕێك حراوە.

ساڵی دواتر بۆتە پێشمەرگە لە کەرتی ٣ی مەرگەی تیپی ٤٣ی ئاسۆس. دوای شەش مانگ بۆ تیپی ٢١ی کەرکوك گوێزرایەوە، ساڵی ١٩٨٧بەشدار بووە لە خولی عەسکەریی ئەهواز بۆ مەشق و راهێنان لە سەر بەکارهێنانی موشەکی مالۆتکا.

هەر لەو ساڵەدا دەزگا ئەمنییەکان برایەکیان لە کەرکوك بە بەر چاوی خەلکەوە گوللەباران کردو دواتریش پێنج برای و باوکیان دەستگیر کردو تا ئێستا سێ برای بێسەرو شوێنن، لە ساڵی ١٩٨٨دا برایەکی تری بەناوی عەبدولهادی سالح سەعید لە گوندی شاناخسێی ناوچەی شارباژێر لە هێرشێکی کیمیایی فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانیی عێراقدا شەهید بوو.

لە کاتی شاڵاوی ئەنفالەکاندا، پاش نەهامەتییەکی زۆر، براو دایکی گەیاندە شارۆچکەی تەکیەو خۆیشی هەڵکشایە سەر سنور، ساڵی ١٩٨٩ لە ئێران بەشدار بوو لە خولێکی عەسکەریی دیکە لە شاری مازندەران. ساڵی ١٩٩٠ بەنهێنی و بەناسنامەی ساختە دەچێتە ڕانیەو لەوێدا بەیارمەتیی ڕێکخستنە نهێنییەکان براو دایکی دەدۆزێتەوە. هەر ئەو ساڵە دەزگا ئەمنییەکان چەند کادرێکی ڕێکخستنەکانیان لە ڕانیە دەستگیر کرد، بۆیە بەر لەوەی مەترسییەکە بگاتە لای، ڕانیەی بەجێهێشت و پەیوەندیی بە پێشمەرگە پارتیزانەکانی ڕستی سورداشەوە کرد کە غەریب هەڵەدنی ڕابەرایەتیی دەکردن. لەو ماوەیەدا بەشدار بوو لە چالاکییەکانی پێشمەرگە پارتیزانەکان لە پانتایی نێوان سورداش و شێخ بزەینی.

لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١دا بەشدارییەکی کارای لە

ئۆپەراسیۆنەکانی گرتنی ڕانیەو دوکانو سلێمانیو چەمچەماڵو قەرەهەنجیرو کەرکوکدا کرد. هەر ئەو ساڵە کرایە کارگێڕی کۆمیتەی پیرەمەگرونو دواتر لەوێ بووە نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە بەرەی کوردستانی.
ساڵی دواتر ڕاژەی بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی کەرکوك لە دەربەندیخان گواستەوەو لە ساڵی ١٩٩٣دا کرایە بەرپرسی لێکۆڵینەوە لە ئاسایشی ناوشاری هەولێر.
ساڵی ١٩٩٦ لە کۆلیجی عەسکەریی قەڵاچوالاندا بەشداریی لە خولی ئەفسەراندا کردو هەمان ساڵ لێپرسراوەتیی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی ڕانیەی پێ سپێردرا. ساڵی ٢٠٠٠ کرایە جێگری بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرکوك لە دەربەندیخان، ساڵی ٢٠٠٣ کرایە جێگری بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك لە دەربەندیخان، ساڵی ٢٠٠٧ بە پلەی لیوا گوێزرایەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆو هەر لەو ساڵەشدا بڕوانامەی بە کالۆریۆسی لە کۆلیجی یاساو سیاسەتی زانکۆی سلێمانیو وەدەستهێنا.
هەمان ساڵ بەشدار بوو لە ئۆپەراسیۆنی کێوماڵ کردنی چیای حەمرین کەتێیدا ناوچەکە لە ماوەی سێ مانگ لە چەکدارەکانی ڕێکخراوی قاعیدە پاك کرایەوە.

* ( جاسم ڕەحیم شەمزین کاکەیی ):-

- ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی کۆلێژی مافە، بەشی یاساو سیاسەت لە زانکۆی

بەغدا لە ساڵی (١٩٨٢-١٩٨٣).
- چەندین نووسینی ئەدەبیو یاسایی هەیە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا.
- حاکم بووە لە شارەکانی سلێمانیو کفریو خانەقینو کەرکوك، ئێستا حاکمە لە قەزای داقوق.

* ( جاسم محەمەد جەعفەر ):-

- ساڵی (١٩٥٨) لەخورماتوو لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لە ئەندازیاری شارستانی لەزانکۆی سلێمانی لە ساڵی (١٩٨٠) بەدەستهێناوە.
- چووەتە ڕیزی بەرهەڵستکارانی ئیسلامیی عێراقییەوە لە ساڵی (١٩٧٩)، هەروەها حوکمی غیابیی لەسێدارەدان دراوە لە ساڵی (١٩٨١).
- ساڵی (١٩٨١) چووەتە دەرەوەی کوردستان.
- یەکێکە لەدامەزرێنەرانی (الاتحاد الإسلامي لتوركمان العراق)ەو بووەتە جێگری حیزبەکە.
- لە حکومەتەکەی ئیبراهیم جەعفەری وەزیری ئاوەدان کردنەوەو نیشتەجێبوون بووە، لە ساڵی (٢٠٠٥) وەزیری وەرزشو لاوان بووە لەحوکمەتەکەی نوری مالیکی.

* ( جان دەمۆ ):-

- ناوی (یۆخنا دەمۆ یوسف)ەو نازناوی شیعری (جان دمو) بووەو کە لە ناوی بیرمەندی فەرەنسی (جان پۆل سارتەر)ەوە وەریگرتووە.
- ساڵی (١٩٤٢) لە گەرەی عەرەفەی کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی نوێگەری لە کەرکوك لە پەنجاکانداو بە زمانی عەرەبیو ئینگلیزی گەلێك کاری کردووە، یەکێك بووە لە دامەزرێنەری (جماعة كركوك).
- لەبەر ئەوەی ماڵێکی تایبەتو سەربەخۆی نەبوو، بەڵکو ئەوەی هەیبوو هەمووی بە کۆڵیەوە بوو، لەگەڵ خۆیدا بۆ باخچە گشتییەکانو ماڵی هاوڕێیەکانی دەگواستەوە، بۆیە هەمووو دەستنووس و لێکۆڵینەوەکانی پەراگەندە بووە.
- ساڵی (١٩٩٣)دا کۆمەڵە شیعرێکی بەناوی (أسمال) لە دەزگای ئامەد بە چاپ گەیاندووە.
- ساڵی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە.

* ( جاوید موفتی ):-

- ناوی (جاوید کوری حەسەن موفتی)یە لە ساڵی (١٩٣٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.

- سالی (١٩٦٠) (دار المعلمین)ی تەواو کردووەو بەشداری کردووە لە کتێبی ئەدەبیاتی گەنجان لە سالی (١٩٦٤).
- یەکێکە لەو نووسەرو ئەدیبو شاعیرانەی جێ پەنجەی دیارە لە کەرکوك.
- سالی (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.

* ( جوامێر ئاغای هەمەوەند ):-

- جوامێر ئاغای هەمەوەند کە زۆرجار بە (چوکل) هەمەوەند ناودەبرێت یەکێکە لە سەرکردە خێڵەکییە ناودارە هەڵکەوتووەکانی کەرکوك.
- ئەم زاتە کوری ئەحمەدی کوری حەمەی کوری جوامێری یەکەمە (باوەگەورەی هەمەوەندەکانی کوردستانی عێراق) ە لە سییەکانی سەدەی هەژدەداو لە ئامێزی بنەماڵەی بەگزادەکانی هەمەوەندا هاتووەتە دونیاوە.
- لە تاقی لاوێتییدا نموونەی سوارچاکیو دلێریو جەنگاوەریی پێوە دیاربووە، ئەوجا بووە بە سەرۆکی هۆزەکەیو رۆلێکی گرنگو بەرچاوی لە شەرەکانی دژ بە تورکو فارسو رووس بینیوە لە مێژووی پر لە کارەساتو دەربەردەری و پەراگەندەیی ئەو هۆزەدا بە تەواوی شوێندەستی دیار بووەو گەلێك ئازارو مەینەتی چەشتووە.
- سالی (١٨٨٠)ی زایین کاتێك جوامێرو هەمەوەندەکان لە ئەوپەری لوتکەی هێزو دەسەلاتدا بوون وبە سەربەرزی لە زێدی باب باپیرانیاندا لە چەمچەمالو بازیان ژیانیان بەسەر دەبرد.
- بکوژانی حەمە پاشای جاف لە تیرەی کەرەموەیسی سەر بە هۆزەکەی پاشای غەدرلێکراو بە ناچاری پەنا بۆ جوامێر ئاغا دێنن، ئەمیش بەپێی عورفی خێڵەکی ئەو سەردەمە دالدەیان دەدات.
- بەو هۆیەوە شەری قورس لەنێوان هەمەوەندو جافدا بەرپا دەبێتو لە سەرەتدا هەمەوەندەکان دەتوانن بەرەنگاری لەشکری گەورەی جاف لە بناری (گل)دا بکەنو زەبریان پێ بگەیەنن،
- وەلێ دواتر لەژێر گوشاری سەختی جافدا، کە ئەو دەمە لە لایەن عوسمانییەکانەوە بەپێی مەرامی خۆیان پالپشت دەکران هەمەوەندو کەرەم ویسییەکان دەشکێن وبۆ ئەو بەری سیروان پاشەکشێ دەکەن، لەوێندەریش پاش شەرێکی سەختو خوێناوی، کە زۆربەی هەرە زۆری کەرەم وەیسییەکان و ژمارەیەك لە هەمەوەندو جافی تێدا کوژران، جوامێرو هۆزەکەی ناچار دەکرێن کە بۆ ئەودیوی سنوور پەنا ببەن لەو قۆناغەدا قاجارییەکان بە هەلیان زانی کەلك لە توانای جوامێر وهەمەوەندەکان وەرگرن وبە مەبەستی پاراستنی هاوسەنگی هێز لە ناوچەکەدا دژ بە عوسمانییەکان بەکاریان بهێنن لەو پێناوەدا قاجارییەکان رێزێکی زۆر لە جوامێر دەگرن وناوچەی (زەهاو)ی پێ دەبەخشن.
- بەو شێوەیە هەمەوەندەکان لە سنووری (زەهاو)و (قەسری شیرین) دا سەر بەرزانە دەژیانو لەلایەن (ظل السلطان) ی فەرمانرەوای ئەسفەهانەوە مایەی بایەخو حورمەت دەبن وەلێ دواتر بە لادانی (ظل السلطان) یەکسەر باری هەمەوەندەکان تێکدەچێتو لە لایەن قاجارییاکانەوە کە زۆر لەدەسەلاتی هەمەوەندەکان نیگەران بوون.
بەلام لەدوایدا عوسمانییەکان وقاجارییەکان رێك دەکەون بۆ پاککردنەوەی سنووری هەردوولا لە هەمەوەندەکان، ئەوەبوو قاجارییەکان سوپایەکی گەورەیان بە فەرماندەیی (حسام الملك) بۆ ناوچەکە نارد، لەم لاشەوە عوسمانییەکان سوپایەکیان بە فەرماندەیی (قودرەت ئیسماعیل پاشا) بۆ هەمان مەبەست نارد کاتێك (حسام الملك) سالی (١٨٨٦) دەگاتە (قەسری شیرین) پەنادەباتە بەر پیلانو فرتوفێل بە ناوی دانووستانەوە داوەتی جوامێر دەکات بۆ سەربازگەکەی خۆی بۆیە لەوێ دەست بە جێ تەقەی لێ دەکەنو دەیکوژن.

* ( جوامێر - مامۆستا جوامێر ):-

.ناوی (نەجمەدین رەشید ئەمین)ە -
.سالی ١٩٥٤ لە کەرکوك لەدایکبووە -
.سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە -
سالی ١٩٧٦ پەیوەندی کردووە بە رێکخستنەکانی - .کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان
سالی ١٩٧٧-١٩٧٩ لەلایەن بەعسەوە و ماوەی سێ سال - .زیندانی کراوە
سالی ١٩٨٠ پەیوەندی کردووە بە ریزەکانی پێشمەرگەوە - لە خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان و بووە ئەندامی .پەرلەمانی کوردستان
سالی ٢٠٠٣ کراوەتە لێپرسراوی مەکتەبی مافی مرۆڤی - .یەکێتی نیشتمانی کوردستان

* ( جوان سەلاحەددین ):-

- سالی (١٩٨٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لەنێوان سالانی (٢٠٠٨-٢٠٠٩)، پەیمانگای هونەرە جوانەکانی تەواو کردووە، بەشی هونەری شێوەکاری.
- نزیکەی ٢٥ پێشانگای شێوەکاریی لە دەرەوەی وولات کردووەتەوە، لە سووریاو تورکیاو ئێران.

- ساڵی (٢٠٠٩) لە پێشانگای گەلەری سلێمانی (١١٥) تابلۆی نمایش كردووە.
- ساڵی (٢٠٠٩) لە پێشانگای (ناوەندی لاوانی كەركوك) (٣٠) تابلۆی پێشكەش كردووە بە ناونیشانی ئاوازی گوڵ.
- ساڵی (٢٠٠٩) بەشداری پێشانگای قوتابخانەی نەورۆزی سەرەتایی كردووە بە (٥٠) تابلۆ.
- ساڵی (٢٠١٠) بەشداری پێشانگای هەڵەبجەی كردووە بە (١٥٠) تابلۆ.
- ساڵی (٢٠١٠) بەشداری پێشانگای قوتابخانەی نەورۆزی سەرەتایی كردووە بە (١٠٠) تابلۆ.
- ساڵی (٢٠١٠) بەشداری پێشانگای رێكخراوی دیجلەی كردووە لە یادی مافی ئافرەتدا بە (٧٥) تابلۆ.

* جومعە ساڵح عومەر مەولوود شوانی:-

- ساڵی ١٩٦٤ لە كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی ١٩٨٣ كۆلیژی سەربازی بەغدای تەواو كردووە لە خولی ٦٣ بە ناونیشانی (طیران الجیش).
- ساڵی ١٩٩١ خانەنشین كراوە.

* (جومعە محەمەد ئەحمەد):-

- ساڵی (١٩٤١) لە گەرەكی (ئیمام قاسم) لە كەركوك لەدایكبووە.
- دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانە لە دیالە لە ساڵی (١٩٦٤-١٩٦٥).
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (فتح القریب)، بەزمانی كوردی دوو بەرگ، كەركوك، ١٩٤٧.
- (شەرحی ئەربەعینی نەوەوی)، كەركوك، ١٩٧١.
- (سێ چیرۆكی منداڵان بە كوردی)، كەركوك، ١٩٧٢.
- (ژیانی پێغەمبەری نازدارمان)، سلێمانی، ١٩٧٥.
- (جامع الخیرات) بەزمانی عەرەبی، یەك بەرگ.
- (فێربوونی نوێژ)، ١٩٧٦.

- (معارف علماء الدین)، شەش بەرگە.
- (الطبیعة وما وراءها)، ئامادەیە بۆ چاپ، لەگەڵ گەلێكی تر.

* (جومعە نوورددین محەمەد-جومعە جەباری):-

- ساڵی (١٩٦٩) لە كەركوك لەدایكبووە.
- دەرچووی كۆلیژی ئاداب بەشی زمانی عەرەبی.
- ساڵی (١٩٩٦)ەوە لە گۆڤاری (گوڵان)و (خەبات)و رۆژنامەی (التآخي)و (باسەرە)و (كانیاو) كاری كردووە.
- لە كتێبە چاپكراوەكانی: (بەر لە ئەنفال دوای لە یادچوون)، وەرگێران لە عەرەبییەوە.

* (جیمۆ بێ ناو):-

- (جەمیل كوڕی حاجی برایمی كوڕی مەلا ئەحمەدی كوڕی شێخ زیائەددین)ە.
- جەمیلی حاجی برایم هەر لە منداڵییەوە هێمای زیرەكی و بزێوی تیادا دەردەكەوێت بۆ كاركردن و خوێندن ئەم شارو ئەو شار دەكات لە بەرێوەبەرێتی نەوت ماوەیەك فەرمانبەری دەكات، لە سەید خەلیلی لای كەلار دەبێتە مەلا، ئینجا لە پەنجاكاندا لە سلێمانی ماوەیەك مەلایەتی دەكا لەوێوە لە شەستەكانەوە دێتە كفری و دەبێتە پێش نوێژی مزگەوتی گەورە تا ساڵی (١٩٨٢) كۆچی دوایی دەكات و لە گۆرستانی (باوە شاسوار) بەخاك دەسپێردرێت.
- مەلا جەمیل لە سییەكانەوە كتێبی كوردی دەخوێندەوە لە چلەكانەوە دەستی نووسینی هەبووە لە گۆڤاری گەلاوێژدا، چەند نووسینێكی هەیە لەوانە (بەربەرەكانی ژیان) لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە (١٢)ی ساڵی (١٩٤٣)دا بڵاوكراوەتەوە.
- مەلا جەمیل حاجی مەلا برایم وەك مەلاكانی تر هەر بەستراوی كتێبی ئایینی نەبوو، بەڵكو مێژوو فەلسەفەی دەخوێندەوە لە زماندا كوردی وعەرەبی وتوركی وفارسی

بە نووسین خوێندنی زانییوە وفێری چەرەیەك ئینگلیزیش بووە، لە وەزیفەکەیدا لە شەریکە بەکاری هێناوە.
– جەمیلی حاجی برایم یەك کتێبی چاپکراوی هەیە ئەویش کتێبی (مێژووی شەڕی ئەهلی صەلیب و قارەمانی کورد صلاح الدین ئەیوبی)یە ئەم کتێبە ساڵی (١٩٥٩) بە قەبارەی (١٦٨) لاپەرە لە سلێمانی لە چاپخانەی (کامەران) چاپی کردووە مەلا جەمیل لەوکاتەدا ئەو کتێبەی داناوە مودەریسی مزگەوتی (عەلی نیزامی) بووە لە سلێمانی.

*** (جیهاد دڵپاك):-**

– (جیهاد زۆراب ئەحمەد)، نازناوی هونەری (جیهاد دڵپاك) ە.
– ساڵی (١٩٤٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– سەرجەمی خوێندنەکانی هەتا پەیمانگای مامۆستایانیشی لە کەرکوك تەواو کردووە.
– ساڵی (١٩٧١)ەوە بە کاری هونەرییەوە خەریکە.
– یەکەم کاری هونەری کە بەشداری تێدا کرد ساڵی (١٩٧١) بوو بە ناوی (ژیان کچە لاڵەکە).
– ساڵی (١٩٧٧) چووەتە سلێمانی و بەشداری شانۆگەری (پردی ئارتا)ی کردووە.
– ساڵی (١٩٨٤) هەستا بە دەرهێنانی شانۆگەری (ئەنتی گۆنا) هەروەها نووسین و دەرهێنانی ئۆپەرێتی (دارستان).
– ساڵی (١٩٨٥) لە زنجیرە درامای (ژاڵە) بەشداری کرووە.
– لە دوای ڕاپەرین لە درامای (چارەنووسی ئادەمیزاد) ئینجا (کەژاوەی مەرگ).
– ساڵی (١٩٨٣) سکرتێری دامەزرێنەری یەکێتی هونەرمەندان بووە.
– ساڵی (١٩٧٤) لە شۆڕشی ئەیلول بەشداری کردووە و لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە لە کەرکوك دوورخراوەتەوە لەبەر کاری سیاسی.
– لە زنجیرە درامای (گەرەلوول)ی یەك و دوو و سێ و زنجیرە درامای (کەرکوك ٤) و (لاپەڕەکانی کەرکوك) وەکو ئەکتەر بەشداری کردووە.
– لە (٢٥)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** (جیهاد زەینەڵ):-**

– لە ساڵی (١٩٥٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– خۆشنووسێکی بەرچاوی شاری کەرکوکە.
– دەرچووی کۆلیژی ئابوورییە.

*** جمهور مستەفا عەلی:-**

– لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٩ی تەپەی کەرکوك. هەر سێ قۆناغی خوێندنی لەوێ تەواو کردووەو پاشان لە کۆلیژی پەروەردەی زانکۆ وەرگیراوە.
– ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد. ساڵی (١٩٨١) بووە پێشمەرگە لە هەرێمی ٢ی کەرکوك.
– ساڵی (١٩٨٦) کرایە ڕابەری سیاسی لە سنووری تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.

*** جەمال بەهادین محێدین.**

فەرماندە. ناسراو بە شێخ جەمالی گەرمیان، لە دایکبوی ساڵی (١٩٥٦)ی گوندی داربەڕوی ناوچەی سەنگاو، ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو لە ساڵی (١٩٧٨)دا بووەتە پێشمەرگە لە هەرێمی ٥ی قەرەداغ.
لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا پلە بە پلە گەشەی کردووە، لە فەرماندەی مەفرەزەوە دەستی پێ کردووەو پاشان بۆتە جێگری فەرماندەی کەرت و لە ساڵی ١٩٨١دا بۆتە فەرماندەی کەرتی ٥ی داویە، ساڵی ١٩٨٥ کرایە جێگری فەرماندەی تیپی ٥١ی گەرمیان، لەو ماوەیەدا ڕۆڵێکی دیاری لە چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەدا هەبووەو بەشداریی ژمارەیەکی زۆری نەبەردو ئۆپەراسیۆنەکان کردووە لەوانە نەبەردەکانی زینانە، سلێمان بەگ، سەرجادەی کەرکوك – بەغدا، توکن عەزین، قادر تەنکی، ئاوڕێژی کچان، سەی جەژنی، ژاڵە، خاڵە بەگ، بەردەکەڕ، تەپە عەرەب و لە یەکەم ئۆپەراسیۆنی ساڵی ١٩٨٦ی گرتنی شارۆچکەی سەنگاودا ڕۆڵێکی باڵای گێڕاوە.
ساڵی ١٩٨٦ پاش ئەوەی کەبڕیاری دروستکردنی تیپی ٥٩ی حەمرین دراو سنوری چالاکییەکانی دەستنیشان کرا، بڕیار درا جەمال بەهادین محێدین ببێ بە یەکەم فەرماندەی تیپە تازەکە، بەڵام پێش دەستبەکاربوونی لەو تیپە، لە ئۆپەراسیۆنی قەیوان – ماوەت لە ٦ی ئەیلولی ١٩٨٦ لە چیای دۆڵبێشکی ناوچەی شارباژێر شەهید بوو.

شەهید جەلال کەریم

شەهید جەبار پیرۆزخان

شێخ محەمەد شێخ سەلمان لەگەڵ شەهید جەلال کەریم

جەبار پیرۆز خان و مارف بەرزنجی

شیخ جەلال محەمەد ئەحمەد

جەمال کەمال کوبرلو

جەلیل قەیسی

جەعفەر عەسکەری

جومعە سالّح عومەر مەولود شوانی

شێخ جەمیل قادری

شێخ محەمەد شێخ سەلمان لەگەڵ شەهید جەلال کەریم

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی

جەلیل حەمە موراد شەریف

* جەلیل حەمە موراد شەریف:-

ساڵی ١٩٦٤ لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە،
- ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- هەر لە ساڵی ١٩٧٩ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.
- بەردەوام بووە لە کارو ڕێکخستنەکانی حیزب تا پرۆسەی ئازادی عێراق.
- ساڵی ٢٠٠٩ کراوە بە بەڕێوەبەری چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی.

* بنەماڵەی ( جەلیلی کەرکووکی ):-

بنەماڵەی جەلیلی یەکێکە لەو بنەماڵە ناودارانە بوون کە لە ناوچەی کەرکووکەوە بۆ کرماشان هاتوون، مەلا عەبدولجەلیل زەنگەنەی کەرکووکی، ڕێبەری بنەماڵەی جەلیلی کە باپیرانی لە شێخە سوونی مەزهەبەکانی ڕێبازگەرێتی لە کوردستانی عێراق بوون.
لە کەربەلا درێژەی بە خوێندندا و ساڵانێك لەلای ئاغا محەمەد باقر وەحید بەهبەهانی و زانای شیعەی ئەو دەڤەرەدا تەواو کرد.

ئەلزەعیم جەمال کەمال ئیبراهیم

*** جەمال کەمال ئیبراهیم:-**

**- سالی ١٩١٨ له کەرکوك لەدایکبووه.**
**- سالی ١٩٤٠، خولی (١٨)ی له کۆلێژی سەربازی پۆستەمییەی له بەغدا تەواو کردووه بەناونیشانی (مشاة) دوا پلەی (عمید) بووه له سوپا.**
**- سالی ١٩٩٠ کۆچی دوایی کردووه.**
**- کاری جۆراوجۆری سەربازی به ئەنجام گەیاندووه.**

*** جەبار عەبدوللا عەزیز:-**
**- سالی ١٩٤١ له چەمچەماڵ لەدایکبووه.**
**- سالی ١٩٥٨ خولی (النواب الضباط)ی تەواو کردووه له خولی (خاصه) به پلەی (جۆقی سەربازی)**
**- سالی ١٩٨٠ نێردراوه بۆ فەرەنسا بۆ خولی موسیقای سەربازی.**
**- سالی (١٩٨٣-١٩٨٧) ئامر سرییەی مۆسیقای سەربازی بووه له سلێمانی.**

*** جەودەت تەیفور عەباس:-**
**- ناوی جەودەت تەیفوور عەباس ئەحمەد بەزاز نازناوی (هەژار) بووه.**
**- سالی ١٩٧٢ کۆلێژی سەربازی پۆستەمییەی له بەغدا تەواو کردووه له خولی (٥٠) بەناونیشانی (مدفعیة).**
**- سالی ٢٠٠٤ شەهید کراوه لەبەردەم ماڵەکەی خۆی لەلایەن چەند تیرۆریستێکەوە.**
**- سالی ١٩٧٣ سوپای بەجێهێشتووه و پەیوەندی به شۆڕشی ئەیلوولەوە کردووه.**
**- سالی ١٩٧٥ گواستراوەتەوە بۆ فەرمانبەری مەدەنی له**

**سەماوە له هێلی شەمەندەفەر و سالی ١٩٨٠ خانەنشین کراوه.**
**- له دوایی (٢٠٠٣) دووباره گەڕاوەتەوە سوپا.**

*** چالاك سدیق حەسەن:-**

– ساڵی ١٩٦٥ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– مامۆستای مۆزیك لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی و کەرکوك.
– ساڵی (١٩٩٨) بە فەرمی دامەزراوە بە مامۆستا لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی. بۆماوەی (٥) ساڵ یاریدەدەرو بەڕێوەبەری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك بووە ٢٠٠٧ تا ٢٠١١.
– شارەزایە لە ئامێری کەمانچەو مۆزیك بە گشتی و مۆزیکی کوردی و ڕۆژهەڵاتی ناوین، شارەزا لە هونەری دەستگاو مەقامەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین.
– دەرچووی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی موسڵ ساڵی (١٩٨٧–١٩٨٨)، هەروەها دەرچووی کۆلێژی هونەر لە زانکۆی بەغدا بەشی زانستی مۆزیك بە پلەی یەکەم زۆر باشە لە ساڵی (٢٠١٣– ٢٠١٤) دەرچووە.
– سەرەتای فێربوونی لە پایزی ساڵی (١٩٨١) بەهۆی هونەرمەندی شەهید عومەری مەلا سدیقی برایەکێی کەرکوکەوە کە بە مامۆستا (جەلال سۆدەچی) ناساندو لای ئەو فێری سەرەتاکانی ئامێری کەمانچە بووە لەسەر ستایلی مۆزیکی ڕۆژهەڵاتی.
– ساڵی (١٩٨٢) چووەتە لای مامۆستای خوا لێخۆش بوو (قادر مەردان) لای ئەو لەسەر شێوازی ئەکادیمی سەرەتاکانی ئامێری کەمانچەی (VioLIN) خوێند یەك ساڵ زۆر سوودی لێ بینی بەو هۆیەوە توانیی لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ وەربگیرێت.
بەڵام لەبەر بارودۆخی ناهەمواری کوردستان بەتایبەتیش شاری کەرکوك نەیتوانی کاری هونەری ئەنجام بدات لە دوای تەواوکردنی پەیمانگا، بۆیە کارە هونەرێکانی لەدوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی خەڵکی کوردستانەوە دەست پێدەکات تەنیا چەند چالاکییەك نەبێت:
– بەشداریکردنی وەك خوێنکارێك لە هەموو فیستیڤاڵ و چالاکییە مۆزیکێکانی پەیمانگا لەماوەی خوێندنیدا.
– دامەزراندنی تیپی مۆزیکی گەرمیان لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی هونەرمەندی لەوانە شەهید عومەری مەلا سدیق (١٩٥٨ – ١٩٨٤) کە بەشداری ئاهەنگی تەکێی جەبارییان کرد بۆ کەرتەکەی شەهید مامە ڕیشە کە لەکاتی ڕێکەوتنەکەی ساڵی (١٩٨٤)دا بوو لەوکاتەدا ناوبانگێکی زۆری دەرکرد، بەڵام لەدوای تێکچوونی ڕێککەوتنەکە هەندێ لە ئەندامانی تیپەکەیان گیران.
– سەرەتای ساڵی (١٩٩٢) لە شاری سلێمانی لەگەڵ هونەرمەندان (حەمە ڕەئووف کەرکوکی و لالۆ ڕەنجدەرو دلێر حوسێن). چەند هونەرمەندێکی تر تیپی مۆزیکی کەرکوکیان دامەزراند لەو ساڵەدا چالاکی هونەرییان زۆر کرد.
– ساڵی (٢٠١١)وە ئەندامی ئەنجوومەنی باڵای سەندیکای هونەرمەندانی کوردستانە و سەرۆکی لقی کەرکوکی هەمان سەندیکایە کە کارێکی ڕێکخراویی و ئیداری و هونەرییە سەرۆکی تیپی مۆزیکی کەرکوکە، ساڵانە چەندین بەرهەم پێشکەش دەکەن بەتایبەتی لەساڵی (١٩٩٨) تا ئێستا.
– ئەندامی ئۆرکیسترای سلیمانییە لە ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری چەندین کاری ئۆرکێسترایی سیمفۆنیك کردووە بە ڕابەرایەتی هونەرمەندان (ئەنوەر قەرەداغی، نەجات ئەمین، عەبدوڵڵا جەمال سەگرمە، مستەفا عەباس، کۆمەڵی مایسترۆی بیانی)
– لەگەڵ زۆرینەی تیپە مۆزیکێکانی شاری سلێمانی کاری کردووە.
– بەشداری چەندین کاری تۆمارکردنی بەرهەمی هونەرمەندانی کوردی کردووە.
– دەستەی دامەزرێنەری ڕێکخراوی ئازاد هەورامییە.
– لەگەڵ دروست بوونی کەناڵی کوردسات هەر لەسەرەتاوە وەکو موزیك ژەن کاری تێداکرد بۆ ماوەی پێنج ساڵ بە بەردەوام بەتایبەتی لە بەرنامەکانی (سۆزو ئاوازو میلۆدی) هەروەها دامەزرێنەرو سەرپەرشتیاری گرووپی بەرنامەی ئاوێنە بووە لەو کەناڵە. لە کەناڵی ئاسمانی کەرکوکیش هەر لە سەرەتاوە سەرپەرشتی دوو بەرنامەی مۆزیکی کردووە (بەرنامەی میلۆدی و مەقامات).
– چەند خول و ۆرك شۆپی لەناوەو دەرەوەی وڵاتدا لەسەر هونەر بینیوە لەوانە لە زانکۆی (مۆزارتیۆم) لە وڵاتی نەمسا لەگەڵ ڕێکخراوی (yes acadimi) ئەمریکی پێنج ساڵ کاری کردووە (٢٠٠٧ تا ٢٠١٢).
– کاری مۆزیك و ئاوازی بۆ کۆمەڵێ هونەرمەند کردووە لەوانە (حەمە ڕەئووف، عەباس محەمەد، ئاکۆ عەبدولسەلام، نامۆ عومەر، عەباس سەلاح داودە، چنار کەرکوکی... هتد)
– کۆمەڵێ ئاوازو بەرهەمی بۆ مندالان لە کەناڵە ئاسمانییەکان بڵاوکردووەتەوە.
– چەند بەرهەمێکی مۆزیکی ئۆرکیسترایی داناوە لەسەر شانۆ نمایش کراوە.
– مۆزیکی بۆ درامای کەرکوك ٤ داناوە کە لە دەرهێنانی

ناسر حەسەن بوو.
- بەشدار بووە لە فیستڤاڵەکانی مۆزیکی کوردی ۲۰۰۳ لە شاری سنەو ۲۰۰٤ لە سەردەشت ۲۰۰٥ لە دیاربەکر کۆنسێرتێکی ئۆرکێسترا لە ۲۰۱٤ لە شاری سۆفیای وڵاتی بولگاریا.

* (چالاك محەمەد بازرگان):-

- ناوی (چالاك محەمەد نوری عوسمان بازرگان)ە.
- ساڵی (۱۹٦۹) لە گەڕەکی ئیمام قاسم هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (۱۹۸٦) بۆ ماوەی ۱٥ ساڵ حوکمی زیندانی کراوە لە (ئەبو غرێب).
- ساڵی (۱۹۸۸) ئازاد کراوە کە سێ ساڵی تێدا بووە.
- ساڵی (۱۹۸٥) بریاری وێنەکێشانی داوەو لە ساڵی (۱۹۸۹)وە بەشداری کردووە لە یەکەم پیشانگای هاوبەش.
- ساڵی (۱۹۹٤)ەوە لە هەندەران لە هۆڵەندا دەژێت.
- ساڵی (۱۹۹۹)دا لە شاری (ئەرمیلۆ)دا یەکەم پیشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە.
- ساڵی (۲۰۰۰)دا بەشداری کردووە لە پێشانگایەکی هاوبەش لە (ئەمستردام) بە هاوبەشی هونەرمەند (جەمال محەمەد).
- ساڵی (۲۰۰۱)دا لە شاری (ئەرمیلۆ) بەشداری پیشانگای سێیەمی کردووە کەهەردوو ڕۆژنامەی (ئەرمیلۆس نیموز بلات)و (هاندل بۆست) لە سەریان نووسیوە.
- ساڵی (۲۰۰۸)دا بەشداری پێشانگای شێوەکاری کردووە لە (Harderwijk Sint Jansen dal.)
- ساڵی (۲۰۱۰)دا بەشداری پێشانگای شێوەکاری کردووە لە (Harderwijk Sint Jansen dal.)
- ساڵی (۲۰۱۲)دا بەشداری پێشانگای شێوەکاری کردووە لە (Nijkerk veen ..atelier injoy.)
- ساڵی (۲۰۱٤)دا بەشداری پێشانگای شێوەکاری کردووە لە (Harderwijk Sint Jansen dal.)
- بەشداری پێشانگای شێوەکارانی هۆڵەندای کردووەو تابلۆکەی بووە بە یەکەم لەسەر ئاستی هۆڵەندا لە شاری (ئیتر میلو).

* (چنار نامیق):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (بیرەوەرییەکانی ڕۆژمێرێکی شەکەت)، شیعر، ۱۹۹۹.
- (پێکەکان بیریان ئەچێت بمخۆنەوە)، شیعر، هەولێر،

۲۰۰۰.
- (کۆ شیعر)، هەولێر، ۲۰۰٦.
- (وەرزەکانی هەلوەرین)، هەولێر، (۲۰۰۸).
- (جینۆسایدو ئەنفالی کوردی)، سلێمانی، ۲۰۱۳.

* (چنوور نامیق):-

- ساڵی ۱۹۷۱ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مەرکانە شکاوەکانی جەنگ)، هەولێر، ۱۹۹۹.
- (ئێواران بۆنی خەوم لێدێت)، شیعر، سلێمانی، ۲۰۰٤.
- (دارە تووە تەنیاکە)، سێ نۆڤلێت، هەولێر، ۲۰۰٤.
- (لێوی مەراق)، شیعر، هەولێر، ۲۰۰۹.

* ( چۆبان ئۆلوخان-چۆبان خدر حەیدەر ):-

- ساڵی (١٩٤٨) لە کەرکوك لە گوندی بەشیر لەدایکبووە.
- شاعیرو نووسەرو وەرگێڕە لە زمانی تورکیو دکتۆرای هێناوە لەسەر ئەدەبو زمانی تورکی لە ساڵی (١٩٧٩) لە زانکۆی ئەستەمبوڵ.
- کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەو کتێبی هەیە لە بارەی ئەدەبو شیعری تورکی لەوانە:
- (کرکوك فلکلوری)، ١٩٧٥.
- (عراق تورکمن اغیرلاری)، ١٩٧٩.
- (جلەنك)، ١٩٨٥.
- (اوقوما کتابی)، ١٩٨٦.
- (اوقوما ویازما کتابی)، ١٩٨٦.
- (تورك دیلینکسن کیرشی)، ١٩٨٦.
- (ماهر دیواندن سەجمە)، ١٩٨٨.
- (المحادثة الترکیة)، ١٩٩٠
- (دلیل وقواعد الاملاء في اللغة الترکیة)، ١٩٩٣.
- (قواعد اللغة الترکیة)، ١٩٩٣.
- (موقع اللغة الترکیة بین الفصائل اللغویة).
- (الثابت في المیثولوجیا الترکیة والعربیة).
- (لیلی والمجنون في الأدب الترکي).
- (مبادئ اللغة الترکیة).
- (المیثولوجیا الترکیة).
- (قواعد الإملاء في اللغة الترکیة).
- یوسف زلیخا، چیرۆك، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٧.
- ملا یاسین بەشیرلی، دیوانندا سیچمەلر، دیوانی شیعر بە زمانی تورکی، ٢٠٠٨.
- شذرات في اللغة والأدب الترکي، ٢٠١٤

* ( چۆپان یەسو ساوك ):-

- (چۆپان کوڕی یوسف جەماڵ)ە، لە ساڵی (١٨٥٩) لە دێی (قەڵخانلوی گەورە)ی کاکەییان هاتووەتە دنیاوە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٦٢) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو لە پاشا چووەتە کفریو لەلای زانایانی ئایینیدا ڕێزمانی عەرەبیو وێژەی فارسی خوێندووەو پاشان گەڕاوەتەوە زێدو مەڵبەندەکەی خۆیو پاشماوەی ژیانی بە کشتوکاڵو ماڵاتدارییەوە بردووەتە سەر.
- شاعیرێکی دڵ تەڕو خۆشەویست بووە، هونەری بەزاری ماچۆپیو تورکی هۆنیوەتەوە.
- ساڵی (١٩٠٣) لەگەڵ ماڵی باوکیدا لە دێی (حەفت تەغار) ەوە باردەکەن بۆ دێی (عەرەب کۆی) لە هەرێمی داقوق، لە پاش هەشت ساڵ واتە لە ساڵی (١٩١١) لەوێوە دەگوێزنەوە بۆ دێی (وەردەك) لە هەرێمی موسل.
- ساڵی (١٩٢٥) لە گۆڕستانی (شاە هەیاس) لە نزیك دێی (وەردەك) لە سەر لێواری ئاوی (خازر) بەخاك سپێردراوە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٩٢٦) بە ساڵی کۆچکردنی دادەنێن.

*چۆپی فەتاح:-

- ساڵی ١٩٨٦ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە ساڵی ١٩٨٨ەوە لەگەڵ خێزانەکەی لە هۆڵەندا جێگیر بووە.
- ساڵی ١٩٩٦ چووەتە بەر چاودێری قوتابخانەی مۆسیقا لە هۆڵەندا.
- ساڵی ١٩٩٩ چووەتە ئەکادیمیا کوردی بۆ مۆسیقا لە ئەڵمانیا.
- زمانی ئینگلیزی لە زانکۆ تەواو کردووە.
- یەکێکە لە خانمە گۆرانیبێژەکانی کەرکوك، کە گەلێك گۆرانی بە کوردیو ئینگلیزی هەیە

* چیا قادر کەریم.

پێشمەرگەی دێرین و کادیری ڕاگەیاندن. لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٣ی گوندی شێخ لەنگەر لە قەزای کفری، دەرچووی پەیمانگەی تەکنیکیی کەرکوك.
ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد، ساڵی ١٩٨٥ پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد. تا ساڵی ١٩٨٨ لە ڕێکخراوی ٤ی کۆمەڵە لە سنووری مەڵبەندی یەك پێشمەرگایەتیی کرد.
پاشان لەگەڵ کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، لە شاری سەقز گیرسایەوەو لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٩٠ بوو بەبێژەر لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان و تا ساڵی ١٩٩٤ لەوێ کاری کرد.
ساڵی ١٩٩٥ چوو بۆ سویدو پاشان لە ئەڵمانیا گیرسایەوەو تا ساڵی ٢٠٠٤ لەوێ مایەوە. لەو ماوەیەدا هەم لە ڕێکخستنەکانی دەرەوە کاری کرد هەم پەیامنێری کەناڵی ئاسمانیی کوردسات بوو، ساڵی ٢٠٠٤ گەڕایەوە بۆ کوردستان و لەبەشی ڕاگەیاندنی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران لە سلێمانی دامەزرا.
ساڵی ٢٠١٠ بوو بە ئەندامی مەکتەبی سکرتاریەت و لێپرسراوی ئاسایشی بارەگای مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە سلێمانی.

* چالاك حەسیب عەلی:-

- ناوی چالاك حەسیب عەلی عەبدولڕەحمان تاڵەبانییە و ساڵی ١٩٤١ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٦٤ کۆلێژی سەربازی (الاحتیاط)ی تەواو کردووە لە خولی (٢٠) بەناونیشانی (مشاة) دوا پلەی (رائیدی مافناس بووە).
- ساڵی ٢٠١٨ کۆچی دوایی کردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٥-١٩٦٦) کاری کردووە لە ڕێکخراوی H٣.
- ساڵی ١٩٧٧-١٩٧٨ لە سەربازگەی سلێمانی و سنجار کاری کردووە.
- بەرهەمەکانی:-
- مذکرات ضابط رغماً عنه.
- مذکرات احمد عزیز.
- دیوانی شێخ ڕەزا تاڵەبانی.

* ( حاجم ئەلحەسەنی ):-

- سالی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لەزانکۆی بەغدا بەدەستهێناوەو سەفەری وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کردووە لە سالی (١٩٧٩) بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی، خوێندنی زمانی لە (دنفر، کولورادو) ماجستێری لە ئابووری خوێندووەو دکتۆرای لەزانکۆی (کانکتیکت) بەدەستهێناوەو بووەتە مامۆستا لە هەمان زانکۆ.
- کۆمپانیایەکی بۆ ئینتەرنێت و کۆمپانیایی وە بەرهێنانی لە (لۆس ئەنجلوس) بەدەستهێناوە.
- کاری بەرهەلستکاری کردووە لەدژی رژێم لەریزی حیزبی ئیسلامیی عێراقی.
- سالی (٢٠٠١) گەراوەتەوە عێرق، لە (١٠)ی نیسانی سالی (٢٠٠٣) بووەتە ئەندامی (مجلس الحکم الانتقالي)..
- سالی (٢٠٠٤) بووەتە وەزیری پیشەسازی و کانەکان لە حکومەتی کاتی.
- دژی بەشداری نەکردنی هەلبژاردن بووەو کشاوەتەوە لە ریزی حیزبی ئیسلامی چووەتە لیستی (عراقیون).
- لە (٣)ی نیسانی سالی (٢٠٠٥) بووەتە سەرۆکی پەرلەمانی عێراق.
- سالی (٢٠٠٥) هەلبژێردراوە بەئەندامی پەرلەمانی عێراق.

* ( حاکم ):-

- شاعیرەو لەوە دەچێت نازناوی شیعری (حاکم) بێت و هیچ شتێك دەربارەی ژیانی نازانرێت.

* حازم شوکر داقووقلو:-

- سالی ١٩٦٦ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- داود بابایا سلام دەستانی، شیعر بە تورکی، ٢٠٠٨.
- اوج قبلەم وار دنیارا، شیعر بە تورکی، ٢٠٠٨
- عاشورا دەستانی، شیعر بە تورکی، ٢٠٠٨.
- کربلادە کونش باطمان، شیعر بە تورکی، ٢٠٠٩.
- BEN VATAN DERTLISYIM، شیعر بە تورکی ٢٠١٠

* حازم نازم فازڵ:-

- سالی ١٩٥٩ لە پردێ لەدایکبووە.
- بەهەمەکانی:-
- المنح السنیة علی الوصیة المتبولیة، ٢٠٠٤.
- الفهارس، رسائل النور لسعید النورسي، ٢٠٠٥.
- رسالة الحقوق للامام علي بن حسین زین العابدین، ٢٠٠٥
- مناجاة القرآن، ٢٠٠٥
- صفحات البدیعة من حیاة بدیع الزمان، سعید النورسي، ٢٠٠٥
- من حکایات البر والاحسان، ٢٠٠٥.
- صفحات من طفولة المفکرین، ٢٠٠٦.
- قالوا في وجه الظالمین، ٢٠٠٧.
- عقوق الوالدین عبر العصور، ٢٠٠٩
- العسل وفوائده الطیبة، ٢٠٠٩
- المقاصد النوریة السبعة، ٢٠١٢
- وفاة النبي، ٢٠١٤
- الأسماء الحسنی، ٢٠١٤

* ( حەبیب تالەبانی - شێخ حەبیب تالەبانی ):-

- (شێخ محەمەد حەبیب کوری شێخ عەلی کوری شێخ عەبدولرەحمان کوری شێخ ئەحمەد تالەبانی)یە.
- لە گوندی تالەبانی ناوچەی چەمچەمال لەدایکبووە کە باوکی شێخ عەلی یەکێکە لە زاناکانی تەریقەی نەقشبەندی.
- سالی (١٩٢٠) بووەتە بەرێوەبەری ناحیە.
- سالی (١٩٢٤) بووەتە نوێنەری کەرکوك لە (مجلس التاسیس العراقي).

- سالی (١٩٢٥) دووبارە هەلبژێردراوە.
- قازی شەرعی بووە لە سالی (١٩٢٨).
- سالانی (١٩٣٠، ١٩٣٣) دووبارە هەلبژێردراوە بە نوێنەری لیوای کەرکوك.
- سالی (١٩٤٣) بە سەرۆکی شارەوانی هەلبژێردراوە، لەم پۆستە ماوەتەوە تاکو ماوەی (١٥) سال تا سالی (١٩٤٩).
- سالی (١٩٥٩) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

* حەبیب هورمزی:-

- سالی ١٩٣٣ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- العشائر الترکمانیة في العراق، ٢٠٠٤
- هاشم ناهد، اربیل وترکمان العراق، وەرگێران، ٢٠٠٤

- Irakta Turkmen Boy ve oymaklari، ٢٠٠٥.
- كركوك وهويته القومية والثقافية، وەرگێران، ٢٠٠٨
- Irak Turkmen TURCESI SOZLUGU، 2013
- الكيان التركماني في العراق، وەرگێران، ٢٠١٤

* ( حەبێ خان ):-

- (حەبێ خان كچی كەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف)ە.
- ساڵی (١٩٢٧) لە كەلاری كۆن لەدایكبووە.
- ئافرەتێكی بەخشندەو كوردپەروەرو شاعیر بووەو خوشكی (مینە جاف) شاعیرە، بەڵام مەخابن شیعرەكانی تاكو ئێستاكە بڵاونەكراوەتەوە.
- لە (١١)ی تەمموزی ساڵی (١٩٩٧) كۆچی دوایی كردووە.

* ( حەبیب دوویزی - مەلا حەبیبی دوویزی ):-

- ناوی (مەلا حەبیبی كوڕی محەمەدی كوڕی ئیبراهیمی كوڕی حەمە)یە.
- ساڵی (١٩٢٤) لە پردێ لەدایكبووە كە لە عەشیرەتی (ساڵەیی)یە.
- ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە لە كەركوك.
- ساڵی (١٩٥١) بووەتە مەلا لە دێی مەرعی.
- ساڵی (١٩٥٣) دامەزراوە لەوەزارەتی پەروەردە.
- ساڵی (١٩٦٠) لە قوتابخانە سەرەتاییەكان بە مامۆستای زمانی عەرەبیو ئاینی دانراوە.
- لە (٢)ی ئابی ساڵی (١٩٨٦) خانەنشین كراوە.

* ( حەسەن ئەمین ):-

- ناوی (حەسەن كوڕی ئەمین كوڕی حاجی حوسێن خدر)ە.
- شاعیرێكی نەخوێندەوار بووە، لە دەورووبەری ساڵی (١٩٠٢) لە گوندی (هەرێنە) ناوی زەنگەنە لەدایكبووە.
- لە كاروباری كشتوكاڵ كاری كردووەو لە دواییدا ناوچەی زەنگەنەی جێهێشتووەو لە دێی پەڵكانە لە ناوچەی قەرەحەسەن نیشتەجێ بووە.

* ( حەسەن ئەمین محەمەد ئەمین شێخانی ):-

- ساڵی (١٩٦٨ لەخورماتوو لەدایكبووە.
- بەرچووی كۆلیژی شەریعەتی ئیسلامییە لەزانكۆی بەغدا ساڵی (١٩٩٠-١٩٩١).
- بەڕێوەبەری نووسین بووە لەهەریەكە لەرۆژنامەی راستیو (نبأ) بەرهەمەكانی بەزمانی كوردیو عەرەبی بڵاوكردووەتەوە.
- بەشی یەكەمی كتێبی (شایەتحاڵەكانی ئەنفال)ی عارف قوربانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

* ( حەسەن بارام ):-

- ساڵی (١٩٧٥) لە خورماتوو لەدایكبووە.
- كتێبە چاپكراوەكانی:
- (خورماتوو لە نێو پاكتاوی رەگەزیدا)، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (بەشێك لە ئەنفالی گەرمیان)، كەركوك، ٢٠٠٧.
- (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی خورماتوو)، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- (بەرەو كۆنگرە گرفتو چارەسەری كەركوك)، ٢٠٠٨.
- (كوردو پارتە سیاسییەكانی عێراق)، ٢٠١١.
- (مەوسوعەی پارتە سیاسییەكانی كوردستانو عێراق ١٩٠٨ - ٢٠٠٥)، ٢٠١٢.

- (فەرهەنگی ڕۆژنامەگەری کوردستان و عێراق ١٨١٦ - ٢٠٠٠)، ٢٠١٢.
- (ئینسکلۆپیدیای پارت و بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە جیهاندا)، ٢٠١٤.

* ( حەسەن پەڵکانە زەنگەنە - مەلا حەسەنی پەڵکانە زەنگەنە ):-

- ناوی شاعیر (مەلا حەسەن کوڕی ئەمین کوڕی حاجی حوسێن خدری زەنگەنەی سپی سەر)ە.
- ساڵی (١٩٠٥) لە دێی سپی سەری زەنگەنە هاتووەتەوە دنیاوەو پاشان هاتووەتە ناوچەی قەرەحەسەن لە دێی پەلکانەو شوان نیشتەجێ بووە لای شاعیر (شێخ عومەر عەسری بەرزنجی) لە پەلکانە.
- ساڵی (١٩٨٥) کۆچی دوایی کردووە.

* ( حەسەن پاشا ):-

- لە بنەڕەت خەڵکی کەرکوکە.
- لە ڕێگای ئینکشارییەوە لە ئەستانە لە ساڵی (١٦٩٧) پێگەیشتووە.
- ساڵی (١٦٩٧) بووەتە وەزیرو والی لەسەر (میسر).
- ساڵی (١٦٩٩) بووەتە والی لەسەر شام ئینجا لەسەر (شارەزوور).

* ( حەسەن پاشای بوشناق ):-

- ساڵی (١٦٩٦) بووەتە والی کەرکوك بۆ ماوەی ساڵێك تاکو (١٦٩٧)، ئینجا لە دوای خۆی ئیبراهیم پاشا کورد بووەتە والی کەرکوك.

* ( حەسەن پاشا تۆپاڵ ئۆغلو ):-

- ساڵی (١٦٨٥) بووەتە والی کەرکوك، ساڵی بەردەوام بوونی نازانرێت، بەڵام لەوانەیە تا ساڵی (١٦٩٢) بەردەوام بووبێت.
بەڵام سەرچاوەی پشت ڕاست نییە.

* ( حەسەن عەبدوڵڵا تاڵەبانی ):-

- (حەسەن کوڕی شێخ عەبدوڵڵا کوڕی شاعیر شێخ ڕەزای تاڵەبانی)یە.
- ساڵی (١٩١٣) لە بەغدا لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٣٤) کۆلیژی (ماف) ی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٤٦) بووەتە پارێزگاری سلێمانی.
- ساڵی (١٩٥٩) لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم بووەتە وەزیری هاتووچۆو ئەشغال.
- ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە.

* ( حەسەن تکەچی - مەلا حەسەن تکەچی ):-

- یەکێك لە مەقام زانەکانی کەرکوك.
- بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە و ژیانی نادیارە.

* ( حەسەن جاف - دکتۆر حەسەن جاف ):-

- ناوی تەواوی (حەسەن کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف)ە.
- لە (٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٤٢) لە دێی کەلار هاتووەتە دنیاوە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی ودواناوەندی لە شارەکانی کفری و خانەقین تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦٦) بەکالۆریۆسی لە کۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدای وەرگرتووە ماجستێرو دکتۆراشی لە ساڵی (١٩٧٤) لە زانکۆی تاران وەرگرتووە، چوار ساڵ مامۆستایی لە کۆلیژی (ئیلاهیات و مەعارفی ئیسلامی) سەر بە زانکۆی تاران کردووە.
- ئێستا سەرۆکی بەشی مێژووی هاوچەرخە لە (ئامۆژگای مێژووی عەرەب بۆ خوێندنی باڵا کە سەر بە یەکێتی مێژوونووسانی عەرەبە).
- یەکەم ووتاری لە گۆڤاری (پررسیهای تأریخی)دا بە ناوی (طریقت درسیان کردها) واتا (تەریقەت لە ناو کوردەواری)دا لە ژمارە پێنجی ساڵی نۆهەمی ئەو گۆڤارەدا بڵاوکراوەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مێژووی ئەردەڵان)، مەستورەی کوردستانی، وەرگێران، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٩.
- (ئەم قسانە بەم پێوانەیە باویان نەماوە)، بەغدا، ١٩٩٦.
- (تەئریخی جاف، کریم بەگ فەتاح بەگ جاف)، لێکۆڵینەوە، بەغدا، ١٩٩٥.
- (چەردەیەکی کۆمەڵایەتیانە لە مێژووی نوێی عێراق)، پاشکۆی بەرگی پێنجەم دەربارەی شۆڕشی بیست، عەلی وەردی، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (الوجیز في تأريخ إيران، دراسة في التأريخ السياسي)، لە چوار بەرگدا، ٢٠٠٣- (٢٠٠٨).
- (هؤلاء في مرايا هؤلاء).

* ( حەسەن جاف ):-

- ناوی (حەسەن عەباس بارام)ە.
- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٦) کۆلێژی ئەدەبیات بەشی جوگرافیای لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- دوای تەواوکردنی خوێندنی چووەتە سعودیەو بۆ ماوەی سێ ساڵ ویەك ساڵ لە جەزایر کاری مامۆستایی کردووە.
- چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی هەیە:
- (چیرۆکی نوێی کوردی).
- (کامەران موکریی چیرۆك نووس).
- (بارانە ووشە)، بەرگی یەکەم.
- (ملامح التجدید في القصة الکردیة الحدیثة).
- چەند لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی هەیە:
- (کەرکوکییەکان بارکەن برۆن).
- (نووسین بە رادان).
- (بارانە ووشە)، بەرگی دووەم، ئامادەیە بۆ چاپ.
- (بارانە ووشە)، بەرگی سێیەم، بە عەرەبی ئامادەیە بۆ چاپ.
- چەند چیرۆکێکی هەیە:
- (لە خەونەکانی نامۆیێك).
- (باران).
- (دیجلەی تاوان).
- چەند رۆمانێکی هەیە:
- (عەلەبستی).
- (گۆرستانی لم).
- (کۆرەو-داستانی کۆچ)، دەستنووسە.
- (یادداشتەکانی پیاوێکی لە بیرکراو)، کۆ چیرۆك، ٢٠١٣.
- بەرهەمەکانی بە زمانی عەرەبی:
- (ملامح التجدید في القصة الکردیة الحدیثة).
- (القنص)، کۆمەڵە چیرۆکی لە خەونەکانی نامۆیەك، کراوە بە عەرەبی.
- (بسمة)، کۆمەڵە چیرۆکی عەبدوڵڵا ئاگرینە، کراوە بە عەرەبی.
- (المقابر الرملیة-گۆرستانی لم)، کراوە بە عەرەبی.
- بەرهەمەکانی بە زمانی کوردی:
- (تاوەری بابل).
- (بەفری کلیمانجارۆ).
- (چەردەیکی کۆمەڵایەتیانەی مێژووی نوێی عێراق)، عەلی وەردی، بەرگی یەکەم.
- (چەردەیەکی کۆمەڵایەتیانەی مێژووی نوێی عێراق)، عەلی وەردی، بەرگی دووەم.
- (یقظة الکورد-وریابوونەوەی کورد)، جەرجیس فەتحوڵا، بەرگی یەکەم.
- (یقظة الکورد-وریابوونەوەی کورد)، جەرجیس فەتحوڵا، بەرگی دووەم.
- (قرکردنی ئەرمەن لە بەردەم دادگادا).
- (کەرکوك لە چەرخە کۆنەکاندا).
- (چیرۆکی خۆشەویستیەکی مەجووسیانە).
- (مەرحەبا ئەی خەم)، لەژێر چاپدایە.
- (ژنانی کرملین)، لەژێر چاپدایە.
- (کۆی رۆمانەکان)، ٢٠١٤.
- (کۆی چیرۆکەکان)، ٢٠١٤
- سەرنووسەری گۆڤاری (کاژاو) بوو لە ساڵی (١٩٨٤).
- سەرنووسەری رۆژنامەی (هەرێمی کوردستان) بوو لە (٢٥)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٥) تا (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٦).
- سەنووسەری گۆڤاری (الوفاق)و (هەولێر) بوو لە ساڵی (١٩٩٦) کە تەنها دوو ژمارەی لێ دەرچوو.

* ( حەسەن حوسێن نەفتچی ):-

- ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە، خۆی لە خێزانی نەوتچییەکانە.
- دەرچووی کۆلێژی یاسایە، گەلێك کاری بەڕێوەبەرایەتی کردووە لە ناحییەکان.
- ماوەیەك بەڕێوەبەری ناحیەی ئاغجەلەر بووە.

* ( حەسەنی خانەقا - شێخ حەسەنی خانەقا ):-

- (شێخ حەسەن کوڕی عومەر کوڕی سەید حوسێن خانەقا) یە.
- ساڵی (١٩١٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شارەزای هەیە لە زمانی کوردیو عەرەبیو تورکی وفارسی.

* ( حەسەن ڕاوچی - حاجی حەسەنی ڕاوچی ):-

- ناوی (حاجی حەسەن کوڕی سدیق کوڕی عوسمان)ە، بەرەگەز لە هۆزی شوانە.
- ساڵی (١٩٠٤)ی زایینی لە شاری کەرکوك لە گەرەکی موسەڵڵا هاتووەتە دونیاوە.
- خاڵۆ حەسەنی ڕاوچی پیاوێکی پیاوانەو رووخۆشو قسەزانو میوان دۆست بووەو بەزۆری کاری ڕاو و ڕاوچێتی کردووە لە دەوورووبەری کەرکوك لە جەوەڵ بۆر، لەیلان، ئاغجەلەر، بناری گل، داقوق، خورماتوو، تازە، دووبز، پردێ،

شوان، پەنجا عەلی، سینگ دەوەڵان، هەروەها لە دەوروبەری ریازو چەویجەش راوی کردووە.
– لەگەڵ ئەم دۆستو برادەرانەیدا چونەتە دەشتو بیابانو شاخ راووشکاری لەگەڵدا کردوون: سەید عەلی وەلی بەرزنجی (١٩٣٠)دا دانیشتووی شاری کەرکوك گەرەکی شۆریجە، سالار ئەمین ئاغا، لە ئاوایی (باینجان)، شێخ ئیسماعیل کوری عەبدولکەریم (دانیشتووی قادر کەرم)، پاشای محەمەد نازم، عەبدولمەجید شێخ حەسیب تاڵەبانیو چەند کەسێکی تر.
– ئەو چەکانەی بەکاری هێناوە یەك تیر، سێ تیر، پێنج تیر، نیهایەت جاندار، ساچمە، تفەنگی ئینگلیزی، برنەو، دەمانچە، خەنجەر.
– لە ساڵی (١٩٤٣)ی زایینی لە تەمەنی (٣٩) ساڵیدا ژنی هێناوەو کورو کچێکی هەیە.

* (حەسەن زەنگەنە):-

– ناوی (حەسەن محەمەد سەعید)ە، ناسراو بە (حەسەن زەنگەنە).
– ساڵی (١٩١٩) لە ناحیەی (قادر کەرەم) لەدایکبووە.
– هەر بە منالی ئازایەتیو هۆشیاری تیا بەدی دەکرا، چونکە یەکێك بووە لە خوێندکارەکانی (مەلا کاکە حەمەی سەیفوڵلا)، کە مامۆستایەکی گەورەی کوردایەتی بووە.
– لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابووردوو ماڵی دێتە شاری کفری.
– ساڵی (١٩٥٤) پەیوەندی دەکات بە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، لەگەڵ (عەلی حەمدی)و (جەلال قەرەداغی)و (فەقێ عەلی)و (ئەحمەد کەلاری)و (حەمە ئەمین کەلاری)و (حەمەی وەلی)و چەندانی تر رێکخراوی جوتیاران لە ناوچەی کفریو بەمۆ دادەمەزرێنن.

– ساڵی (١٩٦٣) تا (١٩٧٥) کادرێکی چالاکی ناو ریزەکانی پارتی بووە، دوو جار بریندار بووە.
– دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول لە چەمچەماڵ دەست بەسەر کراوە.
– ساڵی (١٩٨٤) ئەمنی کەرکوك دەیگرنو ئازارو ئەشکەنجەی زۆری دەدەن بەو هۆیەوە تووشی نەخۆشی دەبێت.
– ساڵی (١٩٨٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (حەسەن عەلی - مام حەسەن مام عەلی):-

– ساڵی (١٩٠٧) لەدایکبووە.
– ساڵی (٢٠٠٢) کۆچی دوایی کردووە.
– شارەزای لە بواری ئەسپناسی ژیریدا هەبووە.

* (حەسەن عیززەت):-

– ساڵی (١٩٣٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– نووسەرو وەرگێر بووە لە بواری پەروەردەدا گەلێك بابەتی وەرگێراوە لە گۆڤاری (المعلم الجدید)و رۆژنامەی (الافاق)و (البشیر)و (کرکوك).
– دوو کتێبی چاپکراوی هەیە لەسەر شاعیرانی تورکمان.
– لە بەرهەمەکانی:
– (شعراء الترکمان من الجیل الماضي)، بە زمانی عەرەبی، چاپخانەی (الأمة)، بەغدا، ١٩٨٩.
– (شعراء الترکمان المعاصرون)، بە زمانی عەرەبی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٩٠.
– لە (٢٨)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٢) کۆچی دوایی کردووە.

* (حەسەن غەریب):-

– ساڵی (١٩٧٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– لە هەشتاکانەوە دەستی کردووە بە گۆرانی وتن.

*** ( حەسەن فەتاح حوسێن ):-**

- ساڵی (١٩٢٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە بەرهەمەکانی: (استبیان تربوي لمعرفة آراء مدیري ومدیرات المدارس الابتدائیة في امور الادارة والتفتیش)، بە زمانی عەرەبی.
- دیوانێکی شیعری بە جێ ماوەو لە بواری پەروەردەو فێرکردن کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٩٥) کۆچی دوایی کرد.

*** ( حەسەن قەرەچێواری بەرزنجی - شێخ حەسەن قەرەچێواری بەرزنجی ):-**

- لەژێر نازناوی (شەمسەدین)و (پیری قەرەچێوار)دا ناوبانگی دەرکردووە ئەم زاتە (کوری شێخ عەبدولکەریم کوری شێخ عەبدولقادر کوری شێخ حوسێن قازانقایە کوری شێخ مەحموودی کلیسە، کوری شێخ ئیسماعیل ولیانی)یە کە ناسراوە بە (غەوسی دووەم)، ناوی دایکی فاتمە خانی کچی شێخ عەبدولقادری قەرە حەسەنییە.
- شێخ حەسەن لە ساڵی (١٨٤٧)ی زایینی دا لە شاری کەرکوك هاتووەتە جیهان، لە تەمەنی شەش ساڵیدا لە تەکیەکەی باوکیدا لەگەڵ خوێندن و نووسیندا ئاشنایی پەیدا کردوو، ئەو تەکیەیە پشتاوپشت تا ئەمڕۆ ماوەو ئێستا لە گەڕەکی ئاخوور حوسێنە لە کەرکوکدا.
- هەر بە منداڵی نیشانەی زیرەکی و وریایی لە شێخ حەسەندا بە دیار کەوتووە چونکە بە زوویی شارەزایی لە هەموو بوارەکانی زانیاریدا پەیدا کردووە، بەپێی ئەو نەریتانەی کە لە کوردستاندا باوبووە، زانیاری لە بواری (فقە، نەحو، صەرف، منطق، بەیان، زمان، مێژوو) بە دەسهێناوە، بە تایبەتی دەستێکی باڵای هەبووە لە تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرمایشەکانی حەزرەتی پێغەمبەر.
- پیاوێکی پیاوانەو سۆفییەکی لە خواترس و هەق ویژو ڕەوشت بەرز بووە، هەمیشە چاوتێرو ئارەزووی لە پیاوەتی و چاکە بوو، هەتیوو هەژارانی خۆشوویستووە.
- لە سەرەتاوە لە گوندی (قەڵای میکاییل) دەگیرسێتەوە بۆ ماوەیەك ڕابەری خەڵکی دەکات، ئینجا دەگوێزێتەوە بۆ دێی (قەرەچێوار) لەوێ نیشتەجێ بووەو تەکیەی دروست کردووەو بووتە یەکێ لە پیرانی ڕێبازی (قادری) کە لە کوردستاندا زۆر بڵاون، لە ئاخرو ئۆخری ژیانیدا دەگوێزێتەوە بۆ (قادر کەرەم) لەوێ تەکیەیەکی خنجیلانە دروست دەکات.
- لە تەمەنی دە ساڵیدا بۆ ئاشنابوون لەگەڵ زانیاری ئایینیدا بۆ ماوەی چەند ساڵ چووەتە شاری (هەولێر)و (کۆیە)و گوندەکانی ناو هۆزی (دزەیی)و (خۆشناوەتی) لە ناوچەی (مەخمور)و (شەقڵاوە) دا.
- ساڵی (١٩٠٦)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.
- لە قادر کەرەم گومەتێکی بەرزی بۆ کراوە، مزگەوت و تەکییەو مەقامی لەوێیە.

*** ( حەسەن قوله - شێخ حەسەن قوله ):-**

- کوری شێخ محێدینەو یەکێکە لە مەلا بەناوبانگەکانی کەرکوك، خوێندەوارو ڕۆشنبیر بووە.
- چووەتە ئەستەمبوڵ و لەوێ ژنێکی بە ناوی گورجی هێناوە.
- بەشداری شەری رووسیاو عوسمانییەکانی کردووە.
- لە دواییدا زانیاریمان دەربارەی ژیانی نییە.

*** ( حەسەن کەنووش دەلۆیی - جنوونی ):-**

- ناوی (میرزا حەسەن دەلۆی)یەو نازناوی شیعری (جنوونی)یە.
- ماوەیەك ماڵی دەچێتە خانەقی و لە دێی (زاوتە) دادەنیشێ و ماوەیەکیش دەچێتە پەڵکانی دەلۆ نزیك خانەقی، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی دەلۆ لە بناری (ئاشداخ).
- ساڵی (١٨٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووەو لە ساڵی (١٨٩٤) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( حەسەن کەوسەر ):-**

- ساڵی (١٩٤٢) لە تسعین لەدایکبووە.
- لە بەرهەمەکانی:-
- (دوشن یابراقلر)، دیوانێکی شیعری بە زمانی تورکی، چاپخانەی (التضامن)، بەغدا ١٩٧١.
- (بالیم بابایا سلام)، شیعری، بە زمانی تورکی، بەشی دووەم، (مکتب السلام)، کەرکوك، ١٩٩٩.
- (کربلا تورکلاری)، شیعری ئایینی، بە زمانی تورکی، ٢٠٠٠.
- (جلال رضا افندی وشعرلریندن سەجمەلر) لێکۆڵینەوەیکی شیعری، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، بەغدا، ٢٠٠١.
- (تسین فولکلوروندان ئەورنەکلر)، بە زمانی تورکی، لێکۆڵینەوەی مێژوویی، (مکتب الکوثر)، کەرکوك، ٢٠٠٢.

- (جیراغ)، چیرۆك، (مکتب الکوثر)، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (دلیل المطبوعات الکرکوکیة)، وەرگێران بۆ سەر زمانی عەرەبی، (مکتب عبد الوهاب اوچی)، کەرکوك، ٢٠٠٣.
- (Alfabe birinci sinif okul kitabi)، کتێبی قوتابخانەیی بە زمانی تورکی، کەرکوك، ٢٠٠٣.
- (Dort okul kitabi icin bir sozluk)، فەرهەنگ بە زمانی تورکی، کەرکوك، ٢٠٠٣.
- TEMEL OKUL SOZLUK، 2004
- القاريء کورتە چیرۆك، ٢٠١٠.
- الجدید في أصول الإلقاء وقواعد التجوید، ٢٠١١
- علی ضفاف المشهد، ٢٠١١
- تاریخ الأدب الترکي في العراق، وەرگێران، ٢٠١٢
- کونش قوشلاری، شیعر، ٢٠١٣.
- معجم المواقع العراقیة بأسماء ترکیة، وەرگێران، ٢٠١٤

*** ( حەسەن گەرمیانی ):-**

- یەکێکە لە گۆرانی بێژەکانی کەرکوك.

*** ( حەسەن گورەم ):-**

- ساڵی (١٩٢٢) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- هەر لە منداڵییەوە چاوی کوێر بووە.
- بایەخی بە ئەدەب داوە بە تایبەتی لە بواری شیعردا.

*** ( حەسەن مستەفا ئەحمەد ):-**

- ساڵی (١٩١٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- نووسەرو دەرچووی کۆلێژی سەربازییەو گەلێك کتێبی لە بوارەدا بە ئەنجام گەیاندووە، وەکو:
- (من العلمین إلی نهر سانکرو)، وەرگێران، بەغدا، ١٩٥٠.
- (مع رومل في الصحراء)، وەرگێران.
- (العتاد العسکري العربي)، بەیروت، ١٩٦٠.
- (اسرائیل والقنبلة الذریة)، چاپخانەی (دار الطلیعة)، بەیروت، ١٩٦٠.
- (البارزانیون وحرکات بارزان ١٩٣٢-١٩٤٧)، چاپخانەی (دار الطلیعة)، بەیروت، ١٩٦٣.
- (التعاون العسکریة العربي)، چاپخانەی (دار الطلیعة)، بەیروت، چاپی یەکەم ١٩٦٤، چاپی دووەم، ١٩٦٥.
- (المساعدات العسکریة الألمانیة لاسرائیل، إستنتاجات ودروس)، چاپخانەی (دار الطلیعة)، بەیروت، ١٩٦٥.
- (السبیل إلی القیادة)، وەرگێران، چاپخانەی (دار الطلیعة)، بەیروت، ١٩٦٦.
- (حرب حزیران ١٩٦٧، الجبهة المصریة)، بەیروت، ١٩٧٣.
- (حرب حزیران ١٩٦٧، الجبهة الشرقیة)، بەیروت، ١٩٧٣.
- (المیراج طائرة حربیة للعالم)، وەرگێران، بەغدا، ١٩٧٣.
- (مذکرات ملحق عسکري في لندن قبل حرب فلسطین الاولی وفي اثنائها ١٩٤٦-١٩٤٩)، چاپخانەی (آفاق عربیة)، بەغدا، ١٩٨٥.
- (مذکراتي السیاسیة في واشنطن)، بەغدا، ١٩٩٠.

*** ( حەسەن نوحی - مەلا حەسەنی نوحی ):-**

- ناوی (مەلا حەسەنی کوڕی سۆفی عەبدولحەسەن کوڕی محەمەد کوڕی کوێخا ڕۆستەمی زەنگەنە)یە.
- ساڵی (١٨٨٨)ی زایینی باوکی لە دەڤەری گەرمیانەوە ماڵ دەگوێزێتەوە بۆ کوردستانی ئێران و لە شاری (سەقز) نیشتەجێ دەبێت.
- ساڵی (١٩٠٢) دا لە شاری (سەقز) لە گەڕەکی (سەرپەچە)ی خواروو لەدایك و باوکێکی کورد چاوی هەڵهێناوە.
- مەلا حەسەن نازناوی (نوحی) بۆخۆی هەڵبژاردووە جگە لە زمانی زگماکی خۆی عەرەبی و فارسیشی بە چاکی زانیوە، لە دەستنووسێکی خۆیدا دەڵێت:- (لە ساڵی (١٩٢٩)دا پاش خوێندنی فارسی و کوردی دەستم کرد بە خوێندنی زانیاریەکان لە ماوەی هەشت ساڵدا توانیومە ئیجازە وەرگرم).
- شاعیر دوو ساڵ لای مامۆستا ساڵح ئەفەندی قەرەداغی لە (خانەقین) خوێندوویەتی، ئینجا لە وێوە چووەتە (کفری) بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەلای مەلا سەعیدی موفتی سیوەیلی خوێندویەتی لە پاشان چووە بۆ شاری (کەرکوك) وبۆ ماوەی ساڵێك لای مامۆستا (مەلا تاهیر) خوێندوویەتی هەر ئەم مەلایەش لە ساڵی (١٩٣٧) دا ئیجازەی مەلایی پێداوە ئینجا دەبێتە مەلای دێی (دوانزە ئیمام) ئینجا لە ساڵی (١٩٤٣)دا دەرواتە گوندی (مەلا ئۆمەر) لە قادرکەرم.
- شاعیر پیاوێکی پیاوانەو ئازاو قەڵەم بەدەستێکی بە توانا بووە، دەسخەتی خۆش و جوان بووە، جگە لەوەی کە شاعیرو مەلا بووە، دەستێکی باڵای هەبووە لە بواری بیناسازی و دوورماندا، ئارەزووی لە گەشت و سەیران و سواری ئەسپ بووە، پیاوێکی نیشتمان پەروەرو ڕووخۆش بووە.
- لە (٢٢)ی ئابی ساڵی (١٩٥٩)دا نزیکەی ساڵێك لە سەر کوردایەتی و نیشتمانی پەروەری لە پۆلیسخانەی شاری (کەرکوك) بەندکراوە لەوێ تووشی نەخۆشی دێ و گەلێ ئێش وئازار دەچێژێت.
- لە (١٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٦) لە نەخۆشخانەی (خوورماتوو) کۆچی دوایی دەکات.

*** حەسرەت:-**

-( حەسرەت مەلا شەریف ساڵح ئەمین مستەفا حاجی میرزا) یە.
- لە دێی مەرزیخە لە کەرکوك لە دایکبووە, تاقانەی باوك و نازداری دایکی بووە, بەشێکی زۆری تەمەنی بە خوێندنی مەلایەتی بردووەتە سەر، ئەم دێ و ئەو دێی کردووە بەدوای نان پەیداکردندا تا خۆی گەیاندووەتە دێی مەرزیخە و بووەتە مەلای مزگەوتەکەی.
- دەستێکی زۆر باڵای هەبووە لە شیعر نوسیندا وە پەیڕەوی شاعیرە کۆنەکانی ئەکردەوەو بە زمانە ئەدەبییەکەی ئەدەبی کلاسیکی ئەوسای ئەنووسی.
- دیوانێکی (٢٠٠) لاپەڕەیی بە ناوی (مجمع الاشعار)ەوە پێکەوە نابوو، بەڵام دەستی گەردوون و بەختی ناهەمواری کورد فەوتاندی.

- حەسرەت لە شیعری هەجوا توانایەکی باشی هەبووە.
- سالی ١٩٦٩کۆچی دوایی کردووە.

*** حەسەن نووحی - مەلا حەسەنی نووحی:-**

- شاعیر لە دێی بیبانی ناوچەی پردێ لەدایکبووە.
- سالی ١٩١٠ زایینی لەدایکبووە.
- لە تەمەنی دە سالییەوە دەخرێتە بەر خوێندنی ئایینی.
- لە تەمەنی ٧٦ سالیدا، کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی شێخ ئولفەت بە خاك دەسپێردرێت.
- شیعرەکانی بە زمانێکی سادە و ڕەوان نووسیوەتەوە.
- ماوەیەك لە مزگەوتەکانی کەرکوك لای کۆمەلێك زانی ئایینی خوێندنی تەواو کردووە.

*** ( حەسون کولەمەن - مەلا حەسون کولەمەن ):-**

- ناوی (مەلا حەسون کوری عەبدولوەهاب)ە.
- سالی (١٩١٧) لە گەرەکی موسەللا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٤٠) دامەزراوە بە ئیمامو خەتیب لە مزگەوتی (نەبی دانبیال) تا سالی (١٩٨١).
- لە (٣) ئاداری سالی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( حەسیب تالەبانی ):-**

- سالی (١٩١٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (گولزار)، بەغدا، ١٩٦٥.

*** ( د. حەسیب شوانی ):-**

- سالی (١٩٧٩) لە چەمچەمال لەدایکبووە.
- سالی (٢٠٠٨) ماستەری لە مێژووی سیاسی وەرگرتووە.
- سالی (٢٠١١) دکتۆرای لە سیاسەتو ناکۆکییە نێو دەولەتییەکاندا لە ولاتی ڕووسیا بە دەستهێناوە.
- مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی.

*** ( حەسیب کوری شێخ عەلی تالەبانی - شێخ حەسیب کوری شێخ عەلی تالەبانی ):-**

- (شێخ حەسیب کوری شێخ عەلی کوری شێخ عەبدولرەحمانی تالەبانی)یە
- سالی (١٨٩٠)دا لە گەرەکی بەرتەکیەی شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- لە تەمەنی شەش سالیدا لە حوجرە فێری خوێندنو نووسین بووە.
- گەلێك خزمەتی ناوچەی گەرمیانی کردووە، چونکە تاکە سوار بووە لە ناو ئاغاو شێخەکان لە هەفتەیەك دا جارێك یان زیاتر دەستەی مەقام بێژانی لە دیوەخانەکەی دا کۆکردووەتەوەو مەقامی پێیان خوێندووەو مەشقی پێ کردوون، لە هەموو ڕوویەکەشەوە دەستی یارمەتیان بۆیان درێژ کردووە، جگە لەوەی قائیمەقام بوو مەقام دۆستو ڕۆشنبیر بوو.
- بە زۆری ئەم هونەرمەندانە هاتووچۆی دیوەخانەکەی شێخ حەسیبیان کردووە لەوانە: عەلی مەردان، خدر بارام چاوەش (١٨٧٥-١٩٢٩) کامیل محەمەد، ئیسماعیل زەنگەنە (کامیل تەپەلوویی) خولە ئۆمەر، ڕەشید کویلە ڕەزا، یاسینە وەدەیانی دیش.
- دیوەخانەکەی شێخ قوتابخانەیەکی میللی بووە بۆ دەنگخۆشانی ئەو سەردەمە لە ناوچەی گەرمە سێری کەرکوك بۆ زیندووکردنەوەی هونەری کوردی.
- شێخ حەسیب جگە لە حەزی هونەر ئارەزووی ڕاووشکارو ئەسپ سواریشی هەبووە، قسەزانو ڕووخۆش ودلتەربووە، دەستی یارمەتی بۆ هەژاران نەداران درێژ کردووە بە تایبەتی

لە کاتی گرانی گەورەدا (سەفەربەر).
- شێخ حەسیب لە کاروباری میریدا ئەم وەزیفانەی بینیووە (بەرێوەبەری شارۆچکەکانی قەرەحەسەن‌و خورماتوو، قەرەتەپەو شوان‌و پردێ و قەلادزێ‌و قایمقامی قەزاکانی قەلادزێ‌و دهۆك‌و سلێمانیش بووە.
- شێخ حەسیب لە سالی (١٩٤٩) تووشی نەخۆشی تەوژمی خوێن بووە، هەر لەو سالەدا لە مالی شێخ حەبیبی برای لە کەرکوك گیانی لەدەستداوە لە تەکیەی تالەبانی بەخاکیان سپارد.

* (حەسیب مەلا مەحموود حەکیم مودەرریس - مەلا حەسیب مەلا مەحموود حەکیم مودەرریس):-

- ناوی (مەلا حەسیب مەلا مەحموود مەلا حەکیم مەلا ئیسماعیل شوانی)یە.
- سالی (١٩٠٩) لە گەرەکی (ئەحمەد ئاغا) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی ئایینی لەلای مەلا ئەحمەد مەلا حەکیم تەواو کردووە و بروانامەی زانستی ئایینی وەرگرتووە، هەروەها لەلای مەلا حەقی و شێخ جەلیل و مەلا عەبدولکەریم کوری شێخ حوسامەدین و مەلا قادر و مەلا ئەمین مەلا سالح محەمەد خوێندنی کردووە.
- سالی (١٩٣٦) بووەتە مامۆستا لە ناحییەی (سەنگاو)و دوای ماوەیەك گەراوەتەوە کەرکوك.
- لە ماوەی ژیانیدا ئیمام‌و خەتیبی گەلێك مزگەوت بووە وەکو مزگەوتی (ئۆلو جامیع)و مزگەوتی (مەلا داود)و (مزگەوتی مەلا ئەحمەدی حەکیم)و گەلێك مزگەوتی تر، لە سالی (١٩٧١)دا کاتێك حکومەتی بەعس مزگەوتی (مەلا داود)ی رووخاند تا ماوەیەك نەخۆشکەوت لە مالەوە لەبەر ئەوەی خزمەتێکی زۆری ئەو مزگەوتەی کردبوو.

- شارەزایی هەبوو لە زمانی کوردی‌و عەرەبی‌و تورکی‌و فارسی. لە هەمان کاتدا شارەزایی خەتخۆشی هەبووەو گەلێك دەستنووسی خەتخۆشی لێ بە جێماوە.
- لە (٢٦)ی کانوونی یەکەمی سالی (١٩٨٠) کۆچی دوایی کردووە.

* (حەقی):-

- لە سالی (١٨٩٦) لەدایکبووە لە دێی دوراجی لە ناوچەی خورماتوو.
- ناوی (محەمەد ئەمین ئاغای کوری محەمەد خورشید ئاغای دووراجی)یە نازناوی شیعری (حەقی)یە.
- یەکێك بووە لە هاوکارانی باوکی لە شەری هۆزەکەیان دژی سوپای عوسمانی.
- لە شەری شوعەیبەو ئاوباریك بەشداری کردووە.
- لە سالی (١٩٥٩) کۆچی دوایی کردووە.

* (حەقی - مەلا حەقی):-

- سالی (١٩٣٢) لە گەرەکی موسەللا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- زانستی تەجویدی لەلای (مەلا عەبدولقادری خەتیب) لە بەغدا تەواو کردووە.
- خوێندنی (فقە)و قورئانی لەلای (مەلا محەمەد سەرسپی) و (مەلا حەسیبی حەکیم)و (مەلا سالحی جەریسی)و (مەلا مەجیدی قوتب) تەواو کردووە.
- سالی ١٩٥٤ یاساکانی رێزمان و زانستی تەجوید و هونەری (القراءات) و لەبەرکردنی قورئانی خوێندووە.
- ماوەیەك وەکو ئیمام‌و خەتیب لە مزگەوتەکانی (عومەر قیردار)و (ئیبراهیم تکریتی)و (مزگەوتی گەورەی کەرکوك)و مزگەوتی (النور الکبیر)و مزگەوتی حاجی (طارق الصراف) دەستبەکار بووە.
- ماوەیەك ئەندام بووە لە (المجلس العلمي التابع للأوقاف) و ئەندام بووە لە (مجلس الفتوی في مدینة کرکوك).
- هەر یەکە لە (محەمەد جەمیل عەبدولقادر)و (عەباس عیزەت)و (مەلا ئەحمەد خورشید)و (محەمەد فاتیح رەزا) ئیجازەی مەلایەتییەکان لەلای مەلا حەقی وەرگرتووە.

- لە ١٣حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٢ کۆچی دوایی کردووە.

*** (حەکیم مەلا ئیسماعیل - مەلا حەکیم مەلا ئیسماعیل):-**

- ئیمام و خەتیب بووە لە مزگەوت (حاجی مەحموود).
- یەکێکە بووە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك و لەژێر دەستی گەلێك مامۆستای ئایینی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.

*** (حەکیم عوسمان حەمید - دکتۆر حەکیم عوسمان حەمید):-**

- ساڵی (١٩٧٥) لە ورمێ لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٣) لە ئامادەیی (حیکمە)ی لە شاری کەرکووك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٩٧) بەکالۆریۆسی لە بەشی ڕاگەیاندن لە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی بەغداد تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٦) ماجستێری لە ڕاگەیاندنی تەلەفزیۆنی لە کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠١٢) دکتۆرای لە ڕاگەیاندنی تەلەفزیۆن لە فاکلتی زمان و زانستە مرۆڤایەتییەکان لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠١) دەستبەکاربووە لە بەشی ڕۆژنامەنووسی پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی.
- لە ماوەی خزمەتی خوێندنی باڵادا چەندین وانەی جۆراوجۆری وتۆتەوە لە بەشی ڕاگەیاندنی پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی وەك (بەڕێوەبردنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن، ڕایگشتی، هونەری نووسینی ڕۆژنامەنووسی، ڕاگەیاندنی تایبەتمەند، مێژووی ڕۆژنامەنووسی، تیۆرەکانی ڕاگەیاندن، بەرهەمهێنانی ڕادیۆ وتەلەفزیۆن).
- لە زانکۆی سلێمانی کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان بەشی ڕاگەیاندن بۆ ماوەی چوار ساڵ چەند وانەیەکی وتۆتەوە وەك (ژانری تەلەڤیزیۆن، تیۆری ڕاگەیاندن) لە قۆناغی سێ وچوار ویەك.
- سەرپەرشتیکردنی چەندین توێژینەوەی دەرچوونی خوێندکارانی زانکۆ وپەیمانگاکانی کردووە.
- ساڵی (٢٠١٢) بەشداری کردووە وەك ئەندامی لێژنەو توێژکردنی ماستەرنامە لە بواری ڕاگەیاندن.

* خول ونەزموونەکان:

- ساڵی (٢٠٠٥) بە مەبەستی ئەنجامدانی توێژینەوە سەردانی کەناڵی (الجزیرة) لە دەوحەی پایتەختی وڵاتی قەتەر بۆ ماوەی (١٨) ڕۆژ.
- ساڵی (٢٠٠٧) بەشداریکردن لە خولێکی تایبەت بە بەڕێوەبردنی گرووپی چڕ (**focus group**) کە لەلایەن پارتی کۆماری ئەمریکییەوە ڕێکخرابوو لە ئەستەنبوڵ.
- ساڵی (٢٠٠٨) بەشداریکردن لە خولێکی تایبەت بە پرۆسەی دیموکراتی کە لەلایەن پارتی دیموکراتی ئەمریکییەوە (**NDI**) ڕێکخرابوو، لە شاری سلێمانی.
- ساڵی (٢٠١٠) بەڕێوەبردنی خولێکی تایبەت بە (ئیتیکی کاری ڕاگەیاندن لە کاتی هەڵبژاردن) بۆ کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکانی عێراق لە ئوتێل (مەم وزین) لە شاری سلێمانی.
- ساڵی (٢٠١٠) بەشداریکردن لە خولێکی ئیندیکسی هۆڵەندی تایبەت بە گەیاندن لە نێو دەزگاکاندا لە شاری هەولێر، کە لەسەر بودجەی کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنی عێراق ئەنجامدرابوو.
- ساڵی (٢٠١١) بەشداریکردن لە خولێکی تایبەت بە ئەنجامدانی ڕاپرسی لەلایەن بانکی نێودەوڵەتی (**World Bank**) لە عەممان-ئوردن.
- ساڵی (٢٠١١) بەشداریکردن لە خولێکی تایبەت بە پەرەپێدانی پرۆگرامی خوێندنی ڕاگەیاندن لە عێراق کە لەلایەن ڕێکخراوی یونسکۆ (**UNESCO**) ڕێکخرابوو لە عەممانی پایتەختی ئوردن.
-ساڵی (٢٠١١)بەشداریکردن لەخولێکی تایبەتە بە خوێندنی تێکەڵ،لەلایەن ڕێکخراوی (**GIZ**)ئەڵمانی، لە شاری هەولێر.
- لە (٢٠)ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٢) بەشداریکردن بە توێژینەوەیەك لە سیمینارێکی زانستی لە زانکۆی (برادفۆرد) لە وڵاتی بەریتانیا.
- وتنەوەی وانەی تایبەت بە ڕاگەیاندن وڕایگشتی وهەڵبژاردن وهونەرەکانی نووسین لە چەند خولێکدا بەم شێوەیەی خوارەوە:
- ساڵەکانی (٢٠٠٨-٢٠٠٩) دوو خولی تایبەت بە هونەرەکانی تەلەفزیۆن کە لەلایەن مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە ڕێکخرابوو.
- پێنج خولی تایبەت بە هەڵبژاردن ومیدیا کە لەلایەن مەکتەبی هەڵبژاردنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە ڕێکخرابوو بۆ مەڵبەندەکانی یەکێتی نیشتمانی.
- دوو خولی تایبەت بە هونەرەکانی تەلەفزیۆن کە لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە ڕێکخرابوو لە سلێمانی و خورماڵ.
- ساڵی (٢٠١١) خولێکی تایبەت بە بەرنامەی ڕادیۆیی بۆ کارمەندای ڕادیۆی نەوا لە شاری سلێمانی.
- ساڵی (٢٠١٢) خولێکی تایبەت بە کاری ڕۆژنامەنووسی بۆ پەیامنێرانی ڕۆژنامەی (گۆڕان)ی سەر بە ڕێکخراوی (ئازادی لاوان) لە شاری سلێمانی.
- ساڵی (٢٠١٢) وتنەوەی وانە لە وورکشۆپێکی تایبەت بە گرفتەکانی بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە کەناڵە بینراوەکان لە هۆڵی مەم وزین لە شاری سلێمانی کە لەلایەن تەلەفزیۆنی جەماوەرەوە ڕێکخرابوو.
- ساڵی (٢٠١٣) سیمنارێکی تایبەت بە ئەرکەکانی میدیا بۆ ڕۆژنامەنووسانی حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان شاری سلێمانی.
- لە (٢٥ی نیسانی ساڵی (٢٠١٣) بەشداریکردن لە خولێکی تایبەت بە ئەرك و ڕۆڵی میدیا کە لەلایەن ڕێکخراوی پەرپێدانی دیموکراسی وڕێکخراوی (نالی)یەوە ڕێکخرابوو لە هۆڵی عیزەددین مستەفا.
- لە (٨) ئایارو (٥) حوزەیران و (٣٠) حوزیرانی ساڵی (٢٠١٣) بەشداریکردن لە سێ خول لە نووسینگەی ئاراستەکردن وڕابەرایەتی مەعنەوی سلێمانی کە بۆ ئەفسەرانی وەزارەتی ناوخۆ سازدرابوو دەربارەی ئیتیکی میدیا ومامەڵەی کارمەندانی ئاسایش لە کاتی نا ئارامیدا.
- ئەنجامدانی میتینگ بۆ ڕاگرایەتی پەیمانگا ودەستەی وانەوتنەوەی بەشی ڕاگەیاندن لەگەڵ بەرپرسی پەیوەندیەکانی کونسلخانەی ئەمریکی بۆ قسەکردن لەسەر ڕێگەکانی هاریکاری و پەیوەندیکردنی هەردوولا.
- لە (١٥)ی نیسانی ساڵی (٢٠١٣) بەشداریکردن لە وۆرکشۆپێك کە سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ڕێکی خستبوو تایبەت بە ڕاگەیاندن وکۆمەڵگە بە بۆنەی

سالیادی رۆژنامەنووسی کوردی، وبەشداری کردن وەك ئەندامی لیژنەی نووسینەوەی راسپاردەی وورکشۆپەکە.
- سەرۆکی رێکخراوی پرۆگرامی گەشەپێدانی کوردستان کە لە (٢١)ی نیسانی سالی (٢٠١٣) لە شاری سلێمانی دامەزرا ودەستی بە کارەکانی کردووە.
- سالی (٢٠٠٤) سەرنووسەری رۆژنامەی (گەرانەوە) بۆ ماوەی شەش مانگ.
- سالی (٢٠٠٥) هەوالساز لە رادیۆی نەوا بەشی عەرەبی بۆ ماوەی سالێك.
- سالانی (٢٠٠٦-٢٠٠٨) بەرپرسی هەلسەنگاندن وپێداچوونەوە لە کەنالی گەلی کوردستانی ئاسمانی بۆ ماوەی دوو سال.
- راوێژکاری گۆڤاری "تان وپۆ" کە گۆڤارێکی وەرزی سیاسیە لە شاری سلێمانی دەردەچێ.
* بەرهەمەکانی لە بواری کتێب و بلاوکراوەو چاوپێکەوتن:
- وەرگێرانی کتێبێك بە ناوی (کارکردن لە تەلەفزیۆن دا) لە زمانی عەرەبیەوە بۆ زمانی کوردی و چاپکردنی لەلایەن ناوەندی سەردەم بۆ بلاوکردنەوە لە سالی ٢٠١٠.
- بلاوکردنەوەی چەندین وتاری جۆراوجۆر لە رۆژنامەکانی هەرێمی کوردستان بە زمانی عەرەبی وکوردی.
- سازدانی چەندین چاوپێکەوتن لەسەر تەوەری جۆراوجۆر لە کەنالە بینراوو بیستراوەکانی راگەیاندن لە هەرێمی کوردستان وجیهان (کوردسات، گەلی کوردستان، NRT، KNN، جەماوەر، پەیام، زاگرۆس، رادیۆ نەوا، ئاژانسی ناوخۆ، خەندان، نالیا، ئەلعێراقیە، فەیحا، BBC radio).
- ئەنجامدانی (٤٣) فۆکس گروب لە شارەکانی سلێمانی و کەرکووك و هەولێرو دهۆك لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیان (راگەیاندن. تەندروستی، پەروەردە، سیاسە، کارگێری).
- لەنێوان سالانی (٢٠٠٩-٢٠١١) ئەنجامدانی چەندین پرۆژەی راپرسی لە شارەکانی سلێمانی و کەرکوك.
- سالی (٢٠١١) بەرێوەبردنی سیمیناری تایبەت بە پتەوکردنی پەیوەندنی نێوان نەتەوەکانی شاری کەرکوك (کورد. تورکمان) لە چوارچێوەی چالاکییەکانی رێکخراوی (کۆربەندی هزری کوردی) لە شاری کەرکوك.
- سالی (٢٠١١) بەرێوەبردنی سیمیناری تایبەت بە وتوێژکردن دەربارەی بارودۆخی شاری کەرکوك پاش کشانەوەی هێزە ئەمریکییەکان، لە چوارچێوەی چالاکییەکانی رێکخراوی(کۆربەرندی هزری کوردی)لە شاری کەرکوك.
- هاوکاریکردنی دادگای سلێمانی وەك پسپۆر وشارەزا لە (٧) کەیسی تایبەت بە تاوانە رۆژنامەنووسیەکان لەسەر راسپاردەی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ودادگای سلێمانی.
- سالی (٢٠١٣) بە چاپ گەیاندنی کتێبێك بە ناونیشانی (دور تكنولوجيا الاتصال في تطوير العمل الإعلامي في وسائل الإعلام الكوردستانية) لەلایەن ناوەندی سەردەم بۆ بلاوکردنەوە.

* ( حەکیم کاکە وەیس ):-

- سالی (١٩٤٩) لەگوندی حەساری گەورەی کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٧٣) بەکالۆریۆسی لە بیرکاری کۆلێژی زانستی بەغدا تەواو کردووە.
- سالی (١٩٧٦) چووەتە ریزی پاسۆکەوە.
- سالی (١٩٨٤)ە نیشتەجێی سویدە.
- گەلێك لێکۆلینەوەو نووسین و کتێبی وەرگێراوی هەیە، لەوانە:
- (١٩٨٤)، رۆمان جۆرج ئۆر وێل، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (نامەکانی مەسعود محەمەد)، ئامادەکردن، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (گورگی رووتەلان)، رۆمان، هێرمان هیسە، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (تەونی جالجالۆکە)، رۆمان، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٨، چاپی دووەم، هەولێر، (٢٠٠٨).

– (نەتەوایەتی کوردو ئیسلامەتییەکەی)، هەولێر، ٢٠٠٩.
– (دۆن کیشۆت، داستان شیترڤانتێس)، وەرگێران، سلێمانی.

* ( حەمزە سالح حەمامچی ئۆغلو ):–

– سالی (١٩٤٥) لە ساری کەهیە لەدایکبووە.
– سالی (١٩٧١–١٩٧٥) وەرگێر بووە لە رۆژنامەی (یۆرد).
– گەلێك بەرهەمی شیعری هەیە لەوانە (یەدینجی قدح)، دیوانێکی شیعری بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٨٩.

* ( حەمز عەلی – شێخ حەمزە- مەولانا حەمزە ):–

– ناوی (حەمزە کوری عەلی ئەفەندی کوری محەمەد ئەفەندی کوری ئیسماعیل ئەفەندی کوری عەلی ئەفەندی کوری پیر ئەفەندی)یە.
– یەکێك بووە لەوانەی کە کۆنترین قوتابخانەی ئایینیی هەبووە کە گەلێك دەستنووسی جۆراوجۆری تێدا هەبووە کە بە کتێبخانە دەگمەنەکانی عێراق دەژمێردرێت.
– لە کاتی خۆی موفتی کەرکوك بووە، تا ماوەیەکی دووردرێژ، ئینجا رۆیشتووە بۆ بەغداو لەوێ نیشتەجێ بووە تا کۆچ کردنی لە کاتی خوێدا زانای سەردەمەکەی بووە لە سەدەی دوانزە هەم.
– سالی (١٦٩٨) دیوانێکی شیعری بە زمانی فارسی نووسیوە.

* ( حەمە ئەمین قادر عاشوور گلی ):–

– سالی (١٩٣٦)دا لە گوندی (هەفتەغار)ی شاری کەرکوك لەدایکبووە.
– قوناغی ئامادەیی لە بەغدا تەواو دەکات، بەلام لەبەر دەست کورتی ناتوانێت زانکۆ تەواو بکات، بۆیە لە کۆلیژی کارگێری و ئابووری بازرگانی بەفەرمانبەر دادەمەزرێت، بەلام لەگەل ئەم کارەدا کۆلیژی ئاداب، بەشی زمانی کوردی تەواو دەکات، تا بەوەی لەنێوان سالانی (١٩٣٧–١٩٧٤) بۆ ئینگلتەرا دەروات، لەوێ لە زانکۆی (ASTEN) لە پەرمنگهام لە سالی (١٩٨٠) لەسەر مێژوو زمانی کوردی بروانامەی دکتۆرا بەدەست دەهێنێت.
– هەرچەندە دکتۆراکەی تەواودەکات، بەلام حکومەتی عێراقی ناهێلێ بە دامەزراندنی، پاشان لە زانکۆی (ئەربد) لە (ئوردن) داواکاری وەرگرتنی دەردەچێت و دەست بە دەرس ووتنەوە دەکات.
– بەلام لە (٢)ی نیسانی سالی (١٩٨٣) لە ئوردن موخابەراتی عێراقی هەلدەسێت بەژەهراوی کردنی لە نەخۆشخانەو تەرمەکەی لە (٤)ی نیسانی سالی (١٩٨٣) بەرەو کەرکوك دەهێنرێتەوە.

* ( حەمە پاشای جاف ):–

– (حەمە پاشای کوری کەیخەسرەو بەگی سلێمان بەگی زاهیر بەگی یار ئەحمەد بەگی سەیفوللا بەگی سەید ئەحمەدی جوانرۆ)یە.
– لە سالی (١٨١٤) لەدایکبووە.
– ئەم زاتە لە پاش کۆچی دوایی باوکی لە سەرەتای بەهاری تەمەنیدا لە ١٤ یان ١٦ سالیدا بووە بە سەرۆکی عێلی گەورەی کۆچەری جاف و بە بلیمەتی و چاونەترسی و لێهاتوویی خۆی توانیویەتی پەیتا پەیتا سام و شۆرەتێکی زۆر پەیدا بکات و هۆزەکەی بە ئەوپەری دەسەلات وشکۆداری بگەیەنێت بۆیە عوسمانی وقاجارەکان هەولی راکێشانیان داوە بەلای خۆیاندا.
– سالی (١٨٥١)ی زایینی عوسمانییەکان نازناوی پاشایان بە محەمەد بەگ بەخشی و ئیدی ناوبانگ و شۆرەتی پتر پەرەی سەند.
– سالی (١٨٦٦) کە محەمەد پاشا لەسەر گردی شێروانە لە لێواری رووباری سیروان قەلا شکۆ دارەکە (قەلای شێروانە)ی بنیات ناو پاش دروستکردنی بوو بە هێمای دەسەلات وتوانای خاوەنەکەی وهۆزەکەی لەو سەردەمەدا عوسمانییەکان بەمەبەستی کۆنترۆل کردنی جاف و دانانی سنوورێك بۆ جموجۆلیان لەنێوان سنووری کوردستانی عێراق و ئێراندا، داوایان کرد لە حەمە پاشا بە خۆی و هۆزەکەیەوە واز لە ژیانی کۆچەری بهێنن و لە شارەزووردا نیشتەجێ بن.
– زیرەك و زانا بوو و باش لە مەرامی عوسمانییەکان تێدەگەیشت ئەو داوایەی پەسند نەکردو بە یاوەریی هۆزەکەی روویان لە ئێران کردەوەو لەلایەن دەسەلاتدارنی قاجارییەوە بە گەرمی پێشوازییان لێکرا کە لەنێوان زەهاوو جوانرۆدا سەرقالی ژیانیان بوون.
– سالی (١٨٧٤) (حەمە پاشا) لەلایەن شا (ناسرەددین)ی قاجارییەوە نازناوی (خان)ی پێبەخشراو کرا بە فەرمانداری هەرێمی (زەهاوی) عوسمانی کوریشی (عوسمان پاشا) بە فەرمانداری جوانرۆ دانرا.
– پاش ئەوەی محەمەد پاشای جاف و هۆزەکەی سێ سالیان لە کوردستانی ئێران بردە سەر، لەگەل قاجارییەکاندا تێکچوون و لە نزیك سنوور تووشی شەرو شۆری خوێناوی هاتن، سەر ئەنجام پێوەندییان بە عوسمانییەکانەوە کردەوەو بۆ کوردستانی باشوور گەرانەوەو لەلایەن عوسمانییەکانەوە رێزو حورمەتێکی زۆریان لێگیراو محەمەد پاشایان بە قائمقامی هەلەبجە دانا.
– زۆری نەخایاند عوسمانییەکان وەك پیشەی لەوەو بەریان دەستیان کردەوە بە پیلان گێران لە دژی حەمە پاشا، ئەوەبوو عەزیزی شاوەیس سەرۆکی تیرەی (کەرەم وەیس) سەر بە (جاف)یان هاندا لە رووی دەسەلاتی محەمەد پاشادا بووەستێت و بەربەرەکانیی بکات ئەمیش عەزیزی بەندکرد ولە بەندیخانەدا بەهۆی نەخۆشییەوە کۆچی دوایی کرد، وەلێ هەندێك لە کار بەدەستانی عوسمانی پروپاگەندەی ئەوەیان کرد گوایە عەزیز لە بەندیخانەدا بە فەرمانی محەمەد پاشا دەرمانخوارد کراوە.
– سالی (١٨٨١) کاتێك محەمەد پاشا لە برایم سەمەن نزیك بە کفری لەگەل هەندێك پاسەوانەکانیدا لە گەشتێکی راووشکاردا دەبێت، بەدەستی تاقمێك لە خزمانی عەزیز غەدری لێدەکرێت و دەکوژرێ، ئەوجا بکووژان و خزمانیان پەنا بۆ جوامێری ئاغای هەمەوەند دەبەن، ئەویش هەرچۆنێك بێت پەنایان دەدات، ئیدی شەری قورس و خوێناوی لەنێوان جاف بە سەرۆکایەتی مەحموود پاشای کورە گەورەی محەمەد پاشا لەلایەك و هەمەوەندو کەرەم وەیس لە لایەکی بەرپا دەبێت، سەرئەنجام بکوژانی حەمە پاشای جاف زۆربەی هەرە زۆری خزمانیان دەکوژرێن و جوامێر

ئاغاو هەمەوەندەکانیش بۆ نێو سنووری کوردستانی ئێران دەپەڕنەوە.

*** ( حەمە بەگی جاف ):-**

- ناوی (حەمە بەگی کوڕی فەتاح بەگی کوڕی حەمە پاشای جاف)ە.
- ساڵی (١٩٠٤) لەناوی قەلآی (شێروانە) لەدایکبووە.
- حەمە بەگی جاف یەکێکە بوو لەوانەی کە باوەڕی بەوە هەبوو کە دەبێت تێکۆشانی سیاسی بگرینە بەر بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانمان.
- هەر بۆیە لەگەڵ ئەمینی ڕەواندوزیو ئیبراهیم ئەدهەمو ڕەئوف جەلالیو شێخ جەمالی تالەبانی ڕێکخراوە یەکیان دانا لە (کفری) کە ناوی ڕێکخراوەکە (پارتی ئازادی کوردستان) بووە، کە لقێکی لە شاری (کفری) بووە، وەئەم زاتانە ئەندامی ئەو کۆمەڵەیە بوون (حەمە جاف، شێخ جەمال تاڵەبانی، موفتی سەعید ئەفەندی، وەستا ساڵحی خەیات، تۆفیق ئاغای گەلآلی، مەلا موحێدین زەلزەلە.
- قوتابخانەیەکی لە (کەلار) کردووەتەوەو ڕەئوف بەگی جەلالی وەك مامۆستا هێناوەتە کەلار.
- لە ساڵی (١٩٢٨) بووەتە ئەندامی پەرلەمان لەگەڵ محەمەد سەعید وەنداوی.
- یەکەم کەس بووە کە جلوبەرگی کوردی جۆری مرادخانی لەبەر کردووە.
- لە (١)ی ئایاری ساڵی (١٩٣٤) کۆچی دوایی کردووە.

*** حەمە پیرە: -**

یەکێکە لە شاگردەکانی مەلا وەلی لەپاش مردنی مەلا وەلی حەمەپیرە وەکو مەقام خوێنێکی شارەزاو دەنگخۆش لە شاری کەرکوك دەرکەوت بەپێی ئەوەی لەسەردەمی مەلا وەلیدا ژیاوە شاگردی مەلا وەلی بووەو دەبێت ژیانی بکەوێتەسەدەی نۆزدەوە. پیرە خەڵکی گەڕەکی بەرتەکێی کەرکوکە. لە حەمە پیرەیشەوە (محەمەد خەلیل ئاغا ١٩٣١) ئامێری دەفی بۆ حەمەپیرە لێداوەو ژەنـدووەو هەموو مەقامەکانی لێوە فێر بووە، بەڵام لەکاتێدا حەمەپیرە لەژیاندا بووە محەمەد خەلیل نەیتوانیوە لەبەردەمی مەقام بخوێنێت بەڵام دوای مردنی حەمە پیرە ئیتر محەمەد خەلیل ئاغا ڕۆڵ دەگێڕێ و دەبێتە مەقامخوێنی یەکەم لە شاری کەرکوك و ناوناوبانگ دەردەکات دیارە هونەرمەندی گەورەیش عەلی مەردان خوێنکاری ئەو کەڵە هونەرمەندانەیە کە مەلا وەلی بە مامۆستای گەورەی هەموو ئەم کەڵە هونەرمەندانە دادەنرێت. مەقامبێژو مەقامزان میقداد عومەر لە زمانی حاجی عومەر پاسەوانی مامێوە دەیگێڕێتەوە کە چەند جارێك هونەرمەندانی موسڵ سەردانی حەمەپیرەیان کردووە بەهەمان شێوە ئەمیش چووەتە ئەو شارەو لەمەوە فێری چڕینی مەقامی ئیبراهیمی بوون.

مێژووی مەقام خوێندنیش نەك هەر لە کوردستان کە شاری کەرکوك و کفری کانگای بووە دەیگەڕێننەوە بۆ مەلا وەلی وەکو لە سەرچاوەکانی وەکو کتێبی (دلیل الجمهوریه العراقیه) کە باس لە مەقاماتی عێراقی دەکات دەیگەڕێننەوە بۆ سێ چوار سەدەی پێش ئێستاو بەتایبەتی بۆ مەلا وەلی شارەزاو مەقامبێژی کورد کە لەتیرەو هۆزی زەنگەنەیە.

*** حەمە زیاد غەریب - مەلا ئاراس:-**

- ناسراو بە مەلا ئاراس.
- لەدایکبووی ساڵ (١٩٦٠)ی گوند تولکیی ناوچەی شێخ

بزێنی.
- لە تەمەنی حەوتساڵیدا لە حوجرە. خوێندویەتی و لەوێوە ژیانی فەقییەتی دەستپێکردووە.
- ساڵی (١٩٧٧) لە كەركوك پەیوەندیی بەڕێکخستنەكانی كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستانەوە كرد.
- ساڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە كرد. ماوەیەك لە ناوچەی سەركردایەتی مایەوەو پاشان وەك كادیری جەماوەری بۆ سنووری هەرێمی ٢ی كەركوك گوێزرایەوە، بەڵام زۆرترینی هەڵسووڕانی وەك كادیر، لەناوچەكانی شوان و ساڵەیی و قەڵاسێوكەو شێخ بزێنی بوو.
- ساڵی (١٩٨٢) كرایە فەرماندەی كەرتی ٨ی ساڵەیی و هەمان ساڵ وەك فەرماندەی كەرتی ٤ بۆ خاڵخاڵان گوێزرایەوە.
- ساڵی (١٩٨٣) بۆ ناوچەی هەولێر وەك جێگری فەرماندەی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر گوێزرایەوە.
- ساڵی (١٩٨٤)دا كرایە فەرماندەی تیپی ٩٩ بیتوێن و لە كۆتایی هەمان ساڵ كرایە فەرماندەی تیپی مەڵبەندی سێ.
- ساڵی (١٩٨٥)دا بووە فەرماندەی تیپی ٢١ی كەركوك و هەر ئەو ساڵە، لەپاڵ ئەوەی كە فەرماندەی تیپی٢١ی كەركوك بوو، بۆ ماوەیەك ئەركی سەرپەرشتی كردنی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵانی پێ سپێردرا.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی ژمارەیەكی زۆر شەڕو نەبەردی كردووە لەوانە شەڕەكانی مۆردخواردەی سەرووو شێوەسووررو گۆپتەپەو ئۆپەراسیۆنەكانی هێزی پشتیوان لە كوردستانی ڕۆژهەڵات (١٩٨٢)و دابان - هەلاج (١٩٨٥) و قەیوان - ماوەت (١٩٨٦)و لەم سەروبەندەدا یانزە جار بریندار بووە. بەپێی ڕاپۆرتی پزیشك، ١٥٤ وردە ساچمە لە جەستەیدا بووە.
- لە ١١ی نیسانی ساڵی (١٩٨٧)دا لە گوندی مەرزیخەی ناوچەی شێخ بزەینی بەموشەكێكی فرۆكەی پیلاتۆز شەهید بوو.

*** ( كاكە حەمەی خانەقا - شێخ كاكە حەمەی خانەقا ):-**

- ناوی (شێخ كاكە حەمە كوڕی سەید ئەحمەدی خانەقا)یە.
- ساڵی (١٩٢٠) لە كەركوك لەدایكبووە.
- بەكالۆریۆسی لە یاسا لە زانكۆی بەغدا تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٤٨) هەڵبژێردراوە بە نوێنەری كەركوك لە (مجلس نواب).
- چووەتە نێو حیزبی دیموكراتی كوردستان لە ساڵی (١٩٤٧).
- ساڵی (١٩٥٨) نوێنەری (مجلس نواب) بووە لەلایەن حیزبی دیموكراتی كوردستان.
- لە (١٨)ی ئابی ساڵی (١٩٦٣) بە كارەساتی كەوتنە خوارەوەی هەلیكۆپتەر شەهید بووە.

*** ( محەمەد سەعید - حەمە درێژ ):-**

- ناوی تەواوی (محەمەد سەعید عەبدوڵلا)یە.
- ساڵی (١٩٢٦) لە كەركوك لە گەڕەكی (بولاق)ی نزیك (بەرتەكیە) هاتووەتە دنیاوە.
- (حەمە درێژ لە باوكی واتە (سەعید عەبدوڵلا)و لە مامی واتە (حاجی عومەر عەبدوڵلا)ەوە فێری هونەری مەقام ناسین ومەقام خوێندن بووە.

*** ( حەمە سەعید ئەحمەد ):-**

- ساڵی (١٩١٩) لە گوندی (زەنقری) داقوق هاتووتە دنیاوە.
- هونەرمەندێكی میللی و دەنگی گەلێك ناسك و دڵگیر بووە، شارەزای مەقامەكانی قەتارو خورشیدی و ئای ئای و ئەڵلاوەیسی بووە، لەم دواییەدا تواندرا گەلێك لە گۆرانییەكانی تۆمار بكرێت.
- ساڵی (١٩٨٣) كۆچی دوایی كردووە.

*** ( حەمە سووری كەلاوقووت ):-**

- حەمە سوور ناوی (محەمەد ئەحمەد مەحموود)ە.
- ساڵی (١٨٧٧) لە گوندی (شەشۆ) لە ناوچەی (ماوەت) لە شارباژێر لە نزیك (ئاوە كوریتی) لە بنەماڵەیەكی زاناو ڕۆشنبیر لەدایكبووەو لە هۆزی (جاف)ە.
- ماوەیەك بە منالی پەیوەندی دەكات بە شێخ عەبدولكەریمی شەدەلە دوای مانەوەی چەندان ساڵ لە خزمەتی شێخ عەبدولكەریم دەبێت.
- حەمە سوور زیاتر لە چەند ژنێكی هێناوە، بەڵام تەنها كوڕو كچێكی هەیە.
- دوای كۆچی دوایی شێخ عەبدولكەریم لە ساڵی (١٩٤٢) موریدەكان دەبن بە سێ بەشەوە بەشێكیان لەگەڵ حەمە سوور دەچنە كەركوك، دەچێتە خزمەتی (سەید ئەحمەد خانەقا)، بەڵام بەهۆی ئەو گوشارەی لەلایەن حكومەتی ئەو ساوە بۆ سەر بزووتنەوەكەیان بەتایبەتی حەمە سوور كە گوایە بیروباوەڕی سۆسیالیزم بڵاودەكاتەوە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەكات، بۆیە ناچار سەید ئەحمەد خانەقا دەریان دەكات، ئەمانیش ڕوو دەكەنە گوندی (كەلاوقووت).
- حەمە سوور دوای تەمەنێكی دووروودرێژ لە (٢)ی كانوونی

یەکەمی ساڵی (١٩٨٧) لە گوندی (کەڵاوقووت) کۆچی دوایی دەکات، هەر لە هەمان گوند بە خاکی دەسپێرن.

*** ( حەمە کەریم عارف ):-**

- ناوی (محەمەد عەبدولکەریم عارف)ە.
- ساڵی (١٩٥١) لەکەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٥) کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٧)وە بەبەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبیی بڵاودەکاتەوە.
- ماوەیەك سەرۆکی یەکێتی نووسەران لقی کەرکوك بووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (تیرۆژ)، چیرۆك، سلێمانی، ١٩٧٩.
- (ئامانجی ئەدەبیات)، م. گۆرکی، شاخ، ١٩٨٥.
- (بەیداغ)، چیرۆك، شاخ، ١٩٨٨.
- (کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلام دا)، هەولێر، ١٩٩٨.
- (کۆچی سوور)، رۆمان، چاپی یەکەم، شاخ، ١٩٨٨، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٩٩.
- (لە خۆبێگانەبوون)، چیرۆك، هەولێر، ١٩٩٩.
- (هونەرو ژیانی کۆمەڵایەتی)، بلیخانۆف، وەرگێران، هەولێر، ١٩٩٩.
- (دووره وولات)، رۆمان، قاسمۆف، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی)، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠.
- (زیندە خەون)، کۆمەلە چیرۆکی چیخۆف، وەرگێران، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١.
- (راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا)، هاوبەش، هەولێر، ٢٠٠١.
- (هاوماڵەکان)، رۆمانی ئەحمەد محەمەد، وەرگێران، لە فارسییەوە، چاپی یەکەم، شاخ، ١٩٨٥، چاپی دووەم، ٢٠٠٢.
- (نینا)، رۆمان، سابت رەحمان، وەرگێران، چاپی یەکەم،

شاخ، چاپی دووەم، ٢٠٠٢.
- (پێناسنامەکان)، عەزیز ئەمین، وەرگێران، چاپی یەکەم، شاخ، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- (کورد لە سەردەی نۆزدەو بیستدا)، کریس کۆچێرا، وەرگێران، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (ئازادی یا مەرگ)، نیکۆس کازنتزاکی، وەرگێران، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، چاپی دووەم، (٢٠٠٨).
- (نامۆ)، رۆمان، ئەلێلاکامۆ، وەرگێران، چاپی یەکەم، شاخ، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٣، چ٣، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (قوربانی)، رۆمان، هیرپ میدۆ، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٤.
- (پەلکە زێرینە)، هەولێر، ٢٠٠٤.
- (کورد گەلی لە خشتە براو غەدرلێکراوە)، وەرگێران، چاپی سێیەم، هەولێر، ٢٠٠٤.
- (ریالیزمو دژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا)، دهۆك، ٢٠٠٤.
- (چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی)، وەرگێران، چاپی یەکەم، شاخ، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (چیرۆکستان)، دەق و رەخنە، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (مەسەلەی کورد لە عێراقدا)، عەزیز شەریف، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (راگەیاندن لەنێوان حەقیقەتبێژی و عەوام خەڵەتێنی دا)، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (دیداری چیرۆکڤانی)، وەرگێران، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدەبی رۆشنبیری)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (ئەدەبی منالانی کورد)، لێکۆڵینەوە مێژووی سەرهەڵدان، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (فەرهەنگی گۆڤەندو زنار فارسی-کوردی)، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٥، بەرگی دووەم، (٢٠٠٨).
- (داوەتی کۆچەریان)، چیرۆك، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (لە مەهابادی خوێناوییەوە تا کەنارەکانی ئاراس)، نجف قلی پسیان، وەرگێران، هەولێر، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت)، وەرگێران،

کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (جێ پێ، کۆ چیرۆك)، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (لێکدانەوەیەك لە مەڕ نامۆ)، وەرگێڕان، بەغدا، ٢٠٠٦.
- (گوزارشتی مۆسیقا)، فوئاد زەکەریا، وەرگێڕان، ٢٠٠٦.
- (ئەو ڕۆژەی کە ون بوون)، کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦.
- (ڕێبەر)، ڕۆمان، مەهدی حوسێن، چاپی یەکەم، شاخ، چاپی دووەم، ٢٠٠٧.
- (شکست)، ڕۆمان ئەلکساندر فەدایف، چاپی یەکەم، شاخ، چاپی دووەم، ٢٠٠٧.
- (گەمەی پاشا و وەزیر)، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- (دەربارەی شیعرو شاعیری ڕەزا بەراهەنی)، وەرگێڕان، چاپی دووەم، ٢٠٠٧.
- (زارۆکستان)، کۆمەڵێ نووسەر، وەرگێڕان، سلێمانی، (٢٠٠٨).
- (ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ)، چیرۆك، کەرکوك، (٢٠٠٨).
- (پەیڤستانی من)، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- (شیعر کوژی)، چەند پەیڤێك دەربارەی شیعرو شاعیری، ٢٠١٠.
- (دلێری خۆ ڕاگرتن)، ئەشرەفی دەهقانی، شاخ.
- (خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ)، مەسعود ئەحمەد زادە، شاخ.
- (مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد)، ئیحسان نوری پاشا، وەرگێڕان، چاپی یەکەم.
- (قوتابخانە ئەدەبییەکان)، ڕەزا سەید حوسەینی، وەرگێڕان، هەولێر، چاپی یەکەم.
- (کۆچ سرخ)، کۆمەڵە چیرۆکێکە بە فارسی.

*** ( حەمە لووتەی جەباری ):-**

- ساڵی (١٨٤٥) لە دێی بانگۆل هاتووتەوە دنیاوە.
- ساڵی (١٩١٥) کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی (سوورە زەلی بانگۆل) نێژراوە.
- زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی بە باشی زانیوە.
- بەرهەمەکانی: (فەرهەنگی کوردی و تورکی) کە بە شیعر هۆندراوەتەوە بەڵام تا ئێستا دەستمان نەکەوتووە.

*** ( حەمە داماو ):-**

- ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لەو شاعیرانەی لە سەرەتای حەفتاکاندا لە بواری شیعردا کاری کردووە.
- لە (٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا کۆچی دوایی کردووە.

*** ( حەمەد محەمەد ئەحمەد - حەمە دیان ):-**

- ساڵی (١٩٦٧) لە داقوق لەدایکبووە.
- دەرچووی بەکالۆریۆسە لە زانستی کتێبخانە و زانیارییەکان لە زانکۆی موستەنسرییە لەنێوان ساڵانی (١٩٨٨ - ١٩٨٩).
- بەرهەمەکانی:
- (مێژووی قەدەغەکردنی کتێب لە کتێبخانەی گشتی کەرکوك)، ٢٠٠٨.
- (قەیرانی خوێندنەوە)، ٢٠١٣.

*** ( حەمەی کۆترەمل ):-**

- یەکێك بووە لە دەنگ خۆشەکانی شاری کەرکوك لەسەر قەوان گۆرانی تۆمار کردووە.

*** ( حەمە نەجیبی بەرلوت - مەلا حەمە نەجیبی بەرلوت ):-**

- ناوی (مەلا حەمەد نەجیب کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا مەحموودی بەرلوتی)یە.
- ساڵی (١٩٣٢) لە گوندی (بەرلوت) لەدایکبووە.
- زانستەکانی ئایینی لە هەڵەبجەو سلێمانی و کەرکوك و کفری و قزرەبات و کەلاری کۆن خوێندووە.
- شیعرەکانی بە کوردی و فارسی و عەرەبی نووسیوە.
- ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( حەمید چکچکان - عەبدولحەمید سلێمان ):-**

- ناوی تەواوی (عەبدولحەمید سلێمان زەهاوی)یە لە ساڵی (١٩٢١) لە شاری خانەقین لەدایکبووە، بەڵام نازناوی (حەمید چکچکان)ە.
- پۆلی شەشەمی سەرەتایی لە خانەقین تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٤٧) ژنی هێناوە و چوار کوڕو حەوت کچی هەیە.
- ساڵی (١٩٥١) مالیان هاتووەتە کەرکوك و مووچە خۆربوو، شوفێر بوو لە کۆمپانیای نەوتی ژووروو لە کەرکوك.
- ٣١ ساڵ خزمەت کردنی هەیە تا لە ساڵی (١٩٨٢) دا خانەنیشن کراوە.
- لە تاڤی لاویدا، هۆگری هونەری سیحر بووە، لە ساڵی (١٩٤٨) لە لای سیحربازێکی بەناوبانگ، بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك ئەم هونەرەی خوێندووە و فێربووە، بەرادەیەك کە جێگەی سەر سووڕمانی مامۆستاکەش بووە، گەلێك کتێبی

دەربارەی سیحر خوێندوەو کتێبێکی زۆر بەنرخ و دەگمەنی هەبووە لێیان دزیووە.
– لای ئەو سیحر کردن هونەرێکی وەرزشییە، زۆربەی نهێنییەکانی سیحر لە گورج و خێرایی نواندنی دەستەکانی هونەرمەندایە، بەشێکیشی لەو کەرەستانەیە کە بەکاری دەهێنین، سەرەڕای بەهرەی شارەزایی وفڕوفێڵ هەلخەلەتاندن.
– لە شاری کەرکوك وزۆربەی شارەکانی تری عێراقدا بەڵکو لە هەندێ وولاتانی کەنداوی عەرەبیشدا لە جەژن و بیرەوەرییەکاندا، ئاهەنگی سیحری دەگێڕاو پێشکەشی دەکرد.
– لە حەفتاکاندا چەند ئەڵقەیەکی سیحری بەرەش و سپی، ئەڵقەیەك یان دوانیش بەڕەنگاوڕەنگ بۆ تەلەفزیۆن تۆمارکرد.

*** حەمید محەمەد کاکەمەند:-**

– لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٧) گوندی تۆپزاوای نزیك شاری کەرکوك.
– لە خێزانێکی هەژارو زەحمەتکێش لەدایکبووە.
– لە هەرەتی لاوێتییەوە هەستێکی جۆش سەندووی کوردپەروەرانەی هەبووە.
– ساڵی (١٩٥٩) پەیوەندیی بەریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردو لە ئابی ساڵی (١٩٦٢)دا چووە ڕیزی شۆڕشەوە.
– ساڵی (١٩٦٤) لە هێزی ڕزگاریی چەمی ڕێزان بوو کە فەرماندەکەی جەلال تاڵەبانی بوو.
– لە دوای تەقینەوەی ناکۆکییەکانی ناو پارتی لەنێوان باڵی مەکتەبی سیاسیی و باڵی مەلا مستەفا بارزانیدا لە ساڵی (١٩٦٤)، لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی پەنای بۆ ئێران بردو تا ساڵی (١٩٦٦) لەوێ مایەوە.
– پاش گەڕانەوەی باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی بۆ شارەکان و ڕێکخستنەوەی ریزەکانی، تا ساڵی (١٩٧٠) لە دەستەی پاریزگاریی تاڵەبانی پێشمەرگە بوو. پاش تێکەڵبوونەوەی هەردوو باڵی پارتی، گەڕایەوە بۆ کەرکوك.
– ساڵی (١٩٧١)دا لە ڕێگەی عەلی بچکۆڵەوە کە کادریری ڕێکخستن بوو، پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردو بۆ ساڵی دواتر کەوتە کارکردن لەگەڵ فەرەیدون عەبدولقادر کە ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە بوو.
– دڵسۆزیی بۆ کۆمەڵە هانیدا زەوییەکەی خۆی لە کەرکوك پێشکەش بەڕێکخستنی کۆمەڵە بکاو بەپارەی خۆیشی خانوویەکی لەسەر دروست بکا بە جۆرێك کە بگونجێ لەگەڵ پێداویستییەکانی ڕێکخستنی نهێنیدا. هەر لەو خانووەدا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی " ئاڵای سوور" چاپ کرا.
– ساڵی (١٩٧٤) لەگەڵ دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کوردو حکومەتی عێراقدا، پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کردو لە گوندی قرخ ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکردەوە. دوای هەرەسهێنانی شۆڕش، گەڕایەوە بۆ کەرکوك و درێژەی بە هەڵسووڕانی خۆی دا لەناو ڕێکخستنی کۆمەڵەدا.
– ساڵی (١٩٧٦) کاروباری کۆمیتەی ئاگر بە شێوەیەکی کاتی ڕادەستی ئەوو حەمە کەریم عەلی ڕەزا ناسراو بە ئەحمەد کرێکار کرا.
– ساڵی (١٩٧٨) پاش ئەوەی کە کۆمیتە بڕیاری دروستکردنی شانەی چەکداریدا لەناو کەرکوك، بووە لێپرسراوی شانەیەکی چەکدارو هەندێ چالاکیی شۆڕشگێڕانەی ئەنجام دا.
– ساڵی (١٩٨٠) دوابەدوای بوونی حەمە کەریم عەلی ڕەزا بە پێشمەرگە. لێپرسراوەتیی کۆمیتەی ئاگر ڕادەستی کرا ساڵی دواتر لە شاڵاوێکی فراوانی دەزگا ئەمنییەکان لە دژی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر، دەستگیر کراو دادگا بۆ ماوەی ١٥ ساڵ فەرمانی زیندانی کردنی بۆ دەرکرد.
– ساڵی (١٩٨٢) بەلێبووردنی گشتی ئازاد کراو ساڵی دواتر لە ناوچەی سەنگاو پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد.
– ساڵی (١٩٨٤) گوێزرایەوە بۆ بەشی گومرگ و تا ساڵی (١٩٨٩) لەوێ خزمەتی کرد.
– ساڵی (٢٠١٠) لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا خانەنشین کرا.

*** (حەمید جاف):-**

– ناوی (حەمید محەمەد ئەمین جاف)ە.
– لە بەغدا، لە ساڵی (١٩٣٠) لەدایکبووە.
– لە ساڵی (١٩٥٦) پەیمانگای (سکك)ی تەواو کردووەو لە کاری حکومیدا بوو تا ساڵی (١٩٨٥).
– هەر لە ساڵی (١٩٥١)ەوە، وەکو (کۆتەڵکار)ێك بە ناوبانگ بوو کە پارچە داری بەکار هێناوە لەکارەکانیدا، ئەم کارەی لە هونەرمەند (جەلیل شاهین)ەوە وەرگرتووە.
– لە بەرهەمەکانی:
– (معجم إعلام المكفوفين)، ٢٠٠٢.
– (معجم علماء الفلك)، ٢٠٠٢.
– (ثمالات كؤوس الألم)، ٢٠٠٣.
– (نفثات مكلوم)، ٢٠٠٣.

- (عرق الدم والدموع)، ٢٠٠٣.
- (مكابدات في زمن الحصار)، ٢٠٠٣.
- (الحان الحان)، ٢٠٠٤.
- (الِمع الأسماء في اوائل النساء)، ٢٠٠٤.
- (کلپەی دەروون)، شیعر، کەرکوک، ٢٠٠٤.
- (الأواخر في التأريخ)، ٢٠٠٦.
- (عزاء الشجون بالشجون)، ٢٠٠٦.
- (الشماريخ في تراجم إعلام التأريخ)، ٢٠٠٧.
- (كشف الحلك عما يدور في الفلك)، ٢٠٠٧.
- (صفو البيان في إعلام كردستان)، ٢٠٠٧.
- (التبر المسبوك في تراجم ادباء كركوك)، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٧.
- (ژان و ژیان)، شیعر، کەرکوک، (٢٠٠٨).
- (الشمائغ في الأدب والحكمة والتأريخ)، ٢٠٠٩.
- (التبر المسبوك في تراجم ادباء كركوك)، بەرگی دووەم، ٢٠٠٩.
- (الغربة في الوطن)، ٢٠٠٩.
- (تداعيات الوجدان)، ٢٠٠٩.
- (الشماريخ في الأدب والحكمة والتأريخ)، بەرگی یەکەم، دووەم، سێیەم، چوارەم، تا بیستەم.

* ( حەمید خالید کەریم ):-

- ساڵی (١٩٤٧) لە گەرەکی بەگلەر لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٣) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی پسپۆڕی زمان و ئەدەبی کوردی لە کۆلێژی ئاداب لەزانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- دامەزراوە بە مامۆستا لە هەمان ساڵ لە دێی باوە لای ناحیەی لەیلان.
- ساڵی (١٩٧١) دەستی بەنووسین کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (سروودی کەو)، شیعرو چیرۆک بۆ منالان، کەرکوک، ٢٠٠٧.
- (لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بۆسەلماندنی بەکوردی بوونی ئەلفبێی نووسینی کوردی)، کەرکوک (٢٠٠٨).
- (ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی زانستی زمانەوانی لەزمانی کوردیدا)، کەرکوک، (٢٠٠٨).

* ( حەمید دەروێش ):-

- ساڵی (١٩٥٤) لە گوندی شۆراوی کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٥) پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٢-١٩٧٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە بەغدا.
- ساڵی (١٩٧٩) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە فلۆرەنسا، ئیتاڵیا.
- ساڵی (١٩٨٠) لە ئیتاڵیا لە شاری فلۆرەنسا بەشی هونەر جوانەکای خوێندووە.
- ساڵی (١٩٨٧) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە لەندەن.
- ساڵی (١٩٨٧) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- ساڵی (١٩٨٨) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە لەندەن.
- ساڵی (١٩٨٨) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- ساڵی (١٩٨٩) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە ستراسبۆرغ، فەرەنسا.
- ساڵی (١٩٨٩) ماستەری لە هونەری شێوە کاری وەرگرتووە لە پاریس.
- ساڵی (١٩٨٩) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە پاریس.
- ساڵی (١٩٩٠) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- ساڵی (١٩٩٠) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- ساڵی (١٩٩١) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە

جینیاك، فەرەنسا.
- سالّی (١٩٩٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە گراتس.
- سالّی (١٩٩٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە دارمشتات.
- سالّی (١٩٩٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە فەرەنسا.
- سالّی (١٩٩٤) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە فەرەنسا.
- سالّی (١٩٩٤) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە پاریس.
- سالّی (١٩٩٥) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە پاریس.
- سالّی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە ڤییەنا.
- سالّی (١٩٩٧) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە.
- سالّی (٢٠٠٠) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- سالّی (٢٠٠٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- سالّی (٢٠٠٤) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە.
- سالّی (٢٠١٠) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- سالّی (٢٠١٠) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- سالّی (٢٠١٠) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- سالّی (٢٠١١) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.
- سالّی (٢٠١١) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە فەرەنسا.
- سالّی (٢٠١١) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە پاریس.

*** (حەمید رێبوار):-**

- سالّی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووەو نووسەرو وەرگێرو رۆژنامەنووس بووەو گەلێك لێکۆلّینەوەی هەیە لە بواری شیعرو رەخنە، بە زمانەکانی کوردیو عەرەبیو کتێبێکی چاپکراوی وەرگێراوی هەیە لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی بەناونیشانی (الكورد في دائرة المعارف الإسلامية).
- لە (١٣)ی تشرینی یەکەمی (٢٠٠٣)دا کۆچی دوایی کردووە.

*** (حەمید شەریف):-**

- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك، لە حەفتاکاندا جێپەنجەی دیارە لە بواری هونەریدا.
- سالّی (١٩٧٦) پێشانگای هاوبەشی کردووەتەوە لەگەلّ نورەددین ناسر.

*** (حەمید عەبدوللّا سالّح):-**

- سالّی (١٩٧٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- کۆلیژی ئەدبیاتی زانکۆی سەلاحەدینی لە سالّی (٢٠٠٢) تەواو کردووە.
- ماستەری لە بواری جوگرافیای سیاسی لە زانکۆی سەلاحەدین لە سالّی (٢٠٠٧) بەدەستهێناوە.
- بەرهەمەکانی: (سیاسیەتی تەعریب لە شاری کەرکوك، شیکردنەوەیەکی جوگرافی-سیاسی)، سلێمانی، (٢٠٠٨).

*** حەیدەر ئاغای عەزیز ئاغا - مەحزوون:-**

- ناوی (حەیدەری کوڕی عەزیزی کوڕی خەسرەوی کوڕی محەمەد)ە
- محەمەدی براشی رەسولّ چەلّەوی باوکی فەقێ قادری هەمەوەندی شاعیرە.
- سالّی (١٨٨٨)ی زایینی لە شاری (سیرت)ی لیبیا، وەختی ئاوارە بوونی هەمەوەندەکان لەوێ لە دایك بووە، هێشتا تەمەنی زۆر مندالّ بووە لەگەلّ هۆزەکەیان گوازراوەتەوە بۆ (ئەزمیر)و پاشان بۆ (ئەدەنە).
- لە ئەدەنە خوێندنی سەرەتاییو ناوەندی تەواو کردووە، بەلّام لەبەر دەستکورتی بەردەوام نەبووە لە خوێندن.
- پاش ماوەیەك هەمەوەندەکان لە (ئەدەنە) هەلّهاتوونو گەراوەنەتەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان، کە حەیدەر ئاغاو خانەوادەکەشی لەناو ئەو هەلّاتووانە بوونو گەراونەتەوە بۆ گوندەکەی خۆیان لە (چەراغە رووتە)ی سەر بە چەمچەمالّ.
- ئەو چەند سالّەی کە لە (ئەدەنە) ژیاوە، بۆ حەیدەر ئاغا ژیانێکی زۆر کاریگەر بووە، کە کاریگەرییان لەسەر تەواوی ژیانی بەجێهێشتووەو وایان کردووە کە کەسایەتییەکی تەواو جیاوازی هەبێت لە چاو باوكو براو مامەکانی، کە ئەوان کەسایەتییەکی دەرەبەگانەیان هەبووە.
- حەیدەر ئاغا لە هەندێ شیعردا نازناوی (مەحزوون) بووە.
- سالّی (١٩٣٤) بە نەخۆشی مردووە و لە (چراغە رووتە) نێژراوە.
- حەیدەر ئاغا لە ماوەی ژیانیدا چەند بەرهەمێکی نووسیوەو ئامادەی کردووە، بەلّام بە داخەوە تاکو ئێستا زۆربەی زۆری ئەو بەرهەمانە هێشتا هەر دەسنووسنو لە چاپ نەدراون:-
- دەستنووسی کۆمەلّێك لە شیعرەکانی فەقێ قادری هەمەوەند.
- بەیانکردنی عەشیرەتی هەمەوەند - طائفەی بگزادە.
- دەست نووسی چامەیەکی شیعری (تەها مەحموود هەوەمەوەندی).
- داستانی حەرب شێخ مەحموودو کەریم بەگو سایر بەگ.
- گەلێك بەرهەمی شیعری جۆراو جۆری چاپکراوی هەیە کە تاکو ئێستاکە بە چاپ نەگەیەنراوە.

* (حەیدەر کەماڵ گۆزەچی):-

- ساڵی (١٩٦٥) لە خوورماتوو لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٦) پۆلی شەشی سەرەتایی تەواو کردووە.
- ساڵانی (١٩٨٣-١٩٨٧) بەشداری کردووە لە پێشانگاکانی بەغدای نێودەوڵەتی.
- ساڵانی (١٩٨٥-١٩٩٤) بەشداری پێشانگاکانی (دار التراث والفنون)ی کردووە.
- ساڵانی (١٩٩١)و (١٩٩٤) بەشداری پێشانگای مۆزەخانەی کەرکوکی کردووە.
- ساڵانی (١٩٩٢-١٩٩٣) بەشداری فێستیڤاڵی بابلی کردووە.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشداری فێستیڤاڵی بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی کەرکوکی کردووە.

* (حوسامەدین حەکیم محەمەد قادر):-

- ساڵی (١٩٥٥) لەدایکبووە.
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووەو لە ساڵی (١٩٧٦)دا دەستی بەکاری هونەری کردووە.
- ساڵی (١٩٧٠) بەشداری چالاکی قوتابخانەکانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی (بهو البلدية)، خەڵاتی یەکەمی بەدەستهێناوە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧١-١٩٧٣) بەشداری پیشانگای ساڵانەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدای کردووە.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پیشانگای مامۆستایانی هونەری کردووە لە هۆڵی چالاکییەکانی بەغدا.
- ساڵی (١٩٨٧) پیشانگای تایبەتی لە هۆڵی میدیا لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٨) بەشداری پیشانگای هونەرمەندانی کردووە لە هۆڵی میدیا لە هەولێر.
- ساڵی (١٩٨٩) بەشداری پیشانگای هونەرمەندانی سلێمانی کردووە لە هۆڵی مۆزە خانە.
- ساڵی (١٩٩٠) بەشداری پیشانگای هونەرمەندانی سلێمانی کردووە لە هۆڵی سوور کێو.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشداری پیشانگای هونەرمەندانی کوردی کردووە لە ئەڵمانیا.
- ساڵی (١٩٩٣) بەشداری پیشانگای هونەرمەندانی کوردی کردووە لە ئەمریکا.
- ساڵی (١٩٩٤) بەشداری پیشانگای شێوەکاری وشانۆی کردووە لە هۆڵی میدیا.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پیشانگای هەمیشەیی شێوەکاری کردووە لە گەلەری زاموا.
- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری پیشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی حەسیب ساڵح.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری پیشانگای پۆستەری کردووە لە هۆڵی حەسیب ساڵح.

* (حوسام کاکەیی):-

- ساڵی (١٩٦٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شێوەکارو فۆتۆگرافەر کارە، ئێستا لە هۆڵەندە دادەنیشێت.
- لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٠-٢٠٠٥) پێنج پێشانگای تایبەتی خۆی لە (هۆڵەندا) کردووەتەوە.
- هەروەها لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٠-٢٠٠٦) دوانزە پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەندان لە (هۆڵندا) کردووەتەوە.

* (حوسێن بەرزنجی):-

- ناوی تەواوی (حوسێن عەبدولکەریم حوسێن بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٩٢٠) لە شارۆچکەی قادرکەرەم لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵانی (١٩٤٩-١٩٥٠) کۆلیژی یاسای لە بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٥٠)ەوە کاری پارێزی کردووەو گەلێك یارمەتی هەژارانی داوە.
- هاوڕێو خەباتی ئەم بەریزانە بووە، (دڵدار، شێخ حوسێن خانەقا، شێخ مارف بەرزنجی، شێخ کاکە حەمەی خانەقا، شێخ فازڵی تاڵەبانی، شێخ حەمە ساڵحی کلێسە).
- شەهید هەندێك بابەتی بە پێزی لە بڵاوکراوەکانی سەردەمی خۆی بڵاوکردووەتەوەو بەشێك لە دەستنووسەکانیشی لە دوای بە جێهێشتووە:
- (دەست هەڵچنێك لەوتە بە نرخەکانی تۆماس جیفرسۆن سەرۆکی ئەمریکای ساڵی (١٨٠٠)، کە لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
- کورتە چیرۆکی (بەند کراوێك)، لە نووسینی تۆڵستۆی لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
- شانۆگەری (مام ڤانیا-لاڵە ڤانیان)، نووسینی چیخۆف لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە کوردی.
- هەروەها شەهید جگە لە زمانی کوردی زمانەکانی ئینگلیزیو عەرەبیو تورکیو فارسیشی زانییوە.

* (حوسێن باباجانی):-

- ساڵی ١٨٥١ زایینی لەدایکبووە.
- پزیشکی نەشتەرکاریو شاعیرو نووسەرو زانای زۆر زمانی بیانی وەکو فەرەنسیو ئەڵمانیو تورکیو فارسی بووە، لە شاری کەرکوك لە گەڕەکی ئاخور حوسێن لەدایکبووە لە خانوویەکدا تەلار ئاسای هەبوو، پێوانەی حەوشەکەی پتر لە دوو هەزار مەتربوو، باغێکی تەژی لە پرتەقاڵ و نارنجو سێوو هەرمێ و ترێو دارخوورمای تیا بوو، ئەکەوتە پشتی بازارەکەی ئاخور حوسێنەوە بەلای خۆرئاوایی بەرامبەر بە مزگەوتی (نائیب).
- (حوسێن باباجان) لە کەرکوك لەدایکبووە، بە منداڵی لە کەرکوك خوێندبووی، پاشان چووبووە کۆلیژی سوپاییو لە ئەستەمبوڵ پزیشکی خوێندبوو، لە ساڵی ١٨٨٤ لەو کۆلیژە دەرچووە باسێکی گرنگ و نایابی پێشکەش کۆلیژەکە دەکات کە بریتی بووە لە ٤٠٠ لاپەڕە نەشتەرکارێکی لێزانو کارامابوو، پاش چەندین ساڵ خزمەت گەڕابووەوە نیشتمانەکەی خۆی لەو ماڵە گەورەیەیدا کە دروستی کردبوو چەند ژوورێکی تەرخان کردبوو بۆ بینینی نەخۆشو بۆ هاتنو چوونی خەڵك.
- حکوومەتی عوسمانی زۆر بە خۆشحاڵییەوە بە پلەی (مقدم طبيب) دایدەمەزرێنن لە سوپای چواردا، ئەمیش زۆر دڵسۆز و پاك بووە لە کار و پیشەی خۆیدا، پاش ماوەیە دەبێتە پشکێنەر لە لیژنەی پزیشکی تەجنیدی شارەکانی کەرکوك،

هەولێر، سلێمانی، دیالە، مووسڵ، راپۆرتی پێشکەش کاربەدەستانی لەشکر و سوپای عوسمانی کردووە لەبارەی بەرگریکردن لە نەخۆشی بەمجۆرە سولتان عەبدولحەمیدا فرمانێکی بۆ دەردەکات کە بیێتە کلیل بەدەستی کەعبەی شەریف لە شاری مەککە، بەڵام خۆشی لێنایە و بیانووی دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی نەچێت، لەپای ئەوە سولتان دووری دەخاتەوە بۆ یەمەن دوو ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە، لەدواییدا پلەیەکی دەدەنێ و دەبێتە قائیماقامی سوپا، بەڵام لەدوای رۆیشتنی سولتان عەبدولحەمید خانەنشین دەکرێت.

– گەلێك هەڵبەستی جۆراوجۆری هەبووە، زۆربەی هەڵبەستەکانی کەوتوونەتە لای بنەماڵەی حەسەن بەگی جاف، چونکە لەپاش کۆچکردنی دکتۆر منداڵەکانی ئەو بیرۆکەیەیان نەبووە کە بیپارێزن، جگە لە شیعر و نامەی پزیشکییەکەی کتێبێکی بەنرخی هەبووە لەسەر مەلهەمەت فەلەکییات، کە پوختەی بیروباوەڕ و تاقیکردنەوە دەرمانکاری تیمارکردنی بووە کە بە شێوەیەکی زانستی و ئەدەبی دایرشتووە.

– دیوەخانێکی گەورەشی هەبوو بۆ هاودەمان ودۆستان وبرادەران، کە زۆرجار کۆڕی ئەدەبی تیا دەبەسترا، هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ شێخ رەزای تاڵەبانی هاورێ و هاودەم بوو، حوسێن ئەفەندی ژندۆست بوو چەند ژنێکی هەبوو.

– دکتۆر حوسێن باباجان بەسێ زمان شیعری باشی هەبوو، بەڵام وەکو دەردەکەوێت دیوانەکەی سووتاوە.

– دکتۆر حوسێن لە یەکێ لە ژنەکانی کوڕێکی هەبوو لە کۆلێژی پزیشکی خوێندبووی سەر ئەنجام شێت بوو.

– لە ژنێکی تری سێ کوڕی هەبوو وەکو نەبوبەکرو بەدیع، لە ژنەکەی تری کچی زۆر بوو، لە دوای مردنی ماڵە کەیان بەشکرد بەسەر خۆیاندا.

– ساڵی ١٩٢٤ لەسەر رێگای کەرکوك – سلێمانی کۆچی دوایی دەکات و لە گردی سەیوان دەنێژرێت.

– (لێکۆڵینەوە لەسەر ژیانی شێخ محێدین)، لەگەڵ عەبدولجەباری شۆڕیجەدا.

– دیوانێکی شیعری چاپ نەکراو.

*** ( حوسێن پاشا عوموجەزادە ):–**

– ساڵی (١٦٨٣) بووەتە والی کەرکوك بۆ ماوەی دوو ساڵ تا (١٦٨٥) لەدوای خۆی (حەسەن پاشا تۆباڵ ئۆغڵو) جێگەی گرتووەتەوە.

*** ( حوسێن جاف ):–**

– لە ساڵی (١٩٤٧) لە بەغدا لەدایکبووە.

– لە بنەڕەت دەگەڕێتەوە سەر خێزانی عەشیرەتی جاف

*** ( حوسێنی پەڵکانە – شێخ حوسێنی پەڵکانە ):–**

– (شێخ حوسێنی کوڕی شێخ عومەر کوڕی شێخ ساڵحی پەڵکانە)یە لە نەوەی شێخ محێدینە.

– ساڵی (١٩٥٤) لە دێی پەڵکانەی سەر بە ناوچەی قەرەحەسەن هاتووەتە دنیاوە.

– لە سەرەتادا خوێندنی (ئیسماعیل نامە)و (فتح القریب)ی لای باوکی تەواو کردووە لە دوایدا هاتووەتە کەرکوك لەلای مەلا باقری لەیلانی و مەلا رەحیم ساڵەیی و مەلا حەمید رۆژبەیانی مەلا ئەحمەدی کوردەو مەلا مەجیدی قوتب و مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، خوێندنی تەواو کردووەو بووەتە فەرمانبەر لە ئەوقافی کەرکوك.

– ئەندامی دەستەی دامەزرێنەرو بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك بووە لەنێوان ساڵانی (١٩٧٢–١٩٧٤).

– بێژەری ووتاری ئایینی بووە لە رادیۆی کوردی بەغدا بۆ ماوەی (١٩) ساڵ لەنێوان (١٩٨٣–٢٠٠٢).

– چەند بەرهەمێکی دەستنووسی هەیە لەوانە:–

– (مێژووی هەڵکەوتوانی شاری کەرکوك).

– (لێکۆڵینەوەو سەرنج لە دیوانی صابری).

(رۆغزایی) ناوچەی قەزای كفری.
- دەرچووی كۆلیژی پەروەردەی زانكۆی بەغدایە بەشی زمانی ئینگلیزی.
- نووسەرو وەرگێرە بەزمانەكانی كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی لە بەرهەمە چاپكراوەكان:
- (یاداشتەكانی مێجر نوئیل)، بەغدا ١٩٨٤.
- (نێرگسە جاری)، ١٩٨٥.
- (هۆزانی كورد)، بەرگی یەكەم، ١٩٨٦، بەرگی دووەم، ١٩٩١.
- (حكايات تراثية كردية)، ١٩٨٨.
- (رحلة المستر جيمس برانت)، ١٩٨٨.
- (عشائر اللور الكردية وشاعرها الفيلسوف بابا طاهر العريان)، ١٩٩٦.
- (مجموعة قصصية باللغة العربية بعنوان صخب الصمت)، ١٩٩٩.
- (هۆزەكانی كورد)، بەغدا ١٩٨٦.
- (هۆزەكانی كورد)، بەغدا ١٩٩٢.
- (لم اقل نعم)، كۆمەڵێك چیرۆك، ١٩٩٣.
- (بابا طاهر العريان، الشاعر الكردي المتصوف، حياته وآثاره الأدبية)، ١٩٩٨.
- (مذكرات ميجر نوئيل في كردستان العراق)، ١٩٩٩.
- (تأريخ الفيلية، مخطوط المرحوم عباس العزاوي)، ٢٠٠٣.
- (كوردو كوردستان)، كۆمەڵێك لە پسپۆران، و، هاوبەش، هەولێر، ٢٠٠٣.
- (بعد أصداء الوجع البعيد)، ٢٠٠٧.
- (العشائر الكردية)، وەرگێران، ٢٠٠٧.
- (كوردو كوردستان)، رۆژهەڵاتناس فرایزەر، و، هەولێر، (٢٠٠٨).

* (حوسێن حەسەن عەبدەلی - حوسك چاوەش):-

- ساڵی (١٨٨٥) لە عەلی سەرای لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٦٠) كۆچی دوایی كردووە.
- دەهۆڵ ژەنێكی لێهاتوو بوو، جگە لەوەش شارەزای ئامێری (تەنبوور) بووە.
- ناسراوە بە (حوسك چاوەش).

* حوسێن حەسەن بەگ ئۆغلو:-

- ساڵی ١٩٥٥ لە كەركوك لەدایكبووە.
- بەرهەمەكانی:-
- قرية يحياوة، ٢٠١١.

* (حوسێن خانەقا - شێخ حوسێن خانەقا):-

- ساڵی (١٩١٢) لە كەركوك لەدایكبووە.
- ناوی (شێخ كاكە حوسێن كوری سەید ئەحمەد خانەقا)یە.
- لە دوای مردنی باوكی كاروباری خێزانەكەی گرتووەتە ئەستۆ.
- لە پەنجاكان چەند جارێك بە نوێنەری كورد لە (مجلس النواب) هەڵبژێردراوە تا رووخاندنی پاشایەتی لە عێراق لە ساڵی (١٩٥٨).
- یەكێك بووە لە دامەزرێنەرانی حیزبی هیواو رزگاری.

- ساڵی (١٩٨٠) ئەندامی كۆری زانیاری كورد بووە لە بەغدا.
- ساڵی (١٩٨٤) لە بەغدا كۆچی دوایی كردووە.

* (حوسێن خانەقا - دكتۆر حوسێن خانەقا):-

- (شێخ حوسێن كوری شێخ حەسەن كوری عومەر كوری سەید حوسێن خانەقا)یە.
- ساڵی (١٩٤٣) لە كەركوك لەدایكبووە.
- بروانامەی دكتۆرای لە زیندەوەرزانی لە فەرەنسا تەواو كردووەو بووەتە مامۆستا لە زانكۆی بەغدا.
- ساڵی (٢٠٠٥)وە سەرۆكی زانكۆی كەركوكە بووە بۆ ماوەی چەند ساڵێك.

* حوسێن سوزلو:-

- ساڵی ١٩٤٣ لە كەركوك لەدایكبووە.
- بەرهەمەكانی:-
- معجم المؤلفين التركمان، بەرگی یەكەم، ٢٠١٣
- معجم المؤلفين التركمان، بەرگی دووەم، ٢٠١٥

* (حوسێن شەهباز حەسەن):-

- ساڵی (١٩٤٨) لە داقوق لەدایكبووە.
- لە بەرهەمەكانی:
- (كركوك ئاغزی)، ١٩٧٩.

* (حوسێن عەبدولقادر كەسنەزانی - مەلا حوسێن عەبدولقادر كەسنەزانی):-

- ساڵی (١٨٨٥) لە دێی (كربچنە) لەدایكبووە.
- قوتابخانەیەكی ئایینی كردووەتەوە بۆ خوێندنی زانستەكانی ئایین.

*** (حوسێن عەبدوڵلا قادر جاسم):-**

- ساڵی (١٩٦٨) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوک.

*** (حوسێن عەلی):-**

- هونەرمەند (حوسێن کوڕی عەلوان کوڕی مەحموودی زەند)ە.
- لە ناو خەڵکی بە (حوسێن عەلی)و (حوسێن عەلی گورجی) ناسراوە چونکە ناوی نەنکی-دایك باوکی (گورجی کچی نایف)ە.
- براپەك و دووخوشکی هەیە: (نووری، گومەزی، پێخ گوڵ).
- ساڵی (١٩٢٥)ی زایینیدا لە دێی خنجیلانەکەی (زەند مەلا یوسف) کە ناسراوە بە (حەوتەغاری دارا بەگ) (هەفتەغار) لە ناوچەی (داقوق)ی کەرکوك، لە ئامێزی هۆزی (داودە) ی خواروو لەدایکبووە.
- هەر لە منداڵییەوە گوێی بە سۆزی شمشاڵی شوانو دووزەلەو مەقامی ئەڵلاوەیسی وقەتارو خاوکەرو ئا..ئایو سەوزە. سەوزە زرینگاوەتەوەو کاری کردووەتە سەر هەست ونەستی.
- گۆرانی بەستەکانی لە هەرەتی لاوێتیدا لە هونەرمەندی بە توانا (جەبار تاخورما)ەوە بەدەس هێناوە.
- لە هونەرمەندان ماموستا عەلی و عەبدوڵلا سەعید کەرکوکی (عەبەی سەعە عەرەبەتی) لە رێگای قەوانەوە فێری مەقامە کوردییەکانی خۆمان بووە، ناوە.. ناوە هامشۆی مەقام بێژ (شوکر جەیرانی) کردووەو سوودی لێ بینیووە.
- بە حەقیقەت ئەگەر بێت و گوێ لە گۆرانیە پرشنگدارەکانی بگری دەبینین بە زەقی مۆرکی رەسەنایەتییان پێوە دیارە، لە نەغمەو مەقامە رەسەنە دێرینەکانی گەرمیاندا شارەزایی هەبووە وەکو (مەقامی ئەڵلاوەیسی، قەتار، خاوکەر، خاوخۆش، خورشیدی، ئای.. ئای، لە مەقامە رۆژهەلاتیەکانیشدا شارەزایی لە: (بەیات، حیجاز، نورفە، سەبا، حوسێنی، عوشاق) هەبووە.
- لە بواری هونەردا قوتابخانەیەکی تایبەتی بووە، خاوەن دەنگێکی بە سۆزی باریك وبەجۆش. هەست بزوێن ودل تەزێن بووە، بەئاوو هەواو سروشتی دەشتی گەرمیانی رەنگین پەروەردە بووە.
- ساڵی (١٩٤٨)ی زایینی چەند هاورێیەکی هونەر دۆست لە قەومو قیلەی خۆی لە ئاوایی (حەوتەغار) دا پاڵ پشتیان کردووە تا برواتە ئێسگەی کوردی بەغداو لەوێ گۆرانی بلێت بەلام باوکی بە توندی بەرپەرچی دەداتەوە.
- ساڵی (١٩٧٤)ی زایینی سەر لە بەغدا دەدات و دەچێت بۆ تۆمارکردنی گۆرانییەکانی لە تەلەفزیۆنی کوردی بەغدا.
- هەر لە شەستەکانی سەدەی رابردووەوە تووشی نەخۆشی (شەکرە) دێ وبەردەوام بە ئازارێوە دەینا ڵاند..
- ساڵی (١٩٨١) لە (شۆریجە)ی بەغدا ئۆتۆمبیلێك لێ دەداو قاچێکی دەشکێنێ ئەمەش زۆر ئازاری دەدا، چونکە نەخۆشیەکەی هۆی ئەوە بووە قاچی درەنگ بگیرسێتەوە چاك بێتەوە.
- نەخۆشی شەکرە لە ساڵی (١٩٨٥)دا لە چاوەکانی داو وورده.. وورده کاری تێکردن و کزبوون تا لە ساڵی (١٩٩٠) بە تەواوەتی لە بینین کەوتن، ئەمە سەرباری نەخۆشی گورچیلەو دلە کوتێ کە تەنگیان پێ هەڵچنی بوو.
- لە رووی ئابووریشەوە مرۆڤێکی دەستکورت بوو، بە ژیانی کولەمەرگی دەژیا، بۆ بژێوی ژیان جارێ جوتیاری و جارێ کرێکاری دەکرد، شوفێری ئەمو ئەو بوو.
- لە رێکەوتی (١٨)ی تەمموزی ساڵی (١٩٩١) لە شاری بەغدا گیانی بەخوای گەورە سپارد لە گۆرستانی (شێخ مەعروف) لە هەمان شاردا نێژرا.

*** حوسێن عەزیز سێودین:-**

- دەرهێنەری سینەمایی ناسراو، کە ئێستا لە هەولێر نیشتەجێیە.
- ساڵی (١٩٨٠)وە لە ئەڵقە رۆشنبیرییەکاندا رێکخراو بووە.
- ساڵی (١٩٨١)دا بەهۆی جەنگی عێراق - ئێران و بەهۆی ئائەمنی ژیانی چووە دەرەوە بۆ ئێران و لەوێشەوە بۆ هۆڵەندا کۆچی کرد.

*** حوسێن عەلی رۆبیتان:-**

- ساڵی ١٩٦١ لە کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٠ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٦١.
- ساڵی ١٩٩٢ خانەنشین کراوە.

*** (حوسێن عەلی داقوقی):-**

- ساڵی (١٩٢٢) لە داقوق لەدایکبووە.
- دکتۆرای لە ئەدەب هەیەو یەکێکە لە نووسەرەکانی کەرکوك.
- لە بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مبادئ علم الاجتماع)، چاپخانەی (دار الکشاف)، بەیروت، ١٩٥٦.
- (مشروع الخطة لمکافحة الأمیة في الجمهوریة العراقیة)،

بەیروت، ١٩٦٥.
- (تقرير عن منهج الدراسة الابتدائية في العراق)، ١٩٦٥.
- (تقرير عن التفتيش الابتدائي والثانوي)، بەغدا، ١٩٦٩.
- (دولة البلغار المسلمين في الغولغات)، مێژوو، عەممان، ١٩٩٩.
- (دراسات في الحضارة الإسلامية)، مێژوو، بەغدا، ٢٠٠٢.
- (الفكر العربي في آسيا الصغرى).

*** ( حوسێن عەلی ڕەشید-حوسێن ئەلرەسام ):-**

- دەرچووی هونەرە جوانەکانی بەغدایە (١٩٧٩-١٩٨٠).
- سەرقالی نیگار کێشانو پەیکەر تاشینەو دانیشتوی کەرکوکە.

*** ( حوسێن غولام - مەلا حوسێن مەلا غولام ):-**

- ساڵی (١٩١٢) لە دێی تۆپزاوە لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٥) کۆچی دوایی کردووە.
- ئەم هونەرمەندە میللیە گەلێ دەنگی خۆش ولەبار بووە.
- خوێندەوارییەکی چاکی هەبووەو لە ئامرازی تەمبوورو ژەنیشدا بەچاکی شارەزایی هەبووەو لە دیوەخانو کۆڕە تایبەتیەکاندا بەدەم تەمبوورو ژەنینەوە مەقامی ئەللاویسی وقەتارو خاوکەرو خورشیدی خوێندووە، گەلێ حەزی لە خوێندنەوەی شانامەو داستانە کوردییەکان بووە.

*** ( حوسێن کەرکوکی - مەلا حوسێن کەرکوکی ):-**

- (مەلا حوسێن کوری زەکی کوری حەسەن کەرکوکی)یە.
- بەپێی هەندێك لە دەستنووسەکانی کەرکوك لە (دار المخطوطات)دا ناوی هاتووە، بەلام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

*** ( حوسێن میسری ):-**

- ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.

- هەر لە حەفتاکانەوە لە بواری هونەریدا کار دەکات.
- ساڵی (١٩٩٩)ەوە دەستی کردووە بە دەرهێنانی چەند درامایەك لەوانە (خۆرنەوازان)، (تابلۆی یەکی شوبات)، (هارون ئەلرەشید)، (رەشەی پۆلیس)، (حەسەنە فەنی)، (گولە بێ رۆژەکان)، (وەستا جومعە)، (نیشتیمان).
- ئامادەی درامای (ڕەزاو ڕەمەزان) بوو بەلام سەد مەخابن تەواوی نەکرد.
- لە (٣١)ی ئاياری ساڵی (٢٠٠٩) کۆچی دوایی کرد.

*** ( حیکمت جەواد ئەحمەد - جوانە کاکەیی ):-**

- ساڵی (١٩٦٠) لە دێی عەلی سەرای لەدایکبووە لە قەزای داقوق.
- ناسراوە بە (جوانە کاکەیی).
- خوشکی هونەرمەند (گرفتار کاکەیی)ە.
- کۆمەڵێك شیعری مندالانی هەیە.

*** حیلمی:-**

- یەکێکە لەو شاعیرانەی کەرکوك کە زانیاریمان نییە دەربارەی، بەلام دەڵێن دەستنووسی شیعرەکانی لەلای دکتۆر ئیبراهیم شوانییە.

*** حەمە سوور دووشیوانی:-**

- ئەندامی ئەنجوومەنی پەرلەمانی عێراقە لەسەر لیستی کەرکوك لە هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠١٣ -٢٠١٧

حەبسە خانی نەقیب لە ماڵی مەلا قادری ئیمام لە ئیمام قاسم

شێخ حەمەدئەمین مەلا سەعید زەنكی

حەمید فەتحوڵلا مستەفا بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگای كەركوك لە ساڵی ١٩٤٩

حەمزە عەبدوڵلا

شێخ حوسامەددین قادری

*** حەسیب سالح:-**

– حەسیب سالح لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٠ لە کەرکوك لەدایکبووە.

– قۆناغەکانی خوێندنی لە کەرکوك و بەغدا تەواو کردووە.

– ساڵی ١٩٥٤ کۆلێژی شارستانی ئەندازیاری زانکۆی بەغدای بە پلەی یەکەم تەواو کردووە، بۆیە لەلایەن فەیسەڵی دووەمەوە خەڵاتی ڕێزلێنانی پێ بەخشراوە.

– بۆ ماوەیەکی کەم وەك ئەندازیار لە فەرمانگە ئاوی بەغدا دامەزراوە و دواتر وازی هێناوە و خەریکی کاری ئازاد و بەڵێندەرایەتی بووە و کۆمپانیای بە ناوی خۆیەوە دامەزراندووە.

– چەندین پرۆژەی گەورەی تەلارسازی ئاوەدانی جێبەجێ کردووە لەوانە:-

– مۆنۆمێنتی ئازادی لە گۆڕەپانی تەحریر لە بەغدا، کە کارێکی تەلارسازی و هونەری پەیکەرتاشی هونەرمەندی گەورە جەواد سەلیمی لەسەر نەخشێنراوە.

– تەلاری بانکی ڕافیدەین و وەزارەتی تەندروستی و کۆمپانیای دڵنیایی و چەندان پرۆژەی تر لە عێراق و کوردستان.

– بایەخی زۆری بە کاری کولتوری داوە و تەلاری کتێبخانەی گشتی نیشتمانی و هۆڵەکانی وانە وتنەوە لە شاری بەغدا بەرهەمی کاری ئەون.

– لەسەر ئەرك و بودجەی خۆی یانەی ڕۆشنبیری زانکۆ و کتێبخانەی زانکۆی سلێمانی لە ساڵی ١٩٧٩ دا دروستکردووە.

– حەسیب سالح لە دامەزرێنەرانی یەکێتی بەڵێندەرانی عێراق بووە و لە کۆتایی هەشتاکاندا سەرۆکی ئەو یەکێتییە بووە.

– حەسیب سالح هەر لە قۆناغی ئامادەییەوە خولیای پیشەیی هەبووە و لە ڕێکخراوی خوێندکاران کاری کردووە و هەڵگری بیری چەپ و پێشکەوتنخواز بووە.

– ساڵی ١٩٤٨ نوێنەری هەڵبژێردراوی خوێندکارانی شاری کەرکوك بووە بۆ کۆنگرەی خوێندکارانی عێراق لە گۆڕەپانی (السباع) لە بەغدا، کە یەکەم کۆنگرەی خوێندکاران بووە لە مێژووی عێراقدا، هەر لەو کۆنگرەیەدا بەڕێز مام جەلال وەك نوێنەری خوێندکارانی کۆیە بەشدار بووە، هەروەها شاعیری گەورەی عەرەب محەمەد مەهدی ئەلجەواهیریش ئامادە بووە.

– لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا بەوپەڕی ئازایەتی و چاونەترسییەوە بەرگری لە مافەکانی گەلی کورد کردووە.

– لە ناوەڕاستی ساڵانی نەوەدەکاندا، لەسەر داوای سەدام حوسێن، سەعدی مەهدی سالح ئەندامی مەجلیسی قیادەی سەورە لەگەڵ ژمارەیەك لە کەسایەتییە کوردەکانی شاری بەغدا کۆبووەوە لەو کۆبوونەوەیەدا سەعدی مەهدی سالح باسی ئەوەی کرد کە گوندەکانی سەر بە قەزای چەمچەماڵ بخرێنە سەر پارێزگای کەرکوك و لەسەر ئیدارەی حکومەتی هەرێم نەمێنن، حەسیب سالح لەو کۆبوونەوەیەدا وتی: من خزمم لەو ناوچانە هەیە و پێیان باشە کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بمێننەوە، چونکە مامەڵیان لەگەڵیاندا خراپ بووە.

– هەروەها هەر لەو کۆبوونەوەیەدا پێشنیاری ئەوە کرا، حیزبی کوردی لایەنگری بەغدا دامەزرێندرێ، هەر لەوێ ڕەتی کردەوە و وتی ئەوە ئەزموونێکی شکست خواردووە و پێویستە لەگەڵ حیزبەکانی کوردستان گفتوگۆ بکرێ و ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێ.

– لە ١٨ی شوباتی ٢٠١٢ لە شاری عەممان، پایتەختی ئوردن کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ شاری کەرکوك و لەوێ بە خاك سپێردرا.

*** حەبیب تاڵەبانی - شێخ حەبیب تاڵەبانی:-**

– ساڵی ١٩١٦ لە گوندی سیامەنسووری ناحیەی قەرە حەسەن لەدایکبووە.

– شێخ حەبیب کوڕی شێخ قادر کوڕی شێخ وەهاب سیامەنسوورییە ناسراوە بە شێخ قادری سیامەنسوور.

– باوکی لە ساڵی ١٩٢٧ دەبێتە نائیب پەرلەمانی عێراق لە خولی حەوتەمدا، هەروەها ئەندامی حیزبی هیوا بووە.

– لە ١ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٤ کۆچی دوایی کردووە.

*** حەبیب مستەفا:-**

- ساڵی ١٩١٣ لە کەرکوك لەدایکبووە و ناوەندی و سەرەتایی لە کەرکوك تەواو کردووە و دواناوەندی لە بەغدا.
- دەچێتە کۆلێژی سەربازی شاهانە لە خولی هاوکاران.
- لە خولی (معاون الشرطة) وەردەگیرێت و لە ساڵی ١٩٣٨ بە پلەی مولازم دەردەچێت.
- بەشداری خولی معاون الشرطة دەکات لە کۆلێژی عالیە و دوای دەرچوونی دەبێتە معاونی پۆلیسی و هەر لە ساڵی ١٩٤١ەوە لە لیوای کەرکوك داقووق کار دەکات.
- زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی زانیوە.

حاكم موعتەسەم

*** حەسەن ئایش:-**

- لە شارۆچکەی قادر کەرەم لەدایکبووە، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە دەستی داوەتە ئاواز و فۆلکلۆری کوردی لە بواری قەتار و ئای ئای و ئەلاوەیسی.

مەلا حەسەن ڕەبیع تەرفاوی

مەلا حەسوون گولە مەن

شێخ حوسامەددین قادری

حەمە سەعید بەگی جاف

مەلا حەمە نەجیبی بەرلووت

حوسێن یونس سابونچی

قوتابیانی پۆلی شەشی سەرەتایی ساڵی ۱۹٦۲ سەباح بازرگان و حەسیب ڕۆژبەیانی و کاکە رەش و حەمە کەریم عارف و سەیفەددین نوری فەتاح و ئەسوەد محەمەد و مەحمود محەمەد خەلیفە

کۆتایی ساڵانی سییەکان حیکمەت ئەمین و جەلال سائیب و سالح بۆلشەویك

شێخ حوسێن عەبدولقادر کەسنەزانی

* ( خاچیك گرابیت ئاید نجیان ):-

- ساڵی (١٩٣٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بە رەگەز ئەرمەنییەو لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (الحسرة الافيونية)، چاپخانەی (الازهر)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (الريح والأوراق، فلسفة الحياة)، بەرگی یەکەم، کەرکوك، ١٩٦٢.

* ( خاکی- محەمەد حوسێن ئەحمەد ):-

- لە هەندێك سەرچاوە بە محەمەدو لە هەندێکی تر بە حوسێن بەناوبانگە بۆیە بە محەمەد حوسێن بەناوبانگە.
- نازناوی شیعری (خاکی) بووە.
- لە گەرەکی (موسەڵلا) لەدایکبووەو ژیاوە.
- وا پێ دەچێت لە ساڵی (١٨٥٨)ی زایینیی کۆچی دوایی کردبێت.

* ( خالید باشبلاخی ):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی شاعیر:
- (تاسەو چاوەروانی)، بەغدا، ١٩٨٩.
- (کوردستان وڵاتی منە)، سلێمانی، ١٩٩١.
- (چاوەکانت پەرستگامن)، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٩٢.
- (چاوەکانت پەرستگامن)، بەشی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (مۆبایلە شیعر)، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (ئاوێنەی عەشقێکی خاوێن)، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (ژنێك لێوان لێو لە ئەوین)، شیعر، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (مۆبایلە شیعر)، بەرگی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٦.

* ( خالید رەباتی - مەلا خالید رەباتی ):-

- ناوی (مەلا خالید کوری مەلا محەمەد کوری مەلا مستەفا کوری محەمەد)ە، نازناوی شیعری (غالی) بووە.
- لە (١)ی تەمموزی ساڵی (١٩١٢) لە گوندی (رەبات) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٣) خوێندنی زانستی ئایینی لەلای مەلا مەحموودی بەرلووتیو مەلا قادری سۆفی تەواو کردووە.
- پێدەچێت شاعیر بووبێت، بەڵام تاوەکو ئێستاکە یەك پارچە شیعری بە نازناوی مەلا (غالی) دۆزراوەتەوە.
- لە (١١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٦) لە کەلار کۆچی دوایی کردووە.
- دەستنووسی وتارەکانی لەلایەن بنەماڵەکەیەوە لە دووتوێی کتێبێکدا لە ساڵی (٢٠١٠) بە چاپگەیانراوە.

* ( خالید رەزا ):-

- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك.
- بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی کتێبخانەی ئامادەیی کوردستان لەگەڵ ئاری بابان.

* ( خالید ستار ):-

- ساڵی (١٩٥٤)دا لەشاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ماوەیەك فەرمانبەر بووە لە سەرۆکایەتی تەندروستی سلێمانی.
- بەشداری پێشانگای پێنجەمی هونەرمەندانی سلێمانی کردووە لە ساڵی (١٩٧٩)دا.

- ساڵی (١٩٨٣) بەشداری یەکەمین پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.

* ( خالید شوانی ):-

- ناوی تەواوی خالید سەلام سەعید شوانی.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٧٥)ی شاری کەرکوك. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٩٤) لە کۆلێژی یاساو سیاسەتی زانکۆی لە بەغدا وەرگیراوە.
- ساڵی (١٩٩٩) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٩٣) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردووە.
- ساڵی (٢٠٠١) لە سلێمانی بەکارمەند لەوەزارەتی دارایی ئیدارەی سلێمانیی حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزراوە.
- ساڵی (٢٠٠٣) لە بواری ڕێکخستندا پلەی ئەندامی کۆمیتەی وەرگرتووە. پاش ڕووخانی ڕژێمی بەعس، لە مەڵبەندی ٢ی ڕێکخستنی کەرکوك لێپرسراوەتیی ڕێکخستنی مافپەروەران و پارێزەرانی پێ سپێردراوە.
- ساڵی (٢٠٠٦) بە ئەندامی خولی یەکەمی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق هەڵبژێردرا.
- ساڵی (٢٠٠٨) لەپاڵ ئەوەی کە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق بووە. کراوەتە ئەندامی ئۆفیسی پەیوەندییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە بەغدا.
- ساڵی (٢٠١٠) لە خولی دووەمی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق بە ئەندام هەڵبژێردرایەوە.
- لە ژیانی پەرلەمانیی لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق چەند لێپرسراوەتییەکی گرنگی وەرگرتووە وەك سەرۆکایەتیی لیژنەی یاسایی، ئەندامەتیی لیژنەی چاودێریی جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠)و هەروەها سەرپەرشتیاری کەیسی دادگایی کردنی لێپرسراوانی ڕژێمی بەعس بووە لە مەسەلەی تاوانەکانی جینۆسایدو پاکتاوی ڕەگەزیدا. هەر ئەو ساڵە ئەندامی لیژنەی باڵای دانووستان بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان کە بەچاودێریی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەغدا بەڕێوە چووە.
- لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە ساڵی (٢٠١٠) لە سلێمانی بەسترا، بەئەندامی ئەنجوومەنی سەکردایەتی هەڵبژێردرا.
- ماوەیەك ڕاوێژکاری سەرۆکۆماری عێراق بووە.

* ( خالید عەبدل ):-

- لە (١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٦٠) لە گەڕەی (ڕێویە)ی ئیمام قاسمی کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە سەرەتاییەوە خولیای خوێندنەوە بووە.
- خانەی مامۆستایانی سلێمانی خوێندووە.
- لە دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکانی (برایەتی، خەبات، جەماوەر، باسەرە) کاری کردووە.
- لە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکانی (ئاسۆیی پەروەردەیی، نەوشەفەق) کاری کردووە.
- سەرنووسەری ڕۆژنامەی (سەکۆی مامۆستا)و (هەژیان) بووە.
- لە ڕادیۆی (دەنگی کوردستان) وەك هەواڵسازو پێشکەشکاری بەرنامە کاری کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (پەنجاو سێ کورتیلە چیرۆك)، ٢٠١٣.
- (خۆشترین وەرز).
- ١٧ چیرۆك بۆ منداڵان)، ٢٠١٣.

* ( خالید کاکی ):-

- ساڵی (١٩٧١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ناوی (خالید محەمەد حوسێن)ە.
- سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٩٣) کۆلێژی زمانی لە زانکۆی بەغدا بە پلەی نایاب تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٩٤)ەوە عێراقی بەجێهێشتووەو لە پایتەختی ئیسپانیا جێگیر بووەو ماجستێری لە بواری ئەدەبی ئیسپانی بەدەستهێناوەو ئێستا خەریکی ئامادەکردنی دکتۆرایە لە زانکۆی (ئۆتۆنۆما).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (بلا حذر)، ١٩٩٨.
- (هوامش الحارس)، ٢٠٠١.
- (اقناص في الطائر)، ٢٠٠٥.

- (مهد المرایا المتقابلة)، ٢٠٠٥.
- له بواری مۆسیقاو شێوەکاریدا جێ پەنجەی دیارە.

* (خالید مەجید فەتحوڵلا شوانی):-

- ناوی (خالید عەبدولمەجید فەتحوڵلا)یە.
- ساڵی (١٩٦٠) لە شاری کەرکوك لە گەرەکی تەپەی مەلا عەبدوڵلا کەیەکێکە لە گەرەکە دێرینەکانی ئەم شارە، چاوی

بەدنیا هەڵهێناوە.
- ساڵی (١٩٨٣) بەکالۆریۆسی لە زانکۆی بەغدا کۆلیژی ئاداب بەشی جوگرافیا وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٧٥)ەوە دەستی داوەتە نووسین و یەکەم نامیلکە شیعری لە ساڵی (١٩٧٨) لەژێر ناوی (خونچەکانی گەرووی تەپە)ەوە بەچاپ گەیاندووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (هەوارگەی سێ دەنگ)، کۆمەڵە چیرۆك، هاوبەش، ٢٠٠٠.
- (پرسیارە نەزۆکەکان)، کۆمەڵە چیرۆك، هاوبەش، ٢٠٠٠.
- (کشانەوەی مەرگ)، پەخشانە شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٠.
- (گورگ)، کۆمەڵە چیرۆکی وەرگێردراو، هاوبەش کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (شوێنەواری خوێنەکەت لەسەر بەفرەکەدایە)، کۆمەڵە چیرۆکی وەرگێردراو، بە هاوبەشی لەگەڵ عەلی بەرزنجی، ٢٠٠٧.
- (دراسات في جغرافية السكان)، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧.
- ئەو بەرهەمەنانە ئامادەن بۆ چاپ:-
- (جوگرافیای ئابووری هەرێمی کوردستان).
- (جوگرافیای دانیشتوان).

* خالید گەرمیانی:-

- ناوی تەواوی (جەمال کەریم محەمەد)ە.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٥)ی گوندی کوردەمیری حاجی حوسێنی ناوچەی پێباز لە گەرمیان.
- ساڵی (١٩٧٤) ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوو بەڵام دواتر وازی لەو حیزبە هێناوەو هیچ پەیوەندییەکی پێوە نەماوە.

- ساڵی (١٩٧٧)دا پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە كردووەو لە سنووری هەرێمی ٥ی قەرەداغ لە مەفرەزەكەی سیروان تاڵەبانیی فەرماندەی هەرێمەكە بووەتە پێشمەرگە.
- بەهۆی لێهاتوییەوە لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا زوو گەشەی كرد. هەر ئەو ساڵە كرایە فەرماندەی مەفرەزەو نێردرایە ناوچەی گەرمیان. لەو كاتەدا گەرمیان تەنها یەك مەفرەزەی پێشمەرگەی لێ بووە.
- لەوێ لە ماوەیەكی كەمدا پەرەی بەچالاكییەكی پێشمەرگە داو ئەركەكانی پێشمەرگایەتی و ڕێكخستنی پێكەوە گرتە ئەستۆ. لە سۆنگەی باش ڕایی كردنی كاروبارەوە، ژمارەی پێشمەرگەكانی گەرمیان زیادی كردو چەندین شانەی ڕێكخستن لە گوندو شارۆچكەكان دروست كران. ساڵی دواتر كەرتی ٥ی دووز پێكهێنراو گەرمیانی كرایە فەرماندەی كەرتەكە.
- یەكێ لە بەناوبانگترین چالاكییەكانی كەدەنگدانەوەیەكی زۆری لە ناوچەكەدا هەبووە، بەدیل گرتنی كوڕی قایمقامی كفرییە.
- ساڵی (١٩٨٠) دەزگا ئەمنییەكانی كفری دوو كادیری ڕێكخستنیان بەناوی عوسمان خەلیفە عەلیو سیروان ڕەشید دەستگیر كرد، لەبەرامبەردا، گەرمیانی لە بۆسەیەكدا كوڕی قایمقامی كفریی بەدیل گرتو بە دوو كادیرەكەی ڕێكخستنی گۆڕییەوە.
- لە كۆتایی ساڵی (١٩٨٠)دا بڕیارە درا بگوازرێتەوە بۆ كەرتی جەباری. لە كاتێكدا خۆی ئامادە كردبوو بچێ بۆ ناوچەی جەباری، لە ٨ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٨٠) دا لە كاتێكدا كە لە گوندی كەسنەزانەوە بەرەو گوندی قازانقایەی قەرەداغ بەرێ كەوتبوو، كەوتە بۆسەی هێزێكی گەورەی سوپای عێراقەوەو پاش بەرگرییەكی سەخت لەو بۆسەیە شەهید كرا. تەرمی لە گوندی تەنگیسەر بەتەنیشت گۆڕی شاسوار جەلالەوە بەخاك سپێردرا.

* (خالید محەمەد ڕەمەزان):-

- ساڵی (١٩٤٥) لە گەڕەكی موسەڵڵا لەدایكبووە.
- پەیمانگای هونەرە جوانەكانی لە بەغدا لەنێوان ساڵانی (١٩٦٤-١٩٦٥) بەشی هونەری شێوەكاری تەواو كردووە.
- بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی كردووە لە یانەی مامۆستایان لە (١-٧)ی حوزەیرانی ساڵ (١٩٧٣).
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای ساڵانەی هونەرمەندانی كەركوكی كردووە لە هۆڵی (ئەلتەئمیم بۆ هونەری نوێ).

* (خەبات بزێنی):

- لە (١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٣) لە گوندی (قەرەناو) لەدایكبووە.
- هەر بە زووی دووای فەرهوود كردنی ماڵو دێیەكەیان لەلایەن حەرەس قەومییەكان، چوونەتە شاری كەركوكو لە گەڕەكی ئازادی گیرساوەتەوەو تەمەنی مێرد مناڵی بەسەر بردووە.
- هەر لە كەركووك خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیو ئامادەیی تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٨٠)، بە نیازی خوێندن چووەتە ئیتاڵیا. بەهۆی ڕاوەستانو بەرەنگار بوونەوەو نارەزایی دەربڕین، سەبارەت بە چەوسانەوە قەتڵو عامی گەلی كورد، تووشی نەگەڕانەوەی زیاد لە ٣٠ ساڵ بووە.
- بە درێژایی ئەم ساڵانە لە پاڵ خوێندنی زانكۆ خەریكی چالاكی سیاسی، كوولتووریو ئەدەبی بووە، بەشداری كۆڕو سێمینارو شەوانی شیعری كردووە.
- بەرهەمەكانی لە گۆڤارو ڕۆژنامە ئیتاڵیو ئەورووپییەكان بڵاوكراونەتەوە.
- پەرتووكێكی شیعریشی بە ناوی (زەماوەندی كچە پێریو كوڕە شوان) لە ستۆكهۆلم - سوید بڵاوكردووەتەوە.
- ئامیلكە شیعرێك، بە زمانی ئیتالی، بە ناوی (كەندێلە - مۆم) بە چاپ گەیاندوە.
- ساڵی (٢٠١٣) لەسەر سایتی (ئەماتزۆن) بەرهەمێكی شیعری بە ناوی (نێل سیلێنسیۆ دێل دێسێرتۆ - لە ناو بێ دەنگی سەحرادا)، بە زمانی ئیتالی، بۆ ماوەی سێ مانگ بە خوێنەرانی ١٨ وڵاتی جیهان، وەك شاعیرێكی كورد لە ئیتالیا، ناساند.
- جگە لەوەی زۆر چاوپێكەوتنی تەلەفزیۆن، ڕادیۆو ڕۆژنامەوانی ئەنجامداوەو هەندێ جار خەڵاتیش كراوە.

* ( خەتا پۆش ):-

- ناوی (محەمەد خورشیدی کوڕی محەمەد باقری)یە، سەرۆك هۆزی داودەیە.
- ساڵی (١٨٧٦) لەدایکبووە، نازناوی شیعری (خەتا پۆش) بووە.
- لە ئاوایی (دوڕاجی) ژیاوەو سەرۆکایەتی هۆزەکەی کردووە.
- پیاوێکی ڕۆشنبیرو نیشتمانپەروەر بووە، ملی بۆ فەرمانی دەسەڵاتدارانی عوسمانی نەداوە، بۆیە زۆر جار بە هێزەوە لەشکریان کردووەتە سەر بەڵام عوسمانییەکان بەشکاوی گەڕاونەتەوە تا دواجار بە چەکی قورس لێیان داوەو قەڵاکەیان ڕووخاندووە، بۆیە بە ناچاری جێگاکانی بەجێهێشتووەو چووەتە ناوچەی خانەقی لای ئاغاکانی (باجەلان) ماوەیەکیش دەچێتە بناری (بەمۆ).
- ساڵی (١٩٢٥) کۆچی دوایی دەکات.

* ( خەتاب عومەر بەکر - دکتۆر خەتاب عومەر بەکر ):-

- ساڵی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:
- (البيتوشي: حياته وآثاره) ١٩٨٤.

* ( خەدیجە میرزا مەحموود ):-

- یەکێکە لە ئافرەتە شاعیرەکانی کەرکوك کە بە ناو (خەدیجە خان سابلاغی) بە ناوبانگ بووەو هەر لە کەرکوك ژیاوە،
- ساڵی (١٩٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

* ( خەزعەل ئەلماجدی - دکتۆر خەزعەل ئەلماجدی ):-

- ساڵی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:
- (يقظة دلمون)، ١٩٨٠.
- (اناشيد إسرافيل)، ١٩٨٤.
- (خزائيل)، ١٩٨٩.
- (الدين المصري)، ١٩٨٩.
- (سفر سومر، الاساطير السومرية في كتاب واحد)، ١٩٩٠.
- (المدن السومري)، ١٩٩٨.
- (المعتقدات الارامية)، ٢٠٠٠.
- (الطب وعلاقته بالطب والاسطورة والدين في تراث وادي الرافدين).

* ( خەسرەو جاف ):-

- (خەسرەو محەمەد سەعید محەمەدی جاف)ە، لە ساڵی (١٩٤٥) لە کەلار لەدایکبووە.
- ئەندازیاری بنیاسازی لە ئێران تەواو کردووە.
- شاعیرو نووسەرو ڕۆماننووسێکی بەناوبانگەو گەلێك ڕۆمان و چیرۆکی بەپێزی خستۆتە کتێبخانەی کوردیەوە:-
- (دائیرەت ولمعارفی هونەرو زانیاری)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٨.
- (ئەندێشەکانی مورسی میترلنگ)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (کۆردەرە-الوادی)، ڕۆمان، بەغدا، ١٩٨٩.
- (هیچ-لا شی)، ڕۆمان، بەغدا، ١٩٩١.

- (دەڵە دێوەکەی سوڵتان)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٩٢.
- (پاشایان کوشت)، ڕۆمان، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٩٤.
- (گەماڵ)، ڕۆمان، بەغدا، ١٩٩٥.
- (ران)، ڕۆمان، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٩٥.
- (قەڵای جانەوەران)، وەرگێڕان، بەغدا،١٩٩٦.
- (مرۆڤ لە ڕێڕەوی پێگەیشتنی دا). وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٩٦.
- (بەفری گڕ گرتوو)، شیعر، بەغدا، ١٩٩٦.
- (ورێنە کورتە ڕووداو)، بەغدا، ١٩٩٨.
- (پرسە)، بەغدا، ١٩٩٩.
- (ئاوێنەی ئاوان)، شیعر، بەغدا، ١٩٩٩.
- (همسة الامس)، ١٩٩٩.
- (کوردو خەیام نەناسی)، هەولێر، ٢٠٠٤.
- (موسوعة اعلام الكرد المصورة)، پێنج بەرگ، (٢٠٠٤-٢٠٠٥).
- (دەریار)، ڕۆمان، هەشت بەش، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (فەرهەنگی زانیاری)، دە بەرگ.
- (لێدوان دەربارەی دە ڕۆمانی جیهان)، سومەرست مام، وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٧.

* ( خەسرەو سالْح ):-

- یەکێکە لە مەقام زانەکانی کەرکوك.
- بەڵام زانیاریمان دەربارەی نییە و شتێکی ئەوتۆ دەربارەی چالاکییەکانی باس نەکراوە.

* ( خەڵەف شەوقی ئەمین ئەفەندی داودی ):-

- ئەم رووناکبیرو رۆژنامە نووسەی کورد لە ساڵی (١٨٩٨) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، سەرەتای خوێندنی لە قوتابخانە تورکییەکان و بەزمانی تورکی دەستپێکردووە.
- لە گۆڤارو رۆژنامەکانی وەك: (الاوقاف العراقية، شط العرب، الاوقاف البصرية، لغة العرب، خدمة الوطن وكرخ)دا بەبەردەوامی نووسینی تیایاندا بڵاوکردووەتەوە، بەشداری لە گۆڤارەکانی گاڵتەو گەپ کردووە، وەکو (حبزبوز، كناس الشوارع، قرندل، الوادي)، سەرەرای بەشداریکردن لە هەدوو گۆڤاری کوردی (ژیان، ژین).
- هاوکات یەکێك بوو لە نووسەرو وەرگێرە چالاکەکانی گۆڤاری (دیاری کوردستان) کە لەنێوان ساڵانی (١٩٢٥-١٩٢٦)دا (سالح زەکی ساحێبقران) (١٨٨٦-١٩٤٤) بەزمانی کوردی، عەرەبی وتورکی بڵاوی کردووەتەوە.
- لە ناوەراستی بیستەکانی سەدەی بیستەمی رابردووشدا ماوەیەك بووە بە پشکنەری دارایی کوردستان.
- یەکێکیش بووە لە دامەزرێنەرانی رادیۆی بەغدا لە (٣١)ی ئایاری ساڵی (١٩٣٦)دا.
- شارەزاییەکی دیاری لە زمانەکانی عەرەبی، تورکی فارسی، ئینگلیزی‌و هیندی دا هەبووەو ماوەیەکی زۆریش لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دوور خراوەتەوە بۆ وولاتی هیندستان.
- یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی یانەی سەرکەوتنی کوردان.
- زۆر بایەخی بە زمانی کوردی داوە، ژمارەیەك لە کتێبی رۆژهەڵاتناسانی وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی‌و عەرەبی.
- بەرهەمەکانی:
- (ذكرى سعد زغلول في العراق).
- (زاد المسافر ولهفة المقيم والحاضر)، دەربارەی ماوە مێژووییەکەی حوسێنی پاشای کوری ئەفراسیایی حاکمی بەسرە بووە.
- (قصص مختارة من الأدب التركي)، وەرگێران، ١٩٣٦.
- (الفلقة: فطاحل اللغة وفحول الشعراء)، ١٩٣٩.
- (قضية فلسطين)، وەرگێران، ١٩٣٩.
- (مائة فكاهة وفكاهة).
- (مرشد العمال واصحاب الحرف المعامل لمعمل خالد)، ١٩٣٦.
- (نقدات ملا نصر الدين)، ١-٣ بەش.
- (وساوس السلطان عبد الحميد).
- (مذكرات خلف شوقي الداوودي)، ١٩٩٠.
- لە ساڵی (١٩٣٩)دا کۆچی دوایی کردووە لە (سەلمان پاك) بە خاك سپێردراوە.

* ( خەلوسی بەتلیسی نەسیمی زادە ):-

- بەرهەمەکانی:
- (سيد عماد الدين نسيمی ديوانی)، ١٩٧٣.

* ( خەلیل ئەحمەد حەسەنی ):-

- هونەرمەندو نووسەری شانۆیی بووە.
- ساڵی (١٩٣٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٧) کۆچی دوایی کردووە.

* ( خەلیل ئاغا - سەید خەلیل ئاغا ):-

- (کوری سەید محەمەد کوری سەید ئیبراهیم ئاغا)یە، نەوەی ناوداری پایەبەرزی کاکەیی سەید (شا ئیبراهیم)ی بەغدایییە.
- ساڵی (١٨٥٦) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٥٩)ی زایینیی بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو پاشان چووەتە داقوق‌و لەلای زانایانی ئایینیدا خەریکی فێربوونی ریزمانی عەرەبی‌و ویژەی فارسی بووەو ئەوسا گەراوەتەوە زێدو مەڵبەندەکەی‌و پاشماوەی ژیانی بە کشتوکاڵ‌و ماڵتداری بردووەتە سەر.
- لە هۆنینەوەی هۆنراودا دەستێکی باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ تەرو پاراوو شیرین‌و پتر لە بەیازەکان‌و

کەشکۆڵەکاندا تۆمار کراوە.
- ساڵی (١٩٣٢) کۆچی دوایی کردووەو لە گۆرستانی ئیمام ئەحمەد لە کەرکوك نێژراوە،، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٩٣٣)ی زاینیی بە ساڵی کۆچ کردنی دادەنێن.

* خەلیل خوێناوی:-

- یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك، کە شیعرێکی لە ژمارە (١)ی گۆڤاری گزنگ بڵاوکردووەتەوە، بەڵام دەڵێن گوایە لەنێوان ساڵانی ١٩٧٠-١٩٨٠ لە رێکخراوێکی مارکسی فەلەستینییەکاندا کوژراوە.

* ( خەلیل داودە - مەلا خەلیل داودە ):-

- شاعیر لە ساڵی (١٨٦٨) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٨٩٩) کۆچی دوایی کردووە.

* ( خەلیل زەکی ئیبراهیم - ئەمیر لیوا ):-

- ناوی تەواوی (خلیل ئیبراهیم جمعە) یە بەڵام لەبەر زیرەکی ناوی (زەکی)یان بۆی داناوە.
- ساڵی (١٨٨٦) لەدایکبووە.
- قوتابخانەی رۆشدیەی سەربازی لە بەغدا تەواو کردووە.
- قوتابخانەی سەربازی لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی (١٩٠٣) تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٠٦) بەشداری شەڕی قەفقاسی کردووە لە بەرەی رووسیا.
- ساڵی (١٩٢١) پەیوەندی بە سوپای عێراقەوە کردووە.
- ساڵانی (١٩٢٧-١٩٣٠) لە ناوچەکانی کوردستان کاری کردووە.
- ساڵانی (١٩٣٠-١٩٣١) لە ناوچەکانی خواروو کاری کردووە.
- ساڵانی (١٩٣١-١٩٣٢) لە ناوچەکانی رۆژهەڵات کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٣٤) خانەنیشین کراوە.
- ساڵی (١٩٣٧) کۆچی دوایی کردووە.
- زمانەکانی کوردی وعەرەبی و تورکمانی و فەرەنسی و ئینگلیزی بە باشی زانیووە.

* ( خەلیل فەقێ رەمەزان-عەبداڵ داودە ):-

- ناوی شاعیر (خەلیل فەقێ رەمەزان)ە لە هۆزی داودەیە.
- ساڵی (١٨٨٠) لە دێی دووراجی لە قەزای خورماتوو لەدایکبووە، کە هاوسەردەمی شاعیر (محەمەد خورشید ئاغای داودە) بووە.
- لە سەفەربەردا بۆ سەربازی رای ئەپێچن و خۆی دەرباز دەکات و بۆ ماوەیەك لە چاو وون دەبێت، پاش کۆتایی هاتنی شەڕ سەر هەڵدەداتەوەو دەگەرێتەوە ناو خزمانی خۆی.

- ساڵی (٢٠٠٩) دیوانێکی شیعری هەیە کە کۆی هەموو بەرهەمە شیعرییەکانییەتی بە ناونیشانی (زیندوکردنەوەی عەبداڵ داودەو بەرهەمەکانی) کە لەلایەن (هەردەوێل کاکەیی و سەلاح هەلاج) کۆکراوەتەوە.
- ساڵی (١٩٢٩) کۆچی دوایی کردووە.

* خەلیل حاجی ئۆزن:-

- ساڵی ١٩٤٨ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- دنیا بیتەر، شیعر، ٢٠٠٦
- حر ترکمانم، شیعر، ٢٠٠٧
- قره بارین کرکوکم، شیعر، ٢٠٠٧.
- کرجك رؤیا، شیعر، ٢٠٠٨
- عزیز ئولکەم، شیعر، ٢٠٠٨
- اتاش کوملەك، شیعر، ٢٠٠٨
- عجی شربت، شیعر، ٢٠٠٩
- یولون صونی، شیعر، ٢٠١١

* ( خەلیل کاکەیی - حوسێن کاکەیی ):-

- ناوی (خەلیل محەمەد حوسێن کاکەیی)یە.
- ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی ئەلتەئمیم بۆ هونەری نوێ لە کەرکوك لە ساڵی (١٩٨٢).
- ساڵی (١٩٨٣) دووەمین پێشانگای تایبەتی هونەرمەند کراوەتەوە لە هۆڵی تەئمیم بۆ هونەری نوێ.
- ساڵی (١٩٨٣) بەشداری یەکەمین پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.
- سێیەم پێشانگای لە هۆڵی تەئمیم بۆ هونەری نوێ لە ساڵی (١٩٨٤) کردووەتەوە.
- بەشداری پێشانگای هاوبەش لەگەڵ (١٤) هونەرمەندی سلێمانی لە ساڵی (١٩٨٤) کردووە.
- بەشداری پێشانگای هاوبەش لەگەڵ بێستون عەبدولقادر لە سووورداش (١٩٨٥).
- بەشداری هاوبەشی پیشانگاکانی لە جنیف وبروکسل وهولندا وئیسپانیا و ئەلمانیا.
- پێشانای تایبەتی لە هەولێر لە ساڵی (١٩٩٤).

* ( خەلیل منەوەر ):-

- ناوی (خەلیل کوڕی خدری کوڕی ئەحمەدی کوڕی خەلیل)ە، لە هۆزی (کاکەیی)یە.
- ساڵی (١٨٧٨) لە گەرەکی (موسەڵلا) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، هێشتا ساوا بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٨٠) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- شیعری میرزا خەلیل لە رووی ناوەرۆکەوە خەریکی

تۆمارکردنی ڕووداوی ڕۆژانەیە، لە پاشان دەبێتە ڕووداوێکی مێژوویی.

- شیعری میرزا خەلیل لە ڕووی زمانەوە ساکارە، بەزمانێکی تێکەڵاو دەنووسێ، ئەگەرچی لە بنچینەدا خۆی خاوەنی دیالێکتی گۆرانییە بەڵام دیالێکتی کرمانجی خوارووی گەرمیانی (ناوچەی کەرکوک) کاری تێکردووە.
- لە (١٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٣) کۆچی دوایی دەکات.

*** ( خەلیل موخلس ):-**

- ناوی (مەلا خەلیلی موخلس)ەو لە کفری لەدایکبووەو لە بواری شیعردا جێپەنجەی دیارە.

*** خەماس ڕەشید ئەحمەد ( پاڵە ):-**

- لەدایکبووی ساڵی (١٩٦١)ی شاری کەرکوکە.
- ساڵی (١٩٨٠) لە کەرکوک پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو پاش دوو ساڵ لە هەرێمی ٢ی کەرکوک بووەتە پێشمەرگە.
- پاش هەڵوەشاندنەوەی سیستمی هەرێمەکان و کارکردن بەسیستمی تیپەکان، خۆی بۆ تیپی ٢٣ی سووورداش گواستەوەو لەوێ کرایە فەرماندەی مەفرەزە.
- ساڵی (١٩٨٥) گەڕایەوە بۆ سنووری کەرکوک و لە تیپی ٢١ی کەرکوک لە کەرتی یەکی ساڵەیی وەك فەرماندەی مەفرەزە پێشمەرگایەتیی کرد، دواتر بە پلەی جێگری

فەرماندەی کەرت گوازرایەوە بۆ تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.
- ساڵی (١٩٨٦)دوا بەدوای واژۆکردنی ڕێککەوتنی ئاشتیی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتیی مەڵبەندی ٤ی لە بادینیان دامەزراندو ئازاد هەورامیی وەك لێپرسراوی مەڵبەندەکە بەهێزێکەوە بۆ دەڤەری بادنیان نارد. خەماس لەگەڵ هێزەکەدا بەپلەی فەرماندەی کەرت ڕەوانەی بادنیان کرا.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی دەیان چالاکیی پێشمەرگانەی کردووەو چەند جارێکیش بریندار بووە.
- لە ١٤ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٧)دا لە کاتی هێرش کردنە سەر یەکێ لە ڕەبییەکانی سوپای عێراق لە بادینان شەهید بوو. تەرمی لەوێ بەخاك سپێردراو دواتر لەساڵی (٢٠٠٣)دا پاش ڕووخانی ڕژێمی بەعس، گوێزرایەوە بۆ کەرکوك و لە گۆڕستانی ڕەحیماوا نێژرا.

*** ( خەمناکی ):-**

- ناوی (محەمەد ئەحمەد بەگی زەنگەنەو ئامۆزای میر ئەحمەد بەگی زەنگەنە)یە.
- لە حکومەتەکەی میر ئەحمەدا وەزیر بووە.
- ساڵی (١٦٩٠) لە قەیتول نزیك قادر کەرەم لەدایکبووە.
- نازناوی شیعری (خەمناکی)یە.
- ساڵی (١٧٨٢) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( خەیروڵڵا کازم داقوقلو ):-**

- ساڵی (١٩٢٨) لە داقوق لەدایکبووە.
- گەلێك شیعری تورکمانی هەبووە.
- بەرهەمەکانی:
- (جاغداش ئازەربایجان شعریندەن سیجمەلر)، شیعر بە

زمانی تورکی، چاپخانەی (الجاحظ)، بەغدا، ١٩٧٤.
- (یولوجولوق)، شیعرو پەخشان بە زمانی تورکی. چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٥.
- (خیالیمدا یاشیان کوزەل)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا. ١٩٨٦.
- لە (١٤)ی نیسانی ساڵی (١٩٨١) کۆچی دوایی کردووە.

*** خەیری عەبدوڵڵا بەیاتی:-**

- ساڵی ١٩٣٩ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- ثمانیة اشهر في تلعفر المدینة الترکمانیة المنسیة، ٢٠٠٦.
- الألم الترکماني، ٢٠٠٧
- محطات ترکمانیة، ٢٠٠٨
- الطریق إلی العمرة، ٢٠٠٨
- کرکوك مدینة رومانسیة، ٢٠٠٩
- این تکمن الحقیقة، ٢٠١١
- همسة حب لمدینتي کرکوك، ٢٠١٢.

*** (خدر بارام چاوش - خلەی بارام چاوش):-**

- ساڵی (١٨٧٥) لە ئاوایی (خدر بەگ)ی ناحیەی قەرە حەسەنی گەرمیاندا لەدایکبووە.
- لە هەرەتی لاوێتیدا شەیدای مەقامات و گۆرانی و مۆسیقای کوردی بووە، لەناو خەڵکیدا بە (خلەی بارام چاوەش) بە ناوبانگ بووە.
- برایەکیشی هەبووە بە ناوی (ساڵح)ەوە، ئەم زاتە لە ئامێری باڵەبان و زورناژەنیندا هونەرمەندێکی بێ هاوتا بووە.
- پیاوێکی پیاوانەو قسەزان و نەفس بەرز بووە لە ووتوێژ کردندا هێمن و لەسەر خۆبووە، خەڵکی خۆشیان ویستووە و رێزیان لێ گرتووە، خاوەنی باڵایەکی مام ناوەندی بووە، مووی سەری زەردو دوو پەلکی درێژی هەبووە، کەواو سەڵتەی فەقیانەداری کردووەتەبەر.
- لەسەر داواکردنی شێخ حەسیب شێخ عەلی شێخ عەبدولرەحمان تاڵەبانی (١٨٩٠-١٩٤٩) ماڵ دەگوێزێتەوە بۆ ناحیەی لەیلان لە نزیك ماڵی شێخ حەسیب جێگر دەبێت.
- خدر بارام ئاسکە زێرینەیەکی هەبووە لە دار دروست کراوە، بەزەنگیانەو موروو و قوماشی رەنگامە رازاندۆیانەتەوەو لەسەر تەختەیەك بە شێوەیەکی هونەری بەندیان کردووە، ئینجا لەسەرقەفە قامیشێکی کوندار بەستویانەو دەزوویەکیشیان بە ناوی قامیشەکەدا تێپەر کردووەو لەژێر زگی ئاسکە زێرینەکەدا بەندیان کردووەو ئەم سەرەکەشی بەپەنجە تیتەی دەستی راستی بەستویەتیەوەو لە پێشی خۆیدا دایناوە، جا لە پێش خەڵکیدا کە لە تەمیرەی داوە ئەو ئاسکەیە لە سەر ئەو تەختەیە سەمای کردووە، ئەو ئاسکەیە تا ساڵی (١٩٩١) لە ماڵی کورەزاکانی پارێزرا بوو.
- لەگەڵ ئەم مەقام خوێن و گۆرانی بێژانە مەقامی خوێندوەو تەمیرەی ژەنیووە: کامیل محەمەد تەپەلوی، محەمەد خەلیل ئاغا، عەبدوڵڵا سەعید عەربەتی، خولەی ئۆمەری، مەلا حوسێنی مام غولام، حەمەی کۆترەمل.
- لە ژیانییدا دووژنی خواستوە: (پیرۆز بەرزنجی) و (دەوڵەت عەلیوەلی کاکەیی)-هونەرمەند خدر بارام چاوش لە هۆزی (کەڵهور)، کە هۆزێکی کوردی رەسەنن.
- لە دەورووبەری ساڵی (١٩٢٩) لە تەمەنی (٥٤) ساڵیدا ماڵ ئاوایی لە نەتەوەو هونەرە رەسەنەکەی کردووەو لە گۆرستانی (ئیمام حەسەن)ی لەیلان بەخاك سپێدراوە.

*** (خدر عەبدوڵڵا- مەلا خدر عەبدوڵڵا - خضر):-**

- ناوی (مەلا خدر کوری عەبدوڵڵا کوری عەبدولرەحمان کوری عەباس)ە.
- ساڵی (١٨٦٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بووەتە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی (سدیق) و مزگەوتی مەلا (خدر).
- لە کاتی دامەزراندنی (مدرسة الصنایع) لە کەرکوك لە سەردەمی عوسمانییەکان بووەتە مامۆستای زمانی فارسی و شارەزاییەکی زۆری لە زمان و ئەدەبی فارسییدا هەبووە.
- ساڵی (١٩٤٧) کۆچی دوایی کردووە.

*** (خدر لوتفی ئەفەندی):-**

- ناوی خدر کوری لوتفی کوری (سەمینە) لە نەوەی کەمال خاقانە کە سوڵتان مرادی چوارەم ناردی بۆ (قوینە) بۆ ئەوەی وانەی رێبازی سۆفیگەرێتی (رێگەی مەولەوی) بەخەڵکی ئەو هەرێمە بڵێتەوەو فێریان بکات.
- خدر لوتفی لە ساڵی (١٨٨٠) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە لە گەرەکی موسەڵڵا لەدایك و باوکێکی کاکەیی، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٨٢) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- لە تەمەنی (١٨-١٩) ساڵیدا چووەتە ریزی سەربازییەوەو بووە بە جێگری ئەفسەر لە پاش ساڵێك بووە بە ئەفسەر لە نووسینگەدا.

– ساڵی (١٩٢٤) گەڕاوەتەوە کەرکوك بەپلەی (یوز باشی الای) واتە (نەقیب).
– خزمەتی سەربازی لەم شارانە بووە (کەرکوك، کفری، بەغدا، ئەرزروم، ئەستەمبوڵ، قەفقاس).
– لەو کاتەی لە کفریدا بووە خۆی خەریك کردووە بە وانە وتنەوە لە قوتابخانەی (الرشدیە).
– شاعیر ئەم چەند بەرهەمەی بەزمانی تورکی هەبوو:
– (حیات کز شتم).
– (قبر ستان زیارەتی)، ئەمەیان وونبووە.
– (نظیفي یاد)، دەربارەی قۆریاتی تورکمانیە.
– (حیاتدە ادارە).
– (فضولي البغدادي)، ئەمەیان وونە.
– شاعیرمان لە (٢٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٥٩) لە تەمەنی (٧٩) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

* ( خورشید محێدین - مەلا خورشید ):-

– ناوی (مەلا خورشید کوڕی محێددین)ە.
– ساڵی (١٩٠١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– زانستە ئایینییەکانی خوێندووە لەلای مەلا تاهیرو مەلا سابیرو مەلا محەمەد گەورە.
– یەکێکە لەوانەی لە بواری فەلەکناسیدا شارەزایی هەبووەو ئامرازێکی ئەستێرەناسی دروست کردووە لە دار بۆ چاودێری ئەستێرەو ئەستێرە گەڕۆکەکانی گەردوون‌و هەستاوە بە دروستکردنی ئەخشەیەکی ڕێکوپێك بۆ دابەشکردنی لەسەر شێوازێکی زانستی کە بەشێك لە زانیارییەکانی لەگەڵێك دەستنووس‌و لێکۆڵینەوەدا بە جێ هێشتووە کە تاوەکو ئێستاکە بڵاونەکراوەتەوە، وەکو: (مفتاح الاسرار)، (الشجرة والثمرة).
– ساڵی (١٩٨٢) کۆچی دوایی کردووە.

* ( خورشید ڕەشید ):-

– ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– بەکالۆریۆسی لە زمانی کوردی لە بەغدا وەرگرتووە.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا)، بەغدا، ١٩٨٩.

* ( خورشید سیامەنسووری - مەلا خورشید سیامەنسووری ):-

– ساڵی (١٩١٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– خوێندنی زانستی ئایینی لەلای مەلا (ڕەزای واعیز) وەرگرتووەو لە دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨) بووە بە مامۆستا لە گوندی (قەرەوەیس).
– ڕۆشنبیرو پیاوێکی نیشتیمانی‌و نووسەر شاعیر بووەو گەلێك بەرهەمی لێ بە جێماوە.
– ماوەیەکیش کتێبخانەی هەبووە لەسەر شۆستەی شەقامی (ئەوقاف)و گەلێك لە گۆڤارە کوردییەکانی ئەو کاتەی بڵاودەکردەوە بە تایبەتی لەنێوان چلەکان‌و پەنجاکانی سەدەی رابردوودا.
– ساڵی (١٩٩١) کۆچی دوایی کردووە.

* ( خولەی ئۆمەر ):-

– یەکێکە لە مەقام زانەکان.

* ( خولەی حیسابگر ):-

– لە تەکیەی جەباری لەدایکبووەو ژیاوە.
– دەستێکی باڵای هەبووە لە دیاریکردنی حیساب‌و کات‌و کاتەکانی زانینی باران‌و هەورو باو تۆزو گەلێك شتی سەرسووڕهێنەر.

* خالید جوانڕۆ:-

– ناوی خالید عەلی ئەحمەد ناسراو بە خالید جوانڕۆ.
– ساڵی ١٩٦٩ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکووکە، بەشی مۆسیقا ساڵی ٢٠٠٧.
– سەرەتای کاری هونەری لە ساڵی ١٩٨٥ بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك بووە.
– ئەو تیپانەی بەشداری کردووە بریتی بووە لە:– باباگوڕگوڕ، مۆسیقای یەکێتی ئافرەتان، کرێکارانی کەرکوك، قیسارە ڕۆشنبیری کەرکوك، مۆسیقای کەرکوك، ناوەندی عەلی مەردان، شەفەق، هونەرمەندانی کەرکوك، تیپی مۆسیقای تەلەفزیۆنی کەرکوك.

*** خەمینە سالح ئەحمەد.**

ئەندامی دێرینی ڕێکخستنەکان‌و ئەندامی ئەنجومەنی ناوەند. لەدایکبووی سالی ١٩٦٤ی چەمچەماڵ. لە بنەماڵەیەکی کە لە زووەوەو تێکەڵ بە ژیانی سیاسی بووە. دایکی کادیرێکی چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستان‌و لێپرسراوی لقی چەمچەماڵی یەکێتیی ئافرەتانی کوردستان بووەو برایەکیشی سەرلق بووە لە شۆڕشی ئەیلولدا. ئەم ژینگەیە کاریگەریی زۆری لەسەر پەرەسەندنی هۆشیاریی نیشتمانیی هەبووە. لە سەرەتای گەنجێتیدا لەگەڵ دایکیدا بڵاوکراوە حزبییەکانی بەسەر ڕێکخستنەکاندا بڵاو کردووەتەوەو بەشداریش بووە لە چەند چالاکییەك بۆ گەیاندنی داوو دەرمان بە پێشمەرگە.
سالی ١٩٧٥ دوا بەدوای هەرەس هێنانی شۆڕش، خێزانەکەی ئاوارەی ئێران بووەو دواتریش لە شاری ئەراك نیشتەجێ بووە، لەوێ قۆناغی ناوەندیی خوێندنی تەواو کردووە.
لە سالی ١٩٧٧دا پەیوەندیی بەڕێکخستنە نهێنییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد لە ئێران، لە سالی ١٩٧٨دا لە ئەسفەهان ژیانی هاوسەریی لەگەڵ موئمین سەلام سادق پێکهێناو دواتریش خۆی‌و مێردەکەی گەڕانەوە بۆ کوردستان‌و لە سلێمانی گیرسانەوە.
سالی ١٩٨٠ مێردەکەی پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردو لەوێ زۆر سود لە توانای وەك چەخماخچی‌و چەکساز وەرگیراو بەهۆی ئەم بەهرەیەوە موئمین سەرقالی چاك کردنەوەی چەکە لە کارکەوتووەکان بوو. ئەم کارە لە ژیانی پێشمەرگەیەتیدا بایەخێکی تایبەتی هەبووە.
خەمینە لەگەڵ مێردەکەیدا ئەم قۆناغەی ژیانی لەناوچەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەت بەسەر بردووە، سەرەتا لە گوندی ئیلەللای دەشتی کۆیە نیشتەجێ بووە، دواتر بەهۆی ژیانی پێشمەرگەیاتییەوە لە گوندەکانی سنووری گەرمیان‌و قەرەداغ ژیاوە.
لەو ماوەیەدا وەك کادیرێکی ڕێکخستن لەناو ژناندا کاری کردووە، لەکاتی شاڵاوی ئەنفالەکاندا بەنهێنییەوە گەڕایەوە بۆ چەمچەماڵ بەڵام بارودۆخی ئەو کاتەی چەمچەماڵ‌و پشکنینی ماڵەکان‌و گەڕانی بەردەوامی سەربازەکان بەدوای ڕزگاربووەکانی شاڵاوی ئەنفالەکاندا، ناچاریان کرد چەمچەماڵ بەجێ بێڵێ‌و لە سلێمانی خۆی بشارێتەوە. لەو ماوەیەدا بە هەوڵ‌و تەقەللای مێردەکەی، توانی بەخۆی‌و سێ منداڵەوە بگاتە سنووری مەڵبەندی ٣ بەڵام لە چیاکانی دەوروبەری گوندی بالیسان بەر بۆردومانی کیمیایی کەوتن، پاش ئەهامەتییەکی زۆر لە چیای قەندیل ئاودیو بوون‌و گەیشتنە قاسمە ڕەش، لە ئێران ماوەیەك لە ئۆردوگای ئاوارەکانی بارام ئاوا مایەوەو دواتر لە گوندی کانی دینار نیشتەجێ بوو.
سالی ١٩٨٩ پەیوەندیی بە یەکێتیی ژنانی کوردستانەوە کرد کە تازە دامەزرا بووو وەك کادیر کاری تێدا کرد.
پاش ڕاپەڕینی سالی ١٩٩١ لە کۆمیتەی ٦ی ئاوارەکان پلەی ئەندامی کەرتی پێ درا، لەناو یەکێتیی ژنانیش بەپلەی کارگێڕی کۆمیتە کاری کرد. سالی ١٩٩٥ پلەکەی لە کۆمیتەی ئاوارەکاندا بۆ ئەندامی کۆمیتە بەرز کرایەوەو لە سالی ١٩٩٦دا لە کۆنفرەنسی مەڵبەندی ٢ی ڕێکخستنی کەرکوکدا بەشداری کرد، لەهەڵبژاردندا دووەم دەنگی بەدەستهێناو ئەمەش ئەو دەرفەتەی پێ بەخشی کە ببێتە ئەندامی مەڵبەند، سالی ١٩٩٨ گوێزرایەوە بۆ مەکتەبی ماف مرۆڤ‌و سالی دواتر لە کۆمەڵەی داکۆکی کردن لە قوربانیانی ئەنفالکراوەکان وەك ئەندامی لیژنەی باڵا کاری کرد.
سالی ٢٠٠٥ کرایە ئەندامی مەکتەبی ماف مرۆڤ‌و سالی ٢٠٠٧ بووە لێپرسراوی لیژنەی ٢ی ماف مرۆڤ لە سنووری مەڵبەندەکانی ٢١ی دەوروبەری سلێمانی‌و ٢٧ی دوکان لە هەڵبژاردنی ٢٠٠٩دا لەسەر لیستی هاوپەیمانیی کوردستانی کاندید کرا بۆ پەرلەمانی کوردستان. هەر ئەو سالە لێپرسراوەتیی بەشی ئاماری مەکتەبی ماف مرۆڤی گرتە ئەستۆ، سالی ٢٠١٠ کرایە لێپرسراوی بەشی کارگێڕیی مەکتەبی شەهیدان‌و ئەنفالکراوەکان‌و هەر ئەو سالە، پاش کۆنگرەی سێیەمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بە ئەندامی ئەنجومەنی ناوەند دانرا.

*** خەلیل ئیبراهیم جومعە:-**

- ناوی سیانی ئاوێتەیی (خەلیل زەکی ئیبراهیم)ە.
- سالی ١٨٨٦ لە کەرکوك لە دایکبووە.
- سەرەتایی لە کەرکوك و قوتابخانەی سەربازی لە سالی ١٩٠٦ بە سەرکەوتوویی بەدەستهێناوە.
- بەشداری شەڕی قەفقازی کردووە لەبەرەی ڕووسیا و پلەکەی بەرزکراوەتەوە بۆ (ئەرکان) و لە یەکێك لە فەیلەقەکانی عوسمانی دامەزراوە.
- لە ٢١ی نیسانی ١٩٢١ پەیوەندی بە سوپای عێراقەوە کردووە بە پلەی (مقدم) و ئەفسەری ئەرکانی چالاکییە سەربازییەکان لە وەزارەتی بەرگری.
- لەنێوان سالانی (١٩٢٢-١٩٢٧) لە سوپای عێراقدا کاری کردووە و یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی (مدرسة الخيالة) لە عێراق.
- سالی (١٩٢٧-١٩٣٠) سەرۆکی سەربازی باکووری عێراق بووە.
- سالی (١٩٣٠-١٩٣١) سەرۆکی ناوچەکانی خوارووی عێراق بووە.
- سالی (١٩٣١-١٩٣٣) سەرۆکی سەربازی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بووە.
- سالی ١٩٣٣ دووبارە گەڕێندراوەتەوە بۆ ناوچەکانی خواروو.
- سالی ١٩٣٤ خانەنشین کراوە و زمانەکانی تورکی و کوردی ئینگلیزی و فەرەنسی زانیوە.

*** خاڵە حەمرین:-**

جیا لەوەی شاعیر و تەنزنووس بوو، خاوەنی یەكەم ڕۆژنامەی ئەهلی سەربەخۆی تەنز ئامێز بووە، كە لە ساڵانی ئەوەتەكانی سەدەی ڕابردوو لە شاری هەولێر دەریكردووە، هاوكات وەكو باوكێكی میهرەبان هەمیشە هاوكاری زۆربەی هونەرمەندان و ڕۆشنبیرە كەركووكییە ئاوارەكانی كردووە لە شاری هەولێر.. سەدانی شیعر و بەرهەمی خۆی لە زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەكانی كوردستان بڵاو كردۆتەوە، لە دەیان كۆڕ و سیمینار بەشداریكردووە...

خاڵە حەمرین كەسایەتییەكی زۆر جوان بوو، لەگەڵ ئەوەی ئەوكاتە تەندروستی باش نەبوو، كەچی بەردەوام پێدەكەنی و هەستت بە نەخۆشییەكانی نەدەكرد.

لەگەڵ گەورەدا گەورە بوو و لەگەڵ منداڵیشدا منداڵ، بڕوا ناكەم كەسێك هەبووبێ لەو كەسایەتییە ڕەنجابێت.

ئەوكاتەی دەهاتە لامان، هەر شیعرێكی نوێی نووسیبووایە، بۆی دەخوێندینەوە بێ ئەوەی چاوەڕێی بۆچوونی بەرامبەرەكانی بكات. ڕای بەرامبەر هەرچی بووایە، واتە باش و خراپ، ئەو گوێی پێ نەدەدا و بڕوا ناكەم لەسەر ڕای پێچەوانە لە كەس ڕەنجابێت.

ڕۆژانە لە عەسران لە چایخانەی (مەچكۆ) پەیدا دەبوو و تا دوای ئێوارە لەوێ دەمایەوە، مێزەكەی ئەو بەردەوام قەرەباڵغ بوو و زۆربەی برادەران بۆ گفتوگۆ دەچوونە لای كە ئەویش چێژی لەو دانیشتنانە وەردەگرت.

ئەو پیاوە ڕاستە گەنج نەبوو، بەڵام بەزوویی بەجێی هێشتین.

ناوی تەواوی خاڵە حەمرین: (عەبدولڕەحمان ئەحمەد عەلی جاف)ە و لە ساڵی ١٩٤٥ لە شاری كەركوك لە دایكبووە، لە سەرەتای لاوی لە ڕیزەكانی مقاوەمەی شەعبی سەربە حیزبی شیوعی عێراق كاری سیاسی كردووە و لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول بووە بە پێشمەرگە و دواتر بەهۆی سەرسام بوونی بەكەسایەتی "مەلا مستەفای بارزانی" خەباتی گواستووەتەوە بۆ ڕیزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان، لە هێزەكانی (ڕزگاری و هەڵگورد) تا ساڵی ١٩٧٥ پێشمەرگە و مامۆستای شۆڕش بووە، لە ساڵی ١٩٧٥ بە بڕیاری بەعس دەگوازرێتەوە بۆ شاری هەولێر و لەوێ نیشتەجێ دەبێت تاكو لە ٢٩ی شوباتی ساڵی٢٠٠٧ كۆچی دوایی دەكات و لەسەر وەسیەتی خۆی لە سەر ڕێگای كەركووك بەخاكی دەسپێرن..

خاڵە حەمرین

خەیری عەبدوڵڵا

ئەمیر لیوا خەلیل زەكی ئیبراهیم

خالید كاوێس، نووسەر و وەرگێڕ لە هەمان كاتدا لە بواری ڕۆژنامەگەریدا كار دەكات

* (دارا بەگ داودی-دارا داودە):-

- (دارا بەگ کوڕی محەمەد باقر کوڕی ئیسماعیل کوڕی برایم

کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەمەد عەلی کوڕی حەقی بەگ)ە، بوو کە شوێنی عەشیرەتەکەی لە ناوچەی (داقوق) بووە.
- ساڵی (١٨٩١) لەدایکبووە.
- نوێنەری کەرکوک بوو لە (مجلس التأسیس) لە ساڵی (١٩٢٤).
- لەنێوان ساڵانی (١٩٣٥، ١٩٣٩) (١٩٤٢، ١٩٤٣-١٩٤٧)، (١٩٤٧-١٩٤٨) نوێنەری کەرکوک بووە لە (مجلس النواب)دا.
- ساڵی (١٩٥٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (دارا نورەددین):-

- یەکێکە لە حاکمە بەناوبانگەکان کە بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بەوەی کە خەڵکی کەرکوکە.
- لە تەمەنی (٥٠) ساڵیدا سزای سێ ساڵ بەندکردنی بەسەردا سەپێنرا لە بەر ئەوەی رەخنەی لە یەکێك لە بڕیارەکانی (مجلس قیادة الثورة) گرتووە کە تاکو ساڵی (٢٠٠٢) لە بەندیخانە بووە.
- لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٣-٢٠٠٤) ئەندامی (مجلس الحکم الانتقالي) بووە وەکو نوێنەری کورد.

* (دانا عەسکەر):-

- ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- لە سەرەتای هەشتاکانەوە لە بواری ئەدەب و رەخنە کاردەکات.
- چوار دیوانە شیعری هەیە و کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی لە سەر چیرۆك و شیعر بۆ چاپ ئامادەیە.

- (فیستیڤاڵی گۆرانییەکانی خەزان)، ٢٠٠٢.
- (رەهەندەکانی دەق لەنێوان فکرو ئەندێشەدا)، ٢٠٠٦.
- (ماناو دەلالەتە شاراوەکانی دەق)، لێکۆڵینەوە، چاپی

یەکەم، ٢٠١٠.
- (ململانێ لەگەڵ پرسیار)، ٢٠١٢.
- (خوێنی رژاوی دوو سێو)، شیعر، ٢٠١٣.
- (رەهەندە فینۆمینۆلۆجی و ئاراستە ناوەکییەکانی دەق)، ٢٠١٣.
- (ماناو دەلالەتە شاراوەکانی دەق)، لێکۆڵینەوە، چاپی دووەم، ٢٠١٤.

* (دانش):-

- ناوی (رەزا بەگی کوڕی فەتاح بەگی کوڕی حەمە پاشای جاف)ە.
- ساڵی (١٨٨٨) لەناو قەڵای (شێروانە) لەدایکبووە.
- شارەزایی تەواوی هەبووە لە زمانەکانی عەرەبی و فارسیدا، پاشان چووەتە قوتابخانەی (رۆشدیە)ی سەربازی عوسمان.
- ساڵی (١٩٤٢) لە تەمەنی (٥٤) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

* (داود بەگی جاف):-

- (داود بەگ کوڕی فەتاح بەگ کوڕی محەمەد پاشای جاف) ە.
- ساڵی (١٩٠٥) لە کفری لەدایکبووە.
- لە بەهاری ساڵی (١٩٣١)دا لە ئەبەردییەکی دلێرانەدا لەگەڵ سوپاکەی شێخ مەحموودا بەرەنگاری سوپای ئینگلیزیان کردووە لە گوندی (ئاوپاریك).
- ساڵی (١٩٣٥) هەڵبژێردراوە بە نوێنەری کەرکوک لە (مجلس النواب العراقي).
- دووبارە لە ساڵی (١٩٣٩) هەڵبژێردراوە، لە کۆی (١٦) خولی ئەنجوومەنی نوێنەراندا نۆ جار هەڵبژێردراوە.

- ئەندامێکی کارای پارتی (هیوا) بووە، یەکێك لە کۆبوونەوە مێژوویی و چارەنووسسازەکانی ئەم پارتە لە مالی (داود بەگ) لە کەلار لە هاوینی (١٩٤٤) گرێدراوە، کە ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامانی کەرکوك و گەرمیان بەشدارییان تێدا کردووە.
- سالی (١٩٤٧) لەگەل چەند هاوەلێکی نائیبەکانی لە بەغدا هەولی رزگارکردنی چوار ئەفسەرە کوردەکەیان داوە تا لە مردن رزگاریان کەن بەلام سەری نەگرتووە.
- هەروەها لە (مجالس النیابیة) چەند جارێك تا شۆرشی ١٩٥٨ هەلبژێردراوە.
- سالی (١٩٥٩) بەهۆی ئالۆزبوونی باروودۆخی ناوچەی (کەلار) و تێکچوونی پەیوەندی نێوان (داود بەگ) و (عەبدولکەریم قاسم) بۆیە خۆی و خانەوادەکەی ولاتیان بەجێهێشت و لە ئێران نیشتەجێ بوون.
- لە ئایاری سالی (١٩٦٦) لە تاران کۆچی دوایی کردووە.

* (داود پاشا):-

- سالی (١٥٩٥) بووە والی کەرکوك تەنها سالێك کەمتر والی بووە وئینجا حەسەن پاشای منلاجق بووەتە والی کەرکوك.

* (دەدە هوشیار):-

- گەلێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم شاعیرە لە سەدەی حەڤدەهەمی زاینییدا ژیابێت.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی کاکەیی و شیعر گۆرینەوەی هەبووە لەگەل (فضولي) شاعیر.

* (دەردوونی):-

- وا پێدەچێت کە خەلکی دەڤەری گەرمیان بێت لە نزیك کفری، بەلام هیچ شتێك دەربارەی نازانرێت.

- شایانی وتنە چەند شاعیرێکی تریشمان بەم ناووە هەیەو نازناوی (دەردوونی)یان هەلگرتووە، ئەمیش ناوی ئەو شاعیرانەیە:
- (مەلا سالحی ئاهی).
- (مەلا سالحی تەرەماری).
- (مەلا سالحی حەریق).
- (مەلا سالحی مەلا ئەحمەدی سوورنج).
- (مەلا سالح سەلاروەند).

* (دەروێش ئیسماعیل ئەحمەد):-

- بە (سمایلە کوێر) ناسرابوو.
- سالی (١٨٩٠) لەدایکبووە.
- سالی (١٩٦٥) کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێك بووە لە حیکایەت خوانە بەناوبانگەکان.

* (دەروێش جەباری):-

- ناوی تەواوی (دەروێش عەبدوللا جەباری)یە.
- سالی (١٩١٥) لە شاری بەغدا لەدایکبووە.
- سالی (١٩٤٥) دەچێ بۆ زانکۆی ئەزهەر لە قاهیرە بە مەبەستی خوێندن و وەرگرتنی بروانامەی بەکالۆریۆس.
- لە (٩)ی نیسانی سالی (١٩٦٢) لەسەر کوردایەتی و نیشتمان پەروەریی بۆ ماوەی سالێك زیندان دەکرێ و هەرچی لە نێو کتێبخانەکەیدا دەبێت لە کتێب و گۆڤار، کە هەندێکیانی لە قاهیرەوە هێنا بوو، هەمووی بە تالاندەبرێت.
- لە پاش دۆزینەوەی هەندێ کتێبی قەدەغەکراو لە کتێبخانەکەی بەدرێتە دادگای عورفی سەربازی لە کەرکوك وبۆ ماوەی سالێك لەسەرکار لادەبرێت لەپاشان دیگەرێنەوە سەر کارەکەی خۆی.

- لە ناوەراستی شەستەکانی سەدەی رابردوو دەگوازرێتەوە بۆ بەغدا وله میانی پەروەردەو فێرکردن بۆ ماوەی (١٦) سال خزمەتی زانست دەکات.
- سالی (١٩٧٩) خانەشین دەکرێت.
- یەکەم نووسینی لە گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە) بلاوکراوەتەوە، بەناونیشانی (کانی گۆگرد لە کوردستان).
- دوا بەرهەمشی بە ناونیشانی (من نضالات الزعیم مصطفی البارزاني، عودته من کوردستان إیران إلی کوردستان العراق) لە رۆژنامەی (التآخي) لە (٧)ی ئەیلولی سالی (٢٠٠٣).
- لە (٧)ی کانوونی یەکەمی سالی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی دەکات.

* (دەروێش غەیبوللا سەلیم):-

- یەکێکە لە مەقام زانەکانی کەرکوك.

* (دەروێش نەزەری گەرمیانی):-

- ناوی (مام نەزەر کوری مام قەیسەر کوری مام محەمەد)ە.
- سالی (١٧٨٦)ی زاینیی لە کەرکوك لەدایکبووە، بەلام هەندێك سەرچاوە ئاماژە بە سالی (١٧٩٠)ی زاینیی دەکەن بە سالی لەدایکبوونی.
- سۆفیکارو زانایەکی ئایینی بەناوباگ بووە لەناو کاکەییەکان و گەلێك سروودی ئایینی بە کوردیو تورکی هەیەو باپیرەی شاعیر (هیجری دەدە)ی کاکەییە.
- هەر لە منداڵییەوە لەلای باوکی خەریکی خوێندن بووە لە تاف جوانییدا چووەتە بەغداو لەوێدا خەریکی فێربوونی رێزمانی عەرەبیو رەوانبێژیو وێژەی عەرەبی بووەو پاشان گەراوەتەوە مەلبەندەکەی خۆی.
- شاعیرێکی هەرە بەرزی کوردەو هۆنراوەکانی گەلێ تەرو پاراوو ناسکن.
- سالی (١٨٧٥)ی زاینیی کۆچی دوایی کردووە، بەلام هەندێك سەرچاوە ئاماژە بە سالی (١٨٧٨)ی زاینیی دەکەن بە سالی کۆچ کردنی.

* (دەروێش وەلی قۆجە کاکەیی):-

- سالی (١٩٠٨) لە دێی (عەرەب کۆیی) لەدایکبووە، بەلام هەندێك سەرچاوە سالی (١٩١٠) بە سالی لەدایکبوونی دادەنێن.
- هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو پاشان لەلای سەی بورهان رێزمانی عەرەبی خوێندووەو لە پاشا خەریکی کارو مزیاری بووەو ئەوسا بووەتە دەروێش و بە دێکان و شارەکاندا گەراوە.
- گەلێك بەرهەمی شیعری هەیە بە تایبەتی سروودی ئایینی بە شێوەزاری ماچۆیی.
- سالی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (دڵپاك تاهیر دەروێش):-

- سالی (١٩٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتاییو ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی (١٩٧٩) پەیوەندی بە کۆمیتەی (هێرش)ەوە کردووە لە رێکخستنەکانی یەکێتی نشتیمانی کوردستان.
- سالی (١٩٧٩) تا سالی (١٩٨٣) پەیوەندی کردووە بە تەلەفزیۆنی کەرکوکەوە لە بەشی کوردی، پێشکەش کاری بەرنامەی (شەوچەرەی هونەری) بووە.
- سالی (١٩٨٣) بەشی کارەبای لە ئامادەیی پیشەسازی کەرکوك تەواو کردووە.
- بەهۆی فشار هێنان لەلایەن دەزگا داپلۆسێنەرەکانی بەعسەوە لە سالی (١٩٨٣)دا شاری کەرکوکی بەجێهێشتوو و بە نهێنی لە شاری هەولێر ژیانی بەسەر بردووە.
- سالی (١٩٨٧) لەگەل شەهیدی هونەرمەند (کەریم عوسمان) ژیانی هاوسەری پێکهێناوە.
- بەشدارییەکانی لە بواری شانۆدا:
- سالی (١٩٨٤) شانۆگەری (قەلای دمدم)، لە دەرهێنانی (سەعدون یونس).
- سالی (١٩٨٥) شانۆگەری (شاری ئەوین)، لە دەرهێنانی (تەلعەت سامان).
- شانۆگەری (لۆ تێم ناگەن؟)، لە دەرهێنانی هونەرمەند (تەحسین شەعبان).
- شانۆگەری (خانەدان)، لە دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).
- شانۆگەری (خاتوکلاوزەر)، لە دەرهێنانی (سەعدون

یونس).
- شانۆگەری (ئەوەدەمەی ئەڤین مەزنتر دەبێ)، لە دەرهێنانی هونەرمەند (ئەحمەد سالار).
- شانۆگەری (گۆرێللا)، لە دەرهێنانی هونەرمەندی شەهید (کەریم عوسمان).
- شانۆگەری (باخچەی ئاژەڵان)، لە دەرهێنانی (دانا رەئوف).
- شانۆگەری (کەمانچەی رۆچێلد)، لە دەرهێنانی هونەرمەندی شەهید (کەریم عوسمان).
- بەشداریکردن لە درامای (کەوەکانی قەرەچوغ)، لە دەرهێنانی هونەرمەند (تەلعەت سامان).
- لە دوای راپەرینەی ساڵی (١٩٩١)ەوە وەکو بێژەی تەلەفزیۆنی (گەلی کوردستان) لە کەناڵی هەولێر دەست بەکار بووە تا ساڵی (١٩٩٦).
- لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٧)ەوە وەکو ئەندامی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوەی (ی.ن.ك) دەست بەکاربووە.
- لە ساڵی (١٩٩٧) لەگەڵ کۆمەڵێك ژنی ناو یەکێتی هێزی پێشمەرگەی ژنانیان دامەزراند.
- لە سەرەتای دروست بوونی تەلەفزیۆنی (خاك)دا وەك بێژەری بەرنامەی ریپۆرتاژ کاری کردووە تا ماوەی پێنج ساڵ.
- لە ساڵی (٢٠٠٠)دا کە کەناڵی ئاسمانی (کوردسات) دامەزرا یەکەم بەرنامەی هەفتانەی خۆی بەرنامەی (ریپۆرتاژ) بووە، تاکو ساڵی (٢٠٠٢) بەردەوام بووە لەو کەناڵە.
- لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٢)دا وەك پەناهەندە رووی کردووەتە وڵاتی (ئوستڕالیا)و ماوەی حەوت ساڵ ژیانی بەسەر بردووە.
- لە ساڵی (٢٠١١)دا لە زانکۆی سلێمانی بڕوانامەی ماستەری وەرگرتووە لە یاسای نێودەوڵەتی.
- ئێستا ئەندامی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوەی یەکێتیە.
- چەندین بەرهەمی ئەدەبیی هەیە لە شیعرو نووسینی جۆراوجۆر، هەندێك لە شیعرەکانی کراون بە گۆرانی لەلایەن هونەرمەندان (بەهجەت یەحیا)و (نیان عەبدوڵڵا).

* (دڵسۆز):-

- ناوی (حەمە ئەمین ئاغا)یە کوڕەزای حاجی (خەلیل ئاغای باجەڵان)ە، نازناوی شیعری (دڵسۆز)ە.
- ساڵی (١٩٢٢) لە دێی حاجی خەلیل لە گوندی بنکوڕەی ناحیەی قورەتووی سەر بە قەزای خانەقی لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦١) بووەتە پێشمەرگە لە شۆڕشی ئەیلول.
- ساڵی (١٩٧٥) ئاوارەی خوارووی عێراق کراوە.
- ساڵی (١٩٨٢) گەراوەتەوە بۆ کەلار.
- ساڵی (٢٠٠٤) کۆچی دوایی کردووە.

* (دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز - دکتۆر دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز):-

- ساڵی (١٩٧٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٧) بەکالۆریۆسی بەدەستهێناوە لە بەشی مێژووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین.
- ساڵی (٢٠١٠) ماستەری بەدەستهێناوە لە بەشی مێژووی کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی.
- ساڵی ٢٠١٤ دکتۆرای بەدەستهێناوە (شركة نفط العراق المحدودة، دراسة تأريخية في نشاطها الإقتصادي والخدمي في كركوك (١٩٢٧-١٩٧٢)
- بەرهەمەکانی:
- (نەوتی کەرکوك و ململانێی زلهێزەکان)، ٢٠١١.

* (دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان - دکتۆر دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان):-

- ساڵی (١٩٧٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندەیی و ئامادەیی لە هەولێر تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٩٩ - ٢٠٠٠) زانکۆی سەلاحەدینی بەشی مێژووی تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٦) ماستەری لە بواری مێژوو بەدەستهێناوە بە ناونیشانی (کەرکوك، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەنێوان ساڵانی ١٩٣٢ - ١٩٥٨، رۆڵی سیاسی و رۆشنبیری).
- ساڵی (٢٠١٢) دکتۆرای لە بواری مێژوودا بەدەستهێناوە بە ناونیشانی (باروودۆخی کۆمەڵایەتی شاری کەرکوك لەنێوان ساڵانی ١٩٢١ - ١٩٥٨).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ئیسماعیل حەقی شاوەیس)، ٢٠٠٤.
- (باروودۆخی کۆمەڵایەتی شاری کەرکوك لەنێوان ساڵانی ١٩٢١ - ١٩٥٨)، ئامادەیە بۆ چاپ.

* (دلێر عوێد):-

- ساڵی (١٩٦٣) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٢) لە پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی بووە تەواوی نەکردووە.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشی گرافیکی لە دانیمارك خوێندووە

ماوەیەك مامۆستای رەنگ بووە.
- سالی (١٩٩٥) یەکەم پێشانگای لە شاخ لەکوردستان کردووەتەوە.
- سالی (١٩٨٩) پێشانگای لە شاری ESBJERG لە دانیمارك.
- سالی (١٩٩٠) لە شاری KOBENHAVN لە دانیمارك.
- سالی (١٩٩٠) لە مۆزەخانەی KOLDING HUS لە دانیمارك پێشانگای خۆی کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩١) لە زانکۆی KOBENHAVN لە دانیمارك پێشانگای کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٢) لە گەلەری ROSKILDE لە دانیمارك پێشانگای کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٣) لە گەلەری FLOSBACHAI لە شاری FARANKFURT لە ئەلمانیا پێشانگای کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٥) پێشانگای لە خانووی قوتابیان لە دانیمارك کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٩) پێشانگای لە شاری پاریس لە فەرەنسا.
- سالی (٢٠٠٠) پێشانگای لە سەندیکای هونەرمەندانی MAERSK AIR لە دانیمارك.
- سالی (٢٠٠١) پێشانگای لە سەندیکای هونەرمەندانی وەزارەتی ووزەو ژینگە لە دانیمارك کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠١) براوەی پۆستەری : (١) ئەنتەر ناسیۆنال فۆرم-(٢) سیوسیال دیموکرات-(٣) ڤیستەر بوور کەلتوور-(٤) مافی مرۆڤ -(٥) فیستڤاڵی کوردی.
- بەشداری زیاتر لە ٢٠ پێشانگای هاوبەشی کردووە.
- لە (١٨)ی حوزەیرانی سالی (٢٠٠٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (دلێر محەمەد شەریف):-

- سالی (١٩٦٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی کۆلیژی یاسایە.
- رۆژنامەنووس و هونەرمەندی شێوەکارەو سەرنووسەری گۆڤاری (بیری نوێ)یە.
- ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی کوردستانەو ئەندامی پەرلەمانی کوردستانە.
- سالی (١٩٨٤) پێشانگایەکی هاوبەشی لە شاخ لەگەڵ هونەرمەند شۆرش کردووەتەوە.
- سالی (١٩٨٥) یەکەم پێشانگای تایبەتی کردووەتەوە.
- سالی (١٩٨٦) دووەم پێشانگای تایبەتی کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٢) سێیەم پێشانگای تایبەتی لەهەولێر کردووەتەوە.
- سالانی (١٩٩٢) تا (١٩٩٧) بەشداری گەلێك پێشانگای هاوبەشی کردووە.
- سالی (١٩٩٦) چوارەم پێشانگای تایبەتی لەهۆڵی میدیا لە هەولێر کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٧) پێنجەم پێشانگای تایبەتی لە زاموا کردووەتەوە.

* دلشاد باویانی

فەرماندە. ناوی تەواوی دلشاد شەریف محەمەد مەحمود لە دایکبوی سالی ١٩٥٨ی گەرەکی قۆریەی شاری کەرکوك، بەرەچەڵەك دەچێتەوە سەر گوندی باویان لە ناحیەی هەریری سەر بەپارێزگای هەولێرو لە خێڵی هەروتییە، باوکی شەریف محەمەد مەحمود، کە لەسەردەمی پاشایەتیدا ئەندامی رێکخستنە نهێنییەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، دوورخراوەی سیاسی بوو، بەماڵ و منداڵەوە بۆ کەرکوك دوورخرابۆوە، ئەزموونی دوورخراوەیی و دواتریش ئەزمونی پێشمەرگایەتیی باوك، رەنگدانەوەی قوڵی لەسەر بیرکردنەوەو ژیانی کورەکەی هەبوو.
لە سالی ١٩٦١دا لەگەڵ تەقینەوەی ناکۆکییەکانی نێوان کوردو رژێمی جەنرال عەبدولکەریم قاسمدا، باوکی رێگای پێشمەرگایەتیی گرتە بەر، لەو سۆنگەیەشەوە کە بەدرێژایی ئەمەنی پێشمەرگایەتیی، ماڵ و منداڵەکانی لە گەڵدا بوون، باویانی لە تاق منداڵییەوە ئاشنایەتیی لەگەڵ هەلومەرجی دژواری خەباتدا پەیدا کرد.
سالی ١٩٧٥ دوا بەدوای هەرەس هێنانی شۆرش، باویانی و هەموو خێزانەکەی ناوارەی نێران بوون، پاش گەرانەوەی خێزانەکە بۆ عێراق بۆ شاری دیوانیەی باشوری عێراق دور خرایەوەو لە سالی ١٩٧٨دا رێ پێ درا بگەرێتەوە بۆ کوردستان.
سالی ١٩٨١ باویانی پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە سنووری هەرێمی ٧ی بالەك ژیانی پێشمەرگەیەتیی دەست پێکرد. سالی ١٩٨٣ کرایە جێگری فەرماندەی کەرت و دواتر بۆ تیپی تایبەتی مەلبەنی سێ گوێزرایەوەو سالی ١٩٨٥ لێپرسراوەتیی جێگری فەرماندەی تیپی تایبەتی مەلبەندەکەی پی سپێردرا. لەو ماوەیەدا بەشداریی لە ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەدا کردووە.
سالی ١٩٨٨، لەگەڵ کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، لە پیرانشارو نەغەدە گیرسایەوەو لەو قۆناغەدا

بەشدار بوو لە ئۆپەراسیۆنەکانی مەشق و ڕاهێنانی هێزی پێشمەرگەداو بەشداریشی لە خولێکی عەسکەریدا کرد کە لە گوندی بادیناوای نزیك شاری پیرانشار ساز کراو ماوەکەی چل ڕۆژ بوو.
لە ساڵی ١٩٩١دا بەشداریی لە جێبەجێ کردنی بەرنامەی ڕاپەڕیندا کردو لە ئۆپەراسیۆنەکانی ڕزگارکردنی هەریرو باسرمەو شەقڵاوەدا بەشداریی کرد.
دواتر بەشدار بوو لە ئۆپەراسیۆنی رزگارکردنی هەولێردا، لەناو شار شەڕی کۆڵان بە کۆڵانی کردو بەشداریش بوو لە هێرش کردنە سەر بارەگای بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی هەولێرو لەوێدا بریندار بوو، دواتر لە شەڕی ڕزگارکردنی پردێدا بەشداریی کردو پاشانیش بەشدار بوو لە ئۆپەراسیۆنی کەرکوك و لەوێش بەسوکی بریندار بوو.
لە نیسانی ١٩٩١دا بەشداریی یەکێ لە گەورەترین شەڕەکانی هێزی پێشمەرگە کرد، ئەویش شەڕی کۆڕێیە کەتێیدا هێزی پێشمەرگە سنووری بۆ پێشڕەویی هێزەکانی عێراق لە پارێزگای هەولێر دانا، پاش ڕاپەڕین کرایە فەرماندەی هێزی ٢٢ی دەشتی هەریرو دواتر کرایە فەرماندەی فەوج لە سوپای یەککرتوی کوردستان لە شەقڵاوە.
لە ساڵی ١٩٩٩ بەدواوە بەشداریی لە چەند خولێکی فەرماندەیی کۆلیجی سەربازیی قەڵاچوالاندا کردو پلەی مولازمی بەدەستهێنا.
هەر ئەو ساڵە لە قەڵاچوالان بەشداریی لە خولێکی بەرزکردنەوەی پلەی سەربازییدا کردو پلەی نەقیبی بەدەست هێنا، ساڵی ٢٠١٠ بەپلەی لیوا خانەنشین کرا.

* دلێر جاف.
فەرماندە، ناوی تەواوی قادر حەمە سالح یاروەیس لە دایکبووی ساڵی ١٩٥٠ی گوندی قەڵاتە بزانی گەرمیان، هەر لەو گوندە خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە.
لەبەر نەبونی خوێندنگەی ناوەندی لە گوندەکەی بۆی نەلواوە درێژە بە خوێندن بدا ساڵی ١٩٦٨ ژیانی پێشمەرگایەتیی هەڵبژاردو بەهۆی لێهاتووییەوە پلە پلە سەر کەوت، تا لە دواییدا گەیشتە پلەی سەرپەل تا ساڵی ١٩٧٥ پێشمەرگە بوو، لەو ساڵەدا بەهۆی هەرەسهێنانی کتوپڕی شۆڕشەوە ئاوارەی ئێران بوو، لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٦دا، نزیکەی ٤ مانگ پاش جاڕدانی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار، گەڕایەوە بۆ کوردستان و پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد هەر ئەو ساڵە کرایە فەرماندەی مەفرەزە لە سنووری هەورامان و شارەزور، ساڵی ١٩٧٩ کرایە فەرماندەی کەرت لە سنووری هەرێمی یەکی هەورامان ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندیی بە یەکێتی شۆڕشگێڕانی کوردستانەوە کردو پلەی کادیری پێشکەوتوی پێ درا.
هەر ئەو ساڵە کرایە جێگری فەرماندەی تیپی ١٥ی شارەزور، ساڵی دواتر بەشداریی لە کۆنفرەنسی یەکەمی یەکێتیی شۆڕشگێڕانی کوردستاندا کرد لە گوندی خەتێ لە ناوچەی خۆشناوەتی، دواتر بە پلەی جێگری فەرماندەی تیپ گوێزرایەوە بۆ تیپی ٥٣ی شێروانە لە ساڵی ١٩٨٤دا بەشدار بوو لە کۆنفرەنسی دووەمی یەکێتی شۆڕشگێڕانی کوردستان کە لە مێرگەپان لە بناری چیای پیرەمەگرون بەسترا.
هەر ئەو ساڵە کرایە فەرماندەی تیپی ١٥ی هەورامان و ساڵی ١٩٨٧ لێپرسراوەتیی تیپی مەلبەندی یەکی پێ سپێردرا، لە تەمەنی پێشمەرگایەتیدا کە ١١ ساڵی خاناندووە٩ جار بریندار بووەو بەشداریی لە ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەدا لە ناوچەکانی گەرمیان، شارەزور، هەورامان، دەشتی هەولێر، قەرەداغ دۆڵی جافەتی و خۆشناوەتی کردووە.
لە ١٧ی ئایاری ١٩٨٧دا لە کاتی بەرێوەچونی قۆناغی دووەمی ئۆپەراسیۆنی گلەزەردەکە یەکێکە لە چالاکییە گەورەکانی هێزی پێشمەرگە لەو ساڵەدا لە ساڵەد، لە شەڕێکی سەختدا لە کاتی هێرش کردنە سەر بارەگای فەجی سوکی ٩٠ شەهید کرا.

* دریڤان عەبدولقادر:
– ساڵی ١٩٨١ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی ٢٠٠٢-٢٠٠٣ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە یاساو ئیدارە لە زانکۆی کەرکوك بەدەستهێناوە.
– سەرپەرشتیاری پەیمانگای کادیرانی کەرکوك بووە ساڵی (٢٠٠٦-٢٠٠٧).
– ساڵی (٢٠١٠) بڕوانامەی ماستەری لە یاسای گشتی بەدەستهێناوە.
– خوێندکاری نامەی دکتۆرایە لە یاسای نێودەولەتی و تەشریعاتی بواری میدیا.
– ئێستا سەرۆکی بەشی تەکنیکی میدیاییە لە زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی، ماوەیەك لە پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی و زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی مامۆستا بووە.
جێگری لێپرسراوی مەلبەندی دووی ڕێکخستنی کەرکوك بووە تا ٢٠١٠ بە هەڵبژاردن.
– بۆ ماوەی ساڵێك سەرنووسەری ڕۆژنامەی کەرکوکی نوێ بووە.
– بەشداری چەندین چالاکی حیزبی و ڕێکخراوەیی کردووە.

دەروێش غەیبوڵڵا سەلیم

دەروێش شاکیری کاکەیی

**کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی پەرلەمانی عێراقی لە ساڵی ١٩٥٨ لە بەغدا**
**ڕیزی پێشەوە لە ڕاستەوە: نووری سەعید، ئەحمەد موختار بابان، زیا جەعفەر، سەعید قەزاز**
**لە ڕیزی پشتەوە داود بەگی جاف دەردەکەوێ**

* (ڕابەر ڕەشید):-

- ساڵی (١٩٦٥) لە گوندی (کتکە) سەر بە شارۆچکەی پردێ ل پارێزگای کەرکوك.
- ساڵی (١٩٨٣) لە خانەی مامۆستایان دەرچووە.
- سەرنووسەری مانگەنامەی (پردێی ئازاد)ە کە لەلایەن (سەنتەری ڕۆشنبیری پردێ)وە دەردەچێت.
- ئەندامی دەستەی نووسەرانی (ئاڵای ئازاد)و گۆڤاری (پێشکەوتن) بووە.
- سەرنووسەری ئەم بڵاوکراوەو ڕۆژنامانە بووە: (پاڵە، دەنگی جووتیاران، پردێ برایەتی،).
- بەرپرسی (سەنتەری ڕۆشنبیری پردێ)یە لە شارۆچکەی پردێ.

* (ڕازی ئیبراهیم):-

- ساڵی (١٨٠٤) لە گەڕەکی حەلواچییەکان لەدایکبووە.
- ساڵی (١٨٧٦)دا کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك.

* (ڕازی مەلا حەکیم):-

- ناوی (مەلا عەبدولحەکیم عومەر شەریف تەرزی)یە نازناوی شیعری (رازی)یە.
- ساڵی (١٩٠٢) لە قەڵای کەرکوك لەدایکبووە.
- ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (قیردار) بووە.
- ساڵی (١٩٨٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (ڕاسخ):-

- ناوی (محەمەد راسخ)ە لە شیعرەکانیدا تەنیا نازناوی (راسخ)ی بەکارهێناوە، شاعیرمان کوڕی عەبدولقادر کوڕی ئەحمەد بەگی یاڵاوزادەی کوڕەزای فەقێ بەکر ئەفەندی کۆنە ئانیبی بەغدایە.
- ساڵی (١٨٨٧)دا لە گەڕەکی (بەگلەر) لە کەرکوك لەدایکبووە. لەدایکەوە دەچێتە سەر بنەماڵەی (نەفتچی)ی ناسراوی کەرکوك.
- کاك ئەحمەد تاقانە نووسیویە: بنەماڵەی نەفتچی گەورەترین بنەماڵەی کەرکوك بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بنەماڵەیە بە تورکمان ناسراون، قسەیەکی زۆر هەیە کە سەر بە عەشیرەتی زەنگەنەن، لەلایەکی دیکەوە شاعیرمان زاوای شێخ ڕەزای تاڵەبانی شاعیرە.
- خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی گەڕەکدا بووەو ماوەیەکیش لەگەڵ محەمەد سادقی شاعیری برادەریدا پێکەوە چوونەتە گوندی (هەرتەل)و لەوێ لای زانایەکی (مەلا فەتحوڵڵا ناسر)، (عەروزیان خوێندووە)، ماوەیەکیش چووەتە (حەلەب) دوای بووەتە ئەفسەر، میدالییەی جەنگیشی وەرگرتووە.
- شاعیرمان ماوەیەك گەڕاوەتە عێراق، ئەگەر چی پایەی موتەسەریفی خراوەتەپێش، ڕەتی کردووەتەوەو ئەمو (نازم بەگی نەفتچی) لەلایەن خەڵکەوە بە (مبعوث) دانراون ونێودراونەتەوە ئەستەمبول.
- (راسخ) ڕۆژانی دوای ژیانی لە ئەستەمبوڵدا بەسەر بردووە.
- ماوەیەك لە پەیمانگای شار بووەتە مامۆستا، کاتێ لە ئەستەمبول بووە لەگەڵ گەلێك شاعیرو ئەدیبدا ناسیاری پەیدا کردووەو دۆستایەتییەکی بەتینی لەگەڵیاندا بەستووە.
- لە ڕۆژنامەی (حوادث)و هی دیکە شیعرو نووسینی بڵاوکردووەتەوە ئەم شاعیرە حەوت ساڵی دوایی بە هەناسە تەنگی بەسەربردووە.
- دوایش تووشی نەخۆشی دیق (سیل) بووە لە ساڵی (١٩٣٦)دا لەو ماڵەیدا مردووە.
- لە کەسانی نزیك و باوەڕپێکراویم بیستووە دوو دەفتەری شیعری کوردی بووەو لە ناوچووە، بەڵام شیعرێکی کوردی لە ژمارە (٢٥)ی ژیانەوە بڵاوکردۆتەوە.

* (ڕاشد کاکەیی):-

- ناوی تەواوی (ڕەشید کوڕی نۆشداری میللی مەحموود فەتاح)ە.
- ساڵی (١٩١٦) لە گوندی (عەلی سەرا) سەر بە قەزای داقوق لەدایکبووە.
- هەر لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە حەزی لە ئاوازو ڕازی کوردی کردووە، لە یاری پاڵەوانێتیدا دەستێکی باڵای هەبووە پڕ هونەرو بەتوانا بووە.
- دەگێڕنەوە لە ساڵی (١٩٤٣)دا چەند پاڵەوانێکی تورك بەرەو ناوچەی داقوق هاتوون وتووشیان بە تووشی ڕاشد کاکەییەوە بووە، توانی پاڵەوانانە خۆی پیشانیان بدات و لە پێش عەشیرەتی تاڵەبانی و کاکەیی لە دەشت و گۆڕەپانی (سیحە) دا شەش پاڵەوانەکەی تورکی بەزاند.
- ساڵی (١٩٥٦)دا لە وێستگەی هێڵی شەمەندەفەرلە شاری دووز خورماتوو بە بەشداربوونی، جەماوەرێکی زۆر کە لە سێ هەزار کەس پتربوون، لەنێوانیاندا (٥٠٠) کەس لە کرێکارو فەرمانبەری هێڵی ئاسنی شەمەندەفەر بوون بە ئامادە بوونی موفەتیشی گشتی مەکنەزی و بەڕێوەبەری گشتی شەمەندەفەری نێوان کەرکوك وبەغدا ئەم زاتە توانی لە پێش چاوی ئامادەبووان ئاسنێکی (ڕێڵ) پێنج مەتری

شەمەندەفەر هەڵگرێتە ئاسمان بۆ ماوەی دوو خولەك‌و رایبگرێت.
- ساڵی (١٩٥٩) كۆچی دوایی كرد لە گوندی عەلی سەرای سەر بە قەزای داقوق نێژرا.

*** (ڕەئوف محەمەد - حاجی ڕەئوف):-**

- كوڕی (حاجی محەمەد وەردە كوڕی سەلیم ئاغا)یە.
- ساڵی (١٨٩٨) لەدایكبووە.
- ناوبانگی بە زیرەكی و بەخشندەیی‌و پیاوەتی لە ناوچەكەدا ناوبانگ دەردەكات.
- فرۆشگایەكی گەورەی بۆ دانەوێڵە لە ناوەڕاستی بازاڕی شارەكەدا هەبوو.
جوتیارەكانی دەورووپشتی گەنم‌و جۆو برنجیان ئەهێنایە لای هەر ئەو ڕۆژە بۆی ساغ دەكردنەوە، كەس نەبوایە خۆی لێی ئەكڕین‌و دوای نەئەخستن.
- یارمەتی هەژارانی ئەداو دەستی نەدارانی دەگرت، فەرمانبەرە غەریبەكانی ئەحەواندەوە، بێ ئەوەی لە ناو هیچ ڕێكخراوەیەكدا بێت بە پارە پاڵپشتی ئەگرتن دەستی یارمەتی درێژ دەكرد بۆ:-
- پانەی سەركەوتن‌و لێ قەوماوانی بوومەلەرزكەی پێنجوێن ساڵی (١٩٤٦)و لافاوەكەی سلێمانی ساڵی (١٩٥٧) پەنابەرانی كۆماری مەهاباد، دامەزراندنی قوتابخانەی ناوەندی لە ساڵی (١٩٤٩).
- یەكەم كەس بوو بانزینخانەی هێنایە كفری وناوچەكە.
- پەیوەندی لەگەڵ بەگزادەكانی جاف، میرانی بابان، سەیدەكانی كفری، وەنداوییەكانی، زەنگەنە، داودە، گێژ زەند، پاڵانی، لە ناو عەرەب‌و توركمان ناسراو و دیاری و خاوەن ڕێز بوو، لە ناو هۆزو بنەماڵەكان ساردی هەبوایە ئەم پیاوی ئاوبژی كەر بوو.
- دەم بە پێكەنین‌و ڕووخۆش، پیاوێكی كەڵەگەتی چوار شانەبوو.
- ساڵی (١٩٦٠) كۆچی دوایی كردووە.

*** (ڕەئوف جەباری):-**

- یەكێكە لە شاعیرەكانی كەركوك‌و لە كتێبی (دلیل الجمهورية العراقية) لە ساڵی (١٩٦٠)دا ناوی هاتووە، بەڵام هیچ زانیاری دیكەمان دەربارەی نییە.

*** (ڕەئوف خانەقا - شێخ ڕەئوفی خانەقا):-**

- (شێخ ڕەئووف كوڕی شێخ سەعید كوڕی شێخ محەمەد)ە.
- ساڵی (١٩٠٢) لە كەركوك لەدایكبووە.
- چەند پۆستێكی بەڕێوەبەری لە ناحییەكانی عێراق بینییوە.
- ساڵی (١٩٥٠) چووەتە ڕیزی حیزبی دیموكراتی كوردستانەوە.
- ساڵی (١٩٦٠) بەڕێوەبەری كتێبخانەی گشتی كەركوك بووە، تاكو ساڵی (١٩٦٦) بەردەوام بووە.
- ساڵی (١٩٦٣) چەند جارێك گیراوە، لە هەمان ساڵ دوور خراوەتەوە بۆ ڕومادی.
- ساڵی (١٩٧١) هەڵبژێردراوە بە سەرۆكی یەكێتی نووسەرانی كورد لقی كەركوك.

- لە (١٧)ی ئایاری ساڵی (١٩٧٣) لە تەق تەق كۆچی دوایی كردووە‌و لەوێ نێژراوە.
- ساڵی (٢٠٠٠) دیوانێكی شیعری لە سلێمانی بە چاپی گەیاندووە بە ناونیشانی (یادگاری خانەقا)، ساڵی (٢٠١٣) بۆ جاری دووەم بە چاپی گەیاندووەتەوە.

*** (ڕەئوف عەلی بریندار):-**

- ساڵی (١٩٣٩) لە گەڕەكی ئاخوڕ حوسێن لەدایكبووە.
- لە (١)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٦١) تا ساڵی (١٩٦٤) دەبێتە مامۆستای سەرەتایی.
- ساڵی (١٩٦٤) تا ماوەی ساڵ ونیوێك لەلایەن ڕژێمەوە دەگیرێت، بەڵام دوای ماوەیەك ڕەوانەی ڕومادی كراوە لە

سەرکارەکەی لابراوە.
– ساڵی (١٩٦٦) چووەتە کارگەی کۆلاو بووەتە چاودێر لە کارەکەیدا.
– بەڵام لە (١٥)ی تەمموزی ساڵی (١٩٧٤) لەلایەن رژێمەوە دووبارە دەگیرێتەوە گەلێك تۆمەتی نابەجێ بەسەریدا دەسەپێنێت تا بەوەی لە (١١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٤) فەرمانی لە سێدارەدانی دەدرێت.
– گەلێك نووسینی بەزمانی عەرەبی وکوردی هەبووە بەڵام مەخابن گشتی لە ناو چووە.

* (رەئوف کەرکوکی - سەید رەئوف کەرکوکی ):-

– هیچ شتێك دەربارەی نازانرێت بەڵام یەکێك بووە لە ئەفسەرانی کوردستان لە سەردەمی شێخ مەحموودی نەمردا.

* (رەحمەتوڵڵای گلی - مەلا رەحمەتوڵڵای گلی ):-

– ناوی (رەحمەتوڵڵا کوری مەلا ئەحمەد -بە ناوبانگ بە مەلا ئەحمەد چاوش- کوری مەلا مستەفا)یە کە لەناوچەی گلی جەباری بووە.
– ساڵی (١٨٣٨)ی زاینی لەدایکبووە.
– ژیانی بە رەوەندی لە گوندەکانی (حەسار، خاڵە بازیانی، لەیلان) بەسەر بردووە.
– شیعری بە زمانی کوردی‌و عەرەبی‌و تورکی‌و فارسی نووسیوە.
– لە شەری جیهانی یەکەم نەچووە بۆ سەربازی‌و لە لادییەکانی کەرکوك خۆی شاردۆتەوە تا لە دواییدا بووە بە ئیمامی مزگەوتی گەرمکی بەگلەر.
– ماوەیەك هاتووەتە گوندی (قەرەبلاخی زەنگاباد)و پاشان چووەتە کەرکوك.
– ساڵی (١٩١٨)ی زاینی لە تەمەنی ٨٣ ساڵی لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

* (رەحمەتوڵڵا شەڵتاغ ):-

– (رەحمەتوڵڵا کوری سوڵتان ئاغا کوری خەلیل)ە، کە بە ناوبانگ بووە بە (شەڵتاغ) یان (شەڵتاغ کەرکوکی).
– زۆربەی پەیوەندی دارانی مەقام بە یەکێك لە کوردەکانی عێراق دەزانن، هەر چەندە چەن کەسێك لەگەڵ باوك ومامی بۆ بەغدا رۆیشتووە، بەڵگەکان ئەوە دەخەنە روو کە لەگەڵ باوکی‌و مامی (نوعمان ئاغا) لە کازمییە نیشتەجێ بوونە.
– چەند راوبۆچوونێك هەیە لەسەر ساڵی لەدایکبوونی، هەندێك ئاماژە بە ساڵی (١٧٩٨) دەکەن‌و هەندێکی تریش لەنێوان (١٧٥١)، (١٧٩٣) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
– بەڵام (شێخ جەلال حەنەفی) لە کتێبی (المغنون البغدادیون) دا لەم بارەیەوە دەڵێ: ناوبراو بە (شەڵتاغ) دەناسراو زۆربەی خەڵکی دەڵێن کوردەو لە شاری (کفری) هاتووەتە دنیاوە، بۆیە تاوەکو ئێستاکە مێژووی لەدایکبوونی بە تەواوەتی نازانرێت.
– بەڵام برا تورکمانی ئێرە بە یەکێك لە ئەندامانی هۆزی بەیاتی دەزانن هەر چەندە دوورە لە راستییەوە، شەڵتاغ ناونیشانی (کوری سولتان) بووە، جارێکیان بۆ بەرتەکیەی کەرکوك دێت، ئەوکاتە (شێخ عەبدولرەحمان) لێپرسراوی تەکیەی تاڵەبانی دەبێت کە چاوی بە شەڵتاغ دەکەوێ، بەدوای (وەلی مەقام خوێن)دا دەنێرێ بۆ بەشداری کردنی خوێندنی مەقام لە تەکەیی تاڵەبانی.
– شلتاغ سەرەتا لە سەر دەستی هەندێ مەقام خوێنی بە ناوبانگی وەك ماشائەڵڵای مەندەلاوی ومەلا عەبدولرەحمان وەلی کفری وهی دیکەش فێری خوێندنی مەقام بوو.
– لە هەمان کاتدا لەژێر دەستی کۆمەڵێك مامۆستای بواری گۆرانی‌و مەقام لە بەغدا فێری بنەماکانی ووتنی مەقامی عێراقی بووە، هەر لەوانیشەوە توانیویەتی ئەو توانا هونەرییەی خۆی پەرە پێبدات.
– لە بەغدا لە قاوەخانەی (ئەلشەت) کە دەروانێتە سەر رۆخی رووباری دیجلە لە (رەسافە) هەردەم مەقامی خوێندووەو بایەخی بە خوێندنی مەقامی عێراقی داوە، بە تایبەتی بە زۆریش لەگەڵ تیپی (چالغی)دا، کە هەر یەکە لە ئەندامانی تیپەکە بریتی بوونە لە:
١. حزقێل شەمولی عەزرە (١٨٠٤ – ١٨٩٤)، سەنتوورژەن.
٢. لوتفی رزەبیچ مەندەلاوی، جۆزەژەن.
٣. حزقێل شۆتە مینیر (١٨٠٤ – ١٩١٧)، رەقەژەن.
٤. هارون زەنگی رۆبین، تەپڵ لێدەر.
– (رەحمەتوڵڵا شەڵتاغ) لە ماوەی ژیانیدا گەلێك گۆرانکاری‌و داهێنانی کردووە لە بواری مۆسیقاو مەقامدا، دەتوانین بڵێن داهێنانەکانی دەوری گرنگی بینیووە لە پێشکەوتنی مۆسیقاو مەقامدا:

– یەکەم کەسە کە پارچەی (ئەلسەیەرەنگ) لە مەقامی (راست)دا بەکارهێناوە.
– یەکەم کەسە کە مەقامی (ئیبراهیمی) خوێندووە لە دووگادا، چونکە مەقامی (ئیبراهیمی) خوێندنی زۆر قورس بووە.
– هەستاوە بە گواستنەوەی گەلێك مەقاماتی کەرکوك بۆ بەغدا، بە تایبەتیش (قۆریات)، بەناوبانگترینیان مەقامی (مۆجیلە) کە لەلایەن (مۆجی) کەرکوکییەوە داهێنراوە، کە

لە بەغدا پێی دەوترێت مەقامی (مودمی).
- داهێنان لە مەقامی (تەفلیس)دا، هەستاوە بە دانانی پارچەی (ئەلسونبولە) لە مەقامی (ئیبراهیمی).
- هەموو مەقامەکانی بە شێوەیەکی جوان ووتووە بە تایبەتی (راست، سێگا، ئیبراهیمی، بەیات، تاهیری، باجەلان، قۆریات، بەشیری، تەفلیس، بەختیاری، مۆجیلە).
- لە رووی دەنگەوە توانایەکی بەهێزو فراوانی هەبووە.
- گەلێك لە مەقام خوێنەکانی وەکو (ئەحمەد زێدان، مەلا عوسمان موسڵی، ورباز، ئەبو حەمید، سالح ئەبو دمیر، حاجی حەمەد نەیار) لاسایی دەنگیان کردووەتەوە، گەلێکیشیان مامۆستای بەناوبانگیان لێ دەرچووە.
- ساڵی (١٨٧١) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی شێخ عومەر لە تەمەنی (٧٨) ساڵیدا.

*** رەحیم حەسەن محەمەد حەسەن:-**

- ساڵی (١٩٧٤) لە گوندی نارلوجەی ئەحمەد رەجەب سەر بەناحیەی شوان لە دایك بووە.
- خوێندنی سەرەتای لە گوندەکە تەواو کردووە.
- ئامادەیی لە شارۆچکەی (تەق.. تەق) تەواو کردووە.
- دەرچووی پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانە لە رانیە

*** بەرهەمە رۆژنامەوانییەکانی:-**

- رەخنەی سەرۆکی حکومەت و هەڵوێستی نوێی ئەمریکا. ژمارە (٣٢١) رۆژنامەی هەواڵ، ٢٨ ئاداری، ٢٠٠٩.
- لەنێوان ئەم بیرکردنەوانەدا سەرپشك بە عێراقیت یان کوردستانی؟ رۆژنامەی هەواڵ ژمارە ٣٢٨، ١٦ ئاداری ٢٠٠٩.
- یەك پارچەیی خاکی عێراق بە دەستوورەوە بەندە، رۆژنامەی باسەرە، ژمارە ٢٣٤ ساڵی ٢٠٠٨.
- بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە فەرهەنگی داگیر کەراندا. رۆژنامەی باسەرە ژمارە٢٢٤، ساڵی (٢٠٠٧)، ٢١ تشرینی دووەم.
- لە دادگایی کردنەکەی سەدام دا کێ داوا تۆمار بکات، رۆژنامەی باسەر، ژمارە ١٦٢ ساڵی (٢٠٠٦).
- مادەی ١٤٠ مادەیەکی دەستووره یان خاڵێکی ستراتیژی، رۆژنامەی کەرکوکی ئەمرۆ، ژمارە ١٥٦، ساڵی (٢٠٠٧).
- مادەی ١٤٠ یەکێکە لە مادە ستاتیژییەکان، رۆژنامەی کەرکوکی ئەکرۆ، ژمارە ١٢٤، ساڵی (٢٠٠٦).
- کوردایەتی لەنێوان ئینتیماو هەرەمەکەی ماسلۆدا، رۆژنامەی کەرکوکی ئەمرۆ، ژمارە ١٢٤ ساڵی (٢٠٠٧).
- مشتومڕەکان لە سەرڏانانی سەرۆکی پەرلەمان ئاماژەیە بۆ ئاکرەوی لە دەسەڵاتدا، رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٣١٨، ساڵی (٢٠٠٩).
- رێگرییەکانی دەستووری تورکی لەبەردەم چاکسازی ئەتنیکیدا، رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە، ٢١٨ ساڵی (٢٠٠٩).
- ئامانژەی پشت هەڵبژاردنەکانی شارەوانی تورکیا، رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە، ٣٢٢ ساڵی (٢٠٠٩).
- پێکانی ئامانجەکانی راپەڕین لە کوێی دەسەڵاتی کوردی دایە، رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٣٢٠، ساڵی (٢٠٠٩).
- شەرمی سەرکردایەتی سیاسی کورد تاکەی!! رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٣١٥، ساڵی (٢٠٠٩).
- چەند سەرە قەڵەمێك لەسەرکتێبی حەپسەخانی نەقیب، رۆنامەی هەواڵ ژمارە، ٣٢٩، ساڵی (٢٠٠٩).
- سیاسەتی ئەمریکا لەنێوان نەوت و پرۆژەکەی کامیانە؟! رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٢٥٩، ساڵی ٢٠٠٧.
- حەماس، ئەوبزنەی ئانی شوانەکەی خوارد. رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٣١٣ ساڵی (٢٠٠٩).
- یەکسانی رەگەزی لە سەربەخۆیی ئابووری دایە.. رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٣١٢ ساڵی (٢٠٠٩).
- برکردنی زمانی کوردی بەپێی دەستور لە پەروەردەی کەرکوك داتا چەندە؟ رۆژنامەی باسەرە، ژمارە ٢٥٧، ساڵی (٢٠٠٨).
- ریپۆرتاژ.. فەرامۆشکردنی خوێندنی کوردی لە پەروەردەی کەرکوك داتا چەندە؟! رۆژنامەی رۆژنامەی کەرکوکی نوێ، ژمارە ٥٢، ساڵی (٢٠٠٩).
- خەفەکردن و گۆشەگیرکردنی زمان و نەژادی تر جگە لە دۆگمابوون ئاکامی تری نیە، رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٣٢٥، ساڵی (٢٠٠٩).
- گرەوکردن لە سەردەستور، کوردستان و عێراق بەرەو کوێ دەبات. رۆژنامەی هەواڵ ژمارە ٤٨٠ ساڵی (٢٠١٢).
- ئاستی هەڵوەستەکردنی دەسەڵات داران لە سەرپیرۆکەی ئەنفال.. رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٤٦٨، ساڵی (٢٠١٢).
- ئامانجە دوورو نزیکەکانی تورکیا لە رۆژئاوای کوردستان. رۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٤٨٣، ساڵی (٢٠١٢).
- پێکەنینە دەستکردەکان. رۆژنامەی کەرکوکی ئەمرۆ ژمارە ١٢٧، ساڵی (٢٠٠٦).
- چەند خۆزگەیەك لە وتارەکەی سەرۆك کۆماردا، رۆژنامەی کەرکوکی نوێ، ژمارە ١٦٤، ساڵی (٢٠٠٧).
- راستیەکانی شاری کەرکوك و ئەرکی رۆشنبیران.. گۆڤاری بانە رۆژ، ژمارە ٢٩، ساڵی (٢٠٠٦).
- گفتوگۆی تورکیا.. کوردستان، گۆڤاری دەریا، ژمارە ٣٩، ساڵی (٢٠٠٨).
- رێژەی سەرکەوتنمان لە شەڕی دەستووردا.. رۆژنامەی رێگای کوردستان ژمارە ٧٧٠ ساڵی (٢٠٠٧).
- کار وابروات دەستوور دەبێتە بەشێك لە مێژوو.. رۆژنامەی کەرکوکی ئەمرۆ ژمارە ١٧٢، ساڵی (٢٠٠٧).
- ناوەندی کەرکوکی کۆمەڵەی چالاکییەکانی هاموون لەنێوان وەهم و راستیدا رۆژنامەی کەرکوکی ئەمرۆ، ژمارە ١١٣، ساڵی (٢٠٠٦).
- گۆرانکاری جەوهەری یان پەلەقاژی مەرگ، رۆژنامەی کەرکوکی ئەمرۆ ژمارە ٦٩٧، ساڵی (٢٠٠٥).
- ئەرکەکانی رۆژنامە گەری کوردی، رۆژنامەی کەرکوکی ئەمرۆ، ژمارە ١٦٤، ساڵی (٢٠٠٧).
- گەندەڵی ئیداری و ئاستی پاك و خاوێنی قوتابخانەکان، رۆژنامەی باسەرە، ساڵی (٢٠٠٧).
- ململانییەکانی تورکیا و ئەمریکا و عەقڵییەتی سەرانی تورك، رۆژنامەی کەرکوکی ئەمرۆ، ژمارە ١٣٧، ساڵی

(٢٠٠٧).

– کەرکوک پێوەرێکی عەیارە (٢٤) بۆ دەسەڵاتی کوردی، ڕۆژنامەی باسەرە ژمارە ١٧٨، ساڵی (٢٠٠٦).

– چارەسەری کێشەی عێراق دابەشکردنە، نەك پرۆژەکەی (بیکەر.. هاملتۆن). ڕۆژنامەی باسەرە، ژمارە ١٨٠، ساڵی (٢٠٠٦).

– لادەرانی دەستووری عێراق کێن؟، ڕۆژنامەی باسەرە، ژمارە ٢٣١ ساڵی (٢٠٠٨).

– کوتەکەکەی ژێر عەباکەی سەدامو هەواڵەکەی ڕۆژنامەی!!! ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژمارە ٤٥٦، ساڵی (٢٠٠١)، ئەم بابەتەم بەناوی (سەربەست) بلاوکردەوە.

– لە سەرکەوتنی هەڵبژاردەی عێراق چیمان دی. ڕۆژنامەی باسەرە ژمارە ٢١، ساڵی (٢٠٠٨).

– تەنیاسێبەری خۆیان دەبینن لە بەیانیانو.!!! ڕۆژنامەی کەرکوکی نوێ، ژمارە ٢٨، ساڵی (٢٠٠٩).

– بەرنامە نابەجێیەکانی خوێندن بگۆڕن. ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان ژمارە ٤٤٢، ساڵی (٢٠٠١).

– دەستخۆشی بۆ دانەری ئەلف بێ و سەرنجێك بۆ ٢١٢، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژمارە ١٥٩، ٢٠٠١

– ڕێچکەی ڕاستەقینەی هەڵبژاردنی شاری کەرکوك و مەرامی سیاسی، ڕۆژنامەی تاك، ژمارە١، ساڵی ٢٠٠٥

– سەرکردە (ڕێبەر کێیە)، ڕۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٥٤٢، ساڵی ٢٠١٣.

– نواندنی خەمەکان بە زمانی نەسینی ڕۆژنامەی کەرکوکی ئەمڕۆ، ژمارە ١٣٧، ساڵی ٢٠٦.

– پەرلەمان و سەرۆکی هەرێم بڕیارتان چییە؟ ڕۆژنامەی کەرکوکی ئەمڕۆ، ژمارە ٩٤، ساڵی ٢٠٠٥.

– دەنگ نەدان وەستاندنی کۆمەڵگە، ڕۆژنامەی تاك، ژمارە٩ ساڵی ٢٠٠٥.

– جۆرەکانی عەرەق، ڕۆژنامەی تاك، ژمارە١٦، ساڵی ٢٠٠٦.

– دەم سپییەکان لە دەم سپییەوە نەبنە دەست سپی، ڕۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٢١١، ساڵی ٢٠٠٦.

– نەسروڵلاکان و نموونەکانیان هەر ڕاوەستن، ڕۆژنامەی باسەرە، ژمارە ١٤٧، ساڵی ٢٠٠٦.

– کاریگەری فرۆشتنی چەکی پلاستیکی لەسەر ئایندەی منداڵ، ڕۆژنامەی باسەرە، ژمارە ٢٢٩، ساڵی ٢٠٠٨.

– ئاستی ڕەگەز پەرستی پەرلەمانی تورکیا، ڕۆژنامەی باسەرە، ژمارە ٢٢٢، ساڵی ٢٠٠٧.

– سەرۆکی هەرێم لەپاڵ کاترینا ئەم بڕیارانەش، ڕۆژنامەی کەرکوکی ئەمڕۆ، ژمارە٨٨ ساڵی ٢٠٠٥

– ئەگەر دەنگ نادەی ڕەخنەش مەگرە، ڕۆژنامەی باسەرە، ژمارە١١٨، ساڵی ٢٠٠٨

– لەنێوان تەختەی شانۆ و شۆستەدا، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژمارە ٦٩١، ساڵی ٢٠٠٦.

– جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەی بەغدا، یەکسانە بە ناوچەی سەوز لە کوردستان، ڕۆژنامەی کەرکوکی ئەمڕۆ، ژمارە ٢٤٧، ساڵی ٢٠٠٨.

– کۆمەڵگەی مەدەنی و ڕۆڵی ڕۆشنبیر، ڕۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٢٥٠، ساڵی ٢٠٠٧.

– چەند سرووتێك بۆ پێشمەرگە و شەڕڤان، ڕۆژنامەی هەواڵ ژمارە ٦٢٨، ساڵی ٢٠١٥.

– کارتی داعش و کارتی بەرامبەر، ڕۆژنامەی ژمارە ٦٠١، ساڵی ٢٠١٥.

– بیری سۆشیالیزم لە هۆنراوەکانی قانیعدا، ڕۆژنامەی هەواڵی ژمارە ٦٥٢، ساڵی ٢٠١٦.

– ستاندەری تیڤییەکان و پرۆسەی پەروەردە لە چ ئاستێکدایە، ڕۆژنامەی کەرکوکی نوێ، ژمارە ٤٧، ساڵی ٢٠٠٨.

– ئایا، دەچیت بۆ دەنگدان، ئەگەر دەچیت بۆ؟ ئەگەر ناچیت بۆ؟، ڕۆژنامەی باسەرە، ژمارە ١١، ساڵی ٢٠٠٥.

– ئەنفال لەنێوان قڕکردن و بەکارهێناندا، ڕۆژنامەی تاك ژمارە٢، ساڵی ٢٠٠٥.

– بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لەنێوان بەرژەوەندی وڵاتان و ڕێکردنی ڕاستەقینەی خۆیدا، گۆڤاری کەرکوکی ئەمڕ، ژمارە ١٨٢، ساڵی ٢٠٠٩.

– با هەولێر ببێتە مەڵبەندی سەرەکی چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد، گۆڤاری کانیاو، ژمارە ١٤، ساڵی ٢٠٠٨.

*** ( ڕەزای تاڵەبانی - شێخ ڕەزای تاڵەبانی ):-**

– (ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی خاڵس کوڕی ئەحمەد کوڕی مەحموودی تاڵەبانی)یە.

– ساڵی (١٨٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.

– خوێندنی لە قوتابخانە ئایینپیەکانی کەرکوك تەواو کردووە، ڕۆیشتووە بۆ ئەستەمبول بۆ خوێندن لە ساڵی (١٨٦٠)و لەوێ فێری زمانەکانی فارسیو تورکیو عەرەبی بووەو ڕۆشنبیری فراوان بووە، لەوێ چاوی کەوتووە بە

نووسەری تورك نامق كەمال (١٨٤٠-١٨٨٠).
- لە دوای ماوەیەك هاتووەتەوە كۆیەو ئینجا كەركوك‌و لەدوایدا لە بەغدا گیرساوەتەوە تاكو (٢٠)ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩١٠) كۆچی دوایی كردووەو لە گۆڕستانی گەیلانی نێژراوە.
- دەتوانین بڵێن بە دامەزرێنەری شیعری هەجوو دادەنرێت لە ئەدەبی كوردیداو دەستێكی باڵای هەبووە لەو بوارەدا.
- لە بەرهەمەكانی كە لە دوای كۆچ كردنی بە چاپ گەیەنراوە:
- (دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، چاپی یەكەم، بەغدا، ١٩٣٥، چ ٢ بەغدا، ١٩٤٦، چاپی سێیەم، مهاباد.
- (دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، چاپی یەكەم، سلێمانی، ١٩٩٩، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، هەولێر، ٢٠٠٠.

*** (ڕەزا شوانی):-**

- ناوی (ڕەزا ساڵح عەلی گۆگجەیی)یە.
- یەكێكە لە نووسەرەكانی كەركوك كە لە حەفتاكان جێ پەنجەی دیارە، ئێستا لە تەراوگە لە نەرویج دەژێت.
- ساڵی (١٩٤٦) لە دێی (گۆگجە) لەدایكبووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی لە كەركوك تەواو كردووە.
- ساڵانی (١٩٦٣-١٩٦٤) لە ڕیزی پێشمەرگەی كوردستان لە ناوچەی (قەرەحەسەن)و (قەرەداغ) خزمەتی كردووە.
- ساڵانی (١٩٦٥-١٩٦٧) لەلایەن ئەمنی كەركوك‌و ئەمنی بەعقوبەوە لەسەر هەڵوێستی كوردایەتی گیراوە.
- ساڵی (١٩٦٨) پەیمانگای ئامادەكردنی مامۆستایانی لە بەعقوبە تەواو كردووە.
- ساڵانی (١٩٦٩-١٩٩٥) مامۆستا بووە لە كەركوك.
- ساڵانی (١٩٦٧-١٩٩٥) لە ڕۆژنامەو گۆڤارە كوردییەكاندا نووسینی هەمەچەشنەی بڵاوكردووەتەوە بە تایبەتی بۆ منداڵان.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی (هەڵەشەیی)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٧٠.
- ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٣) بە ناوی (هیوا)و (شوان)ەوە پەیامنێری ڕۆژنامەی (هاوكاری) بووە لە كەركوك.
- ساڵی (١٩٧١) ئەندامی دەستەی دامەزرێنەرو ئەندامی یەكەمین دەستەی بەڕێوەبەری یەكێتی نووسەرانی كورد لقی كەركوك بووە.
- ساڵانی (١٩٨٤-١٩٩٤) ئامادەكەری بەرنامەی (جیهانی منداڵان) بوو لە تەلەفزیۆنی كەركوك.
- ساڵی (١٩٩٦) هاتووەتە هەندەران‌و لە نەرویج نیشتەجێیە.
- ساڵانی (٢٠٠٠-٢٠٠٢) مامۆستای زمانی كوردی بووە لە نەرویج.
- ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٥) لە شاری (بێرگن) لە نەرویج رادیۆی (كوردستان)ی كردەوە كە هەموو پرۆگرامەكانی خۆی ئامادەی كردووە.
- لە (٢٥)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٦) لە نەرویج كۆمەڵەی منداڵانی كوردی دامەزراندوەو خەریكی دەرهێنانی گۆڤارێكی منداڵانە لە تاراوگە كە تاكو ئێستاكە چوار ژمارەی چاپ كراوە بە ناوی (كوردیلەكان).
- ساڵی (٢٠٠٨) لە پێشبركێی ئەدەبی منداڵان لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری كوردستان دوو خەڵاتی یەكەمینی چیرۆك‌و هۆنراوەی وەرگرتوو.
- كتێبی داهاتووی بە ناوی (بەراوردێك لەنێوان پەندی كوردی‌و پەندی گەلان)ە.
- چاوپێكەوتنێك بە مێژووی ئەدەبی منداڵان، ٢٠١٥.

*** (ڕەزای واعیز - مەلا ڕەزای واعیز):-**

- (مەلا ڕەزا كوڕی وەیسی، عەشیرەتی زەنگەنە)یە.

- ساڵی (١٨٧٠) لە كەركوك لەدایكبووە.
- بە زمانەكانی عەرەبی‌و توركی‌و كوردی‌و فارسی دیوانی شیعری هەیە.
- لەژێر دەستی مەلا محەمەد فەیزی ئەفەندی زەهاوی لە

بەغدا خوێندنی تەواو کردووە لە قوتابخانەی سلێمانی، ئینجا گەڕاوەتەوە کەرکوک.
– ساڵی (١٩٢١) بووەتە بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوک و مامۆستاو ئیمامەتی گەلێک لە قوتابخانەی مزگەوتەکانی کەرکوکی کردووە، وەکو قوتابخانەی (تۆقات).
– هەڵبژێردراوە بە ئەندامی ئەنجوومەنی ئەوقاف و ئەندامی ئەنجوومەنی ئەوقافی زانستی و سەرۆکی زانایانی ئایینی کەرکوک بووە تاوەکو کۆچکردنی.
– یەکێک بووە لەوانەی زۆر تێکۆشاوە لە دژی ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩١٨).
– زمانەکانی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی بە باشی زانییوە لە رووی ئەدەب و زمانەوە.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی: (منظومة العوامل للجرجاني).
– ساڵی (١٩٦٣) لە بەغدا لەلای کورەکەی نورەددین واعیز کۆچی دوایی کردووەو لە قەبرستانی ئەعزەمیە نێژراوە.

* (ڕەسوڵ حاوی):-

– ناوی (ڕەسوڵ کوڕی مەلا یەعقوب ماهونی)یە، کە ناسراوە بە نازناوی (حاوی) برای (ثاقب خدر)ە.
– ساڵی لەدایکبوونی نازانرێت بەڵام لە ساڵی (١٨٢٦) کۆچی دوایی کردووە.
– ساڵی (١٨١٤) لە سەردەمی (عەلی پاشا) بووەتە کاتب و چووەتە بەغدا.
– لە کتێبە چاپکراوەکانی:
– (دوحة الوزراء نظمي زاده مرتضى نين كلشن خلفا آدي ايلة يازديغي بغداد تاريخنه ذيلدر)، مێژووی عێراق لە سەردەمی عوسمانی بە زمانی تورکی، چاپی یەکەم بەغدا، ١٨٢١، چاپی دووەم چاپخانەی (دار السلام)، بەغدا، ١٨٣٠.
– (دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء)، دوو بەرگ بە زمانی تووركی، وەرگێڕانی موسا کازم نەورەس، چاپخانەی (کرم)، بەیروت، ١٩٦٣.

* ڕەسوڵ عومەر لەتیف - وەستا ڕەسوڵ:-

– ناسراو بەوەستا ڕەسوڵ. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٧)ی کەرکوک. دەرچووی کۆلێژی ئێوارانی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی سلێمانی.
– ساڵی (١٩٧٩) لە کەرکوک پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.
– ساڵی (١٩٨٨) بووە بە پێشمەرگە لە سوپای ڕزگاریی کوردستان (سرک) و لێپرسراوی هێڵی بابەگوڕگوڕ.
– ساڵی (١٩٩١) لەکاتی ڕاپەڕیندا یەکێک بوو لە فەرماندەکانی هێزی بروسک و ڕۆڵی بەرچاوی لە ڕزگارکردنی شارەکانی هەولێرو کەرکوکدا هەبوو. هەمان ساڵ بووە لێپرسراوی کۆمیتەی ئاوارەکانی کەرکوک لە ڕانیە.
– ساڵی (١٩٩٣) بووە فەرماندەی فەوجی تایبەتی ئاوارەکانی کەرکوک لە ڕانیەوە.
– ساڵی (١٩٩٥) بووە کارگێڕی مەڵبەندی پێشمەرگە لە ساڵی (١٩٩٩) بە هەڵبژاردن بووە جێگری لێپرسراوی ئەو مەڵبەندە.
– ساڵی (٢٠٠٣) بووە لێپرسراوی بەشی خانەنشینی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و ساڵی (٢٠٠٥) گەڕایەوە بۆ خزمەت کردن لە مەڵبەندی پێشمەرگە.
– لە پێشمەرگایەتیدا شەش جار بریندار بووە، لە یەکێکاندا لە ساڵی (٢٠٠١)دا بەسەختی بریندار بوو، ئەمەش بووە هۆی لە دەستدانی قاچێکی و لەم سەروبەندەدا ٢٢ جار لە دەرەوەو ناوەوەی وڵات نەشتەرگەریی بۆ کراو ٢٧ بوتڵ خوێن کراوەتە جەستەیەوە. بەپێی پێوانە بەکارهێندراوەکان ڕێژەی کەمئەندامییەکەی گەیشتۆتە ٨٥٪.
– ساڵی (٢٠١٠) لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی بەئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی هەڵبژێردراو لە هەمان ساڵ بوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی چەمچەماڵ.
– ساڵی (٢٠١٣) لە سۆنگەی باری تەندروستییەوە وازی لە لێپرسراوێتی مەڵبەند هێناو گوێزرایەوە بۆ کارکردن لە مەکتەبی ڕێکخستن.
– ئێستا بەرپرسی میحوەری چوارە لە کەرکوک لە وەزارەتی پێشمەرگە.

* (ڕەشید ئەحمەد محەمەد (ڕەشید-رشدی)):-

– ساڵی (١٨٩٣) لە گەڕەکی موسەڵلا لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٣٣) لە قەبرستانی داقوق نێژراوە.

* (ڕەشید ئاغای زەنگەنە):-

– ناوی (عەبدولکەریم ڕەشید جاسم ئاغای زەنگەنە)یە.
– ساڵی (١٨٦٤) لە گوندی (گوڵباغ)ی سەر بە قادر کەرەم لەدایکبووە.
– پۆلی چواری سەرەتای هەر لە قوتابخانەی قادرکەرەم تەواو کردووە لە منداڵیشەوە لەلای مەلا ئەمین و مەلا حوسێن و باوکی فێری خوێندنی ئایینی قورئانی پیرۆز بووە.
– فارسی و عەرەبی و تورکی بە باشی دەناسی.
– ساڵی (١٩٥٨)دا لە دێیەکەیان (قەرەوەیس) گوزاراونەتەوە

بۆ ناوچەی قەرەحەسەن دواتر بۆ ناو شاری کەرکوکو لە گەڕەکی (بلاغ) نیشتە جێ بوونە.
- ساڵی (١٩٦٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (ڕەشید چاوش):-

- یەکێك بوو لە پیاوە دەوڵەمەندەکانی چەمچەماڵ وا بزانم لە سلێمانییەوە هاتبووە چەمچەماڵ.
- بەڵام ئەم زاتە یەکەم کەس بوو جلی ڕانکچۆغەی هێنا بۆ چەمچەماڵ وبە هەمیشەیی لە بەری دەکردو بەرە. بەرەبڵاوبووەوە خەڵکی قەزاکەو هەموو دێهاتەکانی دەوروپشتی کەواو سەڵتەو فەقیانەی گەورەیان بە کار دەهێنا.

* (ڕەشید حەسەن حەمید دەلۆیی - دکتۆر ڕەشید حەسەن حەمید دەلۆیی):-

- ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٢) بەکالۆریۆسی لە کۆلێژی کشتوکاڵ بەشی بەروبوومی ئاژەلی لە زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
- لە (١٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٣) لە وەزارەتی خوێندنی باڵا دامەزراوە.
- ساڵی (٢٠٠٢) بروانامەی ماستەری لە تەکنەلۆژیای گۆشت لە کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی تکریت بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٨) بروانامەی دکتۆرای لە خواردن لە زانکۆی تکریت بەدەستهێناوە.
- ئەم لێکۆڵینەوانەی لە بوارەکەی خۆیا بڵاوکردووەتەوە:
- (تاثير اضافة الاسبرين في العلف، الصفات الانتاجية لأفراخ اللحم المرباة بكثافة عالية خلال الصيف)، لە گۆڤاری (التقني)، لە سالی (٢٠١١) بڵاوکراوەتەوە.
- (تاثير إضافة الاسبرين إلى عليقة افراخ اللحم المرباة بكثافة عالية خلال اشهر الصيف نسب بروتينات الدم)، لە گۆڤاری (الانبار للعلوم البيطرية)، لە ساڵی (٢٠١٠) بڵاوکراوەتەوە..
- (تاثير إستخدام الحنطة المحلية مع اضافة انزيم الفايتيز ومخلوط الانزيمات المحللة للالياف او كلاهما على الاداء الانتاجي لفروج اللحم)، لە کۆڕی زانستی دەیەم کە لە (مركز احياء التراث العربي) لە زانکۆی بەغدا لە ساڵی (٢٠١٠) پێشکەش کراوە.
- (تاثير إستخدام القمح الشليمي بدلا من الحنطة مع إضافة انزيم الفايتيز ومخلوط الانزيمات المحللة للالياف او كليهما على الاداء الانتاجي الصفات النوعية لذبيحة فروج اللحم)، لە کۆڕی زانستی دەیەم کە لە (مركز احياء التراث العربي) لە زانکۆی بەغدا لە ساڵی (٢٠١٠) پێشکەش کراوە.
- (دراسة الصفات النوعية الفيزيوكيمياوية والميكروبية على الذبائح المجمدة المستوردة).
- (دراسة إحلال بيكربونات الصوديوم محل كلوريد الصوديوم على الصفات الانتاجية والفسلجية لفروج اللحم).
(-Qualry chmical & microbial characterisktics of table eggs at retai stores in Baghdad)، لە گۆڤاری (علوم دواجن باكستان) لە ساڵی (٢٠١١) بڵاوکراوەتەوە.
- (تاثير إضافة قشرة البيض بدلا من كاربونات الكالسوم لفروج اللحم على الاداء الانتاجي)، لە کۆنفرانسی زانستی دووەم بە ناونیشانی (مؤتمر الوراثة والبيئة)، لە (١٩ - ٢٠)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٣) پێشکەش کراوە.

* (ڕەشید ساڵح):-

- شاعیر لە ساڵی (١٨٦٦) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی لە ئەستەمبوڵ لە قوتابخانەی سوڵتانییە تەواو کردووەو نووسەر بووە لەلای سوڵتان عەبدولحەمید لە سەردەمی عوسمانییەکان.
- شارەزای بووە لە زمانەکانی کوردیو ئینگلیزیو فەرەنسیو ئەڵمانیو تورکی.
- لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٨٩٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (ڕەشید عەلی داقوقلی):-

- ساڵی (١٩١٨) لە داقوق لەدایکبووە.
- لە (١٩)ی تەمموزی ساڵی (١٩٧٥) لە داقوق کۆچی دوایکردووە.
- نازناوی شیعری (داقوقلی) بووە.
- بەرهەمەکانی (دەکمە یارەمە)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (التضامن)، بەغدا، ١٩٧٣

* (ڕەشید عاکف هورمزی):-

- (ڕەشید عاکف کوڕی حاجی عەلی کوڕی زەینوعابدینە ئەفەندی)یە.

- ساڵی (١٨٩٤) هاتووەتە دنیاوە.
- لە (١٧)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٣) کۆچی دوایی کردووە.

* ( ڕەشید کازم بەیاتلی ):-

- ساڵی (١٩١٤) لە کفری لەدایکبووە.
- لە (٢٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٣) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمەکانی:
- (مکتبلی شرقی و شعرلری)، شیعر لە زمانی تورکی، چاپخانەی (جمهوریت)، کەرکوك، ١٩٦٧.
- (تورکمنجه الفباء)، چاپخانەی (دار الجمهورية)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (اوقوما کتابی ایکنجی صنف ایجن) بە زمانی تورکی، چاپی یەکەم چاپخانەی (اسعد)، بەغدا، ١٩٧٢، چاپی دووەم چاپخانەی (السعدون)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (اوقوما کتابی اوجونجی صنف ایجن)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (السعدون)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (اوقوما کتابی دوردنجی صنف ایجین)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الجاحظ)، بەغدا، ١٩٧٤.

* ( ڕەشید کویلە ڕەزا - ڕەشەی کولە ڕەزا ):-

- ساڵی (١٨٨٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە مەقام زانەکانی کەرکوك کە توانایەکی چاکی هەبووە لە بواری گۆرانیو مەقامدا.
- لە کاتی سەرهەڵدانی شەری جیهانی یەکەمدا ماوەیەك چووەتە تەبریزو لەوێ فێری خوێندنی مەقامو ئاوازی ئازەری بووە. بەڵام لە کۆتایی شەرەکەدا لە کاتی گەرانەوەی بۆ عێراق لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاوە دەستگیر کراوەو بە دەسبەسەری ڕەوانەی (سەنغافورە) کراوە کە بۆ ماوەی دوو ساڵ ژیانی لەوێ بردووەتە سەرو لە دواییدا گەراوەتەوە بۆ کەرکوك.
- لەبەر ئەوەی دەنگێکی فراوانو بە توانای هەبووە بۆیە ناونراوە بە (شەڵتاغی بچووك)، لەبەر ئەوەی هەمان ڕێبازی (شەلتاغی گەورەی) هەبووە.
- شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە مەقامەکانی (ڕەست)و (حیجاز)و (حوسێنی)و (بەیات)و (سەبا)و (ئیبراهیم).
- ساڵی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

* ( ڕەشید محەمەد مەردان - مەلا ڕەشید ):-

- ناسراو بە (مەلا ڕەشید).
- بروانامەی (دبلۆم)ی چاپی ئۆفسێتی لە ئەڵمانیا بەدەستهێناوەو چەندین جار لەلایەن چاپخانەی شارەوانی کەرکوك ڕەوانەی دەرەوەی وڵات کراوە.
- ساڵی (١٩٥٠)ەوە کاری چاپخانەو چاپ کردنی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

* ( ڕەعد موتەشەر ):-

- ساڵی (١٩٦٣) لە بەغدا لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) بە کارەساتێك کۆچی دوایی کرد.
- یەکێکە لە شاعیرو نووسەرو ڕۆژنامەنووسەکانی کەرکوك.
- کاری کردووە لە بواری ڕۆژنامەگەری لە پێشو لە دوای پرۆسەی ئازادکردنی عێراقەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (البحث عن فانووس الحقيقة)، کۆمەڵە شیعرێکە، ١٩٩٧.
- (حلم سمكة)، کۆمەڵە چیرۆکێکە، ١٩٩٩.
- (الغرقى يجمعون المرجان)، شیعر، ٢٠٠٢.
- (اتقاطر مرجانا لغرقاي)، دیوانی شیعری.

- (اتقاطر من معصمي)، تونس.
- الزهرة العليلة، ديواني شيعري، ٢٠١٠

* (رەفعەت بەگی داودە):-

- ناوی (رەفعەت بەگ کوڕی سمایل بەگی کوڕی ئیبراهیم بەگی کوڕی سمایل بەگی کوڕی محەمەد کوڕی حەقی بەگ)ی سەرۆکی هۆزی (داودە)یە.
- ساڵی (١٩٢٠) لە شاری (خورماتوو) دژی سوپای داگیرکەری بەریتانیا راپەرینێکی چەکداری بەرپا کردو بە کەسێکی دژی دەسەڵاتی ئینگلیزو حکومەتی تازە دروستکراوی عێراق ناویان بردووە.
- لە (١٢)ی ئایاری ساڵی (١٩٦٢) کۆچی دوایی کردووە.

* رەفعەت محەمە یاسین:-

- ناسراو بە دارا.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٩)ی شاری کەرکوک.
- هەر سێ قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوک تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨١) بڕوانامەی دبلۆمی لە پەیمانگای تەکنەلۆژیی میسان بەدەستهێنا.
- هەر ئەو ساڵە پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردو لە کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵ ڕێکخرا.
- ساڵی (١٩٨٣) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لەبارەگای مەکتەبی عەسکەری لە گوندی کانی تووی ناوچەی مەرگە لە سەر دەزگای بێ سیم کاری کرد.
- لە مانگی ئابی ساڵی (١٩٨٦) بۆ ماوەی ٤٥ ڕۆژ لە شاری کرماشان لە ئێران خولێکی عەسکەری لەسەر مۆشەکی سام ٧ و کاتیۆشاو هاوەن بینی.
- لە مانگی تشرینی یەکەمدا. وەك پێشمەرگەی دەزگای بێ سیم، لەگەڵ ئەو هێزە گەورەیەی پێشمەرگە بوو کە لە سێ قۆڵەوە موشەك بارانی دام و دەزگا ئەوتییەکانی بابا گوڕگوڕو جەوەڵبۆرو چەمەبۆری کرد. هەروەها لە مانگی تشرینی دووەمدا وەك پێشمەرگەی دەزگای بێ سیم، لەگەڵ تیپەکانی مەڵبەندی ٢ی کەرکوکدا بەشدار بوو لە گرتنی شارۆچکەی ئاغجەلەر.
- پاش دامەزراندنی مەڵبەندی بادینان لە ساڵی (١٩٨٧)، دوا بەدوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی ئاشتیی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، لە کۆتایی بەهاردا لەگەڵ ئەو هێزەی کە ئازاد هەورامی رابەرایەتیی دەکرد. لە دۆڵی جافەیەتییەوە بەرەو بادینان بەڕێ کەوت.
- لە مانگی ئابی ساڵی دواتردا، لەگەڵ هێزەکەی بادینان گەڕایەوەو ئەرکی پاراستنی ڕێگای نێوان دۆڵی باڵەکایەتی و شوێنی گردبوونەوەی هێزەکانی مەڵبەندی ٣ی هەولێریان پێ سپێردرا.
- لە مانگی شوباتی ساڵی (١٩٨٩)دا وەك پێشمەرگەی دەزگای بێ سیم گوێزرایەوە بۆ تیپی ٣٧ی شاربازێر. لە مانگی حوزەیراندا گوێزرایەوە بۆ چاپخانەی برایم عەزۆ لە شاری سەقزو لەوێ وەك مۆنتێر کاری کرد.
- ساڵی (١٩٩١) لەگەڵ دەزگای ڕاگەیاندن گەڕایەوە بۆ هەرێم و بەشدار بوو لەدانانی بارەگای دەزگای ڕاگەیاندن لە گەڵاڵە لە ساڵی (١٩٩١). هەر ئەو ساڵە وەك دیزاینەرو سەرپەرشتیاری چاپ کاری لە خولی حەوتەمی ڕۆژنامەی "ڕێبازی نوێ"دا لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٩٢)دا وەك دیزاینەرو لێپرسراوی بەشی هونەری لە گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کاری کرد.
- سەرباری کارکردنی لە گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، لەمانگی حوزەیراندا گوێزرایەوە بۆ مەکتەبی ڕێکخستن و تا ساڵی (٢٠٠٧) وەك بەڕێوەبەری ئیدارەی پەیمانگای کادیران لە هەولێرو سلێمانی کاری کرد.
- لە نیسانی ساڵی (١٩٩٧) لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا بەشدار بوو لە دەرکردنی گۆڤاری "تایم" کە خۆی بووە سەرنووسەری و خاوەنی ئیمتیازەکەشی پارێزەر نزار خەسرەو بوو.
- ساڵی (١٩٩٨) پاش ئەوەی ٨ ژمارەی لێ دەرچوو، گۆڤارەکە لەبەر گرفتی دارایی ڕاگیرا.
- ساڵی (٢٠٠٦) پرۆژەی "تایم" زیندوو کرایەوەو ئەمجارە بەشێوەی ڕۆژنامە دەرچوو، خۆی سەرنووسەری بوو، سۆران داوودی جێگری سەرنووسەرو پارێزەر نزار خەسرەو خاوەنی ئیمتیازی بوو تا ژمارە ٢٣ کە لە ١٩ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٢) دەرچووە، سەرنووسەری ڕۆژنامەکە بوو، پاشان دەستی لەکار کێشایەوەو سۆران داوودی جێی گرتەوە.
- ساڵی (٢٠١٠) بووە بەڕێوەبەری کارگێڕیی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان. ساڵی (٢٠١٢) خانەنشین کرا.

* رەفعەت عەبدوڵلا کاکە رەش:-

- ساڵی ١٩٥٩ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی باجوان تەواو کردووە و ناوەندی لە شەرقیە و ئامادەیی لە خوێندنگەی حیکمە تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٢ کۆلێژی کشتوکاڵی بەشی دارستان لە زانکۆی مووسڵ تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٧٧ پەیوەندی بە رێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووە.
- لە ٢٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٧٢ بووە بە پێشمەرگە لە ناوەندی کۆمەڵە، پاشان گواستراوەتەوە بۆ تیپی (٢١)ی کەرکوك.
- ساڵی ١٩٨٧ بووە بە لێپرسراوی رێکخستنەکانی سنووری تیپی (٢٥)ی خالخالان.
- ساڵی ١٩٩٠ جێگری بەتالیۆنی شەش بووە.
- ساڵی ١٩٩١ جێگری هێزی کەرکوك بووە.
- ساڵی ١٩٩٢ یەکەم قائیمقامی چەمچەماڵ بووە لەدوای راپەرین.
- ساڵی ١٩٩٣ بریکاری وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن بووە و لە هەمان کاتدا سەرلەشکری (١٤)ی باباگورگور بووە.
- ساڵی ١٩٩٧ وەزیری ئەشغال نیشتەجێبوون بووە.
- ساڵی ١٩٩٨ وەزیری دارایی و ئابووری بووە.
- ساڵی ٢٠٠٠ پارێزگاری کەرکوك بووە
- ساڵی ٢٠٠١ لە دووەمین کۆنگرەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەڵبژێردراوە بە ئەندامی سەرکردایەتی.
- ساڵی ٢٠٠٣ لێپرسراوی مەڵبەندی کەرکوك بووە.
- ساڵی ٢٠٠٥ ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بووە.
- ساڵی ٢٠٠٦ دووبارە بووەتەوە بە لێپرسراوی مەڵبەندی کەرکوك.
- ساڵی ٢٠١٠ بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی.
- ساڵی ٢٠١٢ بووە بە لێپرسراوی مەکتەبی رێکخستن.
- ئێستا لێپرسراوی مەکتەبی رێکخستنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.
- هەروەها سەرۆکی ناوەندی ئینسکلۆپیدیای کەرکوکە.

* رەفیق ئەفەندی:-

- ناوی (محەمەد رەفیق کوری حاجی ئەمین کوری حاجی مەلا محەمەد کوری مەلا سەعدی)یە.
- ساڵی ١٨٦٨ لە کۆیە هاتووەتە دونیاوە.
- خوێندنی ئایینی لای باوکی مەلا محەمەد ئەفەندی قوتب تەواو دەکات، ئینجا دەچێتە لای مەلا عەلی حیکمەت سیامەنسوری.
- زمانی تورکی و عەرەبی و فارسی بە تەواوەتی زانیوە.
- ساڵی ١٩٢٤ بە نوێنەری کەرکوك لە پەرلەمانی پاشایەتی عێراق هەڵبژێرا تا نزیکەی ساڵی ١٩٢٨.
- دەستێکی باڵای هەبووە لە جووت وشە بەکارهێنان، بە تایبەتی لە قاوغی رەوانبێژیدا دایرشتووە.
- ساڵی ١٩٣٦ کۆچی دوایی کردووە.

* ( رەفیق ئەمین - مام رەفیق ):-

- ناوی (رەفیق ئەمین عومەر ئەحمەد)ە.
- ساڵی (١٩٤٥) لە لادێکانی چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لە دووزەلە و دەهۆڵ و دەمبك ژەنەکانی کەرکوك.
- ئەم ئاوازانەی بە ئامێرەکانی ژەندووە:
- (سەوزە سەوزە، بووکانە بووکانە، شای باڵا بەرز دەرچووە لە ماڵ، کەمەرە لەقێ، کەمەرە لەرزێ، قەرەداغی، شیرنی لەیلانی، چۆپی، مەری، هۆهۆ، لە بووکێ مەدە، هاواری).

* ( رەفیق عەلی - مەلا رەفیق ):-

- ناوی (مەلا رەفیق کوری مەلا عەلی)یە.
- ساڵی (١٨٩٥) لە کەرکوك لەدایکبووە لە گەرەکی زێویە.
- ساڵی (١٩٥٧) کۆچی دوایی کردووە.
- لای (مەلا قادری ئیمام)و (مەلا محەمەدی جەلی زادە) خوێندوویەتی.
- لەنێوان ساڵانی (١٩١٩-١٩٥٧) مەلاو ئیمامی مزگەوتی (دلی باش) بووەو لە دواییدا مەلا عەبدوڵلای کوری جێگەی گرتووەتەوە.

* ( رەفیق تەوفیق - زەعیم رەفیق تەوفیق ):-

- ئەفسەرێکی نیشتمانی پەروەردەبووەو خەڵکی شوان بووە، دواتر یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی حیزبی (هیوا)، کە دەورێکی باڵای هەبوو لە بڵاوبوونەوەی حیزبی هیوا لە ناوچەی شوان.

*** (رەفیق حیلمی):-**

- (رەفیق حیلمی کوڕی سالح ئەفەندی ئامان کوڕی عەبدوڵلا ئەفەندی کوڕی حاجی غەفور)ە.
- سالی (١٨٩٨) لە کەرکوك لەدایکبووە، سالح ئەفەندی کوڕی پیرۆزخان کچی قادر ئاغا کوڕی حەمە ئاغای برای هەمزە ئاغای مەسرەفن دایکی حەلاوەخان کچی مارف ئاغای کوڕی عەزیز ئاغای کوڕی بابکر ئاغابرای هەمزە ئاغای مەسرەفە.
- رەفیق حیلمی خۆشیو خێزانەکەشی لەدایکیشەوە لە باوکیشەوە لە بنچینەوە. لە هۆزی هەمزە ئاغای مەسرەفن.
- رەفیق حیلمی دوو مامو دوو پووری هەبووە: تۆفیق وشەوکەتو جەمیلەو مریەم. ئەمانە هەموو بە (ئامان) ناوبانگیان دەرکردووە.
- ئامان ناوی نەنکیان بووە لە بەر ئازاییو گوڕجی ناویان ناوە، ئێستاش بەرەی ئەمانە بە (ئامان) دەناسرێن لە کەرکوك وەك (یونس تۆفیق ئامان).
- رەفیق حیلمی سێ براو دوو خوشکی هەبوو: جەمیلو شەفیقو ئیبراهیمو عیسمەتو بەهیە.
- عیسمەتی خوشکی بە درێژایی ژیانی لەگەڵ رەفیق حیلمی برای بووە هەردەم بە (کاکە) بانگی کردووە، بەهیە دووەمین خوشکی رەفیق حیلمی، بە زانیاری وبیرتیژی ناوبانگی دەرکردبوو بە سەعات پرسیاریان لێ دەکرد سەبارەت بە زانیاری گشتی جوغراف، مێژوویی، دینی. بێ وچان وەڵامی دەدایەوە هەمووی بەگوێ گرتن فێربوو بوو.
- باوکی رەفیق حیلمی یۆزباشی بووە، زۆر دەستی رۆیشتووەو مووچەی باشی بووە، بەردەستی زۆرو ئێجگار خێزانەکەیو مندالەکانی خۆشی ویستووە هەتا بەناوی خۆیانەوە بانگی نەکردوون بە رەفیق حیلمی ووتووە (کاکە لاو) (کوڕی لاو) بە عیسمەتی کچی ووتوە (کچان) هەر چەند لە جەنگ بەسەربەرزی گەڕاوەتەوە، زۆر دیاری جوان وچاکی بۆ هێناون.
- رەفیق حیلمی چونکە باوکیو دایکی زوو کۆچی دوایی دەکەن هەر بە گەنجیو زووبە زوو باری قورسی ژین دەکەوێتە سەر شانیو دەکەوێتە ناو گێژە لوکەی ژیانی گشتییەوەو خولیای زانیاری پێشکەوتنو سەر بەرزی خۆییو گەلو نیشتمانی دەداتە مێشکیو کار دەکاتە سەر هەموو کردەوەو ئیشو کارو ژیانی.
- پێش کۆچی دایكو باوکی لە نزیك تەمەنی بیست ساڵیدا رەفیق حیلمی ژن دەهێنی.
- رەفیق حیلمی ١٠ منداڵی دەبێ ٤ کوڕو ٦ کچ، کوڕو کچێکی هەر لە منداڵییەوە کۆچی دوایی دەکەن.
- خوێندنی رەفیق حیلمی: وەکو ووتمان لە کەرکوك دەبێت، بەڵام لەبەر گوێزانەوەی باوکی لەگەڵ سوپا لەم لا بۆ ئەو لا. قوتابخانەی سەرەتایی لە کفری تەواو کردووە، کە باوکی دەگوێزرێتەوە سنوور، خێزانەکەیو ماڵو منداڵی دەنێرێتە سلێمانی. لەوێ رەفیق حیلمی بە تاقی کردنەوە یەکسەر دەخرێتە پۆلی دووهەمی قوتابخانەی روشدیەی عەسکەری کە دوای پێی دەڵێن (اعدادی عسکری) پاش تەواوکردنی پۆلی سێیەمی (اعدادی عسکری) لە سلێمانی رەفیق حیلمی دەڕوا بۆ بەغدا لەوێ پۆلی چوارو پێنجی ئەو (اعدادییە) تەواو دەکاتو دەکرێ بە قوتابی نارده بۆ تەواوکردنی ئەرکانی حەرب لە تورکیا.
- رەفیق حیلمی لە بەر ئەوەی لە بیرکاریدا (ئەندازیاری) زۆر باشی دەبێ دەیەوێت ئەندازیاری (هەندەسەی عالی) لە تورکیا تەواو بکا، لە بەر ئەو دەگەڕێتەوە سلێمانیو اعدادی مەلەکی تەواو دەکات ئەوجا دەڕوات بۆ تورکیا لەوێ داخلی زانکۆ (جامعە استانە) دەبێ وشهادەی هەندەسەی عالی لێ وەردەگرێ.
- ئەمە لە نامەیەکدا ڕوون دەکاتەوە کە بە ئینگلیزی نووسیویەتی.
- ئەوەی بەدەرئەکەوێت کوردی وتورکی وعەرەبی وفارسیو ئینگلیزیو ئەلمانی زانیبوە، هەر لەبەر ئەمەش بەهۆی تێکەڵ بوونی لەگەڵ خەلکیدا توانیوویەتی خۆی فێری ئەم زمانە بکات وسوود لە هاوزمانەکانی دەوروبەری وەربگرێت.
- بەڵام چۆن (رەفیق سالح) بوو بە رەفیق حیلمی لە تورکیا مامۆستایەکی کە ناوی (عەبدوڵلا حیلمی پاشا) دەبێت وبنچینەی کوردە لە بەر زیرەکی و ئازای وخۆشەویستی ناونیشانەکەی خۆی (حیلمی) دەداتێ وەك خەلات، هەر بەم ناونیشانە ناوبانگ دەردەکات لە دوایشدا نووسینو لێکۆلینەوە کانیشی هەر بەو ناونیشانە ناوبانگی دەرکردووە.
- سالی (١٩٦٠) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمەکانی:
- (جوغرافیا، صنفی چوارەم سەرەتایی)، عەزیز سامی، وەرگێڕان، لە عەرەبییەوە، بەغدا، ١٩٢٩، (ئەمە یەکەم کتێبی کوردێ چاپکراوە لەلایەن نووسەرێکی کەرکوکییەوە).
- (نامیلکەی کۆمەڵایەتی)، زیاگۆگ ئەلب، وەرگێڕان، لە تورکییەوە، موسل، ١٩٣٢.
- (خلاصەی مسئلەی کورد)، شارلس هوبز، وەرگێڕان، لە فەرەنسییەوە، موسل، ١٩٣٢.
- (سەرەتای علمی ژمارە)، بەغدا، ١٩٣٦.
- (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٤١.
- (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)، بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٥٦.
- (یاداشت)، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٦.

- (یاداشت)، بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٥٦.
- (یاداشت)، بەرگی سێیەم، بەغدا، ١٩٥٦.
- (یاداشت)، بەرگی چوارەم، بەغدا، ١٩٥٧.
- (یاداشت)، بەرگی پێنجەم، بەغدا، ١٩٥٧.
- (یاداشت)، بەرگی شەشەم، بەغدا، ١٩٥٨.
- (پاش تەممون)، شیعر، بەغدا، ١٩٦١.
- (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)، بەرگی یەکەمو دووەم، هەولێر، ١٩٨٨.
- (یادداشت)، بەشی یەکەم، هەولێر، ١٩٨٨.
- (یادداشت)، بەشی دووەم، هەولێر، ١٩٨٨.
- (یادداشت)، بەشی سێیەم، بەغدا، ١٩٩٢.
- (یادداشت)، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

* (رەفیق شوانی - دکتۆر رەفیق شوانی):-

- ساڵی (١٩٥٣) لە دێی (ناروجە)ی شوان لە کەرکوك لەدایکبووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی لە هەمان دێ و لە رێداری شوان و دواناوەندی لە کەرکوك.
- دەرچووی بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سلێمانییە لە ساڵی (١٩٧٦-١٩٧٧).
- لە (٣٠)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٧) بووەتە مامۆستای زمانو ئەدەبی کوردیو لە (٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠) مامۆستایە لە بەشی زمانی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین.
- ماستەری لە هەولێرو دکتۆرای لە بەغدا لە ساڵی (١٩٩٧) تەواو کردووە.
- لە (٢٠٠٠-٢٠٠١) تاکو (٢٠١٢) ئەندامی ستاف خوێندنی باڵای ماستەرو دکتۆرای زمانی کوردی بووە لە هەمان کۆلێژدا.
- ساڵی (٢٠٠٠)دا بووەتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (هاواری ئەنفال) لە هەولێر، کە بە تەنها ژمارە (١)ی لێدەرچوو، دواتر راگیرا.
- چیرۆکێکی بڵاوکراوەی لەسەر کارەساتی ئەنفال بەناوی (کولەزەرد)ەوە بڵاوکردووەتەوە.
- لە بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (چەند بابەتێکی زمانو رێزمانی کوردی)، دەزگای موکریان هەولێر، ٢٠٠١.
- (ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا)، نامەی دکتۆرا، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (دەردی دووری هەوارگەی وێران)، دیوانی شعیرو پەخشان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (کێشەی کەرکوك و چۆنیەتی چارەسەرکردنی)، بنکەی توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن)، ماستەرنامە، بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨.
- (دیوانی دەردووری هەوارگەی وێران)، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٣، شیعرو پەخشان.
- (زمانی کوردیو شوێنی لەناو زمانەکانی جیهاندا)، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریان، هەولێر ٢٠٠٨.
- (ئەدەب، کۆمەڵە وتارێکی ئەدەبی)، وەزارەتی رۆشنبیری بەرێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٨.
- (زمانەوانی، کۆمەڵە وتارێك)، دەزگای موکریان، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (وتارەکانم دەربارەی کێشەی کورد)، مەکتەبی ناوەندی راگەیاندنی (ی ن ك) چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، ٢٠٠٩.
- (دیوانی دەردی دووری هەوارگەی وێران)، چاپی دوەم، بەرگی دووەم، بەشیعرو پەخشانی نوێوە، وەزارەتی رۆشنبیری، بەرێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە. هەولێر ٢٠١١.
- (وشەسازی زمانی کوردی)، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠١١.
- (رێزمانی زاری شوان)، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ٢٠١٣.
- (نەورۆز، سەرەتای شارستانیەتو جەژنی نەتەوایەتی کوردە)، هەولێر، ٢٠١٤.
- (ژیانی من)، چاپ نەکراوە.

* رەفیق رەشید ئاغجەلەری:-
- ناوی تەواوی: (رەفیق رەشید حەمە ئەمین)ە.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٣)ی شارۆچکەی ئاغجەلەر.
- خوێندنی سەرەتاییو ناوەندیی لە ئاغجەلەر تەواو کردووە. دواتر خانەی مامۆستایانی لەسلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٣) بە مامۆستا لە گوندی کوردیانی ناوچەی زارەتی دامەزراوەو هەر ئەو ساڵە پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو بەهۆی هەڵسووڕانو چالاکییەوە پاش ماوەیەکی کەم بووەتە لێپرسراوی رێکخستنەکانی ئاغجەلەر.
- لە سۆنگەی جموجۆڵو دەرکەوتنی وەك هەڵسووڕاوێکی دیار، بە گومانی پەیوەندی کردنی بەرێکخستنە نهێنییەکانەوە چەند جارێك لە ئاغجەلەر گیراوەو بۆ لێکۆڵینەوە رەوانەی کەرکوك کراوە. خۆڕاگریو نەدرکاندنی هیچ نهێنییەکی رێکخستن، دەزگا ئەمنییەکانی ناچار کرد ئازادی بکەن.
- ساڵی (١٩٨١) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە هەرێمی دووی کەرکوك بووە پێشمەرگەو لە ماوەیەکی کورتدا بووە فەرماندەی مەفرەزەو پاشان فەرماندەی کەرت.

دوای دروستبوونی تیپەکان لە ساڵی (١٩٨٢)، لە تیپی ٢١ی کەرکوك پێشمەرگایەتیی کرد. هاوکات وەك مامۆستای شۆڕش لە گوندی گۆزەبۆرەی ناوچەی ئاغجەلەر وانەی بە خوێندکارە منداڵەکان دەوتەوە.
ژیانی پێشمەرگایەتیی درێژ نەبوو، لە ٢ی تشرینی یەکەمی (١٩٨٢)دا لە شەڕێکدا لە گوندی چەرمەگا لەگەڵ دوو پێشمەرگی تردا بە ناوی سەرتیپ ئاوبارەیی و شەماڵ سلێمان شەهید کرا.

* رەفیق مەحموود محەمەد هەمەوەندی:-

- ساڵی (١٨٩٨) لە کەرکووك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩١٨) دەرچووی کۆلیژی سەربازی عوسمانییە.
- ساڵی ١٩٢١ بەشداری سوپای عێراقی کردووە.
- پاسەوانی فەریق بەکر سدقی بووە
- لەبەر لێهاتووی لە سوارچاکیدا ناونیشانی (رفیق الخیال) یان پێوتووە.
- ساڵی ١٩٧٤ کۆچی دوایی کردووە.

* (رەمەزان زامدار):-

- ساڵی (١٩٤٣) لە گەرەکی (ئیمام قاسم) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٨) چووەتە خوێندگای I.P.C TRANING GENH لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك لە ساڵی (١٩٦١) تەواوی کردووەو لە ساڵی (١٩٧٥ خانەنیشن کراوە.
- ساڵی (١٩٦٦) بە خوێندن فێری فۆتۆگراف بووە.
- لە سەرەتای ساڵی یەکەم بەشداری دانانی تیپی مۆسیقای کوردی بووە لەگەڵ هاورێکانی بۆ دامەزراندنی تیپێك کەدوای بووە بە تیپی سۆلاڤ.
- لە بواری شیعریشدا دەستی باڵای هەیەو گەلێك ئاوازو شیعری بۆ گۆرانی بێژان داناوە.

* (رەمزی چاووش):-

- ساڵی (١٩٤٥) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٣) بە مامۆستا دامەزراوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (یا وجه مدینتي الثابتة)، ١٩٧٦.
- (موسم العشق)، ١٩٨٣.

* رەمزیە حەبیب مەیاس:-

- ساڵی ١٩٤٥ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دبلۆمی لە (معهد إعداد المعلمات) تەواو کردووە.
- هەر لە شەستەکانەوە دەستی بە نووسین کردووە لە رۆژنامە و گۆڤارەکان.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- مهرجان الفراغ، خواطر شعرية باللغة العربية، ٢٠٠٥
- Kerkuk Benim Hoyratim، ٢٠٠٥
- میاس نەنەدە بە زمانی تورکمانی، ٢٠٠٩
- سنبلات في دفاتر افكاري، ٢٠١٢
- حق يولوندا (خوريات بە زمانی تورکمانی)، ٢٠٠٦
- سحر (خواطر باللغة العربية)، ٢٠١٤

* (رەنج خاڵۆ بازیانی):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ژیلەمۆی گەرمیان)، ١٩٩١.
- (تیشکە سەوزەکانی گەرمیان)، ١٩٩٤.
- (لە وڵاتی ئەنفال کراودا)، ١٩٩٣.
- (چرکەکانی خەو بینینم)، ٢٠٠٥.
- (چرای حەزێکی یاخی)، دیوانی شیعر، سلێمانی، ٢٠١٤.

* رەنج عەبدولحەمید محەمەد:-

- ناسراو بە رەنجە موهەندیس.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٧)ی شاری کەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بەڕیزەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.
- ساڵی (١٩٧٩) بروانامەی بەکالۆریۆسی لەبەشی کارەبای کۆلیژی ئەندازیاریی زانکۆی سلێمانی بەدەستهێنا.
- ئایاری ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد هەر ئەو ساڵە، بۆ سوود وەرگرتن لە شارەزایی و زانستی، گوێزرایەوە بۆ تۆژەڵە بۆ بەشی تەکنیکیی رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان و لەم رووەوە رۆڵی کارای هەبوو لە کارکردن لەگەڵ دەستەی ئەندازیاراندا بۆ بەگەڕخستنەوەی رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان.
- لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٠ - ١٩٨٩) لێپرسراوی بەشی تەکنیکیی رادیۆ بوو.
- لە پێشمەرگایەتیدا بەشداریی هەردوو کۆنفرانسی یەکەم و

دووەمی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستاندا کردووە لە ساڵانی (١٩٨١و ١٩٨٢).
- ساڵی (١٩٨٨) وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا، بەڵام لە ساڵی (١٩٨٩) لە هەولێر پەیوەندیی بە رێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردەوەو پاش راپەرینی ساڵی (١٩٩١) بووە کادیری رێکخستن لە سنووری شاری کەرکوك، هەر ئەو ساڵە بووە لێپرسراوی کۆمیتەی یەکی ئاوارەکانی کەرکوك لە هەولێرو دواتر بووە کارگێری مەڵبەندی ٢ی رێکخستنی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٩٢) بووە ئەندامی کۆمیتەی باڵای یەکێتیی ئەندازیارانی کوردستان و دواتر لێپرسراوەتیی یەکێتییەکەی گرتە ئەستۆ.
- ساڵی (١٩٩٣) لە کابینەی یەکەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە بەڕێوەبەری گشتیی تەکنیکی لە وەزارەتی گواستنەوەو گەیاندن لە هەولێر دامەزرا.
- ساڵی (١٩٩٤) رۆڵێکی دیاری لە دامەزراندنی رێکخراوی گەشەپێدانی ئابووریی کوردستاندا نواند.
- ساڵی (١٩٩٩) بووە بریکاری وەزارەتی گواستنەوەو گەیاندن لە ئیدارەی سلێمانیی حکومەتی هەرێمی کوردستان. ساڵی (٢٠٠٦) خانەنشین کرا.
- ساڵی (٢٠٠٩) بەئەندامی خولی یەکەمی ئەنجوومەنی ناوەندی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دانرا.

* (رەنجووری):-

- رەنجووری شاعیر، (مەلا عومەری زەنگەنە کوڕی خالید بەگی کوڕی عومەر بەگی زەنگەنە)یە.
- ساڵی (١٧٥٠) لە ئاوایی (گەڕاوی)ی ناوچەی کەرکوك لەدایکبووە.
- رەنجووری کەسێکی دیارو لە روو بووە لە نێوەندی رۆشنبیریی کورددیدا، پێوەندی بەهێز بووە لەگەڵ شاعیر وخوێندەواران لە دیوەخان و کۆڕی شیعردا دەوری باڵای بووە. هەروەها کتێبخانەیەکی گەورەی هەبووە بەڵام بە داخەوە هەر لە نێو مزگەوتەکەدا کراوەتە ژێر خۆڵەوەو بەشێکیشی زۆریش بەهۆی باو و باران و خۆڵەوە هەر لە ناو مزگەوتەکە لە ناو چوونە.
- لە ماوەی ژیانیدا دوو جار هاتووەتە کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٧٦٥)و (١٧٨٦)، ماوەیەکیش مامۆستا بووە لە مزگەتی (زێوێ) لە گەڕەکی (ئیمام قاسم). دەربارەی گۆڕی رەنجووری زۆربەی سەرچاوەکان ئەوە دەخەنە روو کە لە ئەنیشت قوتابخانەی (ئیمام قاسم)ەوە کە دەکات پشت قوتابخانە ناوەندی (ئاڵا).
- لە بەرهەمەکانی:
- (دیوانی رەنجووری) ئەویش بریتییە لە ئەو هەڵبەست و شیعرانەی کە لێی بە جێ ماوە لە (٢٦٠) لاپەڕەدا بە چاپکراوە لە ساڵی (١٩٨٣) لەلایەن (محەمەد عەلی قەرەداغی).
- (تقویم رنجوري)، بریتییە لە نامەیەکی زانیاری دەربارەی کات و وەرزەکان بە زمانی فارسی کە بەشێك لەو دەستنووسە لە (دار المخطوطات) لە بەغدا پارێزراوە بە ژمارە (٣١٦٥٠/٢).
- (تسکین القلوب)، نامەیەك دەربارەی پزیشکی و ئەو دەرمانانەی کە لەوکاتەدا باو بووە کە رەنجووری بەپێی ئەزموونی خۆی سوودی لێ بینیوەو بە زمانی فارسی بووە.
- دوو دەستنووس دۆزراوەتەوە کە رەنجووری لە ساڵی (١٧٩٥) نووسیویەتی دەربارەی چۆنێتی هەڵسووکەوتی ژن و پیاو لەگەڵ یەکتریدا کە یەکێك لە دەستنووسەکانی لەلای (عەبدولرەقیب یوسف)ە.
- ساڵی (١٨٠٩)دا کۆچی دوایی کردووە.

* (رەهبەر):-

- ناوی تەواوی (شێخ تەهای شێخ سەعیدی نەقشەبەندی) یە.
- ساڵی (١٩٠٤) لەدایکبووە لە عەشیرەتی (لەك)ە خەڵکی (کۆچك نەخشینەیە)ی دەورووبەری چەمچەماڵە.
- لە دوایدا لە کەرکوك لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) نیشتەجێ بوونە.
- لە تەمەنی یەك ساڵیدا دەبێت باوکی کۆچی دوایی دەکات و دایکی شوودەکاتەوە بە (شێخ جەوادی) مامی شاعیر بەڵام دایکیشی زۆر بێ رەحمانە لەگەڵیدا رەفتار دەکات، لە دوایدا دایکیشی دەمرێت بۆیە بە جارێك سەرگەردانی ئەم ماڵ و ئەو ماڵ دەبێت.
- بەزمانەکانی کوردی وتورکی وفارسی وعەرەبی شیعری ووتووە لەبەر.
- شیعرەکانی بابەتی کۆمەڵایەتی و سۆزداری و نیشتمانی و خواناسی لە خۆی گرتووە.
- شاعیر بە فەقێیەتی رووەدەکاتە کۆیەو چوار ساڵ لە شاری کۆیە جێگردەبێت پاشان دەچێتە (تەوەکەل)و شاری (سێووکە)و لەلای مەلا توفیق شەش مانگ دەمێنێتەوە پاشان دەچێتە گۆپتەپە دێتەوە بۆ کەرکوك.
- مەلا قادری ئیمام قاسم لە مەدرەسەی مەحموودی خاڵ بەمووچەی هەشت رووپیە دایدەمەزرێنێت.
- تاقیکردنەوەی مامۆستایی دەکات ولە ساڵی (١٩٣٩) بە

ماموّستا دادەمەزرێت.
- له کۆتایی ژیانیدا دەبێتە ئیمام‌و خەتیبی مزگەوتی شێخ خدری بابپری تا (٢٨)ی شوباتی سالی (١٩٧٣) که کۆچی دوایی دەکات.

* (رزگار حەمە رەئوف):-

- سالی (١٩٧٠) له چەمچەمال لەدایکبووە.
- سالی (١٩٨٤) سەرەتای هونەری بووە له شانۆگەری (هەلەشەو تاوان).
- سالی (١٩٩١)یەوە تا سالی (٢٠٠٦) بەشداری گەلێك فیستیڤالی گۆرانی‌و شانۆو موزیکی کردووە له سەرتاسەری کوردستاندا.
- بەشداری ئەم شانۆگەرییانەی کردووە:
- شانۆی (هەلەشەو تاوان)، ١٩٨٤.
- شانۆی (دەنگی زەنگۆلەکان)، ١٩٨٥.
- شانۆی (شارەکەم)، ١٩٨٦.
- شانۆی (تارمایەکان)، ١٩٨٦.
- شانۆی (وانەیەك له بێکەسەوە)، ١٩٨٧.
- شانۆی (مامە یارە)، ١٩٨٨.
- شانۆی (گۆرانی خۆرهەلهاتن)، ١٩٨٩.
- شانۆی (بینایی)، ١٩٩٢.
- ئۆپەرێتی (رووبارە گەورەی هەرێم)، ١٩٩٤
- شانۆی (شەوێکی باراناوی)، ١٩٩٦.
- شانۆی (کەرنەڤالی ستەم دیدەکان)، ١٩٩٦.
- شانۆی (حیزبی سەلامەت‌و کەرامەت)، ١٩٩٧.
- کۆرالی له چاوەروانی فریشتەکاندا، ١٩٩٧.
- شانۆی (بێ ناسنامەکان)، ١٩٩٧.
- شانۆی (کێشەی سێبەری کەرەکە)، ١٩٩٨.
- شانۆی (چیرۆکەکانی عەزیز نەسین)، ١٩٩٨.
- ئۆپەرێتی (ئاشتی)، ١٩٩٩.
- شانۆی (ئەنفال لەو دیویی پەنجەرەکانەوە)، ١٩٩٩.
- شانۆی (شەوێکی گوماناوی)، ٢٠٠٠.
- ئۆپەرێتی (پەپولەکان)، ٢٠٠١.
- فیستیڤالی مەقامات، چەمچەمال، ٢٠٠٢.
- له بەرهەمە موزیەکەکانی:
- گۆرانی (ئەلوەن) له ئاوازو وتنی خۆی‌و هۆنراوەی (فایق نامۆ)و موزیك (ئەنوەر قەرەداغی)، له سالی (١٩٩٤) کاری کلیپی بۆ ئەنجام دراوە له کەنالی (گەلی کوردستان).
- گۆرانی (بمسوتێنەو ئاوامەبە)، ئاوازو وتنی خۆی‌و هۆنراوەی (یوسف لەتیف)و موزیك‌و دابەشکردنی خۆی، له سالی (١٩٩٥) کاری کلیپی بۆ ئەنجام دراوە له کەنالی (گەلی کوردستان).
- گۆرانی (چاوەروانی) ئاوازو وتنی خۆی‌و هۆنراوەی (ئەنوەر عومەر)و موزیك‌و دابەشکردنی (ئەنوەر قەرەداغی)، له سالی (١٩٩٨) کاری کلیپی بۆ ئەنجام دراوە له کەنالی (گەلی کوردستان).

* (رزگار شوانی):-

- له سالی (١٩٦٣) له کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە له رۆژنامەنووسەکانی شاری کەرکوك.
- ماوەیەك له دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی (صوت التاميم) بووە.

* رزگار عەلی حەمە جان:-

- لەدایکبووی سالی (١٩٦٠)ی شاری کەرکوك. خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندیی له کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی (١٩٨٢) له بەشی رووپێوی پەیمانگای تەکنیکیی هەولێر بروانامەی دبلۆمی بەدەستهێناوە.
- سالی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەیەکێتیی خوێندکارانی

مامۆستا دادەمەزرێت.
- لە کۆتایی ژیانیدا دەبێتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی شێخ خدری باپیری تا (٢٨)ی شوباتی سالی (١٩٧٣) کە کۆچی دوایی دەکات.

* (رزگار حەمە رەئوف):-

- سالی (١٩٧٠) لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- سالی (١٩٨٤) سەرەتای هونەری بووە لە شانۆگەری (هەڵەشەو تاوان).
- سالی (١٩٩١)یەوە تا سالی (٢٠٠٦) بەشداری گەلێك فیستیڤالی گۆرانی و شانۆو موزیکی کردووە لە سەرتاسەری کوردستاندا.
- بەشداری ئەم شانۆگەرییانەی کردووە:
- شانۆی (هەڵەشەو تاوان)، ١٩٨٤.
- شانۆی (دەنگی زەنگۆڵەکان)، ١٩٨٥.
- شانۆی (شارەکەم)، ١٩٨٦.
- شانۆی (تارمایەکان)، ١٩٨٦.
- شانۆی (وانەیەك لە بێکەسەوە)، ١٩٨٧.
- شانۆی (مامە یارە)، ١٩٨٨.
- شانۆی (گۆرانی خۆرهەڵهاتن)، ١٩٨٩.
- شانۆی (بینایی)، ١٩٩٢.
- ئۆپەرێتی (رووبارە گەورەی هەرێم)، ١٩٩٤
- شانۆی (شەوێکی باراناوی)، ١٩٩٦.
- شانۆی (کەرنەڤالی ستەم دیدەکان)، ١٩٩٦.
- شانۆی (حیزبی سەلامەت و کەرامەت)، ١٩٩٧.
- کۆرالی لە چاوەروانی فریشتەکاندا، ١٩٩٧.
- شانۆی (بێ ناسنامەکان)، ١٩٩٧.
- شانۆی (کێشەی سێبەری کەرەکە)، ١٩٩٨.
- شانۆی (چیرۆکەکانی عەزیز نەسین)، ١٩٩٨.
- ئۆپەرێتی (ئاشتی)، ١٩٩٩.
- شانۆی (ئەنفال لەو دیوی پەنجەرەکانەوە)، ١٩٩٩.
- شانۆی (شەوێکی گوماناوی)، ٢٠٠٠.
- ئۆپەرێتی (پەپولەکان)، ٢٠٠١.
- فیستیڤالی مەقامات، چەمچەماڵ، ٢٠٠٢.
- لە بەرهەمە موزیەکەکانی:
- گۆرانی (ئەلوەن) لە ئاوازو وتنی خۆی و هۆنراوەی (فایق نامۆ)و موزیك (ئەنوەر قەرەداغی)، لە سالی (١٩٩٤) کاری کلیپی بۆ ئەنجام دراوە لە کەنالی (گەلی کوردستان).
- گۆرانی (بمسوتێنەو ئاوامەبە)، ئاوازو وتنی خۆی و هۆنراوەی (یوسف لەتیف)و موزیك و دابەشکردنی خۆی، لە سالی (١٩٩٥) کاری کلیپی بۆ ئەنجام دراوە لە کەنالی (گەلی کوردستان).
- گۆرانی (چاوەروانی) ئاوازو وتنی خۆی و هۆنراوەی (ئەنوەر عومەر)و موزیك و دابەشکردنی (ئەنوەر قەرەداغی)، لە سالی (١٩٩٨) کاری کلیپی بۆ ئەنجام دراوە لە کەنالی (گەلی کوردستان).

* (رزگار شوانی):-

- لە سالی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە رۆژنامەنووسەکانی شاری کەرکوك.
- ماوەیەك لە دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی (صوت التأمیم) بووە.

* رزگار عەلی حەمە جان:-

- لەدایکبووی سالی (١٩٦٠)ی شاری کەرکوك. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی (١٩٨٢) لە بەشی رووپێوی پەیمانگای تەکنیکیی هەولێر بروانامەی دبلۆمی بەدەستهێناوە.
- سالی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەیەکێتیی خوێندکارانی

کوردستانەوە کردو لەڕێی ئەم کۆمەڵەیەوە، لە ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٨٣)دا چووە هێزی پێشمەرگەوەو لە تیپی ٢١ی کەرکوک ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد.
- ساڵی (١٩٨٥) کرایە فەرماندەی مەفرەزە لەکەرتی یەکی قەڵاسێوکەی سەر بەتیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.
- ساڵی دواتر لێپرسراوەتیی جێگری فەرماندەی کەرتی ٣ی چەمچەماڵی تیپەکەی پێ سپێردرا.
- ساڵی (١٩٨٧) بووە فەرماندەی کەرت لەهەمان تیپ.
- پاش واژۆکردنی رێککەوتننامەی ئاشتیی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و پارتی دیموکراتی کوردستان لە تارانی پایتەختی ئێران.
- ساڵی ١٩٨٦و دوا بەدوای پێکهێنانی مەڵبەندی ٤ی بادینان بە لێپرسراوەتیی ئازاد هەورامی، لە ساڵی (١٩٨٧) دا وەك لێپرسراوی هێزی پێشمەرگەی ناوچەکانی ئاکرێ‌و شێخان رەوانەی بادینان کرا.
- ساڵی (١٩٨٨)دا پێش کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، کرایە سەرپەرشتیاری تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان. ساڵی (١٩٩٠) کرایە رابەری سیاسیی بەتالیۆنی ٦ی کەرکوك.
- لەراپەرینی ساڵی (١٩٩١)دا بەشداریی لە جێبەجێکردنی پلانە دانراوەکاندا کردو وەك جێگری فەرماندەی رەتلی تایبەت بە هێرش کردنە سەر سەربازگەی خالید بەشداریی لە ئۆپەراسیۆنەکانی پارێزگای کەرکوکدا کرد.
- پاش راپەڕین، لێپرسراوەتیی کۆمیتەی رێکخستنی بنەسڵاوەی سەر بەمەڵبەندی ٢ی رێکخستنی کەرکوکی پێ سپێردرا.
- ساڵی (١٩٩٣) کرایە کارگێڕ لە مەڵبەندی ٣ی رێکخستنی هەولێر.
- ساڵی (١٩٩٥) وەك ئەندامی مەکتەب گوێزرایەوە بۆ مەکتەبی رێکخستن.
- ساڵی (١٩٩٧)دا سەرپەرشتی کردنی رێکخستنەکانی ناو کەرکوك‌و خانەقین‌و بەغداو دووز خورماتووی پێ سپێردرا.
- لە کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ساڵی (٢٠٠١) بەئەندامی یەدەکی کۆمیتەی سەرکردایەتی هەڵبژێرلو هەر ئەو ساڵە بەلێپرسراوی مەڵبەندی رێکخستنی گەرمیان دانراو دواتر کرایە پارێزگاری کەرکوك لە نەریمەندیخان.
- ساڵی (٢٠٠٣) لە سەروبەندی رووخانی رژێمی بەعس. بەشدار بوو لە ئۆپەراسیۆنی چوونی هێزی پێشمەرگە بۆ ناو شاری کەرکوك‌و لەم سەروبەندەدا لە ساڵی پاشتردا بەشدار بوو لە پێکهێنانی کۆمەڵەی فریاکەوتنی ئاوارەکانی کەرکوك بۆ سەرپەرشتی کردنی پرۆسەی گەڕانەوەی ئاوارەکان بۆ کەرکوك‌و چارەسەرکردنی کێشەکانی سەرلە نوێ نیشتەجێبوونیان.
لە ماوەی نێوان (٢٠٠٥ - ٢٠١١)دا سەرۆکی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك بوو. ساڵی (٢٠١٢) لێپرسراوەتیی مەکتەبی پەیوەندییە گشتییەکانی یەکێتیی گرتە ئەستۆ.
- ساڵی (٢٠١٣) لێپرسراوەتیی مەڵبەندی ٣ی رێکخستنی هەولێری پێ سپێردرا.

* (رۆستەم یادگار کاکەیی):-

- ناوی (رۆستەم کوڕی یادگار کوڕی مستەفا کوڕی نەزەر)ە.
- ساڵی (١٨٩٥) لە خورماتوو لە گوندی شۆراو لە تیرەی (قەرەسەنی) هاتووەتە دنیاوە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٩٧) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- ساڵی (١٨٨٩) ماڵیان باری کردووەتە داقوق وئینجا چوونەتە گوندی (عەرەب کۆیی).
- ساڵی (١٩١٩) ماڵی رۆستەم‌و دەیان خێزانی کاکەیی تر دەگوێزرێتەوە بۆ گوندی (مێخاس) لە سنووری خانەقین ولە وێ نیشتەجێ دەبن.
- ساڵی (١٩٢٠) کاتێك بڵێسەی شۆڕش دەگاتە خانەقین رۆستەم یادگار یەکێك دەبێت لەوانەی بەشداری گرتنی بنکەی سەربازی داگیر دەکەن.
- دوای ئەوەی کە ئینگلیزەکان هاتنەوە خانەقین خۆیی‌و

هەڤاڵەکانی بڕیاری گولەباران کردنی دەردەکرێت بەڵام خۆشبەختانە برینەکەی ڕۆستەم کوشندە نابێت‌و پاش ماوەیەك لە ئینگلیزەکان خۆی دەکات بەمردوو بەجێی دەهێڵن وخزمانی ڕزگاری دەکەن.
– ساڵی (١٩٣٠) ڕۆستەم یادگار لە گوندی (دەلەسی گەورە) بەدەستی پیاوێکی چەپەڵ دەکوژرێت‌و تەرمەکەی لە گۆرستانی (حەواشەکان) دەنێژرێت، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٩٣١) بە ساڵی کوژرانی دادەنێن.

* (ڕوشدی ئاکا):-

– ساڵی (١٩٢٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٥٣) بەکالۆریۆسی لە یاسا بە دەستهێناوە.
– قائیمقامی مەرکەزی کەرکوك بووە لەنێوان ساڵانی (١٩٦٤-١٩٧٦).
– ساڵی (٢٠٠٥) کۆچی دووای کردووە.

* (ڕووفائیل میناس):-

– یەکێکە لە نووسەرەکانی کەرکوك کە گەلێك لێکۆڵینەوەی هەیە لەسەر مێژووی ئایینی مەسیحی لە کەرکوك‌و مێژوونووسێکی بە توانا بووە.

* (ڕووزار ئەحمەد):-

– یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك لە ناوچەی داقوق.

* ڕووناك شوانی:-

– ناوی (ڕووناك عوسمان عەبدوڵڵا)یە.
– ساڵی (١٩٦٠) لە کەرکوك لە دایك بووە.
– لە کەرکوك قۆناغەکانی قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی‌و ئامادەیی تەواو کردووە.
– زمانی ئینگلیزی لە کۆلیژی ئاداب لە زانکۆی بەغدا بەدەست هێناوە
– زمانی ئینگلیزی‌و عەرەبی‌و فارسی‌و تورکمانی‌و سویدی بە باشی دەزانێت.
– ساڵی (١٩٨٤) بەهۆی بڕیاری گرتنی خێزانەکەیان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە کەرکوکیان بەجێهێشت‌و لە سلێمانی نیشتەجێ بووە‌و لەوێ بووەتە مامۆستا لە زمانی ئینگلیزی.
– لە قۆناغی ئامادەییەوە دەستی بە نووسین کردووە، بەڵام لەدوای ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستانەوە، لە زۆربەی ڕۆژنامەکاندا چەندین بابەت، شیعر، کورتە چیرۆك، ستوونی هەفتانە‌و مانگانەی بڵاوکردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٤) بۆ یەکجاری ڕووی لە تاراوگە کردو لە سوید نیشتەجێ بووە.
– بەشداری چالاکی کردووە لە بوارەکانی ناساندنی ئەنفال‌و جینۆسایدی کورد، بۆ ئەم مەبەستەش لە چەندین کۆنفرانسی نەتەوەیی‌و نێو نەتەوەییدا بەشداری کردووە، لە چەندین ڕێکخراوی حکومی‌و مەدەنییدا وەکو چالاکی بوارەکانی مافی ژنان، مافی منداڵان، مافی مرۆڤدا کاری کردووە.

– ساڵی (٢٠٠٠) ئامادەکاری بەنامەی (ژیلەمۆ) بووە لە تەلەفیزۆنی (میدیا تیڤی)، کە ئەو کاتە تاقە کەناڵی ئاسمانی کوردیی بوو.
– ساڵی (٢٠٠٢) لە سوێد وەکو مامۆستای زمانی کوردیی‌و عەرەبی کاری کردووە.
– بەرهەمەکانی:-
– (بەشی من – سهم من)، نووسینی پەرینوش سەنیعی، وەرگێڕان لە فارسییەوە، ٢٠١٢.
– (ڕووخسارە بەندکراوەکەم- چهرەی ممنوعەی من)، نووسینی (لەتیفە)، وەرگێڕان لە فارسییەوە، ٢٠١٣.
– (باوکی ئەو- پدر آن دیگری)، نووسنی پەرینووس سەنیعی، وەرگێڕانی فارسی، ٢٠١٤.
(پیاوێکی بێ چارەنووس - Mannen utanode)، نووسینی (ئیمرە کیرتێش)، ئامادەیە بۆ چاپ.

* ڕووناك محەمەد مستەفا:-

– لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٥)ی گوندی شێخانی سوورقاوشانی ناوچەی ئاغجەلەر. ئەگەرچی دەرفەتی ئەوەی بۆ نەرەخساوە بخرێتە بەر خوێندن، بەڵام بەهەوڵ‌و ڕەنجی خۆی توانیویەتی فێری خوێندەواری بێ.
– لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. فاکتەری یارمەتیدەر بۆ بەئاسایی بەڕێوەچوونی ئەم مەسەلەیە. زۆرتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە باوکی ئەندامی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بووە.
– ساڵی (١٩٧٨) گوندەکەیان ڕاگوێزراو دانیشتوانەکەی ناچار کران لە گوندی عەسکەر نیشتەجێ بن، لەوێ پەیوەندیی لەگەڵ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا زیاتر پەرەی سەندو لە ماوەی نێوان (١٩٧٨ – ١٩٨٠)دا هەندێ ئەرکی قورسی پێ سپێردرا وەك گەیاندنی دەمانچەو نارنجۆك

بەرێکخستنەکانی سلێمانی‌و کەرکوك‌و لەم ڕووەوە توانی بەیارمەتیی باوکی، ئەم جۆرە ئەرکە قورسانە بەرێکوپێکی جێبەجێ بکا.

- سالی (١٩٨٠) هاوسەرگیریی لەگەڵ عەلی بچکۆلی ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی ڕەنجدەراندا کرد. ئەم هاوسەرگیرییە گۆڕانێکی ڕیشەیی بەسەر هەموو ژیانیدا هێناو لە ژیانی سەختی ڕێکخستنە نهێنییەکانەوە بردییە ژیانێکی سەختتر کە ژیانی پێشمەرگایەتییە، لەو ماوەیەدا ژیانی پێشمەرگایەتیی لەگەڵ مێردەکەیدا لە ناوچەی شوان‌و شێخ بزێنی بەسەر برد.

- سالی (١٩٨١) بەشداریی لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا کردو هەر ئەو ساڵە بەهۆی ئەوەی کە دووگیان بوو، بەنهێنی چووە شاری سنە لە ئێران‌و لەوێ یەکەم کوڕی بوو.

- سالی (١٩٨٢) لەگەڵ پێکهێنانی مەڵبەندەکانداو سپاردنی لێپرسراوەتیی مەڵبەندی دوو بە عەلی بچکۆل، تا سالی (١٩٨٤) لەگوندی سەرگەڵوو گیرسایەوە.

- سالی (١٩٨٤)، دوا بەدوای دەستپێکردنەوەی وتووێژ لەنێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و حکومەتی عێراقدا، ماڵی گواستەوە بۆ گوندی ڕاگوێزراوی شێخان. سالی دواتر، بۆردومان کردنی گوندەکە لەلایەن تۆپخانەی سوپای عێراقەوە، کارێکی وای کرد گوندەکە کەڵکی ژیانی تێدا نەمێنێ، بۆیە جارێکی تر گەڕایەوە بۆ گوندی سەرگەڵوی دۆڵی جافەتی‌و لەوێ نیشتەجێ بوو.

- سالی (١٩٨٨) لە کاتی شاڵاوی ئەنفالەکاندا لە مێردەکەی دابڕاو لەگەڵ دوو کوڕەکەیدا بۆ ماوەی سێ مانگ خۆیان لە سلێمانی شاردەوە. دواتر، بەیارمەتیی ڕێکخستنەکانی ناوشار، بەرەو چیای قەندیل بەڕێ کراو لەوێوە خۆی گەیاندە شاری سەقز لە ئێران‌و لەگەڵ خێزانەکەیدا دوو سالی لەوێ بەسەر برد.

- لە ئایاری (١٩٩٠)دا لەگەڵ مێردو دوو کوڕەکەی لە ڕێی ئێرانەوە چوو بۆ پاکستان‌و بۆ ماوەی ٩ساڵ ژیانێکی دژوارو سەختی وەك ئاوارە بەسەر برد.

- سالی (١٩٩٩) لەڕێی کۆمیسیۆنی ئاوارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، بەخێزانەوە وەك پەنابەر لە نیووزیلاند وەرگیرا.

- سالی (٢٠٠٠) وازی لە ژیانی تاراوگە هێناو گەڕایەوە بۆ کوردستان.

*ڕێبوار ئەحمەد:-

- سالی (١٩٦٣) لەدایکبووە. خوێندنی سەرەتایی تا دواناوەندی لە سالی (١٩٨٢) لە کەرکووك تەواو کردووە. پاشان بەهۆی هەڵسووڕانی سیاسی‌و هەر بەم پێیەش هەوڵی گرتنی لەلایەن ڕژێمەوەو دەرچوونی حوکمی غیابی "مەحکەمەی سەورە" بۆ لەسێدارەدانی، چەند جارێك لە خوێندن براوەو سەرئەنجام سالی (١٩٩٠) پەیمانگای تەکنیکی لە کەرکووك تەواو کردووە.

- سالی (١٩٩٣) لەگەڵ گرووپە چەپەکان ولە نێو بزووتنەوەی شووراکانی ئازاردا کاری کردووە.

- سالی (١٩٩٣) یەکێك بووە لە (١٠) کەسی دامەزرێنەری حککع‌و پاشان تا سالی (١٩٩٧) وەکوو ئەندامی مەکتەبی سیاسی کاری کردووە.

- سالی (١٩٩٥) لەسەر نووسینی‌و وتارێکی ڕەخنەگرانە سەبارەت بە تێڕوانینی ئیسلامی بۆ مافی ژنان لەلایەن حیزبولای سەر بە ئێرانەوە فتوای کوشتنی بۆ دەرکراو بڵاوکراوەی " بۆ پێشەوە"ش کە ئەو وتارەی بڵاوکردبووەوە، لەلایەن دەسەڵاتی ناسیۆنالیزمی کوردەوە داخرا.

- سالی (١٩٩٧) بووە بە سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی حیزب.

- سالی (١٩٩٨) هاوکات بووە بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حککا تا سالی (٢٠٠٤)و کەرتبوونی ئەو حیزبە.

- سالی (٢٠٠٢) لەگەڵ گۆڕینی ئارایشتی ڕابەریی حککع وەکوو لێدەری حیزب هەڵبژێردراوە. لەگەڵ پێکهاتنی حیزبی حیکمەتی وەکوو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوە. یەکێك بووە لە دامەزرێنەران‌و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی کوردستان

- سالی (٢٠٠٩) بەهۆی باری تەندروستییەوە دەستی لە بەرپرسیارێتی کێشاوەتەوەو ئەندامی ڕاوێژکاری هەر سێ مەکتەبی سیاسی حککع‌و حککك‌و حککا - حیکمەتیست بووە.

- سالی (٢٠١٢) بەهۆی کەرتبوونی حیزبی حیکمەتی ئیستیقالەی لەو حیزبە داوە. ئێستا ئەندامی ڕاوێژکاری مەکتەبی سیاسیی "حککع‌و حککك"ە.

شێخ ڕەئوف خانەقا

ڕەفیق حیلمی و بەشیر موشیر

*** رەمزا ساڵح- رەمزا كەبابچی:-**

- ساڵی ١٩٣٩ لە بناری گڵ لەدایكبووە.
- لە ساڵی ١٩٥٣ پەیوەندی بە ڕێكخستنەكانی حیزبی شیوعی كوردستانەوە كردووە.
- ساڵی ١٩٦١ زیندانی كراوە و براوە بۆ نوگرە سەلمان.
- ساڵی ١٩٨٣ خۆی و سەرجەم و خێزانەكەی زیندانی كراون لە بەرئەوەی كوڕەكەی شەهید خەلیل پێشمەرگە بووە لە ساڵی ١٩٨٩یش دووبارە زیندانی دەكرێن.
- لە كارێكی تێرۆرستانە تەقینەوە لە شێوەی دیاری دەنێرنە ماڵیان و خێزانەكەی و كوڕێكی تەمەن ١٨ ساڵانی شەهید دەبن.
- لە ١٨ی كانوونی دووەمی ٢٠١٣ كۆچی دوایی كردووە.

*** رەمزا حەسەن مەلا وەلی:-**

- ساڵی ١٩١٩ لە داقووق لەدایكبووە.
- سەرەتایی لە داقووق و ناوەندی لە كەركوك تەواو كردووە.
- ساڵی ١٩٤١ خولەكانی كۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو كردووە بە پلەی مولازم.
- بە ئەفسەری سەربازگری لە قەزای مەندەلی دادەمەزرێ، دواتر دەگوازرێتەوە بۆ كفری و پاشان بۆ سەربازگری ناوچەی دووی كەركوك هەتا ساڵی ١٩٤٧ بەردەوام دەبێت.

*** ڕەشید تاهیر حاجی وەلی:-**

- ساڵی ١٩٠٢ لە كەركوك لەدایكبووە سەر بە بنەماڵەی بەناوبانگی حاجی وەلییە لە كەركوك.
- لە سەردەمی عوسمانی لە قوتابخانەی مەلەكی خوێندوویەتی، پاشان بە خۆبەخش دەچێتە خزمەتی سەربازی دەگاتە پلەی جێگری ئەفسەر لە بەشی ڕەدیف، پاشان دەچێتە خولی یەكی قوتابخانەی ئەفسەرانی جەندرمە و تەواوی دەكات ئینجا دەچێتە قوتابخانەی ئەفسەران بە پلەی مولازم دەردەچێت، لە كاتی ئاگربەست بە خانەنشینی دەگەڕێتەوە عێراق و دەبێتە جابی، دواتر بە بریكاری بەكاربردن لە پردێ و خورماتوو كار دەكات تا ساڵی ١٩٤٧.

*** ڕەفیق فەوزی خەلیل موخلیس:-**

- ساڵی ١٨٩٨ لە شاری كەركوك لە دایكبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ڕوشدی لە سلێمانی تەواو كردووە بەهۆی وەزیفەی باوكی لەو شارەدا پاشان باوكی گوازراوەتەوە بۆ شاری دیوانییە، دەچێتە قوتابخانەی نموونەی یەكەمی كوڕان و پاشان چووەتە خانەی مامۆستایان و پەیوەندی دەكات بە خزمەتی سەربازی.
- ساڵی ١٩١٤-١٩١٨ دەچێتە قوتابخانەی جەنگی بۆ ئەفسەرانی یەدەگ دوای تەواو كردنی خولی جێگری ئەفسەرانی جەنگی لە بەشی ڕەشاشات دامەزرا.
- بەشداری بزاوتە سەربازییەكانی كووت دەكات و لەكاتی بوونی هێزەكانی عوسمانی بە پشتێنی گەمارۆ لێدراو لە شاری كووت ناوبراو لەگەڵ یەكینەكەی گوازرایەوە بۆ ئێران لە دوو توێی تیپی ئیحسان پاشا لەوێ لە ساڵی ١٩١٥ بە دیلی دەكەوێتە دەست هێزەكانی ڕووسیاو دەرفەت وەردەگرێت و ڕادەكات لە دیلی و دەگەڕێتەوە بۆناو یەكینەكەی.
- ساڵی ١٩١٦ پلەی بەرز دەكرێتەوە بۆ وەكیلی ئەفسەری جەنگی، پاشان لەگەڵ سرییەیەكدا دەنێردرێ بۆ بەرەی تەورێز و بۆ چەند شوێنێكی شەڕ دەگوازرێتەوە دواجار بۆ عێراق و سلێمانی.
- ساڵی ١٩١٧ پلەی بەرز كرایەوە بۆ ئەفسەری جەنگی و بەشداری دەكات لە چەندین جەنگ لە عێراقدا، دیسانەوە لەبەرەی شەڕی شەرگات بە دیل دەگیرێت و هەشت مانگ لە دیلیدادەمێنێتەوە و لە دواییدا دەگەڕێتەوە بۆ كەركوك.
- ساڵی ١٩١٩ دوای ساڵێكی تەواو لە عێراق لە قوتابخانەی (ڕووپێوی سەربازی) تەواو دەكات بڕوانامە لەو بوارەدا بەدەست دەهێنێت و دەستدەكات بە كاری بازرگانی.
- ساڵی ١٩٢١ لە بەغدا بە ئەندازیار لە فەرمانگەی تاپۆ دادەمەزرێت و پاشان لە فەرمانگەكانی هەولێر و سلێمانی و كەركوك و حیللە تا ساڵی ١٩٤٧ بەردەوام دەبێت.
- جگە لە زمانی كوردی، زمانەكانی عەرەبی و توركی و فارسی زانیوە.

*** ڕەمزا عەبدوڵڵا:-**

- لە كەركوك لە گەڕەكی ڕەحیماوا لەدایكبووە.
- یەكێكە لە گۆرانیبێژە لاوەكانی عێراق و دەنگێكی بەتواناو ڕەسەنی هەیە.

شێخ ڕەوف و شێخ مەلیكی كوڕی و ئاغای جوكول دزەیی

ڕەفیق حیلمی و دکتۆر قوتبەددین عەزیز کاکەیی و نوری سابت لە ناوەڕاستی پەنجاکانی لە کەرکوک

ڕەفیق حیلمی لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێی قوتابیدا

ساڵی ١٩٥٦ بەغدا دوکانی بەشیر موشیر ڕەفیق حیلمی و شاکر مەجروم

ڕەمەزان زامدار – دکتۆر حوسامەدین

*** ڕەزا سەعید حوسێن:-**

– لە ١ی گەلاوێژی سالی١٩٤٤ لە شارۆچکەی سەنگاو (گۆپتەپە) لەدایکبووە.

– ناسراوە بە ڕەزای حاجی حەمە سەعید گولە و لە هۆزی زەنگەنەیە، یەکێك بووە لە پیاوە ناسراو و خوێنەدەوار و تا ڕادەیەك دەولەمەندەکانی سەنگاو، پیاوێکی زۆر میانڕەو، نەرم و نیان بووە، هەمیشە پرس و ڕای پێکراوە، پیاوێکی بە ئەمەك و مرۆۋ دۆست بووەو بە تەنگ خەلك و کەس و کارەوە هاتووە، یەکێك لە خەسلەتەکانی ڕێك پۆشێکی زۆر بەناوبانگ بووە هەمیشە سیمای کوردەواری بە بۆشاکییەوە دیاربوو.

– لە کاتی پرۆسەی ئەنفالدا کاتێك سەنگاو لەلایەن ڕژێمی لەناوچووی بەعسەوە دەڕووخێندرێت دەربەدەری چەمچەمالْ دەبێتو بۆ ماوەیەك لەبەر ئەوەی فەرمانبەر دەبێت لە فەرمانگەی پۆستەو گەیاندن، حکومەت بێزاری دەکات سەرەڕای ڕووخانی خانووبەرەکەیو دەربەدەری، زۆری بۆدەهێنن کە ببێتە جەیشی شەعبی، بۆیە ناچار دەبێت ماوەیەك خۆی بشارێتەوە، پاشان دەچێتە شاری سلێمانی و لەوێ دادەنیشێتو دەوامەکەشی دەگوازێتەوە بازیان تاوەکو خانەشین دەبێت.

– لە سالی ١٩٦٣ پۆلی سێی ناوەندی بووە، لەبەر پێویستی خێزانەکەی (مالی باوکی) واز لە خوێندن دەهێنێت بۆ یارمەتیدانی باوکی، چونکە حاجی سەعیدی گولە پیاوێکی ناودار و خاوەن دیوەخان بووە و هەمیشە دیوەخانی بە میوان ئاوەدان بووە، کە لەو کاتەدا بە یەکێك لە کۆنترین دووکاندار و بازرگانی سەنگاو دەناسرێتو لە هەر (٩٦)ش لادێکەی سەنگاوەوە دەهاتن بۆ بردنی پێداویستی لە دووکانەکەی، حاجی حەمە سەعیدی باوکی جگە لە کاری بازرگانی بۆ بژێوی ژیان و خزمەتکردنی میوان، کاری فەلاحەتی و ئاژەلداریشی کردووە، چونکە کۆن عادەت وابوو کە گوندییەك دەهاتە شار ئەبوایە لە مالی خاوەن دووکانەکەدا ڕۆژی بکردایەتەوە و لەوێ نانی بخواردایە و ئالیکی ولاخەکانیشی بدرایە ئەمە ئاسان نییە، بۆیە ئەم تێکەلییە و فرە کەلتوورییە وای لە ڕەزا کرد کە کوڕی گەورەی مالەکەیان بوو هەر لە منداڵییەوە لەسەر خۆ و گوێگرێکی باش بێت بۆ قسە و گوزەشتی ناو دیوەخان. هەروەها حاجی حەمە سەعید گولە لە ڕێکخستنەکانی پارتیشدا کاری کردووە، لەسەرەتای دروستبوونی پارتییەوە وە لە هەمان کاتدا لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردووەوە لە مەجلیس بەلەدییە دادەمەزرێت و یەکێك بووە لە ئەندامانی و زۆر چالاکانە کاری کردووە، بەهەمان شێوە ڕەزا سەعید تێکەلْ بە ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی بووە لە حەفتا تا نسکۆی شۆڕش سالی ١٩٧٤ بەرپرسی کۆمەلەی هەرەوەزی جووتیاران بووە، هەر لە دوای نسکۆی شۆڕش کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستان و شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بەڕێگەی شەهید مەلا نووری بانگهێشتکراوە کە وەك ئەندامێك لە ڕێکخستنەکاندا کار بکات. بەپێی ئەو بەلگەنامانەی کە لە کەسوکارەکەیەوە بەجێماوە ئەوە دەخەنە ڕوو کە گەلێك دەستنووسی ئەو کاتەی کۆمەلەی ڕەنجدەرانی لەلا بووە کە ئەستێرەیەکی سووری لەناودا بووەو کۆمەلەی ڕەنجدەران نووسرابوو، بەلاّم بەداخەوە هەمووی لەناوچووە.

– بەهۆی ئەوەی ڕەزا سەعید چاوی زۆر لەسەر بووە بەردەوام جاش و جەیش لەسەنگاو مالەکەیان دەپشکنی و بێزاریان دەکرد تا بڕیاریدا واز لە سیاسەت بهێنێت و داوای دامەزراندنی کرد لە پۆستەی سەنگاو لە سالی ١٩٧٦ دامەزراو سەرەڕای دەوامی فەرمانبەرێتی کاری دووکانداریشی دەکرد، بۆیە بڕیاریدا کاتی تەرخان بکات بۆ پەروەردەی منداڵەکانی و ڕێنمایی براو خوشکەکانی.

- بەردەوام هەوڵی داوە لە ڕێگەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی وەکو یۆنسکۆ و فاو پشکی خەڵکی سەنگاو لە ئاوەدانی و پێویستی جووتیار و قوتابخانە بەدەستبهێنێت.

- ڕەزا سەعید خاوەنی (٦) کوڕ و (٢) کچە بە ناوەکانی:-

- د. سەلاح ڕەزا سەعید، پرۆفسیۆر لە بوای فیزیای نانۆ تەکنۆلۆژی، ئێستا سەرۆکی زانکۆی (چەرموو)ە لە چەمچەماڵ.

- سەباح ڕەزا سەعید، (دبلۆمی بازرگانی) بەڕێوەبەری ژمێریاری، تەندروستی سلێمانی.

- ڕەنج ڕەزا سەعید، (بەکالۆریۆس لە ڕاگەیاندن) جۆرنالیست، خاوەنی ئەزموونێکی زۆرە لە کاری ڕۆژنامەوانیدا، ئامادەکار، ئامادەکار و پێشکەشکاری سەرکەوتوو لە بەرنامەکانی: چاوی سێیەم، بەرنامەی ٢١، لەگەڵ ڕەنج، لە تەلەفزیۆنەکانی خاك، کوردسات، ئێن ئار تی کاری کردووە، لە ئێستاشدا کار دەکات لە تەلەفزیۆنی ڕووداو کە بەرنامەکانی ڕەخنە ئامێزن.

- سالار ڕەزا سەعید (دبلۆمی میدیا) ڕۆژنامەنووس و ماوەیەکی زۆر بەرپرسی بەشی هەواڵی ڕۆژنامەی ئاسۆ بووە، پاشان لە تەلەفزیۆنی ڕووداو لە سلێمانی کاری کردووە لە ئێستاشدا بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی ڕووداوە و فەرمانبەرە لە وەزارەتی ڕۆشنبیریی.

- ئارام ڕەزا سەعید، (بکالۆریۆس - یاسا) پارێزەرە، ماوەی چەند ساڵێك لە دادی سلێمانی کاری کردووە، ئێستا پارێزەری ڕاوێژکارە.

- بەڵێن ڕەزا سەعید،(بکالۆریۆس - ڕاگەیاندن) ڕۆژنامەنووس، بکالۆریۆسی هەیە لە بواری میدیا، ماوەیەکی زۆر بەرپرسی ڕادیۆی مەڵبەندی سلێمانی (ی. ن. ك) بووە، پاشان بەرپرسی ڕادیۆی ئالیا و لە بوارەکەی خۆیدا کارامە

د. پ. سەلاح ڕەزا سەعید

بووە، بەڵام لە ئێستادا خەریکی کاری ڕیکلام و میدیایە.

- هێرۆ ڕەزا سەعید، هاوسەرگیریی کردووەو هەر لە سلێمانییە.

- ئاورینگ ڕەزا سەعید، (بەکالۆریۆس ئابووری) هاوسەرگیریی کردووە لە وڵاتی سویدە.

- ڕەزا سەعید لە ڕێککەوتی ١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠١٠ لە ڕێگای سلێمانی - سەنگاو گیانی سپارد و لە گۆڕستانی شێخ عەباس لە سلێمانی بە خاك سپێردراوە.

* (زاهیر شکور سابیر):-

- ساڵی (١٩٥٢) لە گوندی شۆراوی لای کەرکوک لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوک تەواو کردووە.
- نووسەرو رۆژنامە نووسەو لە گۆڤارو رۆژنامەکانی وەکو:-
- گۆڤاری (حەمرین)و (بیرو هوشیاری)و (کەرکوک)و (سیاسەتی نێودەوڵەتی)و رۆژنامەی (کەرکوکی نوێ)و (كركوك الجديدة) و گۆڤاری وەرز کاری کردووە.
- ساڵی ١٩٩٨ -٢٠٠٠ لێپرسراوی لیژنەی مافی مرۆڤی گەرمیان بووە.
- ساڵی ٢٠٠٠-٢٠٠٣ بەڕێوەبەری ئیدارەی مەکتەبی بیروهۆشیاری بووە.
- ساڵی ٢٠٠٤-٢٠٠٦ سەرنووسەری هەفتەنامەی کەرکوکی نوێ بووە.
- ساڵی ٢٠٠٥-٢٠١٣ جێگری بەڕێوەبەری کەناڵی تەلەفزیۆنی کەرکوک بووە.
- ساڵی ٢٠١٤ سکرتێری ئەنجوومەنی سیاسی کەناڵی ئاسمانی کەرکوک بووە.
- ئێستا بە پلەی جێگری مەڵبەند لە راگەیاندنی مەکتەبی رێکخستنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بووە.
- دەستەی دامەزرێنەری ناوەندی محەمەد ئەمین عەسری بۆ لێکۆڵینەوە.
- بەڕێوەبەری گشتی ئیدارەی ئینسکلۆپیدیای کەرکوکە.
- ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری ناوەندی سیکیۆلاریزمە لە کەرکوک.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- کتێبی (ئانارشیزم و دەوڵەت).
- (عەلمانییەت).
- (جارانی کەرکوک - گەشتێك بەناو گەرەك و شەقامەکانی کەرکوکدا)، ٢٠١٣.
- کەرکوك لە روانگەی هاوچەرخانەوە، ئامادەیە بۆ چاپ.
- دیوانێکی شیعری، ئامادەیە بۆ چاپ.

* (زاهیر رۆژبەیانی):-

- ناوی (زاهیر عەلی رۆژبەیانی)یە.
- ساڵی (١٩٥٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە (٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٢) بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (چیرۆکی هونەری کوردی)، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٧، چاپی دووەم، دهۆك، (٢٠٠٨).
- (شیعر، لە دەرەوەی شیعر)، هەولێر، (٢٠٠٨).
- کاروباری گێرانەوە، هەولێر ٢٠١١.
- دوو بەرهەمی دەستنووسی لێ بەجێماوە.
- لە ٦ی ئاداری ساڵی ٢٠١٢ بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کردووە.

* (زایەر عەلی خدر):-

- ساڵی (١٩٣٧) لەدایکبووە.
- دووزەلە ژەنێکی بەناوبانگی شەستەکان بووە.

* (زەبوونی - سلێمان بەگ):-

- نازناوی (سلێمان بەگ)ە، کە یەکێکە لە شاعیرەکانی دێی قەیتول، لە رەچەڵەکی (میر ئەحمەد بەگ)ە.
- ساڵی (١٧٤٨) لە کرماشان لەدایکبووە.
- بۆ خوێندن چووەتە بەغدا پاشان گەڕاوەتەوە بۆ قەیتول.
- گەلێك شیعری بە زمانی گۆرانی هەیە لە وەسپدا.
- ساڵی (١٨٠٤) کۆچی دوایی کردووە.

* (زەمان محەمەد حوسێن):-

- ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی زانکۆی سەلاحەددین بەشی بایۆلۆجییە.
- شارەزایی هەیە لە هونەری شێوەکاری و زەخرەفە و نەخشەسازی و تابلۆکێشان، دەستی هەیە لە شیعر نووسین و وەرگێران لە کوردییەوە بۆ عەرەبی و کتێبی هەیە بۆ چاپ کردن.

* (زەنوری-ذالنوری):-

- ناوی (خەلیل سلێمان بەگ زەنگەنە)یە.
- لە بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (دیوانی ذالنوری)، ئێران، ١٩٧٠.

* (زەنون محەمەد پیریادی - دکتۆر زەنون محەمەد پیریادی):-

- سالی (١٩٣٣) لە گوندی (عەلی مەنسوور) نزیك بەچەمچەمال لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی وناوەندی وئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- بروانامەی بەکالۆریۆسی (B.SE) لە کیمیادا لە (دار المعلمین عالی) سالی (١٩٥٥) بە یەکەم وبە پلەی (شەرف)

وەرگرتووە.
- سالی (١٩٦٧) بروانامەی ماجیستێری لە زانکۆی (ئۆکلاهۆمای-میری لە ئەمریکا تەواو کردووە لە بواری کیمیای ژیانی.
- سالی (١٩٧٠) بروانامەی دکتۆرای (PH.D) لە زانکۆی (ئەکرۆن) لە ئەمریکا وەرگرتووە لە بواری کیمیای ئەندامی وپۆلیمەردا.
- سالی (١٩٧٠-١٩٧١) گەرایەوە زانکۆی بەغدا.
- سالی (١٩٧٢) لە زانکۆی (سلێمانی) کاری کردووە.
- (١٩٧٤-١٩٧٥) لە زانکۆی (ئەریزۆنا) لە (ئەمریکا) دەرسی گوتۆتەوەو لێکۆلینەوەی کردووە.
- سالی (١٩٨١) لە زانکۆی (مشیگان) لە (ئەمریکا) لێکۆلینەوەی لەگەل پرۆفیسۆری خوالێخۆشبوو دکتۆر (چارلس ئۆڤە-بورگەر) لێکۆلینەوەی کردووە.
- سالی (١٩٨٨) پلەی پرۆفیسۆری وەرگرتووەوە لە زانکۆی بەغدا بەشی کۆلیژی زانست.
- دکتۆر (پیریادی) پلەی (یەکەم پرۆفیسۆری) زانکۆکانی عێراقی پێ بەخشراوە لە بریتی ئەم بەرهەمانەی خوارەوە:
- ژمارەی لێکۆلینەوەی زانستی (٨٧).
- ژمارەی ماڤی داهێنان (٣).
- ژمارەی کتێب (دانراو، وەرگێراو) ١٣.
- ژمارەی ووتار بە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی (١١٩).
- ژمارەی نامیلکەو دکتۆراو ماجیستێر (هەلسەنگاندن) ٢٨.
- ژمارەی نامیلکەو دکتۆراو ماجیستێر (سەرپەرشتی کردن) ٨.
- ژمارەی راوێژکاری زانستی، (٢).
- تەفەروغی عیلمی (٢).
- ژمارەی خولی راهێنان (٥).
- ئەندامێتی کۆمەلە زانستییەکان، (٤).
- ژمارەی کۆنگرەی زانستی (١٨).
- ژمارەی ووتاری ئێستگەی کوردی، بەغدا، (١٩٩).
- رەشنووسی کتێب کە ئامادەیە بۆ چاپ، (٥).
- سالی ئەکادیمی (١٩٩٦-١٩٩٧) لە ئەنجامی هەلبژاردن دکتۆر زەنون محەمەد عەزیز بەیەکەمی وەزارەتی خوێندنی بالا هەلبژێردرا.
- بەرهەمەکانی:
- (کیمیاء الجزیئیات الکبیرة العملي)، ١٩٨٥-١٩٨٦.
- (ادبیات الکیمیاء)، ١٩٨٨.
- (الکیمیاء العضویة للدائن وتشخیصها)، ١٩٨٩.
- (کیمیاء اللواصق والاصباغ والاطلیة البولیمریة)، ١٩٩١.
- (التفاعلات العضویة لأیون الکاربون السالب)، ١٩٩٩.
- (الجذور الحرة في الکیمیاء العضویة)، ٢٠٠١.
- (السیرة الحیاتیة والعلمیة)، ٢٠٠٦.

* زەینەل ئاغا ئاوچی:-
- سالی ١٩٦٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- إشراقات رؤى جبهة ترکمان العراق للقومیة الترکمانیة العراقیة، ٢٠٠٧

* (زەینەل حەوێش - مەلا زەینەل حەوێش):-

- ناوی (مەلا زەینەل کوری حەوێش کاکەیی)یە.
- سالی (١٨٦٩)ی زایینی لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.

- هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو لە پاشا ڕێزمانی عەرەبیو شەریعەتی ئیسلامو وێژەی فارسی لەلای مەلاکان خوێندووەو لە پاش مەرگ باوکی چووەتە دوکانەکەیو خەریکی دارتاشی بووەو لە پاشا ڕۆیشتووەتە دێی تەرجیلو خەریکی کشتوکاڵو ماڵداری بووە.
- لە هۆنینەوەی هۆنراودا دەستێکی بەرزو باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ تەڕو پاراوو شیرینن‌و دیوانەکەی کە داگری دوو هەزار هۆنراوێك ئەبێ بە داخەوە هێشتا لە چاپ نەدراوە.
- ساڵی (١٩٢٣)ی زایینیی کۆچی دوایی کردووە.

*** ( زەینەڵ سابوونچی ):-**

- ساڵی (١٨٨٨) لە گەڕەکی (موسەڵلا) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەنگ خۆش‌و مەقام زان‌و قورئان خوێن بووە، شارەزایی هەبووە لە مەقامەکانی (ڕاست)و (حیجاز)و (بەیات).
- شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە زانستی تەجویداو بە یەکێك لەو کەسە چاکانەی ئەو بوارە دادەنرێت.
- ساڵی (١٩٨٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( زەینەڵ نەعلبندی کوردی ):-**

- ساڵی (١٨٠٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٨٩٥) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.
- فێری هونەری مەقام بووە لە (ڕەحمەتوڵلا شەلتاغ).

*** ( زرار سدیق ناروجەیی - دکتۆر زرار سدیق ناروجەیی ):-**

- ناوی (زرار سدیق تۆفیق ناروجەیی)یە.
- ساڵی (١٩٦٨) لە کەرکوك لە دێی ناروجەی شوان لەدایکبووە.
- دکتۆرای هەیە لە بواری مێژووی کورد.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (القبائل والزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط)، دەزگای موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (چەند لێکۆڵینەوەیەك لە مێژووی کورد)، ئەکادیمیای کوردی. هەولێر. (٢٠٠٨).
- (کوردستان في القرن الثامن عشر الهجري)، دەزگای موکریانی. چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٠، چاپی دووەم، ٢٠١١.
- (کوردو کوردستان لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامیدا)، ٢٠١٤.
- (کۆمەڵگای کوردەواری لە سەدەکانی ناوەڕاست)، ٢٠١٤.

*** ( زرار عەلی ):-**

- ناوی (زرار عەلی حەسەن)ە.
- ساڵی (١٩٧٧) لە گەڕەکی ڕەحیماوەی شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- بڕوانامەی دبلۆمی لە زمانی عەرەبیدا لە پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایان بەشی زمانی عەرەبی لە ساڵی (١٩٩٩) وەرگرتووە.
- بەکالۆریۆسی لە مێژوودا لە کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٧) وەرگرتووە.
- لە بواری نووسین‌و وەرگێڕاندا: لە سەرەتای نەوەدەکانەوە دەستی بە نووسین کردووەو سەرەتا لە ساڵی (٢٠٠١) بە بڵاوکردنەوەی دیوانە شیعری (قەسیدەیەکی ڕوح سەوز) هاتووەتە ناو دنیای نووسینەوەو دواتر دوای تەواوکردنی بەشی مێژوو، دەستی بە کاری وەرگێڕان کردووە بەتایبەتی لە بواری مێژوودا.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مێژووی کورد لە شارستانی ئیسلامیدا)، وەرگێڕان، لە نووسینی: د. ئەحمەد مەحموود ئەلخەلیل، چەند ساڵێك لە زانکۆی سلێمانی پرۆگرامی خوێندن بووە.
- (مێژووی زەردەشتی لە سەرەتاوە تا سەدەی بیستەم)، وەرگێڕان، لە نووسینی ماری بۆیس.
- (مێژووی ئەیوبیو مەمالیك لە میسرو شامدا)، وەرگێڕان، لە نووسینی سەعید عەبدولفەتاح عاشوور، ئێستا پرۆگرامی خوێندنە لە زانکۆی گەرمیان.
- (بەهەشتی منداڵان)، چیرۆك بۆ منداڵان.
- (بووکی بەهار)، چیرۆك بۆ منداڵان.
- خاوەنی چەندین کۆڕو سیمیناری ئەدەبیو بوارە جیاجیاکانی ترە.
- لە چەمچەماڵ بەشدار یان سەرپەرشتیار یان دەستەی نووسەرانی ئەم بڵاوکراوانە بووە (مەشخەڵ، بێداری، ڕاژان، ڕێنما، چەمچەماڵ).
- ساڵی (١٩٩٨) لە هەولێر بڵاوکراوەی (ڕەسەن)ی دەرکردووە.
- لەسەر ئاستی کەرکوك (بۆ ماوەی دوو ساڵ دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (باباگوڕگوڕ) بووە کە لەلایەن (کۆمەڵەی ڕووناکبیریو کۆمەڵایەتی باباگوڕگوڕ)ەوە دەردەچوو.
- لەسەر ئاستی کوردستان: بۆ ماوەی سێ ساڵ پەیامنێری گۆڤاری (لڤین) بووەو لە ساڵی (٢٠٠٥) خەڵاتی باشترین نووسەری ساڵی ئەو گۆڤارەی وەرگرتووە.
- ئێستاو بۆ ماوەی (١٠) ساڵە سەرنووسەری گۆڤاری (گوڵەکان)ی تایبەت بە منداڵانە کە تا نووسینی ئەم بابەتە (٩٦) ژمارەی لێ دەرچووە.
- لە بواری کاری ڕێکخراوەییدا:
- جگە لە سەندیکای ڕۆژنامەنووسان لە زۆر ڕێکخراوی

پیشەپی و جەماوەریدا کاری کردووە، لەوانە:
(کۆمەڵەی کوردستانێکی سەوز، ڕێکخراوی گەشەپێدانی قوتابیانی کوردستان، سەنتەری گەشەپێدانی چالاکی لاوان).
- سالی (٢٠٠٥) دەستەی دامەزرێنەری (ڕێکخراوی خێزانی بەختەوەر) بووە لە بواری هۆشیاری خێزانی، لە شاری کەرکوك‌و بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەرپرسی ڕاگەیاندنی ئەو ڕێکخراوە بووە، کە ئێستا ئەم ڕێکخراوە فراوان بووەو ئۆفیسی لە زۆرێك لە شارەکانی کوردستاندا هەیە.
- سالی (١٩٩٢)وەوە چووەتە بواری شانۆوەو لە دەیان کاری شانۆیی وەکو (ئەکتەر، نووسین، دەرهێنان)و کارە هونەرییەکانی تر بەشداری کردووە.
- سالی (٢٠٠٦)ەوە چووەتە بواری فیلمسازی‌و دراماوەو بەشداری ئەم بەرهەمانەیە:
- چاویلکە، لە نووسین‌و دەرهێنانی خۆی (کوورتە فیلم- ١٣ خولەك).
- زێ، لە نووسین‌و دەرهێنانی خۆی (فیلمێکی ٤٣ خولەکی).
- تارمایی تاوان (زنجیرە درامایەکی ٢٦ ئەڵقەیی) لە نووسینی خۆی‌و دەرهێنانی هونەرمەندی شاری سلێمانی بەڕێز (بەکر ڕەشیدە) کە زیاتر لە سەدو پەنجا ئەکتەری شارە جیاوازەکانی سلێمانی بەشدارییان تێدا کردووە.
- ئێستا ئەم سیناریۆیانەی ئامادەن بۆ کارکردن‌و لە کاتی ئەم نووسینەدا بڕیار وایە کاریان تێدا بکرێت زنجیرە درامای (مانەوە) بڕیار وایە هونەرمەندی شاری کەرکوك (محەمەد سەید) کاری دەرهێنانی بۆ بکات)، (زنجیرە درامای (خەزانێك بەر لە پایز) بڕیار وایە هونەرمەندی شاری سلێمانی (بەکر ڕەشید) کاری دەرهێنانی بۆ بکات، (خەمی خاك) هێشتا دەرهێنەری دیاری نەکراوە.
- ئێستا ئەندامی تیپی شانۆی (گەل)ە لە چەمچەماڵ.

* (**زریان عوسمان - دکتۆر زریان عوسمان**):-

- ساڵی (١٩٥٤) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، لە گەڕەکی تەپەی مەلا عەبدوڵڵا.
- ساڵی (١٩٧٣) چووەتە کۆلیژی پزیشکی‌و لە ساڵی (١٩٧٩) کۆلیژی پزیشکی موسلی تەواو کردووە.
- لەبەر ئەوەی یەکەمی کۆلیژ بووە کردیانە مامۆستای پزیشکی لە کۆلیژی سلێمانی.

- لە دوایدا چووەتە ڕیزی پێشمەرگایەتی.
- ساڵانی (١٩٨٨-١٩٩٠) چووەتە ئێران‌و لەوێشەوە چووەتە بەریتانیا.
- ساڵی (١٩٩٤) دبلۆمی هێناوە.
- ساڵی (١٩٩٧) دکتۆرای هێناوە لە بەشی نەخۆشییەکانی هەناوو دڵ.
- ساڵی (٢٠٠٦) گەڕاوەتەوە کوردستان‌و کراوە بە وەزیری تەندروستی.

* (**زمناکۆ هیدایەت**):-

- ساڵی (١٩٨٠) لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٤) پەیوەندی کردووە بە کۆمەڵەی هونەر جوانەکانی چەمچەماڵ بەشی شانۆ.
- ساڵی (١٩٩٤) بۆ یەکەمین جار بەشداری کرد لە شانۆی (ئەم ڕووبارە گەورەیەی هەرێم).
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری کردوو لە شانۆگەری (منداڵی شارەکەم).
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری کردووە لە شانۆگەری (ئەنفال).
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری کردووە لە شانۆگەری (مۆدیل).
- ساڵی (١٩٩٩) بەشداری کردووە لە شانۆگەری (یاخیبووان).
- ساڵی (٢٠٠٠) بەشداری کردووە لە شانۆگەری (ڕاپەڕین).
- ساڵی (٢٠٠١) بەشداری کردووە لە فیستیڤاڵی کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری کردووە لە شانۆگەری (تۆ تاوانباری).
- ساڵی (٢٠٠٣) بە دەوری سەرەکی بەشدار بووە لە فیلیمی (چارەنووس).
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری کردووە لە شانۆگەری (ئێمە کوردمان نەهێشت، شێواو) لە شاری کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشدار بوو لە شانۆگەری (بەڵام ڕۆژهەڵات).
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری کەرنەڤاڵی ئەنفالی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) لە گرتەی فیلمی (بەرەو تاوان) بەشدار بووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) لە چوار شانۆگەری تردا بەشدار بووە لە

کەرکوك.
- سالی (٢٠٠٥) بەشدار بوو لە کەرنەڤالی ئەنفال لە زانکۆی سلێمانی.
- سالی (٢٠٠٥) لە شاری هەڵەبجەی شەهید بەشدار بوو لە کەرنەڤالی کیمیاباران.
- سالی (٢٠٠٥) لەگەڵ چەند لاوێکی شاری کەرکوك چەند شانۆیەکی تری ئەنجام دا.
- سالی (٢٠٠٥) چەندین نمایشی کردووە لە تەلەفزیۆنی کەرکوك.

* (زولفیقار پاشا):-

- سالی (١٦١٥) بووەتە والی کەرکوك، بەڵام بەردەوامی سالی کارەکەی نازانرێت.
- وابزانم لە تیرەی کەلهورە.

* (زوهدی داوودی):-

- ناوی (زوهدی خورشید داوودە)یيە.
- سالی (١٩٤٠) لە شاری (داقوق) لەدایکبووە.
- قوتابخانەی سەرەتای لە قەزای خانەقین وقۆرەتوو تەواو کردووە.
- سالی (١٩٥٩) خوێندنی لە (دار المعلمین) تەواو کردووە لە کەرکوك.
- سالی (١٩٥٥)ەوە ئاشنایەتی پەیدا کردووە لەگەڵ (قەحتان هورمزی)، بەهۆی خۆپیشاندانی سالی (١٩٥٦)و بەشداری کردنی تێدا لە قوتابخانە دەرکراووە بۆ ماوەی سالێك.
- شاری کەرکوکیش پەیوەندییەکی پتەوی هەبووە لەگەڵ ئەم نووسەرانە:-
(یوسف حەیدەری)، (ئەنور غەسان)، (موئەیەد راوی)، (عەلی شوکر بەیاتی)، (جەلیل قەیسی)، (محێدین زەنگەنە) (سەرگۆن پۆلس) (جان دەمۆ).
- هەر لە سەردەمانێك نووسینی بلاوکردووەتەوە، یەکەم شیعری لە گۆڤاری (الندیم)و (رۆژنامەی فتی الموصل)و (صوت المحاربین)، یەکەم چیرۆکی لە رۆژنامەی (الادیب) ی لوبنانی لە سالی (١٩٥٨) بلاوکردووەتەوە، یەکەم کۆمەلە چیرۆکی لە سالی (١٩٦٢) لە بەغدا بە چاپ گەیاندووە.
- یەکەم رۆمانی لە سالی (١٩٦٠) بلاوکردووەتەوە بە ناونیشانی (طریق الاخرین).
- لەنێوان سالانی (١٩٦٧-١٩٧٢) وولاتی بەجێهێشتووە بۆ خوێندنی فەلسەفەی مێژوو، پلەی ماجیستێری بەدەستهێناوە لە زانکۆی (لایبزك) لە ئەلمانیا، لە سالی (١٩٧٦) لێکۆڵینەوەی دکتۆرای بەدەستهێناوە، لە سالانی (١٩٧٦-١٩٧٩) مامۆستا بوو لە کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی (موسل).
- کتیبێکی بەزمانی ئەلمانی بە چاپ گەیاندووە بە ناوی (الاکراد، تأریخ.. حضارة والکفاح المصیري)، کە دووجار بە چاپ گەیەنراوە لەنێوان سالانی (١٩٨٧، ١٩٨٨).
- ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیاندووە:
- (رجل في کل مکان)، رۆمان، ١٩٧٤.
- (الزنابق التي لا تموت)، کۆمەلە چیرۆك، ١٩٧٨.
- (رحلة إلی بابل القدیمة)، رۆمان، ١٩٨٤.
- (اسطورة مملکة السید)، چیرۆك، ١٩٩٠.
- (اطول عام في حیاة وادي کفران)، ١٩٩٤.
- (زمن الهروب)، ١٩٩٨.
- (سعاں). کۆمەلە چیرۆك، بەزمانی ئەلمانی، ١٩٩١.
- (اطول عام)، رۆمان، بەزمانی ئەلمانی، ١٩٩٣.
- (وداعا نینوی)، سێ چیرۆکی درێژ، بەزمانی ئەلمانی ٢٠٠١.
- (قصائد الغربة)، ١٩٩٤.
- (تحولات)، ٢٠٠٧.
- (فردوس قریة الاشباح)، (٢٠٠٨).
- (زمرة السعداء).
- (النورس الحائر).
- لە ٧ی کانوونی دووەمی سالی ٢٠١٧ کۆچی دوایی کردووە.

* زەکی بنیامین هارون.
- رۆژنامەنووس و شاعیرو وەرگێڕ بووە لە کەرکوك لە دایکبووە، لە خێزانێکی ئاییندار پەروەردە بووە و لە موسڵ پێگەیشتووە،
- بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەی (ئەلیانس) لە موسڵ.

محەمەد سابیر و دکتۆر زەنون پریادی و بەهجەت ڕەئوف ناجی
١٩٥٤ - ١٩٥٣

محەمەد سابیر و بەهجەت ڕەئوف ناجی و دکتۆر محەمەد زەنون پیریادی
١٩٥٤-١٩٥٣

*** سابیر یان سەبوور حاجی قوربانی رەزا سەرچەور - مەلا سەبوور:-**

- ناوی سابیر یان سەبوور حاجی قوربانی رەزا سەرچەور.
- بە بنەچە لە بەگزادەی جاف بوون، هەروەها (کەلهور)یشیان لێ بیستوون، ئامۆزای بنەماڵەی (خەتاب)ەکانی کەرکووکن، کە یەکێکیان (فاتیح ئالتوونچییە).
- ئیمام و خەتیبی مزگەوتی ئیمام قاسم بووە، ماڵەکەشی بەرامبەر بە مزگەوتەکە بووە. بۆ کارێك رووی لە شارۆچکەی قەڵادزێ کردووە، ئیتر حەزی بە خوو و دابونەریتی ناوچەکە کردووە و هەر لەوێ گیرساوەتەوە.
- لە کەرکووك بە مەلا سەبوور و لە قەڵادزێ بە مەلا سابیر کەرکووکی ناسراوە. ئیمامی مزگەوتی خانەقای قەڵادزێ و موریدی شێخی بێژوێ بووە.
- خەڵکی قەڵازدێ خۆشیان ویستووە و بە پیاوێکی نوورانی و خواناس ناسراوە، تەنانەت خەڵك گوتوویانە: مەلا سابیر بەیانییان، کە لە خەو هەڵدەستێت، لیرەیەك لەژێر پشتییەکەی دادەنرێت؟ چونکە دووکانەکەی هیچی وای تێدا نەبووە و رزق و رۆژیشی باش بووە...هتد.
- مەلا سابیر سێ ژنی هێناوە، یەك لە ژنەکانی منداڵی لەپاش بەجێنەماوە و مردووە، ژنی دووەمی تەنها یەك کوری لێ بووە بە ناوی (بەهائەدین) و ئەویش مردووە. بەهائەدین، تەنها دوو منداڵی لەپاش بەجێماوە، حوسامەدین و سەبیحە، کە کورەکەی مامۆستای خانەنشینە و لە سلێمانی دادەنیشێت، کچەکەشی کابانی ماڵ و خێزانی (نووری حەمەسەعید)ە و لە قەڵادزێ نیشتەجێن.
- ژنی سێیەمی بە ناوی (زەکییە حەسەن- دەکاتە نەنکی بوار نوورەدین)، کورێك بە ناوی (نوورەدین) و سێ کچ (نەجیبە، فەخری، سەبری)، ئێستا تەنها فەخری و سەبری لە ژیاندا ماون.
- (زەکییە حەسەن) لە تورکمان یان تورکەکانی کەرکووك بووە، دەیانگوت: خزمەکانی لە ئەستەمبووڵ دەژین... هتد، برایەکەی هەبوو بە ناوی (خاڵە عەبدولرەحمان)، کە لە گەرەکی بولاق دەژیان لای تەکییەکە، هەروەها مێردی خوشکی، پیاوێکی ناسراوی کەرکووك بوو بە ناوی (سدیق بەندە غەفوور).
- بۆ زانیاری زیاتر بوار نورەددین یەکێکە لە کورەزاکانی و نووسەرێکی بەرچاوە لە شاری کەرکوك*.

*** بوار نوورەدین سابیر:-**

- ساڵی ١٩٦٢ لە قەڵادزێ لەدایك بووە، سەرەتای هەشتاکان دەستی بە نووسین کردووە و یەکەم بەرهەمی بە ناوی خوازراوی (کارا)، لە ژمارە سێی گۆڤاری قەندیل (ساڵی ١٩٨٧ لە شاخ) بڵاوبووەتەوە.
- بەرهەمەکانی:-
- هاواری دڵ- ژیان و بەرهەم و گۆرانییەکانی هونەرمەند مەزهەر خالقی: ماوەی ٢٠ ساڵ دەستنووسەکەی هێناوە و بردووە. ساڵی ١٩٨٩ رەزامەندی رەقابەی بەغدای وەرگرتووە، لەبەرئەوەی لەلایەن (خەبیری سیاسیی)ەوە (حذف)ی زۆری تێدا کراوە، چاپی نەکردووە. ساڵی ١٩٩٩ چاپی یەکەم و تا ساڵی ٢٠٠٧، چاپی پێنجەمی بڵاوکراوەتەوە. سەرەتای ٢٠١٦، چاپی شەشەمی بڵاوکراوەتەوە.
- دەنگی مێینە لە گۆرانی فۆلکلۆری کوردیدا، بڵاوکراوەی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد بە هاوکاری رێکخراوی نەرویژی (Norwegian Peopele‹s Aid “NPA”)، چ(شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٤. هەر لەو ساڵەدا وەك یەکێك لە کتێبە خەڵاتکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری دەستنیشان کراوە.
- بیبلیۆگرافیای کتێبی فۆلکلۆری کوردی ١٨٦٠- ٢٠٠٤، پێشەکی و پێداچوونەوە: د.عیزەددین مستەفا رەسووڵ، بڵاوکراوەی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، چ(شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- رەدووکەوتن لە کەلتووری کوردیدا، بڵاوکراوەی ئنستێتیوتی کەلەپووری کوردبە هاوکاری رێکخراوی نەرویژی (NPA)، چ(شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٥. چاپی دووەم، چ(ئاراس)، هەولێر، ٢٠٠٧.
- میر عەبدالخانی بدلیس- بلیمەتێکی فەرامۆشکراو لە مێژووی کورددا... بڵاوکراوەی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)، چ(حەمدی)، سلێمانی، ٢٠٠٧، چاپی دووەم، چ(شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- ئەستێرەی سوور (تۆمارێك لە خەباتی نهێنی رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان لە ناوچەی پشدەر ١٩٧٨- ١٩٩١/ گرێدانەوەی بەشێك لە رێکخستنەکانی "ی.ن.ك" دوای ئەنفال ١٩٨٨-١٩٩١)، پێشەکی: فەرید ئەسەسەرد، بەرگی یەکەم و دووەم، بڵاوکراوەی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)، چ(حەمدی)، سلێمانی، ٢٠٠٩، چاپی دووەم (بە یەك بەرگ چاپکراوە)، چ(کارۆ)، سلێمانی، ٢٠١١.
- إمارة بدليس والأمير عبدال خان البدليسي في كتاب اوليا جلبي السياحتنامة- دراسة تحليلية، تأليف: بوار نورالدين، ترجمه الى العربية: علي شمدين، من منشورات دار سردم للطباعة والنشر، م(سردم)، ٢٠١١. چاپی دووەم، بڵاوکراوەی دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان، چ(کەمال)، سلێمانی، ٢٠١٢.
- بیبلیۆگرافیای ناسێنراو و پۆلێنکراوی کتێبی تایبەت بە کورد و کوردستان، بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ(سەردەم)، سلێمانی، ٢٠١٢.
- تەها کەریمی- ئەفسانەی سپیدارێك، بڵاوکراوەی بەرێوەبەرایەتیی هونەری سینەمای سلێمانی، چ(کەکۆن)، سلێمانی، ٢٠١٣.
- شێرکۆ بێکەس- بیبلیۆگرافیا و پێرستی لە کتێبی کوردیدا ١٩٥٦- ٢٠١٠، چاپی یەکەم ٢٠١٣ و چاپی دووەم ٢٠١٤، بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ(سەردەم)، سلێمانی.
- خەباتی براکان- کورتەیەك لە ژیانی شەهید (عوسمان

قەلادزێ)یی و بنەماڵەكەیان، بڵاوكراوەی ئەنجومەنی باڵای كۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەكانی كوردستان، چ(شڤان)، سلێمانی، ٢٠١٣.
- بنكەی گەلاوێژ- مێژوو و بیبلیۆگرافیای چالاكی و بەرهەم، بڵاوكراوەی حەڤدەهەمین فێستیڤاڵی گەلاوێژ، چ(دلێر)، سلێمانی، ٢٠١٣.
- عەلائەددین سەجادی- بیبلیۆگرافیا و پێرستی لە كتێبی كوردیدا ١٩٢٩- ٢٠١٢، بڵاوكراوەی یەكێتیی نووسەرانی كورد- لقی سلێمانی، چ(دیلان)، سلێمانی، ٢٠١٣.
- بیبلیۆگرافیای كتێبی كوردی- بەرگی یەكەم: مێژوو و جوگرافیا، بڵاوكراوەی ئەكادیمیای كوردی، چاپی یەكەم، چ(حاجی هاشم)، هەولێر، ٢٠١٤.
- مام جەلال تاڵەبانی- بیبلیۆگرافیا و پێرستی لە كتێبی كوردیدا ١٩٦٤- ٢٠١٠، بڵاوكراوەی رۆژنامەی كوردستانی نوێ، چ(پیرەمێرد)، سلێمانی، ٢٠١٤.
- رەدووكەوتن لە توێژینەوەیەكی ئەكادیمیدا- هەڵەی لۆژیكی، زانستی، شاردنەوەی سەرچاوە و پلەیجرزم لە توێژینەوەیەكی (م.عیزەت فەتاح حەمەسالح)دا- خوێندنەوەیەكی رەخنەگرانە، بڵاوكراوەی یەكێتیی ژنانی كوردستان، چ(كارۆ)، سلێمانی، ٢٠١٦.
- ئیبراهیم ئەحمەد- بیبلیۆگرافیا و پێرستی لە كتێبی كوردیدا ١٩٥٩- ٢٠١٠، بڵاوكراوەی ناوەندی چاپەمەنی و راگەیاندنی خاك، چ(جەنگەڵ)، تاران، ٢٠١٦.
- هاواری دڵ- ژیان و بەرهەم و گۆرانییەكانی هونەرمەند مەزهەر خالقی، چاپی شەشەم، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی یەكەم: مێژوو و جوگرافیا- كتێبی ساڵانی ١٩٢٥- ٢٠١٠، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی دووەم: مێژووی هاوچەرخ- بەشی یەكەم (كتێبی ساڵانی ١٩٢٨- ١٩٩٩)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی دووەم: مێژووی هاوچەرخ- بەشی دووەم (كتێبی ساڵانی ٢٠٠٠- ٢٠٠٤)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی دووەم: مێژووی هاوچەرخ- بەشی سێیەم (كتێبی ساڵانی ٢٠٠٥- ٢٠٠٧)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی دووەم: مێژووی هاوچەرخ- بەشی چوارەم (كتێبی ساڵانی ٢٠٠٨- ٢٠١٠)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی سێیەم: ئەدەب- بەشی یەكەم (كتێبی ساڵانی ١٩٣٥- ٢٠٠٤)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی سێیەم: ئەدەب- بەشی دووەم (كتێبی ساڵانی ٢٠٠٥- ٢٠١٠)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی چوارەم: زانستە مرۆڤایەتییەكان (كتێبی ساڵانی ١٨٦٠- ٢٠١٠)، پاشكۆی زانیارییە گشتییەكان (كتێبی ساڵانی ١٩٣٥- ٢٠٠٩)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی پێنجەم: راگەیاندن (كتێبی ساڵانی ١٩٧٠- ٢٠١٠)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی شەشەم: ئایینەكان (كتێبی ساڵانی ١٩٢٥- ٢٠١٠)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی حەوتەم: زمان (كتێبی ساڵانی ١٩٢٠- ٢٠١٠)، تاران، ٢٠١٦.
- كورد و كوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێرستیان لە كتێبی كوردیدا- بەرگی هەشتەم: هونەر (كتێبی ساڵانی ١٩٣٤- ٢٠١٠)، تاران، ٢٠١٦.

*** (سابیر رەئوف دەمیرچی):-**

- ساڵی (١٩٤١) لە گەرەكی پیریادی لەدایكبووە.
- خوێندن و نووسین فێربووە بێ ئەوەی بچێتە قوتابخانە.
- زمانی كوردی وعەرەبی وتوركمانی زانیووە.
- چاپكراوەكانی:
- (محزون كوكلم)، شیعر بە زمانی توركی، چاپخانەی (تجارية) كەركوك، ١٩٧١.
- (ظفر شارقیسی)، شیعر بە زمانی توركی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٥.
- (كیجە كلدی)، دیوانێكی شیعری بە زمانی توركی، بەغدا، ١٩٨٦.
- (عاشقلار سەسی)، شیعری بە زمانی توركی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (قوش سەسلری)، شیعری بە زمانی توركی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٩٠.
- (خوریاتلاریم)، شیعر بە زمانی توركی، چاپخانەی (دار

الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٩٣.
- (عراق تورکمانلرینین خلق ماصاللریندان ئەورنکلر)، چیرۆك بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٩٩.
- (دەدە قنبر داستانی)، شیعر، بە زمانی تورکی، کەرکوك، ٢٠٠١.
- (Zaman Acisi) شیعر بە زمانی تورکی، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (Olumsuz Turkmen)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الثقافة)، هەولێر، ٢٠٠٣.
- BEN BUYUM، 2004
- اصلان بابا داستانی، شیعر، 2005
- Goz Bebegim fuzuli، 2006
- Yesil zumrut cagri، 2007
- Canim kerkuk، 2007
- Azerbycan destani، شیعر 2008
- کویلو بابا دستنان، ٢٠٠٩
- جانِ بولات دستانی، ٢٠١٠
- سالی ٢٠١٢ کۆچی دوایی کردووە.

* (سابیر شاکیر مەلول):-

- سالی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- دەرچووی کۆلیژی زانستییە بەشی بایەلۆجی زانکۆی بەغدا.
- بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی:
- (ئەو شەوەی بە تەنها بە جێیان هێشت).
- (کرم زال)، شعر، وەگێڕان.
- (کچێك کە بە خۆی دەوێت بێوەژن)، وەرگێڕان.

* (سابیر سەڵتە زەرد):-

- (سابیری حاجی فەتحوڵڵای دەلۆی)یە کە بە (سەڵتە زەرد) ناوبانگی دەرکردووە.
- سالی (١٩١٦) چاوی بەژیان هەڵهێناوە.
- سابیری مێردمنال لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی رووی کردە کاسبی ودوکانێکی دانا لە چلەکانەوە ئەو دوکانەی کردبووە نیوە کتێبخانەیەك بۆ فرۆشتنی (گەلاوێژ) و (ژین) و (دەنگی گێتی تازە) دوای ئەوانیش (هەتاو) و (هیوا) وەك باوەڕپێکراوێك ناوی (سابیر حاجی فەتحوڵڵا) لە دوابەرگی ئەو هەموو بلاوکراوانەدا تۆمار کراوە، بەهۆی کتێبی کوردییەوە بوو بە دۆست و برادەری ئەدیب و نووسەران و مالەکەشی کردبووە دیوەخانیان تا جارێکیان، قانعی شاعیر لە پەنجاکاندا شەوێك دەبێت بە میوانیان و ئەوشەوە، خوا کورێکیان پێدە بخشێت وناویان لێنا (قانع) ئێستا ئەم قانێعی دووەم نیشتەجێی شاری (کەلار)ە.
- مەلا سابیر لە لاوێتییەوە بیستبووی کە پالەوانی کورد سەلاحەددین ئەیوبی رەنگی دروشمەکەی زەردبووە، ئەم و وەستا (کەریم رەعنا)ی باوکی (ئەورەحمانی جوانەمەرگ) سەڵتەی زەردیان لەبەرکرد، بەلام ناز ناوەکەی هەر بەسەر مەلا سابیردا برا.

- سەڵتە زەرد کۆنترین ئەندامی هیوا بوو لە سالی (١٩٣٩) وە لە خانەقی پەیوەندی بە مەلا سەی حەکیم وعەزیز پیشتیوانەوە هەبووە بەوانەوە گرێ درابوو.
- کە شەڕی جیهانی دووەم هەلگیرسا نرخی شەکرو چا بەرەو گرانی رۆیی بریاریاندا چانەخۆنەوە، لە کفریشەوە مەلا سابیر وفەقێ محەمەدی سەعاتچی ومەلا ئەحمەدی رووتیان لەگەلبوو وەتاکو ئێستاکە لەم داب و نەرێتەیان بەردەوام بوونە.
- هەر کە حیزبی (هیوا) لە ئارادا نەما سەڵتە زەرد یەکەم کەس بوو لەو ناوچەیە کە چووە رێزی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە.
- ئەم زاتە دوا سالەکانی ژیانی لە شاری کەلار بردەسەر نەخۆشی لای لێ بری بوو تاوەکو لە (٣٠)ی تشرینی یەکەمی سالی (١٩٨٦) کۆچی دوایی کرد.

* (سابیر عەبدولقادر کەرکوکی - مەلا سابیر عەبدولقادر کەرکوکی):-

- سالی (١٨٦٩) لە گەرەکی (چقور) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە رەگەزا کوردی لوڕن، خزمیان زۆرە لە دێی بنگردی لای

چەمچەماڵ.
- مەقام زانێکی کەرکوك بووە، خوێندنی ئایینی لەلای (مەلا رەزای واعین)و (مەلا ناسیح محەمەد مودەریس) خوێندووە.
- شارەزای خوێندنی مەقام بووە لەلای (مەلا محەمەد خەلیل ئاغا)و (حاجی نوعمان خەلیفە)و (مەلا عوسمانی موسلی).
- لە (٢٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٤١) کۆچی دوایی کردووە.

* (سابیر کەرکوکی - مەلا سابیر کەرکوکی):-

- نووسەر ناوی (مەلا سابیر کوری مەلا محەمەد کوری ئیسماعیل کوری ئیبراهیم کوری عاشور کوری ئیبراهیم کوری محەمەد کوری یوسف کەرکوکی)یە.
- ساڵی (١٨٩٣) لە یەکێك لە گەرەکەکانی قەڵا لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٩)دا لە سەردەمی حوکمی (عەبدولکەریم قاسم) دا چەند جارێك گیراوە.
- ماوەیەك ئیمامو خەتیب بووە لە گەلێك لە مزگەوتەکانی کەرکوك، وەکو مزگەوتی (موسەللا)و (قیردار).
- کتێبخانەیەکی گەورەی هەبووە نزیکەی (٣٥٠٠) کتێبی چاپکراوو (٤٠٠) دەستنووسی ئایینیو ئەدەبیو مێژوویی جۆراوجۆری تێدا هەبووە بە زمانەکانی تورکیو عەرەبیو فارسی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (دروویشلك)، بە زمانی تورکی، بغدا، ١٩٥١.
- (کرکوك منتخب خوریراتلری)، لە سێ بەرگدا، ساڵانی ١٩٥١، ١٩٥٣، ١٩٥٤.
- (گلشن العلماء)، کتێبی ئایینی، بەغدا، ١٩٥١.
- (مشاعرة)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (معارف)، بەغدا، ١٩٥٣.
- (شهرستانی کیمدر)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (معارف)، بەغدا، ١٩٦٢.
- (کرکوك شعراسی)، ناساندنێك بە شاعیرەکانی کەرکوك بە زمانی تورکی، چاپخانەی (زمان)، بەغدا، ١٩٦٥.
- بەرهەمە دەستنووسەکانی:
- (کرکوك خوریاتلری)، پێنج بەرگ بە تورکی.
- (المقارنة بين الاديان السماوية)، بە عەرەبی.
- (موعظة حسنة)، بە تورکی.
- (تحليل القران)، دوو بەرگ بە عەرەبی.
- (لالەزار کربلاء)، چوار بەرگ بە تورکی.
- (اون ایکی امام مناقبی)، چوار بەرگ بە تورکی.
- (مسائل الفتاوی في المذاهب)، بە عەرەبی.
- (کرکوکده قادری شیخلری نن مناقبی)، دوو بەرگ بە تورکی.
- (شبقە وصاريق)، بە تورکی.
- (إسلامیتده نوروز جائزمی)، بە تورکی.
- (التوسل)، بە عەرەبی.
- یەکێکە لەو کەسانەی لە بواری کۆکردنەوەی دەستنووسو پاشماوەکاندا دەستێکی باڵای هەبووە.
- لە (٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦١) کۆچی دوایی کردووە.

* (سابری کاکەیی - سەید سابوور):-

- شاعیرو زانای ئایینی بووەو ناوی (سەید سابیر سەید حەممود) بووە.
- ساڵی (١٩٠٧) لە دێی (عەلی سەرای) سەر بە داقوق لە کەرکوك لەدایکبووە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٩٠٩) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە، پاشان چووەتە کەرکوكو لەلای زانایانی ئایینیدا خەریکی فێربوونی رێزمانی عەرەبیو قورئان بووەو ماوەیەکیش لەلای زانا (مەلا عەباس حیلمی) شەریعەتی ئیسلامی خوێندووەو کە لەلای خەڵکی بە (سەید سابوور) بە ناوبانگ بووە، لە پاشا خەریك کارو مزیاری بووە، تا کۆتایی ژیانی بە وانە ووتنەوەو رێنوێنی خەڵك بردووەتە سەر.
- هۆنینەوەی هۆنراوەدا دەستێکی بەرزو باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ ناسكو پاراوو شیرینن.
- ساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

* (سابیر کوردستانی):-

- ناوی تەواوی (سابیر محەمەد ئەحمەد)ە لە ساڵی (١٩٥٥) دا لە ناوچەی کەرکوك هاتووەتە دنیاوە.
- خاوەن دەنگێکی زوڵاڵەو چەندین گۆرانی تۆمار کردووە.

* سادق سایەخان مەحموود زەنگەنە:-

- ساڵی ١٩٤٧ لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٦٩ کۆلیژی سەربازی بەغدای لە خولی ٤٩ تەواو کردووە بە ناونیشانی (تموين ونقل).
- ماوەیەك (آمر تموين ونقل فق١٤)بووە.
- ساڵی ١٩٩١ خانەنشین کراوە.

*** ( ساڵەح هەلاج ):-**

**- یەکێکە لە نووسەرو ئەدیبەکانی کەلارو ماوەیەکی چاکە لە بواری ڕۆژنامەگەری کار دەکات.**
**- کتێبە چاپکراوەکانی:**
**- (گوڵبژێرێك لە شیعرو شاعیرانی گەرمیان)، کەرکوك، (٢٠٠٨).**
**- (لێك دابران)، شیعر، (٢٠٠٨).**
**- (پەیکی خەمەکانی ئێوەم)، کۆمەڵە شیعری ژنە شاعیری گەرمیانی ئەمام عەبدوڵڵا، ٢٠٠٩.**
**- (عەبدال داودەو بەرهەمەکانی)، هاوبەش، هەولێر، ٢٠٠٩.**
**- (مێژووی شیعرو شاعیرانی گەرمیان)، چاپی دووەم، ٢٠١٣.**

*** ( سالار ئیسماعیل سەمین ):-**

**- ساڵی (١٩٤٥) لە شاری کفری لەدایکبووە.**
**- ساڵی (١٩٦٩) پەیمانگای وەرزشی بەغدای تەواو کردووە.**
**- ساڵی (١٩٧١) دامەزراوە بە مامۆستای وەرزش لە قەزای خورماتوو.**
**- یەکێکە لە چیرۆك نووسەکانی کەرکوك، هەر لە هەشتاکانی سەدەی رابردووەوە دەستی چیرۆك نووسینی هەبووە لەژێر ناوی (غۆلام گەرمیانی) بابەتی بڵاوکردووەتەوە.**
**- بەرهەمە چاپکراوەکانی:**
**- (ڕەش پێستێك)، چیرۆك، بەغدا، ٢٠٠٠.**

**- (سمی دەسەلات)، چیرۆك، سلێمانی، ٢٠٠٤.**
**- (زاڵگەی پردەکە).**
**- (المتاهة).**
**- (ئەشکەوتی خوێن)، ڕۆمان.**

*** ( سالار ڕەشید ):-**

**- سالار ڕەشید یان ساڵح عەزیز ڕەشید (هەر لە منداڵییەوە دوو ناوی هەبووە).**
**- ساڵی (١٩٦٠) لە شاری کەرکووك لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.**
**- خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی نالی، ناوەندی لە قوتابخانەی کاوەو دواناوەندیی لە قوتابخانەی ئیمام قاسم و ئامادەیی لە عەبدولمەلیك تەواو کردووە.**
**- ساڵی (١٩٧٩ - ١٩٨٠) لە زانکۆی سلێمانی، کۆلێژی زانستەکان - بەشی فیزیا وەردەگیرێ و لە قۆناغی سێهەمیدا بەهۆی وەستانەوە لە بەرامبەر بەجەیشی شەعبیکردنی خوێندکاران، لە زانکۆ فەسڵ ئەکرێت.**
**- ساڵی (١٩٧٦) لە ڕێگەی ئەسعەد عەزیز سۆفی شەریف (شێخ دارا)ەوە کە ئەو دەمە لە ئامادەیی ئیمام قاسم لە پۆلی چوارەمی دواناوەندی هاوپۆلی یەك بوون، بە ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەی مارکسی - لینینیی کوردستان (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)ەوە پەیوەست دەبێت و پاشان لە بەرواری ٢٠/ ٧/ ١٩٧٧ دەبێتە ئەندامی کۆمەڵە.**
**- کاتێك کە کۆمیتەی ئاگر" لە مانگی ١٠ی ساڵی (١٩٨١) کەوتە بەر هێرشی گرتن و ڕاوەدوونان، سالار بەرپرسی خەتێکی ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و خەتێکی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بوو، پەیوەندی هەر بە هاوڕێ (ئەسعەد)ەوە هەبوو. ئەگەرچی کلێشەی ڕێکخستن و ناوی نهێنیی سالار (ئەسرەوت)و ئەوەی، کە پەیوەندی بە**

ئەسعەدەوە هەیەو تۆری پەیوەندییەکانی گشت ئاشکرا بیوون و لەبەردەستی دائیرەی ئەمندا بوون و ئەوەی مابووەوە و مەعلووم نەبوو، تەنها تەواوەتی ئەو بوو، بەلام بەهۆی خۆراگریی هاوڕێ ئەسعەدەوە، کە سەرباری ئەشکەنجەیەکی ئێجگار زۆر ناوی تەواوەتی ئەوی نەدرکاندو لەو شالاوی گرتنە ڕزگاری بوو.

– سالار دوای ماوەیەك لە خۆشاردنەوەو ئیختیفا، کەوتەوە هەلسووڕان و بیرکردنەوە لە دامەزراندنەوەی کۆمیتەی ئاگرو لێکگرێدانەوەی ئەندام و شانەو هێڵە لێکپچڕاوەکانی ڕێکخستن، کە بە تەواوی لێك هەلوەشابوونەوە. بۆ ئەم مەبەستەش چەندین جار سەردانی زیندانی ئەبو غرێب و مووسلی کردووەو بۆ پەیوەندیکردن بە هاوڕێیانی دەرەوەو ناوەندیی کۆمەلەوە، سەردانی گوندو بنکەو بارەگاکانی کۆمەلەی کردووە.

– پاشان لە کۆبوونەوەیەکدا، لە تەمووزی سالی (١٩٨٢) لە گوندی سوورقاوشان، کە پێکهاتبوو لە: ئازاد هەورامی، ئەحمەد کرێکار، سالار ڕەشید، عەلی بچکۆل، مامۆستا قادر، محەمەد ئەحمەد، کۆمیتەی ئاگر (کۆمیتەی ڕێکخراوی شاری کەرکووك) سەرلەنوێ لە سێ ئەندام پێك ئەهێنرێتەوە، کە ئەمانە بوون: سالار ڕەشید، مامۆستا قادر، محەمەد ئەحمەد، کە هەر یەکێك لەوان بەرپرسی کەرتێك بوو، بەم ناوانەوە: کەرتی شەهید حەسەن، کەرتی شەهید سەلاحی موهەندیس، کەرتی شەهید سیروان.

بەو جۆرە دوای ئەو زەبرە گەورەیە، سالار بە دامەزرێنەرەوەی کۆمیتەی ئاگر دەژمێردرێ.

– لەهەمان کاتدا ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی " یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان"یش بەهۆی ئاشکرابوونییەوە لە بەریەك هەلوەشابووەوە. ئەم لە دامەزراندنەوەی ئەو ئەنجوومەنەشدا وەك بەرپرسی لقی کەرکووك بەشداریی دەکات و بەوپێیە دەبێتە ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانیش.

– سالار ئەندامی کۆنفرانسی دووو سێی کۆمەلەو ئەندامی کۆنفرانسی دوو و سێی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بووە.

– لەو ماوەیەدا یەکێك بووە لە کادرە هەرە ئاکتیڤ و بزێوەکانی شاری کەرکووك و زانکۆی سەلاحەدین، کە زیاتر لە ژمارەی پۆلێکی کۆمەلە، ئەندامی بۆ ڕیزەکانی کۆمەلە ڕێکخستووەو چەند بەرابەریش دۆست و هەواداری لە دەوری ڕێکخستنەکانی یەکێتی ساز داوە.

– لەو سالانەدا مالەکەیان لە گەرەکی یادگار گەورەترین بنکەی سووری کۆمەلە بووە، کە هەفتانەو بەشێوەیەکی دەوری زۆربەی کۆبوونەوەکانی تێدا ئەنجام دراوە. هەرچی بەیاننامە هەیە، بە ڕۆنیۆی سەرەتایی هەر لەوێ چاپ کراوەو پاشان لە نێوشاردا بلاو کراوەنەتەوە. هەرچی چاپەمەنییەکانی شاخیش هەیە، ئەوێ یەکەم مەنزلی بووەو پاشان لەوێوە بەسەر ڕێکخستنەکانی نێو شاری کەرکووکدا دابەش کراون.

– ئەو بەشداری لە خۆپیشاندانەکانی شارەکانی کوردستان لە سالی (١٩٨٢) لە زانکۆی سەلاحەدین و لە شاری هەولێر دەکات و شەوانە لە بەشە ناوخۆییەکانی خوێندکاران لەگەل هاوڕێیانی تریدا، کات و شێن و ئەخشەی ڕۆژی

دوایی خۆپێشاندانیان دیاری دەکردو سەرەنجام دەگیرێت و ماوەیەك لە ئەمنی هەولێر زیندانی دەبێ.

– لە هاوینی سالی (١٩٨٤)و لەدوای بەشداریکردنی لە کۆنفرانسی سێی کۆمەلە، بەهۆی ناکۆکیی فکرییەوە، لەگەل (٤٥) کەس لە هاوڕێکانی واز لە کۆمەلەو یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان دەهێنێ.

– ئەم کۆمەلە ئەندام و کادرە لە ڕێگەی سالارەوە قسەوباسیان لەگەل مەلا بەختیارو ئالای شۆڕشدا هەبووە، بۆ مەبەستی پێکەوە کارکردن چەندین دانیشتنیان سازکردووە، لەوانە، کۆبوونەوەی سووورداش و کۆبوونەوەی مالی شێخ جەناب لە سەرچنار. بەلام لە دواکۆبوونەوەیاندا لە مالی مەلا بەختیار و لە گوندی تەکیەی ناوچەی قەرەداغ (کە جگە لە سالار دوو هاوڕێی تریشی تیایدا بەشدار بوون)، بەهۆی جیاوازی لە تێڕوانین و لێکدانەوەیاندا، لێك دووردەکەونەوەو کۆتایی بە پەیوەندیی نێوانیان دێت.

– لە سالی (١٩٨٤) لە کاتێکدا کە حکوومەتی بەعس دەیەوێت بەزۆرەملێ مەشقی جەیشی شەعبی بەسەر خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدیندا بسەپێنێ، لەگەل کۆمەلێك لە هاوڕێکانی کۆمیتەیەك بەنێوی "لیژنەی ناوخۆی خوێندکاران"ەوە پێك دەهێنن و گەورەترین مانگرتن لە مێژووی بزووتنەوەی خوێندکاری لە کوردستان سازو ڕابەری دەکەن و لە دژی ئەو داوایەی ڕژێم دەوەستنەوە.

– ئەوەی شایانی باسە، سالار یەکێك بووە لە ئەندامە زۆر ئاکتیڤەکانی ئەم لیژنەیەو زۆربەی ئەو بەیاننامانەی کە ئەم لیژنەیە بلاوی کردوونەتەوە، لە نووسینی ئەو بوونە.

– سالی (١٩٨٧) لەگەل چەند هاوڕێیەکیدا ڕێکخراوی کۆمەلەی تیکۆشەرانی کۆمۆنیست - کۆتك دادەمەزرێنن، لە هەمان سالدا لەگەل چەند هاوڕێیەکیدا ئەلقەی ئۆکتۆبەر

دادەمەزرێنن.

- لە ڕاپەرینی ساڵی (١٩٩١)ی شارەکانی کوردستان هەڵسووڕاوێکی شووراکان لە شاری کەرکووك بووە.
- لە پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق لە ساڵی (١٩٩٣) بەشداری دەکات ولە مانگی مارتی ساڵی (٢٠٠٥) بەهۆی ناکۆکیی فکرییەوە واز لەو حیزبە دەهێنێ.
- ماوەی (١٧) ساڵە لە وڵاتی سویسرا دەژی و خاوەنی ڕەگەزنامەی سویسرییە.

بەشێك لە نووسراوەکانی:

* ڕابەر دەستنووسێکی ٩٠ لاپەڕەیی ناوخۆیی بۆ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە شاری کەرکووك، دەربارەی شێوازی کارکردن لە نێو جەماوەرو چۆنییەتی خۆپاراستن و بەرخورد لە کاتی گرتن و زینداندا.
* مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستان و ناکۆکییەکان و کەرتبوونی، لێکۆڵینەوە، دەستنووسێکی ٤٠ لاپەڕەیی، لە نێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە شاری کەرکووك بڵاوکراوەتەوە.
* دەوڵەت، لینین وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، ساڵی (١٩٨٢)، دەستنووسێکی ٤٠ لاپەڕەیی، لە نێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە شاری کەرکووك بڵاو کراوەتەوە.
* باوەگوڕ گوڕ، گۆڤار ٣ ژمارە، بڵاوکراوەی لقی کەرکووکی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان. ئەم گۆڤارە لەلایەن ڕاگەیاندنی مەڵبەندی ٤ی یەکێتی لە بالیسان چاپ دەکرا.
* مێژووی بزووتنەوەی خوێندکاریی لە کوردستان، لێکۆڵینەوە، چاپخانەی ئیبراهیم عەزۆ، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.
* شۆڕشی سۆسیالیستی و ماف میللەتان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا، لینین وەگێڕانی لە عەرەبییەوە، ساڵی ٢٠٠٤.
* بنەمای ڕێکخراوەیی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری، مەنسوور حیکمەت، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٤.
* تەرحی سازماندەیی ڕابەریی حیزب مەنسوور حیکمەت، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٤.
* دەستووری هەڵبژاردنی نوێنەران بۆ کۆنگرەی دووەمی حیزب، مەنسوور حیکمەت، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٤.
* پێشنووسی پەیڕەوی ناوخۆی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی ئێران، ئیرەجی ئازەرین، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٤.
* دەربارەی: بەڵگەنامەی خیلافاتە سیاسییەکان، حەمیدی تەقوایی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە،٢٠٠٤.
* بانگەوازی بەستنی کۆنگرەی پێنج، حەمیدی تەقوایی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٤.
* داوەتکردنی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٤.
* بڕیاری کۆنگرەی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق لە پەیوەند بە یەکێتیی هاوسەنگەری لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی ئێران، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ٢٠٠٤.
* سەرنگوونیی کۆماری ئیسلامی و ڕۆڵی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی ئێران، کۆڕشی مودەڕیسی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٤.
* تێزەکان دەربارەی فۆیەرباخ، کارڵ مارکس، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە، ٢٠٠٤.
* نامەیەکی لینین ڕۆژێك بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر، لینین، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٥.
* سێ سەرچاوەو سێ بەشی مارکسیزم، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە، ٢٠٠٥.
* لۆدڤیگ فۆیەرباخ و فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی، فریدریك ئەنگلس، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی. ن.ك). ساڵی (٢٠٠٥).
* ئەرکەکانی بزووتنەوەی ژنانی کرێکار لە کۆماری سۆڤێتیدا، لینین، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە، ٢٠٠٥
* دەربارەی مانگرتن، لینین، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە، ٢٠٠٥.
* دەوڵەت و شۆڕش، لینین، وەرگێڕانی بەشی یەکەمی لە عەرەبی و فارسییەوە، ٢٠٠٦
* حیزب و دەسەڵاتی سیاسی، مەنسوور حیکمەت، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٦.
* بزووتنەوەی سەلبی و ئیسپاتی، مەنسوور حیکمەت، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٦.
* مەنسوور حیکمەت کێ بوو؟ نووسینی: حەمیدی تەقوایی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ٢٠٠٧.
* هەڵبژاردەیەك لە نووسراوەکانی مەنسوور حیکمەت، دوو بەرگ (بە قەوارەی ١١٩١ لاپەرە)، ئامادەکردن و پیاچوونەوەی: سالار ڕەشید، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٨.
* چەندین وتارو چاوپێکەوتنی جۆراوجۆری دیکەی لە سایت و ڕۆژنامە کوردییەکان بڵاو کردووەتەوە.
* بەرپرسی بەشی کوردیی ماڵپەڕی ئەرشیفی مارکسیستەکان لە ئینتەرنێت (http//www. Marxısts. Org/ kurdı)ە.

ئەم ماڵپەرە بە ٥٦ زمان ئاساری مارکسی بڵاو دەکاتەوە. ئەوەی شایانی باسە. بەشی کوردیی ئەم ماڵپەرە لە ساڵی (٢٠٠٥) هەر لەلایەن خودی سالار ڕەشیدەوە دامەزراوەو کەریم مەلا ڕەشید کارە هونەرییەکانی دەباتە ڕێوە.

* (ساڵح بارام چاوش):-

- برای خدر بارام چاوش بووە.
- ئەم زاتە لە ئامێری باڵەبان و زوڕناژەنیندا هونەرمەندێکی بێ هاوتا بووە.

* (سالح ئەحمەد عەزیز):-

- ناسراو بەمام سالح سەید مورادی.
- لەدایکبووی سالی (١٩٥١)ی گوندی کوردەمیریی حاجی حوسێنی ناحیەی پێباز. سالی (١٩٦٢) مالیان گواستۆتەوە بۆ کولەجۆی زەنگابادو دوای ماوەیەك بنەمالەکەی گوندی سەید مورادی لە ناوچەی قەرەتەپە ئاوەدان کردووەتەوەو تێیدا نیشتەجێ بووە و کشتوکالی تێدا کردووە.
- سالانی شەستەکاندا پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردو لە گەرمیاندا وەك کەسایەتییەکی بڕواپێکراو تەماشا دەکرا.
- سالی (١٩٧٥) هەرەسهێنانی شۆڕشی زۆر پێ ناخۆش بوو. دوو سال پاش ئەم ڕووداوە، پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد. لەو قۆناغەدا ئەرکێکی زۆر سەختی گرتە ئەستۆ. ئەویش کڕینی چەكو تەقەمەنی بوو بۆ هێزی پێشمەرگە لە گوندە عەرەب نیشینەکانی دەوروبەری قەرەتەپە. لەڕاستیشدا لەم ڕووەوە زۆر سەرکەوتوو بوو. بەلام جموجولو هەلسووڕانی لەم بوارەدا سەرەنجی دەزگا ئەمنییەکانی ڕاکێشا.
- سالی (١٩٧٩)دا دەستگیرکراو لە بارەگای بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی کفری ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر درا، بەلام هەر ئەو سالە بەر لێبوردنی گشتیی کەوتو ئازاد کرا. بەردانی، ڕێگر نەبوو لەبەردەم ئەوەی کە دەزگا ئەمنییەکان بەردەوام بن لەسەر تەنگ پێ هەلچنینی. هەر ئەو سالە پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردو لە کەرتی ٥ی دووزخورماتووی هەرێمی ٢ی کەرکوك ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد. لەم ماوەیەدا ڕۆلێکی کارای لە چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەدا گێرا.
- سالی (١٩٨٣) کرایە فەرماندەی کەرتی ٥ی حەمرینی تیپی ٥١ی گەرمیان. لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی سالی (١٩٨٤)دا لەڕەوتی بەرپەرچدانەوەی هێرشێکی بەربلاوی سوپای عێراق بۆ سەر شارۆچکەی کۆکس، شەهید کرا. دوای شەڕەکە، تەرمەکەی برایە گوندی سپیسەرو لەوێ بەخاك سپێردرا.

* (سالح پاشا نەفتچی):-

- یەکێکە لە خێزانەکانی نەوتچییەکان لە کەرکوك.
- لە سەردەمی حەمیدیدا بووەتە موتەسەڕفی لیوای (حیللە) لە سەردەمی والی مستەفا عاسم پاشا.
- سالی (١٨٩٣-١٨٩٤) بووەتە موتەسرفی سلێمانی.
- سالی (١٩٠٨) هەلبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك لە (مجلس المبعوثین).
- سالی (١٩٢٤) هەلبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك لە (مجلس تأسیس العراق).
- سالی (١٩٢٧) کۆچی دوایی کردووە.

* (سالح جەریسی - مەلا سالح جەریسی):-

- ناوی (مەلا سالح کوڕی مەلا محەمەد کوڕی مەلا ئەحمەد جەریسی)یە.
- لە سالی (١٩٤٣) لە گوندی (یارمجە) لە ناحیەی (لەیلان) لەدایکبووە.
- لە سالی (١٩٧٥) کۆلێژی شەریعەی لە بەغدا تەواو کردووە.
- لەلای هەر یەکە لە (مەلا مەجیدی قوتب)و (مەلا عەبدولعەزیز شیلەخانی)و (مەلا عەبدولمەجیدی مودەرس) خوێندنی نەحوو سەرفو فیقەو تەفسیری تەواو کردووە.
- لە سالی (١٩٦٧) بووەتە ئیمامو خەتیب لە مزگەوتی (عەبدولرەزاق ئەلتوحەق).
- لە سالی (١٩٨٠) ماستەری لە زانکۆی ئەزهەر بەدەستهێناوە بە ناونیشانی (سیدنا داود بین القران والتوراة والانجیل).
- لە سالی (١٩٨٤) کۆچی دوایی کردووە.

* (سالحی دەرماناوی گەورە - مەلا سالحی دەرماناوی گەورە):-

- ناوی (مەلا محەمەد سالحی کوڕی فەقێ ئەمینی کوڕی حاجی محەمەد)ەو لە عەشیرەتی (لەك)ەو لەدێی دەرماناوی گەورەی سەر بە پردێ لە سالی (١٨٨٧)ی زایینیی هاتووەتە دنیاوە.
- ئیجازەی مەلایەتی لە کەرکوك وەرگرتووە لەلای مەلا (عومەر گومبەتی) لە سالی (١٩٣٩).
- لە دواییدا گەڕاوەتەوە دێیەکەی خۆیو مەلایەتی کردووە.

* (سالح مەلا ڕەحمەتوللا - مەلا سالح مەلا ڕەحمەتوللا):-

- ناوی (مەلا سالح کوڕی مەلا ڕەحمەتوللا کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا مستەفا)یە.
- یەکێکە لە مەلا بەناوبانگەکانی کەرکوك کە لەگەلێك لە

دەستنووسەکانی (دار المخطوطات)دا لە بەغدا ئامازەی پێکراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* (ساڵحی رەزا فەتاحی دەلۆ):-

- ساڵی (١٩٠٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.

* (ساڵح رەفعەت کەرکوکی):-

- یەکێکە لەو شاعیرانەی کە بەشێکی زۆری شیعرەکانی لە رۆژنامەی (حوادث) لەنێوان ساڵانی (١٩١١-١٩١٨) بڵاوبووەتەوە.

* (ساڵح رۆستەم ئەفەندی):-

- ناوی (ساڵح ئەفەندی کوڕی رۆستەم ئاغای عەشیرەتی ساڵەیی)یە.
- یەکێکە لە نووسەرەکانی کەرکوك.
- ساڵی (١٨٢٥) کۆچی دوایی کردووە.

* ساڵح عەسکەری:-

- ناوی (ساڵح کوڕی کاکە رەزا عەلی عەسکەری)یە.
- ساڵی (١٩٤١) لە گوندی (عەسکەر)ی لای ئاغجەلەر لە دایك بووە.
- بە رەچەڵەك دەچنەوە سەرسەیدەکانی بەرزنجەو لە بنەماڵەیەکی نەقشبەندی و لە شێخانی بزووتنەوەی هەقەیە.
- قۆناغی سەرەتایی لە گوندی عەسکەر بوو، ناوەندیو دواناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە، هەرچەندە لە زانکۆ وەرگیرابوو، بەڵام بەهۆی قورسی ژیانەوە خوێندنی کۆلیژی بۆ نەکرا.
- ساڵی (١٩٥٤) پێش ئاهەنگی (لاوانی دیموکراتی کوردستان) خۆییو عەلی عەسکەری دەگیرێن لە گەرەکی چوار باغی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٥٩) دوای دەرچوونی لە خولی پەروەردە لە ناوچەی (مانگێشی)ی سەر بە لیوای موسل بە مامۆستا دامەزرا، هەر لەو ساڵەدا هاوسەرێتی لەگەڵ گەلاوێژ خان پێکەوەنا.
- ساڵی (١٩٦٠) بوو بە مامۆستا لە قوتابخانەی سەرەتایی چەمچەماڵ.
- شەوی یازدەی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١) لەتەك ژمارەیەك رووناکبیرو تێکۆشەرانی چەمچەماڵ دەستگیرکراو رەوانەی بەندیخانەی کەرکوك کرا بە تۆمەتی پشتگیری لە شۆڕشی کورد.
- ساڵی (١٩٦٢) لە قوتابخانەی چەمچەماڵەوە گوازرایەوە بۆ قوتابخانەی گوندی (گورگەچاڵ)ی نزیك کەرکوك.
- لە شوباتی شوومی ساڵی (١٩٦٣)، زۆر چالاکانە کەوتە ناو جووتیارانی ناوچەکانی شوانو ساڵەیی نزیکەی چل چەکداری کۆکردەوە بۆ بەرەنگار بوونەوەی کودەتاچییەکان.
- ماوەیەك لە قادر کەرەمو بناری گڵو خۆرنەوەزانو کلکە سماق چالاکی سیاسی هەبووە.
- لە جیابوونەوەی سەرکردایەتیی ناوەند (القیادە المرکزیە) لە لیژنەی ناوەند (اللجنە المرکزیە) چووە پاڵ سەرکردایەتیی ناوەندو بوو بەئەندامی سەرکردایەتیو ولە سلێمانی سەرپەرشتی رێکخراوەکانی دەکرد.
- لە ساڵی (١٩٦٧) چووە بەغدا بۆ ئەوەی راستەوخۆ سەرپەرشتی کارەکانی حیزب بکات.
- ماوەیەکی زۆر لە ژێر ئەشکەنجەو ئازار دا لە قەسر ئەلینهایە ماوەتەوەو خۆراگر بووە تا لە ساڵی (١٩٧٠) بەبێ دادوەریو دادگایکردن شەهید کراوە.

* (ساڵح کانی چناری - مەلا ساڵح کانی چناری):-

- ناوی (مەلا ساڵح کوڕی قادر کوڕی حەسەن کانی چناری) یە.
- ساڵی (١٩٢٧) لە دێی تەکیەی عەبدوڵڵای سەر بە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٤٤ دەچێتە سلێمانی لە مزگەوتی شێخ سەلام لەلای مەلا عەبدوڵڵا چروستانی، کە زانستەکانی (فقة ونحو صرف وبلاغة ومنطقي) خوێندووە. لە دواییدا لای دکتۆر مستەفا زەڵمی و مەلا عەبدولڕەحیم بەرزەخی مۆڵەتی زانستی ئایینی وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٦٤) دوور دەخرێتەوە بۆ (سەماوە) لەسەر هەستی نەتەوایەتی و دەبێتە ئیمام خەتیب لە مزگەوتی سەماوە. لە دواییدا دەبێتە ئیمام خەتیب لە پارێزگای بابل.
- ساڵی (١٩٧٦) بووەتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (ئیمام قاسم).

- ساڵی (١٩٨٨) ئەبەزانە دابەزییە سەر تەعریب و ئەنفالکردنی کوردستان و لە ئەنجامدا لەلایەن ئەمنی بەعسەوە تووشی گرتن و ئازاردان بوو تا لە ئەنجامدا چاوێکی لە دەست دا.
- لە ١٤ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠١)دا بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد.

* (ساڵح مەلا محەمەد - مەلا ساڵح مەلا محەمەد):-

- ناوی تەواوی (مەلا ساڵح کوڕی مەلا محەمەد کوڕی فەتاح) ە.
- ساڵی (١٩٣٦) لە دێی تەکیەی جەباری لەدایکبووە.
- یەکێکە لە مەلا بەناوبانگەکانی کەرکوك کە لەگەڵێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات)دا لە بەغدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* (ساڵح محەمەد دیمیرچی):-

- ساڵی (١٩٢٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٠) ماستەری لە زانکۆی (لوواستین) بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٦٣) دکتۆرای لە زانکۆی (لوواستین) بەدەستهێناوە.
- بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی:
- (أساسیات علم التربیة)، نووسین: (هـ. د. فوت)و (ل. م. تورك)، بەغدا، ١٩٧٨.

* (سالم حەبیب محەمەد داغستانی):-

- ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەشی پێگەیاندنی مامۆستایانی تەواو کردووە.
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەشی نیگاری لە سیرامیك تەواو کردووە.

* (سامان ئەبو بەکر سەعید):-

- ساڵی ١٩٦٨ لە کەرکوك لەدایکبووە
- دەرچووی پەیمانگەی هونەری کەرکوك بەشی ئەلیکترۆن لە ساڵی ١٩٩٠
- ساڵی ١٩٨٥ یەکەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی ئامادەیی پیشەسازی تەئمیم کردووەتەوە.
- ساڵی ١٩٨٦ دووەم پێشانگای تایبەتی هۆڵی (قاعە التامیم للفن الحدیث) کردووەتەوە.
- ساڵی ١٩٩٠سێیەم پێشانگای تایبەتی هۆڵی کتێبخانەی پەیمانگەی هونەری کەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی ٢٠٠٦ چوارەم پێشانگای تایبەتی کردووەتەوە.
- پێشانگای تایبەتی لە کەرکوك لە ڕۆژی٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٦ لە هۆڵی هونەرمەندانی کورستان(قشڵە) کردووەتەوە.
- پێشانگای تایبەتی لە سلێمانی لە ڕۆژی٢٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٦ لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی کردووەتەوە.
- ساڵی ٢٠٠٩ پێنجەمین پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی نەورۆز کردووەتەوە.
- شەشەمین پێشانگای تایبەتی لە٢٤ ساڵیادی کارەساتی ئەنفالکردووەتەوە.
- ساڵی ٢٠١٥حەوتەمین پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی کەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی ١٩٩٥ و ١٩٩٧ بەشداری چەند پێشانگایەکی دووەلی لە بەغداد کردووەتەوە.
- بەشداری لە چەندین پێشانگا لە دەرەوەی وڵات (میسر، تونس، ئوردن، ئەڵمانیا، هۆڵەندا) کردووە.
- ساڵی ١٩٨٩ تا ٢٠٠٦ بەشداری لە سەرجەم پێشانگای ساڵانەی هونەرمەندانی کەرکوك کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٥بەشداری لە فیستیڤاڵی شێوەکاری ساڵانەی (ی.هـ.ك) لە کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و دهۆك کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٥ بەشداری فیستیڤاڵی هونەر لەچەمچەماڵ کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٥ بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کورد(ئەنفال خۆری ڕەشپۆش) هۆڵی مۆزەخانەی نیشتمانی (ئەمنەسورەکە) لە سلێمانی کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٣ بەشداری پێشانگای گرووپی کوردستان - کەرکوك لە هۆڵی هونەرمەندانی کوردستان.
- ساڵی ٢٠٠٥ تا ٢٠١١بەشداری گەلەری دهۆك وزاموای

سلێمانی و هەولێر و کۆیەی کردووە.
– دروستکردنی دیزاینی چەندین فۆڵدەر و ئارم و لۆگۆی کۆمەڵە ودەسگا و ڕێکخراوەکانی کردووە.
– ساڵی ٢٠٠٩ بەشداری پێشانگای شێوەکارانی کورد لە عەممان – ئوردن.
– ساڵی ٢٠١٠بەشداری فیستیڤاڵی گەلاوێژ کردووە.
– ساڵی ٢٠١٢ بەشداری پێشانگای هاوبەشی سەنتەری ڕۆشنبیری بەغدای کردووە.
– بەدەسهێنانی زیاتر لە (٣٤ ) بڕوانامەی ڕێزلێنان.

*** ( سامان بەرزنجی ):-**

– ساڵی (١٩٧٧) لە کەرکوك لە ئاڵتون کۆپری لەدایکبووە. لە دوایدا لە هەولێر نیشتەجێ بووە.
– ساڵی (١٩٩٥– ٢٠٠٦) بابەتی خەتی خوێندووە لەلای زیادی ئەندازیار، هەروەها لە بواری خەتی (النسخ)دا دەستێکی باڵای هەبووە.
– بەشداری گەلێك پێشانگای ناوخۆو دەرەوەی کردووە لەوانە:
– پێشبڕکێی خۆشنووسانی هەولێر بە ناوی (محەمەد تاهیری کوردی).
– پێشبڕکێی خاچی سووری نێودەوڵەتی بۆ خۆشنووسی عەرەبی لە هەولێر لە ساڵی ١٩٩٩.
– بەشداری پێشبڕکێی خۆشنووسانی هەولێری کردووە لە ساڵی ٢٠٠٥.
– بەشداری پێشبڕکێی خۆشنووسانی هەولێر بە یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٩– ٢٠١٢).
– بەشداری دیداری دوبەی کردووە بە خۆشنووسی عەرەبی لەنێوان ساڵانی (٢٠١٠– ٢٠١١).

*** ( سامان کەریم ):-**

– ناسراو بە (محەمەد عەبدلرەحمان عومەر)
– ساڵی (١٩٦٣) لە شاری سلێمانی لەدایکبووە. خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیو دواناوەندی هەر لەو شارە تەواو کردووە، پاشان لە زانکۆی مووسڵ کۆلیژی ئەندازیاری وەردەگیرێ، بەڵام بەهۆی کاری سیاسییەوە نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکات.
– ساڵی (١٩٧٩) بەهۆی بەشداریکردنی لە خۆپیشاندانی دژی سیاسەتی تەعریبکردنی خوێندنەوە دەستگیر دەکرێت. لە ساڵی (١٩٨١)ەوە لە نێو کۆڕو کۆمەڵی دیراسیی کۆمۆنیستیی جیاوازدا دەستی بەکارکردن کردووە. یەکێك بووە لە ڕابەرانی مانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی مووسڵ.
– ساڵی (١٩٨٤)و نوێنەری ئەوان بووە بۆ هاوئاهەنگیکردن لەگەڵ نوێنەرانی خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین. یەکێك بووە لە نوێنەرانی ئەوان بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ سەرۆکی زانکۆ، بەڕێوەبەری دەزگای ئەمنو حیزبی بەعسو پارێزگاری مووسڵ. هەروەها نوێنەری ئەوان بووە بۆ دانیشتن لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لە سووڕداش، کە ئەو دەمە لەگەڵ حکوومەتی بەعس لە دانووستاندا بوو. لە پێکەوەنانو دامەزراندنی چەندین ئەڵقەو سازمانی کۆمۆنیستیدا بەشداری کردووەو چەندین جار بەهۆی ئاشکرابوونییەوە تووشی ڕاونانو خۆشاردنەوە هاتووە. هەڵسووڕاوێکی چالاکی بزووتنەوەی شوورایی بووە.
– ساڵی (١٩٩١)و نوێنەری شووڕای نوێنەرانی شاری سلێمانی بووە بۆ کۆمەککردنی شووراکانی شاری کەرکووكو هاوئاهەنگیکردن لەنێوانیاندا.
– یەکێکە لەو (١٠) کادرەی کە حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراقیان پێکهێناو لەو دەمەوە تا ئێستا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییە لەو حیزبەداو بەرپرسیارێتی جۆراوجۆری بینیوە: ئەندامی کۆمیتەی ڕابەریی ڕێکخراوی کوردستان، سکرتێری کۆمیتەی ڕابەریی ڕێکخراوی کوردستان، سەرنووسەری بڵاوکراوەی الی الامام، بەرپرسی ڕێکخستنەکانی دەرەوەی حیزب، سەرۆکی مەکتەبی سیاسی، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی.
– ئێستاش ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبەو چەندین نامیلکەی بە زمانی عەرەبی نووسیوەتەوە، لەوانە: خەبات دژی بێکاری" حیزبی شیوعیی عێراقی: ئایین ئیسلامی سیاسیو نیشتمانپەروەریو " چینی کرێکارو شۆڕشەکانی جیهانی عەرەبی".

*** ( سامی توتنچی ):-**

– ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– بەرهەمەکانی:
– (ایکی کونل)، شیعر بە زمانی تورکی، ئەستەمبوڵ، ١٩٩٧.
– (کونلیمك ازکیلری) شیعری بە زمانی تورکی، کەرکوك، ٢٠٠٠.

- (انغام قلبي)، دیوانی شیعری، ۲۰۰۱.
- ساڵی (۲۰۱۱) کۆچی دوایی کردووە.

* ( سامی جەلالی ):-

- ساڵی (۱۹۳۸) لە گەرەکی بەگلەر لەدایکبووە.
- یەکێکە لەو هونەرمەندانەی کە هەر لە ساڵی (۱۹۵۳)دا لە بواری سروودو گۆرانی تورکمانی بەشداری کردووەو دەوری هەبووە لە خوێندنی مەقامدا.
- ساڵی (۱۹۵۲)دا کۆمەڵێك لە گۆرانیو قۆریاتو بەستەی لە رادیۆی بەغدا تۆمار کردووە بە زمانەکانی عەرەبیو تورکمانی.
- لە (۱۰)ی ئەیلولی ساڵی (۲۰۰۲) کۆچی دوایی کردووە.

* ( سامی سەعدوڵلا عەلی ):-

- ساڵی (۱۹۷۱) لە گوندی (شیرناو) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (۱۹۹۳) پەیمانگای مەلبەندی مامۆستایانی هەولێری تەواو کردووە.
- ساڵی (۱۹۹۵) یەکەم پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی کتێبخانە لە چەمچەماڵ.
- ساڵانی (۱۹۹۶-۲۰۰۲) بەشداری کردووە لە زۆربەی پێشانگای هاوبەش لە فیستیڤاڵی هونەری کەرکوك.
- ساڵی (۱۹۹۷) دووەم پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (۲۰۰۱) سێیەم پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی کتێبخانە لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (۲۰۰۳) چوارەم پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی قشلە لە کەرکوك.
- ساڵی (۲۰۰۵) بەشداری کردووە لە فیستیڤاڵی شێوەکارانی کوردستان.
- ساڵی (۲۰۰۵) بەشداری کردووە لە حەوتەمین پێشانگای کۆمەڵەی شێوەکارانی سەربەست لە سلێمانی.
- ساڵی (۲۰۰۸) بەشداری کردووە لە یەکەمین پێشانگای شێوەکارانی کەرکوك لە قشلە لە کەرکوك.
- ساڵی (۲۰۰۹) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی شێوەکارانی چەمچەماڵو کەرکوك لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (۲۰۱۰) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی هەرێم لە پێنجەمین فیستیڤاڵی نێودەوڵەتی کتێب لە هەولێر.
- ساڵی (۲۰۱۱) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی شێوەکاری یادی هەڵەبجە لە کەرکوك.
- ساڵی (۲۰۱۳) پێنجەم پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە کامپی ئاوارەی باکوور لە مەخمور.
- لە دەیان پێشانگای هاوبەشی دیکەدا بەشداری کردووە.

* ( سامی عەلی دەلۆ ):-

- ناوی (سامی کوری عەلی بەگی وەیسی بەگی دەلۆ)یە.
- ساڵی (۱۹۲٤) لەدایکبووە، لە ئاوایی (عەین فارس)ی سەر بەناوچەی قەرەتەپە.
- لە تیرەی بەگزادەکانی جامریزی دەلۆیە.
- بۆ خوێندن هاتووەتە کفریو خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە گەراوەتەوە ئاواییەکەی خۆیانو دەستی داوەتە کشتوکاڵ کردنو لەشەستەکانەوە هاتووەتە کفری ولەو ساوە لەم شارە دادەنیشێت.
- لە چلەکانەوە ئەم شاعیرەمان شیعری نووسیوەو لە گۆڤاری (گەلاوێژ)و (دەنگی گێتی تازە)دا بلاوی کردووەتەوە.
- شاعیرمان کۆمەڵە شیعرێکی تێهەڵکێشی عەرەبی بە کوردی هەیە پەردەیەکی شانۆگەری لە ژیانەوە هەڵبژاردووەو هێناویتی بە شێوەیەکی کاریکاتۆری دایرشتووە وەك (چیرۆکی ئامەی بەستەزمان) (شارستانو لادێیی).
- ساڵی (۲۰۰٤) دیوانێکی شیعری بلاوکردووەتەوە.

* ( سەباح ئیسماعیل محەمەد ):-

- ساڵی (۱۹٦۱) لە کەرکوك هاتووەتە دونیاوە.
- دەرچووی زانکۆی تەکنەلۆژی-بەشی ئەندازیاریی.
- ئەم کتێبانەی بە چاپ گەیاندوون:
- (ئاوێزە)، بە هاوکاری لەگەڵ حەمە سەعید زەنگەنە، ۲۰۰۲.
- (دیالۆگ)، چاوپێکەوتنی ئەدەبی، ۲۰۰٤.
- (ناعەقڵانییەت لە گوتاری جەبهەی تورکمانیدا)، نووسینی د. جەبار قادر، وەرگێران، ۲۰۰٤.
- (چەمكو ستاتیکای شوێن لە ئەدەبدا)، لێکۆڵینەوە، لە بلاوکراوەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك، چاپی یەکەم، ۲۰۰۵، چاپی دووەم، هەولێر، ۲۰۰۹.
- (هیزە وریا بن)، کۆمەڵە چیرۆك، عەزیز نەسین، وەرگێران، لە چاپکراوەکانی کتێبخانەی سۆران-هەولێر، ۲۰۰٦.
- (ژنێك بۆ شەش پیاو)، کۆمەڵە چیرۆك، عەزیز نەسین، وەرگێران، هەولێر، ۲۰۰٦.
- (وەرزی کۆچ بەرەو باکوور)، رۆمان، ئەلتەیب ساڵح، وەرگێران، هەولێر، ۲۰۰۷.
- (باڵەخانەی یاقوبیان)، رۆمانی عەلا ئەسوانی، وەرگێران، هەولێر، ۲۰۰۹.
- (درێژترین ساڵ، رۆمان زوهدی داودی)، وەرگێران، هەولێر،

(٢٠٠٨).
– (شیکاگۆ)، رۆمان، عەلا ئەسوانی، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٩.
– ماڵە ئەندەلوسییەکە، واسیتی ئەلئەعرەج، وەرگێران.
– زەنگەکانی رۆما، جان دۆست، وەرگێران.
– مرۆڤێك ناوی لە ناوندا نییە، واسیتی ئەلئەعرەج، وەرگێران.
– تاکسی، خالید ئەلخەمسی، وەرگێران.
– عێراقییەکە لە پاریس، سامۆئیل شەمعوون، وەرگێران.
– شەماعییە، عەبدولستار ناسر، وەرگێران.
– کەسێتی تاکی عێراقی، باقر یاسین، وەرگێران.
– موبارەك و سەردەمەکەی، محەمەد حەسەنێن هەیکەل، وەرگێران.
– میرنامە، جان دۆست، وەرگێران.
– عەشقی وەرگێر، وەرگێران.
– جێگری سەرنووسەری رۆژنامەی (سێبەر)ە.

* (سەباح بازرگان):-

– ساڵی (١٩٥١) لە شاری کەرکوك لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
– قوتابخانەی سەرەتایی وناوەندی وئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
– ساڵی (١٩٧٥)دا لە کۆلێژی زانیاری سلێمانی بەکالۆریۆسی لە کیمیادا وەرگرتووە.
– لە هەفتاکانەوە نووسینی بڵاودەکاتەوە.
– بەرهەمەکانی:
– (خەڵاتەکانی نۆبڵ لە کیمیادا نێوان سەد ساڵ ١٩٠٠-٢٠٠٠)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
– (الوان من الأدب، قصص وقصائد كردية وتركمانية)، وەرگێران.

– (دليل كتاب كركوك واصدارتهم المطبوعة)، ٢٠١٠.
– (المرشد إلى صحافة كركوك ١٩١١-٢٠١١):-
– گەڕەکی ئیمام قاسم، ٢٠١٧.

* سەباح بوترس یۆنان:-

– ناوی سەباح بوترس یۆنان دەمانە.
– ساڵی ١٩٤٣ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی ١٩٦٣ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە، لە خولی (٢٠)ی (کارگێری – الاداري).
– ساڵی ٢٠٠١ خانەنشین کراوە.

* سەباح خورشید عەلی سادق:-

– ساڵی ١٩٥٥ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی ١٩٧٧ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٥٥ بەناونیشانی درع.
– هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە زانستی تاقیگەکاندا لە کۆلێژی تەکنیکی بەغدا.
– ساڵی ٢٠٠٨ خانەنشین کراوە.

* سەباح تۆزلوو:-

- ساڵی ١٩٥٥ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- إيمان صفحاتلاری، شیعر، ٢٠١٠
- Kulak Dolduran sozler، 2010
- صهيل الشعر يخترق مرابط القمة، وەرگێران.
- مزدەلیك، شیعر، ٢٠١١
- SILAYADONIS، 2012

* (سەباح قەرەئاڵتون):-

- ساڵی (١٩٥٦) لە گەرەکی بەگلەر لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩١) بەشی کارگێڕیو ئابووری لە زانکۆی موسڵ تەواو کردووە.
- یەکێکە لە شاعیرو شێوەکارەکانی شاری کەرکوك.
- بەرهەمەکانی:
- (بهار کلدی)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٩٠.
- (بیزیم تورکومن)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٩٧.
- (اینانج اوکیلری)، شیعر بە زمانی تورکی، ٢٠٠١.
- قصائد دينية، ٢٠٠٦.
- ساڵی (٢٠٠٥) کۆچی دوایی کرد.

* (سەباح عەبدوڵلا کەرکوکی - دکتۆر سەباح عەبدوڵلا کەرکوکی):-

- ناوی (سەباح عەبدوڵلا جەعفەر ئەلسادق)ە.
- ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.

- سەرەتایی لە قوتابخانەی موسەڵلا تەواو کردووە و ناوەندی لە (المستقبل) تەواو کردووە و ئامادەیی لە موسەڵلا تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٣ بەکالۆریۆسی لە بواری پزیشکیدا بەدەستهێناوە لە زانکۆی بەغدا.
- گەلێك پیشەی پزیشکی کردووە لە پارێزگاکانی عێراق.
- ساڵی ٢٠٠٠ بووەتە جێگری سەرۆکی گشتی یەکێتی نووسەرانی عێراق.
- ساڵی ٢٠٠١ کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری دامەزراندوو بە ناونیشانی (ملتقى الجماهير الإبداعي).
- ساڵی ٢٠٠٤ سەرپەرشتیاری گۆڤاری (الكاتب التركماني) بووە.
- ساڵی ٢٠٠٣ رۆژنامەی هەفتانەی (البشير)ی کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٨ سەرنووسەری گۆڤاری (آفاق صحية) بووە.
- ساڵی ٢٠٠٣ راوێژکاری راگەیاندکاری سەرۆکی بەرەی تورکمانی بووە.
- یەکێکە لە ئەدیبو دکتۆرو رۆژنامەنووسانی تورکمان.
- بەرهەمەکانی:
- (وطن دستانی) شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (ارزی ایلەقمبر)، داستانە شیعری بە زمانی تورکی، کەرکوك، ٢٠٠١.
- ملحمە (ارزی قمبر) دیوان شیعر ٢٠٠٢.
- (نرگیز خانم)، شیعری بە زمانی تورکی، چاپخانەی (عبد الوهاب اوچی)، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- القات جدل فقهي وقانوني بين التحريم والتعاطي، ٢٠٠٥
- Papaganin Hikayasi، ٢٠١٢
- إعلام الصحافة التركمانية في العراق، ٢٠١٣.
- موسوعة الصحافة التركمانية، ٢٠١٦

* (سەباح محەمەد ئەمین):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ئەڤین)، سرروودی گۆرانی منداڵان، سلێمانی، ١٩٨٣.
- (سرروودی شادی)، کۆمەڵە شیعر، دانیمارك، ١٩٨٧.
- (راپەڕینی کوردان ١٩٢٥)، مێژوو، وەرگێڕان، سوید، ١٩٨٨.
- (خونچەکان)، بۆ منداڵان، هاوبەش، لەندەن، ١٩٩١.
- (تاقیکردنەوەی تیۆریی بۆ شۆفێری ئۆتۆمۆبیل رانەندەگی لە بەریتانیا)، وەرگێڕان، هاوبەش، لەندەن، ٢٠٠٠.
- (فیلمی دیزنی کاتێك دوو هونەرمەندی گەورە بە یەکتر

دەگەن)، سلێمانی، ٢٠٠١.
– (تۆ هەڵبەستی تۆ مەبەستی)، شیعر، سلێمانی، ٢٠٠٤.
– (راپۆرتی كارگێری دەڤەری كەركوك ١٩١٩)، وەرگێران. سلێمانی، ٢٠٠٦.

* ( سەباح مەحموود ):–

– ساڵی (١٩٨٠)دا لە ئەڵقەی رۆشنبیرییەكان رێكخراو بووە.
– ساڵی (١٩٨١)دا بەهۆی ئاشكرابوونی كۆمیتەی ئاگری كۆمەڵەی رەنجدەرانەوە ناچار بووە، لەگەل نەجمەدین فەقێ و د. خالید ڕوو لە شاخ بكەن و بچنە بارەگاكانی سەركردایەتی (ی. ن. ك).
– لە پایزی ساڵی (١٩٨٢)دا لە گوندی مەلا سەق لەگەڵ نەجمەدین فەقێ و هۆشیار عەبدولخالقدا بەشداری لە دووهەمین كۆبوونەوەی دامەزراندنی بەرزەدا كردووە (یەكەمین كۆبوونەوە ئەوەیان بوو، كە سەباح حەسەن خورشیدی تێدا بوو، بەڵام كشایەوە).
– لە مانگی هەشتی (١٩٨٤)دا لە هەولێر لەلایەن دەزگا ئەمنییەكانەوە گیراوەو خراوەتە ژێر ئەشكەنجەی زۆر قورسەوەو حوكمی بیست ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێندراوە. پاشان بە لێبووردنی گشتی ئازاد ئەكرێ و ئێستا نیشتەجێی وڵاتی سوێدە.

* ( سەباح موسا – دكتۆر سەباح موسا ):–

– ساڵی (١٩٥٨) لە كەركوك لەدایكبووە.
– خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە كەركوك تەواو كردووە.
– كۆلێژی ئاداب، بەشی زمانی كوردی لە زانكۆی بەغدا تەواو كردووە.
– ساڵی (١٩٨٠) تا (٢٠٠٥) وەكو بێژەر لە تەلەفزیۆنی كەركوك كاری كردووە.
– ساڵی (٢٠٠٢) ماستەری لە زمان و ئەدەبی كوردی وەرگرتووە.
– ساڵی (٢٠٠٨) دكتۆرای لە زمان و ئەدەبی كوردی وەرگرتووە.
– مامۆستایە لە بەشی كوردی كۆلێژی پەروەردەی زانكۆی كەركوك.
– بەرهەمەكانی:
– (رەنگدانەوەی چەند لایەنێكی واتاسازی لە رۆژنامەگەری كوردی عێراقدا).
– (الصحافة الكردية.. بداياتها وآفاقها).
– (رۆژنامەنووسی كوردی).
– (زمانی رۆژنانووسی كوردی لە عێراقدا ١٩١٤–١٩٤٥)، ٢٠١٤.

* ( سەباح هورمز شانی ):–

– ساڵی (١٩٤٨) لە كەركوك لەدایكبووە.
– بەرهەمە چاپكراوەكانی:
– (قراءة اخرى في المسرح السرياني)، ٢٠٠٥.
– (التقليدي واللاتقليدي في المسرح الكردي)، ستۆكهۆڵم، ١٩٩٣.
– (المسرح الكردي في ثلاثة عقود ١٩٧٠ – ٢٠٠٠)، دهۆك، ٢٠٠٣.

* سەبری :–

– ناوی نورەدین عەسكەری زادەیە و نازناوی سەبرییە، لە دەستنووسێكی كۆنی لای شێخ حوسێن بەرزنجی كە مێژووی نووسینەوەی لەسەر نییە دەستمان كەوتووە و شیعری بە فارسی و توركی و كوردی (زاری سۆرانی) هەیە، گومانمان بۆی دەچێت كە لە سەدەی نۆزدەدا ژیابێت.

* ( سەبغەتوڵڵا مەلا عەلی سیامەنسووری ):–

– یەكێكە لە زانا ئایینییەكانی كەركوك و لە گەلێك لە دەستنووسەكانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژە بە ناوی كراوە، بەڵام لێكۆڵینەوەمان دەربارەی ژیانی كەمە.
– ساڵی (١٨٨٧) لەدایكبووە.

* ( سەدرەدین درۆزنە – شێخ سەدرەدین درۆزنە ):–

– یەكێكە لەو بەهرەمەندانە، شاعیرێكی ناوچەی سەنگاوە كە ناوی تەواوی (سەدرەدین عەلی حوسێن)ە، لەبنەماڵەی شێخانی درۆزنەیە
– ساڵی (١٩٠٥) یان (١٩٠٧) لە گوندی درۆزنەی (ئاوەسپی) لەدایكبووە، پیاوێكی رووخۆش و قسەشیرین و نیشتمان پەروەردە دڵتەر بووە، شیعری زۆری هەبووە،بەڵام لەبەر ئەوەی نەخوێندەوار بووە شیعرەكانی نەنووسیوەتەوەو هەر دەماودەم لەلای خەڵكەكە وتراوەتەوە، ئەویش لەبەر خۆشەویستی لای خەڵكی ناوچەكە.
– جێی ئاماژە بۆ كردنە كە لە هەموو یادو كارەساتەكاندا شیعری وتووە، كورێكی لە شەڕی قاتەكەی كفریدا شەهید بووە بە ناوی (حەمید).
– شیعرەكانی لە شێوەی شیعری میللی دایە كە بە رەوالەت سادەو ساكاربووە، ناوەڕۆكی شیعرەكانی زیاتر سیاسی ودڵداری و كۆمەڵایەتین، هەروەها شیعری ئایینی و موناجاتیشی ووتوە.

- ساڵی (١٩٩٥) كۆچی دوایی كردووە.

*** ( سەدرەدین عارف - سەدرەدین مەلا عارف شێخ بزێنی ):-**

- ساڵی ١٩٤٢ لە كەركوك لەدایكبووە.
- ناوی (سەدرەدین عارف عومەرە).
- ساڵی ١٩٦٦ زمانی ئینگلیزی لە كۆلێژی ئاداب لە زانكۆی بەغدا تەواو كردووە.
- ساڵی ١٩٦٧ وەك مامۆستا لە شارۆچكەی خورماتوو دامەزراوە.
- لە حەفتاكانی كەركوك، چەند تابلۆیەكی كێشاوە و لە گۆرەپانی شێوەكاری بزربووە.
- لە رۆژنامەی كەركوك تابلۆیەكی بلاوكردووەتەوە بەناو جوبرانْ خەلیل جوبران.
- نزیكەی ١٠-١٥ چیرۆكی نووسیوە.
- هەروەها كاری وەرگێرانی كردووە لە ئینگلیزییەوە بۆ كوردی و عەرەبی.

*** ( سەدرەدین كاكەیی ):-**

- ناوی (سەدرەدین ئەمین كاكەیی)یە.
- لە ساڵی (١٩٦١) لە كەركوك لەدایكبووە.
- كۆلێژی هونەرە جوانەكانی بەغدای تەواو نەكردووە لەبەر رژێمی بەعس و وازی لە خوێندن هێناوە.
- پێشانگا تایبەتییەكانی:
- ساڵی (١٩٩٩) لە سەنتەری رۆشنبیری فەرەنسی پێشانگای تایبەتی خۆی لە عەممان كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠١) لە هۆڵی سووك شوكلی لە بنسلڤانیا لە ئەمریكا پێشانگای تایبەتی خۆی كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠١) لە هۆڵی سنكد ستۆدیۆ لە بنسلڤانیا لە ئەمریكا پێشانگای تایبەتی خۆی كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٣) لە هۆڵی سووك شوكلی لە بنسلڤانیا لە ئەمریكا پێشانگای تایبەتی خۆی كردووەتەوە.
- پێشانگا هاوبەشەكانی:
- ساڵی (١٩٨٩) لە سەنتەری هونەر، لە فیستیڤاڵی واستی

لە بەغدا كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٩) لە هۆڵی ئاری لە هەولێر كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٥) لە سەنتەری چالاكی هونەری لە هۆڵەندا لەگەڵ هونەرمەند كاكەیی كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری پێشانگای پێنج هونەرمەندی كردووە لە برۆكسل لە بەلجیكا.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری پێشانگای پێنج هونەرمەندی كردووە لە دیستلبیرگین لە بەلجیكا.
- ساڵی (١٩٩٩) بەشداری پێشانگای كردووە لە پەیمانگای سرفانتسی ئیسپانی، پێشانگای دۆنكیشۆت لە ئەردەن.
- ئەم هونەرمەندە لە ساڵی (٢٠٠٠) بە سەرپەرشتی (بێرنارد ئیمێ) سەفیری فەرەنسا لە ئەردەن پێشانگایەكی تایبەتی خۆی لە (ناوەندی رووناكبیری فەرەنسی)و (هاوكاری زمانەوانی) لە عەممان كردووەتەوە لە رۆژانی (٨-٣٠) ی حوزەیران.
- ساڵی (٢٠٠١) لە هۆڵی ئایزرمان پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ حوسام كاكەیی لە هۆڵەندا كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠١) لە باخچەی هونەر پێشانگای هاوبەشی سی و پێنجەمینی لە شاری لیتس لە ئەمریكا كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠١) لە هۆڵی ئینتەرناشیۆناڵ ئارت، لە كالیفۆرنیا لە ئەمریكا كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠١) لە مۆزەخانەی بوجەر هاوس پێشانگای ساڵانەی لە بنسلڤانیا لە ئەمریكا كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٢) لە هۆڵی ئیلیزابیس میدل، پێشانگای پێنج برا لە كۆڵم لە هۆڵەندا كرایەوە.
- ساڵی (٢٠٠٢ لە مۆزەخانەی لانكستەر بۆ هونەر پێشانگای ساڵانەی لە ئەمریكا كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٢ لە مۆزەخانەی هێرشی پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەندی فۆتۆگراف شەمسەددین ئەمین لە بنسلڤانیا لە ئەمریكا كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٣) لە مۆزەخانەی لانكستەر چل و یەكەمین پێشانگای تایبەتی خۆی لە بنسلڤانیا كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٤) لە ئەیا گالەری لە لەندەن لە بەریتانیا لەگەڵ هونەرمەندانی عێراقی پێشانگای كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٤) لە هۆڵی دی ئۆمێگیفینك پێشانگای سێ هونەرمەند لە هۆڵەندا كراوەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٤) لە مۆزەخانەی لانكستەر پێشانگای تایبەتی چل و دووەمی لە بنسلڤانیا لە ئەمریكا كردووەتەوە.

*** سەرکەوت مەجید تارۆ:-**

– ساڵی ١٩٦٣ لە گەڕەکی شۆریجەی شاری کەرکوک لەدایکبووە.
– ساڵی ١٩٧٣ لە قوتابخانەی سەلاحەدین لە پۆلی سێی سەرەتایی بۆ یەکەمجار شانۆگەرییەک ئامادە دەکات، بە سەرپەرشتی مامۆستا تالیب و هەریەکە لە نەجات ئەحمەد، شەهاب ئەحمەد، عەبدولواحید زێڕەنگەر.
– ساڵی ١٩٧٥ بۆ یەکەمجار چووەتە سەر تەختەی شانۆ و بەشداری شانۆگەریی نەهێشتنی نەخوێندەواری کردووە.
– ساڵی ١٩٧٦ بەشداریی شانۆگەریی بەهاری ڕەشی کردووە لە ناوەندی شۆریجەی کوران.
– ساڵی ١٩٧٧ بەشداریی شانۆگەریی گورگی دڕندەی کردووە لە ناوەندی شۆریجەی کوران.
– ساڵی ١٩٧٨ بەشداریی شانۆگەریی هەتیوێکی بێکەسی کردووە، لە نووسین و دەرهێنانی یەلماز شوکر.
– ساڵی ١٩٧٩ بەشداری شانۆگەریی بەشی من گریانە لە دەرهێنان و نواندنی خۆی.
– ساڵی ١٩٨٠ لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی بەشی دەرهێنانی شانۆ وەردەگیرێت.
– ساڵی ١٩٨٢ شانۆگەریی دوا گۆرانی وەک ئەکتەر و دەرهێنەر لە سلێمانی جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ١٩٨٣ شانۆگەریی دەهۆڵی ئاورشمینی وەک ئەکتەر و ئاوازدانەر و دەرهێنەر بەشداریکردووە.
– ساڵی ١٩٨٣ شانۆگەریی چارەنووسی ئادەمیزاد وەک ئەکتەر و ئاوازدانەر لە سلێمانی جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ١٩٨٤ شانۆگەریی لە یادنەوە بۆ فێربوون وەک ئاوازدانەر و یاریدەدەری دەرهێنەر لە سلێمانی جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ١٩٨٤ شانۆگەریی ڕێساو لە ڕێسابەدەر وەک ئاوازدانەر و دەرهێنەر لە سلێمانی جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ١٩٨٥ شانۆگەریی هاملێت درنگ دەگەڕێتەوە وەک ئەکتەر بەشداریی کردووە.
– ساڵی ١٩٨٥ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی بەشی دەرهێنان تەواو کردووە.
– ساڵی ١٩٨٥ شانۆگەریی بەشێک لە ژیانی ڤانکۆخ وەک نووسەر و ئەکتەر و دەرهێنەر جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ١٩٨٥ بۆ یەکەمجار فیلمی کۆتایی هەنگاوەکانی حەمە فەریق حەسەنی وەک ئەکتەر و دەرهێنەر بە نهێنی و بە کامێرای هەشت میلیم لە کەرکووک جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ١٩٨٨ لە شانۆگەریی گالیسکەکە دەڕوات وەک ئەکتەر و ئامادەکار و دەرهێنەر لە فیستیڤاڵی شانۆیی پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی سلێمانی بەشداریی کردووە.
– ساڵی ١٩٩١ فیلمی قەرەجی لە چامە شیعرییەکەی شاعیری ڕووسی پۆشکین و شێرزاد حەسەنەوە وەرگرتووە و وەک ئەکتەر و دەرهێنەر جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ١٩٩١ شانۆگەریی ئاور شانۆیەکی سەرجەم گۆرانی ئامێزی بۆ منداڵانی چەمچەماڵ وەک ئاوازدانەر و نووسەر و ئەکتەرو دەرهێنەر جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ١٩٩٤ بەشداری فیلمی زامێلی گەرمیان وەک نووسەر و ئەکتەر و دەرهێنەر جێبەجێ کردووە، یەکەم فیلم بووە کە باسی گەندەڵی کردووە و نیشاندانی ڕاگیراوە.
– ساڵی ١٩٩٥ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری کەرکوکی دامەزراندووە تەنها کارمەندی بەڕێوەبرایەتییەکە بووە بە هاوکاری هونەرمەندان و نووسەران و دڵسۆزانی دەرەوەی بەڕێوەبەرایەتییەکە و هەموو ئەم چالاکییانەی لە ماوەی ساڵێکدا جێبەجێ کردووە:
– هەشت پێشانگای شێوەکاری منداڵانی ئاوارەکانی کەرکوک بە هاوکاری هونەرمەندان سوعاد ستار و بەیان عەلی
– دوو پێشانگای شێوەکاری هونەرمەندانی کەرکوک
– یانزە ڕۆژ دیداری شاری کەرکوک، کە کۆڕ و سیمینار بوو بۆ یانزە نووسەر و شرۆڤە کار و پسپۆڕ و هونەرمەند لەسەر کەرکوک.
– فیستیڤاڵی گۆرانی منداڵە ئاوارەکانی کەرکوک لە سلێمانی و دەربەندیخان و چەمچەماڵ.
– ساڵی ١٩٩٧ بەشداری فیلمی مێژووی مەنگی کردووە لە نووسین و دەرهێنانی خۆی لە هۆڵەندا.
– ساڵی ١٩٩٨ بەشداری ئۆپەرێتی ئەوینی خاک کردووە وەک ئەکتەر و دەرهێنەر لە هۆڵەندا.
– ساڵی ٢٠٠٠ مۆنۆدرامای جوانترین حەرام وەک دەرهێنەر جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ٢٠٠٣ کورتە فیلمی مەولانە ڕۆمی و شەمس وەک ئەکتەر جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ٢٠٠٤ فیلمی زامێلی بەرەو باوەڕ وەک ئەکتەر بە زمانی ئینگلیزی جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ٢٠٠٥ شانۆگەریی فرمێسکەکانی خوا وەک ئەکتەر بە زمانی ئینگلیزی جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ٢٠٠٦ کورتە فیلمی فرۆشگای سەر کۆڵان وەک ئەکتەر بە زمانی ئینگلیزی جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ٢٠٠٤وە وەک خۆبەخش هاوکاری قوتابیانی کۆلێژی سینەمای واتکینسی بۆ نواندن کردووە لە ئەمەریکا.
– ساڵی ٢٠٠٤وە بەردەوام لە کەناڵێکی تەلەفزیۆنی شاری ئاشڤێل هەفتەی دوو کاتژمێر بەرنامەی لەسەر کورد بە زمانی ئینگلیزی جێبەجێ کردووە.
– ساڵی ٢٠٠٩ کورتە فیلمی دوێنێ لە مێژوودا وەک ئەکتەر بە زمانی ئینگلیزی جێبەجێ کردووە.

*** ( سەرگیس عیواز ):-**

- یەكێكە لە شاعیرە مەسیحییەكانی قەڵای كەركوك كە شیعری بە زمانی توركی هەیە لە سەدەی هەژدەهەمی زایینی ژیاوە.

*** ( سەراب-ڕێبوار زەنگەنە ):-**

- یەكێكە لە شاعیرە لاوەكانی كەركوك كە لە هەشتاكانەوە دەستی شیعر نووسینی هەیە.
- لە بەهەمە چاپكراوەكانی (ئێوارە سەرابییەكان)، ٢٠٠٣.

*** ( سەربەست ئەفەندی ):-**

- ساڵی (١٩٧١) لە گەڕەكی ئیسكانی شاری كەركووك لەدایكبووە.
- دەرچووی پەیمانگای تەكنیكی پزیشكی بەشی سڕكردن (تخدیر)ی شاری هەولێرە ساڵی (١٩٩٤- ١٩٩٥).
- سەرەتای چوونی بۆ ناو جیهانی كاریكاتێر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٩١)، ئەوكاتەی خۆی و خانەوادەكەی لە كۆڕەوە مەزنەكەی ساڵی (١٩٩١) ئاوارەی وڵاتی ئێران بوون، بە وێنەیەكی كاریكاتێری بەشداری كرد لەو پێشانگا هونەرییەی كەوا بۆ ئاوارە كوردەكانی ئۆردووگای (كەریم ئاوا)ی سەر بە شاری ئەسفەهان سازكرابوو.
- لە چەندین رۆژنامەو گۆڤار بابەتی كاریكاتێری بڵاوكراوەتەوە، وەك رۆژنامەی (برایەتی، یەكگرتوو، باسەرە، داهێنان، رابوون، الافق)، هەروەها چەندین بابەتی كاریكاتێری بڵاوكراوەتەوە لە گۆڤاری (هەرێم، الحوار، دەهۆل تایمز، گەپ، هەفتانە).
- بەشداری لەم پێشانگا كاریكاتێریانەی كردووە:
- پێشانگای هونەری كەوا ساز كرابوو بۆ كوردە ئاوارەكانی ناو ئۆردوگای ( كەریم ئاوا) لە ئێران، ساڵی (١٩٩١).
- پێشانگای تایبەتی لەژێر ناوی (ئاوێنەی راستییەكان)،لە هۆڵی مەڵبەندی هونەری بەیان لەهەولێر ساڵی (١٩٩٩).
- پێشانگای هاوبەش لەگەڵ (كۆمەڵەی كاریكاتێریستانی كورستان)، لە هۆڵی میدیا لە هەولێر ساڵی (٢٠٠٥).

*** ( سەربەست كەركوكی-عوسمان خەتاب ):-**

- ساڵی (١٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٥٤) لە كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٧٦) خوێندنی لە زانكۆی بەغدا تەواو كردووەو بەكالۆریۆسی لە كارگێڕی و ژمێریاری وەرگرتووە لە كۆلێژی كارگێڕی و ئابووری.
- ساڵی (١٩٧٧-١٩٧٨) خوێندنی دبلۆمی لە دیوانی چاودێری دارایی لە بەغدا وەرگرتووە.
- ساڵانی (١٩٧٩-١٩٨١) چاودێری كاروباری حیسابداری بووە لە سەرۆكایەتی زانكۆی سلێمانی و پاشان تا مانگی ئاداری ساڵی (١٩٨٢) لە سەرۆكایەتی زانكۆی سەلاحەددین لە هەولێر.
- ساڵانی (١٩٨٣-١٩٨٤) كارمەندی بارەگای سەرەكی (جوقد) بووە لە شاری دیمەشق.
- ساڵانی (١٩٩٠-١٩٩١) خوێندنی دبلۆمی لە

(كۆنسۆڵتەیشنی كۆمپیوتەری و حیسباداری كۆمپیوتەری) لە لەندەن خوێندووە.
- ساڵانی (١٩٩٤-٢٠٠٤) بەڕێوەبەری كاروباری رۆشنبیری بووە لە مەڵبەندی (كەی سی سی) لە لەندەن.
- ساڵی (١٩٩٧) سكرتێری كۆمیتەی یەكێتی نووسەرانی كورد بوو لە بەریتانیا.
- ساڵی (٢٠٠٢) خوێندنی بەڕێوەبردنی دەزگای پەنابەرییەكانی تەواو كردووە.
- ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٥) جێگری بەڕێوەبەری مەڵبەندی رۆشنبیری كورد بووە لە لەندەن.
- ساڵانی (٢٠٠٥-٢٠٠٧) بەڕێوەبەری مەڵبەندی رۆشنبیری كورد بووە لە لەندەن.
- ساڵانی (٢٠٠٩-٢٠١٠) پسپۆری كاروباری كەڵچەری عێراق بووە لە كۆمپانیای (NCC London).
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (سروودی شادی)، كۆمەڵە شیعر، دانیمارك، ١٩٨٧.
- (لێكۆڵینەوەیەك لەسەر راپەڕینی كوردان ١٩٢٥)، وەرگێڕان، سوید، ١٩٨٨.
- (خۆنچەكان)، كۆمەڵەیەك شیعرو چیرۆك بۆ منداڵان، بە هاوكاری لەگەڵ بەڕێزان سامی شۆڕش و هەڤاڵ كوێستانی، لەندەن، ١٩٩١.
- (تاقیكردنەوەی تیۆریی رانەندەگی لە بەریتانیا)، بە هاوكاری بەڕێزان: محەمەد گەردی و ئەنوەر سوڵتانی، لەندەن، ٢٠٠٠.
- (فیلمی دیزنی: كاتێ دوو هونەرمەندی گەورە بە یەكتر دەگەن)، كتێب بۆ منداڵان، دەزگای (خاك)، سلێمانی، ٢٠٠١.
- (ئێوارە خەونێك لەگەڵ باوەگوڕگوڕا)، كۆمەڵە شیعر، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (تۆ مەبەستی، تۆ هەڵبەستی)، كۆمەڵە شیعر، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (كورد لە بەریتانیا)، لەگەڵ كاپ سینكەر، بە ئینگلیزی، لەندەن و سیدنی، ٢٠٠٥.
- (راپۆرتی كارگێڕی بەریتانی سەبارەت بە دەڤەری كەركوك ١٩١٩)، وەرگێڕان و لێكۆڵینەوە، دەزگای (ژین)، سلێمانی،

٢٠٠٥.

- (نازم حیکمەت: کۆمەڵێ لە شیعرەکانی)، لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ئەدەبی تورکی نوێ، ٢٠١٠.
- (سوورەوەردی لەزادگایەکی کوردەوارییەوە بۆ جیهانییەتی فەلسەفە)، ٢٠١٣.
- (میرزا مەنگوڕی و یۆتۆپیا جیهانییەکەی)، لێکۆڵینەوە، وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان / بەڕێوەبەرایەتی سلێمانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی.

*** ( سەرتیب فەتاح - دکتۆر سەرتیب فەتاح ):-**

- دکتۆر (سەرتیب کوڕی فەتاح ئاغای کوڕی سەید خەلیل ئاغای کاکەیی)ە.
- ساڵی (١٩٤٩)ی زایینی لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٥) لە خوێندگای تۆپزاوە خراوەتە بەر خوێندن.
- ساڵی (١٩٦١) ی زایینی بۆ خوێندنی پلەی ناوەندی و دواناوەندی چووەتە شاری کەرکوک.
- ساڵی (١٩٦٦) لە زانکۆی بەغدا وەرگیراوە.
- ساڵی (١٩٧٠) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی پێ بەخشراوەو لەدوا ناوەندی کەرکوک بە مامۆستا دامەزراوە، لە پاش ساڵێک بۆ خوێندن چووەتە بەریتانیاو لە زانکۆی باکووری ئینگلتەرە بڕوانامەی ماجیستێری بەدەستهێناوە پاشانیش لە ساڵانی(١٩٧٨-١٩٧٩)ی زایینی بڕوانامەی (بایۆفیزیک)ی وەرگرتووە، لە دواییدا گەڕایەوە ئامێزی وڵاتو لە (٢٣)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٩)ی زاییندا لە زانکۆی سلێمانی بەمامۆستایی دامەزرا.
- پاش ئەوەی زانکۆکە لە سلێمانییەوە گوێزرایەوە بۆ هەولێرو گۆڕانی ناوەکەی بۆ زانکۆی سەلاحەدین، لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی ناوبراودا بوو بە مامۆستا، دواتریش کرا بە سەرۆکی بەشی بایۆفیزیک.
- ساڵی (١٩٨٤) ی زایین دا وەك نوێنەری زانستی زانکۆی سەلاحەدین نێردرا بۆ ئیتالیا، لەوێش پەیوەندی بە(ڕێکخراوی فیزیکی جیهانی سێیەم)ەوە کردوو بوو بە ئەندامی ئەو ڕێکخراوە، پاشان بەهۆی دروستکردنی ئامێری (کارۆمۆگناتیسی) خەڵاتی وەرگرت، ئەم ئامێرەش بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی (ئیفلجی وشکستی گەورە) بەکاردەهێناو چەندین نەخۆشی پێ چارەسەر دەکرد، بە تایبەتی تووشبوانی (ئیفلیجی و نیوە ئیفلیجی و ئیفلیجی گشتی) ئەمە لەڕێگەی (لێدانی شەپۆلەکانی کارۆموگناتیسی) یەوە ئەنجامی ئەدا.
- ساڵی (١٩٩٩) کرا بە جێگری سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین و سەرۆکی کاروباری زانستی وتوێژینەوەی زانستی.
- دەورێکی گرنگی بینی لە دامەزراندنی بەشی (بایۆفیزیک) لە زانکۆی سەلاحەدین.
- توانایەکی چالاکی هەبوو لە بوارەکانی ڕۆشنبیریی وئەدەبداو شاعیرێکی داهێنەرو ئەدیب وڕۆشنبیر بووە، چەندەها توێژینەوەی پوخت و بەپێزی بە ئینگلیزی و عەرەبی بڵاوکردووەتەوە، هەروەها کتێبێکی پڕ بەهای بە زمانی عەرەبی نووسیوە بە ناوی (اله من یعشق العلم).
- ساڵی (١٩٩٩)دا زۆربەی بەرهەمە ئەدەبی وزانستییەکانی کۆکردووەتەوە ولە چاپیداون، چەندین دەستنووسیشی هەن چاوەڕوانی بڵاوکردنەوەن.
- مرۆڤێکی دڵ و دەروون خاوێن بووە، دژ بە ئاژاوەو شەڕ وململانێ بووە، نەتەوەو نیشتمانەکەی خۆش دەویست، حەزی لە پیاوەتی وچاکە بووە، هەمیشە لایەنگری دەستەی نەدارو هەژاران بووە.
- لە (٢٣)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کرد.
- لە (٢٤)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٠) تەرمەکەی لە هەولێرەوە بەرەو کەرکوک لە گۆڕستانی (ئیمام ئەحمەد) لە گەڕەکی چای بە خاك سپێردرا.

*** ( سەردار جاف ):-**

- ناوی (سەردار ڕەزا قادر)ە.
- ساڵی (١٩٥٧) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایك بووە.
- بەرهەمەکانی:
- (سەمای ڕوح)، شیعر، هەولێر، ٢٠٠١.
- (شرۆڤەیەك لە بازنەدا)، وتارو ڕەخنە، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (مستەفا بارزانی ناسنامەی نەتەوەو ڕەمزی تێکۆشان و بەرخودان)، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (شیرین تر لە دەق)، لێکۆڵینەوەو ڕەخنە، سلێمانی، ٢٠١٢.
- (بارزانی وڵاتی منەو کوردستانیش بارزانیمە)، شیعر، هاوبەش.

*** ( سەردار ڕەشید زەنگەنە ):-**

- ساڵی (١٩٥٩) لەدایکبووە.
- ماوەیەکە بەرهەمەو نووسینی هەیە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی کەرکوکدا.

- بەرهەمە چاپکراوەکانی: (دیمانە)، دوو بەرگ.

* (سەردار فەتاح):-

- ساڵی (١٩٤٠) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووەو لە ساڵی (١٩٩٠) کۆچی دوایی کردووە.
- کتێبێکی چاپکراوی هەیە دەربارەی فلکلۆری کوردی.

* (سەرگۆن پۆڵس):-

- ساڵی (١٩٤٤) لە حەبانیە لەدایکبووە.
- چیرۆك نووس و رەخنە گربووە، ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٥٦) خێزانەکەی گەڕوانەوتەوە کەرکوك و لە گەڕەکی تەپەی مەلا عەبدوڵلا نیشتەجێ بوونە.
- یەکێك بووە لە (گرووپی کەرکوك) کە رۆڵێکی باشیان گێڕا لە بزووتنەوەی تازەگەری لە شیعرو ئەدەبی عێراقی و عەرەبیدا کە زۆربەشیان کورد بوون جگە لە (قەحتان) نەبێت هەموویان پەیوەندییان کردووە بە حیزبی شیوعی عێراقییەوە.
- ساڵی (١٩٧٧) رۆیشتووە بۆ ئەمریکا، لەوێ یەکسەر دەچێتە کتێبخانەی ئەمریکی و داوای کتێبەکانی گرووپی (پینتکیس)ی ئەمریکی دەکات، کە دواجار بوو بە هاورێی.
- ماوەیەك لەنێوان ئەورووپا و ئەمریکا هاتوچۆ دەکات و دواجار بە نەخۆشی شێرپەنجە لە نەخۆشخانەیەکی بەرلین لە رۆژی (٢٢) تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی دەکات.
- ئەوەی لە بەرهەمەکانیدا بە ناوبانگە بە تازەگەری لە شیعرو چیرۆك کە هەر لە شەستەکانەوە بەردەوام بوو تا ساڵی (١٩٩٣).
- لە شەستەکان کۆچی کرد بۆ ئەمریکا و لەوێ گۆڤاری (دجلة)ی دەرکردووە.
- بەرهەمەکانی:
- (یومیات في السجن لهوش منه)، وەرگێڕان، ١٩٦٩.
- (عشر قصائد)، ١٩٨٥.
- (الوصول إلى مدينة اين)، ١٩٨٥.
- (الاول والتالي)، ١٩٩٢، (٢٠٠٨).
- (الحياة قرب الاكروبول)، ١٩٨٨، (٢٠٠٨).
- (الغرفة المهجورة)، ١٩٩٢.
- (حامل الفانووس في ليل الذئاب)، ١٩٩٦.
- (شهود على ضفاف)، ١٩٩٧.
- (إذا كنت نائما في مركب نوح)، ١٩٩٨.
- (هناك في ضياء وظلام النفس والآخر)، ٢٠٠٠.
- (كتاب النبي)، (٢٠٠٨).
- (عظمة اخرى لكلب القبيلة)، (٢٠٠٨).
- (قصائد اولى)، ٢٠١٤.
- (عاصمة الانفاس الاخيرة)، چیرۆك، ٢٠١٤.
- (بحر المتاعب).
- (أساطير وتراب).
- (شاحذ السكاكين).
- (رقائم لروح الكون).
- (عاصمة آدم).
- (الهجرة من آشور إلى بلدان الاشياء الاخيرة).

* (سەروەر ئەحمەد کەریم):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (چەند لاپەرەیەکی شاراوە لە مێژووی کەریم بەگ)، سلێمانی، ١٩٩٨.
- (چەمچەماڵ)، بەر لە مەملەکەتی ئاشوور، سلێمانی، ٢٠٠٣.

* (سەعدوڵلا موفتی- موفتی):-

- (سەعدوڵلا کوڕی حاجی دەروێش ئەفەندی)یە، نازناوی (موفتی)بووە لە شیعردا.

* سەعدون عومەر سەعدون ساڵەیی:-

- ساڵی ١٩٥٥ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٨ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٥٧ بەناونیشانی مغاویر.
- ساڵی ٢٠٠٩ خانەنشین کراوە.

* سەعدون کۆپرلو:-

- ساڵی ١٩٥٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ٢٠١٤ کۆچی دوایی کردووە.
* بەرهەمەکانی:-
- YILLANMIS CILELER، 2004
- Altun kopru، 2008
- Kerkuk Gonlumde Ask Yuregimde، 2008
- Insan vatanini sever، 2009

* ( سەعدی بەرزنجی - دکتۆر سەعدی بەرزنجی ):-

- ساڵی (١٩٤٢) لە ناحیەی قادر کەرەم لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٦) کۆلیژی ماف تەواو کردووە.
- لە سەرەتادا لەناو حیزبی شیوعی بوو، بەڵام لە ساڵی (١٩٦٣)دا وازی لە حیزبی شیوعی هێناوەو لە ساڵی (١٩٦٧) چووەتە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستان.
- ساڵی (١٩٧٢) ماستەری هێناوەو لە دواییدا دکتۆرای وەرگرتووە لە فەرەنسا لە ساڵی (١٩٧٨).
- ساڵی (٢٠٠٥)ەوە ئەندامی پەرلەمانی ئەنجوومەنی نیشتمانی عێراق بوو لەسەر لیستی کوردستانی.
- لە (١٤)ی تەمموزی ساڵی (٢٠١٢) کۆچی دوایی کردووە.

* ( سەعید بەسیم دەمیرچی ):-

- ساڵی (١٩٠٢) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شاعیرە چاکەکان کە شیعری تورکمانی وعەرەبی هەیە.
- ساڵی (١٩٦٥) کۆچی دوایی کردووە.

* سەعید شێخ جەواد ( شێخ سەعید شێخ جەواد ):-

- مامی رەهبەری شاعیر بووە.
- ئەم زاتە زۆر تاقەتی زانستی ئایینی نەبووە، زیاتر شارەزایی لە کیمیاگەرییدا هەبووە و لەو بوارەدا پیاوێکی زیرەك بووە، تەنانەت توانیویەتی پارەی ئەو سەردەمە دروست بکات کە بە ئامێری دەستی ساکار کاری کردووە بە مەرجێك کانزایی بووبێت، لە گرانییەکەدا بەو کارە گوزەرانی کردووە.

* ( سەعید چەلەبی ):-

- یەکێکە لە نووسەرکانی کفری.
- بەڵام زانیاریمان دەربارەی نییە.

* ( سەمەد چاوشین ):-

- ناوی (عەبدولسەمەد محەمەد شەریف)ە.
- ساڵی (١٩٦٠) لە گوندی تۆبزاوای خوار کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨١) دەستی داوەتە کاری ڕۆژنامەنووسی.
- بەرهەمەکانی:
- (کەرکوك و قینی رەشی جەزراوی)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (لە پێناوی کەرکوکدا)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (لە بانی مەقانەوە بۆ دۆزەخەکانی سەدام)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (زامەکانی کەرکوك)، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (تورکمان لە بەڵگەنامەکانی بەعسدا)، کەرکوك، ٢٠٠٧.

* ( سەعید شێخ خدر نەقشبەندی ):-

- یەکێکە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك و نووسەرو شاعیر بووە باوکی شاعیر (رەهبەر) بووە.
- ساڵی (١٨٤٠) زایینی لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٠٤) زایینی کۆچی دوایی کردووە لە کەرکوك.

* ( سەعید شاکەلی - شێخ سەعید شاکەلی ):-

- ناوی (سەعید ئەحمەد محەمەد شاکەلی)یە.
- ساڵی (١٩٥٥) لە دێی سەیدەی ناوچەی شاکەل لەدایکبووە.
- زانکۆی سلێمانی بەشی بەڕێوەبەرایەتی تەواو کردووە لە ساڵی (١٩٨١).
- دامەزرێنەری کتێبخانەی گشتی کەلار بووەو ماوەیك بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرییەکانی گشتی کوردستان و راوێژکاری وەزارەتی ڕۆشنبیری بووە.
- خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری (دژنە بەنشت)ە کە تایبەتە بە

كتێبخانەی گشتی.
- خاوەنی پێنج بەرگی كتێبی (ژیلەمۆی گەرمیان)ە.

* ( سەعید عەبدوڵڵا ):-

- باوكی حەمە درێژی مەقامەزان.
- بەیانیان بۆ ماوەی سەعاتێك لە بن منارەی بەرتەكیەدا، مەقامێكی (مەنسووری) دەخوێندو دوای دەیكردە مەقامی (قەزاز) بۆیە بەیانیان چاوەڕێی خوێندنی مەقامی ئەویان دەكرد.

* ( سەعید عەبدولڕەحمان ):-

- ساڵی (١٩٣٩) لە ئاخور حوسێن لەدایكبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ئاوەندی لە كەركوك تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٥٦) بۆ خوێندن چووەتە توركیا.
- دەرچووی كۆلێژی ئەندازیاری بوو لە بەشی مەدەنی زانكۆی ئەستەمبول لە ساڵی (١٩٦١).
- ساڵی (١٩٦٣) بڕوانامەی ماجستێری لە هەمان زانكۆ بە دەست دەهێنێت، لە هەمان ساڵدا لەلایەن كاربەدەستانی (میتی) توركییەوە لە زانكۆی ئەستەمبول گیرا كە تۆمەتی ئەوەی كۆمەكیان بۆ شۆڕش كۆكردووەتەوە لە توركیاو پەیوەندییان بە كۆمەڵەی خوێندكارانی كورد لە ئەوروپا هەبووە.
- ساڵی (١٩٦٤) لەگەڵ (جەمال عەلەمدار) و (ئیبراهیم سایبر) لە سوید كۆمەڵەی پەنابەرانی سیاسی كوردیان دامەزراند.
- تا حەفتاكان ڕۆڵێكی گرنگی دەبێت لە یارمەتی پەنابەراندا لە ئەوروپا.
- ساڵی (١٩٩٤) بە نەخۆشی دڵ كۆچی دوایی دەكات و لە هەولێر دەنێژرێت.

* ( سەعیدی قوتان - شێخ سەعیدی قوتان ):-

- ناوی (شێخ سەعید كوڕی ئەحمەدی مەڵحە كوڕی شێخ محەمەد كوڕی شێخ ئەحمەد سەرداری بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٨٩٧) لە گوندی (سەرگەڵو) هاتووە دونیاو هەر لە منداڵییەوە لە گوندی (مەڵحە) نیشتەجێی بوونە.
- لە مزگەوتی (مەلا ڕەفیق) لە گەڕەكی (زێوێ) زانستە ئایینییەكانی خوێندووەو پاشان لە لای (مەلا ئەحمەد سیامەنسووری) تەواوی زانستە ئایینییەكانی تەواو كردووە، شارەزایی لە زمانی عەرەبی و فارسی و توركیشدا هەبووە.
- ساڵی (١٩٢٠) كۆچی دوایی كردووە.

* ( سەعید كوڵەجۆ - مەلا سەعید كوڵەجۆ ):-

- یەكێكە لە زانا بەناوبانگەكانی كوردستان لە بواری ئایین و زانستەكانی ئاییندا.
- لە كفری گەورە بووەو خوێندنی تەواو كردووەو لە (كوڵەجۆ) بووەتە ئیمام و خەتیب و لە دوای خۆی كوڕەكەی عەلی جێگەی گرتووەتەوە.
- ساڵی (١٩٦٢) كۆچی دوایی كردووە.

* ( سەعید مەلا ):-

- ساڵی (١٩٢٣)ی زایینی لە گوندی قەرەچێوار لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٤٩)ەوە ژنی هێناوە دوو كوڕو سێ كچی هەیە.
- گەلێك گۆرانی و قەتاری گەرمیانی تۆمار كردووە.
- لە (٢٧)ی ئابی ساڵی (١٩٨٧) لە نەخۆشخانەی كەركوك كۆچی دوایی كردووە.

* ( سەعیدی ملباز - مەلا سەعیدی ملباز ):-

- یەكێكە لە زانا ئایینییەكانی (خورماتوو).
- بەڵام زانیاریمان دەربارەی چالاكی و بەرهەمەكانی نییە لە بواری خوێندن و فێركردندا.

* ( سەعیدی موفتی - مەلا سەعیدی موفتی ):-

- ساڵی (١٨٧٨) لەدایكبووە كە خۆی بە بنەڕەت خەڵكی چوارتا بووە بەڵام هەر لە كفری ژیاوە.
- ساڵی (١٩٢١) لە كفری كۆچی دوایی كردووە.
- زانیاری زیاترمان دەربارەی ژیانی نییە لە بواری ئایینەدە.

* ( سەعید ئەحمەد - مام سەعا ):-

- ناوی تەواوی (سەعید ئەحمەد محەمەد)ە لە بنەماڵەی (كەریمان)ی عەشیرەتی كاكەییە، كەناسراوە بە (مام سەعا) یان (مام سەعای ئەحمەد شیرین).
- ساڵی (١٨٨٧) لە یەكێك لە دێیەكانی كاكەییەكان لەدایكبووە.
- شارەزاییەكی تەواوی لە مەقامەكانی ناوچەی گەرمیاندا هەبووە، بەڵام بەداخەوە هیچ بەرهەمێكی تۆمار نەكراوە.
- ساڵی (١٩٥٦) لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا بە نەخۆشی تەنگەنەفەسی كۆچی دوایی كردووە.

* (سەفانەددین حیسامەددین قادری - مەلا سەفانەددین حیسامەددین قادری):-

- ساڵی (١٩٤٦) لە گەڕەکی (ساری کەهیە) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ماوەیەك ئیمام و خەتیب بووە لە مزگەوتی (مستەفا قیردار) و (ئیبراهیم بەگ تکریتی) و (جبوری).
- دەستنووسەکانی:
- (کتاب شرح ١٧ حدیث نبوي).
- (کتاب أذکار وأوراد الاقطاب الاربعة).
- (المدائح النبویة).
- (الرسالة النقشبندیة).

* سەفائەددین نەجات عەلی غالیب:-

- ساڵی ١٩٦٩ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- الاصابات الریاضیة وسبل معالجتها، نامەی ماستەی، ٢٠٠٨
- نصائح في الصحة الریاضیة ٢٠١٢
- بیادر الخیر، ٢٠١٣

* سەفییە بەیرەقدار:-

- ساڵی ١٩٥٣ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- تورکمان لیدەرلری، ٢٠٠٥.
- BIZIM KERKUK، شیعر ٢٠٠٥
- کرکوك عاشیقی، ٢٠٠٧
- COCUK FOLKLORU، 2011
- بیز تورکمنز.

* (سەلاح بەهلول عەلی):-

- ساڵی (١٩٦٥) لە گەڕەکی بەگلەر لەدایکبووە.
- لە بواری شیعری تورکمانیدا کاردەکات.
- لە دەستەی نووسەرانی (تورکمان دیلی)یە.
- بەرهەمەکانی:
- (نرەنین کوزلری)، شیعر بە زمانی تورکی، ١٩٨٩.
- (جوشونجەلر)، شیعر بە زمانی تورکی، ١٩٩٠.
- (إنسانلیغن کولکەسینده)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دارالشؤون الثقافیة)، بەغدا، ١٩٩١.
- (ایتجن بیرباغیرش)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة)، بەغدا، ١٩٩٦.
- (چاغداش تورکمن خویرات انتولوژیسی).
- (بیر عمر بوله گیچتی).
- (مبادئ القومیة الترکیة)، وەرگێران، ٢٠٠٥.
- دوقوز ایشق، ٢٠٠٤
- FUZULI KUMLERIN KIMLER FUZULININ، ٢٠٠٤
- هر یونیله یونس امره، ٢٠٠٥
- OFKEYELE KARANLIPIOKSAMAK، 2005

- ئولوم دید یکینیز نه اولسون افندیلر، ٢٠٠٦
- محمد عزت خطاطا، ٢٠٠٦
- فتح القسطنطینیة، ٢٠٠٦
- ئولو مدەن صونراکی یورویوش، ٢٠٠٧
- چاغداش تورکمان خویراتانتولوز جیسی، ٢٠٠٧
- سلطان محمد فاتح، ٢٠٠٧
- بیر شهر حکایەسی، ٢٠٠٨
- باشبوغوموز ایزندە، ٢٠٠٨
- توفیق جلال اورغان، ٢٠٠٨
- بیر عمر بویولە کیجتی، ٢٠٠٨
- TURKMAN KADIN EDEBIYATCILARIK ANTOLOJISI، 2008
- التون کوبرو، ٢٠٠٨
- ABDULVAHIT KUZECI OGLU، 2010

* (سەلاح حەسەن پاڵەوان):-

- ساڵی (١٩٦٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکەمین نووسینی بە چیرۆك دەستی پێکردووە.
- ساڵی (١٩٨٨) لە گۆڤاری بەیان یەکەمین چیرۆکی بەناوی (تەرمی شەو) بلاوکردووەتەوە.
- کۆمەڵێك وتاری رەخنەیی لە ساڵانی هەشتا و نەوەتەکان لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بلاو کردوەتەوە.
- لەگەڵ (عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی) و (حەمید رێبوار) و (سەدرەدین عارف) و چەند برادەرێکی تر لە ساڵی (١٩٩٢) گۆڤاری (پرۆژە)یان دەرکرد، یەکەمین گۆڤاری رەخنەیی بوو، چەند ژمارەیەکی لێ بلاوبووەوە.
- بە هەر سێ زمانی (عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی) کاری

وەرگێرانی کردووە.
- ئەم کتێبانەی بە چاپ گەیاندووە:
- (پاش بوونیادگەری)، تیری ئیگلتون، وەرگێران.
- (شیکردنەوەی دەروونی لە تیۆری ئەدەبیدا)، تیری ئیگلتون، وەرگێران.
- (داهێنان و مەرگ)، کتێبێکی فیکرییە، نووسین.
- (تیۆدۆر ئادۆرنۆ)، نووسین.
- (باسی کۆتاییەکان)، عەلی حەرب، وەرگێران.
- (دەسەڵاتی ئەفسانە)، جۆزیف کامبل، وەرگێران.
- (شیعری کراوە)، کتێبی رەخنەیی، نووسین.
- (مێژووی گریان)، لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیرە لەسەر گریان.
- ئەو کتێبانەی ئامادەن بۆ چاپ:
- (دلنەواییەکانی فەلسەفە)، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە.
- (چیرۆکەکانم).
- (قوربانی دەستی کەسانی ترین)، وەرگێران.

* (سەلاح حەمە ئەمین):-

- ناوی (سەلاح محەمەد ئەمین عەلی کەریم بەرزنجی).
- سالی (١٩٥٨) لە گەرەکی بەگەکان لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- لە سەرەتای هەفتاکاندا لە شاری کەرکوك بەشداری کردووە لە چەند پێشانگایەکی قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی خوێندن.
- سالی ١٩٧٧ بەشداری یەکەمین پێشانگەی هاوبەشی کردووە، (پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوك) بووە.
- سالی (١٩٨٥) یەکەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە (هۆلی التامیم) لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی ١٩٨١ (تەقەنیاتی فۆتۆگرافی) بە کارهێناوە لە بواری هونەری شێوەکاریدا.
- سالی (١٩٨٦) لەگەل (١٠) لە هونەرمەندانی شاری کەرکوك پێشانگایەکی هاوبەشیان کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٢) لە دەرەوەی کەرکوك بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەش.

- سالانی (٢٠٠٠-٢٠٠١)دا بەشداری کردووە لەکارە هێلکارییەکانی چەند دیوانە شیعرێك و کۆمەلە چیرۆکێکی مامۆستایان (محەمەد سابیر، عەباس عەسکەر، بەکر دەروێش).
- شیعر بەزمانەکانی کوردی و عەرەبی دەنووسێ و چەندین شیعری لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردی و عەرەبییەکاندا

بلاوکردووەتەوە.
- لە کۆتایی سالی (٢٠٠٧) تا سالی (٢٠١١) (سەرۆکی لیژنەی هونەری شاری کەرکوك) بووە.
- کتێبێکی هەیە بەناونیشانی (راستکردنەوەی مێژووی هونەری شێوەکاری لەشاری کەرکوکدا)، سالی (٢٠٠٨).
* سالی (٢٠١١)دا رۆلی یەکێك لە کارەکتەرە سەرەکییەکانی زنجیرە درامای ( کەرکوك 4)ی بینی کە لە دەرهێنانی هونەرمەند (ناسر حەسەن) بووە.
* تاوەکو ئەمرۆ چەندین بابەتی هونەری لە بواری هونەری شێوەکاری و شانۆدا بە زمانی کوردی و عەرەبی لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بلاوکردووەتەوەو ماوەی پتر لە (٤) چوار سال پەیامنێری گۆڤاری (شاکار) بووە لە شاری کەرکوك، هەروەها چەند بابەتێکی هونەری لە رۆژنامە عەرەبییەکانی دەرەوەی عێراقدا بلاوکردووەتەوە.
- سالی (١٩٧٧) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوك لە هۆلی (مديرية الثقافة الجماهيرية) کردووە.
- سالی (١٩٧٨) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوك لە هۆلی (مديرية الثقافة الجماهيرية) کردووە.
- سالی (١٩٧٩) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوك لە هۆلی (مديرية الثقافة الجماهيرية) کردووە.
- سالی (١٩٨٠) بەشداری لە پێشانگەی سالانەی هونەرمەندانی کەرکوك لە هۆلی (مديرية الثقافة الجماهيرية) کردووە
- سالی (١٩٨١) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوك لە هۆلی (مديرية الثقافة الجماهيرية) کردووە.
- سالی (١٩٨٣) بەشداری لە پێشانگەی سالانەی

هونەرمەندانی کەرکوک لە هۆڵی (مديرية الثقافة الجماهيرية) کردووە.
– ساڵی (١٩٨٤) بەشداری لە پێشانگەی ساڵانەی هونەرمەندانی کەرکوک لە هۆڵی (مديرية الثقافة الجماهيرية) کردووە.
– ساڵی (١٩٨٥) یەکەم پێشانگەی تایبەتی خۆی لە هۆڵی (التأميم للفن الحديث) کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٨٦) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوک لەگەڵ (١١ هونەرمەند) لە هۆڵی (التأميم للفن الحديث) کردووە.
– ساڵی (١٩٨٨) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوک لە هۆڵی (التأميم للفن الحديث) کردووە.
– ساڵی (١٩٨٩) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوک لە هۆڵی (التأميم للفن الحديث) کردووە.
– ساڵی (١٩٩٢) بەشداری لە فیستیڤاڵی یەکەمی هەڵەبجەی شەهید کردووە.
– ساڵی (١٩٩٣) بەشداری لە فیستیڤاڵی دووەمی هەڵەبجەی شەهید کردووە.
– ساڵی (١٩٩٤) بەشداری لە فیستیڤاڵی سێ یەمی هەڵەبجەی شەهید کردووە.
– ساڵی (١٩٩٦) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوک لە (متحف الصمود) کردووە.
– ساڵی (١٩٩٨) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوک لە (نقابه الفنانين / کەرکوک) کردووە.
– ساڵی (٢٠٠١) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوک لە (نقابه الفنانين / کەرکوک) کردووە.
– ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوک لە (نقابه الفنانين / کەرکوک) کردووە.
– ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری لە فیستیڤاڵی ئازادی (شێوەکاری ومۆزیک) لە هۆڵی (چالاکی قوتابخانەکان) کردووە
– ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری لە یەکەمین پێشانگەی هاوبەش بۆ شێوەکارانی کەرکوک لە سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان لقی کەرکوک کردووە.
– ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری لە پێشانگەی هونەرمەندانی کەرکوک لە دووەم ساڵی ڕزگاریدا لە هۆڵی ناوەندی کەرکوک یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان کردووە.
– ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری لە دووەمین فیستیڤاڵی شێوەکاری کوردستان (کەکوک / سلێمانی / هەولیر / دهوک) کردووە.
– ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری لە پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوک لە سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان لقی کەرکوک کردووە.
– ساڵی (٢٠٠٨) بەشداری لە یەکەمین پێشانگەی باوەگرکر بۆ شێوەکارانی کەرکوک لە ڕیکخراوی هونەرمەندانی کوردستان ناوەندی کەرکوک کردووە.
– ساڵی (٢٠٠٨) بەشداری لە فیستیڤاڵی هەفتەی ڕۆشنبیری ڕۆنیا / پێشانگەی هاوبەشی شێوەکارانی کەرکوک لە سەنتەری ڕۆنیا کردووە.

*** سەلاح داودە :-**

– (سەلاح محەمەد خدر بارام چاوەش) کە بە (سەلاح داودە) ناوبانگی دەرکردووە.
– لە تەمەنی (١٢) ساڵییەوە شەیدای گۆرانی کوردی بووە.
– هەروەها شارەزایی هەیە لە مەقامی: ئەڵلاوەیسی، قەتار، خاوکەر، خورشیدی، نای نای، هەمایۆن، سەبا، حوسێن، خەنابات، حیجاز، ئورفە، ڕەست، دەشت.
– هەر لە منداڵییەوە لە باوکی محەمەد (١٩١٣–١٩٨٠) و باپیرەی بارام چاوش (١٨٥٠–١٩٢٠) گۆرانیو مەقام فێربووە.
– ساڵی (١٩٥٧)وە بۆ یەکەم جار مەقامی خورشید وگۆرانی (نایلۆن برا نایلۆنە) تۆمار کرد.
– ساڵی (١٩٦٦) گۆرانی (کوێستانان خاڵ خاڵ)و (ڕێبوارو ڕێبوار) لە تەلەفزیۆنی کەرکوک تۆمار کردووە، لە ساڵی (١٩٨٦) یش مەقامی ئەڵلاوەیسی و بەستەی (ئامینێم) تۆمار کردووە.
– لە (٨)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٩) لە کاتی ئاهەنگی ساڵی یادی عەلی مەردان کۆچی دوایی کرد.

*** سەلاح شاکیر بیرەقدار:-**

– ساڵی ١٩٥٨ لە کەرکوک لەدایکبووە.
– بەرهەمەکانی:-
– ادلة وقواعد النظريات الموسيقية، ٢٠٠٥
– کرکوک موطن المقام العراقي الأصيل، ٢٠١١
– نوتلی کرکوک بستلری، ٢٠١٣

*** ( سەلاح شوان ):-**

- ناوی (سەلاحەدین کوری ئەحمەد خورشید)ە.
- سالی (١٩٤٧) لە دێی (مام رەش)ی ناوچەی (شوان) لەدایکبووە.
- سالی (١٩٧٢) بەشی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدای تەواو کردووە.
- لە ناوەراستی شەستەکانەوە دەستی بەشیعر نووسینی کردووە.
- یەکێك بووە لە دەستە نوێخوازەکەی ئەدەبی کوردی کە بەناوە (روانگە)وە ناسرا.
- سالی (١٩٧٠)ەوە لەکاری رۆژنامە گەری کاری کردووە لە رۆژنامەی هاوکاری و گۆڤاری بەیان وروانگەو برایەتی و رۆشنبیری نوێ.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (دلدارەکەم پایزە گەوالەیەك نییە)، ١٩٧٨.
- (ئەستێرە بەرزە)، کۆ چیرۆك، ٢٠١٢.
- ( شەوێك لە شەوانی سیمرخ)، کۆ شیعر، ٢٠١٣.

*** ( سەلاح شوکر عەلی ):-**

- یەکێکە لە رۆژنامەنووسەکانی خورماتوو، دەورێکی بالای بینیوە لە دەرکردنی گۆڤاری (کۆژین)و (هەنجیرە)و رۆژنامەی (خورماتوو) بە زمانی عەرەبی، ماوەیەك جێگری سەرنووسەری گۆڤاری (هەنجیرە)یە.

*** ( سەلاح شێخلەر ):-**

- سالی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای سالانی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆلی تەئمیم بۆ هونەری نوێ.

*** سەلاح عەباس زەمۆ:-**

- ناوی سەباح عەلی رۆستەمە.
- سالی ١٩٧٣ لە گوندی شۆراوی سەر بە ناحیەی نەوجوولی ناوچەی داوودە لەدایکبووە.
- سالی ١٩٨٧ پەیوەندی بە ریزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە کردووە.
- سالی ١٩٩٠ بووەتە پێشمەرگە.
- لە هەلسووراندنی ئیشوکارەکانی ناو شار رۆلێکی بەرچاوی هەبووە.
- لە ٩ی ئاداری سالی ١٩٩١ لە شەری ناسراو بە شەری قاتعەکەی خورماتوو شەهید دەبێت.

*** ( سەلاح فایق ):-**

- سالی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە قۆناغی ئامادەییەوە قوتابخانەی بە جێهێشتووە.
- لە دوای کودەتاکەی سالی (١٩٦٣) هەلدێ بۆ شاخ و دەبێتە پێشمەرگە.
- سالی (١٩٦٤) دەگەرێتەوە بۆ کەرکوك و دەبێتە سەرباز.
- سالی (١٩٧٦)ەوە لە بواری رۆژنامەگەری عەرەبی لە لەندەن کاری کردووە، پاش ئەوەی لە سووریاوە دەچێتە بەریتانیا و ئینجا بۆ فیلیپین.
- چاپکراوەکانی:
- (رهائن)، دیوانێکی شیعری، دیمەشق، ١٩٧٥.
- (تلك البلاد)، دیوانێکی شیعری، لەندەن، ١٩٧٨.
- (Another fire befittingacity)، دیوانێکی شیعری، لەندەن، ١٩٧٩.
- (طريق إلى البحر)، دیوانێکی شیعری، پاریس، ١٩٨٣.
- (مقاطعات واحلام)، دیوانێکی شیعری، لەندەن، ١٩٨٤.
- (The lodem the word)، شیعر بە زمانی ئینگلیزی، لەندەن، ١٩٨٥.
- (رحيل)، دیوانێکی شیعری، چاپی یەکەم، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، لەندەن، ١٩٨٧.
- (اعوام)، دیوانێکی شیعری، ئەلمانیا، ١٩٩٣.

* (سەلاح محەمەد میرزا):-

- ساڵی (١٩٥٦)دا لەشاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٠)دا پەیمانگای تەندروستی لەبەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٣) بەشداری پێشانگای یەکەمی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.
- ساڵی (١٩٨٥)دا ڕووی لە تاراوگە کردووەو لە شاری (ڤیستارۆس) لە وڵاتی سوید نیشتەجێ بووە.
- لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٥)دا یەکەم پێشانگەی تایبەتی خۆی لە شاری (هان فۆش) لە وڵاتی سوید کردووەتەوە.
- لە بەهاری ساڵی (١٩٨٦)دا دووەم پێشانگەی تایبەتی خۆی لە کتێبخانەی گشتی شارۆچکەی (مۆرگن گۆڤا) کردووەتەوە.
- بۆ ماوەی (١٧) ساڵ کارمەند بووە لە نەخۆشخانەی شاری (ڤیستارۆس)و لەو ماوەیەدا هەموو ساڵێك لە ئاهەنگەکانی سەری ساڵدا پێشانگەی تایبەتی خۆی لە هۆڵی نمایشکردنی ئەو نەخۆشخانەیەدا کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٤)دا پێشانگەی تایبەتی لە شاری (سانا) کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٦)دا لەگەڵ دوو هونەرمەندا پێشانگەیەکی هاوبەشیان لە شاری (ڤیستارۆس) کردوتەوە.

* سەلاح محەمەد شاکەلی:-

- ناوی (سەلاح محەمەد سلێمان مەحموود سەعید شاکەلی) یە.
- ساڵی ١٩٥٧ لە شاکەل لەدایکبووە.
- سێی ناوەندی لە کفری تەواو کردووە.
- لەنێوان ساڵانی ١٩٧٦-١٩٧٧ لەبەر کاری سیاسی لە کەربەلا بەند کراوە.
- بەرهەمەکانی:-
- چیرۆکێك لە دەشتاییەکی ئەفریقاوە، ئامادەیە بۆ چاپ.
- ماندێلا، سەرەتایەك بۆ ناسینی، ئامادەیە بۆ چاپ.
- گەلێك بەرهەمی جۆراوجۆری نووسیوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی وەکو:- کوردستانی نوێ، هەرێم، جەماوەر، خەبات، هەواڵ، ڕێبازی ئازادی، ئاڵای ئازادی، هەولێر، گەلاوێژی نوێ، مامۆستای کورد، بانەڕۆژ، سۆشیالیست، هەفتانە.
- ئەندامی کۆمەڵەی کەلەپووری کوردە.

* (سەلاح نەورەس):-

- ساڵی (١٩٤١) لە موسەڵلا لەدایکبووە.
- گەلێك بەرهەمی شیعرو شانۆی هەیە، لەوانە:
- (ایناده زمان) دیوانێکی شیعری بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الجمهورية)، کەرکوك، ١٩٧٢.
- (اوزاقدان) لییورم)، بە تورکی، بەغدا، ١٩٨٠.
- (اوزاقدان شعرلری)، شیعر، وەرگێڕان، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا، ١٩٨٦.
- (لوح یرلی بیەس)، شانۆ بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة) بەغدا، ١٩٨٧.
- (پنجەرە)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة) بەغدا، ١٩٨٩.
- Vatan Bende yasiyor، 2011
- Aynada zaman، 2012
- Uzaktan Geliyorum، 2012
- Pencere، شیعر 2012

* (سەلاحەددین سدیق هورمزی):-

- ساڵی (١٩٣٧) لە دێی ترکەڵان لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە.
- بایەخی داوە بە بواری شیعرو وەرگێڕان، لەنێوانی ئەدەبی تورکی ئینگلیزیداو لە شەستەکانی سەدەی ڕابردودا دوو کتێبی بە چاپ گەیاندووە.
- بەرهەمەکانی:
- (دماء بريئة)، چاپخانەی (دار الزمان) بەغدا، ١٩٦٣.
- (عمالقة الشعر التركي)، شیعری وەرگێڕاو لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، چاپخانەی (الشمال)، کەرکوك، ١٩٦٤.

* (سەلاحەددین شێرزاد):-

- ساڵی ١٩٤٨ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە قوتابییەکانی خۆشنووسی مامۆستا (هاشم ئەلبەغدادی).
- خوێندنی سەرەتایی لە کەرکوكو زانکۆی لە بەغدا تەواو کردووە.
- دەستێکی باڵای هەیە لە خۆشنووسی جۆری (الرقعة)و (فارسی).
- لە دوایی ساڵی (١٩٦٥)ەوە چووەتە فەرەنسا بۆ بەردەوامی بە خوێندن لەو بوارەدا.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٧- ١٩٧٣) خوێندنی خۆشنووسی خوێندووە لە لای مامۆستا (هاشم ئەلبەغدادی).

– ماوەیەك چووەتە ئەستەمبول بۆ تەواوکردنی خوێندنی بالاو چاوی کەوتوە بە (حامد ئامێدی).
– سالی (١٩٨٦) بۆ بەردەوامی لە خوێندنی بالا چووەتە دەولەتی ئیماراتی عەرەبی و دکتۆرای لە هونەری ئیسلامی بەدەستهێناوە بە ناونیشانی (تطور فن الخط في العصر العثماني).
– سالی (١٩٩٧)دا بروانامەی (سفیر الخط العربي) پێ بەخشراوە لەلایەن دەمەزرێنەرانی کۆمەلەی خۆشنووسانی عێراق.
– سالی (٢٠٠٤)دا (ویسامی) تایبەتمەندی پێ بەخشراوە لەلایەن ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق.
– بەشداری کردووە لەم پێشبرکێیە نێودەولەتییانە:
– پێشبرکێی نێودەولەتی بە ناوی خۆشنووس (حامد ئامێدی).
– پێشبرکێی نێودەولەتی سێیەم بە ناوی خۆشنووس (ابن البواب).
– پێشبرکێی نێودەولەتی پێنجەم بە ناوی خۆشنووس (سەید ئیبراهیم).

* (سەلاحەددین ساقی وەلی):-

– سالی ١٩٣٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– سالی ١٩٥٩-١٩٨٢ لە بواری پەروەردەدا کاری کردووە.
– بەرهەمەکانی:-
– تأریخ الصحافة في العراق، بە هاوبەشی لەگەل محەمەد خورشید.
– دلیل المطبوعات الکرکوکیة.
– لە ٢٠تشرینی یەکەمی سالی ١٩٨٥ کۆچی دوایی کردووە

* (سەلاحەددین شوکر جەروو):-

– بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
– اقداح عرق السوس في تأریخ ارض الطوز، ٢٠١٢

* (سەلاحەددین عەبدولحەمید عەبدوللا):-

– سالی (١٩٥٤) لە کفری لەدایکبووە.
– خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کفری تەواو کردووە.
– سالی خوێندنی (١٩٧٧-١٩٧٨) کۆلێژی ئادابی، بەشی کوردی زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
– سالی (١٩٧٢)ەوە دەستی کردووە بە نووسین.
– بەرهەمە بلاوکراوەکانی بریتیە لە:
– (دیاری مندالان)، شیعر بۆ مندالان، ١٩٩٦.
– (سۆزی گەرمیان)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.
– (مامۆستای پارتیزان شەهید خالید گەرمیانی)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
– (سۆزی گەرمیان)، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.
– (شاری کفری لە تەرازووی رەسەنایەتی و شارستانییەتدا)، ٢٠٠٩.
– چەند بەرهەمێکی مێژوویی و کەلتووری و ئەدەبی تری ئامادەن بۆ چاپ.

* (سەلاحەددین ناجی ئۆغلو):-

– سالی (١٩٤٥) لە خورماتوو لەدایکبووە.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (طوزدان سسلر)، چاپخانەی (جمهوری)، کەرکوك، ١٩٧٢.
– (غلام یابا یا سلام)، داستان بە زمانی تورکی، بەغدا، ١٩٩٣.
– طوز خورماتوو قدیماً وحدیثاً، ٢٠٠٥
– طوز خورماتوو، ٢٠٠٩
– طوز خورماتوو، ٢٠١٠
– ئاقسودان سسلر، ٢٠٠٥
– محبة قایناغي، ٢٠٠٥
– بوضك، ٢٠٠٨
– غملر کارواني، ٢٠١٠
– نزهة في قرى البیات، ٢٠٠٩
– (اسماء الساکنین الأوائل في طوز قبل ١٩١٤-١٩١٨، ٢٠١٠

* (سەلامی ترێ خۆر - مەلا سەلامی ترێ خۆر):-

– یەکێکە بووە لە پیاوە گەورەکانی بزووتنەوەی (حەقە) لە ناوچەی شواندا لە سەردەمی خۆیدا دەورێکی بالای هەبوو لەو بزووتنەوەیە.
– لە گەرەکی ئیمام قاسم دادەنیشت، پیاوێکی وریاو ئاقل و زانا بوو، گەلێك شیعری فارسی و عەرەبی و کوردی لەبەر بوو.

* (سەلام جاسم):-

– سالی (١٩٥٦)دا لەکەرکوك لەدایکبووە.
– بەشی ئینگلیزی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدای تەواو کردووە.
– سالی (١٩٨٣) بەشداری یەکەم پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆلی مۆزەخانەی سلێمانی.

* (سەلام محەمەد):-

– ناوی (عەبدولسەلام محەمەد ئەمین)ە.
– لە (٢١)ی تەمموزی سالی (١٩٥٤) لە گوندی (کارێزەی خالخالان) سەر بە ناوچەی (شوان) لەدایکبووە.

- خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی لە شاری کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی (١٩٧٠)ەوە دەستی بە نووسینی شیعر کردووەو جێپەنجەی دیارە لە بواری نوێکەری لە شیعری کوردیدا لە کەرکوك.
- سالی (١٩٧٨) خوێندنی بروانامەی بەکالۆریۆسی لە بەشی یاسا لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- بێجگە لە شیعر نووسین کاری رۆژنامەگەریشی کردووە لە رۆژنامەی (برایەتی)و (هاوکاری)، هەروەها لە رادیۆی کوردی بەغدا سەرپەرشتی پرۆگرامێکی رۆشنبیری کردووە بە ناوی (کاروانی رۆشنبیری) لەگەل (سەلاح شوان)و (محەمەد موکری) پێکەوە ئامادەو پێشکەشیان کردووە.
- لە کۆتایی سالی (١٩٩١)ەوە نیشتەجێی ولاتی سویدە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (هەلۆ سوورەکانی قەندیل)، کۆمەلە شیعر، دەزگای چاپ‌و بلاوکردنەوەی (ی.ن.ك.)، ١٩٨١.
- (پرد)، کۆمەلە چیرۆك، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٦.
- (دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە)، شیعر، بەغدا، ١٩٨٨.
- (دیوانی سەلام محەمەد)، ٢٠٠٩.

*** (سەلام محەمەد ئەمین گۆگجەیی - مەلا سەلام محەمەد ئەمین گۆگجەیی):-**

- یەکێکە لە مامۆستاکانی بواری شەریعەت‌و دەرچووی کۆلیژی شەریعەتە لە بەغدا.
- سالی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

*** (سەلمان فایق کاکەیی):-**

- سالی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٦٩) دەرچووی بەشی شانۆی پەیمانگای هونەرە

جوانەکانە لە بەغدا.
- دکتۆرای لە سینەما بەدەستهێناوە لە رۆما.
- یەکێکە لە دەرهێنەرە تەلەفزیۆنییەکانی شاری کەرکوك‌و خەلکی گەرەکی (چای)یەو ئێستا لە ئەلمانیا دەژێت‌و چەندین فیلمی کوردی دەرهێناوە وەکو (ژالە، مەرەزە، تەقینەوە).
- گەلێك بەرهەمی شانۆیی دەرهێناوە، وەکو: (ئەنتیکۆنا، تاجر البندقية، تەقینەوە، کاوەی ئاسنگەر).

*** (سەلیمە ئەحمەد کەرکوکی-کەرکوك قیزی):-**

- ناوی (سەلیمە ئەحمەد)ە.
- سالی (١٩٢٨) لە گەرەکی ئاوچی شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- گەلێك گۆرانی بە زمانی تورکمانی ووتوە، یەکەم بەشداری لە سالی (١٩٦٠)دا بەشداری فیستیڤالی (الهلال الأحمر) کردووە لە کەرکوك‌و بە سەرپەرشتی هونەرمەندی گەورە عەبدولواحید گۆزەچی‌و مۆسیقار جەمیل بەشیر.
- گەلێك مەقام‌و خۆریات‌و بەستەی هێمن‌و لەسەر خۆی

وتووە کە گەلێك جەماوەری هەبووە لەو سەردەمەدا.
- گەلێك گۆرانی جۆراوجۆری هەیە کە نزیکەی (٥٠) گۆرانی دەبێت لە بەشی تورکمانی ئێستگەی ڕادیۆی بەغدا تۆمار کراوە.
- لە (١٦)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٨) بەنەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

* ( سەلیم سێون کەرکوکی ):-

- یەکێك بووە لە ئەندامانی (فرقە إخوان الفن) کە لە حەوت ئەندام پێکهاتبوون لە بەغدا کاریان کردووە، کە زۆربەیان لە جوولەکەکانی عێراق بوونە، سەلیمیش جوولەکەیەکی خەڵکی کەرکوك بووە و لە بواری مۆسیقادا دەستێکی باڵای هەبووە.
- بەشداری لە گەلێك لە ئاهەنگەکاندا کردووە لە ئێستگە و دەرەوەی ئێستگەی بەغدا.

* ( سەمیر حوسێن کەهیە ئۆغلوو ):-

- ساڵی ١٩٦٤ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- مخاض نهر الجوع، شیعر، ٢٠١١
- سەسیز دونوش، شیعر، ٢٠٠٩
- کونول هایقیریشی، شیعر.
- یاشام، شیعر.
- لیلام، شیعر.
- غریب کربلاء.
- قمر بني هاشم، شیعر.
- نزیف عذراء القلب، شیعر.

* ( سەمیر خورانی - دکتۆر سەمیر خورانی ):-

- ساڵی (١٩٦٩)، لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (حفنة من ثلوج الجبل)، شیعر، ٢٠٠٦.
- (الرحیل عبر المدارات)، شیعر، هەولێر، ٢٠٠٣.

* ( سەمیرە سالح عەلی ):-

- ساڵی (١٩٦٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٥) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی بەشی پەیکەرسازی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨١) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی لە هۆڵی پەیمانگا.
- ساڵی (١٩٨٢) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی لە هۆڵی پەیمانگا.
- ساڵی (١٩٨٣) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی لە هۆڵی پەیمانگا.
- ساڵی (١٩٨٤) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی لە هۆڵی پەیمانگا.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی لە هۆڵی پەیمانگا.
- ساڵی (١٩٨٧) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی پەیکەرتاشی لەگەڵ موزەفەر حەمید لە هۆڵی گازینۆ نەسر.
- ساڵی (١٩٨٩) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەش لەگەڵ شەش هونەرمەند لە هۆڵی چالاکی قوتابخانەکان لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی هونەمەندانی چەمچەماڵ لە هۆڵی کۆمیتەی ڕێکخستنی (ی. ن. ك.) لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی چەمچەماڵ لە قوتابخانەی ئەختەر.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی مامۆستایانی هونەرمەند لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠١) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەش لەگەڵ هونەرمەند (سامی سەعدوڵڵا) لە کۆمەڵەی هونەرەجوانەکانی چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠١) بەشداری کردووە لە پێشانگای سێیەم فیستیڤاڵی هونەری چەمچەماڵ لەمەڵبەندی ڕۆشنبیری لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠١) بەشداری لە پێشانگای هاوبەشی فیستیڤاڵی هونەری کەرکوکی کردووە لە کەلار.
- ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی یادی کارەساتی ئەنفال لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی مامۆستایانی هونەر لە هۆڵی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لە کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری کردووە لە فیستیڤاڵی شێوەکاری و گۆرانی و میوزیك لە هۆڵی چالاکی قوتابخانەکان لە کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی مامۆستایانی هونەر لە هۆڵی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لە کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری کردووە لە یەکەمین فیستیڤاڵ هونەری گەرمیان لە خانەقین.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری کردووە لە چرکەساتێك لە یادی کارەساتی ئەنفال لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی کۆمەڵەی هونەری دیجلە لە قشڵەی لە کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری کردووە لە حەوتەمین پێشانگای کۆمەڵەی شێوەکارانی سەربەست لە گەلەری بابان لە سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری کردووە لە چوارەمین فیستیڤاڵ هونەری چەمچەماڵ لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی شێوەکارانی چەمچەماڵ لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری کردووە لە دەیەمین فیستیڤاڵی هونەری کەرکوك لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی شێوەکارانی چەمچەماڵ لە هۆڵی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری کردووە نە دووەم فیستیڤاڵی هونەری لە مەخمور.

* ( سەمین ئەمین - حاجی سەمین ئەمین کچانی ):-

- ئەم شۆڕشگێڕە ناوی (سەمین)ە کوڕی (ئەمین)ە کوڕی

(کەریم)ە کوڕی (عەبدولرەحمان)ە کوڕی (یەعقوب)ە کوڕی مەلا وەیسی دێی (کچان)ی سەر بە ناوچەی سەنگاوە.
- ساڵی (١٨٩٠) لە شاری (کفری) لەدایکبووە.
- لە کاتی عوسمانییەکان لە ترس رەشبگیری بەخێزانەوە چوونەتە دێی (برایم خان) کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری کفرییەوە.
- ئەمینی باوکی لەوێ خێزانی دووەم مارە دەکات کە ناوی (ئایش) دەبێ و ئامۆزای ئیبراهیم خانە لەگەڵ ئەو بنەماڵەیەدا تێکەڵاوییەکی بەهێزیان دەبێت.
- چەندەها جار لەگەڵ ئیبراهیم خاندا چووە بۆ ناوچەی (کرف)ی ئێران، جارێکی لەگەڵ کۆمەڵێ جەردەو رێگردا رووبەڕوو بوونەتەوەو بەسووکی بریندار‌دەبێت.
- کاتێ ئیبراهیم خان هێرش دەباتە سەر شاری کفری لە (٢٢)ی ئابی ساڵی (١٩٢٠) (سەمین کچانی) چەکدار دەبێت‌و تەمەنی سی سالیك دەبێت، (پاشای فەدعەمیش) سەر بە هۆزی دەلۆیە یەکێك بووە لە چەکدارەکانی برایم خان زۆریش رەفیقی حاجی سەمین بووە.
- ئەم دوو چەکدارە وویستویانە هێرش بەرن بۆ سەر مەتریلۆزەکەی ئینگلیزەکان (برایم خان) قایل نەبووە لەبەر ئەوەی سەمین تەنها کوڕی باوکی بووە، جێگای مەتریلۆزەکەش بەسەرلووتکەی چیای (قەرەئۆغلان)ەوە بووە زۆر جێگایەکی سەختە.
- سەمین کچانی وەك ئەو خەڵکە بەرلێبوردنی گشتی کەوت و گەڕایەوە بۆ کفری لەگەڵ (شاسوا کچانی) خالیدا دەستی کرد بە بازرگانێتی و زۆر دەولەمەندبوو، خاوەن دیوەخانێکی گەورەو میوانێکی بەردەوام بوو.
زۆرتر تێکەڵاوی لەگەڵ بەگزادەکانی جافدا هەبوو بەتایبەتی (کەریم بەگ)و (داود بەگی ئەورەحمان بەگ) هەروەها لەگەڵ عەشیرەتی زەنگەنەشدا بەتایبەتی، (رۆستەم ئاغا)و (عەبدولکەریم ئاغا)و (کویخا نایف کویخا سالم)و (بەرلوتا).
- لەو سەردەمەدا لایەنگری حیزبی هیوا بووە، پاش مردنی سەنوقێکی بچووکی هەبوو کردوویانەتەوە چەند پسوولەو پیتاکی حیزبی هیوامان دۆزییەوە.
- تورکییەکی چاکی دەزانی‌و خوێندەوارییەکی باشی هەبوو.
- سێ خێزانی هەبوو یەکەمیان لەتورکمانەکانی شاری کفری بوو، دووەمیان کچانی خزمی خۆی بوو، سێیەمیان جاف بوو خەڵکی دێی (گۆڕ شەلە).
- ساڵی (١٩٥٤) حەجی ماڵی خوای کردووە.
- ساڵی (١٩٥٦)دا لە شاری کفرییەوە لەگەڵ چەندخزمێکیدا چەند سوارێك دەچن بۆ دێی کچانی بۆ سەردانی (کویخا سالح) پاش چەند رۆژێك لە راوو شکارەو گەڕانی ئەو خزمانە، شەوێك تووشی ژانێکی کوتوپڕ دەبێت دەمرێت.
- لە بەهاری ساڵی (١٩٥٦) دا تەرمەکەی دەگێڕنەوە بۆ گۆڕستانی (باوە شاسواری) کفری.

* ( سەنا جاسم ):-

- ساڵی (١٩٨٥) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵێ (ئەلتەئمیم بۆ هونەری نوێ) کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندان کردووە لە هۆڵی (ئەلتەئمیم بۆ هونەری نوێ).

* ( سەی سایەقە شێت - سادق خدر مەحموود ):-

- ناوی (سادق کوڕی سەید خدر کوڕی سەید مەحموود کوڕی سەید محەمەد)ە.
- خەڵکی دێی (چەم سوورخاوو)ە.
- ساڵی (١٩٢١) لە دێی (عەلی مستەفا) لەدایکبووە.
- شیعری بە زمانەکانی کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی هەبووە. بەڵام شیعرەکانی زۆربەی فەوتاوە.

* ( سەی وەڵەد ئەفەندی ):-

- ساڵی (١٨٥٣)ی زایینیی لەدایکبووە.
- لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو لە پاشا رۆیشتووەتە کفری‌و لەلای زانایانی ئایینییدا خەریکی فێربوونی رێزمانی عەرەبی‌و شەریعەتی ئیسلام‌و وێژەی فارسی‌و عەرەبی بووەو لە پاشا گەڕاوەتەوە زێدو مەلبەندەکەی خۆی‌و لە پاش ماوەیەك چووە ناو لەشکرو بووە ئەفسەرو ئەوسا گەڕایەوە زێدەکەی‌و خەریکی وەرزێڕی‌و ماڵاتداری بوو.
- لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا دەستێکی بەرزو باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ ناسك‌و تەڕو پاراوو شیرینن‌و زۆربەی لە کەشکۆڵ‌و بەیازەکاندا تۆمار کراوە.
- ساڵی (١٩١٨)ی زایینیی کۆچی دوای کردووەو لە گۆڕستانی ئیمام ئەحمەد نێژراوە.

* سەید محەمەد ئاغا:-

- ساڵی (١٨١٦)پێش دەست بەکاربوونی وەك والی بەغدا، (داود پاشا) سەردانی کەرکوك دەکات ولەگەڵ کەسایەتییە ناودارەکانی کەرکوك کۆدەبێتەوە، لە کۆبوونەوەکەدا، کەسایەتی سەید محەمەد بۆ داود پاشا دەردەکەوێت، بۆیە داوا لە (سەید محەمەد) دەکات یاوەری بێت بۆ بەغدا، داود پاشا لە جێگەی سەعید پاشا دەبێتە والی بەغداو یەکێك لەوانەی پشتی پێ دەبەستێت (سەید محەمەد)ە نازناوی (سەید محەمەد ئاغای) پێدەبەخشێت.
- عەلی وەردی لە کتێبەکانی (لمحات إجتماعية في تاريخ العراق الحديث).
- باسی (سەید محەمەد ئاغا) دەکات کەچ رۆڵێکی هەبووە لە گێڕانەوەی ئاسایش‌و ئارامی لە ناوچەکانی (دلێم)و خوارووی عێراق.
- دوای بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعون بەشێوەیەکی فراوان، سەید محەمەد ئاغا ساڵی (١٨٣٢) دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوك‌و داود پاشا لە چوارچێوەی سنووری (خاسە تیماریدا) لە کەرکوك (١٥) گوند دەبەخشێتە (سەید محەمەد ئاغا).

* ( سەید محەمەدی پیریادی - مەلا سەید محەمەدی پیریادی ):-

- ناوی مەلا سەید محەمەدی کوڕی مەلا عەزیزی پیریادییە.
- ساڵی (١٨٨٩) لە گوندی (پیریادی) چەمچەماڵ لە دایکبووە.
- سەرەتا لای باوکی دەستی بە خوێندن کردووە، پاشان بۆ

تەواوکردنی پلەکانی تری خوێندنی ئایینی رووی لە شاری کەرکوك کردووەو لەلای (مەلا رەزای واعین ئیجازەی زانستی وەرگرتووە.
- پاش تەواوکردنی خوێندن لە جێی باوکی بووەتە مەلای گوندەکەی خۆی (گوندی پیریادی)، دواتر گواستیویەتیەوە گوندی (عەلی مەنسوور).
- لە کۆتایی سییەکانیشدا بە پلەی پێش نوێژی سەربازی (ئیمام تابور) لە سوپای عێراقدا دامەزراوە، سەرەتا لە بەغداو لە دوایدا لە:- سەماوە، دیوانییە، کەرکوك، موسڵ کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٤٩) کۆچی دوایی کردووە.
- لە پاش خۆی دەسنووسێکی گرنگی خۆی بۆ جێهشتووین بەناوی (پێش کەوتن وەتەن) ئەم دەستنووسەی لە ناوەراستی سییەکاندا لە گوندی (عەلی مەنسوور) نووسیوە کە تەرخانی کردووە بۆ باسی (ئەسڵی قەومی کورد).

* (**سەیران محەمەد ئەمین شوانی**):-
- ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- دیوانی (ئاوێزە).
- (شەوی سەفەر)، ٢٠١٠.

* (**سەیفەددین خەتیب**):-

- شاعیرێکی عەرەبەو لە ساڵی (١٩٢٠) لەدایکبووەو سەرپەرشتی بەشە عەرەبییەکەی رۆژنامەی (کرکوك)ی کردووەو دوو دیوانی شیعری چاپکراوی هەیە.
- ساڵی (١٩٧٢) کۆچی دوایی کردووە لە کەرکوك.

* (**سەید ئەحمەدی فەیلەسوف - مەلا سەید ئەحمەدی فەیلەسوف**):-

- ناوی تەواوی (سەید ئەحمەدی کوری سەید ئەمین کوری سەید محەمەد کوری سەید ئەمین کوری سەید خدر کوری سەید بوان کوری سەید خان عەلی)ە، بە مامۆستا (مەلا سەید محەمەدی فەیلەسوف) ناسراوەو بەناوبانگە، لە بنەماڵەی (شێخ بابا شێخ ئەحمەد باینجوبی کوری سەرپید مەحموود سەبزواری)یە کە بنەرەتییان دەگەرێتەوە بۆ گوندی (باینجوب) لە سەرووی رۆژئاوی شاری (سنە) لە کوردستانی رۆژهەلات.
- ساڵی (١٩١١) لە ناوچەی (جەباری) لە خێزانێکی ئایینی لەدایکبووە.
- خوێندنی ئایینی لەلای (حاجی مەلا عەبدولسەمەدو مەلا ئەحمەدی رۆژبەیانی)و (مەلا عەبدولکەریمی باوایی) خوێندوویەتی.
- بێجگە لە زمانی کوردی زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە.
- دوای تەواوکردنی هەموو برگەکانی خوێندنی شەرعی و دینی و فەلسەفەیی، ئیجازەی وەردەگرێ و دەکرێت بە مودەریس لە پەیمانگای ئیسلامی لە بەسرا، بەڵام لە بەردووری وناڕەحەتی ئەو سەردەمە پێوەندی بەو فەرمانەوە

ناکات ئینجا دەکرێت بە مودەریس لە پەیمانگای ئیسلامی لە (کوبێسە) و زیاتر لە ساڵێك لەوێ دەرس دەڵێتەوە، پاشان رەوانەی ئەوقافی کەرکوك دەکرێت، بەڵام لەبەر هەستی کوردایەتی هەموودەم بەربەرەکانی دەکرێت تاکو واز لە مامۆستایی دەهێنێت و لە ئاوایی زەردك لە ناوچەی سالەیی دەبێت بە مامۆستا و هەمیشە فەقێیەکی زۆری هەبووە ماوەی پانزە ساڵ لەوناوچەیەدا ماوەتەوە وئینجا چووەتە گوندی (مووەفەر)و (چیمەنی گەورە)و (گۆپتەپە).
- ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندی دەکات بە شۆڕشەوە ولە سەردەمی مەلا حەمزەدا دەبێت بە ئەندامی دادگای تەمیزی کوردستان.
- ساڵی (١٩٧٧) گەراوەتەوە بۆ کوردستان و لەناوچەی بازیان نیشتەجێ بووە، پاشان هاتووەتە چەمچەماڵ.
- لە (١٤)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٤) لە دوای نەخۆشیەکی درێژ خایەن لە گۆرستانی (رەحیماوا) بەخاك سپێردراوە.

* (**سەید فاتح - مەلا سەید فاتح**):-

- یەکێکە لە شاعیرە بەناوبانگەکانی کەرکوك کە لە ناوچەی (جەباری) ژیاوە.
- زانیاریمان دەربارەی نییە بەتایبەتی بەرهەمە شیعرییەکانی.

* (**سەید قودرەت مەلا عەباس**):-

- کوری شاعیری بە ناوبانگی کاکەیی (مەلا عەباس حیلمی) یە.
- سەید قودرەت پیاوێکی کەسایەتی ناو کاکەییەو دانیشتووی گوندی تۆپزاوەیە لە داقوق، جوامێرو چاوتێرو خاوەن تەکیەیە.
- لە تەمبوور ژەنیندا ئاشنایی هەیەو دیوانە شیعرێکی ئامادەیە بۆ چاپ.

* (سەید مەحمود-ئەحە عاسم):-

- یەکێکە لەمەقام خوێنە بەناوبانگەکانی شاری کەرکوك.

* (سەیدی شێخ محەمەد):-

- (سەید ئەحمەد کوری محەمەدی کوری شێخ عبدول سەمەد کوری شێخ مستەفای سەید مەحموود)ە.
- سالی (١٨٨٩) لە ئاوایی (بەکرە شەل)ی لەدایکبووە بۆ خوێندنی مەلایەتی باوکی دەنێرێتە لای مەلا باشەکانی کفری، لەوێ لەگەل (سەمین فارس دەلۆ) پێکەوە لە ژوورێکدا دادەنیشن.
- ئەچێتە قوتابخانەی میرییەوە دەگاتە پلەی (روشدیە).
- کە جەنگی یەکەمی جیهانی دەقەومێ دەگیرێت وبەهۆی فەقێتییەوە رزگاری دەبێت و دەگەرێتەوە (بەکرە شەل).
- سالی (١٩١٧) باوکی لە تەمەنی (١١٠) سالیدا کۆچی دوایی دەکات ولە سالی (١٩١٨) دەگەرێتەوە (کفری) وئیتر ناچێتەوە بەرخوێندن تا ئیجازەی عیلمی وەربگرێت و ببێتە (مەلا) بەلکو دوکانێك دەکاتەوەو بازرگانی دەکاتە پیشە.
- سالی (١٩٢١) ژن دەهێنێت و ئیتر لە کفری جێگر دەبێت.
- کوردیو عەرەبیو فارسیو تورکی بەباشی زانیوە خوێندەوارێکی زانا بووە.
- سەرەتای سییەکان دەبێتە (ئەندامی شارەوانی) و چل سال بەو جۆرە دەوام دەکات و چەند جارێکیش دەبێتە ئەندامی ئیداری لەناو پیاو ماقولانی شارو فەرمانبەراندا رێزێکی زۆری هەبوو هەر بە (سەید) بەناوبانگ بووە.
- چوار کوری هەبووە بە ناوەکانی:- (مستەفا ١٩٢٤)، (هاشم ١٩٣٥)، (موکەرەم ١٩٤٢)، (فاتح ١٩٤٤).
- زۆر حەزی لە راوی سوێسکە بووە، بۆ نیوەرۆژە گۆشتی سوێسکی ئەخوارد، لەیەك کاتدا نانی ئەخواردو شەوان دوو سەعات پاش رۆژ ئاوابوون دەنووست و شەو دانیشتنی نەبوو، قەت ئاوێ سەلاجەی نەدەخواردوو زۆر دل و دەروونی زۆر ئاوەدان بوو، هەر کەس بێتو دل گەردی بکردایە وەلامی نەدەدایەوە تا ئەو کەسە ناچار خۆی پەشیمان دەبۆوە.
- هەزاران شیعری فارسی وتورکی و کوردی لەبەربوو بەپێی شوێنی دەیگێرایەوە ولێکی دەدایەوە لەوانە: (سەعدی، حافز مەولەوی، ناری، شێخ رەزا، حاجی قادر)بوو.
- سنوقێکی سەردەمی فەقێیەتی زۆر نایابی هەبوو، پربوو لە وورده پارەو پوولی نمونەی زەمانی عوسمانی و ئینگلیزو وعێراق، سەدان دەست خەت و ئەشعاری تیادابوو، چەند بەلگە نامەیەکی تایبەتی وگشتی لە ناودا، سەعاتێکی دەگمەنی هەبوو تەمەنی لەگەل لەدایکبوونی مندالیدا بوو.
- شاعیر نەبوو بەلام دانە دانە شیعرو رووداوەکانی نووسیوەتەوە.
- تا ئەو رۆژەی کۆچی دوایی کرد، دەچووە سەر دوکان و لە ناو خەلکدا دادەنیشت، پەکی نەکەوتبوو، لە (٢٣)ی شوباتی سالی (١٩٨٥) وەك رۆژانی دیکە نیوەرۆ لە دوکان هاتەوە نیوەرۆژی کردو دەستنوێژی شت هەستا بچێتە مزگەوت نوێژی جەماعەت بکات تاکێك لە گۆرەوییەکانی لە پێکردو ویستی ئەویتریان لەپێ بکات نەیتوانی و گیانی لە دەستدا.
- دانیشتوانی شار بە رێزەوە تەرمەکەیان لە قەبرستانی (باوەشاسوار) بە خاك سپارد.

* سەید محەمەد جەباری - محەمەد جەباری):-

- (سەید محەمەد کوری سەید سەمەد کوری سەید قادر)ە.
- سالی (١٨٧٨)ی زاینیی لە گوندی مەحموود پەریزاد لە ناوچەی جەباری لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی (کۆمەلەی ئازادی کوردستان) کە لە دواییدا ناوەکەی بووە بە (پارتی ئازادی کوردستان).
- سالی (١٩١٥) لەگەل شێخ مەحموود چووەتە شەری (شوعەیبە) لە بەسرە لە دژی ئینگلیزەکان.
- لە (١٣)ی ئاداری سالی (١٩١٩)دا لە یەکەم حکومەتی شێخ مەحموودا بەرێوەبەری ناحییەی (جەبارە) بووە.
- نەخشێکی بەرچاوی لە شەری (٢٥)ی ئایاری سالی (١٩١٩)ی تاسلوجەدا هەبووە.
- لە بەهاری سالی (١٩٢٠)دا بەشداری دەکات لە کۆبوونەوە بەناوبانگەکەی (ژالەی رەبات) لەگەل سەرۆك عەشیرەتەکانی (هەمەوەند)و سنووری (قەرەداغ) کە تێکرا بریار دەدەن دژی ئینگلیزەکان بجەنگن بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر ئازادکردنی (شێخ مەحموود).
- بەشداری شەرەکانی (بانی مەقان)و (چەمی قوشلان)ی کردووە دژی ئینگلیزەکان.
- لە (٣٠)ی ئابی سالی (١٩٣٠)دا یەکێك بووە لەوانەی لە بینای (قشلە)ی کەرکوك یاداشتی داوە بە ئینگلیزەکان بۆ دانانی (شێخ مەحموود) بە مەلیکی کوردستان.
- دوای تێکچونی حکومەتەکەی شێخ مەحموود لە ناوچەکەی خۆیدا ماوەتەوەو شەرێکی قورسی لە نزیك قەرەهەنجیر کردووەو پەلاماری قەرەچێواری داوەو سووتاندویەتی پاشان چووەتە هەورامان و هەشت مانگ لای شێخ ماوەتەوە.
- سالی (١٩٣٦) لە گوندی (جانی) کۆچی دوایی کردووە.

*** (سەید محەمەد سەید فەتاح سەید عەلی):-**

- ناوی سەید محەمەد سەید فەتاح كوڕی سەید عەلییە.
- ساڵی (١٨٧٨) لە دێی تاوێرپەرز لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٥٨) كۆچی دوایی كردووە.
- شاعیرێكی نەخوێندەوارو خاوەن مێشكی خاوێن و بیری تیژو زیرەك بوو.

*** (ستار ئەحمەد شەریف):-**

- ساڵی (١٩٦٨) لە شاری كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٩٢) كۆلێژی ئابووری تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی كەركوكی كردووە.
- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری پێشانگای فێستیڤاڵی زانكۆی سلێمانی كردووە.

*** (ستار ئەحمەد عەبدولڕەحمان):-**

- یەكێكە لەو شاعیرە نوێخوازانەی لە سەرەتای هەشتاكانەوە، دەستی كردووە بە بڵاوكردنەوەی بەرهەمەكانی.
- ساڵی (١٩٦٢) لە شاری كەركوك هاتووەتە دونیاوە.
- ئەم دیوانە شیعرییانەی بەرهەم هێناوە:-
- (ئاسۆ برینی هەتاوە)، نامیلكە شیعر، سلێمانی، ٢٠٠١.
- (كۆچباری گزنگ)، رۆمانە شیعر، كەركوك، ٢٠٠٣.
- (زریوەی ئەستێرە دەسرازەی زامە)، شیعر، كەركوك، ٢٠٠٥.
- (نیشتمانێك لە هاژەی ئاو)، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (دیوانی ستار ئەحمەد)، ٢٠١٣.
- (ئاوابوونی جەستە لە سەفەری دڵدا)، شیعر.
- (سۆزی شاعیر)، شیعری گۆرانی.
- (گۆرانییەك بۆ چرۆكان)، شیعری منداڵان.
- ماوەیەك یەكێك بووە لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (بانەڕۆژ).
- ١٠ كتێبی دیكەی ئامادەیە بۆ چاپ لە هەموو رۆژنامەو گۆڤارە كوردییەكاندا بەرهەمی بڵاوكردووەتەوە.

*** ستار شێخانی:-**

- (تاوانێ لە قیتاری شیندا)، ئەجاسا كریستی، وەرگێڕان، كەركوك.
- (كورد لە سێبەری خەلافەتی ئیسلامیدا)، ئەرشال بو لاندیان، وەرگێڕان، كەركوك، ٢٠٠٦.
- (كوردستان لە چاخی مەغۆلدا)، عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، وەرگێڕان، لە عەرەبییەوە، ٢٠٠٩.

*** (ستار عەبدوڵڵا بەرزنجی):-**

- ساڵی (١٩٤١) لە گەڕەكی (ئیمام قاسم)ی شاری كەركوك لەدایكبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و خانەی پێگەیاندنی مامۆستایانی بەشی وەرزشی لە كەركوك تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٥٦) لە هەڵبژاردەی (مەعاریف) كە پەروەردەی ئێستایە وەرگیرا تاكو ساڵی (١٩٦٢) بووە سەرۆكی هەڵبژاردەی (مەعاریف) و بەدوایدا لە هەڵبژاردەی كەركوك لە یاری (باڵە)دا یاری كردووە.
- ساڵی (١٩٦٨) لە یانەی سۆلاڤ دامەزرا.
- ساڵی (١٩٧٣) بڕوانامەی راهێنانی بەدەستهێناوە لەلایەن (مستر شندۆ) كە لێزانێكی یابانی بووە.

هەروەها پلەی ناوبژیوانی لە تۆپی پێ و باڵە بەدەستهێناوە.

- ساڵی (١٩٧٣)وە لە دەستەی هەڵبژاردنی یەكێتی لاوان و بەرپرسی وەرزش بووە لە هەمان یەكێتی تاكو ساڵی (١٩٨٢).
- ماوەیەك سەرۆكی یانەی وەرزشی كەرامە بووە.
- ئێستا سەرۆكی یانەی سۆلاڤی نوێیە.
- ئەم بەرهەمانەی هەیە:
- (یاسای تۆپی پێ)، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٦.
- (شێخ محێدینی كەركوك)، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (شێخ حەسەنی گلەزەردی بەرزنجی زاناو داهێنەر)، هەولێر، ٢٠٠٧.

*** (ستاری شێخ محەمەدی كەرەدان - شێخ ستاری شێخ محەمەدی كەرەدان):-**

- مەلای مزگەوتی (نائیب) بووە وزانایەكی بەناوبانگ بووە.
- ماوەیەك دادوەر بووە لە شەقڵاوە.

*** (ستران عەبدوڵڵا محەمەد):-**

- ناوی (ساڵح عەبدوڵڵا)یە.
- ساڵی (١٩٦٩) لە كەركوك لەدایكبووە.
- دوای هەڵایسانی راپەڕینی ساڵی (١٩٩١)و رزگاركردنی كەركوك پەیوەندیی بەڕیزەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانەوە كردو هەر ئەو ساڵە خوێندنی بۆ زانكۆی سەلاحەددینی هەولێر گواستەوە.
- ساڵانی (١٩٩١ - ١٩٩٢) بەرپرسی لقی كۆلێژی كارگێڕیو ئابووریی كۆمەڵەی خوێندكارانی كوردستان بوو.
- ساڵی (١٩٩٣) بڕوانامەی بەكالۆریۆسی ئابووریی لە

زانکۆی سەلاحەددین بەدەستهێنا.
- هەر ئەو ساڵە لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) دامەزراو دەستی بەکاری ڕۆژنامەنووسی کرد. پلە بە پلە لەبەرپرسی لاپەرەوە بۆ ئەندامێتیی دەستەی نووسەران گەشەی کردو پاشان
- ساڵی (١٩٩٧)دا بوو بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەکە. هەر ئەو ساڵە. لە سلێمانی لەگەڵ هەر یەك لە فەرید ئەسەسەردو سۆران داوودیو ڕەفعەت محەمەد یاسینو نزار خەسرەو بەشدار بوو لە پرۆژەی دەرکردنی گۆڤاری (تایم) کە هەوڵ درا پانتاییەکی فراوانتری ئازادیی تێدا دەستەبەر بکرێو کەمتر پابەند بێ بەسیاسەتە فەرمییەکان.
- ساڵی (١٩٩٩) بووە جێگری سەرنووسەری ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) هەر ئەو ساڵە بووە ئەندامی مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانو ماوەیەکیش بەوەکالەت سەرنووسەری ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)بوو.
- ساڵی (٢٠٠١) وەك ڕاوێژکاری ڕاگەیاندنی سەرۆکی ئیدارەی سلێمانیی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەستبەکار بوو. پاشان بووە بەڕێوەبەری ڕاگەیاندنو پەیوەندییەکانی حکومەت بەپلەی تایبەت.
- ساڵی (٢٠٠٤) لەگەڵ چەند ڕۆژنامەنووسێکدا دامەزراوەی (خەندان بۆ پەخشو وەشاندن)ی دامەزراندو یەکەم سەرۆکی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی دەزگاکەو یەکەم سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئاسۆ) بوو کە دامەزراوەکە دەری کردووە. لەو ماوەیەدا وردە وردە ڕۆژنامەکەی لە هەفتانەوە بەرەو ڕۆژانە برد.
- ساڵی (٢٠٠٨) وازی لە سەرنووسەریی ڕۆژنامەی (ئاسۆ) هێناو بووە سەرنووسەری گۆڤاری (هەفتانە)و وەك سەرۆکی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی دامەزراوەی خەندان بەشدار بوو لە دامەزراندنی گۆڤارەکانی (ئەلئیسبوعیە)و (ئەلویلایە)و (ئوفق)ی عەرەبیو (کۆپری)ی تورکمانی.
- لە ئابی ساڵی (٢٠٠٩) وەك سەرنووسەر لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) دامەزرا.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ڕازەکانی تەعریبو ڕاگوازتن)، ١٩٩٥.
- (گوڵو گوللەو مارێنن)، ٢٠٠٣.
- (گوڵدان).
- (بە تەنیشت سیاسەتەوە).
- رائحة السمك المسگوف)، ٢٠٠٤.
- (ئابووری کوردستان)، هەندێك هزر بۆ قۆناغی پەرینەوە، ١٩٩٥.
- (رؤى كردية بكلمات عربية)، ١٩٩٩.
- (سەما لەگەڵ گورگە بۆرەکاندا).
- (نەتەوەیەك لەسەر کاغەز).
- (باوەر بە مەسەلەی کەرکوك بهێنینەوە).
- (لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم، کوردستانی عوسمانیو تورکیا)، ٢٠١٣.
- (یارو نەیار)، ٢٠١٣.
- (مێخەك، کەمێك دوور لە سیاسەت)، سلێمانی، ٢٠١٣.
- ئێستا سەرنووسەری ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)یە.

* (سدیق ئەحمەد عاشور):-

- ساڵی (١٩١٥) لە موسڵ لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٣٤) لە (دار المعلمين)ی سەرەتایی دەرچووی.
- ساڵی (١٩٣٩) لە کۆلێژی سەربازی دەرچووە.
- هاورێی گیانی بەگیانی ئازاد شەوقی بووە، هەر مامۆستا ئازادیش گەواهی ئەوەمان بۆ دەدات کە کورد بووەو بەکوردیش قسەی کردووە، چەندێ جار لەگەڵ ئازاد شەوقی هاتوونەتە سلێمانیو وێنەی سەرچناریان کێشاوە، ناوبراو زیاتر لە (١٠) تابلۆی لەبارەی کوردستان لەمۆزەخانەی بەغدا پارێزراوە.
- ئەم هونەرمەندە لەگەڵ د. سینان سەعیدو مەحموود عوبێدی یەکەم گرووپی شێوەکاری لەکەرکوك دادەمەزرێنن. ناوبراو تاکو ساڵی ١٩٦٠ لە هەموو پێشانگاکانی ئەو گرووپە (جماعە فنانی کرکوك) بەشدار دەبێت. لە ساڵی (١٩٥٥)یشدا بە (ئەندامی کۆمەڵەی هونەرمەندانی عێراقی) لەبەغدا وەردەگیرێت.
- جگە لەوەش لەلایەن پارێزگاری کەرکوکەوە خەڵات دەکرێتو هەروەها هونەرمەند (فائق حەسەن) زۆر سەرسام

بووە بەم هونەرمەندە.
- لە دیارترین ئەو هونەرمەندانەیە کە زۆربەی کارەکانی بەرەنگی ئاویی ئەنجام داوە، لەو پێشانگایەشدا کە لە سالی ۱۹٥۰ خالید سەعید بردوویەتی بۆ کەرکوك‌و (سدیق ئەحمەد عاشور) بەشداری لەگەلدا کردووە لە هۆلی کتێبخانەی وەزارەتی پەروەردە، لە دواییدا هونەرمەند (خالید سەعید) ئەوە دەگێڕێتەوە کە هەمان پێشانگای کە لە ۸۰ تابلۆ کەمتر نەبوو بردوویەتە کەرکوك‌و موسڵ‌و هەولێرو لە کەرکوك سدیق ئەحمەد عاشور بەشداری کردووە لەگەلیدا بە ٤۰۰ دانە تابلۆی ئاوی کە بە داخەوە دانەیان فرۆشتووە بە نیو دینار.
- شاکیر حەسەن دەربارەی کارکردنی ئاویی (سدیق ئەحمەد عاشور) وەها دەدوێت: "سدیق ئەحمەد لەو نیگارکێشە ئینتباعیەیە کەمینانەی عێراقە لە دوا دوایی سییەکاندا دەرکەوتووە، ئەو وەك ئەفسەرێك لە سوپای عێراقدا رەنگی ئاوی بەکاردەهێنا بۆ نیگارکێشانی دیمەنی سروشتی هەتا لە میانەی هەندێ لە ئەرکە سەربازییەکانیشدا لە چادرگەکان‌و کێلگەو چیاکاندا کێشاوە.
- سالی (۱۹٥۳) پێشانگای هاوبەشی لە قوتابخانەی (غازی) لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥٤) پێشانگای هاوبەشی (فریشتە)ی لە کتێبخانەی گشتی کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥٦) پێشانگای هاوبەشی لە پێشانگای کشتوکالی‌و پیشەسازی‌و ئاژەلی لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥٦) پێشانگای هاوبەشی لە یانەی مەنسوور لە بەغدا کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥۷) پێشانگای هاوبەشی یەکەمی لەگەڵ (جماعة فناني كركوك) لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥۷) پێشانگای هاوبەشی دووەمی لەگەڵ (جماعة فناني كركوك) لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥۷) پێشانگای هاوبەشی سێیەمی لە یانەی مەنسوور لە بەغدا کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥۸) پێشانگای هاوبەشی سێیەمی لە یانەی مەنسوور لە بەغدا کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥۸) پێشانگای تایبەتی بە بۆنەی شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی سالی (۱۹٥۸) لە چین کردووەتەوە.
- سالی (۱۹٥۹) پێشانگای هاوبەشی لە پێشانگای کشتوکالی‌و پیشەسازی‌و ئاژەلی لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالانی (۱۹٥٦-۱۹٦٤) بەشداری هەموو پێشانگاکانی (جمعية التشكيليين العراقيين)ی کردووە لە بەغدا.
- سالی (۱۹٦٥) بەشداری پێشانگای لیوای کەرکوکی کردووە.
- سالی (۱۹۷۹) بەشداری پێشانگای هاوبەشی (الخمسينيون)ی کردووە لە بەغدا.
- سالی (۱۹۸۲) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی عێراقی کردووە لە ئیتالیا.
- سالی (۱۹۸۲) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی (الرواد)ی کردووە لە بەغدا.
- سالی (۱۹۸۲) رێزلێنانی بۆ کراوە لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری‌و راگەیاندنی عێراقییەوە لە هۆلی مۆزەخانەی گشتی بۆ هونەری نوێ (کولبەنکیان).
- لە سالی (۱۹۸۳) بەشداری پێشانگای هاوبەشی یانەی (الفروسية)یەی کردووە لە بەغدا.
- لە سالی (۱۹۸٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی (مختارات من الفن العراقي) لە هۆلی (ئۆرفەلی) لە بەغدا کردووە.
- لە سالی (۱۹۸٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی (پۆرترێتی) کردووە لە هۆلی (ئۆرفەلی) لە بەغدا.
- لە سالی (۱۹۹٤) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆلی (ئۆرفەلی) لە بەغدا کردووەتەوە.
- لە سالی (۱۹۹٤) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆلی (عین) لە بەغدا کردووەتەوە.
- لە سالی (۱۹۹٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لە یادی چوار سال بەسەر شەری کەنداودا کردووە.
- لە سالی (۱۹۹۷) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆلی (دائرة الفنون التشكيلية) لە بەغدا کردووەتەوە.
- لە سالی (۱۹۹۸) پێشانگای تایبەتی خۆییان لە هۆلی (حمورابي) لە عەممان بۆ کردووەتەوە.
- لە سالی (۱۹۹۸) پێشانگای تایبەتی خۆییان لە یادی سالێك بەسەر کۆچی دوایی لە هۆلی (الاناء) لە بەغدا بۆ کردووەتەوە.
- لە سالی (۲۰۰۲) پێشانگای تایبەتی بۆ کراوەتەوە لە هۆلی (الدروبي).
- لە سالی (۲۰۰۸) پێشانگای تایبەتی بۆ کراوەتەوە لە هۆلی (ئۆرفەلی) لە عەممان.
- لە سالی (۲۰۱۰) پێشانگای تایبەتی بۆ کراوەتەوە لە هۆلی (میدیا) لە هەولێر.
- لە سالی (۲۰۱۰) پێشانگای تایبەتی بۆ کراوەتەوە لە هۆلی (مدارات) لە بەغدا.
- لە سالی (۱۹۹۷) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

*** (سدیق بەندە غەفوور):-**

- مەقام زانێکی تورکمانی شاری کەرکوکە بە تایبەتی لە مەقامەکان و قۆریات‌و بەیاتی تورك.

*** (سدیق تۆفیق خدر زەنگەنە - مەلا سدیق تۆفیق خدر زەنگەنە):-**

- ساڵی (١٩١٢) لە گەڕەکی (بەرتەکیە)ی شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- هونەرمەند مەلا سدیق لە تاق لاوێتیدا خولیای هونەری مەقامو گۆرانی کوردی بووە وشان بە شانی یاوەرەکانی وەکو: (مامۆستا عەلی مەردان، حەمەی کۆترەمل، ڕەزاچاوەش)، مەقامو گۆرانی لە ئاوایی لەیلان لە تەکیەی شێخ حەسیبی تاڵەبانی دا ووتووە.
- مەلا سدیق شیعری شاعیرانی لەبەر کردووە، وەکو: (مەولەوی، تاهیر بەگ، مەلای جەباری، مەحوی، سایبری، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەمسی تەبریزی، حافیزی شیرازی، هەروەها لەگەڵ هونەرمەندان حەمە درێژ، سەید محێدین جەباری)، هەمیشە پێشبرکێی مەقامو گۆرانی کردووە ولە تەکیەی تاڵەبانی دا لە کەرکوك مەقامی خوێندووە.
- جگە لە مەقام گۆرانی بە کوردیو عەرەبیو تورکی وفارسیش خوێندووە، تەنانەت لە گۆرانیو مەقامی جووەکانیش شارەزایی هەبووە.
- مەلا سدیق لەگەڵ ئەم مەقام زانانەش دۆستایەتی هەبووە خلەی بارام چاوەش، حاجی نەعمان، سەید زەینەل سابوونچی، مەلا محەمەدی حافیز، عەبدوڵڵا موختار، سەید یەحیای تارژەن لە دیوەخانەکەی (شێخ حەسیب تاڵەبانی) دا لەتەك سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی دا دانیشتووە وگۆرانی ووتووە.
- لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا کوڕێکی لە بەندیخانەی کەرکوك بەند کرا بوو، جا هانای هێنا بووە لای شێخ حەسیبی تاڵەبانی بۆ ئەوەی لە بەندیخانە بۆی ڕزگار بکات، جا شێخ حەسیب پێ وت ئەگەر مەقامێکی خۆشم بۆ بڵێی سبەی بەیانی بۆتی ڕزگار دەکەمو دەستی دەدەم بە دەستت، ئەویش گۆرانی (یار غەزاڵ) ی بۆ ووت، بەڵام چۆن یار غەزالێك داروبەردی هێنایە جۆش وخرۆش. بۆیە شێخ حەسیب پەیمانەکەی هێنایە دی وکوڕەکەی بۆ ڕزگار کرد.
- لە ساڵەکانی سی دا مەقامی جبووری و ئەوای مەلا سدیق بەناوبانگ بوو، دەنگی بەرز، ئەدای ڕێکوپێك، میانی بەرزی بۆ دانەنا کۆتایەکەشی زۆربە جوانی دەهێنایەوە.
- مەلا سدیق گوزەرانی ژیانی، ماوەیەك لە بازاڕی گەورەی کەرکوك (عەتار)بووە پاشان دەستی لە عەتاری هەڵگرتووەو لە شارەوانی کەرکوك بە باخەوان دامەزراوە، هەروەها لەمزگەوتی (شێخ حوسامەدین) بە (مؤذن) بانگدەر دامەزراوە.
- ساڵی (١٩٩٢) تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی قوورگ بووە لە (١٢)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٣)دا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆرستانی شێخ محێدین بەخاك سپێدرا.
- مەلا لە تاق هەرزەکاریدا حەزی لە کچە جوولەکەیەك بووە، هەر چەندە جارێك چووەتە خوازبێنی بەڵام نەیانداوە پێی بۆیە لە خۆشەویستی ئەو کچە هەموو گۆرانیو مەقامەکانی جوولەکەکانیشی لەبەر بووە.
- ساڵی (١٩٣٦) سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی هونەرمەند بۆ ماوەی سیو پێنج ڕۆژ لە کەرکوك دەمێنێتەوە، لە ماڵی شێخ حەسیب تاڵەبانی لەگەڵ مەلا سدیق چەند جارێك بە دوو قۆڵی ئاهەنگ دەگێڕن.

*** (سدیق ڕەسوڵ قادری):-**

- ساڵی (١٨٩٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لە جەنەراڵەکانی سوپای عوسمانیو لە دواییدا سوپای ڕووسی.
- پشکێنەر بووە لە سوپای کوردستانی حکومەتەکەی شێخ مەحموود لەنێوان ساڵانی (١٩٢٢-١٩٢٤).
- هەروەها ماوەیەك بەڕێوەبەری ناحیەو قەزا بووە لە ناوچەکانی کوردستان.
- گەلێك کتێبی بەچاپ گەیاندوە لەوانە:
- (مذکرات القادري في بيان الثورة الروسية العظمى وإيضاح غوامضها)، ١٩٥٢.
- (الخطر الأحمر)، ١٩٥٧.
- ساڵی (١٩٨١) کۆچی دوایی کرد.

*** سدیق ڕەشید مستەفا ساڵەیی:-**

- ساڵی ١٩٥٠ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٣ کۆلیژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٥١.
- دەرچووی کۆلیژی یاسایە.
- دەرچووی کۆلیژی ئەندازیارییە.
- ساڵی ١٩٨٤ بڕوانامەی ئەندازیاری پاشایەتی سەربازی بەریتانیای بەدەستهێناوە.

*** (سدیق قولەبەرزی):-**

- ناوی (مەلا سدیق کوڕی مەلا محێدین کوڕی قادر زەنگەنە)یە.

- ساڵی (١٩٢٢) لە دێی قولەبەرزە لەدایكبووە.
- ئیجازەی زانستی ئایینی لەلای (مەلا عەبدولكەریمی مودەرس) وەرگرتووەو بووەتە ئیمام لە گەلێك لە دێیەكانی دەوروپەری كەركوك.
- كۆمەڵێك دەستنووسی شیعری لێ بە جێماوە.
- ساڵی (١٩٨٤) بە ڕووداوی هاتوچۆ كۆچی دوایی كردووە.

* ( **سدیق موزهر مستەفا** ):-

- ناوی (سدیق كوڕی موزهر كوڕی مستەفا)یە، لە ساڵی (١٨٨٢) لە كەركوك لەدایكبووە، خێزانەكەی سەر بە هۆزی (ئاكۆ)ن.
- خوێندنی دواناوەندی لە بەغدا تەواو كردووە.
- لە ئەستانە قوتابخانەی ماڵی لە ساڵی (١٩٠٥ تەواو كردووە، گەلێكی كاری حكومی كردووە لەسەردەمی عوسمانییەكان لە عێراقدا.
- لە دادگاكانی (موسڵ)و (سلێمانی)و (هەولێر)و (نەجەف) و (كەركوك)و (بەسرە) لە دادگاكانی حكومەتی عێراق كاری كردووە.
- لە ساڵی (١٩٤٢) سەرۆكی دادگای كەركوك بوو، لە دواییدا لادرا لەو پۆستەی.
- لە ساڵی (١٩٧٤) كۆچی دوایی كردووە.

* ( **مەلا سلێمان- سالم** ):-

- ناوی (سلێمان)ەو نازناوی شیعری (سالم) بووە.
- لە ساڵی (١٨٨١) لە كەركوك لەدایكبووە.

* ( **مەلا سلێمان خدری-خضري** ):-

- مەلای مزگەوتی قۆریە بووە.
- یەكێكە لە مەلا بەناوبانگەكانی كەركوك كە لەگەڵێك لە دەستنووسەكانی (دار المخطوطات)دا لە بەغدا ئاماژەی پێكراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی كەمە.
- لە ساڵی (١٨٤٤) كۆچی دوایی كردووە.

* ( **سلێمان سالم كەركوكی - شێخ سلێمان سالم كەركوكی** ):-

- (شێخ سلێمانی كوڕی شێخ سالم مستەفا)یە.
- لە كەركوك لەدایكبووەو لەلایەن زانایانی ئەم شارەوە فێری خوێندن بووە.
- لە ساڵی (١٩٢٦) چووەتە بەغداو بووەتە مامۆستا لە مزگەوتی (ئۆزبك)، ئینجا بووەتە مامۆستا لە مزگەوتی ئەمیر عەبدولئیلا لە (عیوازیە) لە (١)ی ئایاری ساڵی (١٩٥٠).
- ئەندام بووە لە ئەنجوومەنی زانستی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی گشتی لە ساڵی (١٩٤٩)، هەروەها بەشداری لە چەند كارێكی ئایینی كردووە لە ژیانیدا.
- لە (٢٩)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٥٤) كۆچی دوایی كردووە.

* ( **سلێمان شافیعی** ):-

- ناوی (سلێمانی كوڕی محەمەد داقوقی شافعی)یە.
- لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەم ژیاوە.
- لە دەوروبەری شارۆچكەی داقوق ژیاوە.

* ( **سلێمان كاكەیی** ):-

- ناوی (سەید سلێمان ئەفەندی كوڕی سەید حەسەن)ە.
- ساڵی (١٨٥٨) لە كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٣٥) كۆچی دوایی كردووە.
- گەلێك شەرە شیعریو چامەی شیعری لەنێوان خۆیو شێخ ڕەزای تاڵەبانییدا هەیە، هەروەها عەباس عەزاوی لە كتێبی (كاكەییەكاندا) ئاماژەی بە توانای شیعری ئەم شاعیرە كردووە.

* ( **سلێمان موفتی** ):-

- ناوی (سلێمان كوڕی محەمەد كوڕی دەروێش كوڕی لوتفەڵڵا ئەفەندی موفتی)یە.
- ساڵی (١٨٣١) موفتی بووە لە كەركوك.
- ئەدیبو دادوەرو زانایەكی ئایینی بەناوبانگ بووەو خوێندی لەژێر دەستی شێخ حوسامەدین تەواو كردووە.
- بووە بە دادوەر لە هەولێر تا ساڵی (١٩١٥)و لە دواییدا لە زاخۆ و كەركوك دادوەر بووە بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ.
- لە ماوەی ژیانیدا هەستاوە بە وەرگێڕانی كتێبی (اجماع العشق) هی شاعیری توركی (فەزولی)یە، كە لە فارسییەوە كردوویەتییە سەر توركی.
- ساڵی (١٩١٨) خۆی هەڵبژاردووە بۆ سەرۆكایەتی شارەوانی كەركوك بەڵام نەیتوانییوە بەرامبەر بە ڕكابەرەكەی كە (مەجید یەعقوبی) بووە بیباتەوە.
- لە (٤)ی ئایاری ساڵی (١٩٢٤) كاتێك ئینگلیزەكان هەستان بە خولقاندنی ڕووداوی (لیڤییەكان)و دەستدرێژی بۆ سەر خەڵكی كەركوكو كوشتنی خەڵكێكی زۆری بێ تاوان لە كەركوك یەكێك بووە لەوانەی كە دەستبەسەر كراوە لەو ڕووداوەدا لەبەر ئەوەی پشتگیری لێقەوماوانی كردووە.
- ساڵی (١٩٢٤) كۆچی دوایی كردووە.

* ( **سمایلی ناوجاف - مەلا سمایلی ناوجاف-جەفایی، فەقێ** ):-

- كوڕی خەلیفە مەحموودی زەنگەنەیە لە ئاوایی (كوردەمیر) لەدایكبووە.
- دایكی ناوی (شیرین)ەو لە هۆزی دەلۆی جامرێزییەو خۆی لەناو خەڵكدا بە (مەلا سمایلی ناوجاف) بە ناوبانگ بووە، چونكە لەبەر ئەوەی زۆربەی ژیانی لەناو جاف بەسەر بردووە لە گوندەكانی (زەردە)، (درۆزنە)، (بەكرە شەلە)، (كانی ماران)، (تیلەكۆ)، (میل قاسم) كە هەموویان لە ڕۆژهەڵاتی شاری كفریو لە سەرقەڵاوە نزیكە.
- مەلا سمایل بە خۆرسكی شاعیر بووە، چونكە نەخوێندەوار بووەو شیعرەكانی شێوەی نەتەوەی (میللی) یان بە سەرەوەیە، لە سەركتێبی پەنجەی كوردی ونەفەسێكی كوردەواری سادە وڕووت هۆنراوەتەوە.

– زۆربەی شیعرەکانی مەلا سمایل شێوە گاڵتەجاریی (بەزمەسات)ی پێوەیە، هەمیشە دەم بە پێکەنین و نوکتەباز بووە، لە ناونیشانی پارچە شیعرەکانی:– (موناجات، شیعر بە قەبردا، بۆ کەریم بەگی جاف، کەلام کاکەلی، شیعر بە خەمدا بە پیرەوەچوونی جوانیدا، مشکی شارەزوور، جاف وگۆران، بۆ دۆمەکان، بۆ ناوچەی زەنگەنە، دەسار، راوچی. بەهاری جامرێز، بۆ شێخ حەسەنی قەرەچێوار.
– لە ناوەراستی پەنجاکاندا لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

* ( **سمکۆ بەهرۆز محەمەد-ئەژی** ):–

– ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– دەرچووی بەشی مێژوو لە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی بەغدا لەنێوان ساڵانی (١٩٨٤–١٩٨٥).
– ئەم بەرهەمانەی لە بواری مێژوودا بە چاپ گەیاندووە:
– (ئەرایخای وڵاتی کوردەواری)، ٢٠٠٣.
– (مێژووی سەردەمە کارگێریی و بەرێوەبەرییەکانی پارێزگای کەرکوك).
– (مێژووی گۆرانە رۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوك)، ٢٠٠٦.
– (مێژووی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەی کەرکوکدا)، ٢٠٠٦.
– (مێژووی ئەو کۆمەڵ و رێکخراوو حیزبانەی لە ناوچەی کەرکوکدا سەریان هەڵداوە)، ٢٠٠٦.
– (دەروازەیەکی مێژوویانە بۆ رووداوەکەی ساڵی (١٩٥٩)ی شاری کەرکوك)، ٢٠٠٦.
– (مێژووی هونەری تەلارسازی ناوچەی کەرکوك)، ٢٠٠٧.
– (گۆرانە ئابوورییەکانی ناوچەی کەرکوك لە روانگەی سەردەمە مێژووییەکاندا)، ٢٠٠٩.
– دووبارە نووسینەوەی مێژووی کەرکوك.
– (بیبلۆگرافیای ناودارانو رۆشنبیرانی کەرکوك)، ٢٠١٢.
– گەلێك بابەت و لێکۆڵینەوەی مێژوویی نووسیوە لە گۆڤار و رۆژنامەکانی کەرکوك، نەوشەفەق، باسەرە، وەرز، بانەرۆژ، کەرکوکی ئەمرۆ، بە ناوەکانی:– ئەژی، ئەمر، دانا.

* ( **سمکۆ جەباری** ):–

– بەرهەمە چاپکراوەکانی (کۆی بەرهەمە کوردییەکانی نووسەری شەهید جەبار جەباری)، سلێمانی، ٢٠٠٤.

* ( **سوبحی سەعاتچی** ):–

– ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (Turk folkloru ile ilgili Irak'ta yayimlanan kitap ve makaleler bibliyograf yasi)، ئینسکلۆپیدیای کتێبو لێکۆڵینەوە بە زمانی تورکی، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری لە تورکیا، ئەنقەرە، ١٩٨٢.
– (Kerkuk cocuk folkloru)، فلکلۆری منداڵان لە کەرکوك، بە زمانی تورکی، لە بڵاوکراوەکانی (فضولي)، ئەستەمبول، ١٩٨٤.
– (Mimar sinan)، ناساندنی سینانی تەلارساز، بە زمانی تورکی. ئەستەمبول، ١٩٨٧.
– (Mimar Sinanin yapilarndaki kitabeler)، دەربارەی نووسینەکانی سینان لەسەر بیناکاری، بە زمانی تورکی. ئەستەمبول، ١٩٨٨.
– (Mimar sinan and terzkiretul Bunyan)، بەدواداگەران لەسەر بەرهەمەکانی تەلارسازی سینان، بە زمانی ئینگلیزی، ئەستەمبول، ١٩٨٩.
– (Irak Musir Turk sairleri Antolojisi)، بیبلۆگرافیای شاعیرانی تورکی لە عێراق، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری لە تورکیا، ئەنقەرە، ١٩٩١.
– (Kerkuk'ten Derlenen cocuk oyunlari)، دەربارەی یاری منداڵان لە کەرکوك، بەشی یەکەم و دووەم و سێیەم، ئەنقەرە، ١٩٩٢.
– (Kerkuk kenti ve ev mimarisi)، نامەی دکتۆرا لەسەر هونەری تەلارسازی کەرکوك، ئەستەمبول، ١٩٩٢.
– (Kerkuk'ten Derlenen olay Turkuleri)، دەربارەی گۆرانی لە کەرکوك، ئەستەمبول، ١٩٩٢.
– (Tatihi Gelisim icinde Irakta Turk varligi)، دەربارەی تورکمان لە عێراق، چاپخانەی (الأبحاث التاريخية)، ئەستەمبول، ١٩٩٦.
– (الوجود التركماني في العراق في ضوء التطورات التاريخية)، ١٩٩٦.
– (Kerkuk Gul destesi)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (اوتکن)، ئەستەمبول، ١٩٩٧.
– (Baslang icindan Gunumaze kadar Turkiye disindaki Turk Edebiyalari An tolojisi، Nesir-Nazim)، پێناسەی ئەدەبی تورکی لە دەرەوەی تورکیا، بەشی یەکەم، ئەنقەرە، ١٩٩٧، بەشی دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم، ئەنقەرە، ١٩٩٧.
– (Kerkukuklu Mehmet Rsih oz Turkmen)، چاپخانەی (اوزنەر)، ئەستەمبول، ٢٠٠١.
– (Tarihten gununmuze Irak Turkmenleri)، دەربارەی تورکمانی عێراق، لە بڵاوکراوەکانی (اوتوکان)، چاپی یەکەم و دووەم، ئەستەمبول، ٢٠٠٣.
– (Kerkuk Evleri)، دەربارەی تەلارسازی لە کەرکوك، لە بڵاوکراوەکانی (دار كلاسيك)، ئەستەمبول، ٢٠٠٣.
– (كركوك النسيج العمراني وبيوتها التقليدية)، ٢٠٠٧.
– (كركوك وهويتها العمرانية)، ٢٠٠٩.

* ( **سوبحی نازم تۆفیق** ):–

– ساڵی (١٩٤٥) لە قەڵا لەدایکبووە.
– مێژوونووس و ئەفسەری سەربازی بووە.
– ساڵی (١٩٧٤) نامەی ماجستێری لە کۆلێژی ئەرکان بەدەستهێناوە.
– بەرهەمەکانی:
– (تاريخ القوة الجوية للمملكة العربية السعودية ١٩٣٥–١٩٨٢)، وەزارەتی بەرگری، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە، بەغدا، ١٩٨٤.
– (احدث الطائرات الحربية المستخدمة في العالم)، چاپی یەکەم چاپخانەی (الانتصار) بەغدا، ١٩٨٤، چاپی دووەم چاپخانەی (دار الملايين) بەیروت، ١٩٨٤، چاپی سێیەم

چاپخانەی (الخلود)، بەغدا، ١٩٨٥، چاپی چوارەم چاپخانەی (الانتصار)، بەغدا، ١٩٨٦.

- (الطيران البحري وحاملات الطائرات)، چاپخانەی (الانتصار)، چاپی یەكەم، بەغدا، ١٩٨٥، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٨٦.

- (الطائرات السمتية المستخدمة في العالم)، چاپخانەی (الانتصار)، چاپی یەكەم، بەغدا، ١٩٨٥، چاپی دووەم بەغدا، ١٩٨٨.

- (طائرات النقل العسكري المستخدمة في العالم)، چاپخانەی (الانتصار) بەغدا، ١٩٨٥.

- (قوة دلتا)، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی، بەغدا، ١٩٨٦.

- (العمليات العسكرية اليابانية خلال الحرب العالمية الثانية، چاپخانەی (الانتصار)، چاپی یەكەم، بەغدا، ١٩٨٦، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٨٧، چاپی سێیەم، ١٩٨٨، چاپی چوارەم، بەغدا، ١٩٨٩.

- (الصواريخ أرض-ارض، نشأتها، حاضرها، انواعها)، چاپخانەی (الانتصار)، چاپی یەكەم، بەغد، ١٩٨٨، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٨٩، چاپی سێیەم، بەغدا، ١٩٩٠.

- (المقاومة العسكرية الإسلامية للغزو المغولي حتى سقوط الدولة الخوارزمية ١٢١٨-١٢٣١)، چاپخانەی (الاثير)، بەغدا ١٩٩٥.

- (حملة السلطان سليمان القانوني على العراق ١٥٢٣-١٥٣٥)، وەرگێران لە توركییەوە بۆ عەرەبی، دوبەی، ١٩٩٥.

- (مواقف تركيا من قضية فلسطين ١٩٣١-١٩٥٦)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ٢٠٠١.

- (تركيا والتحالفات السياسية ١٩٣١-١٩٤٧)، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای (بيت الحكمة)، چاپخانەی (الزمان) بەغدا، ٢٠٠١.

- (الميثاق البلقاني ومعاهدة مونترو ١٩٣٠-١٩٤٢)، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای (بيت الحكمة)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ٢٠٠١.

- (الحلف البلقاني والمعاهدة البريطانية، الفرنسية، التركية ١٩٣٥-١٩٥٥) لە بڵاوكراوەكانی دەزگای (بيت الحكمة)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ٢٠٠٢.

- (الحلف الاطلسي وحلف بغداد)، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای (بيت الحكمة)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ٢٠٠٢.

- (اوضاع الوطن العربي وقضاياه ١٩٣١-١٩٤٥)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ٢٠٠٣.

- عبدالسلام محمد عارف كما رايته، ٢٠٠٧

- عبدالسلام محمد عارف كما رايته، ٢٠١٠

*** (سوداد عەبدولكەریم مەحموود بەیاتی):-**

- ساڵی ١٩٥٨ لە كەركوك لەدایكبووە.

- ساڵی ١٩٨٣ كۆلێژی (ضباط الاحتياط)ی تەواو كردووە لە خولی ٦٤ بەناونیشانی (مشاة).

- دەرچووی كۆلێژی ئادابە بەشی ڕاگەیاندنی زانكۆی بەغدا لە ساڵی ١٩٨٢.

- ساڵی ١٩٨٦ لە شەڕی (عێراق - ئێران) شەهید بووە.

*** (سوعاد ستار عومەر):-**

- ساڵی (١٩٥٣)دا لەكەركوك لەدایكبووە.

- ساڵی (١٩٧٧)دا ئەكادیمیای هونەرە جوانەكان بەشی پەیكەرتاشی لە بەغدا تەواو كردووە.

- ماوەیەك مامۆستا بووە لە ئامادەیی سیروانی سلێمانی.

- ساڵانی (١٩٧٤-٧٥-٧٦) بەشداری پێشانگاكانی ئەكادیمی كردووە.

- ساڵی (١٩٧٧)وە تاوەكو ساڵی (١٩٨٢) هەموو ساڵێك پێشانگایەكی هاوبەشی یان تایبەتی لەشاری كەركوك كردووەتەوە.

- ساڵی (١٩٧٧) بەشداری پێشانگای هاوبەشی كردووە لەگەڵ عەباس عەلیو ئەنوەر عەبدولرەحمان لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە كەركوك.

- ساڵی (١٩٧٨)دا بەشداری پێشانگای هونەرمەندە لاوەكانی كەركوكی كردووە لە شاری هەولێر.

- ساڵی (١٩٧٨) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە كەركوك كردووەتەوە.

- ساڵی (١٩٧٩)دا بەشداری پێشانگای پێنجەمی هونەرمەندانی سلێمانی كردووە.

- ساڵی (١٩٧٩) پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەند (فاروق فایق عومەر) لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە كەركوك كردووەتەوە.

- ساڵی (١٩٨١) بەشداری پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ كەمیل شەمعون لە كەركوك كردووە.

- ساڵی (١٩٨٣) بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی كەركوكی كردووە لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.

- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی كردووە لەگەڵ هونەرمەند ئاری بابان لە هۆڵی تەئمیم بۆ هونەری نوێ.

- ساڵی (١٩٨٩) بەشداری پێشانگای هاوبەشی بە بۆنەی ڕۆژی هونەر لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی یەکەمی کۆمەڵەی هەشت لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشدای پێشانگای هونەرمەندانی کورد لە ئەڵمانیا.
- ساڵی (١٩٩٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی دووەمی کۆمەڵەی هەشت لە هەولێر/دهۆك.
- ساڵی (١٩٩٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی دووەمی هونەرمەندانی کەرکوك لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٤) بەشداری پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.
- بەشداری پێشانگای هاوبەشی فیستیڤاڵی هونەرمەندانی کوردستان لە هەولێر.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای پۆستەی دژی شەڕی ناوخۆیی لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای هاوبشی بە ئاوەبوون لەگەڵ میدحەت کاکەیی، ئاری بابان، چیمەن ئیسماعیل.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی مامۆستاکانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی-هەولێر.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی میهرەجانی هونەری شێوەکاریی لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کوردستان (ئەربیلا) لە هەولێر.
- ساڵی (١٩٩٦) پێشانگا لە گەلەری زاموا لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری پێشانگای تایبەتی لە کتێبخانەی (خلزە) لە شاری خلزراین.
- بەشداری پێشانگای هاوبەشی کونست ناوت لاین لە شاری لیواردن.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هۆڵەندی مۆڵداڤ، عێراقی سووری، گەلەری هنریك بەیکمان لە شاری مارۆم.
- ساڵی (١٩٩٩) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هۆڵەندی مۆڵداڤ - عێراقی ئەمریکی ئەنگۆلی - گەلەری ئۆلێنیست،ئایینییە لە شاری ڤاخێتیگن.
- بەشداری پێشانگای هاوبەش لەگەڵ ئاشتی مەهدی لە هۆڵی (Wereld De).
- بەشداری پێشانگای تایبەتیلە هۆڵی بەلەدییەی شاری بەیترستزتڤاغ ساڵی ٢٠٠٠ لە هەرێمی فریزلاند بۆ ماوەی سالێك S.O.C..
- بەشداری پێشانگای هاوبەشی ڕێکخراوی پێشانگای پێشانگایR.S.Aهاوبەشی هونەرمەندانی عێراق دەنباغ هاوبەشی هونەرمەندانی کوردی دەنباغ.
- پێشانگای تایبەتی لە شاری یاورە.
- ساڵی (٢٠٠١) پێشانگای تایبەتی لە شاری خورەدایك.
- ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی عێراق لەمۆزەخانەی مووزەیو لە دەنباغ.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگای هاوبەش لەگەڵ پێنج هونەرمەندی کوردی ئاراز حەمە، دارا ئارام، عەدنان شینۆ، کوێستان جەمال، لە مۆزەخانەی ئۆیسترلان لە خۆرەدایك.
- ساڵی (٢٠٠٥) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی مۆزەخانەی نۆیستڕلان لە خۆرەدایك.
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری پێشانگای هاوبەش لەگەڵ ئاراز حەمە، دارا ئارام، عەلی لەتیف لە کتێبخانەی ئوتوریخت.
- بەشداری پێشانگای هاوبش لەگەل هونەرمەندی کورد بە بۆنەی ئەنفال و هەڵەبجە دانهاغ.
- ساڵی (٢٠٠٨) بەشداری پێشانگای هاوبەش لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی کورد: ئاراز حەمە، دارا ئارام، عەدنان شینۆ.
- ساڵی (٢٠٠٩) بەشداری پێشانگای هاوبەش لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی کورد: ئاراز حەمە، دارا ئارام، عەدنان شینۆ لە زینت.
- ساڵی (٢٠٠٩) بەشداری پێشانگای هاوبەش لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی کورد: ئاراز حەمە، دارا ئارام، عەدنان شینۆ لە کەنەدا.
- تا ساڵی (١٩٩٧) مامۆستای هونەرە جوانەکانی سلێمانی بەشی پەیکەتاشی بوو.
- ساڵی (٢٠٠٢)ەوە کارمەندی مۆزەخانەی شاری خۆرەدایك لە هۆڵەندا.
- لێکۆڵینەوەیەکی هونەری نووسیوە بە ناونیشانی (الحلقة المفقودة في ظهور الفن التشكيلي كنشاط إنساني) لەگۆڤاری (الثقافة الجديدة)، ژمارە (٢٦٧)، ساڵی (١٩٩٦).
- لە بواری شانۆ ئەم کارانەی کردووە:
- ساڵی (١٩٨١) هەستاوە بە دروستکردنی دەمامك بۆ شانۆگەری (استعراضات تراثية) لە کەرکوك کە لە دەرهێنانی هەیسەم عەبدولرەزاقە.
- ساڵی (١٩٨٢) هەستاوە بە نەخشە کێشانی دیکۆری شانۆگەری (بنادق الأم) لە کەرکوك لە دەرهێنانی لیبرۆن سیمۆن.
- یاریدەدەری دەرهێنەر بووە لە شانۆگەری (غاية اليوتوبيا) لە کەرکوك و هەستاوە بە نەخشەکێشان و دروستکردنی دەمامکی ئاژەڵەکان، ئەم شانۆگەرییە لە دەرهێنانی ئیسماعیل هەورامی بوو.
- ساڵی (١٩٨٣) یاریدەدەری دەرهێنەر بووە لە شانۆگەری (غايە اليوتوبيا) لە کەرکوك و کە لە دەرهێنانی عەبدولرەزاق محەمەد بوو.
- ساڵی (١٩٩٠) دیکۆری شانۆگەریی (دەریا)ی دروست کردووە، کە لە دەرهێنانی میدیا ڕەئوف بوو لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٢) هەستاوە بە کاری مکیاجی فیلمی کوردی (مەرگی ئەرخەوانی)، دەرهێنانی کامەران ڕەئوف.

*** (سولەیمان بەگی کوڕی فەتاح بەگ):-**

- ئەم زاتە کوڕی میرلیوا فەتاح پاشایە کە لەیەکەم تەشکیلاتی حکومەتی عێراقدا موتەسەڕیف بووە.

*** (سۆران مامە حەمە):-**

- ساڵی (١٩٨٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە (٢١)ی تەمموزی ساڵی (٢٠٠٨) لە کەرکوك تیرۆر کرا.
- لە بواری ڕۆژنامەگەریو نووسینی شیعردا کاری کردووە.
- بەرهەمەکانی: (وەرزی بێتاقەتی)، (٢٠٠٨).

* (سۆران نەدار):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (کۆنگرەی ئاشقان)، هۆنراوە، (۲۰۰۸).
- (فێرگە)، شیعر بۆ منداڵان، (۲۰۰۸).
- (جۆلانە)، شیعر بۆ منداڵان، (۲۰۰۸).
- (بەهار)، شیعر بۆ منداڵان، (۲۰۰۸).
- (جەژنانە)، شیعر بۆ منداڵان، (۲۰۰۸).
- (هێلانە)، شیعر بۆ منداڵان، (۲۰۰۸).
- (باران)، شیعر بۆ منداڵان، (۲۰۰۸).
- (گروگاڵ)، شیعر بۆ منداڵان، (۲۰۰۸).
- (توانەوە)، هۆنراوە، ۲۰۰۹.
- (جاڵجاڵۆکە)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۰۹.
- (سمۆرە)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۰۹.
- (هەتاو)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۰۹.
- (پەپوولە)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۰۹.
- (دارگوێن)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۰۹.
- (یاری)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۰۹.
- (گەڵارێزان)، هۆنراوە، ۲۰۱۰.
- (دیاریو شەپۆل)، یەکەم ڕۆمانی منداڵان بە زمانی کوردی، ۲۰۱۰.
- (ورچێکی قەڵەو)، چیرۆك بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (چرۆی نوێ)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (تۆپەکەم)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (جووجەڵە)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (کۆلارە)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (بلوێر)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (بووکەکە)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (چۆلەکە)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (تابلۆ)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (هەڵمەتو خەونی ڕەنگاڵەی منداڵان)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۰.
- (بێکەسو گڕەی هاوینی گەرمیان)، بیرەوەری ئەدەبی، ۲۰۱۰.
- (زین جێناهێڵم)، چوارینە شیعری، ۲۰۱۰
- (شەنگەستەی قەڵای مەمکێك)، هۆنراوە، ۲۰۱۱.
- (بەرزیو نزمی لە ئەزموونی شیعری شێرکۆدا)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (هونەری جوانکاری لە شیعرەکانی شێخ ڕەزادا)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (کفریو نوێگەری)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (لەتیف هەڵمەت لە بواری منداڵاندا)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (لەتیف هەڵمەت پێشرەوی شیعری نوێی کوردی)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (لەتیف هەڵمەت لە کفرییەوە)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (بیروڕام دەربارەی شیعر)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (گەرمیانو ئەدەبی منداڵان)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (لە شیعرەوە بەرەو شیعر)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (بروسکەی هەوری شیعر)، بیرەوەری ئەدەبی، ۲۰۱۱.
- (سۆزێ بۆ لەتیف هەڵمەت)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱
- (ئەڤین ئاسۆ هاوڕێ نزیکەکەی منداڵان)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (بابە نوئێل)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (باخچە)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (بەردەکانی وڵات)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (بەفرو خۆر)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (پشیلەکەم)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (بیستو هەشت کۆتر)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (پێشمەرگەو سەرۆك)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (پێنج ئاژەل)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (فیلی ڕێوی)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (کەو)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (گورگە بۆر)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (مۆسیقاژەن)، شیعر بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (کەڵەشێریش شێرە)، چیرۆك بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (نانو ژیان)، ڕۆمان بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.
- (خەون)، ڕۆژمان بۆ منداڵان، ۲۰۱۱.

* (سۆلاڤ ساڵەیی):-

- ناوی تەواوی (زەیتون قاسم خەلیل ساڵەیی)یە.
- ساڵی (۱۹٦۰) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- قوتابخانەی سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەیی لە هەولێر تەواو کردووە.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوكو لە بواری ڕۆژنامەو رادیۆدا کاری کردووەو بەردەوامە.
- دیوانە شیعرێکی بەچاپ گەیاندووە بە ناونیشانی (خەونە زەیتونییەکان) لە ساڵی (۲۰۰۱).

* (سوارە نەجمەدین جەبار):-

- ساڵی ۱۹۸٦ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە سلێمانی تەواو کردووە.
- کۆلێژی کارگێڕی و ئابووری لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
- سەرەتا لە بواری ڕۆژنامەگەری کاری کردووە و لێپرسیراوی پاشکۆی گەنجانی هەفتەنامەی هەواڵ بووە.
- ساڵی ۲۰۰٦ یەکەم کورتەچیرۆکی نووسیوە و هەروەها کۆمەڵە چیرۆکێکی بەناونیشانی:- نامەیەك بۆ فرۆید، ئەو نامانەی بۆ پیرێتی خۆم دەیاننێرم.
- ساڵی ۲۰۱۱ بە هاوبەشی خەڵاتی یەکەمی شیعری لە پانزەهەمین فیستیڤاڵی گەلاوێژ بەدەسهێناوە.
- ساڵی ۲۰۱۵ خەڵاتی دووەمی هەمان فیستیڤاڵی بەدەستهێناوە لە بواری چیرۆکدا.

* (سوهەیلە تەها محەمەد بەیاتی):-

- ساڵی ۱۹۵۹ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- شاعیر و لێکۆڵەرە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە خورماتوو تەواو کردووە.
- ساڵی ۱۹۸۹ ماستەری لە کۆلیژی ئاداب لە زانکۆی سەلاحەدین بەدەستهێناوە بە ناونیشانی (إبن الخشاب

وجهوده في اللغة والنحو).
- سالی ١٩٩٧ دکتۆرای لە زانکۆی موسڵ بەدەستهێناوە بەناونیشانی (جهود الكرماني اللغوية والنحوية في شرح صحيح البخاري).
- بەرهەمەکانی:-
- أسلوب الإستفهام في ديوان الحطيئة.
- المثنيات في معجم الصحاح الجوهري.
- المنهج الوصفي في كتاب (في النحو العربي نقد وتوجيه).
- الذخيرة التراثية.

* (سیاوش پاشا):-

- ساڵی (١٦٩٢) بووەتە والی کەرکوك پێدەچێت تاکو ساڵی (١٦٩٥) بەردەوام بووبێت.

* (سینان سەعید - دکتۆر سینان سەعید عەبدولقادر):-

- ناوی (سینان سەعید عەبدولقادر تەرزی باشی ئۆغلو)وە
- ساڵی (١٩٣٤) لە کەرکوك لەدایکبووەو سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لەم شارەدا تەواو کردووە و لە خولێکی تایبەتی پەروەردەدا بووەتە مامۆستای (رەسم).
- ساڵی (١٩٥٩) نێردراوە بۆ کۆماری (ئازەربایجان) و لە بەشی عەرەبی رادیۆی (باکۆ) کاری کردووە، لەگەڵ بەردەوام بوونی لە خوێندنی باڵاو دەرچوونی لەو خوێندنە لە ساڵی (١٩٦٥) و دکتۆرای وەرگرت.
- لە کاتی خوێندنی دکتۆرە (رائیدە سەعید)ی خواستووە.
- لە (٣٠)ی تەمموزی ساڵی (١٩٧٢) تا (١٥)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٣) کاری کردووە وەکو سکرتێری رۆژنامەی (یورد)ی تورکمانی.
- بەرهەمەکانی:
- (من القصص العراقي)، چیرۆك، بەیروت، ١٩٥٦.
- (مرزا علي اكبر صابر)، وەرگێران لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، چاپخانەی (قیزیل شرق)، ئەزەربیجان، ١٩٦٢.
- (الاب والابن)، چیرۆك، وەرگێران لە روسییەوە بۆ عەرەبی، چاپخانەی (دار التقدم)، مۆسکۆ، ١٩٦٦.
- (واقف)، شیعری وەرگێراو لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، چاپخانەی (دار النشر الاذربايجانية الحكومية)، ئەزەربیجان، باکو، ١٩٦٨.
- (ملا بناة)، شیعری وەرگێراو لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، ئەزەربیجان، باکو، ١٩٦٨.
- (جليل محمد زاده خولي)، شیعری وەرگێراو لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، ئەزەربیجان، باکو، ١٩٦٨.
- (عراقدة تورك مطبوعاتي و ادبي مسالەلر ١٩٥٤-١٩٦٦)، نامەی دکتۆرا بە زمانی تورکی، ئەزەربیجان، باکو، ١٩٦٩.
- (اغنيات اذربيجانية إلى بلاد العرب)، شیعری وەرگێراو لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، بەغدا، ١٩٧١.
- (دراسات في الصحافة العراقية)، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا، ١٩٧٢.
- (إعلام الأطفال الناشئة ازاء القانون والجريمة وتقدير المعاصر لرجل الشرطة)، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس، بەغدا، ١٩٧٩.
- (إعلام الحرب بين الامس واليوم)، چاپخانەی (دار الجماهير)، بەغدا.
- (التحرير الرياضي في الصحافة العراقية والعربية)، بەغدا، ١٩٨٠.
- الصورة البصرية في قصائد شعراء كركوك، ٢٠١٠
- لە (١٢)ی حوزەیران ساڵی (١٩٩١) کۆچی دوایی کردووە.

* (سیروان ئەحمەد قادر - دکتۆر سیروان ئەحمەد قادر):-

- ساڵی (١٩٦٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٠-١٩٨١)، دبلۆمی بەشی شارستانی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٠)بکالۆریۆسی لە شەریعەت هێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٣)ماجستێری لە شەریعەت هێناوە بە ناوی

(التأويل في ضوء أصول الفقة الإسلامي).
- ساڵی (٢٠٠٧) دکتۆرای لە شەریعەت هێناوە بە ناوی (السياسة الشرعية وأثرها في بناء الأحكام وتطبيقها).
- ساڵی (١٩٩٦) ئیجازەی زانستی وەرگرتووە لەسەر دەستی شێخ محەمەد ئەمین سەعید.
- ئیمام و خەتیبی مزگەوتی ئیسکان بووە.
- گەلێك لێکۆڵینەوەی هەیە لەسەر شەریعەت.
- ساڵی (٢٠١٠)دا بووەتە ئەندامی پەرلەمانی عێراق لەسەر لیستی (کوردستانی) لەسەر ئاستی پارێزگای کەرکوك.
- کتێبە چاپکراوەکانی:
- (التأويل في ضوء أصول الفقة الإسلامي).
- (السياسة الشرعية وأثرها في بناء الأحكام وتطبيقها).
- (أحكام القيام والتقبيل في الفقه الإسلامي).

*** (سیروان بێلانە):-**

- ناوی (سیروان عوسمان محەمەد)ە، ناسراوە بە (سیروان بێلانە).
- ساڵی (١٩٦٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٨) دەسپێکی کاری هونەری بووە.
- لە (٤٥) شانۆگەری وەك ئەکتەر بەشدار بووە.
- لە (٢٨) کاری شانۆیی دەرهێنەر بووە.
- بەشداری کردووە لە چەندین فیستیڤاڵی شانۆیی لەسەر ئاستی کەرکوك و کوردستان و عێراق.
- خاوەن چەندین خەڵات و بروانامەی رێزلێنانە گرنگترینیان:
- خەڵاتی باشترین ئەکتەری فیستیڤاڵی شانۆیی لاوانی عێراق لە ساڵی (١٩٩٦).
- خەڵاتی باشترین دەرهێنەر لە یەکەمین فیستیڤاڵی شانۆیی کوردی لە کەرکوك.
- خەڵاتی باشترین ئەکتەری فیستیڤاڵی شانۆی تەبایی و برایەتی.
- ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری تیپی شانۆی ئاشتی کەرکوکە.
- بۆ چەندین ساڵی ئەندامی دەستەی کارگێری سەندیکاو رێکخراوی هونەرمەندانی کوردستان بووە.

*** (سیروان رەحیم):-**

- ساڵی (١٩٦٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- چەندین فلیمی بەڵگەنامەیی دروست کردووە.
- پێنج کتێبی چاپکراوی هەیەو ساڵانێکی زۆرە بەرنامەڤان و ئامادەکاری بەرنامەی دیکۆمێنتاری (کاروان) بووە لە تەلەفزیۆنی (مەد)ی (میدیا).
- فلیمی دیکۆمێنتی (بەشیر موشیر) کە بە ناوی (بلیمەت)ە دوو کاتژمێرو چل دەقیقەیە لەگەڵ دوو کتێبدا بڵاوکردووەتەوە.
- ئێستا لە ئەڵمانیا دەژێت.

**-:سیروان فازڵ فەیزوڵڵا تاڵەبانی ***

- ساڵی ١٩٤٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٠ کۆلیژی (الضباط الاحتياط)ی تەواو کردووە لە خولی ٥٠ بەناونیشانی (مشاة).

- ساڵی ٢٠١٢ خانەنشین کراوە.

*** سیروان سەرگەڵوویی:-**

- ناوی سیروان کوڕی شێخ مەحمود کوڕی شێخ ساڵح باڵدار کوڕی شێخ عەبدوڵڵا کوڕی شێخ محەمەد کوڕی (حاجی شێخ ئەحمەدی سەردار بەرزنجی)یە.
- بەرهەمە بڵاوکراوەکانی: کتێبی (ساداتی بەرزنجە - ژیاننامەی پیاوچاکان، ساڵی ٢٠١٤.
- (خانەقای سەید ئەحمەد لە ئامێزی مێژوودا - ساڵی ٢٠١٥).
- چەند بەرهەمێکی دەستنووسی هەیە کە ئامادەن بۆ چاپ لەوانە:
- کەرکوك چرای زانست و رۆشنبیری.
- ساداتی بەرزنجە، ژیاننامەی پیرانی تەریقەت.

- گەرەکی ئیسکان لە تەمەنی (٥٠)ساڵیدا.
- خانقاة السید احمد ذاکرة في التاریخ، بە زمانی عەرەبی.

*** سیروان کوێخا نەجم:-**

- ناوی (سیروان نەجم ڕەشید)ە.
- ساڵی (١٩٦١) لە کەرکوک لە دایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە کەرکوک تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٩٨- ٢٠٠٢)، کۆلیژی یاسای لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
- لە ٢٢ی (حوزەیرانی) ساڵی (١٩٧٩)ەوە لە ڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانی کاری سیاسی خۆی کردووە.
- لە ٦ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٠)ەوە بووەتە پێشمەرگە لە سنووری دووی چەمی (ڕێزان).
- ساڵی (١٩٨٢) بووەتە فەرماندەی مەفرەزە.
- ساڵی (١٩٨٣) لە شەڕی ناوخۆ برینداربووە.
- ساڵی (١٩٨٤) بووە بە جێگری کەرتی دووی (شوان) لە تیپی (٢)ی کەرکوک.
- ساڵی (١٩٨٥) بووە بە فەرماندەی کەرتی ساڵەیی تیپی (٢١)ی کەرکوک.
- لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨٦) بووە بە فەرماندە لە تیپی (٢٥)ی خاڵخاڵان.
- ساڵی (١٩٨٧) بووە بە فەرماندەی تیپی (٢٣)ی سورداش.
- لە کارەساتی ئەنفال لە سنووری کەرکوک بووە، کە هێزەکانی پەراگەندەی کۆکردەوە لە سنووری مەلبەندی چواری ئەو سەردەمە لە ناوچەی خۆشناوەتی.
- لە هەمان ساڵدا لە دوای ئەوەی ڕژێمی بەعس دەستی بەسەردا گرت، بەفەرمانی (نەوشیروان مستەفا) گەڕاوەتەوە بۆ سنوورەکەی لەگەڵ سی هەڤاڵی تا مانگی دوانزەی ساڵی (١٩٨٨) کە بەردەوام بوونە لە پارتیزانی لە سنووری پارێزگای کەرکوک بەگشتی.
- لە پارتیزانی تووشی دووشەڕی قورس هاتووە، شەڕێکیان لە (چەمی تولکی) لە نزیك (قەرە سالم)، شەڕی دووەمی لە (چەمی کارێزە) کە سێ پێشمەرگە شەهید بوون، پاشان گەڕانەوە بۆ سەر سنوورەکانی بۆ لای سەرکردایەتی.
- ساڵی (١٩٨٩) لەدوای ئەوەی تەشکیلاتی تیپەکانی گۆڕا بۆ (بەتالیۆن) کرا بە فەرماندەی (بەتالیۆن)ی شەشی کەرکوك بەردوام بوو تا داگیرکردنی (کوێت) لەلایەن عێراقەوە.
- ئەوە بووە هۆکاری ئەوەی کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕاپەڕینێکی سەرتاسەری.
- ساڵی (١٩٩١) سەرکردایەتی لە شێوەی پارتیزانی بەشێك لە هێزەکانی ناردەوە سنووری کەرکوك، بۆیە لەگەڵ ئەو هێزانە دەوری بەرچاوی بینیووە.
- هەر لە سلێمانییەوە بەشداری ڕاپەڕینی کوردستانی کرد تا کەرکوك، کە توانیان بۆ ماوەی دە ڕۆژ کەرکوك ڕزگاربکەن، پاشان کۆڕەوی کوردستان دەستی پێکرد، لەکاتی کشانەوەدا تووشی شەڕێکی قورس بوون لە (دەربەندی بازیان)، پاشان بە بەتالیۆنی خۆیانەوە لە شەدەڵە جێگیربوون بۆ ئامادەکردنی تەشکیلاتی تازە پاشان بەرەی کوردستانی دروست بوو، هێزەکانیان هاتنە ناوشارەوە، کە ڕۆڵی گەورەی بینی.
- ساڵی (١٩٩٢) کرا بە بەرپرسی هەواڵگری (قیادة منطقة کرکوك).
- ساڵی (١٩٩٣- ١٩٩٤) کرا بە قایمەقامی چەمچەماڵ.

- سالی (١٩٩٥- ١٩٩٨) بووەتە جێگری پارێزگاری کەرکوك لە دەربەندیخان.
- سالی (٢٠٠٣) کراوە بەئەندامی مەکتەبی ڕێکخستن.
- سالی (٢٠٠٣) لە هێزەکانی تر بەشداری لە پرۆسەی رزگارکردنی کەرکوك کردووە.
- سالی (٢٠٠٤- ٢٠٠٥) بۆتە بەرپرسی مەلبەندی چەمچەمال.
- سالی (٢٠٠٥) لە هەلبژاردنی مەلبەندەکان لە چەمچەمال دەرنەچووە، هاتووەتە مالەوە تا کۆنگرەی سێ بەسترا لە سالی (٢٠١٠).
- لە کۆنگرەی سێ بەئەندامی سەرکردایەتی هەلبژێردرا.
- کرا بە جێگری لێپرسراوی مەکتەبی ڕێکخستن تا ١٢ی کانوونی یەکەمی سالی (٢٠١٢).
- لە ١٢ی کانوونی یەکەمی سالی (٢٠١٢)ەوە کراوە بە لێپسراوی مەلبەندی شەشی (سۆران)، تاکو ئێستاکە بەردەوام لە سەرکارەکەی.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتی کاری سیاسیو ڕێکخراوەییو سەربازیو فەرماندەیی بەشداری شەڕەکانی کەرکوكو کوردستانی کردووە.
- دووجار بریندار بووە، جارێکیان بوو بەهۆی ئەوەی کە قاچی ڕاستی پلاتینی بۆ دابنرێت.
- لە بنەمالەکەیان نۆ شەهیدیان هەیە.

*** سامان گەرمیانی**

پێشمەرگەی دێرینو ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، ناوی تەواوی سامان تۆفیق محەمەد عەلی، لەدایکبووی سالی ١٩٥٥ی کفری خوێندنی سەرەتایی لە کفری تەواو کردووەو ناوەندیی لە بەغدا.
سالی ١٩٧٣ پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو سالی ١٩٧٤ دوابەدوای دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کوردو حکومەتی عێراقدا، بووەتە پێشمەرگە لە بەتالیۆنی یەکی چۆمان، پاش هەرەسهێنانی شۆڕش لە سالی ١٩٧٥، ئاوارەی ئێران بووەو چەند مانگێکی لە کامپی ئاوارەکانی سەراو نیلوڤەر بەسەر بردووە. پاش هەلوەشاندنەوەی کامپەکانی ئاوارەکانو پەرەوازەکردنی، دانیشتووانەکانیان بەسەر شارەکانی ئێراندا ڕەوانەی شاری تەورێز کرا لە پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژهەلات، لەوێ بەشدار بوو لە خولێکی فێرکاریی کارەبایی و دوای تەواوکردنی خولەکە، بەچاودێر لە کارگەیەکی خواردنەوە گازییەکان دامەزرا، لەو ماوەیەدا خرایە ژێر چاودێریی دەزگای ساواکەوە، چونکە ساواك گومانی ئەوەی لێدەکرد کە بەبێ وەرگرتنی مۆلەتی فەرمی سەردانی شارەکانی تر دەکاو پەیوەندی لەگەل ئاوارە کوردەکانی دیکەدا دادەمەزرێنێ، لەو ماوەیەدا هەوالی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی پێ گەیشتبوو و دەشیزانی تالەبانی لە سوریا سەرقالی دانانی بەرنامەیەکە بۆ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری لە کوردستاندا، ئەمەش لەگەل مەیلی کوردپەروەرانەیدا هاوجووت بوو.

لە سالی ١٩٧٦دا لەگەل هەر یەك لە عادل شوکر ئەحمەد فەرحان بادینیو داوود محەمەد عەلی تەورێزیان بەجێهێشتو چوونە شاری ورمێ، لەوێوە بەهاوکاریی چەند دۆستێك، لە سنووری ئێران، تورکیا پەڕینەوەو چوونە سنووری ناحیەی گەڤەرو لەوێوە گەیەنرانە سەر سنووری تورکیا، سوریا، لە شارۆچکەی دێرك پەیوەندییان بەبارەگای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد، لەوێ لەلایەن برایم عەزۆو فەرهاد شاکەلیو عەبدولڕزاق عەزیز میرزاوە بەگەرم گوڕی پێشوازییان لێکرا.
هەر لەو سالەدا لە سوریا لەگەل سەید کەریم هاودیانیو فوئاد عومەر سەرپەرشتی خولێکی پێشمەرگانەی کرد کە بەیارمەتیی سورییەکان بۆ مەشق پێکردنی ١٢٧ کادیری پێشمەرگە ڕێکخرابوو، دواتر لەگەل دکتۆر کەمال خۆشناودا بەشدار بوو لە سەرپەرشتی کردنی خولێکی سیاسی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی پێشمەرگەو دواتر خۆیشی لەگەل هەر یەك لە عەبدولڕەزاق عەزیز میرزاو فەرهاد شاکەلیو مستەفا خوخیو حەسەن ئەرمۆ و هەڤال یەزدینو عادل شوکر ئەحمەدو حوسێن بابە شێخو حەسەن فەیزوللا بەشدار بوو لە خولێکی مەشقو ڕاهێنانی سەربازی کە فەلەستینییەکان لە شاری قامشلوو بۆ کادیرە عەسکەرییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سازیان کردبوو، هەموو ئەم خولانە بەشێك بوون لە بەرنامەی خۆئامادەکردنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری لە کورستان.
لە تشرینی دووەمی سالی ١٩٧٦دا لەگەل تیمێکی مەشق پێکراوی پێشمەرگەدا سوریای بەجێهێشتو چووە ناو خاکی تورکیا بەو نیازەی کە لەوێوە بچێتە بادینان بۆ بەشداری کردن لە خەباتی چەکداریدا، بەلام لەم سەفەرەدا تیمەکە لە ڕێگادا تووشی ئەهامەتییەکی زۆر بوو لەدواییدا ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ سوریا، بەهاری ١٩٧٧ لەگەل تیمێکی تردا هەولێکی تری داو ئەمجارە بەسەرکەوتوویی گەیشتە دۆلی خواکورك، لەوێ لەگەل چەند هەڤالێکدا بەشدار بوو لە هەولەکانی گەیاندنی چەك بۆ پێشمەرگە لە سوریاوە بەناو خاکی تورکیادا.
پاش کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی سەرکردایەتیی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان لە برادۆست لە ئابو ئەیلولی سالی ١٩٧٧و ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگە، کرایە ڕابەری سیاسیو ڕەوانەی سنووری هەرێمی ٨ی دەشتی هەولێر کرا، سالی ١٩٧٨ گوێزرایەوە بۆ هەرێمی ٥ی قەرەداغ بەلام زۆر لەوێ نەمایەوە چونکە تالەبانی کردی بە فەرماندەی مەفرەزەی پاسەوانیی خۆی، لە پایزدا گوێزرایەوە بۆ سنووری هەرێمی ٥ی قەرەداغو لەوێ یەکەم کەرتی هێزی پێشمەرگەی لە سنووری گەرمیان دروست کرد، هەر ئەو سالە لێپرسراویەتی جێگری فەرماندەی هەرێمی ٥ی قەرەداغی پێ سپێردرا کە فەرماندەکەی فەیسەل ڕەشید تالەبانی بوو.
سالی ١٩٨٢ پاش ڕاگرتنی کارکردن بەسیستمی هەرێمەکانو پێکهێنانی تیپەکان، کرایە یەکەم فەرماندەی تیپی ٥١ی گەرمیان کە سنوورەکەی هەمان سنووری

کەرتی ٣ی کفری و کەرتی ٥ی دوز بوو، سالی ١٩٨٤ کرایە لێپرسراوی عەسکەریی مەلبەندی یەك، سالی ١٩٨٦ ئەرکی ڕێکخستنەوەی تیپەکانی مەلبەندی ٣ی پێ سپێردرا.
لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی لە ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەدا کردووە لەوانە شەڕی قاز بەگیان سالی (١٩٧٧)و شەڕی شیوەشان لە دەشتی کۆیەو شەڕی میریاسی خواروو لە قەرەداغ سالی ١٩٧٨، ئۆپەراسیۆنی دابان – هەلاج سالی ١٩٨٥ شەڕەکانی قەیوان – ماوەت سالی ١٩٨٦و ئۆپەراسیۆنی داستانی ڕزگاری لە سالی ١٩٨٧ کە تێیدا سەرپەرشتیی قۆلی بالخی کردووە.
سالی ١٩٨٨ دوای تەشەنە سەندنی جەنگی کیمیایی و کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، لە ئێران گیرسایەوەو سالی دواتر ڕووی کردە سویدو لەوێ جێگیر بوو، هەمان سال بە لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستنی سوید هەلبژێردرا.
سالی ٢٠٠٩ گەڕایەوە بۆ کوردستان، هەر ئەو سالە بەئەندامی خولی یەکەمی ئەنجوومەنی ناوەند دانرا، سالی ٢٠١٠ لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان بە ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی هەلبژێردرا

*** سەلاح ڕەنجدەر.**

**پێشمەرگەو کادیرو ڕۆژنامەنووس ناوی تەواوی سەلاحەددین ئیسماعیل محەمەد ئەمین لەدایکبووی سالی ١٩٦٠ی گەڕەکی ئیمام قاسم لە شاری کەرکوك، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکوك تەواو کردووە.**
**سالی ١٩٧٧ لە پەیمانگای گەشتوگوزاری بەغدا وەرگیراو هەر ئەو سالە پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانەوە کردو لەو ڕێگەیەوە پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد، سالی دواتر بەهۆی ئاشکرابوونی بەشێکی ڕێکخستنەکانی هەولێرو سلێمانییەوە، بۆ ماوەی سالێك هەموو جموجولی خۆی هەلپەسارد، سالی ١٩٧٩ دوابەدوای تەواوکردنی خوێندن و دامەزرانی بە فەرمانبەر لە فەرمانگەی گەشتوگوزاری سلێمانی، جارێکی تر پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردەوە، سالی ١٩٨٢ پەیوەندیی ڕێکخستنی لە سلێمانییەوە بۆ کەرتی ڕێکخستنی بازیان گوێزرایەوەو لەو کاتەدا ئاوات شێخ جەناب لێپرسراوی کەرتەکە بوو.**
**هەر ئەو سالە پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە تیپیی ٥٧ی سەگرمە بوو بە پێشمەرگە، سالی ١٩٨٥ بوو بە کادیری کۆمەلەو ئەرکی سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنەکانی ناوچەی قەرە حەسەن و بەشێکی ڕێکخستنەکانی ناوچەی جەباریی پێ سپێردرا، لەو کاتەدا ڕێکخستنەکان بەهۆی جیابوونەوەی گرووپی ئالای شۆڕشەوە نەختێك شێواوییان تێکەوتبوو، ئەو توانی شانەو هێلە پەرش و بلاوو دابڕاوەکان ڕێك بخاتەوە.**
**سالی ١٩٨٦ لە ڕێکخراوی ٤ی کۆمەلە، پلەی ئەندام کەرتی ڕێکخستنی پێدرا، سالی ١٩٨٩ وازی لە پێشمەرگایەتیی هێنا، بەلام لە ڕاپەڕینی سالی ١٩٩١دا پەیوەندیی بەیەکێتییەوە کردەوە، بەشداریی لە ڕاپەڕیندا کردو دواتر بوو لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی چەمچەمال، سالی ١٩٩٣ بووە لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستنی چەمچەمال و لە سالی ١٩٩٤دا لە پال ئەم لێپرسراوێتییەدا بەسەرپەرشتیاری ناوچەی چەمچەمالی مەکتەبی هۆشیاری و ڕووناکبیری دانرا، هەر ئەو سالە لەناو بارەگای کۆمیتەکە ڕادیۆی دەنگی کەرکوکی دامەزراندو بۆ ماوەی شەش مانگ خۆی بەڕێوەی برد، پاشان مەهدی کاکە حەمەو عارف قوربانی بوونە بەڕێوەبەری ڕادیۆکە، سالی ١٩٩٥ بووە لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستنی ٦ی کەرکوك.**
**سالی ١٩٩٩ گوێزرایەوە بۆ مەلبەندی پێشمەرگەو لەوێ وەك لێپرسراوی کۆمیتەو ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (ڕێبەری پێشمەرگە) کار کرد، سالی ٢٠٠٤ لە کەرکوك ڕۆژنامەی (ڕای ئازاد)ی بەهەردوو زمانی عەرەبی و کوردی دەرکرد، ئەم ڕۆژنامەیە کە لە ماوەی ١٠ مانگدا ٢٠ ژمارەی لێ دەرچووە، یەکەم ڕۆژنامەی سەربەخۆیە لە کەرکوك دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس. سالی ٢٠٠٦ بوو بە کارگێڕی مەلبەندو لێپرسراوی بەشی ڕووناکبیری و سەرنووسەری گۆڤاری (ڕێبەری پێشمەرگە)، سالی ٢٠٠٨ لە بەشی زمانی عەرەبیی زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی دەستی بەخوێندن کرد، سالی ٢٠١٠ بوو بە جێگری لێپرسراوی مەلبەندو بەردەوامیش بوو لەسەر کارەکەی وەك سەرنوسەری گۆڤاری (ڕێبەری پێشمەرگە) تا وەستانی گۆڤارەکە لە مانگی ئەیلولی سالی ٢٠١١، دوای ئەوەی کە ١٢٠ ژمارەی لێ دەرچوو، ڕاستەوخۆ پاش ئەمە هەمان مانگ وەك سەرنووسەری گۆڤاری (سەنگەر)، دەستبەکار بوو کە یەکەم ژمارەی لەو مانگە دەرچوو. لەپال سەرنووسەریی ئەم گۆڤارە لێپرسراویەتی بەشی ڕووناکبیریی مەلبەندی پێشمەرگەشی گرتە ئەستۆ.**
**دیارترین بەرهەمەکانی (بازنەی ئاگر)، سالی (٢٠٠٠)، (فەرهەنگی مەشخەلان بۆ مێژووی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان)، سالی (٢٠٠٦).**

*** سەنگەر قوباد**

**– ١٩٨٣/٨/٢٠ لە کەرکوك هاتووەتە دونیاوە.**
**– ٢٠٠٧/٢/١٨ بەشداریی پێشانگەیەکی هاوبەشی لە گەلەریی لقی کەرکوکی ڕێکخراوی هونەرمەندانی کوردستان کردووە.**
**– ٢٠٠٧/٦/٢ بەشداریی پێشانگەیەکی هاوبەشی لە گەلەریی مۆزەخانەی نیشتمانیی سلێمانی کردووە.**
**– ٢٠٠٧/١١/٢١ بەشداریی پێشانگەیەکی هاوبەشی لە گەلەریی قشلەی کەرکوك کردووە.**
**– ٢٠٠٩/٦/١ بەشی شێوەکاریی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوکی تەواو کردووە.**
**– ٢٠٠٩/٦/٩ بەشداریی پێشانگەیەکی هاوبەشی لە گەلەریی قشلەی کەرکوك کردووە.**
**– ٢٠١٠/٩/١ وەك مامۆستا لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی**

چەمچەماڵ دامەزراوە و تا هەنووکە بەردەوامە.
- ٢٠١٣/٤/١٤ بەشداریی پێشانگەیەکی هاوبەشی لە گەلەریی مۆنەمێنتی ئەنفال لە چەمچەماڵ کردووە.
- ٢٠١٤/١٠/١٥ لەگەڵ هەریەك لە شێوەکاران گارا رەسول و عەلی دەروێش و نووسەر شاهۆ عەبدولقادر دا، پرۆگرامێکی تیۆریی شێوەکاری لە کەرکوك بە ناونیشانی (پرۆگرامی کارکردن لە هونەری شێوەکاری لە کەرکوك) دامەزراندووە، کە کارکردنە لەسەر هونەری شێوەکاری بە شێوەیەکی تیۆری.
- ٢٠١٤/١٠/٢٠ لە سیاقی (پرۆگرامی کارکردن لە هونەری شێوەکاری لە کەرکوك) لەبارەی بابەتی (بە جیهانگیریکردنی هونەری شێوەکاریی هاوچەرخ)ـەوە دوواوە، کە لە هۆڵی مستەفا گەرمیانی لە کۆمەڵەی رووناکبیری و کۆمەڵایەتیی کەرکوك بەڕێوەچوو.
- ٢٠١٥/٣/٨ بەشداریی پێشانگەیەکی هاوبەشی لە گەلەریی رۆشنبیریی چەمچەماڵ کردووە.
- ٢٠١٥/٣/٢٩ لە سیاقی (پرۆگرامی کارکردن لە هونەری شێوەکاری لە کەرکوك) لەبارەی بابەتی (سەرەتاکانی هونەری شێوەکاریی باشووری کوردستان) ـەوە دوواوە، کە لە هۆڵی کتێبخانەی گشتیی کەرکوك بەڕێوەچوو.
- ٢٠١٥/٦/١٤ لە سیاقی (پرۆگرامی کارکردن لە هونەری شێوەکاری لە کەرکوك) لەبارەی بابەتی (دابەشبوون و کۆکردنەوەی هونەرەکان) ـەوە دوواوە، کە لە هۆڵی مستەفا گەرمیانی لە کۆمەڵەی رووناکبیری و کۆمەڵایەتیی کەرکوك بەڕێوەچوو.
- ٢٠١٥/١٠/١٩ لە سیاقی (پرۆگرامی کارکردن لە هونەری شێوەکاری لە کەرکوك) لەبارەی بابەتی (هونەری شێوەکاریی پاش نوێگەری)ـەوە دوواوە، کە لە هۆڵی مستەفا گەرمیانی لە کۆمەڵەی رووناکبیری و کۆمەڵایەتیی کەرکوك بەڕێوەچوو.
- ٢٠١٥/١١/١٧ پێشانگەی تایبەت (پرۆژەی تەلبەند) ی لە گەلەریی رۆشنبیریی چەمچەماڵ کردووەتەوە.
- ٢٠١٦/٥/٣٠ لە سیاقی (پرۆگرامی کارکردن لە هونەری شێوەکاری لە کەرکوك) لەبارەی بابەتی (داماڵینخوازیی شێوەکاری) ـەوە دوواوە، کە لە قاوەخانەی کولتووریی کەرکوك بەڕێوەچوو.
- لە ٢٠٠٧ ـەوە تا هەنووکە لە بواری هونەری شێوەکاری دەنووسێت. بابەتی هونەری لەم رۆژنامانەدا نووسیوە: ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ، هزر و هونەری خەبات، روانگە و رەخنەی چاودێر، هاوڵاتی.

*** سدیق بلووکێنی:-**

- سدیق کوری عەلی کوری حەسەن کوری حوسێنە.
- ساڵی ١٩٢٧ لە دێی (بلووکێن)ی سەر بە ناوچەی (ئاغجەلەر)ی قەزای چەمچەماڵ هاتووەتە دنیاوە. بە منداڵی چووەتە حوجرە، لای مەلا عەبدولعەزیزی شیلەخانی (عەبدولعەزیز کوری محەمەد گووروون) لە مزگەوتی حاجی قادری عەللاف و مزگەوتی عەبدولرەزاق

لە شاری کەرکوك خوێندوویەتی، هەموو زانستێکی ئایینی تەواو کردووە و ئیجازەی لێ وەرگرتووە، بەڵام نەبووە بە مەلا. لەوێ دووکانی فرۆشتنی کەرەستە و ئامێری کارەبایی داناوە.
- هەر لە لاوییەوە تێکەڵی سیاسەت بووە و بە ئەندامی (حیزبی هیوا) وەرگیراوە. پاشان چووەتە ریزی (پارتی دیموکراتی کورد). هێندە چالاك و هەڵسووڕاو بووە، بووە بە بەرپرسی لیژنەی ناوچەی کەرکووکی پارتی.
- ساڵی ١٩٥١ بەر لە سازدانی دووەم کۆنگرەی پارتی، بووە بە لایەنگری باڵی ساڵح رۆشدی دژی باڵی هەمزە عەبدوڵڵای سکرتێری ئەوسای حیزب.
- سدیق بلووکێنی، بە حوکمی پێوەندییە فراوانەکەی، تێکەڵی لایەنە سیاسییەکانی دیکەی عێراق بووە، بە تایبەت حیزبی نیشتمانیی کامیل چادرچی، تەنانەت بووەتە بەرپرسی لقی کەرکووکی ئەو حیزبە و خاوەندی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری رۆژنامەی کوردی- عەرەبیی حەفتانەی (رای گەل- رای الأهالي)ی ئۆرگانی حیزبەکەیش کە لە کەرکوك دەرچووە. لەبەر ئەوەی پیاوێکی پڕ جموجووڵی کارا بووە، تاقمێك تورکمانی ناحەز رۆژی ٢٧ی ئابی ساڵی١٩٦٢ غافڵکوژی کردووە. ئیدی منداڵەکانی لای باپیریان لە دایکەوە دەستی سۆزیان بەسەردا کێشراوە و گەورە کراون.
- سدیق بلووکێنی، رۆژی ٥ی تشرینی دووەمی ساڵی١٩٤٧ ژنی هێناوە و لە خاتوو "نازدارە کچی مەلا عەبدولعەزیزی محەمەد گووروون" ئەمانەی هەن: ئاواز ١٩٤٩، کەنعان ١٩٥٣، دڵشاد ١٩٥٦، ئازاد ١٩٥٧، نەوزاد ١٩٦١، نەزەهات ١٩٦٣.

له فرۆکەخانەی کەرکوك، سالی ١٩٦٣

*** سەمەدی باروتچی:-**

- ئەم پیاوه له (لەیلان) بوو، پیشەی دروستکردنی باروورد بوول ە شیاکه و تەپاله و ڕیخی ئاژەڵان.

- له لەیلان باروتچییەکان ئەمانەیان له مەنجەڵی گەورە.. گەورەدا دەناو و ئاوی کوڵهاتوویان بەسەردا دەکرد، مەنجەڵ و قازانەکان بنەکانیان کونکونبوون، تەشتی گەورەیان لەژێردا بوو، ئەو ئاوه کوڵهاتووەی دەکرا بەسەر ڕیخەکەدا لەژێرەوه ئەو تەشتانەدا کۆ دەبووەوه دەخرانه سەر ئاگر و خڵتەکان وشك دەکرانەوه، دوایی بەچەند کارێکی تایبەت باروودیان بەرهەم دەهێنا.

*** عەقید ساتع ڕەئفەت ڕەفیق خادم سوجادە:-**

- سالی ١٩٣٣ له کەرکوك لەدایکبووه.
- دەرچووی کۆلێژی سەربازی بووه له (بەغدا) له خولی ٣٤ له بەشی پیادە.
- ئەندامی دادگای سەربازی بووه له بەغدا له کەرخ.
- له سالی ١٩٨٠ بەڕووداوی هاتووچۆ کۆچی دوایی کرد.

*** ئیمامی سەربازی مەلا سەعید محەمەد سەید عەزیز پیریادی:-**

- سالی ١٨٩٩ له گەڕەکی پیریادی له کەرکووك لەدایکبووه.
- باوکی ئیمام بووه له مزگەوتی پیریادی له مزگەوتی مەلا عابید، زانستی ئایینی له مزگەوتی مەلا ڕەزای واعیز له هەمان گەڕەك بەدەستهێناوه.
- دوای ئیجازەی ئایینی بووەته ئیمام له گوندی پیریادی لەنزیك چەمچەماڵ لەدوایدا چووەته گوندی عەلی مەنسوور له چەمچەماڵ لەوێ کتێبێکی نووسیوه بەناوی (پێشکەش وەتەن) دەربارەی مێژووی کورد که پێشکەش به مێژوونووس ئەمین زەکی کردووه.
- سالی ١٩٤٠ کراوه به ئیمام له سوپا له سەماوه لەدوای شەش مانگ گواستراوەتەوه بۆ دیوانیه سالی ١٩٤٢ گواستراوەتەوه بۆ کەرکوك دوای چوار مانگ گواستراوەتەوه بۆ شەنگال لەدوایدا بۆ موسڵ و چوار ساڵ لەوێ بووه له کۆتاییدا گواستراوەتەوه بۆ (فوج حراس کرکوك).
- سالی ١٩٤٩ کۆچی دوایی کردووه له گۆڕستانی موسەلا نێژرا.

*** ڕائید سەرحان ڕۆبیتان قادر داودی:-**

- سالی ١٩٢٦ له خورماتوو لەدایکبووه.
- سالی ١٩٤٧ له (مدرسة الصنايع العسكرية) له بەغدا دەرچووه له خولی (الهندسة الآلية الكهربائية).
- هەروەها له سالی ١٩٦١ له کۆلێژی (الضباط الاحتياط) دەرچووه.
- ماوەیەك ئامری (مذخر تموين) بووه له بەغدا.
- سالی ١٩٧٥ خانەنشین کراوه.
- له ١٣ی ئاداری سالی ٢٠٠٢ کۆچی داویی کردووه.

* سالەح بندیلك:-

لە سالآنی پەنجاکانی سەدەی پێشووداو لە ناحیەی قادرکەرەم کەسێك هەبوو بەناوی (سالەح بندیلك) پیاوێکی قەلەوی کورتیلەی سوورکەلآنەی بێ مزەپڕەت بوو. ژیانێکی سادەی هەبوو، بەزۆری خەریکی ڕاوی تەیر و تەوالْ و ماسی بوو، زۆر حەزی لە ڕاوە سوێسکە بوو، چەندین جۆر داوی هەبوو کە لە کلکە بارگیر دروست کرابوون، جارێکیان چووبوو بۆ ڕاو بەبێ ئەوەی سوێسکە مێکە و داوەکەی لەگەلْ خۆیدا ببات، ئەچێتە ناو چالێکەوە دەخەوێ و بە گژوگیا خۆی دادەپۆشێ و دەستی دەردەکات و لەپی پان دەکاتەوە، وەکو سوێسکەی مێ دەخوێنێت، سوێسکە نێرەکان دێنە دەنگی خوێندنەکەیەوە، هەر سوێسکێ دێتە سەر دەستی یەکسەر دەیگرێت، هەندە مەعلان بوو شوێن پێی سوێسکەی نێر و مێی لێك جیا دەکردەوە.

هەروەها شارەزا بوو لە شوێن پێ هەلگرتنی دز و تا دەچووە سەریان و دەیانیگرت.

جارێکیان دووکانەکەی حاجی مارفیان لە قادر کەرەم دزی، دنیا زستان و باران بوو، مەلا بانگدانی بەیانی مام عەبە کلکاش کردییە بان قەلآکەیا و جاڕی دا کەس لە مالْ دەرنەچێت، کەس مەڕومالآت دەرنەکات دووکانەکەی حاجی مارف دزراوە، تاوەکو سالەح بندیلك شوێنی پێی دزەکان هەلکات.

مام سالەح و چەند پیاوێکی ڕەشید ڕەزنەیان بەست و کەوتنە دوای، لەبەردەم دووکانەکەوە شوێنی پێی دزەکەی هەلگرت، ئەم کۆلآن و ئەو دۆلْ وئەم دەشت و ئەو تەلآن ڕۆیشت، تا گەیشتە ئاواییەك، چووە بەر دەرگای مالێك و جۆری پێلآوی دزەکە و دزەکەی دۆزییەوە.

* سیروان عومەر:-

- یەکێکە لە هونەرمەندەکانی کەرکوك کە لە بواری گۆرانی و مۆسیقادا دەستێکی بالآی هەیە و گەلێك بەرهەمی بە پێزی بەرهەمهێناوە لە بوارەکەیدا.

- ئێستا سەرپەرشتیاری هونەری لە خوێندنی کوردی لە شاری کەرکوك.

- ماوەیەك ئامادەکار و پێشکەشکاری بەرنامەی هونەری بوو لە کەنالی ئاسمانی کەرکوك دەربارەی مەقامات.

* سوفیان جەلال

- لە شاری کەرکوك لەدایکبووە

- کۆلێژی هونەر بەشی شێوەکاری لە سلێمانی تەواو کردووە

- لە ١٦ی شوبات تا ٣٠ی شوباتی ٢٠١٩ پێشانگای (هەلوەرین)ی لە سلێمانی لە کارگەی کۆنی جگەرەی سلێمانی کردووەتەوە.

* د. سەید ئەحمەد نەقیب:-

- لە سالی ١٩١٠ لە کەرکوك لەدایکبووە.

- سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە و کۆلێژی پزیشکی لە بەغدا خوێندووە.

- بەشداری خولی ئەفسەرانی یەدەکی کردووە و بە پلەی مولازمی یەکەمی پزیشك دەرچووە.

- سالی ١٩٤٦ پلەکەی بەرز دەکرێتەوە بۆ نەقیب.

- جگە لە زمانی دایك زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و تورکی و عەرەبی زانیوە.

- لە نەخۆشخانەی سەربازی کەرکوك ئەفسەری پزیشك بووە.

بارەگای تیپی دووی سەربازی سوپای عێراق، سالی ۱۹٦۳

بارەگای تیپی دووی سەربازی سوپای عێراق، سالی ۱۹٦۳

دکتۆر سینان سەعید

دکتۆر سینان سەعید لەگەڵ شاعیر نازم حیکمەت

دکتۆر سینان سەعید لەگەڵ چەند ناودارێکی ئازەربایجانی

سینان سەعید  لە ساڵی ١٩٧٩ لە بەغدا

سەییدوەڵەد ئاغای کاکەیی

سابیر عەلی ئەحمەد

سەبیحە خەلیل زەکی

سەباح حەسەن نەجم

دکتۆر سەلیم نوحاس بەڕێوەبەری تەندروستی کەرکوک

مەلا ساڵح جەریسی

سوعاد شاکیر

سەمیر فەتاح

سەلمان شێخ بزێنی

دکتۆر سایفن عەبدولقادر

*** د. سەمەد ئەحمەد**

- ساڵی ١٩٦٥ لە گەڕەکی شۆڕیجەی شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- لەسەر هەڵوێستی سیاسی، ساڵی ١٩٨٤ لەلایەن دەزگاکانی ئەمنی ڕژێمی بەعسەوە دەستگیر کراوە.
- ساڵی ١٩٩١ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بواری پەروەردە، لە زانکۆی موسڵ بەدەستهێناوە.
- ساڵی ٢٠٠٦ بڕوانامەی ماستەری لە بواری پەروەردە و دەروونناسی لە زانکۆی کۆیە بەدەستهێناوە.
- ساڵی ٢٠١٣ بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری دەروونناسی پەروەردەیی، لە وڵاتی لوبنان بەدەستهێناوە.
- لە زانکۆی لە سلێمانی، کۆلێجی یاساو رامیاریشی تەواو کردووە و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زانستە سیاسییەکاندا بەدەستهێناوە.
- ئێستا مامۆستایە لە کۆلێجی پەروەردەی چەمچەماڵ لە بەشی پەروەردە و دەروونناسی.
- لە بواری کۆنفرانسە زانستییەکاندا، لە ساڵانی ١٩٩٤ تاوەکو ٢٠١٤ بەشداری چەندین کۆنگرەی زانستی وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵای کردووە، هەروەها بەشداری پێنجەمین کۆنگرەی زانستی کۆلێجی رامیاری کردووە لە چەمچەماڵ و لە سلێمانی کە لە ساڵی ٢٠١٤ بەڕێوەچووە.
- لە ڕۆژی سێشەممە ڕێککەوتی ٦ی ئاداری ساڵی ٢٠١٧ لە زانکۆی کوردستان، لە شاری سنە، بەتوێژینەوەیەك بەناونیشانی (تراژیدیای هەڵەبجە.. هەوڵێك بۆ ناسینی بەعسیزم) بەشداری کۆنفرانسی زانستی ٢٩ ساڵەی کیمیابارانی هەڵەبجەی کرد و بەو بۆنەیە خەڵاتکرا.
- زیاتر لە ١٢ ساڵ لە بواری ڕاگەیاندنی (نووسراو و بینراو و بیستراو)دا کاری کردووە. لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنە ناوخۆیی و کەناڵە ئاسمانییەکاندا دەیان چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازکراوە.
- کتێبە چاپکراوەکانی بریتین لە :-
- ساڵی ٢٠٠١ نمایشی جەستە بێدەنگەکان - کۆمەڵە چیرۆك.
- ساڵی ٢٠٠١ خوێندنەوەیەك بۆ بیری ماکیاڤیللی - لێکۆڵینەوە.
- ساڵی ٢٠٠١ جیهانگیریی، سەرهەڵدان و گەشەکردنی - لێکۆڵینەوە.
- ساڵی ٢٠٠٣ لەناو بازنەی دەقدا، ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.
- ساڵی ٢٠٠٤ سیستمەکانی هەڵبژاردن - لێکۆڵینەوە.
- ساڵی ٢٠٠٦ مەملەکەتی ئیسکەکان - کۆمەڵە چیرۆك.
- ساڵی ٢٠٠٧ لە سێبەری پرسیاردا - دیدار.
- ساڵی ٢٠١٠ سایکۆلۆژیای دەسەڵات و جەماوەر - لێکۆڵینەوە.
- ساڵی ٢٠١٢ گەڕانەوەی تارماییەکەی ژەنەڕاڵ - کۆمەڵە چیرۆك.
- پێنج جار بەشداری فیستیڤاڵی گەلاوێژی کردووە، دووجار خەڵاتی یەکەمی بەدەستهێناوە، دووجار خەڵاتی دووەمی چیرۆکی بەدەستهێناوە، یەك جار خەڵاتی سێیەمی چیرۆکی بەدەستهێناوە.
- خەڵاتی دووەمی چیرۆکی (یەکەم فیستیڤاڵی ئەدەبی ژنان)ی بەدەستهێناوە.
- دیاری و خەڵاتی تایبەتی فیستیڤاڵی شەهید شێخ مارف بەرزنجی بەدەستهێناوە.
- دیاری تایبەتی ڕۆژنامەی (هەواڵ)ی وەرگرتووە.
- دیاری تایبەتی ڕۆژنامەی (ڕێبازی نوێ)ی وەرگرتووە.

ئەم وێنەیە (سامی عەبدولمەجید عەبدولغەفار هەورامی)یە دەگەڕێتەوە بۆ ١٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٩ کە (٣٨) ساڵ لەمەوپێش لە نەخۆشخانەی بەسرە گیراوە لەو کاتەدا سامی و مام مەجیدی باوکی و خوشك و براکانی زیندانی کرابوون لە زیندانی بەعسدا، لە وێنەکەدا وا دەردەکەوێت سامی نەخۆش کەوتووە، بۆیە گوازراوەتەوە بۆ ئەو نەخۆشخانەیە.

*** شاخەوان مەنسوور:-**

**- ناوی (شاخەوان مەنسوور فەتاح)ە.**
**- لە ٥ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٢ لە گەڕەکی ئیمام قاسمی کەرکوك لەدایکبووە.**
**- دەرچووی زانکۆی بەسرەیە بەشی کۆلێژی زانست.**
**- کوری مەنسوور چایچی گەرەکی ئازادییە، لە دوای نسکۆی ١٩٧٥، هەموو رۆژێك کێشەی کورد مێشکی ئەکرۆژی،(جاسمی حاجی محەممەد) هاورێی زیندانی دەکرێ، چیرۆکی (دەبا ساتێکیش چاولێکنێ )ی بۆ دەنووسێ.**
**- لە سەرەتای هەشتاکانەوە کە حکومەت دەست دەکات بە رووخاندنی گوندەکانی دەوروبەری شاری کەرکووك،چیرۆکی (گەرانە بۆ هەوار )دەنووسێت. پاش راپەرین و بەهاری ئازادی کوردان، ئیدی دەرگا بە رووی وشەی کوردیدا، والا دەبێت، بە دەیان: وەرگێران و نووسین و گوتار و چاوپێکەوتن و... هتد. لە زۆربەی هەرە زۆری رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بلاودەکاتەوە. دواتر روو دەکاتە کتێب و کتێبۆکە و راپۆرتی درێژ درێژ...هتد.**
**- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-**
**- نەتەوە بێ دەوڵەتەکان - ساڵی ١٩٩٩ لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی. نووسینی گیدۆن گۆتلیب.**
**- ناوی سازگار لە رۆژهەلاتی دەریای سپی دا - ئامادەکردن و نووسینی چەند سەرنجێك ساڵی ١٩٩٨ .**
**- سۆسیال دیموکرات و کۆمۆنیستەکانی ئەورووپا - لە عەرەبییەوە کراوە بە کوردی، نووسینی عەبدول عاتی محەممەد ئەحمەد، ئازاری ساڵی ٢٠٠١ .**
**- سەد پرسیار و وەلام + پەنجا پرسیار و وەلام، ئەم دوو کتێبە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ مەکتەبی رێکخستنی (ی. ن. ك) پلەی هەر کادرێکی بەرز بکردایەتەوە، لەم دوو کتێبە تاقیکردنەوەی بۆ دەکردن. ساڵی ١٩٩٩ .**
**- رەنگی دیموکراسی لە کوردستان دا، لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی- نامیلکەیەکی بچووکە ساڵی ٢٠٠٠. ناوی سەرچاوەکەی:**
Searching for Democracy from Media to America, by Dr. Stephan Mansfield and Douglas Layton.
**- پێشکەوتنی جیهانی لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی و ٩٢ لاپەرەیە و فلیپس گۆنزالس نووسیوویەتی.ساڵی ٢٠٠١.**
**- سەرهەلدانی ئاژاوەگێری لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی**
**- نووسینی: رۆبەرت دی. کاپلان، ١٧٤ لاپەرەیە، لەسەر داوای دکتۆر بەرهەم ساڵح کراوە بە کوردی. ساڵی ٢٠٠٣ لە بلاوکراوەکانی خانەی وەرگێرانی (ح. هـ. ك).**
**- کۆمەڵی مەدەنی و سەرلەنوێ بیناکردنەوەی کۆمەڵگا**
**- لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی، نووسینی: جۆرج. ف. ماکلین، ١٩٤ لاپەرەیە و لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك) ساڵی ٢٠٠٤.**
**- حیزبی دیموکرات لە ئەمریکا - لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی، بە هاوکاری سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان بلاوکراوەتەوە- لقی کەرکووك. ٢٠١١. ناوی سەرچاوەکەی:**
Wikipedia. The free encyclopedia
**- عێراق لە گۆرەپانی نێو دەوڵەتیدا،سیاسەتی دەرەوە و ...هتد. لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی، لە ژمارە (٦٢٨٤) کوردستانی نوێ بە شێوەی ئەلقە بلاوبووەتەوە تا دەگاتە ژمارە (٦٣٢٠).**
**- فەرهەنگی مێژوویی کورد، لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی- نووسینی: مایکل. م. گونتەر ، ٤٤٣ لاپەرەیەو ئامادەیە بۆ بلاوکردنەوە و ماوەیەکی دی دەکەوێتە بەر دیدەی خوێنەران.**
**- شاخەوان مەنسوور خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری سۆنگەیە، کە هەڵمەت هۆشیار سەرنووسەری بوو و ٥ ژمارەی لێدەرچووە.**

* ( شاخەوان كەركوكی - عەوف عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵا ):-

- ساڵی (١٩٦٨) لە كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٩٢) كۆلێژی كشتوكاڵی زانكۆی موسڵی تەواو كردووە.
- ساڵانی (١٩٩٥-١٩٩٨) هەواڵساز بووە لە بەشی عەرەبی رادیۆی دەنگی كوردستان لە عێراق.
- ساڵانی (١٩٩٦-٢٠٠٠) وەكو وەرگێر كاری كردووە.
- ساڵی (٢٠٠٠)ەوە وەكو وەرگێڕ كاری كردووە لە دەزگای (ئاراس) بۆ چاپ و پەخش.
- ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٥) لە دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (باسەرە) بووە.
- ساڵانی (٢٠٠٥-٢٠٠٧) لە دەزگای (شەفەق) كاری كردووە.
- ساڵانی (٢٠١٠-٢٠١٢) سەرنووسەری ڕۆژنامەی (بزاو) بووە.
- ساڵی (٢٠١٢)ەوە سەرنووسەری گۆڤاری (واتە) بووە.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (الشهداء الضالون)، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- (البارزاني، من مهاباد إلى آراس)، وەرگێڕان لە كوردییەوە.
- (وكالات الانباء، من الحمامة إلى الانترنيت)، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- (شبح الغرفة ١٣)، كۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- بەشداری كردووە لە وەرگێڕانی:
- (یهود كردستان) وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- (الصحافة مهنة الاخلاق)، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی.
- (الشهداء الضالون)، وەرگێڕان بۆ كوردی.
- (سیرة الابهی)، وەرگێڕان بۆ كوردی.

* ( شاغازی پاشا شاهوار زادە ):-

- ساڵی (١٦٥٥) بووەتە والی كەركوك كە تا (١٦٥٨) خایاندووە ماوەی فەرمانڕەواییەكە سێ ساڵ بووە لە دوای خۆی والی محەمەد پاشا ساری جێگەی گرتووەتەوە.

* ( شاكیر سابیر زابت ):-

- ساڵی ١٩١٣ لە كەركوك لەدایكبووە.
- سەرەتایی لە كفری تەواو كردووە.

- ئامادەیی لە كەركوك و بەغدا تەواو كردووە.
- لە یەكی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٨ كۆلێژی سەربازیی بە پلەی مولازمی دووەم تەواو كردووە.
- ساڵی ١٩٥٩ خانەنشین كراوە.
- هەر لە ساڵی (١٩٤١)ەوە ئارەزووی كتێب كۆكردنەوەی هەبووە، كتێبخانەیەكی گەورەی پێكەوە ناوە نزیكەی نۆ هەزار كتێبی تێدا بووە.
- ساڵی ١٩٦٨ كۆمەڵەیەكی ڕۆشنبیریی دامەزراندووە بە ناونیشانی (جمعیة نشر الثقافة والمعرفة) كە لە نیسانی هەمان ساڵ تا ١٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ بەردەوام بووە.
- كتێبخانەیەكی ئەهلی هەبوو بە ناونیشانی دار (الأقلام التركمانیة) لە شەقامی ڕەشید لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧١.
- ٣١ی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٠ كۆچی دوایی كردووە.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (تاریخ الصداقة بین العراق وتركیا)، لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەغدا، ١٩٥٥.
- (موجز تأریخ التركمان في العراق)، لێكۆڵینەوەیەكی مێژویی، چاپخانەی (المعارف) بەغدا، ١٩٦١.
- (عراق توركمانلری اغزندە اتالر سوزی)، دەربارەی پەندی پێشینانی توركمانی، چاپخانەی (البصري)، بەغدا، ١٩٦٢.
- (كركوكدە إجتماعی حیات)، چاپخانەی (زمان)، بەغدا، ١٩٦٤.
- (الكیل والمیزان والمقیاس في المدن العراقیة في القرن التاسع عشر)، چاپخانەی (المعارف) بەغدا، ١٩٦٤.
- (بیات عشیرتي حقندة تأریخي اراشدیرما)، چاپخانەی (زمان) بەغدا، ١٩٦٥.
- (بزدكي اخلاق واخلاق اكلامي دردي)، چاپخانەی (الجاحظ)، بەغدا، ١٩٦٦.

(العلاقات الدولية ومعاهدات الحدود بين العراق وإيران)، دەربارەی یاسای نێودەوڵەتی گشتی، لە بڵاوکراوەکانی (دار البصري)، بەغدا ١٩٦٦.
- (الرموز والإشارات والعلامات في المطبوعات العربية)، چاپخانەی (الأمة) بەغدا، ١٩٦٨.
- (ضابطك كوزكوس)، چاپخانەی (الأمة) بەغدا، ١٩٦٨.
- (ضابطك مكتبي)، چاپخانەی (الأمة) بەغدا، ١٩٦٨.
- (ضابطك كوز ياشلري)، چاپخانەی (الأمة)، بەغدا، ١٩٦٨.
- (موجز تأريخ الصحافة في كركوك)، دەربارەی مێژووی رۆژنامەگەری، چاپخانەی (دار الجمهورية)، بەغدا، ١٩٦٩.
- (تأريخ المنازعات والحروب بين العراق وإيران)، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا، ١٩٨٤.

*** شاكیر ئەفەنی سەید محەمەد:-**

- ساڵی (١٩٠٢) لە کەرکوك لەدایك بووە.
- ساڵی (١٩٢٧) خانەی مامۆستایانی لە بەغدا تەواو کردووە لە هەمان ساڵ لە قوتابخانەی (ئسیرائیلیە) دەکرێتە مامۆستا.
- لە (٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٨) راژەکەی دەگوازرێتەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆو دەکرێتە بەرێوەبەری ناحیەی (پێنجوێن).
- لەنێوان ساڵانی (١٩٣٨- ١٩٤٦) بەرێوەبەری ناحیە دەبێت لە:- مزوری باڵا، ناحیەی بەرزنجە، ناحیەی مەڵحە، ناحیەی قەڵادزێ، ناحیەی خورماتوو، ناحیەی حەریر.
- ساڵی (١٩٥٩) دەکرێتە یاریدەدەری موتەسەریفی لیوای (رومادی).
- ساڵی (١٩٦١) دەکرێتە یاریدەدەری موتەسەریفی (عەمارە)
- ساڵی (١٩٤٢) دەگوازرێتەوە بۆ سنووری کەرکوك‌و دەکرێتە بەرێوەبەری ناحیەی (مەڵحە).

*** (شاكی):-**

- ناوی (محەمەد شاكی)یەو لە سەدەی هەژدەهەمدا لە کەرکوك ژیاوە.
- یەکێکە لە شاعیرە سۆفیزمەکانی کەرکوك بەپێی سەرچاوەی (محەمەد ئەمین زەکی).
- لە ساڵی (١٨٦٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** (شاهین ئەحمەد محەمەد):-**

- ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لە کۆلێژی هونەرەجوانەکان لە بەغدا لەنێوان ساڵانی (٢٠٠١-٢٠٠٢) تەواو کردووە.

*** (شەرەفەددین جەباری):-**

- ساڵی (١٩٧١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مدينة اغرقت في الظلام-صور ووثائق)، (٢٠٠٨).
- (قراءة لأبرز المحطات والاحداث المهمة في المسيرة النضالية الـ(٣٤) للاتحاد الوطني الكردستاني)، ٢٠٠٩.

* خاص جدا)، ٢٠١١.
* یەکێتیانە)، ٢٠١١.

*** شەریف ناڵبەند):-**

- ناوی (مەلا شەریف کوری محەمەد کوری سەلیم ناڵبەند) ە و یەکێکە لە شاعیرو زانا ئایینییەکانی ناوچەی لەیلان لە کەرکوك.
- گەلێك بەرهەمی دەستنووسی لێ بە جێماوە وەکو (فتح الاعزان).

*** (شەفیق عومەر):-**

- یەکێك بووە لەو مامۆستا بەناوبانگانە کە شارەزایی لە هونەری خەتی (ثلث)و (نسخ)دا هەبووە.
- بەرێوەبەری قوتابخانەی ئیمام قاسم بووە.

*** (شەکیبە وەنداوی):-**

.ساڵی (١٩٤٠) لە کفری لەدایکبووە -
- دەرچووی قوتابخانەی (مدرسة الفنون البيتية)ی لە کەرکوك تەواو کردووە لە ساڵی (١٩٦٠).
- ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە.
- دیوانێکی شیعری چاپکراوی هەیە لە ساڵی ١٩٦٨ لە ئەستانبول چاپی کردووە.

*** (شەمسەددین تاهیر خانچی):-**

- ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- گەلێك چیرۆك‌و نووسینی بە زمانی عەرەبی هەیەو کتێبێکی چاپکراوی هەیە بەناونیشانی (افكار من حياتي).
- لە (٧)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٣) کۆچی دوایی کردووە.

* (شەمسەددین تورکمان ئۆغلو):-

- ناوی (شەمسەددین ئەحمەد خەلیل)ە.
- سالی (١٩٥٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك.
- بەرهەمەکانی:
- (جوبان ایله اوجی)، شیعری میللی بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، بەغدا، ١٩٩٠.
- (ارزی قمر)، شانۆگەرییەکی شیعری بە زمانی تورکی، کەرکوك، ٢٠٠١.
- (قوجا خونکار)، شیعر لە زمانی تورکی، کەرکوك، ٢٠٠١.

* شەمسەددین گۆزەچی:-

- سالی ١٩٦٥ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- نامەی ماستەری لە سالی ٢٠٠٨ بەدەستهێناوە بەناونیشانی (حول تأریخ المطبوعات العراقیة).
- نامەی دکتۆرای بەدەستهێناوە لە سالی ٢٠١٠ بەناونیشانی حول التلفزیونات في العراق.
- بەرهەمەکانی:-
- Hoyratlarim، شیعر، ٢٠٠٤.
- KERKUK SOYKIRMLAR، شیعر 2004
- Fuzuli siir yarismasi، شیعر، 2004
- Turkmeneli Edebyati korfez savasi sonrasi1991-2003، 2005
- Kerkuk saileri، بەرگی یەکەم، 2006
- Kerkuk saileri، بەرگی دووەم، 2007
- Irak Basin Tarihi، 2008
- icimizdeki kerkuk، 2009
- TELAFER sasrleri، 2010
- SOLMAYAN PAPATYLAR، 2010
- BIZGUNAS DEGILIZ، 2010
- Sehit sair kemal omer Beg، 2010
- Irak Televizyonlari، 2010
- عادل عبدالله، جوهرة كركوك الرياضية، ٢٠١٠
- IKI GONUL، 2010
- Kerkukun Efsane sesi Abdulvahit kuzeci، 2012
- Poets of Kirkuk، 2014

* (شەمعون جامچی):-

- یەکێك بوو لەو جوولەکانەی کەرکوك کە بەناوبانگ بوو لە دروستکردنی جامدا.

* (شەنگوڵ حەسیب قادر):-

- ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ١٤ پێشانگای کردووەتەوە.
- زیاتر دەوری بینووە لە بەکارهێنانی نەخشاندنی گوڵ لە تابلۆکانیدا.
- ئێستا لە تەراوگە دەژێت.

* (شەهناز خانم):-

- یەکێکە لە ئافرەتە شاعیرەکانی کەرکوك، کچی (ڕەسوڵ حاوی کەرکوکی)یە.
- ساڵی (١٨١٠) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٨٣٠) لە تەمەنی بیست ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە بە نەخۆشی کۆلێرە لە بەغدا.

* (شەوقی سەید ئەمین):-

- ناوی (سەید ئەمین کوری سەید سەمین)ە، خەڵکی (کفری) بووەو لە سەردەمی (خەلیل منەوەر) ژیاوەو شیعری بە دیالیکتی گۆران وتووە.
- نازناوی یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك بەڵام مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی لەو باوەڕەدایە کە نازناوی (سەید ئەمین)ێك بێت.
- لە هەندێك لە دەستنووسەکاندا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* (شەوکەت ڕەشید):-

- (شەوکەت کوری ڕەشیدی کوری عیزەتی کوری عەبدوڵڵای کوری هەمزە ئاغای بابانی)یە.
- ساڵی (١٩٣٠) لە سلێمانی چاوی بە دنیا هەڵێناوە.
- هەر لە منداڵییەوە شەیدای گۆرانی و مۆسیقا بوو، هەر لە سەرەتاوە خۆی فێری لێدانی شمشاڵ ونەی کردووە، هەر ئەمەش هانیدا بچێتە تیپی مۆسیقای سوپاوە وخۆی فێری ئامێرەکانی وەکو کلارنێت و عودو نەی وسەکسیفۆن وتەپڵ وجازو جومیش و زورنا بکات.
- توانا و دەنگێکی چاکی هەبووە لە گۆرانی ووتن، کە خاوەنی سیفەتێکی تایبەتی بووە.
- هەر چەندە بروانامەی شەشی سەرەتایی هەبوو بەڵام چەندەها بروانامەی فەخری وەرگرتووە.
- لە (٢٩)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٦٩) لە کۆمەڵەی

هونەرە جوانەکاندا تاقی کرایەوەو بە سەرکەوتووی بروانامەی ئەو ئامۆژگایەی وەرگرتووە، هەروەها لە زانستی نۆتەی مۆسیقا شارەزاییەکی بێ هاوتای هەبووەو وانەی نۆتەی بەزۆربەی هونەرمەندە لێهاتووەکان ووتووە.
– دۆستێکی دێرینی حەسەن زیرەك بووە.
– ساڵانی حەفتاکان بووە بە سەرۆکی تیپی مۆسیقای (سۆلاڤ).
– لە (١٧)ی نیسانی ساڵی (١٩٩١) کۆچی دوایی کردووە.

*** (شەونم عەزیز بەرزنجی):-**

– ساڵی (١٩٥٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– سەرەتایی و ناوەندی لە قادر کەرەم و سلێمانی تەواو کردووە.
– لەنێوان ساڵانی (١٩٧٥-١٩٧٩) کۆلێژی زمانی کوردی لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
– یەکەم بەرهەمی شیعری لە ساڵی (١٩٧٠) بڵاوکردووەتەوە.
– بەرهەمەکانی:
– دیوانێکی شیعری چاپکراوی هەیە بە ناوی (کات بۆ بیست و پێنج دەچێت) کە لە ساڵی (١٩٩٠) لە شاخ بە چاپ گەیەندراوە.
– کۆمەڵە شیعری (هەناسەی ئۆخەی) لە ساڵی (١٩٩٩) لە هەولێر چاپ کراوە.
– لە ساڵی (٢٠٠٤) کۆچی دوایی کردووە.

*** (شکور مستەفا):-**

– ناوی (شکور کوری مستەفا کوری عەبدوڵڵا)یە.
– ساڵی (١٩٢٦) لە دێی (مامشە) لە ناحیەی (قەرە حەسەن) لەدایکبووە لەدایکێکی کاکەیی.
– ساڵی (١٩٣٢) هاتووەتە کەرکوك و خراوەتە بەر خوێندن و قورئانی پیرۆز لە لای (مەلا ئایشە خان)دا.
– ساڵی (١٩٤١) زانستەکانی ئایینی لەلای (مەلا سەعدوڵڵا کوری مەلا محەمەد ئەمینی هەوایی زادە)ی خەڵکی (دووشیوان) تا کتێبی (جامی) خوێندووە، پاشان لە لای (مەلا سەید ئەحمەدی جەباری) و (مەلا عەبدوڵڵا بڵاوە) و (مەلا عەلیس لەلالان)دا تا نیوەی کتێبی (سیووتی)ی خوێندووە.
– ساڵی (١٩٤٨)دا چووەتە بەغداو لە قوتابخانەی (الهداية الإسلامية) خوێندوویەتی.
– ساڵی (١٩٤٩-١٩٥٥) کۆلێژی شەریعەتی لە بەغدا تەواو کردووە.
– ساڵی (١٩٥٥) لە قوتابخانەی ناوەندی (بەعقوبە) بۆ ماوەی دوو ساڵ زمانی عەرەبی وتۆتەوە.
– لە (٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٧) دوورخراوەتەوە بۆ (عانە) و (راوە) و لەوێ بۆ ماوەی نۆ مانگ مامۆستای زمانی عەرەبی بووە، لە هەمان ساڵدا گوازراوەتەوە بۆ (حەببانییە)، لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٨)دا گوازراوەتەوە بۆ کەرکوك.
– ساڵی (١٩٥٩) گوازراوەتەوە بۆ (قەڵا دزێی) و پاشان بۆ (کەربەلا) لەوێ شەش ساڵی ژیانی بردووەتە سەر.
– ساڵی (١٩٦٦)دا ڕاگوێزراوەتەوە بۆ بەغداو تا ساڵی (١٩٧٠) لە ناوەندی (جمهوریە) مامۆستای زمانی عەرەبی بووە.
– ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧١) گوازراوەتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردی، لەگەڵ (سامی عەبدولرەحمان)دا خوێندنی کوردییان تا دوا پلەی ناوەندی جێبەجێ کردووە، سەرلەبەری کتێبە دەرسییەکانیان لەگەڵ مامۆستاو ڕۆشنبیرانی پەروەردەو خوێندندا کردووە بە کوردی، لە دواییدا بووەتە سەرۆکی چاودێرەکانی بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردی لە بەغدا.
– ساڵی (١٩٧٥) گوازراوەتەوە بۆ (کۆڕی زانیاری کورد) لە بەغدا.
– ساڵانی (١٩٧٧-١٩٧٩) کراوە بە ئەمینداری گشتی کۆڕ لەگەڵ (مەسعود محەمەد)دا، پاشان (کۆڕی زانیاری کورد) هەڵوەشێندرایەوەو (شکور مستەفا)یان کرد بە پسپۆڕی زمان لە (کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کوردی).
– زۆر بەچاکی زمانی عەرەبی و کوردی و تورکی و فارسی و ئازەری زانیوە.
– لە (١٦)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٨) هاتووەتەوە کوردستان و تا دوا ڕۆژی ژیانی سەرگەرمی کاری وەرگێڕان و ڕۆشنبیریی کوردی بووە.
– لە (١٨)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە.
– بەرهەمە چاپکراو و وەرگێڕاوەکانی:
– (چیرۆك بۆ منداڵان)، ئەنگێل کراڵچێف، بولغارستان، لە تورکییەوە کراوە بە کوردی، بەغدا، ١٩٦٧.
– (پەروەردەی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی بۆ پۆلی چوارەمی سەرەتایی)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٠.
– (خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی سەرەتایی)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧١.
– (خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی سەرەتایی)، و، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٢.
– (خوێندنەوەی کوردی)، و، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٢.
– (القراءة العربية في المناطق المشمولة بالدراسة الكردية للصف الابتدائي)، ١٩٧٢، ١٩٧٤، ١٩٧٥.

- (جوغرافیای عێراق وولاتانی دەرەوە بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی)، وەرگێڕان، هاوبەش بەغدا، ١٩٧٣.
- (خوێندنەوەی کوردی نوێ بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی)، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٣.
- (قەڵای دمدم)، ڕۆمان، بەغدا، ١٩٧٥.
- (کورد ئۆغلۆ، بەغدا)، ١٩٧٥.
- (شعر الشاعر الكردي عبد الله گۆران)، وەرگێڕان لە ئازەرییەوە بۆ عەرەبی، ١٩٧٦.
- (ئەفسانەی چیای ئاگری)، یەشار کەمال، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.
- (سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقیێ)، ئۆردخانی جەلیلی، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٧.
- (کۆمەڵناسی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی وێژەیی)، وەرگێڕان، هاوبەش بەغدا، ١٩٧٨.
- (ئەفسانەی کوێر ئۆغلی)، یەشار کەماڵ، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی، بەغدا، ١٩٧٩.
- (لەمەر ڕەنگ‌و ڕووی ڕۆشنبیری تورك)، ١٩٧٩.
- (برێ تێکستێ فۆلکلۆری بە شێوەی کرمانجی باکوور)، ١٩٧٩.
- (مذكرات مامون بك)، لە تورکی عوسمانییەوە بۆ عەرەبی بە هاوبەشی لەگەڵ (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی)، بەغدا، ١٩٨٠.
- (سیابەندو خەجێ)، سیابەندۆف سیامەند، وەرگێڕان لە ڕووسییەوە بۆ کوردی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٠.
- (داستانی شێخ بەدرەدین کوری قازی سیماونە)، نازم حیکمەت، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی، بەغدا، ١٩٨١.
- (تەنەکە)، ڕۆمان، یەشار کەمال، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی، بەغدا، ١٩٨١.
- (کاریتە یان ئەو دیوی چیا)، ڕۆمان، بەرگی یەکەم، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی، بەغدا، ١٩٨٣.
- (بطولة الكرد في ملحمة قلعة دمدم)، جەلیلێ جەلیلی، وەرگێڕان لە کوردییەوە بۆ عەرەبی، ١٩٨٣، ١٩٩٩.
- (قەڵای دمدم)، عەرەب شەمۆ، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٨٤.
- (زەوی ئاسن‌و ئاسمان مس)، یەشار کەمال، بەرگی دووەم، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی، ١٩٨٧.
- (چامە شیعرێکی زۆر درێژ)، عەبدولەتیف بەندەر ئۆغلو، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی، ١٩٨٧.
- (مێژووی کورد لە سەدەی شازدەدا، شەرەفنامە وەك سەرچاوەیەکی مێژووی نەتەوەیی کوردی)، شەمسی محەمەد ئەسکەندەر، وەرگێڕان لە ئازەرییەوە بۆ کوردی، هەولێر، ١٩٨٨.
- (مێژووی ئەردەلان)، مەستورەی کوردستانی، وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ کوردی بە هاوبەشی لەگەڵ (دکتۆر حەسەن جاف)، بەغدا، ١٩٨٩.
- (پێشبینی لێزانە قەرەجەکە)، عەبدولمەجید لوتفی، وەرگێڕان بۆ کوردی، ١٩٩٠.
- (بدرخانیو جزیرة بوتان)، مالمسانژ، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، ١٩٩٨.
- (علاقة الاثوريين مع الكرد)، ١٩٩٨.
- (القومية الكردية وعبد الله جودت في مطلع القرن العشرين)، ٢٠٠٠.
- (خۆبیوون‌و شۆڕشی ئاگری)، ڕۆهات ئالاکۆم، و، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، ساغ کردنەوەو شەرحی، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (النظام في اناضول الشرقية-الاسس الإجتماعية والاقتصادية والبنى القومية)، وەرگێڕان، ٢٠٠١.
- (تاريخ الامارة البابانية)، وەرگێڕان، ٢٠٠١.
- (ئەندێشەو هونەر لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا)، ٢٠٠٣.
- (چەند وتارێك سەبارەت بە ژیان‌و نووسینەکانی)، هەولێر، ٢٠٠٣.
- (خوێندنەوەی کوردی نوێ بۆ پۆلی ناوەندی)، هاوبەش، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (شريف باشا سنوات العاصفة لدبلوماسي كردي)، ٢٠٠٦.
- (گوێی ئاگردان یا ئەشقێکی ناکام)، نازم حیکمەت، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (سەرچاوەکانی بیروباوەری کوردەواری)، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (دیوانی قاصد، ساغ کردنەوە)، هاوبەش، هەولێر، (٢٠٠٨).
- (مەولوودنامەی مەلا عوسمان ئەفەندی)، زازایی.
- (بیرهاتنێد من)، ئەحمەدی میرزای، وەرگێڕان لە ڕووسییەوە بۆ کوردی.
- (کۆمەڵێك چیرۆکی منداڵان)، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی.
- (کۆمەڵناسی گەلی کورد)، مارتن ڤان برۆینسن، و، هەولێر.
- (نادرنامەی ئەلماس خانی کەلهور)، هەولێر.
- (یاداشتەکانی برێ گەریدەی بیانی لە کوردستاندا)، عیسمەت شەریف وانلوو، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی.
- (ئاسکوێژی)، بەلاغەت.
- (یاداشتەکانی سوورمە خانم)، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی.
- (ئەحمەدی خانی).
- (هەژاری موکریانی).

– (مسالة اناضول الشرقية، كوردستان تركيا)، ئيسماعيل بێشكچی، وەرگێڕان لە توركييەوە بۆ عەرەبی.
– (مەلا ئيدريسی بەدليس)، محەمەد بەيراقدار، وەرگێڕان لە توركييەوە بۆ كوردی.
– (گيای نەمر، بەشی سێيەم لە سێينەكەی يەشار كەمال)، وەرگێڕان لە توركييەوە بۆ كوردی.
– (جۆن تورك و بزووتنەوەی نەتەوەيی كورد)، عەبدوڵڵا جەودەت.

*** (شلێر سيامەنسووری):-**

– ساڵی (١٩٧٢) لە كەركوك لەدايكبووە.
– ساڵی (١٩٩٢) دەستی بە هونەری وێنەكێشان كردووە.
– ساڵی (١٩٩٥) كۆلێژی پەروەردە، بەشی بيركاری تەواو كردووە.
– ساڵی (١٩٩٧) يەكەمين پێشانگای تايبەتی لە كەركوك كردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٩) پێشانگای وێنەيی لە سۆران كردووەتەوە.
– ساڵی (٢٠٠٢) پێشانگای فۆتۆگرافی كردووەتەوە.
– بەشداری لە چەندين پێشانگای هاوبەشيی كردووە لە كەركوك و هەولێر.
– شارەزايە لە بواری نووسين و كاری فۆتۆگرافيدا.
– بەشداری لە سەرجەم چالاكييە هونەرييەكانی پەروەردەی سنووری چەمچەماڵ كردووە لە ساڵی (٢٠٠٠) تا (٢٠٠٨).

*** (شوان خورشيد):-**

– بەرهەمە چاپكراوەكانی (هونەری رۆژنامەنووسی لە گۆڤاری نزاردا)، كەركوك، ٢٠٠٥.

*** (شوكر جەيران):-**

– ئەم هونەرمەندە كوڕی رەشيد كوڕی چۆڵەكی كاكەييە ناوی دايكی (جەيرانە) بۆيە لە ناو خەڵكيدا بە (شوكر جەيران) ناوبانگی دەركردووە.
– ساڵی (١٩٣٠) لە ئاوايی (عەبدوڵڵا غانم)ی داقوق لەدايكبووە.
– ئێستا لە گوندێكی بچووكدا خۆی و ستاری برای و كوڕەكانی لە نزيك دێی (عەلوەت پاشا) دادەنيشن گوندەكەش هەر بە ناوی خۆيەوە ئاوەدان كراوەتەوە، دەكەوێتە باشووری قەزای داقوقەوە بە (١٥ كم)ەوە پێی دەڵێن ئاوايی (شوكر جەيران)وە ئێستا بە كاری كشتوكاڵ وبەخێوكردنی ئاژەڵەوە خەريكە.
– لەسەردەمی ژيانی خۆيدا لەگەڵ ئەم بەڕێزانە مەقامی خوێندووە:
(شێخ نەسرەدين تاڵەبانی)، (محەمەد خدر بارام چاوش) (محەمەد مەلا فاتيح)، (فەتاح مەحموودی مەملاك)، (كاميل شوكر نادر)، (عارف دەلۆی كاكەيی)، (مام عەبدوڵڵای مەلا حوسێن–مام عەلی)، (نادر دەمگێر)، (دەروێش غەيبوڵڵا سەليم).
– لەم ديوانخانانەی ناوچەكە مەقامی خوێندوو:
(شێخ عاسی شێخ عيزەدين تاڵەبانی)، لە دێی (عەبدوڵڵا غانم)، (سەيد ئيسماعيل ئاغا–لەدێی دەللسی بچووك)، (شێخ حەسيب شێخ عەلی تاڵەبانی–دێی لەيلان).

– ئەم هونەرمەندە لە ڕێگەی قەوانەوە لە خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵا سەعيدی عەربەتييەوە ئاشنای مەقامەكان بووە.

*** شوكر خەيات:-**

– يەكێكە لە گۆرانيبێژ و مەقامزانە بەناوبانگەكانی دەڤەری گەرميان كە خاوەن شێواز و جۆرێكی تايبەتە لە وتنی مەقام بەتايبەتی مەقامی يارغەزال
– دەستی باڵای هەيە لە دووريني جلوبەرگی كورديدا.
– گەلێك مەقامی تۆماركراوی لە ڕاديۆ و تەلەفزيۆنەكانی كوردستان هەيە.

*** (شوكر محەمەد حەيدەر):-**

– ساڵی (١٩٦٦) لە قادر كەرەم لەدايكبووە.
– يەكێكە لەوانەی لە بواری رۆژنامەوانی كار دەكات لە كفری و گەلێك لێكۆڵينەوەی هەيە.
– بەرهەمە چاپكراوەكانی:
– (قسە خۆشەكانی ناوچەی گەرميان)، بەشی يەكەم.
– (قسە خۆشەكانی ناوچەی گەرميان)، بەشی دووەم.
– رێبەری شوێنەوارەكانی گەرميان، ٢٠١٤

*** (شوكر وەلی پاڵەوان):-**

– ساڵی (١٩١٠) لە كەركوك لەدايكبووە.
– يەكێكە لە پاڵەوانەكانی شاری كەركوك كە تاكو پەنجاكان دەوری گێڕاوە كەزۆرخانەی هەبوو لە گەڕەكی (ئاخوڕ حوسێن).
– لە سەرەتادا لەژێر دەستی ياريزانی زۆرخانە (محەمەد نەبو خاڵ) فێربووە، بەڵام لە دواييدا يەكێك بووە لە ياريزانە بە تواناكان لەو يارييەدا.

- دەستێکی باڵای هەبوو لە هونەری نەخش و نیگاری خانوو دروستکردندا.
- ساڵی (١٩٨٠) کۆچی دوایی کردووە.

* (شوکری عەبدوڵئەحەد):-

- ساڵی (١٨٩٥) لە کەرکوك لەدایکبووەو لە بنەڕەتدا لە مەسیحییەکانی قەڵای کەرکوکە.
- ساڵی (١٩١٩) بووەتە بەڕێوەبەری لە قوتابخانەی سەرەتایی (ظفر)، لە کاتێکدا کە ئینگلیزەکان ڕۆژنامەی (نجمة)یان لە کەرکوك بە زمانی عەرەبی و لە دواییدا بەزمانی تورکی عوسمانی دەرکرد یەکێك بوو لەوانەی کە ڕۆژنامەکەی لەنێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٤) بەڕێوەبردووە.
- لەنێوان (١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٧) تا (١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٤٠) بوو بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی (شمعون الصفا)، لە دواییدا گواسترایەوە بۆ بەغدا.
- ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (شنە نەجات عەبدوڵڵا):-

- ساڵی ١٩٩٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٩)ەوە دانیشتووی وولاتی هۆڵەندایە.
- ڕۆمانێکی بەناوی (من بەهێزم - IAM STRONG) بە زمانی ئینگلیزی لەسەر ئەنفال نووسیوە.

* (شێخە زەرد):-

- ناوی (مەلا سەید محەمەد کوری مەلا عەبدولقادر)ەو لەبنەڕەتدا دەچنەوە سەر سەیدەکانی (پیرخدری) کە ئەم بەرەبابە دەگەڕێتەوە بۆ زانای خواناس وبەناوبانگی کورد (پیرخدری شاهۆ) ناسراو بە (زاهید).
- (شێخە زەرد) لە ساڵی (١٩١٩) لە گوندی (دەرگا سلێمان)ی سەرسنووری نێوان عێراق-ئێران لەدایکبووە. قورئانی پیرۆزو هەندێك لە کتێبەکانی فەقێیەتی لای باوکی خوێندووە و، بۆخوێندن گەلێك شوێن و ناوچەی کوردستان گەڕاوە. پاش تەواوکردنی خوێندن و وەرگرتنی (ئیجازەی عیلمی) لە گوندی گۆرانی جەباری و هەندێك گوندی تری ناوچەکە مەلایەتی کردووە.
- شێخە زەرد زانایەکی ناوداری ناوچەی جەباری و چەمچەماڵ و دەوروبەری بووەو شاعیرێکی ناوداری میللی دەڤەرەکەو پیاوێکی دەم بەزەردەخەنەو قسەخۆش بووە. نازناوی شیعریی (شێخەزەرد) بووە وکەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی بووەو پەیوەندییەکی بەهێز وپتەوی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایانی ئایینی و شێخ و ڕیش سپی و پیاوماقوڵان و سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەکە و دەوروبەری هەبووە.
- لە (٢٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٨٢) لە قەزای چەمچەماڵ کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێ لە گۆڕستانی (شێخ سەعید) بەخاك سپێردراوە.

* (شێخ سدیق ئەحمەد کەریم):-

- بۆ ماوەیەك بەرپرسی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کەرکوك بووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (پاکتاوکردنی ڕەگەزی کورد لە مێژوودا)، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (ئەرشیفەکانی عێراق)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (گەرانێك بە نێو ماڵەکانی کتێب و سینەما و شانۆو فۆتۆو مۆسیقاو تەلەفزیۆن لە کەرکوك)، کەرکوك، ٢٠١٢.

* (شێرزاد باخەوان-شێرزاد ئەمین فەرەج):-

- ساڵی (١٩٦٦) لە شۆریجە لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٩) یەکەم پێشانگای کردووتەوە لە بواری شێوەکاریدا.
- ساڵی (١٩٨٦) پێشانگای تایبەتی کاریکاتێری بە ناوی (شارەکەم) لە هۆڵی (الفن الحديث) کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩١) پێشانگای تایبەتی بە ناوی (ئاوارەکان) لە هۆڵی ڕەواندوز کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٣) پێشانگای تایبەتی بە ناوی (بە بۆنەی دەستگیر کردنی سەدام حوسێن) لەهۆڵی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان ناوەندی کەرکوك لە قشلە کردووەتەوە.
- هەروەها سێ بەشداری پێشانگای کردووە لە دەرەوەی وڵات لە (تورکیا) و (ئوردون) و (میسر).

* (شێرزاد جەباری):-

- (شێرزاد کوری حوسێن کوری سەید محەمەد جەباری)ە.
- ساڵی (١٩٤٤) لە دێی وەستا خدر لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٣) دەستی داوەتە شیعر نووسین.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی (گوڵزار، شاعیرانی ناوچەی

جەباری)، کەرکوک، ١٩٧٠.

– ساڵی (١٩٨٧) لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە لە سێدارەدرا.

*** (شێرزاد جەوهەر):-**

– ناوی (شێرزاد جەوهەر عەبدوڵڵا)یە.
– ساڵی (١٩٦٨) لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.

– پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە کەرکوک خوێندووە، بەڵام تەواو نەکردووە.
– ساڵی (١٩٨٧)، پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی قوتابخانەی کوڕان لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٣) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– ساڵی (٢٠٠٤)، پێشانگای تایبەتی لە ڕۆژی شەهید لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– پێشانگای تایبەتی پۆستەریی بۆ یادی دەیەمین ساڵەی کیمیابارانی گۆپتەپە کردووەتەوە.
– پێشانگای تایبەتی پۆستەریی بۆ یادی هەڵەبجەی شەهید لەناو بازاری چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– پێشانگای تایبەتی پۆستەریی بۆ یادی نۆزدەهەمین ساڵەی کارەساتی ئەنفال لەبەردەم هۆڵی ڕۆشنبیری چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– هەمان پێشانگا دوو جار لە هەولێر لە (٣٠نیسانی) ٢٠٠٧ کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٨٣) پێشانگای هاوبەشی لە بەغدا کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٨٤) پێشانگای هاوبەشی لە قوتابخانەی کوڕان کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٨٦) پێشانگای هاوبەشی لە هۆڵی مەڵبەندی ڕۆشنبیری کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٨٧) پێشانگای هاوبەشی لە قوتابخانەی کوڕان کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٨٨) پێشانگای هاوبەشی لە باخچەی گشتی چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٢) پێشانگای هاوبەشی بۆ یادی دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە کتێبخانەی گشتی کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٤) پێشانگای هاوبەشی بۆ یادی دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە کتێبخانەی گشتی کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٥) پێشانگای هاوبەشی لە هۆڵی حەسیب ساڵح لە سلێمانی کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٦) پێشانگای هاوبەشی بۆ یادی کارەساتی ئەنفال لە هۆڵی شێوەکاری چەرموو کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٧) پێشانگای هاوبەشی پێنجەمین فیستیڤاڵی هونەریی کەرکوکی لە کەلار کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٨) پێشانگای هاوبەشی شەشەمین فیستیڤاڵی هونەریی کەرکوکی لە دەربەندیخان کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٩) پێشانگای هاوبەشی یەکەمین فیستیڤاڵی هونەریی لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– ساڵی (٢٠٠٠) پێشانگای هاوبەشی دووەمین فیستیڤاڵی هونەریی لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– ساڵی (٢٠٠١) پێشانگای هاوبەشی سێیەمین فیستیڤاڵی هونەریی لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
– ساڵی (٢٠٠٣) پێشانگای هاوبەشی دەیەمین فیستیڤاڵی هونەریی کەرکوکی لە هۆڵی ڕۆشنبیری کەرکوک کردووەتەوە.
– ساڵی (٢٠٠٤) بەشداریی پێشانگای هاوبەشی هەڵەبجەی کردووەتەوە بە تابلۆیەکی گەورەی عومەری خاوەر.
– ساڵی (٢٠٠٥) پێشانگای هاوبەشی چوارەمین فیستیڤاڵی هونەریی لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.

*** شێرزاد حەبیب:-**

– لەدایکبووی ساڵی (١٩٧٠)ی گوندی کۆرمۆر لە گەرمیان.
– ساڵی (١٩٨٤) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی یەکێتییەوە کردو ساڵی (١٩٨٦) بوو بەپێشمەرگە لەتیپی پارێزگاریی مەڵبەندی یەك. ساڵی (١٩٨٧) لەشەڕی نەوجول بەسەختی بریندار بوو. لە ئۆپەراسیۆنەکانی ئەنفالدا شوێن بزر کرا.

*** (شێرزاد ڕۆژبەیانی):-**

– (شێرزاد کوڕی مەلا محەمەد ئەمین کوڕی مەلا ئەحمەد گەورەی فەرقانی ڕۆژبەیانی)یە.
– ساڵی (١٩٤٦) لە گوندی مەتارە هاتووەتە دنیاوە.
– کۆلێژی شەریعەی (الامام الاعظم)ی تەواو کردووە لە بەغدا

لە ساڵی (١٩٧٨) لە هەمان ساڵی لە شارۆچکەی (حەریر) بە مامۆستایی دامەزراوە، ماوەیەکی زۆر لە کاروباری مامۆستایدا کاری کردووە.

*** شێرزاد ڕەحیم نەجار:-**

- ناسراو بە شێرەی گیتار.
- ساڵی ١٩٧٢ لە گەڕەکی بەرتەکێی کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك و چەمچەماڵ تەواو کردووە.
- لە ساڵی ١٩٨٦ بەشداریی ئەو گرووپەیان کردووە کە لە بواری مۆسیقادا ڕۆڵی هەبوو بەناوی تیپی هانا، کە لە بواری مۆسیقای ڕۆژهەڵاتیدا کاری دەکرد.
- ساڵی ١٩٩٣ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواو کردووە.
- بەشداریی گەلێك چالاکی و فیستیڤاڵی هونەریی کردووە، بە تایبەتی لەگەڵ گرووپی هونەری سەهەند.
- ساڵی ٢٠٠٢ گەیشتووەتە وڵاتی سوید، ماوەیەك مامۆستای هونەر بووە لە وڵاتی سوید، لەگەڵ گەلێك تیپی بیانی بەشداری کردووە وەکو مۆسیقا و وەکو دەنگ. بەتایبەتی لە ئیسپانیا و فیلەندا و نەرویج و دانیمارك و ئەڵمانیا و هەنگاریا.
- ماوەیەکە لە کەناڵی ئاسمانی کەرکوك لە بەشی دەنگ کار دەکات.

*** (شێرزاد فاتیح محەمەد):-**

- ساڵی (١٩٤٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- تاکو ساڵی (٢٠٠٤) مامۆستای زمانی ئینگلیزی بووە، ئێستاش سەرپەرشتیاری یەکەمی زمانی ئینگلیزیە لە پەروەردەی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٦٧)ەوە پەیوەندی بە (کاژیکەوە) کردووە.
- ئەندامی ناوەندی ئاڤێستایە لە کەرکوك کە لە مانگی یەکی ساڵی (٢٠٠٣)ەوە لە کەرکوك دامەزراوە.

*** (شێرکۆ جەبار):-**

- ساڵی (٢٠١٢) ماستەری هێناوە لە بواری ڕاگەیاندندا لە میسر، نامەی ماستەرەکەی بە ناونیشانی (دور الحملات الإعلامية التلفزيونية في نشر الوعي السياسي لدى الشباب العراقي) بووە.
- ساڵی (٢٠١٤) دکتۆرای لە بواری ڕاگەیاندندا بەدەستهێناوەو خوێندنی لە وڵاتی میسر تەواو کردووە، نامەی دکتۆراکەی بە ناونیشانی (معالجة القضايا العراقية في البرامج الحوارية السياسية في القضائيات العربية وانعكاساتها على النخبة).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
TV- (ڕاگەیاندن. بەرجەستەکردنی ستەمی ئایدیۆلۆژی- وەك نموونە)، کەرکوك، ٢٠٠٦.

*** (شێرکۆ شاکیر سەید محەمەد - لیوا شێرکۆ شاکیر سەید محەمەد):-**

- لە (٩)ی ئاداری ساڵی (١٩٤٠) لە گەڕەکی (ئاخوڕ حوسێنی) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٦- ١٩٤٧) لە قوتابخانەی (ئیمام قاسم) خوێندنی سەرەتایی دەستپێدەکات. سەرەتایی لە قوتابخانەی تاهیری دووەم لە قەڵا تەواو دەکات، لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی دەچێتە قوتابخانەی (ئەیوبیە)، پۆلی پێنج و شەشی سەرەتایی لە قوتابخانەی (نەجاح) تەواو دەکات.
- ساڵی (١٩٦٠) لە کۆلیژی پۆلیس لە خوولی (١٧) وەردەگیرێت، پێش تەواوکردنی و دەرچوونی لە (١٠) شوباتی ساڵی (١٩٦٣) دەستگیر دەکرێت و لە بەندیخانە بەشداری تاقیکردنەوەکان دەکات و لە (٢١)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٣) ئازاد دەکرێت و لە فەوجی چوار لیوای دوو (قوەی سەیار) لە کەرکوك بە پلەی مولازم دادەمەزرێت.
- لە (١)ی ئایاری ساڵی (١٩٦٣) جارێکی تر دەستگیر دەکرێت و ڕەوانەی گرتووخانەی (خەلف ئەلسەدە) دەکرێت لە بەغدا.
- ماوەی دە ڕۆژ لە کۆلیژی پۆلیس ئەشکەنجەیەکی زۆر دەدرێت بە تۆمەتی ئەندام بوون لەناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان.
- ساڵی (١٩٦٣) بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك حوکم دراو ڕەوانەی گرتووخانەی بەعقوبە کرا، ساڵی (١٩٦٤) لە لێبوردنێکی گشتیدا لە بەندیخانە ئازاد دەکرێت.
- دوای ئازادکردنی پەیوەندی دەکات بە شۆڕشی کوردستانەوەو لە هێزی قەرەداغ دەبێت بە پێشمەرگە.
- ساڵی (٢٠٠٥- ٢٠٠٧) دەبێتە بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك.

*** شوان داودی:-**

- ماوەیەك بەرپرسی باڵای دەزگای ڕۆژنامەی هەواڵ بووە.
- ئەندامی ئەنجوومەنی پەرلەمانی عێراقە لەسەر پارێزگای کەرکوك بۆ هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠١٣

*** شێرکۆ فاتیح شوانی - لیوا شێرکۆ فاتیح شوانی:-**

- ناوی (شێرکۆ فاتیح نامیق کەریم شوانی)یە.
- ساڵی (١٩٦٩) لە ناحیەی ماوەت لە خانەوادەیەکی پێشمەرگە لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٤) چۆتە بەرخوێندن و هەردوو قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیی لە ماوەت تەواوکردوە.
- ساڵی (١٩٧٩) فاتیح شوانی باوکی دەبێتە پێشمەرگە، بەو هۆیەوە هەر ئەو ساڵە رژێمی بەعس لە رۆژی (١٥)ی ئەیلول خانەوادەکەی دەستگیر دەکات و بەو منداڵییە شەهید شێرکۆ ساڵێکی تەمەنی لە گرتووخانەی گەورەی شاری سلێمانی بەسەردەبات و رۆژی (١٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٨١) بە لێبوردنی گشتی ئازاد دەکرێن، پاش ئازادکردنیان دەچنە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان. ساڵی (١٩٨٤) پەیوەندی بە رێکخستنەکانی (ی.ن.ك)ەوە دەکات.
- ساڵی (١٩٨٧) شەهید لە هەرەتی لاوێتیدا چەکی پێشمەرگایەتی دەکاتە شان و لەگەڵ باوکی دەبێتە پێشمەرگە.
- لەکاتی ئەنفال و وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان، خانەوادەکەیان روو لە ئێران دەکەن و لە شاری سەردەشتی رۆژهەڵاتی کوردستان نیشتەجێ دەبن، لەگەڵ دەسپێکی بڵێسەی راپەرینی ساڵی (١٩٩١) لەگەڵ هێزی پێشمەرگە دەگەنەوە شاری سلێمانی و لە ئازادکردنی ئەمەنە سوورەکەی سلێمانی بەشدار دەبن تا لە شاری کەرکوك فاتیح شوانی باوکی بریندار دەبێت و راپەرین تاجی سەرکەوتن لەو شارە لەسەردەکات.
- لەگەڵ دەستپێکی کۆرەوە مەزنەکەدا ئاوارە دەبن و لە سەیران بەن بارەگا دادەنێنەوە تا ئەوکاتەی لەمانگی ئایاردا بەفەرمانی سەرکردایەتی و بە نهێنی دەگەرێنەوە ناوچەکانی چەمچەماڵ و شوان.
- لە رۆژی ١٨ی مایسی ساڵی ١٩٩١ شەهید شێرکۆ و چەند پێشمەرگەیەکی هاورێی لەدەربەندی بازیان بەهەڵە دەکەونە بۆسەی لیوای حەرەس جمهوریەوە و دەستگیر دەکرێن و رەوانەی کەرکوك و پاشان ئەمنی عامەی بەغدا دەکرێن.
- لەپاش دادگایکردنیان لە دادگای سەورە، حوکمی لە سێدارەدانیان بۆ دەرچوو، کاك شێرکۆ بە هەڤاڵەکانی وت برادەران دڵگران مەبن ئێرە شوێنی شەهیدانی وەکو خاڵە شەهاب و ئەنوەرو جەعفەرو سەدان شەهیدی تر بووە و شۆرش لێرەوە بڵێسەی سەندووە.
- لەپاش ئەوەی لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی سوپای عێراق دیل بە دیلیان پێدەکرێت و ئازاد دەبن، شەهید شێرکۆ دەستبەجێ پەیوەندی بە هەڤاڵەکانییەوە دەکاتەوە و کراوە بەفەرماندەی بەتالیۆنی ١٣ی شوان لە هێزی ٦ی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٩٣) ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو مەهاباد پێکهێناوە و بەرهەمی ئەم هاوسەرگیرییە سێ منداڵە بەناوەکانی (براکۆ، رێکان، دیار).
- لەگەڵ یەکگرتنەوەی سوپای کوردستاندا شەهید شێرکۆ بووە بەفەرماندەی لیوای قیادەی مەنتیقەی کەرکوك. پاشان دەچێتە لەشکری بازیان لەگەڵ کاك ئەنوەر دۆڵانی درێژە بە خەباتی پێشمەرگەیەتی دەدات.
- ساڵی (١٩٩٦) لەلایەن سەرۆك (مام جەلال)ەوە خەڵاتی قارەمانێتی پێدەبەخشرێت، پاشان دەکرێت بە بەرپرسی مەشق و پشکنین لە فەرماندەیی کەرکوك، دواتر دەکرێتە جێگری فەرماندەیی کەرکوك لەگەڵ لیوا کاکەمەند.
- پاش ئەوەی پەیوەندی بە کۆلێژی سەربازی قەڵاچوالانەوە دەکات بە سەرکەوتوویی خولەکەی بریوە و بووە بە ئەفسەر.
- ساڵی (٢٠٠٣)دا بەشداری شەرەکانی گروپی تیرۆریستی "جند الاسلام"ی کردووە لە هەڵەبجە و هەورامان دووان لە هاورێکانی شەهید دەبن بەناوەکانی عەلی محەمەد هەمزەیی و موبارەك.
- ساڵی (٢٠٠٣)دا بەشداری ئازادکردنی شاری کەرکوکی کردووە و بەرەو خۆرئاوای شارەکە پێشرەوی دەکات و لە ناوچەی (ریاز) بە سەختی بریندار دەبێت و رائید(فاتیح عەبدوڵلا)ی جێگری و موبارەك عوبێد و وریا حەمە رەزا بنەیی پورزای لەوێ شەهید دەبن و شەهید شێرکۆش بریندار دەبێت و رەوانەی نەخۆشخانەی شاری تاران دەکرێت، لەبەر سەختی برینەکەی چاوێکی لەدەست دەدات.
- ساڵی (٢٠٠٦) دەکرێت بە فەرماندەی لیوای (١٠)ی کەرکوك بۆ پارێزگاری لە شارەکە کە بارەگاکەی لە قەرەهەنجیر بووە. لیواکەی کاك شێرکۆ یەکێك بوو لە لیوا چالاکەکان و ببووە چقڵی چاوی تیرۆریستان.
- ساڵی (٢٠٠٩) لەبەر کارو چالاکییەکانی لەلایەن سەرۆك مام جەلال دووبارە خەڵات دەکرێتەوە وە توانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە دەوروبەری کەرکوك جێگیربکات.
- ساڵی (٢٠١٠) دەکرێتە فەرماندەی لیوای (١)، بەگیانێکی لە خۆبردەیی کارەکانی ئەنجام دەدات و لەپاڵ ئەم ئەرکەیدا

دەبێتە ئەندامی لیژنەی ئەمنی شاری کەرکوك.

- شەهید شێرکۆ لەلای هەموو پێکهاتەکانی شارەکە ببووە کەسێکی بەرێزو خۆشەویستو هەموو هەوڵێکی بۆ ئارامی شاری کەرکوك بوو، لەهەر شوێنێك مەترسی لەسەر کەرکوك هەبوایە، شەهید شێرکۆ لەوێ سەنگەری قایم دەکرد. لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکاش پەیوەندی پتەوی دروست کردبوو کە ببووە مایەی متمانەی ئەمریکییەکانو بەشداری چەند خولێکی لەگەڵ ئەوانیش کردبوو کە بەسەرکەوتوویی خولەکانی تەواوکردبوو.

- پاش ئەوەی شاری موسڵ لەلایەن تیرۆریستانەوە داگیرکراو مەترسی لەسەر کەرکوکیش دروست کردبوو، شەهید شێرکۆ قەڵغانێکی بە دەوری شارەکە دروست کردبوو، لە زۆربەی شەرەکانی دژ بە تیرۆریستان لە باشووری شارەکەو تەلوەردو مەلا عەبدوڵڵا مەکتەب خالید رۆڵێکی قارەمانانەی بینی و لە رۆژی (١٧)ی تەموزی ساڵی (٢٠١٤) لە تەلوەرد دووبارە بەسەختی برینداربۆوەو هێشتا بەتەواوی چاك نەببووەوە خۆی گەیاندەوە بەرەکانی شەر.

- لەگەڵ برینداربوونی خۆی یەکێك لە پاسەوانەکانی بەناوی (سەمەد ئەحمەد) شەهید دەبێت، و چەند پاسەوانێکیشی بریندار دەبن.

- لە رۆژی (٢٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠١٤) داعش تەلوەردی داگیرکرد، کاك کۆسرەت، شەهید شێرکۆی دەستنیشان کرد بۆ سەرپەرشتی گرتنەوەی لەگەڵ کۆمەڵێك فەرماندەدا، لەکاتی کۆنترۆڵ کردنەوەیدا، (مولازم هاشم بنەیی)و (عەتای کاکە حەمەی حاجی مەحمود)و (کەمالی حاجی ئاغا)و کۆمەڵێك پێشمەرگەی قارەمان شەهیدبوون.

بەشەهیدبوونی ئەم پێشمەرگانە کاك شێرکۆ زۆر خەمباربوو، وتی شەری منو داعش لێرەوە دەستپێدەکات، بۆیە شێرکۆ وەکو شێرو لە تۆڵەی ئەم شەهیدانەدا هێزی داعشی تێکشکاندو بە شەهیدبوونی خۆشی مژدەی رزگارکردنی تەواوی ناوچەکانی راگەیاندو لە رۆژی (٣٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠١٥) شەهید شێرکۆ لەگەڵ شەهیدان (نەشئەت جەمیل بنەیی)و (دانا عەباس بنەیی)و (مەریوان عەبدولرەحمان بنەیی)و (کاوە مەحموود تۆفیق) گەیشتنەوە کاروانی نەمران.

*** شوان مەجید کەریم - شوان مەندیی:-**

- ساڵی ١٩٦٦ لە شارۆچکەی (ماوەت) لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٢ دەخرێتە بەر خوێندن و قۆناغی (سەرەتایی و ناوەندی ) هەر لەو شارۆچکەیە تەواودەکات.
- ساڵی ١٩٨٣ دەبێتە پێشمەرگە.
- ساڵی ١٩٨٨ ئاوارەی ئێران دەبن.
- یەکەم شیعری لەشاری (سەردەشت) دەنووسێت بەناونیشانی(خەتا ناکەم).
- ساڵی ٢٠٠٤ پەیمانگای مامۆستایانی تەواوکردووە.
- ساڵی ٢٠٠٢ بەشداری خولی سەربازی کردووە لە کۆلێژی سەربازیی قەڵاچوالان.
- وەك فەرماندەیەك بەشداری کردووە لە ئازادکرنی شاری کەرکوکدا لە پرۆسەی رزگارکردنی عێراقدا دوای رزگارکردنی شاری کەرکوك.

- وەك دڵسۆزییەك بۆ کورد و کەرکوك لە ئەفسەری سەربازییەوە کارەکەی دەگۆڕێ بۆ ئەفسەری پۆلیس پاش کارکردنێکی زۆر لە بنکەکان و بەڕێوەبەرایەتی شاری کەرکوکدا بە پلەی عەقیدی پۆلیس کرا بە بەڕێوبەری پۆلیسی قەزای داقوق.
- هەر لەو ساڵەداو خولیای ئەدەب کەوتۆتەوە سەری جارێکی تر دەس بە نووسینی شیعر دەکاتەوە.
- ساڵی ٢٠١٣ یەکەم کۆمەڵە شیعری بەچاپ دەگەیەنێت لەژێر ناونیشانی (ئەڵقە).
- هەر لەو ساڵەدا کتێبی دووەمی لە ژێر ناونیشانی (چوارینەکانی سەدایی) بەچاپ گەیاندووە و خاوەنی دوو کتێبی شعرییە.

*** شوان عاسی:-**

- ناوی شوان عاسی مستەفایە.
- ساڵی ١٩٦٨ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٩٠ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٧ بە هاوبەشی لەگەڵ سەلمان ئیسماعیل، پێشانگای هاوبەشیان کردووەتەوە.
- ساڵی ١٩٨٩ بەهاوبەشی لەگەڵ خەسرەو حوسێن، پێشانگای هاوبەشیان لە پەیمانگای هونەرەجوانەکان کردووەتەوە.
- ساڵی ١٩٩٠ پێشانگای خۆی لە هۆڵی سوورکێو لە سلێمانی کردووەتەوە.
- ساڵی ٢٠٠٨ پێشانگای خۆی لە سلێمانی و هەولێر کردووەتەوە.

ساڵی ٢٠١٢ پێشانگای خۆی لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی کردووەتەوە.

*** شەهیدانی شەڕی داعش:-**

نەقیب (سامی حوسێن مەولود)، نەقیب (ڕەحمان عەلی ڕەسول پیرۆت)، نەقیب (سۆران هاید مەولود حەمە، مولازم (عەلی عەبدولحسەن عەبود)، (حوسێن مەنسور کەرەم)، (عەلی فازا عەلی نادر)، (محەمەد عیرفان محەمەد)، (مەریوان ئەنوەر محەمەد)، (بەهجەت محەمەد محەمەد ئەمین)، (شاهۆ نوری محەمەدڕەشید)، ئەرکان جهیانباش ڕۆستەم)، (هارون خەزعەل زائر)، (مەقدید حەمید سەلیم)، (محەمەد ئەمین ئەحمەد ئەمین)، (دابان حەمە ساڵح حەمە خورشید)، (بروا ئەحمەد فەتاح)، لیوا (شێرکۆ فاتیح نامیق)، موقەدەم (عەبدوڵڵا عەجیل حەسەن)، نەقیب (قادر ئەحمەد ڕەسول)، نەقیب (موعتەسەم جەمال سدیق)، نەقیب (شەماڵ کەماڵ ئەحمەد)، نەقیب (بەرزان فاتیح محەمەد)، مولازمی یەکەم (هاشم ئەنوەر عەزین)، (دانا عەباس موجبان)، (دڵشاد خورشید سەمین)، سەمەد ئەحمەد حوسێن، حەسیب جەبار ستار کەریم، نەشئەت جەمیل حەمە، سائیر فەیزوڵڵا عەبدوڵڵا، هەڵکەوت محەمەد قادر، کاوە محەمەد، عەلی محەمەدی عەبدوڵڵا، ئیبراهیم جەماڵ جەلال، مەریوان مەولود محەمەد، عادل عەلی حەیدەر، شاخوان ڕەشید، ئاراز ڕەفیق کەریم، شێروان قابیل، بورهان عومەر ئەمین. هیشام نەبیل خورشید، ڕۆکان محەمەد عەباس، یاسین حوسێن، ناسیح عاسی سەعید، ئومێد محەمەد مەجید، هێمن عادل غەفور، ڕێبوار شکور حمە لاو، محەمەد جەوهەر سەعید، ئومێد فایق کەریم، قەیسەر ئیسماعیل محەمەد نەجم، سۆران محەمەد سەعید، جێگیر جەلال قادر، پشتیوان عوسمان، مەریوان عەبدولڕەحمان حەمە ساڵح، بەرزان محەمەد مەهدی، ڕزگار محەمەد ساڵح، ئاوارە ئەحمەد شکور، عیسام مستەفا، ئەحمەد نادر، سامی غالیب تالیب، ئالان محەمەد بەشارەت، سیروان کەمال ئەحمەد، هێمن ئەحمەد تۆفیق، ئەحمەد ئەسعەد قادر، موقەدەم (دڵشاد شکور سابیر)، نەقیب (ئەحمەد حەسەن محەمەد)، ئەحمەد وەیس عەبدولڕەحمان، پێشبنی حیسامەدین بایز، هێمن حەوێز حەمە نەجم، ئاراس عومەر مەعروف، ئیسماعیل عەلا حەسەن، عومەر عەبدوڵڵا محەمەد، بریار ئەحمەد مەحموود، عەلی ئەحمەد قادر، سامان جەعفەر ئەحمەد، ئەحمەد سدیق تۆفیق، نەقیب (گۆران عەبدولخالق عیزەت، ئەحمەد حەمە ساڵح عەبدولقادر، سامان جەعفەر ئەحمەد، محەمەد جەواد ستار، ئادەم حەسەن محەمەد، شێرزاد خدر کەریم، ئیبراهیم ئیسماعیل، جێگیر قاسم ڕەسوڵ، مەریوان خەلیل کاکل، ئاسۆ عوسمان حەسەن، محەمەد نەجمەدین عیزەدین، ڕزگار حەسەن غەزال، گۆران ڕەحیم محەمەد ساڵح، هێمن حەمە غەریب ئەحمەد، عەقید (نەریمان مەولود محەمەد)، نەقیب (محەمەد عەبدولڕەحمان عەزیز، نەقیب (دڵشاد جەمال ئەحمەد)، پشتیوان حوسێن ئەحمەد، سەیف نەجیب حامد، ئاکار سەلاحەدین محەمەد، ژیلوان شێروان ئەحمەد، هۆشیار مەغدید ئیسماعیل، ڕێبوار سەعدی عومەر، ئەرکان محەمەد عەلی، پێشەنگ محەمەد جەبار، ئاریان نازم فازڵ نوری، کازم حامد محەمەد وسۆ،

عومەر سەباح تاهیر، محەمەد محمود ئیسماعیل، زانا عەلی عەبدوڵڵا، عەلی فوئاد مایخان فروخ، حەیدەر ئەكرەم عەبدوڵڵا، كۆسرەتمحەمەد مەحمود، ئەژین سەباح عەلی، كاكەمین یوسف مەروان، جەمیل عومەر ئەحمەد، موحسن عوسمان ئەحمەد، هۆگر عوسمان خالید، دەرباز عوسمان عەزیز، زیرەك حەسەن عەبدوڵڵا، گۆران عەباس فەریق، بورهان عەبدوڵڵا عەزیز، دەریا خەڵەف تاهیر، سەروا محەمەد مەجید، ئەحمەد عەلی محەمەد، یوسف مەعروف شەریف، حەیدەر حەمە ئەمین عەبدوڵڵا، هەژار ئەنوەر مەجید، سامان ئەحمەد عەلی رەمەزان موراد رەحیم ئەمین كاروان كامەران كەریم، هیوا فوئاد رەشید، محەمەد حوسێن محەمەد، كەیفی ئیبراهیم عەلی، پشتیوان رەحمان نەریمان، مەولود عەلی محەمەد، عەلی غازی رەئووف، رزگار عەبوش سابیر، سەمەد ئەكبەر غەفور، نەبیل سەلاح كەریم، بەسام مستەفا حیسامەدی، تەها لوقمان حەسەن، محەمەد سەباح كەریم، دێرین جەلیل محەمەد، سەركەوت قادر سەعید قادر، هارون لەتیف كەریم، ئەحمەد غەفور محەمەد نەجم, جوانرۆ كەریم محەمەد ئەمین، رەنگین یوسف عەزیز، ئیبراهیم حەمە سالح ئەمین، رزگار عوسمان كەریم رەزا، هیوا حەیدەر عەلی پاشا، عەبدوڵڵا حەسەن عەبدوڵڵا، رەسوڵ خدر مینە خدر، ئارام قادر عوسمان حەمەد، شێرزاد حەسەن كازم حەسەن، دیار بەكر شوكور كەریم، شۆرش مەجید حەمید عەلی، ئاوات ئەحمەد محێدین، بریار ئازاد خدر سالح، هونەر عەلی سەید مەلا عەلی، محەمەد نورەدین محەمەد، عەقید (شێرزاد رەفعەت قادر)، عەقید (عەبدوڵڵا گەنجو حەسەن)، عەقید (یوسف وەحید ئیبراهیم)، مولازمی یەكەم (نەجات جەبار ئەحمەد قادر)، مولازم (مەریوان كەریم قادر), مولازم (عەلی سالح فەتحوڵڵا)، مولازم (محەمەد كەریم ئەحمەد)، محەمەد كەریم عەزیز، هەڵۆ كەماڵ شەریف، زانا دڵشاد، فامی محەمەد عەلوش، سەدرەدین عەزیز، هێمن عادل، موخەلەد ئیبراهیم، عاسی حەبیب، سەلاح سوبحی، عەلی فازڵ، فوئاد ئەحمەد، سامان جەعفەر، مەهدی محێدین، سەباح مەجید، یوسف سەباح، كەریم سەمین، هاورێ عەزیز، ئەسعەد بەهجەت.

شوكر پاڵەوان

شێرزاد جەباری - مامۆستا جومعە -مامۆستا عوسمان وەلی
٢٤-٤-١٩٦٩

شوکر ڕەزا

کۆنگرەی چوارەمی یەکێتی نووسەرانی کورد شێرزاد جەباری
١١-١-١٩٧٤

شێرزاد جەباری و کۆمەڵێك مامۆستا لەسەر ڕێگای هەڵەبجە
٢٩-٣-١٩٧٩

قوتابخانەی ئازادی کۆمەڵێك مامۆستا لەگەڵ شێرزاد جەباری
٢٤ی نیسانی ساڵی١٩٦٩

شێرزاد جەباری لە یەکێك لە گەشتەکانیاندا

شێرزاد جەباری لە دێی مامشە لە ١٩٧٣

**کۆمەڵێك مامۆستا لەگەڵ شێرزاد جەباری لە قوتابخانەی فەلەستین**
**٦-٥-١٩٧٨**

**کۆمەڵێك مامۆستا لەگەڵ شێرزاد جەباری لە قوتابخانەی فەلەستین**
**٦-٥-١٩٧٨**

شێرزاد جەباری لە یەکێك لە گەشتەکانیاندا

شێرزاد جەباری و کۆمەڵێك مامۆستا لە کەرکوك

**کۆمەڵێك هاوڕێی شێرزاد جەباری**

**ئەم وێنەیە لە یەکێك لە چایخانەکانی هاوینەهەواری شەقڵاوە لە ساڵی ١٩٥٨ گیراوە**
**لە ڕاستەوە:- شوکور مستەفا - عەبدولسەلام محەمەد ئەمین - مستەفا نەریمان**

*** عەمید ڕوکن (شێرزاد عەزیز کافرۆشی):-**
- ساڵی ۱۹۷۱ لە کەرکووك لەدایکبووە.
- ساڵی ۱۹۹۰ لە پۆلی شەشەم بە یەکەمی سەر پارێزگای سلێمانی دەرچووە لە کۆلێژ زمان لە زانکۆی سلێمانی وەرگیراوە.
- ساڵی ۱۹۹۱ لەلایەن حیزبی بەعسەوە بڕیاری دەستگیر کردنی بۆ دەرچوو.
- دەرچووی خولی یەکەمی کۆلێژی سەربازی (قەڵاچوالانە).
- بڕوانامەی ماستەری هەیە لە زانستی سەربازی.
- دەرچووی کۆلێژی جەنگ خولی نۆزدەهەمە.
- یاریدەدەری کۆلێژی سەربازی و جێگری فەرماندەی فیرقەی پێنجی سووپای عێراقی بووە.
- سەر بە هۆزی کافرۆشی دەورووبەری کەرکووك بووە.
- کراوەتە فەرماندەی تیپی بیستی پارێزگای کەرکوك لە ساڵی ۲۰۱۷.
- لەدواییدا گواسترایەوە بۆ مووسڵ.

*** شاکیر کاهیەچی:-**
یەکەم کەس بووە کە لە کەرکووك دووکانی شیرینی و پاقلاوەی داناوە.

کوڕێکی بەناوی مەحموود شاکیر، بەڕێوەبەری قوتابخانەی نالی بووە.

*** لیوای پزیشك شەرەفەدین محێدین بەرزنجی:-**
ساڵی ۱۹٤۲ لە ئاڵتوون کۆپری لە کەرکووك لەدایکبووە.
- ساڵی ۱۹٦۷ کۆلێژی سەربازی لە (كلية الضباط الاحتياط) لە بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی ۱۹٦۷ کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- بەشداری گەلێك کۆڕ و کۆبوونەوەی کردووە دەربارەی بەنج و ڕێنمایی لە گەلێك ناوچەی عێراقدا، بەشداری گەلێك کۆنگرەی نێودەوڵەتی کردووە.
- ساڵی ۱۹۹۵ خانەنشین کراوە.

*** مەلا شەفیق گوڵدەرەیی:-**
- ناوی مەلا شەفیق کوڕی کوێخا ڕەشید کوڕی فەقێ سەعیدی گۆڵدەرەیە.
- ساڵی ۱۹۲۸ لە گوندی گۆڵدەرەی بچووك لەدایکبووە.
- ساڵی ۱۹٥۲ دەستی کردووە بە خوێندن لە حوجرەی مزگەوت.
- ساڵی ۱۹٥۹ ئەندامی وەفدی جەماوەری پارتی دیموکراتی کوردستان بووە لە لیوای کەرکوك بۆ پێشوازیکردن لە مەلا مستەفای بارزان.
- ساڵی ۱۹٥۹ ئەندامی وەفدی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە بە سەرپەرشتی ئیبراهیم ئەحمەد بۆ میواندارێتی عەبدولکەریم قاسم بۆ داوای مافەکانی کورد لە حکومەتی عێراق.
- یەکێکە لە کەسایەتییە ڕۆشنبیرییەکانی ناوچەکە.

* ( عابد - مەلا عابد ):-

- ناوی (عابد کوری یوسف) بووە، بەڵام لە دوای ئەوەی بووەتە موسلمان ناوەکەی بووە بە (عابد کوری عەبدوڵلای قادری)، کە لە بنەڕەتدا خۆی لەدایكو باوکێکی جوولەکە لەدایکبووە.
- لە کاتی لەدایکبوونیدا دایکی کۆچی دوایی کردووەو بۆیە لەلای بیروباوەڕی ئایینی جولەکەکان وابووە هەر منداڵێك لە کاتی لەدایکبووندا دایکی بمرێت ئەوە ئەو منداڵە سەر بە خێر نییەو هەر لە منداڵییەوە داویان بە (زوبەیدە خانم) خێزانی (حەسەن ساقی) بۆ بەخێوکردن.
- ساڵی (١٨٩٨)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە (٧)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٢) کۆچی دوایی کردووە.
- ماوەیەکی زۆر لە مزگەوتی حاجی خدر بووە تا بەوەی لە دواییدا بە مزگەوتی (مەلا عابد) بە ناوبانگ بووە.

* ( عادل تۆفیق ):-

- ناوی (عادل تۆفیق عەبدوڵلا بەیاتی)یەو لە ساڵی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی کۆلێژی ئێتەرنەری زانکۆی بەغدایە.
- یەکێکە لەو شاعیرانەی کە شیعری بە زمانی عەرەبی بڵاوکردووەتەوە.

* ( عادل چاوشین ):-

- ناوی (عادل عەبدوڵلا بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٩٥٥) لە گەرەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- بەشداری کردووە لەم شانۆگەرییانە:
- (کاوەی ئاسنگەر)، چەمچەماڵ، ١٩٧٠.
- (دەرەبەگ)، ١٩٧٤.
- چیرۆکی تەمسیلی (مەرەزە)، (دەرەبەگ)، (فەلەستین)، (قەڵاچۆکردنی نەخوێندەورای).
- (مامۆسای زیرەك)، (دکتۆر پەپوولە)، (گریان).

* ( عادل زەینەل حوسێن بەیاتی ):-

- ساڵی (١٩٣٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لێکۆلەرەوەیە لە زانستی بیرکاری.
- ماجستێری لە بیرکاری لە زانکۆی واشنتۆن لە ساڵی (١٩٦٦) هێناوە.
- ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (Con tiutions to Galton's tank order statistice)، نامەی ماستەر لە ماتماتیك بە زمانی ئینگلیزی، زانکۆی واشنتۆن، ١٩٦٦.
- (الاستقصاء)، بەغدا، ١٩٧٦.
- (المعادلات التفاضلية)، بەغدا، ١٩٧٦.
- (المصفوفات)، چاپخانەی (دار الرسالة)، بەغدا، ١٩٧٨.
- (مبادئ الرياضيات، التفاضل والتكامل)، چاپخانەی (دار الكتب)، موسل، ١٩٨٠.
- (الدوال المركبة)، چاپخانەی (دار الكتب)، موسڵ، ١٩٨٣.
- (مقدمة في التحليل العددي)، چاپخانەی (التعليم العالي)، موسڵ، ١٩٨٩.

* ( عادل عەبدوڵلا ):-

- ساڵی (١٩٣٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- وەکو یاریزانی باڵە لە تیپی فوتابخانەی قەڵای سەرەتایی یاری کردووە.
- ساڵی (١٩٥٠) خەڵاتی لە ڕاکردنی ١٠٠ مەترو ٢٠٠ مەتر وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٥٤) هەڵبژێردراوە بە یاریزانی هەڵبژاردەی معارفی عێراق.
- ساڵی (١٩٥٦) بەشداری خولی سەربازی لە تاران کردووە لە تۆپێن.
- لە (١٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (عادل عەلی):-

- ساڵی (١٩٥١) لەشاری کەرکوک لەدایك بوو.
- ساڵی (١٩٧٧)دا ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەشی نەخشەسازی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٥)دا پێشانگای تایبەتی لەکەرکوك کردووەتەوە لە هۆڵی یانەی وەرزشی سۆلاف.
- مامۆستای هونەر بووە لەکەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٩) دووەمین پێشانگای تایبەتی کردووتەوە لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەر لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٨١) سێیەمین پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی تەئمیم بۆ هونەری نوێ کرووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٣) بەشداری یەکەمین پێشانگای شێوەکاری هونەرمەندانی کەرکوك کردووە لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.

* (عادل کازم موسا):-

- ساڵی (١٩٥٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٦-١٩٧٧) پەیامانگای هونەرە جوانەکانی بەشی شێوەکاری لە بەغدا تەواو کردووە.

* عادل گەرمیانی - دکتۆر عادل گەرمیانی):-

- ناوی ((عادل محەمەد گەرمیانی))یە.
- ساڵی ١٩٥٦ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو پەیمانگەی تەندروستی بەغدای تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٢ وەرگیراوە لە کۆلێژی ئاداب بەشی کوردی لە زانکۆی سەلاحەدین.
- ساڵانی ١٩٥٦ - ١٩٨٧ بەکالۆریۆسی لە زمان و ئەدەبی کوردی لە زانکۆی سەلاحەدین بەدەستهێناوە.
- ساڵانی ١٩٩٥-١٩٩٦ ماستەری لە کۆلێژی پەروەردەی ئبن روشد لە زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
- ساڵانی ١٩٩٨ - ١٩٩٩ دکتۆرای لە هەمان زانکۆی بەدەستهێناوە.
- لە بواری رەخنەی ئەدەبی بڵاوکراوەی هەیە.

- بەرهەمەکانی:-
- چیرۆکی لە خەومای، ئەحمەد موختار بەگی جاف، بە زمانی عەرەبی.

* عادل نادر:-

- ساڵی ١٩٥٦ لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- لەگەڵ دوو برایدا بەشداری شۆڕشی ئەیلوولی کردووە.
- لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی کردووە بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە، لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەران.
- ساڵی ١٩٨٢ لە چالاکییەکانی ڕێکخستندا لەپاش گرتنی رەبایەی حەی سناعی چەمچەماڵدا ئاشکرا دەبێت، بۆیە هەر هەمان ساڵ پەیوەندی دەکات بە هێزی پێشمەرگەوە و دەکرێت بە کادری ڕێکخستن لە سنووری کەرتی دووی تیپی ٥٧ی سەگرمە و دواتر دەچێتە سنووری تیپی ٥٩ی حەمرین وەك کادری کاروباری کۆمەڵایەتی.
- بەشداری زۆربەی شەڕەکانی کردووە و پێنج جار بریندار بووە.
- لە پرۆسەی ئەنفالدا لە ساڵی ١٩٨٨ وەك پارتیزان ماوەیەك لە سنووری هەردوو تیپی ٥٧ و ٥٩ دەمێنێتەوە و دواجار لە سەرگەلو بە چەکی کیمیایی بریندار دەبێت کە تا دوا تەمەنی کاریگەری لەسەر دەبێت.
- لە کارەساتی ئەنفالدا دوو کوڕ و کچێکی و براژنێکی لە لایەن بەعسەوە لە نوگرە سەلمان زیندانی دەکرێن، دواتر بە لێبوردنی گشتی ئازاد دەکرێت.
- لە دوای ئەنفال لە قاسمە رەش دەبێتە جێگری ئیدارەی مەکتەبی سیاسی تا تەشکیلاتی مەفرەزەکان بۆ خوارەوە، بۆ سازادنی ڕاپەڕینی شارەکانی کوردستان، بە تایبەتی لە چەمچەماڵ و کەرکوك.
- دوای ڕاپەڕینی چەندین پلەی حیزبی وەرگرتووە وەك کارگێڕی مەڵبەند لە شارەزوور و کەرکوك، جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی کەرکوك و دوا پلەش ئەندامی مەکتەب ڕێکخستن بوو.
- لە ٢٤ی شوباتی ساڵی ٢٠١٢ تووشی جەڵدەی مێشك دەبێت، دوای ململانێیەکی زۆر لە ٢٧ ئاداری ساڵی ٢٠١٥ کۆچی دوایی دەکات.

* ( عارف دەلۆی کاکەیی ):-

- هونەرمەند ناوی (عارف فارس مەحموود)ە کە بە (عارف دەلۆ)و (عارف دەلۆی کاکەیی) بەناوبانگە.
- ساڵی (١٩١٥) لە ئاوایی (زەنقر)ی داقوق لەدایکبووە.
- مەقامەکانی ناوچەی گەرمیانی بە چاکی و رەوانی زانیبووە وەکو مەقامی (ئەللاوەیس، قەتار، خاوکەر، خورشیدی، نای نای) جگە لەمانە لە لاوك و حەیران ئاشنای هەبووە.
- ساڵی (١٩٤٥) لەبەر دەستکورتی هاتووەتە کەرکوك لە گەرەکی حەدیدییەکان نیشتەجێ بووە.
- جگە لە مەقامە کوردییەکان بە عەرەبی و تورکمانیش مەقام و گۆرانی وتووە.
- لە (٢١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٣) کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی حەدیدییەکان بەخاك دەسپێردرێت.

* ( عارف کریم قوربانی-عارف قوربانی ):-

- ساڵی (١٩٧٠) لە بنگرد لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (تەم و دوکەل)، سلێمانی، ١٩٩١.
- (کەرنەڤاڵی مەرگ)، ١٩٩٢.
- (مارشی نەبەزین)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٣، چاپی دووەم، ١٩٩٧.
- (سەید جەوهەر جەوهەر بوو بۆ کوردستان)، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (کۆچ و کۆچپێکردن هۆکارو بنەماکانی)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، چاپی دووەم، ٢٠٠١.
- (شایەتحاڵەکانی ئەنفال)، بەرگی یەکەم، سلێمانی، شوباتی ٢٠٠٢.
- (شایەتحاڵەکانی ئەنفال)، بەرگی دووەم، سلێمانی، ئەیلولی ٢٠٠٢.
- شایەتحاڵەکانی ئەنفال)، بەرگی سێیەم، سلێمانی، شوباتی ٢٠٠٣.
- لە نوم رەیحانەوە بۆ تۆبزاوا)، سلێمانی، ئازاری ٢٠٠٤.
- لە تۆبخانەوە بۆ عەرعەر)، ئازاری ٢٠٠٤.
- کەرکوك و پاکتاوی رەگەزی)، سلێمانی، ئازاری ٢٠٠٤.
- گەرانەوە بۆ کەرکوك)، کەرکوك، ئازاری ٢٠٠٤.
- خەمەکانی کەرکوك)، سەرەتای ٢٠٠٥.
- لە بارەی کەرکوکەوە)، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (دەربارەی کەرکوك)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (شایەتحاڵەکانی ئەنفال)، بەرگی چوارەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- (شاهد علی جریمة العصر، سائق الجرافة الذي دفن المؤنفلین).
- (کوردو جەبهەی تورکمانی).
- (شهود عیان عن الانفال).
- (کرکوك الحقائق والارقام).
- (دیدێکی جیاواز بۆ کەرکوك).
- (زەروریەتی خۆنوێکردنەوەی یەکێتی).
- (کێ کەرکوکی داگیر کردووە؟).
- (ئەنفالی هەڵەبجە، گەلاوێژ)، ٢٠٠٦.
- (ئەنفالی هەڵەبجە، حەپسە)، ٢٠٠٦.
- (ئەنفالی هەڵەبجە، زارا)، ٢٠٠٦.
- (ئەنفالی هەڵەبجە، شەمیلە)، ٢٠٠٦.
- (عوزێر شایەتحاڵێکی زیندوی ئەنفالەکان)، ٢٠٠٦.
- (فەرەج ئەو ئەنفالکراوەی لە گۆڕە بە کۆمەڵەکانەوە گەرایەوە)، ٢٠٠٦.
- (زەروریەتی خۆنوێکردنەوەی یەکێتی)، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (کێ کەرکوکی داگیر کردووە)، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- (گۆڕە بە کۆمەڵەکان)، ٢٠١٠.
- (لە بارەی گۆڕی بە کۆمەڵی مناڵە ئەنفالکراوەکانەوە)، ٢٠١٠.
- (ئەو سایەق شۆفڵەی بەشێك لە ئەنفالەکانی داپۆشی).
- Wahid، An Eyewitness of Anfal Genocid al) Crimes).
- (وەحید، شایەتحاڵێك لەسەر تاوانی جینۆسایدی ئەنفال).
- (تەیمور.. تاکە رزگاربووی گۆڕی بە کۆمەڵی ژن و مناڵە ئەنفالکراوەکان)، ٢٠١٣.
- (شایەتحاڵەکانی ئەنفال)، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ٢٠١٤.
- (شایەتحاڵەکانی ئەنفال)، بەرگی دووەم، چاپی دووەم، ٢٠١٤.
- (شایەتحاڵەکانی ئەنفال)، بەرگی سێیەم، چاپی دووەم، ٢٠١٤.
- (شایەتحاڵەکانی ئەنفال)، بەرگی چوارەم، چاپی دووەم، ٢٠١٤.
- Hepse شایەتحاڵی کیمیاباران و ئەنفالی هەڵەبجە، ٢٠١٥
- Semile شایەتحاڵی کیمیاباران و ئەنفالی هەڵەبجە، ٢٠١٥
- TAIMUR، ٢٠١٥
- تیمور، دیدار شاهد، ٢٠١٥
- شمیلە، مصاحبە رۆژنامەنگاری، ٢٠١٥
- گلاوێژ، شاهد بمباران وانفال حلبچە، ٢٠١٥

- واجد کوچانی، شهید زنده، گورهای جمعی انفال، ۲۰۱٥
- ساڵی (۱۹۹۲) سەرنووسەری گۆڤاری چەرموو بووە.
- ساڵی (۱۹۹٦- ۲۰۰۱) سەرنووسەری گۆڤاری ئاران.
- ساڵی (۱۹۹٦-۲۰۰۱) بەڕێوەبەری نووسینی ڕووناکی.
- ساڵی (۱۹۹٦-۲۰۰۱) ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری حەمرین.
- ساڵی (۱۹۹٦-۲۰۰۱) ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (ئەنفال).
- ساڵی (۱۹۹٦-۲۰۰۱) ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (ئەنفال) ڕۆژنامەبوو لە ساڵانی گۆیتەپەدا دەرچووە.
- سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئاسۆ) بوو.
- ماوەیەك بەڕێوەبەری دەزگای خەندان بووە بۆ پەخش و وەشاندن.

* ( عارف مەعروف داوودی ):-

- ساڵی (۱۹٦۲) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدایە، بەشی هونەری بیستن و بینین.
- بەشداری گەلێك دەرهێنانی تەمسیلی لە بەغداو کەرکوك کردووەو گەلێك لێکۆڵینەوەی هەیە دەربارەی شانۆ.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی (تزاحم البيادق في سماء الشعر)، ۲۰۰۹.

* ( عاسی سەعید کاکەیی ):-

- ساڵی (۱۹۲۲) لە گەڕەکی موسەڵلا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ماوەیەك کارمەندی (النشاط المدرسي) بووە لەوێ زیاتر چاوی کراوەتەوەو فێری وێنەکێشانی بوارەکانی هونەر بووە، بە تایبەتی دەستێکی باڵای هەبوو لە کۆتەڵ دروستکردندا، وێنەی چەندین کەسی دروست کردووە لەوانە (عەبدولکەریم قاسم) لە پێش دەرگای فەیلەقی کەرکوك، هەروەها وێنەی دەروێش شاکیری کاکەیی و وێنەی خۆی تا ئێستا ماوە.
- دەسخەتێکی زۆر جوانی هەبوو زیاتر لە مامۆستا حاتەمی برای فێرببوو، چەندین دەستنووس و نامەی ماوەتەوە کە لەگەڵ گەورە پیاوانی ئایینی تایەفەی کاکەیی ئاڵوگۆڕی کردووە.
- هاوڕێی سەید حەسەن ڕەسمچی و مەحموود عوبێدی بووە، لە ساڵی (۱۹۸۹) لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

* عاشقی:-

- ناوی (شێخ محەمەد کوڕی شێخ نەجمەدین سابری)یە.
- ساڵی ۱۹۰۰ لە شۆڕیجەی کەرکوك هاتووەتە دونیاوە.
- لای مەلا مەردان و مەلا ناسیح سیامەنسووری زانستە ئایینییەکانی خوێندووە.
- مەلایەتی کردووە لە مزگەوتی مەلا ئەحمەدی گردە و مزگەوتی بلاغ.
- کاتێك ماڵی لە کەرکوك بووە ماوەی ۳ ساڵ لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك کاری کردووە، لە ساڵی ۱۹٤۲ تا ۱۹٤٥.
- ساڵی ۱۹٤٥ لەگەڵ شێخ ئەمینی برا دوکانی خەیاتی و قوماش فرۆشی داناوە لە قەیسەری کەرکوك.

سورکان، دواتر چووەتە کەوەڵە بۆ ماوەی ٤ ساڵ مەلایەتی کردووە.
- ساڵی ۱۹٥۲ کۆچی دوایی کردووە.

* ( عالی ):-

- لە بنەڕەتدا ناوی (محەمەد)ەو لە شیعری تورکیدا بە ناوبانگە بە (عالی)، دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی گەلێك راوبۆچوون هەیە کە لە تورکیادا بە مۆر (عەلی بابا) بە ناوبانگە، لە کەرکوکیش بە مۆر (بابا عەلی) ناو هێنراوە، هەندێك لە سەرچاوەکانیش بە (نور عەلی بابا) نووسیویانە، کوڕەکەشی لە دیوانەکەی خۆیدا لە ناوی بنەڕەتی خۆی بەم شێوەیەی نووسیوە (عەبدولقادر غولامی کوڕی شێخ نور عەلی ئەلعالی)، لە کتێبی (الانفاس الرحمانية)دا بە مۆر (بابا عەلی) نووسراوە.
- ساڵی (۱۸۰٥) لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لە هەرە موریدە دڵسۆزەکانی (شێخ عەبدولرەحمانی خالسی) لە دوای ئەوەی لە بواری تەریقەدا چالاك بووە، (شێخ عەبدولرەحمان) ئیجازەی (وەلی) پێداوەو بۆ ئیرشادو تەریقەتی قادری ناردویەتییە (سیواس)و لەوێ تەکیەیەکی فراوانی تەریقەتی قادری کردووەتەوەو لە ناوچەکانی دەوروبەریشی ئاوەدان بووە، لە ساڵی (۱۸۷۰)ی زایینیی لەگەڵ کوڕەکەی گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوك و لەو کاتەدا (شێخ عەبدولرەحمان کۆچی دوایی کردبوو، کوڕی (شێخ عەلی) لە شوێنی بوو، بۆ ماوەی سێ مانگ وەکو میوان ماوەتەوەو لە دواییدا گەڕاوەتەوە بۆ (سیوان).
- ئاشنایەتی لەگەڵ (زیا پاشا)دا هەبووەو هەر بەهۆی ئەویشەوە تێکەڵاوی گەلێك خەڵك بووە.
- بەرهەمەکانی:
- گەلێك بەرهەمی شیعری بە زمانەکانی تورکی، عەرەبی، فارسی هەبووە.
- (تنبيه السالكين)، یەکێکە لە کتێبە بەناوبانگەکانی کە گەلێك لایەنی جۆربەجۆری تەریقەت و ئایینی تێدایە.
- ساڵی (۱۸۸۲) کۆچی دوایی کردووە.

* ( عالیە محەمەد ئەمین ):-

- ساڵی ۱۹٥۷ لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شاری کەرکوکدا تەواو کردووە.
- دەرچووی کۆلێژی وەرزەیی بەشی زانستی کۆمەڵناسی، زانکۆی سەلاحەددینە.
- لە قۆناغی خوێندنی سەرەتایی وەك وەرزشکارێك بەشداری لە چالاکییە وەرزشییەکانی (چالاکی قوتابخانەکانی کەرکوك) کردووە.
- لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی لەنێوان ساڵانی (۱۹۷۱-۱۹۷٤) بەشداری لە یارییەکانی (گۆڕەپان و مەیدان) کردووەو چەندین جار خەڵاتی یەکەم و دووەمی لەسەر ئاستی کەرکوکدا بەدەستهێناوە، هەروەها بەشداری لە یارییەکانی (باسکەو باڵەو تۆپی دەستی) کردووە.
- ساڵانی (۱۹۷٦-۱۹۷۹) لە قۆناغی خوێندنی ئامادەیی بۆ ماوەی سێ ساڵ بەدوای یەکدا پاڵەوانی (گۆڕەپان و مەیدان)

کچانی پارێزگای کەرکوک، پلەی یەکەمی لەم یاریبانە بەدەستهێناوە (ڕاکردنی ١٠٠م، ڕاکردنی بەربەست ٤×١٠٠م، هەڵدانی قورسایی، هەڵدانی دیسك)و هەروەها لەو ساڵانەدا یەکێك بووە لە یاریزانە سەرەکییەکانی تیپی وەرزشی کچانی کەرکوك‌و ئەم یاریبانەی لەگەڵ ئەو تیپەدا کردووە (باسکەو باڵەو تۆپی دەستی).

- ساڵی (١٩٧٦)دا بوو بە ئەندام لە (یانەی وەرزشی سۆلاف)و لەگەڵ ئەو یانەیەدا بەشداری لەم یاریبانە کردووە (ڕاکردنی ١٠٠م، ڕاکردنی بەربەست ٤×١٠٠م، هەڵدانی قورسایی، هەڵدانی دیسك)و هەروەها بەشداری لە تیپەکانی (باسکەو باڵەو تۆپی دەستی) ئەو یانەیەدا کردووە.
- ساڵی (١٩٧٨) لە یاری (هەڵدانی قورسایی)دا ژمارەی پێوانەیی عێراقی تۆمار کرد کە (٧٠/٢٨م) بوو، ئەم ژمارە پێوانەییە لەسەر ئاستی عێراقدا تا ئەم دەمە بەناو ئەوەوەماوە.
- ساڵەکانی (١٩٧٩-١٩٨٣) لە زانکۆی سلێمانی‌و دواتر لە زانکۆی سەلاحەددین بۆ ماوەی چوار ساڵ پاڵەوانی (گۆڕەپان‌و مەیدان)ی زانکۆ بووە.

*** عەباس ئەحمەد:-**

- ساڵی ١٩٥٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- دیوانی شیعری، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٦
- دیوانی شیعری، بەرگی دووەم، ٢٠٠٧
- نجوم في سماء التركمان، ٢٠١٢
- أربيل وهويتها التركمانية، ٢٠١٠
- نفخات إيمانية،
- نفخات إيمانية،
- خواطر ورؤى، ٢٠١٤

*** (عەباس جەمیل جێماو):-**

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (یەکەمین فیستیڤاڵی تەبایی‌و برایەتی)، بەرنامە، ئامادەکردن، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (نەرمە سەمای کۆچ)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٩.

*** (عەباس حوسێن ئەرەناى):-**

- ساڵی (١٩٤٣) لە گەرەکی چای لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٣) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە بەغدا تەواو کردووە.
- هەر لە شەستەکانەوە بەشداری گەلێك پێشانگای لە ناوەوەی کەرکوك‌و لە دەرەوە کردووەتەوەو بەشداری کاری نەخشەسازی شانۆیی کردووە گەلێك دیکۆری شانۆگەری جێبەجێ کردووەو بەشداری کردووە لەگەڵ تیپی (مللي طاقمي)ی لە حەفتاکان.
- ساڵی (١٩٧٠) پێشانگاییەکی تایبەت بە خۆی کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٠) لەگەڵ هاوڕێکانی بەشداری پێشانگای ئەنقەرەی کردووە.
- ساڵی (١٩٧٣) بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کردووە لە یانەی مامۆستایان لە (١-٧)ی حوزەیرانی هەمان ساڵ.
- ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٦) دوو پێشانگای تایبەتی لە ئەنقەرە لە تورکیا کردووەتەوە.
- هەر لە ساڵی (١٩٩٧) لە تورکیا دەژێت.

*** (عەباس حیلمی - مەلا عەباس حیلمی):-**

- ساڵی (١٨٨٢) لە کەرکوك‌و لە خێزانێکی کوردی هەژارو لە بنەماڵەیەکی ئایینی و خوا پەرست لەدایکبووە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٨٤) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- ناوی (عەباسی کوڕی وەلەد کوڕی سەید وەلی وێزی)یە، بە بنەماڵە دەگەڕێتەوە سەر (میری سووری کوڕی سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی)یە.

- لە موسڵ لە حوجرە دەخوێنێ و قورئان خەتم دەکات.
- گەلێك شیعری هەیە بە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی و کوردی.
- یەکێك بووە لە هۆنەرانی هەرە بەرزی کوردو لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا دەستێکی بەرزو باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ تەرو پاراوو شیرینن.
- ساڵی (١٩٥٩) تووشی نەخۆشی ئیفلیجی دەبێت و تا (٧)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٦) لە ناو جێ دەکەوێت.

* (عەباس عەسکەر):-

- (عەباسی عەسکەر کوڕی عەلی عەسکەر ئەحمەد توتونچی خانەقینی)یە، لە ساڵی (١٩٣٩)ی زایینی لە شاری خانەقی لە گەڕەکی (حەمیدیە) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٨-١٩٥٩) خانەی مامۆستایانی لە شاری (بەعقوبە) تەواو کردووە لە شاری کەرکوك بووەتە مامۆستا تا ساڵی (١٩٨٦) لەسەر ئارەزووی خۆی خانەنیشین کراوە.
- ساڵی (١٩٦٠)وە هاتووەتە ناو جیهانی ئەدەبەوە لە هەمان ساڵدا بە زمانی عەرەبی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا دەستی کردووە بە نووسین.
- دەستێکی باڵای هەبووە لە وەرگێڕاندا بەتایبەتی وەرگێڕانی بەرهەمی شاعیرانی کورد بۆ سەر زمانی عەرەبی.
- شیعرەکانی لە بەرهەمی دیوانێکدا بە چاپ گەیاندووە بە ناونیشانی (دیوانی عەباس عەسکەر).
- ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دووای کردووە بە شێرپەنچە.

* عەباس عەرەب خەماس:-

- ساڵی ١٩٣٩ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- عبرت، شیعر بە زمانی تورکی.
- حکمت، شیعر بە زمانی تورکی، ٢٠١٠
- بالعلم تسمو، ٢٠١١
- اعمال وداعیة.

* (عەباس عەلی ئەسعەد ئەلعەتار):-

- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (اثر التاهیل التربوي لمدرسي العلوم في تحصیل الصف السادس العلمي في ثانویات العراق)، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەردە، زانکۆی بەغدا، ١٩٧٥.
- (اثر إستخدام أسلوبي الاستكشاف والتاكيد في التجارب المختبرية على تنمية التفكير العلمي لدى طلبة المرحلة الخامسة)، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی پەروەردە، زانکۆی بەغدا، ١٩٨١.
- (اتجاهات طلبة الصف المنتهي في كلية التربية نحو مهنة التدريس في اربيل جامعة صلاح الدين)، زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێژی پەروەردە، هەولێر، ١٩٨٥.

* (عەباس عەلی ئەلشەکرچی):-

- ساڵی (١٩٧٨) پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ فاروق فایق عومەرو سوعاد ستار کردووەتەوە.

* (عەباس کەمال ئەفەندی):-

- ساڵی (١٨٩٢) کۆچی دوایی کردووە.
- کۆمەڵێك بەرهەمی چاپکراوی هەبووە بەڵام زانیاریمان دەربارەی نییە.

* (عەبدوڵڵا محێدین):-

- ساڵی (١٩٤٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٨)وە ئاشقی مۆسیقا بووە لەسەر دەستی (ودمەن) کە مۆسیقاژەنێکی دیانی کەرکوك بووەو وانەی مۆسیقای پێی ووتون.
- ساڵی (١٩٦٦) چووەتە جۆقی مۆسیقای سەربازی بۆ ماوەی نۆ ساڵ وەکو مۆسیقاژەن کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٥٩) لە تیپی مۆسیقای بێ کەس کاری کردووە لەگەڵ هونەرمەندان رەمەزان زامدارو خالید دلێر.
- لە سەرەتای شەستەکان یەکێك بووە لە دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای سۆلاڤ.

- ساڵی (١٩٧٠) ئەندامی تیپی میللی رەشید بووە لە بەغدا تاکو ساڵی (١٩٧٩).
- ساڵی (١٩٨٠) ئەندامی تیپی مۆسیقای کەرکوك بووەو لە ساڵی (١٩٨٢)شدا لە تیپی مۆسیقای تەلەفزیۆنی کەرکوك TVتاکو ساڵی (١٩٨٩) بەرپرسی بەشی مۆسیقای کەرکوك بووە.
- لە ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٧ کۆچی دوایی کرد.

* ( عەبدولجەبار شۆریجە ):-

- ناوی عەبدولجەبار کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی شێخ نەجمەدین (سابری).
- ساڵی (١٩٦٧) لە دێی شۆریجە هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (١٩٩١) کۆلیژی شەریعەی زانکۆی بەغدای تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی:
- (پیاوانی شۆریجە)، دەستنووس.
- (سیره مشایخ شورجه).
- لێکۆڵینەوەی دەستنووسی (قاموس رنجوري، عربي فارسي).
- لێکۆڵینەوەی بەشی یەکەمی دەستنووسی کتێبی (برء الالام)ی (شێخ محیّدین کەرکوکی)، ٢٠١٢.
- (إعلام برزنجة)، دەستنووس.
- (لە یادەوەری ئافرەتێکی کوردی ئیماندارەوە)، دەستنووس.
- دووبارە چاپکردنەوەی کتێبی (دیوان صابري) لە ساڵی (٢٠٠٩) و زیادکردنی پاشکۆیەك بۆ دیوانەکە.
- ئامادەکردنی کتێبی (صفات الداعین إلی الله) بۆ چاپ کردن، کە هی مامێتی شێخ ئەحمەد نەجمەددین بەرزنجی، ساڵی (٢٠٠٩).
- ئامادەکردنی کتێبی (الاشرافیة) بۆ چاپ کردن، نووسینی شێخ مەحموودی قوتب، وەرگێڕان بۆ سەر زمانی عەرەبی ئەحمەد نەجمەددین.

* ( عەبدولجەبار مستەفا باخەوان ):-

- ساڵی (١٩٥٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لە ساڵی (١٩٨٨) لە ئیتاڵیا لە کۆلێژی ئەندازیاری بەشی تەلارسازی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٩٢) ماجستێری لە ئەندازیاری دەربارەی پلانسازی شار لە وڵاتانی تازە پێگەشتوو بەدەستهێناوە.
- پسپۆرە لە بواری وزەی نوێکراو.
- ماوەیەك مامۆستا بووە لە زانکۆی سلێمانی.
- کتێبە چاپکراوەکانی:
- (ئەندازییاری خانووبەری لادێکانی کوردستان)، سلێمانی، ٢٠٠٥، هەروەها لە ساڵی (٢٠٠٨) هەمان کتێب چاپی دووەم کراوەتەوە.
- (چیمەن ئاواییەکی نوێ لە کوردستان)، ٢٠٠٦.
- (بردي، آلتون کوبري، المدینة والمستقبل العمراني)، (٢٠٠٨).
- (ئیتاڵییەکان.. دۆستی گەلی کورد)، کەرکوك، ٢٠١٤.
- (مشروع حدیقة العلوم في کرکوك)، کەرکوك، ٢٠١٤.

* ( عەبدولحەکیم رەزی ):-

- ساڵی (١٩١٠) لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێکە لەو نووسەرانەی لە بواری پەخشانی هونەریو رەخنەسازی هونەریدا دەستێکی باڵای هەبووەو گەلێك لێکۆڵینەوەو کتێبی چاپکراوی هەبووە.
- کتێبێکی مێژوویی هەیە بە ناونیشانی (إستیطان الاتراك في منطقة الشرق الاوسط)، لە بەغدا چاپ کراوە.

* عەبدولحەکیم مەلا محەمەد عەبدولقادر - مەلا عەبدولحەکیم مەلا محەمەد عەبدولقادر رایەتی:-

- ساڵی ١٩٠٥ لە پشدەر لەدایکبووە.
- ژیانی مەلایەتی و خوێندنی ئایینی لە گوندەکانی خواموراد، خاڵدان، کانی کەوە، ئەحمەد لەوەن، قەرەتامۆن، قولە، بردووتەوە سەر.
- زانایەکی زیرەك و بوێر و دەسترەنگین بووە لە بواری زانستە ئایینییەکان و ئەدەب و زمانی عەرەبی و کوردیدا.
- دەستنووسێکی (١٦٠) لاپەرەیی هەبووە کە بریتی بووە لە دیوانی شیعری خۆی بە کوردی و عەرەبی، بەڵام بەداخەوە فەوتاوە و تەنها چەند پارچە شیعرێکی عەرەبی و کوردی ماوە.
- ساڵی ١٩٧٢ لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

* ( عەبدولحەمید قەرەحەسەنی ):-

- ناوی (مەلا سەید عەبدولحەمید)ە.
- شاعیرو نووسەر لە ساڵی (١٩٠٦) لە گوندی (خاڵەبازیانی) لەدایکبووە.
- لەگەڵ (مەلا جەمیل رۆژبەیانی) کتێبێکیان دەربارەی زانستی کەلەپوور بە زنجیرە لە ساڵی (١٩٤٤)دا لە گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە) بڵاویانکردووەتەوە.

* عەبدولحەمید مەجید عەبدوللا:-

- ناوی (عەبدولمەجید مەلا مەجید گەراوی)یە.
- ساڵی ١٩٥٠ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٠ کۆلیژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٤٧ بەناونیشانی (الإداري).
- لەنێوان ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٦ کۆلیژی یاسای زانکۆی موستەنسرییەی تەواو کردووە.
- ماوەیەك (وکیل آمر مدرسة الشؤون الاداري في معسکر رشید) بووە.
- ساڵی ١٩٩٣ خانەنشین کراوە.

* (عەبدولخالق قوتب):-

- ناوی نووسەر (عەبدولخالق کوڕی ئەحمەد حەمدی قوتب)ە.
- گەلێك چیرۆك و لێکۆڵینەوەی هەبووەو دەست و پەنجەی دیارە لە هونەری شانۆ لە شارەکە.

* (عەبدولڕەحمان بەکر):-

- ساڵی (١٩٠٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٢٣) لە کفری دامەزراوە بە مامۆستا تا ساڵی (١٩٢٥).
- ساڵی (١٩٢٦-١٩٢٧) دامەزراوە بە مامۆستا لە ناوەندی کەرکوك، لە دواییدا بووەتە بەڕێوەبەر لە قوتابخانەکانی قۆریەو مەلیك غازی.
- لە (٢١)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٣) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولڕەحمان خاڵسی تاڵەبانی - شێخ عەبدولڕەحمان خاڵسی تاڵەبانی):-

- ناوی (شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ مەلا مەحموودی زەنگەنە کوڕی ڕۆستەم ئاغای کوڕی یوسف ئاغای کاکە سووری ناوچەی بۆکانە)، نازناوی (خاڵس)ە.
- ساڵی (١٧٩٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شێخە بەناوبانگەکانی تەریقەتی (قادری)یە.
- چەند بەرهەمێکی لێ بەجێماوە لەوانە:
- (دیوان المرتب)، لە ساڵی (١٨٦٧) لە ئەستەمبوڵ چاپی کردووەو لە ساڵی (١٩٤٧) چاپی دووەمی کراوەتەوە لە تاران.
- (کتاب المعارف: في شرح مثنوي الشریف لجلال الدین الرومي).
- (بهجة الاسرار: مناقب الشیخ عبد القادر الکیلاني)، وەرگێرانی لە تورکییەوە، ١٨١٥.
- هەروەها شیعری تەخمیسی هەیە لەسەر شیعری شاعیری تورکی فضولي، هەروەها شیعری بە هەر چوار زمانی کوری (شێوەی هەورامی)، فارسی، تورکی، عەرەبی هەبووە.
- ساڵی (١٨٤٤) مزگەوت و منارەیەکی لەناو تەکیەی تاڵەبانیدا دروست کردووە.
- ساڵی (١٨٥٨) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولڕەحمان دەروێش جەعفەر):-

- ساڵی (١٩٤٦) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٢)وە کەوتۆتە خولیای هونەری خۆشنووسی.
- لەژێر کاریگەری هونەرمەندی عەرەب (هاشم الخطاط)و هونەرمەندی تورکیا (حامید ئامێدی).
- هەموو جۆرەکانی خەتخۆشی وەکو ثلث، فارس، دیوانی، جەلی دیوانی، نووسخ، کووفی، ڕوقعە) فێربووە.

* (عەبدولڕەحمان ڕەمزا گۆگجەیی):-

- ساڵی (١٩٢٧) لە گوندی گۆگجە لەدایکبووە.
- ساڵانی (١٩٤٩-١٩٥٢) لە بەغدا کۆلیژی شەریعەی تەواو کردووە.
- ساڵانی (١٩٦٢-١٩٦٣) بووەتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئیمام قاسم.
- ساڵی (١٩٥٦) ئەندامی پارتی دیموکرات بووە.
- لەنێوان (١٩٦٦-١٩٦٧) تووشی گرتن و ڕاوەدوونان بووە، ماڵی گواستۆتەوە بۆ بەغدا.
- یەکێك لەو مامۆستایانەی کە یاداشتیان داوە بە بەغدا

دەربارەی خوێندنی کوردی.
- گەلێك نووسینی هەیە بە زمانی عەرەبی.
- ساڵی (١٩٦٩) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی - مەلا عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی):-**

- ناوی (مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی حوسێن بەگ)ە، لە عەشیرەتی (ڕۆژبەیانی) لە گوندی (فەرقانە).
- خوێندوویەتی لای مەلا عەبدولڕەحیم زیاری، دوای ئەوەی ئیجازەی وەرگرتووە چووەتە بەغداو بووەتە مامۆستای تەکیەی خالدیە، لە دواییدا لە مزگەوتی ئەحمەدی لە مەیدان دەرسی ووتووە.
- ماوەیەك مامۆستا بووە لە مزگەوتی (سلێمانی) لەسەر قەڵای کەرکوك.
- لە ساڵێ (١٨٥٣) کۆچی دوایی کردووەو لە دوایی خۆی دوو کوڕی بە جێ ماوە لەوانە مەلا محەمەدو مەلا ئەحمەد.

*** (عەبدولڕەحمان زەنگەنە- مەلا بەشدراو):-**

- ساڵی ١٩٢٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٤٠ دەستی کردووە بە شیعر نووسین.
- ساڵی ١٩٦٣ لەگەڵ محەمەدی مەلا کەریم و مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لە کووت زیندانی کراوە.
- دوو کتێبی لەبارەی سیاسەت و کوردایەتی و یادەوەری هاوڕێکانییەوە نووسییەوە، بەڵام بەعس دەستی بەسەردا گرتووە و چاپ نەکراوە.
- لەلایەن مامۆستا فایەق بێکەسی شاعیر نازناوی (بەشدراو)ی وەرگرتووە.
- ساڵی ١٩٨٣ لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمەکانی:-
- گوڵزارستان، بەرهەمی شیعرەکانییەتی.

*** عەبدولڕەحمان سەفەر ئاغا:-**

- ساڵی (١٨٣٠)ز لە دایك بووە. سەرۆکی زەنگەنەکانی ناوچەی سەنگاو بووە، پیاوێکی ناودارو کەسایەتییەکی سەردەمی خۆی بووە، وەکو دەگێرنەوە ئەم تیرەیە دەگەڕێتەوە سەر (سەید بابەکر ئاغای کوڕی ئەوشێروان بەگی باوکی میر سمایل) بابەکر بە سەید ناو براوە، چونکە پیاوێکی دیندارو خواپەرست بووە، تاکو ئێستاش هەندێ زەوی‌و زاری کە هەیبووە لە گوندی قەیتوول، بە زەوییەکانی سەی بابەکر ناوبراوە، عەبدولڕەحمان ئاغا شەش کوڕو کچێکی هەبووە، ناودارێکی پایە بەرزبوو، بەڵام ساڵی کۆچی دوای ئەم زاتە نەزانراوە گۆڕەکەی لە گۆرستانی (سوور خەلیل) نزیك گوندی توکنی سەر قەڵای سەرووی شاری کفری بە خاك سپێردراوە.

*** (عەبدولڕەحمان سدیق کەریم):-**

- لە (٢)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوك لەدایکبووە
- دەرچووی کۆلێژی ئەندازیاریی، بەشی شارستانیی (زانکۆی موسڵ)ە لە ساڵی (١٩٨٩).
- ئەندامی ڕاوێژکار لە سەندیکای ئەندازیارانی عێراق‌و کوردستان.
- ئەندامی کارا لە سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان.
- ئەندامی دامەزرێنەرو بەڕێوەبەری کۆمەڵەی کوردستانێکی سەوز (١٩٩٢- ١٩٩٦).
- وەزیری ژینگەی عێراق لەکابینەی ئەنجوومەنی حوکمی عێراق (٢٠٠٣-٢٠٠٤).
- ئەندامی سەرکردایەتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان بووە لە (١٩٩٦-٢٠٠٨).
- ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان بووە لە (٢٠٠٥-٢٠٠٧).
- ئەندامی ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریی یەکگرتوو بووە لە

(٢٠٠٨-٢٠٠٩).
- لە (٩)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٩) دەستی لەکاری حیزبیی کێشاوەتەوە.
- ئەندامی یەکێتی پەرلەمانتارانی عێراقە.
- ئەندامی یەکێتی وەزیرانی عێراقە.
- ئێستا خاوەنی پرۆژەی (پرد)ە بۆ ریفۆرم و پەرەپێدان.
- خاوەنی چەندین نووسراوو و نامیلکەو توێژینەوەو بەرنامەو بابەتی رۆژنامەوانییە، لەوانەش:
- (بە کوردی).
- (ئافرەت و ئەفسانەی گوناهی یەکەم).
- (کتێبی ئەنفال لە ڕووانگەی ئیسلامەوە).
- (ژینگە).
- (قفڵەکانی سەردەم).
- نوێکردنەوەی یادی مەولوود.
- جەژنی قوربان جەژنی ژیان.
- نەورۆز جەژنی نەتەوەیی کوردە.
- ژینگە لە قورئان و فەرموودەدا.

* عەبدولڕەحمان شێخانی:-

- ناوی سەید عەبدولڕەحمان کوری سەید محەمەد کوری سەید عەبدولڕەحمانە نازناوی شیعری (هەژار)بووە.
- ساڵی ١٩٢٦ لە گوندی قەڵا میکائیل لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٤٧ نیشتەجێ بوو لە نزیك شارۆچکەی قادر کەرەم و مەکینەیەکی ئاردی داناوە و جارجاریش خەریکی کشتوکاڵ بووە.
- ساڵی ١٩٥٩ لە سەردەمی حوکمرانی عەبدولکەریم قاسم زیندانی کراوە و جارێکی دیکەش لە ساڵی ١٩٦٨ لە ئەمنی عامە بەندکراوە.
- سەید عەبدولڕەحمان کەمێك خوێندەواری هەبووە، لەبەر هەڵوێستی سیاسی کە مەیلی چەپڕەوی هەبووە زۆر تاڵی و چەرمەسەری و کوێرەوەری بینیوە.
- لە ٢١ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردووە.

* ( عەبدولڕەحمان شۆڕیجە - شێخ عەبدولڕەحمان شۆڕیجە ):-

- (شێخ عەبدولڕەحمان شۆڕیجە کوری شێخ نەجمەددین (صابری) کوری شێخ عەبدولڕەحمان کوری شێخ مەحموود قوتبی شۆڕیجەی بەرزنجی)یە، لە نەوەی شێخ محێددین کەرکوکە کە ئەویش کوری شێخ حەسەن گڵەزەردەیە، لە ساداتی بەرزنجەیە.
- لە ساڵی (١٩١٥) کاتی جەنگی جیهانی یەکەم کە پێی وتراوە سەفەر بەلك، شێخ نەجمەددین (صابری) بەهۆی ناهەمواری دنیاوە ماڵی ئەچێتە گوندی (دێلێژەی) قەرەداغ، بۆ ناو ئەو خزم و دۆستانەی کە لەوێن.
- شێخ عەبدولڕەحمان لە دێلێژە لە ساڵی (١٩١٥) لەدایکبووە، پاش مانگێك دایکی (مەهروب خان کچی شێخ

ڕەزایی ئۆسمانلەکە) کە یەکەم ژنی (سابری)یە کۆچی دوایی ئەکات.
- بەبێ دایك ئەمێنێتەوەو بەشیری مەڕو ماڵات بە خێوی ئەکەن.
- ساڵێك بە دواوە واتە دوای سەفەربەر، سابری ماڵەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ دێی شۆڕیجە.
- شێخ عەبدولڕەحمان لە شۆڕیجە بە شیری ماڵات بە خێوکراوەو هەروەها ئافرەتی زۆر کە هاتونە بۆ زیارەت شیریان پێداوە، شێخ عەبدولڕەحمان ئەیوت بۆیە (طباعم موختەلفە) لەبەر ئەوەیی شیری زۆر ئافرەتم خواردووە، یەکێك لەو ئافرەتانە کە شیری داوەتە شێخ عەبدولرحمان (دایە یاسە) کە خێزانی مەلا حەمیدە خەلکی مامشە بووە زۆر جار لە شۆڕیجە ماوەتەوەو شیری داوە بە شێخ عەبدولڕەحمان هەتاکو جارێکیان بە مەلا حەمید ئەڵێت با لەگەڵ خۆمان بیبەین بۆ مامشە بەخێویکەین، مەلا حەمیدیش رازی ئەبێت و ئەیبەن لەگەڵ خۆیاندا هەتاکو ئەگەنە چیمەن، لە چیمەن مەلا حەمید بە (دایە یاسە) ئەڵێت: بەخودا لە مامشە (سیرۆژە) بڵاوبووەتەوە لەناو ئاوایی ئەترسم بیبەین نەخۆش بکەوێت با بیگەڕێنینەوە بۆ شۆڕیجە بیدەینە دەس شێخ نەجمەددین، دووبارە لە چیمەنەوە ئەیگەڕێننەوە بۆ شۆڕیجە بەمشێوەیە شێخ عەبدولڕەحمان بە خێوکراوە.
- لە تەمەنی حەوت ساڵیدا شێخ عەبدولڕەحمان بە خزمەت باوکیدا دەس بە خوێندن ئەکات بەپێی دەستوری ئەو کاتە پاشان دێتە کەرکوك لای کاکی مەلا شێخ محەمەد لە مزگەوتی

ئیمام حەمزە لە بلاغ، دەرسی قورئان ئەخوێنێت، پاشان لە مزگەوتی مەلا رەفیق و ئیمام قاسم، هەروەها لە مزگەوتی نایب لە خزمەتی مەلا عومەر گومەتی زۆر دەرسی خوێندوە. یەکێك لەو فەقێیانەی هاوڕێی کە ئێستا ماوە دکتۆر محەمەد رەمەزان لە زانکۆی بەغدا، دکتۆر محەمەد رەمەزان گێرایەوەو وتی: من فەقێ بوم لەگەڵ شێخ عەبدولڕەحمان بە رۆژ دەرسمان ئەخوێندو بە شەو شێخ عەبدولڕەحمان چوار مشقی دائەنیشت عاسایەکی هەبوو ناوچەوانی لەسەر عەساکە دائەنا ئەزکارو ئەورادی ئەخوێندو زۆر کەم ئەخەوت بە شەوان.

– لە پاش چەند ساڵێك ئەگەڕێتەوە بۆ شۆریجە ئەکەوێتە هۆڵی ژیان و خزمەت کردنەوە لەبەر دەستی شێخ نەجمەددین باوکیان تا کۆتایی ساڵی (١٩٤٤) کە شێخ نەجمەددین کۆچی دوایی ئەکات شێخ عەبدولڕەحمان زیاتر ئەرکەکانی باوکی ئەکەوێتە سەرشانی و جێنیشنی ئەکات.

– لە رۆژی (٣١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٧٧) بە نەخۆشی تەنگە نەفەسی لە شێخ عەبدولقادر گەیلانی لە بەغدا کۆچی دوایی ئەکات و تەرمەکەیان هێناپەوە بۆ دێی شۆریجە لە مێژووی (١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٨).

*** (عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵا خەلیفە):-**

– ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.

– بەکالۆریۆسی لە یاسای کارگێڕی و دبلۆمی لە کارگێڕی هەیە.

– ماوەیەك بەڕێوەبەری گشتی پەیوەندییە جەماوەرییەکانە لە کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکانی نووسینگەی نیشتمانی بەغدا.

– بەرهەمەکانی:

– (فیدرالیة)، ٢٠٠٤.

– (الکوتا النسائیة)، ٢٠٠٩.

*** (عەبدولڕەحمان عەسکەری کەرکوکی):-**

– ناوی (عەبدولڕەحمان عەسکەری کوڕی مەلا مستەفای کەرکوکی)یەو نازناوی شیعری (عەسکەری) هەبووە.

– ساڵی (١٨١٠) لە گەڕەکی موسەڵڵا لەدایکبووە.

– خوێندنی مەنتق و بەدیع و زانستی زمان و زانستی تەفسیرو حەدیسی لەلای (مەلا وەیسی ئەفەندی) خوێندووەو بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەی مزگەوتی (حاجی ئەحمەد ئاغا).

– یەکێکە لە زانا ئاینییەکانی کەرکوك، ماوەیەك لە دێی گەراو بووە لەلای مەلا محەمەد گەراوی.

– ساڵی (١٨٧٢) والی کەرکوك (تەقیەددین پاشا) داوای لێ کردووە ببێ بە دادوەر لە کەرکوك بەڵام نەیکردووەو بەردەوام بووە لە وانە وتنەوە.

– ساڵی (١٨٨٠) کۆچی دوایی کردووەو لە قەبرسانی موسەڵڵا نێژراوە.

*** (عەبدولڕەحمان عەلی حیکمەت):-**

– ناوی (مەلا عەبدولڕەحمان کوڕی مەلا حیکمەت ئەفەندی کوڕی عەبدولوەهاب کوڕی ئیسماعیل محێدین سیامەنسووری)ە.

– ساڵی (١٩٠٥) لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن) لەدایکبووە.

– بووەتە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی (ئەحمەد ئاغا) و (المعهد الإسلامي)، ماوەیەکیش ئەندام بووە لە (مجلس التوعیة الدینیة) لە ئەوقافی کەرکوك.

– لە (٢)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدولڕەحمان قەرەحەسەنی):-**

– شاعیر لە ساڵی (١٨٩٢) لەدایکبووە.

– ساڵی (١٩٤١) کۆچی دوایی کردووە.

– دەربارەی بەرهەمەکانی هیچ زانیاریمان نییە.

*** (عەبدولڕەحمان مەلا مەحموود - مەلا عەبدولڕەحمان مەلا مەحموود):-**

– ناسراوە بە (مەلا عەبدولڕەحمانی کەپەنگ).

– لەنێوان ساڵانی (١٧١٢-١٧٦٧) ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (دڵی باش) بووە.

– لە ساڵی (١٧٦٧) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدولڕەحمان مەحموود هەیبەتوڵڵا):-**

– ساڵی (١٩٤١) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.

– ساڵی (١٩٦١) لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بە کرێکاری دامەزراوە.

– ساڵی (١٩٧٠) بووەتە ئەندامی لقی کەرکوکی کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی و بەشداری کردووە لە (بەهاری درزاو)، (کۆتایی دەرەبەگ)، (مەرەزە).

– ساڵی (١٩٧٣) لە بەر باری ئاڵۆزی سیاسی ئاوارەی ئێران دەبێت، دوای دە ساڵ دەگەڕێتەوە کوردستان.

– لە (١١)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٢)دا شەهید دەبێت.

*** (عەبدولڕەحمانی نفووس):-**

– ناوی (عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدولکەریم)ە ناسراوە بە (عەبدولڕەحمانی نفووس).

– ساڵی (١٩٢٦) لەدایکبووە.

- ساڵی (١٩٤٦) دواناوەندی لە شاری سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٤٦) پەیوەندی کردووە بە ڕیزەکانی ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستان.
- ساڵی (١٩٥٩) بووە بە بەڕێوەبەری نفووسی شاری کەرکوك.
- ساڵی (١٩٦١) لەلایەن ڕژێمی قاسمەوە دەستگیر کراوەو نێردراوە بۆ بەندیخانەی ناوەندی بەغدا، ساڵی (١٩٦٢) ئازاد کراو بۆ (حیلله) ڕاگوێزراوە.
- ساڵی (١٩٦٢) بە نهێنی لە لقی (٥)ی بەغدا دەبێت بە ئەندام لق.
- ساڵی (١٩٦٣) لە کاتی دانووستاندن لەنێوان شۆڕشی ئەیلوول و ڕژێم دەبێت بە ئەندامی لیژنەی گفتوگۆکان.
- لە دوای سەرنەکەوتنی مفاوەزات دەستگیر دەکرێت و دەست و قاچی دەبڕنەوەو شەهیدی دەکەن.

* (عەبدولڕەحیم سەرەڕۆ):-

- ناوی (ڕەحیم مەحموود خەلیل قەرەڵووسی)یە.
- ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە،
- سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك و پەیمانگەی مامۆستایانی باڵای لە موسل تەواو کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (پرۆسەی سووتانی عاشقێك)، دیوانە شیعر، بەغدا، ٢٠٠١.
- (بەسەر شانی سەحەردا وەرە ئەی باد)، دیوانە شیعر.
- بەرهەمە ئامادەکراوەکانی بۆ چاپ:
- (گرفتە دەروونییەکانی منال)، کۆکردنەوەو ئامادەکردن و وەرگێڕان.
- (سۆسیۆلۆژیای پەروەردەو فێرکردن)، نووسینی دکتۆر عەلی وەتفە، دکتۆر عەبدوڵڵا ئەلموجەیدل، وەرگێڕان.
- (ئازاد بوون لە ئایدیۆلۆژیا، چواردە شاعیری هیندی هاوچەرخ)، نووسینی: ڕانژێت هۆسکۆتی، وەرگێڕان بۆ عەرەبی: زەبییە خەمیس، وەرگێڕان بۆ کوردی: نووسەر.
- (مادە هۆشبەرەکان.. لە دۆزینەوەوە تا بنبڕکردن).
- (کەیسی شیعەکان لە جیهاندا)، ئامادەکردنی عەبدوڵڵا مەحموود زەنگەنە، عەبدولڕەحیم سەرەڕۆ.

* (عەبدولڕەزاق عەزیز شێخلەر):-

- ساڵی (١٩٤٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٦-١٩٦٧) پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی لە بەغدا تەواو کردووە.
- بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
- بەشداری پێشانگای لە شاری بەغدا لە ڕێککەوتی (٢٥)ی ئابی ساڵی (١٩٦٩) کردووە.
- بەشداری پێشانگای لە شاری کەرکوك لە ڕێککەوتی (٧)ی ئەیلووی ساڵی (١٩٧٠) کردووە.
- بەشداری پێشانگای لە ئەنقەرە لە ساڵی (١٩٧٠) کردووە.
- ساڵی (١٩٧٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کردووە لە یانەی مامۆستایانی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای ساڵانەی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی تەئمیم بۆ هونەری نوێ.
- ساڵی (١٩٨٥) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی تەئمیم بۆ هونەری نوێ کردووەتەوە.

* (عەبدولڕەزاق نوری):-

- ساڵی (١٩٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٣) ئەکادیمیایی هونەرە جوانەکانی لە بەغدا تەواو کردوو.
- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك.

* (عەبدولستار تاهیر شەریف - دکتۆر عەبدولستار تاهیر شەریف):-

- ساڵی (١٩٣٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٥٠) تا (١٩٥٧) لە ڕیزی (الاخوان المسلمین) مایەوە گەیشتە پلەی (نقیب) واتا ڕێکخەری شانە.
- ساڵی (١٩٧٢-١٩٧٤) سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی پارتی شۆڕشگێری کوردستان بووە.
- لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا وەزیری ئەشغال و گواستنەوەو شارەوانی حکومەتی عێراق بووە.
- ساڵی (١٩٨١-١٩٨٤) ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانی عێراق بووە.
- لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە مامۆستای زانکۆ بووە لە بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی کەرکوك.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (کادری شۆڕشگێڕ)، بەغدا، ١٩٧٦.
- (حاجی قادری کۆیی شاعیری شۆڕشگێڕ)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (موجز تأریخ الحیزب الثوریة الکردستانی)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (تاریخ الحیزب الثوري الکردستاني)، بەغدا، ١٩٧٨.
- (حول خطة التنمیة القومیة للسنوات ١٩٧٦-١٩٨٠)، بەغدا، ١٩٧٨.
- (في الفکر الثوري)، بەغدا، ١٩٧٨.
- (ڕەنگدانەوەی برایەتی کوردو عەرەب لە ئەدەبی کوردیدا)، بەغدا، ١٩٧٩.

- (لێکدانەوەیەک لە بابەت قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری تەوزیمی)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (خومەینی خومە بۆ گەلان)، بەغدا، ١٩٨٠.
- (پەروەردەی منداڵ)، بەغدا، ١٩٨٠.
- (تقييم كتاب القراءة الكردية للحملة الوطنية الشاملة لمحو الأمية الزامي)، نامەی ماستەر، بەغدا، ١٩٨٠.
- (المجتمع الكردي، دراسة إجتماعية ثقافية سياسية)، بەغدا، ١٩٨١.
- (نەشونماکردنی زانیاری لای منداڵ)، بەغدا، ١٩٨٢.
- (قاموسی دەرونناسی)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٥.
- (النمو اللغوي للطفل الكردي)، بەغدا، ١٩٨٧.
- (الذخيرة اللغوية عند الطفل الكردي في منطقة كردستان للحكم الذاتي)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (ململانێ لەگەڵ ژیاندا-یادداشت ١٩٣٥، ١٩٧١)، بەرگی یەکەم، کەرکوک، ٢٠٠٥، چاپی دووەم، (٢٠٠٨).
- (ململانێ لەگەڵ ژیادا-یادداشت ١٩٧١، ١٩٨٣)، بەرگی دووەم، کەرکوک، ٢٠٠٧.
- (دەروونناسی گشتی)، چاپی یەکەم، کەرکوک، ٢٠٠٦، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- (الجمعيات والمنظمات والأحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨)، چاپی یەکەم لە بەغدا ١٩٨٩، چاپ دووەم لە سلێمانی ٢٠٠٧.
- لە (١٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٨) بە دەستێکی نادیار کوژرا.

*** (عەبدولستار جەباری):-**

- ناوی (عەبدولستار عەزیز عەبدوڵڵا) ناسراو بە (عەبدولستار جەباری).
- ساڵی ١٩٦٤ لە شاری کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٨ پەیمانگای باڵای گەیاندنی تەواو کردووەو بروانامەی (دبلۆمی) بەدەستهێناوە.
- یەکێکە لە نووسەرو خەت خۆشەکانی کەرکوک و لە دەیان فیستیڤاڵ و پێشانگای تایبەت بە (هونەری خۆشنووسی) بەشداری کردووەو چەندین خەڵات و ڕێزنامەی پێ بەخشراوە.
- ساڵی ٢٠٠٦ بەشداری لە خولێکی ڕۆژنامەوانی نێودەوڵەتی لە (قاهیرە)ی پایتەختی وڵاتی (میسر) کردووە.
- لە زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردستان بە هەردوو زمانی (کوردی و عەرەبی) ووتارو لێکۆڵینەوەی بڵاوکردووەتەوە.
- چەندین کۆڕو سیمیناری لە بارەی مێژووی هونەری خۆشنووسی سازکردووە.
- ماوەیەک لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (نەوە)و پەیامنێری گۆڤاری (مێرگ) بووە لە کەرکوک.
- کتێبە چاپکراوەکانی:
- (دیاری ناسری ڕەزازی)، ١٩٨٣.
- (خۆشنووسانی کورد)، ٢٠٠٥.
- (ژوانگەی هونەر)، (٢٠٠٨).

*** (عەبدولستار عەبدەڵانی - سەید عەبدولستار عەبدەڵانی):-**

- ناوی (سەید عەبدولستار ئەفەندی کوڕی شەریف سەید ئەحمەدی عەبدەڵانی شارەزووری)یە.
- لەدایک بووی چلەکانی سەدەی نۆزدەهەمە کە لەوانەیە لە ساڵی (١٨٤٠) بێت.
- ساڵی (١٩٢٩) کۆچی دوایی کردووە.
- یەکەم کارێکی قایمەقامی ڕەوانخورماتوو بووە لە دوایدا بەڕێوەبەری ئەوقاف بووە، هەروەها بەڕێوەبەری ئەوقاف بووە لە (مەککە) بۆ ماوەی حەوت ساڵ، ماوەیەک قایمەقامی کەرکوک بووە، نەقیب ئەشراف کەرکوک ویەکەم بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوک بووە کە دواکاری بووە تاکو مردنی.
- دەستێکی چاکی هەبووە لە نووسینی شیعری تورکیدا.
- دیوانەکانی وکتێبەکانی بریتیە لە (معراجیە دیوانی)و (علمیە سالنامەی سی).

*** (عەبدولستار عەبدی - مەلا عەبدولستار عەبدی):-**

- ناوی (عەبدولستار عەبدی کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی سەید عومەرکوڕی سەید موحسین)ە، بەناوبانگە بووە بە (سەید عەبدی ئەفەندی) یا (سەید عەبدی ستای ئەفەندی).
- ساڵی (١٨٥٨) لە گەڕەکی (بەگەکان) لەدایکبووە.
- خوێندنی ئایینی و زانستی لە قوتابخانەکانی کەرکوک

بەدەستهێناوەو ماوەیکیش چووتە ئەستەمبوڵ و خوێندنی لەسەر دەستی (مستەفا عاسم) تەواو کردووە، بۆیە خوێنەوارێکی ئایینی و ئەدەبی و زمانەوانی بووەو دەستی باڵایشی هەبووە لە شیعر نووسیندا، ئیجازەی زانستی ئایینی لەژێر دەستی زانا (ئەحمەد فائیز مەحموود بەرزنجی) بەدەستهێناوە.
– گەلێك فەرمان و ئەرکی ئایینی و خوێندن و کارگێری جێبەجێ کردووەو گەلێك لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان گەراوە، هەروەها ماوەیەك مامۆستا بووە لە ولایەتی (بۆرسە) و (ئەزمیر) و (رەواندوون) و قائیمقام بووە لە شاری کەرکوك، هەروەها بەرێوەبەری ئەوقاف و تەشریفات بووە لە شاری (مەککە) بۆ ماوەی حەوت ساڵ، ماوەیەك دادوەری موسلمانەکان بووە لە شاری کەرکوك، دامەزرێنەری بەرێوەبەرایەتی ئەوقافی کەرکوك بووەو یەکەم بەرێوەبەری بووە.
– دەستێکی باڵای هەبووە لە نووسینی شیعرو ئەدەبدا بە زمانی تورکی و عەرەبی و چامەیەکی شیعری دوورودرێژی هەیە بە ناونیشانی (میعراجیە دیوانی) لە ساڵی (١٩٠٨) لە ئەستەمبول بە چاپی گەیاندووە، لە پاڵ گەلێك دەستنووسی شیعری کە تاکو ئێستاکە بە چاپ نەگەیەنراوە.
– شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە خەتخۆشی عەرەبی و رێگاو رێساکانی ئەو شێوانەی زانیوە.
– لە دوای کودەتاکەی ساڵی (١٩٠٨)ی (مەشروتییەکان) گەراوەتەوە کەرکوك و لەگەڵ زانایانی ئەو سەردەمەدا هەڵسووکەوتی کردووە.
– ساڵی (١٩٣٢) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولستار هەمەوەندی):-

– یەکێکە لەو نووسەرانەی کە گەلێك لێکۆڵینەوەی بەزمانی عەرەبی بە چاپ گەیاندووە:
– (إستقصاءات ومشاهدات في الوية العراق–الكراسة الاولى لواء كركوك)، بەغدا، ١٩٥٢.
– (الشرطة العراقية، دوو بەش)، ١٩٤٩.
– (مبرة يوم التاج)، بەغدا، ١٩٥٤.
– (مذكراتي عن الفترة الاخيرة من حكم صالح او –صالح جبر– في الميزان)، بەغدا، ١٩٥١.
– (مصير مصر–اللواء محمد نجيب)، وەرگێران، ١٩٥٦.
– (مجازر الدم في الموصل–الوثائق والاحداث)، ١٩٦٢.

* عەبدولسەمەد سەبری:-

– عەبدولسەمەد سەبری بە یەکێك لە هاوشانانی ئەحمەد سەبری (لە رووی نازناوەوە– وەرگێر) دەژمێردرێت. و کوری بازرگانێکە بە ناوی محەمەد ئەمین، لە زەمانێکدا لە دادگای کەرکوك ئەندامێتی کردووە و هەم بەو سامانەی لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە بازرگانی کردووە.
– لە نێوان ساڵانی ١٣٢٣ – ١٣٢٥(نووسەر دیاری ناکات ئەم ساڵە هیجرییە یان رۆمییە – وەرگێر) لە گۆڤارێکی مانگانە لەسەر غەزەلێکی کە بڵاوکراوەتەوە نووسراوە (ئەندامی پێشووی دادگای کەرکوك عەبدولسەمەد سەبری) بە گوێرەی ئەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لەپێش ئەو مێژووە ئەو وەزیفەیەی هەبووە.
– لە کەسانی ئەشراف بۆ ئەو وەزیفەیە هەڵدەبژێردران و دادەمەزرێنران، لەبەر ئەوە سەبری لە بنەماڵەیەکی خانەدان و ئەدیب و رۆشنبیر و بەناوبانگ لە قەڵەم دەدرێت.
– لە ژیاندا بووە فرسەتی بڵاوکردنەوەی شیعرەکانی نەبووە، لەبەر ئەوەی فریای گۆڤاری (حەوادیس) نەکەوتووە، کە لە ساڵی ١٣٢٧ی رۆمی دەرچووە و دە ساڵ پێش ئەم مێژووە مردووە، بەڵام لەبەر چی بەشێك لە بەرهەمەکانی ساڵانێکی زۆر پاش مردنی بڵاوکراونەتەوە، شیعرەکانی پاشماوەیەکی کلاسیکن و بە گوێرەی زەمینەو زەمانەوە جوان دەژمێردرێن و هەندێکی لەلایەن شاعیرەکانمانەوە پەسەند کراون و لاسایی کراوەنەتەوە.
– سەبری هاوچەرخی شاعیر و موتەسەوفی بە ناوبانگی کەرکوك فایز بووە و رێزی لێگرتووە و لەژێر کاریگەری شیعرەکانیدا بووە.

* (عەبدولسەمەدی خانەقا - شێخ عەبدولسەمەدی خانەقا):-

– (شێخ عەبدولسەمەدی کوری شێخ عەبدولقادر کوری سەید ئەحمەدی خانەقا)یە.
– ساڵی (١٩٢٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– کۆلیژی یاسای لە بەغدا تەواو کردووە، دامەزراوە بە قازی لێکۆڵەرەوە لە کەرکوك.
– کورتە چیرۆك دەنووسێت لە گۆڤارو رۆژنامەکان.
– ساڵی (١٩٧٥) دوور خراوەتەوە بۆ خوارووی عێراق.
– ساڵی (١٩٨١) گەراوەتەوە سلێمانی و بووەتە سەرۆکی دادگای سلێمانی.
– بەرهەمەکانی:
– (في الغاب)، کۆمەڵە چیرۆك، ١٩٥٢.
– (محاولات في النقد الأدبي)، ١٩٥٨.
– لە نەوتەکان کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولعەزیز ئەفەندی):-

– نووسەرو چیرۆکنووسێکی کەرکوکیە کە بابەتەکانی لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی کەرکوك بڵاوکردووە.
– ساڵی (٢٠٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولعەزیز ئیبراهیم ئاوچی):-

– ساڵی (١٩٣٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٩٠) کۆچی دوایی کرد.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی (حكايات في الظلام)، ١٩٥٩.
– بەڵام زانیاری ترمان دەربارەی نییە.

* (عەبدولعەزیز شێخ ئیسماعیل بەرزنجی - شێخ عەبدولعەزیز شێخ ئیسماعیل بەرزنجی):-

– یەکێکە لە مەقام خوێنەکانی شاری کەرکوك.

* (عەبدولعەزیزی خانەقا - شێخ عەبدولعەزیزی خانەقا):-

- (شێخ عەبدولعەزیز کوڕی شێخ عەبدولقادر کوڕی سەید ئەحمەدی خانەقا)یە.
- ساڵی (١٩٢٧) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٠) بووەتە کارمەند لە وەزارەتی (الإرشاد).
- ساڵی (١٩٦٤) بووەتە بەڕێوەبەری وەزارەتی (الإرشاد) ئینجا بەرزکراوەتەوە بۆ بەڕێوەبەری گشتی (الثقافة والإرشاد) لە ناوچەکانی کەرکوک.
- ساڵی (١٩٧٠) دەوری هەبوو لە دەرکردنی چەند ڕۆژنامەیەکی کوردی.
- ئەندامی بەڕێوەبەری دەستەی نووسەرانی کورد بووە.
- لەنەوەتەکان لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولعەزیز سەمین بەیاتی):-

- ساڵی (١٩٣٨) لە کفری لەدایکبووە.
- لە بواری ئەدەبو شیعری تورکمانی دەستی هەیە.
- کاری کردووە لە بواری خوێندنو بەڕێوەبەری لە قوتابخانەکان.
- بەرهەمەکانی:-
- (شاعریة فضولي البغدادي)، چاپخانەی (الجمهوریة)، کەرکوک ١٩٧٣.
- (التامیم، المحافظة والقرار الخالد)، کەرکوک، ١٩٨٦.
- (فضولین لیلی ومجنون دستانینداکي غزەللر و اجیقلاماسي)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، بەغدا، ١٩٩٣.
- (الشاعر عماد الدین نسیمي البغدادي)، بەغدا، ١٩٩٦.
- (نسیمي)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، بەغدا، ١٩٩٦.
- (اینده إنسان)، ٢٠٠٥
- تأملات في الدین والحیاة، ٢٠٠٧
- إسلامي اکیتیمین نوکره تیم یوننه ملري، ٢٠٠٧
- في محراب الإیمان، ٢٠٠٨
- فضولي دیوانیندەن غزللرو اجیقلاماسي، ٢٠٠٨
- سوسیال بیلیمیلرین ئوکره تیم یونته ملري، ٢٠٠٨.
- جاغداش عراق تاریخي، ٢٠٠٨
- ترکمان أدبیاتي، ٢٠٠٨
- الله وإنسان عاشقي یونس امره، ٢٠٠٩
- (الأمثال الشعبیة الترکمانیة الموصلیة-دراسة مقارنة)، کەرکوک، ٢٠٠٩.
- (الأمثال الشعبیة الترکمانیة الموصلیة-دراسة مقارنة)، کەرکوک، ٢٠١٠.
- دیني شعرلر، ٢٠١٠
- (اینده إنسان)، ٢٠١٠
- من أعماق الجرح العراقي، ٢٠١٢
- غم کارواني، ٢٠١٣
- بوردلر و کیزلر، ٢٠١٣

* (عەبدولغەفور مستەفا):-

- ساڵی (١٩٣٩) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانە بەشی پەروەردەی وەرزشی لەنێوان ساڵانی (١٩٦١-١٩٦٢).
- لە بواری یاری کردنو ناوبژیوانو ڕۆژنامەنووسی وەرزشی کار کردووەو گەلێك بابەتی لە ڕۆژنامەکانی (الملعب)و (الزمان)و (النور)، (التآخي)، (کرکوك)، بڵاوکردووەتەوە.

* (عەبدولغەفور واعیز):-

- ناوی (مەلا عەبدولغەفور کوڕی مەلا مستەفا کوڕی مەلا عەبدوڵڵای واعین)ە.
- زانایەکی ئایینی بووەو ماوەیەك مامۆستا بووە لە قوتابخانەی (حاجی مستەفا قیردار)و ماوەیەك ئیمامو خەتیب بووە لە مزگەوتەکانی کەرکوك.
- بەرهەمێکی دەستنووسی بە جێماوە بە ناوی (النهجة المرضیة) لە (دار المخطوطات العراقیة) پارێزراوە.

* (عەبدولفەتاح ڕۆستەم محێدین- شێخ البصیر):-

- ناسراو ئەندامی کۆمەڵەی (باراسایکۆلۆجی) عێراقو کۆمەڵەکانی تری تایبەتییەو بەشداری لە چاك کردنی نەخۆشییەکانی نەزۆکیو نیوە سەرئێشەو بڕبڕەی پشت وهەستیاری و ڕووناکی چاوو ئەوانی تر هەیە.
- خوای گەورە ووزەیەکی (کە هرۆموگناتیسی) لە گیانی پەیدا کردووە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کەوا توانای هەیە دەستی بەکار بهێنێ بۆ چاك کردنەوەی نەخۆشی بە بێ ئەوەی هیچ ئامێرێکی پزیشکی بەکاربهێنێت.
خۆی دەڵێت:-
(بەڵێ مرۆڤی لەناو جەستەیدا مەودای کەهرۆمۆگناتیسی دەگاتە (١) بۆ (٤) ملم ڤۆڵتیە، بەڵام لە جەستەی زانایانی (باراسایکۆلۆجی)دا دەگاتە نێوان (٣٥) بۆ (٣٩) ملم ڤۆڵت ئەم تەزووە واتە (شحنة) دەتوانێت چەندین جۆری (ڤایرۆس) لە ناو لەشی ئادەمیزاد بکوژێت، ئەمە سەرەرای چۆنیەتی بەهێزکردنی ماسولکەکانو جوڵاندنی ئەنزیماتی لەش).

* (عەبدولفەتاح وەهبی- کاتب زادە):-

- ناوی (مەلا فەتاح کوڕی وەهبی کوڕی محەمەد عەلی ئەفەندی کاتب زادە)یە.
- ساڵی (١٨٧٢)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی لەسەر دەستی زانا (مەلا مەحموود مەزناوی) وەرگرتووە، هەروەها خوێندنی لەلای مەلا محەمەد خالس کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی وەرگرتووە.
- لە دوای تەواوی کردنی خوێندنی لە ئەستەمبوڵ بووەتە بەڕێوەبەری ناحیەی زێبار، ئینجا بەڕێوەبەری ناحیەی داوودە لە قەزای عەمادیە، ئینجا لە دواییدا گوازراوەتەوە بۆ موسڵو بووەتە مامۆستا لە (دار المعلمین).
- ساڵی (١٩١٧)ی زایینیی دامەزراوە بە قازی لە (ئامێد)، ئینجا بووەتە باشکاتب لە دادگای سلێمانی تا ساڵی (١٩٢٨)ی زایینی.

- شاعیرێکی بەناوبانگ بووە، گەلێك شیعری بەناوبانگی هەیە وەکو (جهان)و (حجرة نامە)، هەروەها کۆمەڵێك شیعری هەیە بە زمانی کوردیو تورکی.
- ساڵی (١٩٤٠)دا کۆچی دوایی کردووە.

* عەبدولفەتاح (وەهبی):-

- ناوی عەبدولفەتاح کوری محەمەد عەلی ئەفەندییە، لە بنەماڵەی کاتیب زادەی کەرکوکە.
- ساڵی ١٨٦١ لە کەرکوك لە دایکبووە.
- ساڵی ١٩٣٧ لە شاری مووسل کۆچی دوایی کردووە.
- وەهبی لە کەرکوك خوێندوویەتی و پاشان لە خزمەت مەلا مەحموودی مەزناویدا هەموو عیلم و فەن و هونەرەکانی ئەو سەدەیە کە باوبووە، سوودی لێ بینیوە.
- لەگەڵ شێخ محەمەد خالسی کوری شێخ رەزای تاڵەبانی فەقێیەتییان کردووە و پێکەوە مۆڵەتیان وەرگرتووە.
- کاتێك بووە بە مەلا چووەتە ئەستانبول و پاشان گەراوەتەوە و بووە بە بەرێوەبەری ناحیەی زێبار، داودە لە عەمادی.
- لە دواییدا بووە بە مامۆستا لە قوتابخانەی (دار المعلمین) ی مووسل، دوای چەند ساڵێك بووە بە بەرێوەبەری ناحیەی ئەتروش لە قەزای دهۆك، پاشان لە ناحیەی تەلەعفەر.
- ساڵی ١٩١٨ بووە بە قازی شەرع و چووەتە ئامێدی لەپاش ئەوە بووە بە باش کاتبی مەحکەمەی شەرعی لە سلێمانی تا ساڵی ١٩٢٨.
- بە هەر چوار زمانی کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی شیعری هۆنیوەتەوە.

* (عەبدولقادر خەلۆسی):-

- ناوی عەبدولقادر بووە نازناوی شیعری (خەلۆسی) بووە.
- ساڵی (١٨٨٤) لە کفری لەدایکبووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩١٩) بەرێوەبەری تەحریرات بووە لە تاپۆی کەرکوك.
- زۆربەی شیعرەکانی لە رۆژنامەی (نجمة)و (ئەیلەری) بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (واویلای وطن)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (شابندر)، بەغدا، ١٩١١.
- (عفاف)، شانۆگەری، بەغدا،
- (القوانین الثلاثة: تسویة حقوق الاراضي واللزمة والعقر)، چاپی یەکەم، بەغدا، چاپی دووەم، چاپخانەی (الفرات)، بەغدا، ١٩٣٤.
- (تسویە حقوق اراضي قانوني ولزمە قانوني)، وەرگێران لە عەرەبییەوە بۆ تورکی، چاپخانەی (بغداد)، بەغدا، ١٩٣٣.
- ساڵی (١٩٤٩) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولقادر زیائی):-

- ناوی (عەبدولقادر محەمەد ئەنوەر خەلیفە ئەمین زیائی)یە.
- ساڵی (١٩٥٧ لە قەڵا لەدایکبووە.
- ئامادەیی بەشی ئەدەبی تەواو کردووە.
- گەلێك نووسینی لە گۆڤارو رۆژنامەی تورکیو عەرەبیو کوردی بڵاوکردووەتەوە لە کەرکوك.

- سیوکیلیم کرکوك، دیوان شیعر بە تورکی، ٢٠٠٧
- صوت بین جدران الصمت، ٢٠٠٨
- بەرهەمە چاپکراوەکانی (موجز عن تاریخ الصحافة الترکمانیة في العراق)، ٢٠١١.

* (عەبدولقادر سوورە خانەقا - شێخ عەبدولقادر سوورە خانەقا):-

- ساڵی (١٧٩٥)ی زایینی لە گوندی سەرگەڵو لەدایکبووە.
- لە دواییدا هاتووەتە کەرکوكو تەکییەکی لە خانەقا دروست کردووەو خانوویەکی لەتەك خانەقاکە دامەزراندووە.
- شاعیرو ئەدیب بووە بەزمانەکانی کوردیو تورکیو فارسی نووسیووە.
- ساڵی (١٨٦٠)ی زایینی لە تەکیەی خانەقا لە کەرکوك نێژراوە.

* (عەبدولقادری سیامەنسووری - شێخ عەبدولقادری سیامەنسووری):-

- شێخ (عەبدولقار کوری شێخ هادی)ە.
- ساڵی (١٨٨٥) لە ناحیەی لەیلان لەدایکبووە، یەکێکە لە شێخەکانی تاڵەبانی، لەبەر ئەوەی لە دێی سیامەنسوور لەدایکبووە بۆیە بە سیامەنسووری بە ناوبانگە.
- یەکێك بوو لەوانەی دژی ئینگلیزەکان بووەو لایەنگیری عوسمانییەکان بووەو سەر بە کۆمەڵەیەکی ئەهێنی بووە کە لایەنگری عوسمانییەکان بووە، بەڵام ئینگلیزەکان شوێنی کۆمەڵەکەیان دۆزییەوەو هێزی ئینگلیزەکان دێیەکەیان بۆردوومان کرد بۆیە هەڵهاتو تا ساڵی (١٩٢١) نەگەرایەوە.
- ئەندامی ئەنجوومەنی نیابی بووە لە خولی حەوتەم لەنێوان (٢٧)ی شوباتی ساڵی (١٩٣٧) تا (٢٦)ی ئابی ساڵی (١٩٣٧).

* (عەبدولقادر عەبدولرەحمان نەجمەددین-سابری):-

- ساڵی (١٩٧٦) لە دێی شۆریجە لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) ماجستێری هێناوە بە ناونیشانی (شیخ معروف نودیهي وآرائه الکلامیة).

* عەبدولقادر عابید عەبدولقادر هەورامی:-

- ساڵی ١٩٦٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٥ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٦٧ بەناونیشانی (دفاع جوي).
- ساڵی ٢٠٠٥ خانەنشین کراوە.

* (عەبدولقادر غولامی):-

- ناوی ئەم شاعیرە (عەبدولقادر کوری محەمەد کوری مور بابا کوری عەلی)یەو نازناوی شیعری (غولامی) بووە.
- ساڵی (١٨٥٤)ی زایینی لەدایکبووەو.
- لە سەرەتادا یا باوەری باوکی زانستە سەرەتاییەکانی لای (ئالتی ئۆغلو قۆجە محەمەد ئەفەندی) خوێندووەو زیرەکیو توانایی خۆی زوو فێری زانستەکان بووە.

- ساڵی (١٨٧٠)ی زایینیی لەگەڵ باوکی دێنە کەرکوك بۆ لای شێخ (عەبدولقادر خالسی) لە تەکیێی تالەبانی، ماوەیەکی چاك شەریعەتی ئیسلامو تەریقەتی قادری دەخوێنێت، هەروەها لەلای شاعیر (فائیز) کتێبی (پەرێشان)ی بە زمانی فارسی خوێندووە.
- لە دوای کۆچی باوکی لەبەر ئەوەی کورە گەورەی بووە جێگەی گرتووەتەوە.
- ماوەیەك راوێژکاری باڵای مەعاریف بووە لە (سیواس)، دوای ماوەیەك وازی هێناوەو کاری ژمێریای کردووە لە دەزگاکانی دەوڵەت، لە دواییدا بە ئارەزووی خۆی وازی لە ژیانی فەرمانبەری هێناوە.
- لە بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- دیوانێکی شیعری چاپکراوی بە زمانی تورکی هەبووە کە لە تەمەنی (١٧) ساڵییەوە بە تەواوەتی لە بواری شیعردا پێگەشتبووە، لەو دیوانەدا کەمێك شیعری عەرەبیو فارسی تێدا بوو لەگەڵ هەندێك لە شیعری عەبدولرەحمان خالسیو شاعیرانی تری کەرکوك کە لە دیوانەکەیدا وەکو تەخمیس بەکاری هێنا بوو.
- (تعجل محققین).
- (میراج مشتاقین).
- ساڵی (١٨٨٦)ی زایینی کۆچی دوایی کردووەو لە سیواس لە تورکیا نێژراوە.

* (عەبدولقادر-فائیز):-

- ناوی (عەبدولقادر کوڕی شێخ عەبدولرەحمان کوڕی خالسی تالەبانی)یە.
- ساڵی (١٨٣٤)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٨٩٨)دا کۆچی دوایی کردووە.
- خوێندنو زانستی ئایینی لەلای زانایانی ئایینی سەردەمی خۆی خوێندووەو بە تایبەتی لە تەکیەی تالەبانی، هەروەها شیعری هۆنیوەتەوە بە زمانی فارسیو تورکی.

* (عەبدولقادر قەدری ئەرسەلان):-

- ناوی (عەبدولقادر قەدری ئەرسەلان بەگ زادە)یە.
- یەکێکە لەو شاعیرانەی کە هۆنراوەیەکی دووروودرێژی لە پێهەڵدانی شێخ مەحموودی نەمردا نووسیوەو لە رۆژنامەی (رۆژی کوردستان)دا بە زمانی کوردیو تورکی بڵاوکردووەتەوە.

* (عەبدولقادر قەرەحەسەنی حەساری):-

- لە بەرهەمە چاپکراکراوەکانی:
- (شەجەرەی پێغەمبەر)، بەغدا، ١٩٣٧.
- (سپارەی خوورەوشت)، بەغدا، ١٩٣٨.

* (عەبدولقادر قرگەیی):-

- ناوی (عەبدولقادر کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی فازل ئەفەندی کوڕی مەلا محەمەد مودەرس) بووەو ئیمامو خەتیبی مزگەوتی (نائیب) بووە لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن).
- ساڵی (١٨٩٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- گەلێك شیعرو چیرۆکی لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان بڵاوکردووەتەوەو ماوەیەکی بەڕێوەبەری خەزینەی کەرکوك بووە.
- ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولقادر کەرکوکی):-

- ناوی (مەلا عەبدولقادر کوڕی عەبدوڵڵا کەرکوکی)یە.
- دەستنووسێکی لە ساڵی (١٧٤٤) بە جێهێشتووە.

* (عەبدولقادر کەسنەزان):-

- ناوی (شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ حوسێن کوڕی شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزان)ە.
- ساڵی (١٩٥٠) لە کەرکوك لەدایکبووەو ئەدیبو چیرۆکنووس بووەو لە بواری بەڕێوەبەرایەتییدا لە ناحییە کاری کردەوە.

* (عەبدولقادری کەوەڵە):-

- ناوی (شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ ئەحمەد مەڵحە کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ ئەحمەدی سەرداری بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٩٠٤) لە گوندی (سەرگەلو) لەدایکبووەو لە ساڵی (١٩١٤) بە ماڵەوە هاتوونەتە گوندی (مەڵحە) لەوێ نیشتەجێ بوونە.
- زمانی کوردیو فارسیو عەرەبی بە چاکی زانییوە، زانایەکی ئایینیو کەسایەتییەکی ناوداری ناوچەکە بووە.
- ساڵی (١٩٧٩) لە تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی

کردووەو لە گۆڕستانی (شێخ محێددین) بە خاك سپێردراوە.

*** (عەبدولقادر محەمەد بەرزنجی - شێخ عەبدولقادر محەمەد بەرزنجی):-**

- ناوی (شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەبدولڕەحیم بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٩١٩) لە سلێمانی لەدایکبووە.
- پاش تەواوکردنی خوێندن لە سلێمانی چووتە قوتابخانەی سەربازی لە ساڵی (١٩٢٧) بە پلەی (مولازم) دەچووە، لە چەندین شوێن وەکو هەولێرو موسڵو کەرکوكو ناسرییە کاروباری سەربازی بردووەتە ڕێوە.
- یەکێك بووە لەو ئەفسەرانە کە لە ئەندامانی حیزبی (هیوا) بووە.
- ساڵی (١٩٤٠)ەوە لە کەرکوك جێگیر بووە.
- ساڵی (١٩٥٧) بە هاوکاری کۆمەڵێك ڕۆشنبیری کورد گۆڤاری (شەفەق)ی وەك یەکەمین گۆڤاری کوردی لە کەرکوك دەرکردووە، لە ساڵی (١٩٥٨) خاوەن ئیمتیازی گۆڤارەکە بووە.
- ماوەیەکیش بەڕێوەبەری تەجنیدی کەرکوك بووە.
- ساڵی (١٩٥٨) لەبەر باری تەندروستی خانەنشین کراوە.
- ساڵی (١٩٥٩) لەبەر ئەوەی نەخشی لە ڕووداوەکانی کەرکوکدا هەبوو بە ناچاری شارەکەی بە جێهێشتوو، ماوەیەك لە سلێمانی و ماوەیەك لە هەولێر بووە، لە دواییدا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و بووتە سەرۆکی نووسینی ڕۆژنامەی (ژینی کاکەی فەلاح).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (سادات البرزنجة)، چاپخانەی (الترقي)، کەرکوك، ١٩٥٩، لە دواییدا لەگەڵ نامیلکەیەکی تردا بە ناوی (في رحاب شخصيات واقلام كردية) چاپ کراوەتەوە لە ساڵی (٢٠٠٧) لە سلێمانی.
- (فەرهەنگی زانیاری)، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی، ١٩٧٢.
- کۆمەڵێك بابەتو لێکۆڵینەوەی لە گۆڤاری (شەفەق)دا بڵاوکردووتەوە.
- لە (١٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدولقادر نەقشی):-**

- شاعیرێکی کەرکوکی و لە سەدەی هەژدەهەمی زاینییدا ژیاوەو هۆنراوەیەکی درێژی لەسەر برسێتییەکەی کەرکوك نووسیوە لە ساڵی (١٨٧٩).

*** عەبدولکەریمی قەرەچێواری - شێخ عەبدولکەریمی دووەمی بەرزنجی قەرەچێواری:-**

- ناوی شێخ عەبدولکەریمی دووەم کوڕی شێخ حوسێن کوڕی شێخ عەبدولکەریمی قوتبە
- ساڵی ١٨٧٧ لە ناحیەی قادر کەرەم لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩١٥ لە تەکیەی شێخ حەسەنی قەرەچێوار دانیشتووە و کاروباری ئایینی بردووەتە ڕێوە.
- ساڵی ١٩٥٤ لە قادر کەرەم کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدولکەریم بەرزنجی):-**

- ساڵی (١٩٣٢) لە دێی (کانی چنار) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٤) کۆچی دوایی کردووە.
- خوێندی ئایینی لەلای زانایانی سەردەمی خۆی خوێندووەو دیوانێکی چاپکراوی هەیە لە ساڵی (١٩٦٩) بە چاپی گەیاندووە.

*** (عەبدولکەریمی باوایی - مەلا عەبدولکەریمی باوایی):-**

- لە عەشیرەتی زەنگەنەیە لە باوایی دانیشتووە قوتابی مەلا ئەحمەد فەرقانی بووە، شیعری کوردی هەیە.

*** عەبدولکەریم تاهیر ئەحمەد:-**

- ساڵی ١٩٤٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- ترکمان جیلسی، ٢٠٠٧
- سرای، ٢٠١٠
- کرکوك شهریم، ٢٠١١
- نوز دیلیم، ٢٠١٣.

*** (عەبدولکەریمی دارەخورما - مەلا عەبدولکەریمی دارەخورما):-**

- یەکێك بووە لە مەلا بەناوبانگەکانی کەرکوك بووە.
- لە بەشێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* عەبدولکەریم دەمیرچی:-

- ساڵی ١٩٨٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٦٣ کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمەکانی:-
- داقوقلوو شاعر ملا عبدالکریم دەمیرچی تین دور تلو کلری، ٢٠١٠

* (عەبدولکەریم رەباتی):-

- ناوی (مەلا عەبدولکەریم فەقێ عەلی)یە.
- ساڵی (١٩٥٩)دا دیوانێکی شیعری بە چاپ گەیاندووە.

* عەبدولکەریم رەحیم تۆفیق:-

- ناسراو بە عەبدولکەریم تاڵەبانی.
- لەدایکبوی ساڵی (١٩٥٥)ی گوندی قەیسەریی سەر بەناحیەی لەیلان لە پارێزگاری کەرکوك. هەردوو قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیی لە لەیلان تەواو کردو قۆناغی ئامادەیی لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٩١) پێش هەڵایسانی راپەرین، لە شانە چەکدارەکانی بروسك رێکخراو لەکاتی راپەریندا بەشداریی لە رزگارکردنی چەمچەماڵ و قەرەهەنجیرو کەرکوکدا کرد. دوای کۆرەوە ملیۆنییەکە، لەگەڵ خێزانەکەی ماوەیەك لە ئێران مایەوەو پاشان گەرایەوەو لە رانیە نیشتەجێ بوو، دواتر چووە شاری چەمچەماڵ. ماوەیەك لە هێزی تایبەتی پارێزگاریی سکرتێری گشتیی یەکێتی بووە پێشمەرگەو پاشان چووە چوارقورنەو لەوێ بووە ئەندامی کەرت لە کۆمیتەی ئاوارەکانی کەرکوك، پاشان بەشداریی خولێکی کادیرانی کردو بووە ئەندامی کۆمیتە.
- دوای پێکهێنانی سوپای یەکگرتووی کوردستان، بووە پێشمەرگەو دوا پلەی لەوێ رابەری سیاسی بوو لە لەشکری باباگوڕگوڕ.
- لە ٩ی ئایاری ساڵی (١٩٩٦) لەشەری ناوخۆدا لە گوندی پونگینەی سنووری بنەسڵاوەی نزیك شاری هەولێر، لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگەی هاورێی شەهید کرا.

* (عەبدولکەریم زەینوعابیدین کەریمی):-

- ساڵی (١٨٨٣) لە داقوق لەدایکبووە، خەڵکی بە مەلا کەریم بانگیان کردووە.
- شاعیرو زانایەکی ئایینی و پزیشکێکی بە سەلیقە بووە لە بواری گژو گیاو گرتنەوەی دەس و قاچدا.
- لە (١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٣) لە قەبرستانی داقوق نێژراوە.

* عەبدولکەریم غێدان مەحموود داودی:-

- ساڵی ١٩٠٧ لە قەزای خورماتوو لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٣٥ خوێندنی ئایینی تەواو کردووە و بووە بە ئیمام تابوور لە سوپادا.
- ساڵی ١٩٦٨ خانەنشین کراوە.
- ساڵی ١٩٧٤ کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولکەریم قادر کەرەم-خادم):-

- ساڵی (١٨٧٤) لە ناحیەی قادر کەرەم لەدایکبووە.
- شاعیرو خوێندەوارێکی هەڵکەوتوو بووە.
- نازناوی شیعری (خادم)ە.
- ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولکەریم گولەمن-کەریم قۆریات):-

- ناوی تەواوی (عەبدولکەریم رەفیق مەجید)ە.
- ساڵی (١٩٢٧) لە گوندی (یەحیاوا) لەدایکبووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی لە لەیلان تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٤٦-١٩٤٨) لە هێزی سوپا کاری کردووە.
- لە (١)ی شوباتی ساڵی (١٩٥٩) کۆمەڵێك گۆرانی لە ئێستگەی بەشی تورکمانی لە بەغدا تۆمار کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە بە نەخۆشی تەنگەنەفسی.

* (عەبدولکەریم شێخ محەمەد حیسامەددین - مەلا عەبدولکەریم شێخ محەمەد حیسامەددین):-

- ناوی (عەبدولکەریم کوری شێخ محەمەد حیسامەددین کوری عومەر کوری حاجی کەوسەر)ە.
- ساڵی (١٩٢٩) لە گەرەکی (ساری کەهیە) لەدایکبووە.
- خوێندنی نەحوو سەرف لەلای (مەلا محەمەد بابا)و (مەلا حەسیب حەکیم) تەواو کردووە.
- ساڵانی (١٩٤٩) تا (١٩٥٢) خوێندنی لە (المدرسة العلمیة الدینیة) لەسەر قەڵا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦٠) خولی مامۆستا ئایینییەکانی بۆ پێگەیاندنی (دار المعلمین) تەواو کردووە، بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەکانی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٦٦) لە دوای کۆچی دوایی باوکی بووەتە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی (حاجی کەوسەر).
- لە (١٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

* عەبدولکەریم حاجی محەمەد - دکتۆر عەبدولکەریم حاجی محەمەد عەلی):-

- ساڵی (١٩٥٤) لە شاری کەرکوك هاتووەتەوە دونیاوە.
- قۆناغی سەرەتایی وناوەندی وئامادەیی هەر لەو شارە تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٩) بروانامەی بەکالۆریۆس لە پزیشکایەتی و نەشتەگەری ڤێتەرنەری لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- هەر لە ساڵی دەرچوونیەوە تاوەکو ئەمرۆ بەردەوامە لەسەر پیشەکەی خۆی و دەیەها نەشتەگەری بەسەر کەوتووانە ئەنجام داوە.
- ساڵی (١٩٩٨) نازناوی (خەبیر)ی لە نەشتەگەری ڤێتەرنەری پێ بەخشراوە.

- دەیەها بابەتی جۆراوجۆری زانستیو کۆمەڵایەتیو تەندروستی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردووەتەوە.
- لە سەرەتای ساڵەکانی حەفتاوە شیعرو نووسینەکانی بڵاوکردووەتەوە.
- ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیاندووە:-
- (نەخۆشییەکانی ئاژەڵ کەتووشی ئادەمیزاد دەبن)، چاپی یەکەم، کەرکوک، ٢٠٠١، چاپی دووەم، ٢٠٠٦..
- (خەونێکی سپی)، هۆنراوە، کەرکوک، ٢٠٠١.
- (باخچەی منداڵان)، سروودو گۆرانی شیعر بۆ منداڵان، بەرگی یەکەم، کەرکوک، ٢٠٠٥، بەرگی دووەم، (٢٠٠٨).
- (وەرزێکی سەیر)، شیعری هەمەرەنگ، کەرکوک، ٢٠٠٥.
- (شاخ)، شیعر، هەمەرەنگ، کەرکوک، ٢٠٠٥.
- (دەنگ)، شیعر، هەمەرەنگ، کەرکوک، ٢٠٠٥.
- (تابلۆ)، شیعر، هەمەرەنگ، کەرکوک، ٢٠٠٥.
- (گۆرانی وەنەوشەو یاسەمین)، شانۆگەری غەسان نەعسان، وەرگێڕان، کەرکوک، ٢٠٠٥.
- (گەشتێك لەنێوان مانگو دەریادا)، غەسان نەعسان، وەرگێڕان، ٢٠٠٦.
- (پلەو پایەی گیانداران لەناو قسەی پێشینان)، کەرکوک، ٢٠٠٦.
- (بیبلیۆگرافیای ٣٠ ژمارەی گۆڤاری گزنگ)، کەرکوک، ٢٠٠٧.
- (هەڵوەستەیەك لەسەر هەندێك وشەو دەستەواژە لە زمانی کوردیدا)، بەرگی یەکەم، کەرکوک، (٢٠٠٨).
- (قرية طوبزاوه في المئة الأولى من عمرها)، (٢٠٠٨).
- (پەیڤا دووبارە لە زمانی کوردیدا)، کەرکوک، ٢٠٠٩.
- (نەشتەگەریەکانم)، بەرگی یەکەم، کەرکوک، ٢٠٠٩.
- (بیبلۆگرافیای ٣٤ ژمارەی نەوشەفەق)، ٢٠١٠.
- (مێژووی پزیشکی ڤێتەرنەری لە عێراقدا ١٩٢١-١٩٢٩)، ٢٠١٠.
- (بەکارهێنانی ئەندامەکانی لەش لە زمانی کوردیدا)، ٢٠١٠.
- (نەشتەرگەری لە ئاژەڵە وردیلەکان).
- (ڕەوانبێژی ئیدۆم)، بەدووقۆڵی لەگەڵ بەڕێز هەردەوێل کاکەیی.
- لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٣)و لە دوای پرۆسەی ئازادی ماوەیەك لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (بانەڕۆژ) کاری کردووە.

*** عەبدولکەریم وەناوی:-**

- عەبدولکەریم عەلی ئاغای وەناوی ساڵی (١٨٩١) لە شاری کفری لە دایکبووە. کەسایەتییەکی ناسراو و خۆشەویست بووە سەرۆکی هۆزی (وەناوی) وەنداوی بووە، لەبەر خۆشەویستی و خزمەتکردنی خەڵك زۆر ڕێزداربووە لای خەڵکی کفری چەندین جار کراوەتە سەرۆکی شارەوانی کفریو ساڵی (١٩٥١) لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا کۆچی دوای کردوو.

*** (عەبدولکەریمی وەلیانی - شێخ عەبدولکەریمی وەلیانی):-**

- ناوی (شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ ئیسماعیلی وەلیانی) یە، لە سەیدەکانی (بەرزنجە)یەو لە ڕووی تەریقەتەوە سەر بە تەریقەتی (قادری) بووە.
- ساڵی (١٨٦٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدوللەتیف تەرزی باشی - مەلا عەبدوللەتیف تەرزی باشی):-**

- ناوی (مەلا عەبدوللەتیف کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی مەلا ئەحمەد تەرزی باشی)یە.
- ساڵی (١٨٥٦) لە گەڕەکی پیریادی لەدایکبووە.
- لە (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩١٨) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمە دەستنووسەکانی:
- (کتاب حج سفري).
- (لائحة الثغور في ترغيب الجند المنصور، في أحكام الدين).
- (كشكول، يحتوي على الأدب والتأريخ والتراجم)، لە دوو بەرگدا.

- (تحفة عسكرية: في احكام الدين على المذهب الحنفي).

* (عەبدوللەتیف عومران بەندەر ئۆغلو):-

- سالّی (١٩٣٧) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- پەیمانگای راهێنانی پیشەسازی تەواو کردووە.
- ئەدیب و نووسەرێکی تورکمانە.
- دکتۆرای لە ئەدەب و زمان هێناوە لە زانکۆی باکۆ لە ئازربایجان لە سالّی (١٩٩٢).

بەڕێوەبەری (إرشاد المنطقة الشمالية) بووە سالّی (١٩٧٠).
بەڕێوەبەری رۆشنبیری تورکمانی و سەرنووسەری (یورد) بووە هەر لە سالّی (١٩٧٠)ەوە.
- نزیکەی ٣٠ بەرهەمی هەیە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (اللهجات والكتابة التركمانية)، ١٩٧٠.
- (تورکمن شاعري فضولي بياتلي)، بە تورکی، یەکێتی رۆشنبیرانی تورکمان، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٧١.
- (یورد طوبراغي)، بە تورکی نوێ، ئەنقەرە، ١٩٧١.
- (الملحمة في الأدب التركماني)، ١٩٧١.
- (نظرة إلى الفولكلور التركماني)، ١٩٧١.
- (ناظم حكمت شاعر الإنسانية والحرية)، بەغدا، ١٩٧٢.
- (عماد الدين نسيمي البغدادي)، بە تورکی، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری تورکمانی، بەغدا، ١٩٧٢.
- (التركمان في عراق الثورة)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (گورگور بابا)، بە تورکی، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری تورکمانی، بەغدا، ١٩٧٣.
- (جیغلق ویارا)، بە تورکی، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری تورکمانی، بەغدا، ١٩٧٥.
- (دوغو إنسانلاري)، بە تورکی، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری تورکمانی، بەغدا، ١٩٧٥.
- (کودوە رجینلرین ازکیسی)، بە تورکی نوێ، ئەنقەرە، ١٩٧٦.
- (قصائد صمد ورغن)، وەرگێران، مۆسکۆ، ١٩٧٧.
- (عراق تورکمن دیلي)، بە تورکی، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری تورکمانی، بەغدا، ١٩٧٧.
- (قرنفل)، بە تورکی، باکو، ١٩٧٧.
- (قصائد مختارة من الشعر التركي المعاصر)، وەرگێران، بەغدا، ١٩٧٨.
- (عروق البحر)، وەرگێراوە لە شیعری تورکی، بەغدا، ١٩٨٠.
- (المعجم التركي العربي)، چوار بەشە، ١٩٨١.
- (یانار داغلاردان بوسکورن یبلدیزلار)، بە تورکی، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری تورکمانی، بەغدا، ١٩٨٢.
- (إشارت أولية في الشعر التركي المعاصر)، بەغدا، ١٩٨٣.
- (شعراء من العراق)، بەغدا، ١٩٨٩.
- (الصفيحة ولو يقتلون الثعبان)، پێداچوونەوە، نووسینی: یەشار کەماڵ، وەرگێرانی: نەسرەت مەردان، بەغدا، ١٩٩٠.
- (مطالع الاعتقاد والقصائد العربية لمحمد بن سليمان فضول البغدادي)، بەغدا، ١٩٩٤.
- (الشاعر فضولي البغدادي)، بەغدا، ١٩٩٥.
- (ست سنوات على ضفاف دجلة والفرات) وەرگێران، ١٩٩٦.
- (ئەلجین ادن ایلدەن صونرا)، (دار الشؤون الثقافية)، بەغدا، ١٩٩٦.
- (نظرة إلى آذربيجان اوزبكستان تركمانستان قازاخستان وقيرغيزستان)، بەغدا، ١٩٩٧.
- (مدية تخترق كبد الزمان)، شیعرو وەرگێران، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (تحليق الطيور فوق بغداد ممنوع)، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- لە شوباتی سالّی (٢٠٠٨) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدوڵڵا ئەمین - دکتۆر عەبدوڵڵا ئەمین):-

- ناوی (دکتۆر عەبدوڵڵا ئەمین مەلا)یە لە بنەماڵەیەکی ئایینی لەدایکبووە.
- سالّی (١٩٣٣) لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- هەر بە منداڵی باوك و دایکی ژیانیان بەجێ هێشتووە و لای ئامۆزایەکی گەورە کراوە و لەچەندین قوتابخانە خوێندوویەتی و لە سالّی (١٩٥٣) قوتابخانەی مامۆستایانی لادێی لەدهۆك تەواو کردووە و بووە بەمامۆستا لەچەمچەماڵ.
- لەبەر دەسترەنگینی لە هونەری شێوەکاری لە چەمچەماڵەوە گوازراوەتەوە بۆ پارێزگاری کەرکوك لەسەر خواستی پارێزگار (یوسف زیانەددین)، کراوە بە مامۆستای هونەر لە ئامادەیی کەرکوکی کوڕان، هەر لەو شارەدا چەندان پێشانگای کردووەتەوە.
- ماوەیەکی زۆر لە هەندەران ژیاوە و زانیاریمان دەربارەی کەمە.
- هەر بۆ هاندان و رێزلێگرتنی لە سالّی (١٩٥٧)دا نێردراوە بۆ (بەیروت) لەلوبنان و بەشداری خولێکی هونەری کردووە و یەکێك بووە لەقوتابیە سەرکەوتووەکانی ئەو خولەیە...
- لە گەرمەی ژیانی سیاسیدا لەدوایی شۆڕشی گەلاوێژی ١٩٥٨ و تێکەلبوونی بەو ژیانە لەکەرکوکدا تووشی ماندووبوون و گیران دەبێت و لەسەر خواستی خۆی لە سالّی (١٩٦١) دەگەرێتەوە بۆ چەمچەماڵ و لەوێش چەندین پێشانگا بۆ قوتابخانەکانی چەمچەماڵ ئامادە دەکات و چەندین تابلۆی هونەری بلاو دەکاتەوە کە زۆربەیان

دیمەنی کوردستان و کچ و ژنی کوردن.. ئەم مامۆستایە لە سالی (١٩٥٧)دا بەدەیان کارتی جەژنە پیرۆزەی لەسەر تابلۆیەکی کوردستان بووەو لەژێریەوە نووسیوە:
بێرە کوردستان عەزیزم گەرتۆ سەیرانت ئەوێ
بتبەمە قەندیل ئەگەر گولزاری کوێستانت ئەوێ
- سالی (١٩٦١)دا هەر لەگەل سەرهەلدانی شۆرشی ئەیلولدا ئەم مامۆستایە بەمادەی (٨٠) ی قانوونی عێراق درایە گرتن و حوکمی لەسێدارەدانی درا بەسەریدا کە بۆ ماوەی دوو سال و نیو لەبەندیخانە مایەوەو لە سالی (١٩٦٣)دا ئازاد کرا.
هەر لەو سالەدا بەپاسەپۆرتی ژن براکەی کە فەرمانبەر بوو لەبەغداو ناوی (عەبدوللا محەمەد) بوو بەرەو ئەلمانیای رۆژهەلات کۆچی کردو لەوێ بەهۆی کۆمەلەی قوتابیانی کورد لەئەوروپا کۆلیژی پزیشکی لەزانکۆی (لایبزیك) وەرگیرا کە لەوەوبەر لەتاقیکردنەوەی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی لەعێراق بروانامەی وەرگرتبوو.
- سالانی (١٩٧٠-١٩٧١) بروانامەی پزیشکی بەشی نەخۆشیەکانی ناوەوەی وەرگرت.
- سالی (١٩٧٣) لەسەر بەیاننامەی کۆمەلەی قوتابیانی کورد لەئەوروپاو داواکردنی ئەو کۆمەلەیە لەو پزیشکە کوردانەی ئەو رۆژگارەی ئەوروپا کە بگەرێنەوە بۆ کوردستان و بۆ خزمەتی شۆرش، دکتۆر عەبدوللا ئەمین یەکەمین دکتۆری کورد دەبێت و دەگەرێتەوە بۆ کوردستان و لەچۆمان و ئاکرێ و قەلادزێ بەشداری دەکات لەشۆرش و تا نسکۆی شۆرشی ئەیلول لە سالی (١٩٧٥) دا بۆ جارێکی تر دەگەرێتەوە ئەلمانیای رۆژهەلات و لەوێ چەند مانگێك دەگیرێ و لەپاشدا بەرەو ئەلمانیای رۆژئاوای ئەو سەردەمە دەروات و لەشاری (دیورنیگ) لە یەکێك لەنەخۆشخانەکاندا کار دەکات و لە سالی (١٩٨٠)دا دەست لەو کارە هەلدەگرێ و هەرخۆی نەخۆشخانەیەك لەو شارەدا دەکاتەوە بەقەرز وەرگرتن لە حکومەتی فیدرالی و عیادەیەك دادەنێ کە هەموو پێداویستی و ئامێرێکی پزیشکی تیا دەبێ و چەندین پزیشك و پەریستار لەو عیادەیەدا کار دەکەن.
- سالی (١٩٩٤)دا دەست لەو نەخۆشخانەیە هەلدەگرێ و خۆی خانەنشین دەکات و ئێستا لەولاتانی ئەوروپا ژیان بەسەر دەبات.
- د. عەبدوللا ئەمین لە سالی (١٩٥٤)دا، پەیوەندی بە (جماعة فناني كركوك)ەوە دەکات و لەگەل دوو برادەرە کوردەکەی دیکەی (سدیق ئەحمەد عاشوور) و (محەمەد مەهدی) بەشداری لەچوارەم پێشانگای (گرووپی هونەرمەندانی کەرکوك) دەکات، تاکو سالی (١٩٦٠)یش لەگەلیان بەردەوام دەبێت و پێشانگای تایبەتی و هاوبەشیان لەگەل دەکاتەوە.

* (عەبدوللا ئیبراهیم - دکتۆر عەبدوللا ئیبراهیم):-

- سالی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (البناء الفني لرواية الحرب في العراق، دراسة في النظم والسرد والبناء في الرواية العراقية المعاصرة)، نامەی ماستەر، زانکۆی بەغدا، بەغدا، ١٩٨٧.
- (رمادل الليل)، (دار الشؤون الثقافية)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (التفكيك: الأصول والمقولات)، مەغرب، ١٩٩٠.
- (المتخيل السردي، متابعات نقدية في التناص والرؤيا والدلالة)، بەیروت، ١٩٩١.
- (معرفة الاخر، مدخل إلى المناهج النقدية الحديثة)، بەیروت، ١٩٩١
- (البنية السردية للسيرة الشعبية العربية)، ١٩٩٢.
- (السردية العربية، بحث في البنية السردية للموروث الحكائي العربي)، بەیروت، ١٩٩٣.
- (المركزية الغربية: إشكالية التلوين)، بەیروت، ١٩٩٧.
- (المطابقة والاختلاق-المركزية الغربية، إشكالية التكون والتركز حول الذات)، بەیروت، ١٩٩٧.

* (عەبدوللا تەبیب ئۆغلو):-

- سالی (١٨٣٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ناوی (مەلا عەبدوللا کوری حاجی مەحموود) بووە کە نازناوی شیعری (تەبیب) بووە.
- دیوانێکی دەستنووسی لێ بەجێماوەو گەلێك چاپکراوی تری هەیە.
- لەسەر رەزامەندی موتەسەرفی کەرکوك (تەقییەدین پاشا) هەستاوە بە وەرگێرانی کتێبی (عەنتەر) لە عەرەبییەوە بۆ تورکی لەسەر شێوەی شیعرو پەخشان.
- سالی (١٩٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدوللا تاهیر بەرزنجی):-

- سالی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٨٠) کۆلێژی ئاداب بەشی زمانی عەرەبی لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
- رەخنەگرو وەرگێرو شاعیرو چیرۆك نووسە، لە زمانەکانی عەرەبی و کوردی دەنووسێت و وەرگێرانی هەیە لە زمانەکانی عەرەبی و کوردی فارسی.
- سالی (١٩٩٢)دا بەشداری پرۆژەی دەرکردنی گۆڤاری (پرۆژە - المشروع)ی کردووە بە زمانی عەرەبی و کوردی لەگەل رەخنەساز (سەلاح حەسەن پالەوان)، یەکێکە لە دامەزرێنەری بنکەی رووناکبیری و رۆشنبیری (گەلاوێژ)، سەرنووسەری گۆڤاری (گەلاوێژ)ی نوێیە بە زمانی عەرەبی و کوردی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ارواح في عراء.. انطلوجيا الشعر الكردي الحديث)، بەغدا، (٢٠٠٨).
- (ذات زمان .. الظلام كان ابيض)، تەیب جەبار، ٢٠١٠.
- (قصائد تلتفت إلى الامام)، تەیب جەبار، وەرگێران، ٢٠١٢.

- (الجنجر الضامیء)، شیعر، بغدا، ١٩٨٧.
- (صید الامواج)، کۆمەڵە شیعرێك، سلێمانی، (٢٠٠٨).
- (الولي)، کۆمەڵێك کورتە چیرۆکە، سلێمانی، (٢٠٠٨).
- (السمکة الفضیة)، لەتیف هەڵمەت، وەرگێران، بەغدا، ١٩٨٧.
- (لا منزل یشبه البحر)، سامی هادی، وەرگێران.
- (الریاح لا تصادق احدا)، لەتیف هەڵمەت، وەرگێران.
- (شذرات قباد)، کۆمەڵێك چامەی شیعرییە، وەرگێران، سلێمانی، (٢٠٠٨).
- (من ثقب الباب)، وەرگێرانی شیعری فارسی.
- (کلب یغادر اعماقي)، رەسول یۆنان، وەرگێران لە فارسییەوە.
- (شروشیتالی شاهان)، جان دەمۆ، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (فێمینیزم، فکیرو رەوتەکانی)، نورە فەرەج ئەلموساعید، وەرگێران.
- (باڵگەیەك بۆ نیشتنەوە)، موسا بیدەج، وەرگێران.
- (ئەڵێی تەختەم دەسوتێم)، شیعری شاعیرانی عەرەب لە دوانزەهەمین فیستیڤاڵی (گەلاوێژ)، وەرگێران بە هاوکاری لەگەڵ محێدین مەحموود.

* (عەبدوڵلای تۆم تەن):-

- ناوی (عەبدوڵلا قادر)ە، ناسراوە بە (عەبدوڵلا تۆم تەن).
- ساڵی (١٩١٢) لە گوندی بەکرەگەرەی ناو هۆزی زەنگەنە لەدایکبووە، پاشان ماڵیان هاتووتە دێی دوانزە ئیمامی نزیك کفری.
- شاعیرێکی نەخوێندەوار بووە بەڵام بە سەلیقە بووە، زۆربەی شیعرەکانی فەوتاوە لەبەر ئەوەی تۆمار نەکراوە، بەڵام بەشێك لە شیعرەکانی لە کتێبی (گوڵبژێرێك لە شیعرو شاعیرانی گەرمیان) بڵاوبووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدوڵلا جەلەمۆردی - مەلا عەبدوڵلا جەلەمۆردی):-

- ناوی (مەلا عەبدوڵلا کوری مەلا مستەفا جەلەمۆردی)یە.
- لە سەردەمی خۆیدا ئیمام و خەتیب بووە لە خانەقای (شێخ خدر) لە کەرکوك، گەلێك کتێبی دەستنووسی لێ بە جێماوە.

* (عەبدوڵلا جواد):-

- ساڵی (١٩٤٩) لە گوندی (کەعوبە)ی سەر بە ناحیەی (ریاز) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٧) روودەکاتە کەرکوك ونیشتەجێ دەبێت.
- ساڵی (١٩٨٤) دڵی لە لێدان دەکەوێت.
- لە دوای خۆی کۆمەڵێك گۆرانی بەجێهێشتووە کە بەشێکی زۆری نەفەوتاوە.

* (عەبدوڵلا جوندی):-

- ساڵی (١٩٥٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لێکۆڵینەوەو شیعرو چیرۆکی هەیە لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا.
- دەرچووی کۆلێژی ئاداب بەشی زمانی کوردییە.

* (عەبدوڵلا حەیدەر):-

- زانایەکی ئایینی بووەو کتێبێکی داناوە بە ناونیشانی (نسب القضایا في کرکوك).

* (عەبدوڵلا خەتیب):-

- ناوی (مەلا عەبدوڵلا کوری مەلا مستەفای خەتیب)ە.
- ساڵی (١٨٩٦) لە کفری لەدایکبووە.
- خوێندنی لە قوتابخانەی روشدیە تەواو کردووەو ماوەیەك ئیمام و خەتیب بووە لە مزگەوتی کفری و شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە جۆرەکانی مەقاماتدا.
- کتێبێکی دەستنووسی لێ بە جێماوە بە ناونیشانی (المولد النبوي).
- ساڵی (١٩٤٤) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدوڵلا خدری- مەلا خضري):-

- ناوی (عەبدوڵلا کوری مەلا سلێمان کوری مەلا مستەفای خدری)یە.
- لە دوای کۆچی دوایی باوکی مەلا سلێمان لە ساڵی (١٨٤٤) جێگەی باوکی گرتووەتەوە لە گەرەکی قۆریە.
- قوتابخانەیەکی ئایینی هەبووە لە کەرکوك لە گەرەکی (قۆریە) کە تا ماوەیەکی چاك قوتابخانەکە بە ناوی خۆیەوە بووە ئەوەیش بەپێی ئەو دەستنووسەی کە بە رێنووسی (حەسەن کوری سلێمان شەلماشی) نووسراوە ئاماژە بە (مدرسة الملا عبد الله الخضري) دەکات لە ساڵی (١٨٥٨)، ئەمەش ئەو راستییە یەکلا دەکاتە کە تاکوو ئەو مێژووە لە ژیاندا بووەو ئەو قوتابخانە ئایینییەی بردووەتە رێوە.

* (عەبدوڵلا دارتاش - د. عەبدوڵلا دارتاش):-

- ناوی (عەبدوڵلا عەلی محەمەد شەریف شوانی)یە ناسراو بە (عەبدوڵلا دارتاش).

- سالی (١٩٥٦) لە گەرەکی ئەلماس (گەوهەرباری)ی شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیو دواناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- دەرچووی کۆلێژی شەریعەت ویاسایە لە زانکۆی بەغدا.
- وێرای تەواوکردنی کۆلێژی ماف لە زانکۆی (موستەنسریە) ی ئێواران لە شاری بەغدا، ئێستا پیشەی پارێزەرە.
- لە سەرەتای حەفتاکانەوە دەستی بەنووسینی (شیعر)و نووسینی تری جۆراو جۆر کردووەو دیوانێکی شیعری بەناو رێنامەی ئەوینێکی نوێ، ئامادەیە بۆ چاپکردن.
- هەروەها کتێبی گرنگی مێژوویی شاری دێرینی کەرکوكو قەلای مێژووی کارگوودی لەژێر چاپدایە.
- گەلالەی پرۆژەی کتێبێکی دیکەی بە ناوی مێژووی نەتەوەی کورد لە کتێبە ئاسمانییەکاندا لە هزردایە.
- ئێستایش لەوولاتی ئەلمانیا دەژیو هەر لەوێ سەرقالی تەواوکردنی خوێندنی بالا ماستەرو دکتۆرایە.

*** (عەبدوللا زیانی ):-**

- ناوی (عەبدوللا کوری شێخ عەلی زیانی)یە.
- سالی (١٩١٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لەنێوان سالانی (١٩٣٥-١٩٦٥) ئیمامو خەتیب بووە لە مزگەوتەکانی (یایچی)و (حاجی حەبیب هورمزی)و (داقوق) و (منارە نەخشینە)و نائیب)و (حەسەن پاکین).
- سالی (١٩٦٦-١٩٦٧) بووەتە ئیمامو خەتیب لە مزگەوتی (دەبباش) لە کەرخ لە بەغدا.
- شارەزایی هەبووە لە زمانەکانی کوردیو عەرەبیو فارسیو تورکی.
- سالی (١٩٨٥) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدوللا سەراج ):-**

- سالی (١٩٣٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خولی مامۆستایانی پەروەردەی لە سالانی (١٩٥٣-١٩٥٤) لە کەرکوك تەواو کردووە.
- یەکەم پێشانگای لە سالی (٢٠٠٦) لە کوردستان کردووەتەوە چوارەم پێشانگای لە هەندەران کردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (سەرەتای زانیاریو تەندورستی)، وەرگێران، هاوبەش، بەغدا، ١٩٦٠.
- (لاکێشە رووناکەکان)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٠.
- (مردوو خەون نابینی)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨١.
- (بارام ناوێك هەبوو)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٢.
- (پەرەنگ)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٦.
- (هەلکشان بەرەو لوتکە)، رۆمان، بەغدا، ١٩٨٩.
- (پەیك)، چیرۆك، پاریس، ١٩٩٥.
- (کاولاش)، رۆمان، هەولێر، ١٩٩٧.
- (سۆناتای روح)، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٧، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (کۆچرەو.. کۆچرەو)، ٢٠٠٣.
- (ونگە)، چیرۆك، چاپی یەکەم، بەرلین، ٢٠٠٣، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (ئەژدەر)، نۆڤلێت، سلێمانی، ٢٠٠٥.

- (پەرتەوازەی ئێرو ئەوێکانی رەوان)، رۆمان، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (بەرەو ئاستانەی رۆمانو گۆشە نیگاکان)، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (ناوێ لەم تێکستە بنێ)، (٢٠٠٨).
- (پەیڤستان)، کۆ گوتار، ٢٠١٣

*** (عەبدوللا سەعید عەرەبەتی ):-**

- ناوی (عەبدوللا کوری سەعید)ە، لە دەورووبەری سالی (١٩٠٠) لەدایکبووە.
- کاتی خۆی لە دەست باوەژن هەلاتووە خۆی گەیاندۆتە گوندی پەنجا عەلی لە (لەیلان).
- عەبدوللا یەکەم جار ئامۆزایەکی خۆی بە ناوی (نارنج) دەهێنیو هەرزوو جیا دەبنەوە، ئینجا نەجمە محەمەد ئیسماعیل لە گوندی ترکەشکانی دەهێنێ سێ کچو دوو کوریان دەبێت بەم ناوانە:-
(کافیە، ئەسلیە، سودابە، فەتحوللا، سالار).
- عەبدوللا لە منداڵییەوە گۆرانی وتووە، مەقامە کوردییەکانی وەکو قەتار، خاوەر، ئەللاوەیسی، ئای. ئای بەچاکی زانیوە، هەمیشە هاتووچۆی دیوەخانی شێخ فایەق تالەبانی لە گوندی ترکەشکان کردووە، گۆرانی وتووەو خەلکی سەرسام کردووە.
- سالی (١٩٣٩) عەبدوللا سەعید لەگەل ئەمین باخەوان دەچێت بۆ بەغداو چەند مەقامێك تۆمار دەکات لە رادیۆی کوردی بەغدا کە ئەوسا تازە دامەزرابوو لە بری ئەوە (٧٥) روپیەی پەدەنێ.
- عەبدوللا سەعید لە شایی لەگەل دەهۆلو زورنا بەم جۆرە گۆرانی ووتوە خەلکەکە بێ دەنگ دەبوو زورنای دەژەنی، ئینجا لەگەل زورناکە مەقامی دەوتو کە هەلدەسایەوە بۆ بەستە دەهۆلەکەش دەکەوتە لێدانو شایی گەرم دەبوو.
- لە چایەخانەکانی کەرکوك گۆرانی ووتووە بە تایبەتی لە چایەخانەی (حەمەی کۆترەمل)، کە خۆشی مەقازان بوو دەنگی خۆی لەسەر قەوان تۆمارکردبوو لە چایەخانەکەی خۆی لێی دەدا.
- سالی (١٩٤٤) بە نەخۆشی خوێن پژانی لووت لە نەخۆشخانەی کەرکوکی گشتی لە شاری کەرکوك لە شەوێکی گەرمی ئەو سالەدا بە نائومیدی سەری نایەوە.

* ( عەبدوڵڵا سافی کەرکوکی - سافی ):-

- ناوی (حاجی عەبدوڵڵا کوڕی مەلا دەروێش کوڕی محەمەد ئەفەندی)یەو نازناوی شیعری (ساف)یە.
- شاعیرو ئەدیبی کەرکوکییە.
- کوڕی (مەلا دەروێش محەمەد)ە کە یەکێك بووە لە پیاوە ئایینییەکانی کەرکوك.
- ساڵی (١٨٢٨) لەدایکبووە لە کەرکوك.
- ساڵی (١٨٩٨) کۆچی دووای کردووە.
- دیوانێکی شیعری دەستنووسی لای مێژوونووس عەباس عەزاوی هەیە.
- بەرهەمەکانی:
- (دیان)، دیوانێکی شیعری بە زمانی تورکی.
- (افترانامە)، دیوانێکی شیعری بە زمانی تورکی.
- (حکایە)، ڕۆمان بە زمانی تورکی.
- (قسطاس مستقیم)، بە زمانی تورکی.
- (اخبار الدول واثار الاول)، وەرگێران لە عەرەبییەوە بۆ تورکی، سێ بەش.
- (امثلة)، بە زمانی تورکی.
- (لغات ترکیة)، فەرهەنگی تورکی-تورکی.

* ( عەبدوڵڵا سافی یەعقوبی ):-

- (عەبدوڵڵا ساف کوڕی عومەر ئەحمەد یەعقوبی)یە.
- ساڵی (١٨٧٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٨٩٦) کاتب بووە لە دادگای تێهەڵچوونەوەی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٠٤) بووەتە دادوەری کەرکوك.
- ساڵی (١٩٠٨) ئەندامی (مجلس إدارة کرکوك) بووە.
- ساڵی (١٩١٣) هەڵبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك لە (مجلس المبعوثین).
- ساڵی (١٩١٤) دووبارە هەڵبژێردراوەتەوە تا ئاگربەستی شەڕی جیهانی یەکەم.
- لە (٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٣٩) کۆچی دوایی کردووە.

* ( عەبدوڵڵا سلانی - مەلا عەبدوڵڵا سلانی ):-

- ناوی (مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەلا عەبدولسەمەد سلانی)یە.
- بەپێی دەستنووسەکان ماوەیەك لە کەرکوك مامۆستا بووەو قوتابی (مەلا عەلی حیکمەت) بووە، بەڵام دەربارەی ژیانی هیچ نازانرێت تەنها بەرهەمێکی بە دەستنووسی خۆی بە جێماوە بە ناوی (رسالة في معرفة ساعة الوقت).

* ( عەبدوڵڵا سلێمان مەشخەڵ ):-

- ساڵی (١٩٦٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پەیمانگای تەکنەلۆژیای کەرکوکی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٣)ەوە دەستی کردووە بە شیعر نووسین.
- ساڵی (١٩٨٤)ەوە کۆمەڵە شیعرێکی بە ناوی (هاوارێك بۆ ڕاپەڕین) لە دەزگای سانسۆری بەعس ڕەت دەکرێتەوە.
- لە وڵاتی کەنەدا دەژێت.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:

- (چاوولێیە)، شیعر، ١٩٩٢.
- (چەند گۆرانییەك لە جەنگەڵستانی ژیانەوە)، شیعر، ١٩٩٢.
- (نامیلکەی دەربارەی قانونی جەمعیاتی حکومەتی هەرێم)، هەولێر، ١٩٩٣.
- (نامیلکەی باناوڕێك بۆ دواوە تەکانێك بێت بۆ پێشەوە)، ١٩٩٣.
- (ڕژانی دڵۆپەکانی مەنفا)، شیعر، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (بیاپانێکی پڕ لە دووکەڵ)، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (گولە مۆرەکان)، چیرۆك بۆ منداڵان، وەرگێران، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (ئاکشن)، شانۆ بۆ مێرد-منداڵان، وەرگێران، لە ئینگلیزیەوە، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (ئەڵاس چەردەیەك لە شیعری بیانی)، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (لۆلاو سەگەکەی)، کۆمەڵە چیرۆکی منداڵانە، وەرگێران، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- (دلی سەرباز، شانۆ نامە)، دەیڤد فرێنچ، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (دیوارەکان دەروخێنین)، بریخت، وەرگێران، ١٩٩٠.
- (لە کەرکوکەوە بۆ ڤێستەرۆس، بەم دەم پیاسەوە لەگەڵ سەلام محەمەدی شاعیردا)، ٢٠١٣.

* عەبدوڵڵا شاکیر بەشیری:-

- ساڵی ١٩٥٦ لە بەشیر لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- بشیر في ذاکرة التاریخ، ٢٠٠٤
- اولمین خاطره لر، ٢٠٠٥
- بشیر وخریف علی المحك، ٢٠١١
- کلام وکلام، ٢٠١٢
- کوکل اهلاری، ٢٠١٢
- کیتی عمر، ٢٠١٤
- حائر بالعربیة، ٢٠١٤

*** ( عەبدوڵڵا عەبدولڕەحمان زەنگەنە ):-**

- ساڵی (١٩٤٥) لە كەركوك لەدایكبووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی وناوەندی‌و ئامادەیی وخولی پەروەردەیی لە كەركوك تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٦٤) بوو بە مامۆستای سەرەتایی لە دێی كەوەڵە ساڵی (١٩٩٥) خانەنیشن كراوە.
- هەر لە منداڵییەوە ئارەزووی خوێندنەوەی هەبووە.
- لە گۆڤاری هەتاو نووسەری كوردو بەیان‌و ڕەنگین دا نووسینی بڵاوكردووەتەوە.
- هەورەها لە ڕۆژنامەی پێشكەوتن‌و پاشكۆی عێراق‌و هاوكاری نووسینی بڵاوكردووەتەوە.
- دوای پرۆسەی ئازادی لە ئەوشەفەق‌و بانە ڕۆژو كەركوكی ئەمرۆدا وهاویردا نووسینی بڵاوكردووە ئەم كتێبانەی چاپكردووە:
- (ووتەكانی ژیان بەشی یەكەم هاوبەشە لەگەڵ محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنەدا).
- (قەرەقووش).
- باڵوولی دانا).
- ئەمانەشی لە پاش بە جێماوە:
- (مامۆستای هونەر)، چیرۆكی منداڵان.
- (لە هەر باخێ گوڵێك).
- لە (٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠١١) كۆچی دوایی كردووە.

*** ( عەبدوڵڵا عەبدولكەریم مارف بەرزنجی ):-**

- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (كەركوك لە مێژوودا)، سوید، ٢٠٠١.

*** عەبدوڵڵا عەبدولكەریم محەمەد:-**

- ناسراو بە عەبدوڵڵا دڵێر.
- لەدایكبووی ساڵی (١٩٥٦)ی شاری كەركوك‌و هەر لەو شارەش قۆناغەكانی خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٧٥) لەبەشی كیمیای كۆلیژی زانستی زانكۆی سلێمانی وەرگیراوە.
- ساڵی (١٩٨٠)دا بڕوانامەی بە كالۆریۆسی بەدەستهێناوە.
- مێژووی پەیوەندی كردنی بەڕێكخستنەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستانەوە بۆ ساڵی (١٩٧٧) دەگەڕێتەوە.
- لە ئەیلولی ساڵی (١٩٨٠)دا فەرمانی گرتنی لەبەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی كەركوكەوە دەرچوو. دوای دەرچوونی فەرمانەكە بە چەند ڕۆژێك، پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە كردو دواتر لە بارەگای ئێزگەی دەنگی گەلی كوردستان لە گوندی توژەڵە گیرسایەوە.
- هاوینی ساڵی (١٩٨١) گوێزرایەوە بۆ سنووری هەرێمی دووو لەوێ وەك كادیری ناو جەماوەر لەناوچەی شوان‌و قەڵا سێوكە كاری كرد. ساڵی دواتر كرایە لێپرسراوی دارایی تیپی ٢١ی كەركوك.
- ساڵی (١٩٨٦)دا بووە ڕابەری سیاسی لە سنووری تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.
- ساڵی (١٩٨٧) گوێزرایەوە بۆ بارەگای مەكتەبی ڕاگەیاندن لەبەرگەلوو كرایە لێپرسراوی بەشی دابەشكردنی چاپەمەنی كە ئەركەكەی ڕێكخستنی پرۆسەی دابەشكردنی چاپەمەنییەكان بوو بەسەر ڕێكخستنەكانی ناوشارو تیپەكانی هێزی پێشمەرگەو دامودەزگاكانی یەكێتیدا.
- لە شوباتی ساڵی (١٩٨٩) وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا دوو جار بەسەختی بریندار بووە. جاری یەكەم لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٢) لەشەڕی تەگباسان لە ناوچەی ئاغجەلەرو جاری دووەم لە ساڵی (١٩٨٧) لەسەر گەلوو لەسۆنگەی تۆپبارانكردنی گوندەكەوە.
- ساڵی (١٩٩١) پەیوەندیی بەڕێكخستنەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانەوە كردەوەو بەشداریی لە ڕاپەڕیندا كرد.
- دوای ڕاپەڕین ئەركی ڕێكخراوەیی گرتە ئەستۆ.
- ساڵی (١٩٩٣)دا كرایە كارگێڕی كۆمیتەی ڕێكخستنی زانكۆو پەیمانگاكان لە مەڵبەندی یەكی ڕێكخستنی سلێمانی‌و ساڵی دواتر بە ئەندامی مەڵبەند هەڵبژێردرا.
- ساڵی (١٩٩٥) بووە بەڕێوەبەری پەیمانگەی ناوەندیی مامۆستایانی سلێمانی.
- ساڵی (١٩٩٦) بۆ جاری دووەم بەئەندامی مەڵبەندی سلێمانی هەڵبژێردرایەوەو كرایە لێپرسراوی كۆمیتەی ڕێكخستنی پەیمانگاكان.
- ماوەی ساڵانی (٢٠٠١- ٢٠٠٦) بەڕێوەبەری گشتیی ئاوارەكان بوو لە وەزارەتی ماڤ مرۆڤو ئاوارەو ئەنفالكراوەكانی ئیدارەی سلێمانیی حكومەتی هەرێمی كوردستان.
- ساڵی (٢٠٠٣) دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس‌و دانانی بارەگای مەڵبەندی دووی ڕێكخستنی كەركوك لەناو شاری كەركوك، كرایە كارگێڕی ئەو مەڵبەندەو لەو ماوەیەدا، لەگەڵ ژمارەیەك لەكادیرانی كەركوكی، سەرقاڵ بوو بەفەراهەم

کردنی پێداویستییەکانی گەڕانەوەی ئاوارە کەرکوکییەکان بۆ زێدی خۆیان‌و لەم ڕووەوە بەشدار بوو لە دامەزراندنی ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارە.
- ساڵی (٢٠٠٦) کرایە بەڕێوەبەری گشتیی دیوانی وەزارەتی ماف مرۆڤ لە حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و هەر لەو ساڵەشدا بەشدار بوو لە دامەزراندنی ئەنجوومەنی باڵای پاراستنی ژینگەی کوردستان کە ئۆفیسی سەرەکیی لە شاری هەولێرەو ئەرکەکەی دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی ژینگەیە. پاش هەڵوەشاندنەوەی وەزارەتی ماف مرۆڤ، چالاکیی لە بواری ماف مرۆڤدا گواستەوە بۆ دەستەی سەربەخۆی ماف مرۆڤ.

*** عەبدوڵلا عیزەددین شاسوار:-**

- ناسراو بەعەبدوڵلا سیاسی.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٦)ی گوندی حەساری ناوچەی شوان لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٤)، کاتێك خوێندکاری ئامادەیی بوو لە شاری کەرکوك، لەگەڵ دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کوردو ڕژێمی عێراقدا، پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کردو بوو بە پێشمەرگە.
- ساڵی (١٩٧٥) پاش هەرەسی شۆڕش، گەڕایەوە بۆ کەرکوك‌و چووە سەر خوێندن. ساڵی دواتر خوێندنی ئامادەیی تەواو کردو هەر ئەو ساڵە لە کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی سلێمانی وەرگیرا.
- ساڵی (١٩٨٠) خوێندنی زانکۆی تەواو کردو ساڵی دواتر پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە هەرێمی چوار ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد. هەر ئەو ساڵە گوێزرایەوە بۆ ناوچەی سەرکردایەتی و لەکەرتی 2ی هەرێمی پارێزگاریی مەکتەبی سیاسی لە گوندی شێنێ درێژەی بە ژیانی پێشمەرگایەتیی دا.
- لە ئابی ساڵی (١٩٨٢)دا، گوێزرایەوە بۆ تیپی ٢١ی کەرکوك‌و هەر ئەو ساڵە لەگەڵ تیپەکەدا بۆ بەشداری کردنی لە هێزی پشتیوان، بۆ جاری دووەم گەڕایەوە بۆ ناوچەی سەرکردایەتی‌و بەشدار بوو لە چالاکییەکانی تیپەکە لە گوندەکانی مەزراوێ‌و ئالوەتان‌و کونە مشك لەناوچەی سەردەشت. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا، گوێزرایەوە بۆ کەرتی دووی شوانی هەمان تیپ.
- ساڵی (١٩٨٣) کرایە ئەندامی پۆل لە کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵ‌و ڕابەری سیاسیی کەرتی ٦ی شەهیدانی چیمەن.
- ساڵی (١٩٨٥) کرایە کادیری جەماوەری لە سنووری ناوچەی شوان‌و پاشان بوو بەڕێکخەری سنوورەکە.
- لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٧) کرایە جێگری فەرماندەی کەرت لە تیپی تایبەتی مەڵبەندی دوو لەسەر گەڵوو لە دۆڵی جافەتی. پاش مانگێك لەگەڵ ٧١ پێشمەرگەدا کەدەرچوی ئامادەیی‌و زانکۆ بوون، ڕەوانەی ئێران کران بۆ بەشداری کردن لە خولێکی فەرماندەییدا کە سوپای پاسداران لە تاران بۆ پێشمەرگەی یەکێتی سازی کردبوو. لەو خولەدا زانستە عەسکەرییەکانی خوێندو مەشقی لەسەر بەکارهێنانی چەند جۆرێکی چەکی سووك‌و قورس کرد.
- لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٨٨)دا گوێزرایەوە بۆ تیپی ٢١ی کەرکوك، کە بەهۆی شاڵاوی ئەنفالەکانەوە لە سنووری خۆشناوەتی جێگیر بوو. هەر ئەو ساڵە، لەگەڵ کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، لە گوندی بلەکێ گیرسایەوەو ماڵیشی بردە شاری سەقز.
- لە کۆتایی ساڵی (١٩٩٠)دا، لە کاتی خۆئامادەکردنی هێزی پێشمەرگە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەی ڕاپەڕین. کرایە جێگری تیپی (٦٢)ی کەرکوك. لەکاتی ڕاپەڕیندا بەشدارییەکی کاریگەرانەی کرد. بەتایبەتی لە شەڕەکانی سنووری کەرکوکدا.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا سێ جار بریندار بووە: جارێك لە ساڵی (١٩٨٦)دا، لەکاتی هێرش کردندا بۆ سەر ڕەبییەکانی پشتێنی ئەمنیی کەرکوك، جاری دووەم لە ساڵی (١٩٨٧)دا لە کاتی هێرشی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر هێزەکانی سوپای عێراق لە گوندی کەندەشێن لە ناوچەی سووورداش‌و جاری سێیەم لە ساڵی (١٩٩١)دا، لە کاتی هێرش کردنی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سەربازگەی خالید لە دووبز.
- پاش ڕاپەڕین، کرایە لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی قەرەهەنجیر.
- ساڵی (١٩٩٢) کرایە کارگێڕی کۆمیتەی کەرکوك‌و پاشان کرایە لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستنی چەمچەماڵ.
- ساڵی (١٩٩٣) کرایە کارگێڕی مەڵبەندی دووی ڕێکخستنی کەرکوك.
- لە شوباتی ساڵی (١٩٩٨)دا کرایە قایمقامی قەزای چەمچەماڵ. لەماوەی دەستبەکاربوونی، قەزاکە چەند پڕۆژەیەکی گرنگی فێرکاری‌و خزمەتگوزاریی بە خۆوە بینی وەك پڕۆژەی ئاوی بازیان - چەمچەماڵ، دامەزراندنی هەردوو پەیمانگەی مامۆستایان‌و تەکنیکی لە چەمچەماڵ‌و دورست کردنی نزیکەی (١٥٠٠) خانوو بۆ ئاوارەکانی کەرکوك لە چەمچەماڵ‌و تەکیەو قەرەناو.
- ساڵی (٢٠٠٣) بووە بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی کشتوکاڵ.
- ساڵی (٢٠٠٩) کرایە ئەندامی یەکەم خولی ئەنجوومەنی ناوەند.
- ساڵی (٢٠١٠) بەپلەی بەڕێوەبەری گشتی خانەنشین بوو.

*** (عەبدوڵلا فاتەکە):-**

- ساڵی (١٨١٩) لەدایکبووە.
- خەڵکی دێی (قەلا میکائیل)ەو شاعیرێکی نەخوێندەوار بووە.
- ساڵی (١٨٨٧) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدوڵلا قودسی زادە):-**

- ناوی (عەبدوڵلا قودسی) بووە لەقەبی شیعری (قودسی) بووە خێزانەکەی بە (زادە) بەناوبانگ بوونە.
- ساڵی (١٨٥٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٨٨٤) هەستاوە بە دروستکردنی گومەتێك لەسەر مزگەوتی مەلا سەعید لە قۆریە لە نزیك ناوچەی (جرت

مەیدان).
- ئەم نووسەرە باوکی هەردوو نووسەر (محەمەد زەکی)و (ئەحمەد مەدەنی)یە.
- کتێبێکی هەیە بە ناونیشانی (وسیلة حسنی)، دیوانی شیعرێ بە زمانی تورکی.
- سالی (١٩٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدوڵلا کەرکوکی):-

- (مەلا عەبدوڵلا کوری ڕەشاد کوری محەمەد کوری ئەحمەد کوری ناسر کوری عەبدوڵلا کەرکوکی)یە.
- یەکێکە لە زانا ئاینییەکانی کەرکوك.
- لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* (عەبدوڵلا لەبیب کوری مەلا عەلی سیامەنسوور):-

- سالی (١٨٩٦) لەدایکبووە.
- لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* (عەبدوڵلا لەیلانی - مەلا عەبدوڵلا لەیلانی):-

- (مەلا عەبدوڵلا کوری عەبدولرەحمانی لەیلانی)یە.
- یەکێکە لە زانا ئاینییەکانی کەرکوك.

* (عەبدوڵلا لۆبیاچی - مەلا عەبدوڵلا لۆبیاچی):-

- ناوی (مەلا عەبدوڵلا کوری عومەر لۆبیاچی)یە.
- سالی (١٨٩٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە زانستی ئاینیو خەتخۆشیو نووسینداو ماوەیەك لە شاری موسل لەلای زانایانی ئەو شارە گەلێك زانستی ئاینی خوێندووەو هەر لەو شارەشدا فێری خوێندنی مەقامات بووە، لەژێر دەستی (شێخ عەبدولفەتاح)، شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە خوێندنی جۆرەکانی مەقاماتو قۆریات، بە تایبەتی شیعری شاعیرانی تورکیو عەرەبیو فارسی بەکارهێناوە لە خوێندنی مەقامو قۆریاتدا.

- لە کۆتایی شەڕی جیهانی گەڕاوەتەوە کەرکوكو بووەتە ئیمامو خەتیبی مزگەوتی (حاجی عەلاو ئاغا)و لە سالی (١٩٤١)دا بووەتە مامۆستا لە مزگەوتی ئاینی لە کەرکوك دەربارەی خوێندنی قورئانو زانستی تەجوید.
- لە (١٥)ی تەمموزی سالی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدوڵلا مەحموود زەنگەنە):-

- لە (١٩)ی ئەیلولی سالی (١٩٦٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٩٤) دەستی کردووە بە بڵاوکردنەوەی نووسینەکانی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان.
- تا ئێستا لە بواری وەرگێڕاندا ئەم کتێبانەی چاپ کردووە:
- (ئەزموونی شانۆی مایرهۆڵد)، هاوبەش لەگەل کامەران سوبحان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٣.
- (شارێکی قاوەیی)، کۆمەڵە چیرۆك، لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد، ٢٠٠٦.
- (شکستی بلیمەتی)، کۆمەڵە وتار، کۆمەڵەی ڕووناکبیری وکۆمەڵایەتی کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (لە سۆراخی ڕاستیەکاندا)، سێ لێکۆڵینەوە لەسەر ڕاگەیاندن، لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد، ٢٠٠٦.
- (ئاراستە نوێکانی شانۆ)، بە هاوبەشی لەگەڵ کامەران سوبحان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٧.
- (زمانو عەقلو کۆمەلگەو فەلسەفە لە جیهانی هاوچەرخدا)، خانەی وەرگێڕانی سلێمانی، ٢٠٠٩.
- (تێکشاندنی عەقل)، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری (هەنار)، ٢٠٠٩.
- (گەلو نەتەوەو دەوڵەت)، دەزگای (شەفەق)، ٢٠٠٩.
- (ووشە گەڕۆکەکان)، کۆمەڵە چیرۆك، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری (هەنار)، ٢٠١٠.
- (مافی گەیاندن..میدیا جەماوەرییەکان و گەشەسەندنی ئابووری)، مەکتەبی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ك)، ٢٠١٠.
- (کلتوورو کۆمەلگە) مەکتەبی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ك)، ٢٠١١.
- (مۆزاییکی خۆشەویستیو مردن)، ڕۆمان، لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کورد، ٢٠١٢.
- (کلتوورو کۆمەلگە، تیۆرو ڕەهەندەکان)، یانەی (قەڵەم)، ٢٠١٢.
- (فەلسەفەی شارستانی)، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری (هەنار)، وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان، ٢٠١٢.
- (فیزیای جەستە)، مایرهۆڵد و شانۆی جووڵە و ڕیتم،

لێکۆڵینەوەی شانۆیی، بە هاوبەشی لەگەڵ کامەران سوبحان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٣.
- (ئاوێنەو دەمامەك)، کۆ چیرۆك، لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کورد، ٢٠١٣.
- (میتۆدێك بۆ فێربوونی ئیسلام)، ٢٠١٣.
- (گەشتی تیشك)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، نووسینی عەبدولرەحمان مونیف، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری (هەنار)، وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان- ٢٠١٣.
- (تێنسی ولیامز ئاراستە نوێیەکانی شانۆی هاوچەرخ)، هاوبەش لەگەڵ کامەران سوبحان.
- (ژیان و خۆشەویستی)، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیریی بازیان بە بۆنەی رۆژی خۆشەویستییەوە.
- (ئینسایکلۆپیدیای زانیاری).
- (منداڵی و گەنجێتی، چەمکی پەروەدەو گرفتی نامۆبوون).
- (دونیای چەمکەکان).
- (بنەماکانی سەرکردایەتی، نیلسۆن ماندێلا وەك نموونە).
- (بنەماکانی ژیانێکی سەرکەوتوو).

*** (عەبدوڵڵا مەحموود عومەر):-**

- ناوی (مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەحموود کوڕی عومەر کوڕی عوسمان)ە.
- زانایەکی ئایینی بووەو کتێبێکی داناوە بە ناوی (شرح رسالة الوضع) لە ساڵی (١٩٠٢).

*** (عەبدوڵڵا مەزهەر ساڵەیی):-**

- ناوی (عەبدوڵڵا مەزهەر کوڕی لەتیف بەگی ساڵەیی)یە.
- ساڵی (١٨٨١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٣٠) کۆچی دوایی کردووە.

*** عەبدولهادی سالح سەعید:-**

- ناسراو بە دکتۆر هادی.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٧)ی شاری کەرکوك.
- قۆناغەکانی خوێندنی لە کەرکوك بڕیوەو دواجاریش پەیمانگای پزیشکیی کەرکوکی تەواو کردووە.
- مێژووی پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کەرکوکی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە بۆ ساڵی (١٩٨٠) دەگەڕێتەوە. پاش دوو ساڵ پەیوەندیی بەتیپی ٢١ی کەرکوکەوە کردو ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد. لەو ماوەیەدا هەم وەك پزیشك ئەرکەکانی لەناو هێزی پێشمەرگەو ناوچە لادێ نشینەکاندا بەجێ گەیاند هەم وەك پێشمەرگە.
- لە تیپی ٢١ی کەرکوك کرایە فەرماندەی مەفرەزەو دواتر هەر بەو پلەیە بۆ تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان گوێزرایەوە. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی بەشێکی زۆری چالاکییەکانی هەردوو تیپی کردووە.
- ساڵی (١٩٨٧) لە شاڵاوێکی گرتنی کەسوکاری پێشمەرگەدا لەناو شاری کەرکوك، دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێمی بەعس باوکی و حەوت برایان گرت و لە ڕۆژی گرتنیانەوە تا ئێستا بێ سەروشوێنن.
- لە ٢٢ی ئازاری ساڵی (١٩٨٨) لە ئەنجامی هێرشی کیمیایی فڕۆکەکانی ڕژێمی بەعس، لە گوندی شاناخسێی ناوچەی شارباژێر لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا شەهید بوو.

*** (عەبدوڵڵا محەمەد - مەلا سەید عەبدوڵڵا محەمەد):-**

- ناوی (مەلا سەید عەبدوڵڵای کوڕی سەید محەمەد ئەمینی پیر خدری شاهۆ)یە.
- ساڵی (١٩١٧) لە گوندی (بەردە زەرد)ی ناوچەی موکریان لەدایکبووە.
- ماوەیەکی زۆر زانستەکانی ئایینی لە پێنجوێن و سلێمانی و بانی خێڵان و ناوچەی گەرمیان خوێندووە، لەلای (مەلا قادری سۆفی) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.
- یەکەم کەس بووە کچەکەی خۆی ناوەتە بەر خوێندن لە حوجرەی مزگەوت تا بۆ ئەوەی خەڵکی چاوی لێ بکەن بۆ ناردنی منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە.
- ساڵی (١٩٦٠) ماڵی دەچێتە کفری و دبێتە مەلا مزگەوتی (حاجی رەشید).
- ساڵی (١٩٦٦) دەچێتە بەغداو لە مزگەوتی (دار السلام) دادەمەزرێت.
- یەکێك بووە لەوانەی دەستی شیعر نووسینی هەبووەو شیعرێکی زۆری فەوتاوە.
- لە (٢٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٦) لە کفری کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەبدوڵڵای کوڕی نەجمەددین صابری - شێخ عەبدوڵڵای کوڕی نەجمەددین صابری):-**

- ناوی (عەبدوڵڵا کوڕی نەجمەددین کوڕی شێخ عەبدولرەحمان کوڕی شێخ مەحموود قوتبی شۆڕیجە)یە.
- ساڵی (١٩٤٠) لە دێی شۆڕیجە لە ناوچەی قەرە حەسەن لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی وناوەندی ودواناوەندی لە شاری کەرکوك تەواو کردووە، لەبەر ئەوەی بە پلەی یەکەمی شاری کەرکوك دەردەچێت دەوڵەت لەسەر ئەرکی خۆی لە ساڵی (١٩٥٩) دەینێرێتە دەرەوە بە (بعثة جامعية) بۆ (لەندن) بە مەبەستی خوێندنی (ئەندازیاری نەوت) کە (١١) ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە.
- ساڵی (١٩٧٠) دەگەڕێتەوە بۆ وڵات ونیشتمانی خۆی لە کەرکوك.
- چەند ووتارێکی بەهێزی دەربارەی ڕێزمان و ووتەی کوردی بڵاوکردووەتەوە لە گۆڤاری (گزنگ) کە یەکێتی نووسەرانی کورد لە کەرکوك دەریان دەکرد، هەروەها بەشداری کۆڕەکانی یەکێتی نووسەرانی کردووە لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندی دەکات بە شۆڕشەوە لە بەشی ئینگلیزی لە ئێزگەی کوردستان کار دەکات.
- ساڵی (١٩٧٥) دەچێتە دەرەوە بۆ ئێران پاش ساڵێك پەنابەری بۆ دەردەچێت لە وولاتی (نەمسا) هەر لەوێ (ماجیستێر) وەردەگرێت لە زمانی ئینگلیزی بەشی (ترجمە) تا ئێستاش مامۆستایە لە زانکۆی شاری (گراز) لە نەمسا بەیەکەم وەرگێری (عەرەبی بۆ نەمساوی) دادەنرێت.
- کۆمەڵێك شیعری بڵاونەکراوەی هەیە.

*** ( عەبدولمەجید لوتفی ):-**

- ناوی تەواوی (عەبدولمەجید عومەر عەبدولرەحمان)ەو لە سەرەتای ژیانی ئەدەبیدا بە ناوی (عەبدولمەجید عومەر) وتارو بەرهەمەکانی بڵاودەکردەوە ودواجار نازناوی (لوتفی) ی بۆخۆی هەڵبژارد تاکو کەسایەتییەکی سەر بە خۆی هەبێت دوور لە نازناوی خێزانەکەی کە هەندێ لە خزمەکانی بەو نازناوە دەیاننووسی وەك چیرۆکنووس (زید خلوصی) ی کوڕی دکتۆر (صفاء خلوصي) برازایو (ناطق خلوصی) خوشکەزای شاعیری وێنەکێش دکتۆر (صدی خلوصی) کچەزای برا گەورەکەی. وێنەکێش (حنان خلوصی) کچەزای خوشکەکەی.
- (عەبدولمەجید لوتفی) ساڵ (١٩٠٥) لە شاری خانەقین لەدایکبووە وبە منداڵی لەلای مەلا دەستی بە خوێندن کردووە پاشان دەچێت بۆ بەغداو ساڵی (١٩٣٢) قوتابخانەی پیشەسازی بەشی میکانیك لەوێ تەواو دەکات، ماوەیەك لە میناى (بەسرە) کار دەکات وپاش ئەمەش لە کۆمپانیای نەوت لە شاری کەرکوك کاردەکات.
- ساڵی (١٩٣٤) بووەتە فەرمانبەر لە قەزای (لەیلان)ی شاری کەرکوك، لەم کارە بەردەوام بووە تا خانەنشین کراوە، پاشان لە (لەیلان)ی کەرکوکەوە چووە بۆ بەغداو لە ساڵی (١٩٣٨) لە وەزارەتی دارایی کاری کردووە وتا گەیشتۆتە پلەی سەرۆکی چاودێران.
- لە (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٢) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووەو لەسەر خواستی خۆی لە (باوە مەحموود) نێژراوە.
- (عەبدولمەجید لوتفی) بێجگە لەوەی خاوەنی چەندین کتێب ووتارە هەروەها کاری رۆژنامە نووسیشی لە گۆڤاری (قرندل)کە خاوەنەکەی (صادق الازدی)یەو (الزهراء) کە خاوەنەکەی (مەحموود شوکت) بوو کردووەو هەروەها لە رۆژنامەی (الهاتف)یش کە خاوەنەکەی (جعفر الخلیلی) بوو ووتاری بڵاوکردووەتەوە.
- کاتێ چیرۆكو هۆنراوەکانی دەخوێنیتەوە هەست بەوە دەکەیت کە بایەخێکی زۆری بە ئافرەت دابێت، لە چیرۆکەکانیدا ئافرەت لە بابەتە هەرە گرنگ کانێتی، کە بایەخی پێدابوو، ئەم بایەخدانەش پێوەندبوو بە گیروگرفتەکانی جیابوونەوەو زۆری ژن هێنانو خیانەتی هاوسەرێتی..
- کتێبە چاپکراوەکانی بریتییە لە:-

(اصداء الزمن-١٩٣٨)، (قلب الام -١٩٤٠) (خاتمة موسيقا ١٩٤١) (نظرات في الأدب المشاركة-١٩٤٨)، (عفيفة ١٩٥٣)، (في الطريق ١٩٥٨)، (انشودة تموز ١٩٥٩)، (عيد في البيت ١٩٦١)، (الجذرة والريح ١٩٦٩)، (الرجال تبكي بصمت ١٩٦٩)، (تصابي الكلمات ١٩٧١)، (الخطا في العد التنازلي)، (ضجة النهار) ١٩٧١) (خمسة ايام في مدريد ١٩٧٢)، (مسؤولية الاديب الكردي الكبرى، جريدة التاخي ١٩٧٢)، (المتنبي شاعر الفكر العربي ١٩٧٧)، (فتحة اخرى للشمس ١٩٨٠)، (خليج المرجان ١٩٨٤) (من هموم المضايق ١٩٨٤) (اللغة الكردية الموحدة ١٩٨٤)، (توقعات حفيدة العجوز ١٩٨٩).

*** ( عەبدولمەجید یەعقوبی ):-**

- ناوی (عەبدولمەجید کوڕی عومەر کوڕی ئەحمەد یەعقوبی) یە.
- ساڵی (١٨٨٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە (١٥)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨) بووەتە بەڕێوەبەری شارەوانی کەرکوك.
- لە ئایاری ساڵی (١٩٢٤) بووەتە موتەسرفی لیوای کەرکوك.
- لە (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٢) لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە.

*** ( عەبدولمەلیك عەباس ):-**

- ساڵی (١٩٢٦) لە گەڕەکی چای لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٦) نووسینگەی (الخط العربي) لە شەقامی (ئەتڵەس) لە نزیك (سوق العصري) کردووەتەوەو بەردەوام بووە تاکو ساڵی (١٩٧٩).
- یەکێکە لە خەتخۆشە بە ناوبانگەکانی کەرکوکە.
- لە (٢)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٧) لە نزیك قەبری ڕەشید کولەڕەزا بە خاك سپێردراوە.

*** ( عەبدولوتەلیب حەمود محمەمد جبووری ):-**

- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسو ماجستێری لەزانستی سەربازی بەدەستهێناوە.
- پلەی سەرۆکی فیرقەی هەبووە لەسووپای عێراقیو سەرۆکی ئەکادیمیای سەربازی بووە.
- چەند جارێك گیراوەو بۆماوەی ٥ ساڵ حوکم دراوە بەتاوانی رووخاندنی رژێمی بەعس.
- جێگری سەرۆکی وەزیران بووە لە ساڵی (٢٠٠٥).

*** عەبدلوهاب ئیسماعیل:-**

- لە دایکبووی شاری کەرکوکە (١٩٥٤).
- دەرچووی پەیمانگەی تەکنیکیی بەغدایە، بەشی بیناسازی.
- بە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی لە کاری رۆژنامەنووسی بەردەوامە وێرای بڵاوکردنەوەی کاریکاتێرەکانی لە رۆژنامەو گۆڤارەکان.
- دوو پێشانگەی تایبەتی کاریکاتێری کردۆتەوە.
- پێشانگای سێیەمی لە٢١ی نیسانی ساڵی ٢٠١٦ کردووەتەوە.

*** ( عەبدولوەهاب تاڵەبانی ):-**

- ناوی (عەبدولوەهاب محەمەد عەزیز تاڵەبانی)یە.
- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (پێکەنینی خۆر)، وەرگێرانە، بەغدا، ١٩٧٩.
- (پیرەمێرد)، ١٩٨٥.

شێخ عەبدولوەهاب تاڵەبانی

- (حكايات عن الجبل وأيامنا العراقية الجميلة)، بەغدا، ١٩٨٦.

* (عەبدولوەهاب داقوقی):-

- ساڵی (١٩٤٢) لە داقوق لەدایکبووە.
- لە بواری رۆژنامەگەریو فلکلۆردا کاری کردووە.
- بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی:
- (دليل العمل الميداني للمؤلفات الشعبية)، بەغدا، ١٩٧٤.
- (قصائد ملحمية لناظم حكمت)، بەیروت، ١٩٨٠.
- (کۆمەڵێك چیرۆك)، یەشار کەماڵ، وەرگێڕان، ١٩٨٠.

* (عەبدولوەهاب قەڵایی):-

- ساڵی (١٨٤٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی ئایینی لەژێر دەستی باوکی (مەلا مەحموود کوڕی مەلا محەمەد) وەرگرتووە.
- ساڵی (١٨٧٥) دامەزراوە بە نووسەری دارایی لە یەکێك لە بانکەکانی کەرکوك.
- ساڵی (١٨٩٢) بووە بە بەڕێوەبەری تاپۆ لە موسڵ لە دواییدا گوازراوەتەوە بۆ بەڕێوەبەری تاپۆ لە بەغدا.
- ساڵی (١٩١٢)دا کۆچی دوایی کردووە.

* عەبدولوەهاب محەمەد ئەمین مەحموود ساڵەیی:-

- ساڵی ١٩١٦ لە گوندی یارمجەی کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی زانستی ئایینی و بڕوانامەی لە وەزارەتی ئەوقاف وەرگرتووە و خوێندنی لە زانکۆی ئەزهەر تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٤٣ وەکو ئیمامی سەربازی دامەزراوە.
- ساڵی ١٩٦٩ خانەنشین کراوە.
- ساڵی ١٩٩٢ کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولواحید فەهمی مەحاکی):-

- ساڵی (١٩٢٢)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- رۆژنامەنووسو راگەیاندنکارو نووسەرو چیرۆکنووسێکی کەرکوك بووەو گەڵێك لێکۆڵینەوەو بابەتی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتی نووسیووە.

* (عەبدولواحید گۆزەچی):-

- ساڵی (١٩٢٥) لە گەرەکی موسەڵڵا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٢) لەلایەن کۆمپانیای نەوتی کەرکوکەوە نێردراوە بۆ بەریتانیا بۆ بەشداری کردنی لە رادیۆی لەندەن (BBC)، لەوێ گەلێك مەقامی عەرەبیو تورکی وتووە.
- ساڵی (١٩٥٤-١٩٦٨) کۆمەڵێك گۆرانی بۆ رادیۆی (بەغدا) تۆمار کردووە.
- ساڵی (١٩٥٦) کۆمەڵێك لە گۆرانییەکانی لەسەر قەوان لە تورکیا تۆمار کردووە.
- ساڵی (١٩٦٦) کتێبێکی بە چاپ گەیاندووە دەربارەی ژیانو رێڕەوی هونەری خۆی لە کەرکوك بە ناونیشانی (خوريات واغاني گۆزەچی اوغلو) کە لەلایەن خۆیەوە نووسینو ئاوازی بۆ کراوە.
- لە (٢٩)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەبدولواحیدی نوری-ع. و. نوری):-

- ساڵی (١٩٠٣) یان لە ساڵی (١٩٠٤ لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- لە قوتابخانەکانی سلێمانیو کەرکوك خوێندنی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٢٧) پەیمانگای پەروەردەی تەواو کردووە.
- شاعیرو نووسەرێکی دیموکراتی پێشکەوتن خوازو مامۆستایەکی پەروەردەی پێشکەوتووبووە.
- ساڵی (١٩٤٤) لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.
- گەلێك بەرهەمو لێکۆڵینەوەی هەیە:
- (ئاغا ئۆغلو ئەحمەد).
- (لە وڵاتی ئادەمیزادە سەربەرزەکاندا)، چاپخانەی سریان، بەغدا، ١٩٣٩.
- (بەرەو رووناکی)، بەغدا، ١٩٤٢.
- (پیرۆزی مندال،چاپخانەی ژیان)، سلێمانی، ١٩٤٠.
- (دوانێك لە پەیرەوی میللییەوە)، بەغدا ١٩٤٢.
- (لە رێگەی سەرکەوتنی ئینسانا)، بەغدا، ١٩٤٣.

* (عەبدین کاکەیی):-

- ساڵی (١٩٥٣) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی پەیمانگای نەوتی لەبەغدا تەواو کردووە.
- ماوەیەك کارمەند بووە لەکۆمپانیای نەوتی بەسرە.
- هەر لە ساڵی (١٩٦٣)وە خولیای هونەری وێنەکێشانی هەبووە.
- هەریەکە لە مامۆستایان: نورەددین عیزەتو محەمەد عیزەت خەتات کاریگەریان لەسەری هەبووە.

- بابەتەکانی بەگشتی بریتییە لەکلاسیکی، تەعبیری، هێلکاری.

* (عەتا تەرزی باشی):-

- ساڵی (١٩٢٤) لە گەرەکی بولاق لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٠) لە کۆلێژی یاسا دەرچووەو لەو بوارەدا کاری کردووە.
- گەلێك لێکۆڵینەوەی هەیە بە زمانی تورکیو عەرەبی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (شرقی وتورکلیر)، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەغدا، ١٩٥٣.
- (تعلیقات علی التعلیقات الوافیة للدکتور صلاح الدین ناهي)، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەغدا، ١٩٥٤.
- (کرکوك خویراتلری وماعنیلری)، سێ بەرگی لێ چاپ کراوە لە ساڵانی ١٩٥٥، ١٩٥٦، ١٩٥٧.
- (Turk Irak Dostlugunun isigi altinda Irak Turkleri)، چاپخانەی (اسیا)، ئەستەمبوڵ، ١٩٥٦.
- (کرکوك هوالری)، دوو بەرگی لێ چاپ کراوە لە ساڵانی ١٩٦١، ١٩٨٠، ١٩٨٩، ١٩٩١.
- (کرکوك اسکیلر سوزی)، چاپخانەی (زمان)، بەغدا، ١٩٦٢.
- (کرکوك شاعرلری)، نۆ بەرگ لە ساڵانی ١٩٦٣، ١٩٦٨، ١٩٨٨، ٢٠٠٠، ٢٠٠١.
- (ارزی قمبر)، دە بەرگی لێ چاپ کراوە لە ساڵانی ١٩٦٤، ١٩٦٧، ١٩٧١، ١٩٩٩، ٢٠٠١، ٢٠٠٢.
- (Irak Turlmenleri arasinda yagmur duasi torenleri ve sosyolojik degeri)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دەس)، ئەنقەرە، ١٩٧٦.
- (کرکوك هوالری وماعنیلری)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، بەرگی یەکەم ١٩٩٠، بەرگی دووەم ١٩٩١.
- (کرکوك مطبوعات تأریخی)، چاپخانەی (بیلکی سیار)، بەشی یەکەم، کەرکوك، ٢٠٠١، بەشی دووەم، چاپخانەی (بیلکی سایار)، کەرکوك، ٢٠٠١.
- لە یەکی نیسانی ساڵی ٢٠١٦ کۆچی دوایی کردووە.

* (عەتا تاڵەبانی):-

- ناوی (عەتا کوڕی شێخ جەماڵ تاڵەبانی)یە.
- ساڵی (١٩٢٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتاییو ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- لە (٤)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە.
- شاعیرو کەسایەتییەکی نیشتمانی دیار بووەو لە شانە سەرەتاییەکانی حیزبی (هیوا) ئەندام بووە.
- ماوەیك دەچێتە ناو حیزبی (شیوعی) عێراقەوەو لە ساڵی (١٩٥٤) بەند دەکرێتو ساڵی (١٩٦١) دووردەخرێت بۆ حیللە.
- لەهەمان ساڵ بەرپرس بووە لە لیژنەی قەزای کفری حیزبی شیوعی عێراقی.
- دوای کودەتاکەی شوباتی ساڵی (١٩٦٣)، پەیوەندی کردووە بەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و لە ساڵی (١٩٦٧). گەڕاوەتەوە بۆ گوندەکەی لە (زەرداو).
- ساڵی (١٩٧٢) بووەتە سەرۆکی شارەوانی قەزای کفری
- ساڵی (١٩٨١) لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە گیراوە.
- ڕۆژی (٤ی) مایس ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە.
- ساڵی (١٩٩٢) خۆی هەڵبژاردرد بۆ ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:

- (عندما يتكلم الارقام-موضوعات حول مفاوضات الجبهة الكردستانية مع الحكومية العراقية عام ١٩٩١)، سلێمانی، ٢٠٠٠.

* (عەتا سەبری):-

- ناوی (عەتا سەبری حەسەن سامی)یە.
- ساڵی (١٩١٣) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە بەغدا تەواو کردووەو (دار المعلمين)ی تەواو کردووە.
- خوێندنی لە ئیتاڵیا لەنێوان ساڵانی (١٩٣٧-١٩٤٠) خوێندووەو لەبەر شەڕی جیهانی هاتووەتەوە بەغداو لە دوایدا چووەتە لەندەنو ماوەی چوار ساڵی خوێندوویەتیو بووەتە مامۆستا لە پەیمانگای هونەر جوانەکان.
- یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (أصدقاء الفن) لە ساڵی (١٩٤١).
- زۆری ژیانی لە دەرەوەی کەرکوک بەسەر بردووە.
- ساڵی (١٩٥٠) دیپلۆماسی لەلەندەن وەردەگرێتو لە ساڵی (١٩٥١) بەشداری لەدامەزراندنی (جماعة بغداد للفن الحديث) دەکات، هەروەها لە (٢٧)ی تشرینی دووەم تا (٣)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٥) لەگەڵ نیگارکێشێکی بەریتانی (ئار، ڕۆس تۆماس) بەسەفەرێکی هونەری، بۆ ڕەسمکردنی دیمەنەکانی کوردستان، دێنە کوردستان، پاشان بەرهەمەکانی ئەم سەفەرەیان دەکەنە پێشانگایەکو لەهۆڵی (المدرسة التأسيسية) لەسەعدون لەبەغدا پیشانی دەدەن، عەتا سەبری وەك دەزانین دەیان تابلۆی لەبارەی کوردو دیمەنەکانی کوردستانەوە هەیە.
- ساڵی (١٩٨٧) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەتیە شاوار ئەحمەد محەمەد):-

- ساڵی (١٩١٧) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٢) کۆچی دوایی کردووە.
- حیکایەت خوانو قسەزان بووە، پیاوێکی کەڵەمێردی ناو هۆزەکەی بووە لە دەڤەری کاکەییان.

* (عەدالەت عەبدوڵڵا):-

- ناوی (عەدالەت عەبدوڵڵا محەمەد)ە.
- ساڵی ١٩٧٧ لە شارۆچکەی کەلار لەدایکبووە.
- ساڵی ٢٠١٣-٢٠١٤ بەکالۆریۆسی لە بەشی ڕاگەیاندن لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی ٢٠١٥-٢٠١٦ ماستەری لە بواری ڕادیۆ و تەلەفزیۆن لە وڵاتی لوبنان بەدەستهێناوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- گە رمیان و گەرمیانییەکان، ١٩٩٩.
- لە پێناوی ئاشتی دواڕۆژدا، ٢٠٠١
- (تیرۆرزمو مافی مرۆڤ)، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- (نحن وعراق الأمس واليوم-تاملات فكرية وهموم سياسية)، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- تیرۆریزم و جیهانی ئەمڕۆ، ٢٠٠٨
- کورد و عێراق و چەند پرسێکی فیکری و سیاسی، د. شاکر نابلسی، وەرگێران.
- یەکێتی لە سەردەمی قەیران و بەرەنگاریدا، ٢٠١٠.

- دیدی فەلسەفییانەی، عەلی حەرب، وەرگێران، ٢٠١٠.
- جیهانی میدیا ڕۆژنامەگەری، ٢٠١٣.
- ڕۆشنبیری و دەسەڵات، ٢٠١٥.
- الكورد، الحالة العراقية، والآخر العربي، ٢٠١٦.
- ساڵانی ١٩٩٩-٢٠٠٣ بەرپرسی ڕۆژنامەی (الاتحاد) بووە لە نووسینگەی کەرکوك.
- ساڵی ٢٠٠٧- ٢٠١٣ ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری دەزگای واڵا بووە بۆ ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوە.
- ساڵی ٢٠٠٦-٢٠٠٩ بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بووە.
- جێگری سەرنووسەری گۆڤاری بانەڕۆژ، المستقبل بووە
- دەستەی نووسەرانی گۆڤاری حەمرین و ئەنفال بووە.
- ساڵی ٢٠٠٧ خەڵاتی بنکەی گەلاوێژیی وەرگرتووە بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری.
- بەشداری کۆنفرانسی پاریسی کردووە، بە ناونیشانی (عن الحالة العراقية والقضية الكوردية).
- بەشداری کۆنفرانسی عەمانی کردووە بە ناونیشانی (حول دور الإعلام في المصالحة الوطنية).
- بەشداری کۆنفرانسی قاهیرەی کردووە بە ناونیشانی (حول الربيع العربي).
- بەشداری کۆنفرانسی بەیروتی کردووە بە ناونیشانی (التحديات السياسية والإجتماعية والإقتصادية للشرق الأوسط).

* (عەدنان باباجان):-

- یەکێ بووە لە شێوەکارانی کەرکوکو، زانیاریمان دەربارەی ژیانی هونەری نییە.

* (عەدنان فەرهاد):-

- شاعیرەو دیوانێکی شیعری هەیە بە زمانی عەرەبی بە ناونیشانی (لهيب الغضب).
- لە بنەرەتدا لە خێزانی فەرهادن کە ئەمانە لە بنەچەدا کوردنو دامەزرێنەری مزگەوتی (فەرهاد)ن کە بە مزگەوتی

منارە نەخشینە بە ناوبانگە لە بازاڕی گەورە.

*** ( عەدنان قوتب ):-**

- ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠١٠) کۆچی دوایی کردووە.
- نووسەرو ئەدیبو ڕۆژنامەگەر بووەو کتێبێکی چیرۆکی هەیە بە ناونیشانی (آماڵ)، ٢٠١٠
- بەڕێوەبەری نووسین بووە لە گۆڤاری (الهلال الأحمر)و گۆڤاری (دمت).

*** ( عەدنان محەمەد حوسێن کاکەیی ):-**

- ساڵی (١٩٨٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای تەکنیکی کەرکوك بەشی ئەندازیاری شارستانی بووە.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری لە یەکەمین فیستیڤاڵی هونەری کەرکوك کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری لە پێشانگای هاوبەشی خۆشنووسانی کەرکوك کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٦) خەڵاتی دووەمی لە پێشبڕکێی (قەڵاو منارە) بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٩) خەڵاتی یەکەمی لەسەر ئاستی کوردستان بەدەستهێناوە لە پێشبڕکێی نۆیەمی خۆشنووسی بە ناوی خۆشنووس (شەهید حاجی زەهاوی) لە شاری هەولێر.
- ساڵی (٢٠٠٩) خەڵاتی یەکەمی لە خەتی جەلی دیوانی بەدەستهێناوە لە پێشبڕکێی (خالید زامدار) لە شاری سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠١)و ساڵی (٢٠٠٧) لە پێشبڕکێی (ئەرسیکا) لە شاری ئەستەمبولی تورکیا بەشداری کردووەو بڕوانامەی ڕێزلێنانی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری لە پێشبڕکێی (بوردە) لە شاری دوبەی پایتەختی ئیمارات کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) بەشداری لە پێشبڕکێی خۆشنووسی لە وڵاتی سووریا کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٨) بەشداری لە پێشبڕکێی (نبي الرحمة) لە وڵاتی مەغرب کردووە.

*** ( عەدنان محەمەد قادر ):-**

- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك کە لەنێوان ساڵانی حەفتاکانو هەشتاکاندا جێ پەنجەی دیارە.
- ساڵی (١٩٧٩) یەکەم پێشانگای تایبەتی کردووەتەوە.

*** ( عەزەدین فارس ):-**

- ناوی (عەزەدین فارس حەسەن خاتوون)ە.
- ساڵی (١٩٢٦) لە گوندی عەلیانی سەر بە ناوچەی زەنگەنە لەدایکبووە.
- شیعرەکانی زیاتر دڵداریو کۆمەڵایەتیو جوانی سروشت بوونە، بەڵام سەرجەم دیوانە شیعرییەکانی لە سەردەمی حەرەس قەومییەکانی بەعسدا بە ماڵەکەیەوە دەستووتێنرێت.

- ساڵی (١٩٥٧) ماڵی دەچێتە کفری.
- ساڵی (١٩٦٢) دەبێتە پێشمەرگەی ئەیلول.
- لە (١٨)ی تەمموزی ساڵی (١٩٨٤) بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کردووە.

*** عەزیز ئاغای زەنگەنە :-**

عەزیز کوری محەمەد کوری ڕۆستەم ئاغای زەنگەنە ساڵی (١٩١٢) لە دایك بووە، ڕۆستەم ئاغای باپیری لەگەڵ زاڵە ئاغادا، ساڵی (١٨١٢) لە شەری نێوان فەرمانرەوای بابانو عوسمانیەکاندا بەدیلی دەکەونە دەست سوپای عوسمانی و لە شاری موسڵ شەهیدیان دەکەن، پیاوێکی قسەخۆشو قسە لە ڕوو بووە، کەسایەتییەکی دیاری شاری کفری بووە ساڵی (١٩٩٢) کۆچی دوای کردووە.

*** ( عەزیز پشتیوان ):-**

- ناوی (عەبدولعەزیز نور محەمەدی یارەوەیسی جاف نەورۆڵەی)یە.
- لە ڕۆژی (١٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٩١٢) لە ئاوایی (پیران) هاتووەتە دنیا.
- لە پێنج ساڵییەوە لەگەڵ دایكو باوکیدا لە زێدوماڵی هەڵکەندراونو هاتوونەتە ئاوایی (سەوز بلاخ) ی ناوچەی خانەقی، پاش سێ ساڵ هاتووەتە خانەقی لە گەڕەکی (کۆردەرە)، قوتابخانەی سەرەتایی لەوێ تەواو کردووەو لە ساڵی (١٩٢٨)دا بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەکەی خۆی.
- ساڵانی (١٩٣٤-١٩٣٧) لە قوتابخانە (الفالحية) لە پارێزگای (عمارة) مامۆستا بووە ئینجا گوازراوەتە قوتابخانەی (قوڵە)ی خانەقین هەروەها یەکێك بووە لە ئەندامەکانی هیوا چالاکی جۆراوجۆری کردووە لە ناوچەی

(گەرمیان).
– لە پێش (هیوا)دا ڕێکخراویەکی ناوچەییان هەبووە لە خانەقی و کفری بەناوی (برایەتی وپشتیوان)، پاش ئەمانی هیوا هاتووەتە ریزی پارتیەوە. هەر لە ئەنجامی هوشیاری سیاسی و هەستی کوردایەتی، لەگەڵ چەند تێکۆشەرێکی دیکەی وەك (مستەفا شەوقی، ئەمین ڕەواندوزی، میر حاج ئەحمەد) دەورێکی گەورەی بووە لە دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیەدا، بۆیە لەو کاتەوە نازناوی پشتیوانی هەڵگرتووە.
– ساڵانی (١٩٦٧ – ١٩٦٩) بەرپرسی لقی (٥)ی پارتی بووە، لە مانگی ئابی ساڵی (١٩٦٩) دەگیرێ و لە (قصر النهایە) زیندانی دەکرێ تا دوای ساڵی (١٩٧٠) بەهۆی ڕێککەوتنی (١١)ی ئادارەوە ئازاد دەکرێ و درێژەی بە خەباتی سیاسی دەدا.
– لە (٧)ی ئابی ساڵی (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.

* (عەزیز زەینەڵ - مەلا عەزیز زەینەڵ):-

– ناوی (مەلا عەزیز کوڕی مەلا زەینەڵ کوڕی مەلا حوسێن)ە، کە بەناوبانگ بووە بە (تۆپاڵ مەلا عەزین).
– ساڵی (١٨٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ماوەیەك دامەزراوە بە مامۆستا لە مزگەوتی (شێخ جەرجیس) و مزگەوتی (منارە نەخشینە) و وانەی زانستی ئایینی ووتووەتەوە.
– ساڵی (١٩٥٠) کۆچی دوایی کردووە و لە مزگەوتی (شێخ جەرجیس) نێژراوە.

* (عەزیز سامی وەنداوی):-

– ساڵی (١٨٩٣) لە کەرکوك دایك بووە.
– خوێندنی لە (دار المعلمین)ینی لە ئەستەمبوڵ تەواو کردووەو ماوەیەك مامۆستا بووە لەوێ و لە دواییدا گەراوەتەوە بۆ عێراق و لە بواری پەروەردادا کاری کردووە.
– ساڵی (١٩٢٣)دا لە وەزارەتی پەروەردە کاری کردووە.
– لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٣٧)دا بووەتە بەڕێوەبەری معارفی کەرکوك.
– دیوانێکی شیعری چاپنەکراوی بە جێ ماوە.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (خریطة العراق)، ئەستەمبوڵ.
– (ملهمات)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (قدر)، ئەستەمبوڵ، ١٩٢٠.
– (الجغرافیة الاولیة)، چاپی یەکەم چاپخانەی (دار السلام)، بەغدا، ١٩٢٨، چاپی دووەم چاپخانەی (الشعب)، بەغدا، ١٩٣٠.
– (جغرافیة العراق الحدیثة)، بغداد، ١٩٢٩.
– (رحلة إلى القمر)، وەرگێران بۆ عەرەبی، بەغدا، ١٩٢٩.
– (آسیا)، چاپخانەی (الشعب)، بغداد، ١٩٣٠.
– (قارتا افریقیة واوقیانووسیا)، چاپخانەی (دنکور)، بغداد، ١٩٣١.
– (تضحیة معلم)، وەرگێران لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (دنکور)، بەغدا، ١٩٣٤، چاپی دووەم ناونیشانی کتێبەکەی گۆڕی بۆ (المجنون)، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەغدا، ١٩٥٥.
– (في بلاد الزنبقة البیضاء)، وەرگێران لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، چاپخانەی (الجزیرة)، بەغدا، ١٩٣٦.
– (الجغرافیة المتوسطة الحدیثة)، بەرگی یەکەم چاپخانەی (الاهالي)، بەغدا، ١٩٣٨، بەرگی دووەم چاپخانەی (الشعب)، بەغدا، ١٩٣٨.
– (الجغرافیة الاولیة الحدیثة الرابعة الابتدائیة)، چاپخانەی (الشعب)، بەغدا، ١٩٣٨.
– (الجغرافیة الاولیة الحدیثة للصفوف الخامسة الابتدائیة)، چاپخانەی (الشعب)، بەغدا، ١٩٣٨.
– (دنیا الباسفیك)، چاپخانەی (الرشید)، بەغدا، ١٩٤٧.
– (الجغرافیة الاولیة الحدیثة للصفوف الثالثة الابتدائیة)، چاپخانەی (بغداد)، بەغدا، ١٩٥٠.
– (عروس الخلیج.. الكویت)، چاپخانەی (العربیة)، بەغدا، ١٩٥١.
– (حریة الوجدان)، وەرگێران لە تورکییە بۆ عەرەبی، چاپخانەی (الرابطة)، بەغدا، ١٩٥٥.
– (الخطاط البغدادي علي بن هلال المشهور بابن البواب)، وەرگێران، چاپخانەی (المجمع العلمي العراقي)، بەغدا، ١٩٥٨.
– (التانجو الأخیر انشودة العیون السود)، وەرگێران لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، چاپخانەی (شفیق)، بەغدا، ١٩٦٧.
– لە (١٩)ی تەمموزی (١٩٨٤) کۆچی دوایی کردووە.

* عەزیز قادر سەمانچی:-

– ساڵی ١٩٣٣ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– بەرهەمەکانی:-
– التأریخ السیاسي لترکمان العراق، ٢٠٠٥
– نزلاء الفندق العتیق.
– قطار المعارضة العراقیة من بیروت إلى بغداد، ٢٠٠٩.

* ( عەلاوەدین- مەلای لەیلان ):-

– یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکان.
– لە بەشێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژە بە ناوی هاتووە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* ( عەلی ئەفەندی ):-

– یەکێکە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك، لەسەردەمی سوڵتان مەحموود.
– باوکی (ئەسعەد نائیب)ی شاعیرو زانای ئایینە.

* ( عەلی ئەفەندی - مەلا عەلی ئەفەندی ):-

– ناوی (مەلا عەلی ئەفەندی حوسامی کەرکوکی کوڕی مەلا ئەبو بەکر ئەفەندی)یە، کە بەناوبانگە بە (گچکە مەلا).
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:–
– (سراج الطالبین)، بە زمانی فارسی، لە ساڵی (١٨٩٧) نووسیویێتی و لە ساڵی (١٩٠٤) لە کەرکوك بە چاپی گەیاندووە.
– مەلا عەلی بە کوردیو فارسی شیعری وتووە.

* ( عەلی ئەفەندی کەرکوکی-ظلمي ):-

– بنەڕەتی ناوی (عەلی کوڕی حاجی حەسەن کەرکوکی)یەو نازناوی شیعری (ظلمي)یە.
– لەسەردەمی والی (داوود پاشا)دا ژیاوەو گەلێکی شیعرو پەخشانی بە زمانی عەرەبی بڵاوکردووەتەوە.
– یەکێکە لە زاناو نووسەرەکانی کەرکوك بووە.

* ( عەلی بەرزنجی ):-

– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (سەمای شیعرو ڕەهێڵەی خۆشەویستی)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠١.
– (گورگ)، چیرۆك، وەرگێڕان، هاوبەش، کەرکوك، ٢٠٠٥.
– (گەڵا ڕژاوەکان)، گابریل مارکیز، ڕۆمان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، کەرکوك، ٢٠٠٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٦.
– (قطوف من الشعر الكردي الحديث)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
– (بیرەوەری سۆزانییە خەمبارەکانم)، ڕۆمان، مارکیز، وەرگێڕان، هاوبەش، کەرکوك، ٢٠٠٧.
– (الصّل، الحية الصفراء)، وەرگێڕانە، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧.
– (بنیاتی زمانی شیعری)، جان کۆهین، وەرگێڕان، هاوبەش، کەرکوك، ٢٠٠٨.
– (غمرات على مشارف التلال–للقاص محمد سعيد زنكنه)، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٨.
– (الصّل، الحية الصفراء)، وەرگێڕانە، چاپی دووەم، ٢٠١٤.
– (شوێنەواری خوێنەکەت لەسەر بەفرەکەدایە)، چیرۆك، وەرگێڕان، بەهاوبەشی لەگەڵ خالید مەجید فەتحوڵڵا، کەرکوك.

* عەلی بەگ:-

عەلی سەلیم ئەحمەد سەلیم ناسراو بە عەلی سەلیم بەگ ساڵی (١٩١٨) لە دایك بووە لە ئاوایی حەمە سەلیم نزیك خورماڵ، کە ئێستا ئەو دێیە بە (دێ کۆن) ناسراوە عەلی بەگ بەمنداڵی کەوتووەتە کەلار، کەسێکی وریاو ژیر بووە.
– ساڵی (١٩٤١) پەیوەندی کردووە بە حیزبی هیوای کوردستانەوە تا دواکۆنگرەی هیوا، پاشان دەبێتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان.
– ساڵی (١٩٦١) لەگەڵ یەکەم دەستەی پێشمەرگایەتی شۆڕشی ئەیلول چەکی پێشمەرگایەتی هەڵدەگرێ. یەکەم مەخفەری پۆلیسی عێراقی لە گۆڕە شەلە دەگرن، لەناو شۆڕشدا چەندین بەرپرسیارێتی بڕیوەو گەیشتووەتە فەرماندەی هێزی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە شەڕەکانی ناوچەی گەرمیان ڕۆڵی گرنگی هەبووە، بەهۆی نزیکی لە بەڕێز مام جەلال لە شۆڕشی نوێدا پەیوەندی کردووە بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە.
– ساڵی (١٩٨٩) لە بەردەم ماڵەکەی خۆیدا لە کەلار شەهیدی دەکەنو لە گۆڕستانی کەلاری کۆن بە خاك سپێراوە.

* ( عەلی بەستێ ):-

– ساڵی (١٩٠٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٦٣) کۆچی دوایی کردووە.
– یەکێك بووە لە پیاوە ناودارەکانی کەرکوك کە دەورێکی گەورەی بینی لە ڕووداوەکەی هێزی (لیڤی) بۆ سەر گەرماوی ژنان لە ساڵی (١٩٢٤–١٩٢٥)، کە ڕۆڵێکی سەرەکی بەرگری هەبووە لەگەل کۆمەڵێکی تردا.

* ( عەلی پاشا تات ):-

– لە (١٥٩١) والی کەرکوك بووە تاکو (١٥٩٥) لە دوای خۆی (داود پاشا) بووەتە والی.

*** (شێخ عەلی تاڵەبانی - شێخ عەلی گەورە):-**

- ناوی (شێخ عەلی گەورە کوڕی شێخ عەبدولرحمانی خالس)ە.
- ساڵی (١٨٣٢)ی زاینیی لە دێی (قرخ) لەدایکبووە.
- سەرەتا لەلای باوکی فێری خوێندنی ئاینیی بووە. لە دواییدا بە گەلێك لە شارەکانی کوردستاندا گەراوە بۆ خوێندن، لە (کۆیە) لەلای (مەلا ئەسعەدی جەلیزادە) خوێندوویەتی.
- ماوەیەك لە مزگەوتی (بلاغ)ی نزیك بە تەکیەی تاڵەبانی لەلای (مەلا سەید محەمەد) لەگەل (شێخ عومەری گەنجی)دا خەریکی سلووکی تەسەوف بووە، تا لەژێر چاودێری باوکی گەیشتووەتە پلەی خیلافەت، بۆیە کاتێ باوکی کۆچی دوایی کردووە، زانایەکی شارەزاو مورشیدێکی بەتوانا بووە.
- (شێخ عەلی) ئەدیبێکی بەرزو شاعیرێکی باڵادەست بووە، بەڵام بەداخەوە شیعرەکانی کۆنەکراونەتەوە. لە پارچە شیعرێکی بە بۆنەی کوشتنی (شێخ سەعید حەفید) لە شاری موسل بە زمانی فارسی باس لە شێوەی شەهیدکردنەکەی دەکات.
- (شێخ عەلی) لە ئیرشادا جێگایەکی گەورەی گرتووە لە هەموو کوردستان‌و لە دەرەوەی کوردستاندا، بەشی زۆری مەلا بەناوبانگەکانی کەرکوك، وەك (مەلا ناسیح)و (مەلا رەزای واعین)و (مەلا مەحموودی مەزناوە)و (مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی) خەلیفەو هاوکاری بوون. (مەلای رەزای واعین) لە پەیتێکدا، کە لەسەر دەرگای مەزارەکەی لەسەر مەرمەر هەڵکەندراوە، ووتوویەتی: (شیخ علي كان قطب زمانە)، لەوێدا ساڵی کۆچکردنی بە حەرفی ئەبجەدی دیاری کراوە، کە دەکاتە ساڵی (١٣٢٦)ی کۆچی.
- (شێخ عەلی گەورە) سێ برای هەبووە، دوانیان شاعیری گەورە بوون: (شێخ عەبدلقادر) کە نازناوی شیعری (فاین) بووە، شیعرەکانی هەموو لە مەیدانی عیرفان‌و تەسەوفدا بوون، لەگەل (شێخ رەزای) کەڵە شاعیری بەناوبانگی کورد، برای سێیەمی (شێخ عەبدولواحید) بووە کە شێخی ئیرشاد بووە).
- لە ساڵی (١٩٠٨)ی زاینیی کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەلی تاهیر بەرزنجی):-**

- ساڵی (١٩٥٧) لە (سەنگاو) لەدایکبووە.
- سەرەتایی لە (حەفتەغار)و ناوەندی لە (خورماتوو)و ئامادەیی لە (سلێمانی) تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٨) کۆلێژی زمانی کوردی لە زانکۆی سەلاحەددین تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٢) ماستەری لە زمانی کوردی لە زانکۆی سلێمانی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٨) دکتۆرای لە زمان‌و ئەدەبی کوردی لە زانکۆی سلێمانی بەدەستهێناوە.
- بە زمانی کوردی‌و عەرەبی دەستنووسێت.
- بەرهەمەکانی:
- (رۆڵی بزووتنەوەی رووانگە لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا)، ٢٠١٠.

- (بوونیاتگەری لە رەخنەی کوردیدا)، ٢٠١١.
- ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی.

*** عەلی تەپەلوو:-**

- لە گوندی تەپەلووی قەرەحەسەن لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٤ بووە بە پێشمەرگە لە کەرتی چواری جەباری.
- ساڵی ١٩٨٧ کراوە بە فەرماندەی مەفرەزە، ساڵی ١٩٨٨ بووە بە فەرماندەی کەرتی پارتیزانی دوای ئەنفال.
- لە کاتی راپەرینی کەرکوك لە گەرەکی راپەرین شەهید کراوە.

*** (عەلی جەباری - مەلا عەلی جەباری):-**

- ناوی (عەلی عەبدولرەحمان مەحموود)ە.
- لە ساڵی (١٩١٧) لە دێی (گۆلەمە)ی جەباری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٦) فەرمانی دامەزراندنی قوتابخانەیەکی فەرمی لە گوندەکەی وەردەگرێت وئەم قوتابخانەیە تا (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨) بەردەوام دەبێت.
- ساڵی (١٩٦٠) هاتووەتە کەرکوك.
- شارەزای هەبووە لە زمانی کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی‌و تورکیدا.
- دەستنووسێکی بەجێماوە بەناوی (گوڵستان).
- لە (٣١)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٧) بە نەخۆشی شەکرە کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەلی جەلەمۆردی - مەلا عەلی جەلەمۆردی):-**

- لە دێی جەلەمۆرد لەدایکبووە.
- مەلا بووە لە مزگەوتی (فەرهاد) لە کەرکوك.
- گەشتی کردووە بۆ هەورامان‌و لەلای شێخ عوسمانی سەراجەددین ماوەتەوە.
- بە دەستی یەکێك لە مەریدەکانی کوژراوە لە ساڵی (١٨٥٣) لە هەمان مزگەوت نێژراوە.

*** عەلی حوسێن حەسەن:-**

- ناسراو بە شوانەی تەنسیق. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٦) ی گەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك. هەر سێ قۆناغی خوێندنی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- لەسەرەتای ساڵانی حەفتاکاندا، کاتێك خوێندکاری قۆناغی خوێندنی ناوەندی بوو، پەیوەندیی بەلقی کەرکوکی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە کردو بووە لێپرسراوی بەشی رۆشنبیری.
- ساڵی (١٩٧٤) لە کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی لاوانی کوردستان بە ئەندامی سکرتاریەت هەڵبژێردراو پاشان لێپرسراوەتیی لقی کەرکوکی پێ سپێردرا.
- ساڵی (١٩٧٤)، لەگەڵ دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کوردو ڕژێمی عێراقدا، پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کرد. پاش هەرەسهێنان شۆڕش. گەڕایەوە بۆ کەرکوك و درێژەی بە خوێندن دا.
- مێژووی پەیوەندی کردنی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە دیار نیە، بەڵام دەشێ ئەم پەیوەندییە بۆ ساڵی (١٩٧٥) بگەڕێتەوە.
- ساڵی (١٩٧٦) لەبەشی بیناسازیی کۆلیژی ئەندازیاریی زانکۆی سلێمانی وەرگیرا.
- ساڵی (١٩٨٠) هەر کە خوێندنی تەواو کرد، پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە هەرێمی ٢ی کەرکوك ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد. بۆ ساڵی دواتر، کرایە ڕابەری سیاسیی هەرێمەکە.
- ساڵی (١٩٨٢) کرایە لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە تیپەکانی ٢١ی کەرکوك و ٢٥ی خاڵخاڵان و لە هەمان کاتدا لێپرسراوەتیی سەرجەم هێڵ و شانە و ڕایەڵەکانی ڕێکخستنەکانی ناو کەرکوك و چەمچەماڵی گرتە ئەستۆ.
- ساڵی (١٩٨٤) دوا بەدوای دەستپێکردنی وتووێژ لەنێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ڕژێمی عێراق، کرایە نوێنەری یەکێتیی لە لیژنەی هەماهەنگیی نێوان یەکێتی و ڕژێمی عێراق لە کەرکوك.
- پاش ناکامیی وتووێژ، گەڕایەوە سەر ئەرکی پێشوی وەك لێپرسراوی ڕێکخستنەکان.
- لە ١٥ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٧) لەگەڵ دوو پێشمەرگەی هاوڕێی بەناوی جمهور مستەفاو نەوزاد عوسمانەوە، لەناوچەی ئاغجەلەر کەوتنە بۆسەی جاشەکان و هەرسێکیان شەهید بوون.
- ساڵی (٢٠١٢) ناوەندی مێژووی سەر بەمەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە دوتوێی نامیلکەیەکدا بەناونیشانی (پێشکەشە بە بەڕێز دایکی ڕەوا) نۆزدە نامەی لەو نامانە بڵاوکردەوە کە لە ماوەی نێوان حوزەیرانی ١٩٨٢ و ئایاری ١٩٨٥ بۆ خێزانەکەی خۆی ناردبوو.

*** (عەلی حەسەن شەوی):-**

- ناوی (عەلی کوڕی حەسەن) نازناوی (شەوی)یە.

- یەکێکە لەوانەی کە کتێبی (العقد الجوهري) مەولانا خالیدی نەقشبەندی وەرگێڕاوە لەگەڵ نووسینی حاشیەی پێویست بۆ ئەو کتێبە.

*** (عەلی حیکمەت ئەفەندی سیامەسووری-مەلا عەلی سیامەنسووری):-**

- ناوی (مەلا عەلی ئەفەندی)یە کوڕی حاجی (عەبدولوەهاب) ە کە خەڵکی دێی (سیامەنسوور)ە.
- حاجی وەهاب لە سیامەنسوورییەکانی ئاوایی سیامەنسووری ناوچەی قەرەحەسەن بوو، بە بنەماڵە دەوڵەمەندو خاوەن زەوی و زارو مەڕو ماڵات بوون، بەڵام خۆی چونکە لەگەڵ بەگەکانی خۆیاندا نێوانی ساردبوو باری کردبووە کەرکوك و بووبوو بە بازرگانی ڕۆن و خوری، لە ئاوایشا مێگەل و جووت و کشی هەبوو، عەلی کوڕی لە کەرکوك لە ساڵانی (١٨٥٨) لەدایکبووە، لە ماڵ بە شێوەی سیامەسووری (گۆرانی) قسەیان کردووە.
- کە فراژی بوو، بووە قوتابی لای مەلا حەمیدی بلاغ ووردە کتێبەکانی خوێندو بووە فەقێ و زۆر شاری کوردستان گەڕا.
- سەر ئەنجام چووە کۆیەو لای زانای بە ناوبانگ (مەلا عەبدوڵڵا جەلی زادە) خوێندی و ئیجازەی وەرگرت وگەڕایەوە کەرکوك لە مزگەوتی (حاجی ئەحمەد ئاغا) بوو بە ئیمام وخەتیب و مدرس، حاجی ئەحمەد ئاغا کوڕی وولاتی پشدەر بوو، لە کەرکوك بازرگانی توتن بوو ئەم حاجی ئەحمەد ئاغایە مزگەوتێك لە کەرکوك دروست دەکات مەلا عەلی دەکاتە مەلای مزگەوتەکە.
- لە نووسراوەکانی:
- (شرح المطالع).
- (شرح المواقف).
- (شرح التجريد).
- ماوەیەك مامۆستا بووە لە مزگەوتی (ئۆلو جامیع)و (تەکیەی تاڵەبانی)و (مزگەوتی سەی ئەحمەد خانەقا).
- لە (٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەلی خاڵس - شێخ عەلی خاڵس):-**

- ناوی (شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی) یە.
- ساڵی (١٨٣٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی لەلای سەید محەمەد لە گەڕەکی بلاخ لە دێی تەکیە تەواو کردووە.
- ماوەیەك چووەتە هەورامان و کۆیەو ئینجا گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوك.
- ساڵی (١٩١١) کۆچی دوایی کردووەو لە تەکیە نێژراوە.

*** (عەلی خانەقا - شێخ عەلی خانەقا):-**

- (شێخ عەلی کوڕی شێخ عوبێد کوڕی شێخ عومەری خانەقا کوڕی شێخ حوسێن کوڕی شێخ قادری سوور کوڕی شێخ ئەحمەدی سەردار بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکووك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك

تەواو کردووە، پیاوێکی رۆشنبیرو خوێندەوارو قسەزان و زمان پاراو خۆش مەشرەب و گاڵتەچی بووە، هەروەها مرۆڤێکی چاونەترس و ئازاو جوامێرو خاوەن هەڵوێست بووە، زمانی عەرەبی و تورکی زۆر بەباشی دەزانێ، سەرەرای زمانی دایکی کە کوردییە.

– (مەئموور ماڵ) بووە لە قەزای دووبز و ناحیەی ئاڵتون کۆپری.

*** عەلی دێوانە :-**

– عەلی محەمەد عەزیز ناسروا بە عەلی دێوانە، ساڵی (١٩٢٩) لە شاری کفری لە دایك بووە، کاری بەرگ دووری کردووەبەگەنجێتی لە رێگەی (مەلا سایر سەڵتەزرد)ەوە پەیوەندی دەکات بە (حیزبی هیوا)وە ئەندامێکی چالاکی ئەو حیزبە بووە، پاشان دەبێت ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان.

– ساڵی (١٩٦١) لەلایەن رژێمی عەبدولکەریم قاسم دەگیرێ راپێچی زیندانی کەرکووك دەکرێ.

– ساڵی (١٩٦٢) لە زیندان ئازاد دەبێت و دەبێتە پێشمەرگە، یەکێك بووە لە کادرە چالاکەکانی پارتی لە ناوچەی گەرمیان، پیاوێکی قسە خۆش و رووح سووك و خۆشەویست بووە دەنگ و ئاوازی خۆش بووە مەقامی کوردی زانیووە لە سەرەمەرگدا وەسێت بۆ حاجی خورشید سوەیل کە یەکێك بووە لە هاورێ نزیکەکانی دەکات (لەپاش مەرگی گەر کوردستان ئازاد)کرا بچێتە سەر گۆرەکەی و بڵێت: (عەلی دێوانە کوردستان رزگار بوو).

– ساڵی (١٩٨٩) مام عەلی دێوانە لە شاری کفری کۆچی دوای دەکات لە گۆرستانی باوە شاسوار بە خاکی دەسپێرن.

*** (عەلی دەروێش ):-**

– ساڵی (١٩٦٦)دا لەشاری کەرکوك لەدایکبووە.

– بەشداری زۆربەی پێشانگای قوتابخانەکانی کردووە.

– بۆ ماوەی سێ ساڵ لەپەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ هونەری خوێندووە.

– یەکەمین پێشانگای تایبەتی لە ساڵی (١٩٨٥)دا لە هۆڵی تەنمیم بۆ هونەری نوێ کردوویتەوە.

– دووەم پێشانگای لە ساڵی (١٩٨٦)دا کردووەتەوە.

– سێ یەم پێشانگای لە ساڵی (١٩٨٧)دا کردووەتەوە.

– ساڵی (١٩٨٨)دا بەشداری لەپێشانگای هاوبەش کرد لەگەڵ هونەرمەندانی کەرکوك و سلێمانی و هەولێر.

– ساڵی (١٩٨٨)دا بەشداری لەپێشانگایەکی هاوبەش کرد لەگەڵ هونەرمەندانی دهۆك و زاخۆ.

– ساڵی (١٩٩٤)دا بەشداری لەپێشانگایەکی هاوبەش کرد لەپەیمانگای هونەری کەرکوك.

– ساڵی (١٩٩٦)دا پێشانگای تایبەتی پێنجەمی کردەوە.

– ساڵی (١٩٩٦)دا لەگەڵ هونەرمەندان ئەحمەد زەردەشت و نزار بەزاز لەپێشانگایەکی هاوبەش لەبەغدا.

– ساڵی (١٩٩٨)دا بەشداری لەپێشانگایەکی هاوبەش کرد لەگەڵ هونەرمەند عەبدولرەحمان جۆڵا لەکەرکوك.

– ساڵی (٢٠٠٣) پێشانگای خۆی کردەوە لەکۆمەڵەی رووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك.

– لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٤-(٢٠٠٨)) گەلێك پێشانگای لە کەرکوك کردووەتەوە.

– ساڵی (٢٠٠٦) کتێبێکی بە ناونیشانی (نامیلکەی کاریکاتێری) لە هەولێر بە چاپ گەیاندووە.

– ساڵی (٢٠١٣) پێشانگای تایبەتی خۆی کردەوە لە ناوەندی (محەمەد ئەمین عەسری) لە کەرکوك.

*** (عەلی زەنگەنە ):-**

– ساڵی (١٩٥٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.

– سەرەتایی و ناوەندی لەم شارە تەواو کردووە.

– خانەی مامۆستایانی سلێمانی تەواوی کردووە.

– بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٧٣) بەشداری لە کاری هونەریدا کردووە.

*** عەلی رۆبیتان قادر داودی:-**

– ساڵی ١٩٣٢ لە خورماتوو لەدایکبووە.

– ساڵی ١٩٥٧ کۆلیژی سەربازی لە بەغدا تەواو کردووە لە

خولی ٣٣ بە ناونیشانی تۆپ هاوێژ.
- ماوەیەك (مدیر تجنید كركوك) بووە.
- سالی ١٩٨٠ خانەنشین کراوە.

* ( عەلی زالیاوەیی - مەلا عەلی زالیاوەیی ):-

- ناوی (شێخ مەلا عەلی مەلا فەقێ کەریم کوری کوێخا شاسوار محەمەد خانی زەنگەنە)یە، دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی (میر سمایلی) فەرمانڕەوای زەنگەنە.
- ساڵی (١٨٩٠) لە دێی (زالیا) لە ناحیەی سەنگاو لەدایکبووە.
- شاعیرو خەتخۆش و گەلێك شیعری ئایینی لێ بە جێماوەو لەلای مەلا محەمەد زالیاوەیی خوێندنی تەواو کردووە.
- گەلێکی کتێبی ئایینی وەرگێراوەتەوە سەر زمانی کوردی و شارەزایی هەبووە لە زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی.
- بەرهەمە وەرگێراوەکانی:
- (تنبية الغافلين).
- (قصص الأنبياء).
- (تفسير الأحلام)ی ئیبن سیرین.
- ساڵی (١٩٧٠) کۆچی دوایی کردووە.

* ( عەلی ساڵح پەری عەبدوڵلا-مەلا عەلی حافز ):-

- ساڵی (١٨٩٢) لە گوندی قەڵغانلو سەر بە قەزای خورماتوو لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٥) هاتووەتە کەرکوك و بووەتە قورئان خوێن لە مزگەوتی قیردار.
- ساڵی (١٩٦٢) کۆچی دوایی کردووە.

* ( عەلی سنجەر - مەلا عەلی سنجەر ):-

- ساڵی (١٩١٧) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٧) کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێکە لە شاعیرە کلاسیکییەکان و لە کەرکوك و سلێمانی ژیاوە.

* ( عەلی شاکەلی-غالب ):-

- (شێخ عەلی کوری مەحموود کوری شێخ سەعیدە ڕووتەڵەی شاکەڵ)ە.
- ساڵی (١٩٠٨) لە کەلار لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٨) کۆچی دوایی کردووە.
- لە ژیانی ڕۆژانەیدا گۆشەگیر بوو، لە خواترس و قانع بوو نانی ئەمڕۆی بوایە گوێی لە سبەێنی نەبوو، بەتەنگ تەرپۆش و تەرخۆری دنیاوە نەهاتووە.
- شاعیرمان شێخ عەلی شاکەل (غالب) ڕێرەوی نەقشی گرتبوو جار بە جارێك ئەچووە خزمەت شێخانی نەقشبەندی ولە (بیارە) ماوەیەك ئەمایەوە.
- نازناوی شیعری (غالب) بووە لە نووسینەوەی شیعرەکانیدا.
- تەنها سێ شیعری لە پاش بەجێماوە لە کەشکۆڵی (شاکەل) کۆکردنەوەی (شێخ سلێمان شاکەلی) نووسراونەتەوە.

* ( عەلی شاکیر عەلی - دکتۆر عەلی شاکیر عەلی ):-

- ساڵی (١٩٥١) لە دێی (بەشیر) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (تاريخ العراق في العهد العثماني ١٦٣٨-١٧٥٠م/ ١٠٤٨-١١٦٤ هـ، دراسة في احوال السياسة)، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی بەغدا، ١٩٧٦.
- (ولاية الموصل في القرن السادس عشر، دراسة في اوضاعها السياسية والادارية والاقتصادية)، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی موسل، ١٩٩٢.

* ( عەلی سدیق ):-

- ساڵی (١٩٦٣) لە گەڕەکی (بەرتەکێ) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٢) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواو دەکات.
- ساڵانی هەشتاکان لەگەڵ هونەرمەند (فەلاح عومەر) دوو پێشانگای تایبەتی لە کەرکوك و سلێمانی دەکەونەوە.
- لە هەندەرانیش لە چوار پێشانگای هاوبەش لەگەڵ هونەرمەندانی ئەورووپا بەشدار بووە.

* ( عەلی شوکر بەیاتی ):-

- ناوی (عەلی شوکر عومەر خەلیل بەیاتی)یە.
- ساڵی (١٩٣٨) لە قۆریە لەدایکبووە.
- ئەدیب و نووسەرو پارێزەرە.
- بەرهەمەکانی:

- (رذاذ الصدا) شیعر، چاپخانەی (الجمهورية)، کەرکوك، ١٩٦٩.
- (شعراء من كركوك)، کەرکوك، ٢٠٠١.
- (النزوح الثالث)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (تراتيل سومرية)، کەرکوك، ٢٠٠٣

* (عەلی عەزیز):-

- ناوی تەواوی (عەلی عەزیز محەمەد ئەمین)ە.
- لە (١)ی تەمموزی ساڵی (١٩٤٧) لە شاری کەرکوك لە گەرەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا لە ساڵی (١٩٦٢)دا بۆ یەکەم جار مامۆستای خواڵێخۆشبوو (ئەنوەر تایەر) دەیبات بۆ ئێسگەی کوردی بەغدا لەوێ گۆرانی (بۆ ئەو یارە لێم زیزە) تۆمار دەکات.
- هەروەها ئەندامی تیپی سۆڵاڤ بوو لەنێوان ساڵانی (١٩٦٨-١٩٧٠).
- عەلی عەزیز پتر لە (٢٥) گۆرانی تۆمار کردووە لەوانە:-
- (لێم زیزە)، (ڕووناك)، (من ونەسرین)،(بەچکە شێر)، (نەورۆز).
- عەلی عەزیز لە (٢٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستانی ئیمام قاسم بەخاك سپێردرا.

* (عەلی عەسکەری):-

- ساڵی (١٩٣٥) لە گوندی عەسکەری سەر بە شارۆچکەی ئاغجەلەری قەڵاسێوکە لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە (عەسکەر) و ناوەندیی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- لە کۆلیژی ئەندازیاری لە زانستگای موسڵ وەرگیراوە، بەڵام لە سەر بڕیاری پارتیو لە بەر خەباتو کوردایەتی نەچووەتە زانکۆ.
- بەرەچەڵەك دەچێتەوە سەر گرووپی ئایینیی هەقە. مامی، شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، شێخی تەریقەتی هەقە بوو. لە بنەماڵەیەکی کوردپەروەرە. باوکی شێخ عەبدوڵڵا عەسکەری، یەکێك لەلایەنگرانی شێخ مەحموود بوو لەکاتی تێکۆشانیدا بۆ وەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی کورد.

- لە سەرەتای پەنجاکاندا کە خوێندکار بوو لە کەرکوك، پەیوەندیی بە یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە کردو دواتر بەهۆی هەڵسووڕانو چالاکییەکانییەوە، بوو بە ئەندامی کۆمیتەی باڵای هەردوو ڕێکخراوی قوتابیانو لاوان.
- دوای ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتیو دامەزراندنی ڕژێمی کۆمار لە عێراق لە ساڵی (١٩٥٨)، بووە ئەندامی لیژنەی ناوچەی کەرکوکی پارتی.
- ساڵی (١٩٥٩) لە کۆنگرەی چوارەمی پارتی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا، بە ئەندامی لیژنەی باڵای چاودێریو پشکنین هەڵبژێردراو لە کۆنگرەی پێنجەمدا کە ساڵی دواتر لە بەغدا بەسترا، بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا.
- لەم سەروبەندەدا، کاتێك بارزان کەوتە بەر هێرشی خێڵە نەیارەکانی دەوروپشتی، مەکتەبی سیاسی بۆ بادینانی نارد بۆ پێکهێنانی هێزێکی چەکدار بۆ پاراستنی بارزان لە هێرشی خێڵە نەیارەکانو لەم ڕووەوە هەماهەنگیی لەگەڵ هەر یەك لە شێخ ئەحمەد بارزانیو مەلا مستەفا بارزانی کرد. لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١) دا، لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی مایەوەو ڕۆڵێکی کارای لەڕێکخستنی هێزەکاندا گێڕا.
- ساڵی (١٩٦٢) گەڕایەوە ناوچەی سلێمانیو بووە فەرماندەی هێزی خەبات کە هەلسووڕانی پێشمەرگانەی زۆربەی سنووری پارێزگای سلێمانیی دەگرتەوە.
- لە قەیرانی ساڵی (١٩٦٤)ی سەرکردایەتیی پارتیدا، لەگەڵ

باڵی مەکتەبی سیاسی مایەوە. پاش هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان هەردوو باڵی ناو پارتیو کۆتایی هاتنی شەڕەکانی ماوەت بەقازانجی باڵی بارزانی، لەگەڵ ئەندامەکانی تری مەکتەبی سیاسیدا کشانەوە بۆ ئێرانو تا ساڵی (١٩٦٦) لەوێ مایەوە. پاش گەڕانەوەی لە ئێران، هیچ لێپرسراوێتییەکی پێ نەسپێردراو وەك دەستبەسەر لە دۆڵە ڕەقە دانرا.
- دوای ئەوەی کە هەستی کرد هەڕەشەی لەناوبردنی لەسەرە. خۆیو چەند ئەندامێکی تری مەکتەبی سیاسی

گەرانەوە بۆ شارەکان‌و پێکەوە کەوتنە ڕێکخستنەوەی پارتی‌و بەرەزامەندیی حکومەتی عێراق هێزی چەکداریان پێکهێنا.

- سالی (١٩٧٠) ڕۆلێکی کارای لە ئاشتبوونەوەی هەردوو بالدا گێراو لەدوایین کۆنگرەی بالی مەکتەبی سیاسیی پارتیشدا لە بەغدا، ڕۆلێکی کاریگەری لە تێکەلکردنەوەی هەردوو بالدا گێرا. دوا بەدوای ئەمە، بەبێ وەرگرتنی هیچ لێپرسراوەتییەك لە چۆمان دانیشت.

- سالی (١٩٧٤) پاش زیادبوونی فشاری سوپای عێراق لەسەر ناوچەکانی نزیك بارەگای سەرکردایەتیی پارتی لە حاجی ئۆمەران، لێپرسراوێتی پاراستنی ناوچەکەی پێ سپێردراو هێزێکی گەورەی خرایە بەر دەست.

- لە هەلومەرجی راگەیاندنی پەیمانی جەزائیر لەنێوان عێراق‌و ئێران لە ٦ی ئازادی سالی (١٩٧٥)، لە کۆبوونەوەی کادیرو فەرماندەکانی پێشمەرگەدا داوای خۆ بەدەستەوە نەدان‌و بەرگریی کرد، بەلام گوێی لێ نەگیراو کۆتایی بە شۆڕش هێنرا.

- پاش هەرەسهێنانی شۆڕش، بەشدار بوو لە کۆبوونەوەی کادیرە سیاسی‌و عەسکەرییەکانی شۆڕش لە شاری ورمێ کە ئامانجەکەی تاوتوێکردنی بارودۆخی پاش هەرەسهێنانی شۆڕش بوو. کۆبوونەوەکە ژیانی ئاوارەیی ڕەتکردەوەو جەختی کردە سەر گەرانەوە بۆ عێراق‌و کارکردن بۆ دروستکردنی حیزب‌و دەستپێکردنەوەی چالاکیی سیاسی.

- بەلام هەر کە گەرایەوە بۆ عێراق، حکومەتی عێراق بلاوەی پێکردن‌و بەسەر شارەکانی ناوەراست‌و باشووری عێراقدا دابەشی کردن.

- هەر ئەو سالە لەگەل یەك لە سالح یوسفی، خالید سەعید، رەسول مامەند، تاهیر عەلی والی، سەعدی عەزیز، عومەر مستەفا، عەلی هەژار، کاردۆ گەلالی‌و ناسیح محەمەد رەحیم، بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستانیان پێکهێنا‌و کەوتنە خۆ ئامادەکردن بۆ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار. لەئەیلولدا لە رێی فەرەیدون عەبدولقادرەوە پەیوەندیی لەگەل تالەبانی دامەزراند کە ئەوسا لە سووریا کاروباری قۆناغی پاش هەرەسهێنانی شۆڕشی ڕێکدەخستەوە. لەو بوارەدا ڕۆلێکی کارای هەبوو لەکردنی بزووتنەوە بەبالێکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

- سالی (١٩٧٦) بەشداریی لە پێکهێنانی دەستە چەکدارەکاندا کردو خۆیشی چوو بۆ شاخ، لێپرسراوەتیی فەرماندەی گشتیی هێزی پێشمەرگەی گرتە ئەستۆو خۆی یەکەم بەلاغی عەسکەریی شۆڕشی نووسی.

- سالی (١٩٧٧)، لە کۆبوونەوەکانی ٣١ی ئاب - ١٢ی ئەیلول کە لە ناوچەی برادۆست بەستران، بووە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی. لە مانگی تشرینی دووەمداو پاش ئەوەی کە حکومەتی عێراق پێشنیاری وتووێژی کرد، کۆمیتەی سەرکردایەتی بریاری ناردنی دا بۆ بەغدا بۆ وتووێژ لەگەل حکومەتدا. لە لۆلانەوە بەهەلیکۆپتەرێکی سوپای عێراق گوێزرایەوە بۆ کەرکوك‌و لەوێشەوە چوو بۆ بەغدا. لەوێ سێ ڕۆژ مایەوەو لەوتووێژیدا لەگەل سەددام حوسێنی جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش، داوای ڕاگرتنی پرۆژەی ڕاگواستنی گوندەکان‌و زیندووکردنەوەی بەیاننامەی (١١ی ئازاری سالی ١٩٧٠)ی کرد، بەلام سەددام داواکانی ڕەت کردەوەو لە ئاکامدا وتووێژەکە سەری نەگرت.

- لە گەرانەوەی مەلا مستەفای بارزانیدا لە یەکێتی سۆڤیەت، عەلی عەسکەری نوێنەرو لێپرسراوی قوتابیانی کەرکوك بووە، وتاری پێشکەش کردووە، ناونیشان وتارەکەی (گول وگوللە) بووە، بارزانی لەوێ ناسیوویەتی‌و لێی پرسیووە کوری کێی.

- لە کەرکوك بێمنەت کوردایەتی خۆی دەرخستووە، بەگژ بەرێوەبەرو داپلۆسێنەرو دوژمنانی کورددا چووە، پارێزگاری لە کەرامەتی کورد کردووە، لەسەر ژمێرییەکەی سالی (١٩٥٧) لە کەرکوك لە پاکمال‌و ڕێژەی کورد دا ڕۆلی بووە، بۆ ئاهەنگی نەورۆزی سالی (١٩٥٣) خوێندکارە کوردەکانی بانگهێشت کردووە بۆ گۆیتەپە.

- سالی ١٩٥٩ ژنی هێناوە، لە ڕۆژی شایی‌و ژن گواستنەوە لەسەر سیاسەت‌و کوردایەتی گیراوە، لەبەر هەژموون‌و هیمەتی کوردایەتی نارنجۆکێکیان فرێداوەتە مالەکەی لە گەرەکی ئیمام قاسم خانووە بەکرێیەکەی لێ رووخاوە، نۆبەرەی لە کەرکوك خوا پێیداوە بە ناوی (شۆڕشگێڕ) کە زیاتر بە (شۆڕش) ناودەبرێ.

- لە کۆنگرەی چوارەی پ.د.ك لەو تێکۆ شەرانە بووە مۆلەتی رەسمی پارتییان وەرگرتووە، کراوە بە لێپسراوای لقی بادینان.

- چەند ئەفسەری بەرشەق‌و زللەداوە لە ناو کەرکوك و نەیهێشتووە غەدر لە کورد بکەن لەشەردا هەلۆو لە ئاشتیدا کۆتری سپی بووە، لە هاورێیەتیدا بەوەفا، دۆستخواز لە گفتوگۆدا، دەم بەخەندە، لە هەلوێستدا جوامێر وبێمنەتبووە، لەگەل تێکەل بوونەوە لەگەل پارتی، مەلا مستەفای بارزانی پێیووتووە (عەلی بویتە مۆنتی گۆمری) کە جەنەرالێکی سوپای بەریتانیا بووە، عەلی عەسکەری گوتوویەتی ڕۆملی کوردستانم.

- عەلی عەسکەر کە دەگەرێتەوە عێراق دەکرێ بە سەرۆکی شارەوانی رەفاعی.

- سالی (١٩٧٦) شۆڕشی نوێ هەلدەگرسێتەوە، بۆ یەکەمجار لە (٦)ی ئابی سالی (١٩٧٦) لە گوندی هەلەدن بریاری دروستکردنەوەی بزووتنەوەی سۆشیالیست راگەیەنێ، دەستەی دامەزرێنەرو رابەرو شۆڕش هەلگیرسێنەرو سوارچاکی شۆڕشی نوێ بووە، لەیەکەم کۆبوونەوە بووەتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك)و فەرماندەی (هـ.پ.ك)،یەکەم بەلاغی عەسکەری نووسیووە.

- سالی (١٩٧٧) بە نوێنەرایەتی (ی.ن.ك) بە بەرگی کوردییەوە چووەتە (بەغدا) بۆ دانووستاندن لەگەل حکومەتی عێراق نەگەیشتوونەتە ئەنجام بە (سەدام حوسێن)ی گوتووە: (هەر لەو شاخە دەبین تا مافمان دەستێنین تاقاق قیامەت شەرتان دەکەین).

- بەهاری سالی (١٩٧٨) بەهێزێکی گەورەوە لەناوچەی قەلادزێوە بەرەو برادۆست چوو بۆ دانانی بارەگای مەکتەبی سیاسی لە برادۆست‌و وەرگرتنی وەجبەیەکی گەورەی چەك کە نیاز وابوو لە سووریاوە، بەناو خاکی تورکیادا، بگاتە دەست هێزی پێشمەرگە. ئەو هێزە لەناوچەی هەکاری لە تورکیا تووشی کێشەیەکی زۆر بوو، لە حوزەیراندا چەکدارە خێلەکییەکانی ناوچەکە هێزەکەیان لە توپەت کردو ژمارەیەکی زۆریان لێ بەدیل گرتن، لەوانە عەلی عەسکەری. دیلەکان رادەستی سەرکردایەتیی کاتیی پارتیی دیموکراتی کوردستان کران. هەر ئەو سالە خۆی‌و حوسێن بابە شێخ‌و خالید سەعید لەیەك ڕۆژدا لەناو بران.

وللاب تزويج البكر صغيرة وكبيرة بغير اذنها منهاج لكن
قال الشيخ ابن حجر في شرح هذا المتن ويشترط لصحة ذلك كفاءة
الزوج ويساره بمهر المثل على المعتمد كما بينته
في شرح الارشاد انتهى ما هو المقصود هذا حكمه في مذهبنا وفي
مذهب الحنفي والا يخفى على من له ادنى معرفة بمذهب الحنفي انه لا ينفذ
عقد الولي على البالغة بغير رضاها

تزويج بغير اذنها شرواني

دەستنووسێکی مەلا عەلی حیکمەت

*** (عەلی مەلا فەتاح):-**

- ساڵی (١٨٥٣) لە دێی بانگۆل لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شاعیرە ونبووەکانی شاری کەرکوک.
- ساڵی (١٨٨٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەلی فەتحوڵڵا - مەلا عەلی فەتحوڵڵا):-**

- ساڵی (١٩١٢) لە دێی (زالوای) سەر بە شارۆچکەی قادر کەرەم لەدایکبووە.
- هەر لە تەمەنی دە ساڵییەوە دەخرێتە بەر خوێندن و خوێندنی ئایینی لای مەلا محەمەد ئەمین مەلا عەبدوڵڵا دەخوێنێت، دواتر دەچێتە تەکیەی شێخ عەبدولکەریم لە قادر کەرەم، دواتر دەچێتە مزگەوتی منارە نەخشلی لەلای مەلا ناسیح ئەفەندی مۆڵەتی زانستی ئایینی وەردەگرێت.
- ساڵی (١٩٣٩) لە قەڵای کەرکوک دەبێتە پێشنوێژو وتار خوێنی مزگەوتی (حەسەن مەکی) نۆ ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ مزگەوتی (عەلی بەگ).
- ساڵی ١٩٤٨ تا ١٩٥٣ دەبێتە ئیمام خەتیب لە مزگەوتی نائیب.
- مامۆستا عەلی فەتحوڵڵا ساڵی (١٩٧٢) لەگەڵ مەلا عەبدولمەجیدی قوتب و شێخ عەلی تاڵەبانی دەچنە چۆمان بۆ زیارەتی بارزانی، رژێمی بەعس لەسەر هەڵوێستی کوردانەی چەند جارێك بەندی کردووە.
- لە (٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠١)دا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ محێدین بە خاك سپێردراوە.

*** (عەلی قەڵایی):-**

- ناوی (عەلائەددین کوری بەهائەددین یەعقوبی)یە.
- ساڵی (١٩٣٩) لە گەرەکی حەمام لەسەر قەڵا لەدایکبووە.
- یەکێکە لە مەقام خوێنەکانی کەرکوک کە لەسەر دەستی (مەلا نورەددین) فێر بووە، شارەزایی هەبووە لە مەقامەکانی (سێگا)و (بەیات)و (نەهاوەند).
- ساڵی (١٩٦٢) یەکەم گۆرانی لە تەلەفزیۆنی (بەغدا)و تەلەفزیۆنی (کەرکوك) تۆمار کردووە.
- ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەلی کەرکوکی):-**

- یەکێکە لەو کەسانەی کە لە بنەرەتدا خەڵکی کەرکووکەو لە سەدەی نۆزدەدا لە ئەفریقیا ژیانی بەسەر بردووەو بە یەکێك لە پاڵەوانەکانی راوکردنی فیل دانراوە لە ئەفریقیا.
- لە سەرەتادا وەکو فەرمانبەرێك لە میسردا کاری کردووە لە سەردەمی (خدێوی ئیسماعیل) لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەدا دەسەڵاتەکەی تا سوودان و نۆغەندا بووە، بۆیە ئەم عەلی کەرکوکییە کاری کردووە لە بەرێوەبەرایەتی هێڵی ئیستیوائی خوارووی سوودان، لە دوای ئەوەی حکومەتی میسر کشاوەتەوە لە سوودان بەهۆی سەرنەکەوتنی شۆرشی عورابی لە ساڵی (١٨٨٢) لەژێر کاریگەری ئینگلیزەکان، عەلی کەرکوکی بریاری مانەوە لە سوودان دەدات و فێری راوکردنی فیل دەبێت لەو وڵاتەدا بەسەرکەوتوویی.
- لە کاتی شەری ئینگلیزەکاندا یەکێك بووە لەوانەی بەشێکی زۆری سەربازەکانی ئینگلیزەکانی بە دیل گرتووەو زیانێکی گەورەی داوە لە ئینگلیزەکان، بۆیە بە یەکێك لە پاڵەوانەکانی سوودان ناونراوە.
- بەڵام چارەنووسی ژیانی لەوەو دوای نازانرێت و نادیارە.

*** (عەلی کەریم):-**

- ساڵی (١٩٥٠) لە شاری کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٨) بۆ یەکەمین جار ئاشنای هونەری شانۆ بووە.
- یەکەمین بەرهەمی شانۆیی (فلوس الدوه)ی یوسف ئەلعانی بوو لە ساڵی (١٩٦٨).
- ساڵی (١٩٧١) وەك ئەکتەر بەشداری شانۆیی (کچە لاڵەکەی) کردووە.
- ساڵی (١٩٧٣) وەك کارەکتەرێکی سەرەکی بەشداری شانۆگەری (یەك، دوو، سێ)ی کردووە.
- ساڵی (١٩٧٤)و لە یەکەمین فیستیڤاڵی هونەری کوردی لە شاری بەغداو لە شانۆگەری (تەقینەوە)دا خەڵاتی باشترین ئەکتەرو نووسەری شانۆیی وەرگرتووە.
- بەرهەمە شانۆییەکانی:
- تەقینەوە، د. پاڵمی، مانگی ئاوابو، گالیسکەی مەرگ، سروودی خۆشنوودی، پاسەوان، دیفز دیفز، سزاو تاوان، گۆرستانێکی بێ گۆر.
- بەرهەمە تەلەفزیۆنییەکانی:
- بەهاری دزراو، مەرەزە، ژاڵە، مەرگی ئەرخەوانی، فرمێسکی رەشی، مەملەکەتی خۆر، ئەژدیها، گەمەی پر لە گوناح، سلاو گوڵەکانی پاییز، خۆرنەوەزان، خەمی چۆڵەکەکان، رابوون، ژیلەمۆ.
- کتێبە چاپکراوەکانی:
- (مەرگی سوشاب)، دەقی شانۆیی.
- (لەبازنەی شانۆیی)، ووتاری شانۆیی.
- (ئەزموونی شانۆیی)، لێکۆلینەوە.
- (لە شانۆی ئیسپانییەوە)، وەرگێران.

- (لە شانۆی فەرەنسییەوە)، وەرگێران.
- (نواندن لە سینەمادا)، وەرگێران.
- بە بەردەوام لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان ووتارو لێکۆڵینەوەی شانۆیی بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی بڵاوئەکاتەوە.

*** ( عەلی کەریم مەحموود ):-**

- ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵانی (١٩٧٦-١٩٧٧) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەشی شێوەکاریی و خۆشنووسی لە بەغدا تەواو کردووە.

*** ( عەلی لەیلانی - مەلا عەلی لەیلانی ):-**

- ناوی (مەلا عەلی کوڕی شێخ مستەفای مەریوانی)یە.
- ساڵی (١٩٢٠)، لە بنەماڵەیەکی ئاییینی گوندی کریچنە لەدایکبووەو خوێندنی ئاییینی لای شێخ مستەفای نەقشبەندی لە شاری هەولێر تەواو کردووە.
- ئەگەرچی بنەماڵەکە بە ڕەچەڵەك خەڵکی ناوچەی سەنگاون، بەڵام مەلا عەلی کە ناودارترین کەسایەتی بنەماڵەکەیە، بە مەلا عەلی لەیلان ناوبانگی دەرکردووە و خانەوادەکەشی هۆکاری ئەو نازناوە دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی ناوبراو لە مزگەوتی لەیلان پێشنوێژو وتارخوێن بووە.
- لە سەردەمی باوکیدا سێ مەلا بەناوی عەلی لە کەرکوك هەبوون، کە یەکێکیان مەلا عەلی فەتحوڵڵایەو ئەوی تریان مەلا عەلی (دانیال)ە و ئەوی تریشیان مەلا عەلی لەیلان بوو. مەلا عەلی و خانەوادەکەی تاکو ساڵی (١٩٥٢) لە لەیلان ماونەتەوە و لەو ساڵە لەسەر داوای زانایانی ئاییینی کەرکوك، مەلا عەلی و خانەوادەکەی ڕوویان کردووەتە ناوەندی کەرکوك و لەوێ نیشتەجێبوون.
- ماوەیەك ئیمامو خەتیبو بووە لە مزگەوتی (حەسەن مەکی) لەسەر قەڵاو مزگەوتی (لەیلان)و ماوەیەکیش چووەتە میسرو خەریکی خوێندنی ئاییینی بووە.
- وەك مامۆستای قوتابخانە ئاییینییەکانو ئەندامی ئەنجوومەنی زانستی شارەکە کاریکردووەو تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دواییکرد هەر ئەندامی ئەنجوومەنی زانایانی ئاییینی کەرکوك بووەو ڕۆڵی هەبووە لە پێگەیاندنی چەندین مامۆستای ئاییینی شارەکە.
- یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی مەلا عەلی پێ دەناسرێتەوە، ئەوەیە کە یەکەمین مامۆستای ئاییینی بووە بە زمانی کوردی لە تەلەفزیۆنی ئەو کاتەی (کەرکوك) وتاریداوەو ئەم هەڵوێستەشی تووشی گێچەڵی دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەی شارەکەی کردووە.
- مەلا عەلی هاوشێوەی زۆرێك لە مەلاکانی تری شارەکە ڕۆڵێکی بەرچاوی بینیوە لە هێورکردنەوەی خەڵك و دامرکاندنەوەی ئەو ئاژاوەگێڕییەی لە مانگی تەمموزی ساڵی (١٩٥٩) لەنێوان کورد و تورکمانەکانی کەرکوك هاتە ئاراوە.
- لە (١٨)ی ئابی ساڵی (١٩٦٨) بە ڕووداوی کەوتە خوارەوەی فرۆکەیەکی میسری لە کاتی هاتنەوەی بۆ عێراق کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی لە (٢٢)ی ئابی ساڵی (١٩٦٨) بە خاك سپێردراوە.
- بەشێك لە مێژوونووسان هۆکاری کەوتنەخوارەوەی فرۆکەکەی مەلا عەلی دەگەڕێننەوە بۆ هێرشێکی موشەکی، هۆکاری ئەو وتەیەش بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کە جگە لە مەلا عەلی چەندین سەرکردەی فەلەستینی لە ناو فرۆکەکەدا بوونە.

*** ( عەلی مەحموود محەمەد ):-**

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (کەرکوك شاری قەڵاو ئاگرو خوێن)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (کەرکوك لەنێوان حەزی خەڵکەکەیو خەونی ئایدۆلۆژیادا)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (چەند لاپەرەیەکی شاراوە لە مێژووی کۆمەڵکوژییەکان)، ٢٠٠٦.
- (بازرگانی مەرگ)، سلێمانی، (٢٠٠٨).

*** ( عەلی مەردان ):-**

- ساڵی (١٩٠٤) لە شاری کەرکوك لە گەڕەکی تەکیەی شێخ عەلی لەدایکبووە.

- خوێندنی لە تەکیەی کەرکوك‌و لەلای مەلا سالْح دەستپێکردووە هەر لە وێشەوە لەلای مامۆستای دەنگخۆش مەلا رەئوف تەجویدی قورئان‌و هەندێك مەقاماتی کوردی‌و قۆریاتی تورکمانی بووە.
- لە دوای هەشت سالْ تەکیەو شاری کەرکوکی بە جێهێشتووەو بە مالْەوە چووەتە گوندی لەیلان.
- لە گوندی لەیلاندا هونەرمەند خدر بارامی ناسیوە.
- لە بەغدا ئاشنایەتی پەیدا کردووە لەگەل هونەرمەندانی گۆرانی‌و مەقاماتی فارسی‌و عەرەبی‌و تورکی‌و کوردی‌و گەلێك مەقام‌و گۆرانی لە ئێزگەی کوردی بەغدا تۆمار کردووە.
- شارەزایی لە ئامێرەکانی مۆسیقا هەبوو بە تایبەتی عوود.
- هەروەها شارەزای زمان‌و ئەدەبی کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی‌و تورکمانی بووەو شیعری زۆربەی شاعیرەکانی لە دەیان بەستەو مەقامدا خوێندۆتەوە.
- سالْی (١٩٨١) کۆچی دوایی کردووە.
- لە گۆرانییە بەناوبانگەکانی: (لەبەر چاوی بەد، شیرین کەلامە، گیانە بەسێتی، کەتان کەتانە، مامە، ئای چەندم خۆش دەوێت، مینا گیان، گەردن بلور، هەوریلار، کۆلاْن بە کۆلاْن، فاتیمە، خالْو خالْو، چەند جارم وت، لێم یاخی، شەکرەسێو، بێرە کوردستان.. چەند بەرهەمێکی تر).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی (گۆرانییەکانم)، بەغدا، ١٩٨١.

*** (عەلی محەمەد ئەحمەد - عەلی قەزاو):-**

- سالْی (١٩٢٢) لە ئاوایی (تۆپزاوە)ی داقوق لەدایکبووە.
- لەبەر ئەوەی دایکی ناوی (قزاو)ە، لەناو جەماوەر و یاوەرانی دابە (عەلی قزاو) ناسراوە.
- لەم مەقامزانانە فێری مەقام بووە: (مام عەبدوللاّی مەلا حوسێن، سەعید ئەحمەد شیرین، عارف دەلۆی کاکەیی).
- سالْی (١٩٤٦)ی زایینی ژنی هێناوەو چوار کوڕی هەیە کە نیشتەجێی گوندەکانی (عەرەب کۆیی) لە ناوچەی داقوق.

*** (عەلی شێخ محەمەد جەمیل تالْەبانی - شێخ عەلی شێخ محەمەد جەمیل تالْەبانی):-**

- ناوی (شێخ عەلی کوڕی شێخ محەمەد جەمیل کوڕی شێخ محەمەد عەلی کوڕی شێخ عەلی خالْسی کوڕی شێخ عەبدولرەحمان خالسی کوڕی شێخ ئەحمەد تالْەبانی کوڕی مەلا مەحموودی زەنگەنە)یە.
- سالْی (١٩٢٧) لەدایکبووە لە کەرکوك.
- خوێندنی عیلمی لەلای (مەلا عەزیزی شەل)و (مەلا محێددین)و (مەلا ئەحمەدی فەرقان) خوێندووەو ئیجازەی مەلایەتی لەلای (مەلا عەزیزی شیلەخانی) وەرگرتووە.
- سالْی (١٩٥٤) هاتووەتە کەرکوك‌و لە تەکیەی (شێخ جەمیل تالْەبانی) زانستەکانی ئاپینی خوێندووەو دامەزراوە بە ئیمام‌و خەتیب لە (تەکیەی تالْەبانی).
- لە سەردەمی ئەودا لە سالْی (١٩٦٧) تەکیێیەکە ئاوەدانکراوەتەوەو لەسەر شێوازێکی تازە دروستکراوە.
- ئەندامی ئەنجوومەنی عیلمی کەرکوك بووە.
- ئەندامی سەندوقی زەکات بووە بۆ کەرکوك‌و کوردستان.
- لە (٢٢)ی کانوونی دووەمی سالْی (١٩٩٠) بە ڕووداوی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەلی محەمەد رەحیم):-**

- سالْی (١٩٨٥) یەکەمین پێشانگای تایبەتی کردووەتەوە لە هۆلی تەئمیم بۆ هونەری نوێ.
- سالْی (١٩٨٦) دووەمین پێشانگای تایبەتی کردووەتەوە لە هۆلی تەئمیم بۆ هونەری نوێ.

*** (عەلی محەمەد وەردە):-**

- (حاجی عەلی کوڕی محەمەد وەردە کوڕی سەلیم ئاغا) بوو.
- سالْی (١٨٩٨) لەدایکبووە.

- ساڵی (١٩٨٩) کۆچی دوایی دەکات.
- پیاوێکی خوێندەوارو ڕۆشنبیرو لە ئەندامانی حیزبی (هیوا) بوو.

*** (عەلی ناسر):-**

- ساڵی ١٨٧٣ لە ناوچەی قەرەحەسەن لەداپکبووە.
- شاعیرێکی نەخوێندەوار بووە خەڵکی ناوچەی (قەرەحەسەن) نزیکی کەرکوك بووە.
- هەژارو ڕووتو قووت بووە، شاعیرێکی پایەبەرزو هوشیارو زیرەك بووە.
- لە (١٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٥١)دا لە ئاوایی (تەپەلو) کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەلی حاجی وەهاب - مەلا عەلی حاجی وەهاب):-**

- لە مزگەوتەوە ناوبانگی مەلایەتیو زانایی بەرز ئەبێتەوەو نازناوی (حیکمەت) پەیدا دەکات بە ناوی خۆیەوە ئەو مەلایانە کە ئیجازەیان لای ئەو وەرگرتووە بریتی بوونە لە مەلا ناسیح ئەفەندی مدرس زادە، مەلا ئەحمەد ئەفەندی قوتب، مەلا عەلاوە دین (لەیلان)، مەلا ئەحمەدی ڕۆژبەیانی فورقانی، مەلا مەحموود جوانرۆی، مەلا ئەسعەد بۆرەدەری، پتر لە پەنجا مەلا ئیجازەیان لای وەرگرتووە.
- کە ئینگلیز کەرکوکی داگیر کرد بە زۆر کردیان بە قازی کەرکوك سەرنووسەری دادگا مستەفا ئەفەندی بوو، ئەم مەلایە هەم فەقێی وهەم هاوسێی بوو فێری شێوەی زمانی سیامەسووری بوو بوو لە دائیرە هەر بەو شێوەیە لەناو خۆیان قسەیان ئەکرد، وەك بزانم مەلا عەباس، ناجی عەباسو عەبدولرەحمان ناجیو ڕەئوف ناجی وحەمید ئەفەندی ومەلا سلێمانی عەلی نایشو ڕەفیق ئەفەندی خادم سوجادەیش هەر لای ئەو خوێندبوویان بەڵام ئیجازەیان وەرنەگرتووە.
- مەلا عەلی ئەفەندی فارسیو تورکی زۆر باش زانیوە، لە ئەدەبیات وحیکمەت وفەلسەفەدا شارەزابوو.
- ئەم زانا مەزنە بەپیتو برشتە زانستییە ساڵی (١٩٢٤)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.

*** عەلی وەسمان ئەمین:-**

- ساڵی (١٩٢٦) لە گوندی هەوارە قوڵەی ناو تیرەی ڕۆغزایی جاف لە دایك بووە، مام عەلی کەسێکی هێمنو کەم دوو بووە، بەڵام ڕاستگۆو بووە، کەسێکی نیشتمان پەروەرو دلسۆزی پێشمەرگەوبووە.
- ساڵی (١٩٧٧) بەهۆی پەیوەندی بوونی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێمەوە بۆ ماوەی شەش ساڵ حوکم دراوەو دوو ساڵ لە زیندان بووە، پاشان بە لێبووردنی گشتی ئازاد کراوە، لە کارەساتی ئەنفالدا گەلێك لە خێزانەکەی ئەنفالکراوون.
- ساڵی (٢٠٠٩) لە تەمەنی ٨٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

*** (عەلی یەحیا مەنسوور - دکتۆر عەلی یەحیا مەنسوور):-**

- ساڵی (١٩٣١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (تنقيبات سامراء) نووسینی: ئەرنیست هرتسفلد، فرێد ریش زرە، وەرگێران، بەغدا، ١٩٨٥.
- (بوابة عشتار)، نووسینی: ڕۆبێرت کولدیفای، وەرگێران، بەغدا، ١٩٨٥.
- (النشاط البريطاني في العراق ١٧٩٨-١٨٠٦، تاسيس مقيمية لشركة الهند الشرقية في بغداد)، وەرگێران، بەسرە.

*** (عەواد عەلی):-**

- ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- (التحليل السيميائي للعرض المسرحي الحديث، آفاق العلاقات المسرحية)، نامەی ماستەر، کۆلێژی هونەرە جوانەکان، زانکۆ بەغدا، بەغدا، ١٩٨٩.
- (شرفات الجسد، جدلية الحضور والغياب في المسرح)، عەمان، ١٩٩٦.
- (عبد الوهاب خمسون قصيدة حب).
- (غواية المتخيل المسرحي)، (مركز الثقافي العربي)، بەیروت ١٩٩٧.
- (المالوف والمألوف في المسرح العراقي، دراسات في النقد المسرحي التطبيقي)، (دار الشؤون الثقافية)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (معرفة الاخر: مدخل إلى المناهج النقدية الحديثة)، بەیروتو دار ئەلبەیزا، ١٩٩١.

*** (عەونی داودی):-**

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (كركوك المدينة الضاحكة بالنار والنور)، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (كركوك رحلة في ذاكرة التاريخ)، چاپی یەکەم، سوید، ٢٠٠٢، چاپی دووەم سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (صفحات من تاريخ التعريب في كركوك)، وەرگێران.

*** (عەونی نەقاش):-**

- ساڵی (١٩٦١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك.
- بروانامەی دبلۆمی لە فێرکردنی سەرەتایی بەدەستهێناوە، سەرپەرشتیاری هونەرییە لە بەڕێوەبەرایەتی چالاکی قوتابخانەکانی پەروەردەی کەرکوك.
- هەر لە ساڵی (١٩٩١)ەوە لەسەر ڕێچکەی خۆشنووسی خۆشنووسانی وەکو (محەمەد شەوقی، سامی ئەفەندی، عەبدولعەزیز ڕیفاعی، حامید ئامێدی)، وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٩١) قوتابخانەیەکی بۆ فێرکردنی خۆشنووسی لە نووسینگەکەی لە کەرکوك کردووەتەوە، گەلێك لاوی بەهرەمەندی لەو بوارەدا فێری خۆشنووسی کردووە.
- جۆرەکانی خۆشنووسی وەکو (ئەلسولس، ئەلنووسخ، ئەلنیدازە، ئەلدیوانی، ئەلدیوانی ئەلجەلی، ئەلڕوقعە) بەکار هێناوە.

- سالی (١٩٩٤)دا پێشانگای تایبەتی یەکەمی خۆی کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠٦)دا پێشانگای تایبەتی دووەمی خۆی کردۆتوە.
- سالی (٢٠٠٦)دا پێشانگای تایبەتی خۆی لە کۆمەڵەی (الاخوة والثقافة لتركمان العراق) کردووەتەوە.
- گەلێك خەلاتی جۆربەجۆری لەسەر خۆشنووسی لە بەغداو هەولێرو ئەستەمبول و سووریاو دوبەی وەرگرتووە، وەکو ئەمانەی خوارەوە:
- خەلاتی (الكوفة للخط العربي) لە بەغدا لە سالی (١٩٩٥).
- خەلاتی فیستیڤالی (الدار السلام العالمي) لە سالی (١٩٩٦).
- خەلاتی یەکەمی لە فیستیڤالی (هەولێر) لە سالی (٢٠٠٠).
- خەلاتی رێزلێنان لە نووسینی (ئەلنووسخ) لە سالی (١٩٩٨) لە (ئەرسیکا) لە ئەستەمبول.
- خەلاتی رێزلێنانی لە سالی (٢٠٠١) لە (ئەرسیکا) لە ئەستەمبول.
- خەلاتی سێیەمی لە خۆشنووسیدا وەرگرتووە لە سالی (٢٠٠١) لە (ئەرسیکا) لە ئەستەمبول.
- خەلاتی سێیەمی لە خۆشنووسی (ئەلنووسخ) وەرگرتووە لە سالی (٢٠٠٤) لە سووریا.
- خەلاتی رێزلێنانی لە خۆشنووسی (ئەلموحەقیق) وەرگرتووە لە سالی (٢٠٠٨) لە (ئەرسیکا) لە ئەستەمبول.
- خەلاتی لە پێشبرکێی (الحلية الشريفة) لە سالی (٢٠١٢) لە ئەستەمبول وەرگرتووە.
- خەلاتی رێزلێنانی لە (الملتقى الرمضاني) لە دوبەی لە سالی (٢٠١٢) وەرگرتووە.

*** عوبێد خالید تۆماری:-**

- سالی (١٩٧٩)دا کاتێك لە بەغدا دەیخوێند، بەشداری لە دامەزراندنی یەکەمین ئەلقەی رۆشنبیریی سەرەکی لەگەل نەجمەدین فەقێ عەبدولا، سەباح حەسەن خورشیدو گوشاد عەبدلرەحمان کرد. یەکێك بوو لە هەلسووڕاو چالاکەکانی ئەلقە رۆشنبیرییەکان و پاشان یەکێك بوو لە کادیرە سەرەکییەکانی بەرزە. مالەکەیان لە گوندی تۆماری سەر بە ناحییەی شوان ببوو بە حەشارگەیەکی نهێنی بۆ بەرزە. کەسووکارەکەشی بە دایك، برا، خوشك، مام و ئامۆزاکانییەوە ناراستەوخۆ بە ئەو پەری دلسۆزییەوە خزمەتی بەرزەیان دەکرد. لە دوای هەلوەشاندنەوەی بەرزەوە لە کاری سیاسی کشایەوەو خەریکی ژیان و گوزەرانی خۆی بوو.

*** (عوبێد لەتیف بەرزنجی-هەوری):-**

- ناوی (شێخ عوبێد کوڕی شێخ لەتیف کوڕی شێخ ڕەزای بەرزنچی)یە.
- سالی ١٩٤٤ لە گوندی (کەلوڕ)ی سەر بە پارێزگای کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی ١٩٦٣ دەستی بە شیعر نوسین کردووە.
- سالی ١٩٦٥ بابەتی هەمەجۆری نووسیوە، یەکەم بابەتی بەناوی (شاعیرێکی نادیار).
- سالی ١٩٧٣ لە گۆڤاری هەولێر بلاوبۆتەوە، ئیدی لەو مێژووەو لە نووسین بەردەوام بووە، سەرەڕای ئەو بابەتانەی کە لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بلاوکراوەتەوە، شێخ عوبێد ناز ناوی شیعری (هەوری) بۆخۆی داناوە.
- بەرهەمەکانی:
- (دیوانی هەوری) کە نزیکەی ٥٠٠ لاپەرە دەبێت،شیعری چەند شاعیرێکی کەرکوکی کردووە بە پێنج خشتەکی لەوانە سێ پارچە شیعری لوتفی باوکی، یەك پارچە شیعری شێخ نەجمەدین (صابری) و یەك پارچە شیعری شێخ ڕەئووفی خانەقا، سالی ٢٠١١
- (چوارینەکانی هەوری) کە زیاتر لە ١٠٠٠ چوارینە لە خۆ دەگرێت، سالی ٢٠٠٧ لەسەر ئەرکی خۆی لەچاپ دراوە.
- یەکەم کەس بووە کە شیعرەکانی باوکی کۆکردۆتەوەو ئامادەی کردووەو لەسالی ١٩٨٤ بەهاوکاری ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان لە چاپخانەی (الاديب البغدادي) بە چاپ گەیشتووە، پاشان بە قەوارەیەکی گەورەترو بە شێوەیەکی جوانتر لەسالی ٢٠٠٧ لە دەزگای رۆشنبیری شەفەق چاپی دووەم کراوەو بلاوکراوەتەوە، بۆ جاری سێیەم لەسالی ٢٠١٣ لەلایەن کۆمەلەی روناکبیری و کۆمەلایەتی کەرکوك بە شێوەیەکی زۆر جوان بلاوکراوەتەوە.
- (گەوهەرێکی ون بوو) کە بریتیە لە کۆمەلی بابەتی هەمەرەنگ سەرجەمیان بۆ شەهید ئەردەلانی کوڕی نووسراوەو لەچلەکەیدا لە رێکەوتی (٣٠ی حوزەیرانی سالی ٢٠١١) خوێندرایەوەو لەلایەن (هەوری) پێشەکی بۆ نوسراوەو ئەمەش لەسەر ئەرکی دووکەس کە هاوڕێی هەوری بووە بە چاپ گەیشتووە.
- (پەندی پێشینان رێ نیشاندەری ژیان) بریتیە لە ٥٥٠ پەند بە شێوەیەکی کورت و پوخت لەسالی ١٩٧٠شرۆڤە کراون، لەلایەن کاك حەمە سەعید زەنگەنە پێشەکی بۆ نووسیوەو لە سالی ٢٠١٣ لەلایەن یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك چاپ کراوە.
- ئەم بەرهەمانەی ئامادەن بۆ چاپ:
- (باخچەی بوێژانی کورد) نزیکەی ١٥٠ شاعیری کوردی تێدا لەسالی ١٩٧٠ کۆ کراوەتەوەو تا ئێستا دەستنووسە.
- (دەستەگولی شاعیرانی کەرکوك) ژیاننامەی ١٦ شاعیری ناوداری شاری کەرکوك لەسالی (١٩٧٩).
- (دیوانی نوری) حاجی مەلا محەمەدی نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر بەزمانی کوردی و فارسییە لەسالی ١٩٨٩ کۆی کردۆتەوەو پێشەکی بۆ نووسیوەو بەشێکی لەسالی ١٩٩٠ لە ژمارە (٨٤) ی گۆڤاری کاروان بلاوی کردۆتەوە.
- (دوا بەرهەمی شاعیری گەورەی کورد بورهان جاهید ١٩١٨ - ١٩٩١) لەسالی ١٩٩٢ کۆی کردۆتەوەو پێشەکی بۆ نووسیوە.
- (چیرۆکی عەشقی بێگەرد) لە عەرەبییەوە بە هۆنراوە وەرگێراوە بۆ سەر زمانی کوردي و لە سالی ٢٠٠٦ شاعیری گەورەی گەلەکەمان (لەتیف هەلمەت) نووسینێکی لەسەر نوسیوە.
- (تیشکێ لە مێژووی عێراق و کورد) بریتیە لە باسی دوایین خەلیفەی عەباسی عەبدوللا (المستعصم بالله) لە بنەچەی هارون رەشید بووە، لە سالی (١٢٤٢ز) تا هاتنی هۆلاکۆ سالی (١٢٥٨ز) کە بەغدای داگیر کردووە.
- (دەبوایە وا نەبوایە) باسێکی مێژوویە لە سالی ٢٠٠٨ نووسراوە.
- (چوارینەکانی هەوری) بەشی دووەم نزیکەی (٤٦٣) چوارینە لە خۆ دەگرێت، مامۆستا ئەحمەد تاقانە لە سالی

٢٠١٥ پێشەکی بۆ نووسیوە.

* (عورفی-سەید مەحموود):-

- ساڵی (١٨٣٢)ی زایینی لەدایکبووە.
- بە ئەسڵ خەڵکی ناوچەی جەبارییە.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك‌و دیوانێکی شیعری بچووکی هەیەو کتێبێکی هەیە بە ناوی (کتاب الحدیث) کە تایبەتە بە کۆکردنەوە چوارینەکانی کەرکوك دەربارەی قۆریات.
- ساڵی (١٨٩٠) کۆچی دوایی کردووە.

* (عوسمانی خانەقا - شێخ عوسمانی خانەقا):-

- (شێخ عوسمان کوڕی شێخ عەبدوڵلا کوڕی شێخ عومەری خانەقا)یە.
- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.

* (عوسمان خورمەلەیی - مەلا عوسمان خورمەلەیی):-

- نزیکەی ١٠٠ ساڵی ژیاوەو لە ساڵی (١٩٥٠) کۆچی دوایی کردووە.
- زانیاریمان دەربارەی کەمە، بەڵام لە بەشێك لە دەستنووسەکاندا ئاماژەی پێکراوە.

* (عوسمان خۆشناو):-

- ساڵی (١٩٣٠) لە کۆیە لەدایکبووەو دامەزراوە بە فەرمانبەر لە شارەوانی کەرکوك‌و نیشتەجێ بووە لە گەڕەکی ئیمام قاسم.
- ساڵی (١٩٥٩)دا وەکو بەڕێوەبەری کارگێڕی لە ڕۆژنامەی (گاوورباغی) دامەزراوەو دیوانێکی شیعری چاپ کراوی هەیە.

* (عوسمان شکور فەرەج):-

- ساڵی (١٩٤٧) لە دێی (باوە) لە ناوچەی (قەرەحەسەن) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٦) پەیمانگای مامۆستایانی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- یەکێکە لە چیرۆك نووسەکانی کەرکوك.
- یەکەم چیرۆکی لە ساڵی (١٩٦٨) بە ناوی (بەسەرهاتێك) نووسیوە.

* (عوسمان ڕەحمان محەمەد - کوردۆ):-

- ناسراو بە کوردۆ.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٣)ی شاری کەرکوك.
- خوێندنی سەرەتایی لە گوندی مەرزیخەی ژووروو لە شێخ بزێنی تەواو کردووەو خوێندنی ناوەندی لە شوان و ئامادەیی لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٨٢) لە پەیمانگای تەکنیکیی کەرکوك وەگیراو ساڵی ١٩٨٤) خوێندنی تەواو کرد. هەر ئەو ساڵە پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لەسوسێ‌و چەمچەماڵ‌و تیپی ٢٥ی خالخالان چالاکیی نواند. لە قۆناغی دوای ئەنفالەکاندا.
- لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٨)و نیوەی یەکەمی ساڵی (١٩٨٩) لە ناوچەی شێخ بزێنیی خواروو لەدەستە پارتیزانەکانی پێشمەرگە چالاکیی نواند. هەر ئەو ساڵە، پاش گەڕانەوەی لە ئەرکی پارتیزانی، کرایە بەرپرسی ڕێکخستنی تیپی ٢١ی کەرکوك لە ئێران.
- دواتر گوێزرایەوە بۆ زەڵێ‌و وەك مامۆستای خولەکانی فەرماندەیی گشتیی‌و پارتیزانی کاری کرد. لەم نێوانەدا وەك مامۆستا بەشداریی لەدەرچواندنی حەوت خولی پێشمەرگایەتی کردووە.
- لەڕاپەڕینی (١٩٩١)دا وەك ڕابەری سیاسیی بەتالیۆنی مامەندە بەشداریی کردو لە هەولێر کرایە لێپرسراوی هێزی پارێزگاریی بارەگای مەکتەبی سیاسی. لەمەکتەبی ڕێکخستندا وەك کارگێڕی کاروباری پەیمانگای کادیران کاری کردو سەرپەرشتیی دەرچواندنی ١٦ خولی کادیرانی مەڵبەندەکانی کرد.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٩٨ - ٢٠٠٣)دا لێپرسراوەتیی کۆمیتەی مەکتەبەکانی پێ سپێردراو هەر لەو ماوەیەدا بڕوانامەی بەکالۆریۆسی یاسای گشتیی لە زانکۆی سلێمانی بەدەستهێنا.
- ساڵی (٢٠٠٢) دەستی بەپیشەی پارێزەری کردو ساڵی (٢٠٠٧) پلەی ماستەری لە بواری یاسای گشتیی لە زانکۆی سلێمانی بەدەستهێنا.
- چەردەیەك وتارو لێکۆڵینەوەی هەیە.

* (عوسمان عەلەمدار - مەلا عوسمان عەلەمدار):-

- ناوی (مەلا عوسمان کوڕی مەحموود عەلەمدار)ە.
- یەکێکە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك.
- لە هەندێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* (عوسمان مەزڵوم):-

- ناوی (عوسمان مستەفا)یەو نازناوی (مەزڵوم)ە.
- ساڵی (١٩٢٢) لە گەڕەکی ئیمام ئەحمەد لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٦) کۆلێژی ماڤی تەواو کردووەو دامەزراوە بە کاتبی یەکەم لە دادگا.
- لە دیوانەکانی:
- (کرکوك خوریاتلاری)، شیعر بە زمانی تورکی، بەرگی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەم، چاپخانەی (جامعة)، بەغدا، ١٩٥١.
- (کوکلمك دفترندن)، دیوانێکی شیعری بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الشمال) کەرکوك، ١٩٦٧.
- (عابدین)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (البلدیة)، کەرکوك، ١٩٧٢.
- (خوریاتلار)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٧٥.
- (خوروزلە حسبحالم و خوروز خوریاتلرم)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٧٨.
- لە (٢٢)ی تەمموزی ساڵی (١٩٩٥) کۆچی دوایی کردووە.

* ( عومەر ئاغای تەرجیلی ):-

- ناوی (عومەر ئاغا كوڕی نامیق تەجیلی)یە، نازناوی شیعری (فەوزی)یە.
- سالی (١٨٨٨) لە گەڕەكی پریادی لە كەركوك لەدایكبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی (رشدیة الملكیة) تەواو كردووە.
- شیعری بە زمانی كوردیو توركمانی هەیەو چوارینەكانی خەیامی كردووەتە توركی.
- لە (٢١) تشرینی یەكەمی سالی (١٩٥٤) كۆچی دوایی كردووە.

* ( عومەری پەلكانە -عەسری ):-

- ناوی مەلا شێخ عومەری كوڕی شێخ سالحی پەلكانەیە.
- سالی ١٩١٤ لە گوندی پەلكانە لەدایكبووە.
- شاعیر لای چەند زانیایەكی بەناوبانگی ئەو سەردەمە خوێندنی ئایینی خوێندووە وەكو: مەلا ئەحمەدی فەرقانی، مەلا ڕەفیق، مەلا عومەری، گومبەتی، مەلا مەجیدی قوتب، مەلا عەلائەددین.
- شاعیر زمانەكانی فارسی و عەرەبی و توركمانی زانیوە و نازناوی عەسری بووە گەلێك داندراوی هەیە لەوانە:- (ناهەمواری دنیا، ڕاستی لە كوێیە، خواناسی تەواو).

* ( عومەر خانەقا - شێخ عومەر خانەقا ):-

- (شێخ عومەر كوڕی شێخ حوسێن كوڕی شێخ عەبدولقادری سووروەیی)ە.
- سالی (١٨٧٠)ی زایینی لە كەركوك لەدایكبووە.
- ژیانی لە گوندی (كویلە) لە ناحیەی قەرەهەنجیر ژیاوە.

* عومەر ڕەفعەت ڕەشید ئەحمەد بیبانی:-

- سالی ١٩٤١ لەدایكبووە.
- سالی ١٩٧٢ كۆلیژی سەربازی بەغدای تەواو كردووە لە خولی ٥٠ بەناونیشانی (المدفعیة الثقیلة).
- سالی ٢٠٠٩ لە وەزارەتی پێشمەرگە خانەنشین كراوە.

* ( عومەرە درێژ ):-

- ئەم هونەرمەندە لە سالی (١٩٥١) لە گەڕەكی (بەرتەكیە)ی كەركوك لەدایكبووە.
- خوێندنی سەرەتاییو ناوەندی هەر لە كەركوك خوێندووە.
- ئەو مەقامانەی كە شارەزایی لێیان هەیە، بریتییە لە: (دەشت، نەوا، خەنەبات، حیجاز، سێگا، هیجران، قەتار، ئەلاوەیسی، خورشیدی، خاوكەر، ئای. ئای).
- كەوتۆتە ژێر كاریگەر مەقامەزان عەلی مەردانو حەمە درێژو میقدادو هەر دەم لە تەكیەی تالەبانی گوێ بیستی مەقامەكانیان بووە.

* ( عومەر سەیدە ):-

- بەرهەمە چاپكراوەكانی شاعیر:
- (پەریسە)، شیعر، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (بەرەو شێت بوون)، شیعر، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (گەمە لەگەل دڕندە)، كۆمەلە وتار، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (ژیان بەدرۆوە جوانە)، شیعر، ٢٠٠٦.
- (شێتبوون)، شیعر، كەركوك، (٢٠٠٨).
- (لە كۆتایی چاوەڕوانیدا)، چیرۆك، كەركوك، ٢٠٠٩.

* ( عومەر سالح - مەلا عومەر سالح ):-

- (عومەر كوری مەلا سالحی كوری مەلا عەبدوللا)یە.
- سالی (١٨٨٢) لە دێی (ئۆمەر گومەت) لە ناوچەی (تەقتەق) لەدایكبووە.
چووەتە بەر خوێندنی فەقێیایەتی لەناوچەكانی پردێ وقادركەرەمو ناوچەكانی خۆشناوەتیی.
- ئیجازەی عیلمی لە سەر دەستی مامۆستا مەلا سالح ئەفەندی وەرگرتووە.
- تەریقەتیشی لە شێخ عەبدولرەحمان بریفكانی وەرگرتووە لە پاش مردنی مەلا سدیقی كاكی بووەتە ئیمام لە خانەقای خۆیان، پاشان بووەتە ئیمام وخەتیبی مزگەوتی ئیمام قاسم.
- لە (١٠)ی حوزەیرانی سالی (١٩٦٩) كۆچی دوایی كردووەو لە گۆڕستانی شێخ محێدین لە كەركوك بە خاك سپێردراوە.

* ( عومەر عەبدوللا عەلی جەباری ):-

- سالی ١٩٤٦ لە كەركوك لەدایكبووە.
- سالی ١٩٦٨ كۆلیژی سەربازی بەغدای لە خولی ٤٦ تەواو

کردووە بە ناونیشانی الاداری.
- ماوەیەك (مدير شعبه حسابات الفرقه١٥) بووە.
- ساڵی ١٩٩٩ خانەنشین کراوە.

* ( عومەر عەبدوڵڵا - حاجی عومەر عەبدوڵڵا ):-

- مامی مەقام زان (حەمە درێژ).
- لە تەمەنی (١٠٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، نزیکەی ٥٠ ساڵ مەقام خوێن بووە لە بەرتەکیە.
- کاتێکیش کە مەقامی خوێندووە لە تەکیەی تاڵەبانیو لەبەر دەنگ خۆشیو سافو سەدای بەرزی خەڵکی (تسعین) گوێیان لە گوتنەکەی بووە.

* ( عومەر عەسری - شێخ عومەر عەسری ):-

- ساڵی (١٩١٣) لە پەڵکانەی قەرەحەسەن لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٧) کۆچی دوایی کردووە لە شێخ محێددین نێژراوە.
- گەلێك بەرهەمی شیعریو کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیو ڕەخنەیی هەیە.
- کتێبێکی دەستنووسی هەیە بە ناوی ئامۆژگاری.

* ( عومەر عەسکەری - مەلا عومەر عەسکەری ):-

- ناوی (عومەر کوڕی حەیدەر کوڕی میرزا عەلی کوڕی محەمەد)ە.
- گەلێك لە قوتابخانەکانی کوردستانی عێراق و ئێرانی گەڕاوەو لە دواییدا لە مزگەوتی دانیال پێغەمبەر گیرساوەتەوە.
- دەتوانین بڵێین لەدایکبوونی بە نزیکی لەنێوان (١٧٩٢-١٧٩٥) دایە.
- باوکی (حەیدەر) لە بنەڕەتی عەشیرەتی موکرییە لە ناوچەی ئێران.
- سەرەتای گەشتی خوێندنی لە دێی کارێزەی ناوچەی شوانەوە دەستی پێکردووە لە ساڵی (١٨١٢) تا (١٨١٨)، لە دواییدا گەیشتوەتە مەهابادو تا ساڵی (١٨١٩) بەدەوام بووە.
- هەروەها باس لەوە دەکات کە قوتابی بووە لە خانەقا لە ساڵی (١٨٢٠)، بەڵام دیاری نەکردووە کام خانەقا.
- دەربارەی کۆچی دوایی زانیاریمان زۆر کەمە، بەڵام بەپێی بەڵگەی ئەو دەستنووسەی بە جێ ماوە لە ساڵی (١٨٦٦) ئەوە دەخاتە ڕوو کە لە دوا ساتەکانی ژیانی بووە، ئایە لە دوای ئەو ماوەیە ژیاوە یا لەو ماوەیەدا لە ژیان دەرچووە.

* عومەر عەلی شەریف:-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (منداڵێك بووم لە کوردستان)، مەحموود باکسی، وەرگێڕان، کەرکوک، ٢٠٠٥.
- (٧٠ ناوداری کەرکوك و گەرمیان)، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (لە یادنامەی کەرکوك و گەرمیانەوە)، کەرکوك، ٢٠٠٦.

- (ڕامبۆو چەند ئەفرێنەرێکی دی)، هەولێر، ٢٠٠٩.

* عومەر عەلی فەرەج:-

- ناسراو بە وریا ئاغجەلەری.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٧)ی ئاغجەلەر.
- دەرچووی ساڵی (١٩٧٨ - ١٩٧٩)ی ئامادەیی کشتوکاڵی (بەکرە جۆ)یە.
- مێژووی پەیوەندی کردنی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە بۆ ساڵی (١٩٧٨) دەگەڕێتەوە، کاتێك لە پۆلی سێی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ بوو.
- نزیکەی ساڵێك پاش پەیوەندیی بەکۆمەڵەی ڕەنجدەرانەوە، لە ئەیلولی ساڵی (١٩٧٩)دا پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە هەرێمی دوو ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد.
- لە شوباتی ساڵی (١٩٨٢)دا لەگەڵ پێکهێنانی کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵدا کە یەکەم لێپرسراوی ئەحمەد کرێکار بوو، بوو بەئەندام تێیدا. لەئایاری ساڵی (١٩٨٣) وازی لە ئیشوکاری ڕێکخستن هێنا، ڕووی لە کاری عەسکەری کردو کرایە فەرماندەی کەرت لە تیپی ٢١ی کەرکوك کە لەو

کاتەدا حەسەن حەمید، ناسراو بەمام ڕۆستەم، سەرتیپی بوو.
- لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا وازی لەکاری عەسکەری هێناو بەشداریی لە هەڵبژاردنی ئەندامانی کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵدا کردو بۆوە بەئەندام تێیدا.
- ساڵی (١٩٨٥) ماوەیەك لێپراوەتیی کەرتەکەی گرتە ئەستۆ.
- لەماوەی ساڵانی (١٩٨٧ - ١٩٨٨)دا لەبەشی کاروباری کۆمەڵایەتیی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان کاری کرد.
- لەقۆناغی ئەنفالەکاندا لەگەڵ مەفرەزەیەکی تیپەکەدا تا کۆتایی ساڵی (١٩٨٨) وەك پارتیزانی لە سنووری هەردوو تیپی ٢١ی کەرکوك و ٢٥ی خاڵخاڵان مایەوەو دواتر لەگەڵ مەفرەزەی تیپی ٢١ی کەرکوکدا لەبارەگاکانی سەر سنوور لەبلەکێ و چیوەروو، ماوەیەکیش لە شاری سەقز، گیرسایەوە.
- ساڵی (١٩٩١) بەشداریی لەراپەریندا کردو لەو ماوەیەدا هەندێ ئیشوکاری لۆجیستیکیی لە قەڵاچوالان پێ سپێردرا. دواتر، کرایە لێپرسراوی کۆمیتەی بەرەی کوردستانی لە قەڵەمرەوی چەمچەماڵ.
- پاش راپەرین و لە چوارچێوەی بەرنامەی پەرەپێدانی توانای کادێراندا، لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٢)دا بەشدار بوو لە یەکەم خولی پەیمانگای کادیران لە هەولێرو پاش تەواوکردنی خولەکە کرایە ئەندامی مەڵبەندی دووی ڕێکخستنی کەرکوك کە لێپرسراوەکەی کوردۆ قاسم و بارەگاکەی لە گوندی گۆپاڵە بوو.
- ساڵی دواتر وازی لە کاروباری ڕێکخستن هێناو لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی کەرکوك لەدەربەندیخان خزمەتی کرد. لەئایاری ساڵی (١٩٩٥)دا لە دەزگای زانیاری لە قەڵاچوالان کاری کرد بەڵام پاش ساڵێك گەرایەوە بۆ سەر کاروباری ڕێکخستن و لەو هەڵبژاردنەی کە لەدەربەندی بازیان ئەنجام درا، بوو بەکارگێری مەڵبەندی دووی ڕێکخستنی کەرکوك کە لەو کاتەدا بارەگاکەی لە تەکیە بوو.
- ساڵی (٢٠٠٧) بوو بەجێگری لێپرسراوی مەڵبەند.
- ساڵی (٢٠٠٥)دوا بەدوای پێکهێنانی مەڵبەندی ١٥ی چەمچەماڵ، بەهەمان پلەی خۆی راژەی لە مەڵبەندی کەرکوکەوە بۆمەڵبەندی چەمچەماڵ گواستەوە. لەئەیلولی هەمان ساڵ خانەنشین کرا.

* (عومەری عومەر گونبەدی - حاجی مەلا عومەری عومەر گونبەدی):-

- ناوی تەواوی (حاجی مەلا عومەری کوڕی مەلا ساڵحی کوڕی مەلا عەبدوڵلا کوڕی حاجی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا ئەبو بەکری کوڕی مەلا نورەددین)ە.
- خوێندنی ئاینیی لەلای سەید ساڵح ئەبو بەکر، مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی، مەلا رەزای واعیز، مەلا عومەر قەرەداغی، مەلا ناسیح، مەلا محەمەد ئەفەندی گەراوی خوێندووە.
- بنچینەی (دەربەندی)یەو لە بەرەباڵیی (شەلەوەندی)یەو هەر بە (عومەر گونبەدی) خۆی هەڵداوە.
- ساڵی (١٨٨٢) لە کەرکوك هاتووەتە دنیاوە.
- ناوی ئەویان بە عومەری مامییەوە ناو ناوەو بۆیە بە عومەری دووەم بە ناوبانگە.
- لە کەرکوك لە خانەقا خوێندنی تەواو کردووە.

- ساڵی (١٩٢٤) لە سەردەمی شەری ئەرمەنەکاندا لەسەر خانەقا دانیشتووەو کاروبارەکانی بەڕێوەبردووە.
- ساڵی (١٩٣٠) بە مودەریس لە مەدرەسەی مەحموودی خاڵ لە کەرکوك لە یەکێ مایس بە شێوەی وەکیل لەجیاتی مەلا عەبدولرەحمانی کوڕی مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی دانیشتووە.
- ساڵی ١٩٣٤ بووەتە مامۆستا لە مزگەوتی مەیدان لە کەرکوك، کە لەو کاتەدا قوتابخانەی مەحموودی خاڵ لەگەڵ قوتابخانەی مەلیك غازی کرایە یەك و ناوەکەی بوو بە (المدرسة العلمية الدينية المنظمة) لە مزگەوتی ئۆلو جامیع کە لە سەردەمی کۆماریدا بوو بە (المعهد الإسلامي في كركوك).
- لە (٢٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٧) دامەزرا بە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی ئیمام قاسم.
- لە (٣)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٥) داوای خانەنشینی کردووە.
- لە (١٠)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٩) لە تەمەنی ٨٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

* (عومەر عارف):-

- ساڵی (١٩٣٣) لەدایکبووە.
- باوکی شاعیر بوو لەناو خەڵکدا بە (عارف قاپرەش) بە ناوبانگ بوو کە نازناوی شیعری (عوڕی) بوو.
- مامۆستای فیزیا و ماتماتیك بوو لە قوتابخانەی ئامادەیی موسەڵلا.
- ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (شەفەق) بووە لە کەرکوك و گەلێك نووسینی هەیە لەو گۆڤارە.
- ساڵی (١٩٥٩) بەناوی (هەسان و شەن) وتاری بڵاوکردووەتەوە.
- لە ڕۆژنامەی (ئازادی) لە (١٩٥٩-١٩٦٠) کاری کردووە.

- لە (٢٣)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦) کۆچی دوایی کردووە.

* ( عومەر فەوزی مەکتوبی زادە ):-

- ناوی (عومەر فەوزی کوڕی محەمەد شاکیر کوڕی مەلا عەبدولغەنی کەرکوکی مەکتوبی زادە)یە.
- ساڵی (١٨٧٨) لە گەڕەکی ئاخور حوسێن لەدایکبووە.
- کۆلێژی یاسای لە زانکۆی ئەستەمبول تەواو کردووە.
- کتێبێکی چاپکراوی هەیە بە ناونیشانی (ارض الطیب من ماثر السید طالب بك النقیب)، بەسرە، ١٩١٥.
- ساڵی (١٩٢٥) کۆچی دوایی کردووە.

* ( عومەر قاسم کەرکوکی ):-

- ساڵی (١٧٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووەو ناوی (عومەر ئەفەندی کوڕی قاسم ئەفەندی کەرکوکی)یە، نازناوی شیعری (خاکی)یە.
- سەردەمی (سلێمان پاشا)دا کەرکوکی بەجێهێشتووە چووەتە بەغداو لە مەیدان نیشتەجێ بووەو نووسەر بووە لە مەسرەفخانە لەسەردەمی سەعید پاشا.
- ساڵی (١٨١١) کۆچی دوایی کردووە.

* ( عومەر کەرکوکی ):-

- (مەلا عومەر وەلی کوڕی عەبدولمەجید کەرکوکی)یە.
- یەکێکە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك.
- لە هەندێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* ( عومەر کەریم - مەلا عومەر کەریم ):-

- ناوی (مەلا عومەر کوڕی کەریم کوڕی فەتاح)ە.
- ساڵی (١٩٢٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٤٩ ئیجازەی زانستی ئایینی لەژێر دەستی (مەلا جەمیل رۆژبەیانی)و (مەلا رەزای واعیز وەرگرتووە).
- ماوەیەك ئیمامو خەتیبو بووە لە گەلێك لە دێیەکانی

دەوروبەری کەرکوك.
- لە بواری نووسینی ئەدەب و شیعردا دەستێکی باڵای هەبووە و بابەتەکانی لە گۆڤاری گەلاوێژ و هەتاودا بڵاوکردووەتەوە.
- ساڵی ١٩٦٠ کاتێك مامۆستا ئایینییەکانیان کردە مامۆستای قوتابخانە ئەویش بە مامۆستا و لە گەلێك لە ناوچەکانی کەرکوك خزمەتی کردووە وەکو گوندی گورگە چاڵ، ساری تەپە، قەتان عەرەب، زەند، شۆڕیجە.
- ساڵی ١٩٨١ خانەنشین کراوە.
- ماوەیەك ئیمام و خەتیب بووە لە مزگەوتی خالید کوڕی وەلید لە گەڕەکی رەحیماوا
- لە (١٧)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٨) کۆچی دوایی کرد.

* ( عومەر نەزمی وەنداوی ):-

- ناوی (عومەر نەزمی کوڕی حەسەن سەفوەت کوڕی مەلا محەمەد ئەفەندی وەنداوی)یە.
- ساڵی (١٨٩١) لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩١٣) لە بەغدا یاسای تەواوی کردووە.
- ساڵی (١٩١٤) دامەزراوە بە حاکمی دادگای خانەقینو ئەندام بووە لە دادگای تێهەڵچوونەوەی باقوبە.
- لە شەڕی جیهانی یەکەم پەیوەندی کردووە بە سوپای تورکیاو چووەتە قوتابخانەی ئەفسەران، لە دواییدا دامەزراوە لە دیوانی شەڕی سەربازی لە بەغدا ئەو کاتەی کە ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩١٧) بەغدایان داگیر کرد، بۆیە لە دوای کشانەوەی سوپای تورکی چووەتە موسڵو بە هەمان کارەکەی پێشوی کاری کردووە.
- لە (٢٨)ی ئایاری ساڵی (١٩٢١) بووەتە حاکمی دادگای

تێهەڵچوونەوەی کەرکوک.
- ساڵی (١٩٢٤) دووبارە هەڵبژێردراوەتەوە.
- هەروەها لە ساڵی (١٩٢٦)یش بووەتە سەرۆکی دادگای گەورەی کەرکوک.
- لە (٩)ی نیسانی ساڵی (١٩٢٧) بووەتە موتەسەرفی لیوای کەرکوک.
- لە ماوەی ژیانی کۆمەڵێك کاری بەڕێوەبەری و وەزیری لە حکومەتی عێراق کردووە.
- لە کۆتایی مانگی تەمموزی ساڵی (١٩٧٨) لە لوبنان کۆچی دوایی کردووە.

* (عیرفان سەعید):-

- ناوی (عیرفان سەعید عەبدولقادر)ە.
- ساڵی (١٩٤٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- نووسەرو وەرگێڕەو هەر لە ساڵی (١٩٦٥) لە ڕۆژنامەی (الجمهورية) کاری کردووە.
- چاپکراوەکانی:
- (فهارس صيانة الممتلكات الثقافية)، ١٩٨١.
- (المدن التأريخية وسبل الحفاظ عليها)، وەرگێڕاوە، ١٩٨٦.
- (الورق تأريخه وصناعته)، وەرگێڕاوە، ١٩٨٧.
- (المناخ في المتاحف)، وەرگێڕاوە، ١٩٨٧.

* (عیرفان عەبدولحەمید - دکتۆر عیرفان عەبدولحەمید):-

- ساڵی (١٩٣٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- کتێبە چاپکراوەکانی:
- (الصلة الفكرية بين التشيع والاعتزال)، بەغدا، ١٩٦٥.
- (الأصول والمبادئ العامة في الشريعة الإسلامية)، بەغدا، ١٩٦٧.
- (دراسات في الفرق والعقائد الإسلامية)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٦٨، چاپی دووەم بەغدا ١٩٨٢، چاپی سێیەم بەیروت ١٩٨٤، چاپی چوارەم بەیروت ١٩٩٧.
- (المنحنى التاريخي للتيار العقلي في الإسلام)، بەغدا، ١٩٦٨.
- (عقيدة العصمة في الإسلام)، بەغدا، ١٩٦٨.
- (الاصالة في الفكر الفلسفي الإسلامي)، بەغدا، ١٩٦٩.
- (المستشرقون والإسلام)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٦٩، چاپی سێیەم ١٩٨٣.
- (القرآن الكريم وأثره في النوعة العقلية في الإسلام)، بەغدا، ١٩٧٠.
- (الفلسفة في الإسلام)، بەیروت ١٩٧٤.
- (نشأة الفلسفة الصوفية وتطويرها)، بەیروت، ١٩٧٥.
- (التربية الدينية للصف السادس الثانوي)، چاپی حەوتەم، بەغدا، ١٩٧٨.
- (الخمينية ونظرية النبووة المستمرة ضمن كتاب فضائح الخمينية)، بەغدا، ١٩٧٨.
- (رحلة في التراث)، بەغدا، ١٩٨٠.
- (الدين والسياسة في إيران)، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٣.
- (الفلسفة الإسلامية دراسة ونقد)، بەیروت، ١٩٨٤.
- (نظرية ولاية الفقيه)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (المدخل إلى معاني الفلسفة)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٨٦، چاپی بەیروت ١٩٨٩.
- (دراسات إسلامية) بەغدا، ١٩٩٠.
- (موسوعة البيت)، ئوردون، ١٩٩٠.
- (دراسات في الفكر العربي الإسلامي)، چاپی یەکەم عەممان ١٩٩١، چاپی دووەم بەغدا ١٩٩٢.
- (اليهودية عرض تاريخي)، چاپی یەکەم، عەممان، ٢٠٠٢.

* (عیرفان محەمەد عەلی):-

- ساڵی (١٩٥٣) لە گەڕەکی زێویە لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی لەکەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٣) لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا وەرگیراوە.
- ساڵی (١٩٧٣) پەیکەرێکی تۆپی پێی بۆ یانەی وەرزش سۆلاڤ دروست کردووە.
- ساڵی (١٩٧٦)دا پەیکەری کچە کوردێکی بەجلوبەرگی کوردی لەباخچەی پەیمانگا دروست کردووە.
- لە (٢٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٩١) بەفرۆکەی ڕژێم لە قەرەهەنجیر شەهید بوو.

* (عیزەت ئاغا کوڕی مەجید ئاغای زێویی - حاجی عیزەت ئاغا کوڕی مەجید ئاغای زێویی):-

- بەناو بانگە بە عەزیز مەردان ئاغا، یەکێکە لە پیاوە چاك و دەست دیدە تێرو دەوڵەمەندەکانی شاری کەرکوك.
- ساڵی (١٩٠٣) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە لەدایك و باوکێکی دەوڵەمەندی خاوەن زەوی و زارو گوندێکی زۆر لە (٨)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٨) لە گەڕەکی زێویە کۆچی دوایی کردووە.
- لە ماوەی شەڕی جیهانی یەکەم و دووەم خزمەتێکی زۆری خەڵکەکەی کردووە لە باربووکردن و دابەشکردنی پێویستی بەسەر خەڵکیداو یارمەتی لێقەوماوان لە کاتی پێویستدا لەگەڵ دروستکردنی مزگەوت لە ناوچەکەدا ئەم زاتە گەلێك کاری دووکانداری و کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و

فرۆشتنی زەوی زارووپێویستی مولْکداری کردووە.

– لە ماوەی ژیانی رژێمی بەعسدا گەلێك تووشی لێپرسینەوەو گرتن بووە بەهۆی گرتنی کورەکەی پارێزەر فەتحوڵلا کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە سەرەونگوم کراو وەکو سەرچاوەکان ئاماژەی پێ دەکەن ئیعدام کراوە، هەوەها لە سەردەمی (نوری سەعید)یش چەند جارێك لێپرسینەوەی لێ کراوەو بەگرتن چووە.

*** عیزەت پاشا کەرکوکی - لیوا عیزەت پاشا کەرکوکی ):-**

– ساڵی (١٨٧٠) لەکەرکوك لەدایکبووە.

– ناوی (عیزەت پاشا کوری زەینەل بەگ کوری عەلی ساری کەهیە)یە.

– سەرەتایی لە کەرکوك تەواو کردووە، لە دواییدا چووەتە قوتابخانەی (روشدیە)ی سەربازی لەبەغدا، لە ساڵی (١٨٨٨) لەقوتابخانەی سەربازی لە ئەستەمبول دەرچووە.

– گەلێك پلەی سەربازیی لە دەوڵەتی عوسمانی بەدەستهێناوە تا گەیشتووەتە پلەی ئەمیر لیوا لە ساڵی (١٩٠٥).

– بووەتە سەرکردەی هێزێکی سەربازیی نێوان سنووری تورکیا–ئێران و ماوەیەکیش موتەسەریفی کەرکوك بووە.

– ساڵی (١٩١٤) خانەنیشین کراوە.

– لە دوای شەری جیهانی یەکەم دووبارە گەراوەتەوەو لە حکومەتەکەی (عەبدولرەحمان نەقیب) بووەتە وەزیری معاریف و تەندروستی لە ماوەی نێوان (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٠) تا (٢٩)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢١).

– ساڵی (١٩٢١) بووەتە وەزیری (الاشغال العامة والمواصلات).

– لە (١)ی نیسانی ساڵی (١٩٢٢) خۆی کشاندۆتەوە.

– لە بیستی تشرینی یەکەمی (١٩٣٢) لەبەغدا مردووە لەکەرکوك نێژراوە.

*** ( عیزەت وەلی نەقشبەندی کەرکوکی - حاجی عیزەت وەلی نەقشبەندی کەرکوکی ):-**

– ناوی (عیزەت کوری حاجی وەلی کوری رەجەب)ە.

– ساڵی (١٨٨٥) لە گەرەکی (ساری کەهیە) لەدایکبووە.

– خوێندنی قورئان و زانستی ئیسلام و فیقە و تەفسیری حەدیس و تەسەوف لە کەرکوك فێر بووەو ماوەیەکی زۆر خاوەنی تەریقەتی سۆفی خۆی بووە لە مزگەوتی (شێخ حیسامەددین).

– ماوەیەك بەرێوەبەری پۆستەو گەیاندن بووە لە قەزای (رەواندووز)، بەڵام کاتێك لە ساڵی (١٩١٤)دا شەری جیهانی یەکەم دەستی پێکردووە وازی لە کارەکەی هێناوەو گەراوەتەوە کەرکوك.

– یەکێك بووە لە بازرگانە دەوڵەمەندەکانی کەرکوك و زمانی کوردی و عەرەبی و تورکمانی بە باشی زانییوە.

– گەلێك بەرهەمی لێ بەجێماوە، بەڵام تاکو ئێستاکە بە نادیاری ماوەتەوە.

– ساڵی (١٩٥٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** عیزەدین جاسم رۆستەم ساڵەیی:-**

– ساڵی ١٩٥٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.

– ساڵی ١٩٧٧ کۆلیژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٥٥ بەناونیشانی (مشاة).

– دەرچووی زانکۆی بەغدایە کۆلیژی ئاداب بەشی زمان.

*** ( عیزەدین عەبدی بەیاتی ):-**

– ساڵی (١٩٢٢) لە گەرەکی بەگەکان لەدایکبووە.

– لە (٢٣)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.

– یەکێکە لە وانەی لە بواری پەروەردەو نووسینی شیعردا دەستێکی باڵای هەبووە.

– لە بەرهەمە چاپکراوەکانی:

– (تورکمنجە الفباء)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الجمهوریة)، بەغدا، چاپی یەکەم، ١٩٧١، چاپی دووەم، ١٩٧٣.

- (اوقوما كتابى ايكنجى صنف ايجين)، بە زمانی تورکی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (اسعد)، بەغدا، ١٩٧٢، چاپی دووەم، چاپخانەی (السعدون)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (اوقوما كتابى اوجونجى صنف ايجين)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (السعدون)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (اوقوما كتابى دوردنجى صنف ايجين)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الجاحظ)، بەغدا، ١٩٧٤.

* ( **عیزەددین فەیزی** ):-

- ساڵی (١٩١٧) لە داقوق لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٣٩) خانەی مامۆستایانی بەغدا تەواو کردووە.
- بەرپرسی بەشی کوردی رۆژنامەی (هەولێر) بوو کە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٥٣) دەرچووە.
- بەرهەمەکانی: (یەکێتی نووسەرانی کوردو دوو کۆڕ)، ١٩٨١.
- ساڵی (١٩٨٥) کۆچی دویی کردووە.

* ( **عیزەددین فارس** ):-

- ناوی (عیزەددین کوری فارس کوری حەسەن خاتوون)ە.
- ساڵی (١٩٢٦) لە دێی (عەلیان) لە ناوچەی (زەنگەنە) لەدایکبووە.
- ماوەیەك بەهۆی سەرقاڵی لە زانستە ئاینییەکاندا چووەتە شاری (کفری)و لە ساڵی (١٩٥٧) دامەزراوە بە بەڕێوەبەری ناوی کفری.
- یەکێکە لەوانەی دەنگێکی چاكو شارەزا لە مەقامە کوردییەکانی هەبووە.
- لە (١٨)ی تەمموزی ساڵی (١٩٨٤) بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کردووە.

* ( **عیزەددین کاتب زادە** ):-

- خۆی بەنەوەی کاتب عیزەددین دەرکردووەو هەندێك شیعری هەبووە کە لە گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە) بڵاوی کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٤٨) کۆچی دوایی کردووە.

* ( **عیسام عەلی رەشید - ئازاد ئازری** ):-

- لە (١١)ی ئایاری ساڵی (١٩٨٢) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- باوکی یەکەمین وێنەگری کورد بوو لە شارۆچکەی خورماتوو.
- لە بنەماڵەیەکی هونەرمەندو هونەر دۆست پەروەردە کراوە.
- ساڵی (٢٠٠٦) پەیمانگای تەکنیکی بەشی میکانیکی لە شاری کەرکوك تەواو کردووەو.
- ماوەیەك بەڕێوبەری رادیۆی (ئاشتی) بووە.
- دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (ئاشتی) بووە، دەستەی دامەزرێنەری رێکخراوی چوارچرای هونەری بووە.
- چەند فۆتۆیەکی کراوەتە پۆستەرو فۆلدەری شانۆگەری.
- چەندین بروانامەی رێزلێنان لە بواری ڕاگەیاندنو فۆتۆگرافەریدا وەرگرتووە.
- پێشانگا هاوبەشو تایبەتییەکانی:
- پێشانگای فۆتۆگرافی تایبەتی لە ساڵی (٢٠٠٧) لە کەرکوك.
- پێشانگای هاوبەشی فۆتۆگرافی ساڵانە لە هەولێر لە ساڵی (٢٠٠٧).
- پێشانگای هاوبەشی فۆتۆگرافی ساڵانە لە هەولێر لە ساڵی (٢٠٠٨).
- نمایشی وێنەکانی بە سلایدەر ساڵی (٢٠٠٨) لە ئەڵمانیا.
- پێشانگای هاوبەشی دژی تووندوتیژی ساڵی (٢٠٠٩) لە سلێمانی.
- پێشناگای تایبەتی لە ساڵی (٢٠٠٩) لە کەرکوك.
- پێشانگای هاوبەشی لە ساڵی (٢٠٠٩) لە خورماتوو.
- چەندین وێنەی هونەری لە گۆڤاری (تاو)ی فۆتۆگرافی بڵاوبووەتەوە کە تاکە گۆڤاری فۆتۆگرافیە لە کوردستان.

* ( **عیسمەت ئوزجان** ):-

- ساڵی (١٩٤٦)لە کفری لەدایکبووە.
- گەلێك شیعری تورکمانی هەیەو کتێبێکی چاپکراوی هەیە بە ناونیشانی (شفق)، ئۆفیسی (المنصور)، کەرکوك، ١٩٩٠.
- ساڵی (١٩٩٤) کۆچی دوایی کردووە.

* **عیسمەت رەفیق ساری کەهیە** :-

- ساڵی ١٩٤٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- عشيرة صاري كهية، ٢٠٠٨
- تأريخ علماء كركوك، ٢٠١٠
- صفحات من تأريخ التركمان في العراق، وەرگێران، ٢٠١١
-

* ( **عیسمەت عەبدولەجید بەکر - دکتۆر عیسمەت عەبدولەجید بەکر** ):-

- ساڵی (١٩٤٥) لە کەرکوك لەدایکبوود.
- ساڵی (١٩٦٧) کۆلیژی یاسای تەواو کردووە.
- ماجستێری لە ساڵی (١٩٧٢)و دکتۆرای لە ساڵی (١٩٧٩) لە زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (أثر النزعة الإجتماعية في تطور عقد الإيجار)، بەغدا،

- (شرح قانون تنظيم إيجار العقار رقم ٦٧ لسنة ١٩٧٣)، چاپخانەی (دار السلام) بەغدا، ١٩٧٤.
- (شرح قانون بيع وإيجار العقارات الحكومية رقم ١٧ لسنة ١٩٦٧ المعدل)، چاپخانەی (ابن زيدون)، بەغدا، ١٩٧٥.
- (قانون الاستملاك رقم ٥٤ لسنة ١٩٧٠ المعدل بين الفقه والقضاء)، چاپخانەی (التايمس)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (إختلال التوازن الاقتصادي للعقد ودور القاضي في معالجته)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (موقف المشرع العراقي من تشغيل الاحداث)، بەغدا، ١٩٨١.
- (أصول البحث القانوني)، چاپخانەی (القادسية) بەغدا، ١٩٨٣.
- (الضرورة الملجئة للسكن، دراسة في ضوء القرارات القضائية)، چاپخانەی (القادسية) بەغدا، ١٩٨٢.
- (احكام تخلية المأجور، دراسة في تطبيقات قانون إيجار العقار)، چاپخانەی (الحرية)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (الأحكام القانونية لرعاية القاصرين)، بەغدا، ١٩٨٩.
- (نظرية الظروف الطارئة ودور القاضي في التطبيقات)، بەغدا، ١٩٩٣.
- (الوجيز في شرح قانون الاثبات)، بەغدا، ١٩٩٧.
- (احكام إيجار العقارات التجارية والصناعية، دراسة في ضوء القانون رقم ٢٥ لسنة ١٩٩٦)، بەغدا، ١٩٩٧.
- (وسائل اثبات عقد الإيجار في القانون العراقي)، بەغدا، ١٩٩٧.
- (اصول التشريع، دراسة في اعداد وصياغته)، بەغدا، ١٩٩٩.
- (النصوص القانونية في كتاب ام القرى)، بە بڵاوكراوەكانی (بيت الحكمة)، بەغدا، ١٩٩٩.
- (احكام بيع وإيجار اموال الدولة)، بەغدا، ٢٠٠٠.
- (الحماية القانونية للملكية الفكرية)، لە بڵاوكراوەكانی (بيت الحكمة)، بەغدا، ٢٠٠١.
- (المدخل إلى البحث العلمي)، بەغدا، ٢٠٠١.
- (الأحكام المستحدثة في القانون رقم ٥٦ لسنة ٢٠٠٠، تعديل قانون إيجار العقار رقم ٨٧ لسنة ١٩٧٩)، بەغدا، ٢٠٠١.
- (شرح احكام عقد الإيجار)، بەغدا، ٢٠٠٢.
- اصول تفسير القانون، ٢٠٠٤
- الوجيز في شرح قانون الإثبات، ٢٠٠٦
- الحماية القانونية لحقوق المؤلف، ٢٠٠٧
- مصادر الإلتزام، ٢٠٠٧
- اثر التقدم العلمي في العقد، ٢٠٠٧
- نظرية العقد في الفقه الإسلامي، ٢٠٠٩
- المدخل لدراسة النظام القانوني في العهدين العثماني والجمهوري، ٢٠١٢

* ( **عیماد حوسێن چوپان** ):-

- ساڵی (١٩٦٣) لە گەڕەکی چوقوڕ لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٥) لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان دەرچووە لە بەشی کۆتەڵ.
- ساڵی (١٩٩٥) بەکالۆریۆسی لە کۆلیژی هونەرە جوانەکان وەرگرتووە.
- لە ماوەی ژیانی لەنێوان ساڵانی (١٩٨٤-٢٠٠٥) بەشداری

گەلێك پێشانگای کردووەو گەلێك کۆتەڵی بەرهەمهێناوە لەوانە (خوداوەندی جوانی ڤینووس)ە کە لەپەیمانگای هونەرە جوانەکان لە بەغدا دانراوە.

* ( **عیماد قادر ساڵح زەنگەنە- سیا ڕۆژ** ):-

- ساڵی (١٩٦٨) لە بەغدا لەدایکبووە.
- دەرچووی زانکۆی بەغدا - کۆلێژی کارگێڕی و ئابووری بەشی ژمێریاری ساڵی ١٩٩٤.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- سفرەکان بۆ ویژدان ئەدوێن، ١٩٩٦.
- بارانی شەوگەران، ٢٠٠٠
- هۆلیۆدێك لە سەوای دەروون، شیعر، ٢٠٠٣
- چەند فارغۆنێك کاغەزی گیان، شیعر، ٢٠٠٥
- شاباشی تەشقەڵە، شیعر، ٢٠١٢
- بەرهەمەکانی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی وەکو (ئاسۆ، کاروان، هاوکاری، ڕۆژی کوردستان).

* ( **عیماد عەبدولڕەزاق زەنگەنە** ):-

- ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی قۆناغی ئامادەییە.
- سەرنووسەری گۆڤاری (شار)ی شارەوانیی کەرکوك بووە.
- ساڵی (١٩٨٧)ەوە نووسین بڵاودەکاتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی: (ستایشی دیارو نادیارەکان).
- ساڵی ٢٠١٧ کۆچی دوایی کردووە.

*** عادل شوکر ئەحمەد**

پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدارو فەرماندەی تیپ، ناسراو بەپزگار، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٢ی گوندی کولەجۆی ناوچەی کفری. ساڵی ١٩٧١ خوێندنی سەرەتایی لە کەلار تەواو کردووەوە، هەر ئەو ساڵە بۆ خوێندنی ناوەندی چووەتە بەغدا بۆ خوێندن لە خوێندنگەی ئەهلیی فەیلیی ئێواران.
لە بەغدا پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی لقی ٥ی بەغدای پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە، ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ کۆتایی هاتنی قۆناغی ئاگربڕو دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کوردو حکومەتی عێراقدا، بەغدای بەجێهێشت، ڕووی کردە سلێمانی و لە پلەی ٣ی بەتالیۆنی زمناکۆ بووە پێشمەرگە، لەو ماوەیەدا بەشدار بوو لە چەند شەڕێکی گەورە لەوانە شەڕەکانی سەتیز، عومەر ئاغا و زمناکۆ.
لە ساڵی ١٩٧٥دا لەگەڵ هەرەسهێنانی شۆڕشدا ئاوارەی ئێران بوو و ماوەیەك لە کامپی ئاوارەکانی سەراو نیلوفەر ژیانی بەسەر برد هەر ئەو ساڵە ئێران بەپێی پلانێکی ناوەندیی بەسەر شارەکاندا دابەشی کرد بەم پێیە ئەو لەگەڵ ٢٥ ئاوارەی دیکەدا لە شاری تەورێز نیشتەجێ کرا، لەوێ چووە خولێکی فێرکاریی کارەبایی و دوای ئەوەی پاش چوار مانگ خولەکەی تەواو کرد، بەچاودێر لە کارگەیەکی خواردنەوە گازییەکان دامەزرا.
ژیانی لە تاراوگەو دووریی لە نیشتمان، نەبوونە مایەی دابڕانی لە سیاسەت. هەر لەو ماوەیەدا هەواڵی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و هەوڵەکانی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری پێگەیشت، لە ساڵی ١٩٧٦دا ئەو و هەر یەك لە سامان گەرمیانی و فەرحان بادینی و داوود محەمەد عەلی بڕیاریاندا ئێران بەجێبهێڵن و بچن بۆ سوریا بۆ بەشداری کردن لە هەوڵەکانی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشێکی نوێ لە کوردستان، هەر چواریان بەدزییەوە تەورێزیان بەجێهێشت و چوونە شاری ورمێ و لەوێوە بەهاوکاریی چەند دۆستێك لە سنووری ئێران، تورکیا پەڕینەوەو چوونە ناوچەی گەڤەر، لەوێوە گەیەنرانە جەزیرەی بۆتان و لە ١٤ی نیساندا لە سنووری تورکیا، سوریا پەڕینەوەو خۆیان گەیاندە شارۆچکەی دێرك و لەوێ پەیوەندییان بەبارەگای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد.
لە نیسانی ساڵی ١٩٧٧دا بەشداریی لە خولێکی شەڕی پارتیزانیدا کرد کە ڕێکخراوی ئازادیبەخشی گەلی فەلەستین بەسەرکردایەتی جۆرج حەبەش بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی ئامادە کردبوو، لە پایزی ئەو ساڵەدا بەهاوکاریی کوردی تورکیا لە گەڵ گروپێك پێشمەرگەی مەشق پێکراودا، بەناو خاکی تورکیا، گەیەنرایە ناوچەی برادۆست کە بارەگایەکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی لێ بوو، لەوێ خالید سەعیدو عەلی عەسکەری و قادر خەبات پێشوازییان لێکردن.
لە برادۆست بووە پێشمەرگە لە مەفەرەزەکەی مەلا بەختیارداو لەگەڵ ئەودا بۆ ناوچەکانی دەشتی هەولێرو دەشتی کۆیەو قەرەداغ و شارباژێڕو دۆڵی جافایەتی دابەزی، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨دا کرایە بەرپرسی پاسەوانەکانی تاڵەبانی لە ناوزەنگ، ساڵی دواتر لێپرسراویەتی فەرماندەی کەرتی لە هەرێمی ٥ی قەرەداغ پێ سپێردرا.
لە ساڵی ١٩٨٣دا، کرایە فەرماندەی تیپی ٥١ی گەرمیان، لە ساڵی ١٩٨٥دا تیپەکە لەبەر زۆریی ژمارەی پێشمەرگەکانی، تیپی ٥٣ی شێروانەی لێ پێکهێنراو هەر خۆیشی کرایە فەرماندەی تیپە تازەکە لە ساڵی ١٩٨٨، بۆ جاری دووەم لێپرسراویەتی تیپی ٥١ی گەرمیانی گرتەوە ئەستۆ.
لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی لە ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەدا، کردووە، لەوانە شەڕی شیوەشان لە دەشتی کۆیە ساڵی (١٩٧٨) شەڕی بانی خێلان ساڵی (١٩٧٩)، ئۆپەراسیۆنی دابان - هەلاج، ساڵی ١٩٨٥، شەڕەکانی قەیوان - ماوەت ساڵی ١٩٨٦ ئۆپەراسیۆنی داستانی ڕزگاری ساڵی ١٩٨٧و بەشێکی زۆری شەڕەکانی قەرەداغ و گەرمیان.
لەساڵی ١٩٨٨دا لەگەڵ کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، لە گوندی کانی دینار لەسەر سنووری عێراق - ئێران، گیرسایەوە، لە ساڵی ١٩٩٠دا، لێپرسراویەتی مەفرەزەیەکی پارتیزانی پێ سپێردرا.
ساڵی ١٩٩١ بەشدارییەکی کارای لە ڕاپەڕیندا کردو سەرپەرشتی قۆڵی کفری و قەرەتەپەی کرد، لە ساڵی ١٩٩٢دا کرایە بەرپرسی هێزی یەکی خانەقین ساڵی دواتر بووە فەرماندەی لەشکر لە گەرمیان.
ساڵی ١٩٩٧ لێپرسراویەتی جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی ٢ی ڕێکخستنی کەرکوکی گرتە ئەستۆ.
ساڵی ٢٠٠٣ بووە جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی گەرمیان، ساڵی ٢٠٠٨ وازی لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان هێناو لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا بەشدار بوو لە پێکهێنانی بزووتنەوەی گۆڕان ساڵی ٢٠١٠بە پلەی لیوا خانەنشین کرا.

*** عومەر قادر عەلی**

کادیری دێرینی ڕێکخستن، لەدایکبوی ساڵی ١٩٥٧ی شاری کەرکوك، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیی لە کەرکوك تەواو کردووە، دەرچووی بەشی کیمیای کۆلیجی زانستی زانکۆی سلێمانییە، پەیوەندی کردنی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە بۆ ساڵی ١٩٧٤ دەگەڕێتەوە، کاتێك تەمەنی ١٧ ساڵ و خوێندکاری قۆناغی ئامادیی بووە، لەو قۆناغەدا دەستێکی باڵای لەپەرەپێدانی ڕێکخستنەکان و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازانەدا هەبووە، لە ساڵانی دواتردا لە کۆمیتەی ئاگردا کاری کردووەو لەم ڕووەوە توانیویەتی تەونێکی ڕێکخراوەیی بەهێز لەناو کەرکوك دروست بکات.
لە ساڵانی ١٩٨٠و ١٩٨١دا کۆمیتەی ئاگر چەند گورزێکی سەختی لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێمی بەعسەوە تێسرەوێنراو دەیان ئەندامی لێ گیرا کە بەشێکیان لەسێدارە دران، لە ڕەوتی پرۆسەی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی کۆمیتەکەدا لە بەهاری ساڵی ١٩٨١دا لە کۆبوونەوەیەکدا لە

شاری کەرکوك کە دلێر ئەحمەد شوکری ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتیی ڕێکخستنی ناوخۆ سەرپەرشتیی کردووە. بڕیار درا کاکەڕەش سدیق ببێ بەلێپرسراوی کۆمیتەکەو عومەر قادر ببێ بە جێگری لە کاروباری رۆژئاوای کەرکوکدا هەر لەو ماوەیەدا بەشداریی لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەی رەنجدەراندا کرد، لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا دەزگا ئەمنییەکان هەڵیان کوتایە سەر ماڵەکەی لە گەڕەکی شاترلوی کەرکوك و خۆی هادی برا بچووکیان دەستگیر کرد.
لە بارەگای دەزگای تایبەتی لێکۆڵینەوەی کەرکوك خرایە ژێر ئەشکەنجەدانێکی درندانەوەو لە لێکۆڵینەوەدا ئەوەی خرایە پاڵ کە لێپرسراویەتی باڵای لە کۆمیتەی ئاگردا هەیەو بەشداریشی لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەدا کردووە، بەڵام ئەو هیچی بۆ نەسەلماندن و دواتریش لەگەڵ ٢٠ ئەندامی تردا فەرمانی زیندانی کردنی بۆ دەرچوو، بەڵام لەم مەینەتییەدا هادی برای بێسەرو شوێن کرا، لە تەموزی ساڵی ١٩٨٢ بەلێبوردنی گشتی ئازاد کرا.
پاش ئازادکردنی، پەیوەندیی بەڕێکخستنەوە کردەوەو لە کەرتی شەهید سیروان کاری کرد.
پێش هەڵایسانی شەڕ لەنێوان ئەمریکاو عێراق، لە ساڵی ٢٠٠٢دا وەك خۆئامادەکردنێك بۆ قۆناغی پاش هەرسهێنانی ڕژێمی بەعس، ڕێکخستنەکانی کەرکوك بەسەر شەش کەرتدا دابەش کران و لەم بوارەدا عومەر قادر لێپرسراوێتی جێگری لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی کەرکوك و بەرپرسیارێتی کەرتی ڕێکخستنی گەڕەکەکانی شاترلو، ئەڵماس، عەرفە، حەمام عەلی و قۆریەی پێ سپێردرا.
پاش هەرەسهێنانی ڕژێمی بەعس و ڕێکخستنەوەی مەڵبەندی ٢ی ڕێکخستنی کەرکوك، کرایە کارگێڕی مەڵبەند، ساڵی ٢٠٠٧ لێپرسراویەتی فایلی تورکمانی کەرکوکی پێ سپێردراو لە ساڵی ٢٠١١دا، کرایە ئەندامی مەکتەبی پەیوەندییەکانی کەرکوك.

* عەبدولڕەحمان غەریب ئەحمەد - ڕەحمان غەریب:-

- ساڵی ١٩٦٦ لە گەڕەکی شوان لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی ناوەندییە لە کەرکوك.
- ئەندامی دامەزرێنەری ڕێکخراوی (الأمل)ە لە ساڵی ١٩٩٢.
- ئەندامی دامەزرێنەری فریاکەوتنی کوردستانییە.
- ساڵی ١٩٩٤-١٩٩٦ پەیامنێری ڕۆژنامەی (طريق الشعب).
- ساڵی ٢٠٠٧ پەیامنێری (إذاعة العراق الحر) بووە.
- ساڵی ١٩٩٨-٢٠٠٠ پەیامنێری تەلەفزیۆنی ئازادی بووە.
- ساڵی ٢٠٠٠-٢٠٠٢ بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی ناوخۆیی سلێمانی بووە.
- ساڵی ٢٠٠٣-٢٠٠٥ پەیامنێری ڕۆژنامەی هاوولاتی بووە.
- ساڵی ٢٠٠٦-٢٠٠٧ پەیامنێری (وكالة اصوات العراق) بووە.
- ساڵی ٢٠٠٨ پەیامنێری نیوزیك ماتیك بووە.
- ساڵی ٢٠٠٩ ڕێکخەری ناوەندی میترۆ بووە بۆ بەرگریی لە ماف ڕۆژنامەنووسان.

- ساڵی ٢٠٠٩-٢٠١٢ پەیامنێری سۆمەرییە نیوز بووە
- ساڵی ٢٠١٣ پەیامنێری (المدى) پرێس بووە.
- هەر لە ساڵی ٢٠٠٠ەوە بابەتی بڵاوکردووەتەوە لە ڕۆژنامەی هاوولاتی.

* عوسمان شوکر دەروێش:-

- ناوی (عوسمان شوکر جاسم)ە ناسراو بە عوسمان دەروێش.
- لەژێر ناوی ( عوسمان دەروێش شکور) و ( عوسمان دەروێش) و ( عوسمان لورنەژاد) نووسین و بابەتە ئەدەبییەکانی بڵاوکردووەتەوە.
- ساڵی ١٩٦٤ لە گەڕەکی شۆڕیجەی شاری کەرکوك لەدایك بووە
- پلەی خوێندنی تا سێی ناوەندی خوێندووە.
- لەسەرەتای ساڵی هەشتاکانەوە دەنووسێ و یەکەم بەرهەمی شیعری بە ناوی دایك لە گۆڤاری بەیان لە ساڵی ١٩٨١ بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
١. دلۆپی ئەشك (شیعر) ساڵی ٢٠٠٧
٢. ١٠٠ چوارینە شیعری مۆبایل ساڵی ٢٠٠٨

٣. نەوزاد و نازە (کورتە ڕۆمان) ساڵی ٢٠٠٩
٤. ورچە بەفرینە( شیعر بۆ منداڵان) ساڵی ٢٠١١
٥. مەتەڵ بۆ منداڵان ساڵی ٢٠١٢
٦. بەڵێن و باپیرە ( چیرۆکی منداڵان) ساڵی ٢٠١٣
٧ . ئەنفالنامە ( شیعری شاعیران) ساڵی ٢٠١٣
– ئەم کتێبانەشی ئامادەن بۆ چاپ :
١. گەوهەر ( ڕۆمان)
٢. باخچە ( شیعر بۆ منداڵان)
٣. مەتەڵ بۆ منداڵان بەرگی دووەم
٤ . مەتەل بۆ منداڵان بەرگی سێیەم
٥. مەتەڵ بۆ منداڵان بەرگی چوارەم
٦ . دیوانی منداڵان
٧. کۆمەلە چیرۆکی منداڵان
٨. ئەنفال نامە بەرگی دووەم
٩. لەتاڵ تالتر ( کۆمەلە چیرۆك)

* عەبدوڵڵای خەتیب - مەلا عەبدوڵڵای خەتیب:-
– لە ساڵی (١٨٩٦) لە شاری کفری لەدایکبووە و هەر لەوێیش لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا کۆچی کردووە, ناوی تەواوی مەلا عەبدوڵڵای خەتیب زادەی کوڕی مەلا موستەفای خەتیب زادەی کوڕی فەیزییە خوێندنی مەلایەتی لەسەر دەستی باوکی تەواو کردووە پاشان دەبێتە پێش نوێژو وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی کفری. مەلا عەبدوڵڵای خەتیب خاوەنی دەنگێکی خۆش و کاریگەر بووە لە بواری مەقاماتیشدا کەسێکی شارەزاو مەقامزانێکی گەورەبووە نەك لەسەرئاستی کفری بەڵکو لەسەر ئاستی ئێراقیش، چەندین جاریش محەمەد گویانچی سەردانی مەلا عەبدوڵڵای خەتیبی لە شاری کفری کردووە لە مزگەوتی گەورەی کفری ماوەتەوەو سوودی لێ بینیوە, هەروەها هونەرمەند نازم غەزالیش سەردانی کردووە پرس وڕای پێکردووە. دیارە مامۆستا عەلی مەردانیش چەندین جارسەردانی شاری کفری کردووەو چاوی بەمەلا عەبدوڵڵای خەتیب و حاجی قەنبەر بەگلەرو ئەو مەقامبێژانە کەوتووە لە کتێبی (گۆرانییەکانم) باسی مەلا عەبدوڵڵای خەتیبی کردووە باسی مەقاماتیان کردووەو بیروڕایان گۆڕیووەتەوە.
– ساڵی ١٩٤٤ کۆچی دوایی کردووە.

* عەلی شێخ عومەر ئەحمەد
– ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی١٩٨٣ پەیمانگای موسڵی لە بەشی (میکانیك) تەواو کردووە.
– لە ساڵی ١٩٧٩ ەوە دەستی داوەتە خوێندن و نووسین و بۆ یەکەم جار لە پاشکۆی (عێراق) شیعری بڵاوکردووەتەوە.
– ساڵی ٢٠٠٥ لە بواری چیرۆکدا خەڵاتی ڤیستیڤاڵی گەلاوێژی بەدەستهێناوە.
– ساڵی ٢٠١٢ لە ڤیستیڤاڵی نەتەوەیی شیعری کوردی خەڵاتی ڕەخنەسازی وەرگرت.
– ساڵی ٢٠١٥ خەڵاتی ڕێزلێنانی وەرگرت بە بۆنەی ڕۆژی جیهانی کتێب.
* بەرهەمەکانی:
– ڕۆمانی دەق و تەنگەژەی خوود، ٢٠١٥
– دوو بەرهەمی ئامادەیە بۆ چاپ.

* عەبدوڵڵا کەریم مەحمود
– نووسەر و پێشمەرگەی دێرین، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٧ی گوندی هەزار کانیی ڕەباتی سەر بە ناحیەی سەنگاو.
– لە ساڵی ١٩٥٩ ماڵیان لە گوندی هەزار کانییەوە گواستویەتییەوە بۆ گەڕەکی ئابڵاخ لە شاری سلێمانی، خوێندنی سەرەتایی لە خوێندنگەی بێکەس و ناوەندی لە وەتەن تەواو کردووەو دواتر ڕووی کردووەتە خوێندن لە خانەی مامۆستایانی سلێمانی.
– ژیانی ئەدەبی بە هۆنراوەو چیرۆکی منداڵان دەستپێکردو لە ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاکاندا کەوتە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ساڵی ١٩٧١.
– پاش ئەزموونە سەخت و تفت و تاڵەکەی هەرەسهێنانی شۆڕش. لە ساڵی ١٩٧٥، ساڵی ١٩٧٦پەیوەندی بە یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە کرد.
– پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد، هەر لەو ساڵەدا بەشێکی بەرچاوی بەرهەمەکانی لە گۆڤارەکانی ((بەیان)) و ((نووسەری کورد)) و ((ڕۆشنبیری نوێ)) و ((ڕۆژی کوردستان)) و ڕۆژنامەکانی ((هاوکاری)) و ((عێراق))دا بڵاوکردەوە.
– ساڵی ١٩٧٧ یەکەم دیوانە شیعری بە ناونیشانی ((مژدانەی شەکراوێکی تاڵ)) و لە ساڵی پاشتردا چەند چیرۆکێکی بۆ منداڵان بە ناونیشانی ((سروودی شادومانی)) بە چاپ گەیاند.
– ساڵی ١٩٧٩ بە مامۆستا دامەزراوەو ژیانی مامۆستایەتی دەست پێ کردووەو هەر لەو ساڵەشدا لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر هونەرمەند مەزهەری خالقی بڵاوکردووەتەوە.
– ساڵی ١٩٨٤ بەر لەوەی کە ببێ بە پێشمەرگە، دیوانە شیعرێکی بە ناونیشانی ((بە هۆرەی کام کێو ئاشنای)) بڵاوکردەوە.
– ساڵی ١٩٨٤ پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد و لێپرسراویەتی سەرپەرشتیکردنی کەرتی ڕێکخستنی شەهید ئازادی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانی پێ سپێردرا کە ئەرکەکەی سەرپەرشتی کردنی کاروباری ڕێکخستنی ناوچەی دۆڵی جافاتی بوو، لەو ماوەیەدا بووە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردستان و بابەتەکانی لە گۆڤارەکانی ((نووسەری کوردستان)) و ((گزنگ)) و ((نووسەری چیا))دا بڵاوکردەوە.
– ساڵی ١٩٨٨ لەگەڵ کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، لە شاری سەقز گیرسایەوەو تا ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ لەوێ بوو.
– قۆناغی دوای ڕاپەڕین بە قۆناغی گەشەکردنی شێوازی نووسینی دادەنرێ.
– لە ساڵانی سەرەتای دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستانی

نوێدا وەك رۆژنامەنووس و نوسەر بەرهەمی تێدا بڵاوکردووەتەوەو هەروەها چەردەیەك بابەتی لەسەر شاڵاوی ئەنفالەکان و بوارە جیاجیاکان لە رۆژنامەکانی ((ئاڵای ئازادی))و ((کوردستان)) و ((هەرێم)) بڵاوکردووەتەوە.

– ساڵی ١٩٩٨ بووە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ((تایم)) و لە ژمارەی پێنجەم بە دواوە ڕیزە ڕیپۆرتاژێکی سەبارەت بە هەندێ بابەتی وەك پۆلیسی هاتووچۆی سلێمانی و شارەوانیی سلێمانی و یاخبوونی هەمەوەندەکان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا و ژیانی فۆلکلۆریی ماوەت و کەنیسەی مەسیحییەکانی سلێمانی و نهێنییەکانی گرووپی هەقە بڵاوکردەوە کە لە ژیانی رۆشنبیریدا دەنگدانەوەیەکی زۆریان هەبووە.

– ساڵی ٢٠٠١ کتێبێکی دیکۆمێنتاری گرنگی لەسەر مامە ڕیشە بەناوی ((پێشمەرگە پۆڵاینەکە)) بڵاوکردەوە کە سەرەنجێکی زۆرتری بەلای ژیان و تێکۆشانی مامە ڕیشەدا ڕاکێشا.

– ساڵی ٢٠٠٢ یەکێ لە گرنگترین بەرهەمەکانی، کە تایبەت بوو بە گێڕانەوەی سەرگوزشتەکانی ئەنفال و جەنگی کیمیایی، بە ناونیشانی ((ڕەشەبای ژەهر و ئەنفال)) بڵاوکردەوەو پاش دوو ساڵ بەشی دووەمی هەمان کتێبی بڵاوکردەوە، ئەم کتێبە بەهەردوو بەشەکەیەوە دەنگدانەوەیەکی زۆری لە ژیانی رۆشنبیریدا هەبووەو لەم سۆنگەیەوە بەشی دووەمی کتێبەکە خەڵاتی باشترین کتێبی ساڵی ٢٠٠٤ی لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیرییەوە پێ بەخشرا.

– ساڵی ٢٠٠٥ کرایە ئەندامی مەکتەبی ڕاگەیاندن و ساڵی ٢٠١٠ خانەنشین کرا.

*** عەلی حوسێنی ئەلسەعیدی:-**

– ئەمیش بەشێوەیەکی لابەلا ئەندامی گرووپی کەرکوك بووە، ساڵی (١٩٥٩) وازی لە کارەکەی هێنا لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك چوو بۆ ئەڵمانیاو نەمساو چەند بروانامەیەکی لە بواری نواندندا هێنایەوە لە عێراقدا ڕەواجیان نەبوو. بەڵام هەر سەرقاڵی کاری شانۆیی بووە.

– جارێکیان لە میهرەجانی شانۆکارانی عەرەبدا لە دیمەشق شێتگیر دەبێت و هێرش دەکاتە سەر بەرێوەبەری ئاهەنگەکە مێکروفۆنەکەی لێ دەستێنێ و هاوار دەکات و جەماوەری شانۆکە گەمژەن من گەورەترین و گرنگترین دەرهێنەرو ئەکتەری جیهانم، ئینجا لەسەر شانۆکە خۆی ڕووت دەکاتەوەو هاوڕێیەکانی بە زۆر پەل کێشی دەکەنە پشت پەردەی شانۆکەوە

*** مەلا عەبدوڵڵای دار بەسەرە:-**

– ناوی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەلا محەمەد کوڕی مەلا یوسف (یوسف زێرین)ە لەبنەماڵەی میر سمایلی قەیتولی زەنگەنەیە.

– لە ساڵی (١٨٧٥)ی زایینی لە گوندی (کۆشك) هاتووەتە دنیاوە.

– هەر لە تەمەنی دە ساڵییەوە لەلای شێخ حەسەنی قەرەچێوار خوێندوویەتی.

– لە دوای ئەوەی لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، جێگەی باوکی گرتووەتەوەو، هەروەها لە دێیەکە ئاسیاوی هەبووەو کاری ئاشەوانی کردووە.

– لە ساڵی (١٨٩٩)ی زایینی، لە ئەنجامی شەڕی تاڵەبان و جەباری، ئاژاوە دەکەوێتە ناوچەکەوە، دێی کۆشك بەجێدەهێڵێت و دێتە داربەسەرەو مەلایەتی گوندەکە دەکات و لە ساڵی (١٩٠٠) مزگەوتێك دەکاتەوە.

– لە ساڵی (١٩٠٠– ١٩٣٧) دوو ئاشی دەبێت لە گوندەکە یەکێك لە سەرووی گوندەکە، ئەوەی تریش لە خوارووی گوندەکە.

– لە ساڵی (١٩٣٧– ١٩٣٨) لەسەر داوای شێخ عەبدولکەریم لە تەکیەی شێخ عەبدولکەریم پێش نوێژی تەکییەکە دەکات.

– لە ٧ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٣٩) بە فەرمانی پاشایەتی بە فەرمی دادەمەزرێت.

– لە ساڵی (١٩٦٣)ی زایینی خانەنشین دەکرێت.

– لە ساڵی (١٩٦٥)ی زایینی کۆچی دوایی دەکات.

*** عەبدولکەریم نادر:-**

– ناوی نوری عەبدولکەریم عەبدوڵڵا عەبدولکەریم قارەمان بەنازناوی (عەبدولکەریم نادر)

– ساڵی ١٩٠٦ لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.

– لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوو لە قوتابخانەی سەربازی دەریاوانی لە ئەستانە دەرچووە.

– سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.

– بەشداری شەڕی جیهانی یەکەمی کردووە لە عەمارە و موسڵ و عەقرە و بەسرە.

– لە کاتی هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق یەکێك بووە لەو ئەفسەرانەی کە چەکەکانی نەداوە بە ئینگلیزەکان کە بە تاوانی زانیوە بۆیە ڕاگوێزی دادگای سەربازی کراوە، هەر

بۆیە نوری پاشا خەڵاتی کردووە و ناونیشانی (نادر)ی پێداوە.
- کوڕی مامی (بەکر سدقی) بووە، زمانەکانی کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی و هیندی زانیوە و شیعری بە ئازەری کۆن هۆنیوەتەوە.
- ساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کردووە.

*** عەمار بن حاتەم:-**
- لە ساڵی ١٩٧٨ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی هەیە لە زانست و دبلۆم لە (ئیدارە) و کۆمەڵێك بڕوانامەی نێودەوڵەتی هەیە دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی.
- هەر لە ساڵی ١٩٩٧ بەبەردەوامی کاری نووسین و بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە دەکات و بەرهەمەکانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە جۆربەجۆرە عێراقی و عەرەبییەکان بڵاوکردووەتەوە.
- بەشداری گەلێك پێشانگای شێوەکاری کردووە لە کوردستان و عێراق لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٩-٢٠١٥).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (رماد الطين)، ٢٠١٣ بەرهەمی شیعری.
- بەشداری لە کتێبی over land over sea لە بەریتانیا لە ساڵانی ٢٠١٥ دەربارەی (ئەنترۆپۆلۆجیای شیعر)
- الدفتر الأحمر - حكايات في الصندوق الأسود)، ٢٠١٧.

*** عومەر عەلی سەید (عومەر سەید):-**
- ساڵی ١٩٧٠ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ئامادەیی لە چەمچەماڵ تەواو کردووە.
- لە ساڵی ١٩٨٤-١٩٩٩ لە بواری شانۆ و شێوەکاریدا کاری کردووە.
- پتر لە بیست و پێنج کاری شانۆیی وەکو ئەکتەر و دەرهێنەر و ئامادەکار و نووسین بەشداریی کردووە.
- دوو جار خەڵاتی باشترین نواندن و دەرهێنانی بەدەستهێناوە.
- خاوەنی بەشداری سێ پیشانگای تایبەت و پانزە پیشانگای هاوبەشی کردووە.
- لە ساڵی ١٩٩٢ەوە لە بواری نووسین و ئەدەب و ڕۆژنامەگەری کار دەکات.
- ساڵی ٢٠٠٦ خەڵاتی دووەمی چیرۆکی ڤیستیڤاڵی گەلاوێژی بردووە.
- ساڵی ١٩٩٧ پەیمانگای ناوەندی مامۆستایانی سلێمانی تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی:-
- بازنە ڕاخراوەکانی بابل، رۆمان، ٢٠١٠
- سەرزەمینی زیکزیکە، ڕۆمان، ٢٠١٨.
- ئەسپەرە، ڕۆمان، ٢٠١٩

*** عاسی عەلی حەمە ئەمین تیلەکۆ:-**
- ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- گەلێك هۆنراوەی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی وەکو: عێراق، هاوکاری، ڕەنگین، بەیان، پاشکۆی عێراق.
- تا ئێستا دوو نامیلکەی شیعری بڵاوکردووەتەوە.
- گەلێك دیوانی دەستنووسی چاپ نەکراوی هەیە.

هونەرمەند عەلی مەردان لەگەڵ کۆمەڵێك لە هونەرمەندان

کۆڕی ئەدەبی هەڵبەستی یەکێتی نووسەران لە کەرکوك ساڵی ١٩٧٢ لە ڕاستەوە بۆ چەپ:- ئیسماعیل ڕۆژبەیانی، سەلام محەمەد، ڕەزا شوان، عەبدوڵلا سەڕاج

هونەرمەند جیهاد دلپاك لەسەر پردی خاسە

*** عەلی مەولان:-**

- ناوی عەلی کوڕی سۆفی قادر کوڕی مەولوودە، کە ناسراوە بە عەلی مەولان.
- لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم هاتووەتە دونیاوە، هاوسەرەکەی ناوی عەمەر ڕەشید باوایی) و سێ کوڕ و سێ کچی لێبووە بە ناوەکانی محەمەد، عەبدوڵلا، فەتحوڵلا، سەلما، بەهیە، ڕەحمە.
- یەکێك بووە لە سەرکردەکانی سەید محەمەد جەباری کە بەشداری شەڕی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ی کردووە لە دژی ئینگلیزەکان، لە ١٢ی نیسانی ساڵی ١٩١٥ لە بیابانی شوعیبە لای بەسرە بەشداری گەلێك داستانی کردووە.
- دوا شەڕیش کە بەشداری تێدا کردووە، شەڕی بان مەقان بووە، لە ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ سەی محەمەدی جەباری دژی ئینگلیزەکان لەنزیك شارۆچکەی چەمچەماڵ.
- ئەم بنەماڵەیە چەندەها کەسایەتی و پێشمەرگە و شەهیدیان داوە لەم شارە و خزمەتی لایەنە جۆربەجۆرەکانیان کردووە.

*** نەقیب عەبدوڵلا عەبدولڕەحمان بەکر:-**

- ساڵی ١٩١٨ لە بەغدا لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٣٦ بەشداری خولی (١٥)ی کۆلێژی سەربازی نەکات و ساڵی ١٩٣٨ بە پلەی مولازم دەرچووە و گوازراوەتەوە بۆ فەوجی دووی لیوای (٥) لە کەرکوك.
- لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٢ گوازرایەوە بۆ فەوجی (١) لیوای پێنج و پلەکەی بەرز کرایەوە بۆ نەقیب پاشان گوازرایەوە بۆ بارەگای فرقەی دوو لە کەرکوك تا ساڵی ١٩٤٧ لەوێ بوو.
- زمانەکانی عەرەبی و کوردی و تورکی بە باشی زانیوە.

شێخ عەبدولقادر کەسنەزانی

شێخ عەبدولکەریم حوسامەدین قادر

شێخ عەبدولکەریم عەبدولقادر کەسنەزانی

مام عەبدوڵلای تۆمتەن

له دەسه چەپ عەبدولحەمید فەتحوللا مستەفا

موقەدەم عەبدولحەمید فەتحوللا مستەفا به جلوبەرگی سەربازییەوە

عەبدولحەمید فەتحوللا مستەفا له گۆڕەپانی مەشقی سەربازیدا

دکتۆر عەبدولستار تاهیر شەریف

عەبدولڕەحمان گۆگجەیی لەگەڵ کۆمەڵێك مامۆستا

عەبدولڕەحمان گۆگجەیی لەگەڵ کۆمەڵێك مامۆستا

وەرزشوان - عەبدولغەفور مەعتا

عەبدوڵلای زینوی شێخی

عەزیز فەتحوللا مستەفا و فەیسەلی دووەم لەگەڵ پارێزگار مستەفا یەعقوبی

عەزیز قەلدەر هاشم

عەلی حیکمەت بەگ

عەلی مەعروف ئۆغلو

ساڵی ١٩٦٤ عەلی عەسکەری و لوتفی مەحمود ئەفەندی ڕەسام برای شەهید محەمەد قودسی

سەرەتای پەنجاکان کۆمەڵێك قوتابی کوردی ئامادەیی کەرکوك پێنجەم کەس لە ڕاوەستاوەکان عەلی عەسکەری

مەلا مەحمود عەرەب و مەلا عومەر گونبەدی لە مزگەوت و مەرقەدی ئیمام قاسم

عەبدوڵڵا قادر دانساز

عەتا تەرزی باشی

عەونەڵڵا

عەلی حیکمەت سیامەسووری

عەلی فەتحوڵڵا

مەلا عەبدوڵڵا حەسون

مەلا عەبدوڵڵا لۆبیاچی

مەلا عەلی لەیلانی

عیزەت ئاغای زێوییەو فەتحوڵڵای کوڕی

عیزەت ئاغای زێویی لەگەڵ فەتحوڵڵای کوڕیو گەلاوێژی برازای

* عەبدولڕەحمان محەمەد سالح (عەبدولڕەحمان بەزاز):-

- ساڵی ١٩٢٥ لە شاری کەرکووك لەدایکبووە.
- سەرەتای ژیانی لە گەڕەکی بڵاخ بووە و بە پیشەی بەرگدووری لە بازاڕی قەیسەری دەستی پێکردووە و پاشان بووە بە یەکێك لە گەورەترین بازرگانەکانی شارەکە و دووکانی کووتاڵفرۆشی لە بازاڕی حەسیرەکە بووە.
- ساڵی ١٩٦٧ لە فلکەی ئیخوان نیشتەجێ بووە و نۆ کوڕ و دوو کچی هەیە.
- ساڵی ١٩٩١ کۆچی دوایی کردووە.

* مولازم عەلی ئەحمەد ئیبراهیم جاف:-

- ساڵی ١٩٥٠ لە کەرکووك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٣ لە کۆلێژی سەربازی لە بەغدا تەواو کردووە لە خولی ٥١ بەشی (مخابرە).
- ساڵی ١٩٧٤ پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە کردووە و ساڵی ١٩٧٥ گوازراوەتەوە بۆ فەرمانبەری مەدەنی لەبەر بەشدارییکردنی لە شۆڕشی کورد.
- ساڵی ١٩٧٧ کۆلێژی یاسای لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە و تا ساڵی ١٩٨٤ بووەتە (دادوەر).
- ساڵی ١٩٨٤ پەیمانگای دادوەری تەواو کردووە و بووەتە دادوەر لە وەزارەتی عێراق.
- ساڵی ٢٠١٧ دکتۆرای لە یاسای تاوان بەدەستهێناوە بە پلەی نایاب.
- گەلێك لێکۆڵینەوەی دادوەری و یاسایی و ئەدەبی هەیە بەتایبەتی لە بواری شیعر لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستان.
- گەلێك پۆستی یاسایی بینیوە لە هەولێر و سلێمانی و کەلار و سەرسەنگو عەمادی و دهۆك و زاخۆ و کۆیە و شەقڵاوە.

* شێخ عەبدولەتیف بێدەری:-

- یەکێکە لە زانا گەورەکانی کەرکوك بەدەیان شیعری ئایینی و نیشتمانی عیرفانی هەبووە، گەلێك کتێبی دەستنووسی لەپاش بەجێماوە کە هەندێکی لە (دار المخطوطات) لە بەغدا پارێزراوە، بەشێك لە دەستنووسەکانی فەوتاوە.
- ساڵی ١٨٩٤ لە کەرکوك نێژراوە و لە گۆڕستانی شێخ محێدینی کەرکوك بە خاك سپێردراوە.

* عومەر ئەحمەد کەریم بەرزنجی:-

- ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی ١٩٨٤ زانکۆی بەغدای تەواو کردووە و زمانی هۆڵەندی تەواو کردووە.
- خاوەنی بڕوانامەی پەیمانگەی زانستی تاوانە لە ئیتیالیا
- ماوەی ١٤ ساڵە بە فەرمی لە پۆستی وەزارەتی دەرەوەی عێراق کار دەکات.
- لە تەمووزی ٢٠٠٤ەوە باڵیۆز بووە لە وەزارەتی دەرەوەی عێراق.
- لە ٢٧ شوباتی ٢٠٠٩ بۆ ١ی ئایاری ٢٠١٣ باڵیۆزی عێراق بووە لە لوبنان
- لە ساڵی ٢٠١٥ بریکاری وەزارەتی دەرەوەی عێراق بووە بۆ کاروباری یاسایی و پەیوەندییەکان
- لە ٢٧ی ئایاری ٢٠١٣ بۆ ٣ی ئایاری ٢٠١٥ بووەتە باڵیۆزی عێراق لە ڕۆمانیا
- لە ئێستاشدا باڵیۆزی عێراقە لە وڵاتی ڤاتیکان لەسەر پشکی یەکگرتووی ئیسلامی.

* عەبدولرەحمان جەباری:-

- یەکێك بوو لە مەلا دەنگ خۆشەکانی کەرکوك، لە گەڕەکی بۆلاق کە لەلای مەلا (محەمەدی یوممە) دەیانخوێند.
- نای.. نای، هۆرەی باش ئەوت، بەستەشی جوان ئەدا دەکرد.

* عەلی داودە ( حەمە عەلی داودە ):-

- یەکێك بوول ە مەلا دەنگخۆشەکانی کەرکوك، لە گەڕەکی بۆلاق کە لەلای مەلا (محەمەد یوممە) دەیانخوێند.

* عەلی حوسێن:-
- لەدایکبووی شاری کەرکوکە (کوردستان ).
- دکتۆرا لە زانکۆی ئیلز ئینتەرناشیۆناڵ.
- خاوەنی ١٢ پێشەنگای شێوەکاری تایبەتە و بەشداری لە زیاتر لە ٤٠ پێشەنگای کردووە.
- وەرگێڕانی چەندین کۆمەلە شیعر لە کوردییەوە بۆ ئینگلیزی.
- وەرگێڕانی پێنج ڕۆمان لە ئینگلیزی و عەرەبی و فارسییەوە بۆ زمانی کوردی, لەتەك وەرگێڕانی شانۆیی و کتێبی ئەکادیمی.
- ساڵی ٢٠١٧ دیوانی شیعری بە عەرەبی (فی لیل منفای تشرقین) و دیوانی شیعری بە کوردی چاپ کردووە.

* عەلی زەنگەنە:-

- یەکێکە لەو هونەرمەندانەی کە بەشداری گەلێك کاری هونەریی کردووە لە دراما و گۆرانی.
- لە سەرەتادا لە درامای مەرەزە وەکو گۆرانیبێژ بەشداری کردووە.
- بەرزی باڵاکەت یەکەم گۆرانی بووە کە لە ساڵی ١٩٧٨ وتوویەتی لە تەلەفزیۆنی کەرکوك.

- هەروەها گۆرانی: کوا بەهار، منی شاعیر، هەلاهەلا، تەمەن دەڕوا، باوابێ، هۆ دایە گیان، شایی لادێ، نەگۆڕاوم، لە دەستم دێ، لە گەلێك بۆنەی جیاجیا وتووە.
- ئێستا مامۆستاو بەرپرسی تیپی سۆلاڤە.

* عەبدولقادر بەکر قادر:-

- ساڵی ١٩٥٢ لە گەڕەکی پیریادی لەدایکبووە.
- هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە پەیوەندی دەکات بە ڕیزەکانی شۆڕش، دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول، پەیوەندی دەکات بە ڕیزەکانی دروستبوونی کۆمەڵەی (مارکسی - لینینی) کوردستانەوە، کە لە ڕێگای مام حەمیدی گومرگەوە پەیوەندی دەکات، دواتر ڕۆڵی بەرچاوی دەبێت لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە و دەبێتە لێپرسراوی یەکێك لە کەرتەکانی کۆمیتەی ئاگر، کە ئەم شەهیدو هەڤاڵانە لەگەڵیدابوونە:-
فەرهاد سەعید، جەنگی نەجمەدین، عەبدولعەزیز بەکر قادر، مستەفا چالاوی، خالە کاکەمەند، سامی هەورامی.
- لە ڕۆژی ١٧ای تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨١ لەگەڵ چل ئەندامی کۆمیتەی ئاگر دەستگیر دەکرێن و حوکمی لە سێدارەدان دەدرێن، بەڵام بۆ ماوەی ساڵێك ڕادەگیرێت بەهۆی دەرچوونی لێبوردنی گشتییەوە، بۆیە لە ساڵی ١٩٨٢ ڕەوانەی گرتووخانەی موسڵ دەکرێن و لە ساڵی ١٩٨٣ لە سەرووبەندی ڕێکەوتنامەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ حکومەتی عێراق لە موسڵەوە دەگوازرێنەوە بۆ گرتووخانەی (ئەبو غرێب) کە ژمارەیان دە هەڤاڵی کۆمیتەی ئاگر دەبێت، لەوێ لەسێدارە دەدرێن.

* عەبدولمەجید پاشا یەعقوبی:-
- لە ساڵی ١٩١٨ بووتە بەڕێوەبەری شارەوانی کەرکوك.
- ساڵی ١٩٢٤ بووەتە موتەسەڕیفی کەرکوك.
- ساڵی ١٩٢٧ بووەتە موتەسەڕیفی هەولێر
- ساڵی ١٩٣٧ بووەتە موتەسەڕیفی دیالە.
- ساڵی ١٩٣٨ بووەتە موتەسەڕیفی سلێمانی.
- - ساڵی ١٩٣٩ بووەتە موتەسەڕیفی کووت.
- ساڵی ١٩٤٢ بووەتە موتەسەڕیفی مووسڵ.
- ساڵی ١٩٣٠ بووەتە بەڕێوەبەری باری شارستانی گشتی.
- ساڵی ١٩٣١ بووەتە سەربازکردنی گشتی عێراق.
- ساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێك بوو لەوانەی کە هەوڵیداوە ولایەتی مووسڵ بخرێتە سەر عێراق دژی تورکەکان.
- زمانەکانی کوردی و ئینگلیزی و تورکی و عەرەبی زانیوە.

* (غازی فاتیح وەیس):-

- (غازی کوری فاتیح وەیسی دەلۆی دێی کنگربان)ە.
- ساڵی (١٩٥١) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٤) کۆلیژی ئادابی بەغدادی تەواو کردووە لە بەشی ئاداب و زمانی کوردی.
- مووچە خۆر بووە لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی سلێمانی.
- ساڵی (١٩٨٠) بروانامەی ماجیستێری لە (لەندن) وەرگرتووە لە زانستی دەنگ، ئینجا گەراوەتەوە وولات و بووەتە مامۆستای کۆلیژی ئاداب، ئەوەندەی پێ نەچوو بوو بە سەرۆکی بەشی کوردی لە زانکۆی سەلاحەددین لە هەولێر.
- ساڵی (١٩٨٤) کتێبی (فۆنەتیك)ی لە چاپ دا.
- لە (١٥)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٥) بەکارەساتی ئۆتۆمبێل گیانی لە دەستدا.
- گەلێك لێکۆڵینەوەی زمانەوانی لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان بڵاوکردووەتەوە.

* (غازی محەمەد):-

- ساڵی (١٩٥٤) لەکەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٣) بەشداری (پێشانگای گشتی ماتەمینی

گەلی فەلەستین)ی لە کەرکوك لە هۆڵی شارەوانی کردبوو.
- ساڵی (١٩٧٧) بەکالۆریۆسی لە بەشی ئابووری لە زانکۆی سلێمانی وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٧٧) یەکەمین پێشانگای تایبەتی لە جەلەولا کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٧) بەشداری چالاکییە هونەرییەکانی زانکۆی سلێمانی کردووە.
- ساڵی (١٩٧٨) پێشانگای تایبەتی لە جەلەولا کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٥) پێشانگای تایبەتی لەکەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٩) پێشانگایەکی هاوبەش لە هۆڵی میدیا لەهەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٠) بەشداری فێستیڤاڵی ڕۆژی هونەر لەسلێمانی هۆڵی سوورکۆ.
- ساڵی (١٩٩٣) پێشانگای هاوبەش لەدیمەشق و حەلەب.
- ساڵی (١٩٩٣) پێشانگای تایبەتی خۆی لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
- ساڵانی (١٩٩٦-١٩٩٧) بەشداری فێستیڤاڵی چوارەم و پێنجەمی کەرکوکی کردووە لەچەمچەماڵ و کەلار.
- ساڵی (١٩٩٧) پێشانگای تایبەتی خۆی لە چەمچەماڵ کردووەتەوە.
- بەشداری فێستیڤاڵی هەڵەبجەی شەهیدی کردووە.
- کۆمەڵێك تابلۆی هەیە تاکو ئێستاکە نمایش نەکراوە.
- لە (٢٤)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (غالب داودی - دکتۆر غالب داودی):-

- ناوی (غالب عەلی داوودی)یە.
- ساڵی (١٩٣٢) لە گوندی حەفت تەغار لە ناوچەی داقوق لەدایکبووە.
- یەکێکە لە نووسەرە بەناوبانگەکانی کوردو لەو بوارەدا گەلێك بەرهەمی بە پێزی هەیە:-

- (الداودية ماضيها وحاضرها)، نەجەف، ١٩٥١.
- (ثلاثون يوما في تركيا)، بەغدا، ١٩٥٥.
- (يا ظالمي امل راحل وحب مقيم)، ڕۆمان، بەغدا، ١٩٥٦.
- (مذكرات في المبادىء العلوم السياسية)، بەسرە، ١٩٦٤-١٩٦٥-١٩٦٦.
- (نظام الانتداب وجريمة فلسطين)، بەسرە، ١٩٦٥.
- (نظرية الاحالة في القانون الدولي الخاص)، بەسرە، ١٩٦٥.

- (القوانين العسكرية)، بەسرە، ١٩٦٦.
- (محاضرات في العلوم الإنسانية)، بەسرە، ١٩٦٦.
- (شرح قانون العقوبات البغدادي القسم العام قانون العقوبات العسكري قانون أصول المحاكمات العسكرية -القوانين)، بەسرە، ١٩٦٦.
- (مذكرات في مبادئ القوانين)، بەسرە، ١٩٦٧.
- (التجنس في القانونين العراقي والتونسي)، بەسرە، ١٩٦٨.
- (شرح قانون العقوبات العراقي-القسم العام)، بەسرە، ١٩٦٩.
- (مذكرات في القانون الدولي السعودي)، ریاز، ١٩٧٢.
- (القانون الدولي الخاص-النظرية العامة وأحكام الجنسية)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٦٧، چاپی دووەم بەغدا ١٩٦٨.
- (القانون الدولي الخاص-النظرية العامة للمواطن والمركز القانوني للأجانب واحكامها في العراق)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٧٦، چاپی دووەم بەغدا ١٩٧٨.
- (القانون الدولي الخاص-الجنسية المواطن مركز الاجانب واحكامه في القانون العراقي)، چاپی یەکەم موسل ١٩٨٣، چاپی دووەم بەغدا ١٩٨٨.
- (المدخل إلى علم القانون وبخاصة الاردني)، چاپی دووەم، ئەربد، ١٩٨٤.
- (القانون الدولي الخاص الاردني في الجنسية-دراسة مقارنة)، ئەربد، ١٩٩٤.
- (ميثاق بغداد الدفاعي والنتائج التي اثمرها).

* (غەریب چوارشاخی - مەلا غەریب چوارشاخی):-

- ناوی (مەلا حەمە غەریبی کوری حەمەی رەسوڵ)ە.
- ساڵی (١٩٢٦) لە ئاوایی چوارشاخی خۆرئاوای سەر قەڵای گەرمیان لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٣) هەموو شیعرەکانی بە دەستی بەعس سووتێنراوە.
- ساڵی (١٩٨٤) بووەتە مەلای مزگەوتی کەلار.
- ساڵی (١٩٨٥) کۆچی دوایی کردووە.

* غەریب عەسکەری:-

- ناوی تەواوی حەمە غەریب سەعید تۆفیق.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٣)ی گوندی عەسکەر لەناوچەی قەڵا سێوکە.
- دەرفەتی تەواوکردنی خوێندنی نەبووە. هەر ئەوەندەی پێکراوە کە تا پۆلی سێی ناوەندی بخوێنێ.
- ساڵی (١٩٥٦) ژیانی سیاسی دەست پێدەکا، کاتێك لەو ساڵەدا پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٦١) لە کاتی دروستبوونی نارەزایی بەرامبەر بەیاسای چاکسازیی کشتوکاڵ لە سەردەمی جەنرال عەبدولکەریم قاسمو یاخیبوونی خێڵەکان، پەیوەندیی بەیاخیبوونەکەوە کردو لەگەڵ خێڵە راپەریوەکاندا چەکی هەڵگرت. پاش دامرکاندنەوەی یاخیبوونەکە، چەکی دانەنا.
- ساڵی (١٩٦٢)دا پەیوەندیی بەو بزووتنەوە چەکدارییەوە کرد کە پارتی دیموکراتی کوردستان هەڵگیرساندبوو. لێرە

بەدواوە ژیانی پێشمەرگایەتیی دەست پێدەکا.
- ساڵی (١٩٦٤) لەکاتی دروستبوونی دووبەرەکی لەنێوان باڵی مەکتەبی سیاسیو باڵی سەرۆکی پارتی، پشتگیریی باڵی مەکتەبی سیاسیی کرد پاش کشانەوەی هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی بۆ ناو ئێران، تا ساڵی (١٩٦٦) لە هەمەدان مایەوە.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیی ساڵانی شەستەکاندا دوو جار بریندار بووە: جارێك لەساڵی (١٩٦٤) لە گوندی تەگەران لەناوچەی شاربازێرو جارێکی تر لە ساڵی (١٩٦٧) لەناو شاری کەرکوك.
- پاش یەکگرتنەوەی هەردوو باڵی پارتی لە ساڵی (١٩٧١)، هیچ پلەو پۆستێکی حیزبیی وەرنەگرتو گەرایەوە بۆ سەر ژیانی ئاسایی خۆی.
- ساڵی (١٩٧٧) دوابەدوای دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار لە کوردستاندا، پەیوەندیی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردو دواتریش مەفرەزەیەکی لە چەمی رەزان پێکهێناو لەوێ رۆڵێکی دیارو بەرچاوی لە کۆکردنەوەو رێکخستنی هێزی پێشمەرگەدا لە چوارچێوەی هەرێمی دووی کەرکوك نواند.
- لەژیانی پێشمەرگایەتیدا چەند لێپرسراوەتییەکی دیاری وەرگرتووەو لەماوەی جیاوازدا سەرتیپی سێ تیپ بووە، ساڵی (١٩٨٢) لێپرسراوەتیی تیپی ٩٩ی بیتوێنی پێ سپێردرا کە سنووری ناوچەی رانیەو خدرانی دەگرتەوە. بۆ ساڵی دواتر، لەجێی نازم حەمەی سلێمان کرایە فەرماندەی تیپی ٢٣ی سووورداش. ساڵی (١٩٨٦) بۆ مەڵبەندی دوو گوێزرایەوەو لەوێ بۆ ماوەی یەك ساڵ لێپرسراوەتیی تیپی مەڵبەندی گرتە ئەستۆ.
- ساڵی (١٩٨٧) کرایەوە بەفەرماندەی تیپی ٢٣ی سووورداش.
- لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٣ -١٩٨٨) دووجار بریندار بووە. جاری یەکەم لە ساڵی (١٩٨٣) لە گوندی رەزگەی

ناوچەی پشدەرو جارێکی دیکە لە ساڵی (١٩٨٨) لەکاتی کیمیابارانکردنی هەردوو گوندی گۆپتەپەو عەسکەردا. لە کاتی ئەنفالەکاندا خێزانیو دوو کوڕیو چەند خزمو کەسووکارێکی لەدەستدا.
- دوای هێرشی ئەنفالو کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور لە ساڵی (١٩٨٨) لە قاسمەڕەشو سەردەشت گیرسایەوە. لەو ماوەیەدا ئەرکی هەماهەنگیی نێوان سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانو قەرارگای رەمەزانی سوپای پاسدارانی ئێرانی گرتە ئەستۆ.
- ساڵی (١٩٩١) بەشداریی لە راپەڕیندا کردو لەکاتی رزگارکردنی چەمچەماڵدا بریندار بوو، بەڵام برینداربوونی رێی لەوە نەگرت کە بەشدار بێ لەئۆپەراسیۆنی رزگار کردنی شاری کەرکوکدا.
- پاشان کراوە بە فەرماندەی بەتالیۆنی ١٥ی چەمی رەزان کە بارەگاکەی لەسەرگەڵوو بوو، پاشان برایە سووورداشو دواتریش لە قازان دانرا. هەر ئەو ساڵە کرایە فەرماندەی هێزی ٥ی سلێمانیو دواتریش کرایە جێگری فەرماندەی دوکان.
- ساڵی (١٩٩٢) بەشداریی لە خولی ئەفسەرانی کوردستاندا کردو ساڵی دواتر، پاش پێکهێنانی سوپای یەککگرتوی کوردستان، وەك موقەدەم لە لیوای ٢٢ی دوکان خزمەتی کرد. ساڵی (١٩٩٤) کرایە جێگری هێزی ٥ی سلێمانیو لە ماوەی نێوان (١٩٩٦ - ٢٠٠٣) لە دوکانو لە ساڵی (٢٠٠٣) بەدواوە لە فەرماندەیی گشتیی هێزی پێشمەرگە وەك کارگێڕی فەرماندەییو جێگری لێپرسراوی پشکنینو مەشق بەپلەی لیوا خزمەتی کرد.
- لە (٤ی ئەیلولی ساڵی ٢٠٠٧) لە گوندی عەسکەر بەکارەساتێکی دڵتەزێن کۆچی دوایی کرد.

* (غەفور سالح عەبدوڵڵا):-

- ساڵی (١٩٥٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پەیمانگای کارگێڕی بەغدای لەنێوان ساڵانی (١٩٧٦-١٩٧٧) تەواو کردووە.
- یەکەم چیرۆکی لە ساڵی (١٩٧٣)دا بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ئەو گەرەکەی بەرەو ئاسمانە)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٦.
- (هۆیەك بۆ مردن هۆیەك بۆ ژیان)، محێدین زەنگەنە، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٦.
- (کۆڵانەکان بەرەوە ئاسمان)، کورتە چیرۆك، ١٩٨٧.
- (تووانەوە)، رۆمان، ١٩٨٨.
- (پیاو و کۆتەڵ)، کورتە چیرۆك، ١٩٨٩.
- (پەیکەرو پیاو)، کۆمەڵە چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٩.
- (کور ژنی خوێن)، رۆمان، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (مەلی بەفر)، رۆمان، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (حیلەی خوێن)، رۆمان، ١٩٩٩.
- (بەفرو دیوار)، کورتە چیرۆك، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (مسرحیة هارون الرشید)، محەمەد موکری، وەرگێڕان بۆ سەر زمانی عەرەبی، ٢٠٠٢.
- (رامبو وزمن القتلة)، هینری میلەر، وەرگێڕان بۆ کوردی، ٢٠٠٢.

- (رەخنە لە لووتکەی لۆژیکەوە بۆ هەڵدێری جنێو)، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (چەردەیەکی کۆمەڵایەتیانە لە مێژووی نوێ عێراق)، عەلی وەردی، چوار بەرگ، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٤، (٢٠٠٨).
- (تەلاقی بژێوی)، رۆمان، محەمەد زەفزاف، وەرگێڕان، هەولێر، (٢٠٠٨).
- (فەرهادێکی تر)، رۆمان، چاپی یەکەم، سلێمانی، (٢٠٠٨)، چاپی دووەم، کەرکوك، ٢٠٠٩.
- (سبب للموت.. سبب للحیاة)، کۆمەڵە چیرۆکی محێدین زەنگەنە، وەرگێڕان.
- (مەسیح دووبارە لە خاچ دەدرێتەوە)، نیکۆس کازانتزاکیس، رۆمان، وەرگێڕان.
- (فقهاء الظلام)، سەلیم بەرەکات، رۆمان، وەرگێڕان.
- (لمحات إجتماعیة من تاریخ العراق الحدیث)، دکتۆر عەلی ئەلوەردی، بەرگی سێ و چوار، وەرگێڕان.
- ئەم بەرهەمانەی بە زنجیرە لە گۆڤاری (بەیان)و (کاروان)و رۆژنامەی (هاوکاری) بڵاوکردووەتەوە:
- (دۆستۆفیکس)، لێکۆڵینەوەیەکی درێژ، لیۆنید گروسمان، وەرگێڕان.
- (الروایة الفرنسیة الجدیدة)، لێکۆڵینەوەیەکی درێژ، ئالان رۆب، وەرگێڕان.
- (حصان في مجلس الشیوخ)، لیۆنید ئەندریا، وەرگێڕان.
- (الحصان المسروق)، شانۆگەری، وەرگێڕان.
- گەلێك بەرهەمو لێکۆڵینەوەی لە رۆژنامەی (رسالة الأمة)و گۆڤاری (لۆتس) بڵاوکردووەتەوە.
- بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (پیڤین)ی عەرەبی بووە.

* (غەمناکی بچووك):-

- شاعیر لە ساڵی (١٨٧٥) لەدایکبووە.
- خەڵکی دێی (قەیتول) بووە لە تیرەی زەنگەنە، هاوچەرخی مەلا فەتاح جەبارییە.
- بەپێی هەندێك سەرچاوە دەڵێن لە ساڵی (١٨٩٦)دا کۆچی دوایی کردووە.

* (فائیز عەبدولقادر - فائض):-

- کوڕی ناوەندیی شێخ (عەبدولرەحمان خاڵس)ەیە. چوار ساڵ لە شێخ رەزای برای گەورەتر.
- ساڵی (١٨٣٤) یان (١٨٣٥) لە کەرکوك لەدایکبووە. ناوی خۆی (عەبدولقادره)و لە شیعردا نازناوی (فائض)ی بەکارهێناوە.
- خوێندنی مەدرەسەی لە کەرکوك تەواو کردووەو شاعیرێکە لە زمانەکانی (تورکیو کوردیو فارسیو عەرەبی)ی قاڵ بووەو دەسێکی باڵای هەبووە لە ئەدەبیاتی ئەو زمانانە.
- ساڵی (١٨٩٧) یان (١٨٩٨) کۆچی دوایی کردووە.

* (فاتح سەعاتچی):-

- (فاتح کوڕی شاکیر کوڕی ئەحمەد کوڕی سلێمان کوڕی جومعە)یە.
- ساڵی (١٩١٨) لەدایکبووە لە گەڕەکی (ئاغاکان).
- یەکێکە لە شاعیرە تورکمانەکان.

* (فاتیح بابا کەریم):-

- ساڵی (١٩٧٠) لە قادر کەرەم لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٠) پەیمانگای ئامادەی مامۆستایانی تکریتی تەواو کردووە

- ساڵی (١٩٩٢) یەکەم پێشانگای خۆی لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی چەمچەماڵ کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی یادی ئەنفال لە کۆمەڵەی رووناکبیریو کۆمەڵایەتی پارێزگای کەرکوك لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی فیستیڤاڵی کەرکوك لە کەلار.
- ساڵی (١٩٩٩) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی فیستیڤاڵی هونەری چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٠) بەشداری کردووە بە هاوبەشی لە پۆستەر لە شۆڕش بۆ یادی ئەنفال.
- ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری پێشانگای کارەستای ئەنفالی کردووە لە هۆڵی چەرموو لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری لە پێشانگای هاوبەشی یەکەمین فیستیڤاڵی هونەری گەرمیان لە خانەقین.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی کۆمەڵەی هونەرەجوانەکانی کوردستانی لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشی چەمچەماڵ، چرکەساتێك لە یادی کارەساتی ئەنفال.
- ساڵی (٢٠٠٧) بەشداری کردووە لە پێشانگای هاوبەشەی پۆستەر بۆ یادی هەڵەبجەی شەهید ناوبازاری چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٨) بەشداری کردووە لەپێشانگای هاوبەشی فیستیڤاڵی نەورۆز، رێزلێنانی مامۆستایان لە سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠٩) پەیکەری کەمانچەی دروست کردووە لە ناو پارکی پەروەردە نزیك گەراجی شۆڕش.
- ساڵی (٢٠١٠) کاری هونەری دروست کردووە لەسەر پردی مامە ریشە بە کاری ریلیف.
- ساڵی (٢٠١١) پەیکەری شەهید گەرمیانی دروست کردووە.
- ساڵی (٢٠١٢) پەیکەری چوار گۆزەی دروست کردووە لە ناو پارکی (٨)ی ئازار لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠١٣) پەیکەری رێزان حوسێنو کۆرپەکەی لە کورتەك دروست کردووە لە شاری قەڵادزێ.

* (فاتیمە بەیرەقدار):-

- فاتیمە تاهر بەیرەقدار.
- ساڵی (١٩٥٤) لەدایکبووە.
- پەیمانگای هونەرەجوانەکانی لە ساڵانی (١٩٧٧-١٩٧٨) تەواو کردووە.
- یەکێکە لە شێوەکارە بەرچاوەکانی کەرکوك.

* (فاتیمە حەسەن کەنووش - جنونی):-

- کچی شاعیر (حەسەن کەنووش)ەو نازناوی شیعری (جنونی) بووە بە شێوەزای ماچۆیی شیعری هۆنیوەتەوە.

* (فاتیمە خانی قەرەچێواری):-

- فاتیمە خان کچی شێخ حەسەن قەرەچێوارییە، لە دەوروبەری ساڵی (١٨٩٤)ی زایین لە دێی (قەرەچێوار)ی کەرکوك لە ناو خێزانێکی ئایینیا لەدایکبووە.
- ئەم فاتیمە خانە خۆی وباوکی بە خاوەن دیوەخانو تەکیەداری لە ناوی خەڵکدا ناسراون بە درێژایی تەمەنی هەر بە ئامۆژگاری ئایینی وچاکەکردن ژیانی بردووەتە سەر، هەمیشە لە ناو بەگ ومیرەکانی کوردا بەرێزو سەنگین بووە بۆیە بە بەردەوامی تەکیەکەی یان دیوەخانەکەی جمەی ئەهات لە هاتوچۆکەرانو پیاوچاکانی ئەو سەردەمە.
- فاتیمە خان لە ساڵی (١٩٥٩ کۆچی دوایی کردووە

تەرمەکەی لە تەنیشت باوکی لە قادر کەرەم نێژراوە.

* ( فارس فەرەج قەسیرە ):-

- ساڵی (١٩٤٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی لە بەغدا لە ساڵی (١٩٦٧) تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧١) بکالۆریۆسی لە زمانی ئینگلیزی لە زانکۆی ئادابی بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٣) ماجستێری لە وەرگێڕان لە زانکۆی (هریوت وات) لە بەریتانیا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٦) بەڕێوەبەری نووسین بووە لە (دار المأمون).
- ساڵی (١٩٨٧) بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەی (بغداد اوبزرفر) بووە.
- ساڵی (١٩٩٥) کاری بەڕێوەبەری کردووە لە بەشی بڵاوکراوەکانی ئینگلیزی لە (وکالة الانباء العراقیة).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (لغة الدعایة)، نامەی ماستەر، ١٩٨٤
- گەلێك لێکۆڵینەوەی هەیە دەربارەی وەرگێڕان، وەکو:
- (قصص عراقیة)، ١٩٨٧.
- (الحرب والتقدم البشري، دراسة في نشاة الحضارة الصناعیة)، جۆن نیف، ١٩٩٠.

* ( فاروق جەمیل کەریم ):-

- ساڵی (١٩٨٠) لە لەیلان لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لە ڕاگەیاندندا بەدەستهێناوە لە ساڵی (٢٠٠٥).
- کتێبە چاپکراوەکانی: (ڕۆژنامەنووسی لە کەرکوکدا).

* ( فاروق عەلی عومەر - دکتۆر فاروق عەلی عومەر ):-

- ساڵی (١٩٦٧) لە گەڕەکی کۆماری خورماتوو لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لەو شارەدا تەواو کردووە.
- لە کۆلێژی ئەندازیاری وەرگیراوە بەڵام لەبەر نەخۆشی نەیتوانیووە دەوام بکات بۆیە دوای دوو ساڵ دایدەگرێت بۆ کۆلێژی ئەدەبیات بەشی زمانی عەرەبی لە زانکۆی بەغدا، لە دوایدا ماستەریش بە دەستدەهێنێت لە بواری ڕۆژنامەگەریدا.
- لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٤) دا بروانامەی دکتۆرا لە زانکۆی بەغدا لە بواری ڕاگەیاندن بە دەست دەهێنێت.
- لە ژیانی کورتی خۆیدا زۆر ئەشکەنجەو ئازاری بەدەست نەخۆشییەوە بینی هەمیشە بەرێگای نەخۆشخانەکانەوە بوو، بەڵام مرۆڤێکی کۆڵنەوەربوو، زۆر بروای بەخۆی بوو کاتێکیش لە ساڵی (٢٠٠٤) نەشتەرگەریان بۆی کرد زانی تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە، بۆیە تا دوا ساتەکانی ژیانی کۆڵی نەدا.
- لە زمانی کوردی وعەرەبیدا زۆر شارەزابوو.
- لە بواری ڕۆژنامەگەریدا ڕۆژنامەنووسێکی بە توانا بوو بە تاك و تەنیا ڕۆژنامەیەکی دەبرد بەڕێوە هەر بە خۆشی دامەزرێنەری هەردوو ڕۆژنامەی (خورماتوو)و (النبا) بوو، کاتی خۆی لە ڕۆژنامەی (الجمهوریة)و (هاوکاری) کاری دەکرد.
- لە دوایشدا یەکێك بوو لە مامۆستاکانی پەیمانگای ڕۆژنامەگەری لە سلێمانی.
- هەروەها چیرۆکنووس و شاعیریش بوو.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (المطر الناعم-من الشعر الکردي-عبدالله عباس)، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٩٨.
- (فتاة الباندا)، کۆمەڵێك کورتە چیرۆك، بەغدا، ٢٠٠٢.
- لە (٣٠)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٥) کۆچی دوایی کردووە.

* ( فاروق فایق ):-

- ناوی (فاروق فایق عومەر)ە.
- ساڵی (١٩٥٦) لە گەڕەکی بەگلەر لەدایکبووە.
- ساڵانی (١٩٧٢-١٩٧٣) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە بەغدا تەواو کردووە.
- مامۆستا بووە لە داقوق و نۆمەرمەندان.
- ساڵی (١٩٧٥) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی ناوەندی ڕۆشنبیری تورکی.
- ساڵی (١٩٧٦) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە یادی مانگرتنەکەی (گاورباغی).
- ساڵی (١٩٧٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر.
- ساڵی (١٩٧٧) پێشانگای تایبەتی خۆی لە یادی شاعیری تورکمانی (عیماددەین ئەلنەسیمی ئەلبەغدادی) کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٨) پێشانگای هاوبەشی لەگەڵ (سوعاد ستار) و (عەباس عەلی ئەلشەکرچی) کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٨) پێشانگای هاوبەشی لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە کەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٩) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کردووە لەگەڵ (سوعاد ستار) لە هۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەر لە کەرکوك.

- ساڵی (١٩٨٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کردووە.
- ساڵی (١٩٨٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی

هونەرمەندانی کردووە.
- ساڵانی (١٩٨٨-١٩٨٩) هونەری گرافیکی دەربارەی چاپخانە خوێندووە لە سوید.
- ساڵانی (١٩٩٥-١٩٩٦) لە سوید سیرامیکی خوێندووە.

* (فاروق فایق کۆپرلو):-

- ساڵی (١٩٥٣) لە شاری کەرکوك لە (پردێ) لەدایکبووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٦-١٩٧٧) بە کالۆریۆسی زمانی عەرەبی لە کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- گرنگترین کتێبە چاپکراوەکانی:
- (ادبیات الترکمان المعاصرات) بە زمانی تورکمانی، (دار الشؤون الثقافية)، بەغدا، ١٩٩٤.
- (الشمعة)، بریتییە لە کۆمەڵێکی شیعری تورکمانی، چاپخانەی (المرجان)، کەرکوك، ١٩٩٥.
- (صقر على جناح الظلام) تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی شیعری د. عەبدوللەتیف بەندەر ئۆغلو، بەزمانی عەرەبی، (دار الشؤون الثقافية)، بەغدا، ١٩٩٦.
- (ابو العلاء المعري في حلم جميل)، لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر (حەسەن کورەم)، چاپخانەی (المرجان)، کەرکوك، ١٩٩٦.
- (شعراء ترکمان من العراق)، (دار الشؤون العامة)، بەغدا، ١٩٩٨.
- (ترانيم قلب-شعر آلجين اسكندر زاده)، وەرگێڕاوە لە تورکییەوە، کەرکوك، ١٩٩٨.
- (فضولي البغدادي في جهود الدارسين العراقيين)، چاپخانەی (المرجان)، کەرکوك، ١٩٩٩.
- (رباعيات قلب)، کۆمەڵێك قۆریات، چاپخانەی (المرجان)، کەرکوك، ٢٠٠٠
- (الملمعات في الشعر العراقي)، چاپخانەی (الصفاء)، کەرکوك، ٢٠٠١.
- (اسفار وافكار)، چاپخانەی (الصفاء)، کەرکوك، ٢٠٠١.
- (والطيور ايضا رحلت)، ڕۆمانی یەشار کەمال، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (يصدح صوت هابيل)، شیعر، (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ٢٠٠٢.
- (اوراق في مهب الريح)، کۆمەڵە وتار، کەرکوك، ٢٠٠٣.
- (الشعر في عالم المتغيرات)، کەرکوك، ٢٠٠٣.
- (طقوس في مملكة الضاد)، کەرکوك، ٢٠٠٤.
- (من ذاكرة حارتي)، دیوانی شیعری، کەرکوك، ٢٠٠٤.
- (كركوك بين الألم والقلم)، کۆمەڵە وتار، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (على هامش الغروب)، کۆمەڵە وتار، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (المشكلة النحوية تعريف بالملامح وخطوات في التيسير)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (التربية الموسيقية في العراق)، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (إطلالة على الشعر الاذربيجاني)، کەرکوك، (٢٠٠٨).

* (فاروق مستەفا):-

- ساڵی (١٩٤٦) لە گەڕەکی جرت مەیدان لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٣) کۆلێژی ئاداب بەشی زمانی عەرەبی زانکۆی بەغدای تەواو کردووەو بووتە مامۆستا لە قوتابخانەی ناوەندی ئیمام قاسم.

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (قمصان الغيوم المتدلية)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (ارصفة الدفلى واقاليم الغمام)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٤.
- (جماعة كركوك والاستذكارات الناقصة)، چاپی یەکەم کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (ولجيد كركوك باقة من ازهار الخبان)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (طريق الفلى إلى كركوك)، شیعری، کەرکوك ٢٠٠٦.
- (هديل الغمام بين يدي كركوك-امكنة الذاكرة)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (الثمل بعشق كركوك)، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (تسكعات الفقير الكركوكي وايامه المنهزمة-ذاكرة المكان)، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (بريد كركوك الذاهب عشقاً)، شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (قراءات في الأدب القصصي)، کەرکوك، (٢٠٠٨).
- (ذاكرة جرت ميدان-ذاكرة المكان)، کەرکوك، (٢٠٠٨).
- (ما قاله الأصدقاء لكركوك الهاطلة في القلب)، وتار، کەرکوك، ٢٠٠٩.
- (كركوك بيت للدفلى وحديقة للغمام - ذاكرة المكان)، کەرکوك، ٢٠٠٩.
- (في الطريق إلى الشاعر المهندس طيب جبار)، کەرکوك، ٢٠١٣.
- ذاكرة كركوك، ٢٠١٠
- اناس من كركوك، ٢٠١٠
- مصطبة وحيدة امام القلعة، ٢٠١٠
- ادباء وشعراء ومقاه في مذكورات كركوك، ٢٠١٠

- جماعة كركوك التتمات اللاحقة، ٢٠١٢
- منادمات كركوك المتأخرة، ٢٠١٣
- مدخل تعريفي إلى جماعة كركوك، ٢٠١٥
- الأشجار تتعاشق في مرايا كركوك، ٢٠١٥

* ( **فازڵ بەیات** ):-

- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٥) بڕوانامەی (دکتۆرا لە مێژوو) لە زانکۆی ئەنقەرە وەرگرتووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٨-١٩٩٦) مێژوو و زمانی تورکی لە هەردوو کۆلێژی ئاداب و زمانەکان لە زانکۆی بەغدا و لە ساڵانی (١٩٩٦-٢٠٠٢) لە زانکۆی (ئال ئەلبەیت)ی ئوردونی وانەی وتووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (لمحات من تاريخ التركمان في العراق)، بە زمانی تورکی، بەغدا، ١٩٧٥.
- (تاريخ الأدب التركماني في العراق)، بە زمانی تورکی، بەغدا، ١٩٨٤.
- (معجم المصطلحات السياسية والاقتصادية والقانونية والعسكرية، تركي-عربي)، بەغدا، ١٩٩٠.
- (رحلة سهيلة ميرزا اوغلو إلى بلاد الشام، دراسة وترجمة وتحقيق)، لە بڵاوکراوەکانی (ئال ئەلبەیت)، ٢٠٠٠.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٣--٢٠٠٠) لە عێراق و ئوردون شەش کتێبی دەربارەی لێکۆڵینەوەی تورکی بڵاوکردووەتەوە.
- (دراسات في تأريخ العرب في العهد العثماني، رؤية جديدة في ضوء الوثائق والمصادر العثمانية)، بەیروت، ٢٠٠٣.
- (المؤسسات التعليمية في المشرق العربي العثماني، دراسة تأريخية احصائية في ضوء الوثائق العثمانية)، ئەستەمبول، ٢٠١٣

* ( **فازڵ جاف** ):-

- لە کەرکوك لەدایکبووە و هەر لەم شارەدا قۆناغەکانی سەرەتایی و ئامادەیی و دواناوەندی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦٧) بۆ یەکەم جار هاتووەتە سەر تەختی شانۆ.
- ساڵی (١٩٧٧) بەکالۆریۆسی لە شانۆ بەدەستهێناوە لە ئاکادیمیای هونەرە جوانەکان لە بەغدا، لە بەشی دەرهێنانی شانۆیی.

- لە دوای تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ بووە بە ڕاهێنەری هونەری لە ناوەندی ڕۆشنبیری لە زانکۆی سلێمانی.
- لە دوای شەڕی عێراق و ئێراندا پەیوەندی کردووە بە ڕیزەکانی بزووتنەوەی کوردی و لە دواییدا چووەتە ڕووسیا.
- دبلۆمی بەدەستهێناوە لە زانستی شانۆ لە زانکۆی ستۆکهۆلم لە سوید.
- ماستەری لە دەرهێنانی شانۆیی لە زانکۆی لەندەن لە کۆلێژی (گولدسمیس) بەدەست هێناوە.
- دکتۆرای لە زانستی شانۆ لە ئەکادیمیای هونەری شانۆ لە ڕووسیا بەدەستهێناوە.
- لە سلێمانی و کەرکوك بەشداری لە گەلێك شانۆگەری کردووە وەکو ئەکتەر و دەرهێنەر، گرنگترینیان (دایکی شەهید)،(پێشمەرگە)،(راس الشليلة)، (عالم على راحة يدي).
- دەرهێنانی بۆ گەلێك لە شانۆگەرییە جیهانییەکانی کردووە لە عێراق و سوید و بەریتانیا و ڕووسیا و مەغریب، وەکو: (العاصفة الرعدية)، (عودة إلى الصحراء)، (لعبة الحلم)، (الرباط)، (طرطوف)، (النبيان)، (حلم ليلة منتصف الصيف)، (الف ليلة وليلة)، (راشامون)، (اللعب بالنار)، (الموت والعذراء).
- لە سوید گۆڤارێکی تایبەتی بە شانۆ دەرکردووە و هەستاوە بە نووسینی گەلێك کتێب و لێکۆڵینەوە لە بواری شانۆدا، چوار شانۆگەری لە زمانی سویدییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و عەرەبی.
- گەلێك شانۆگەری بۆ منداڵان نووسیوە وەکو (ترێ)، (گەلاوێژ و گورگ)،.
- گەلێك وەرشەی کردووەتەوە بۆ دەرهێنانی شانۆیی بۆ گەلێك شانۆ و تیپ و پەیمانگاو کۆلێژەکان لە سوید و بەریتانیا و فیللەندا و عێراق و ئیتاڵیا.
- بەرهەمەکانی: (ئەزموونی شانۆی مایرهۆڵد)، وەرگێڕانی: عەبدوڵڵا مەحموود و کامەران سوبحان، لە ساڵی (٢٠٠٤) دا لەلایەن دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سەردەمەوە بڵاوکراوەتەوە.

* (فازڵ حەلاق):-

- ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ئەدیب و شانۆکارە لە کەرکوك.
- کتێبێکی چاپکراوی هەیە بە ناونیشانی (الحركة المسرحية في كركوك-تواريخ-اسماء-وثائق)، کەرکوك، ٢٠٠٩.

* (فازڵ عەزاوی):-

- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- شاعیرو ڕۆمانووس و وەرگێڕ بووە، یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی (جماعة كركوك).
- ساڵی (١٩٦٦) بەکالۆریۆسی لە زمانی ئینگلیزی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- دکتۆرای لە ئەڵمانیا لە زانکۆی (لایبزج) تەواو کردووە دەربارەی (کێشە سەرەکییەکانی پێشکەوتنی ڕۆشنبیری عەرەبی).
- ساڵی (١٩٦٩) لەگەڵ چەند ئەدیبێکدا گۆڤاری (شعر ٦٩)یان دەرکردووە کە یەکێك بووە لە دەنگە ئەدەبییەکانی شەستەکان، بەڵام لەلایەن دەسەڵاتی ئەو کاتەوە ڕاوەستێنراوە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٩-١٩٧٦) بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (الف باء) بووە.
- ساڵی (١٩٧١) لە کاتی خوێندنەوەی هەڵبەستێکی بە ناوی (انا الصرخة، اية حنجرة تعزفني؟) لە (جمعية التشكيليين) لە بەغدا، لەلایەن دەسەڵاتی ئەمنی ئەو کاتەوە تووشی لێدان و سزا بووە.
- ساڵی (١٩٧٧) عێراقی بەجێهێشت بەرەو ئەڵمانیا.
- بەرهەمەکانی:
- (أساطير خالدة)، شیعر، کەرکوك، ١٩٥٦.
- (مخلوقات فاضل العزاوي الجميلة)، چیرۆك، چاپی یەکەم نەجەف، ١٩٦٩، چاپی دووەم کولونیا-ئەڵمانیا ٢٠٠٠.
- (القلعة الخامسة)، چاپی یەکەم، دیمەشق، ١٩٦٩، چاپی دووەم، ٢٠٠٠، لە دواییدا کراوە بە فلیم.
- (سلاماً ايتها الموجة سلاماً ايها البحر)، بەغدا، ١٩٧٤.
- (كانت الطائرات تحلق عالياً)، چیرۆك، ١٩٧٤.
- (الشجرة الشرقية)، شیعر، بەغدا، ١٩٧٦.
- (الأسفار)، شیعر، ١٩٧٦.
- (الديناصور الأخر)، ١٩٨٠.
- (الهبوط إلى الابدية بحبل)، چیرۆك، ١٩٨٨.
- (مدينة من رماد)، ١٩٨٩.
- (رجل يرمي احجاراً في بئر)، شیعر، ١٩٩٠.
- (عودة الاستعمار من الغزو الثقافي إلى حرب الخليج)، لەندەن، ١٩٩١.
- (آخر الملائكة)، ١٩٩٢، لە ساڵی (٢٠٠٧ وەرگێڕاوەتە سەر

زمانی ئینگلیزی و ناوەکەی بووە بە (The last of the Angels).
- (صاعداً حتى الينبوع)، شیعر، ١٩٩٣.
- (بعيداً داخل الغابة-البيان النقدي للحداثة العربية)، ١٩٩٤.
- (في نهاية كل الرحلات)، شیعر، ١٩٩٤.
- (صاحب الفخامة الديناصور-رواية خوزيه كاردومو بيريس)، وەرگێڕان، چاپی یەکەم دیمەشق ١٩٩٥، چاپی دووەم دیمەشق ٢٠٠٦.
- (سماء وأرض-شعر ونثر-كيستيان موغنشترن)، وەرگێڕان، ئەڵمانیا، ١٩٩٦.
- (كوميديا الاشباح)، ئەڵمانیا، ١٩٩٦.
- (الروح الحية جيل الستينات في العراق-مذكرات)، بەیروت، ١٩٩٧.
- (فراشة في طريقها إلى الناس)، شیعر، دیمەشق، ١٩٩٨.
- (دماغ لينين-رواية تيلمان شينغلر)، وەرگێڕان، ئەڵمانیا، ١٩٩٨.
- (الاسلاف)، ئەڵمانیا، ٢٠٠١.
- (إعراب تحت سماء غريبة)، شیعر، ئەڵمانیا، ٢٠٠٢.
- (الرجل الذي لا خصال له-رواية روبرت موريل)، وەرگێڕانی کتێبی یەکەم لە ئەڵمانیا ٢٠٠٣، وەرگێڕانی کتێبی دووەم لە ئەڵمانیا (٢٠٠٨).
- (الاعمال الشعرية)، دوو بەش، ٢٠٠٧.
- (عودة الملائكة)، ئەڵمانیا، (٢٠٠٨).
- (حياتي مع بيكاسو)، وەرگێڕان.
- (أصدقاء السوء جماعة كركوك).

* ( فازڵ محەمەد ):-

- ناوی (فازڵ کوڕی محەمەد کوڕی مستەفا شوانی)یە.
- لە سییەکانی سەدەی ڕابردوو لەدایکبووە پەیامنێری گۆڤاری (اهل النفط) بووە لە پەنجاکان.
- کتێبێکی چاپکراوی هەیە لەگەڵ (فەهمی عەرەب ئاغا) بە ناونیشانی (ماذا في كركوك) کە لە سالی (١٩٥٤) چاپ کراوە.
- لە نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو کۆچی دوایی کردووە.

* فازڵ محەمەد قەڵەڵی:-

- ساڵی ١٩٤٣ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- پنار، شیعر ٢٠٠٦
- گورگور بابەدان حەیدەر بابایە سلێمان، ٢٠٠٨
- گولستان، ٢٠١٠
- پارلاك یلدزلەر، ٢٠٠٨
- القدر والحب، کورتە چیرۆك، ٢٠١٤

* ( فازڵ مەهدی بەیاتی - دکتۆر فازڵ مەهدی بەیاتی ):-

- (تورکمن تأریخندن بایراقلر)، بەغدا، ١٩٧٥.
- (سلجو قلر دورینده عراق تورکلر)، ئەنقەرە، ١٩٧٥.
- (تورکجه دیل بیلکسی)، چاپخانەی (الجامعه)، بەغدا، ١٩٨٢.
- (تورکجه دیل بیلکسی ایجین دیل الیتشیر ملاری)، چاپخانەی (چاپخانەی (الجامعه)، بەغدا، ١٩٨٣.
- (اویغولامالی تورك دیل بیلکسی)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٤.
- (عراقده تورکمن ادبیاتی تاریخی ١٩٥٨-١٩٦٨)، چاپخانەی (الأمة)، بەغدا، ١٩٨٤.
- (معجم المصطلحات السياسية والاقتصادية)، بەغدا، ١٩٩٠.
- (الترجمة بين اللغتين التركية والعربية)، بەغدا، ١٩٩١.
- ساڵی ١٩٤٦ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- دراسات في تأريخ العرب في العهد العثماني، ٢٠٠٤
- بلاد الشام في الأحكام السلطانية في الدفاتر المهمة (١٥٤٤-١٥٦٦) وەرگێران، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٦، بەرگی دووەم، ٢٠٠٦، بەرگی سێیەم، ٢٠٠٧.
- الدولة العثمانية في المجال العربي، ٢٠٠٧.
- بغداد من خلال وثائق الأرشيف العثماني، ٢٠٠٨
- البلاد العربية في الوثائق العثمانية، بەرگی یەکەم، ٢٠١٠، بەرگی دووەم، ٢٠١١
- المؤسسات التعليمية في المشرق العربي العثماني، ٢٠١٣
- الموصل من خلال وثائق الأرشيف العثماني والصور التأريخية المحفوظة، ٢٠١٤
- القدس من خلال الصور التأريخية، وەرگێران، ٢٠٠٩

* ( فازیل مەحموود - شێخ فازیل ):-

- ناوی (شێخ فازیلی کوڕی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ محەمەد سالح کوڕی شێخ حەمە ئەمین قازان قایە کوڕی شێخ مەحموود کلێسە کوڕی شێخ سمایلی ولیانی کوڕی شێخ محەمەدی نۆرەدێی کوڕی سەید بابا عەلی کوڕی سەید بابا ڕەسوڵ)ە.
- ساڵی (١٩١٢) لەدایکبووە.
- لە سەرەتادا لە شاری کەرکوکەوە چووەتە شاری خورماتوو ئینجا شاری کفری.
- لە (٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٢) کۆچی دوایی کردو لە شاری کفری لە گۆڕستانی باوە شاسوار نێژراوە.

* ( فانی ):-

- ناوی (عەبدولڕەحمان کەرکوکی)یە، زانایەکی ئایینیەو دەستێکی باڵای هەبووە لە خەتخۆشی و مەقامبێژیدا.

* ( فایق تاڵەبانی ):-

- (شێخ فایق کوڕی محەمەد ڕەئوف کوڕی عەلی تاڵەبانی) یە.
- هەڵبژێردراوە بە نوێنەری کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٣٥) و (١٩٣٩).
- ساڵی (١٩٥٦) کۆچی دوایی کردووە.

* ( فایق سەعید ):-

- ساڵی (١٩٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٥) دەرچووی بەشی ئابووری زانکۆی موستەنسرییە.
- ساڵی (٢٠٠١) بەشی پەروەردەی زانکۆی ستۆکهۆڵمی تەواو کردووە.

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (حەوت رۆژ لەگەڵ قەرەداغیدا)، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٢.
- (دابەشکردنی دەسەڵات)، وەرگێران لە سویدییەوە، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٣.
- (تێکشکانی بەهاکانی خوێندکار)، چاپخانەی ڕەنج، ٢٠٠٤.
- (دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە ئێران)، وەرگێران لە سویدییەوە، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٤.
- (یەکەمین مامۆستا)، وەرگێران لە فارسییەوە، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٥.
- (هەراسانکردنی منداڵ لەنێوان ماڵو قوتابخانەدا)، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٧.
- (قوتابخانەکان ڕوویان لە قیبلە نییە)، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٨.
- (خۆکوژی منداڵ)، چاپخانەی رەنج، ٢٠١٠.
- ستروکتوورەکانی بیرکردنەوە و گەشەسەندنی مەعریفی منداڵان، ٢٠١٥
- پۆستراومای منداڵان: کاریگەرییە دەروونییەکانی جەنگ و تیرۆر ٢٠١٦.

* (**فایق سابیری حەمامچی**):-

- ساڵی (١٩٤٢)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠١٠)دا کۆچی دوایی کردووە.
- لە بواری وەرزشو چالاکی هونەریدا دەستێکی باڵای هەبووەو هونەری نەخشی لەسەر میتال هەڵکەندووەو گەلێك تابلۆی هونەری هەبووەو تیپێکی شانۆییشی دامەزراندووە.
- دوو دیوانی شیعری چاپکراوی هەیە:
- (النار المرة)، شیعر بە زمانی عەرەبی، کەرکوك، ٢٠٠٣،
- (عاشقلار)، شیعر بە زمانی تورکی.

* (**فایق عومەر ڕەسوڵ**):-

- یەکێکە لە شێوەکارەکانی شاری کەرکوك.
- ساڵی (١٩٥٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٠) لە بەغدا دبلۆمی لە پەیمانگای هونەری تەواو کردووە.
- لە ساڵی (١٩٨٨)ەوە لە نەمسایە.
- لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٠-٢٠٠٥) تابلۆکانی گەیشتۆتە ئاستی گەلەرە هونەرییە جیهانییەکان لە ڤیینا-نەمسا.
- شوێنی گەلەرییەکانی:
- ڤیینا گەلەری (AAI)، ساڵی (١٩٩١).
- زانکۆی وارشۆ-پۆڵەندا، ساڵی (١٩٩٢).
- ڤیینا گەلەری کارل شتروبل، ساڵی (١٩٩٣).
- ڤیینا گەلەری لە سیلیستا، ساڵی (١٩٩٤).
- هۆڵەندا گەلەری مانا، ساڵی (١٩٩٥).
- ڤیینا گەلەری شیکا، ساڵی (١٩٩٧).
- ڤیینا گەلەری تولیراتر، ساڵی (١٩٩٨).
- ڤیینا گەلەری کاراگو، ساڵی (١٩٩٩).
- ڤیینا گەلەری میدونا، ساڵی (٢٠٠٠).
- ڤیینا گەلەری ووشەو وێنە، ساڵی (٢٠٠١).
- ڤیینا گەلەری ووشەو وێنە، ساڵی (٢٠٠٣).
- سالیزبورغ گەلەری هونەر، ساڵی (٢٠٠٤).

- ڤیینا گەلەری شپیك تاگل، ساڵی (٢٠٠٤).
- ڤیینا گەلەری ئوری ئوك، ساڵی (٢٠٠٤).
- سالیزورغ گەلەری جیهانی، ساڵی (٢٠٠٥).
- ڤیینا گەلەری ئوری ئوك، ساڵی (٢٠٠٦).
- ڤیینا گەلەری رین ئوسل، ساڵی (٢٠٠٦).

* (**فایق مستەفا ئەحمەد چەقماچی - دکتۆر فایق مستەفا ئەحمەد چەقماچی**):-

- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ماجستێرو دکتۆرای لە ئەدەبی شانۆ لە قاهیرە لە ساڵی (١٩٧٧) بەدەستهێناوە.
- بەرهەمەکانی:
- (اثر التراث الشعبي في الأدب المسرحي النثري في مصر ١٩١٤-١٩٥٢)، بەغدا، ١٩٨٠.
- (من بواكير المسرح الشعري العربي)، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی ئەلموستەنسریە، ١٩٨٤.
- (اثر الف ليلة في المسرح العراقي المعاصر)، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی ئەلموستەنسریە، ١٩٨٥.
- (شهريار في المسرح العربي الحديث)، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی ئەلموستەنسریە، ١٩٨٥.
- (الأدب العربي الحديث، دراسة في شعره ونثره)، زانکۆی موسڵ، ١٩٨٧.
- (في النقد الأدبي الحديث، منطلقات وتطبيقات)، موسڵ، ١٩٨٩.
- (في ذاكرة المسرح العربي)، بەغدا، ١٩٩٠.
- (دفاع عن المقالة الأدبية)، کەرکوك، (٢٠٠٨).

* (**فایق نەجار**):-

- ساڵی (١٩٢١) لە گەڕەکی (سەقاخانە) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە بواری خوێندنی مەقامو قۆریاتدا دەستێکی باڵای هەبووە، شارەزایی تەواو هەبووە لە ڕاهێنانی کەسانی تر لەسەر خوێندنی مەقامو قۆریات.
- ساڵی (١٩٥٤) کاسێتێکی گۆرانی بۆ ماوەی (٤٥) دەقیقە

تۆمار کردووە لەگەڵ هاورێیەتی (عەبدولواحید گوزەچی)و (عەبدولرەحمان قزلئای).
– ساڵی (١٩٥٩) چوار گۆرانی لە کاتی کردنەوەی ئێزگەی تورکمانی لە بەغدا تۆمار کردووە.
– ساڵی (١٩٦٣) بۆ ماوەی دوو سەعات گۆرانی تۆمار کردووە لەگەڵ (تۆپال پاشا).
– ساڵی (١٩٦٤) بۆ ماوەی دوو سەعات گۆرانی تۆمار کردووە لەگەڵ (محەمەد ئەحمەد ئەربیلی)و (مشکۆ)و (محەمەد قەلایی).
– لە شوباتی ساڵی (١٩٩٦) بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

* (فەتاح ئاغای کاکەیی):-

– ساڵی (١٨٩٠) لە کەرکوك لە ئاوایی (لاسین)ی داقوق لەدایکبووە.
– (فەتاح ئاغا کوڕی سەید خەلیل کوڕی سەید محەمەد کوڕی سەید ئیبراهیم)ە.
– یەکێکە لەوانەی کە بایەخی داوە بە خوێندن لە دێییەکەی خۆی قوتابخانەی کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٥٤) کۆچی دوایی کردووە لە گۆڕستانی (ئیمام ئەحمەد) لە کەرکوك نێژراوە.

* (فەتاحی بانی مۆردی - مەلا شێخ فەتاحی بانی مۆردی):-

– ناوی (مەلا شێخ فەتاحی کوڕی شێخ مەحمودی بانی مۆردی)یە، ناسراو بە (شێخ مەحمودی گەورە) کە دەچێتەوە سەر (شێخ ئیبراهیمی بانی مۆردی)، ئەویش کوڕی شێخ ئەحمەدی بۆن خۆشە.
– لە گوندی بانی مۆرد لە بناری چیای سەگرمە لەدایکبووە.
– لە دەوروبەری (١٩٣٠-١٩٣١) کۆچی دوایی کردووە.

* (فەتحوڵڵا عیزەت):-

– (فەتحوڵڵا کوڕی عیزەت ئاغا کوڕی مەجید ئاغا)یە.
– ساڵی ١٩٣٦ لە گەڕەکی زێوبە لەدایکبووە.
– خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە ئیمام قاسم تەواو کردووە، ئامادەیی لە قوتابخانەی (المرکزیة) لە کەرکوك تەواو کردووە.
– ساڵی ١٩٦٠ – ١٩٦١ دەستی بە خوێندنی یاسا کردووە لە کۆلێژی یاسا.
– ساڵی ١٩٦٣-١٩٦٦ لە زیندانەکانی ڕژێمی بەعس بەند دەکرێت.
– ساڵی ١٩٦٨ دووبارە دەست دەکاتەوە بە خوێندن و لە ساڵی ١٩٦٩ وەك پارێزەر دەردەچێت و لە بەغدا کاری پارێزەری دەکات
– کادرێکی پێشکەوتووی حیزبی شیوعی بووە و ئەندامێکی چالاك بووە لەنێو شاری کەرکوکدا و ئەندامی کۆمیتەی کەرکوك و بەرپرسی دەڤەری شوان بووە.
– ساڵی ١٩٧٢ لەلایەن ئەمنی ڕژێمەوە لە شەقامی ئەتڵەس دەستگیر دەکرێت و لە دوایدا لەناو دەبرێت.

* (فەتاح پاشا-ئەمیر ئەللیوا):-

– (فەتاح کوڕی سلێمان پاشا)یە، لە بەغدا لەدایکبووە، لە بنەرەتدا خەڵکی خورماتووە.
– ساڵی (١٨٦١) لەدایکبووە.
– پیاوێکی سەربازیو کارگێڕی عوسمانییەکان بووە.
– قوتابخانەی سەربازی ئەستەمبولی تەواو کردووەو بەنیشانەی (ضابط رکن) شەهادەی بەدەستهێناوە کە بەردەوام بووە تا گەیشتۆتە (ئەمیر ئەللیوا) لە سوپای عوسمانی.
– ساڵی (١٩١٤) خانەنیشین کراوە.
– ساڵی (١٩٢١-١٩٢٤) موتەسەڕیفی لیوای کەکوك بووە.

- ساڵی (١٩٢٦) لەگەڵ کوڕەکەی (نوری بەگ) کارگەی رستن‌و چنینی لە (کازمیە) دامەزراندوە کە یەکێك بووە لە کارگە پێشکەوتووەکانی لەو سەردەمەدا.
- ساڵی (١٩٣٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (**فەتاح جەباری - مەلا فەتاح جەباری**):-

- (مەلا فەتاح کوڕی سەید مستەفا کوڕی سەید ئیسماعیل کوڕی سەید جانی کوڕی سەید عەبدولجەبار)ە.
- ساڵی (١٨١٠) لە دێی بانگۆڵ لە سەرووی ڕۆژهەڵاتی کەرکوك لەدایکبووە.
- سەر بە عەشیرەتی جەباری ناوچەیی کەرکوکە.
- شاعیرێکی گەورەیەو ژیاوە لە نیوەی یەکەمی سەدەی چواردەهەمی کۆچی.
- ساڵی (١٨٧٨) لە دێی (تاوێر بەرز) کۆچی دوایی کردووە

* (**فەتاح قەڵەو- حاجی خڕە**):-

- خەڵکی کفرییەو لە عەشیرەتی قەرەداغییەکانە.
- ساڵی (١٩٠٧) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٢) کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێك بووە لە بازرگانە دەولەمەندەکانی شاری کفری.

* (**فەتاحی کۆسەر - حاجی فەتاحی کۆسەر**):-

- یەکێك بووە لە دەوڵەمەندەکانی شاری کفری لەسەرەتای سەدەی بیستەم.
- ساڵی (١٩١٩) لە گرانییە گەورەکەدا گەنم‌و خورمای زۆر لە بەغداوە هێناوە بۆ کفری‌و بە نرخێکی کەم فرۆشتوێتی بە خەڵکەکە.

* (**فەتاح مەحموود مەللاك چۆڵەکی - مامە فەتاح مەحموود مەللاك چۆڵەکی**):-

- ساڵی (١٩١٣) لە ئاوایی (عەرەب کۆیی) داقوق لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩١٥) ماڵی باوکی لە ئاوایی ناوبراو گوێزراونەتەوە بۆ ئاوایی (عەبدوڵڵا غانم) تا ئێستا لەوێ ماون‌و بەکاری کشتوکاڵی‌و مەڕوماڵات بە خێوکۆدنەوە خەریکن.
- ساڵی (١٩٥٥) ژنی هێناوە وپێنج کوڕو کچێکی هەیە.
- شارەزایی هەیە لە مەقامەکانی ئەڵڵاوەیسی‌و قەتارو خاوکەرو و خاوخۆش، خورشیدی، ئای ئای.
- شارەزایی هەیە لە گۆرانییە کۆنەکانی باوباپیران وەکو یارغەزال، سەوزە هۆسەوزە، خاڵوی ڕێبوار، هۆکاکی جووتیار هەی ئار هەی ئار.

* (**فەتحی سەفوەت قیردار**):-

- ساڵی (١٨٩٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە خێزانی قیردارەکانی کەرکوکە کە باوکی ناوی (محەمەد سەعید چەلەبی) بووە کە یەکێکە لە بازرگانە دەولەمەنەکانی کەرکوك.
- یەکێکە لە شێوەکارە بە تواناکانی ئەم سەردەمەی خۆی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (تربیە بدنیە ومکتب اوینلری) چاپخانەی (صنایع) کەرکوك، ١٩١٤.
- (نماذج الاشغال الیدویة) بەغدا، ١٩٢٩.
- لە تەمموزی ساڵی (١٩٦٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (**فەتۆش - مەلا فەتۆش**):-

- ناوی (فەتحوڵڵای کوڕی حەوێش کاکەیی)ە، بەتیرە لە بنەماڵەی (خوبیلەزادە)یە.
- ساڵی (١٨٦٣) لە شاری کەرکوك لە گەڕەکی (چای) هاتووەتە دنیاوە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٦٦) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- لەلای مام پیرەوەیسی کاکەیی نراوەتە بەر خوێندن.
- ساڵی (١٨٨٧) بەهۆی دەست کورتیەوە لە کەرکوك دەگوێزرێتەوە بۆ ئاوایی (تەرجیل) لەوێ بەکاری کشتوکاڵییەوە خەریك دەبێت بۆ ماوەی چوار ساڵ وئینجا دەچێتە گوندی (زەنقر).
- دوای ماوەیەك دەگەڕێتەوە کەرکوك وبە دووکانی دارتاشیەوە خەریك دەبێت.
- وادەگێڕنەوە گوایە باوك ودایکی هەر لە منداڵییەوە بە (فەتۆش) بانگیان کردووە، بۆیە شاعیر ئەم ناوەی بە لاوە پەسەند بووەو کردوویە بە نازناوی خۆی‌و سروودو هۆنراوەی لەسەر دارشتووە، بەڵام جارجاریش بە ناوی خۆیەوە شیعری دەنووسی.
- مەلا فەتۆش بە یەکێك لە ناودارانی کەرکوکی ئەوڕۆژگارە دەژمێردرێت، لە لای کاکەییەکان پلەو پایەی بەرزی هەبووە، شیعرەکانی بە شێوەی ماچۆیی (گۆران) دارشتووە.
- شاعیر لە شاری کەرکوك لە گەڕەکی (پیرپادی) قوتابخانەیەکی تایبەت لە سەر ئەرکی خۆی لە ماڵەکەی خۆیدا کردووەتەوەو فرە کەسی لە نەخوێندەواری ڕزگار کردووە.
- ساڵی (١٩١٩)ی زایینی کۆچی دوایی کردووەو لە گۆرستانی (موسەڵلا) بە خاك سپێردراوە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٩٢٠) بە ساڵی کۆچکردنی دادەنێن.

* ( فەخری جەلال ):-

- ساڵی (١٩٤٠) لە گەڕەکی چای لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٤) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦٦) بووەتە مامۆستای ڕەسم لە قوتابخانەی ئیمام قاسم.
- بەشداری پێشانگای یەکێتی مامۆستایانی کەرکوکی کردووە لە یانەی مامۆستایانی کەرکوك، لە ڕۆژانی (١-٧) ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٣).

* ( فەخرەددین عەلی ڕەزا - هەردی ):-

- ناسراو بەهەردی.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٢)ی گوندی دووشیوان لە ناحیەی شوان.
- ساڵی (١٩٧٥) خێزانەکەی گواستییەوە بۆ کەرکوك و لە گەڕەکی قۆریەو دواتر لە گەڕەکی حەمام عەلی بەگ نیشتەجێ بوو. لەوێ لەڕێی کرێکارییەوە بەشدار بوو لەیارمەتیدانی خێزانەکەی بۆ دابینکردنی بژێوی ژیان.
- سەرەڕای دواکەوتنی لە خوێندن، مەراقی خوێندن بوو، تینی دایە خۆی و بەم هۆیەوە لە خوێندنگەی ئێوارانی ئیمام قاسم قۆناغی سەرەتایی تەواو کرد.
- ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد. ساڵی (١٩٨١) ئەم پەیوەندییەی لەلای دەزگای ئەمنییەکان ئاشکرا بوو، بەهۆی ئەمەوە دەستگیر کرا، بەڵام پاش مانگێك ئازاردان، لەبەر خۆراگری و نەدرکاندنی هیچ نهێنییەك و نەبوونی بەڵگە لەسەری، ئازاد کرا، پاش ئازادبوونی، لەمانگی حوزەیراندا پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە کەرتی یەکی ساڵەیی لە هەرێمی ٢ی کەرکوك بوو بە پێشمەرگە.
کاتێك هەرێمەکان هەڵوەشێنرانەوەو پەیڕەوی لە سیستمی تیپەکان کراو تیپی ٢١ی کەرکوك پێکهات، چووە کەرتی ٣ی چەمچەماڵ و دواتریش کرایە جێگری فەرماندەی کەرتی ٢ی شوان. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا ئەرکەکانی پێشمەرگایەتیی بەڕێکوپێکی جێبەجێ کردووە.
- لە چالاکییەکی تیپی ٢١ی کەرکوکدا بۆ تۆڵەی شەهید کردنی مامە ریشە، لە ٣١ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٥) لە گوندی تەعریبکراوی گورزەینی ساڵەیی بەسەختی بریندار بوو، بۆ بەیانییەکەی پاش ململانێیەکی سەخت لەگەڵ مەرگدا شەهید بووو تەرمەکەی لە گوندی دووشیوان بەخاك سپێردرا.

* ( فەخری نووسرەت پاڵەوان ):-

- یەکێك بووە لە پاڵەوانەکانی شاری کەرکوك لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن.

* ( فەرمان نەبەرد ):-

- یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك، کە شیعرێکی لە ژمارە (١) گۆڤاری گزنگ بڵاوکراوەتەوە، بەڵام هیچ زانیارییەکی ترمان دەربارەی نییە.

* ( فەرهاد حەمزە محەمەد ):-

- ساڵی (١٩٦١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- دەرچووی بەشی جیۆلۆجی کۆلێژی زانیاری زانکۆی سەلاحەدین لە ساڵی (١٩٨٤).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (مێژووی خەباتی گەلی ڤێتنام)، ١٩٨٤.
- (فاشیزم و خوێنی گەلە چەوساوەکان)، ١٩٨٥.
- (سێ ئەنترناسیۆنالەکە جیهان)، لە (هەڵەدن)، ١٩٨٥.
- (CIA حکومەتە نادیارەکەی ئەمریکا)، ٢٠٠٠.
- (مێژووی نەوتی کەرکوك)، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦.

- (نەوت و کورد و کەرکوك)، ٢٠١١.
- LOG ANALYSIS IN CARBONATE ROCKS)، ٢٠١١.
- (مێژووی نەوتی کەرکوك)، ٢٠١٢.

* (فەرهاد شاکەلی):-

- (فەرهاد محەمەد سلێمان شاکەلی).
- سالی (١٩٥١) لە دێی شاکەل لەدایکبووە.
- شاعیرو زمانەوان‌و ئەکادیمیکارە، یەکێکە لە ڕێبەرانی بزووتنەوەی نویخوازیی سالأنی حەفتاکان لە شیعری کوردیدا.
- لە قۆناغی خوێندنی دواناوەندیدا دەستی بەبلأوکردنەوەی هۆنراوەو وتار کردو هەر لەو قۆناغەشدا بناغەی ئاشنایەتیی لەگەل بیروباوەڕی مارکسیزمدا داناو لە سالأنی دواتردا زۆرتر بەلای ماویزمدا دایشکاند.
- سالی (١٩٧١) لەبەشی زمانی کوردیی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا وەرگیرا.
- سالی (١٩٧٣)دا یەکەم دیوانی شیعری بەناونیشانی (پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی) بلأوکردەوە. لەم قۆناغەی ژیانیدا، لەبەغدا لە هەفتەنامەی (برایەتی) کاری کردووەو هەروەها ئەندامی لقی بەغدای کۆمەلی هونەرو وێژەی کوردی بووە.
- سالی (١٩٧٤) لەگەل هەرەسهێنانی ئاگربری چوار سالەی نێوان کوردو حکومەتی عێراقدا، بەغدای بەجێهێشت‌و پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کرد. پاش ئەوەی شۆڕش شێوە حکومەتێکی لە ناوچەکانی دەرەوەی دەسەلأتی حکومەتی عێراق پێکهێناو چەند دەزگایەکی دامەزراند لەوانە ئەمانەتی ڕۆشنبیری‌و لاوان، لەو ئەمانەتە بەفەرمانبەر دامەزراو ماوەیەك وەك نووسەر لەرادیۆی دەنگی کوردستان کاری کردو وتاری بە زمانی کوردی‌و عەرەبی دەنووسی. لەو ماوەیەدا بەشدار بوو لە دامەزراندنەوەی یەکێتیی نووسەرانی کوردو بووە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر تێیدا. لەڕووی سیاسیشەوە، هەر لەو ماوەیەدا پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردو ڕاستەوخۆ لەگەل سکرتێری کۆمەلە شەهاب شێخ نوری کاری کرد.
- لە سەروبەندی هەرەسهێنانی شۆڕشدا لە سالی (١٩٧٥) پشتگیریی پرۆژەی درێژەپێدانی شۆڕشی کرد، بەلأم پاش شکستی پرۆژەکە، لەسەید سادق خۆی رادەستی هێزەکانی عێراق کردو دواتر گەڕایەوە بۆ بەغدا بۆ تەواوکردنی خوێندنی.
- لەبەغدا بەردەوام بوو لەسەر هەلسووڕانی سیاسیی خۆی‌و ماوەیەك سەرپەرشتیی ڕێکخستنەکانی بەغداو خانەقین‌و باشووری عێراقی کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کرد. هەر ئەو سالە، دوای گیرانی چەند ئەندامێکی ڕێکخستن‌و زیادبوونی مەترسیی گیرانی، لەگەل هەر یەك لە برایم عەزۆو برایم عەبد عەلی لە سنووری نێودەولەتیی عێراق - سووریا پەڕییەوەو لە سووریا پەیوەندیی بە تالەبانی‌و دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد.
- لە سووریا بەشدار بوو لەدابین کردنی پێداویستییە لۆجستیکییەکانی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار لە کوردستانداو ئەو مەفرەزەیەی کە لە سالی (١٩٧٦) دا بەسەرکردایەتیی برایم عەزۆ گەڕایەوە بۆ کوردستان، ئەوو نەجمەددین بیوك کایا بەشدار بوون لە پێگەیاندن‌و پەروەردەکردن‌و بەڕێ کردنی بۆ کوردستان.
- لە تشرینی دووەمدا لەگەل هێزێکی پێشمەرگەدا بەناو کوردستانی باکووردا بەڕێ کەوت بەرەو ناوچەی بادینان بەلأم پلانەکە سەری نەگرت‌و هێزەکە، پاش نەهامەتییەکی زۆر، گەڕایەوە بۆ سەری کانی لە سووریا.
- پاش شکستهێنانی پلانەکە، شاکەلی بڕیاری دا واز لە سیاسەت بێنی.
- سالی (١٩٧٧) لە بەیروت گیرسایەوەو دواتر چوو بۆ ئەلمانیای ڕۆژئاواو لە شاری هامبۆرگ ژیا. سالی دواتر ئەلمانیای بەجێهێشت‌و ڕووی کردە سوید. لەوێ لە زانکۆی ئۆپسالا دەستی بەخوێندن کردو بڕوانامەی دکتۆرای تێدا بەدەستهێنا. دواتر بوو بەمامۆستا لەو زانکۆیە. دیارترین بەرهەمی، ماستەر نامەکەیەتی سەبارەت بە (ناسیونالیزمی کوردی لە مەم‌و زینی خانیدا)و تێزی دکتۆراکەی دەربارەی (پەخشانی هونەریی کوردی)یە.
- لە هاوینی سالی (١٩٧٨)ەوە تا ئێستا لە سوید دەژی، مامۆستای زمان‌و ئەدەبی کوردییە لە زانکۆی (ئۆپسالا) لە سوید.
- هەشت دیوانی شیعرو کۆمەلە چیرۆکێك‌و دوو لێکۆلینەوەی زانستی‌و نزیکەی دە کتێبی وەرگێرانی بلأوکردووەتەوە، بەشێك لە شیعرو چیرۆك‌و لێکۆلینەوەی گۆڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی، فەرەنسی، سویدی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئیتالی، نۆروویژی، تایلاندی‌و ئیسلاندی.
- کۆمەلێك لێکۆلینەوەی زانستی لەسەر ئەدەبی کوردی‌و تەسەووف بە ئینگلیزی بلأوکردووەتەوە.
- بەرهەمەکانی:
- (پرۆژەی کۆدەتایەکی نهێنی)، شیعر، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٣، چاپی دووەم، کوردستان، ٢٠٠٠.
- (ڕووبارە تیشکێك لە هەتاوی سوورەوە)، شیعر، بەیروت، ١٩٧٧.

- (هەوران)، شیعر، ئوپسالا، ١٩٨١.
- (ژێ)، شیعر، (بەناوی فەرهاد شاکەلی)، چاپی یەکەم، سوید، ١٩٨٥، چاپی دووەم کوردستان، ٢٠٠٠.
- (فرمێسك و هونەر)، وەرگێرانی ٢٠ شیعری گۆرانە لە کوردییەوە بۆ سویدی، بە هاوکاری (بەختیار ئەمین) و (لارش بێکسترۆویم)، ستۆکهۆلم، ١٩٨٥.
- (بۆنی هەوری وڵاتەکەم)، وەرگێرانی شیعری چواردە شاعیری کوردە لە کوردییەوە بۆ سویدی، بە هاوکاری چەند وەرگێری کورد و سویدی، ستۆکهولم، ١٩٩١.
- (نیگاری تۆ لە دیواری زیندانەکەم هەڵدەکۆڵم)، چاپی یەکەم، سوید، ١٩٩٤، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (بۆریس پاستێرناك)، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە، چاپی یەکەم، سوید، ١٩٩٥، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (بۆنی تاریکی)، چیرۆك، چاپی یەکەم، سوید، ١٩٩٧، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٠.
- (پەخشانی هونەریی کوردی)، رۆهات ئالاکۆم، وەرگێران، ئەستەمبول، ١٩٩٨.
- (ئاوگوست ستریندبێرگ)، پاریا (شانۆنامە)، وەرگێران لە سویدییەوە و نووسینی پێشەکی بۆی، چاپی یەکەم، مالمۆ، ٢٠٠٠، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، کوردستان، ٢٠٠١.
- (هەموو رازێ من ئاشکرایە و هەموو ئاشکرای تۆ راز)، شیعر، چاپی سێیەم، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (ئەم چرایە دلم رووناك دەکاتەوە و تەمەنم دەسووتێنێ)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان، کوردستان، ٢٠٠٦.
- (زمانی گەردەلوول خەونی شنەبا)، کۆمەڵەوتار، ستۆکهۆلم، سوید، ٢٠٠٨.
- (زمانی کوردی لە ئاستانەی سەردەمێکی تازەدا)، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (بڵاچەیەك درز دەخات تاریکە شەوی تەمەنم)، ٢٠٠٩.
- (دەرزیئاژن)، ٢٠٠٩.
- (دەنگی رووناکی لە گێتیپەکەی تاریکیدا)، ٢٠١٠.
- (کە بازنەو لاکێشەکان هەڵدەوەشێنەوە)، ٢٠١٠.
- (نیلسۆن ماندێلا)، ٢٠١٠.
- (لاپەرەیەك لە ئەزموونی رووناکبیرانی کورد، رەفیق حیلمی)، ٢٠١٠.

*** فەرهاد عەبدولعەزیز:-**

- یەکێکە لە نووسەرەکانی چەمچەماڵ، نامەی ماستەری هەیە بەناونیشانی:- (ناوچەی چەمچەماڵ لەنێوان ساڵانی هەردوو شەری جیهانیدا (١٩١٨- ١٩٣٩)، بارودۆخی کۆمەڵایەتی، رامیاری و رووناکبیری، (٢٠١٣).

*** فەریدون عەبدولقادر تالب تالەبانی:-**

- ساڵی ١٩٥٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٥ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٥٤ بەناونیشانی (مشاة).
- ساڵی ٢٠١٤ بە پلەی لیوا لە وەزارەتی پێشمەرگە خانەنشین کراوە.

*** فەرەیدون عەبدولقادر:-**

- ناوی فەرەیدون عەبدولقادر فەرەج.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٧)ی گەرەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك.
- لەکاتی لەدایکبوونیدا باوکی لە سلێمانییەوە وەك کارمەندی حکومەت بۆ کەرکوك گوێزرایەوەو لە فەرمانگەی دادگای چارەسەری کێشەی زەوی و زار کاری دەکرد. ساڵی (١٩٤٨) ماڵیان گەرایەوە بۆ سلێمانی.
- هەرسێ قۆناغی خوێندنی لە سلێمانی تەواو کردووەو لە ساڵی (١٩٦٥)دا لە بەشی کۆمەڵناسیی زانکۆی موستەنسریەی بەغدا وەرگیراوە.
- سەرەتایی ژیانی سیاسیی بۆ ساڵی (١٩٦٢) دەگەرێتەوە، کاتێك بوو بە ئەندام لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و دواتریش پەیوەندیی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی (١٩٦٤) لەکاتی سەرهەڵدانی قەیران و دووبەرەکی لەناو سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستاندا، لەگەڵ چەند هاورێیەکیدا هەوڵی ناوبژیوانیان لەنێوان هەردوو باڵی نەیاردا، بەڵام هەوڵەکەیان هیچی لێ سەوز نەبوو. بەڵام لەدواییدا بەلای باڵی مەکتەبی سیاسیدا دای شکاند.
- ساڵی (١٩٦٧) بەدواوە وردە وردە کەوتە ژێر کاریگەریی بیروباوەری چەپی شۆرشگێرو دەستی بە خوێندنەوەی ئەدەبیاتەکانی ئەم رێبازە کرد.
- ساڵی (١٩٦٩) بووە ئەندامی لیژنەی بەغدای یەکێتیی قوتابیانی کوردستان سەر بەباڵی مەکتەبی سیاسی.
- ساڵی (١٩٧٠) خۆی و شەهاب شێخ نوری و فازڵ مەلا مەحموود کەوتنە بانگەشەکردن بۆ پرۆژەی دامەزراندنی رێکخراوێکی چەپی شۆرشگێرو لەم سەروبەندەدا بەشدارییەکی کاریگەری لەم کۆبوونەوانەی بەغدادا کرد کە دواتر پێکهێنانی کۆمەڵی مارکسی - لینینیی کوردستانیان لێکەوتەوە. دوای دامەزراندنی کۆمەڵە، بووە یەکێ لە ئەندامی سەرکردایەتی لەو ماوەیەدا کاری لێپرسراوانەی بۆ تۆکمەکردنی رێکخستنە نهێنییەکان کردو لێپرسراوەتیی

ڕێکخستنەکانی کەرکوکی گرتە ئەستۆ. لەم سەروبەندەشدا داوای لێ کرا ماڵی بباتە کەرکوك‌و لەوێ نیشتەجێ بێ تاکو باشتر سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی ئەوێ بکات.

- لەکاتی سەرهەڵدانی قەیرانی ناسنامەی لەناو کۆمەڵەدا، پشتگیریی ڕێبازی کوردستانیی کردو ڕێبازی بە عێراقی کردنی هەڵسوورانی کۆمەڵەی ڕەتکردەوە.

- ساڵی (١٩٧٢) پاش چوونی تاڵەبانی‌و شەهاب شێخ نوری بۆ دەرەوەی وڵات، زۆربەی ئەرکەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە کەوتنە سەر شانی، بۆیە کەوتە فراوان کردنی سەرکردایەتی بە جۆرێك کە هەر یەك لە جەعفەر عەبدولواحیدو ئارات عەبدولغەفورو محەمەد میرزا سەعیدی بردە ناو کۆمیتەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە.

- لەو ماوەیەدا هەندێ وتاری بۆ ڕونکردنەوەی هەڵویستی کۆمەڵە سەبارەت بە هەندێ مەسەلە بۆ ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان‌و ئەندام‌و کادیرانی کۆمەڵەنووسی‌و هەروەها سەرپەرشتی دەرکردنی ڕۆژنامەی (ئاڵای سوور)ی کرد کە بەیەکەم ئۆرگانی کۆمەڵە دادەنرێ.

- ساڵی (١٩٧٣) بەکارمەند لە شارەوانیی کەرکوك دامەزراو لە ساڵی (١٩٧٤) لەسەروبەندی دەستپێکردنەوەی شەر لەنێوان کوردو حکومەتی عێراقدا، وازی لە کارەکەی هێناو پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کرد.

- پاش دامەزراندنی دەزگا کارگێرییەکان لەناوچەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتی عێراق، ئەرکی سەرۆکی شارەوانییەکانی پێ سپێردراو دواتر لەناوچەی پێنجوێن گیرساپەوە.

- ساڵی (١٩٧٥) پاش هەرەسهێنانی شۆڕش، گەڕاپەوە بۆ سلێمانی‌و کەوتە کارکردن بۆ سەقامگیرکردنی ڕایەڵەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە. لە حوزەیرانی ئەو ساڵەدا سەرکردایەتیی کۆمەڵە ڕایسپارد سەردانی سووریا بکاو لەوێ چاوی بە تاڵەبانی بکەوێ بۆ دروستکردنی هەماهەنگی لەنێوان هەڵسوورانی سیاسیی ناو وڵات‌و دەرەوەی وڵات‌و دابینکردنی پێداویستییەکانی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار لە کوردستاندا، بەڵام ڕێکخستنی دیدارەکە دواکەوت‌و کەوتە مانگی ئابەوەو شوێنی دیدارەکەش لە سووریاوە گوێزرایەوە ئەڵمانیا. پاش گەڕانەوەی بۆ سلێمانی، بەسەر هەڵومەرجێکی دژواردا کەوت، چونکە بەشێکی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانەوە ئاشکرا ببوون‌و ڕەوشی ڕێکخستنەکان شپرزەیی‌و شێواویی پێوە دیار بوو.

- هەر ئەو ساڵە لەگەڵ سەرکردەکانی تری کۆمەڵە کە فەرمانی گرتنیان لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانەوە بۆ دەرچوو بوو، چوو بۆ ئێران. بەپێی ئەو نەخشەیەی کە سەرکردایەتی کۆمەڵە دایینابوو، نیاز وابوو لە تاران پەیوەندی بەباڵیۆزخانەی سووریاوە بکرێ‌و لە ڕێی سوورییەکانەوە بنێردرێن بۆ سووریا، بەڵام ئەندامانی تیمەکە لە ئێران دەستگیر کران‌و بە تۆمەتی دزەکردنە ناو خاکی ئێران درانە دادگاو لە سەقز زیندانی کران، پاش تەواوکردنی ماوەی زیندانی کردنەکە، لەسەری ساڵی (١٩٧٦)دا لە سنووری پێنجوێن ڕادەستی عێراق کرانەوە.

- لە بەغدا لەگەڵ پۆلێك ئەندامی دیکەی کۆمەڵەدا، لە تەموزی (١٩٧٦) بەپێی ماددەی (١٧٥)ی یاسای سزای بەغدادی دادگایی کراو شەش ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنرا. بەڵام لە ئابی (١٩٧٩) بەلێبوردنی گشتی ئازاد کراو لە تشرینی یەکەمدا لە چەمی ڕێزانەوە پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردو لەوێوە چوو بۆ ناوزەنگ کە بارەگای سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی لێ بوو.

- لەوێ بەپێی بڕیاری کۆبوونەوەی فراوانی ساڵی (١٩٧٨)ی شێنێ. پلەی ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی وەرگرتەوە، ساڵی (١٩٨١) لە یەکەم کۆنفرانسی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراو دوای کۆنفرانسەکە کرایە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی. لەو ماوەیەدا ڕۆڵێکی کارای لە بواری ڕۆشنبیری‌و ڕاگەیاندندا گێڕاو نامیلکەیەکی بەناوی (پارتی پێشڕەوی چینی کرێکاری کوردستان) بڵاوکردەوە.

- ساڵی (١٩٨٢) لەدووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی ڕەنجەرانی کوردستان کە لەناوزەنگ بەسترا. بەئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردرایەوە.

- لەوتووێژی ساڵی (١٩٨٤)ی نێوان یەکێتیی نیشتمانی کوردستان‌و حکومەتی عێراقدا، بەشداریی لە خولەکانی دایەلۆگدا کردو بەرگریی لە تێروانین‌و مافەکانی کورد کرد، هەر ئەو ساڵە، لە سێیەم کۆنفرانسی کۆمەڵەی ڕەنجەرانی کوردستان کەلە مێرگەپان بەسترا، بەئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردرایەوە. لەو ماوەیەدا، لە بواری نووسیندا زۆرتر جەختی کردووەتە سەر دەربڕینی تێروانینە سیاسیی‌و ئایدیۆلۆژییەکانی‌و تێروانینانەشی بە شێوەی چەند لێکۆڵینەوەیەك کە لە ژمارەکانی خولی دووەم‌و سێیەمی گۆڤاری (کۆمەڵە)دا بڵاوکراونەتەوە دارشتووە.

- ساڵی (١٩٨٨) لە ڕەوتیی هەوڵداندا بۆ پێکهێنانی بەرەی کوردستانی، وەك نوێنەری یەکێتیی بەشداریی لەچەند خولێکی دایەلۆگدا کردو ڕۆڵێکی کارای لە سەرخستنی دایەلۆگەکاندا گێڕا. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا بووە لێپرسراوی دەزگای ڕاگەیاندن لە شاری سەقزو لەو ماوەیەدا بەشدارییەکی کارای لە نووسینی سەروتارو وتارەکانی ڕۆژنامەی (ڕێبازی نوێ)دا کرد، سەرباری نووسینی ژمارەیەکی زۆری وتار بۆ ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان.

- لە ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)دا ئەرکی لێپرسراوەتیی کردنی کاروباری ڕاپەڕینی لە ناوچەکانی سلێمانی‌و گەرمیان پێ سپێردراو لەم ڕووەوە ڕۆڵێکی دیاری لەسەرپەرشتی کردنی سنوورێکی فراوانی لە سلێمانیەوە تا خانەقین بینی. لەکاتی کۆڕەودا لەگەڵ هەریەك لە عومەر فەتاح‌و ئازاد بەرواری‌و فازل میرانی، لەسەر داوای بەرەی کوردستانی، وەك نوێنەری کورد پرۆسەی وتووێژی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا دەستپێکرد. شاندەکە لەبەغدا هەڵوێستی کوردی ڕوون کردەوە ڕێی بۆ وتووویژ لەسەر ئاستێکی باڵاتر خۆش کرد.

- هەر ئەو ساڵە، بڕیاری پشوو و خانەنشینکردنی دا، لەم سەروبەندەدا وازی لە هەموو پۆستەکانی هێناو خەریکی بازرگانی بوو، بەڵام ساڵی دواتر، لەسەر داوای تاڵەبانی گەڕایەوە، بووەوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، لێپرسراوەتیی مەکتەبی ڕاگەیاندنی پێ سپێردراو لەم سەروبەندەدا لەپاڵ ئەم لێپرسراوەتییە، ئەرکی سەرنووسەری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێی وەرگرت. ساڵی (١٩٩٤) لێپرسراوەیەتی مەکتەبی ڕاگەیاندنی بەجێهێشت‌و بووە ئەندامی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی.

- لەکاتی ڕووداوەکانی ٣١ی ئابی ساڵی (١٩٩٦)دا لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا کشایەوە سەر سنوورو دوای دابین کردنی پێداویستییەکانی ئەنجامدانی ئۆپراسیۆنی یەکەمی

(گەردەلول)و دانانی نەخشەی گەرانەوە بۆ ناوچەکان، لێپرسراوەتیی قوڵی پێنجوێن - شارەزور - هەڵەبجەی پێ سپێردراو لەم ڕووەوە ئەرکەکانی بەرێکوپێکی ئەنجام گەیاند.
- لە کۆتایی ساڵی (١٩٩٦) بەدواوە، چەند لێپرسراوەتییەکی گرتە ئەستۆ وەك پارێزگاری سلێمانی، مەڵبەندی ١ی ڕێکخستنی سلێمانی، فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، مەڵبەندی پێشمەرگەو وەزیری ناوخۆی ئیدارەی سلێمانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، سەرباری ئەوەی کە لە دووەم کۆنگرەی یەکێتی لە ساڵی (٢٠٠١) بەئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی هەڵبژێردرا.
- پاش ڕووخانی ڕژێمی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٣)، سەرپەرشتی کاروباری پارێزگای کەرکوکی کردو پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ ئەمریکییەکان‌و پێکهاتەکانی تری شاری کەرکوکدا دروست کرد.
- لە ماوەی ساڵانی (٢٠٠٥ - ٢٠٠٦) ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق بوو. لەو ماوەیەدا بەشدار بوو لە پرۆسەی نووسینی دەستوری عێراق‌و لەم سەروبەندەدا سەرۆکایەتیی یەکێ لە لیژنەکانی دارشتنی دەستوری کرد.

*** ( فەرەیدون عوسمان کەریم ):-**

- ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- تا پۆلی پێنجی ئامادەیی لەو شارە تەواو کردووە.
- بەهۆی سیاسەتەوە دەگوازرێتەوە شارۆچکەی (نوعمانییە) ی نزیك (بەسرە)و پۆلی شەشەمی ئامادەیی لەوێ تەواو دەکات.
- بەشی بایەلۆژی کۆلێژی زانستی زانکۆی بەسرە تەواو دەکات.
- دوای هەرەسهێنانی شۆرش لە ساڵی (١٩٧٦) ڕوو دەکاتە ئەمریکا کە لەوە پێشتر بەرپرسی پارتی دیموکرات بووە لە بەسرە.
- لە ئەمریکا بەشی ئەندازیاری کارەبا لە زانکۆی (ستەیت نۆڤ یونڤێرستی نیویۆرك) بە دەست دەهێنێت.
- دوای بەدەستهێنانی پلەی بەرز لە خوێندن، دادەمەزرێت لە (IBMکۆمپانیای )ی ئەمریکی بۆ دروستکردنی کۆمپیوتەر.
- لەو ماوەیەی کە لە ئەمریکایە گەلێك لێکۆڵینەوەی بە پێزی ئەنجام داوە لە بواری کۆمپیوتەرداو گەلێك داهێنانی بە نرخی لەو بوارەدا بە جێ هێناوە.

*** ( فەرید ئەڵڵا وێردی ):-**

- ساڵی (١٩٢٤) لە بەسرە لەدایکبووە، لە بنەڕەتدا خەڵکی کەرکوکە.
- دەرچووی کۆلێژی مافە لە ساڵی (١٩٨٤).
- ماجستێری لە زانستی مۆسیقاو ئاواز بەدەستهێناوە لە نیویۆرك لە ساڵی (١٩٦٨).
- گەلێك پاشماوەی بە جێماوە لەسەر ئۆرکستراو سیمفۆنیاو ئامرازەکانی مۆسیقا.
- دەورێکی باڵای هەبووە لە پێشکەوتنی مۆسیقای نوێ لە عێراق‌و زانستی تەکنیکی ئامرازەکانی مۆسیقا.

*** ( فەرید زەنگەنە ):-**

- یەکێکە لە نووسەرەکانی شاری کەرکوك.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ڕاژە)، ٢٠٠٦.
- (هۆنراوە پەروەدییەکان)، ٢٠٠٦.
- (ڕابەرو ناسنامە بۆ وتنەوەی وانەی نەخش‌و نیگار لە قوتابخانە سەرەتاییەکان)، ٢٠٠٧.

***فەرید عەبدولکەریم مەحموود بەیاتی:-**

- ساڵی ١٩٤٩ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی کۆلێژی سەربازی بەغدایە لە ساڵی ١٩٧٢.
- ساڵی ١٩٨١ کۆلێژی ئەرکانی عێراقی تەواو کردووە لە خولی ٤٨ بە ناونیشانی (مشاة).
- ساڵی ٢٠٠٧ خانەنشین کراوە.

*** ( فەریق ئەمین ):-**

- ناوی (فەریق کوری ئەمین کوری عەلی سەفەری زەنگەنە) یە.
- لە هاوینی ساڵی (١٩٥٥) لە ئاوایی (عەزیز قادری)ی ناو هەردەی زەنگەنەی سەر بە قەزای کفری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦١) لە کفری خراوەتە بەر خوێندن‌و پلەی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی تیادا تەواو کردووە ئینجا چووەتە کۆلێژی ئەدەبیات بەشی کوردی زانکۆی بەغدا بەهۆی باری ئالەباری خۆیەوە دوو ساڵ دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە، لە تاق لاوییدا تووشی نەخۆشی (شێرپەنجە) بووە.
- شاعیرمان لە ساڵی (١٩٦٨)وە دەستی داوەتە شیعر نووسین‌و لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانی وەکو (بەیان، ڕۆژی کوردستان، پاشکۆی عێراق) شیعری بڵاوکردووەتەوە، شاعیر نزیکترین هاورێی شاعیر (لەتیف هەڵمەت) بووە.
- سێ جار ناوزگی نەشتەرگەری بۆ کراوە، تا لە ڕۆژی (١٧) ی تەمموزی ساڵی (١٩٧٩)دا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆرستانی (باوەشاسوار)ی کفری بە خاك سپێردراوە.

* ( فەریق حەبیب تۆفیق ):-

- ساڵی (١٩٧٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پەیمانگای تەکنیکی بەشی رووپێوی تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی لە بواری وەرگێران: (خەتەنەکردن و توندو تیژی دژی ژنان)، (٢٠٠٨).

* ( فەزلولڵای کوڕی وەلی ئەفەندی ):-

- ساڵی (١٧٦٢)ی زایینی لەدایکبووە.
- برای (لوتفەڵلا)ی (کاتب دیوان) بووەو لە دوای مردنی براکەی بووەتە (کاتب دیوان) لە ساڵی (١٨٠١)ی زایینی تا ساڵی (١٨٠٢)ی زایینی لە دواییدا لە کارەکەی لابراوە، بەڵام لە ساڵی (١٨١٢)ی زایینی دووبارە کراوەتەوە بە (کاتب دیوان).
- هەندێك لە سەرچاوەکان بە شاعیرێکی کوردی دادەنێن بەڵام هەندێك لەبەر ئەوەی شیعری تورکی هەیە خۆیان لە کوردییەکەی بە دووردەگرن.
- ساڵی (١٨٣٠)دا بە نەخۆشی کۆلێرە کۆچی دوایی کردووە.

* ( فەقێ سمایلی زەنگەنە ):-

- ناوی (سمایلی کوڕی خەلیفە مەحموودی زەنگەنە)یە.
- ساڵی (١٨٧٤) لە درۆزنەی جامرێزی بناری دەلۆ لەدایکبووە.
- هەندێك لەلای مەلا خوێندویەتی، پاشان وازی هێناوەو بە کشتوکاڵییەوە خەریك بووە.
- لە سییەکانی سەدەی رابردوو دەچێتە گوندی میل قاسمی نێوان کفری و کەلار.
- ساڵی (١٩٤٨) کۆچی دوایی کردووە.

* ( فەقێ حەمەی کاکەیی ):-

- ناوی (محەمەد کوڕی حەیدر کوڕی زۆراب)ە، لە ناو خەڵکیدا بە (سەید حەمە هەیەر) ناسراوە.
- ساڵی (١٨٨٦) لە گوندی (عەلی سەرای) لە هەرێمی داقوق لەدایکبووە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٨٨) بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- هەر لە منداڵییەوە لەلای (مەلا عەباس حیلمی) خەریکی فێربوونی رێزمانی عەرەبی و شەریعەتی ئیسلام بووەو ئەوسا تا کۆتایی ژیانی بەکاری کشتوکاڵ و ماڵداری بردووەتە سەر.
- پیاوێکی هۆشمەندو وریاو ژیرو هەق وێژو سەرراست بووە، زانایەکی ئایینی ئەو رۆژگارەی هۆزەکەی دەژمێردرێت.
- ساڵی (١٩٦١)دا کۆچی دوایی کردووە.

* ( فەقێ رەشید کوڕی جاسم ئاغا ):-

- ناوی (رەشیدی کوڕی جاسمی کوڕی فەلامەرز ئاغای زەنگەنە)یە.
- ساڵی (١٨٦٤) لە ئاوایی خان لەناو هۆزی زەنگەنە لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی ناوچەی زەنگەنەو گەلێك شیعری نیشتمانی ئایینی و خۆشەویستی وەسپی هەیە، لە دوای خۆی دیوانەکەی بە چاپ گەیەنراوە.
- لە (٢١)ی تەمموزی ساڵی (١٩٦٦) لە تەمەنی ١٠٢ ساڵیدا لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

* ( فەقێ قادری هەمەوەند ):-

- فەقێ ناوی قادر یان (عەبدولقادر) کوڕی رەسوڵ کوڕی جوامێر لە تایەفەی بەگزادەو تیرەی چەڵەبی عەشیرەتی هەمەوەندە.
- ساڵی (١٨٣٠) لە بازیان لەدایکبووە، هەواڵ هەیە ئەوە دەگەیەنێ لە گوندی (قودرەتە) لەدایکبووە.
- فەقێ قادر لە سەرۆکەکانی عەشیرەتی هەمەوەند بووە، ماوەیەك پلەی قایمەقامیەتی قەزای چەمچەماڵ و ناوچەی بازیانی پێ سپێردرا بوو لە سەردەمی فەرمانڕەوای سوڵتان عەبدولعەزیزی عوسمان (١٨٣٠-١٨٧٦).
- لە ماوەی ساڵانی (١٨٨٥-١٨٨٧) ژیانی دیلی لە بەندیخانەکانی کەرکوك و موسڵ و بەغدا بردووەتە سەر.
- ساڵی (١٨٨٧) فەقێ لەگەڵ بەشێك لە بەگزادەی هەمەوەندو خەڵکی عەشیرەتەکە، دەسەڵاتی عوسمانی دووری خستووەتەوەو ئاوارەی کردوون بۆ شاری (بەنغازی) لە وڵاتی (لیبیا).
- هەندێ لە سەرچاوەکان ئەوە دەخەنە روو کە فەقێ قادر لە ساڵی (١٨٩٠) لە وڵاتی (لیبیا) کۆچی دوایی کردووە.

* ( فەلەکەدین ئەمین کاکەیی ):-

- ساڵی (١٩٧٢) لە گەرەکی قەسابخانە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠٠١) بەشداری کردووە لە پێشانگای (هونەر پەردەیەکە بۆ ئاشتی) لەگەڵ هونەرمەندانی دهۆك و هەولێر.
- ساڵی (٢٠٠١) پێشانگایەکی هاوبەشی کردووەتەوە لە هۆڵەندا لەگەڵ براکانی (سەدرەدین-شەمسەدین-حیسام).
- ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری کردووە لە پێشانگای یادی

ئەنفالی لە چەمچەماڵ.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری کردووە لە خوولی گەلەری زاموا لە سلێمانی.
- ساڵی (٢٠٠٣)دا بەشداری کردووە لە پێشانگای سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان لقی کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری کردووە لە پێشانگای سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان لقی کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٤) پێشانگای هاوبەشی لە چلەی هونەرمەندی خوالێخۆشبوو (حوسێن عەبدوڵڵا).
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگایەکی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە بە بۆنەی ڕۆژی جیهانی ئافرەتانەوە.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگایەکی هاوبەشی هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە بەبۆنەی دامەزراندنی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگایەکی هاوبەشی هونەرمەندانی کردووە بە ناوی (ئاشتی و لێبوردەیی) لەلایەن (منظمة تنمية السلم وغرس روح التسامح).
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگایەکی هاوبەشی هونەرمەدانی کەرکوکی کردووە بەبۆنەی ساڵیادی ڕزگارکردنی کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگایەکی هاوبەشی هونەرمەدانی کەرکوکی کردووە لە هۆڵی شوکر مستەفا.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگایەکی شەش هونەرمەندی کردووە بەسەر پەرشتی کۆمەڵەی ڕووناکبیرو کۆمەڵایەتی کاکەیی.
- ساڵی (٢٠٠٥) لە کۆمەڵەی هونەری دیجلە بەشداری پێشانگایەکی هاوبەشی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری پێشانگایەکی هاوبەشی کردووە لەلایەن ڕێکخراوی گەشەپێدانی مەدەنییەت.

*** (فەلەکەدین سابیر کاکەیی):-**

- ساڵی (١٩٤٣) لە کەرکوك لە گوندی (ئەلبوگەسە) لەدایکبووە.
- سەرەتایی لەگوندی تۆبزاوە تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦١-١٩٦٣) ناوەندیو ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- لە کۆلێژی ڕۆژنامەگەری وەرگیراوە لە بەغدا، بەڵام نەیتوانییوە تەواوی بکات.
- هەر لە پەنجاکانەوە لە بواری ڕۆژنامە بە زمانی عەرەبیو کوردی کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٦٧) وەکو پەیامنێر لە ڕۆژنامەی (التاخي) کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٧٣) بووەتە بەڕێوەبەری نووسین لە ڕۆژنامەی (التاخي).
- ساڵی (٢٠٠٣) بووەتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (التاخي).
- ساڵی (١٩٨٠-١٩٩١) بووەتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (خەبات) کە بە نهێنی لە شاخ دەرچووە.
- لە (٣١)ی تەمموزی ساڵی (٢٠١٣) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- یەکەم ڕۆمانی بە زمانی عەرەبی بە ناونیشانی (ورقة اليانصيب) لە ساڵی (١٩٦٧) لە بەغدا بڵاوکردووەتەوە.

- (الكوردي مدان حتى يثبت براءته)، ئەورووپا، ١٩٧٩.
- (سبيل الحركة التحررية الكردية)، کوردستان، ١٩٨٤.
- (نبذة عن تاريخ المسرح الكردي)، ١٩٨٤.
- کۆمەڵێك پەخشان بە زمانی عەرەبی لە ساڵی ١٩٨٤ لە ئەورووپا چاپ بووە.
- وەرگێڕانی ڕۆمانێکی کورتی (میخاییل شۆلۆخۆف) نووسەری ناسراوی سۆڤیەت، کە خەڵاتی نۆبلی وەرگرت لەبەر ڕۆمانی (دۆنی ئارام)، ئەم بەرهەمە لە زمانی فارسییەوە وەگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردیو لە ساڵی ١٩٨٤ لە چیا چاپکراوە، لە ساڵی ٢٠٠٧ لە هەولێر دووبارە چاپ کرایەوە.
- (دەربارەی خوێندنو فێربوون لە کوردستانی عێراق)، ١٩٨٥.
- (مسيرة العمل الجبهوي للحزب الديمقراطي الكردستاني في العراق ١٩٧٥-١٩٨٨)، چاپی یەکەم کوردستان ١٩٨٨، چاپی دووەم هەولێر ٢٠٠٤.
- (القذافي والقضية الكردية)، چاپی یەکەم کوردستان ١٩٨٩، چاپی دووەم قوبرس ١٩٩١، چاپی سێیەم (٢٠٠٨).
- (نەتەوەیەکی بێ ڕۆژنامەی ڕۆژانە)، ١٩٨٩، بە بۆنەی (٩٠) هەمین ساڵڕۆژی دەرچوونی یەکەمی ڕۆژنامەی (کوردستان) لە قاهیرە.
- (شاکیر فەتاحی شەهید)، هاوبەش، هەولێر، ١٩٩٨.
- (دەفتەری کاف)، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١.
- کتێبی (فەلەکەدین کاکەیی بە ڕەنگی خۆیو دوور لە سیاسەت)، ٢٠٠٥، چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریو ئەدەبییە لەلایەن (شێرزاد عەبدولرەحمان)ەوە.
- (چۆن فێری ڕقت دەکەن)، نووسینی (میخاییل شۆلۆخۆف)، وەرگێڕان، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (وێژدان و ئازاد)، بەشی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (بێداری)، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (وێژدان و ئازاد)، بەشی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٨.
- ڕۆمانی (ورقة اليانصيب)، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٨.
- (ڕوناهی زەردەشت)، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٨)، چاپی دووەم، دیار بەکر، ٢٠٠٩.

- (موطن النور–الكتاب الاول)، هەولێر ٢٠٠٩.
- (Ronahiya Zerdesti)، (ڕوناهی زەردەشت)، ئەستەمبوڵ، ٢٠٠٩.
- (موطن النور)، چاپی دووەم، ٢٠١٠.
- (بێداری)، چاپی دووەم، ٢٠١٠.
- (البيت الزجاجي للشرق الأوسط)، هەولێر، ٢٠١٠.
- (إحتفالا بالوجود)، هەولێر، ٢٠١٠.
- (ویژدان و ئازادی)، چاپی دووەم، ٢٠١٠.
- (حلاجيات، يقظة متوهجة في حضور الحلاج)، هەولێر، ٢٠١٠.
- (لحظة الحكمة)، هەولێر، ٢٠١١.
- (ئاگایی) چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١١.
- (دەفتەری کاف)، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٣.
- (دەفتەری خاك)، هەولێر، لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبییە دەربارەی (ئەحمەدی خانی) و (مەلا جەزیری) و (هەژار) و چەند بابەتێکی دیکە.
- ساڵی (١٩٩٢) لە یەکەم خولی پەرلەمان هەڵبژێردرا.
- ساڵی (١٩٩٦) بووەتە وەزیری ڕۆشنبیری لە حکومەتی هەرێمی کوردستان تا ساڵی (٢٠٠٠).
- لە دواییدا بووەتە وەزیری هەرێم تا ساڵی (٢٠٠٣).
- ساڵی (٢٠٠٦) بووەتە وەزیری ڕۆشنبیری دووبارە.
- لە ڕۆژی (٣١)ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٣) کۆچی دوایی کردووە.

* (فەلاح عومەر):-

- ساڵی (١٩٦٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٦) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواو کردووە.
- یەکەم پێشانگای تایبەتی لە (البيت العراقي) لە دیمەشق لە ساڵی (١٩٩٥) کردووەتەوە.
- دووەم پێشانگای تایبەتی لە ساڵی (٢٠٠٤) لە (کولش ئۆهایۆ) لە ئەمریکا کردووەتەوە.
- بەشداری گەلێك پێشانگای شێوەکاری کردووەتەوە لە سلێمانی و کەرکوك و بەغداو دیمەشق.
- سێیەم پێشانگای لە کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٩) کردووەتەوە، لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری و هونەر لە کەرکوك.

* (فەهمی عەرەب ئاغا):-

- ساڵی (١٩٠٢)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٧)دا کۆچی دوایی کردووە.
- گەلێك بابەتی ڕۆژنامەوانی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان بڵاوکردووەتەوە،
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ابن الناطور)، چاپخانەی (ام الربيعين)، موسڵ، ١٩٣٠.
- (کرکوك تأريخی: کلدانيلر زماننده حال حاضره قدر کرکوك)، چاپخانەی (النجم)، موسڵ، ١٩٣٦.
- (تأريخ جرانمده نەشسر براولای)، چاپخانەی (الجامعة)، بەغدا، ١٩٥١.
- (ثمن الشرف)، وەرگێڕاوە لە تورکییە بۆ عەرەبی، چاپخانەی (رابطة)، بەغدا، ١٩٥١.
- (مقبر)، وەرگێڕان، چاپی یەکەم و دووەم، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەغدا، ١٩٥٣.
- (المعرفة الإسلامية ومدى تأثيرها على المدنية المسيحية)، وەرگێڕان، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەغدا، ١٩٥٥.
- (المنتفق في النهضة العراقية الحديثة)، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەغدا، ١٩٥٦.
- (الأسرة التعليمية في الناصرية)، چاپخانەی (دار المعرفة)، بەغدا، ١٩٥٧.
- (ماذا في كركوك)، بە بەشداری لەگەڵ فازڵ محەمەد، چاپخانەی (التتويج)، کەرکوك، ١٩٥٧.

* فەهمی کاکەیی:-

- ساڵی (١٩٥١) لە پارێزگای کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٠) یانەی مامۆستایانی کەرکوکی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧١) لە ناوچەی کەندیناوەی سەر بە پارێزگای هەولێر بە مامۆستا دامەزراوە، پاشانیش گوێزراوەتەوە پارێزگای سلێمانی و لە گوندو شارۆچکەکانی ئەوێ کاری کردووە.
- سەرەتای نووسینی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٦٩)، ئەو دەمە بە زمانی عەرەبی هەڵبەستی نووسیوە.
- لە بواری شانۆدا وەك ئەکتەر کاری کردووە، لە تیپەکانی (یەکێتیی هونەرمەندانی عێراق) و تیپی (مەشخەڵ) و (کۆمەڵی هونەرو ویژەی کوردی لقی کەرکوك) چالاك بووە.
- لە شۆڕشی ئەیلول بەشداریی کردووەو لە گوندی ئۆمەرەگەدەی سەر بە ناحیەی قەرەحەسەن مامۆستای شۆڕش بووە، هەروەها لە ئۆردوگای (سەراوگەرم) لە (سەرپێڵی زەهاو).
- ساڵی (١٩٨٢) بەشداریی شۆڕشی گوڵانی کردووەو کارگێڕی لقی سێی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، بۆ ماوەیەکیش لە دەنگی کوردستانی عێراقەوە بەرنامەی کاروانی شەهیدانی ئامادەو پێشکەش کردووە.
- ساڵی (١٩٨٧)ەوە نیشتەجێی سویدەو ماوەی (٢٦) ساڵە زمانی کوردی دەڵێتەوە.
- شیعرو چیرۆك و شانۆگەریی و کتێبی خوێندنگەی بە

زمانەکانی کوردیو عەرەبیو سویدی نووسیوە، هەروەها چەندین زنجیرە درامای نووسیوەو لە ڕادیۆی کوردیی بەغداوە پێشکەش کراون.
– شارەزایی لە زمانی کوردی بە هەموو زاراوەکانییەوە (کرمانجیی خواروو، کرمانجیی سەروو، هەورامی، کەلهوڕیو فەیلی)و زمانەکانی (عەرەبی، فارسی، تورکمانی) هەیەو هەروەها سویدی دەزانێت.
– سالی (١٩٧٠) ئەندامی دامەزرێنەری تیپی شانۆیی (مەشخەل) بووە کە سەر بە لقی سێی پارتی دیموکراتی کوردستان، وەك ئەکتەر بەشداریی کردووە لە شانۆگەریی (دایکی شەهید)و شانۆگەریی (پێشمەرگە).
– سالی (١٩٧١) ئەندامی دامەزرێنەری تیپی شانۆیی (سۆلاڤ) بووە، سەر بە یانەی (سۆلاڤ).
– سالی (١٩٧٢) ئەندامی دامەزرێنەری (کۆمەلی هونەرو وێژەی کوردی لقی کەرکوك)و جێگری سەرۆکی لق بووە.
– سالانی (١٩٧٥ – ١٩٨٢) نووسینو ئامادەکردنی چەندین تەمسیلیو زنجیرە درامای ڕادیۆیی کردووە بۆ ڕادیۆی کوردی لە بەغدا.
– سالی (١٩٨٤) هەستاوە بە دەرهێنانی گۆڤاری (باوەگورگوڕ) ئۆرگانی لقی سێی پارتی دیموکراتی کوردستان.
– سالی (١٩٨٤) لە دەستەی نووسینی گۆڤاری (هەلمەت)ی (رابیتەی نووسەرانو ڕۆژنامەنووسانی پێشمەرگە – جود) بووە.
– سالی (١٩٨٩) سیناریۆی فیلمی (ئاسۆ)ی نووسیوە بە هاوبەشی لەگەل دەرهێنەری فیلمەکە مامۆستا (سەلمان فایەق)، هەروەها ڕۆلی کەسایەتی (شاسوار)ی بینیوە کە ڕۆلێکی سەرەکی بوو لە فیلمەکەدا. ئەو فیلمە لە (ستۆکهۆلم) و زۆربەی زۆری شارە گەورەکانی سوید، هەروەها لە زۆربەی سەتەلایتە ئاسمانییە کوردییەکان پیشان درا.
– سالی (١٩٩٧) ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەلەی ئەلفوبێی کوردیو بەرپرسی پرۆژەی دانانی کتێبی خوێندنگە لە دەرەوەی ولات بوو.
– سالی (٢٠٠١) ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کتێبی خوێندنگەی سویدی (LFF) بوو، چوار جاریش خەلات کراوە.
– سالی (٢٠٠٣) هەستاوە بە دامەزراندنی دەزگای پەخشو بلاوکردنەوەی (سان) بۆ بلاوکردنەوەی کتێبی خوێندنگە.
– سالی (٢٠٠٤) ئەندامی دامەزرێنەری یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان – لقی سوید بوو.
– سالانی (٢٠٠٤ – ٢٠٠٦) بەرپرسی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان – لقی سوید بووە.
– سالانی (١٩٩٥ – ٢٠١٤) بەشداری کردووە لە دەیان بەرنامەی تەلەفزیۆنیی ڕاستەخۆو ناڕاستەوخۆ لە بوارەکانی (پەروەردە، ئەدەب، زمان، فەرهەنگو ئاین) لە کەنالە جوداکانی سەتەلایتە کوردییەکان لە دەرەوەو ناوەوەی ولات.
– سالانی (٢٠٠٢ – ٢٠١٢) دەیان گوتاری ئەدەبی، زمانەوانی، هونەری، پەروەردەیی، ئایینیو سیاسی بە زمانی کوردیو عەرەبیو نووسیوەو بلاوی کردووە لە مالپەرە کوردیو عەرەبییەکاندا.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (ژان)، شانۆگەری، ١٩٧٩.
– (تەرم)، شانۆگەری، لە گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)، ١٩٨٠.
– (دەچلەو فرەهات)، ئۆپەرێت، لە گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)، ١٩٨١.
– (خوێنهەلات)، کۆمەلە هەلبەست، لەسەر ئەرکی لقی سێی پارتی دیموکراتی کوردستان، ١٩٨٤.
– (تاراوگە)، شانۆگەری، ١٩٨٨.
– (میناى چاوجوان)، چیرۆکی مێردمندالان، ١٩٩٠.
– (Gelas om våren och andra berättelser från Kurdistan)، بە زمانی سویدی، 1995.
– (ئەمە چییە چیی پێ دەلێن، ١٠٠١ پرسیارە بۆ مێردمندالان)، ١٩٩٧.
– (ڕۆژ باش، بۆ فێربوونی ئەلفوبێی زمانی کوردی)، ئەم کتێبە چوار جاری دیکەش لەچاپدراوەتەوە، 1999.
– (گەرمیان)، کتێبی خوێندنەوە، لەگەل چەند هاوڕێیەکی تر، لەسەر ئەرکی وزارەتی پەروەردەی سوید، ٢٠٠٠.
– (باوەگورگوڕ)، کتێبی خوێندنەوە، لەگەل چەند هاوڕێیەکی تر، ٢٠٠١.
– (دیلان)، کتێبی خوێندنەوە، لەگەل چەند هاوڕێیەکی تر، ٢٠٠٣.
– (کراسێکی گولنێرگز بۆ نازێ)، کتێبی مندالان، لە بلاوکراوەکانی دەزگای (ئاراس)، ٢٠٠٧.
– (خوێندنەوەی کوردی ٢)، دوو جار چاپ کراوە، ٢٠١١.
– (خوێندنەوەی کوردی ٣)، دوو جار چاپ کراوە، ٢٠١١.
– (خوێندنەوەی کوردی ٤)، ٢٠١٢.
– (ئەلفبێ بۆ فێربوونی پیتەکان)، ٢٠١٢.
– (خوێندنەوەی کوردی ١)، ٢٠١٣.

*** ( فەوزی ئەکرەم تەرزی ):–**

– سالی (١٩٦٠) لە خورماتوو لەدایکبووە.
– بەرهەمە شیعرییەکانی:
– (Azerbaycan destani)، بە زمانی تورکی، باکو، ٢٠٠١.
– (جنت قوشلاری)، چاپخانەی (بیلکی صایار و باصیم ئەوی)، کەرکوك، ٢٠٠٣.
– (طوزخورماتو و بلام توردەن)، چاپخانەی (عبد الوهاب اوچی)، کەرکوك، ٢٠٠٣.

*** فەیسەل ڕەشید تالەبانی:–**

– ناسراو بە سیروان تالەبانی.
– لەدایکبووی سالی (١٩٤٦)ی گوندی مامشە لە ناوچەی قەرە حەسەنی پارێزگای کەرکوك. پلەکانی خوێندنی سەرەتاییو ناوەندیی لە کەرکوك تەواو کردووە لە سالی (١٩٦٠)دا پەیوەندیی بە یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە کردووە.
– لە سۆنگەی هەژارىو دەستکورتییەوە، سالی (١٩٦١) لە تەمەنی ١٥ سالیدا پاش ئەوەی خوێندنی ناوەندیی تەواو کرد، وازی لە خوێندن هێناو ئەرکی بەخێو کردنی خێزانەکەی گرتە ئەستۆو دەستی بە کرێکاری کرد.
– سالی (١٩٦٢) بەکارمەند لەبەڕێوەبەرایەتیی خانەنشینی کەرکوك دامەزراو هەر لەو ماوەیەشدا بووە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانو لێپرسراوێتیی لقی کەرکوکی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی گرتە ئەستۆ. پاش

ئاشکرابوونی لەلای دەزگا ئەمنییەکان، ڕووی لە شاخ کردو ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد.
– دوای بەیاننامەی ١١ی ئازاری ساڵی (١٩٧٠)، کرایە بەڕێوەبەری شارەوانیی خانەقین. لەو قۆناغەدا وردە وردە لە بیروباوەڕی چەپ نزیك بووەو لە ساڵی (١٩٧٢)دا پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردو لەناو کەرکوك ڕۆڵێکی بەرچاوی لە ڕێکخستندا گێڕا.
– ساڵی (١٩٧٤) لەگەڵ دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کوردو ڕژێمی عێراقدا، بۆ جاری دووەم پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کردو دوای هەرسهێنانی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥)، گەڕایەوە بۆ کەرکوك و لەناو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا درێژەی بە هەڵسووڕانی سیاسیی دا. دوای دەستپێکردنی شاڵاوی گرتن و ڕاوەدوونانی ئەندامانی کۆمەڵە، لە کەرکوکەوە گوێزرایەوە بۆ سلێمانی.
– لەوێ بەشێوەیەکی کارا بەشدار بوو لە هەوڵەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان بۆ پێکهێنانی دەستە چەکدارە سەرەتاییەکان و خۆیشی لە ٣ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٦)دا بۆ جاری سێیەم دەستی بە پێشمەرگایەتی کردەوەو لەگەڵ هەریەك لە ئەنوەر مەجید سولتان و محەمەد مەحموود محەمەد ناسراو بە شێخ شەماڵ باخ و حوسێن کەریم قادر، مەفرەزەیەکی چەکداری لە شارباژێڕو پێنجوێن و قەراغ دروستکردو ڕۆڵێکی دیاری بینی. هەر ئەو ساڵە بووە فەرماندەی مەفرەزەو لە ساڵی (١٩٧٧)دا بووە فەرماندەی کەرتی یەکی هەرێمی ٥ی قەرەداغ و دواتریش بووە فەرماندەی هەرێمەکەو لە هەمان کاتدا لێپرسراوەتیی لێژنەی ناوچەی گەرمیانیشی گرتە ئەستۆ.
– لە ٣٠ی نیسانی (١٩٧٩)، لە کاتێکدا کە لە ناوچەی سەرکردایەتییەوە دەگەڕایەوە بۆ سنووری هەرێمەکەی خۆی، کەوتە بۆسەی جاشەکانەوەو خۆی و ٤ پێشمەرگەی تر کە دووانیان سەردەستەی پێشمەرگە بوون بەناوی سدیق ئیبراهیم (حاجی چاوشین) و حەسەن حەمە ساڵح مەحموود خاوی و ئەوانی تر پێشمەرگە بوون بەناوی نەجات ڕەحیم کەریم و عەلی چەلەبی، لە نزیك گوندی زێڕین جۆی شارەزوور شەهید بوون.

* ( فەوزی زەنگەنە ):-

– ساڵی (١٩٥٢) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٧٤) کۆلێژی زانست بەشی بایۆلۆجی لە زانکۆی موسڵ تەواو دەکات.
– ساڵی (١٩٨٣) بڕوانامەی ماستەری بەدەستهێناوە.
– ساڵی (١٩٩٤) نازناوی پرۆفیسۆری یاریدەدەری پێدەبەخشرێت.
– لە (٢١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠١) پەیوەندی کردووە بە زانکۆی سلێمانی، بوو بە مامۆستا لە بەشی بایۆلۆجی کۆلێژی زانست.
– سەر لە بەیانی (٢٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٢) لە کاتی وانە ووتنەوە دڵە گەورەکە لە لێدان کەوت.

* ( فەوزی عەلی ):-

– (فەوزی کوڕی عەلی کوڕی حەسەن)ە.
– ساڵی (١٨٨٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ئەندامی ئەنجوومەنی نیابی بووە لە خوولی چوارەمدا لەنێوان (٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٣٣) تا (٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٣٤).

* ( فەیسەڵ هەمەوەندی ):-

– ناوی (فەیسەڵ تاهیر)ە لە ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– یەکێکە لە چیرۆك نووسەکان و یەکەم بەرهەمی لە ساڵی (١٩٧٨) بڵاوکردووەتەوە بە ناونیشانی (تابلۆیەك لە خەونمدا).
– چاپکراوەکانی:
– (هەوارگەی سێ دەنگ)، کۆمەڵە چیرۆك، هاوبەش، بەغدا، ٢٠٠٠.
– (پرسیارە ئەزۆکەکان)، چیرۆك، هاوبەش، کەرکوك، ٢٠٠٠.
– (دار زەیتون)، چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٥.
– (بیرەوەری سۆزانییە خەمبارەکانم)، وەرگێڕان، هاوبەش، کەرکوك، ٢٠٠٧.
– (کۆنسێرتی دەف ژەنەکان)، چیرۆك، بەغدا، ٢٠٠٩.
– (دیواودەری شیعر)، خوێندنەوە، ٢٠١٤.
– تیشکێك لەبارەی تورکمانەوە، پێداچوونەوە، ٢٠٠٧

* ( فریاد شوانی ):-

– (شکۆفە)، شیعر، ١٩٩٢.
– (عەشق و باران و گەرمیان)، شیعر، ١٩٩٦.
– (ڕوحی باران)، شیعر، ١٩٩٧.
– (گێرفانی فرمێسك)، شیعر، سلێمانی، ١٩٩٩.
– (وەرزی بارینی تەرمەکان)، شیعر، ٢٠٠٧.

* فریاد حەمید محەمەد:-

– ساڵی (١٩٨٠) لە دایك بووە.
– ساڵی (٢٠٠٥– ٢٠٠٦) دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی .دووزی ئێوارانە
– ساڵی (٢٠٠٣)ەوە بەشێوەیەکی بەردەوام دەنووسێت.

- یەكەم بابەتی بەزمانی عەرەبی بە ناونیشانی:- (للكورد نساء شهد التأريخ لادوارهن بامانة)،ژیانەوالعربی)،ژمارە ٩.
- دووەم بابەتی بەناونیشانی:- (الكاكائية او القاغانلو)، رۆژنامەی (ئاوەسپی)، ژمارە٨، ساڵی ٢٠٠٤.
- گەلێك بابەتی هەیە بەزمانەكانی عەرەبیو كوردی. دەربارەی جێنۆسایدو ئەنفال.
- ساڵی (٢٠٠٤) لە رۆژی جیهانی كتێب، ناسنامەی رێزنامەی پێەخشراوە لەلایەن حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە، لە كتێبخانەی گشتی سلێمانی، بۆ ئەو رۆڵەی گێراوییەتی لە پاراستنی كتێبخانەی گشتی دووز لە كاتی پرۆسەی ئازادی عێراق.
- سوپاس نامەی بۆ هاتووە لەلایەن رۆژنامەی (اوجاق)ەوە كە بە زمانی توركمانی دەردەچێت.

* فریال ئەلمودەریس:-

- ساڵی ١٩٤٧ لە كەركوك لەدایكبووە.
- بەرهەمەكانی:
- الصديق الصغير، چیرۆك هاوبەش، ١٩٧٣

* (فلامەرز مام وەلی - مام فلامەرز مام وەلی):-

- (مام فلامەرز كوری مام وەلی كوری مام حەسەن كوری مام رۆستەم كوری مام باپیر)ە، لە نەوەی ناوداری پایەبەرزی كاكەیی (پیرنەریمان) گەورەیە.
- ساڵی (١٨٦٥) لە چەمچەماڵ لەدایكبووە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٦٨) بە ساڵی لەدایكبوونی دادەنێن.
- سروودی ئایینی بە نازناوی (خەلیفە)وە بە شێوەزاری (ماچۆ - گۆران) هۆنیوەتەوە جاری وایش هەبووە بە ناوی (مەجنون).
- مەلا فلامەرز لە خوێنینەوەی هۆنراودا دەستێكی باڵای هەبووەو هۆنراوەكانی گەلێ جوانو شیرینو پاراونو پتر لە بەیازو كەشكۆڵەكاندا تۆمار كراون.
- ساڵی (١٩٧١) لە شاری كەركوك كۆچی دوایی كردووە.

* فنوونی:-

- نازناوی شاعیرێكی دیكەی ناوچەی كەركوكە، زانیاریمان دەربارەی كەمە، هەندێكیش بە هەڵە ناسنامەیان نووسیوە.

* (فوئاد ئەلكنجی):-

- ساڵی (١٩٥٧) لە عەرەفەی كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٨٣) بەكالۆریۆسی لە فەلسەفەی بەدەستهێناوە لە زانكۆی بەغدا.
- ساڵی (١٩٨١) یەكەم پێشانگایی كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٣) دووەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی (المتحف الوطني للفن الحديث) لە بەغدا كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٤) سێیەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی (المتحف الوطني للفن الحديث) لە بەغدا كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٦) چوارەم پێشانگای كردووەتەوە.
- كۆمەڵێك دیوانی شیعری بە زمانی عەرەبی هەیە بەم ناوانە: (ضوء على مياه الثلج، مراثي الجسد، احزان قلبي، رماد الاجساد، رسالة ساخنة إلى الخاتم، صرخة المساء، البكاء الأخير).
- ئەم بەرهەمانەی ئامادەیە بۆ چاپ : (قاموس الأحلام، نظريات الفن، جماليات التربية في حياتنا الجنسية).
- سەرنووسەری رۆژنامەی (نرگال)بووە.

* (فوئاد تاهیر سادق):-

- ساڵی (١٩٣٨) لە رەواندوز لەدایكبووە.
- لە كۆتایی جەنگی جیهانی دووەم خێزانەكەیان هاتوونەتە كەركوكو سەرەتا لە گەرەكی (یایچی) گیرساونەتەوە.
- خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی (ئیمام قاسم) تەواو كردووە، ناوەندی لە (الشرقية) تەواو كردووە.
- ساڵانی (١٩٥٤-١٩٥٩) خوێندنی بەشی بازرگانی (COMMERCE) تەواو كردووە بروانامەی (كەمبریج)ی لە ئینگلیزی، بروانامەی (R.S.A.LONDON) لە وانەكانی ژمێریاری تێچوون، (COST) بیركاری رازگری (سكرتاریەت)، وردیاری و ئینگلیزی وەرگرت.
- ساڵی (١٩٥٨) لە یەكێتی قوتابیانی كوردستان كاری كردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٥٩-١٩٦١) لە بەرێوەبەرایەتی بووجە، بەرێوەبەرایەتی كۆگاكان، بەرێوەبەرایەتی خاوەنێتیو ئازووقە كاری كردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٠-١٩٦١) چەند جارێك گیراوەو ئازاد كراوە.
- ساڵی (١٩٦٢) دووبارە بەنكراوەتەوە ولە كەركوكەوە رەوانەی بەغدا كراوە.
- لە (١٠)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٤ لە ئەنجامی رێكەوتنی سەركردایەتی شۆرشی كوردستانو دەسەڵاتی بەغدا، جەنگ راگیراو عەبدولسەلام عارف سەركۆماری ئەوسا هەندێك لە

خواستەکانی کوردی جێ بەجێ کردوو، بەو هۆیە ئازادکرا.
- ساڵی ١٩٦٤ لە زانکۆی (پوونا)ی هیند وەرگیرا.
- لە (٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٧) بە سەردانێك هاتووەتەوە کەرکوك.
- ساڵانی (١٩٦٧-١٩٧٠) وەك ژمێریاری پاوانکردنی تووتن لە هەولێر بەردەوام بووە.
- ساڵی (١٩٧٢) بە دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد لە کەرکوك دەستەی بەڕێوەبەر بوو کە بریتی بووە لە تاهیر خانەقا، فوئاد تاهیر سادق، عەزیز خانەقا، عوسمان خانەقا، رەئوف خانەقا، رەزاشوانی و گەلێکی تر.
- لە (٢٨)ی ئایاری ساڵی (١٩٧٤) چەکی پێشمەرگایەتی لە قەندیل کردووەتە شان.
- لە دوای نوشستی شۆرش لە کەرکوکەوە بەرەو ڕوومادی ماڵی ڕاگوێزراوە.
- ساڵی (١٩٧٨) ڕاگوێزراوەتە کوردستان و لە سلێمانی جێگیربووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (باسخوازی)، سلێمانی، ١٩٨٥.
- (فەرهەنگی تاهیر سادق، فەرهەنگی هاو واتاکانی کوردی)، سلێمانی، ١٩٩٨.
- (کۆمەلزانی و کورد)، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (بیرەوەرییەکانی ژیانی ژێر دەستی)، سلێمانی، ١٩٩٥.
- (هۆشیاریمان)، سلێمانی، ٢٠٠١.
- (فەرهەنگی یاریدەدەر عەرەبی-کوردی-ئینگلیزی)، چوار بەرگ، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- (هۆشیاری ئابووری)، سلێمانی.

*** فوئاد فاروق رەفیق هەمەوەندی:-**
- ساڵی ١٩٥٩ لە گەرەکی قۆرییە لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٠ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٥٩، بەناونیشانی درع
- دوا کاری (ضابط رکن الفرقة الآلية الأولى).

*** (فوئاد مەحموود قادر):-**

- ساڵی (١٩٥٤) لە خورماتوو چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.
- ساڵی (١٩٧٥) کۆلێژی پەروەردەی بەشی کوردی لە بەغدا تەواو کردووە و لە ساڵی (١٩٧٧) بە مامۆستا دادەمەزرێت.
- بنەماڵەی مەحموود توتنچی لەگەڵ حاجی جومعەی برایدا بەرەگەز (ئۆمەر سۆفین).
- مامۆستا فوئاد لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوودا لە بواری چیرۆك نووسیدا گەلێك بەرهەمی هەیە.
- ساڵی (١٩٨٩) بە فەرمانی رژێم گوێزراوەتەوە بۆ پەروەردەی (تکریت) لە ساڵی (١٩٩١) لە سەرکار لابراو خانەنیشن کراوە.
- لە (٢٣)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٥) بەهۆی تەقینەوەی ئۆتۆمبێل لە نزیك قایماقامیەت گیانی لەدەست داوە.

*** (فوئاد رەشید - دکتۆر فوئاد رەشید):-**

- ساڵی (١٩٦٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٨) کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین بەشی کوردی تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) بڕوانامەی دکتۆرای لە رەخنەی ئەدەبی کوردی بەدەستهێناوە.
- ئەم کتێبانە بە چاپ گەیاندووە:-
- (رەخنەی رۆمانی کوردی)، ٢٠٠٥.
- (ئاسنامەی دەق)، ٢٠٠٥.
- (بوونیادگەری لە رۆشنبیری و رەخنەی ئەدەبی کوردیدا).
- (دەقی شیعری-چێژ و بەها).

*** فەرمان هیدایەت:-**
- ساڵی ١٩٨٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٩١ باوکی شەهید کراوە، ئەوکات تەمەنی ٨ساڵان بووە.
- لە تەمەنی ١١ ساڵیدا سەرپەرشتی رۆژنامەی رۆژی کردووە.
- بەشداری چالاکییەکانی حیزبی شیوعی کوردستانی کردوە و کادرێکی بەرچاوی ئەو حیزبە بووە.
- بەرهەمەکانی:-
- گەنج و تازەگەری (مانیفێستی گەنجە)
- ئەنفال دۆزەخی بێ گوناهەکان.
- حیزب و پایەکانی.
- سۆمەرییەکان رابردووی کوردن.
ئێمە مارکسین یان مارکسیزانین.
- گێلاسە حەرامەکان.
- کلنا نموت ولیس بیننا خالدون.
- مرۆڤی هاوچەرخ.

*** فەخری عومەر حەمە عەلی - سەیدەلی فەخری:-**

- ساڵی ١٩٣٣ لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- سەرەتایی لەنێوان ساڵانی (١٩٣٨ -١٩٣٩) تەواو کردووە.
- ناوەندی و دواناوەندیشی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- کۆلێژی (الصیدلیة والکیمیاء الملکیة)ی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٥٧ بە بڕیاری (الإدارة الملکیة) بووەتە ئەفسەری پلە دوو، هەر لەو ساڵەدا دامەزراوە بە دکتۆر لە نەخۆشخانەی سەربازی، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٨ لەسەر ئارەزووی خۆی خانەنشین دەکرێت.
- ساڵی ١٩٥٩ دوکانی دەرمانسازی دامەزراندووە لە شەقامی (الجمهوري)، لە هەمان کاتدا دامەزراوە بە فەرمانبەر لە نەخۆشخانەی کەرکوك کە ئەوکات لە تەنیشت کۆشکی عەلی مەردانی ئێستاوە بوو، کە تاکە نەخۆشخانەی کەرکوك بوو، لە دواییدا گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانەی (الجمهوري) کە لەوێ بەڕێوەبەری (مدخل) بوو، تا ساڵی ١٩٦٣ لەسەر کارەکەی مایەوە.
- ساڵی ١٩٦٣ ماوەیەك بەند کراوە، بە هۆکاری سیاسی.

فەرمان هیدایەت

*** فەرهاد سەنگاوی**

- پێشمەرگەی دێرین و کادری ڕاگەیاندن و پەرلەمانتار، ناوی تەواوی فەرهاد حەمە سالح کەریم، لەدایکبووی سالی ١٩٦٢ی شاری کەرکوك، تاق منداڵی، بەپێی هەلومەرجی شەڕو ئاشتی، لە کەرکوك و سەنگاو و چەمچەماڵ بەسەربردووە و پۆلەکانی قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی لە سەنگاو و چەمچەماڵ بڕیوە. هەرچەند ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر میر سمایلی زەنگەنە، باوکی هەژار و نەدار بووەو شوانی و گاوانی بۆ خەڵك کردووە، چونکە لە منالییەوە لە داهاتی دوو دێ بێبەش کراوە.
- بەم جۆرە، سەنگاوی تافێکی سەختی منالی بەسەر بردووەو زۆر زوو تێکەڵەیەك هەستی نەتەوایەتی و چینایەتی لە دەروونیدا چەکەرەی کردووە.
- سالی ١٩٧٨ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد و لە سالی ١٩٨٠دا بووە پێشمەرگەی کەرتی ٥ی گەرمیان لە هەرێمی ٥ی قەرەداغ.
- سالی پاشتر گوێزرایەوە بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی و لەوێدا نێردرا بۆ گوندی توژەڵە کە بارەگای ڕاگەیاندنی ناوەندی یەکێتی نیشتیمانی لێ بوو. لە بارەگای ڕاگەیاندن لە بەشی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان کاری کرد، سەرەتا بەکاری سادە دەستی پێکرد وەك ئامادەکردنی هەواڵ و ڕێکخستنی چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەو دواتر وەك بێژەر چالاکی نواند.
- ماوەی نێوان سالانی ١٩٨١-١٩٨٨ بە گرنگترین ماوەی ژیانی پێشمەرگایەتی دادەنرێت کە تێیدا توانیویەتی وەك بەناوبانگترین بێژەر و خاوەنی کاریگەرترین دەنگ لە سەردەمی شۆڕشدا دەرکەوێ، بە دەنگە ڕەوان و زوڵاڵەکەی ڕۆلیکی گەورەی لە سەقامگیرکردنی گیانی بەرخودان و خۆڕاگری شۆڕشگێڕانەدا گێڕاو بەشدارییەکی کارای لە بەرزکردنەوەی ورەی پێشمەرگەو جەماوەردا کرد، لە ئاکامی ڕۆلی گەورەی لە بلاوکردنەوەی گیانی شۆڕشگێڕانەدا، لە سالی ١٩٨٢دا دەزگا ئەمنییەکان مالی باوکیان لە سەنگاو سووتاند و باوك و دایك و خوشکێکیان دەستگیر کرد و بۆ ماوەی ٩ مانگ لە زیندانی کەرکوك بەندیان کردن، کاتێك ئازادکران، دایکی پەکی کەوتبوو و زۆری نەبرد بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد.
- سالی ١٩٨٨ لەگەڵ کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، لە دۆلە کۆگە گیرسایەوە کە بارەگای یەدەکی ڕادیۆی لێ بوو و بەردەوام بوو لەسەر ئەرکەکانی خۆی، دواتر لە شاری سەقز لە ئێران نیشتەجێ بوو.

لە ئایاری ١٩٩٠دا لە ڕێگەی ئێرانەوە چوو بۆ سوریا و لە سالی ١٩٩١دا چوو بۆ دانیمارك و لەوێ گیرسایەوە، بەلام هەر ئەو سالە لەگەڵ هەلایسانی ڕاپەڕین لە کوردستان بە پەلە گەڕایەوە بۆ سلێمانی و لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان کە لەو کاتەدا بارەگاکەی لە گردی عەلی ناجیی ناو شاری سلێمانی بوو، بە دەنگە زوڵاڵەکەی بەشدارییەکی کارای لە ڕاپەڕیندا کرد و هەر بەو دەنگە حەماس خولقێنەش هەوالی سەرکەوتنەکانی ڕاپەڕینی خوێندەوە لەوانە هەوالی ڕزگارکردنی شاری کەرکوك لە نەورۆزی ئەو سالەدا.
- سالی ٢٠٠٩ پەیوەندی بە بزووتنەوەی گۆڕانەوە کرد، بەلام زوو وازی لێ هێنا و گەڕایەوە بۆ ناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.
- لە هەلبژاردنی سالی ٢٠١٣ی پەرلەماندا لەسەر لیستی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کاندید کراو بووە ئەندامی پەرلەمان.

*** فەخری:-**

- ناوی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ محێدین کوڕی شێخ مەحموودی قوتب کوڕی شێخ عەبدولڕەحما کوڕی شێخ عەبدولعەزیز کوڕی شێخ محێدینی کەرکووکە.
- سالی ١٩١٤ لە گوندی شۆڕیجەی ناوچەی قەرەحەسەن لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە قادر کەرەم بە زمانی تورکی تەواو کردووە.
- لە سەرەتاوە شیعرەکانی بەنازناوی بێکەس بەرهەم هێناوە تا سالانی سییەکان، بەلام لەدوایی نازناوی شیعری فەخری هەلبژاردووە.
- ڕۆلێکی سەرەکی هەبووە لە چالاکییەکانی حیزبی هیوا هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لە لقی کەرکوك خەباتی کردووە.
- سالی ١٩٤٩ لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك دادەمەزرێت تا کۆتایی سالی ١٩٥٤ بەلام لەدوایدا کێشەی بۆ دروست دەبێت و ڕوو دەکاتە ناوچەکانی دەرەوەی کەرکوك تا سالی ١٩٥٨ دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز.
- سالی ١٩٧٩ لە تەمەنی ٧٥ سالیدا کۆچی دوایی دەکات.

*** فەتحیە خان:-**

- بە یەکێك لە ئافرەتە ناسراوەکانی گەرمیان دادەنرێت.
- کەسایەتییەکی بەڕێز و بایەخدار بووە لەلای خەلکی ناوچەکە، لە کاتی تەنگانەدا خۆڕاگر و بە توانا بووە لە زۆربەی کارەکاندا، پرسی پێکراوە، لە تاق لاویدا بە سوارچاکی وتفەنگ چێتی ناسراوە، زۆر جار شەوانە لەگەڵ براکانیدا چاودێریی ناوچەکەی کردووە.

*** فەرحە ئیبراهیم- دایکی جەمال:-**

- لە سالی ١٩٠٨ هاتبووە دنیاوە.
- لە جوولەکە کوردەکانی کەرکوك بوو.
- (فرحە)ش لە ناوە جوولەکەکانی ڕۆژهەلاتدا ناوێکی پیرۆز بوو لەو سەردەمەدا لە یەکێ لە مالەکانی (صالحیە) نیشتەجێ بووە، دەیانوت کە مەلیك غازی بۆخۆی یەکێك بووە لەوانەو هەر ئەویش ناوەکەی لە (فرحە)وە گۆڕیوە بۆ (بهیجە).

- (فرحه - بهیجه) یەکەم ئافرەتی کورد بوو کە بەشێوەی سۆرانی گۆرانی خۆی لەسەر قەوان تۆمار کردووە.
- ئەم ئافرەتە لەسەرەتادا شوو بە ئەندازیارێکی ئیشغالی بەغدا دەکات بەڵام ئەم هاوسەرێتییەی زۆری نەخایاند.
- لە ساڵی ١٩٣٤یشەوە بەتەواوی وازی لە گۆرانیش هێنا، کەم کەم نەبێت گۆرانی نەدەوت، دەڵێن گوایە دواتر شووی کرد بە ئەفسەرێکی تەجنید لە ڕەواندز، لەوێش نەحەساوەتەوە و هەواڵی نەماوە تا لە هەڵەبجە و سلێمانی سەرهەڵدەدا و دوای دەچێتەوە بەغدا.
- ساڵی ١٩٧٩ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی شێخ مەعروف ئەلکەرخی لەلایەن (امانه العاصمه) دەنێژرێت.

*** د. فراز مارف بەرزنجی:-**

- لە ساڵی ١٩٤٦ دەخرێتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی (ئیمام قاسم).
- ساڵی ١٩٥٤ ئامادەیی دەهێنێت و لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ وەردەگرێت.
- لە هەولێر و شەقڵاوە دادەمەزرێت، لە بەغدا دبلۆم دەخوێنێت و لە ساڵی ١٩٧٩ دەگەڕێتەوە هەولێر، هەروەها بەشداری خولی (سۆنەر) دەبێت لە بەریتانیا و دەبێت بە یەکەم ئافرەت لە بەکارهێنانی ئامێری سۆنەر.
- لە هەولێر هاوسەرگیری لەگەڵ شێخ مستەفا دەکات و لەدواییدا ماڵی دەهێنێتە سلێمانی.

*** فەرهاد هەورامی:-**

- برای شەهید ئازاد هەورامییە.
- نووسەر و مۆسیقاژەن بووە.
- ساڵی ١٩٦٦ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ٢٠١٩ بە کارەساتێکی دڵتەزێن کۆچی دوایی کردووە.
- ماوەیەکی زۆر لەگەڵ خێزانەکەی ئاوارەی ڕومادی بوونە و ماوەیەکیش لە بەندینخانە ژیانی بەسەر بردووە بەهۆی هەڵوێستی کوردانەیانەوە.

فەتاح پاشا و عیزەت پاشا و مەجید بەگ

سالی ١٩٥١ بەغدا سەیدەلی فەخری لەگەڵ کۆمەڵێ قوتابی لە کۆلیژی سەیدەلی لە بەغدا

سالی ١٩٥٢ سەیدەلی فەخری عومەر سەیدەلی ئیسماعیل موحیەددین و پارێزەر ئەنوەر خۆشناو

سالی ١٩٥٢ سەیدەلی فەخری لەگەڵ كۆمەڵێ قوتابی زانكۆ

سالی ١٩٥٢ سەیدەلی فەخری لەگەڵ كۆمەڵێ قوتابی لە كۆلیژی سەیدەلی مەلەكی لە بەغدا

سالی ١٩٥٣ دکتۆر ئیبراهیم تاها و ئەندازیار حوسام سەیدەلی فەخری

سالی ١٩٥٥ گەڕەکی ئیمام قاسم مالی سەیدەلی فەخری

سالی ١٩٥٩ دکتۆر عەبدولعەزیز حەکیم و سەیدەلی فەخری و سەیدەلی یۆبەرد

سالی ١٩٥٩ سەیدەلی فەخری

سالی ١٩٥٩ دکتۆر عەبدولعەزیز حەکیم و سەیدەلی فەخری و سەیدەلی یۆبەرد

شێخ فەیزوللا تالەبانی

فەقێ حەمە حەیدەر

فەتحوڵلا عیزەت زێوڕی لەگەڵ کۆمەڵێک منداڵانی زێوڕیە

فەتحوڵلا عیزەت زێوڕی لە بەندیخانەی (نوگرە سەلمان)

سالی ١٩٥٩ دکتۆر ئیشۆ و سەیدەلی فەخری و دکتۆر جەلال

فەتاح ئاغا و هیجری دەدەی کاکەیی و زانایانی ئایینی کەرکوك

فەتحوللا عیزەت زێویی لە قوتابخانەی ئیمام قاسم

* ( قابیل تاڵەبانی - شێخ قابیل تاڵەبانی ):-

- (شێخ قابیل کوڕی شێخ حەسیب کوڕی شێخ عەلی تاڵەبانی)یە، کە بە (بێ ناو) یان (مەریوانی) ناسراوە.
- ئەم هونەرمەندە لە ساڵی (١٩٣٠)دا لە خێزانێکی ئایینی لە ئاوایی (لەیلان)ی کەرکوك هاتووەتە دنیاوە بەڵام لە پێناسەکەی ساڵی (١٩٢٧) نووسراوە.
- پلەی خوێندنی سەرەتایی لە هەمان دێ تەواو کردووەو ئامادەشی لەیەکێ لە قوتابخانەکانی شاری کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٤٤) لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك دامەزراوە.
- ساڵی (١٩٧٢)دا لە پاش (٢٨)ساڵ خانەنشین کراوە.
- هەر لە منداڵییەوە حەزی لە مۆسیقاو مەقامو گۆرانی کوردی کردووە، لە ساڵی (١٩٥٣)دا چووەتە ئێزگەی کوردی بەغداو لەوێ ئەم مەقامو گۆرانیانەی لە تەك مۆسیقادا بە شێکیانی بە ناوی (بێ ناو)ەوە تۆمارکردووە ئەوانی تریشی بە ناوی (مەریوانی).
- (مەقامی بەیات، هەوای نەمام نەمام، چاوی هەڵهێنە، نەشمیل هەروەها شارەزایی هەبووە لە ئاوازی ژەنینی عود، نایو تەپڵو دووزەلە بە کوردی وعەرەبی وتورکی مەقامو گۆرانی ووتووە.
- لە مەقامە ڕۆژهەڵاتییەکانی وەکو (بەیات، ڕاست، سەبا، حیجاز) ئەڵلاوەیسی، قەتار، خاوکەر، خورشیدی، ئای ئای نیوەشەو هەبووە.
- نەغمەی قۆریاتی تورکمانیشی بە جوانی دەخوێند.
- هونەرمەند سێ کوڕو سێ کچی هەیە، کوڕەکانی (دانا، عەبدولرەحمان، محەمەد) پیاوێکی پیاوانەو سەراست بوو، حەزی لە گەشت وسەیران دەکرد هەمیشە عودەکەی لەگەڵدا هاوڕێ بوو).

* ( قابیل محێدین - قابیل ):-

- ناوی تەواوی (محێدین کوڕی حاجی سلێمان کوڕی حاجی یونس)ە، نازناوی شیعری (قابیل)ە.
- ساڵی (١٨٣٣) لە گەرەکی پیریادی لەدایکبووە.
- نازناوی شیعری (قابیل)ە.
- ماوەیەك هەڵبژێردراوە بە ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕی شاری کەرکوك.
- ماوەیەکیش ئەندامی دادگای شارەکە بووە.
- شاعیرێکی سۆفی بووەو بە زمانی عەرەبیو فارسیو تورکی لێزانی خۆی بەدەرخستووە.
- ساڵی (١٩٠٩) کۆچی دوایی کردووە.

* ( قادری ئیمام - مەلا قادری ئیمام ):-

- ناوی (مەلا قادری عوسمانی کوڕی مەلا قادر)ە.
- ساڵی (١٨٨٨)ی زایینی لە شاری کەرکوك لە گەرەکی ئیمام قاسم هاتووەتە دنیاوە.
- خوێندنی لە تەمەنی شەش ساڵی تا دوازدە ساڵی لە خزمەت مەلا عوسمانی باوکیدا بووە لە دوایدا ئەمیش

وەکو هەموزاناکانی ئەو سەردەمە لە پێناوی خوێندنی لەم شارو ئەو شار کەوتۆتە گەڕان بۆ وەرگرتنی زانستی ئایینی، ساڵێك لە کۆیە لە خزمەتی مامۆستای گەورە (مەلا عەبدوللا جەلی زادە)و ساڵێك لە ناوچەی قەرەداغ لە خزمەتی شێخ (نەجیب)ی قەرەداغیداو پاش ماوەیەکیش دەگەڕێنەوە بۆ شاری کەرکوك لە خزمەتی مامۆستای پایەدار (مەلا مەحموود مەزناوە) بۆ وەرگرتنی بەڵگەنامەی زانستی ئایینی خوێندووەیەتی.
- پاش ماوەیەك هەر لە شاری کەرکوك ئافرەتێك ئەخوازێ بە ناوی (زوبەیدە خان) کە ئافرەتێکی زۆر هۆشمەندو

دڵپاك بووە هەردەم یارمەتی چینی هەژارو لێقەوماوی داوە، دیوەخانی تایبەتی خۆی هەبووە بۆ ژنان، ئاشنایەتی لەگەڵ حەپسەخاندا هەبووە، بەردەوام هاتووچۆی هەبووە لەگەڵ دایکی (سەعید قەزاز)دا.
- مەلا قادر سێ کورو کچێکی هەبووە ناویان (هادی)و (فایق)و (جەمال)و (کافیە خان).
- مەلا قادر لە ساڵی (١٩١٢)ی زایینی باوکی کۆچی دوایی دەکات بۆیە لە شوێنی باوکی لە مزگەوتی ئیمام قاسم دادەمەزرێت، ئینجا لە ماوەیەکی کەمدا کرا بە بەڕێوەبەری ئەوقافی باکووری عێراق، پاش ماوەیەکی کەم توانی پەیوەندی بکات لەگەڵ ئینگلیزەکان لە شاری کەرکوك، هەروەها ئینگلیزەکان ڕێزێکی زۆریان دەگرت.
- مەلا قادر هەرچەندە پیاوی ئینگلیز بوو، بەڵام پیاوێکی ئازادو چاو نەترس بوو خزمەتی شاری کەرکوکی کردووە بە تایبەتی گەلی کورد، هەژارو دەوڵەمەندو گەنجو پیر لە کۆشکەکەیدا هەموو ڕۆژ کۆدەبوونەوە بە تایبەتی ڕۆژانی هەینی.
- زۆر لە پیاوە گەورەکان دۆستی بوونە وەکو: (مەلا ئەفەندی هەولێر)و (جەبار ئاغای دۆغرەمەچی)و (کانی) شاعیرو (مەلا محەمەدی جەلی زادە)و (عەبدولرەحمان چەلەبی)و (شێخ مەحموودی نەمر)و (شێخ قادری حەفید)و (شێخ ڕەئوف)و (شێخ باباعەلی)و (شێخ لەتیف عومەری)و (محەمەد ئەمین عومەری).
- لە سەرەتای ئایاری (١٩٤١)دا شۆڕشی ڕەشید عالی گەیلانی بەرپابوو شێخ مەحموودی نەمر لەو کاتەدا دەست بەسەر بوو لە شاری ناسریە لە باشووری عێراق، خۆی دەرباز کرد هەڵهات بەرەو شاری کەرکوكو گەیشتە ماڵی قادر، ئەوە بوو (چەکمەن) کە ئەفسەرێکی ئینگلیزەکان بوو لە ئیستخباراتی کەرکوك بانگی مەلا قادری کردوو پێ ووت تۆ یارمەتی شێخ مەحموودت داوە بۆ هەڵهاتنیو ئێستاکە حکومەتی بەریتانیا تۆ بە تاوانبار دەزانێت، ئەوەبوو ڕەوانی شاری موسڵ کرا لە ماڵی (ئەرشەد ئەلعومەری) مایەوە کەوەزیری ئەوقاف بوو.
- چەند ساڵێك لەژێر چاودێری حکومەتی ئینگلیزدا بوو تا خانەنشینیان کرد لە ساڵی (١٩٤٩)دا گەڕایەوە بۆ شاری کەرکوكو هەموو خەڵکی گەڕەکی ئیمام قاسم چوونە پێشوازیەوە.
- ساڵی (١٩٥٢)دا کۆچی دوایی کردوو لە مزگەوتی ئیمام قاسم بە خاك سپێردرا.
- کورە گەورەکەی (هادی) لە ساڵی (١٩٤٧) دا خوێندنی کۆلێژی یاسای (کلیە الحقوق) تەواو کرد، لە هەرەتی لاویدا کۆچی دوایی کرد.
- کوری دووەمی (فایق) بەڕێوەبەری خواردەمەنی ئیستهلاکی شاری کەرکوك بووە لە ساڵی (١٩٥٥)دا کۆچی دوایی کردووە.
- کوری سێیەمی (جەمال)، کە یەکەم قائمقامی قەزای حەویجە بووە لە ساڵی (١٩٥٨) دا کۆلێژی یاسای لە شاری بەغدا تەواو کردووە.
- مەلا قادری ئیمام لە ماوەی ژیانیدا لەگەڵ خەڵکی کەرکوك گەلێك کاری چاکیان کردووە وەکو:-
- کردنەوەی قوتابخانەیەکی ناوەندی ئایینی لە ساڵی (١٩٢١) بۆ قوتابیانی ئایینی لە شاری کەرکوك.
- دامەزراندنی کۆلێژی زانستی ئایینی لە ساڵی (١٩٢٧) لە شاری کەرکوك لە شوێنی ئێستای کتێبخانەی گشتی لە گەڕەکی خانەقا.
- دەست بەسەراگرتنی زەویو زاری کشتوکاڵی کەوا وەقف کرابوون بۆ مزگەوتەکان بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف بۆ دابین کردنی موچەی مامۆستاکان وچاککردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکان.
- دروستکردنی بەندیخانە بۆ ئافرەت لە ماڵی خۆیدا.
- لە ساڵی (١٩٢٢) بە شێوەیەکی نهێنی هەوڵی بەردانی شێخ مەحموودی نەمری داوە لە هیندستاو پەیوەندی بە شۆڕشی شێخ مەحموودەوە کردووە.
- بۆ هەر دەست درێژییەك بۆ سەر شاری کەرکوك بەرگری کردووە.
- بۆ یەکەم جار هەڵساوە بە دانانی (سەندووقی خێرو بەرەکات) بۆ کۆکردنەوەی زەکات لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافو پاشان پارەکۆکراوەکان بەسەر فەقێ قوتابییەکان ومەلای مزگەوتەکان وخەڵکی هەژارو دەست کورتو نەداراندا.

*** (قادر بەرزنجی):-**

- ساڵی (١٩٠٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەربازی تەواو کردووەو بووەتە ئەفسەر.
- خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری (شەفەق) بووە لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٠) بووەتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ژین) لە سلێمانی.
- ساڵی (١٩٧٤) لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

*** (قادر جاف - مەلا قادر جاف):-**

- شاعیر ناوی (مەلا قادر کوڕی مەلا موئمینی جاف)ە.
- ساڵی (١٨٥٠) لەدایکبووە.
- ئیجازەی مەلایەتی لەلای مەلا عەبدولرەحمانی پێنجوێنی وەرگرتووەو بووەتە ئیمامو خەتیب لە گەلێك لە لادێیەکان.
- لەسەر داواکاری مەحموود پاشای جاف بووەتە ئیمامو خەتیب لە (قزربات) لە سەعدییە.
- ساڵی (١٩٠٨) کۆچی دوایی کردووە.

*** (قادر عوسمانلەکە - شێخ قادر عوسمانلەکە):-**

- یەکێ بووە لە گەورە پیاوەکانی شێخانی قەرەحەسەن لەگەڵ شێخ مەحموودی مەلیکا لە شەڕی شوعێبەدا جەنگاوە.
- ساڵی (١٩٥١) کۆچی دوایی کردووە.

*** (قادری مامەیی - حاجی مەلا قادری مامەیی):-**

- ناوی حاجی عەبدولقادر عومەر ئەحمەدە ناسراوە بە حاجی مەلا قادری مامەیی.
- ساڵی (١٩٠٢) لە گوندی مەرزیخەی خواروو هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (١٩٣٨) بووەتە مەلای گوندی (مامە) لە ناوچەی دووبز.
- لە (١٧)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٧) کۆچی دوایی کردووەو لە گوندی مامە نێژراوە.

* ( قادر کەسنەزانی بەرزنجە ):-

– لە بواری هۆنراوەو نووسین و وەرگێراندا بابەتی هەیەو سی سالە شیعر دەنووسێت، بەڵام زانیاریمان نییە دەربارەی شیعر و بەرهەمەکانی.

* ( قادر میرئاخور-موخلیس ):

– ناوی (قادر کوری محەمەد داودی)یە.
– سالی (١٩٠٥) لە کفری لەدایکبووە.
– یەکێکە لە شاعیرەکانی کفرییە.
– سالی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

* ( قادری میکائیلی - حاجی قادری میکائیلی ):-
– ئەم کەسە شاعیر بووەو زۆر بە ناوبانگ بووە لە وەختی خۆیدا، بەڵام زانیاریمان نییە دەربارەی شیعر و بەرهەمەکانی.

* ( قارەمان نادر محەمەد - قارەمان شیخ برزێنی ):-

– سالی (١٩٧٦) لە گوندی عەمدۆن ناوچەی شێخ بزێنی سەر بە ناحیەی شوانی پارێزگای کەرکوك لەدایکبووە.
– خوێندنی تا پۆلی چواری سەرەتای لە گوندی عەمدۆن خوێندووە و پاشان بەهۆی کارەساتی ئەنفالەوە گوندەکە چۆل دەکرێ و بەرەو کۆمەلگای کەورگۆسك سەر بە پارێزگای هەولێر دەگوازرێنەوە، پاشان درێژەی بە خوێندن داوە تا پۆلی چوارەمی ئامادەیی و لە سالی ١٩٩٥ بۆ شاری هەولێر گواستوویانەتەوە، لە ئامادەی هەولێری کوران درێژەی بە خوێندن دا تا پۆلی پێنجەمی زانستی.
– سالی ١٩٩٦ لە سلێمانی چەند سالێك لە خوێندن دابراوە، دواتر لە سالی ١٩٩٨ گەراوەتەوە بۆ خوێندن و شەشی ئامادەیی لە شاری تەق تەق تەواو کردووەو لە زانکۆی سلێمانی لە کۆلێژی کشتوکال وەرگیراوە، بەڵام لە دواییدا لە پەیمانگای تەندروستی لە شاری کۆیەو لە سال (٢٠٠١) پەیمانگاکەی تەواو کردووە، تا سالی (٢٠٠٤) لە بواری تەندرستی لە کۆمەلگای خالخالان خزمەتی تەندروستی کردووە.
– سالی (٢٠٠٤) لە زانکۆی کۆیە بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن و لە سالی (٢٠٠٨) بەکالۆریۆسی لە مێژوو تەواو کردووە، لە سالی (٢٠٠٩)دا لە ماستەر لە هەمان زانکۆ وەرگیراوەو لە سالی (٢٠١٢) بروانامەی ماستەری بەدەستهێنا، ئێستاش خوێندکاری دکتۆرایە لە زانکۆی کۆیە.
– بەرهەمەکانی:
– (بزووتنەوەی هەقە)، ٢٠١٣.
– چەندین توێژینەوەی زانستی لە زانکۆی کۆیە بلاوکردووەتەوە وەکو: بابەتێك بە ناوی (ئەنفالی شێخ بزێنی) لە گۆڤاری زانکۆی سلێمانی و بابەتێك بە ناوی (مەسیحیەکانی کۆیە) لە گۆڤاری زانکۆی کۆیە و بابەتێك بە ناوی (وێستگەکانی مەولانا خالد) لە کۆنفرانسی تەسەف لە کەلار پێشکەش کرووە.

* قارەمان قەرەوەیسی:-

– ناوی ئەمین محەمەد جەبارییە.
– سالی ١٩٠٥ لە گوندی شێردەرە لەدایکبووە.
– خانەوادەی قارەمان قەرەوەیسی لەبەر ناهەمواری دنیا و دەستکورتی چوونەتە خالساتی لای بەعقوبە لەوێ کاری کشتوکالی ناو باغیان کردووە، دواجار گەراونەتەوە گوندی شێردەرە، ماوەیەکیش لەوێ بوونە و پاشان هاتوونەتە گوندی قەرەوەیس، هەر لەبەر ئەمەیە بە قارەمان قەرەوەیسی ناسراوە.
– شاعیرێکی میللی نەخوێندەوار بووە شیعرەکانی سادە و رەوان و بێ قورتن.
– سالی ١٩٦٩ لە قەرەوەریس کۆچی دوایی کردووە.

* ( قاسم حەسەن ):-

– ناوی (قاسم کوری حەسەن کوری ئەحمەد کوری شێخ)ە.
– سالی (١٩١٠) لە بەغدا لەدایکبووەو لە بنەرەتدا کوردەو خەلکی کەرکوکە.
– باوکی ئەفەسەر بووە لە سوپای عوسمانی، دەرچووی کۆلێژی یاسایەو بەشداری دامەزراندنی (الحزب الوطني الديمقراطي) کردووە لە سالی (١٩٤٦)دا.
– لە دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی (الاهالي) بووە لە سییەکان و دەوری هەیە لە بزووتنەوەی ئایاری سالی (١٩٤١)دا.
– گەلێك کتێبی چاپکراوی هەیەو لە سالی (١٩٧٠)دا کۆچی دوایی کردووە.

* ( قاسمی خلوصی - مەلا قاسمی خلوصی ):-

– ناوی (قاسم کوری خەلوسی توحفەچی)یە.
– زۆری شیعرەکانی لە رۆژنامەی (الحوادث) بلاوکردووەتەوە.
– ئەوەی دەربارەی دەزانرێت کە تا سالی (١٩١٤) لە ژیاندا بووە، بەڵام زانیاری تەواومان نییە دەربارەی لایەنەکانی تری ژیانی.

* (قاسمی-سەید قاسم):-

- ناوی (قاسم)ەو نازناوی شیعری (سەید قاسم)ە.
- ساڵی (١٧٨٠)دا لەدایکبووە.
- دیوانێکی شیعری هەیە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ رووداوەکانی کەرکوك لەنێوان ساڵی (١٨٢١) تا ساڵی (١٨٤٤)، بە تایبەتی لە بواری ئەدەبو ژیانی کۆمەڵایەتی.
- ساڵی (١٨٤٥)دا کۆچی دوایی کردووە.

* (قاسم عەزیز ئاق بایراق):-

- ساڵی (١٩٥٩) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- دیوانی شیعری هەیە بە ناونیشانی (بایراق یوزونون اییشیلدا مامی ایجین تورکولر یاراتدیم)، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة) بەغدا، ١٩٩٠.

* (قاسم محەمەد):-

- ساڵی (١٩١٠) لە بەغدا لەدایکبووە، لە بنەرەتدا لە خێزانێکی کوردی کەرکوك بوونە، باوکی ئەفسەر بووە لە سوپای تورکی.
- کۆلێژی یاسای تەواو کردووە.
- لە شوباتی ساڵی (١٩٣٤) گیراوە.
- لە دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی (الاهالي) بووە لە سییەکاندا.
- دەوری گرنگی هەبووە لە بزووتنەوەکەی ئایاری (١٩٤١)و رایکردووە بۆ ئێران.
- لە (الحزب الوطني الديمقراطي) بووە لە کاتی دامەزراندنیدا لە ساڵی (١٩٤٦) لە پێناویدا خەباتی کردووەو لە رۆژنامەکەی ئیشی کردووە.
- ساڵی (١٩٥٢) گیراوە.
- ساڵی (١٩٥٨) سەفیری عێراق بووە لە هیند، ئینجا لە ساڵی (١٩٦٠) لە (براغ)و ١٩٦٣ لە (بودابست).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (جهاد العرب القومي في فلسطين)، ١٩٣٩.
- (المبادئ السياسية الحديثة في بلادنا)، ١٩٣٩.
- (الثورة الصناعية في انكلترا).
- (الحلف بين الصهيونية والاستعمار)، ١٩٤٦.
- (العرب او المشكلة اليهودية)، ١٩٤٦.
- (اسرائيل دولة فاشية اعتدائية)، ١٩٦٠.
- (بوابتنا ثورات القرن العشرين)، ١٩٦٩.
- (لمحات من تأريخ التطورات الإجتماعية في الغرب)، ١٩٥٨.

* (قاسم محەمەد تۆفیق ساری کەهیە):-

- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی بەغدای لە ساڵی (١٩٦٩) تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی:
- (تأريخ الأدب التركماني)، دوو بەگ، بە تورکی، ١٩٧٨.
- (اعداد مؤلفات الشاعر خيرالله كاظم)، ١٩٨٥.
- (الشعراء التركمان المعاصرون)، ١٩٨٨.
- (الخوريات في الأدب التركماني)، ١٩٩١.

* (قاسم مستەفا بیرمقدار):-

- ساڵی (١٩٣٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- چاپکراوەکانی:
- (اعانة المستفيد في علم التجويد)، چاپخانەی (البلدية)، کەرکوك، ١٩٦٧.

* (قەحتان نەجات هورمزی):-

- ناوی (قەحتان کوڕی نەجات کوڕی عەلی کوڕی زەینەل)ە، لە هۆزی (هورمزی)یە
- ساڵی (١٩٣٦) لە قەرەتەپە لەدایکبووە.
- گەلێك کتێبی چاپکراوی هەیە بە زمانی عەرەبیو تورکی لەنێوان بابەتی چیرۆكو شانۆگەری وەکو:
- (ايام شديدة البؤس)، شیعر، بەغدا ١٩٦٠.
- (نخب العالم المنهار)، شیعر، کەرکوك، ١٩٦٨.
- (الخروج من الجنة رغبة)، شیعر، کەرکوك، ١٩٩٥.
- (قصائد صافينازية)، دیوانێکی شیعری، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (قارب في صحراء)، شانۆ، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (كسيح أمام المرقص)، کورتە چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (سيدة كركوك-ديوان الحب).

* (قەدریە زیائی):-

- ساڵی (١٩٥٠) لە گەرەکی قۆریە لەدایکبووە.
- پەیمانگای مامۆستایانی لەنێوان ساڵانی (١٩٦٨-١٩٦٩) تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی وەکو:- یۆرد، العراق، هاوکاری، صوت الاتحاد، بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمەکانی:
- (کوجوك ارقاداش)، چیرۆك بۆ منداڵان بە زمانی تورکی، چاپخانەی (جمهوريت)، کەرکوك، ١٩٧٣.
- (کونول)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٨٩.

* قەرەوەهاب:-

- ساڵی ١٩٥٧ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- شهید یاراسندن ئەکان وەتەن، شیعر ٢٠٠٤
- ماهیزەر، شیعر ٢٠٠٩
- شهید اللريندەن اوبەن یوقسول، ٢٠٠٤
- ولاتی حمار نفسی، شیعر، ٢٠٠٦
- الله بیر دۆغرەماچی مودەبیر، ٢٠٠٦
- بوردە باریشە، ٢٠٠٦
- شهید دەعوەسنە، ٢٠٠٦
- شوو شیعرلەر ئوکومەیان، ٢٠٠٨
- شیعرلەر غەریبی، ٢٠٠٨

*** (قەمەر بەگلەر ئەلماس):-**

- سالی (١٨٩٦)دا لەدایکبووە.
- پیاوێکی خاوەن فامی دەنگ‌و ئازار خۆشێکی عاشق مەقام، قورئان‌و مەولود خوێنێکی بەتام، قوتابی بەوەفای خەلیل منەوەر شاعیر بەهۆی گرنگی شیعرەکانی یەکێکی وەکو مامۆستا (عەلی مەردان) بەکاری هێناوە لە خوێندنی مەقامدا.
- سالی (١٩٧٨)دا کۆچی دوایی کردووە.

*** (قوربانی حیسابگەر- کوێخا قوربانی حیسابگەر):-**

- سالی (١٩٠٥) لە کەرکوك لە گوندی دەلەسی بچووك لە داقوق دایك بووە.
- مرۆڤێکی وریا و بیرتیژ زانایەکی حیسابگر بوو واتا رۆژ ژمێر بوو، زۆربەی کاکەییەکان سال‌و رۆژی لەدایکبوونیانی دیاری دەکردو حیسابەکەی تەواو دەردەچوو، هەندێك جار دەستنیشانی ڕووداوێکی دەکرد کە ئەو سالە ڕوودەدات، بۆ جوتیارەکانیش حیسابی تۆو دەغل‌و دانی دەکرد، دەیزانی فلانە رۆژ فلانە بالندە ڕوودەکاتە دەڤەرەکەیان.
- سالی (١٩٦٣) کۆچی دوایی کردووە.

**-:قەرە محەمەد ***

- سالی ١٨٩٥ لە کەرکووك لەدایکبووە.
- سالی ١٩٤٨ کۆچی دوایی کردووە.
- باوکی شەهید عەزەدین قەرە محەمەدە

*** (کاروان عوسمان عەلی - کاروان خەیات - ڕێبین):-**

- ناوی (کاروان عوسمان عەلی ئەحمەد مەحموود)ە.
- ساڵی (١٩٨٦) لە کەلار لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (پایز، گوڵبژێرێك لە بەرهەمو ژیانی هونەرمەند عەدنان کەریم)، ٢٠٠٥.
- (پەندە باوەکان)، چوار بەرگ، .
- (دیوانی عەباس حەقیقی).
- (دیوانی هێمن موکریانی).
- (هێمن لە نێو ئەدەبدا)،
- (نامە کۆكو هەندێ لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی هەژار موکریانی)، شیعر.
- (کوردو سەربەخۆیی زمان، چەپکێك لە نووسینەکانی هەژار موکریانی).
- (پەندو مەتەڵ)، ٢٠٠٩.
- (ئێلی باجەڵان لە سەفەوییەکانەوە تا کۆتایی قاجارەکان)، وەرگێران، ٢٠١٤.
- (ئەلبوومی ڕەشید باجەڵان)، ٢٠١٤.
- (بازخوانی و بازشناسی اسناد ایل باجلان)، ٢٠١٤.
- (جامع الطوایع رشید اسماعیل باجلان)، ٢٠١٤.

*** (کاروان محەمەد تەیب):-**

- ساڵی (١٩٨٢) لەدایکبووە.
- بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی:
- بەهاکانی هەواڵی تەلەفزیۆن.
- کۆمۆنیکەیشن.

*** (کارێزی):-**

- ناوی (مەلا یوسفی کارێزی)یەو نازناوی شیعریشی (کارێزی) بووە، کە شیعری بە زمانی کوردی سۆرانی هەبووە.
- ڕەنجووری لە قۆناغی خوێندنی فەقێیەتی و سەردەمی گەنجیدا لە ناوچەی شوان بووەو کارێزی ناسیوەو هەشت کۆپلە شیعری پێنج خشتەکییان وتووە کە ناوی هەر یەکە لە ڕەنجووری و کارێزی تێدا هەیە.
- بەپێی سەرچاوەکان بەوە دەچێت کە خەڵکی گوندی (کارێز) یان (کارێزەی) ناوچەی شوان بێت و بۆ خوێندنی فەقێیەتی ماوەیەك لە خاکی موکریان ژیانی بەسەردا بردبێت.
- ساڵی (١٧٨١) کۆچی دوایی کردووە.

*** (کاکەی تیلەکۆ):-**

- ناوی (عەلی کوڕی نادری کوڕی ئەحمەد تیلەکۆ)یە.
- لە هۆزی شامارەو خەڵکی گوندی تیلەکۆی قەڵەندەی سەنگاوە.

*** (کامەران ئەحمەد میرزا):-**

- ساڵی (١٩٦٩) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٥) پێشانگای یەکەمی تایبەتی لە کەرکوك لە هۆڵی هونەری نوێ کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٣) بەشداری پێشانگای تایبەتی لە سلێمانی کردووە لە هۆڵی مۆزەخانە.
- بەشداری کردووە لە پێشانگاکانی هونەرمەندانی کەرکوك.

*** (کامەران کوێخا جەلال - دکتۆر کامەران کوێخا جەلال):-**

- لە کەرکوك لە گوندی حەساری گەورە لەدایکبووە.
- ماجستێرو دکتۆرای لە بواری مێژووی کۆندا بەدەستهێناوە.
- لە بواری مێژووی کەرکوکدا کتێبێکی بە چاپ گەیاندووە بە ناونیشانی (مێژووی کۆنی کەرکوك لەبەر ڕۆشنایی دەقەکانی نوزیدا)، (٢٠٠٨).

*** (کامیل ڕەزا ئیسماعیل):-**

- ساڵی (١٩٧١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩١) پەیمانگای مامۆستایانی بەشی هونەر تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠١٠) یەکەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە قشڵەی کەرکوك کردووەتەوە.
- بەشداری کردووە لە (١٠) پێشانگای هاوبەش لە کەرکوك و لە دەرەوەی کەرکوك.
- بەشداری کردووە لەم پێشانگایانەی خوارەوە بە شێوەی هاوبەش:
- پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوك، ٢٠٠٣.
- پێشانگای یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان لقی کەرکوك، ٢٠٠٥.
- پێشانگای یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان لقی کەرکوك،

.٢٠٠٧
- فیستیڤاڵی خۆشەویستی و ئاشتی كەركوك، ٢٠١٠.
- فیستیڤاڵی كەركوك دەستە گوڵ، ٢٠١٠.
- پێشانگای سەندیكای هونەرمەندانی كوردستان لقی كەركوك، ٢٠١١.
- پێشانگای كۆمەڵەی هونەری دیجلە، ٢٠٠٧.
- پێشانگای فیستیڤاڵی هەفتەی ڕۆشنبیری (ڕۆنیا) لە كەركوك، ٢٠٠٨.
- پێشانگای هاوبەش لە (١٦)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٦).
- پێشانگای هاوبەش لە (١٤)ی حوزەیرنی ساڵی (٢٠٠٨).
- پێشانگای هاوبەش لە (١٩)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٨).
- پێشانگای هاوبەش لە (٢٩)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٩).

* (**كامیل ڕەشید فەتاح جەباری**):-

- ساڵی (١٩٣٢) لە كفری لەدایكبووە.
- لە (٩)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٠) كۆچی دوایی كردووە.
- ئەدیب و شاعیر بووەو بە زمانی كوردی عەرەبی نووسینی هەیە.

* (**كامیل ساڵەیی**):-

- بەرهەمە چاپكراوەكانی:-
- (موجز في تاريخ كركوك بين وثائق الماضي وحقائق الحاضر)، كەركوك، ٢٠٠٥.
-: (آشتي وآيدن-قصة فتى تركماني احب فتاة كوردية)، چاپی دووەم، ٢٠١٣.
- قائیممەقامی ناوەندی قەزای كەركوكە.

* (**كامیل شوكر نادر**):-

- مەقام زان بوو بەڵام زانیاریمان دەربارەی نییە.

* (**كامیل وەهبی ئەرسەلان**):-

- ساڵی (١٨٦٧)دا لە گەڕەكی شاتەری لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩١٦)دا كۆچی دوایی كردووە.
- لە بواری شیعردا دەستی هەبووەو خوێندنی ئایینی لەلای زانایانی وەكو مەلا حوسێن، مەلا مەحموود مەزناوی، مەلا عەلی حیكمەت خوێندووە.
- لە سەرەتای شەڕی جیهانی یەكەمدا دادوەر بووە لە كەركوك و لە دواییدا وازی لێهێناوە.

* (**كامیل یەعقوبی**):-

- كوڕی (مستەفا یعقوبی)یە.
- ساڵی (١٩٦٥) كۆچی دوایی كردووە.
- لە ئاداری ساڵی (١٩٤٧) هەڵبژێردراوە بە نائیبی كەركوك.
- لە كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٣) هەڵبژێردراوە بە نائیبی كەركوك.
- لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٥٤) هەڵبژێردراوە بە نائیبی كەركوك.
- لە ئەیلولی ساڵی (١٩٥٤) هەڵبژێردراوە بە نائیبی كەركوك.

* (**كاوە مەحموود شاكر**):-

- ساڵی (١٩٥٨) لە كەركوك لەدایكبووە.
- دەرچووی كۆلێژی یاساو سیاسەتە لە زانكۆی بەغدا لە ساڵی (١٩٧٩).
- بڕوانامەی ماستەری لە بواری (ئیسلامۆجین، زانستە ئیسلامییەكان) بە پلەی ئیمتیاز لە هۆڵەندا وەرگرتووە.
- لە سەرەتای هەشتاكانەوە پەیوەندی كردووە بە حیزبی شیوعی كوردستانی و بووەتە پێشمەرگە.
- لە بواری ڕاپەڕین و ڕاگەیاندن كاری كردووەو سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ڕێگای كوردستان) بووە.
- ڕاوێژكار بووە لە پەرلەمانی كوردستان لە بواری باری كەسێتی و نووسینەكانی بە ناوی (هادی مەحموود) بڵاوكردووەتەوە.
- لە كابینەی شەشەم و حەوتەمی حكومەتی هەرێمی كوردستان، بووەتە وەزیری ڕۆشنبیری و لاوان.

* (**كەرەم قادر عەزیز زەنگەنە-شمشاڵ ژەن**):-

- ساڵی (١٩٤٢)ی زایینی لە گەڕەكی ڕەحیماوای كەركوك لەدایكبووە، دانیشتووی گەڕەكی ئیمام قاسمی كەركوكە.
- ساڵی (١٩٥٢) زایینی لە تەمەنی (١٠) ساڵان بووە بووەتە شوان و خووی داوەتە شمشاڵ و لەگەڵیدا ڕاهاتووە لەم شوانانەوە فێری ژەنین بووە: (عەلی حاجی عومەرحەسەن، عوسمان حەسەن)، بۆ ماوەی سی ساڵ شوان بووەو هەمیشە ئەو شمشاڵە یاوەری گیانی بەگیانی بووە.

هونەرمەند ئاوازی جۆراو جۆری کوردی رەسەنی ئەزانی، لەوانە: (لاوك، حەیران، مەجلیسی، سەرشاخی، رۆینە، حۆحۆی مەری، بووکانە بوکانە، سوارە سوارەی سوار، رەفتی شار، قەرەداغی).

* (کەرکوکی):-

- زانای ئایینی و نووسەرێکی بە توانای سەدەی دوانزەهەمی کۆچی بووەو ئیجازەی زانستی ئایینی وەرگرتووە لەژێر دەستی ئیسماعیل حەیدەری و مەلا محەمەد ئەمین.

* (کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف):-

- ناوی (کەریم بەگی کوری فەتاح بەگی حەمە پاشا)یە.
- سالی (١٨٨٩) لەدایکبووە، لە ئاوایی (گردەپان)ی هەوارگەی (کانی چەقەل).
- پاش کۆچی دوایی مەحموود پاشای جاف خەلکی جاف کەریم بەگ بەگەورەی جاف هەلدەبژێرن.
- کەریم بەگ سێ ژنی هێناوە وسێ کوری بووە- کەریم بەگ کە کراوەتە سەرۆك لەلایەن عوسمانی و ئینگلیزو حکومەتی عێراقەوە دان بە سەرۆکایەتی نراو کەریم بەگ هەمیشە سەر بەشێخ مەحموود بووە لەشەری ئاوباریکدا بەشداری کردبوو.
- ئەم زاتە بەلاشە قەلەو بە هەلس و کەوت رۆح سووك بوو دایم لە سەر بەرمال و روو لە قیبلەبوو لەلایەن خەلکەوە خۆشەویست بوو زولم و دەست درێژی پێ ناخۆش بوو.
- هەرچەندە کەریم بەگ لەگەل شۆرشی برایم خاندا نەبوو بەلام دژیشی نەوەستاوە توانی هەندێ لە مال و مالاتی شۆرشگێران لە چنگ تالان کردن بپارێزێت و کە برایم خان شکستی هێناوە وبریاری شەری چەتەگەری دابوو ئینگلیزەکان بریاریاندا بچنە سەری کەریم بەگ بە نهێنی برایم خانی ئاگادار کرد کە خۆی دەرباز بکات ئەویش لە پێش دا بەمە قایل نەبوو دوایی ناچار لەو هەرێمە کشایەوە.
- کەریم بەگ پیاوێکی بەوەفابوو دایم سەری لە دۆست وئەو کەسانەی ئەدا کە لە دلیدا جێگربوو.
- سالی (١٩٤٩) لە کفری بە نەخۆشی دل کۆچی دوایی کرد.
- ژیانی مندالی لەناو عەشرەتەکەی خۆیدا بووە بەلام بۆ وەرگرتنی زانست و خوێندن چووەتە سلێمانی لە مال (ئەورەحمان ئاغای ئەولا ئاغا) ی خالی بووە وبۆ دەرز وەرگرتن چووەتە حوجرەی (مەلا سەعید) لەوێ قورئان و کتێبە ووردەکانی تەواو کردووە ئینجا گەراواتەوە بۆ ناوجاف لەوێش لەلای شێخ عەلی بەرزنجی و شێخ غەنی ناو کە مەحموود پاشا لە ئەستەمبولەوە هێنابووی فارسی و تورکی خوێندووەو لەلای مەلا سەعیدی قزرباتیش عەرەبی تا (فەناری) خوێندووە.
- سالی (١٩٠٨)دا فەتاح بەگی باوکی دنیای بەجێهێشت، کەریم بەگ کەوتە ئیدارەی ئەملاك وکاروباری عەشائری تا (باوەنور) و(ئیبراهیم خانچی) پاشان بووەتە سەرۆکی عەشیرەت.

- کەریم بەگ دەریایەکی ئەشعار وئەدەبیات بوو گەلێ ئەشعاری لەبەربوو.

* (کەریم بەرزنجی - شێخ کەریم بەرزنجی):-

- ناوی (شێخ کەریم کوری شێخ مەحموودی قوتبی بەرزنجی) یە، کە بە (کەریم شۆریجە) بە ناوبانگە.
- سالی (١٨٦٠) لە گوندی (شۆریجە) لەدایکبووە.
- لە دوای کۆچی دوایی باوکییەوە (شێخ مەحموودی قوتب) جێگەی گردووەتەوەو کاروبارە ئایینییەکانی لە ناوچەکەدا بەجێهێناوە.
- سالی (١٩٢٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (کەمال محەمەد سلێمان بەیاتی):-

- سالی (١٩٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- (کلاب بدون اجنحة).
- ئاتلار کیسلمیز، شانۆ، ٢٠٠٤
- شەفەق دۆگروو، شانۆ، ٢٠٠٦
- کرکوك سینی یازدم، رۆمان، ٢٠٠٨
- کرکوکتە قۆریە بازاری، رۆمان، ٢٠٠٩
- دوگوم، شانۆ، ٢٠١٠
- کرکوکتە زەمان، رۆمان، ٢٠١٣.

* (کەنعان گویزەل سەس):-

- ناوی (کەنعان محەمەد)ەو لە ساڵی (١٩٦٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٩١)ەوە هاوشانی ئەیوبی برایو هونەرمەند عەلی ڕەیحانی لە تیپی مازی کاری هونەری کردووە.
- ساڵی (١٩٩٤) لە تیپی ئەیلولو ساڵی (١٩٩٥) لە تیپی هاوژین درێژەی بە کارە هونەرییەکانی داوە.
- تیپێکی بەناوی (گویزەل سەس) پێکهێناوە کە تاوەکو شەهید بوونی بەردەوام بووە.
- کارمەندی تەلەفزیۆنی کەرکوك بووە.
- لە (١١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨) لە کارێکی تیرۆریستی لە چێشتخانەی عەبدوڵڵا خۆیو منداڵەکانیو برایەکی شەهید کران.

* (کەوسەر زەینەل حوسێن):-

- ساڵی (١٨٦٢)دا لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٢٦)دا کۆچی دوایی کردووە.
- شاعیر بووەو نازناوی شیعری (سەروەت) بووە.

* (کریانی):-

- نازناوی یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك بەڵام هیچ شتێك دەربارەی نازاندرێت، بەڵام مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی باوەڕی وایە کە ناوی (عەلی ئاغای نەفتچی) بێت.

* کۆچەر ئەبو بەکر:-

- ناوی (کۆچەر ئەبو بەکر ساڵح)ە.
- ساڵی ١٩٨٦ لە سەقزی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەدایکبووە
- ساڵی ٢٠٠٩ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی - بەشی شانۆی تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی:-
- کۆترەکانی باوکم، شیعر ٢٠١٣.
- هیچ، یادداشت، ٢٠١٥
- بەرهەمێکی داهاتووی هەیە لە شێوەی نامەیەکە لە هاووڵاتییەکی هۆڵەندییەوە بۆخۆی لە شێوەی پرسیار و نامە گۆڕینەوە.
- شیعرەکانی کراون بە فەرەنسی، ئینگلیزی، فارسی، عەرەبی.
- کتێبی (هیچ) کراوە بە ئینگلیزی و کرمانجی.
- زیاتر لە بیست کۆڕی تایبەتی و هاوبەشی گێڕاوە دەربارەی شیعر.
- لە سێ فیستیڤاڵی ئەدەبی بەشداری کردووە: یەکەم، فیستیڤاڵی لاوان، ساڵی ٢٠٠٨ خەڵاتی دووەمی وەرگرتووە،

هەمان فیستیڤاڵ، ساڵی ٢٠٠٩ خەڵاتی یەکەمی وەرگرتووە.
- لە فیستڤاڵی گەلاوێژ، ساڵی ٢٠١٣ خەڵاتی یەکەمی وەرگرتووە.
- سەرپەرشتیاری بەشی چاپ و بڵاوکردنەوەی منداڵانی ئەندێشەیە لە بارەی شیعرەوە.
- سەرپەرشتیاری بەشی چاپ و بڵاوکردنەوەی منداڵانی ئەندێشەیە لە بارەی چیرۆکەوە.

* (کوپر-ثروت):-

- ساڵی (١٨٦٢) لە گەڕەکی (چای) لەدایکبووە.
- ناوی کوپر کوڕی زینەل (زەینولعابیدین کوڕی حوسێن) بووە.
- نازناوی شیعری (ثروەت) بووە.

* (کوردی):-

- لە (٢٥)ی ئابی ساڵی (١٩٠٤) لە شاری کفری لەدایکبووە، ئەو وەختە باوکی لەوێ قازی بوو لە پاش دوو ساڵێك هاتونەتەوە سلێمانیو تا پۆلی شەشی سەرەتایی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٢١) بریاری داوە لەگەڵ براکەی بچێتە کەرکوك بۆ خوێندن لەبەر ئەوەی قوتابخانەی باشی لێ بوو، بەشی ناوخۆیی هەبوو.
- لەو ماوەیەی کە لە کەرکوك بووە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا سەردانی شاعیری میللی عەبدولخالق ئەسیری دەکرد.
- ساڵی (١٩٢٣) هاتووەتە بەغداو چووەتە مەکتەبەی هەندەسە.
- هەر لە بەغدا کۆمەڵەیەکی بچووکیان پێکەوە نا بە ناوی (لاوانی کورد) وە خۆی بروابێکراوی کۆمەڵەکەبوو، دەورێکی گرنگیان بینی لە بڵاوکردنەوەی بیری هوشیاری.
- ساڵی (١٩٢٦)دا دامەزرا بە کارمەند لە (دائرە الاشغال).
- هەر لەو ماوەیەدا کۆمەڵەیەکیان دروست کرد بە ناوی

(زەردەشت) وەخۆی باوەرپێکراوی کۆمەڵەکە بوو، ئەندامێکی زۆریان هەبوو لەکۆمەڵەکە وەکو:- شەوکەت بەگی عەزمی بابان، عوسمان نایف، فوئاد مەستی، شێخ سەلام، کەریم سەعید، کەریم رۆستەم بەناوبانگ بە (کەریم شالوم) شێخ مەحموود، عەبدولواحید مەجید.

– لەبەر چالاکی و جموجوڵەکانی حکومەت لەساڵی (١٩٢٩) گواستیانەوە بۆ رەواندوزو ئینجا موسل، کە لە موسل پەیوەندی هەبوو لەگەڵ مەحموود جەودەت و رەفیق حیلمی ومحەمەد عەلی کوردی و خوێندەوارەکانی ئەو ناوەش وەکو حازم شەمدینان و میر ئیسماعیل یەزیدی و کورەکەی، هەر لەو ماوەیەدا لەگەڵ ئەو کۆمەڵە یەدا هەوڵیان داوە کە جووڵەیەك بە هۆزەکانی زێبارو سوورچی ویەزیدی دژی ئینگلیزەکان بکەن، بەڵام کارەکەیان سەری نەگرت و لە لای حکومەت ئاشکرابوون.

– ساڵی (١٩٣٠) هاتە شاری (حیللە)و هەوڵی دا لەگەڵ هاوەڵەکانی لە بەغداو ئەوانەی ئەوێ بە دروستکردنی کۆمەڵەیەك وپەیوەندی کردن بە کوردستان وبەغداوە، لەگەڵ پیاوە تێگەیشتووەکانی سووریا ولوبنان و میسر وتورکیا وئەمریکا هەروەها لەگەڵ ئەمین رەواندوزی و سەید حەسەن وسەید حوسێن و ئەمین یاموکی وسدیق شاویس وگەلێکی تر لە لەوانەی کە نەفی کرابوون لە (حیللە) وەکو وەهبی بەگ و دکتۆر شوکری، ومستەفا شەوقی و گەلێکی تر.

– لەکاتی هەراکەی (٦)ی رەشی ئەیلولی ساڵی (١٩٣٠) لە حیللە لەگەڵ هاورێکانی دەستیان کرد بە بەیاننامەو نەشرات بۆ کوردستانی عێراق و ئێران و دەرەوەی عێراق، بەهۆی برا کوردەکانی سووریاو لوبنانەوە پەتیا پەتیا بە یاننامەی دەنارد دەربارەی شەرو هەوڵدانەکەی کورد بە تورکی بۆ جەلادەت وکامەران بەدرخان لەشام و بەیروت و مستەفا شاهین و سوورەیا و دکتۆر نەجیب، هەروەها هەوڵیان دەدا کە نووسخەیان بگەیەنن بە (عصبة الامم) لە جنێف و سویسرە.

– هەر لەو ماوەیەدا کتێبی بچووکی نووسیوە بە تورکی لەبابەت مێژووی کوردو باری ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری وئابووری کوردستان لەوێ ثریا بەدرخان لە پاریس دەیگۆرێتە سەر فەرەنسی وبڵاوی دەکردەوە.

– کاتێك کودەتاکەی ساڵی (١٩٣٧) ی بەکر سدیق رووی داوە هەوڵی داوە لەگەڵ هاورێکانیدا کە هۆزەکان ئاگادار بکاتەوە بۆ سەندنی مافەکانیان بەڵام سەری نەگرتووەو لە سەردەمی موتەسەریف مەجید یەعقوبی دوور خراوەتەوە بۆ حیللە لە ساڵی (١٩٤١) بۆ بەغدا، لەو سەردەمەشدا لە هەراکەی رەشید عالی گەیلانی دیسان هەوڵی داوە لەگەڵ هاوەڵەکانی ئەمین رەواندووزی وسەید حەسەن وگەلێکی تر کە دەست بەسەر فەیسەڵی دووەمدا بگرن وەکو یارمەتی تاکو حەقیان دەستێنن ئەوکاتەی لە شەقڵاوە بوو، بەڵام سەری نەگرت.

– ساڵی (١٩٤٨)دا دیسان هەوڵی داوە لەگەڵ هاورێکانیدا لە کاتی رێککەوتنامەی (پۆرتسمۆپ) بەڵام دیسان سەری نەگرتووە.

* (کوێخا ئەلیاس):-

– ناوی ئەلیاس حەسەن کوری ئەحمەدی کاکەیی بەتیرە (ساڵەیی)یە لەبەر ژیری ووریایی بە (کویخا ئەلیاس) بە ناوبانگە.

– ساڵی (١٨٥٠) لە دێی (حەفتە غار) سەر بە شارۆچکەی (داقوق) هاتووەتە دونیاوە.

– لە تاق لاوێتیدا کەوتۆتە خولیای گۆرانی ومەقاماتی کوردی خۆماڵیەوە وەکو:- قەتار، ئەڵڵاوەیسی، خاوکەر، ئای ئای، خورشید، دەشت، حیجان).

– لە ساڵی (١٩١٤)دا لە جەنگی جیهانی یەکەم بەشداری کردووە، لە بەر دەوڵەمەندی لەو ساڵانەدا خواردنی بە خۆرایی بەسەر خەڵکیدا دابەش کردووە.

– شارەزایەکی چاکی هەیە لە مێژووی گەلەکەمان و تیرەو هۆزەکانی کورد.

– لەم ئاوایی ولادێییانە دانشتووە: (زەنقر، باریکە، خانەقی، سیاوەلە، قەرامی) هەروەها لە رووماد‌ی و کەلاریش.

– ساڵی (١٩٩٠) لە تەمەنی (١٤٠) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

* (کوێخا نێرگس):-

– ناوی (نێرگس)ە و کچی (کوێخا مارف کوێخا سمایل مەحموود مێرزە)یە، لە ساڵی (١٨٤٠) لە گوندی گوڵمەکەوەی ناوچەی شوان لەدایکبووە سەربە پارێزگای کەرکوك هاوسنووری گوندی سەیدان ویەختەخان و کەلاوقوتە خۆی لە نزیکەی

(٢٠٠) ماڵ ئەداو (٢٠) کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای چەمچەماڵەوە دوورە دایکی ناوی حەنیف حەمە ساڵح سمایل یەختەخانە کوێخا نێرگس سێ برای هەبووە: حەسەن، فەتاح، ڕەشك.
– کوێخا نێرگس وەکو عادەتی ژن بەژنی پێ دەکرێ لەگەڵ نێرگس ناوێك خەڵکی گوندی یەختەخانە دوو کوری ئەبێ بە ناوی ڕەمەزان و ڕەحیم لەشەڕی شوان و هەمەوەندا کوژران.
– مێردەکەی ناوی حەسەن کەل بووە کوێخا نێرگس ئافرەتێکی باڵابەرزو گەنم ڕەنگ بووە.
– کوێخا نێرگس کە براکانی حەسەن وفەتاح دەکوژێن ژن بۆ مێردەکەی دەهێنێ و سەری خۆی بە گوێزان دەتاشێ وجلوبەرگی پیاوان دەکاتە بەری وسواری ئەسپە شێیەکەی دەبێت، تفەنگی کارخانەو دەمانچە لە خۆی دەداو ئەگەڕێتەوە بۆ گوندی (گوڵمکەوە) لەبەر ئەوەی تەنها ڕەشکس برابچکۆلەی دەمێنێتەوە دەبێت بە کوێخای گوڵمکەوە لە کاتی عوسمانییەکان.
– عوسمانییەکان ناپیاوانە هێرش دەکەنە سەر گوندەکانی کوردستان ناوچەی ئەوانیش بەر ئەو هێرشە دڕندەیە دەکەوێ، کوێخا نێرگس قارەمانانە لە دژی ئەو هێرشانە لەشکر ئامادە دەکات وبەرگی شەڕ دەپۆشێت گوللەی تۆڵە سەندنیان ئاراستە دەکات کوێخا نێرگس یەکێك بووە لەو شێرە مەردانە ئابروو و شەرەفی ناوچەکەی لە دەست دڕێژی عوسمانییەکان پاراستووە.
– کارێکی لە بیر نەکراوەیە کاتێ عوسمانییەکان هێرش دەکەنە سەر گوڵمکەوە ئەو کاتە کوێخا لەلایەکی ترەوە خەریکی پارێزگاری خاك وچارە سەرکردنی نەخۆشی تایفە گەری دەبێ کوێخا ڕەشکی برا بچووکی و ژنەکەی ڕەیحانە سەید قادر دەگرن و بەرەو گرتووخانەی کەرکوکیان ڕەوانە دەکەن هەر لەو کاتەدا کوێخا خۆی ڕێك دەخات و دەڕوات بۆشاری کەرکوك دەتوانێت ڕەشك و خێزانەکەی بدزێت وبیان گەڕێنیتەوە بۆ ناوچەی شوان.
– ساڵی (١٨٩٠) لە تەمەنی (٥٠) ساڵیدا بەمەرگی خوا بۆ یەك جاری ماڵ ئاوایی لە گەل و خاکی کوردستان دەکات بەڵام ناوی دەبێتە وێردی سەرزاری دانیشتوانی ناوچەکەو هەرگیز لە یاد ناچێ هەزار هەزارسڵاو لە گۆڕی ئەوئافرەتە قارەمانە.

* (کوێستانی):-

– کوێستانی دەنگ خۆش و مەقام شوناس و وقورئان خوێن بوو ستایشی ئاینی زۆر بە ڕێك و وەستایانە ئەیخوێند شارەزای زۆربەی مەقامەکان بوو بەتایبەتی مەقامە ڕەسەنەکانی کوردی وەکو ئای ئای و نیوە شەوی و بەیات و زۆر چاکیش قەتارو ئەڵلاوەیسی دەزانیّ و کەمێکیش خاوکەرو خورشیدی ومەقامی سەفەر.
– ناوی تەواوی (سەید محێددین سەید کەریم سەید غەفووری جەباری)یە.
– ساڵی (١٩٢٨)ی زایینی لە ئاوایی (حەمك)ی ناوچەی جەباری هاتووەتە دنیاوە لەپاش چەند ساڵێك مالیان

هاتووەتە شاری کەرکوك نێردراوەتە بەر خوێندن تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندوە پاشان لە مزگەوتیش لای شێخ محەمەد شێخ نەجمەدین (سابری) بەرزنجی قورئان و تەجوید و چەند کتێبێك دەخوێنێت.
– ساڵی (١٩٥٣) دەچێت بۆ ئێزگەی کوردی لە بەغدا بۆ تۆمار کردنی گۆرانی.
– لە (٢٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کرد بە نەخۆشی (ڕەبو) کە لە ماوەیەکی دوور درێژ پێوەی دەناڵاند.

* کەریم پەڕەنگ:-

– لە گەڕەکی شۆڕیجەی کەرکوك لەدایکبووە.
– هەر لە سەرەتاوە لە ڕێگای شیعرو لەدوایدا پەخشان هاتە نێو جیهانی ئەدەبەوە. یەکەم شیعری بە ناوی (خەوەنێکی تر لە ڕەشماڵەی زەویدا) بلاوکردەوە.
– هەر لەناوەڕاستی حەفتاکاندا تێکەڵی بزووتنەوەی چەپ، بووە لەگەڵ جەمیلی مەلا شوکر، ئیحسانی حاجی غەفور، ڕەحیم شالی، نەجیب خودابەخش، جاسم محەمەد غەفور.
– لە کۆتایی حەفتاکانەوەو سەرەتای هەشتاکان وولاتی بەجێ هێشتووەو لە لەندەن دەژی.
– هەر لە حەفتاکانەوە بیری لە وەرگێڕان کردووەتەوەو لەو سەردەمەدا چەند بەرهەمێکی لە عەرەبییەوە کردووەتە عەرەبی ولە دوایدا لە زمانی ئەڵمانییەوە وەریگێڕاوە.
– دەربارەی یەکەم ئەزموونی ڕۆمان نووسی دەڵێت:-
– "یەکەم ڕەشنووسی ڕۆمانی (تاسەی ماڵە کۆنەکەم دەکەم) زۆر کۆنەو خۆشیم نازانم، لە سەرەتاوە ڕۆمانێکی زۆر کورت بوو، بەڵام دووجار دوای دەستکاریکردن بەهۆی

ڤایرۆس و فۆرماتی کۆمپیوتەرەوە سڕرایەوە. کە دەستم بە نووسینەوەی کردەوە کاتی زۆری ویست هەتا توانیم بەشێك لە بیرۆکەکانی بنووسمەوە.."

- هەتا ئێستا (٥) ڕۆمـان و چـوار لێکۆڵینەوەو (١١) شانۆنامەی لە زمانی ئەڵمانییەوە وەرگێڕاوە، ئێستا سەرقالی پێداچوونەوەی ڕۆمانێکی هاینریش بوێلە بە ناوی (بۆچوونەکانی لێبووکێکەوەیە).

-بەرهەمەکانی:-

- گوڵە ئەستێرە، شیعر، ١٩٩٢.
- تاسەی ماڵە کۆنەکەم دەکەم، ڕۆمان، ٢٠١٦.

*** کەریم ئاغای هەمەوەند:-**

- سالی (١٩٢٧) لە گوندی (گورگەیی فەتاح) لە دایك بووە.
- سـالی (١٩٣٦- ١٩٤٢) قوتابخانەی سەرەتایی تەواوکردووە.
- لە دوای فەتاح کەریم ئاغا دەبێتە جێنشینی هۆزەکە.
- لە سالی (١٩٥٦) کەریم ئاغای هەمەوەند لەگەڵ یونس ئاغای مەحموود ئاغای هەمەوەند پێشوازییان لە مەلیك فەیسەڵ و عەبدولئیلا گرتووە.
- چەندین بابەتی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە، پەرتوکێکی مێژوویی بە چاپ گەیاندووە. بە ناوی "هۆزی هەمەوەندو بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردایەتی"
- لە ڕۆژی (٢١)ی ئەیلولی سالی (٢٠١١)دا خەڵاتی زیوینی ئاشتی لە شاری چەمچەماڵ پێشکەش کرا.

*** کاکەڕەش سدیق**

- ناوی تەواوی بابەکر سدیق ئەحمەد، لەدایکبووی سالی ١٩٥٢ی گەڕەکی بولاخی شاری کەرکوك، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی ١٩٧٢ بووەتە پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان،
- سالی ١٩٧٥، دوابـەدوای هەرەسهێنانی شـۆڕش، گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوك و خولێکی ٦ مانگی پێگەیاندنی مامۆستایانی پیشەیی لە بواری تەکنەلۆژیادا تەواو کردووە، ئەم خولە ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخساند کە ببێتە مامۆستا لە ناوەندی پیشەسازی تکریت، هەر ئەو ساڵە پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد و سالی پاشتر لێپرسراویەتی بەڕێوەبردنی شانەیەکی ڕێکخستنی پێ سپێردرا.
- سالی ١٩٧٩ بووە ئەندام لە کۆمیتەی ئاگر، سالی ١٩٨٠ لە سۆنگەی زمان لێدانەوە دەستگیر کرا، بەڵام دەزگا ئەمنییەکان نەیانتوانی هیچی لەسەر ساغ بکەنەوەو لە کۆتاییدا ناچار بوون پاش زیاتر لە ٣ مانگ ئازادی بکەن، هەمان ساڵ پاش ئەوەی لێپرسراوی کۆمیتەی ئاگر حەمە کەریم عەلی ڕەزا ناسراو بە ئەحمەد کرێکار پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، بۆ ماوەی نزیکەی ١٠ مانگ سەرپەرشتی کۆمیتەی کرد.
- سالی ١٩٨١ لە سۆنگەی بەرپابوونی شاڵاوێکی سەخت لە دژی کۆمیتەی ئاگر، پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد و لە بارەگای ناوەندی کۆمەڵە لە ناوزەنگ گیرسایەوە، هەمان ساڵ کرایە لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی شارباژێڕ.
- سالی ١٩٨٥ کرایە کارگێڕی ڕێکخراوی ٥ی قەرەداغ، سالی ١٩٨٧ لێپرسراویەتی کاروباری ڕێکخستنی سنووری تیپی ٥٩ی حەمرینی پێ سپێردرا.
- سالی ١٩٨٨ وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا، سالی ١٩٩١ پەیوەندی بە یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە کردەوەو سالی دواتر کرایە لێپرسراوی هۆبەی سیاسی لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی بە پلەی ڕائید.
- سالی ١٩٩٣ بووە لێپرسراوی هەواڵگری فەرماندەیی ناوچەی کەرکوك.
- سالی ١٩٩٦-١٩٩٧دا لێپرسراویەتی قایمقامییەتی چەمچەماڵی گرتە ئەستۆ.
- سالی ٢٠٠٣ دوابەدوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس، کرایە

کارگێڕی مەلبەندی ٢ی ڕێکخستنی کەرکوك.
- ساڵی ٢٠٠٥ بە ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك هەڵبژێردراو ساڵی دواتر بە ئەندامی لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دیاریکرا.

*** کەریم ئەحمەد خدر ئەمین**

پێشمەرگەی دێرین و فەرماندە ناسراو بە شێخ کەریم چاو ڕەش، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٨ی گوندی چەم سورخاوی سەر بە ناحیەی قادرکەرەم، گوندەکەی خوێندنگەی لێ نەبووە بۆیە نەخراوەتە بەر خوێندن بۆیە دواتر لە پێشمەرگایەتیدا فێری خوێندن و نووسین بووە.
- ساڵی ١٩٧٧ کاتێك ناوی بۆ خزمەتی سەربازی هاتەوە، ڕەتی کردەوە سەربازی بۆ ڕژێمێك بکا کە مافەکانی گەلەکەی زەوت دەکاو خەریکی بەعەرەبکردنی وڵاتەکەیەتی، بۆیە بە گەرمیاندا گەڕا تا مەفرەزەکانی پێشمەرگە بدۆزێتەوەو پەیوەندیان پێوە بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی پێشمەرگە تازە لە ناوچەکە پەیدا بووەوە، نەیتوانی بیاندۆزێتەوەو پەیوەندیان پێوە بکات.
- ساڵی ١٩٧٨ هەوڵدانی بۆ پەیوەندی کردن بە هێزی پێشمەرگەوە سەری گرت و لە کەرتی ٣ی گەرمیان و هەرێمی ٥ی قەرەداغ بووە پێشمەرگە.
- ساڵی ١٩٨١ بووە جێگری فەرماندەی مەفرەزەو لە ساڵی ١٩٨٢دا پاش پێکهێنانی تیپی ٥١ی گەرمیان پلەی بەرز کرایەوەو بووە فەرماندەی مەفرەزە، ساڵی ١٩٨٣ لێپرسراویەتی جێگری فەرماندەی کەرتی پێ سپێردراو زۆری نەخایەند کرایە فەرماندەی کەرت، ساڵی دواتر بۆ سنووری کەرتی یەك گوێزرایەوە کە قەڵەم ڕەوییەکەی سێگۆشەی کەرکوك-قادرکەرەم- دووزخورماتووی گرتووەتەوە.
- ساڵی ١٩٨٧ لەگەڵ پێکهێنانی تیپی ٥٩ی حەمرین کرایە جێگری فەرماندەی تیپەکە، هەر ئەو ساڵە بە هەمان پلەوە بۆ سنووری تیپی ٥١ی گەرمیان گوێزرایەوە، لە کاتی بەرێوەچوونی شاڵاوی سێیەمی ئەنفالدا کە بە ئەنفالی گەرمیان ناسراوە بەشدارییەکی کارای لە بەرپەرچدانەوەی شاڵاوەکەدا کرد، سەرەڕای ئەوەی کە هێزەکانی عێراق توانیبویان دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرن و هەموو دانیشتوانەکەی ڕاگوێزن، بەڵام خۆی و ٧ پێشمەرگەو هەندێ لە کەسوکاری بڕیاری مانەوەو چۆڵ نەکردنی ناوچەکەیاندا، دواتر ژن و مناڵەکانی ڕەوانەی ئێران کرد و پەیوەندی لەگەڵ مەفرەزەکانی تری گەرمیاندا دروست کردەوەو پێکەوە نەخشەی شەڕی پارتیزانییان دانا.
- لە ئابی ساڵی ١٩٨٩ ئاڵوگۆڕ بە مەفرەزە پارتیزانەکان کرا و لەم سۆنگەیەوە خۆی و مەفرەزەکەی کشانەوە بۆ بنکەکانی سەر سنوور، بەپێی بەرنامەی تازەی ڕێکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە، کرایە فەرماندەی تیپی پلە یەك و دواتر خرایە سەر هێزی تایبەت کە بارەگاکەی لە گوندی زەڵێ بوو.
- لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١دا بەشدارییەکی کارای لە ڕزگارکردنی ناوچەکانی گەرمیاندا کرد و لە ئۆپەراسیۆنی ڕزگارکردنی کەرکوکدا لێپرسراویەتی قۆڵەکانی حەی عەسکەری و قادسیە و شۆڕیجەی پێ سپێردرا، دوای ڕاپەڕین کرایە فەرماندەی بەتالیۆنی ١١٦ی قەڵاچوالان و دواتر کرایە جێگری فەرماندەی هێزی ٢ی قەرەداغ، لەگەڵ پێکهێنانی یەککگرتووی کوردستاندا کرایە ئەندامی فەرماندەیی ناوچەی کەرکوك.
- لە ساڵی ١٩٩٤دا دوابەدوای پێکهێنانی لیوا تایبەتەکان، کرایە فەرماندەی یەکێ لە لیواکان و هەر ئەو ساڵە کرایە کارگێڕی فەرماندەیی گشتیی هێزی پێشمەرگە.
- ساڵی ٢٠٠٣ لە کاتی هێرشی هاوپەیمانیی نێودەوڵەتی بۆ سەر عێراق، کرایە جێگری فەرماندەی قۆڵی قادر کەرەم. دووزخورماتوو.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا ٣ جار بریندار بووە، لە ماوەی نێوان ٢٠٠٥. ٢٠٠٩دا لە سنووری کەرکوك لێپرسراویەتی لیژنەی خانەنشینکردنی پێشمەرگە دێرینەکانی پێ سپێردرا.
- ساڵی ٢٠١٠ بە پلەی ڕاوێژکار خانەنشین کرا.

*** کەماڵ ڕەحیم کەریم**

- فەرماندەو پێشمەرگەی دێرین، ناسراو بە کەماڵە خڕە لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٧ی گوندی تەشگای سەر بە قەزای چەمچەماڵ، لەبەر نەبوونی خوێندنگە لە گوندەکە، ناچار بووە لە چەمچەماڵ بخوێنێت، بەڵام دووری ڕێگا و هاتووچۆی ڕۆژانە هەر ئەوەندە دەرفەتی پێداوە کە تا پۆلی سێیەمی سەرەتایی بخوێنێت.
- لە ساڵی ١٩٧٩ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد.
- ساڵی ١٩٨١ لەبەر چاودێری دەزگا ئەمنییەکان و دروستبوونی مەترسی لەسەر ژیانی، پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد و لە کەرتی ٤ی جەباری سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ ژیانی پێشمەرگایەتی دەست پێکرد.
- ساڵی ١٩٨٢ پاش کارکردن بە سیستمی تیپەکان و پێکهێنانی تیپی ٥٧ی سەگرمە، بۆ کەرتی ٣ی هەمەوەندی ئەو تیپە گوێزرایەوە و لە ساڵی ١٩٨٤دا یەکەم هەنگاوی لە سیستمی بەرزکردنەوەی پلەکانی پێشمەرگایەتیدا هەڵهێنا کاتێك کرایە جێگری فەرماندەی مەفرەزە لە هەمان کەرت، لە ساڵی ١٩٨٦دا کرایە فەرماندەی مەفرەزە، لێهاتووی هاندەر بوو بۆ بەرزکردنەوەی پلەی، لە ساڵی ١٩٨٧دا بۆ جێگری فەرماندەی کەرت.
- لە ئایاری ساڵی ١٩٨٨دا بەشدارییەکی بەرچاوی لە بەرپەرچدانەوەی شاڵاوی چوارەمی ئەنفالەکاندا کرد، سەرەڕای کشانەوەی هێزی پێشمەرگە لە ناوچەکە، ماوەیەك لە ناوچەکە مایەوەو دواتر خۆی گەیاندە چیای قەندیل، دوای دەستبەکاربوونی محەمەد غەریب عەبدوڵڵا وەك لێپرسراوی هێزە پارتیزانەکانی سنووری گەرمیان و قەرەداغ و سەگرمە، لەگەڵ هێزەکەی محەمەد غەریب عەبدوڵڵا گەڕایەوە بۆ سنووری دیاریکراوی چالاکییەکانی هێزە پارتیزانەکان.
- لە تشرینی یەکەمدا لە سۆنگەی سەختی ژیانی پارتیزانەوە وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا، بەڵام لەگەڵ بەرپابوونی ڕاپەڕین

لە ساڵی ١٩٩١، بەپەلە پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کردەوەو بەشدارییەکی کارای لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ئەو قۆناغەدا کرد، پاش ڕاپەڕین بە لەبەرچاوگرتنی ڕۆڵی لە کاتی ڕاپەڕیندا، کرایە فەرماندەی تیپ لە بەتالیۆنی ٣ی چەمچەماڵ و لە ساڵی ١٩٩٣دا کرایە جێگری فەرماندەی سریە لە فەوجی ٤ی لیوای سوپای هاوبەش.

– لە ساڵی ١٩٩٤دا کرایە یاریدەدەری فەرماندەی فەوجی ١ی سەنگاو، هەر ئەو ساڵەش کرایە فەرماندەی فەوج.

لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا ٦ جار بریندار بووە، جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٨٢ لە نزیك گوندی ئالوەتانی کوردستانی ئێران، لەکاتی بەڕێوەچوونی ئۆپەراسیۆنی هێزی پشتیوان بۆ پشتیوانیکردن لە هێزەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.

– جاری دووەم لە ساڵی ١٩٨٥ لە گوندی زەنانی ناوچەی چەمچەماڵ.

– جاری سێیەم لە ساڵی ١٩٨٦ لە گوندی قەرەتامۆری سەر جادەی چەمچەماڵ–سەنگاو.

– جاری چوارەم لە ساڵی ١٩٨٦ لە قوتەی حەسەن بەگ لە کاتی بەڕێوەچوونی شەڕەکانی قەیوان–ماوەت.

– جاری پێنجەم لە ساڵی ١٩٨٧ لە شاخی گلە زەردە و

– شەشەم جار لە ساڵی ١٩٩٢ لە ناوچەی بادینان.

– لە ٣١ ئابی ١٩٩٦دا لە هەولێر لە شەڕێکدا لەگەڵ سوپای عێراق کە هێرشی هێنا بووە سەر هەولێر شەهید کرا.

کاکە حەمە

سالی ١٩٣٩ کافیە خانی مەلا قادری ئیمام لەگەڵ خێزانی عیزەددین مەلا ئەفەندی

*** کوێخا کاکل عوسمان مەحموود چیمەنی:-**

**- لە ٦ی تەمووزی ساڵی ١٩٣٠ لە کەرکوك لەدایکبووە**

**- لە ٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠١ کۆچی دوایی کردووە**

**- یەکێکە لە کەسایەتییەکانی گوندی چیمەنی شەهیدانی کاکل کە گوندەکەش بە ناوی ئەمەوە ناونراوە.**

*** د. کامەران نەجمەدین:**

**- ساڵی ١٩٨٨ بەدەستی عەلی کیمیاوی لە پرۆسەی بەدناوی ئەنفالدا شەهید کراوە، تەرمەکەی لە سەربازگەی تۆپزاوە شوێن بزر کراوە.**

* (گەرمیانی - مەحموود شێخ ئیسماعیل شێخ عەبدولکەریم ):-

- ناوی (شێخ مەحموود کوڕی شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ عەبدولکەریم)ی بەرزنجییە.
- لە ساڵی (١٩٣٤) لە ناحیەی قادر کەرەم لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٥٣) نزیکەی (١٠) گۆرانی تۆمار کردووە.
- گۆرانییەکان:- (خاڵەی ڕێبوار، هەی نار هەی نار، گەوهەرێ، باران بارانە، سەوزەمەرۆ، ئامینێ، سوورە گوڵ، غەزاڵێ گیان غەزاڵێ، ئەی بەرگەرد بەگەرد، ئامۆزا بەگەرد).
- لە بنەماڵەیەکی ئەهلی تەسەوف و عیرفانن و هەڵگری تەریقەتی قادری بوون، لە بنەماڵەی شێخانی بەرزنجەن، کە هەمیشە لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە بۆ هاتنەدی هیوا و ئاواتی میللەتەکەیان و گیانی خۆیان بەخت کردووە.
- بە هۆی گەشەکردنی لەناو سۆزی دەروێش و زیکری خوایی تێکەڵ بە ئاوازی ڕەسەنی کوردی باوی ناوچەکە، کە سەرچاوەی شیعری عیرفانی و تەسەوفە وەك شیعری شاعیری گەورەی گەلەکەمان (مەولەوی)، کە سەرەنجام دەبێتە مایەی هەڵکەوتنی لاوێکی ئەو بنەماڵەیە، هەرچەندە ئەوکات بگرتنە بەری ڕێگەی هونەر بۆ ئەندامانی ئەم خانەوادەیە و بەپێی داب و نەریتی کوردەواری کارێکی نەنگ و بە شوورەییان زانیوە، بەڵام کاتێك ئەم لاوە دەچێتە بەغدای پایتەخت و لە ماڵی یامولکێکانی سلێمانی لە گەرەکی ساڵحییە، کە ماڵیان بەرامبەر ئێزگەی کۆماری عێراق دەبێت بەرێککەوت سەردانی ئێزگە و تەلەفزیۆن دەکەن بۆ بینینی ئەو هونەرمەندە بەناوبانگانەی خەریکی تۆمارکردنی گۆرانین، هەریەك لە (نازم غەزالی، زهور حوسێن، مامۆستا عەلی مەردان)، بۆیە پاش تەواوبوونیان لە تۆماری دەنگەکانیان، (گەرمیانی) مایکەکە دەگرێتە دەست و چەند گۆرانییەك دەچڕێت، ئەم کارە دەبێتە مایەی سەرنجراکێشانی دەرهێنەرەکە و پێی دەڵێت:- (ئەوەی وتت دەتوانی دووبارەی بکەیتەوە)، (گەرمیانی)ش بەبێ ئەوەی بزانێت دەنگی تۆمار دەکەن، گۆرانییەکان دووبارە دەکاتەوە، پاشان کاکی دەرهێنەر داوا لە مۆزیکژەنەکان دەکات، مۆزیك بۆ گۆرانییەکانی ڕێکبخەن، ئەمجارە داوا لە گەرمیانی دەکاتەوە گوێبیستی گۆرانییەکان ببێتەوە، (گەرمیانی) دەزانێت دەنگی خۆیەتی تکای لێدەکات بەناوی خۆیەوە بڵاوی نەکاتەوە، دەرهێنەرەکەش دەڵێت: (ئەی چ ناوێکت بۆ هەڵبژێرم؟) ئەڵێت (گەرمیانی).

کاتێك بۆ یەکەم جار لە ڕادیۆ پەخش دەکرێت، یەکەم کەس دایکی دەڵێت:- (ئەمە مەحمووە)، بەڵام تا ماوەیەکی زۆریش زۆربەی خانەوادەکەی خۆشی نازانن، کە ئەم لاوە (مەحموود) ە، هەرچەندە ئەم کۆمەڵە گۆرانییەش بۆ یەکەم جار و دواجار دەبێت، بەڵام هەرگیز دانەبراوە لە سۆز و خۆشەویستی بۆ مەقام و نەغمە و شیعری کوردی و زۆر جار ڕەخنەی لە مەقامبێژان گرتووە هەستی بە لاوازی مەقامەکە کردووە.
- لەژێر کاریگەریی باوباپیرانی هەمیشە شانازی بە جلوبەرگی کوردییەوە کردووە و کەسێکی مرۆڤدۆست و ئاشتیخواز و نیشتمانی پەروەر بووە و بەهانای هەموو ئەو کەسانەوە چووە کە هانایان بۆ بردووە.
- لە ساڵی (١٩٦١) ژیانی هاوسەرگیریی پێکهێناوە و سێ کوڕ و دوو کچی هەیە.
- لە ساڵی (١٩٨٠)وە نیشتەجێی کەرکوك بووە.
- لە ١١ی شوباتی ساڵی ٢٠٠٢ بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

ئەمەی خوارەوەش هەڵبەستراوێکە، لەلایەن هەردوو بەڕێزان (کاك شێخ حوسێن شێخ عومەر بەرزنجی و کاك هەردەوێل کاکەیی) کە دەڵێن:-

نەوەی پیر ئەبێ خزمەتگوزار بێ<br>
دایم لایەنگر حەق و هەژار بێ<br>
کاکە شێخ مەحموویش بۆ ئیشی داماو<br>
پێت بووتایە ئەیوت بەسەر چاو<br>
قەت (نەئی) نەبوو بۆ ئیش هیچ کەسێ<br>
نەناس و ناسیاو تایبەت دراوسێ<br>
بنوو بەبێ غەم بەهەشت بێ جێگات<br>
کردەوەی چاکەت گشت دێتە ڕێگات

* (گەلاوێژ جەباری):-

- (خێزانی شەهید شێرزاد جەباری)یە.
- لە ساڵی (١٩٩٢) لە یەکەم خولی پەرلەمانی کوردستان هەڵبژێردراوە.
- ئێستا ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوکە لەسەر لیستی هاوپەیمانی کوردستان.
- دەوری هەبووە لە هونەری شێوەکاریدا لە سەردەمی حەفتاکاندا.

* (گارا رەسوڵ - تەیب حەسەن):-

- ساڵی (١٩٥٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و دواناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- کۆلێژی زانست بەشی جیۆلۆجی زانکۆی موسڵی تەواو کردووە.
- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك کە لە حەفتاکاندا دەورێکی چاکی هەبوو لەو بوارەدا.
- ساڵی (١٩٧٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی ئاری بابان و ئەیوب شەریفی کردووە لە هۆڵی ئامادەیی ئیمام قاسم.
- ساڵی (١٩٧٨) بەشداری پێشانگای زانکۆکانی کردووە لە موسڵ.
- ساڵی (١٩٧٩) بەشداری دووەم پێشانگای زانکۆکانی کردووە لە موسڵ.
- ساڵی (١٩٨٠) بەشداری سێیەم پێشانگای زانکۆکانی کردووە لە بەسرە.
- لەگەڵ شێوەکار عەبدولستار عەلی لە ساڵانی (١٩٧٩-١٩٨٠) پێشانگایەکی هاوبەشییان کردووەتەوە لە بەشی جیۆلۆجی زانکۆی موسڵ.
- بەشداری پێشانگای شێوەکاری کۆلێژی ئادابی زانکۆ موسڵی کردووە لەنێوان (١٦-٢١)ی ئایاری ساڵی (١٩٨١)

کە تابلۆکانی بریتی بوون لە: (قەڵا، رووبار، رێگا، ژینگەی کوردستان، کۆچ بۆ شار، لادێی کورد، ژووانگەی لاوان، لە روانگەوە، کەوتنی خوود، خانووە رووخاوەکان، کێشە، کارزان، درختی بەروو، بەندکراوێك لە فەلەستین، چاوو گوێچکەکان، رووی ئافرەتێك لە کەرکوك، دیمەنێ: لە زانکۆ، ژیانە چەقبەستووەکان، بۆرترێت، چیا).

* (گرفتار کاکەیی):-

- ناوی تەواوی (ئازاد جەواد ئەحمەد)ە.
- ساڵی (١٩٦٧) لە گوندی (بەیمەکان)ی سەر بەناوچەی کاکەیی شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩١) ئاوارەی ناوچە ئازاد کراوەکان بووە.
- ساڵی (١٩٩٤) یەکەمین پێشانگای کاریکاتێری لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٥) دووەمین پێشانگای کاریکاتێری لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٧) سێیەمین پێشانگای کاریکاتێری لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٧) چوارەمین پێشانگای کاریکاتێری لە هەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشێك لە کاریکاتێرەکانی بە چاپ گەیاندووە.
- ساڵی (١٩٩٨) پێنجەمین پێشانگای تایبەتی لەهەولێر کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٩) (سکاڵا) کۆمەڵە شیعرێکە بۆ منداڵان لە هەولێر چاپ کراوە.
- ساڵی (١٩٩٩) شەشەمین پێشانگای کاریکاتێری کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠١) (دۆشاو) کۆمەڵە چیرۆکێکە بۆ منداڵان لە

سلێمانی بە چاپ گەینراوە.
- سالی (٢٠٠١) حەوتەمین پێشانگای کاریکاتێری لە سلێمانی کردووتەوە.
- سالی (٢٠٠٢) هەشتەمین پێشانگای تایبەتی کاریکاتێری لە تاران کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠٢) بە شداری پێشانگا جیهانییەکانی کردووە لە رۆماو تورکیاو ئەلمانیا.
- سالی (٢٠٠٤) پێشانگای تایبەتی لە خانەقین‌و کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠٦) (گورگێکی دڵسۆز) کۆمەڵە چیرۆکێکی وەرگێراوە بۆ منداڵان لە کەرکوك.
- سالی (٢٠٠٦) پێشانگای تایبەتی لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠٦) پێشانگای تایبەتی لە داقوق کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠٦) لە شیعرو ئاوازی خۆی گۆرانییەکی تۆمار کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠٧) پێشانگای تایبەتی خۆی لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠٨) پێشانگای تایبەتی خۆی لە کەرکوك کردووەتەوە.
- سالی (٢٠٠٨) پێشانگای شێوەکاری لە کەرکوك کردووەتەوە.
- چەندین خەلاتی لەسەر ئاستی کوردستان وەرگرتووە وەکو کاریکاتێرست‌و شێوەکارو وێنەکێش‌و نووسەری بواری منداڵان.
- خۆشنووسی‌و بەرگ‌و نیگاری بۆ دەیان گۆڤارو رۆژنامەو کتێب‌و نامیلکە ئامادە کردووە.
- سیناریۆی (کەروێشك‌و رێوی) لە دووتوێی نامیلکەیەکدا بە چاپ گەیاندووە.
- (باخچەکەم) گۆرانییەکە بۆ منداڵان لە سالی (٢٠٠٦) تۆماری کردووە کە لە شیعرو ئاوازی خۆیەتی.
- دووەمین نامیلکەی کاریکاتێری لە سالی (٢٠٠٨) بە چاپ گەیاندووە.
- (مودلیانی)، کتێبێکە لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی لە کەرکوك لە سالی (٢٠٠٩) بە چاپ گەیاندووە.
- ماوەیەك وەکو وێنەکێشێك لە گۆڤاری (هەنگ)و هەروەها وەکو کاریکاتێریستێك لە رۆژنامەی (هەوال) کاری کردووە.

* (گریانی):-

- ناوی (عەلی کوری یوسف)ە، نازناوی (گریانی)یە.
- خەلکی گوندی زەرداوی نزیك شاری کفرییە، لە بنەرەتدا (کاکەیی) بووە.
- لە شیعرەکانیدا ئەوە دەردەکەوێ بە زمانی یارسانی کە نهێنی نێوان خۆیانە، پاراوەتەوە تا لە زیندان رزگاری بێت.
- هاوتەمەن‌و دۆستێکی زۆر نزیکی خوالێخۆشبوو میرزا خەلیل منەوەر بووە، لە کۆمەڵێ شیعری گریانیدا شاعیر خۆی ئاماژەی پێداوە.
- جگە لە زمانی کوردی زمانی تورکی‌و فارسیشی زانیووە.
- بۆ ماوەی چەند سالێ بەهۆیەکی نادیارەوە لە بەغدا بەندبووەو لە گۆشەی بەندیخانەی بەغداوە چەند نامەیەکی شیعری بۆ میرزا خەلیل منەوەر ناردووە کە دەردە دڵی خۆی بۆ هەلرێژراوەو داوایشی لێ کردووە هەوڵی بۆ بدات تا لە زیندان ئازاد بکرێت.

* گوڵاڵە نووری ئەحمەد:-

- سالی ١٩٦٩ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی ٢٠٠١ بەشی وەرگێرانی زمانی ئینگلیزی لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی مووسل تەواو کردووە.
- دبلۆمی لەسەر کارەبای هەیە.

- دبلۆمی لە ئەدەبی ڕووسی هەیە.
- ساڵی ۲۰۰۷ ماستەری لەسەر ئەدەبی ئینگلیزی بەدەستهێناوە بە ناوی (رؤيا الشعر الأمريكي والعراقي الحديث حول حرب العراق).
- ساڵی ۱۹۸٤ تا ۲۰۰٤ لە کەناڵی لۆکاڵی مووسڵ کاری کردووە.
- ئێستا لە ئۆکرانیا نیتەجێیە.
- ساڵی ۲۰۱۲ خەڵاتی وەرگرتووە لەسەر کتێب و وەرگێران لە ڕووسیا لە میهرەجانی دەیەمی ڕووسی کە لە هۆڵەندا بەستراوە.
- بەرهەمەکانی:
- تقاويم وحشية، شيعر ۲۰۰٥
- حطب، شيعر، ۲۰۰۹.
- لحظة ينام دولفين، شيعر ۱۹۹۹، چاپی دووەم ۲۰۰۰
- لن يخصك هذا الضجيج، شيعر، ۲۰۰۱.
- إنها الوحشة، شيعر دەستنووس.

* (گۆران فەتحی):-

- ساڵی (۱۹۷۲) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (۱۹۹٦) پەیمانگای تەکنیکی کەرکوك، بەشی کارەبای تەواو کردووە.
- ساڵی (۱۹۹۲) بەشداری پێشانگایەی هاوبەشی کردووە.
- ساڵی (۱۹۹۸) یەکەم پێشانگای تایبەتی کردووتەوە لە سلێمانی.
- سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ڕاستی) بووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مزگەوت و تەکیەی و خانەقا دێرینەکانی کەرکوك) لە ساڵی (۲۰۱۲).
- شنگال، مأساة طائفة كوردية، ۲۰۱٥
- الايزديون قرابين كوردستان، ۲۰۱٥

* گوڵسەر کەرکوکی:-

- ساڵی ۱۹۵۷ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ۲۰۰۱ دیوانێکی شیعری بەناوی (شوق كركوك) بڵاوکردووەتەوە.

* پەراوێز:-
(۱) پیر: مەبەستی شێخ حەسەنی قەرەچێوارە.

**گەرمیانی**

**گەرمیانی لە لوتکەی بەفرینی هەلگورد سالی ١٩٨٦**

**گەرمیانی لە بەردەم مزگەوتی قەرەچێوار لە قادر کەرەم**

**گەرمیانی و کاك هەردەوێڵ و چەند کەسایەتییەکی تر**

**ساڵی ١٩٤٩ لە قادر کەرەم لە باڵەخانەی شێخ عەبدولکەریم**
**شێخ عەبدولکەریمی باوە گەورە موعتەسەمی لە باوەشدایە و لەلای ڕاستەوە شێخ عەبدولقادر و شێخ ڕەزا و شێخ حوسێن دانیشتوون و لەلای چەپەوە خالید شێخ عەبدل و لەتیف خالید شێخ عەبدل**

* ( لەتیف حامید بەرزنجی ):-

- ساڵی (١٩٤٠)دا لەدایکبووە.
- دانیشتووی گەڕەکی شۆڕیجەی کەرکوك بووە.
- لەتیف حامید چیرۆك نووسێکی لێهاتوو بوو، چیرۆکەکانی هەروا سادەو ساکار نەبوون، بەڵکو ناوەڕۆك پترو، شێوە نوێو پێشکەوتووزادەی مێشکێکی کامڵو بیرێکی قووڵو رۆشنبیرییەکی فراوانی هەمەلایەنە.
- لەتیف حامید لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٣) پێنج کورتە چیرۆکی بڵاوکردووەتەوە بە ناونیشانی:-

(سێ هەنگاو بەرەو ئەودیو-١٩٧١)، (قوڵپی رشانەوەی رەش ١٩٧١)، (رۆژمێری خەواڵوییەکی شاری سەلجووقی ١٩٧١)، (بەشێك لە داستانی سواڵکەرە نەناسراوەکە-١٩٧٢)، (زەردە، سوور، سەوز، شین، ١٩٧٣).

- لەتیف حامید لە تەمەنێکی کورت (٣٤) ساڵ ژیاوە، لە (٢٢)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کرد.
- لەتیف حامید دەستێکی باڵای هەبوو لە وەرگێڕاندا، لەو بارەیەوە گەلێك بابەتی بە پێزی هەیە وەکو:-

(مستلزمات الثورة والتجدید في الشعر الکردي المعاصر).

* ( لەتیف سەعید نوری بەرزنجی - دکتۆر لەتیف سەعید نوری بەرزنجی ):-

- ساڵی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دکتۆرای هەیە لە ئەدەبی ئینگلیزیو مامۆستای یاریدەدەرە لەزانکۆی کەرکوك.
- چەندین لێکۆڵینەوەی هەیە لەسەر ئەدەبی ئینگلیزی لە گۆڤارەکانی هیندو یەمەن بڵاوی کردووەتەوە.
- یەکێکە لە لێکۆڵینەوەکانی هۆنراوەیەکی شاعیر گۆران (بۆ گوڵی لاولاو)ی بەراورد کردووە لەگەڵ هۆنراوەیەکی شاعیری ئینگلیزی (رۆبەرت هێریك).
- کتێبێکی چاپکراوی هەیە بە زمانی ئینگلیزی (The reality ideal conflict in Joseph Conradis works) (صراع الواقعیة والوهم في اعمال جوزیف کونراد).

* ( لەتیف فاتیح فەرەج ):-

- ساڵی (١٩٧٠) لەدایکبووە.
- ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیاندووە:-
- (کۆچ)، شیعر، سلێمانی، ١٩٩١.
- (تابوتی برسێتی)، شیعر، سلێمانی، ١٩٩٢.
- ( فەنابوون لە بووەتەی رەنگەکاندا)، ١٩٩٥.
- (ونبوون لە بووەتەی رەنگەکاندا)، ١٩٩٦.
- (بە ساڵاچوان کتێبگەڵی لەبیرکراو)، ١٩٩٨.
- (پەپوولەکانی دۆزەخ)، شیعر، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (لە ژیان خەمتر)، شیعر، سلێمانی، ٢٠٠١.
- (تیرۆرو توندرەوی)، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (کوردو کەرکوك)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (کوردو قران)، هاوبەش، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- (تەعریبو راگواستن لە بەڵگەنامەکانی بەعسدا)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (لە سەلمانەوە بۆ مردن)، سلێمانی، ٢٠٠٤.

- (جینۆسایدو كاڵبوونەوە)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (تەعریبو راگوستن)، ٢٠٠٤.
- (لە سەلمانەوە بۆ مردن)، ٢٠٠٤.
- (كتێبی پێكەوە ژیان)، كەركوك، ٢٠٠٥.
- (خوێندنەوەیەكی خێرای كوردستانی نوێ دوای پانزە ساڵ)، كەركوك، ٢٠٠٥.
- (ئێوارەیەك نایەمەوە)، شیعر، كەركوك، ٢٠٠٥.
- (ئەو نامانەی بەفرمێسك نووسراون)، هاوبەش، كەركوك، ٢٠٠٦.
- (رووكاری ژنو بەشداری سیاسی)، هاوبەش، كەركوك، ٢٠٠٦.
- (كۆڤان دەنگ بە دەسەلاتی كوردی نادات)، هاوبەش، كەركوك، ٢٠٠٦.
- (جاش و ئەنفال)، بەڵگەنامە، چاپی یەكەم، كەركوك، ٢٠٠٤، چاپی دووەم، ٢٠٠٦.
- (كوردو توركمانو ١٤٠)، كەركوك، (٢٠٠٨).
- (میرزا خەلیل منەوەرو چەندین لێكۆڵینەوە)، كەركوك، (٢٠٠٨).
- (عاشقانە، شیعر، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- (صابری لە دووتوێی چەند لێكۆڵینەوەیەكدا، فیستیڤاڵی شاعیری كورد صابری)، ئامادەكردنو پێشەكی نووسین، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- (جەلەموّرد لە ئامێزی خوادا)، ٢٠١٢.
- (كوردو كەركوك)، چاپی دووەم، ٢٠١٣.
- (مامەندی كەركوكی.. شاعیرێكی لە بیركراو)، ٢٠١٣.
- ئاوازی نائومێدی، ٢٠١٣
- (شەنگال، ئەنفالێكی تر)، ٢٠١٤.
- (دەو نیو)، شیعر، چەمچەماڵ.
- ژنێك و شتەكان، رۆمان، ٢٠١٥
- مێخەك بەندی نووسین، ٢٠١٥
- نەوت و ئەنفال، ٢٠١٦
- ئەنفال و لێبوردەیی، ٢٠١٦
- كەركوك لە گێژاودا، ٢٠١٦
- ئەنفال و كاڵبوونەوە، ٢٠١٦

* (لەتیف هەڵمەت):-

- ساڵی (١٩٤٧) لە كفری لەدایكبووە.
- ئەم كتێبانەی بە چاپ گەیاندووە:
- (خواو شارە بچكۆلەكەمان)، كەركوك، ١٩٧٠.
- (ئامادەبوون بۆ لەدایكبوونێكی تر)، سلێمانی، ١٩٧٣.
- (پرچی ئەو كچە رەشماڵی گەرمیانو كوێستانمە)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (گەردەولوولی سپی)، شیعر، بەغدا، ١٩٧٨.
- (ئەو نامانەی دایكم نایانخوێنێتەوە)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (وشەی جوان گوڵە گوڵ)، شیعر، بەغدا، ١٩٧٩.
- (جوانترین دێ)، شیعرو چیرۆك، چاپی یەكەم، بەغدا، ١٩٧٩، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.

- (سروودی هەژاران)، شیعر، بەغدا، ١٩٨٣.
- (دەنگی خۆشترین مەل)، شیعرو چیرۆك بۆ منداڵ، سلێمانی، ١٩٨٣.
- (فەڵەستین هەمیشە نیشتیمانی غسان كەنەفانی یە)، بەغدا، ١٩٨٣.
- (عسل الكلمات الجبلية)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (المدن الحديدية او إبتهالات صوفي آثم)، شیعر، چاپی یەكەم سلێمانی ١٩٩٧، چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٠.
- (قلوب من الزجاج-قصائد فلكلورية كردية)، وەرگێران، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (دیوانی لەتیف هەڵمەت)، بەرگی یەكەم، سلێمانی، ١٩٩٩.
- دیوانی لەتیف هەڵمەت)، بەرگی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- (دیوانی لەتیف هەڵمەت)، بەرگی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠١.
- (گوێ درێژو پاشا)، چیرۆكی منداڵان، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (شیخوخة كيلوباترا واطفال المطر)، دیوانێكی شیعری، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (گوڵی ناو ئینجانەكان)، شیعرو چیرۆك، چ ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (چۆلەكەی سەر دارەكە)، شیعرو چیرۆك، چ ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (منداڵو باران)، شیعرو چیرۆك، چ ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (منداڵو چۆلەكە)، چیرۆك بۆ منالان، چ ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (هێلانەیەكی تر)، شیعرو چیرۆك، چ ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (دیوانی منداڵان)، بەرگی یەكەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (دیوانی منداڵان)، بەرگی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (ئەو ووشانەی دڕ بە تاریكە شەوەوە دەدەن)، كەركوك، ٢٠٠٥.
- (دیوانی لەتیف هەڵمەت)، چ ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (وەك منالێك سەرم لە كۆشیدا شاردەوە)، شیعر، نەزار قەبانی، وەرگێران، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (هەڵەبجە)، شیعر، تاها خەلیل، وەرگێران، چاپی دووەم،

سلێمانی، ۲۰۰۵.
- (پرسیار لە منداڵ)، چ ۲، سلێمانی، ۲۰۰۵.
- (کاتژمێر)، چ ۲، سلێمانی، ۲۰۰۵.
- (خوایە وەرە بۆ ئەمریکا)، شیعری وەرگێراو، کەرکوك، ۲۰۰۹.
- (سۆفی و سۆفیگەریێتی)، چ ۲، سلێمانی، ۲۰۰۹.
- (مێژووی سۆفیگەری و سۆفیگەریێتی لە مێژوودا)، ۲۰۱۳.
- (دیوانی منداڵان)، چاپی سێیەم، ۲۰۱۳.
- (ناتالی ساروت و هەڵچوونەکان و رۆمانی نوێ)، فەتحی ئەلعشێری، وەرگێران، ۲۰۱۳.
- (شیعر نامێزی ئەورووپایی و دیکتاتۆرییەتی رۆح)، کۆمەڵێ نووسەر، وەرگێران، ۲۰۱۳.
- (تحولات الغیوم)، شیعر، ۲۰۱۳.
- (دیوانی لەتیف هەڵمەت)، دیوانی شیعری، ۲۰۱٤.
- (شیعری دژە شیعر، یا یارییەکی کۆن و نوێ)، ۲۰۱٤.
- (منداڵ و بوکە شووشە)، شیعر.
- (ئەو هۆنراوەیەیی تەواو دەبێ و تەواو نابێ).
- (ئەم رووبارە ووشك ناکات)، شیعر.
- (گورگەکانی لەتیف هەڵمەت).
- (خەنافس-تەنورەی مینجۆب)، شیعر.
- (هەڵبژاردە بۆ منداڵ و بۆ گەورە).
- (تەسەوف لە کوردستان).
- (منداڵ و بوکەشووشە).
- گەلێك بەرهەم و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا بڵاوکردووەتەوە.

*** لەیلا حوسێن مەعرووف:-**

- ساڵی ۱۹٤۰ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ۱۹۸٦ کۆچی دوایی کردووە.
- ساڵی ۱۹٦۲ بەکالۆریۆسی لە کۆلێژی یاسای بەغدای بەدەستهێناوە.
- بەرهەمەکانی:
- دراسة میدانیة عن ظاهرة الطلاق، ۱۹۸۲
- المراة العراقیة وحقائق التغییر، ۱۹۸۳
- الموقع الجدید للمراة العراقیة، ۱۹۸٥.

*** (لەیلا جەلیل عەباس - دکتۆر لەیلا جەلیل عەباس):**

- ساڵی (۱۹۷۲) لەدایکبووە.
- ساڵی (۱۹۹۳) لە زانکۆی بەغدا کۆلێژی پەروەردە (ئیبن رۆشد)-بەشی زمانی کوردی تەواو کردووە.
- ساڵی (۱۹۹۸) بڕوانامەی ماستەری لە زانکۆی بەغدا-بەشی زمانی کوردی وەرگرت و ناونیشانی نامەکەی بریتی بوو لە (مۆرفێمەکانی (ێ) لە زمانی کوردیدا بە کەرەستەی کرمانجیی خواروو و ژووروو).
- ساڵی (2003) لە زانکۆی بەغدا نامەی دکتۆرای بە ناو نیشانی (نێر و مێ لە زمانی کوردیدا بە کەرەستەی کرمانجیی ژووروو و خواروو) بەدەستهێناوە.
- تا ئێستا زیاتر لە حەوت لێکۆڵینەوەی زانستی لە گۆڤارەکانی زانکۆکانی کوردستان و عێراق بڵاوکردووەتەوە. هەروەها لە گۆڤارەکانی زمانناسی و گزنگ و.. هتد لێکۆڵینەوە و وەرگێرانی زمانی هەیە.
- لە ساڵی (2005)ەوە تاوەکو ئێستا بەشداری زۆربەی کۆنفرانسەکانی کوردستانی کردووە.
- یەکێك بووە لە ئەندامە کاراکانی لیژنەی مافی مرۆڤ و رێنمایی لە زانکۆی کەرکوك و بە لێکۆڵینەوە بەشداری کۆنفرانسەکانی کردووە.
- لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە بووەتە مامۆستا لە زانکۆی کەرکوك بەشی کۆلێژی پەروەردە.

*** (لەیلا مەردان):-**

- لە ساڵی (۱۹٥۳) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە (۹)ی نیسانی ساڵی (۲۰۰٤) کۆچی دوایی کردووە.
- شاعیر و چیرۆك نووسە و بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و تورکی بابەتی هەیە.
- کتێبێکی چاپکراوی هەیە بە ناونیشانی: (صباح الخیر یا مدینتي)، چیرۆك و شیعر، کەرکوك، ۲۰۰۲.

*** (لوتفەڵڵا ئەفەندی):-**

- ناوی (لوتفەڵڵا ئەفەندی کوڕی وەلی ئەفەندی کەرکوکی) بووە.
- ساڵی (۱۷۳۸) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- کاتب ئەلدیوان بووە لەلای سلێمان پاشای گەورە لە بەغدا.
- یەکێکە لە نووسەرەکانی کەرکوك و لە بنەڕەتدا لە بنەماڵەی زانای ئاییتی (فازل زەکی ماهیر) بووە، لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە کەرکوك.
- باوکی نائیبی کەرکوك بووە، لە دوای ئەوەی لە بەغدا کۆچی کردووە گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوك و لەوێ ماوەتەوە.
- ساڵی (۱۸۰۱)دا کۆچی دوایی کردووە.

*** (لوتفی ئەبوبەکر ئەفەندی کەرکوکی مەکتوبی):-**

- ناوی (لوتفی ئەفەندی مەکتوبی کوڕی ئەبو بەکر ئەفەندی نائیب کەرکوکی)یە.
- یەکێکە لە نووسەرەکانی کەرکوك و ناوی هاتووە لە کتێبی (تذکرة الشعراء)ی (عبد القادر الخطیبي الشهرباني) کە لە ساڵی (۱۹۳٦) چاپ کراوە.
- ساڵی (۱۸۳۰)ی کۆچی دوایی کردووە بە نەخۆشی کۆلێرا.

* (لوتفی بەرزنجی):-

- (شێخ لەتیف کوڕی شێخ ڕەزا شێتەی کوڕی شێخ مارف قوولەی کوڕی شێخ فەتاح قوولەی کوڕی شێخ حەسەنی قوولەی کوڕی شێخ محێدینی کەرکوکی کوڕی شێخ حەسەن گلەزەردە)یە، دایکیشی ناوی (حەلاوە خانی کچی شێخ مەحموودی قوولە)یە.
- سالی (١٩٠٥) لە دێی پەلکانەی ناوچەی قەرە حەسەنی سەر بە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی تەواو کردووە لەلای (مەلا سەعیدی ملبان)و (شێخ ستاری شێخ محەمەدی مەرەوالن)و (عەبدولکەریمی دارەخورما)و (مەلا تاهیری عاللا)و (مەلا عەلائەددین)و (مەلا شەریفی سیامەنسووری)و (مەلا محەمەدی هەورامی)و (مەلا سلێمانی تورك).
- بە زمانی کوردیو عەرەبیو فارسیو تورکی شیعری هۆنیوەتەوە.
- بە درێژایی تەمەنی دووجار بووە بە مووچە خۆری میری، جاری یەکەم لە سالی (١٩٣٩)دا لە کاتی دروستکردنی ڕێگای ئۆتۆمبێلی نێوان هەولێرو ڕەواندوز بووە بە چاودێری کرێکارانی ئەشغالو جاری دووەمیش لە سالی (١٩٥٩)دا بۆ ماوەی دوو سال لە کەرکوك کراوە بە چاودێری شارەوانی جارجاریش لە دێیەکانی سالەیی دا مەلایەتی کردووە.
- خاوەنی گەلێك دیوانی شیعرییەو دیوانێکی بە ناونیشانی (دیوانی لوتفی) لە سالی (١٩٨٢) بە چاپ گەیاندووە.
- دەستنووسەکانی:
- (مەولودنامەی پێغەمبەر)، بە شیعر، وەرگێران لە کوردییە بۆ زمانی عەرەبی.
- (السادات البرزنجية)، عەبدولقادر شێخ محەمەدی، لە عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
- (فتح اليمن)، ڕەئس ئەلغۆل، لە عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
- (فتح ملك القطريف)، لە عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
- کتێبی (قصص الأنبياء)ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
- لە (٢٣)ی ئەیاری سالی (١٩٨٩) کۆچی دوایی کردووەو لە ڕەحیماوا بە خاك سپێردراوە.

* لەتیفی شێخ سادقی بەرزنجی - شێخ لەتیفی شێخ سادقی بەرزنجی:-

- سالی ١٩٣٦ لە گوندی هەشەزینی لە ناوچەی سەنگاوی سەر بە چەمچەمال لەدایکبووە.
- لە سالانی پەنجاکان و سەدەی رابردوودا، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتای و ناوەندی لە شاری هەولێر تەواو کردووە.
- سالی ١٩٥٨- ١٩٥٩ لە شاری کەرکوك قوتابخانەی مامۆستایانی ئایینی تەواو دەکات، بەلام بەهۆی کاروباری سیاسییەوە ڕێگە نەدراوە لە دامەزراوە میرییەکانی ئەو کات کار بکات.
- لە ناوەڕاست و کۆتاییەکانی سالانی پەنجاکاندا، تێکەل بە کاری ڕێکخراوەیی و سیاسی دەبێت و هەر لەو کاتەدا پەیوەندی بە ڕێکخراوی یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە دەکات، لە سالی ١٩٦١دا دەبێتە بەرپرسی دەشتی هەولێری پارتی.
- سالی ١٩٦٣ لەگەل دوولەت بوونی پارتی دەچێتە پال بالی مەکتەبی سیاسییەوەو لە ناوچەی سەنگاو وەك بەرپرسی بنکەی پێشمەرگەی میر سمایل کار دەکات.
- سالی ١٩٥٨ کتێبی شاخی بارزان چاپ دەکات، لەو سەردەمەدا لە شاری کەرکوك زیندانی دەکرێت و لەگەل ئەوەشدا بلاوبوونەوەی کتێبەکەی قەدەغە دەکرێت و لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەردەچێت.
- سالی ١٩٦٨ کتێبی (هەلبەست) بە چاپ دەگەیەنێت، لە سالی ١٩٨٧دا چاپی دووەم.
- سالی ١٩٨٧ کتێبی (پەلەوەر) چاپ دەکات، سالی ١٩٨٩ کتێبی (شێخ مەحمود لە شیعری کوردی)دا چاپ دەکات.
- سالی ١٩٩١ ڕۆلێکی باشی هەبووە لە ڕاپەڕینەکانی کوردستان.
- ٥ی تشرینی دووەمی سالی ١٩٩٩ کۆچی دوایی کرد.

لەتیف هەڵمەت

شێخ لەتیف ئیبراهیم بەرزنجی

قوتابخانەی ناوەندی ئەلوەلید ١٩٦٩ شێخ لەتیف شێخ حامید و ڕەفعەت یۆلچو و نەشئەت کەمال

لە ڕاستەوە سەمیعە شێخ مەحمود(خوشکی لەتیف هەڵمەت)
و لەتیف هەڵمەت ساڵی ١٩٥٧

لە ڕاستەوە لەتیف هەڵمەت و قادر حامد محەمەد
ساڵی ١٩٥٦

لە ڕاستەوە محەمەد سالار شێخ عەلی و لەتیف هەڵمەت
ساڵی ١٩٧٥ مەریوان

لەتیف هەڵمەت

محەمەد سالار شێخ عەلی و لەتیف هەڵمەت
ساڵی ١٩٧٥ مەریوان

شێخ مەحموود شێخ محەمەد شێخ حەسەن
باوکی شاعیری بەناوبانگ لەتیف هەڵمەت

*** لاوێن ڕێداری:-**

**- لاوێن لە ستۆکهۆڵم لەدایکبووە، بەڵام باوکی لە دووبز لەدایکبووە و باپیرانی خەڵکی ناوچەی ڕێدارن، دایکیشی کوردی ڕۆژهەڵاتە.**
**- دەرچووی کۆلێژی یاسای زانکۆی ستۆکهۆڵمە، ماوەیەکیش لە ڕێکخراوی منداڵپارێزی سویدی کاری کردووە.**
**- هەر لەسەرەتای لاوییەوە چالاکانە کاریکردووە لە ڕێکخراوی گەنجانی سۆسیال و دیموکرات و یەکێك بووە لە بەڕێوەبەرانی ڕێکخراوەکە.**
**- باوکی بەرهەڵستکاری ستەمی ڕژێمی دیکتاتۆری عێراق بووە، بەو هۆیەوە لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا، خوێندنی زانکۆی بەغدای جێهێشتووە و بووەتە پێشمەرگەی پاسۆك لە شاخەکانی کوردستانی، ساڵی ١٩٨٢ پەراگەندە بووە، دواتر لە سوید گیرساوەتەوە.**
**- ساڵی ٢٠١٤ بووەتە پەرلەمانتار، کە تەنها تەمەنی ٢٤ ساڵ بووە.**
**- لەگەڵ چوار پەرلەمانتارە کوردەکەی تر گرووپێکیان لە پەرلەمان دروستکردووە بە ئامانجی زیاتر ناساندنی پرسی کورد و پەیداکردنی پشتیوانی و تێگەیشتنی زیاتر لە دۆسییەی ئاڵۆزی کورد و کوردستان لە هەر چوار پارچەکە.**

لالۆ ڕەنجدەر یەکێکە لە هونەرمەندە بەتواناکانی کەرکوك‌و کوردستان

لەتیف هەڵمەت و مستەفا نەریمان

*** ( ماجد حاتەم سەعید ):-**

- ساڵی (١٩٥٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای کەرکوکەو مۆسیقا ژەنە لە بواری کەمان ژەنیندا و چەند چالاکییەی تەلەفزیۆنی هەیە.

*** ( مارف بەرزنجی ):-**

- ناوی (مەعرووف عەبدولکەریم بەرزنجی)یە.

-ناوی (مەعرووف کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ حوسێن بەرزنجی کوڕی شێخ عەبدولکەریمی قوتب)ە، کە دەگەڕێتەوە سەر زانای پایەبەرز (شێخ ئیسماعیلی ولیانی).
- لە (١٠)ی شوباتی ساڵی (١٩٢١) لە دێی (قادر کەرەم) لە خوارووی کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی لە قوتابخانەی سەرەتایی قادر کەرم دەست پێ کردووە، لەو سەردەمەدا خوێندنی ئەو قوتابخانەیە تا پۆلی چوارەم بووە. ئیتر لەبەر ئەوەی باوکی نەیتوانیوە بینێرێ بۆ کەرکوك بەهۆی دەست کورتییەوە دوو ساڵ ماوەتەوە. ئینجا لەگەڵ شێخ حوسێنی برای چوونەتە کەرکوك و لەتەکیە کۆنەکەی خۆیان ژیاون. گوزەرانیان زیاتر لە کولە مەرگییەوە نزیك بووە.
- لە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی ناوەندی لە کەرکوك پەیوەندی لەگەڵ پارتی (هیوا)دا هەبووە. لە ساڵی (١٩٤٣) قوتابخانەی ئامادەیی تەواو کردووە.
- کۆلێژی قانونی تەواو کردووە ولە ساڵی (١٩٤٨) کاری پارێزەری کردووە لە ژیانیدا.
- لەبەر دەست کورتی ماوەیەك لە کارگەی توتن دامەزراوە بۆ ئەوەی خوێندنی کۆلێژی ماف بباتە سەر، لە بەغدا پەیوەندی ناسیاوی لەگەڵ ئازادیخوازو نیشتمانپەروەران کردووە، لە خۆپیشاندانەکانی ئەو سەردەمانەی بەغدا بەشدار بووە.
- لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٤٧) فەرمانی گرتنی لەلایەن دەسەڵاتی میرییەوە دەرچووە، ماوەیەك خۆی شاردۆتەوە، لە هاوینی ١٩٤٨ کۆلێژی مافی تەواو کردووە و لەپاییزی ئەو ساڵەدا بووە بە پارێزەر. لە کاروباری حکومیدا شتێکی وای دەست نەکەوتووە پێی بژی، بۆیە کارێکی لەکۆمپانیای نەوت چنگ کەوتووە، بەڵام زۆری پێ نەچووە وازی لێ هێناوە چونکە کاربەدەستە ئینگلیزەکان بەچاوێکی سووك تەماشایان کردووە، بەوەی لەبن دەستی کابرایەکی ئاسووری نەخوێندەواریان داناوە وەك یاریدەدەر.
- لە ئایاری ساڵی (١٩٥٠) بەهۆی جموجۆڵی سیاسییەوە ناچار بوو چوار مانگ خۆی بشارێتەوە بەدەربەدەری لەسەنگاو و قەرەداغ و شارباژێر ئەو ماوەیەی بردە سەر.
- بەشداری دەرکردنی گۆڤاری (شەفەق) ی کردووە لە ساڵی (١٩٥٨) بەزمانی کوردی وعەرەبی.
- سکرتێری دەستەی رێکخراوی (للدفاع عن السلام في كركوك) بووە.
- ماوەیەك سەرۆکی شارەوانی کەرکوك بووە.
- لە (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٩)ەوە لە گرتووخانەی بەغدا مایەوە تا رۆژی (١٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٢) فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو لە دادگای بەغدا. لە دوای کودەتا فاشستیەکەی (٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣) گوێزرایەوە بەندیخانەی کەرکوك و لە (٢٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەسێدارەدرا.

*** ( مارف عومەر گوڵ - دکتۆر مارف عومەر گوڵ ):-**

- ساڵی (١٩٥٦) لە سەنگاو لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٨)ەوە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە.
- ساڵی (١٩٨٢ بەشی یاسای لە کۆلێژی یاساو رامیاری لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- لە رۆژنامەی برایەتی و هاوکاری و گۆڤاری نووسەری کوردا کاری کردووە.
- ماوەیەك لە زیندانەکانی ئەمنی گشتی بەغدا زیندانی کراوە.
- لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا لە حەفتاکانەوە بەردەوام لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات بەرهەمەکانی بڵاوکردووەتەوە، شیعرو رێپۆرتاج و لێکۆڵینەوەو گەلێك بەرهەمی تر.
- ساڵی (١٩٨٤) یەکەم کۆمەڵە هۆنراوەی بە ناوی (هێلانەی نەغرۆ)وە چاپ کراوە.
- دامەزرێنەری بڵاوکراوەی (نێرگز) بووە لە کەرکوك.
- دووەم کۆمەڵە هۆنراوی لە ناو شۆڕشدا بە ناوی (خۆری زیندان) لە چاپخانەی (شەهید عەبدولخالق مەعروف) لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی نووسەرانی کوردستان بە ناوی (دلاوەر مەحموود) لە ساڵی (١٩٨٢)دا بڵاوکردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٧) چاپی دووەمی (خۆری زیندان) بە کۆمەڵێك هۆنراوەی زیادەوە لە چاپخانەی شەهید (سەید ساڵح یوسفی) چاپکراوەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٦) سەر نووسەری گۆڤاری (قەندیل) بووە

لەناو شۆڕشدا.
- سالی (١٩٩٠ بروانامەی ماستەری لە (یاسای نێو دەوڵەتان) وەرگرتووە لەسەر بابەتی (جینۆسایدی گەلی کورد) لە زانکۆی (کییڤ) لە کۆماری (ئۆکراین).
- سالی (١٩٩٥) بروانامەی دوکتۆرای لە یاسای نێودەوڵەتی وەرگرتووە لەسەر بابەتی (کێشەی کەسایەتی یاسایی نێونەتەوەیی گەلی کورد) هەر لە زانکۆی (کییڤ) لە (ئۆکراین).
- سالی (١٩٩٩)ەوە لە کۆلێژی یاسا لە زانکۆی سلێمانی وەکو مامۆستا بەردەوام بووە لە کارکردن.
- سالی (٢٠٠٠) لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (زانکۆی سلێمانی) بووە.
- سالی (٢٠٠٣) پلەی زانستی (پرۆفیسۆری یاریدەدەر) لە هەمان زانکۆ وەرگرتووە.
- وەکو سەرۆکی بەشی (یاسا) و لێپرسراوی (خوێندنی بالا) لە کۆلێژی یاسای زانکۆی سلێمانی کاری کردووە.
- سەرپەرشتی چوار ماستەرنامەی لە یاسادا کردووە.
- بەشداری لە گفتوگۆی زیاتر لە ١٠ نامەی ماستەرو دوکتۆرادا کردووە لە زانکۆی سلێمانی و زانکۆی (سەلاحەددین) لە هەولێر.
- مامۆستای وانە بێژە لە خوێندنی بالای کۆلێژی یاسای زانکۆی سلێمانی وکۆلێژی زانستە رامیارییەکان لە سلێمانی و خوێندنی بالا لە کۆلێژی یاسای زانکۆی کۆیە.
- بەشداری چەندین کۆنفرانسی زانستی لە ناوەوەو دەرەوەی ولاتدا کردووە.
- ماوەیەك راگری کۆلێژی یاسای ئێواران بووە لە زانکۆی کۆیە.
- سەرنووسەری گۆڤاری (زانستە مرۆڤایەتییەکانە) لە زانکۆی کۆیە.
- ئەم کتێبانەی بە چاپ گەیاندووە:
- (خۆری زیندان)، کۆمەلە هۆنراوە، چاپی یەکەم، شاخ، ١٩٨٢، چاپی دووەم، شاخ، ١٩٨٧.
- (هێلانەی نۆغرو)، شیعر، بەغدا، ١٩٨٥.
- (جنیۆسایدی گەلی کورد لە بەر رۆشنایی یاسای نێودەولەتاندا)، چاپی یەکەم، هۆلەندا، ١٩٩٧، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، چاپی سێیەم، ٢٠٠٦، چ ٤، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (کێشەی کەسایەتی یاسایی نێونەتەوەیی گەلی کورد)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩.
- (پۆلێنکردنی تاوانەکانی ئەنفال بە گوێرەی جۆرەکانی جنیۆساید)، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (پێوەندی مەسەلەی کورد بە یاسای نێودەولەتانەوە).
- (بارودۆخی کورد لەچەند بابەتێکی یاسایی نێودەولەتاندا).
- چەندین لێکۆلینەوەی زانستی بلاوکردووەتەوە.

* (مامە ڕیشە):-

- ناوی تەواوی (نەجمەدین شوکر ڕەئوف) کە بە ناوبانگ بەمامە ڕیشە.
- لەدایکبووی سالی (١٩٥٣)ی گوندی تالەبان، سنووری چەمچەمال. لەبەر هەژاریی خێزانەکەی نەیتوانیوە بچێ بۆ خوێندنگە. لە منداڵیدا شوانی و دواتریش کرێکاریی لە کارگەی کورە گەچەکانی چەمچەمال و جەوەل بۆر کردووە.
- سالی (١٩٧٣) پەیوەندیی بە فەلەستینییەکانەوە کردو لە هێزێکی بەرگریی فەلەستینییەکاندا بووە فیدایی و لەیەکێ لە شەرەکان بریندار بوو.
- سالی (١٩٧٨) بەتفەنگی خۆی و سەربەخۆ کەوتە گەران بەچیاو گوندەکانداو وردە وردە دەستەیەکی چەکداری بۆخۆی پێکهێناو کەوتە بەرەنگاری کردنی هێزەکانی سوپای عێراق، لەم چوارچێوەیەشدا بانگەشەی بۆ کوردایەتی و خەبات کردو چەند چالاکییەکی پارتیزانانەی ئەنجام دا کە دەنگیان دایەوەو ناوبانگێکی زۆریان بۆ دروستکرد. لە کۆتاییدا پەیوەندیی بە هەرێمی ٥ی قەرەداغەوە کردو بووە پێشمەرگەی یەکێتیی.
- سالی (١٩٨٢) کرایە فەرماندەی کەرتی ٤ی جەباری. رژێمی بەعس زۆر لێی داخ لەدل بوو. لە رقی ئەو هەموو چالاکییەی کە لە ناوچەکە ئەنجامی دەدا، دەزگا ئەمنییەکانی رژێمی بەعس باوکیان گرت و پاشان شەهیدیان کرد، خێزانەکەشی بۆ ئەوەی بە هەمان چارەنووس نەگات دەربەدەر بوو.
- ئەو مرۆڤەی کە بۆخۆی داستانێك و کەرتەکەشی نموونەیەکی قارەمانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، پەروەردەی ئەم لاوە وەکو هەموو لاوێکی کورد نەگەیشتبووە بیری تەسکی نەتەوایەتی، بۆیە کاتێك بەیانی ئازار دەدرێت، مامە ڕیشە ئامادەیە بچێتە ریزی شۆرشی فەلەستین و ببێتە فیدایی، دوای ئەوەش دوای نسکۆی شۆرشی ئەیلول هەستی چەوسانەوەی گەلەکەی پالی پێوە دەنێت بچێتە ریزی شۆرشی نوێوە لە مانگی تشرینی یەکەمی سالی (١٩٧٨) کە کوردستان بەر شالاوی تەعریب و راگواستن کەوت مامە ڕیشە دەچێتە ریزی کەرتی گەرمیان و دەبێت بە پێشمەرگە.
- چەند مانگێك چەکێك دەکرێت، تەنها لە ناوچەکانی گەرمیان و هەمەوەندو جەباریدا دەکەوێتە چالاکی، ئەوکاتە گالتە نەبوو لە دەشتێکی چۆل و هۆلی جەباریدا بەتەنها بچێت بە گژ دوژمندا، لەو کاتەوا ناوبانگی مامە ڕیشە پەرەدەستێنێت و مام رۆستەم (فەرماندەری کەرتی بازیان) دەیباتە لای خۆی.
- لەگەل تێپەرینی رۆژگاردا مامە ڕیشە دەبێتە داستانێك

وهۆنراوەی ئازایەتی و وشەی (رجل حدیدی) دەبێتە ئازناوی منداڵانی گوندو شارو شارۆچکەکان دەڵێنەوە.
– کەس نییە شەری (تەپەی عەرەب ١٩٧٩) (تەرجیل ١٩٨١) (کونە مشك ١٩٨٢)ی شۆڕشی کوردستانی ئێران)و (بێتواتەی ١٩٨٣)ی نەبیستبێ، کە ڕیشە چ قارەمانێك بووە تێیدا.
– ئێوارەی (٢٤)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٥) لە پیلانێکی چەپەڵدا بەدەستی چەند خۆفرۆشێك لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا شەهید کران، ئەویش دوای ئەوەی لە گفتوگۆی نێوان یەکێتی ورژێمی بەعسدا سەربازێك کە سەر بە ئیستخباراتی عەسکەری بوو پەیوەندی بە تەحسین شاوەیسەوە هەبوو وای بە مامە ڕیشە گەیاندبوو کە تەحسین شاوەیسی دەیەوێت پەیوەندی پێوەبکات، مامە ڕیشە خۆی ودوو پێشمەرگە بە ناو موحسین بیکەسی وسەردار بە تۆیتایەکی فەلاحیی بە بێ ئاگاداری سەرۆکایەتی و تیپ و کەرتەکەش چووبوونە لای ولە نزیك گوندی (حەسەن ئاوا) ی نزیك کەرکوك دەست ڕێژیان لێدەکەن و هەر سێکیان شەهید دەکەن.

* ( **مامەند کەرکوکی** ):–

– ناوی (ڕەمزی ڕەحیم جاو فرۆش)ە.
– ساڵی (١٨٩٥)دا لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن) لەدایکبووە.
– لە حوجرەی مزگەوتەکان و لە قوتابخانەی سەرەتایی ئەو شارەدا خوێندوویەتی.
– لە خانەی مامۆستایانی عوسمانی وەرگیراوە و تەواوی کردووە، پاشان بووەتە مامۆستا، چەند ساڵێك مامۆستا بووە.
– لەسەردەمی حکومەتی عێراقیشدا لە ساڵی (١٩٢٥)دا کراوە بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە تاکۆتایی ساڵی (١٩٢٨) لە کۆیە پێیان ووتووە (ڕەمزی ڕەحیم جۆلا) چونکە باوکی لە کەرکوك پیشەگەری جۆلای قووماشی جاو بووە.
– دوای ساڵی (١٩٢٨) گۆیزراوەتەوە بۆ کەرکوك ئینجا بۆ سلێمانی و لەسەر هەڵوێستی کوردایەتی دەنێردرێ بۆ ماوەت. لە ساڵی خوێندنی (١٩٣٤–١٩٣٥)و دواتریش مامۆستای قوتابخانەی ئەو دێیە بووە.
– ساڵانی چلەکاندا دەچێتە سەر میلاکی وەزارەتی دارایی و دەکرێت بە فەرمانبەری (ئیستهلاك) لە کەرکوك و کفری و پردێ و لە شوێنی دیکە کاری کردووە.
– لە پەنجاکانیشدا دەچێتە بەڕێوەبەرایەتی ئەشغال و لە

دوای (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨) خانەنیشین دەکرێت.
– ساڵی (١٩٦٦)دا لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات.
– مامەند لە سەرەتای بیستەکانەوە لەگەڵ (عەبدولخالق ئەسیری) هاتوونەتە مەیدانی شیعری نەتەوەیی کوردییەوە چونکە ئەو سەردەمە کێشەی کورد کێشەیەکی داگیرساو بوو، بۆیە شیعرەکانیان بووە هەوێنی ئەو بابەتە.
– مامەند بەر لە نووری شێخ سالح (١٨٩٦–١٩٥٨)و گۆران (١٩٠٤–١٩٦٢) دەستی دایە نوێ کردنەوەی شیعری کوردی بە تایبەتی لە ڕووی ڕووخسارەوە، سەبارەت بە شارەزایی لە زمانی تورکی و ئاگاداری لە ئەدەبیاتی نوێی تورکی عوسمانی، زوو کەوتە بەر کاریگەری ئەو نوێکردنەوەیە.
– بەڵام دەبێت ئەو ڕاستیەش بڵێن کە نوری شێخ سالح ڕووبەرێکی گەورەتری لە ڕووبەری شیعرەکانی مامەند داگیر کرد لە کرداری ئەو نوێ کردنەوەیەدا، کاری مامەند تەنیا لە چەند هۆنراوەیەکیدا خۆی نواندو نوێ کردنەوەکەیش بە زۆری لە ڕووی ڕووخسارەوە بووە، ئەوەندە نوێکاری نەخستە نێو ناوەڕۆکی شیعری کوردییەوە.
– مامەند لە سەردەمێکی زووەوە قالبی شیعری وای بەکار هێنا کە لەوەو بەر شاعیری کورد بەکاری نەدەهێناو سەروای شیعری بە تەرزێك بەکار هێنا کە جیاواز بێت لە بەکار هێنانی شاعیرانی پێش خۆی.

*** ( مان ئەحمەد حەمید - مان ):-**

- ساڵی (١٩٦٩) لە گەڕەكی ئیسكان لە كەركوك لەدایكبووە.
- بەرچووی ئەكادیمیای هونەرە جوانەكانی بەغدایە لە ساڵی (١٩٩٣).
- ساڵی (١٩٨٥) یەكەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵی (الفن الحدیث) لە كەركوك كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩١) دووەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە بەغدا كردووەتەوە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٩٣ - ٢٠٠٤) بەشداری گەلێك پێشانگای هاوبەشی كردووە لە كەركوك و دەرەوەی كەركوك.
- ماوەیەك بەڕێوبەری كارگێڕی پەیمانگای هونەرە جوانەكانی كەركوك بووە.
- ساڵی (٢٠١٤) سەرۆكی بەشی شێوەكاری پەیمانگای هونەرە جوانەكانی كەركوك بوو.
- لە ڕازاندنەوەی كەركوكدا دەستێكی باڵای هەیەو گەلێك كۆتەڵی جۆراوجۆری لە پاركەكانی كەركوك دروست كردووە.

*** ( مەتین جەودە ):-**

- ساڵی ١٩٦٩ لە كفری لەدایكبووە.
- دەرچووی ئامادەیی پیشەسازیی كەركوكە لە ساڵی ١٩٨٩.
- لەسەر دەستی (عەونی نەقاش) فێری خۆشنووسی بووە.
- ساڵی (٢٠٠١) ئاشنای خۆشنووس (حەسەن چەلەبی) بووە لە ئەستەمبوڵ.
- بەشداری گەلێك پێشانگای ناوخۆو دەرەوەی كردووە:-
- پێشبركێی نێودەوڵەتی پێنجەم بە ناوی خۆشنووس (سەید ئیبراهیم).
- پێشبركێی نێودەوڵەتی شەشەم بە ناوی خۆشنووس (میر عیماد ئەلحەسەنی).

*** ( مەجید پەرێشان - مەلا مەجید پەرێشان ):-**

- ناوی (مەلا مەجید كوڕی حەمە عەزیز)ە.
- ساڵی (١٩٤٨) لە گوندی زاوتی سەر بە پێبازی ناوچەی كەلار لەدایكبووە.
- ساڵی (٢٠٠٤) دیوانێكی شیعری بە چاپ گەیاندووە بەناونیشانی (دیوانی پەرێشان).
- ساڵی (٢٠١٣) كۆچی دوایی كردووە.

*** ( مەجید مەلا ڕەحمەتوڵڵا - مەلا مەجید مەلا ڕەحمەتوڵڵا ):-**

- ناوی (مەلا مەجید كوڕی مەلا ڕەحمەتوڵڵا كوڕی مەلا ئەحمەد كوڕی مەلا مستەفا)یە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٤٤-١٩٥٣) بووەتە ئیمامی مزگەوتی (مەڵحە) لە ناوچەی حەویجە.
- ساڵی (١٩٥٣)ی زایینیی لە مەڵحە كۆچی دوایی كردووە.

*** ( مەجیدی قوتب - مەلا مەجیدی قوتب ):-**

- ساڵی (١٩٠٦) لە كەركوك لەدایكبووە لە بنەماڵەیەكی كورد لە گوندی شێخ بزێنی.
- ناوی (مەلا مەجید كوڕی حاجی مەردان كوڕی محەمەد ئەفەندی قوتب شێخ بزێنی)یە.
- هەر لە سەردەمی منداڵییەوە فێری خوێندنی قورئان بووە لەسەر دەستی باوكی و شێخ سلێمانی كەركوك و شێخ ناسح محەمەد.
- لە ژیانیدا فێری زمانی عەرەبی و توركی و كوردی و فارسی بووە.
- ساڵی (١٩٢٨)دا بووەتە جێگری ئیمامی مزگەوتی شێخ نوری.
- ساڵی (١٩٢٩) بووەتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی حاجی خەلیل ئاغا ئینجا بووەتە ئیمام وخەتیب لە مزگەوتی حەیدەر پاشا و مامۆستاش بووە لە مزگەوتەكە.
- ساڵی (١٩٣٦) بەردەوام بووە لەوتنەوەی زانستی ئایینی و زمانی عەرەبی تا ساڵی (١٩٤٥)، ماوەیەك بووەتە بەڕێوەبەری قوتابخانەیەكی نیزامی ئایینی، بەردەوام بوو لە وانە ووتنەوە تا ساڵی (١٩٥٨) لە كەركوك.
- ساڵی (١٩٥٩) لە سەردەمی (عەبدولكەریم قاسم) دەستگیر كراوە.
- ساڵی (١٩٣٠) هەڵبژێردراوە بە ئەندامی (المجلس العلمي) لە كەركوك كە لە ساڵی (١٩٥٩) بووەتە سەرۆكی ئەنجوومەنەكە.
- كاتێكش پەیمانگای ئیسلامی سەر بە سەرۆكایەتی (دیوان الاوقاف)ی لە كەركوك لە ساڵی (١٩٦٤) كرایەوە، دامەزرا بە بەڕێوەبەری پەیمانگا هەتا ئەو كاتە هەڵوەشێنرایەوەو خرایە سەر وەزارەتی پەروەردە لە ساڵی (١٩٧٥).
- لە دوای ساڵی (١٩٧٥)ەوە مایەوە بە دەرزووتنەوە لە مزگەوتی (فەرهاد) لە بازاڕی (جووت قاوە).
- هەروەها دەستێكی باڵای هەبوو لە خۆشنووسیدا لە سەر مەرمەڕو پارچەی بەرد كە هەر هەمووی بە خەتی (النسخ) نووسرابوو.
- بەهۆی زیرەكی و چاكی لە وانە ووتنەوە گەلێك زاناو

مامۆستا لەسەر دەستی دەرچوونە وەکو: (عەبدوڵڵا زیائی)، (فاخر سەید محەمەد ئەلرفاعی)، (شێخ هاشم محەمەدو عەبدوڵڵا ئیمام وخەتیبی مزگەوتی منارە نەخشینە)، (شێخ عەبدولوەهاب ئەلتوعمە).

- لەدوای خۆی دەستنووسێکی لێ بە جێ ماوە دەربارەی گوندەکانی کەرکوك.
- لە (٢٦)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەجید نەجمەددین نەجیب تاڵەبانی - شێخ مەجید نەجمەددین نەجیب تاڵەبانی):-**

- یەکێکە لە مەقامزانەکانی شاری کەرکوك.
- بەڵام زانیاری پێویستمان نییە دەربارەی چالاکییە هونەرییەکانی.

*** (مەحاك - مەحاکی داودە):-**

- ناوی (مەحموود کوری ئەحمەد)ە، لە ڕەچەڵەکدا زەنگەنەیە، بەڵام بەداودە بەناوبانگە.
- لە کتێبی (شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ)دا دەڵێ (مەحاك ناوی مەحموود کوری وەستا ئەحمەد کوری دارشاڵە)یە، نازناوی (فنوونی) بووە، لە ڕەگەزدا دەچێتە سەر هۆزی (زەند) لە (داودە).
- ساڵی (١٨٧٨)دا کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەحموود - خولە ڕەنگکەر):-**

- یەکێکە لە کەسایەتییەکانی خەڵکی گوندی بەیانلوو، کە بەناوبانگ بووە لەوەی کە دەستێکی باڵای هەبووە لە بەدەستهێنانی یان دروستکردنی ڕەنگی جۆراوجۆر لە بەردی هەمەچەشن.
- وەکو دەگێڕنەوە لە سەرەتادا فێری ئەم پیشەیە بووە لەژێر دەستی جووڵەکەکان لە کەرکوك و بەردەکانی بە شێوەیەکی زۆر وورد دەیکوتاو دەیکردە جۆرێك لە پۆدرەی ڕەنگ و بە لادێکاندا دەسووڕایەوەو خەڵکی بۆ ڕەنگکردنی بەنی خوری بە کەوچك لێیان دەکری.
- ساڵی (١٩٧٤)دا کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەحموود بەگی زەنگەنە):-**

- ناوی (مەحموود بەگی کوری ئەحمەد بەگی زەنگەنە)یە.
- ساڵی (١٦١٧)ی زایینی بەپێی فەرمانی سولتانی عوسمانی دووەم بووە بە فەرمانڕەوای کەرکوك و گل و خۆرنەوەزان و قەیتوول.
- سەرەتا لەشکرێکی کۆکردەوەو چوو بۆ شەڕی قزڵباشەکان، چونکە جاروبار هێرشیان ئەهێنایە سەر خەڵك و تەنانەت هەندێکیان بە دیل گرتبوو و هێنابوونیان بۆ ئەسپەهان.
- ساڵی (١٦٢٢)ی زایینیدا داوای یارمەتی لە سولتانی عوسمانی کرد، لەبەر ئەوەی لەو دەمەدا عوسمانییەکان لەگەڵ دەوڵەتی سەفەویدا لە شەڕدا بوون و سەفەوییەکان عێراقیان گرتبوو، ئەوە بوو نەیتوانی کۆمەکی بکاو (مەحموود بەگ)یش ناچار خۆی لە ئێران نزیك کردەوەو (شاتامان) کردی بە فەرمانڕەوای کەرکوك و کاتێ ئەو هەواڵە گەیشتە سولتانی عوسمانی بە پەنامەکی لە ساڵی (١٩٢٧)ی زایینیی کوشتیان و بە کوژرانی ئەو فەرمانڕەوایەتی زەنگەنە لاواز بووەوە، سەرەنجام کەرکوك و ناوچەکانی کەوتە ژێر ڕکێفی عوسمانییەکانەوە.

*** (مەحموود بابان):-**

- کوری (جەمیل بابان کوری مەجید پاشا کوری عەبدولقادر پاشا کوری سلێمان پاشای کوری ئیبراهیم پاشا)یە.
- ساڵی (١٩٢٠) لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٤) کۆلێژی ماف تەواو کردووە، دامەزراوە بە جێگری حاکم، لەم پۆستە مایەوە تاکو ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥١).

- هەڵبژێردراوە بە نوێنەرانی (مجلس نواب العراقي)ی قەزای کفری لەم ماوانەی خوارەوە.
- خولی سیانزەهەم ۱۹۵۳-۱۹۵٤.
- خولی چواردەهەم (۹)ی حوزەیرانی ساڵی (۱۹۵٤-۱۳)ی ئابی ساڵی ۱۹۵٤.
- خولی پانزەهەم ۱۹۵٤ -(۲۷)ی ئاداری ساڵی (۱۹۵۸).
- خولی شانزەهەم (۱۰)ی ئایاری ساڵی (۱۹۵۸).
- لە (۱۵)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (۱۹۵۷) لە وەزارەتی عەبدولوەهاب مەرجان، وەزیری تەندروستی بووە.
- لە (۳)ی ئاداری ساڵی (۱۹۵۸) وەزیری دەوڵەت بووە بۆ کاروباری (رئاسة مجلس الوزراء).
- لە وەزارەتی ئەحمەد موختار باباندا لە (۱۹)ی ئایاری ساڵی (۱۹۵۸) وەزیری دەوڵەت بووە.
- دوای ئەوەی عێراقی بە جێ هێشت، راوێژکاربووە لە وەزارەتی ناوخۆی سعودیە، ئینجا رۆیشتووەتە لەندەن و بەکاروباری بازرگانییەوە سەر قاڵ بووە.
- ساڵی (۱۹۹۷) کۆچی دووای کردووە.

*** (مەحموود پاشای کوڕی ئەحمەد پاشا):-**

- ساڵی (۱۵۷۹) والی کەرکوك بووە، بەڵام ماوەی فەرمانڕەوای نازانرێت.

*** (مەحموود پاشای کوڕی ئەیاس پاشا):-**

- لە (۱۵۸۹) تا (۱۵۹۱) والی بوو لە کەرکوك.

*** (مەحموودی جامی - مەلا مەحموودی جامی):-**

- ناوی (مەلا مەحموود کوڕی مەلا عەبدولغەفوری جامی)یە.
- لەنێوان ساڵانی (۱٦۳۳-۱۷۱۲) دامەزرێنەرو مەلاو خەتیبی مزگەوتی (دڵی باش) بووە.
- ساڵی (۱۷۱۲)دا کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەحموود خالید ئەدهەم شوانی):-**

- ساڵی (۱۹۷۷) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانە بەشی مامۆستایانی لە کەرکوك.
- بەشداری گەلێك پێشانگای هاوبەش و تایبەتی کردووە لە کەرکوك.

*** (مەحموود خانەقا - شێخ مەحموود خانەقا):-**

- (شێخ مەحموود کوڕی شێخ عەبدولقادر سوورە)یە.
- ساڵی (۱۸۳٦) لەدایکبووە.

*** (مەحموودی زەنگەنە - شێخ مەحموودی زەنگەنە):-**

- (شێخ مەحموود کوڕی یوسف ئاغای بابانی)ە، لە نەوەکانی کاکە سوورییەکانە، کە لە قەرەداغ نیشتە جێ بوونە.
- ساڵی (۱۷۱۷) لە دێی (ڕەمەزان مامکە) لە ناحیەی (قادر کەرەم) لەدایکبووە.
- یەکێکە لەو زانایانەیە کە ماوەیەکی زۆر لە کەرکوك و بادینان و هەولێر سووڕاوەتەوە و دەرسی ووتۆتەوە و خەڵکی فێری زانستی قورئان کردووە و ماوەیەکی زۆر لە کەرکوك ماوەتەوە تەکیەی دروست کردووە و لەوێ ژنی هێناوە.
- ساڵی (۱۸۰۰) کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەحموود سەنگاوی):-**

- ناوی (حەمە غەریب ئەمین عەلی)یە.
- لەدایکبووی ساڵی (۱۹۵۲)ی گوندی کۆیك لەناوچەی سەنگاو. ریشەی کۆمەڵایەتیی دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی هەژاری جوتیارو لە ڕووی خێڵەکییەوە دەچێتەوە سەر هۆزی ڕوغزایی جاف کە تیرەیەکی دیاری سنووری گەرمیانە.
- بەهۆی هەژارییەوە بۆی نەلواوە لە خوێندنگە فێری خوێندەواری بێ بەڵام بە هەوڵ و ڕەنجی خۆی و هاوکاریی هاورێ خوێندەوارەکانی، فێری خوێندەواری بووە.
- ساڵی (۱۹٦۷) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد. بۆ ساڵی دواتر کرایە ئەندام. ساڵی (۱۹۷٤) لەگەڵ دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کوردو ڕژێمی عێراق، پەیوەندی بە شۆڕشەوە کردو بوو بە پێشمەرگە. ساڵی دواتر پاش هەرسهێنانی شۆڕش، گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی و خەریکی کاری کشتوکاڵ و مەڕو ماڵات بوو.
- ساڵی (۱۹۷٦) لە فەرمانگەی کشتوکاڵی سەنگاو بە کرێکار دامەزراو هەر ئەو ساڵە ماڵی بۆ سەنگاو گواستەوەو لەوێ نیشتەجێ بوو. هەر لەو ساڵەشدا پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردو ئەمەش کاریگەریی زۆری لەسەر پەرەپێدانی هوشیاریی چینایەتیی بەجێهێشت. هەمان ساڵ پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە گەرمیان لە سنووری هەرێمی 5ی قەرەداغ ژیانی پێشمەرگەیەتیی دەستپێکرد.
- لە پێشمەرگایەتیدا وردە وردە گەشەی کردو پلە بە پلە لێپرسراوەتیی وەرگرت.
- ساڵی (۱۹۷۸) بووە جێگری فەرماندەی مەفرەزە لە کەرتی ۲ی هەرێمی ٥ی قەرەداغ.
- ساڵی (۱۹۷۹) بووە فەرماندەی مەفرەزە.
- ساڵی (۱۹۸۰)دا بووە جێگری فەرماندەی کەرتی ٥ی دووز.
لە کۆتایی هەمان ساڵ، دوابەدوای شەهیدبوونی خالید گەرمیانیی فەرماندەی کەرتی ٥ی دووز، لێپرسراوەتیی کەرتەکەی پێ سپێردرا.
- ساڵی (۱۹۸۲) بەشدار بوو لەشەڕەکانی هێزی پشتیوانی لە کوردستانی ئێران و لە بەرەکانی ئاڵوەتان و کونەمشك خۆی و هێزکەی دلاوەرییەکی زۆریان نواندو هەر لەو شەڕانەشدا بریندار بووە و ساڵی دواتر کرایە فەرماندەی تیپی ۱٥ی هەورامان.
- ساڵی (۱۹۸٤)دا وەك فەرماندەی تیپ بۆ تیپی ٥۱ی گەرمیان گوێزرایەوە بەڵام لەبەر زۆریی کەرتەکانی تیپەکە، تیپێکی تر بەناوی تیپی ٥۳ی شێروانە لە سنووری تیپەکەی پێکهێنرا.
- ساڵی (۱۹۸٦) بەشداریی لەیەکێ لە گەورەترین چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان کرد کە

ئۆپەراسیۆنی لێدانی دامەزراوە نەوتییەکانی بابە گورگوڕو جەوەل بۆرو چەمەبۆرە. ئەم ئۆپەراسیۆنە بە فەرماندەیی نەوشیروان مستەفا بەڕێوەچوو و دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە سەرانسەری جیهاندا هەبوو. لەم ئۆپەراسیۆنەدا سەنگاوی لە قۆلی گوندی تۆپخانەوە سەرپەرشتیی موشەکبارانکردنی دامەزراوە نەوتییەکانی چەمەبۆری کرد. بۆ سالی دواتر، کرایە فەرماندەی تیپی ٥٧ی سەرگرمە.

– سالی (١٩٨٨) بەهۆی دروست بوونی کێشەی تاکتیکی لەنێوان تیپەکەی و هێزی پاسدارانی ئێراندا، لە لێپرسراوێتیی تیپەکەی لابرا. لەو ماوەیەدا پەیوەندیی یەکێتیی نیشتمانی لەگەل ئێراندا بایەخێکی زۆری هەبوو، بەتایبەتی کە لەو سالەدا شەڕی عێراق – ئێران بەرەو یەکلایی بوونەوە دەچوو. سەرەرای ئەوەی کە لێپرسراوەتیی لێ سەنرابۆوە، لە شالاوی ئەنفالەکاندا بەرپەرچی سوپای عێراقی دایەوەو بەشدارییەکی کاریگەری لە شەڕەکانی سنووری مەلبەندی یەکدا کرد. دواتر لەگەل هێزی پێشمەرگەدا کشایەوە سەر سنوور.

– لە کۆتایی هەمان سال بۆ ئەنجامدانی چالاکیی پارتیزانی گەڕایەوە بۆ ئەو ناوچانەی کە هێزەکانی عێراق لەکاتی شالاوەکانی ئەنفالدا گرتبوویان، بەلام هێزەکەی کەوتە ناو کێلگەی مینەوەو دوو پێشمەرگەی لێ بریندار بوو، لەم سۆنگەیەوە هێزەکە گەڕایەوە بنکەکانی خۆی لەسەر سنوور.

– لە هاوینی سالی (١٩٨٩) بۆ جاری دووەم وەك پێشمەرگەی پارتیزان گەڕایەوە بۆ ناوچەی گەرمیان‌و نزیکەی سالێك لەوێ مایەوە. لە ئایاری سالی (١٩٩٠) ئەرکەکانی خۆی وەك پێشمەرگەی پارتیزان بەجێ هێناو گەڕایەوە بنکەکانی سەر سنوور.

– هەر لەو سالەدا پاش رێکخستنەوی هێزی پێشمەرگەو دروستکردنی بەتالیۆنەکان، کرایە فەرماندەی بەتالیۆنی یەك کە بارەگاکەی لە گوندی میری سووری ناوچەی مەریوان دانرا. لە تشرینی دووەمدا بارەگای بەتالیۆن بۆ پاوە گوێزرایەوە بۆ ئەوەی بەتالیۆن لە کاتی هەر پێشهاتێکدا بتوانێ زوتر بگاتە ناوچەی شارەزوورو گەرمیان.

– لە راپەرینی سالی (١٩٩١)دا رۆلێکی کارای لە رزگارکردنی قەلەمڕەوێکی فراوانی ناوچەی گەرمیان گێرا. پاش راپەرین کرایە فەرماندەی بەتالیۆنی ٨ی بیتوێن کە دواتر بارەگاکەی لە رانیە دانرا. سالی دواتر بووە فەرماندەی هێزی کەرکوك‌و دوای پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و رێکخستنی کاروباری هێزی پێشمەرگە.

– سالی (١٩٩٣) کرایە جێگری فەرماندەی ناوچەی سلێمانی.

– لەکاتی رووداوەکانی ٣١ی ئابی سالی (١٩٩٦)دا، بەرگرییەکی سەختی لە دەورووبەری هەولێرو کۆیەو دوکان کردو پاش کشانەوەی تاکتیکیی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، بەشدار بوو لە پرۆژەی رێکخستنەوەی هێزەکان.

– پاش داپێنکردنی پێداویستییەکانی ئۆپەراسیۆن (گەردەلولی تۆلە)و دانانی نەخشەی گرتنەوەی ناوچەکان، تەوەرەی باشماخ. بناری پێنجوێن بە مەحموود سەنگاوی‌و شەوکەت حاجی موشیرو شێخ حوسێنە سوور سپێردرا. لەم سەروبەندەدا رۆلێکی دیاری لە ئۆپەراسیۆنەکەدا گێراو بەشدارییەکی کارای لە گرتنەوەی ناوچەکاندا کرد.

– سالی (١٩٩٧) پاش دامەزراندنی فەرماندەیی ٥ی هێزی پێشمەرگە کە سنوورەکەی دۆلی هیران‌و دۆلی سماقولی‌و هیزۆپ‌و دۆلی خەلەکان‌و دوکانی گرتووەتەوە، لێپرسراوەتیی فەرماندەییەکەی پێ سپێردرا. لە ئۆپەراسیۆنی دووەمی (گەردەلولی تۆلە) لە تشرینی یەکەمدا، قۆلی سماقولی بە مەحموود سەنگاوی‌و عومەر عەبدوللا سپێردرا. لەم ئۆپەراسیۆنەش رۆلێکی بەرچاوی گێرا.

– لە کانوونی دووەمی سالی (١٩٩٨) لێپرسراوەتیی فەرماندەیی ٧ی سلێمانیی پێ سپێردراو.

– لە ئازاری سالی (١٩٩٩) بووە ئەندامی دەستەی کارگێری فەرماندەیی هێزی پێشمەرگەی کوردستان‌و ئەرکی سەرپەرشتی کردنی فەرماندەییەکانی سلێمانی‌و شارەزورو گەرمیانی گرتە ئەستۆ.

– سالی (٢٠٠١) لە کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی هەلبژێردراو پاش کۆنگرە لێپرسراوەتیی مەلبەندی ٩ی رێکخستنی شارەزوری پێ سپێردرا.

– سالی (٢٠٠٣) بەشدارییەکی کارای لە پاککردنەوەی ناوچەکانی تەوێلەو بیارەدا کردو لێپرسراوەتیی ئەو قۆلەی گرتە ئەستۆ کە لە چیای شنرۆیوە تا سەر سنووری عێراق – ئێران درێژ بووەتەوە. هەر ئەو سالە گوێزرایەوە بۆ گەرمیان‌و لێپرسراوەتیی مەلبەندی ١١ی رێکخستنی گەرمیانی گرتە ئەستۆ.

– سالی (٢٠٠٦) کرایە نوێنەری تالەبانی لە فەرماندەیی گشتیی هێزی پێشمەرگەو لە سالی (٢٠٠٩)دا بووە یاریدەدەری تالەبانی بۆ کاروباری پێشمەرگە.

– سالی (٢٠١٠) لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی بە ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی هەلبژێردرایەوە. دواتریش بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی هەلبژێردراو جارێکی تر لێپرسراوەتیی مەلبەندی ١١ی رێکخستنی گەرمیانی گرتە ئەستۆ.

– سالی (٢٠١٣)دا بووە لێپرسراوی مەکتەبی پێشمەرگەو تێکۆشەرە دێرینەکان.

*** ( مەحموود سدیق قلینج ):-**

- ساڵی (١٩٥٦) لە گەڕەكی (ساحة الطیران) لە شاری كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٧٨) ئامۆژگای هونەرە جوانەكانی بەغدای تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٨٠) تاكو (١٩٨٦) مامۆستا بووە لە ئامۆژگای هونەرە جوانەكانی بەغدا.
- ساڵی (١٩٩٥) ئەندامی تیپی (بیت المقام العراقي) لقی كەركوك بووە.
- ساڵی (١٩٦٨)ەوە دەستی داوەتە ژەنینی ئامێری عود تاكو ئێستا بێ دابڕان بەردەوامە.

*** ( مەحموود سیامەنسووری ):-**

- ساڵی (١٩٦٥) لە گەڕەكی شۆڕیجەی كەركوك لەدایكبووە.
- دەرچووی پەیمانگای كشتوكاڵیە لە حەویجە.
- ساڵی (١٩٨٧) پێشانگای تایبەتی یەكەمی كردووەتەوە.
- ئێستا لە كەنەدا نیشتەجێیە.

*** ( مەحموود شاكیر ):-**

- یەكێك بووە لە مامۆستا بە ناوبانگەكانی كەركوك تا ماوەیەكی چاك بەڕێوەبەر بووە لە قوتابخانەی (نالی)و لە بواری پەروەردەدا جێ پەنجەی دیارە.
- ساڵی (٢٠٠٧) كۆچی دوایی كردووە.

*** ( مەحموودی شۆڕیجە - شێخ مەحموودی شۆڕیجە ):-**

- (شێخ مەحموود كوڕی شێخ عەبدولعەزیز كوڕی شێخ محێددین كوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردە كوڕی شێخ محەمەد نۆدەهی بەرزنجی)یە.
- لە گوندی (وەنەلەكە) لە ناحیەی قەرەحەسەن لە خێزانێكی ئاینی لەدایكبووە.
- دوای تەواوكردنی لەبەر كردنی قورئان چووەتە كەركوكو لە مزگەوتی نائیب خوێندویەتی لەلای مەلا محەمەدی قرگەیی.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (الاشرفیة في انساب السادة البرزنجیة).
- (تحفة الاحباب).
- (كتاب في بحث العقائد الإسلامیة والتصوف والروحانیات).
- (تفسیر قسم من القرآن الكریم باللغة الفارسیة).
- (كتاب منظوم بالفارسیة في ذكر رجال الطریقة).
- نازناوی شیعری (سەیدا) بووە.
- ساڵی (١٨٩٧) كۆچی دوایی كردووەو لە مزگەوتەكەی خۆی لە شۆڕیجە نێژراوە.

*** ( مەحموود فەهمی هەمەوەندی - فەهمی ):-**

- ناوی (مەحموود كوڕی فەقێ محەمەدی كوڕی حاجی مەحموودی كوڕی خەسرەوی كوڕی ڕەشید)ە. دایكیشی (حوسنییەخان) كچی فەقێ قادری هەمەوەندە.
- لە شیعرو نووسیندا نازناوی شیعری (فەهمی) بووە.
ساڵی (١٩١٣)دا لە گوندی مۆرتكەی ناوچەی بازیان لە - دایك بووە.
- هەتا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندووە، لە بەر نەبوونی پلەكانی تری خوێندن لە ناوچەكەیدا نەیتوانیووە درێژە بە خوێندن بدات.
- هەمیشە هەڵگری بیروباوەڕی نوێو پێشكەوتنخوازانە بووە، ئەندامی حیزبی هیواو دواتر حیزبی شیوعی عێراقیش بووە.
- هەرچەندە كۆمەڵێ لە گوندەكانی بازیان موڵكی خێزانەكەی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز وەكو دەرەبەگێك هەڵسوكەوتی نەكردووە، بەڵكو بەهەوڵی ئەو سەرەتا لە گوندی (مۆرتكە) قوتابخانەی بۆ منداڵانی گوندەكە كراوەتەوە.
- لە گوندی (دەگەزێن)یش قوتابخانەو بنكەی تەندروستیشی دامەزراندووەو پێش زۆربەی گوندەكانی ناوچەكە ئامێری كشتوكاڵی بۆ جووتیارانی گوندەكەی دابینكردووەو ڕێگاوبانو پرۆژەی ئاوی بۆ راكێشاون.
- زۆر ئارەزووی گەشتوگەرانی وڵاتانی هەبووە، وڵاتەكانی: ئێران، ئوردن، سوریا، لوبنان، توركیا، یۆنان، نەمسا، ئیتاڵیا، یۆگسلافیا، ئەڵمانیا گەڕاوە.
- زمانەكانی كوردی، عەرەبی، فارسی، وچەند زمانێكی ئەوروپیشی زانیوە.
- لە سەردەمی پاشایەتیدا لە خولی شازدەهەمی ئەنجوومەنی نوێنەراندا بە نوێنەرایەتی ناوچەكە بە ئەندامی ئەو ئەنجوومەنە دەستنیشان كراوە.
هەر بەو هۆیەشەوە پاش شۆڕشی (١٤)ی تەمووز بۆ (قەلعە - سالح) یان دوور خستۆتەوە.
ساڵی (١٩٦٣) لە ڕووداوێكی نادیار دا لە ناو سلێمانیدا - غافلكوژ كراوە.
نووسەرو شاعیرێكی شارەزا بووە. تەنها نووسەری - ناوچەكە بووە كە لە ماوەی ژیانی خۆیدا زۆر لە بەرهەمەكانی خۆی لە گۆڤارو ڕۆژنامەكانی ئەو سەردەمەدا بڵاوكردۆتەوە.
شیعرو نووسینی لە گۆڤارەكانی: ڕووناكی، دەنگی گێتی - تازە، هەتاوو، ژیان، ژین بڵاوكردۆتەوە.
نامیلكەیەكی لە چاپ دراویشی هەیە بەناوی (گەشتێك - لە ئەوروپادا) كە لە چاپخانەی (ژین) لە سلێمانی لە ساڵی (١٩٥٧)دا چاپو بڵاوكراوەتەوە.

*** ( مەحموود محەمەد ئەلعوبێدی ):-**

- ساڵی (١٩٢٨) لە كەركوك لەدایكبووە.
- (دار المعلمین)ی تەواو كردووە.
- یەكەم پێشانگای خۆی لە گوندی بەشیر كردووتەوە لە ساڵی (١٩٤٩) كە ئەو كاتە بەڕێوەبەری قوتابخانەكە بووە.
- ساڵی (١٩٥٣) یەكەم بناغەی (جماعة فناني كركوك)ی دروست كردووەو یەكەم پێشانگایان لە هۆڵی قوتابخانەی غازی سەرەتایی كردووتەوەو دووەمو سێیەمیان لە كتێبخانەی گشتی كەركوك لە ساڵی (١٩٥٤) كردووتەوە.
- بەرهەمەكانی:

- (فن الرسم)، کەرکوك، ١٩٦٠.
- (کیف تصنع المجسمات)، کەرکوك، ١٩٦٣.
- (الاشغال الیدویة)، کەرکوك، ١٩٦٦-١٩٦٧.
- (نبذة عن مسیرتي الفنیة)، کەرکوك، (٢٠٠٨).
- ساڵی (٢٠٠٨) کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەحموود فەتاح وەلی):-**

- (مەحموود کوڕی فەتاح وەلی کوڕی سلێمان کوڕی ڕەمەزان)ە.
- ساڵی (١٨٢١)ی زایینی لە گوندی (باوە) لەدایکبووە.
- مەحموود باوك و براکانی لەو ناوچەیە بەجێدەهێڵێ و ڕوودەکاتە هەوارگەی کاکەییەکان ولەتەك سەرکردەکانیان دا پەیوەندی برایەتی وخۆشەویستی پەیدا دەکات ودەچێتە سەر ڕێبازی کاکەیی، ئەوانیش ڕێزی لێ دەگرن و ژنی بۆدەهێنن.
- لە برینسازیدا نۆشدارێکی میللی بلیمەت بووە، حکومەتی ئەو سەردەمە بە ڕەسمی ڕێگەی داوە ئەو کارە بکات، بەشێ زۆری ئەو دەرمانانەی کە بۆ خۆشکردنەوەی برینەکان بەکاری هێناوە، خۆی لە گژوگیانی چیاو دەشت و هەردەکانی کوردستان دروستی کردوون، لە نەخۆشی ئاژەڵیشدا دەستێکی باڵای هەبووە، لە نەخۆشی مرۆڤیشدا لەو سەردەمەدا هیچ نۆشدارێك وەکو ئەو لە ناوچەی کەرکوکدا نەبووە.
- مەحموود لە شۆڕشی ساڵی (١٩٢٠)ی زایینی دا بەشداری کردووە لەگەڵ سەید خەلیل ئاغا و سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکوك و باوە ڕۆستەم چووە بۆ (شعێبە) لە ناوچەی (بەسرە).
- مەحموود لە مانگی ئایاری (١٩٤٦) لە گوندی (عەلی سەرای)ی سەر بە شارۆچکەی (داقوق) کۆچی دوایی کردووە لەوێ نێژراوە.

*** (مەحموودی قوتب - شێخ مەحموودی قوتب):-**

- ناوی (شێخ مەحموودی قوتبی کوڕی شێخ عەبدولعەزیز)ە، لە بنەچەی (شێخ محێدینی کەرکوکی) بووە.
- ساڵی (١٨٣٦) لە دێی عوسمانلەکەی قەرەحەسەن هاتووەتە دنیاوە، پاشان چووەتە دێی شۆڕیجەو تەکیەو مزگەوتێکی دروست کردووە خزمەتی زۆری خەڵکی کردووە.
- ساڵی (١٨٧٧) چووە بۆ جیهاد و غەزا واتا بەشداریکردنی لە شەڕی حەفتا ساڵە لە ڕووسیا و سەرکردەی دوو سەدوو پەنجا کەسی کردووە لەو شەڕەدا.
- ساڵی (١٨٨٦) چووە بۆ قەرەوەیس بۆ کردنەوەی مزگەوت.
- بەرهەمەکانی:
- (اشرافیة محمود -او- بحر الانساب) بە زمانی فارسی، بە قەبارەی (٨٢٠) لاپەرە.
- (تحفة الاحباب في إرشاد العباد) بە زمانی فارسی، بە قەبارەی (٥٠٧) لاپەرە.
- (تحفة الاخوان في الوعظ والإرشاد) بە زمانی فارسی، بە قەبارەی (٣٥٢) لاپەرە.
- (الادعیة والطب) سێ بەرگ بە زمانی عەرەبی، لە دواییدا وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی لەسەر دەستی نەوەکانی.
- (بحث في العقائد)، نامیلکەیەك دەربارەی بیروباوەڕی

ئیسلام بە زمانی عەرەبی.
- کۆمەڵێك شیعر بە زمانی فارسی و عەرەبی دەربارەی سەیدەکانی بەرزنجە لە زنجیرەی تەریقەتی قادرییە.
- ڕاڤەکردنی بەشێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆ سەر زمانی فارسی.
- ساڵی (١٨٩٧) کۆچی دوایی ئەکات لە دێی شۆڕیجە بە خاك سەپێندرا.

*** (مەحموودی کەسنەزان - شێخ مەحموودی کەسنەزان):-**

- ناوی (شێخ مەحموود کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ حەسەن کوڕی شێخ حوسێن کەسنەزان)ە، باوکێ شێخی تەریقەتی قادری بوو، برازای شێخ کەریمی کەسنەزانە، ئامۆزای شێخ قادری کەسنەزانە.
- ساڵی (١٩٠٥)دا لە دەوروبەری کفری لە دێی ڕەمەوانی لەدایکبووە.
- شێخ محەمەدی باوکی شاعیرمان بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازی قادری ڕوو دەکاتە گەرمیان و دەست دەکاتە ئیرشاد لەناو دوو هۆزی (جاف و زەنگەنە).
- شاعیرمان شێخ مەحموود لە ساڵی (١٩٤٧)وە بە ماڵەوە دەچێتە (کفری) لەوێ بە خواناسین وبڵاوکردنەوەی ڕێبازی قادرییەوە سەرقاڵ دەبێت.
- لەتیف هەڵمەت کوڕی ئەم شاعیرەیە.
- شاعیرمان جگە لە زمانی کوردی وعەرەبی زمانی فارسی حافزو سەعدی بە نووسین وخوێندنەوەو گفتوگۆ دەزانی و هەتا ئێستا دە دوانزە هەزار دێر هۆنراوەی ئایینی و بابەتی تریشی هەیە.
- شێخ مەحموود لە سەرەتای ساڵانی هەفتادا کتێبێکی بەناو (کاس دهاقا) کە بۆ دانان وکۆکردنەوەی سوودی لە گەلێك سەرچاوەو کتێبی ئاین وەرگرت ولە چاپخانەدا لە

بارێکی ئاڵۆز لێی وون بوو.
- ساڵی (١٩٨٣) کتێبی (میعراجی راستی) چاپ کرد کە بریتییە لە ٨٤ لاپەڕەو چوونی پێغەمبەر بۆ حزووری یەزدانی پاك بە شیعرێکی تەرو پاراو دەست پێدەکات، هەروەها کتێبێکی تری بە چاپ گەیاندووە بە ناوی (نداء الحق).
- ساڵی (٢٠٠٠)دا کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەحموودی مەزناوە- مەلا مەزناوی):-**

- ساڵی (١٨٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٣١-١٨٣٢) دادەنێن بە ساڵی لەدایکبوونی.
- ماوەیەك بۆ خوێندنی زانستی ئایینی چووەتە سلێمانی لەلای (شێخ عەبدولقادری موهاجیر) ئیجازەی وەرگرتووەو ماوەیەکیش بە بۆنەی خزمایەتی لەگەڵ (شێخ عەلی خالسی) دا لە کەرکوك‌و لە مزگەوتێکی ئەم شارەدا وانەی ئایینی وتووەتەوە.
- گەلێك شیعری هەیە بە زمانەکانی عەرەبی‌و فارسی‌و کوردی‌و نازناوی شیعری (هیجری) بووە، بۆیە بە (مەحموود هیجری) بەناوبانگ بووە.
- هەروەها بەپێی دەستنووسێك کە بە جێ ماوە لە ساڵی (١٨٧١) ئەوە دەخاتە روو کە (مەلا مەحموودی مەزناوی) قوتابی بووە لە مزگەوتی (سوورغ) لەلای مامۆستا (موفتی ئەفەندی عەبدولحەکیم)، زانیاری تریش ئەوە دەخاتە روو کە مامۆستا بووە لە مزگەوتی (نائیب) لە گەڕەکی ئیمام قاسم، بەپێی دوو دەستنووس کە بە خەتی (محەمەد سدیق کوڕی مەلا عەبدولقادری پریادی) نووسراوە کە مەزناوی لەنێوان ساڵانی (١٨٩٤-١٨٩٥) مامۆستا بووە لە کەرکوك.
- بەرهەمەکانی:
- لە حاشییەیەکی (شێخ عەبدولقادری موهاجر)دا کە دەربارەی زانستە کە لە ساڵی (١٨٧٨) کە مەزناوی نووسییویەتی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنێکی جوانە.
- حاشییەیەکی بە خەتی (محەمەد ئەمین کوڕی ئەحمەد ئەربیلی) نووسراوە دەربارەی (مەلا مەحموودی مەزناوی) کە قوتابی بووە لەلای.
- نووسراوێکی (محەمەد بەهجەت) دەربارەی (مەلا مەحموودی مەزناوی) کۆمەڵێك شیعری فارسی‌و عەرەبی تێدایە دەربارەی کۆچی زانایانی ئەو کاتە کە هاوسەردەمی (مەلا مەحموودی مەزناوی) بوونە.
- دەستنووسێکی تر کە کۆمەڵێك شتی فارسییە لە ساڵی (١٨٧٦) مەزناوی نووسیوویەتی.
- دەستنووسێکی تر دەربارەی (نقش الصفیحة في الاسطرلاب) کە مەزناوی نووسیوویەتی.
- دەستنووسێکی تر ئەوە دەخاتە روو کە مەزناوی ساڵی (١٨٩٦) نووسوویەتی کە مامۆستای ئایینی بووە لە کەرکوك.
- لە دەستنووسێکی تردا هەندێك شیعری مەزناوی تێدایە.
- ساڵی (١٧٩٠) دەستنووسێك هەیە بە خەتی (عومەر کوڕی شێخ عەبدال) کە موڵکی (مەلا مەحموودی مەزناوی)یە.
- لە دەستنووسێکی تریشدا هێماو خەتی مەلا مەحموودی مەزناوی لەسەردا.
- لە (١٠)ی نیسانی ساڵی (١٩٢١) کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەحموود مودەڕسی کەرکوکی):-**

- (مەحموود کوڕی محەمەد مودەڕیسی کەرکوکی)یە.
- هیچ شتێك دەربارەی ژیانی نازاندرێت، بەڵام لەنێوان ساڵانی (١٨٤٠-١٨٦٠)ی ناوی بە سەر چەند کتێبەکەوە هەیە.

*** مەحموود ئەحمەدین:-**

ساڵی (١٩٨١) لە کەرکوك لە گەڕەکی شۆڕیجە لە دایك بووە.
- ساڵی (١٩٨٨)ەوە دەستی بەکاری هونەری کردووە لە بواری شێوەکاریدا، بەشداری هەشت پێشانگای شێوەکاری کردووەو پێشانگای تایبەتشی کردوتەوە لە ساڵی (٢٠١١).
- ساڵی (٢٠٠٠)ەوە لە رۆژنامەو گۆڤارەکان دەنووسێت.
- لە رۆژنامەی هەواڵ‌و چاودێر چەند ساڵێك کاری کردووە.
- ئێستا لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ کار دەکات.
- بەدەر لە وتارو چیرۆك‌و شیعرو بابەتەکانی لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان باشوورو رۆژهەڵات بڵاوکردۆتەوەو چەند چیرۆکێکیشی لە رۆژنامە عەرەبییەکان‌و سایتە عەرەبییەکان بڵاوکردۆتەوە لەوانە لە رۆژنامەی ئیتحاد، قودسی عەرەبی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- کۆمەڵە چیرۆکی هاوچێوەکانی سەلیم جەودەت.
- رۆمانی خۆکوژی.
- کۆمەڵە چیرۆکی (دجلە تفوح منها رائحة منصور) بە عەرەبی بڵاوبۆتەوە.
- کتێبێك بە ناوی (تەونێك لە شیعرو وشەو و تاری ئەدەبی).
- کتێبێکی لێکۆڵینەوە لە سەر بەرهەمەکانی بەختیار عەلی.
- کتێبی (لە بیقاعەوە بۆ قەندیل).
- (نەکورد کۆتایی هات‌و نە تورکیش حەسایەوە).
- کتێبێك بۆ مەلا جەمیل رۆژبەیانی بەناوی شەهیدی قەڵەم.
- چەند پاشکۆیەکی بۆ رۆژنامەکان ئامادەکردووە وەکو:- شێخ رەزای تاڵەبانی، مەسعود محەمەد، کەریم کابان، سێ پاشکۆی تایبەت بە ئیبراهیم ئەحمەد.
- بەرهەمە ئامادەکراوەکانی بۆ چاپ:-
- لەبارەی کوردەکانی قەفقازەوە.
- کۆمەڵە چیرۆکێك:-
- لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی شێخ رەزاوە.

*** (مەدیحە ئەحمەد جەمیل):-**

- چیرۆك نووس‌و نووسەرو رەخنەساز بووەو زۆری بابەت‌و لێکۆڵینەوەکانی لە رۆژنامەکانی کەرکوکدا بڵاوکردووەتەوە لە پەنجاکان.
- ساڵی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە.

* ( مەدیحە سۆفی - دکتۆرە مەدیحە سۆفی ):-

- لە (٢٦)ی تەموزی ساڵی (١٩٦٠) لە گەڕەکی ڕەحیماوا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٣) کۆلێژی کشتوکاڵی، زانکۆی سەلاحەدینی تەواو کردووە، وەکو ئەندازیاری کشتوکاڵی لە هەولێرو کەرکوك کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٩٥)ەوە لە تاراوگە لە وولاتی ئەڵمانیا نیشتەجێیە.
- ساڵی (٢٠٠٧) بڕوانامەی ماستەری لە بواری ژینگە لە زانکۆی (بۆن) بەدەستهێناوە.
- لە بواری ئەدەبیاتدا چیرۆکی کورت‌و شیعر دەنووسێت، لە بواری ژینگەشدا چەندەها نووسین‌و توێژینەوەی بڵاوکردووەتەوە، هەندێکێشیان لەبەردەستە بۆ چاپکردن.
- لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠١٦ بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری ژینگەدا بەدەستهێناوە.
- لەکاتی بڵاوکردنەوەی چیرۆکی (زەنگی ڕۆژگارێکی ژانگرتوو) لە گۆڤاری بەیاندا لە ساڵی (١٩٨٩)، ڕژێمی فاشی هەموو گۆڤارەکانی ئەو مانگەی لە کتێبخانەکاندا کۆکردەوە و ئەویش ماوەیەك، ناچاری خۆشاردنەوە بوو، کە لەو کاتەدا نەیتوانی هیچ بەرهەمێك بڵاوبکاتەوە
- بەرهەمەکانی:-
- (سورمێ)، دیوانێکی شیعرییە.
- دوو کتێبی ئامادەی چاپن.
- ئەندامی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستانە لە (برۆکسل).
- هاوسەرۆکی ڕێکخراوی سەوزی (ئەورووپی - کوردستان) ە.
- ئەندامی کۆمیتەی ژینگە لە کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان.

* ( مەریەم خان ):-

- (مەریەم خان کچی سەید ئەحمەدی خانەقا)یە.
- ساڵی (١٩٢٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- زمانی کوردی‌و عەرەبی‌و تورکی بەباشی دەزانێت.
- ساڵی (١٩٥٤) هەڵبژێردراوە بە سەرۆکی کۆمەڵەی (الهلال الأحمر)ی لقی کەرکوك تا کۆتایی ساڵی (١٩٥٨).
- ساڵی (١٩٩٧) کۆچی دوایی کردووە.

* ( مەریوان ساڵح عومەر ):-

- ساڵی (١٩٧٧) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- بەشداری دوو پێشانگای نێودەوڵەتی کردووە لە وڵاتی تورکیا لەژێر چاودێری (مرکز الأبحاث للتاريخ والثقافة والفنون الإسلامية) لە ئەستەمبوڵ.
- ساڵی (٢٠٠٥)ەوە لە سێ پێشبڕکێی ناوخۆیی بەشداری کردووە لە هەولێرو سلێمانی.

* ( مەعروف ڕەسافی ):-

- ناوی (مەعروف کوڕی عەبدول غەنی کوڕی فەتاح کوڕی خدرە کۆستە کوڕی مێکائیل)ە، بە گوێرەی (دفتر النفوس العثمانية) لە ساڵی (١٨٧٥)ی زایینی لە گەڕەکی (قەرەغول) لە بەغدا لەدایکبووە، دایکی ناوی (فاتیمە کچی قاسم)ە.
- عەبدول غەنی ڕەساڤ لە گوندی قۆردانە لە ناوچەی جەباری لەدایکبووەو لەناو خێزانێکی جوتیاری هەژاردا چاوی هەڵهێناوە بەڵام بەهۆی تێکەڵ بوونی لەگەڵ چەند کوردێکی بەغداو سەرلێدانی خزمەکانی جەباری تاك‌و توراکێ وشەی کوردی زانیوەو لە کوردی تێ ئەگەیشت بەس نەیتوانیوە پێی بدوێ بە تەواوی.
- سەید محەمەد سەید سەمەد جەباری‌و سەید مەجید عەبدول ڕەحمانی جەباری‌و سەید محەمەد سەید سەعید جەباری‌و شێخ حوسێن سەید محەمەد جەباری‌و چەندەها کەس‌و خزمی تری جەباری چوونەتە سەردانی مەعروف ڕەساڤ‌و دیارییان بۆ بردووەو ئەویش بەدیدەی خزمەکانی

دڵشاد بووە گەشاوەتەوە.
- بەڵام لە دواییدا بەهۆی هاتووچۆ زۆرەکانی مەعروف بۆ توركیا وشامو فەلەستین چەندەها شوێنی تر لە خزمەکانی دابڕاوە ولێییان دووركەوتۆتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (آراء أبي العلاء المعري).
- (المحاضرات في الأدب العربي)، لە دوو بەشدا.
- (نفح الطيب في الخطابة والخطيب).
- (حل اللغز المقدس).
- (كتاب الآلة والادوات).
- (دفع الهجنة).
- (الرسائل والتعليقات).
- (الاناشيد المدرسية).
- ديوانی شيعر.
- بەوجۆرە بێ خزمو بێ کەسو کار لە ڕۆژی هەینی ڕێککەوتی (١٦)ی ئایاری ساڵی (١٩٤٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (مەکتوبی زادە عومەر-فەوزی):-

- نازناوی شیعری (فەوزی) بووە.
- بەڵام زانیاریمان دەربارەی چالاکییەکانی نییە.

* (مەلا سەمەد پیر وەیس):-

- (مەلا سەمەد کوڕی مام پیروەیس کوڕی محەمەد کوڕی حەمە ئەمین)ە.
- ساڵی (١٨٣٩) لە شاری کەرکوك هاتووەتە دنیاوە، لە بنەماڵەیەکی کاکەیی، بەڵام هەندێ سەرچاوەی تر ساڵی (١٨٤٣)ی زایینیی بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو لە پاشا چووەتە داقوقو لەلای زانایانی ئایینییدا خەرکی فێربوونی ڕێزمانی عەرەبیو شەریعەتی ئیسلامو لێکدانەوەی قورئان بووەو لەوێوە چووەتە کفریو سلێمانیو موسڵو لە هەر کوێدا مەلایەکی بینیوە لەلای خوێندوویەتی تا ئەودەمەی مۆڵەتی مەلایەتی وەرگرتووەو سەرێکیشی داوە لە کرندو کرماشانو سەحنەو تارانو لەو شارانەشدا وێژەی فارسی خوێندووەو ئەوسا گەڕاوەتەوە زێدو مەڵبەندەکەی خۆیو پاشماوەی ژیانی بەواڵەوتنەوەو ڕێوێنی خەڵك بردووەتە سەر.
- یەکێ بوو لە هۆنەرانی کوردو هۆنراوەکانی گەلێ تەرو ناسكو شیرینو زۆربەی هۆنراوەکانی لە بەیازو کەشکۆڵەکاندا تۆمار کراوەو دیوانەکەشی کە نزیکەی هەزار هۆنراوەیەك ئەبێ هێشتا لە چاپ نەدراوە.
- ساڵی (١٩١٥) لە شاری (کرند) کۆچی دوایی کردو لەوێ بە خاك سپێردراوە.

* (مەلیك شێخ ڕەئوف - شێخ مەلیك شێخ ڕەئوف):-

- ساڵی (١٩٣٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٤) دەستی بە چالاکی سیاسی کردووەو چەند جارێك تووشی بەند کردن بووە، تا لە دوای شۆڕشی تەموزی ساڵی (١٩٥٨) بە ئاشکرا لە بواری خەباتو سیاسەتدا تێکۆشاوە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٣ - ١٩٦٦) دەگەڕێتەوە بۆ شارو دەست بە کاری مەدەنی دەکات.
- لە دوای ساڵی (١٩٩١) لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیا (کۆمەڵی ڕووناکبیری کەرکوك)یان دامەزراند.
- لە (٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٤) لە شاری هەولێر لە تەمەنی (٥٧) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

*مەلا ڕامی:-

- کەسایەتییەکی پایەبەرزی خەڵکی خورماتووە.
- لەبەر ووتارە ئاگرینەکانی لە سەردەمی ڕژێمی بەعس ساڵی (١٩٨٢) بێ سەروو شوێن دەکرێت.
- لە دوای ڕووخانی بەعسو بەهەوڵو تێکۆشانێکی زۆر

تەرمەکی لە گۆڕستانی ئەلسەکران لە بەغدا دۆزرایەوەو دواتر لە مەراسیمێکی بێ وێنەدا بە خاك سپێردرا.

* ( مەهاباد قەرەداغی ):-

- ساڵی (١٩٦٦) لەدایکبوون لە کفری.
- ساڵی (١٩٧٠) یەکەمین ئامادەبوونی سەر شانۆ لە ئۆپەرێتێکی منداڵان لە کفری.
- ساڵی (١٩٧٨) یەکەمین هۆنراوەی نووسیووە.
- زیندانیکرا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە.
- ساڵی (١٩٨١) دادگاییکراوە لە دادگای ئەلسەورە، برینەوەی ساڵێك سزای زیندان.
- ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندی کردووە بە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان).
- ساڵی (١٩٨٤) دەستیکرد بە خوێندن لە پەیمانگای کەرکوك.
- ساڵی (١٩٨٥) یەکەمین بەشداری کۆڕی شیعری لەگەڵ چەند شاعیرێك لە هەولێر کردووە.
- ساڵی (١٩٨٧) دیپلۆمی لە ژمێریاری لە پەیمانگای کەرکوك وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٨٨) یەکەم کورتە چیرۆك نووسیووە.
- ساڵی (١٩٩١) بەشدارییەکی کارای کردووە لە ڕاپەڕین، لە ئازادکردن شاری کفری.
- ساڵی (١٩٩١) دەستیکردووە بە خوێندنی زمانی سوێدی.
- ساڵی (١٩٩٤) یەکەمین دیوانی شیعری بە هاوکاری ئامۆژگای کولتوور بە چاپ گەیاندووە.
- ساڵی (١٩٩٨) یەکەمین دیوانی شیعری بە زمانی سوێدی لەگەڵ هاوڕێیەکی سوێدی بە ناوی ئانالیل پەتیل نیلسۆن بە چاپ گەیاندووە.
- ساڵی (٢٠٠٦) بووە بە خاوەنی ئیمتیازی هەفتەنامەی (گەنجلاند)و گۆشەیەکی بەردەوامی هەبووە بە ناوی (گەنجینە).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:

* دیوانی شیعر:
- (نەخشەی دوارۆژی کرێکار)، کوردستان، ١٩٩٢.
- (پانۆراما)، شیعر، سوید، ١٩٩٣.
- (شاخ.. کێڵگەی گەنمەشامییە)، ، سوید، ١٩٩٤.
- (میدالیا)، سوید، ١٩٩٥.
- (هاژەی ڕۆح)، کوردستان ١٩٩٩.
- (هێشووی عەشق)، کوردستان ٢٠٠٣.
- (باڵندە بەفرەکان)، بە سوێدی.
- (نەڤین ناوی ژیانە)، ٢٠٠٤.
- (دیوانی مەهاباد قەرەداغی)، ٢٠١٣.

* کورتە چیرۆك و ڕۆمان:
- (فەنتازیا)، کوردستان، ٢٠٠٤.
- (مەرگی مرۆڤ و نیوێك)، ڕۆمانی کۆچ و ١٥ کورتە چیرۆك، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (کۆچ)، ڕۆمان و کورتە چیرۆك، سوید، ١٩٩٥.
- (زەنگدانەوە)، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (نەڤین ناوی ژیانە)، ٢٠٠٦.
- (لەتێ پیاو)، ٢٠١٣.

* لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی:
- (لە پێناو ژیانەوەی ئافرەتدا)، سوید، ١٩٩٥.
- (ئازادکردنی مێژوو)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، چاپی دووەم، سوید، ٢٠٠٣.
- (شەرەفنامە-شەرەف کۆدێکە بۆ کۆیلە کردنی ژن)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، چاپی دووەم، سوید، ٢٠٠٤.
- (ئافرەتیزم).
- (وشە باران)، ٢٠١٠.
- (لە فێمینیزمەوە تا هیومانیزم)، ٢٠١١.

* لێکۆڵینەوەی دەروونناسی:
- (زمان، ڕامان و ناسنامە)، کوردستان ٢٠٠٣.
- (کارەساتی ئەنفال و کاریگەرییە دەروونییەکانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی).
- (ژن وکۆمەڵگە لە قۆناغی باڵندەیی شێرکۆ بێکەس دا)، سلێمانی، ٢٠٠٤.

* بیرەوەری:
- (ساڵێك لە دۆزەخ)، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (چل چرا).

* وەرگێران:
- (دانپێانانێکی پیاوانە)، چیرۆك. د. نەوال سەعداوی، سوید، ١٩٩٦.
- (شیعر هەناسەی گەروونە، هەڵبژاردەیەك لە شیعری هاوچەرخی جیهان)، وەرگێران، سوید، ١٩٩٦.
- (نانی ژەهراوی)، شانۆمە لە نووسینی: ڤیسلین هانچێف، سوید، ١٩٩٦.

* کتێبی پەروەردەو فێرکردن بە هاوبەشی لەگەڵ نووسەری تر:
- (گەرمیان)، سوید، ٢٠٠١.
- (باوەگورگور)، سوید، ٢٠٠٢.
- (دیلان)، سوید، ٢٠٠٣.

- (بیرەوەرییەکانی ژیانی ژێر دەستی، سلێمانی، ٢٠٠٥.

* ( مەهدی زریان ):-

- ساڵی (١٩٦٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە شاعیرەکانی شیعری نوێی کوردی ئەم شارەیە.
- بەرهەمەکانی:
- (مانیفێستەکانی پووچی)، ٢٠٠٥.

* ( مەولوود تەها قایەچی ):-

- ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە بواری ئەدەبدا کاری کردووە گەلێك وەرگێڕاوی هەیە لە عەرەبی و تورکی و گەلێك کتێبی چاپکراوی هەیە.
- بەرهەمەکانی:-
- (شهیدلری انارکن)، شیعر بە زمانی تورکی، کەرکوك، ١٩٦٥.
- (وفد التركمان في بغداد)، چاپخانەی (دار الزمان) بەغدا، ١٩٦٦.
- (وطن شاعری نامق کمال)، چاپخانەی (جمهوریت)، کەرکوك، ١٩٧٠.
- (محمد صادق)، چاپخانەی (جمهوریت)، کەرکوك، ١٩٧١.
- (Irakita Turkmenler arasinda folklor calismalarina toplu bir bakis)، چاپخانەی (انقرە یونفرسیتی)، ئەنقەرە، ١٩٧٦.
- (رشید کاظم بیاتلی نك اثرلرندن سەجمەلر)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٨.
- پیلتیك بابانین ساگیر ئوگلونا ئوگوتو، ٢٠٠٤
- تیمیل ئوکول سوزلوك، ٢٠٠٤

- کرکوکن ترکمان کیملیگی، ٢٠٠٧
- ترکمان ادبلری، ٢٠٠٧
- ئوکول ساگلیك، ٢٠٠٧
- تأريخ الطباعة والصحافة في كركوك، ٢٠٠٨
- کرکوك ئایالیتی، ٢٠٠٨
- قرآن الكريم ئوکوم، ٢٠٠٩
- كركوك في القرن التاسع عشر، وەرگێران، ٢٠١٠
- لە (٧) ئاداری ساڵی (٢٠١١) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد ئەحمەد سابیری ):-

- ناوی (محەمەد شێخ ئەحمەد شێخ ئەحمەدینی سابری بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٩٧٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠٠٦) بڕوانامەی ماستەری لە بواری ژینگە لە هۆڵەنداو پەیمانگای خوێندنی (I.H.E) لە شاری (Delfet) وەرگرتووە.
- فەرمانبەرە لە وەزارەتی ژینگە لە بەغدا.
- بەرهەمەکانی: (تلوث التربة بالرصاص في بغداد)، ٢٠٠٦.

* ( محەمەد ئەحمەد - محەمەد ئاڵتوونچی ):-

- ناسراو بە محەمەد ئاڵتوونچی یان محەمەد کەلارە. پێشتر لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان لە شاری کەرکووك بوو، ئەم کەرتە پەیوەندی بە کەرتی ڕێکخستنی جەباری و تەهای جەبارییەوە هەبوو. بۆیە کاتێك کە کۆمیتەی ئاگر کەوتە بەر پەلاماری گرتن و ڕاونان و تێکوپێك چوو، ئەم کەرتە زیانی بەر نەکەوت. کاتێك کە کۆمیتەی ئاگر پێك ئەهێنرێتەوە، کەرتی شەهید سیروانیش ئەدرێتە کەرکووك و محەمەد وەك لێپرسراوی ئەم کەرتە ئەبێتە ئەندامی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووك.

* ( محەمەد ئەسعەد ساڵەیی ):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی: (تاڤگەی سۆز)، شیعر، ١٩٧١.

* ( محەمەد ئەسعەد نائیب ):-

- ناوی (حاجی محەمەد ئەسعەد کوڕی عەلی ئەفەندی نائیب)ە.
- ساڵی (١٧٨٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- باوکی (عەلی ئەفەندی) دادوەر بووە لە کەرکوك، کورەکەیشی بووەتە مامۆستا لە کەرکوك.
- زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی بە باشی زانیوە.
- لەسەردەمی سولتان مەحموودا نازناوی (نائیب)ی پێ بەخشراوە.
- هەندێ لە سەرچاوەکان بنەڕەتی (نائیب) دەگەڕێننەوە سەر هۆزی میکائیلی جاف لە دێی (گەراو) لەلای هەولێر، هەندێك لە خێزانەکانیان لە (حیللە)و (بەغدا) نیشتەجێ بوونە کە پەیوەندییان بە مامۆستا (عەبدولوەهابی نائیب)ەوە نییە.
- ساڵی (١٨١٥) مزگەوتی (نائیبی) لە کەرکوك لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن) دروست کردووە.
- پەیوەندی هەبووە لەگەڵ شێخ عوسمان کوڕی سندی.

– ساڵی (١٨٢٧) چووە بۆ (بەسرە) لەسەر رەزامەندی والی بەغدا (داود پاشا) لەگەڵ شاعیر ساڵح تەمیم خۆیان ناساندووە بە شاعیر (عەبدولجەلیل ئەلبەسری) خاوەن دیوانی (روض الخل والخليل).
– بەمەبەستی خوێندن دەچێتە بەغدا ولە حوجرەی مزگەوتدا جێگیر دەبێتو لە سەردەمی زاناکانی ئەو قۆناغەدا، نموونەی ماموستا (ئەسعەد سەدرەددین ئەلحەیدەری) زانستە ئاینییەکان دەخوێنێت، گەلێك وانەو بابەتی هزری و رۆشنبیری و زانستی دیکە فێر دەبێت.
– (داود پاشا) والی بەغدا لەلایەن (محەمەد کتخدا)ی بریکارییەوە رووبەرووی کودە تاییەکی سەرنەکەوتوو دەبێتو ئەوجا لەژێر گوشاری بارودۆخدا داوای دانووستان وئاشتی لەگەڵ (والی)دا دەکات، ئەویش ئەسعەدی هاوەڵی دەستنیشان دەکات بۆ ئەوەی لە جیاتی خۆی مەرجەکانی ئەو ئاشتی و پێکهاتنە تاوتوێ بکاتو رێکەوتنەکە لەگەڵ لایەنەکەی دیکەدا ئیمزا بکات.
– لەسەر لێهاتووی خۆی پلەی (کتخدا)ی پێ بەخشراوە.
– ساڵی (١٨٣٢)دا کاتێك لە نوێژی تەراویح دەگەڕایەوە لە (باب المعظم) بەپێی پیلانێکی دارێژراو دەکوژرێت. بەڵام هەندێك سەرچاوە لە شەوی هەینی لە (٢٧)ی رەمەزانی ساڵی (١٢٤٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٣٣)ی زایینیی بە کوشتنی دەبەن.
– یەکێکە لە شاعیرە بەناوبانگەکانو گەلێك شیعری هەیە بەزمانی تورکی وعەرەبی.

*** ( محەمەد ئەمین ئەفەندی ):-**

– لە بنەرەتدا لە عەشیرەتی (زەند)ی ناوچەی کفرییە.
– ساڵی (١٨١١) لە بەغدا لەدایکبووە.
– لە سەرەتادا لەلای باوکی خوێندوویەتی و پاشان لەلای ماموستایانی ئایینی ئەو سەردەمە ئیجازەی زانستی ئایینی وەرگرتووە.
– ماوەیەك جێگری قازی بەغدا بووەو هێندەی پێ نەچووە کراوەتە موفتی بەغدا.
– ماوەیەك بووەتە نوێنەری عێراق لە پەرلەمانی نائیبەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا چووەتە ئەستەمبول، بەڵام کە سوڵتان عەبدولحەمید ئەو پەرلەمانەی داخستووە بووەتە ئەندامی کۆڕی نوێنەرانی دەوڵەتی، تا دوا کاتەکانی ژیانی بەو کارەوە مابوو.
– (محەمەد ئەفەندی) شەرع زانێکی ئاگاو زانایەکی وریا بووە لە کاروباری رامیاری و کۆمەڵایەتی و یاساییدا، شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی و هەندێك نووسراوی هەیە بەو زمانانەو کتێبێکی مێژوویی گەورەی هەیە.
– مزگەوتێکی لە بەغدا دروست کردووە بە ناوی (جامیعی کەیها).
– ساڵی (١٨٩٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( محەمەد ئەمین شەربەتچی ):-**

– ساڵی (١٩٠٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ناوی (محەمەد ئەمین ساڵح زەنگەنە)یە.
– لە تەمەنی لاوێتیدا پەیوەندی کردووە بە حیزبی (هیوا)وە.
– پیاوێکی نیشتمان پەروەردەو بە جەرگ بووە، لە شاری کەرکوك نزیك (جووت قاوە) دوکانێکی شەربەتچی هەبووە لەناو خەڵکیدا بە محەمەد ئەمین شەربەتچی ناسراوە بەڵام لەلایەن تۆرانچییەکانەوە لە (٢٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٩) بە دەستی ناحەزان شەهید کرا.

*** ( محەمەد ئەمین عەسری ):-**

– ساڵی (١٩١٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٣٦) قوتابخانەی ئایینی لە کەرکوك تەواو کردووەو چووەتە خولی ماموستایانو لە یەکێك لە ناوچە دوور دەستەکان دامەزراوە.
– هاوینان هەڵدەستا بەکردنەوەی کتێبخانە لەلای قەڵا بەڵام لە دواییدا وازی لە ماموستایی هێناوە بایەخیدا بە کردنەوەی کتێبخانە.
– هەموو ساڵیك گەشتی دەکرد بۆ تورکیاو ئێرانو میسرو لوبنانو سووریاو هەڵدەستا بە هێنانی کتێبی تورکی و عەرەبی و فرۆشتنی لە کەرکوکدا کە رەواجێکی زۆری هەبوو لە شارەکەدا.
– ساڵی (١٩٤٩) چاپخانەی (حکمە)ی دامەزراند.
– لەنێوان ساڵانی (١٩٥٣-١٩٥٨) بەهۆی چاپخانەکەی (تەرەقی)و کتێبخانەکەیەوە (عەسری) گەورەترین خزمەتی بە بزاڤی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوەی کوردی کردووە.
– لە پاش شۆرشی (١٤)ی گەلاوێژ ساڵی (١٩٥٨) بوو بە خاوەنی رۆژنامەی (بشیر).
– ساڵی (١٩٧١) چاپخانەی (التجارە)و دامەزراندو گەلێك کتێبی کوردی و عەرەبی و فارسی لێ بە چاپ کردووە.
– چاپخانەیەکی هێناو لە گەرەکی پیریادی دایمەزراند.
– لە ماوەی ژیانیدا هەستا بە چاپکردنی کۆمەڵێك کتێبی

کوردی لەسەر ئەرکی خۆی کە خزمەتێکی گەلێك گەورەی بە کتێبخانەی کوردی کردووە.
- زمانەکانی ئینگلیزیو کوردیو عەرەبیو تورکیو فارسی بە چاکی زانییوە.
- سالی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمەکانی:
- (یوسف وزلیخا)، بە زمانی کوردی، چاپخانەی (ترقی) کەرکوك.
- (معراج نامە)، بە زمانی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (ترقی)، کەرکوك، چاپی دووەم، کرەکوك، ١٩٧٣.
- (لیلی ومجنون)، وەرگێران لە فارسییەوە بۆ کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (ترقی) کەرکوك، چاپی دووەم، چاپخانەی (التجاریة)، کەرکوك، ١٩٧٨.
- (اسماعیل نامە)، چاپخانەی (النجاح)، بەغدا، ١٩٥٣.
- (حکایتی دز و قازی)، بە زمانی کوردی، چاپخانەی (ترقی)، کەرکوك، ١٩٥٣.
- (اولوم دەستان)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (ترقی)، کەرکوك، ١٩٥٥.
- (وفات نامەی رسول نازدار)، بە زمانی کوردی، چاپخانەی (ترقی)، کەرکوك، چاپی یەکەم، ١٩٥٥، چاپی دووەم، ١٩٧٢.
- (دەزگیرانی عایشە خان)، بە زمانی کوردی، چاپخانەی (ترقی)، کەرکوك، ١٩٥٦.
- (خورشید خاور)، بە زمانی کوردی، چاپخانەی (ترقی)، چاپی یەکەم، کەرکوك، چاپی دووەم، ١٩٧٣.
- (غزای جبل احد)، بە زمانی کوردی، چاپخانەی (ترقی)، کەرکوك، ١٩٥٦.
- (مولود نامەی کوردی)، بە زمانی کوردی، چاپخانەی (ترقی) کەرکوك، ١٩٥٧.
- (عەقیدەی کوردی)، بە زمانی کوردی، چاپخانەی (ترقی)، کەرکوك، ١٩٥٧.

* ( محەمەد ئەمین فەوزی ):-

- ناوی (محەمەد ئەمین فەوزی کوری عەلی ئەفەندی عەرزوحالچی)یە.
- سالی (١٧٨٦) لە بەغدا لەدایکبووەو لە سالی (١٨٤٨) کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێکە لە نووسەرەکانی کەرکوکو شیعری بە زمانی عەرەبیو فارسیو تورکی هەیەو ماوەیەك کاتب مەسرەف خانە بووە لەسەردەمی داوود پاشا، بەلام لە بنەرەتدا خۆی خەلکی کەرکوکەو لە دەرەوەی کەرکوك ژیاوە.

* ( محەمەد ئەحمەد قەرەداغی - پشکۆ ):-

- ناوی (محەمەد ئەحمەد قەرەداغی)یە، ناسراوە بە (پشکۆ) لە قەرەداغییەکانی ناوچەی کفرییە.
- سالی (١٩١٧) هەر لە کفری لەدایکبووە.
- سالی (١٩٣٥) لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی (دار المعلمین الابتدائیة) لە بەغدا وەرگیراوە.
- سالی (١٩٣٨) بووەتە مامۆستا لە کەرکوکو وەکو مامۆستاو بەرێوەبەر لەم قوتابخانانە وانەی وتۆتەوە: حەویجە، ئاغجەلەر، کفری، چەمچەمال، کەرکوك، بەغدا.
- یەکەم ئەندامی کۆمەلەی هیوا بووە (١٩٣٩-١٩٤٥) لە

ناوچەی کفری.
- ئەندامێکی چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە.
- سالی (١٩٦٢) لەبەر هەلوێستی کوردایەتی، تۆرانچییەکانی کەرکوك تیزاب دەرژێنن بەدەموچاویدا تا لە ژیاندا بوو بەرێگای دکتۆرەوە بووە.
- گەلێك بابەتی رۆژنامەوانی لە گۆڤارەکانی (گەلاوێژو (دەنگی گێتی تازە) بلاوکردووەتەوە، شاعیریش بووە بەلام تاوەکو ئێستا بەرهەمە شیعرییەکانی بلاونەکردووەتەوە.
- لە (١٦) لەسەر (١٧)ی حوەزیرانی سالی (١٩٧٣) کۆچی دوایی دەکات تەرمەکەی براوەتە کفریو لە باوەشاسوار نێژراوە.

* ( محەمەد ئەمینی قالەقژە - حاجی مەلا محەمەد ئەمینی قالەقژە ):-

- ناوی (مەلا محەمەد ئەمینی کوری دەروێش قادری ناسراو بە قالەقژەی کوری ئەحمەدی کوری مستەفای کوری عەلی کوری ئەحمەد)ەو لەنەوەی میر سمایلی عەشیرەتی زەنگەنەیە.
- سالی (١٩٠٧) هاتووەتەوە دنیاوە لە دێی گەراوی ناحیەی قادر کەرەم.
- سالی (١٩٤٠) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە لەمزگەوتی خانەقای عومەر گونبەدی.
- دامەزراوە بە ئیمامو خەتیب لە خانەقای سەید ئەحمەد لە کەرکوك.
- لە (٢٥)ی حوزەیرانی سالی (١٩٦٨) کۆچی دوایی کردووە لە گەرەکی شۆرێجە.

* ( محەمەد ئەمین کەرکوکی ):-

- (مەلا محەمەد ئەمین کوڕی ئیبراهیم کەرکوکی)یە.
- یەکێکە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك.
- لە هەندێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات)دا ئاماژە بە ناوی کراوە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە.

* ( محەمەد ئەمینی مەڵحە ):-

- ناوی (شێخ محەمەد ئەمین کوڕی شێخ ئەحمەدی مەڵحە کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ ئەحمەد سەرداری بەرزنجی کوڕی شێخ یوسفی کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ یوسف کوڕی شێخ شەمسەددین کوڕی شێخ عەبدولسەمەدی سەرگەڵو)وە.
- ساڵی (١٨٩٤) لە گوندە (سەرگەڵو) چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.
- ساڵی (١٩١٤) لەگەڵ باوکی ڕوو دەکاتە کەرکوك و لە دێی (مەڵحە) نیشتەجێ بوونە، سەید ئەحمەد خانەقا لەبەر لێهاتووی دەیکاتە دەمراستی خۆی لە گوندەکە، پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە گوندی (تۆپزاوەی) ناوچەی دوکان و ماوەیەکیش (مامە ڕەزای کەلکە سماق) دەیکاتە ڕاوێژکارو دەستەراستی خۆی لە ناو حەقەکان.
- یەکێك بووە لە پیاوە کارامەو ڕۆشنبیریو ئایینزاکانی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٤٦)دا کاتێك مامە ڕەزا لەسەردەمی کۆماری کوردستان لە مەهاباد دەستەیەك لە حەقەکانی ناردووە کە پێکهاتوونە لە (٤٠) کەس بە سەرۆکایەتی شێخ محەمەد ئەمینی مەڵحە بووە.
- ساڵی (١٩٥٩)دا بە نەخۆشییەکی کتوپڕ کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی (شێخ محێدین) بە خاك دەسپێردرێ.

* ( محەمەد ئەمین محەمەد خورشید داودی-حەققی ):-

- ناوی (محەمەد ئەمین ئاغای کوڕی شاعیر محەمەد ڕەشید ئاغای داودە)یە.
- ساڵی (١٨٩٢) لەدایکبووە.
- حەمە خورشید کە باوکی حەمە ئەمین بوو لە کاتی عوسمانییەکان قەڵایەکی سەختی بۆ بەرەنگاری عوسمانییەکان دروست کرد بوو، سوپای عوسمانییەکان تۆپیان هێناو قەڵاکەیان هەرەس پێ هێنا.
- هەروەها شاعیرمان لەژێر ئاڵای شێخ مەحموود لە (شوعەیبە) شەڕی ئینگلیزەکان و لە ئاوباریکیش دژی بەریتانیا جەنگاوە لە ڕیزی شێخ مەحموود.
- لە چلەکان ئەندامی حیزبی هیوا بووە.
- حەمە ئەمین ئاغا هەق پەرست و هەمیشە لەگەڵ حەقدابووە، بۆیە نازناوی(حەققی) هەڵبژاردووە.
- حەققی داودی ئاشنایەتی وپەیوەندی لەگەڵ ڕۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمەدا بەتین بووە وەکو: پیرەمێرد، بێخود، گێوی موکریانی.
- حەققی داودی پیاوێکی گفت و لفت شیرین و چاوتێر بوو دژی ئەو ئەو کەسانە بووە کە لەم دونیا ماڵی خۆیان ناخۆن.
- ساڵی (١٩٥٩) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد ئاغای غەمناکی ):-

- ناوی (محەمەد کوڕی ئەحمەد بەگی زەنگەنە)یە، نازناوی هۆنراوەی (غەمناکییە).
- ساڵی (١٦٩٠)دا لەدێی قەیتول لەدەورووبەری کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتا لای باوکی فێری زمان و وێژەی فارسی بووە ئینجا لای مامۆستای تایبەتی ڕێزمانی فارسی و عەرەبیی خوێندووە، چەند ساڵێکیش لەکرماشان لای خزمەکانی ماوەتەوەو فێری خەتخۆشی بووە.
- لە پاشان گەڕاوەتەوە زێدی خۆیو بووەتە یارمەتی دەری میر ئەحمەد بەگی زەنگەنە.
- پاشماوەی ژیانی بەکشتوکاڵیەوە بردووەتە سەر.
- ساڵی (١٧٨٢)دا کۆچی دوایی کردووە.

* محەمەد ئاغای زەند:-

- ئەم شاعیرە لە سەدەی حەڤدەهەمدا ژیاوە، بەڵام هیچ زانیارییەکی ئەوتۆمان نییە دەربارەی تەنها ئەوە نەبێت کە ڕەنجووری لە پارچە شیعرێکدا یادی کردووەتەوە، لەوانەیە یەکێك بووبێت لە کەسایەتییەکانی میرسمایلی زەنگەنە.

* ( محەمەد بەرقی ):-

- ساڵی (١٨٨٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پەرلەمانیو ئەفسەری سەرباز بووە لە سوپای عوسمانی. ئەندامی ئەنجوومەنی نائیبەکان بووە لە خولی حەوتەم - کە لە (٢٧)ی شوباتی ساڵی (١٩٣٧) تا (٢٦)ی ئابی ساڵی (١٩٣٧). بەردەوام بووە

* ( محەمەد بەکر محەمەد ):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (کێش و ریتم لە شیعری کوردیدا)، هەولێر، ٢٠٠٤.
- (پەخشانە شیعری کوردی)، هەولێر، ٢٠٠٤.

* ( محەمەد بەگی جاف ):-

- ساڵی (١٩٠٠) لەدایکبووە.
- ناوی (محەمەد بەگ کوڕی فەتاح بەگ کوڕی محەمەد پاشای جاف)ە.
- پەرلەمانی و خەبات کەرێکی نەتەوەی کورد بووە، لە (مجلس نواب العراق) لە خولی یەکەمدا.
- لە یەکێك لە کۆبوونەوە گرنگەکانی کەرکوك کە لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتە کوردەکاندا بەسترا لەگەڵ راوێژکاری ئینگلیزەکاندا، دوای مافەکانی نەتەوەی کوردی کردووە.
- بەڵام زۆر بە داخەوە لە ژیانی گەنجیدا بە جەڵتەی مێشك کۆچی دوایی کرد لە ساڵی (١٩٣٢)دا.
- بۆ یەکەم جار قوتابخانەی لە گوندی کەلار کردووەتەوە.
- ئەندامی ئەنجوومەنی نیابی بووە لە خولی دووەم کە لە (١٩)ی ئایار تا (٢٨)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٨) بەردوام بووە.

* ( محەمەد پەژار):-

- ناوی (محەمەد کوڕی حوسێن کوڕی حەمید)ە.
- ساڵی (١٩٥٤) لە کەلار لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەلارو کفری و کەرکوك تەواو کردووە.
- ماوەیەك دوو بەرنامەی هەبووە لە رادیۆی کوردی بەغدا بە ناوی (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی عێراق)و (کاروانی شیعرو مۆسیقا).
- لە (٢) ئاداری ساڵی (١٩٩١) دەکەوێتە بەر دەسترێژی چەتەکانی (موجاهیدینی خەلقی ئێران).
- لە پاش خۆی کۆمەڵێك شیعری بە جێماوە کە لەلایەن (ئەحمەد باوەر)و (سەرکۆی حەمە رۆستەم). بە چاپ گەیەنراوە بە ناونیشانی (شاعیری شەهید محەمەد پەژار).

* ( محەمەد پاشای ئاش ):-

- ساڵی (١٦٣٨) والی کەرکوك بووە بۆ ماوەی ساڵێك تا ساڵی (١٦٣٩).

* ( محەمەد پاشای چاووش زادە ):-

- ساڵی (١٦٤٨) بووەتە والی کەرکوك کە تاکو ماوەی (١٦٥٢) خایاندووە، کە ماوەی (٥) ساڵ فەرمانڕەوای کردووە.

* ( محەمەد پاشای حەساری ):-

- ساڵی (١٦٥٨) بووەتە والی کە تا ماوەی دە ساڵ بەردەوام بووە تا ساڵی (١٦٦٨) وەلە دوای خۆی محەمەد پاشای کوڕی قەرە مستەفا باشا جێگەی گرتووەتەوە.

* ( محەمەد پاشا کوڕی قەرە مستەفا پاشا ):-

- ساڵی (١٦٦٨) بووەتە والی کەرکوك بەڵام ساڵی بەردەوام بوونی نازانرێت

* ( محەمەد تاڵەبانی ):-

- ساڵی (١٨٨٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ئەندامی ئەنجوومەنی دامەزرێنەری (مجلس التأسيس) بووە لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٢٥) نائیبی کەرکوك بووە.
- بووەتە قازی لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٣٦) بووەتە سەرۆکی شارەوانی.

* ( محەمەد تاهیر تۆفیق ):-

- ساڵی (١٩٢٤)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨١)دا کۆچی دوایی کردووە.
- نووسەرو ئەدیب و شاعیر بووەو کۆمەڵێك کتێبی چاپکراوی هەیە، لەوانە:
- (دراسات في التمثيل المسرحي)، بەغدا، ١٩٤٧.
- (قصة كرم واصلي)، بەغدا،
- (مذكرات الجاسوسة الألمانية سوزي ليبرمان)، وەرگێڕان لە تورکییە بۆ عەرەبی، بەغدا.
- (Araplara Turkce ogreten)، بەغدا، چاپی یەکەم، ١٩٣٥، چاپی دووەم، چاپخانەی (النجاح)، بەغدا، ١٩٥٠.
- (غرام الفارس)، شانۆگەری، چاپخانەی (الرشيد) بەغدا، ١٩٣٩.
- (الخفافيش)، وەرگێڕان لە تورکییە بۆ عەرەبی، شانۆگەری،

بەغدا، ١٩٤٩.
- (القصص المختارة)، بەغدا، ١٩٤٩.
- (فردوس الفكاهات)، چوار بەرگ، چاپخانەی (الرشيد)، بەغدا، ١٩٥٠.
- (عشاق)، چاپخانەی (الزهراء)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٢، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٥٣.
- (قصة شيرين وفرهاد)، بەغدا، ١٩٥٥.
- (قصة يوسف الصديق وزليخا)، چاپخانەی (المعارف)، بەغدا، ١٩٥٥.
- (التجدد في الحرية والديمقراطية)، بەغدا، ١٩٥٧.
- (الحرية والديمقراطية)، چاپخانەی (المعارف)، بەغدا، ١٩٥٧.
- (ثمرات قلب)، چاپی یەکەمو دووەم، بەغدا، چاپی سێیەم، بەغدا، ١٩٥٧.
- (المرشد إلى الاقطار العربية والإسلامية)، چاپخانەی (الأمة)، بەغدا، ١٩٦٥.
- (العراق المصور)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٦٥، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٦٧، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٦٩.
- سەرۆکی کۆمەڵەی چاککردنی باری نابینایان بووە لە عێراق.

* ( محەمەد تاهیری کەرکوکی بەرزنجی ):-

- ناوی (مەلا محەمەد تاهیری حوسێن بەرزنجی)یە.
- یەکێك بووە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك، ماوەیەك لە قوتابخانەی مزگەوتەکانی کەرکوك وانەی ئایینی ووتووەتەوەو گەلێك لە دەستنووسەکان ئاماژە بە ناوی دەکەن وەکو کتێبی (شرح تشريح الافلاك) کە لە نووسینی (مەلا محەمەد تاهیری کەرکوکی)یە.

* ( محەمەد تۆپاڵ - مەلا محەمەد تۆپاڵ ):-

- ناوی (مەلا محەمەد کوڕی مەردان قەساب)ە، کە بەناوبانگە بە (تۆپاڵ).
- ساڵی (١٨٩٢) لە گەڕەی پیریادی لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە مەقام زانەکانی کەرکوك.
- لە قاوەخانەکان مەقامی خوێندووە لەنێوان نوێژی (مەغریب)و (عیشا)دا.
- بەشداری خوێندنی مەقامی کردووە لە مزگەوتەکانی (کەوسەر)و (شێخ حیسامەددین)و (تەکیەی تاڵەبانی).
- بەشداری خوێندنی مەقاماتی کردووە لەگەڵ (محەمەد گوبەنچی)و (یوسف عومەر)و (سەید سەلمان موسڵی).
- ساڵی (١٩٧٨) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد شێخ جەبار جەباری - شێخ محەمەد شێخ جەبار جەباری ):-
- (شێخ محەمەد کوڕی شێخ جەبار کوڕی شێخ قادری جەباری)ە.
- ساڵی (١٩٢١) لە گوندی (شێرە دەرە)ی ناوچەی جەباری لەدایکبووە.
- ساڵانی (١٩٤٤-١٩٤٥) دەچێتە ریزی حیزبی هیواوە.
- لە پاشان بە لە ناوچوونی حیزبی هیوا لە ساڵی (١٩٤٦) دەچێتە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە.

- لە (١١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١) هەر لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بۆ ماوەی یەك ساڵو چوارمانگ لەلایەن رژێمەوە زیندانی دەکرێت.
- لە دیوانە شیعرەکانی (ڕاز و نیاز)ی بە چاپ گەیاندووەو دیوانی (بەرەوهەوراز) لە ساڵی (١٩٩١) بە تاڵان بۆیشتووە.
- ساڵی (١٩٨٤) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد جەمال ):-

- ساڵی (١٩٥٤) لە گەڕەکی ساری کەهیە لەدایکبووە.
- یەکێکە لەوانەی لە بواری شانۆی کۆمیدیا دەورێکی باڵای بینیوە.

* ( محەمەد جەمیل تاڵەبانی - شێخ محەمەد جەمیل تاڵەبانی ):-

- ناوی (شێخ محەمەد جەمیل کوڕی شێخ محەمەد عەلی کوڕی حاجی شێخ عەلی ئەفەندی خاڵسییە، قادری)یە.
- ساڵی (١٨٩٢) لەدایکبووە.
- لە دوای کۆچی دوایی باوکی جێگەی گرتووەتەوە لە تەکیەکەی.
- ساڵی (١٩٦١) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد جەمیل عوسمانی ):-

- ساڵی (١٩١٠) لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٢) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی (مێژووی شەڕی ئەهلی سەلیب)، سلێمانی، ١٩٥٩.

* ( محەمەد جەمیل قیردار ):-

- (محەمەد جەمیل قیردار کوڕی مستەفا قیردار)ە.
- ساڵی (١٨٦٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵانی (١٩٣٩)، (١٩٤٣) هەڵبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك.
- لە (٢٥)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٣) کۆچی دوایی کردووە.

* ( **محەمەد جەواد نەجیب جەباری** ):-

- ناوی (سەید محەمەد کوڕی سەید جەواد کوڕی سەید نەجیب جەباری)یە.
- ساڵی (١٨٩٢) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٩) کۆچی دوایی کردووە.
- ساڵی (١٩١٣)دا گۆڤاری (معارف)ی دەرکردووە.
- بەرهەمەکانی: (نواصول جغرافیای ابتدائی)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (اداب)، بەغدا، ١٩١٠.
- لە ماوەی شەڕی جیهانی یەکەمدا بووتە ئەفسەر لە سوپای عوسمانییدا لە شاری حەلەب و لە دوای تەواو بوونی شەڕیش دامەزراوە بە ژمێریار لە شاری ئەستەمبول.

* **محەمەد جەواد عەلی بەیاتی - دکتۆرمحەمەد جەواد عەلی بەیاتی**:-

- ساڵی ١٩٦٧ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- الخطب الوعظية للإمام علي بن ابي طالب، نامەی ماستەر، ٢٠٠٥
- توظيف المرجعيات الثقافية في شعر محمد مردان، نامەی دکتۆراە، ٢٠١٣
- توظيف المرجعيات الثقافية في شعر محمد مردان، بيروت، ٢٠١٣

* ( **محەمەد ڕامچی** ):-

- ساڵی (١٩٣٩) لە گەرەکی (موسەلاّ) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٠) کۆمەڵێک گۆرانی تورکمانی لە بەغدا تۆمارکردووە.
- تاکو ئێستا کە (٢٥) گۆرانی ومەقام وقۆریاتی بۆ مان بەجێهێشتووە.
- لە (٣٠)ی ئاياری ساڵی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە.

* ( **محەمەد حەبیب تاڵەبانی** ):-

- (شێخ محەمەد حەبیب کوڕی شێخ عەلی کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی ئەحمەد تاڵەبان)یە.
- ساڵی (١٨٨٤) لەدایکبووە.
- بنەرەتی خێزانەکەی دەگەڕێتەوە دێی تاڵەبان لە نزیك قەزای چەمچەماڵ.
- باوکی شێخ عەلی یەکێکە لە زانا ئایینە کانی تەریقەتی قادری.
- ساڵی (١٨٨٤) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٢٠)دا بووەتە بەڕێوەبەری ناحیەی قەرەحەسەن.
- هەڵبژێردراوە بە نوێنەری لیوای کەرکوك لە (مجلس التاسيس) لە ساڵی (١٩٢٤ لە ساڵی (١٩٢٥) دووبارە هەڵبژێردراوە.
- ساڵی (١٩٢٨) قازی شەرعی کەرکوك بوو.
- ساڵی (١٩٣٠) نوێنەری لیوای کەرکوك بوو، دووبارە لە ساڵی (١٩٣٣) هەڵبژێردراوە.
- ساڵانی (١٩٣٤-١٩٤٩) سەرۆکی شارەوانی کەرکوك بووە.
- ساڵی (١٩٥٩) کۆچی دوایی کردووە.

* ( **محەمەد حەسەن ڕۆژبەیانی** ):-

- ساڵی (١٩٥٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٤) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زمانی کوردی لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٧٣)ەوە خەریکی نووسین و وەرگێڕانە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی (پاداشتی کۆتایی ساڵ)، وەرگێڕان، هەولێر، ١٩٧٩.

* ( **محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق** ):-

- ساڵی (١٩٥٣) لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٦) کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی سلێمانیی تەواو کردووە.
- ٢٢ ساڵ مامۆستای پیشەیی و ئامادەیی بووە.
- ١٣ کتێبی لە ئینگلیزییەوە کردووە بە کوردی گەلێك نووسین و وەرگێڕانی لەڕۆژنامەوە گۆڤارەکانی ناوخۆو دەرەوە بڵاو کردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (هۆنراوەو چیرۆکی فۆلکلۆری کوردەواری)، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- (جینۆساید لە عێراقدا، پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد)، میدل ئیست ووچ، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (سەرهەڵدان و شکستی سەربەخۆیی باشووری کوردی لەکوردستانی عێراقدا جەنگی جیهانی یەکەم)، وەدیع جوەیدە، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (کارێکی ژەهراوی ئەمریکاو عێراق و گاز بارانی هەڵەبجە)، یوسن هێلترمان، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٨
- اوجه الشبه بين جينووسايد الكورد والهنود الحمر والهولوكوست النازي، ٢٠٠٨
- (کەرکوك، لەدوو ڕاپۆرتی گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی)، وەرگێڕان، هاوبەش، هەولێر، ٢٠٠٩.
- (کیژی کاپیتان)، ڕۆمان، پۆشکین، وەرگێڕان، سلێمانی.

* ( **محەمەد حوسامەددین عومەر قادری** ):-

- ناوی (شێخ محەمەد حوسامەددین کوڕی مەلا عومەر کوڕی حاجی کەوسەر)ە.
- ساڵی (١٨٩٨) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ئیجازەی مەلایەتی لەلای مەلا مەحموودی مەزناوی وەرگرتووە، بووەتە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی (کەوسەر).
- گەلێك بەرهەمی شیعری و نووسینی هەیە بە زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (الانفاس الرحمانية في سلسلة القادرية الطالبانية)، بە زمانی تورکمانی و عەرەبی و کوردی، چاپخانەی (الشمال)، کەرکوك، ١٩٧٣.
- (رسالة سيرة الائمة الاربعة)، دەستنووس.
- لە (٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٦) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد حوسێن داغستانی ):-

- ساڵی (١٩٤٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ئەدیب و رۆژنامەنووسە.
- گۆڤاری (صدی کرکوك الریاضي)، بە هاوبەشی لەگەڵ کۆمەڵێك نووسەر لە ساڵی (١٩٦٧) بە چاپ گەیاندووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (یقظة الوجع)، پارچە پەخشان، (٢٠٠٨).

* ( محەمەد حوسێن شوانی - دکتۆر محەمەد حوسێن شوانی ):-

- ناوی (محەمەد مەلا حوسێن محەمەد ئەحمەد خەلیفە فەتاح ئەحمەد میکائیل ئیسماعیل کوڕی بەگی (سمایل بەگی))ە ناسراو بە (محەمەد شوانی).
- لە (١)ی ئادای ساڵی (١٩٦٥) لە گوندی (سمایل بەگی) ناوچەی (شوان)ی پارێزگای کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٠) خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە گوندی (ڕێدار)ی (ناوچەی شوان) تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٣) ئامادەیی بەشی زانستی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٥) دبلۆمی لە پەیمانگای (کشتوکاڵی شەترە) لە (ناسریە) تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٩٥) ئامادەیی بەشی ئەدەبی لە هەولێر تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠١) بەکالۆریۆسی لە زانکۆی (سەلاحەددین) لە هەولێر تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) ماستەری لە کۆمەڵناسی لە زانکۆی (موسل) بە دەستهێناوە، نامەی ماستەرەکەی بە ناونیشانی (الاختلاف والتنوع في ظل التضامن الإجتماعي، دراسة میدانیة في مدینة کرکوك) بوو.
- ساڵی (٢٠٠٩) دکتۆرای لە (ئەنترۆپۆلۆژیای کلتووری) لە زانکۆی (بەغدا) بە دەستهێناوە، نامەی دکتۆراکەی بە ناونیشانی (القیم الثقافیة وتلوث البیئة الحضریة، دراسة میدانیة انثروبولوجیة في مدینة کرکوك) بوو.
- پرۆفیسۆری یاریدەدەرە لە کۆلێژی (ئەدەبیات)ی زانکۆی (سەلاحەددین) و مامۆستای وانەبێژە لە کۆلێژی (پەروەردە)ی زانکۆی (کەرکوك).
- لە تەمەنی هەرزەکارییەوە رووی کردووەتە خوێندنەوەو دەستی کردووە بە نووسین، یەکەم نووسینی لە (١٣)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٨) لەسەر سیناریۆی تەلەفزیۆنی (ژاڵە) بڵاوبووەتەوە.
- خاوەنی چەندین کتێب و توێژینەوەی زانستییە بە زمانی کوردی و عەرەبی لە بواری (کۆمەڵناسی) و (ئەنترۆپۆلۆژیا) و (ژینگە)دا، هەندێك لە گرنگترین نووسینەکانی بریتین لە:
- (التنوع الأثني والدیني في کرکوك)، ٢٠٠٦.
- (دور القیم الثقافیة في تلوث البیئة الحضریة).
- (الاثار الإجتماعیة للواقع الصحي في اقلیم کردستان).
- (سۆسیۆلۆژیای چینە کۆمەڵایەتییەکان، دەروازەیەك بۆ شیکردنەوەی چینایەتی کۆمەڵگای کورد)، ٢٠١١.
- (ئەنترۆپۆلۆژیای دانیشتوان)، ٢٠١٣.
- (دەروازەی کۆمەڵناسی)، بە هاوبەشی، ٢٠١٣.
- (سەرەتایەك بۆ نووسینی توێژینەوە لە کۆمەڵناسیدا).
- جگە لە وەرگێرانی چەندین کتێب لە زمانی عەرەبی و فارسییەوە بۆ زمانی کوردی، لەوانە:
- (میتۆدەکانی توێژینەوە لە کۆمەڵناسیدا)، وەرگێران، ٢٠١١.
- (ڕێبازە سیاسی و ئاکارییەکەی تۆماس هۆبز)، وەرگێران، ٢٠١١.
- (بابەتەکانی تیۆردانان لە کۆمەڵناسیدا)، وەرگێران، ٢٠١١.
- (کۆمەڵناسی بابەت و میتۆد)، وەرگێران بە هاوبەشی، ٢٠١١.
- لە بواری لێکۆڵینەوەشدا ئەم بابەتانەی بڵاوکردووەتەوە:
- (دور الصحافة في ترسیخ القیم الدیمقراطیة)، رۆژنامەی (الاتحاد)، ١٩٩٤.
- (جمعیة زانستي ودورها في تعلیم الکبار في کرکوك)، رۆژنامەی (الاتحاد)، ٢٠٠٥.
- (تجربة رعایة النازحین في اقلیم کردستان العراق)، ٢٠٠٨.
- (التلوث البصري في المدن المعاصرة)، ٢٠٠٨.
- (کاریگەری ئەنفال لەسەر سامانی مرۆیی کورد)، توێژینەوە، گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ٢٠٠٢.
- (بنەما کۆمەڵایەتییەکانی چارەنووسی هاوبەش لەنێوان کوردو تورکمان) توێژینەوە، گۆڤاری (توێژینەوە)، ٢٠٠٧.
- (ئەزموونی چاودێری پەنابەران لە کەرکوك)، توێژینەوە، گۆڤاری (زانکۆی کۆیە)، ٢٠١٠.
- (کوردو کلدوئاشووری ئایندەیەکی هاوبەش)، توێژینەوە، گۆڤاری (زانکۆی سەلاحەددین)، ٢٠١٠.
- (رۆڵی چینی ناوەند لە پێکەوەنانی سیما نەتەوەییەکاندا) توێژینەوە، گۆڤاری (زانکۆی سلێمانی) ٢٠١١.
- (ئەنترۆپۆلۆژیای زمان و زمانی کوردی بە نموونە)، گۆڤاری (زانکۆی کەرکوك)، ٢٠١٢.
- (کاریگەری راگواستن لەسەر بوونیادی کۆمەڵایەتی گوندە کوردییەکان، شوان بە نموونە)، گۆڤاری (زانکۆی گەرمیان)، ٢٠١٣.

* ( محەمەد خەتیب ):-

- ساڵی (١٩١٠) لە گەڕەکی (حەمام) لە قەڵا لەدایکبووە.
- لە لێکۆڵینەوە و ژیانی لەسەر بابەتەکانی کەمە

* ( محەمەد خاڵسی تاڵەبانی ):-

- ناوی (شێخ محەمەد کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی)یە، نازناوی شیعری (خاڵسی)یە.
- ساڵی (١٨٧٥) لە گەڕەکی (بولاق) لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەلای باوکی و زانایانی گەڕەکەکە تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩١١) لەبەر ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ والی موسڵ (سلێمان نەزیف بەگ) باش بووە بۆیە کردوویەتی بە قایمەقامی قەزای (دهۆك).
- لە شەڕی جیهانی یەکەمدا گوێزراوەتەوە بۆ یەکێك لە قەزاکانی تورکیاو بەم جۆرە ناوچەیەکی فراوانی چاو پێکەوتووەو بە کۆمەڵێك شاعیرو شیعر دۆستی تورك گەیشتووە.
- لە شەڕی سەربەخۆیی تورکیادا بە لایەنگرنی جێنشینی خەلیفە دانراوەو دوای ماوەیەك کۆتایی بە مووچەکەی هاتووەو گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوك و کراوە بە قایمەقامی کفری.
- گەلێك شیعری تورکی و کوردی هەیە، بەڵام توانای شیعری لەو ئاستەدا نەبووەو هەندێك جار هەوڵی داوە لاسایی (شێخ ڕەزا)ی باوکی بداتەوە.
- ماوەیەك لەلای (مەلا مەحموودی مەزناوی) زانستەکانی ئایینی خوێندووە.
- قوتابخانەیەکی نوێی لە کفری کردووەتەوە لەو ماوەی کە لەوێ بووە.
- ساڵی (١٩٢٢) تووشی نەخۆشی (سیل) بووەو پاش ماوەیەك کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد خدر -خضر- مەحموود ):-

- ساڵی (١٩٦٦) لە گەڕەکی بەگلەر لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٩ دبلۆمی لە هونەری شانۆ لە بەشی داهێنان و نواندن وەرگرتووە.
- شاعیرو ڕەخنەگرو ڕۆژنامەنووس و شانۆکاربووە.
- مامۆستایە لە هونەرە جوانەکانی کەرکوك.
- بەرهەمەکانی:
- (ترانيم آرابخا)، شيعر، كەركوك، ١٩٩٩.
- (أيادي الجن)، شيعر، كەركوك، ٢٠٠١.
- (أسطورة كركوك حورية حب)، شيعر، چاپی یەکەم کەرکوك ٢٠٠٣، چاپی دووەم ٢٠٠٧.
- (لا)، شيعر، كەركوك، ٢٠٠٤.
- (الكفاف في سيرة حميد الحاف)، كەركوك، ٢٠٠٦.
- (انخيد وانا كصمت البخور في لظى صقيع كركوك)، شيعر، كەركوك، ٢٠٠٧.
- (عفوا لاتحضر سيدي المسيح)، شانۆ، کەرکوك، ٢٠٠٩.
- (غياهب الجب)، شانۆ، کەرکوك، ٢٠٠٩.
- النقد المسرحي، ٢٠١١.

- المكياج في المسرح، ٢٠١٢.
- المكياج في السينما والتلفزيون، ٢٠١٣.
المسرح في كركوك، ٢٠١٥.
- بەشداری درامای (کەرکوك ٤)ی کردووە وەکو ئەکتەر.

* ( محەمەدی خولەی بارام چاوەش ):-

- مەقام خوێنێکی چاك بووە تەمیرەو زووڕناشی بە ڕێکوپێکی ژەنیوەو شارەزایی لێیان پەیدا کردووە، باوکی هونەرمەند سەلاح داودەیە.
- ساڵی (١٩١٣) لەدایکبووەو لە ساڵی (١٩٨٠) کۆچی دوایی کردووە.

* محەمەد خورشید داقووقلی:-

- ساڵی ١٩٣٢ لە داقووق لەدایکبووە.
- ساڵی ٢٠١١ کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمەکانی:-
- تیمیل ئوکول سوزلوگو، فەرهەنگ بە زمانی تورکی و عەرەبی، ٢٠٠٤.
- مثقفوا الغرب يتحدثون عن الرسول الأعظم، ٢٠٠٤
- جمهورية تركمانستان، ٢٠٠٦
- التتار وجمهورية تتراستان الإسلامية، ٢٠٠٧.
- داقوق قصبەسی، ٢٠٠٧
- اقوال ونصائح لقمان الحكيم، ٢٠٠٨
- الألفية المنتحبة من احاديث الرسول(ص)، ٢٠٠٨
- جمهورية قيرغستان الإسلامية، ٢٠٠٨
- اقوام وطوائف إسلامية لاتعرف عنها إلا القليل، ٢٠٠٨
- أسئلة وجهت إلى الأنبياء والأولياء، ٢٠٠٨
- من اقوال الإئمة عليهم السلام، ٢٠٠٨
- نصائح الأنبياء والأولياء لأبنائهم، ٢٠٠٨
- علماء الغرب يتحدثون عن وجود عظمة رب العالمين، ٢٠٠٩
- داقووق – طاووق داغار جيغي، ٢٠٠٩
- من اقوال العبادات واخبار الصالحات، ٢٠١٠
- داقوق سوقاقلاريندە، ٢٠١٠

* محەمەد خورشید قەساب ئۆغلوو:-

- ساڵی ١٩٤٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- أدباء المهجر والثقافة التركمانية، ٢٠٠٥
- همسات، بابەتی رۆژنامەوانی، ٢٠٠٧
- قصائد مهجرية، شیعر، ٢٠٠٨
- تركمان اوكولري، ٢٠٠٨
- رحلة العمر، كورتە چیرۆك، ٢٠١٠
- قصائد وشعراء، ٢٠١٠.
- صاري كهية داستاني، شیعر، ٢٠١٢
- صاري كهية داستاني، شیعر، ٢٠١٣

* ( محەمەدی دەرماناوی گەورە - مەلا محەمەدی دەرماناوی گەورە ):-

- ناوی (مەلا محەمەدی کوری محەمەد ئەمینی کوری ئەحمەد)ە، کە ناسراوە بە (ئەحمەد قلێنج) لە عەشیرەتی (لەك)ەو لە دێی دەرماناوی گەورە.
- ساڵی (١٩٢٨) لە ناوچەی پردێ لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٣) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.
- لە (١١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٣) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد دەروێش موفتی ):-

- ناوی (محەمەد دەروێش کوری لوتفەڵلا ئەفەندی)یە.
- کاتێك باوکی کۆچی دوایی کردووە دامەزراوە بە موفتی کەرکوك‌و دوای ماوەیەك ئاوارە بووەو کراوە بە دادوەری شاری (ئورفە)و (ملاتییە)و لە ساڵی (١٩٠٧)دا لە شاری (حەما) لە دواییدا گەڕاوەتەوە کەرکوك‌و لە تۆماری دادوەری کەرکوك ساڵی (١٩٢٠)دا ئاماژە کراوە بە هاتنەوەی.
- لە حوزەیرانی ساڵی (١٩١٠)دا کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد دارتاش - سەید محەمەد دارتاش ):-

- (محەمەد بارام سەید مستەفای کاکەیی)یە.
- ساڵی (١٩٥٢) لە گەڕەکی (بلاخ) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٣) دەستی بە نووسینی شیعرو بڵاوکردنەوە کردووە.
- قۆناغی سەرەتایی وناوەندی لە کەرکوکدا بریووە.
- تا ئێستا (٦) بەرهەمی بە چاپ گەیاندووە، لەوانە:
- (یەکەم هەنگاو)، شیعر، بەغدا، ١٩٩٢.
- (چوارینەکانی سەید محەمەد دارتاش)، هەولێر.
- (یارستان)، شیعر، هەولێر.
- کركوك فولكلورندان درلەملر، ٢٠٠٦.
- سوز صوفراسی، چیرۆکی فۆلکلۆری، ٢٠٠٨.
- ارەنلری باغچەسیندان، جیمجەکلر، ٢٠٠٨.

* ( محەمەد دوزلی ):-

- ناوی (محەمەد عەبدولواحید)ە.
- ساڵی (١٩٧٢) لە شارۆچکەی خورماتوو لەدایکبووە.
- هونەرمەندی مەقام‌و گۆرانی تورکمانییە.

* ( محەمەد رەئوف-فەردی ):-

- ساڵی (١٨٨٢) لە گەڕەکی (چقور) لەدایکبووە.
- نازناوی شیعری (فەردی)و (گورکم) بووە.

* ( محەمەد رەئوف ):-

- ساڵی (١٩٤٤) لە گەڕەکی (ئاوچی) چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.
- هەر لە سەرەتای ژیانی هونەری لە مزگەوت وتەکیەکانی کەرکوك فێری مەقامی ووتنی تورکمانی بووە.
- ساڵی (١٩٦٢) چووەتە ئێستگەی بەغدا گۆرانی تورکمانی تۆمار کردووە هەر لەوێ چاوی بە هونەمەندی گەورە (عەلی مەردان) کەوتووە.

* ( محەمەد رەئوف کەرکوکی ):-

- ناوی (محەمەد رەئوف ساڵح نازناوی هونەری محەمەد رەئوف کەرکوکی)یە.
- ساڵی (١٩٥٦) لە گەڕەکی (بەرتەکیە) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتای هونەری دەگەڕێتەوە بۆ ئاهەنگی قوتابخانەکان، یەکەم گۆرانی بۆ تەلەفزیۆن تۆمار کردووە بە ناوی (شەوانە) لە ئاوازو مۆسیقای مامۆستا (نوری برایم جاف).

- هەر لە ساڵی (١٩٩١)وە زیاتر لە (٥٠) بەرهەمی گۆرانی تۆمار کردووە.

*** ( محەمەد ڕەزا ئەمین ):-**

- ساڵی (١٩٤٢) لەدایکبووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و خولی پەروەردەی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- فێری کەمان بووە لای مامۆستایان: قادر مەردان، ویدمەن، جۆرج، توانی بگاتە تیپی مۆسیقای سلێمانی و ئامێری عودی لێ دەدا.
- دەنگی زۆر خۆش بوو بەڵام گۆرانی نەوت بۆ ئێستگەو تەلەفزیۆن.

*** ( محەمەد ڕەفیق خادم سوجادە ):-**

- (محەمەد ڕەفیق کوڕی حاجی ئەمین کوڕی مەلا محەمەد کوڕی مەلا سەعدی خادم سوجادە)یە.

- ساڵی (١٨٦٩) لە کۆیە لەدایکبووە.
- ماوەیەك ئەندام بووە لە دادگای کەرکوك لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییدا.
- ساڵانی (١٩٢٥-١٩٢٨) هەڵبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك.
- شیعری هەیە بە زمانی عەرەبی و تورکی و کوردی و فارسی.
- ساڵی (١٩٣٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( محەمەد ڕەمەزان عەبدوڵڵا - دکتۆر محەمەد ڕەمەزان عەبدوڵڵا ):-**

- ساڵی (١٩٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- بڕوانامەی ماستەرو دکتۆرای لە (ئەزهەر) لە میسر تەواو کرووە.
- یەکێك بووە لەو بێژەرانەی بەشی کوردی ڕادیۆی قاهیرە کە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٧-١٩٦٨) کاری کردووە، بەڵام ناوبراو لەنێوان ساڵانی (١٩٦١-١٩٦٨) وەکو بێژەر لەو ڕادیۆیە بووە لەگەڵ د. فوئاد مەعسووم، عەبدوڵڵا مارف، عوسمان ئۆغەرانی.
- ساڵی (١٩٧٦) بووە بە مامۆستا لە کۆلێژی (ئیمام ئەلئەعزەم) لە بەغدا.
- بیست ساڵ ڕاگری کۆلێژی شەریعەی بەغدا بووە.
- بەرهەمەکانی:
- (الباقلاني وآراءه الكلامية)، نامەی دکتۆرا، چاپخانەی (الأمة)، بەغدا، ١٩٨٦.
- (البصرة ودورها في نشأة علم الكلام).
- (علم المنطق)، بەغدا، ١٩٩٢.
- (مقولات ارسطو بين الفلاسفة والمتكلمين).
- لە ڕۆژی (٢٦)ی ئایاری ساڵی (٢٠١٤)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد رامز یەعقوبی زادە ):-

- ساڵی (١٨٩٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ناوی (محەمەد کوڕی رامز کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ساڵح یەعقوبی)یە.
- یەکێکە لە شاعیرو نووسەرەکانی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٣٩) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەدی رۆستەم جاف - حاجی محەمەد رۆستەم جاف ):-

- ناوی (حاجی محەمەدی رۆستەم جاف)ە، کە لە تیرەی (رۆغزایی)یە.
- ساڵی (١٩٢٧) لە کەلاری کۆن هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (١٩٣٣) قوتابخانەی سەرەتایی لە کەلاری کۆن تەواو کردووە.
- لە سەرەتای چلەکان هاتووەتە ریزی حیزبی هیواوە تا ساڵی (١٩٤٥) لەو حیزبەدا کاری کردووە.
- پیاوێکی ئازاو خەباتکاری سەردەمی خۆی بووە، لە پاڵ توانای سیاسیدا شاعیرێکی بە توانایش بووە.
- لە (٢٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

* محەمەد زەنگەنە :-

- ئەم شاعیرەمان ژیان و بەسەرهاتی ئاڵۆزە، هەندێك لە ئەدەبدۆستان بە برای ئەحمەد بەگی زەنگەنە و بەشێکیان بە ئامۆزای یان مامی لە قەڵەمی دەدەن.
- لەلایەن (مەلا جەمیل)ەوە ئەم شاعیرە بە غەمناکی گەورە ناسراوە و نازناوی زەبوونیشی داوەتە پاڵی و ئاماژەی بە هیچ سەرچاوەیەکیش نەکردووە، بەڵام تەنها سەرچاوەی باوەرپێکراو تا ئێستا رەنجوورییە، کە نە نازناوی غەمناکی داوەتە پاڵی زەبوونیشی بە شاعیرێکی دیکە ناساندووە.

* ( محەمەدی زەنگەنە-رەنجوورە-رەنجووری شێخانی ):-

- ناوی (محەمەد کوڕی یوسفی زەنگەنە)یە، نازناوی هۆنراوەیی (رەنجوورە)و بە (رەنجووری شێخانی) بە ناوبانگە.
- ساڵی (١٨١٤) لە دەوروبەری کەرکوك لەدایکبووە.
- لە زۆربەی مەڵبەندەکانی کوردستان گەڕاوە بە دوای خوێندن بە تایبەتی لە شاری سلێمانی.
- رەنجووری بە یەکێ لە هۆنەرانی کورد دێتە ژمارەو ئەو لە هۆنینەوەی هۆنراودا دەستێکی باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ تەرو پاراو شیرینن.
- لە دوا تەمەنیدا بەرەو حیجاز کۆچی کردووەو زیارەتی مزگەوتی پێغەمبەری کردووە.
- ساڵی (١٨٨٢)لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد سەعید ئەفەندی بارانی ):-

- ناوی (محەمەد سەعید ئەحمەد بارانی)یە.
- یەکێکە لە ئەفسەرە کوردەکانی سوپای عوسمانی.

* محەمەد سەعید - محەمەد باوایی:-

- خەڵکی گوندی باوای قەرەحەسەنە.
- ساڵی ١٩٨٤ بووە بە پێشمەرگە لە کەرتی چواری جەباری.
- لە راپەرینی ساڵی ١٩٩١ لە کاتی رزگارکردنی شاری کەرکوك لە گەرەکی راپەرینی لەگەڵ شەهید عەلی تەپەلوو شەهید کرا.

* ( محەمەد سەعید بەرزنجی ):-

- ناوی (مەلا سەید محەمەد سەید سەعید بەرزنجی).
- ساڵی (١٨٩٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٠) کۆچی دوایی کردووە.
- گەلێك بەرهەمی دەستنووسی هەیە لەوانە:
- (مناقبات ولي الله الباري الشيخ حسن القرەچیواري).
- (عیوب النفس).
- (فتح البصائر في معرفة كلمات الكفر والكبائر).
- (تنوير الضمير في معجزات البشير النذير).
- (غزوة بدر الكبرى).
- (غزوات الاحد والخندق وفتح مكة وسائر فتوحات النبي).
- (كشكول الاخيار في مناقب الاخيار).
- (خوارق الشيخ عبد القادر الگيلاني).
- (خوارق شيخنا الحاج كاك احمد البرزنجي).
- (رسالة في تجويد القرآن الكريم).
- (مجالس الموعظة ومناقبات خلفاء الراشدين).
- (جمع وإقتطاف ٢٥٠٠ حديث نبوي).
- (الادعية والاوراد المختارة).

* ( محەمەد سەعید جاف-حەمە سەعید بەگی جاف ):-

- ناوی (محەمەد سەعید کوڕی محەمەد بەگی جاف)و.
- ساڵی (١٩٢٦)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.

- ئەدیب و نووسەرو سیاسەتمەدارێكی كورد بووەو لە زمانی كوردیی و عەرەبیی و توركیی و فارسیدا لێزان بووەو گەلێك كتێبی چاپكراوی بە زمانی كوردی هەیە، بابەت و لێكۆڵینەوەكانی لە گۆڤاری (گەلاوێژ)و (هیوا)و رۆژنامەی (التآخي)و (برایەتی) بڵاوكردووەتەوە.
- هەر لە گەنجییەوە ئارەزووی كۆكردنەوەی كتێب و كتێبخانەی دەبێت، تا دەبێتە خاوەنی دەوڵەمەندترین كتێبخانە لە گەرمیاندا، لە چلەكاندا دەبێتە ئەندامی حیزبی (هیوا).
- ماوەیەك راوێژكاری سەرۆك كۆماری عێراق بووە.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی: (ئاوارە) لە دوو بەرگدا.
- لە (٢٤) ئاداری ساڵی (١٩٩٦) كۆچی دوایی كردووە.

*** ( محەمەد سەعید زەنگەنە ):-**

- ساڵی (١٩٥٧) لە شاری كەركوك لەدایكبووە.
- سەدان گوتارو راپۆرت و ریپۆرتاژو بە دواداچوونەوەی رۆژنامەوانی لە گۆڤارو رۆژنامەكاندا بە ناوی خۆی و ناوی خوازراوەوە بڵاوكردووەتەوە.
- جێگری لقی كەركوكی یەكێتیی نووسەرانی كورد بووە.
- ئەندامی ئەنجوومەنی دەزگای رۆشنبیری (شەفەق) بووە.
- ئەندامی دەستەی نووسەران و بەڕێوەبەری نووسین و جێگری سەرنووسەری گۆڤاری (نەوشەفەق) كاری كردووە.
- لە ژمارەكانی (٦٥-١٢٤) بەڕێوەبەری نووسینی رۆژنامەی (باسەرە) بووە.
- لە ژمارە (٣)ەوە تا دوا ژمارەی رۆژنامەی (ئافریدە) بەڕێوەبەری نووسین بووە بە ناوی خوازراوی (كۆژان كەركوكی)، ئەم رۆژنامەیەش ئەنجوومەنی پارێزگای كەركوك /یەكێتی ئافرەتانی كوردستان دەریكردووە.
- لە ژمارە (٢٤) تا ژمارە (٧٩) سەرنووسەری گۆڤاری (منداڵانی باوەگوڕگوڕ) بووە.
- لە ژمارە (١)ەوە تا ژمارە (٣٢)و كۆتایی سەرنووسەری گۆڤاری (حاجیلە)ی منداڵان بووە.
- سەرنووسەری رۆژنامەی (نوگرە سەلمان)ە.
- ئەندامی دەستەی نووسەرنی گۆڤاری (تۆیژاوە)یە.
- سەرنووسەری رۆژنامەی (سێبەر)ە.
- جێگری سەرۆكی لقی كەركوكی (یەكێتی نووسەرانی كورد)ە.
- سكرتێری (كۆمەڵەی هونەرو وێژەی لقی كەركوك)ە.
- ئەندامی دەستەی كارگێڕی نووسینگەی رێكخراوی چاودێری كوردۆساید (چاك)ە.
- بەرپرسی رێكخراوی (یەسنا)یە بۆ بە دیكۆمێنت كردنی گەلكوژی كوردان.
- ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیاندووە:
- (پرسیارە نەزۆكەكان)، كۆچیرۆك، هاوبەش، كەركوك، ٢٠٠٠.
- (ژوانێكی لە یادكراو)، شیعر، دوو بەشە، بەشی دووەمی تەرخان كراوە بۆ شیعری منداڵان، كەركوك، ٢٠٠١.
- (ئاوێزە/١، لە ئاوایی كۆوارە)، ٥١ نووسەری گەرمیان بەشدارییان كردووە، كەركوك، ٢٠٠١.
- (ئاوێزە/٢)، ئامادەكردن، كەركوك ٢٠٠٢.
- (زەردەمار)، نۆڤلێت، چاپی یەكەم، كەركوك، ٢٠٠٢، چاپی دووەم، كەركوك، ٢٠٠٥.
- (ئەنفالستان)، ئامادەكردن، ٢٠٠٥.
- (چاوبركێی سەر زورگەكان)، كۆچیرۆك، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (كۆڤانی دەنگ بە دەسەڵاتی كوردی ئادات)، كەركوك، ٢٠٠٦.
- (الصل)، وەرگێڕانی عەلی بەرزنجی، كەركوك، ٢٠٠٧.
- (غمزات علی مشارف التلال)، وەرگێڕانی كۆمەڵێك وەرگێڕ، كەركوك، ٢٠٠٨.
- (بیبلۆگرافیای ١٠٠ كتێبی لقی كەركوكی یەكێتی نووسەرانی كورد)، كەركوك، (٢٠٠٩).
- (حیزبە فرە جەماوەرەكەی گوڵاباخ)، كۆچیرۆك، كەركوك، ٢٠١٠.
- (١١١ نامەی عاشقانە)، كۆمەڵێك نامەی عاشقانەی مەم و زینەكانی شاری كەركوك، كۆكردنەوەو هەڵەبڕی و پێداچوونەوە، ٢٠١١.
- (حیزب گوڵەباخ الجماهیری) وەرگێڕانی عەوف عەبدولرەحمان، ٢٠١٣.
- (پۆڕپۆرەیتی كەركوكیان) بەرگی یەكەم، ٢٠١٣.
- (الصل، الحیة الصفراء)، وەرگێڕانی لە كوردییە: عەلی بەرزنجی، ٢٠١٤.
- بەم ناوانە بەرهەم بڵاودەكاتەوە:
حەمە سەعید زەنگەنە، م. س زەنگەنە، حەمە تاڵ، شوان محەمەد زەنگەنە، زەردەشتی، عەلی زەردەشتی، قشڵاخی، دڵگوڵ، شەن، دڵوڤان گەرمیانی، كۆژان كەركوكی.

*** محەمەد سەعید سۆفی:-**

- بەرهەمە چاپكراوەكانی:-
- (پارێزگای كەركوك لەناو پاكتاوكردنی رەگەزیدا)، سلێمانی، ٢٠٠٣.

*** ( محەمەد سەعید فطرت ):-**

- محەمەد سەعید كوری مەلا مستەفا ئەفەندی كوری محەمەد ئەفەندی بووە، محەمەد سەعید ناوی خۆیەتی و نازناوی

شیعری (فطرت) بووە.
- ساڵی (١٨٥٤)دا لە کەرکوك لەدایکبووە.
- باوکی وەکی خۆی زانای سەردەمی خۆی بووە.
- دەرسی داوەتەوە لە قوتابخانەی (شاغازی) لە ئەستەمبوڵ و لە دوای گەڕانەوەی کراوە بە دادوەری لێکۆڵینەوە لە کەرکوك و داواکاری گشتی لە سلێمانی و دادوەری تاوان لە کەربەلا.
- ساڵی (١٩٠٦)دا لە ئەستەمبوڵ کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد سەعید موفتی - مەلا محەمەد سەعید موفتی ):-

- ناوی (مەلا محەمەد کوڕی سەعید موفتی سوەیلی)یە.
- ساڵی (١٨٥٨) لە گوندی (بێوەری) ناوچەی (سوەیلی شارباژێر) لەدایکبووە.
- گەلێك لە ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێر و پێنجوێن و کفری گەڕاوە بۆ فێربوونی زانستی ئایینی و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٠٨)دا لەلایەن ئەستەمبوڵەوە کراوە بە قازی و موفتی شاری کفری.
- ئەندامی ڕێخراوی (ئازادی کوردستان) بووە لە شاری کفری.
- تا ئێستا زیاتر لە (٢٠) کەشکۆڵی دەسنووسی لێ بەجێماوە.
- ساڵی (١٩٤١) کۆچی دوایی کردووە و لە کفری نێژراوە.

* ( محەمەد سەعید وەنداوی ):-

- (محەمەد سەعید کوڕی حاجی حوسێن وەنداوی)یە.
- ساڵی (١٨٨٩) لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٢١) بووەتە سەرۆکی شارەوانی کفری.
- ساڵی (١٩٢٥) بووەتە نائیبی لیوای کەرکوك.
- ساڵانی (١٩٢٨-١٩٣٠) بووەتە نائیبی لیوای کەرکوك.
- ساڵی (١٩٣٠ لەگەڵ نۆ نێردراوی کوردیی بۆ بەغدا، داوایان لە مەندوبی سامی بەریتانیا کردووە بۆ کردنەوەی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کوردستان بە زمانی کوردی لە شاری کەرکوك.
- لە (٢)ی نیسانی ساڵی (١٩٥٤) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد سەید ):-

- ناوی (محەمەد عەلی سەید)ە.
- ساڵی (١٩٦٤) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٨٤) تا ساڵی (٢٠٠٢) لە بواری شانۆ وەك ئەکتەر و دەرهێنەر و ئامادەکاری دەقی شانۆیی کاری کردووە لە ڕێگای کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لقی چەمچەماڵ و مەڵبەندی ڕۆشنبیری چەمچەماڵەوە لەو ماوەیەدا.
- زیاتر لە (١٥) کاری شانۆییدا بەشدار بووە، زۆربەی وەك دەرهێنەر.
- ساڵی (١٩٩١) وەك دەرهێنەر کاری کردووە.
- ساڵی (١٩٩٥) دەستی بە کاری فلیمی دیکۆمێنتکاری و کورتە فلیم داوە.
- ساڵی (١٩٩٨)ەوە و بۆ ماوەی چوار ساڵی سەرۆکی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی چەمچەماڵ و لێپرسراوی مەڵبەندی ڕۆشنبیری چەمچەماڵ بووە.
- لە دوای ساڵی (٢٠٠٣) وەك دەرهێنەر و ئامادەکار لە کاری بەرنامە و دراما و فیلمی دۆکیۆمێنتاری کاری لە تەلەفزیۆنی کەرکوك کاری کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٥) لە بواری فیلمسازیدا کاری کردووە وەك سیناریست و دەرهێنەر و (٥) کورتە فیلمی بەرهەمهێناوە و هەموویان جگە لە (باوە گورگور) بەشداری فیستیڤاڵی سلێمانی و هەولێریان کردووە، ئەوانەش:
- (شەوبۆ)، ٢٠٠٥.
- (تۆوی گوڵ)، ٢٠٠٧.
- (لە کەناری خاسەوە)، ٢٠٠٨.
- (ماچی ئێسکەکان)، ٢٠١٠.
- (باوە گورگور)، ٢٠١٢.
- زیاتر لە (١٤) فیلمی دۆکیۆمێنتاریی بەرهەمهێناوە و لە کەناڵی ئاسمانی کەرکوك پەخشکراوە و چەند بەرهەمێکیشیان لە فیستیڤاڵەکاندا بەشدار بووە، ئەوانەش:
- (ئەنفال زامێکی بەردەوام).
- (ئەنفال ئەڵقەی بوکێنی فراند).
- (ئیڤا).
- (کوا ئەنفالەکان؟).
- (ڕێگا).
- (پەپوولە ئەنفال کراوەکان).
- (دیمەنێك لە گەرمیانەوە).
- (مێژووی شانۆی کەرکوك).
- (سینەماکانی کەرکوك).
- (لێرە کات خولەکێك بەر لە مەرگ)، تایبەتە بە قوربانیانی دەستی تیرۆر.
- (نوگرە سەلمان).
- (دایکێکی وشیار).
- (جەلەمۆرد تراژیدیاترین تاوانی ئەنفال).
- بەرهەمهێنانی چەندین کاری درامی بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك، وەك:
- (فرمێسکەکانی نەسین)، کە بریتی بوو لە (٨) ئەڵقە لە ساڵی (٢٠٠٧).
- بەشی دووەمی درامای (فرمێسکەکانی نەسین) کە بریتی بووە لە (١٠) ئەڵقە لە ساڵی (٢٠٠٨).
- ساڵی ٢٠١٧ شانۆی تابوتێك لە ئومێد نواندن و دەرهێنان

* ( محەمەد سابیر مەحموود ):-

- لە شارۆچکەی چەمچەماڵ ساڵی (١٩٣٢) چاوی بەژیان هەڵهێناوە.
- ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣) پاش تەواوکردنی قوتابخانەی ئامادەیی بەشی ئەدەبی لە کۆلێژی (دار المعلمین العالیة) لە بەغدا وەرگیراوە و ساڵی (١٩٥٦) بەشی زمان و ئەدەبی عەرەبی تەواو کردووە و بروانامەی بەکالۆریۆسی وەرگرتووە.
- پتر لە ٢٥ ساڵی لە قوتابخانەکانی ناوەندی و ئامادەیی و (دار المعلمین)ی سەرەتایی، مامۆستایی و بەڕێوەبەرایەتی ئەنجام داوە و پاشان لەسەر داواکاری خۆی ساڵی (١٩٨٤) خانەنشین کراوە.
- هەر لە تاق لاوییەوە کە قوتابی بووە خولیای شیعر و ئەدەب بووە بەرهەمی هەمە جۆری لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمەکانی:

- (ئاوازەکانی دلّم)، کۆمەڵە شیعرێکی تورکمانیە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیو سالّی (٢٠٠٢) لە چاپ دراوە.
- (قەرەجانی گۆرانی)، هانزیگون فویکت، وەرگێڕان.
- (عشرون قصة کردیة)، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٥.
- (الارجوان-قصص کردیة معاصرة)، وەرگێڕان، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٨٩، چاپی دووەم کەرکوك ٢٠٠٧.
- (ولي دیوانه وشم -مسرحیة محمد عبد الرحمن زنکنه)، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٩٠.
- (زایەڵەی کۆچ)، شیعر، چاپی یەکەم، کەرکوك، ٢٠٠١، چاپی دووەم، ٢٠٠٨.
- (بنەماڵەکانی ڕەخنەی ئەدەبی)، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (ئاوازەکانی دلّم)، دیوانی شاعیری تورکمانی سامی یوسف تووتنچی، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (مسرحیة الدرویش ولي وشم-محمد عبد الرحمن زنکنه)، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٣.
- (لم یبقی ثمة من صحراء شرسة سوی المراة-معلقة لطیف هلمت)، وەرگێڕان لە کوردییەوە، کەرکوك، ٢٠٠٤.
- (بەسەرهاتی کەوە بۆر)، چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (یاریزانی شەترەنج)، ڕۆمان، ستیڤان زفایج، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (رماد او حکایات مع الذات)، کۆمەڵە شیعر، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (قطوف-قصائد مختارة من الشعر الکردي المعاصر)، وەرگێڕان، کەرکوك، (٢٠٠٨).
- (المتاهة-قصص کردیة لـ(سالار اسماعیل سمین)، وەرگێڕان، کەرکوك، (٢٠٠٨).
- (پەیامێك لەبارەی)، جۆن لۆك، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٨.
- (گۆرانی، وەرگێڕان)، کەرکوك، ٢٠٠٩.
- (مسرحیة بیفین)، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- زۆر بەرهەمی تری هەیە، تا ئێستا چاوەڕێی لە چاپدان دەکەن.
- لە ٢٨ی ئاداری ساڵی ٢٠١٥ کۆچ دوایی کردووە.

*** ( محەمەد سادق ):-**

- ناوی محەمەد سادق کوڕی حەسەنە، لە ناوخەڵکدا بە (مەلا سادق) بەناوبانگە بووە.
- لە هەندێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لێکۆڵینەوەمان دەربارەی ژیانی کەمە.

*** ( محەمەد سادق کەرکوکی ):-**

- ساڵی (١٨٩١) لە کەرکوك لە گەڕەکی بەگلەر لەدایکبووە باوکی بە بنەچە خەڵکی تورکیایە، ناوی (حوسێن عونی) یە.
- بەڵام هەندێك سەرچاوە وەکو کتێبی (إعلام الترکمان والأدب الترکي في العراق الحدیث)ی (میر بصری) سالی (١٨٨٦)ی بە سالی لەدایکبوونی داناوە.
- سەرەتای خوێندنی لە قوتابخانەی (الرشیدیة) تەواو کردووە کە لە دوایدا ناوی بووەتە (طوب قاب اوتولو) کە لە لای مامۆستا عەلی حکمت ئەفەندی فێری زانستی (النحو والصرف والمنطق) بووە.
- لە ماوەی شەڕدا سێ جار بریندارێکی کوشندەبووە، کە ئەمە وای کردووە ببێتە کەمی تەمەنی.
- لە ژیانیدا ئەفسەر بووەو دەرچووی (المدرسة العسکریة) بووەو لە (شام)و (حلب) و(بیروت) دا بەشداری کردووە کە دواکاری لە گەمارۆی شاری کوتدا بەشدار بووە کە لەوێ بۆ ماوەی دوو ساڵ جەنگاوە.
- لە ماوەی ژیانی شەڕدا دیوانێکی بە چاپ گەیاندووە بە ناوی (یادیگا سفریر).

– دوای ئەوەی لە شەر گەڕاوەتەوە چووەتە خوێندن لە قوتابخانەی سەرەتایی دەست بە وانە ووتنەوە دەکات لە قوتابخانەی (مدرسة الرشدیة) بەلام لە دوایدا بە بێ تاوان دەردەکرێت لە خوێندن.
– ماوەی دە ساڵ لە عومەری بەسەر بردووە لە خوێندن لەنێوان کەرکوك و خورماتوو قەرەتەپەو بەعقوبە.
– شاعیر بابەتە شیعرییەکانی لە (الغزل والمراثي) نووسیوەو بلاویکردووەتەوەو بە سێ زمانی تورکی وفارسی وعەرەبی.
– ئەم شاعیرەمان لەو بەرهەمە ئەدەبییانەی کە بۆمان بەجێماوە، کەوتۆتە ژێر کاریگەری هەریەکە لە (فضولي) و (نظمي)و (نابي)و (ابي الطيب المتنبي)، هەروەها بەکارهێنانی ووشەی فارسی وعەرەبی لە نووسینەکانی بەرچاوەدەکەوێت.
– شاعیر یەکێکە لەوانەی کە پەیڕەوی شیعری کلاسیکی و شاعیرە کلاسیکییەکانی کردووە.
– ئەگەر چاو بە بەرهەمەکانی بخشێنن دەبینن کە دەکرێتە دوو بەشەوە بەشێکی وانەیە کە بلاوبووەتەوە بەشێکی ئەوانەی ترە کە تاکو ئێستاکە دەستنووسە.
* بەرهەمە چاپکراوەکانی بریتییە لە:
– (مذكرات عن الحرب العالمية الاولى)، (یادگار سفریی)، بە قەبارەی ٥٠٠ لاپەرە، لە ساڵی (١٩٢٥) لە چاپ دراوە.
– (گلستان كربلاء)، بە فارسی، لە ساڵی (١٩٢٥) بە قەبارەی ٨٠ لاپەرە، بەقەبارەی مام ناوەندی.
– (تاملاتی)، بە تورکمانی، لە ساڵی (١٩٥٦) چاپکراوە لە ٦٨ لاپەرەی قەبارەی مام ناوەندی.
– (دوشونجەلرم)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار المعرفه)، بەغدا، ١٩٥٦.
– (چوشتون دویغولرم)، لە ساڵی (١٩٦٤ بەچاپ گەیاندراوە، لە ١٤٤ لاپەرەی قەبارەی مام ناوەندی لە چاپخانەی شارەوانی کەرکوك چاپکراوە.
– (Muhammet Sadik'tan secmeler)، بە زمانی تورکی، ئەستەمبول، ١٩٩١.
* بەلام بەرهەمە دەستنووسەکانی بریتییە لە:
– مللی دویوغلرم.
– کرکوك شهداسنی (فریادلرم) لە قەوارەی ١٠٠ لاپەرە دایە.
– (مدحیات اشراف لكركوك) لە ٣٠٠ لاپەرە دایە.
– مرثية (رثاء).
– بهادیله فخر للرم.
– اوتوم بومبالری (القنابل الذرية).
– لەگەل نزیکەی ١٠٠٠ شیعری خۆریات.
– ساڵی (١٩٦٧) کۆچی دوایی کردووە.

* ( **محەمەد ساڵح** ):–

– ناوی (محەمەد ساڵح کوڕی حاجی عومەر گونبەدی کوڕی مەلا ساڵح کوڕی مەلا عەبدوللا کوڕی حاجی مەلا ئیبراهیم کوڕی مەلا ئەبو بەکر کوڕی مەلا نورەددین کوڕی مەلا ئیبراهیم کوڕی مەلا ئەبی بەکر کوڕی مەلا نورەددین کوڕی مەلا هاشم کوڕی جومعە)یە.
– ساڵی (١٩٢٥) لە کەرکوك لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
– قورئانی پیرۆزی لە مزگەوتی (دلی باش) لای مامۆستای مەلا ڕەفیق و خانەقا (عومەر گونبەدی) تەواو کردووە.
– پلەی (سوختەیی) لە ساڵی (١٩٥٨)دا لە لای (سەعدوللای ئەلسەغیر) خوێندووە.
– ساڵانی (١٩٤٠–١٩٤١) بۆ ماوەی شەش ساڵ خوێندنی تەواو کردووە لە (المدرسة العلمية الدينية المنظمة في كركوك).
– لە (١٠)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٥) خوێندنی تەواو کردووە لە (المدرسة الدينية الملحقة بالمعابد).
– لە دواییدا ڕۆیشتووە بۆ قاهیرەو لە زانکۆی ئەزهەر وەرگیراوە لە (معهد البحوث الإسلامية) لە ساڵی (١٩٥٥) تا لە ساڵی (١٩٥٨) ئەو کۆلێژەی تەواو کردووە.
– ساڵی (١٩٦١) کۆلێژی شەریعەی لە بەغدا تەواو کردووە.
– لە (٣٠)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١) دامەزراوە بە مامۆستا لە ناوەندی داقوق.
– لە دواییدا لە (٢٠)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٥) گواززاوەتەوە بۆ دواناوەندی ئیمام قاسمی کوڕان.
– لە (٤)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٦) گواززاوەتەوە بۆ ناوەندی شرقیەیی کوڕان.
– لە (١٥)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٤) گواززاوەتەوە بۆناوەندی شۆڕش.
– ساڵی (١٩٧٧) گواززاوەتەوە بۆ ناوەندی عەبدولرەحمانی غافقی کوڕان.
– لە (٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٨) گواززاوەتەوە بۆ (المعهد الإسلامي في كركوك).
– لە (١)ی تەمموزی ساڵی (١٩٨٢) خانەنشین کراوە.

* ( **محەمەد ساڵح ئاغای داوودی** ):–

– ساڵی (١٩٠٢) لە گوندی دووراجی لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٤١) لەگەل ٣٥ خوێندکاردا خوێندنی ئایینی لەلای مەلا کاکە حەمە خوێندووە.
– لە ناوەڕاستی چلەکاندا بەشداری شۆڕش دەکات.
– لە (٢٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

* ( **محەمەد ساڵح–ئاسف زادە** ):–

– ناوی (مەلا محەمەد ساڵح ئاسف زادە کەرکوکی)یە.
– ساڵی (١٧٥٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– لە گەلێك لە مزگەوتەکانی کەرکوك ئیمام و خەیب بووەو لەسەر مەزهەبی شافیعی بووە.
– ساڵی (١٨٢١) کۆچی دوایی کردووە.
– یەکێکە لە زاناو ئەدیبەکانی شاری کەرکوکەو دیوانێکی شیعری لێ بە جێماوە.

* ( **محەمەد ساڵح–حەمە غەزال** ):–

– مەقام زانێکی ناوچەی خورماتوو بووە.
– مامی باوکی ئەحمەد فەرەجی مەقام زان بووە.

* ( **محەمەد ساڵح–سەید** ):–

– ناوی (محەمەد ساڵح کوڕی سەید عەبدولغەنی)یەو لە

خێزانی نەقیب زادەکانە.
– گەلێك شیعری هەیە بە زمانی تورکمانیی و نازناوی شیعری (سەید)ە.
– ئیمام و خوتبەخوێنی مزگەوتی نەبی دانیال بووە لەسەر قەلا.
– سالی (١٨٦٣) کۆچی دوایی کردووە لە قەبرسانی مزگەوتەکە نێژراوە.

* ( محەمەد سالەیی ):-

– سالی (١٩٦٢) لە کەرکوك هاتووەتە دنیاوە، خوێندنی لە شاری کەرکوك تەواو کردووە.
– لە زانکۆی سەلاحەددین، بەشی کشتوکالی تەواو کردووە.
– بەشداری گەلێك پێشانگای کردووە لە کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و لە دەرەوەیش بەشداری کردووە.
– گەلێك کاریکاتێری بلاوکردووەتەوە لە رۆژنامەی (هاوکاری) و گۆڤاری (رەنگین).
– محەمەد سالەیی لەهونەردا بەجارێك دوو رێچکەی جیاوازی گرتووە هونەری شێوەکاری نیگار کێشان و هونەری کاریکاتێر.
– ئێستا لە تەراوگە دەژێت.
– سالی (١٩٨٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کردووە لە هۆلی مۆزەخانەی سلێمانی.

* ( محەمەد شاکەلی - شێخ محەمەد شاکەلی ):-

– ناوی (محەمەد ئەحمەد محەمەد سەعید شاکەلی)یە.
– سالی (١٩٤٤) لە شارەدێی کەلار لەدایکبووە.
– سالی (١٩٥٤) مالیان گواستییەوە بۆ گوندی شاکەلی بەلام لەبەر نەبوونی خوێندنگە لەو گوندە. ناچار بوو رۆژانە بۆ خوێندن بچێ بۆ کەلار.
– سالی (١٩٥٦) بۆ خوێندنی ناوەندی، چوو بۆ شاری کفری.
– سەرەتایی لە کەلار و ناوەندی لە کفری و ئامادەیی لە کەرکوك خوێندووە.
– سالی (١٩٥٩) رووی لە کەرکوك کرد تا لەوێ دەست بە خوێندنی ئامادەیی بکا و هەر ئەو سالە لەوێ پەیوەندیی بە یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە کردو دواتریش بوو بە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان.
– سالی (١٩٦١) لە پەیمانگای مامۆستایانی کەرکوك وەرگیراوە، لە سالی (١٩٦٣) بە مامۆستا دامەزراوە.
– لەم قۆناغەی ژیانیدا دەستی بەکاری رێکخراوەیی کردو لەم سەروبەندەدا لێپرسراوەتیی چەند شانەیەکی لە کفری و گوندی کارێز گرتە ئەستۆ.
– هەر لە سەردەمی خوێندکارییەوە پەیوەندی بە یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە کردووە، دواتر لە رێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کردستان رێکخراوە.
– سالی (١٩٦٣) خوێندنی تەواو کردو بە مامۆستا دامەزرا. هەر ئەو سالە، پاش هێرشی درندانەی رژێمی بەعس بۆ سەر کوردستان و زیادبوونی گوشار لەسەر رێکخستنە نهێنییەکان، پەیوەندیی بە شۆرشەوە کردو وەك پێشمەرگە بەشدار بوو لە بزاڤی بەرگری لەناوچەی کفری.
– سالی (١٩٦٤) پاش راگەیاندنی ئاگربر لەنێوان شۆرش و حکومەتی عەبدولسلام عارف، بریار درا کارمەندان و مامۆستایانی شۆرش بگەرێنەوە سەر ئیشوکاری خۆیان لە شارەکان. ئەویش بەپێی ئەم بریارە گەرایەوە سەر پیشەی مامۆستایاتی.
– سالی (١٩٦٧) چووە ریزی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستانەوەو دواتریش پەیوەندیی بەبالی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد.
– سالی (١٩٧٤) لەگەل دەستپێکردنەوەی شەر لەنێوان کوردو رژێمی بەعس، پەیوەندیی بە شۆرشەوە کردو لەناو پارتی دیموکراتی کوردستاندا لێپرسراوەتیی رێکخستنی ناوچەی کفریی پێ سپێردرا.
– دوابەدوای بلاوبوونەوەی هەوالی رێککەوتنی عێراق و ئێران لە جەزایر لە ئازاری سالی (١٩٧٥) و تەشەنە سەندنی واتەواتی بلاوە پێکردنی پێشمەرگە، لەگەل چەندین کادیردا سەردانی بەرپرسی لقی ٥ی پارتیی کردو ئامادەیی تەواوی خۆی و کادیرەکان و (٧٠٠) پێشمەرگەی بەتالیۆنی کفری و دووزی بۆ بەرگری و درێژەدان بە شۆرش نیشاندا، بەلام بەرپرسی لق پێشنیارەکەی بەهەند وەرنەگرت و بلاوەی بە پێشمەرگەکان کرد. پاش بێئومێدبوون لە بەردەوامبوونی شۆرش، وازی لە هەولە ناکامەکانی هێناو چووە سەر ژیانی ئاسایی خۆی، بەلام زۆری نەبرد بۆ دیوانیە دوور خرایەوەو هەر ئەو سالە، پاش دامەزراندنی بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان، لەناو ئەم رێکخراوە دەستی بەخەباتی ژێرزەمینی کرد.
– سالی (١٩٧٩) پاش دەستگیرکردنی عەلی هەژار و کاردۆ گەلالی کە هەردووکیان دوو بەرپرسی چالاکی رێکخستنەکانی ناو شاری بزووتنەوەی سۆشیالیست بوون، ژمارەیەك لەبەرپرسانی کۆمیتەی رێکخستنی شارەکان ناچار بوون شارەکان بەجێ بێلن و پەیوەندی بە شۆرشەوە بکەن. بەهۆی ئەمەوە بەشێکی زۆری ئەرکی رێکخستنەکان کەوتە ئەستۆی شاکەلی.
– لە کۆنگرەی یەکەمی حیزبی سۆسیالیست کە لە ئایاری سالی (١٩٨١) لە دۆلەتوو بەسترا، بەشێوەیەکی نهێنی بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەلبژێردرا.
– دوای تیرۆرکردنی سالح یوسفی، سکرتێری حیزبی سۆسیالیست، لەبەغدا لە ٢٥ی حوزەیرانی سالی (١٩٨١)، لێپرسراوەتیی هەموو رێکخستنەکانی کەوتە سەر شان. لەم قۆناغەدا ئەرکێکی زۆر قورسی گرتە ئەستۆ چونکە دەزگا

ئەمنییەکانی رژێمی بەعس پاش تیرۆرکردنی یوسفی، هەموو هەوڵەکانیان بۆ ئەوە تەرخان کردبوو کە رێکخستنە نهێنییەکانی حیزبی سۆسیالیست ئاشکرا بکەن. ساڵی دواتر، سەرکردایەتیی حیزب فشارێکی زۆری خستە سەر تا شار بەجێ بێلێ‌و پەیوەندی بەشاخەوە بکا چونکە ترسێکی زۆر لە دووبارەبوونەوەی کارەساتی گیرانی عەلی هەژارو کاردۆ گەلاڵی‌و کارەساتی تیرۆرکردنی سالح یوسفی هەبوو. لە مانگی ئابدا شاری بەجێهێشت‌و لە بارەگای سەرکردایەتیی حیزب لە بناری چیای قەندیل گیرسایەوە.

- لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٨٣) پاش ئەوەی سەرکردایەتیی حیزب بریاریدا کۆمیتەیەکی سەرکردایەتی بۆ سلێمانی‌و کەرکوك دابمەزرێنی، لەگەڵ هەر یەك لە قادر جەباری‌و محەمەد حاجی مەحموود بووە ئەندامی ئەو کۆمیتەیەو بارەگای کۆمیتەکەی لە شارەزوور دانا.

- لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٥) پشتیوانیی لە هەوڵ‌و تەقەللاکانی ئاشتبوونەوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و حیزبی سۆسیالیستی کوردستان کرد. لە کانوونی یەکەمدا لە کۆبوونەوەی کاولان، سەرکردایەتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ رێ خۆش کردن بۆ ئاشتبوونەوە.

- لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٦)دا شاندی حیزبی سۆسیالیست بەسەرۆکایەتیی ئەو و ئەندامەتیی هەر یەك لە عەبدولخالق هەورامی‌و ئامانج شاکەلی‌و محەمەد کەوچکتاشی‌و برایم گەرمیانای رووی کردە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و لە گوندی یاخسەمەر کەبارەگای تاڵەبانیی لێ بوو، چاوی بە تاڵەبانی‌و ئەندامانی تری سەرکردایەتیی یەکێتیی کەوت. ئەم سەردانە بناغەی ئاشتبوونەوەی نێوان هەردوو لای دانا‌و هەلومەرجێکی لەباری بۆ رێکخستنەوەی پەیوەندییەکانی نێوانیان فەراهەم کرد.

- لە ئایاری هەمان ساڵدا بەشدار بوو لەو شاندەی حیزبی سۆسیالیست کە لەبەر گەلوو کەوتە وتووێژ لەگەڵ شاندی یەکێتی‌و رێککەوتنی ئاشتیی لەگەڵدا ئیمزا کرد. ئەم رێککەوتنە رۆڵێکی دیاری لەهاندانی لایەنەکانی تری بەرەی جود هەبوو بۆ هەنگاونان بەرەو دەستپێکردنی پرۆسەی ئاشتبوونەوەی گشتی‌و لەسایەی هەلومەرجی ئەو ئاشتبوونەوەیەدا بەرەی کوردستانی پێکهات کە دواتر رابەرایەتیی راپەرینی ساڵی (١٩٩١)ی کرد.

- لە پرۆسەی هەڵبژاردنەوەی مەکتەبی سیاسی لە کۆبوونەوەی ئابی ساڵی (١٩٩١)ی شەقلاوەدا، بەئەندامی مەکتەبی سیاسی هەڵبژێردرا. لە کانوونی دووەمی ساڵی پاشتر وەك نوێنەری حیزبی سۆسیالیست بەشدار بوو لەو شاندەی کەبەرەی کوردستانی بۆ سەردانی سووریا پێکی هێنابوو.

- ساڵی (١٩٩٢) بەشدار بوو لە کۆنگرەی یەکگرتنی پارتی گەل‌و پارتی سۆسیالیست (پاسۆك)‌و حیزبی سۆسیالیست کە لە هەولێر بەسترا، بەلام خۆی‌و ژمارەیەکی زۆری کادیرەکانی حیزب رەوتی کۆنگرەکەیان پەسند نەکردو بەجێیان هێشت. دوا بەدوای ئەمە، بەشدار بوو لە کۆنگرەی دووەمی حیزبی سۆسیالیست لە رانیەو بەئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردرایەوە.

- سەرەتای ساڵی (١٩٩٣)، پاش یەکگرتنەوەی حیزبی سۆسیالیست‌و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بووە ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتیی‌و پاشان لێپرسراوەتیی مەکتەبی کۆمەلایەتیی لە هەولێر پێ سپێردرا.

- ساڵی (١٩٩٤) بەشدار بوو لە دامەزراندنی کۆمەڵەی رووناکبیری‌و کۆمەلایەتیی پارێزگای کەرکوك‌و لەسێ کۆنگرەی یەك لەدوای یەکدا بە سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە هەڵبژێردرا. ئەم کۆمەڵەیە وەك یانەیەکی کۆمەلایەتی، لە هەلومەرجی دەربەدەریی کەرکوکییەکاندا، خزمەتێکی زۆری کەرکوکییەکان‌و کێشەی کەرکوکی کردووە.

- لە ماوەی ساڵانی (١٩٩٧ - ١٩٩٨) بووە وەزیری ئەوقاف‌و کاروباری ئایینی لە ئیدارەی سلێمانیی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

- لە ماوەی ساڵانی (١٩٩٨ - ٢٠٠٠) بووە وەزیری رۆشنبیری. پاش یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی هەولێرو سلێمانی.

- لە ماوەی ساڵانی نێوان (٢٠٠٦- ٢٠١٠)دا لێپرسراوەتیی وەزارەتی ئەوقاف‌و کاروباری ئایینیی لە حکومەتی یەکگرتوودا گرتە ئەستۆ. لە ساڵی (٢٠٠٦ - ٢٠١٠) بووە راوێژکاری سەرۆکی هەرێم بۆ کاروباری ئایینی.

- ساڵی (٢٠١١) بیرەوەرییەکانی خۆی وەك ئەندامی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان بلاوکردەوە. خاوەنی چەند کتێبێکە کە کتێبخانەی کوردییان پێ دەوڵەمەند بووە.

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:

- (مەزاری حەیوانەکان). جۆرج ئۆروویل، وەرگێران لە فارسییەوە، هاوبەش، چاپی یەکەم، سلێمانی، ساڵی (١٩٩٢) و چاپی دووەم، ساڵی (٢٠٠٥).

- (گەرمیان رابردووی نزیك‌و ئاییندە)، لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی جوگرافی سیاسی، سلێمانی، (٢٠٠٣).

- (کوردو تورکمان، پرۆژەیەك بۆ راستکردنەوەی واقعێکی خوڵقێنراو)، هەولێر، (٢٠٠٦).

- (لەلادێوە بۆ شار)، سلێمانی، (٢٠٠٦).

- الکورد والترکمان-مشروع لتقویم واقع مفتعل)، (٢٠٠٧).

- (کێشەی ویلایەتی موسل)، فازل حوسێن، وەرگێران لە عەرەبییەوە، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩، چاپی دووەم، کەرکوك، ٢٠٠٧.

- (الکورد والترکمان- إلی این؟)، (٢٠١١).

- (لە بزووتنەوەوە بۆ حیزبی سۆشیالست)، (٢٠١١).

- (قەزای کفری.. شارەدێی کەلار لە پەنجاکانداو پاسەکەی حاجی ١٩٦١-١٩٧٥)، ٢٠١٢.

- (شاعیری عیرفانی گەرمیان).
- (گەرمیان مێژووی سەد ساڵی).
- (لە شارەوە بەرەو لادێ).
- صورة المجتمع والمدرسة في الخمسينات من القرن الماضي، ٢٠١٥.
- وێنەی كۆمەڵگە و قوتابخانە لە پەنجاكانی سەدەی رابردوو، ٢٠١٦

* ( محەمەد شوان ):-

- ساڵی (١٩٥٩) لە كەركوك لەدایكبووە.
- كۆلێژی ئەندازیاری شارستانی تەواو كردووە.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (علمیني یا كركوك كیف ابكیك)، كۆمەڵە شیعر، ٢٠٠٨.
- (ازهار البارود)، شیعر، ٢٠١٤

* ( محەمەد شوكری ):-

- (محەمەد شوكری كوری دەروێش مەحموود)ە.
- یەكێكە لە زانا ئایینییەكانی كەركوك لە بواری (فقە) دا.

* ( محەمەد شوكری قەرەداغی ):-

- مەلا محەمەد شوكری نازناوی (شوكری) لە شیعردا بۆخۆی هەڵبژاردووەو شیعری بە زمانی توركمانی و كوردی هەیەو لە زمانەكانی عەرەبی و فارسی و توركییەوە شیعری گۆڕیوەتەوە سەر كوردی.
- ساڵی (١٨٩٢) لە كفری لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٦٧) كۆچی دوایی كردووە.

* ( محەمەد شێخانی ):-

- ناوی (مەلا مەحمەد سەید عەبدولكەریم شێخانی بەرزنجی) یە.
- ساڵی (١٩٣١) لە قادر كەرەم لەدایكبووە.
- ئیمامو خەتیبی مزگەوتی (عوریان)و مزگەوتی (نائیب) بووە لە كەركوك.
- گەلێك بەرهەمی چاپكراوی هەیە بە زمانی عەرەبی و كوردی، لەوانە:
- (یاساكانی ئیسلام لەفەرمایشتەكانی پێغەمبەردا)، سلێمانی، ١٩٦٣.
- (باخچەی سەیدەكان)، كەركوك، ١٩٧١.
- (پوختەیەك دەربارەی هۆزی شێخانی بەرزنجی)، بەغدا، ١٩٨٥.
- لە (٢٩)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٠) كۆچی دوایی كردووە.

* ( محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە ):-

- ساڵی (١٩٤٠) لە شاری كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٥٩) وازی لە خوێندن هێناوە، بەهۆی باری رامیارییەوە.
- ساڵی (١٩٥٩) یەكەم نووسینی لە گۆڤاری (هەتاو) ژمارە (١٦١) لە (٣١)ی ئابی ساڵی (١٩٥٩) بە ناوی (كارمان ئەوێ نەك قسە) بڵاوكردووەتەوە جاروباریش نووسینی دەنووسی.
- ساڵی (١٩٧١)وە تاكوو ساڵی (٢٠١٣) بەدەوام بووە لە نووسین و چاپ كردنی كتێبەكانی.
- ساڵی (١٩٨٢)دا خانەنیشین كراوە كە فەرمانبەر بوو لە

(بانکی رافیدەینی گشتی) لە بەغدا.
- لە (١)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٥) لە هەولێر بووەتەوە بە فەرمانبەر بەناونیشانی بەڕێوەبەری کارگێڕیو دارایی (مدیر الادارة المالیة) لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕاگەیاندنی وەزارەتی رۆشنبیری، لە (١٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٠) خانەنیشین کراوە.
- ساڵانی (١٩٨٦-١٩٨٨) لە تەلەفزیونی کەرکوك بەرنامەی هەبووە بە ناوی (لەگەڵ رۆشنبیراندا).
- ساڵی (١٩٧٨)وە تاکو (٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٥) بەرنامەی هەبووە لە ئێزگەی رادیۆی کوردی بەغدا.
- ساڵانی (١٩٧٩-١٩٨٠) بەڕێوەبەری لاپەڕەی (وەرزش ولاوان) بووە لە رۆژنامەی (هاوکاری) بەغدا.
- ساڵانی (١٩٩٢-١٩٩٥) پەیامنێری رۆژنامەی (العراق) بووە بەعارەبیو کوردی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مان گرتن)، شانۆگەری، چاپی یەکەم لە ساڵی (١٩٧٩)، چاپخانەی (السندباد) لە بەغدا، لە هەمان ساڵدا چاپی دووەم لە چاپخانەی (علاء) لە بەغدا چاپ کردووە، لەسەر شانۆ نمایش کراوە لە هەڵەبجەو سلێمانی، هەر چەندە رەزامەندی سەندیکای کرێکارانی هەولێری هەبوو لە بەر ئەوەی رامیاری بوو تەلەفزیۆنی کەرکوك رەزامەندی نەدا بۆ تۆمار کردنی.
- (مێژووی عەشیرەتی زەنگەنە)، چاپخانەی (الاندلس) لە بەغدا، (١٩٨٠).
- (وەلی دیوانەو شەم)، شانۆگەری، چاپی یەکەم لە ساڵی (١٩٨١)، چاپخانەی (دار القادسیه للطباعة) لە بەغدا، چاپی دووەم لە چاپخانەی (الحسام) لە بەغا، لە ئێزگەی رادیۆی کوردی بەغدا بە (١٧) زنجیرە تەمسیلی تۆمارکراوە دەرهێنانی کاك سەعید زەنگەنەو خۆشی لە زنجیرە تەمسیلێکەدا دەوری مەلا یوسفی هەبووە، مامۆستا محەمەد سابیر مەحموود کردوویەتی بە عەرەبی و چاپ کراوە بە ناوی (الدرویشی ولی وشم).
- (وتەکانی ژیان)، بەشی یەکەم، وەرگێران، ئامادەکرد لەگەڵ (عەبدوللا عەبدولرەحمان زەنگەنە) لە چاپخانەی (دار القادسیة للطباعة)، بەغدا (١٩٨٢).
- (وتەکانی ژیان)، بەشی دووەم، وەرگێرانو ئامادەکردن، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا، (١٩٨٥).
- (نەورۆزنامە)، بەشی یەکەم، چاپخانەی (دار الحافظ)، بەغدا، (١٩٨٥).
- (باوەڕ)، شانۆ گەریی، چاپخانەی (دار الحافظ)، بەغدا، (١٩٨٥).
- (سەنووقی پۆستە)، دوو چیرۆکی (جلیل محەمەد قلی زادە) ئازەری، وەرگێران، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا، (١٩٨٥).
- (چیرۆكو ئەفسانەی ئەدەبی کوردی)، چاپخانەی (الصقر)، بەغدا، (١٩٨٨).
- (دایە من بووکە شووشە نیم)، شانۆگەری، ئامادەکردن، چاپخانەی (دار الحریة للطباعة)، بەغدا، (١٩٨٩)، لە رادیۆی کوردی بەغدا بە (١٩) زنجیرە تەمسیلی تۆمارکراوە، خۆی لە دەوری (ئەحمەد)دا هەیە.
- (ووتەکانی ژیان)، بەشی سێیەم، وەرگێرانو ئامادەکردن، چاپخانەی (شرکة السندباد للطباعة)، بەغدا، (١٩٩٠).
- (ووتەکانی ژیان)، بەشی چوارەم، وەرگێرانو ئامادەکردن، چاپخانەی (ماردین)، هەولێر، (١٩٩٧).
- (وتەکانی ژیان)، بەشی پێنجەم، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٦، چاپی دووەم، بەغدا، ٢٠٠٤.
- (چیاکان قسە بکەن)، لەسەر شانۆی (هەولێر-گەل)، ١٩٩٩.
- (لە قسە خۆشەکانی کاك ئەحمەد خەتاب، چاپی یەکەم، کەرکوك، ٢٠٠٣، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (ووتەکانی ژیان)، هەر پێنج بەشەکەی، چاپخانە (شەهاب)، هەولێر، (٢٠٠٣).
- (خەونی پاشا یا ماندناو ستافرۆب)، محێدین زەنگەنە، وەرگێران، هەولێر، ٢٠٠٤.
- (وتەکانی ژیان)، هەر پێنج بەشەکەیو کۆتایی، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (فەرهادو شیرین داستانی دڵداری)، شانۆگەری، نازم حیکمەت، وەرگێران، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (کوللە)، شانۆگەری، نووسینی محێدین زەنگەنە، وەرگێران، چاپخانەی (ئەراپخا)، کەرکوك، (٢٠٠٦).
- (سنوقی پۆستەو بەرخ، شانۆگەری جەلیل قلی زادە، وەرگێران، ٢٠٠٦.
- (گوڵ واژە)، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (وتەکانی ژیان)، بەشی شەشەم، بەغدا، ٢٠٠٧.
- (رۆژمێریك بە ناوی باوە گوڕ گوڕ)، (٢٠٠٧).
- (وتەکانی ژیان)، بەشی حەوتەم، کەرکوك، (٢٠٠٨).
- (مێژووی عەشیرەتی زەنگەنە)، چاپی دووەم، ٢٠١٣.
- (مەرگە ساتێکی رۆژنووسی ئەمریکی)، نووسینی ق. سیمۆنۆف، وەرگێران.
- (ئەی پرد قسەبکە)، شانۆگەری، نووسینی محێدین زەنگەنە، وەرگێران، لەلایەن (کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی) مەڵبەندی گشتی هەولێر پێشکەش کرا بە ناوی.
- (القریة القریة، إنتحار رائد الفضاء وقصص اخری)، موعەمەر ئەلقەزاق، وەرگێرانی محەمەد عەبدولرەحمان زەنگەنەو موکەرەم رەشید تاڵەبانی.
- (تری. لی. لم)، چەند چیرۆکێك، عەزیز نەسین، وەرگێران.
- (نەورۆزنامە)، بەشی دووەم.
- چەند چیرۆکێکی لە رۆژنامەی (برایەتی)و رۆژنامەی (یەکبوون)و رۆژنامەی (کەرکوکی ئەمرۆ)و (بانگی ئاشتی) بڵاوبووەتەوە.
- لە (٩)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠١٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( محەمەد عەبدولقادر - مەلا محەمەد عەبدولقادر ):-**

- (مەلا محەمەد کوڕی عەبدولقادر کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ ئەبو بەکر)ە.
- ساڵی (١٨٠٢) دەستنووسێکی بە ناوی (شرح اسطرلاب) لە زێوێی سەروو لە کەرکوك نووسیوە.
- لە هەندێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژەی بە ناوی هاتووە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی ژیانی کەمە.

*** ( محەمەد عەلی بەگی قیردار ):-**

- یەکێکە لە پیاوە بەناوبانگەکانی کەرکوكو سەرۆکی (قیردارە)کانی کەرکوکە.
- سێ جار لە مەجلیسی مەبعووسانی عوسمانیو لە ساڵانی

(١٩٢٨)، (١٩٣٠)، (١٩٣٣)، (١٩٣٤) هەڵبژێردراوە بە نائیبی لیوای کەرکوك، دووجار لە مەجلیسی میللی عێراقدا نوێنەر بووەو هەڵبژێردراوە.
- لە (٢٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٤) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد عەلی تاڵەبانی - شێخ محەمەد عەلی تاڵەبانی ):-

- ناوی (شێخ محەمەد عەلی کەرکوکی کوری حاجی شێخ عەلی ئەفەندی کوری شێخ عەبدولرەحمانی خالسی)یە.
- ساڵی (١٨٥٦) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٣٣) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد عەلی عەجەم ):-

- یەکێك بووە لەوانەی دەورێکی باڵای هەبوو لە شکاوی (گرتنەوەی شکستە).
- پزیشکێکی کوردەواری بووەو لە کەرکوك دەورێکی باڵای هەبووە لە پیشەکانی پزیشکی و چارەسەرکردنی.

* ( محەمەد عەلی مەرزیخەی ژوورو - مەلا محەمەد عەلی مەرزیخەی ژوورو ):-

- ناوی (مەلا محەمەد عەلی کوری عومەری کوری عەلی)یەو لە عەشیرەتی (شێخ بزێنی)یە لە دێی مەرزیخەی ژووروی ناحیەی شوانەو لە ساڵی (١٩٢٦) هاتووەتەوە دنیاوە.
- ساڵی (١٩٥٣) ئیجازەی مەلایەتی بەدەستهێناوە.
- لە (٢٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٠) بە مامۆستا لە زمانی عەرەبی و ئایینی لە وەزارەتی پەروەردە دامەزراوە.
- ساڵی (١٩٨٢) خانەنشین کراوە.

* ( محەمەد عومەر قازانچی - دکتۆر محەمەد عومەر قازانچی ):-

- ساڵی (١٩٥٢) لە گەرەکی پریادی لەدایکبووە.
- ماجستێری لە (علم التخمرات الصناعية) بەدەستهێناوە.
- بەرهەمەکانی:
- (قادم اليك)، بە زمانی تورکمانی، ١٩٧٩.
- (الحوار بلغة الأناشيد)، بە زمانی تورکمانی، ١٩٨٤.
- (قبلة من خلف الزجاج)، چیرۆك بە زمانی ئینگلیزی، ١٩٨٧.
- اولومە زمان ارکەن، ٢٠٠٥
- ترکمان ئویکولوگو، ٢٠٠٧
- نەسردین هوجا کیرکوکتە، ٢٠٠٧
- ئاتیش چەمبەری، شیعر ٢٠٠٨
- کیوپلجم، ٢٠٠٨
- ترکمان ادبیاتدا ئیلیك ئویکو موبارەزەشیك، ٢٠٠٩
- اوان الورد في كركوك، ٢٠٠٩
- مبارزة عشق، ٢٠٠٩
- اوزون مارتلري، ٢٠١٠
- گوندیم اشغال، ٢٠١٠
- ينى ايراك گازيتسى، ٢٠١١
- كادين كالبى، ٢٠١٣.

* ( محەمەد عیزەت خەتات ):-

- ساڵی (١٩٢٩) لە کەرکوك لەدایکبووە لە گەرەکی موسەڵلا لە نزیك مەرقەدی ئیمام ئەحمەد.
- قۆناغی سەرەتایی مامۆستا شەفیق عومەر کە مامۆستای خۆشنووسی بووە دەورێکی باڵای هەبووە لە پێگەیاندنی.
- یەکێکە لەوانەی لە بواری خۆشنووسیدا دەستێکی باڵای هەیەو کاریگەرە بەسەر خۆشنووسانی تورکەوە، لە ماوەی ژیانیدا گەلێك پێشانگاو بەشداری گەلێك پێشبرکێی خەتخۆشی کردووە.
- هەر یەکە لەم هونەرمەندانە (سامی بەگ، محەمەد نەزیف بەگ، یازار بەگ، مستەفا راقم، موسا عەزمی بەگ، حامد ئامێدین محەمەد بەدەوی دەیرانی، سەید ئیبراهیم میسری) کاریگەرییان هەبووە بەسەرییەوە لە بواری خۆشنووسی و نەخشەسازیدا.
- ساڵی (١٩٥٥)دا یەکەم مەکتەبی کردووەتەوە بۆ خۆشنووسین لە شەقامی (بابا گورگور) لە نزیك سینەما (حەمرا) لە دواییدا گواستییەوە بۆ شەقامی ئەتڵەس لە نزیك بازاری (عەسری) لە کەرکوك لە ساڵی (١٩٥٨) لەگەڵ هاورێی خۆشنووسی (عەبدولمەلیك عەباس).
- ساڵی (١٩٥٩) بەشداری خولێکی مامۆستایانی کردووە بۆ ئەوانەی کە لە پێنجی ئامادەیی دابراون و دامەزراوە بە خەبیر لە دادگادا بۆ پشکنینی واژۆ و هێڵی نووسراوەکان.
- ساڵی (١٩٦٩) مامۆستا بووە بۆ وانە وتنەوە دەربارەی خۆشنووسین بۆ مامۆستایانی هەردوو رەگەز.
- ساڵی (١٩٨٠) لەلایەن رژێمی گۆربەگۆرەوە خراوەتە بەندینخانەوە بە تاوانی سیاسی، لە ساڵی (١٩٨١) بۆ ماوەی حەوت ساڵی بەند کراوەو لە ساڵی (١٩٨٦) لە بەندی رزگاری بووە.

– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (نماذج وكليات الخطاط محمد عزت كركوكلي في بدائع الخط العربي)، چاپخانەی (الفنون)، بەغدا، ۱۹۸۸.
– لە (۲۹)ی تەمووزی ساڵی ۱۹۹۱ کۆچی دوایی کردووە.

* محەمەد غەفور ئاغجەلەری:-

– ناوی (محەمەد غەفور ئەحمەد، ناسراو بە حەمە غەفور ئاغجەلەری)یە.
– لەدایکبووی ساڵی (۱۹۳۹)ی شارۆچکەی ئاغجەلەری ناوچەی قەڵاسێوکەی پارێزگای کەرکوك و بەرەچەلەك دەچێتەوە سەر هۆزی کەلهور. هەر لەوێ چووەتە بەر خوێندن و تا پۆلی سێی ناوەندی خوێندووە.
– ساڵی (۱۹٦۰) پەیوەندیی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردو بۆ ساڵی دواتر بەشدار بوو لە یاخیبوونی چەکدارانەی خێڵەکان لە مانگی ئەیلولی (۱۹٦۱)دا. پاش ئەوەی یاخیبوونە خێڵەکییەکە بووە شۆڕشێکی نەتەوەیی، بوو بە پێشمەرگە لە لقی ۳ و پاش ماوەیەك بووە سەردەستە، پاشان سەرپەل و سەر لق. لە کاتی لەتبوونی ساڵی (۱۹٦٤)ی پارتیدا، لایەنگری باڵی مەکتەبی سیاسی بوو.
پاش یەکگرتنەوەی هەردوو باڵ لە ساڵی (۱۹۷۱)، کرا بە فەرماندەی بەتالیۆن و لە ساڵی (۱۹۷۲)دا گوێزرایەوە بۆ هێزی رزگاری.
– ساڵی (۱۹۷٤)، کاتێك شەڕ لەنێوان کوردو عێراق دەستی پێکردەوە، وەك فەرماندەیەکی دیاری پێشمەرگە دەرکەوت، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە توانی رێگای نێوان کەرکوك و سلێمانی بۆ ماوەی سێ رۆژ ببڕێ و لەم سەروبەندەدا شەڕێکی قورسی لەدەربەندی بازیاندا کرد کە تێیدا فرۆکەیەکی جەنگیی هێزی ئاسمانیی عێراق لە نزیك گوندی کەلەشێرە کەوتە خوارەوە.
– ساڵی (۱۹۷۵) دوابەدوای هەرەسهێنانی شۆڕش، چووە ئێران و ماوەیەك لەوێ مایەوە. پاشان گەڕایەوە بۆ عێراق. دواتر پەیوەندیی بەبزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستانەوە کردو پشتگیریی پرۆژەی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری کرد. لەم سەروبەندەدا بەشداریی لە پێکهێنانی مەفرەزە سەرەتاییەکاندا کردو لە سنووری کەرکوك و چەمچەماڵ و بەری کۆیەو چەمی رێزان و قەڵاسێوکە جموجوڵی پێشمەرگانەی دەستپێکرد. لە سۆنگەی کاریگەری و رۆڵی دیاری لە پێشمەرگایەتیدا، حکومەتی عێراق ژن و منداڵ و دایك و باوکیان گرت و بۆ شاری ناسریە دووریان خستنەوە.
– لە ۲۳ی تەموزی ساڵی (۱۹۷۷) لەسەر دەستی مەفرەزەیەکی سەر بە سەرکردایەتیی کاتیی پارتی دیموکراتی کوردستان تیرۆرکرا. ئەو مەفرەزەیە لە ئێرانەوە بە چەك و تفاقی تەواوەوە گەڕابۆوە بۆ کوردستان و ماوەی چەند مانگێك بەناوچەکانی دەشتی کۆیەو شوان و شێخ بزێنی و چەمی رێزاندا گەڕابوو بەبێ ئەوەی هیچ چالاکییەك لە دژی سوپای عێراق ئەنجام بدا. چەکدارەکانی ئەو مەفرەزەیە لە شیوی زیان لە گوندی کانیبیی ناوچەی بازیان، مەفرەزەکەی ئاغجەلەرییان غافڵگیر کردو دایانە بەر دەستڕێژی گوللە، لە ئاکامدا محەمەد غەفور ئاغجەلەری و هەشت پێشمەرگەی هاوڕێی شەهید کران. پێشمەرگە شەهیدەکان: ئەنوەر کەریم، عەبدوڵڵا تۆفیق، حامید مەلا ئەحمەد، رەزا عومەر، سەعید عومەر، کەریم مەلا ئەحمەد، حەمید عەزیز، رەمەزان سەعیدو ئەحمەد محەمەد کە خەڵکی چەمچەماڵ و گۆپتەپەو عەلیبەیان و چیا سەوز بوون. ئەو مەفرەزەیەی تاوانی تیرۆرکردنی ئاغجەلەری و هاوڕێکانی ئەنجامدا، خۆی رادەستی رژێمی عێراق کرد، تا ساڵی (۱۹۹۱) بەردەوام بوو لە سەر جاشایەتی.
پاش ئەنجامدانی کارەکە، هەر ئەو رۆژە هەلیکۆپتەرێك لە نزیك شوێنی تاوانەکە دابەزی و تەرمەکانی بۆ کەرکوك گواستەوە، پاشان هێنرانەوە بۆ ئاغجەلەر. مانگ و نیوێك پاش تیرۆرکردنی ئاغجەلەری، خێزانەکەی و منداڵەکانی و دایك و باوکی ئازاد کران و رێیان پێ درا بگەڕێنەوە بۆ کوردستان.

* ( محەمەد فەیزی مەلا عەلی سیامەنسوور ):-

– ساڵی (۱۸۹۱) لەدایکبووە.
– یەکێکە لە مەلا بەناوبانگەکانی کەرکوك و لە هەندێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژەی بە ناوی هاتووە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی ژیانی کەمە.

* محەمەد قولوو ئۆغلوو:-

– ساڵی ۱۹٤٦ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– بەرهەمەکانی:-
– تسعين في ذاكرة الزمن، ۲۰۰۵
– صرخة الزمن، ۲۰۰٦
– تسعين بين الماضي والحاضر، ۲۰۰۸
– الزراعة أثمن النفط لو؟، ۲۰۱۰
– علی ضفاف المشهد مع حسن كوثر، ۲۰۱۱
– ادبيات وصنعتده تركمان خلق كلنه كلرى، ۲۰۱۲
– زمان كيچمه شيله هايق هريش، ۲۰۱۳
– زمان سوريسيجه هايفرش، ۲۰۱٤
– مراة المؤمن، ۲۰۱٤
– تدلعيات السنين، ۲۰۱٤

* ( **محەمەد مەلا فاتیح** ):-

- یەکێکە لە مەقام زانەکانی کەرکوك.
- بەڵام زانیاریمان کەمە دەربارەی چالاکییە هونەرییەکانی.

* ( **محەمەد مەردان - دکتۆر محەمەد مەردان** ):-

- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (أسفار الشجن)، بەغدا، ١٩٨٢.
- (النواشي)، بەغدا، ١٩٨٣.
- (ملامح من الشعر التركماني المعاصر في العراق)، بەغدا، ١٩٨٥.
- (يتالق الاشراق)، موسڵ ١٩٨٧.
- (المرشد لتعليم اللغة التركية)، موسڵ، ١٩٨٨.
- (توركمن شعر نيده ايزله نيملر)، بەغدا، ١٩٨٩.
- (هاجس البعث والثورة في شعر عدنان سليمان)، موسڵ، ١٩٩١.
- (ئونجه سز اتشلر)، بەغدا، ١٩٩٣.
- (اغاني وطقوس التركمانية، ٢٠٠٤
- تيار الشعر الشعبي التركماني، ٢٠٠٨
- من مسرحيات التركمانية المعاصرة، وەرگێڕان، ٢٠٠٨
- حكايات ارزي وقنبر، ٢٠٠٨
- الأعمال الشعرية الكاملة بين عامي ١٩٧٨-٢٠٠٨، ٢٠٠٩
- منازل الغرق، ٢٠١٢
- ملحمة صاري كهية، ٢٠١٣.
- تيار الشعر الكلاسيكي التركماني، ٢٠١٣
- المصلحة المعتبرة في التجريم، ٢٠١٤
- التسليم في جرائم الأحوال في التشريع

* ( **محەمەد فاتیح جەلال تاڵەبانی - شێخ محەمەد فاتیح جەلال تاڵەبانی** ):-

- ساڵی (١٩٥٤) لە گەرەکی (بەرتەکێ) لەدایکبووە.
- لەژێر دەستی (شێخ عەلی جەمیل تاڵەبانی) زانستەکانی ئایینی خوێندووە.
- ساڵی (١٩٧٩) بووەتە مامۆستای پیشەسازی لە وەزارەتی پەروەردە.
- ساڵی (٢٠٠١) خزمەتەکانی لە وەزارەتی پەروەردەوە گوێزراوەتەوە بۆ وەزارەتی ئەوقاف.
- بۆ ماوەی دە ساڵ وەك بێژەری ئایینی کاری کردووە لە تەلەفیزۆنی (کەرکوك)ی جاران لە بەرنامەی (نور الإسلام).

* ( **محەمەدی قەشقە - مەلا محەمەدی قەشقە** ):-

- (مەلا محەمەد سەید ئەمین کوری سەید عەبدولرەحمان)ە.
- ساڵی (١٩١٢) لە دێی قەشقە لەدایکبووە.
- قۆناغە بەراییەکانی خوێندنی لەلای مامۆستا (مەلا محەمەد ئەمین دزەیی) دەستپێکردووە.
- ساڵی (١٩١٥) باوکی دەیهێنێتە کەرکوك‌و لەوێ لە مزگەوتی سەید نووری لە گەرەکی (بلاخ) لە خزمەت مامۆستا مەلا (محەمەد سەرسپی)و (مەلا رەفیق) تا ساڵی (١٩٢٥) دەمێنێتەوە.
- لەسەر پردی کەرکوك دیواری دوکانێك بە سەریدا دەرووخێت‌و قاچی چەپی دەشکێت ماوەی سێ مانگ لە نەخۆشخانە دەکەوێت، پاشان (محەمەد عەلی عەجەم) چارەسەری کردووە، ماوەیەك بەهۆی شکستی قاچی واز لە (خوێندن دەهێنێت تا لە ساڵی (١٩٢٥) دەچێتە سلێمانی ولەوێ لە مزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخ، لە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا بێژوی ومەلا محەمەدی برای کتێبی (جامی) تەواو دەکات ئینجا چووەتە خزمەت مامۆستا مەلا ئەحمەد مەلا رەسوڵ ولە خزمەت ئەو زانایە خوێندنی تەواو کردووە وئیجازەی پێ دراوە.
- دەوری هەبووە لە کردنەوەی قوتابخانەی ئایینی لە مزگەوتی قەشقەو دەرسی بەم مەلایانە داوە: (مەلا حوسێن حاجی باوە)، (مەلا جەعفەر سەید ئەحمەد)، (مەلا تەیب)، (مەلا عەلی گولەمە).
- ئەندامێك بووە لە دەستەی بڵاوکراوەی (باسەرە)کەی مامۆستا شاکیر فەتاح‌و چەندین نووسینی بەم ناوەوە هەیە.
- ساڵی (١٩٥٤) دەوری هەبووە لە کردنەوەی قوتابخانەی شەوانە لە دێیەکە.
- یەکێك لە کارەکانی لەوناوچەیەدا ژن بەژن‌و شیربایی‌و نان خواردنی پرسەی حەرام کردووە.
- ساڵی (١٩٧٥) بەدواوە بووتە مامۆستای ئایینی لە سەر مەرقەدی پیر شێخ حەسەن قەرەچێواری لە قادرکەرەم.
- لە (٢٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٥) بەنەخۆشییەکی درێژخایەن کۆچی دوایی دەکات.

* ( **محەمەد قازانچی** ):-

- ناوی (محەمەد عومەر قازانچی)یە.
- ساڵی (١٩٥٢) لە پریادی لەدایکبووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٤-١٩٧٥) کۆلێژی کشتوکاڵی تەواو کردووەو ماجستێری لێ وەرگرتووە.
- چاپکراوەکانی:
- (قادم اليك)، ١٩٧٩.
- (الحوار بلغة الاناشيد)، ١٩٩٤.

*** ( محەمەد کەساس- محەمەد چۆپان ):-**

- ناوی (محەمەد کوڕی چۆپین کوڕی مەحموود کوڕی قەمبەڕی کاکەیی)یە.
- سالی (١٨٩٠) لە ئاوایی زەنقر لە دەڤەری داقوقی کەرکوك هاتووەتە دنیاوە، بەلام هەندێك سەرچاوە سالی (١٨٩٢) بە سالی لەدایکبوونی دادەنێن.
- لە پاش فامکردنەوەی لەلای مەلا سەمەد نراوەتە بەرخوێندن، زانیاری لە میرزا خەلیل منەوەر، مەلا زەینەل، مەلا فەتۆش بەدەستهێناوە.
- هەر لە مندالییەوە ئاشنایی لەگەل ئەدەبو شیعردا پەیدا کردووە ئارەزووی لە کێشانی نیگاو وێنەو خۆشنووس هەبوو جگە لە زمانەکەی خۆی عەرەبیو تورکی بە قسەو نووسین بەچاکی زانیووە.
- شیعری هەمە جۆری بە زمانی ماچۆیی داناوە هەندێك جاریش بە شێوەزاری کرمانجی خواروو، نازناوی شیعری (کەساس) بووە.
- سالی (١٩١١) لە ئاوایی عەلیسەرا ژنی هێناوە.
- شایانی باسە لە سالی (١٩١١)دا لە سەر ئەرکی خۆی لە ئاوایی عەلیسەرای خوێندگایەك دەکاتەوە ودەست دەکات بە وانە ووتنەوە، بە مندالان.
- سالی (١٩٣٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( محەمەد کەساس جەباری- دکتۆر کەساس جەباری ):-**

- سالی (١٩٥٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ناوی (محەمەد ئەحمەد سەعید ئەمین)ە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:

- (کەرکوك و بزاڤی شیعری کوردی)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٧.
- (بەهاکان کە نامۆ نەبن)، کۆمەلە شیعر، سلێمانی ٢٠٠٧.
- (چەند لێکۆلینەوەیەکی ئەدەبی)، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپ و بلاوکرنەوەی سلێمانی، (٢٠٠٨).

*** ( محەمەد کەرکوکی - مەلا محەمەد کەرکوکی ):-**

- ناوی (مەلا محەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی عاشور کوڕی حاجی ئیبڕاهیم کوڕی محەمەد کوڕی یوسف کەرکوکی)یە.
- سالی (١٨٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە تەمەنی سێ سالییدا هەردوو چاوی لە دەستداوە بە نەخۆشی (ئاولە).
- خوێندنی ئایینی لەلای (شێخ عومەر کوڕی ئەبو بەکر-مەلا گچکە) لە هەولێر خوێندووەو لە دواییدا چووە بۆ موسل و لەلای (مەلا حەمەد) خوێندنی تەواوە کردووەو لە (عەقرە)ش

لەلای (شێخ عەبدولحەمید بریفکانی) خوێندویەتی.
- یەکێك بووە لەوانەی لە بواری تەسەوفدا ئارەزووی هەبووەو لەسەر رێبازی (قادری-تالەبانی) کاری کردووە.
- سالی (١٨٨٤) کاتێك (حاجی مستەفا) مزگەوت‌و قوتابخانەیەکی دروست کردووە بووەتە مامۆستا لەو قوتابخانەیە.
- لە (٨)ی کانوونی دووەمی سالی (١٩٤٦) کۆچی دوایی کردووەو لە نزیك مزگەوتی (قیردار) نێژراوە.

* محەمەد کوردۆ:-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (خورپەی ناخ)، شیعر، سلێمانی، ١٩٩١.
- (هۆرەی قەلا)، هاوبەش، ١٩٩٢.
- (چرپەی دل)، شیعر، سلێمانی، ١٩٩٨.
- (ژنێك دەمرێ‌و پیاوێك بەچراوە نایە)، شیعر، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (گەران بەدوای شیعرو جیاوازیدا)، لێکۆلینەوە، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (لالەزارو وشە)، رەخنە، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- (لەئیرادەی مەرگەوە بۆ ئیرادەی ژیان‌و دنیا خەونەگەرمەکان)، لێکۆلینەوە، ٢٠٠٨.
- (ژەنەرالی خۆشەویستی)، شیعر، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- (جوانی‌و جیاوازی)، لێکۆلینەوە، سلێمانی، ٢٠٠٩.

* (محەمەد گۆگجەیی - مەلا محەمەدی رەش):-

- ناوی (محەمەد عەلی مەولوود)ە.
- سالی (١٩٠٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە مەلا ئایینییەکانی کەرکوك‌و ماوەیەکی چاك

مەلای مزگەوتی دێی گۆگجە بووە.
- لە (٢٤)ی کانوونی دووەمی سالی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (محەمەد مەحموود مودەریس - مەلا محەمەد مەحموود مودەریس):-

- ناوی (مەلا محەمەد کوری مەحموود مودەریس)ە.
- لە ماوی ژیانییدا خزمەتێکی گەورەی لە بواری زانستی ئاییندا کردووەو گەلێکی لەو بوارەدا پێگەیاندووەو هاوسەردەمی گەلێك زانای ئەو سەردەمە بووە.
- لە هەندێك لە دەستنووسەکانی (دار المخطوطات) لە بەغدا ئاماژە بە ناوی هاتووە، بەلام زانیاریمان دەربارەی ژیانی کەمە.
- سالی (١٨٧٨) کۆچی دوایی کردووە.

* (محەمەد مەزناوی - مەلا محەمەد مەزناوی):-

- هەر چەندە زانیارییەکانمان دەربارەی ژیانی کەمە بەلام بەشێك لە دەستنووسەکان ئەوە دەخەنە روو کە یەکێك بووە لە زاناکانی کەرکوك ئەویش بەپێی بەشێك لە نووسینی هەر یەکێك لە (مەلا محەمەد مەزناوی)و (مەلا یوسف موجمەر)و (مەلا موسای کوری عیسا) بەشێك لە ژیانی ئەم زانایییەیان خستووەتە روو، ماوەیەك لە کەرکوك ژیاوەو خزمەتی بواری زانستی ئایینی کردووە، هەندێك لە زانیارییەکان ئاماژە بە سالی (١٧٨٨) دەکەن کە گوایە (محەمەد مەزناوی) ماوەیەك لە قوتابخانە (شا غازی بووە لە کەرکوك).

* ( محەمەد مەهدی خەلیل ):-

- ساڵی (١٩٠٦) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٢٧) دەرچووی (دار المعلمین)ی بەغدایە.
- محەمەد مەهدی، کوردی شاری کەرکوك بووە لەساڵی ١٩٥٤، پەیوەندی بە (جماعة فناني كركوك)ەوە دەکات تا ساڵی ١٩٦٠.
- ساڵی ١٩٥٠ پارێزگار خەڵاتی دەکات لە کاتێکدا تابلۆی (کندی)ی فەیلەسوف رەسم دەکات و خەڵاتی یەکەمی دەوڵەت (الجائزة الأولى للدولة) وەردەگرێت.
- مامۆستای رەسم بووە، لە قوتابخانەکانی خورماتوو و ناوەندی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٥٤) بەشداری پێشانگای (اصدقاء الفن)ی کردووە لە قوتابخانەی (ملك غازي).
- ساڵی (١٩٥٦) بەشداری پێشانگای پیشەسازی کشتوکاڵی کردووە لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٥٧) بەشداری پێشانگای پەیمانگای رۆشنبیری ئەمریکی کردووە لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٥٩) بەشداری پێشانگای شۆڕشی کردووە، لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٦٠) بەشداری لەچوارەم پێشانگای (جماعة فناني كركوك)دا کردووە.
- ساڵی (١٩٦٩) بەشداری پێشانگای (الفن الحديث)ی کردووە لە بەغدا.
- لە (١١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد مەهدی بەیات ئۆغلو ):-

- ساڵی (١٩٥٢) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- قەیتەز بابا بر عمر دستانی، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا، ١٩٧٩.
- گوران ایلندەبن کیمم، ٢٠٠٥

- اتیمی کمله دیم، ٢٠٠٧
- قەتیز بابابر عمر دستانی، ٢٠٠٨
- مقالات عن فضولي البغدادي وآخرين، ٢٠١٠
- ساڵی (٢٠١٣) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد مەهدی کەرکوکی - میهری ):-

- ساڵی (١٨٤٩)دا لە کەرکوك لە گەرەکی زێوێ لەدایکبووە.
- لێکۆڵینەوەی زانستی و ئاپینییەکانی لە کەرکوك تەواو کردووە، چووەتە ئەستەمبوڵ و گەلێك کاروباری کارگێری وەرگرتووە لە (باب العالي) وەکو وەرگێڕ لە زمانی عەرەبی و فارسی بۆ سەر زمانی تورکی.
- قونسل بووە لە دەوڵەتی عوسمانی لە ویلایەتی (خوی).
- چووەتە (میسر)و پەیوەندی کردووە بە ئیسماعیل پاشا خدێوی.
- چووەتە میسرو هاوڕێی (ئەمیر یوسف کەماڵ بەگ) بووە لە گەشتەکانیدا.

- هەروەها شاعیرێكی چاك بووە دەستێكی باڵای هەبووە لە زمانی توركی و عەرەبی و فارسی و نازناوی شیعری (میهری) بووە.
- هاوسەردەمی شۆرشی عورابی بووە (١٨٨١-١٨٨٢).
- گەشتێكی كردوو بۆ سودان.
- بەرهەمەكانی:
- (الأثر الجلیل في مدح علاء الدین اسماعیل) لە ساڵی (١٨٧٤)دا لە میسر بە چاپی گەیاندووە لە (٨٨) لاپەڕەدا بە زمانی عەرەبی.
- (سودان سیاحتنامەسی)، بە زمانی توركی.
- (رحلة مصرو سودان)، بە زمانی عەرەبی.
- ساڵی (١٩١٨)دا كۆچی دوایی كردووە.

* ( **محەمەد موكری** ):-

- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (سەگوەر)، ڕۆمان، چاپی یەكەم، شاخ، ١٩٨٢، چاپی دووەم، شاخ، ١٩٨٦، چاپی سێیەم، شاخ، ١٩٨٨، چ ٤، سلێمانی، ١٩٩٨.
- (هەرەس)، ڕۆمان، چاپی یەكەم، شاخ، ١٩٨٦، چاپی دووەم، شاخ، ١٩٨٨، چاپی سێیەم، سلێمانی، ١٩٩٨، چ ٤، كەركوك، ٢٠٠٥.
- (كوردو كوردستان لە نامەكەی ئیسماعیل بێشكچی بۆ یونسكۆ)، وەرگێڕان، چاپی یەكەم، شاخ، ١٩٨٧، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٧، چاپی سێیەم، كەركوك، ٢٠٠٦.
- (مسز ژولیا)، شانۆ، سترنبێرگ، وەرگێڕان، چاپی یەكەم وچ ٢، سلێمانی، ١٩٩٨.
- (هارون ئەلرەشید)، شانۆنامە، سلێمانی، ٢٠٠١.
- (ئەژدیها)، ڕۆمان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (دە شانۆنامە)، نووسین و وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (كەرنامە)، محەمەد حەسەن خان ئیعتماد ئەلسەلتەنە، وەرگێڕان، چاپی یەكەم، سلێمانی، ٢٠٠٦، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- تۆڵە، ڕۆمان، ١٩٨٥.
- نێچیر، كۆمەڵە چیرۆك، ١٩٨٦.
- سێ دادگا، شانۆنامە، ١٩٨٣.
- تاراس بۆلبا، ڕۆمان، وەرگێڕان.
- ڤیڤا زاپاتا، ڕۆمان، وەرگێڕان.
- هەمنگوای، لێكۆڵینەوە، وەرگێڕان.
- هینری جێمس، لێكۆڵینەوە، وەرگێڕان.
- یادداشتەكانی قوام السلطة.
- ئیسماعیل بێشكچی و كورد.
- خەسرەوی گولسوخری، لێكۆڵینەوە.
- وەرگێڕانی شیعرەكانی بریخت.
- مردووەكان، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- نادر شا، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- باخچەی ئاژەڵ، شانۆنامە.
- مەرحووم، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- سێ تاری ئاسنین، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- تەمتومان، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- تینوویەتی، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- ساعات من قصب، وەرگێڕان.
- وەرگێڕانی شاعیرانی كورد بۆ عەرەبی.
- وەرگێڕانی شاعیرانی فارسی بۆ كوردی.
- وەرگێڕانی چیرۆكنووسانی فارسی بۆ كوردی.
- سەقاقوس، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- گەمە بە ئاگر، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- سەموم، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- خەونی پاشا، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- كۆترە باریكە، شانۆنامە، وەرگێڕان.
- با سەرەتا بەم پرسیارە تەقلیدییە دەستپێبكەین.

* ( **محەمەد ئەسرەو** ):-

- ناوی (محەمەد كەریم قادر)ە.
- ساڵی (١٩٢٦) لە شاری سلێمانی چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.
- سەرەتایی و ناوەندی وئامادەیی تەواو كردووە، لە پاشان دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە بۆ چەند ساڵێك لە شاری (بەغدا) و (حیللە) و (كەركوك) بووە، ناوبەناوش گەڕاوەتەوە (سلێمانی) لەدواییدا لە شاری (كەركوك) نیشتەجێ بووە.
- هەر لە منداڵییەوە ئارەزووی ئەدەبی كردووەو بە دەیان شیعری هەمە جۆری داناوە لە ناو خەڵكیدا بە (ئەسرەو) ناسراوە.
- لە سەرەتای پەنجاكاندا (١٢٠) چوارینەی خەیامی گۆڕیوەتە سەرزمانی كوردی.
- لە كاتی خۆی لەگەڵ (شێخ رەئوف خانەقا) و دكتۆر (قوتبەدین كاكەیی)دا فەرهەنگێكی كوردی-كوردی یان بە ئەنجام گەیاندووە تاكو پیتی (ڕێ) بەڵام ئێستا بزرەو سەرو سۆراغی نازانرێت.
- لە (٢٣)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٢) كۆچی دوایی كردووەو لە مەزارگەی (موسەڵلا) بە خاك سپێردراوە.

* ( **محەمەد نەورۆزی** ):-

- لە (پیریادی) نیشتەجێ بووە كە باوكی بە (نەورۆز ئاغا)

بەناوبانگ بووە.
– خاوەنی کتێبی (یوسف و زولەیخا) بووە کە بە تورکی نووسیوێتی.
– سالی (١٧٩٥)دا کۆچی دوایی کردوو.

* ( محەمەد نور ئەحمەد ):-

– ناوی (مەلا محەمەد نوڕ کوڕی مەلا ئەحمەد کۆن)ە، لە دێی (عومەر گومبەت) لە سالی (١٨٨٣) لەدایکبووە.
– لە خێزانێکی ئایین پەروەر لەدایکبووەو لەلای باوکی خوێندنی ئایینی تەواو کردووەو تا لە کۆتاییدا ئیجازەی لە مەلا محەمەد کۆیی وەرگرتووە.
– دیوانێکی دەستنووسی شیعری هەیە بە زمانی کوردیو فارسیو تورکیو عەرەبیو نازناوی شیعری (نوری) بووە.
– ماوەیەك ئیمامو خەیب بووە لە دێی (پیر ئەسپانی گەورە) و (سالەیی)و (کارێز)و ناحییەی شوان.
– لە (١٢)ی تەمموزی سالی (١٩٤٨) کۆچی دوایی کردووە.

* ( محەمەد نوری تۆفیق ):-

– لەدایکبووی سالی (١٩٣٤)ی شاری چەمچەمال، لەتاق لاوێتیدا بە گۆڤاری (گەلاوێژ) سەرسام بوو. ئەم گۆڤارە فاکتەرێکی گرنگی هاندانی بوو بۆ چوونە ناو جیهانی رۆشنبیری و نووسین.
– سالی (١٩٥٢) لەخانەی مامۆستایان وەرگیراو سالی (١٩٥٤) خوێندنی تەواو کردو لێرە بەدواوە ژیانی پیشەیی لە بواری پەروەردەدا وەك مامۆستاو بەڕێوەبەری خوێندنگە دەستپێکرد. لەو ماوەیەدا پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد.
– سالی (١٩٥٧) چەند بابەتێکی وەرگێردراوی لە گۆڤاری (هیوا) بلاوکردەوەو لەهەمان کاتدا ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (ئامانج) بوو کە یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان بەشێوەیەکی نهێنی لە سلێمانی دەری دەکرد.
– سالانی شەستەکاندا لە گۆڤارەکانی (هیوا)و (رۆژی نوێ) و (نەورۆز) دەستی بەبلاوکردنەوەی چیرۆکەکانی کرد.
– سالی (١٩٦١)، لەگەل گرژبوونی هەلومەرجی سیاسی لە کوردستاندا، دەستگیر کراو بە سێ سال زیندانی حوکم درا. سالی (١٩٦٤) ئازاد کراو وەك مامۆستا بۆ سلێمانی گوێزرایەوە.
– لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٦٨ – ١٩٧٠) ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (رزگاری) بوو کە گۆڤارێکی سیاسیی چەپ بوو، لە سلێمانی دەردەچوو.
– سالی (١٩٧٠)، پاش دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کورد، بووە ئەندام لەو یەکێتییەو لەماوەی نێوان (١٩٧٢ – ١٩٧٤) بووە سکرتێری نووسینی گۆڤاری (دەنگی مامۆستا) کە یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان دەری دەکرد.
– سالی (١٩٧٤)، پاش دەستپێکردنەوەی شەر لەنێوان کوردو حکومەتی عێراق، پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کردو لە پێنجوێن بوو بە مامۆستا. پاش زیادبوونی ژمارەی ئاوارەکانی کوردی عێراق لە ئێران لە مەریوان گیرسایەوەو لە خوێندنگەی ئاوارەکان وانەی وتەوە.
– پاش هەرەسهێنانی شۆڕش لە سالی (١٩٧٥)، گەڕایەوە بۆ سلێمانیو زۆری نەبرد بۆ دیوانیەو پاشان بۆ عیمارە دوور خرایەوە. پاش پێنج سال ئاوارەیی، سالی (١٩٨٠) حکومەتی عێراق رێی پێدا بگەرێتەوە بۆ سلێمانی. لەو ماوەیەدا پەیوەندیی لەگەل یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا دامەزراندو کوڕێکیشی بوو بە پێشمەرگە. بەهۆی هەلوێستی کورد پەروەرانەو بەهۆی ئەوەی کە کوڕێکي پێشمەرگە بوو، دەزگا ئەمنییەکان زۆر جار تەنگیان پێ هەلدەچنی.
– سالی (١٩٨٥) دوابەدوای زیادبوونی فشاری دەزگا ئەمنییەکان لەسەری، وازی لە پیشەی مامۆستایی هێناو خۆی خانەنشین کرد. بەلام خانەنشین بوونیشی، دەزگا ئەمنییەکان وازیان لێ نەهێنا، کاتێك خۆیو مستەفا سالح کەریمی هاوڕێی ویستیان دوکانی پەڕاوگەو فۆتۆکۆپی لە سلێمانی دابنێن، دەزگا ئەمنییەکان مۆلەتیان پێ نەدان. هەر ئەو سالە دوای ئەوەی کە هەستي کرد مەترسیی گرتنی لەسەرە، بۆ چەند هەفتەیەك لە مالی ناسیاوێکی لە شاری هەولێر خۆی لەبەر چاوان ون کرد.
– سالی (١٩٨٦) یەکەم کۆمەلە چیرۆکی بەناونیشانی (نالەی درەخت) لەبەغدا بەچاپ گەیاندو تێیدا ١٢ چیرۆکی بلاوکردەوە کە لە ماوەي نێوان (١٩٦٥ – ١٩٨٣) نووسیبوی.
– سالی (١٩٩٠) لەگەل چەند نووسەرێکی دیکەدا بەشدار بوو لە پرۆژەی کۆکردنەوەی شیعرەکانی پیرەمێرد. هەر لەو سالەدا بەرگی یەکەمی دیوانەکەی پیرەمێرد لە بەغدا دەرچوو، بەلام دەرچوونی دوو بەرگەکەی تر کەوتە سالانی (١٩٩٤ – ١٩٩٦).
– سالی (١٩٩٢) لە ئۆفیسی رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) کاری کردو ماوەیەك ئەندامی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەکە بوو. ماوەیەکیش راوێژکار بوو لە مەکتەبی راگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.
– سالی (٢٠٠١) ئەرکی سەرنووسەری گۆڤاری مانگانەی (سلێمانی)ی گرتە ئەستۆ کە گۆڤارێکە شارەوانیی سلێمانی دەری کردووەو توانی بیگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە وەك ئەرشیفی شاری سلێمانی هەلبسەنگێنرێ. سالی (٢٠٠٧)

بووە سکرتێری لقی سلێمانیی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان.
– لە ٨ی جوزەیرانی ساڵی (٢٠١١) پاش ململانێیەکی سەخت لەگەڵ نەخۆشیدا کۆچی دوایی کرد.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:–
– (زیندەوەرزانی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی گشتی)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٣.
– (مێژووی نوێ بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٣.
– (ناڵەی دەرەخت)، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٦.
– (سەرجەمی شیعرەکانی پیرەمێرد)، هاوبەش، بەغدا، بەرگی یەکەم، ١٩٩٠، بەرگی دووەم، ١٩٩٤، بەرگی سێیەم، ١٩٩٦.
– (کوردو کوردستان لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیادا)، وەلید حەمدی، وەرگێڕان، سلێمانی، ١٩٩٩.
– (کوردستان لە سەردەمی ئاشتیدا)، ئەحمەد عوسمان ئەبو بەکر، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠١.
– (پیاونامە گوڵبژێرێکی ژیاننامەی شەهیدی ئەمر عەلی عەسکەری یە)، ئامادەکردن، سلێمانی، ٢٠٠٤.
– (فایق هۆشیار یاساناس و نووسەرو نیشتیمان پەروەر)، هاوبەش، سلێمانی٢٠٠٤.
– (سەرجەم پەندەکانی پیرەمێرد)، کۆکردنەوەو ساغکردنەوە، هاوبەش، چاپی یەکەم و چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.

* ( **محەمەد نوری عەسکەری – مەلا محەمەد نوری عەسکەری** ):–

– یەکێکە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوك و خەڵکی دێی (عەسکەر) بووە.
– ساڵی (١٨٩٤) بۆ ماوەیەك مامۆستا بووە لە گەڕەکی شاتەری لە یەکێکە لە مزگەوتەکانی ئەو گەڕەکە.

* ( **محەمەد نوری قادری** ):–

– ناوی (محەمەد نوری کوڕی حاجی یوسفی قەیسەری)یە.
– ماوەیەکی چاك لە کەرکوك و سلێمانی ژیاوە لە کۆڕو کۆبوونەوەی خەڵکی سلێمانیدا بەشداری کردووە.
– بۆ ماوەی چوار ساڵ لە کەرکوك ژیاوە وماوەیەك نەخۆش کەوتووە بە دەست ژانە سك و سکچوون.
– ماوەیەك ڕۆیشتووە بۆ ئەستەمبول بۆ هەوا گۆڕین کە بۆ ماوەی دە مانگ لەوێ ماوەتەوە، ئینجا لە نەخۆشی یەکەمی چاك بووەتەوە.
– ساڵی (١٨٩٣) دەستی کردووە بە نووسینی کتێبەکەی بە ناونیشانی (عجالە)وە کە تا بەرگی حەوتەم لە ساڵی (١٨٩٧) بەردەوام بووە لە نووسینەوەی.
– زمانی عەرەبی و فارسی باش زانیووە.
– بەڵام مەسەلەی کوردبوونی تاکو ئێستا نادیارە، بەدەر دەکەوێت لە سلێمانی فێری کوردی بووە.

* ( **محەمەد وەردە – حاجی محەمەد وەردە** ):–

– کوڕی (سەلیم ئاغا) بوو کە فەرمانبەرێکی تورك بوو لە دەورووبەری نیوەی دووەمی سەدەی پێشوو دێتە ناوچەی (کفری) لەوێ ڕێزی لێ دەگیرێ وکچێك دەهێنێ بە ناوی (وەردە).
– ساڵی (١٩٦٠) کوڕێکیان دەبێت ناوی دەنێن (محەمەد) لە ماوەیەکی کەمدا (سەلیم ئاغا) کۆچی دوایی دەکات و محەمەد بە (حەمە وەردە) ناوبانگ دەردەکات.
– ساڵی (١٩٤٩)دا کۆچی دوایی دەکات.

* ( **محەمەد یاسین سەڕافی کەرکوکی** ):–

– ناوی (محەمەد یاسین کوڕی مەلا ئیبراهیمی مودەریس کوڕی عەبدولکەریم سەڕافی کەرکوك)یە.
– بەپێی هەندێك لە دەستنووسەکان کە لە ساڵی (١٨٢٢)، (١٨٢٦) نووسراوەو مەلا محەمەد یاسین ژێدەری لەسەر نووسیوە ئەوە دەخاتە ڕوو کە لەو ساڵانە لە ژیاندا بووە، هەروەها هەندێك لە دەستنووسەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە خەڵکی (کەرکوك) بووەو بنەڕەتی دەگەڕێتە (موکریان)و لە هۆزی (ئاغتاجەلی) بووە.

* ( **محێدین محەمەد وەردە – محێدین** ):–

– ناوی (محێددین کوڕی حاجی محەمەد وەردە کوڕی سەلیم ئاغا)یە.
– ساڵی (١٩١٠) لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٩٠) کۆچی دوایی کردووە.
– لە هیواو لە پارتی بیست ساڵ خەباتی کردووە.

* ( **مام محێدین** ):–

– ساڵی (١٩٢٧) لە (قادر کەرەم) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– مەقامەکانی (قەتار)و (ئەڵڵا وەیسی)و (ئای.. ئای)و (چوارگا) بە چاکی زانییوە.

* ( **محێدین حەمید محەمەد زەنگەنە** ):–

– ساڵی (١٩٤٠) لە گەڕەکی شاترلو لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٥٨) ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
– ساڵی (١٩٦٤) زمانی عەرەبی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
– ساڵی (١٩٥٧)ەوە بەرهەمەکانی بڵاوکردووەتەوە.
– دوای دوو ساڵی لە خانەقین بووەتە مامۆستا و ئینجا لە قوتابخانەکانی بەعقوبە تا ئەوکاتەی خانەنشین کراوەو لەوێ دانیشتووە.
– یەکێکە لەو نووسەرانەی کە دەورێکی باڵای هەبووە لە سەر شانۆو لێکۆڵینەوەی شانۆیی و گەلێك بەرهەمی بە پێزی هەیە لەو بوارەداو گەلێك خزمەتی شانۆی کوردی و عەرەبی کردووەو بەرهەمەکانی جێگەی ڕێزی جۆرەها خەڵات بووە، جێ پەنجەی لە نووسینی دەقی شانۆی کوردیدا زۆر بەزەقی دیارەو بەرهەمەکانی خاوەنی جێگەوپێگەی خۆیین.
– بەرهەمەکانی:
– (السر)، شانۆگەرییەك لە یەك بەشدا، النجف، ١٩٦٨.
– (الجراد)، شانۆ، بەغدا، ١٩٧٠.
– (الموت سداسیا)، چیرۆکی درێژ، ١٩٧٠.
– (عم ویبقی الحب علامة)، ڕۆمان، دیمەشق، ١٩٧٥.
– (السؤال، او حکایة الطبیب صفوان بن لبیب وما جری له

من العجيب والغريب)، شانۆ، بەغدا، ١٩٧٦.
- (آسوس)، رۆمان، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٧٦، چاپی دووەم هەولێر ٢٠٠٥.
- (الاجازة)، شانۆ، بەغدا، ١٩٧٧.
- (بحثاً عن مدينة اخرى)، رۆمان، دیمەشق، ١٩٨٠.
- (اليمامة)، رۆمان، دیمەشق، ١٩٨٢.
- (كتابات تطمح ان تكون قصصاً)، کورتە چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٤.
- (مساء السلامة ايها الزنوج البيض)، شانۆ، موسڵ ١٩٨٥.
- (كاوه دلدار صياغة مسرحية لأسطورة كردية قديمة)، بەغدا، ١٩٨٩.
- (مسرحيات من فصل واحد)، بەغدا، ١٩٩٤.
- (رؤيا الملك أو ماندارناو سترافروب)، شانۆ، بەغدا، ١٩٩٩.
- (مسرحيتان)، بەغدا، ٢٠٠١.
- (الجبل والسهل)، کورتە چیرۆك، هەولێر، ٢٠٠٢.
- (عشرة نصوص مسرحية)، بەغدا، ٢٠٠٤.
- (الجنزير-كوميديا سوداء)، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (صراخ الصمت الاخرس)، شانۆ، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (الأعمال الكاملة)، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، بەرگی دووەم، سلێمانی، (٢٠٠٨).
- (الأعمال الروائية)، بەرگی یەکەم سلێمانی، ٢٠٠٤، بەرگی دووەم، سلێمانی، (٢٠٠٨).
- لە (٢١)ی ئابی ساڵی (٢٠١٠) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( محێدین داوودی - مامە یارە - بابا محێدین ):-**

- ناوی تەواوی (محێدین محەمەد عەلی)یە، نازناوی شیعری (مامە یارە)یەو لە ناوخەڵکیدا بە (بابا محێدین) ناسراوە.
- ساڵی (١٨٩٠) لە دێی تاڵاوی ناوچەی (داوودە)ی سەر بە خورماتوو هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (١٩٨٢) کۆچی دوایی کردووە.

*** ( محێدین زەلزەلە - موحیی ):-**

- ناوی (محێدین کوری مەلا سەعید زەلزەلە)یە، لە کفری لەدایکبووەو نازناوی شیعری (محيي)یە.

*** ( محێدین کەرکوکی بەرزنجی - شێخ محێدین کەرکوکی بەرزنجی ):-**

- شێخ محێدین (شێخ محەمەد)کوری شێخ حەسەنی گڵەزەردە کوری شێخ محەمەدی نۆدەیی بەرزنجی)یە.
- ساڵی (١٧٢٠) لە گوندی گڵەزەردە لەدایکبووە.
- هاتووەتە شاری کەرکوك لە دەورووبەری ساڵی (١٧٦٥)ی زایینیی و مزگەوتێکی لەگەڵ تەکیەیەك لە گەرەکی ئیمام قاسم بنیات ناوە.
- زانایاکی گەورەیە کە بە زمانەکانی عەرەبی وفارسی وتورکی وهێندی لێکۆڵینەوەو بابەتی گەورەی هەیە.
- لە ماوەی ژیانیدا سێ کوری هەبووە بە ناوەکانی: (شێخ عەبدولعەزیز تەیمزئابادی)، (شێخ حەسەن قولە)، (شێخ محەمەد).
- نزیکەی حەڤدە لێکۆڵینەوەی هەیە کە تاکو ئێستاکە چاپ نەکراوە:
- (مجمع الجواهر).
- (السيف القاطع في الدعوات).
- (برء الآلام في الحكمة والطب).
- (معدن آلال في معرفة حق آلال).
- (جلب الراحة والافاقة في دفع الفاقة).
- (الاوفاق والطب ودفع الشيطان).
- (اصلاح النفوس واداب السلوك).
- (صنائع الأعمال).
- (ابدال الأعمال).
- (تسهيل الصعاب).
- (جامع الفوائد).
- (كشاف الكروب باعثة لتلين القلوب).
- (القصيدة المعشرة).
- (شرح الهمزية).
- ساڵی (١٧٨٠) کۆچی دوایی کردووە لە گۆڕستانی گشتی (ئیمام قاسم) نێژراوە بە تەك مزگەوتەکەی.

*** ( محێدینی دووەمی گڵەزەردەیی - شێخ محێدینی دووەمی گڵەزەردەیی ):-**

- ناوی (محێدین کوری محەمەد کوری فەزڵوددین کوری شێخ عەبدولسەمەد کوری شێخ حەسەن گڵەزەردەی)یە.
- ساڵی لەدایکبوونی ئازارنێت، بەڵام تاوەکو ساڵی (١٨٩٨) لە ژیاندا بووە.
- یەکێك بووە لەو زانایانەی بایەخی زۆری داوە بە پزیشکایەتیو لەم بوارەدا گەلێك بەرهەمی بە جێ ماوە، وەکو:
- (رسالة الدستورات، او مختصر التحفة، في الادوية والعلاجات الطبية)، قەبارەی کتێبەکە (١٠٢٤) لاپەرەیە کە بە رێنووسی فارسی نووسراوەو لە ساڵی (١٨٩٥) نووسراوە، دەستنووسە.

- (جامع الحكمة-في الطب والادوية)، بریتییە لە (٨٢٤) لاپەڕە، ساڵی (١٨٩٨) نووسراوە.

* (میخائیل خاچیك):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (معرض بشيرفون في كركوك يقدم كلمات الاغاني الاثورية)، کەرکوك، ١٩٦٧.

* (میدحەت کاکەیی):-

- ناوی (میدحەت محەمەد عەلی کاکەیی)یە.
- لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٤)ی شاری کەرکوك.
- ساڵی (١٩٧٢) لە بەشی گرافیکی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا وەرگیراوە.
- ساڵی (١٩٧٤) یەکەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە بەغدا کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٥) لە سەنتەری ڕۆشنبیری فەرەنسی لە بەغدا بەشداری پێشانگای شێوەکاریی کردووە.
- ساڵی (١٩٧٦) بروانامەی بە کالۆریۆسی بەدەستهێناوە. هەر ئەو ساڵە بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندن، چووە بۆ ئیسپانیا و لە زانکۆی سان فێرناندۆ لە مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا وەرگیراوە.
- ساڵی (١٩٨٠) خوێندنی تەواو کردووە و بۆ عێراق گەڕاوەتەوە.
هەر ئەو ساڵە کرا بەسەرباز لە سوپای عێراق و ڕەوانەی بەرەکانی شەڕی عێراق - ئێران کرا. بۆ ساڵی دواتر، بەرەکانی شەڕی بەجێهێشت و پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردو لە ناوزەنگ گیرسایەوە.
- ساڵی (١٩٨٤) کوردستانی بەجێهێشت، لە سوید گیرسایەوەو پاش دوو ساڵ ڕەگەزنامەی سویدیی وەرگرت.
- ساڵی (١٩٨٥) لە ژاپۆن چەند پێشانگایەکی لە تۆکیۆو چیبا کردەوەو ماوەیەکیش لە شاری چیبا ژیانی بەسەر برد.
- لە ژیانی هونەرییدا لە زۆر شوێنی جیهان پێشانگای کردووەتەوە لەوانە لە مەدرید لە ئیسپانیا (١٩٧٨) لە بەغدا لە گەلەریی ریواق (١٩٨١)، وارشۆ لە پۆلۆنیا (١٩٨٤)، لە ژاپۆن لە ساڵانی (١٩٨٥، ١٩٨٧، ١٩٨٨)، لە ستۆکهۆڵم لە سوید لە ساڵانی ١٩٨٦، ١٩٩١، ١٩٩٢، ١٩٩٣، ١٩٩٥، ١٩٩٦، ١٩٩٧، ٢٠٠٦، لە کۆریا لە ساڵانی ١٩٨٩، ١٩٩٠، لە دانیمارك (١٩٩٨)، لە پاریس لە فەرەنسا لە ساڵانی ٢٠٠١، ٢٠٠٥، ٢٠٠٧، لە ئیستۆنیا (٢٠٠١)، لە سلێمانی لە کوردستان (٢٠١٢).
- لە سەرەتای ژیانی هونەریدا پشت ئەستور بوو بەڕەنگی ڕەش و سپی لە تابلۆکانیدا، بەڵام دواتر برێکی زۆرتر گەشبینی بەتابلۆکانی داو وەرچەرخایە سەر بەکارهێنانی ڕەنگ. لە هونەرەکەیدا زۆرتر یەك ڕەنگ بە شێوەیەکی چڕ بەسەر هەر تابلۆیەکیدا زاڵە. بەتایبەتی لە بەرهەمە مۆنۆخرۆمەکانی دواییدا.
- ساڵی (١٩٧٦)، دووەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە بەرێوەبەرایەتی ڕاگەیاندنی ناوخۆ لە کەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٦) خوێندنی لە بواری هونەردا خوێندووە لە زانکۆی هونەرە جوانەکان لە سان فرناندۆ لە مەدرید لە ئیسپانیا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٦) بەشداری پێشانگای مۆزەخانەی شارەوانی کردووە لە مەدرید لە ئیسپانیا.
- ساڵی (١٩٧٧) پێشانگای سێیەمی خۆی لە سەنتەری ڕۆشنبیری عێراقی لە مەدرید کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٨) لە پێشانگاو نەخشی جیهانی لە مەدرید لە ئیسپانیا بەشداری کردووە.
- ساڵی (١٩٧٨) پێشانگای سێیەمی لە بنکەی ڕۆشنبیری عێراق لە مەدرید کردووەتەوە لەگەڵ چەند شێوەکارێکی جیهانی و ناودار.
- ساڵی (١٩٧٨) پێشانگایەکی هاوبەشی لە مۆزەخانەی (بیشینی) لە ئیسپانیا کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٩) بەشداری کردووە لەگەڵ پێشانگایەکی هاوبەشی کۆمەڵێك قوتابیانی سەرکەوتو لە زانکۆی هونەر.
- ساڵی (١٩٨٠) پێشانگای گرافیکی کردووەتەوە لە هۆڵی تەئمیم بۆ هونەری نوێ لە (١-١٥)ی ئایاری هەمان ساڵ.
- ساڵی (١٩٨١) پێشانگای لە هۆڵی (ڕەواق) لە بەغدا کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨١) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی (ئەلتەئمیم) بۆ هونەری نوێ لەنێوان (٦-١٥)ی ئایاری ساڵی (١٩٨١) کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٤) پێشانگای لە سەنتەری ڕۆشنبیری ئیتاڵی لە تاران کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٤) پێشانگای لە سەنتەری ڕۆشنبیری وارشۆ لە پۆڵەندا کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٥) پێشانگای لە (جیرا) لەشاری (جیبا) لە یابان کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٥) پێشانگای لە هۆڵی (ڤیلازکویز دیل ریتارلۆ) بۆ نمایشی هونەر لە مەدرید لە ئیسپانیا کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٦) پێشانگای لە (هالاریس هاگمۆن) لە ئیستۆکهۆلم لە سوید کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٧) پێشانگای لە (ئۆجۆوایا) لە شاری (جیبا) لە یابان کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٨) بەشداری لە پێشانگای (ساسیس) لە ستۆکهۆڵم لە سوید کردووە، هەروەها لە هەمان ساڵ بەشداری لە گەلەری (فۆرمیس)ی لە تۆکیۆ لە یابان کردووە.
- ساڵی (١٩٨٩) بەشداری لە پێشانگای هونەری (هۆندای)

کردووە لە (سیئۆل) پایتەختی کۆریای باشوور.
– سالی (١٩٩٠) بەشداری کردووە لە پێشانگای (ئاتا گۆیاما) لە تۆکیۆ لە یابان، لە هەمان سال بەشداری پێشانگای (سۆبایۆنگ) کردووە لە (سیئۆل)ی پایتەختی کۆریای باشوور.
– سالی (١٩٩١) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای (ها لارس هاگمن)، ستۆکهۆلم، سوید.
– پێشانگای (فۆرمیس)، تۆکیۆ، یابان.
– پێشانگای (بیلد)، ڤاربیرك، سوید.
– سالی (١٩٩٢) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای (ئۆدا دیکور) تۆکیۆ، یابان.
– پێشانگای (لنجین)، فاسترڤیك، سوید.
– سالی (١٩٩٣) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای جوهان ئێس، یۆرگا، فلەنندا.
– پێشانگای تیلیر جنری – شا، جیبا، یابان.
– سالی (١٩٩٥) بەشداری پێشانگای (تیلیر جنری–شا) کردووە لە جیبا لە یابان.
– سالی (١٩٩٦) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای بی ئی ١٩، هیلینسکی، فلەنندا.
– پێشانگای تینتۆریری، پاریس، فەرەنسا.
– پێشانگای میهارایا، تۆکیۆ، یابان.
– سالی (١٩٩٧) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای سلۆتس ئاکا بایهیۆڤ، ئیکۆرد، سوید.
– پێشانگای بیلد، ڤاربیرگ، سوید.
– سالی (١٩٩٨) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای کانکۆردۆ، مایبا – شی، یابان.
– پێشانگای کاف، تۆکیۆ، یابان.
– پێشانگای مۆتسۆ، جیبا – شی، یابان.
– پێشانگای وایت، کاگۆشیما، یابان.
– پێشانگای هینریك کامپامان، کۆبنهاگن، دانیمارك.
– سالی (٢٠٠١) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای ئارۆنۆوتچ، ستۆکهۆلم، سوید.
– پێشانگای بیلد گالریت، ڤاربێرگ، سوید.
– پێشانگای هینیریك کامپامان، کۆبنهاگن، دانیمارك.
– پێشانگای کلود دورڤا، پاریس فەرەنسا.
– پێشانگای کاستیلانی، تالین، ئەستۆنیا.
– سالی (٢٠٠٢) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای ك، تۆکیۆ، یابان.
– پێشانگای مۆتسۆ، جیبا، یابان.
– پێشانگای ئاکۆتسۆ، مایبا، یابان.
– پێشانگای مایگاتا، نیکاتا، یابان.
– سالی (٢٠٠٥) بەشداری ئەم پێشانگایانەی کردووە:
– پێشانگای کتێبخانەی کوردیو مۆزەخانەی کوردی، نیویۆرك، ئەمریکا.
– دەزگای ماریا لۆند، پاریس فەرەنسا.
– سالی (٢٠٠٦) بەشداری پێشانگای کۆمەلگەی هونەری کردووە لە ستۆکهۆلم لە سوید.
– سالی (٢٠٠٧) بەشداری ئەم پیشانکایانەی کردووە:
– دەزگای ئایا بۆ شوێنەوارە هونەرییەکان، نیگاتا، یابان.
– گەلەری ئاکۆتسۆ بۆ پیشاندانی شوێنەوار، مایبا تشی، یابان.
– هۆلی مۆتسۆ بۆ پیشاندانی هونەر، جیبا – شی، یابان.
– بوانگەی ك بۆ پیشاندانی هونەر، تۆکیۆ، یابان.

* (**مستەفا ئەحمەد مستەفا**):-

– یەکێکە لە مەقام زانەکانی ناوچەی خورماتوو.
– ناوی تەواوی (مستەفا ئەحمەد) کە ناسراوە بە (مستەفا نانەوا).
– سالی (١٩٥٠) لە دێی (چەوری)سەر بە قەزای خورماتوو لەدایکبووە.

* **مستەفا ئەحمەد کەوسەر**:-

– سالی ١٩٣١ لە کەرکوك لەدایکبووە.
– بەرهەمەکانی:-
– بعض سوزلر وخوریاتلر، ٢٠٠٧
– سوزلر وخوریاتلر، ٢٠١٠
– عبرت، ٢٠١٢
– داتلی دیل، ٢٠١٣

* (**مستەفا بەگی جاف**):-

– ناوی (مستەفا بەگی کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف)ە.
– لە سەرەتای پاییزی سالی (١٩٢١) لە شارەزوور هاتووەتە دونیاوە.
– کاتێك بنەمالەکەی بەیاوەری هۆزە ناودارەکەیان بە کۆچەری لە کوێستانەوە بەرەو گەرمیان چوون، جا بۆ ئەوەی دوور لە مەینەتی ژیانی کۆچەری بژێت بە ئاسوودەیی پەروەردە دەبێت، هەر بە مندالی دەنێرنە نێو خزمانی (گەلالی) وبە دایەنێکی لێهاتوو میهربانی دەسپێرن، پاشان کە تەمەنی دەگاتە شەش سال بەرەو کفری رەوانە دەکرێت تاکو لەوێندەر خوێندنی سەرەتایی بەدەست بهێنێت، ئینجا بۆ خوێندن دەچێت بۆ (سلێمانی) لە مالی خزمی خۆی (حەمە ئاغای عەبدولرەحمان ئاغا) جێگر دەبێت و ئاشنایەتی کەسایەتییەکانی وەکو: (نوری شاوەیس)، (نوری ئەحمەد تەها) (ئەحمەد هەردی) دەبێت.

- لە سەرەتای چلەکانداو لەسەر خواستی مامۆستا (رەفیق حیلمی) سەرۆکی باڵای پارتی هیوا، مستەفا بەگ دەچێتە نێو ریزی ئەو پارتەوەو رۆڵێکی شایستەی تێدا دەبینێت و لە کۆنگرەی هیوا لە گوندی گێژەکان (ناسراو بە کۆنگرەی قەندیلە) سالی (١٩٤٥) بەشداری دەکات.
- هەر لە یەکەم رۆژی هەڵگیرساندنی شۆرشی ئەیلولی مەزنەوە سالی (١٩٦١) مستەفا بەگ شان بە شانی چەند خزمێکی خۆی و زۆر لە ناوداران و رۆڵەکانی هۆزەکەی روو لە دەربەندیخان دەکەن و لە راپەرینە ناسراوەکەی ئەو دەڤەرەدا بەشدار دەبن ئینجا لەگەڵ هاوەڵەکانی بەرەو چیای سوورێن دەچن ولە وێندەر سەقامگیر دەبن، لەلایەن حکومەتی عەبدولکەریم قاسمەوە فەرمانی گرتنیان دەردەچێت.
- پاش تێپەربوونی نۆ مانگ بەسەر ئەو رووداوەدا، مستەفا بەگ و چەند خزم و هاوەڵێکی بە نهێنی بۆ کەلاری کۆن دەگەرێنەوەو لەوێندەر خۆیان حەشار دەدەن بەلام زۆری پێناچێت لەسەر زانیاری کەسانێکی ناحەز بە ئەوان و دۆست بە میری ژمارەیەك پۆلیس شەوێك دێنە سەریان و لە شیرنی خەودا گەمارۆیان دەدەن و دەیانگرن پاشان لە کەرکوك دادگایی دەکرێن و فەرمانی لە سێدارە دانییان دەدرێت، بەلام بە هەول و کۆششی بەردەوامی حەمە سەعید بەگی ئامۆزای، چەند پارێزەرێکی ناسراوی ئەو حوکمە سووك دەکرێت و لە مردن رزگاریان دەبێت و بە بەندکراوی شەش مانگ دەمێنێتەوە، تا لە لێبوردنێکی گشتیدا ئازاد دەبن و سەر لە نوێ بۆ کەلاردەگەرێنەوە، بەلام یەك مانگ زیاتری پێنەچوو دیسان بە تۆمەتی کوردایەتی و جموجولی سیاسی مستەفا بەگ جارێکی دی گیراوەو ماوەی دوو مانگی لە بەندیخانەی کفری بەسەر برد پاشان لە کەلار خرایە ژێر چاودێرییەوە.
- لە کۆتایی سالی (١٩٦٢) بەهۆی هاوکاری نەکردنی لەگەڵ میریدا مستەفا بەگ لە کەلارەوە بۆ خانەقین و ئینجا لەوێشەوە بەرەو شاری (سەماوە)ی باشووری عێراق دوور خرایەوە، پاشان رێگای پێدرا بۆ کەلار بگەرێتەوە.
- لە هاوینی سالی (١٩٦٣)دا پاش دەستپێکردنی شەر لە نێوان میری وهێزی پێشمەرگەدا، مستەفا بەگ سەر لە نوێ روو لە شاخ دەکاتەوەو ماوەیەك وەکو ئەفسەری پێوەندی لەنێوان سەرکردایەتی شۆرش و هۆزەکانی کوردا کار دەکات، هەروەها رۆڵێکی بەرچاو لە نەبەردەکانی سنووری گەرمیاندا وەك شەری کفری و شەری ژالە دەبینێت.
- سالی (١٩٦٤) مستەفا بەگ وەك کەسایەتییەکی دیارو سەرۆك هۆزێکی گەورەی بوونە ئەندام لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆرشدا.
- سالی (١٩٧٠)دا مستەفا دەچێتە ئێران و دەگات بە مال و مندالەکەی لە سالی (١٩٦٩) کە بۆ ئەوێندەر چووبوون و تێدا نیشتەجێبوو بوون، پاشان لە بەهاری (١٩٧٩)دا پێکەوە بۆ عێراق دەگەرێنەوە یەکەمجار لەبەغدا سەقامگیر دەبن، پاشان لە سالی (١٩٨٣) بەرەو کەلار دەگەرێنەوە.
- سالی (١٩٩١) مستەفا بەگ بە یاوەریی تێکرا خەلکی ناوچەکە روو لە ئێران دەکات ولە وێندەر تووشی مەینەتی وزەحمەتێکی زۆر دەبێت.
- لە هاوینی سالی (١٩٩٦) مستەفا بەگ بەهۆی نەخۆشییەوە بۆ بەغدا دەبرێت ولە وێندەر لەلایەن کورو براو خزمانیەوە خزمەتێکی شایستە دەکرێت و چاکترین پزیشکی بۆ دابین دەکەن.
- کەشکۆڵێکی ئاوازەی لەسەر شاعیرانی گەرمیان، لورستان هەبوو، تاوەکو ئێستاکە چاپ نەکراوە.
- لە شەوی (٣٠)ی تەمموزی سالی (١٩٩٧) کۆچی دوایی دەکات ئینجا تەرمەکەی بەرەو کەلار دەبرێتەوەو لە گۆرستانی (سەید خەلیل) بە خاك دەسپێردرێت.

* (**مستەفا بەگی یەعقوبی**):-
- سالی (١٨٩٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ناوی (مستەفا مەزهەر کوری عومەر کوری ئەحمەد یەعقوبی)یە.
- یەکێکە لە ناودارەکانی خێزانی (یەعقوبی).
- لە زەمانی دەولەتی عوسمانی لە دادگای مەدەنی بووەو لە حکومەتی عێراقدا لە ناحییەکانی پردێ و قەرەداغ و چەمچەمال و موسل و کوت و دیالە دەست بە کاربووە.
- دامەزراوە وەکو (کاتب) لە قەزای رانییە لە سالی (١٩١٠).
- سالی (١٩٢٥) دامەزراوە بە بەرێوەبەرایەتی (تحریر) لە لیوای کەرکوك.
- سالی (١٩١٥) گۆڤاری (کوکب المعارف)ی دەرکردووە.
- سالی (١٩٢٧) بووەتە بەرێوەبەری ناحییەی داقوق.
- سالی (١٩٢٤) بووەتە بەرێوەبەری قەزای چەمچەمال.
- لە ئایاری سالی (١٩٢٨) هەلبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك لە پەرلەمانی عێراق، دووبارە لە تشرینی دووەمی سالی (١٩٣٠) هەلبژێردراوە.
- سالی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

* (**مستەفا تالیبی بەغدادی کوردی - شێخ مستەفا تالیبی بەغدادی کوردی**):-

- ناوی (مستەفا کوری ئەسعەد -ئەسەد- کوری عەبدوڵلا) یە.
- باوکی سەر بە عەشیرەتی (لەك)ەو دایکی لە عەشیرەتی (ریزەوەندە).
- سالی (١٨٧٦) لە بەغدا لە گەرەکی شێخ سەراجەدین لە ناوچەی سەرتەپا لەدایکبووە.
- باوکی خەلکی کەرکوکەو لە بازاری قۆریە کاری کردووەو گەلێك گەرماو ئاسیاوی هەبووەو یەکێك بووە لە پیاوە ناودارەکانی کەرکوك.

* **مستەفا حەمە رەشید خۆشناو**:-

- سالی ١٩٦٣ لە گەرەکی شاترلوی کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی ١٩٨٣ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە

خولی ۸۳ بە ناونیشانی (صواریخ سام).
- سالی ۱۹۸۲ پەیمانگەی تەکنەلۆژیا بەشی کارەبای تەواو کردووە.
- سالی ۲۰۰۳ شەهید بووە.

* (مستەفا خەتیب):-

- یەکێکە بووە لە خەتیبە بەناوبانگەکانی مزگەوتی گەورەی کەرکوك.
- تا دەورووبەری سالی (۱۸۱۰) لە ژیاندا مابوو.
- هیچی تر نازانرێت دەربارەی.
- کتێبێکی هەیە بەناوی (رسالة في تأريخ العراق في العصر العثماني).

* (مستەفا راغب پاشا - لیوا):

- سالی (۱۸۹۵) لە خێزانێکی کەرکوکی لەدایکبووە.
- سەرکردەی فیرقەی دوو بووە لە کەرکوك.

* (مستەفا زەنگەنە - دکتۆر مستەفا زەنگەنە):-

- سالی (۱۹٤۷) لە قادر کەرەم لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لە زانکۆی بەغدا بەشی زمانی کوردی تەواو کردووە.
- ماجستێرو دکتۆرای لە زانکۆی سەلاحەددین لە هەولێر تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی:
- (سۆزو نەهێنییەکانی ناوداران)، بەغدا، ۱۹۸۵.
- (گولو ژن و چیا)، شیعر، هەولێر، ۱۹۸۵.
- (قادر کەرەم)، هاوبەش، هەولێر، ۲۰۰۰.
- (رەنگ لە زمانی کوردیدا)، نامەی دکتۆرا. هەولێر، ۲۰۰۲.
- (کناری)، چیرۆك، هەولێر، ۲۰۰٤.
- (رووبارە ئاوێنە)، شیعر، هەولێر.
- (ڤومستان).
- (کارو ئەرکی لە سینتاکسدا)، نامەی ماجستێر.
- (مۆدێرنیتەو کاری رێکخستنی حیزبی).
- (مۆمستان، شیعر، هەولێر.
- (گوێزان، چیرۆك، هەولێر.

* (مستەفا زیائی):-

- سالی (۱۹۵۸) لە قەلا لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (التون جیجك)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الجمهورية)، کەرکوك، ۱۹۷۳.
- (کونل بارجالاری)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا، ۱۹۷٦.
- (کوکل بار جا لاری)، بەغدا، ۱۹۷٦.
- (قوشوقلار)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ۱۹۸۸.
- (باياتيلار و خورياتلار)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ۱۹۸۹.
- (اذربيجان باباثيلارس ايله عراق تورکمن خورتالاری)، بەغدا، ۱۹۸۹.

* (مستەفا سائیب):-

- ناوی (مستەفا سائیب کوری مەلا ئەحمەد سائیب کوری مەلا قادری مەلا حەسەنی قەرەداغی)یە.
- لە (۲۳)ی ئابی سالی (۱۹۰٤) لە شاری کفری هاتووەتە ژیانەوە.
- باوکی قازی کفری بووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە سلێمانی و ناوەندیشی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی (۱۹۲۳) چووەتە قوتابخانەی ئەندازیاری لە بەغدا.
- سالی (۱۹۲٦) بووە بە ئەندازیار لە بەرێوەبەرایەتی رێگاوبانی سلێمانی.
- هەندێ کاری گرنگی بە ئەنجام گەیاندووە، وەکو رێگای سلێمانی - قەرەداغ، سلێمانی - پێنجوێن، سلێمانی - دۆکان، هەروەها دروستکردنی نەخۆشخانە کۆنەکەی سلێمانی و کاری ئەندازیاری دیکە.
- لە سەرەتای ژیانی زۆر بە گەرمی خەریکی کوردایەتی بووە، لەگەل هاورێکانیدا کۆمەلەی (زەردەشت)و کۆمەلەی (خۆیبوون)یان پێکهێناوە، بە خۆی نهێنیگری هەردوو کۆمەلە بوو.
- لەسەر کوردایەتی دوورخراوەتەوە بۆ شارەکانی (موسل، حیللە، کەربەلاو بەغدا) چەندین ووتارو نووسین و چیرۆکی بلاوکردووەتەوە لە گۆڤارو رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە، وەکو: گۆڤاری (گەلاوێژ).
- دوا کاتەکانی تەمەنی لە شاری سلێمانی بە سەربردووە، هەموو ژیانیشی بەرەبەنی بەسەر بردووەو ژنی نەهێناوە.
- لە رۆژی (۹)ی کانوونی یەکەمی سالی (۱۹۸۰) کۆچی دوایی کردووەو لە گردی سەیوان بە خاك سپێردراوە.

* (مستەفا سەید ئەحمەد - مستەفا نەریمان):-

- لە (۲۸)ی حوزەیرانی سالی (۱۹۲۵) لەدایکبووە.
- ناوی تەواوی (مستەفا کوری سەید ئەحمەد کوری شێخ محەمەد کوری شێخ عەبدول سەمەد)ە.
- سالی (۱۹۳۰) چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی.
- سالی (۱۹۳۹) چووەتە قوتابخانەی (ناوەندی کەرکوك)

چونكە قوتابخانەی ناوەندی لە كفریدا نەبوو.
- سالانی (١٩٤١-١٩٤٢) چووەتە (دار المعلمین الابتدائي) لە (ئەعزەمییە)و لە سالی (١٩٤٤) تەواوی كردووە لە مانگی تشرینی یەكەمی هەمان سال.
- بووەتە مامۆستای قوتابخانەی (كەلار) دوو سالی (١٩٤٦-١٩٤٨) لە قوتابخانەكانی (سەرقەلا، كولەجۆ، بان سەندوق) بووە.
- سالانی (١٩٤٩-١٩٦١) لە كەركوك مامۆستاو بەڕێوەبەربوو.
- سالانی (١٩٦١-١٩٦٦) مامۆستا بووە لە (كوت).
- سالانی (١٩٦٧-١٩٧٠) لە بەغدا بەڕێوەبەری قوتابخانەبووە.
- سالانی (١٩٧٠-١٩٨٢) بووەتە پشكێنەر تا خانەنیشین كراوە.
- سالی ١٩٤٩ (خەدیجەی كچی مەلا ڕاغیبی مەلا ئیسماعیل) ی هێناوە لەو ئافرەتە چوار كوڕو دوو كچی بووە، (سەلاحەدین ١٩٥٠)، (سەردار ١٩٥٢) (نەسرین ١٩٥٣)،(سوهەیلە ١٩٥٤)، (سالار ١٩٥٥)، (دلشاد ١٩٦١)، (خێزانەكەی لە ڕۆژی (٢٦) ی تەمووزی سالی ١٩٨٥ كۆچی دوایكردووە.
- سالی (١٩٧٩) چووەتە مالی خواو حەجی كردووە.
- سالی (١٩٤٢) چووەتە ڕیزی كۆمەلەی (هیوا)وە.
- سالانی (١٩٣٩-١٩٤٥)ەوە گەیشتە لیژنەی ناوچەی كفری، لە زۆر كۆبوونەوەكانی (كەلار، كفری، سلێمانی) بەشداری كردووە.
- سالی (١٩٤٥) لەسەر هەلوێستەكانی حیزبی هیوا گیراوە.
- هەر لە دامەزراندنی پارتی دیموكراتی كوردستان لە سالی (١٩٤٦) تا (١٩٦٦) لە ڕیزی حیزبایەتیدا بووەو خزمەتی كردووە.
- سالانی (١٩٥٧، ١٩٦١، ١٩٦٣، ١٩٦٦) لەسەر كوردایەتی گیراوەو ڕەوانەی خوارووی عێراق‌و لەسەر وەزیفەكەی دەركراوە.
- یەكەم نووسینی بەناوی پەخشانێك بوو بە ناوی (ئاوازەیەك لە نەوجەوانێكەوە) لە گۆڤاری (گەلاوێژ ژمارە (١٠)ی لە (٤) ی تشرین یەكەمی سالی (١٩٤٣) بلاوبووەتەوە.
- بەردەوام نووسینەكانی لە: گۆڤاری گەلاوێژ، دەنگی گێتی تازە، ژین، هەتاو، شەفەق، هەولێر، خەبات، بەیان، ڕۆشنبیری نوێ، كاروان، ئۆتۆنۆمی، پەروەردەو زانست، كشتوكال، تەندروستی وكۆمەل، هاوكاری، برایەتی، عێراق بە كوردی وعەرەبی بلاوكردووەتەوە.
- یەكەم كتێبی دیوانی شیعری بوو لە سالی (١٩٥٣) بە ناوی (هاواری لاوان) لەچاپ داوە لە سالی (١٩٥٥) كتێبی (هەلبەست بۆ قوتابیان) بلاوكردووەتەوە.
- سالی (١٩٥٩) بووەتە ئەندامی یەكێتی نووسەرانی عێراق.
- سالی (١٩٧٣) بووەتە ئەندامی یاریدەدەری كۆڕی زانیاری كورد.
- سالانی (١٩٧٢-١٩٧٩) بووەتە سكرتێری نووسینی گۆڤاری (بەیان) لە سالی (١٩٨٣) دووبارە گەڕاوەتەوە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەكە.
- كە شۆڕشی چواردەی تەمموزی سالی (١٩٥٨) بەرپابوو، لە (٢٦)یدا لەگەل حەوت مامۆستا یاداشتێكیان دا بە شۆڕش بۆ مافی خوێندنی كوردی‌و لە (٢٧)ی تەممووزیشدا ئەندامی (وەفدی كوردی) بووە بۆ پیرۆزبای شۆڕشگێرانی تەمموز.
- لە هەردوو كۆنگرەی مامۆستایانی كورد لە شەقلاوەو هەولێر بەشداری كردووە لە سالانی (١٩٥٩)و (١٩٦٠)وە دەورێكی كاریگەری تێدا بینیوە.
- یەكەم ڕۆژمێری كوردی لە سالی (١٩٥٧) داناو ولەسەری گیرا لە پاش شۆڕشی چواردەی تەمموز، یەكەم ڕۆژمێری گیرفان (كوردستان)ی چاپ داوە تا بەوەی گەیشتە ڕۆژمێری پیرەمێرد.
- یەكەم بیبلۆگرافیای كوردی لە سالی (١٩٦٠) بەناو (كتێبی كوردی) دانا، دووەمیان سالی (١٩٧٧)، سێیەمیان سالی (١٩٨٨) بەناو (دووسەد سالی بیبلۆگرافیای كتێبی كوردی (١٧٨٧-١٩٨٦) بە چاپ گەیاندووە، جگە لە مانە بیبلۆگرافیای بۆ گۆڤاری (بەیان)و (ڕۆشنبیری نوێ)و (هاوكاری) دروست كردووە و بلاوكراوەتەوە.
- بەشداری دانانی كتێبی كردووە لە سالی (١٩٧٧) لە جاردانی نەهێشتی نەخوێندەواری تەوزیمی، سەرپەرشتی بەرنامەی تایبەتی تەلەفزیۆنی كردووە وسكرتێری دەركردنی گۆڤارە كوردییەكەی بووە (ئایندە-پاشەڕۆژ).
- لە حەفتاكانەوە سال نەبووە كۆڕ و كۆبوونەوەی لە بەغداو شارەكانی كوردستان پێشكەش نەكردبێت.
- سالی (١٩٨٧) كرا بە سكرتێری نووسینی گۆڤاری ڕەنگین.
- (بەشداری لە ١٧ كتێبی كوردی قوتابخانەكان كردووە).
- كتێبە چاپكراوەكانی:
- (هاواری لاوان)، شیعر، بەغدا، ١٩٥٣.
- (هەلبەست بۆ قوتابیان شیعر)، كەركوك، ١٩٥٥.
- (عەلی ئەفەندی)، شانۆگەری، كەركوك، ١٩٥٧.
- (رووخا)، شانۆگەری، كەركوك، ١٩٥٩.
- (كتێبخانەی كوردی)، بیبلۆگرافیا، كەركوك، ١٩٦٠.
- (مێژووی نوێ بۆ پۆلی شەشەم)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧١
- (مامۆستای نەمر مەلا كاكە حەمەی سیف الله)، بەغدا، ١٩٧١.
- (پەروەردەی نیشتیمانی‌و كۆمەلایەتی بۆ پۆلی یەكەمی ناوەندی)، وەرگێڕان، هاوبەش بەغدا، ١٩٧٢
- (پەروەردەی نیشتیمانی‌و كۆمەلایەتی بۆ پۆلی سێیەم)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٣.
- (ماتماتیكی نوێ)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٤.
- (ڕیاضیاتی نوێ)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٤.
- (ڕیاضیاتی نوێ)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٦.
- (بیبلۆگرافیای كتێبی كوردی ١٨٧٨-١٩٧٥)، بیبلۆگرافیا، ١٩٧٧.
- (خوێندنەوەی بەسوود بۆ پۆلی چوارەم)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٨.
- (خوێندنەوەی كوردی بۆ هەلمەتی گشتی نەهێشتنی نەخوێندەواری تەوزیمی قۆناغی تەواوبوون)، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٨.
- (حساب بۆ قۆناغی تەواو بوون)، وەرگێڕان، هاوبەش بەغدا، ١٩٧٨.
- (پێویستییە پەروەردەییە كۆمەلایەتییەكانی سەرشانی بەڕێوبەرو مامۆستایانی مەلبەندەكانی نەهێشتنی نەخوێندەواری)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (خوێندنەوەی كوردی بۆ پۆلی چوارەمی قوتابخانە گەلییەكان)، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٩.
- (پەروەردەی نیشتیمانی‌و كۆمەلایەتی بۆ پۆلی چوارەم)، وەرگێڕان، هاوبەش، بەغدا، ١٩٧٩.

- (تۆژینەوەیەك لە پێنج بەهرەی نەجمەددین مەلا)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (پەروەردەی نیشتیمانیی و کۆمەڵایەتی بۆ پۆلی شەشەمی قوتابخانە گەلییەکان)، وەرگێران، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٠.
- (خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی قوتابخانە گەلی یەکان)، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٠.
- (پەروەردەکردنی موسڵمانانە)، وەرگێران، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٠.
- (پەروەردەی نیشتیمانیی و کۆمەڵایەتی بۆ پۆلی پێنجەم)، وەرگێران، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٠.
- (خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی قوتابخانە گەلییەکان)، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٠.
- (رێنووسی کوردی لە رەگ و ریشەوە)، بەغدا، ١٩٨١.
- (وشەی کوردی لە هەڵمەتی نیشتمانی بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری تەوزیمیدا)، بەغدا، ١٩٨١.
- (ما أسداه الأكراد إلى المكتبة العربية)، ١٩٨٣.
- (بیبلۆگرافیای گۆڤاری بەیان ژمارەی ساڵەکانی ٦٩-٨٢)، ١٩٨٣.
- (بیبلۆگرافیای گۆڤاری رۆشنبیری نوێ)، ١٩٨٣.
- (شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەوەر)، هاوبەش، بەغدا، ١٩٨٤.
- (شاعیری چەوساوەکان دەلۆ)، ١٩٨٦.
- (فەرهەنگی ئەدیب و نووسەرانی کورد)، بەغدا، ١٩٨٦.
- (شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٦، چاپی دووەم، کەرکوك، ٢٠٠٧.
- (ببلیۆگرافیای دوو سەد ساڵی کتێبی کوردی، ١٧٨٧-١٩٨٦)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (ببلیۆگرافیای رۆژنامەی هاوکاری، ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤)، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٩.
- (بیرەوەرییەکانی ژیانم، بەغدا، ١٩٩٤.
- (یانەی سەرکەوتنی کوردان ١٩٣٠-١٩٦٢)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەورووپشتی)، بەغدا، ٢٠٠٧.
- (بیرەوەیی و یاداشتەکانم).
- ئەم کتێبانەش ئامادەی چاپە:
- وەرگێرانە تورکییەکانی ناو گۆڤارە کوردییەکان لە رۆژنامەی کوردستانەوە.
- (صورة قلمية لأدباء الأكراد).
- (مسؤلون كرد البارزون أسدوا خدمات للدولة العربية ١٩٢٠-١٩٥٨).
- (ولاية الموصل في السالنامات العثمانية).
- جگە لەوانەی باسکرا بیست ساڵ پترە مێژووی رووداوی رۆژ دەنووسێتەوە دەربارەی کوردەواریی و عێراق و جیهان، دەفتەرێکی پڕبەپڕی بە جێماوە بەتایبەتی دەربارەی ئەدیب و نووسەرانی کورد لە کەیەوە دەنووسن و مێژووی ئەوانەی کۆچی دوایی کردووە.
- ساڵی (١٩٩٤) کۆچی دوایی کردووە.

*** (مستەفا-سالم-سۆمەر):-**

- ساڵی (١٨٨٣) لە قەڵا لە گەرەکی مەیدان لەدایکبووە.
- نازناوی شیعری (سالم) بووە.

*** (مستەفا عەسکەری):-**

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی حەقە)، بەغدا، ١٩٨٣.
- (دیوانی ئەسیری)، کۆی کردووەتەوەو لەسەری نووسیەوە، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٧.
- (دیوانی ئەسیری)، کۆی کردووەتەوەو لەسەری نووسیەوە، بەرگی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.

*** (مستەفا عەلە قۆجە):-**

- مەقام زانێکی بەناوبانگی خوورماتوو بووە.
- بەڵام زانیاریمان نییە دەربارەی چالاکییە هونەرییەکانی.

*** (مستەفا کەلاری - مەلا مستەفای کەلاری):-**

- ناوی (مەلا مستەفا کوری عەلی کوری محەمەد)ە.
- ساڵی (١٨٩٧) لە بنگردی کەلار لەدایکبووە.

– ماوەیەك زانستی ئاینی لەلای هەر یەکە لە (مەلا محەمەدی کۆیە)و (مەلا محەمەدی جوانرۆیی) خوێندووە.
– سالی (١٩١٣)ەوە لە (کەلار) لە گوندی (کانی پەموو) نیشتەجێ بووە.
– لە بواری خەتخۆشیو فەتوای ئاینییدا دەستێکی بالای هەبووە.
– لە (٧) شوباتی سالی (١٩٦٩) کۆچی دوایی کردووە لە کەلار.

* (**مستەفا گەرمیانی**):-

– سالی (١٩٦١) لە گەرەکی شۆریجە لەدایکبووە.
– شاعیرو رۆژنامەنووس بووەو دیوانێکی شیعری چاپکراوی هەیە.
– لە (١٦)ی تەمموزی سالی (٢٠٠٧) لە کارێکی تیرۆریستیدا لە کۆمەلەی رووناکبیریو کۆمەلایەتی شەهید بووە.

* (**مستەفا مەزناوی**):-

– ناوی (مستەفا کوری شێخ مەلا محەمەد مەزناوی)یە.
– گەلێك کتێبی قوتابخانەیی هەیە بە زمانەکانی عەرەبیو کوردیو زانایەکی ئاینیو مامۆستایەکی بە توانا بووە.
– سالی (١٩٥٩) کۆچی دوایی کردووە.

* (**مستەفا مەولوود حوسێن**):-

– سالی (١٩٢١) لە گوندی گۆگجە سەر بە کەرکوك لەدایکبووە.
– سالی (١٩٣٩) خوێندنی فەقێیاتی لە گوندی گەلۆزی لەلای مەلا عەبدوللای گەلۆزی خوێندووە.
– یەکێك بووە لەو کەسانەی کە لەگەل چەند قوتابیەك لە

(میسر) لە سالی (١٩٥٧) بۆ لای جەمال عەبدولناسر چوونە، دەربارەی کردنەوەی بەشی کوردی لە ئێسگەی قاهیرەدا.
– سالی (١٩٣٦) ئەندامی حیزبی هیوا بووە.

* (**مستەفا موزهر یەعقوبی**):-

– (مستەفا موزهر کوری عومەر کوری ئەحمەد یەعقوبی)یە.
– سالی (١٨٩٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– سالی (١٩٢٣) بووەتە بەرێوەبەری ناحیەی داقوق.
– سالانی (١٩٢٤–١٩٢٥) بووەتە قائیمقامی چەمچەمال.
– لە ئایاری سالی (١٩٢٨) تا تشرینی دووەمی سالی (١٩٣٠) هەلبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك.
– لە تەمموزی سالی (١٩٣٣) بووەتە قائمەقامی ناحیەی (گل).
– لە کانوونی دووەمی سالی (١٩٣٤) بووەتە قائمەقامی چەمچەمال.
– لە نیسانی سالی (١٩٣٥) بووەتە قائمەقامی کفری.
– سالی (١٩٣٩) بووەتە قائمەقامی چەمچەمال.
– سالی (١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

* (**مستەفا وەیس**):-

– مامۆستایەکی بە توانا بووە لە بواری پەروەردەداو گەلێك کتێبی وەرگێراوی قوتابخانەیی هەیە لە زمانی عەرەبییەو بۆ کوردی لە حەفتاکان بۆ پرۆگرامی قوتابخانە کوردییەکان.
– سالی (١٩٨٤) بە رووداوی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کردووە.

* (**مستەفا واقی**):-

– ناوی (مستەفا باقی)یە نازناوی شیعری (واق)یە.
– سالی (١٨٨٠) بووەتە جێگری بەرێوەبەری داواکاری گشتی، لە دواییدا بووەتە بەرێوەبەری تەحریرات لە سلێمانی.
– سالی (١٨٩١) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

*** ( منەوەر مەلا حەسون ):-**

- ناوی (منوەر حوسێن عەبدولوەهاب)و، نازناوی ئەدەبی (منوەر مەلا حەسون)ە.
- سالی (١٩٥٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لە بەشی زمانی عەرەبی لە زانکۆی هۆڵەندی بەدەستهێناوە.
- پشکێنەری پەروەردەییە لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەرکوك.
- گەلێك بابەتی شیعریو ئەدەبیو رۆژنامەوانیو لێکۆڵینەوەو رەخنەی شانۆیی هەیە بە زمانەکانی عەرەبیو تورکمانی:
- (قراءات ورؤی).
- (حزن بلا حدود).
- (تسع شعراء من كركوك)، بە هاوبەشی.
- (بیتمەیەن جیلە)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة) بەغدا، ٢٠٠١،
- (مرافئ ضبابية)، شیعر، چاپخانەی (عبد الوهاب اوچی)، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (مرافئ ضبابية)، شیعر، وەزارەتی ڕۆشنبیری عێراقی، ٢٠١٠.
- سەرنووسەری رۆژنامەی (القرار)ە.
- سەرنووسەری گۆڤاری (یلدن)ە.
- سەرنووسەری گۆڤاری (لآلئ كركوك).

*** ( مونەیەد حەسەن ):-**

- سالی (١٩٥٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پەیمانگای نەوتی تەواو کردووە.
- لە (٢٣)ی ئەیلولی سالی (٢٠٠٦) کۆچی دوایی کردووە.
- توانایەکی چاکی هەبوو لە گۆرانیو مەقاماتی تورکمانیو عەرەبیو دەورێکی بالای هەبوو لەو بوارەدا.

*** ( مونەیەد ڕاوی ):-**

- سالی (١٩٣٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دواناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووەو دەرچووی (دار المعلمين) بووە لە بواری پەروەردەدا کاری کردووە.
- دوای (١٤)ی تەممووزی سالی (١٩٥٨) مامۆستا بوو لە گوندی کلاوقووت لە ناو شوان.
- سالی (١٩٦٣) چەند جارێك گیراوەو ئازار دراوە بە تایبەتی لە کودەتا خوێناوییەکی حیزبی بەعسداو لە دواییدا لە بواری پەروەردەدا دەر کراوە.
- لەنێوان سالانی (١٩٦٣-١٩٦٩) چووەتە بەغداو خۆی دوورخستۆتەوە لە کەرکوكو تێکەلی ژیانی ڕۆشنبیری ئەو شارە بووە.
- لە دوای کودەتا سەربازییەکەی دووەمی بەعسدا عێراقی بەجێهێشتووەو چووتە عەممانو بەیروت تا سالی (١٩٨٠) لە لوبنان بووە.
- لە دوای سالی (١٩٨٠)ەوە لە ئەلمانیا ژیان بەسەر دەبات.
- یەکێکە لە نووسەرە ناودارەکانی کەرکوكو عێراقو لە بواری رەخنەی ئەدەبیدا دەستێکی بالای هەبووە لەسەر ئاستی عێراق، زۆربەی شیعرییەکانی وەرگێردراوەتە سەر زمانەکانی ئینگلیزیو فەرەنسیو ئەلمانی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (إحتمالات الوضوح).
- (وهم المدن.. وهم الاماكن).
- (مماليك).

*** موحسین حەسەن عەلی:-**

- سالی ١٩٤٥ لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- مخطوطات التاريخ المكتوبة باللغة التركية.
- مخطوطات الأدب المكتوبة باللغة التركية، ٢٠٠٧

*** ( موحسین عەبدولحەمید - دکتۆر موحسین عەبدولحەمید ):-**

- ناوی (موحسین عەبدولحەمید کوری ئەحمەد کوری مەحموود کوری مەلا مستەفا کوری مەلا عومەر کوری عەبدولقادری بەغدا)یە.
- سالی (١٩٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی وناوەندی لە سلێمانی وکەرکوك تەواو کردووە.
- سالی (١٩٦٧) ماجستێری لە (تفسير علوم القران) لە زانکۆی قاهیرە تەواو کردووە، لە ماوەی دکتۆراکەیدا لە میسر گیراوە بۆیە گەڕاوەتەوە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی بەغدا.
- یەکێکە لە سەرکردەکانی پێشەوانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە عێراقو بە یەکێك لە سەرکردەکانی (الحيزب الإسلامي العراقي) دادەنرێت هەر لە دامەزراندنیەوە لە سالی (١٩٦٠).
- گەلێك جار گیراوە لەلایەن رژێمی بەعسەوە لە سالەکانی (١٩٧١)، (١٩٨١)، (١٩٧٨)، (١٩٩٦) کە دوا جار بریاری لە سێدارەدانی درا، بەلام گەلێك زانای ئایینی کەوتنە ناو کێشەکەوە بۆ ڕزگار کردنی، تا بەوەی ڕزگارکراو هەموو دەم

چاودێری دەکرا.

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مواقف المستعمرين من الإسلام)، بەغدا، ١٩٥٩.
- (حركة الإسلام ومفكرو الغرب)، چاپی یەکەم بەغدا، ١٩٦٣، چاپی دووەم بەغدا، ١٩٧٦.
- (الآلوسي مفسراً)، بەغدا، ١٩٦٩.
- (ختم النبوة في القرآن)، بەغدا، ١٩٦٩.
- (حقيقة البابية والبهائية)، ١٩٦٩، ١٩٧٥، ١٩٧٧، ١٩٨٠، ١٩٨٦.
- (حجية التفسير العقلي وضوابطه)، بەغدا، ١٩٧١.
- (الرازي مفسراً)، نامەی دکتۆرا، چاپی یەکەم قاهیرە ١٩٧٢، چاپی دووەم بەغدا، ١٩٧٤، چاپی سێیەم بەغدا، ١٩٧٦.
- (درر السمط في خبر السبط لابن الابار البلنسي)، بەغدا، ١٩٧٤.
- (الوجودية وواجهات الصهيونية)، چاپی یەکەم بەغدا، ١٩٧٥، چاپی دووەم بەغدا، ١٩٧٧.
- (العلم ليس كافراً)، بەغدا، ١٩٧٦.
- (أسرتك ايها المسلم)، بەغدا، ١٩٧٦.
- (نظرات في الاقتصاد الإسلامي)، چاپی یەکەم بەغدا، ١٩٧٦، چاپی دووەم بەغدا، ١٩٧٨.
- (مع الرسول)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (المرأة في ظل الحضارة الغربية)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (اللغة العربية بين شعوبتين)، بەیروت، ١٩٧٧.
- (النظام الروحي في الإسلام ومقومات شريعته)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (حركة التغيير الإجتماعي في القرآن)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (التفسير الحديث)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (محاضرات في ضوابط التفسير)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (دراسات في أصول تفسير القرآن)، چاپی یەکەم بەغدا، ١٩٨٠.
- (من المنظومة الغربية إلى المنظومة الإسلامية)، چاپی یەکەم بەغدا، ١٩٨٠، چاپی دووەم بەغدا، ١٩٩٤.
- (الهجرة النبوية الشريفة)، بەغدا، ١٩٨١.
- (جمال الدين الافغاني المصلح المفترى عليه)، بەیروت، ١٩٨٣.
- (طرائق تدريس التربية الإسلامية للصف الثالث دور المعلمين والمعلمات والصف الثاني معاهد المعلمين)، چاپی سێیەم ١٩٨٣، چاپی چوارەم بەغدا، ١٩٨٥.
- (منهج التغيير الإجتماعي في الإسلام)، چاپی یەکەم بەیروت ١٩٨٣، چاپی دووەم بەغدا ١٩٨٦.
- (الفكر الإسلامي تقويمه وتجديدة)، چاپی یەکەم بەیروت ١٩٨٣، چاپی دووەم بەغدا ١٩٨٧.
- (المذهبية الإسلامية والتغيير الحضاري)، چاپی یەکەم دەوحە ١٩٨٤، چاپی دووەم قەتەر ١٩٨٥، چاپی سێیەم قەتەر ١٩٨٦، چاپی چوارەم بەغدا.
- (أزمة المثقفين تجاه الإسلام في العصر الحديث)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٨٤، چاپی دووەم قاهیرە ١٩٨٥، چاپی سێیەك بەغدا ١٩٩٣.
- (تجديد الفكر الإسلامي)، چاپی یەکەم قاهیرە ١٩٨٥، چاپی دووەم واشنتۆن ١٩٩٦.
- (رسائل السلسلة البيضاء)، چاپی یەکەم، مەغرب ١٩٨٥.
- (من ائمة التجديد الإسلامي)، چاپی یەکەم، مەغرب ١٩٨٦.
- (النورسي الرائد الإسلامي الكبير)، چاپی یەکەم، موسل، ١٩٨٧.
- (الإسلام والتنمية الإجتماعية)، چاپی یەکەم بەیروت ١٩٨٨، چاپی دووەم جەددە ١٩٨٩، چاپی سێیەم واشنتۆن ١٩٩٠.
- (تطور تفسير القرآن الكريم)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٨٩، چاپی دووەم بەغدا ١٩٩٣.
- (علوم القرآن والتفسير)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٩١.
- (حق المعارضة السياسية في المجتمع الإسلامي)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٩٢، چاپی دووەم سنە، ئێران ١٩٩٤.
- (الامام ابو الثناء الالوسي)، بەغدا، ١٩٩٢.
- (المنهج الشمولي في نهج الإسلام)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٩٢، چاپی دووەم بەغدا ١٩٩٤، چاپی سێیەك کوردستانی ئێران ١٩٩٥.
- (اليهود وتفجير الجنس)، بەغدا، ١٩٩٤.
- (تفسير آيات الصفات بين المثبتة والمؤولة)، چاپی یەکەم سنە، ئێران، ١٩٩٥.
- (النورسي متكلم العصر الحديث)، چاپی یەکەم، قاهیرە، ١٩٩٥.
- (صفات الله بين الثابتة والمؤولة دراسة وتقويم)، بەغدا، ١٩٩٦.
- (موقف اليهود من الإسلام والمسلمين)، بەغدا، ١٩٩٦؟
- (نظرات في تفسير آيات من القرآن الكريم)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٩٧، چاپی دووەم بەغدا ١٩٩٨.
- (صحابة رسول الله في القرآن)، بەغدا، ١٩٩٧.
- (صراع الأفكار في المجتمع الإسلامي)، چاپی یەکەم، بەغدا ١٩٩٨.
- (العدل الإجتماعي في الإسلام)، بەغدا، ٢٠٠٠.
- (شخصانية المرأة المسلمة)، بەغدا، ٢٠٠٠.
- (مذهبية الحضارة الإسلامية وخصائصها)، بەغدا، ٢٠٠١.
- (قضايا في الفكر الإسلامي المعاصر)، چاپی یەکەم، بەغدا، ٢٠٠١.

- (ما العولمة)، چاپی یەکەم، بەغدا، ٢٠٠١.
- (العولمة من المنظور الإسلامي)، چاپی یەکەم، بەغدا، ٢٠٠٢.
- (العقائد الإسلامية في ضوء العلم والعقل والوحي)، چاپی یەکەم، بەغدا، ٢٠٠٢.
- (الحزب الإسلامي العراقي مرحلة التأسيس ١٩٦٠)، بەغدا.
- (تأريخ جماعة الاخوان المسلمين في العراق من عام ١٩٤٥ إلى عام ١٩٦٥)، بەغدا.
- (منهاج الشباب المسلم في أسرته)، بەغدا.
- (المرأة المستعبدة في ظل الحضارة الحديثة)، بەغدا.
- (حول قضية التراث)، بەغدا.
- (الإسلام وزي المرأة)، بەغدا.
- (دستور الشباب المسلم في أسرته)، بەغدا.
- (زي المرأة واثره في المجتمع)، بەغدا.
- (الإسلام نظام الحياة لمكتبة الراشدين في الجهاز العربي لمحو الأمية وتعليم الكبار في الجامعة العربية).
- (خالد بن الوليد لمكتبة الراشدين في الجهاز العربي لمحو الأمية وتعليم الكبار).

* (موسا زەکی):-

- ساڵی (١٩١٧) لە قەزای کفری لەدایکبووە.
- لە سەرەتادا لە مزگەوتەکانی کفری خوێندنی تەواو کردووە بە زمانەکانی تورکی و فارسی.
- ساڵی (١٩٣٧) دەرچووە لە (دار العلوم) لە بەغداو دامەزراوە بە مامۆستا لە قوتابخانەکانی کەرکوک.
- بابەت و نووسینەکانی لە رۆژنامەی (آفاق)و (الأخاء - قارداشلق) بڵاوکردووەتەوەو دەستێکی باڵای هەبووە لە نووسینی رۆماندا.
- یەکێکە لەوانەی لە بواری شانۆدا دەستێکی باڵای هەبووەو لە سەرەتاکانی شانۆ بووە لە کەرکوک، لە گەڵێك شانۆی وەکو (اقدار) لەگەڵ (حەقی هورمزی) بەشداری کردووە.
- لە (٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

* (موسلح مستەفا جەلالی):-

- نووسەر لە ساڵی (١٩٣٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە (٢٥)ی تەمموزی ساڵی (١٩٩٧) کۆچی دوایی کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (شێخ نوری شێخ سالح)، ١٩٨٤.
- (الخوارج)، ١٩٨٦.

* (موشی یۆنس موشی):-

- ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (طعون في جلالة السلطة)، ٢٠١٠.
- (اشجان هائمة)، کۆمەڵێك کورتە چیرۆك، ٢٠١٢.

* (مور بابە عەلی):-

- ناوی (محەمەد کوری ئەحمەد پاشا)یە بەناوبانگ بووە بە (مور پابە عەلی) یان (عالی).
- ساڵی (١٨٠٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٨٨٢) لە سیواس کۆچی دوایی کردووە.
- یەکێك بووە لەوانەی لە بڵاوکردنەوەی تەریقەتی (قادری) دا دەستێکی باڵای هەبووەو کتێبێکی چاپکراوی هەیە بە ناونیشانی (تنبیه الساکنین).

* (موراد باشا شەیتان):-
- ساڵی (١٥٥٢) والی کەرکوك بووە تاکو ساڵی (١٥٦٧) بەردەوام بووە.

* (مورادی زەنگەنە - شێخ مورادی زەنگەنە):-
- ناوی (شێخ مورادی کوری بەنی وەیسی زەنگەنە)یە.
- ساڵی (١٨٧٠) لە گوندی زەرداوی خوار کفری لەدایکبووە.
- ماوەیەك روو دەکاتە شاری نەجەف بۆ وەرگرتنی زانستی ئایینی و ماوەیەکیش دەبێتە مودەریس لە خوێندنگای کازمییە لە بەغدا، پاشان روو دەکاتە شاری کەرکوك و ماوەیەك دەمێنێتەوە، ئینجا تا کۆچی دوایی لە خانەقی نیشتەجێ دەبێ.
- لە کتێبە چاپکراوەکانی:
- (گوڵزاری عەشق)، شیعر.
- (روضة الإيمان وحديقة العرفان).
- (گوڵزاری حیکمە).
- (رسالة الهداية).
- (اثمار الهداية).
- ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

* ( موزەفەر پاشا ):-

- ساڵی (١٥٦٧) والی كەركوك بووە تاكو ساڵی (١٥٦٩) لە كەركوك.

* ( موزەفەر حەمید ):-

- ساڵی (١٩٦٣) لە كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٨٥) پەیمانگای هونەرە جوانەكانی سلێمانی بەشی شێوەكاری تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٨٥) یەكەم پێشانگای لە كەركوك كردووتەوە.

* ( موعتەسەم ساڵەیی ):-

- ساڵی (١٩٥٣) لە گەڕەكی زێویە لەدایكبووە.
- لەسەرەتادا لە مزگەوتی باوكی لەو گەڕەكەدا قورئانی پیرۆزی خوێندوە.
- خوێندنی سەرەتایی وناوەندیو ئامادەیی لە شاری كەركوك تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٧٤) چووەتە ئەكادیمای هونەرەجوانەكانی شاری بەغدا لە ساڵی (١٩٧٧)دا بەشی پەیكەرتاشی تەواو كردووە.
- لە چەندین پێشانگای هونەریدا لە شاری بەغداو كەركوك بەشداری كردووە.
- ساڵی (١٩٧٧)ەوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا بە زمانی كوردی وعەرەبی بابەتی هەمە جۆری بڵاوكردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- ساڵی (٢٠٠٦)دا كۆمەڵە چیرۆكی (گێژاو)ی بەچاپ گەیاندووە.
- هەر لەو ساڵەیشدا كتێبی (لەنێوان ئێستاو رابردوودا) ی بەچاپ گەیاندووە ئێستا ڕۆمانێكی بەناوی (خاسەی خۆراگرەوە) بە چاپ گەیاندووە.
- (الخاصة الصامدة)، ٢٠٠٩.
- ئەدەب و هونەری بەرگی یەكەم.
- (ئەدەب و هونەر)، بەرگی دووەم، ٢٠١٠.
- (سێوی زێرین)، كۆمەڵە حیكایەتێكی گەڕۆكی ناوچەی گەرمیان، ٢٠١٠.
- (دانای كویخا شەوكەت)، ڕۆمان، ٢٠١١.
- (ئەدەب و هونەر)، بەرگی سێیەم، ٢٠١٢.
- (هاوارەكانی ڕۆژانی جەنگ)، ڕۆمان، ٢٠١٢.
- بین التراث والمعاصرة، ٢٠١٣
- (داستانی كاكڵو بەستێ)، ڕۆما، ٢٠١٣.
- (لە كەركوكەوە)، ٢٠١٤.
- ماوەیەك مامۆستای هونەر بوو لە ناوەندیی ڕزگاری لە گەڕەكی ئیمام قاسم.
- ماوەیەك لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (بانەڕۆژ) بووە.
- بەڕێوەبەری نووسین بووە لە گۆڤاری (وەرز).

* ( موعتەسەم نەجمەددین ):-

- ساڵی (١٩٦٧) لە شاری كەركوك لەدایكبووە.
- دەرچووی كۆلێژی كارگێڕیو ئابووریيە لە زانكۆی موستەنسرییە نووسەرو ڕۆژنامەنووسەو شارەزایی بواری ئابووریيە.
- چەندین نووسینو لێكۆڵینەوەی لە بواری نەوتدا هەیە.
- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (كوردو توركمان رابردوویەكی پڕ لە قەیرانو داهاتوویەكی تەماویو نادیار)، چاپی یەكەم، (٢٠٠٨).
- (كورد لە گۆڕانكارییەكانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا)، ٢٠١٣.
- (كوردو توركمان رابردوویەكی پڕ لە قەیرانو داهاتوویەكی تەماویو نادیار)، چاپی دووەم، (٢٠١٤).
- ئەمریكا سەركەوتن و پاشەكشێ، ساڵی ٢٠١٥

* (موكەڕەم جەماڵ تاڵەبانی - دكتۆر موكەڕەم جەماڵ تاڵەبانی):-

- ساڵی (١٩٢٣) لە دێی زەرداوی سەر بە قەزای كفری لەدایكبووە، كۆلێژی حقوقی عێراقی تەواو كردووە، ماوەیەك پارێزەری كردووە ماوەیەكی دوورو درێژی لە بەندیخانەكانی حكومەتی پاشایاتی بەسەربردووە.
- ساڵی (١٩٧٤)دا بڕوانامەی دوكتۆرای لە زانستییەكانی ئابووری بە پلەی زۆر باش وەرگرتووە.
- نزیكەی هەشت ساڵ وەزیر بووە.
- سەرنووسەری سێ گۆڤاری بە كوردی وعەرەبی بووە.
- ماوەیەك جێگری سەرۆكی كۆمەڵەی ڕۆشنبیری كوردی بووە.
- كۆلێژی ماف لە ساڵی (١٩٤٦) تەواو كردووە وپیشەی پارێزەری كردووە تا ساڵی (١٩٤٨).
- دكتۆرای لەیەكێتی سوڤێت تەواو كردووە لە (١٩٧٣)و دكتۆرای ناووكی لە ساڵی (١٩٧٥) تەواو كردووە.
- كتێبە چاپكراوەكانی:
- (في سبيل اصلاح زراعي جذري في العراق)، بەغدا، ١٩٦٩.
- (ابراهيم خان ثائر من كردستان)، بەغدا، ١٩٧١.
- (آراء في مفهوم وقضايا الاستلاح الزراعي)، بەغدا، ١٩٧٢.

- (كيف تكون خبيرا في حديقتك البيتية)، بەغدا، ١٩٨٦.
- (حيزب هيوا)، ٢٠٠١.
- (دماء وراء القضبان-مذبحة سجني بغداد والكوت عام ١٩٥٣)، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (حيزب هيوا)، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (الشيخ عبد الرحمن الطالباني العالم المتصوف وشاعر العشق الالهي ومرشد الطريقة القادرية الطالبانية)، بەشی یەکەمو دووەم، سلێمانی ٢٠٠٣.
- (كوردستان اتحاد اختياري لا الالحاق القسري)، سلێمانی ٢٠٠٣.
- (يسألونك عن الانفال)، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- (كردستان والتركمان)، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (الحرب هل كانت الخيار الاوحد لحل ازمة الكويت)، هەولێر، ٢٠٠٦.
- (كردستان والحقوق القومية للتركمان)، سلێمانی، (٢٠٠٨).
- (چوار رۆژ لە کوردستانی ئازادا)، ٢٠٠٨.
- (شێخ رەزای تاڵەبانی، ژیانی پەروەردەیی، بیر باوەڕیو شیعری).

*** ( میدیا زاهیر حاتەم ):-**

- ساڵی (١٩٨٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە چوارچێوەی ئەو هەڵبژاردنانەی ماوەی چوار ساڵ جارێك بۆ ئەنجوومەنی شارەوانی لە سەرتاسەری وڵاتی فینلەندا بەرێوەدەچێت شەوی (٢٦-٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨) لە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی شارەوانی سێ شاری فینلەندا، بە ناوی ئەنجوومەنی شارەوانی پارێزگای راسیپۆری بە سەرۆکی ئەنجوومەنی ئەم شارەوانییە هەڵبژێردرا، کە لە (١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩) دەست بەکار بوو بۆ ماوەی چوار ساڵ.
- کۆلێژی کارگێڕیو ئابووری لە یەکێك لە زانکۆکانی فینلەندا تەواو کردووە لە ساڵی (٢٠٠٧).
- لەسەر لیستی پارتی سویدی فینلەندا هەڵبژێردراوە (SFP. RKP).
- لەو سێ شارەدا (٥١٣٠) دەنگی بەدەستهێناوە کەخاوەنی (٢٧) کورسییە لەو شارەوانیەدا.

*** ( میر سەبری رۆژبەیانی ):-**

- شاعیرێکی کوردەو لە سەردەمی (شاتەهماسبی سەفەوی) یدا ژیاوەو دیوانێکی شیعری هەیە.

*** ( میر سمایلی زەنگەنە ):-**

- ناوی (میر سمایل کوڕی نەوشیروان کوڕی کەی خەسرەو بەگ)ە.
- باپیری میر سمایل لە سەردەمی (شا عەباسی سەفەوی) دا لە دەورووبەری ساڵی (١٥٦٣) لە ناوچەی (مایدەشت) فەرمانڕەوایی کردووە، پاش کۆچی دوایی (خەسرەو بەگ نەوشیروانی) کوڕی دەبێتە جێنیشنی، لە سەردەمی (نەوشیروان بەگ)دا وڵاتەکەی ئاوەدانکردووەتەوە میرێکی دادپەروەرو بە توانا بووە، بەڵام سەفەوییەکان خۆشیان بەوەدا نەهاتووە، سەرەتا باجو خەراجێکی زۆریان خستۆتە سەر ئەویش، گوێ رایەڵییان نەکردووە، بۆیە سەفەوییەکان بە هێزێکی زۆرەوە هێرش دەکەنە سەر وڵاتی (نەوشیروان بەگ)و وڵاتی وێران دەبێتو چوار لە کورانی (نەوشیروان بەگ) دەکوژرێنو ناچار دەبێت وڵاتی خۆی بە جێ دێڵێو دێتە سنووری عوسمانییەکانەوە.
- لە گوندی قەیتول لە نزیك قادر کەرەم نیشتەجێ دەبێت، پاش مردنی (نەوشیروان بەگ) (سمایلی کوڕی) دەبێتە جێنیشنی، ئەمیش سەر لە نوێ سوپا کۆدەکاتەوە، (میر سمایل) بە ژێری خۆی لە عوسمانییەکان نزیك دەکاتەوە، بۆیە عوسمانییەکان پلەی میرایەتی پێ دەبەخشنو لەو سنوورە بەناوی میری زەنگەنەوە فەرمانڕەوای پێکەودەنێت،

پاش خۆی ئەحمەد بەگی كوڕی دەبێتە میرو فەرمانڕەوای زەنگەنە.
- ساڵی (١٥٦٧)ی زایینیی لەلایەن پیاوە گەورەكانی زەنگەنەوە بە سەرۆكایەتی هۆزەكەی هەڵبژێراو بوو بە فەرمانڕەوای كەركوك و خۆرنەوەزان و گل، لەگەڵ خەڵكدا بە میهرەبانی و داد رەفتاری كرد، كاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە سوڵتان (مورادی سێیەم)ی عوسمانی (١٥٧٤ - ١٥٩٤) پێنج سەد سواری بە سەرۆكایەتی (یاوز بەگ) نارد تا دەستگیری بكەن، میر سمایل كاتێ ئەم هەواڵەی پێ گەیشت لەگەڵ سوارەكانیدا چووە پێشوازییەوە، (یاوز بەگ)یش لە دوای چەند ڕۆژ پشوودان و حەسانەوە ئەوی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ لای سوڵتان و ڕووداوەكەی بۆی گێڕایەوە، سوڵتانیش گەلێ ڕێزی گرت و مەڵبەندی كەركوك و خۆرنەوەزان و قەیتوولی لەگەڵ دە هەزار فلووری زێڕ پێ بەخشی و لە پاش گەڕانەوەی بۆ كەركوك خوشكی شێخ مستەفای خواست، پاشان كاروانسەراو مزگەوتێكی لەگەڵدا دروست كردو ئەو باج و گزیتەی كە كۆی ئەكردەوە هەندێكی ئەبەخشییە هەژاران و گەلێ ڕیزی هونەرمەندان و زانایانیشی ئەگرت، لە پاش ماوەیەك ئەوەندە هێزی پەیداكرد كە فەرمانڕەوای موسل بە كارەكاندا ڕاوێژی لەگەڵیدا ئەكرد، پاشان (سلێمان بەگی بابان) (١٥٧١ - ١٥٨٨) بە لەشكرێكی بێ ئەژمارەوە هێرشی هێنایە سەری، بەڵام تێشكاو بە شەرمەزارییەوە گەڕایەوە و كاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە سوڵتانی عوسمانی فەرمانی دا كە باشترین نیشان و خەڵاتی پێ بدەن، بەڵام ئەوەندەی نەخایاند سوڵتانی عوسمانی لێی ترسا و فەرمانی دا كە بیكوژن، پاشا گرتیان و ژینداینان كرد، یەكێ لە جەردەكان بەناوی (حەقی) ئەوی ئازاد كردو پاشان (میر سمایل) خوشكەكەی خۆی لێ مارە كرد.
- ساڵی (١٥٨٩)ی زایینییدا كۆچی دوایی كرد.

* (میرزا شەفیعی جامەڕێزی):-

- ناوی (شەفیع كوڕی عەباسی دەلۆیی)ە.
- ساڵی (١٧٧٦) لەدێی جامەڕێزدا لەدایكبووە كەلەچەند كیلۆمەتری شاری كەركوك دایە.
- لە ناوخەڵكیدا بە (میرزا شەفیعی جامەڕێزی) ناوبانگی دەركردووە.
- شیعری (شەفیع) لەدوا ساڵانی سەدەی هەژدەهەم و نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەهەم لە گەرمیانی كەركوك و هەورامان، لەسەرزاری ڕۆشنبیرو خوێندەوارانی كورد بووە.
- هەر لە منداڵیدا خەریكی خوێندن بووەو گەلێك شوێنی كوردستان گەڕاوەو ماوەیەك لە سلێمانی بووە.
- پاشماوەی ژیانی بەكاروباری كشتوكاڵیەوە بەسەر بردووە.
- ساڵی (١٨٣٦) كۆچی دوایی كردووە.

* (میرزا عبدولقادر باوەیی):-

- ساڵی (١٨٨٧) لەدایكبووە.
- ساڵی (١٩٤٩) كۆچی دوایی كردووە.
-- یەكێكە لە شاعیرەكانی ناوچەی كەركوك.

* (میرزا فەرهادی بیبانی):-

- ناوی (میرزا فەرهاد كوڕی شاوەیسی بیبانی)یە.
- ساڵی (١٧٧١)ی زایینیی لە شاری كەركوك لەدایكبووە.
- هەر لە منداڵییەوە خەریكی خوێندن بووە پاشان چووەتە سلێمانی و چەند ساڵێك لەوێدا ڕێزمانی عەرەبی و ڕەوانبێژی و شەریعەتی ئیسلامی خوێندووە، لەوێوە بە فەقێتی چووەتە بیارەو خەریكی خوێندنی لێكدانەوەی قورئان بووەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو گەڕاوەتەوە كەركوك.
- میرزا فەرهاد یەكێ بوو لە شاعیرانی كوردو زۆربەی هۆنراوەكانی دڵداری و كۆمەڵایەتی و نیشتمانین و لە ئەوپەڕی جوانی و پاراوی و شیرینییەوەن و بەداخەوە زۆربەی هۆنراوەكانی لە ناوچووەو تەنیا چەند پارچە هەڵبەستێكی بەدەستەوە ماوەو ئەویش لە بەیازەكاندا تۆمار كراوە.
- ساڵی (١٨٣١)ی زایینیی كۆچی دوایی كردووە.

* (میرزا مەحموودی زەنگەنە - فنوونی):-

- ناوی (مەحموود كوڕی ئەحمەدی زەنگەنە)یەو نازناوی (فنوونی)یە، بەپێی بەڵگەكان لەدێی قەیتوول لەدایكبووە.
- هەر لەمنداڵییەوە خەریكی خوێندن بووەو مامۆستای تایبەتیی بۆگیراوە فێری زمان و وێژەی فارسی و عەرەبی بووەو پاشان چووەتە كەركوك و ماوەیەك لای خزمەكانی ماوەتەوەو خەریكی خوێندن بووە، بەڵام لەوێدا زۆر نەماوەتەوەو چووەتە لای كێوی ئۆمەرمل لەلای كرماشان پاشماوەی ژیانی لەوێدا بردووەتە سەر، تا لە ساڵی (١٨٧٨) كۆچی دوایی كردووەو لەوێ نێژراوە.

* (میرزا وەلی عەلی):-

- ساڵی (١٩١٧) لەدایكبووە.
- ساڵی (٢٠٠٢) كۆچی دوایی كردووە.
- هونەرمەندێكی دەنگ خۆشی ناوچەی تۆپزاوە بووە.

*** (مینە جاف):-**

- ناوی (حەمە ئەمینی کوڕی کەریم بەگی فەتاح بەگی حمە پاشای جاف)ە.
- ساڵی (١٩١١) لە قەڵای شێروانەی کەلار لەدایکبووە.
- شاعیرێکی بە سەلیقەو نیشتمان پەروەر بوو.
- ساڵی (١٩٦٥) کۆچی دوایی کردووە.
- دیوانێکی شیعری چاپکراوی هەیە لە ساڵی (١٩٧٠) لە بەغدا بە چاپ گەیاندراوە.

*** مام ڕۆستەم:-**

- یەکێکە لە پێشمەرگە دێرینەکانی بزووتنەوەی ڕزگاری نوێی کورد.
- ماوەیەکە چالاکی سیاسی خۆی لەنێو بزووتنەوەی گۆڕان ئەنجام دەدات.
- بەشداری گەلێك چالاکی پێشمەرگانەی کردووە لە دەڤەری گەرمیان.

*** مەریوان حوسێن برایم جەباری**

- لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٩ی کفری، دەرچووی بەشی کارەبای پەیمانگای تەکنیکی هەولێر.
- ساڵی ١٩٧٩ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد و ساڵی ١٩٨١ بوو بە پێشمەرگە لە کەرتی ١ی هەرێمی پارێزگاری.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداری زۆر شەڕی کرد و لە شەڕەکانی ئاڵوەتان و دابان و تەکیە بریندار بوو، لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨٧ بووە فەرماندەی کەرت لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ.
- ساڵی دواتر بەشدار بوو لە خولێکی فەرماندەیی ٧٠ کەسی کە بە هەماهەنگی لەگەڵ قەرارگەی ڕەمەزان لە تاران بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتی سازکرا.
- لە ١٨ی ئابدا وەك پێشمەرگەیەکی پارتیزان لە ناوچەکانی گەرمیان ئەرکەکانی پێشمەرگایەتی جێبەجێکرد و ٤ مانگیش لە سنووری هەماوەند مایەوە، لەو ماوەیەدا ٣ جار بەشداری لە شەڕەکاندا لە دژی سوپای عێراق کرد و لە ساڵی ١٩٨٩دا ڕۆڵێکی دیاری لە گرتنی یەکێ لە ڕەبییەکانی سوپای عێراق لە دەورووبەری سەنگاو بینی.
- ساڵی ١٩٩٠ چوو بۆ پاکستان و تا ساڵی ١٩٩٩ لەوێ مایەوە و پاشان لە نیوزلەندا گیرسایەوە.
- لە ماوەی ساڵانی ٢٠٠٣-٢٠٠٦ وەك کارگێڕی کۆمیتەی ڕێکخستنی یەکێتی لە نیوزلەندا کاری کرد.
- ساڵی ٢٠٠٧ گەڕایەوە بۆ کوردستان و بۆ ساڵی دواتر لە فەرماندەیی هێزی پێشمەرگە خزمەتی کرد، لە مانگی ئەیلولی ساڵی ٢٠١١ بە پلەی عەقید خانەنشین کرا.

*** مەعروف عەلی مەجید**

- ناسراو بە سیروان دێرەشەیی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٧ی گوندی دێرەشەی ناوچەی سەنگاو، لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا خانەوادەکەی لادێی بەجێهێشتووەو لە کەرکوك نیشتەجێ بووەو هەر لەوێش قۆناغی خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٧٨ پەیوەندی بە ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو لە کۆمیتەی ئاگر ڕێکخراوە.
- ساڵی ١٩٨١ پاش زیادبوونی گوشاری دەزگا ئەمنییەکان و ئاشکرابوونی پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە، پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد و لە سنووری کەرتی ٤ی جەباری سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ ژیانی پێشمەرگایەتی دەستپێکرد.
- ساڵی ١٩٨٢ دوای پێکهێنانی تیپەکان، چووەتە سنووری تیپی ٥٧ی سەگرمە و لە کەرتی ٣ی هەمەوەند درێژەی بە پێشمەرگایەتی داوە، هەر ئەو ساڵە لەوێ بووەتە جێگری فەرماندەی مەفرەزەو هەر ئەو ساڵەش بەشداری لە دوو ئۆپەراسیۆنی هێزی پێشمەرگەدا کردووە کە هەریەکێکیان واتای تایبەتی خۆی هەیە، یەکەمیان بەشداری بوونێتی لە گرتنی یەکەم ڕەبییە لە کوردستاندا کە ڕەبییەکەی سەر گوندی کەلە ڕەشە لە ناوچەی سەنگاو، کە ئیتر لێرە بە دواوە هێرش کردنە سەر ڕەبییەکان سامی شکا و کۆتایی بەم تیۆرییە باوە هات کە گوایە (ڕەبییە هەرگیز دەستی بەسەردا ناگیرێ)، دووەمیشیان بەشداری بوونێتی لە ئۆپەراسیۆنی هێزی پشتیوان لە کوردستانی ئێران کە چەردەیەك مانای نەتەوەیەك ڕوون و ڕۆشنی لەخۆگرتبوو، ساڵی دواتر بووەتە

فەرماندەی مەفرەزە ساڵی ١٩٨٦ بووەتە فەرماندەی کەرتی ٣ی هەمەوەند.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا کە تێیدا ٥ جار بە سەختی بریندار بووە، بەشداری لە ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەدا کردووە لەوانە ئۆپەراسیۆنە گەورەکانی گرتنی بێتواتە ١٩٨٣، دابان. هەلاج ١٩٨٥، گرتنی سەنگاو قەیوان. ماوەت ١٩٨٦، داستانی رزگاری ١٩٨٧ و بەشێکی شەڕەکانی دەشتی هەولێر و شارباژێر.
- ساڵی ١٩٨٨ کرایە جێگری فەرماندەی تیپی ٥٩ی حەمرین و هەر لەو ساڵەشدا رۆڵیکی کارای لە بەرپەرچدانەوەی شاڵاوەکانی ئەنفالدا گێڕا و دواتریش بەشدار بوو لە چالاکی پارتیزانی لە گەرمیاندا.
- لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٩دا لە شەڕێکدا بریندار بوو و بۆ چارەسەر گەیەنرایە نزیك شاری سلێمانی بەڵام لە بازگەی تاسلۆجە دەستگیر کرا و رادەستی دەزگا ئەمنییەکان کرا، بۆ ماوەی زیاد لە ساڵێك لە گرتووخانەی ئەمنە سوورەکە هێڵدرایەوەو خرایە ژێر ئازارو ئەشکەنجەوە بەو مەبەستەی کە شوێنی پێشمەرگە پارتیزانەکان ئاشکرا بکات بەڵام ئەو هیچ نهێنییەکی نەدرکاند.
- لە راپەرینی ١٩٩١دا لەگەڵ رزگار کردنی شاری سلێمانیدا لە ٧ی ئازار لە گرتووخانەی ئەمنە سوورەکە ئازاد کرا، لەگەڵ ئازاد بوونی بەشداری لە شەڕەکانی قەرەهەنجیر و کەرکوکدا کرد، پاش راپەرین لێپرسراویەتی پاراستنی بارەگای مەلبەندی ٢ی رێکخستنی کەرکوکی لە گوندی گۆپاڵە و پاشان لە تەکیە پێ سپێردرا، دواتر بەشداری لە خولی یەکەمی ئەفسەرانی قەڵاچوالاندا کرد و پلەی مولازمی دووەمی پێ بەخشرا، دوا پلەی لە فەرمانده‌یی هێزی پێشمەرگەدا رائید بوو.
- لەسەروو بەندی ئەو پشێوی و پاشاگەردانییەی کە پاش رووخانی رژێمی بەعس سەرتاسەری عێراقی گرتەوە، لە ٢٩ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٣دا لەناو شاری کەرکوك تیرۆر کرا.

* **محەمەد خورشید**

کادیری دێرینی رێکخستنی کۆمەڵەی رەنجدەران و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و یەکێ لە دامەزرێنەرانی یەکێتی خوێنکارانی کوردستان.
- لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٦ی گەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك.
- ژیانی سیاسی لە نیوەی یەکەمی دەیەی حافتاکانی سەدەی بیستەم دەستپێدەکات، کاتێك لە ساڵی ١٩٧٢دا پەی بەوە برد کە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و لقی کوردستانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، ژیانی سیاسی کوردستان گرووپێکی تری تێدایە کە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانە، بەڵام پەیوەندی کردنی بە کۆمەڵەوە کەوتە ساڵی پاشتر، کاتێك نەجم فەقێ عەبدوڵڵا، کادری کۆمەڵە، لە ریزی ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەدا رێکیخست.
- لە ساڵی ١٩٧٤دا بووە ئەندامی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، لەو ماوەیەدا خەریکی خوێندن بوو لە کەرکوك و لە هەمان کاتدا ئەرکەکانی خۆی وەك کادرێکی رێکخستنە نهێنییەکان هەڵدەسووراند.
- لە ساڵی ١٩٧٦دا بووە ئەندامی کۆمیتەی ئاگر لە کەرکوك و هەر ئەو ساڵە لەگەڵ هەر یەك لە کۆسرەت رەسوڵ عەلی و شوان عەلی سەعید و رەئوف ئاکرەیی و لەتیف عومەر مستەفا بەشداری لە دامەزراندنی یەکێتی خوێندکارانی شۆرشگێری کوردستاندا کرد، ئەو کۆبوونەوەیە کە یەکێتییەکەی تێدا دامەزرا لە ماڵی ئەو لە کەرکوك بەسترا و تێیدا گەڵاڵەی بەرنامە و پەیرەوی ناوخۆ پەسەند کراو ئەنجوومەنێکی کاتی بەڕێوبەری لێ پێکهات.
- ساڵی ١٩٧٨ پاش پێکهێنانی کۆمیتەی ئاگر لە کەرکوك، بووە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمیتەکە.
- ساڵی ١٩٧٩ لە رەوتی رێکخستنەوەی دەزگاکاندا، یەکێتی خوێندکارانی شۆرشگێر سەرلەنوێ دامەزرایەوەو لە کۆنفرانسێکدا کە بەشێوەیەکی نهێنی و بە سەرپەرشتی قادر حاجی علی لە شاری سلێمانی بەسترا، سەرلەبەری یەکێتیەکە رێك خرایەوە، لەو کۆنفرانسەدا ئەو وەك لێپرسراوی لقی کەرکوکی رێکخراوەکە بەشداریکرد، لەو کۆنفرانسەدا وشەی (شۆرشگێر) لە ناوی رێکخراوەکە لابرا، پرۆگرام و پەیرەوێکی تازە بۆ رێکخراوەکە دانرا و رێکخراوەکە بەو ئاراستەیە برا کە وەك رێکخراوێکی پیشەیی کاربکا.
- ساڵی ١٩٧٩ یەکەم مەفرەزەی پێشمەرگەی ناو شاری کەرکوك لە چەند کادرێك پێکهات لەوانە:- سوارە کەمال و خالید پەرستیار و نوعمان کڵاو قوت، لەو ماوەیەدا ئەرکی رێکخەری پەیوەندی نێوان کۆمیتەی رێکخستنی ناوخۆ و کۆمیتەی ئاگری گرتە ئەستۆ و هەروەها توانی رایەڵەیەکی پتەوی پەیوەندی لەنێوان مەفرەزەکانی پێشمەرگەی چەمی رێزان و کۆمیتەی ئاگردا پێك بێنێ، هەمان ساڵ خوێندنی لە پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر تەواو کرد و لە دوکان بە مامۆستا دامەزرا.
- ساڵی ١٩٨٠ بڕیاردرا وەك نوێنەری کۆمیتەی ئاگر بەشداری لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستاندا بکات، لەم سەروبەندەدا لە گوندی دێلێژەی ناوچەی قەرەداغ، لە کۆبوونەوەیەکیدا لەگەڵ ئازاد هەورامی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و لێپرسراوی لقی ٢ی کەرکوکی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، گەشە بە ئاستی هەمەهەنگی نێوان رێکخستنەکانی ناو شار و هێزی پێشمەرگە درا، هەر ئەو ساڵەو لە کاتێکدا کە خۆی بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسی کۆمەڵەدا ئامادە کردبوو، دەزگا ئەمنییەکانی کەرکوك دەستگیریان کرد، دوای ٤ مانگ لە لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدان لە بارەگای بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی کەرکوك و دەزگای لێکۆڵینەوەی تایبەت، دەزگا ئەمنییەکان هیچ زانیارییەکیان لەسەر رێکخستنە نهێنییەکان لێ هەڵنەکراند، رەتکردنەوەی هاوکاریکردنی دەزگا ئەمنییەکان کە دەیانزانی زانیاری گرنگی لەسەر رێکخستنەکانی کەرکوك و بەشێکی رێکخستنەکانی هەولێر و سلێمانی و بەغدا پێیە، دەزگا ئەمنییەکانی هاندا لە دەستەی لێکۆڵینەوەی تایبەت بیدەنە

دادگا و فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرکەن، پاش بریارەکە بۆ زیندانی موسڵ گوێزرایەوەو لەوێ پاش ٣ مانگ، بە هەوڵ و تەقەلای عەبدولستار تاهیر شەریفی وەزیری پێشووی شارەوانییەکانی عێراق، سزاکەی سووك کرایەوە لە فەرمانی کوشتنەوە کرایە زیندانی هەتا هەتایی و لەم سەروبەندەدا بۆ بەندینخانەی ئەبو غرێب گوازرایەوە.

- ساڵی ١٩٨٢ لە چوارچێوەی لێبوردنێکی گشتیدا ئازاد کرا، لەو ماوەیەدا لە شاری سلێمانی گیرسایەوەو درێژەی بە پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ هاورێیەکانی لە هێزی پێشمەرگە، ساڵی ١٩٩٢ بەشداری لە دامەزراندنی کۆمیتەی بەرگری لە قوربانیانی ئەنفال کرد.

- ساڵی ١٩٩٦ کوردستانی بەجێهێشت و لە فنلاندا گیرسایەوە لە ساڵی ٢٠٠٥دا لەگەڵ چەند هەڤاڵێکیدا کۆمیتەی ریفراندۆمی لە فینلاند دامەزراند و بانگەشەی بۆ سەربەخۆی کوردستان لە رێی راپرسییەوە کرد.

*** محەمەد عەزیز ( محەمەد عەزاوی )**

- ساڵی ١٩٤٢ لە گوندی (زینانە) لە ناوچەی داودە لەدایکبووە.

- ساڵی ١٩٤٥ماڵیان هاتووەتە شاری خورماتوو، سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لەو شارە تەواو کردووە لە کۆلێژی پۆلیس وەرگیراوە، لە دواییدا لە بەرێوەبەرایەتی هاتووچۆی بەغدا بە (مولازم) دامەزراوە، لە ساڵی ١٩٧١ گواستراوەتەوە بۆ بەرێوەبەرایەتی پۆلیسی کەرکوك و لە هەریەکە لەم شارۆچکانە (تازە، حەویجە، چەمچەماڵ، رانیە، دوکان) کاری کردووە.

- لە ساڵی ١٩٧٩ دوردەخرێتەوە بۆ شاری کوفە و لە پیشەی سەربازی دووردەخرێتەوەو لەبەر بەعس نەبوونی.

- لە ساڵی ١٩٦٣دا ٦ مانگ زیندانی کراوە.

- لە ساڵی ٢٠١٠دا لە دوای ململانێیەکی زۆری نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

*** محەمەد لالە عەزیز**

- ناوی محەمەد عەزیز مورادە ناسراوە بە (محەمەد لالە عەزیز).

لالە بە شێوە زاری جافییە بە مانای (خاڵۆ)، ساڵی ١٩٠٥ لە گوندی (دێیەکان) لە شاری سنەی رۆژهەلاتی کوردستان لەدایکبووەو دواتر بە بنەماڵەوە کۆچ دەکەن بەرەو گەرمیان و لە دێی (کۆرمۆر) نیشتەجێ دەبن.

هەر لە تەمەنێکی زۆر کەمەوە کاری لە پیشەی بازرگانیدا کردووە، لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا کچەکانی دەخاتە بەر خوێندن و خەڵکی هاندەدات تا فێری خوێندەواری و زانست بین.

- کەسایەتییەکی خۆشەویست بووە لەلایەن تورکمان و کورد و عەرەبی خورماتووەوە.

- هەردەم ماڵەکەی لانکەی شۆرش بووە و یارمەتی شۆرشی داوەو چەند جارێك زیندانی کراوەو دەربەدەر بووە.

لە ١ ئاداری ساڵی ١٩٩٦ کۆچی دوایی کردووە.

*** د. محەمەد خورشید تۆفیق قادر:-**

- ساڵی (١٩٧٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.

- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی بەزمانی فارسی لە ئێران تەواو کردووە.

- لە ساڵی (٢٠٠٣) لە یاسا بەکالۆریۆسی بەدەستهێناوە لە زانکۆی (سەلاحەدین).

- ساڵی ٢٠٠٨ بروانامەی ماستەری لە یاسای کارگێری لە فەلسەفەی یاسای گشتی بەدەستهێناوە.

-لە ١٤ی شوباتی ساڵی ٢٠١٥ بروانامەی دکتۆرای لە زانکۆی سەلاحەدین بەدەستهێناوە.

- هەر لە ساڵی (٢٠٠٧) وەکو وانەبێژ لە مەکتەبی کەرکوکی زانکۆی هۆڵەندی وانەی وتووەتەوە لە یاسای ئیداری، یاسای سزادانی گشتی، سزادانی تایبەتی لەگەڵ یاسای نێودەوڵەتی.

- سەرنووسەری گۆڤاری (شمس الجامعە)یە.

- ماوەیەك جێگری بەرپرسی لقی سێ و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی کەرکوك و گەرمیانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە.

- لە ٢٦ی شوباتی ٢٠١٧ بووەتە بەرپرسی لقی (٣)ی پارتی

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-

- المقدمة لفهم الانتخابات، بەزمانی کوردی.

- (مسؤولية الإدارة عن تعويض ضحايا جرائم الإرهاب) بە زمانی عەرەبی.

- (ضمانات الحقوق والحريات العامة في مواجهة سلطات الضبط الاداري) بەزمانی عەرەبی

- بەشداری خولی (NDI)و بروانامەی دەربارەی لێزان لە کاروباری رێکەوتنەکان بەدەستهێناوە.

*** مەلا مستەفا**

- ناوی مستەفا ئەمین شەریف ئیسماعیلە.

- ساڵی ١٩٤٠ لە گوندی کانی قادری سەر بە بناری (گل) لەدایکبووە، لە دواییدا ماڵیان هاتووەتە ئاوباریك.

- ساڵی ١٩٥٥ لای مەلا حەسەنی نوحی زانستی ئایینی خوێندووەو لە ساڵی ١٩٥٧ لە کەرکوك درێژەی بە خوێندن داوەو لەلای مەلا ئەنوەر زیائەددین لە مزگەوتی گەورە لە قەلای کەرکوك پەرتوکی (النحو والصرف)، خوێندوە، لە دواییدا لەلای هەریەکە لە : مەلا ئەنوەر، مەلا سەید ئەحمەد تاوێر بەرز، مەلا حوسێنی تەپەلوو، مەلا عەبدولرەحمان عەلی حیکمەت، مەلا جەمیل رۆژبەیانی، مەلا سەید ئەمین ژاژی) زانستەکانی قورئانی خوێندوە.

- ساڵی ١٩٦٧ بووەتە مەلا لە گوندی ئاو باریك، ساڵی ١٩٧٧ ماڵی هاتووەتە خورماتوو

- ساڵی ١٩٨٢ دامەزراوە لە بەرێوەبەرایەتی ئەوقاف بە

بانگدەر لە مزگەوتی کۆماری لە خورماتوو، تا ٢٠٠٤ خانەنشین کراوە.

*** محەمەد خەلیل ئاغا:-**

یەکێکی تر لە مەقامخوێنە شارەزاکانی شاری کەرکوک لە ساڵی ١٩٣١کۆچی دوایی کردووە دەبێت لەدایکبوونی بۆ نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەبگەڕێتەوە، ئەم هونەرمەندە لەبەردەستی حەمە پیرە ئامێری دەفْ ژەندووەو هەموو مەقامە کلاسیکییەکان لە حەمە پیرەوە وەردەگرێت، بەڵام لەپاش نەمانی حەمە پیرە رۆڵ وەردەگرێت و دەبێتە گەورە مەقامبێژی شارەکە. دیارە لە محەمەد خەلیل ئاغایشەوە کۆمەڵێ مەقامخوێنی دیکە ئەو هونەرە وەردەگرن و دەستاودەست ئەم هونەرە مەزنە رادەستی نەوەی دوای خۆیان دەکەن و حاجی نوعمان و مەلا سابیرو مەلا تەها و سەید جەمیل و حاجی سەعید حەمەگوڵە کە باوکی مەقامبێژ حەمەدرێژ بوو هەروەها حاجی عومەر پاسەوان و مەلا محەمەد تۆپال چەندینی دیکەیش ئەم هونەرەیان بۆ دەمێنێتەوە. دیارە لەم کۆمەڵە مەقامبێژەشەوە نەوەیەکی دیکە لەمەقامخوێنان دێتەمەیدان و ئەوە لەدوای ئەوە ئەم هونەرە دەگواسترێتەوە پشتاو پشت وەکو هونەرێکی رەسەن دەبێتە ناسنامە بۆ کەلتورو هونەری کوردیمان.

*** محەمەد عیززەددین**

- ناسراو بە محەمەدی شێخ عیزەددین، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٠ی گوندی کانی چناری سەر بە قەزای چەمچەماڵ لە بنەماڵەیەکی ئاینپەروەرو نیشتیمانپەروەرە، لە خوێندنگەی ئایینی گوندەکە سەرەتاکانی خوێندی ئاینی خوێندووەو دواتر لە چەمچەماڵ دەستی بە خوێندنی سەرەتایی کردووە، لە کەرکوک خوێندنی سەرەتای و ناوەندی تەواو کردووە و لە قۆناغێکی تردا ئامادەیی ئاینی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٦٧ پەیوەندی بە رێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووەو دواتر بووەتە پێشمەرگەو کادر لە سنووری گەرمیان، چەمچەماڵ، شوان، سەنگاو، قەڵا سێوکە.
- ساڵی ١٩٧٤ دوابەدوای دەستپێکردنەوەی شەر لەنێوان کورد و حکومەتی عێراقدا لە هێزی قەرەداغ پێشمەرگایەتی کردووە، دوای هەرەسهێنانی شۆرش لە ساڵی ١٩٧٥، ئاوارەی ئێران بوو و ماوەیەك لە ئۆردوگای ئاوارەکانی سەراب لە نزیك شاری کرماشان مایەوە، لەو ماوەیەدا پەیوەندی لەگەڵ هەندێ لەو سەرکردانە دروستکرد کە دواتر بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستانیان دامەزراند لەوانە رەسول مامەند و عەلی عەسکەری، لە مەهاباد چاوی پێکەوتن و لەگەڵیاندا لەسەر گەرانەوە بۆ کوردستان و دەستپێکردنی جموجۆڵی سیاسی رێککەوت.
- پاش دامەزراندنی بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان، یەکێ لەو کادرانە بوو کە لقی کەرکوکی بزووتنەوەی سۆشیالیستیان دامەزراند ساڵی ١٩٧٩ لێپرسراوەتی رێکخستنەکانی لقی کەرکوکی گرتە ئەستۆ بووە ئەندامی دەزگای رێکخستنی ناوخۆی حیزبی سۆسیالیست.
- لە هێرشی سەختی ساڵی ١٩٨٩ی دەزگا ئەمنییەکاندا بۆ سەر رێکخستنەکانی حیزبی سۆشیالیست، توانی خۆی رزگار بکات تا ساڵی ١٩٩١ بە پەنهانی لە شارەکاندا مایەوە، لە ساڵی ١٩٩١دا بەشدارییەکی دیاری لە راپەریندا کرد و هەر ئەو ساڵە بە سەرپەرشتی و هاوکاری محەمەد شاکەلی ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتیی حیزبی سۆشیالیت لقی کەرکوکی حیزبی رێکخستەوە، ماوەیەك لە چەمچەماڵ سەرپەرشتی هێزی پێشمەرگەی حیزبی کرد.
- ساڵی ١٩٩٢ بەشداری لە کۆنگرەی دووەمی حیزبی سۆسیالیستدا کرد لە رانیە، ساڵی دواتر پشتگیری پرۆژەی هەڵوەشانەوەی حیزبی سۆشیالیست و چوونە ناو یەکێتیی نیشتیمانی کوردستانی کرد، پاش سەرکەوتنی پرۆژەکە کرایە کارگێری مەڵبەندی ٢ی رێکخستنی کەرکوك لە سنووری گەرمیان و چەمچەماڵ.
- ساڵی ١٩٩٥ کرایە قایمقامی چەمچەماڵ، ساڵی ١٩٩٧ وەك ئەندامی مەکتەب لە دەزگای شەهیدان کاری کرد.
- ساڵی ٢٠٠٠ بووە راوێژکار لە وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفال کراوان، ساڵی ٢٠٠٣ خانەنشین کرا.

*** محمد قەیتولی:-**

- ناوی (محەمەد مەجید مەلا سەعید)ە.
- ساڵی ١٩٧٢ لە گوندی قەیتول لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٩٩ کۆلێژی سەربازی لە قەڵاچوالان تەواو کردووە.
- ئێستا بە پلەی عەقید فەرماندەی فەوجە.
- بەرهەمەکانی:-
- قەیتول ژانێکی بێ کۆتایی، ساڵی ٢٠١٣.
- ئەنفالی ناوچەی قادر کەرەم، ٢٠١٤.
- میحوەری چواری کەرکوك قەڵغانی بەرگری و دژ بە هێرشەکانی داعش، ساڵی ٢٠١٧.

مەلا محەمەد ئەمین عەبدوڵڵا

محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە
لەگەڵ کۆمەڵێ هونەرمەند و نووسەردا

**لە چەپەوە: محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە – عەباس عەسکەر – عەبدولستار بەرزنجی**

**محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە و هونەرمەند تاهیر تۆفیق**

محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە لە كتێبخانەی خۆیدا

محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە لەگەڵ كۆمەڵێ ئەدیب و نووسەر
لە كۆنگرەی ئەدیبان و نووسەرانی هەولێر

**محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە و عەبدولڕەحمان مستەفای پارێزگاری کەرکوك**

**محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە و نازم بابان و لە پشتەوە ئەمین شوان**

مەلا مەجیدی قوتب و عەمید سەباحەددین عەبدوڵڵا لەگەڵ ئامر ئینزیباتی كەركوك ئەبو ئەیاد

محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە لەگەڵ كەسایەتییەكانی هۆزی زەنگنە

شێخ مەحمود و سەی محەمەدی جەباری و کۆمەڵێك لە ناوداری سەردەمی شێخ مەحمود

مەجید ڕەئوف و عوسمان مستەفا خۆشناو

شیخ مەجید نەجمەددین

شێخ مەحمود لەگەڵ کۆمەڵێك سەرۆك هۆزەکانی ناوچەی حەویجە

هەندێك زانای ناوداری کەرکوك لە ڕاستەوە: مەلا ئەحمەدی زەنگنە، مەلا مەجیدی قوتب، مەلا ئەحمەد مەلا حەکیم، مەلا عومەر گومبەتی، ساڵی ١٩٥٠ لە یەکێك لە قوتابخانە ئایینییەکانی سەر قەڵای کەرکوك.

شێخ مەحمود لە وێستگەی شەمەندەفەری کەرکوک ساڵی ١٩٢٧

شێخ محەمەد شێخ جەبار جەباری

مەردان عەلی عەبدوڵڵا

مەریەم خانی سەید ئەحمەدی خانەقا

مەلا ئەوڕەحمان

محەمەد ئەمین شەربەتچی

مام مەزەری گەرمیانی

محەمەد جاف و مەعروف چیاووك

سەیید محەمەدی جەباری

هونەرمەند محەمەد گوزەجی و پارێزەر هاشم رەجەب و جەمال بەهجەت

محەمەد سالح ئاغا

محەمەد شاکر پاشا مەکتوبچی

١٩٥٣ - ١٩٥٤ محەمەد سابیر و دکتۆر زەنون پیریادی و بەهجەت ڕەئوف تاجی

• محەمەد سابیر و بەهجەت ڕەئوف ناجی و دکتۆر محەمەد زەنون پریادی سالی ١٩٥٣-١٩٥٤

قوتابخانەی کاوە سەرتیب عەزیز و محەمەد سابیر و محەمەد حوسێن و عەلی ئەمین سالی ١٩٧٦

ئامادەیی کەرکوکی کوڕان سالی ١٩٦٥ سوبحی داودی و موحسین عەبدولحەمید و محەمەد سابیر

ئامادەیی کەرکوکی کوڕان سالی ١٩٦٥ موحسین عەبولحەیمد و محەمەد سابیر

دوکان سالی ١٩٥٨ محەمەد سابیر محەمەد و بورهان سالەیی و عەلی یەحیا مەنسور و مەعروف خەزنەدار و مستەفا نەریمان

دوکان سالی ١٩٥٨ محەمەد سابیر محەمەد و بورهان سالەیی و عەلی یەحیا مەنسور و مەعروف خەزنەدار و مستەفا نەریمان

**سلێمانی سالی ۱۹۵۸ محەمەد سابیر مەحمود و مارف خەزنەدار**

**مارف بەرزنجی**

مستەفا گوك قایا

مامۆستا محەمەد وەلی

محەمە دعەبدولرەحمان و میقداد محەمەد

حەمە سەعید بەگی جاف

شێخ محەمەد حوسامەددین قادری

شێخ محەمەد حوسامەدین عومەر قادری

شێخ محەمەد ڕەشید شێخە سورچی

محەمەد سەعید وەنداوی

محەمەد کەریم قوباد گەڵاڵی

لە ڕاستەوە:- هونەرمەندی کەمانچەژەن خالید جوانڕۆ و محەمەد بارام، کە یەکێك بووە لە گۆرانبێژە بە تواناکان کە لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا سەدایەکی باشی لەنێو گۆرانی کوردیدا هەبووە.

*** د. محەمەد رافع رەئووف جەباری:-**

- ساڵی ١٩٣٨ لە کەرکووك لەدایکبووە، لە گوندی ترکەڵان ئەو کات باوکی مامۆستای قوتابخانە بوو.
- باپیرەی تەکیە و مزگەوتێکی دروست کردووە و بەناوی خۆیەوە.
- باوکی کاری دەرس وتنەوە بووە لەنێو گوندەکانی دەوروبەری کەرکووك و نەبی یونس و تەلەعفەر و داقووق و لە لەیلان و تسعین.
- سەرەتایی و ناوەندی لە قەڵا و غەربییە و دواناوەندی لە کەرکووك تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٥٦ لە کۆلێژی پزیشکی لە بەغدا وەرگیراوە لە ساڵی ١٩٦٢ بەکالۆریۆسی لە پزیشك بەدەستهێناوە.
- لە دواییدا بووەتە ئەفسەری سەربازی بە پلەی مولازمی دووەم و دامەزراوە بە دکتۆر لە نەخۆشخانەی جمهوری و مەجیدیە لە بەغدا و لە ساڵی ١٩٦٦ گواستراوەتەوە بۆ هەولێر.
- ساڵی ١٩٦٧ پۆیشتووە و بۆ ئینگلتەرا و بڕوانامەی (FRCS. ED) بەدەستهێناوە.
- ساڵی ١٩٧١ لە نەخۆشخانەی جمهوری لە کەرکوك دامەزراوە.
- ساڵی ١٩٧٦ گواستراوەتەوە بۆ نەخۆشخانەی (الشعب) لە بەغدا و نور و (مدینة الطب).
- ساڵی ١٩٩٣ هاتووەتەوە کەرکوك.
- لە ١٣ی مایسی ٢٠٠٥ کۆچی دوایی کردووە.

*** د. محەمەد کەمالەدین مەحموود خاوەر (کەمال خاوەر):-**

- ساڵی ١٩٣٤ لە کەرکووك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٥٦ کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە، هەروەها کۆلێژی پزیشکی لە (ڤییەنا - نەمسا) تەواو کردووە.
- شارەزایی هەیە لە نەخۆشییەکانی پێست و حەساسیە.
- ساڵی (١٩٧٤ - ١٩٧٧) بووەتە ئامری نەخۆشخانەی سەربازی کەرکووك.
- ئامر تەبابەی تیپی یەك بووە.
- ئامر تەبابەی تیپی دوو بووە.
- ئامر تەبابەی تیپی پێنج بووە.
- ئامر تەبابەی فەیلەقی یەکەم بووە.
- ساڵی ١٩٨٤ خانەنشین کراوە.

*** نەقیب محەمەد سابیر سلێمان هەمەوەندی:-**

- ساڵی ١٩٥٧ لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- کۆلێژی یاسا و سیاسەت بەشی زانستی سیاسی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٢ کۆلێژی سەربازی لە بەغدا تەواو کردووە لە خولی ٣٢ لە بەشی (درع).
- ساڵی ٢٠٠١ بڕوانامەی لە ماف لە زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر بەدەستهێناوە.
- ساڵی ٢٠٠٣ بڕوانامەی لە زمانی ئینگلیزی لە کۆلێژی زمان دەرباری ئەدەبی ئینگلیزی.
- هەر لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە لە سوپا وازی هێناوە و پەیوەندی بە بزووتنەوەی کوردییەوە کردووە.
- ماوەیەك بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی بوو لەسەر ئیدارەی هەولێر لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، لە ئێستادا بە پلەی لیوا لە پۆلیسی هەولێر لە وەزارەتی ناخۆ.

*** عەمید ڕوکن (مالك خدر خۆشناو):-**

- ساڵی ١٩٦٦ لە کەرکووك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٧ کۆلێژی سەربازی عێراقی تەواو کردووە، لە ڕۆستەمییە، هەروەها کۆلێژی (ئەرکان) و (الحرب)ی تەواو کردووە.
- سەرۆك ئەرکانی (قیادە عملیات الرافدین) بووە.

*** مولازمی یەکەم (مەعسوم محەمەد عەلی ئاغا):-**

- ساڵی ١٩٠٢ لە کەرکووك لەدایکبووە.
- دەرچووی ئامادەیی سەربازی و کۆلێژی سەربازی بەغدا بووە خزمەتی لە بەسرە و ئەنبار و کەرکووك و ڕەواندز کردووە.
- ساڵی ١٩٦٣ خانەنشین کراوە، پاش ئەوەی لەلایەن (الحرس القومی)یەوە لە سەربازگەی (ڕەوازندن) خراوەتە بەندینخانە و لەو شوێنە باری تەندروستی تێکچووە و گیان لەدەست دەدات.
- باوکی ئەفسە و بووە لە سوپای عوسمانی لە کەرکووك.

*** مۆردەخای:-**

- یەکێ بووە لە هونەرمەندە جووەکانی کەرکوك، مۆسیقاژەنێکی بە توانابوو، ئامێری دووزەلەی لێدەدا، لە زۆربەی ئاهەنگەکانی بووك و زاوا و شایی و هەڵپەڕکێ و ئەگلەنجەکان وەك مۆسیقاژەن بەشدار دەبوو و ئامادەبووانی دەهێنایە جۆش و سەما، ئاوازێکی هەبوو بەناوی (ئۆین هواسی) واتا (گۆرانی شاد)ی، تورکمانەکانی کەرکوك ئێستا لە زۆربەی ئاهەنگەکانیان ئەو ئاوازە لێدەدەن و بە موڵکی هونەریی خۆیانی دەزانن.

*** محەمەد نوور:-**

- بڕوانە ناوی (نووری) لە بەشی (نون)

* ( ناجی عەباس ئەحمەد - دکتۆر ناجی عەباس ئەحمەد ):-

- ناوی (ناجی کوری عەباسی کوری مەلا ئەحمەد)ە،
- ساڵی (١٩١٢) لە گەرەکی بڵاخی کەرکوك هاتووەتە دنیاوە.
- لە سەرەتادا خوێندنی فەقێیاتی تەواو دەکات و سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك دەخوێنێت و دەبێتە مامۆستا لە رەواندوزو ئاشنایەتیی لەگەڵ (حوسێن حوزنی موکریانی) دەبێت.
- ساڵی (١٩٣٨) قوناغی ئامادەیی تەواو دەکات.
- ساڵی (١٩٤٢) بروانامەی بەکالۆریۆس لە بەشی جوگرافیا بەدەست دەهێنێت.
- ساڵی (١٩٤٣) وەکو ئەندامی دەستەی نوێی یانەی سەرکەوتن هەڵدەبژێرێ، بەڵام هەرزوو دەکێشتەوە لەبەر سەرقاڵی لە گۆڤاری گەلاوێژ.
- ساڵی (١٩٤٧) لە (میسر) بروانامەی دبلۆمی باڵا بەپلەی ئیمتیاز لە جوگرافیا وەردەگرێت.
- ساڵی (١٩٥٢) بروانامەی ماستەر لە زانکۆی (کلارك) بەدەست دەهێنێت پاشان لە بەغدا لە زانکۆی بەغدا وانەی جوگرافیا دەڵێتەوە.
- ساڵی (١٩٥٩) بەشداری چالاکانە لە کۆنگرەی یەکەمی مامۆستایان لە شەقڵاوە دەکات.
- ساڵی (١٩٦٣) روو لە ئەڵمانیای رۆژئاوا دەکات ولە زانکۆی (هایدلبیرگ) پلەی دکتۆرا بەدەست دەهێنێت، لەوێوە دەگاتە لیبیا و دووساڵ وانە دەڵێتەوە.
- ساڵی (١٩٦٨) دەگەرێتەوە عێراق و لە زانکۆکانی بەغداو سلێمانی و بەسرە وانە دەڵێتەوە.
- ساڵی (١٩٧١) بە ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی کۆری زانیاری کورد هەڵدەبژێرێت لە لیژنەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (کۆچەری ترانس هیومانس لە پارێزگای سلێمانی و هەولێر)، بەغدا، ١٩٧٤.
- (کچانی کورد)، هینی هارۆڵدهنسن، وەرگێران، بەغدا، ١٩٨١.
- ساڵی (١٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٤) کۆچی دوایی کردوو و لە گۆرستانی ئەحمەد لە هەولێر بە خاك دەسپێدرێت.

* ( نادر دەمگێر ):-

- یەکێکە لە مەقام زانەکانی کەرکوك.
- زانیاریمان نییە دەربارەی کارە هونەرییەکانی.

* ( ناری کەرکوکی ):-

- شاعیرێکی کلاسیکی کوردییەو شیعری بە تورکی نووسیوە هاوسەردەمی شاعیری کورد (رەنجوری) بووە کە دەکاتە نێوان ساڵانی (١٧٥٠-١٨١٠).

* ( ناز فەلەکەدین کاکەیی ):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی (چیرۆکی ئەستێرەکان)، هەولێر.

* ( نازدار ئەحمەد ):-

- ساڵی (١٩٧٢) لە شاری خورماتوو لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٥-٢٠٠٣) بەبەردەوامی بەشداری کردووە لە پێشانگاکانی هونەرمەندانی سلێمانی و هەڵەبجەو دهۆك و هەولێر.

- هەروەها بەشداری هەیە لە دەرەوەی وڵات لە هۆڵەندا.
- ساڵی (١٩٩٥) بەشداری فێستیڤاڵی هەڵەبجەی كردووە.
- ساڵی (١٩٩٦) بەشداری فێستیڤاڵی كەركوك كردووە.
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری سێیەم پێشانگای خانمانی كردووە.
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری هەشتەمین پێشانگای هونەرمەندانی كردووە.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری چوارەمین پێشانگای خانمانی كردووە.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری پێشانگای زاموای كردووە.

* (نازم ئەلعاسی - شێخ نازم ئەلعاسی):-

- ساڵی (١٩٢٠) لە دێی (تەل ئەلجەوال) لە ناحیەی (تازە) لەدایكبووە.
- یەكێك بووە لەو كەسایەتییە ئاینییانەی كە دەورێكی باڵای بینییوە لە پەیوەدی نێوان دەولەتی عێراق و مەلا مستەفای بارزانی لە چارەسەركردنی كێشەی كورد، بۆیە گەلێك هاتووچۆو پەیوەندی لەگەڵ كورددا هەبووە.
- لە (٨)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٨٣) كۆچی دوایی كردووە.

* (نازم محێدین ئەحمەد - دكتۆر نازم محێدین ئەحمەد):-

- ساڵی (١٩٤٨) لەدایكبووە.
- لە فیزیا یەكەمی هێنا لە عێراقدا.
- لە ترسی رژێمی بەعس بۆ ناو شۆڕش هەڵات و لە ڕێگاوبان شەهید كرا، هەندێك دەڵێن ڕشایەوەو كۆچی دوایی كرد لە ساڵی (١٩٨٦).

* (نازم ناسر):-

- ساڵی (١٩٤٨) لە كەركوك لە قەڵا لەدایكبووە.
- ماجستێری لە مێژوو لە زانكۆی (سانت بوترسبۆرگ) وەرگرتووە.
- ساڵی (١٩٧٣) پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی (بهو البلدية) كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٧٤) پێشانگای هاوبەشی لە كەركوك كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٨) لە (سانت بوترسبۆرگ) پێشانگای بەرهەمەكانی كردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٩) پێشانگای تایبەتی خۆی لە (المركز الثقافي التركماني) لە شاری (فستروس) لە سوید كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٠) پێشانگای خۆی لە شاری (گۆتنبۆرگ) لە هۆڵی كتێبخانەی گشتی لە سوید كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٤) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵی كتێبخانەی گشتی لە شاری (فستروس) لە سوید كردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٦) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵی كتێبخانەی گشتی لە شاری (فستروس) لە سوید كردووەتەوە.
- ئێستا جێنشینە لە شاری (فستروس) لە سوید.

* (ناسر خەلەف):-

- ساڵی (١٩٧٢) پێشانگای تایبەتی كردووەتەوە لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەری بە ناوی (ئەلحجر ٧٢).
- ساڵی (١٩٧٣) لە ڕێككەوتی (١-٧)ی مانگی حوزەیران بەشداری پێشانگای هاوبەشیكردووە لەگەڵ هونەمەندان: (عەبدولرەزاق شێخلەر، خالید رەمەزان، فەخری جەلال، نورەددین عیزەت، سەعدوڵلا ئەلتكریتی، عەباس ئەرەنای، سوعاد ئەرسەلان، پۆلس عیسا، نەوزاد كەدەك، ئەكرەم سابیر كەركوكی، ئایدن ئەلعراقی، تاریق میخائیل، نەجمەدین محەمەد عەلی).

* (ناسیح بازرگان):-

- ساڵی (١٩٢٧) لە گەرەكی (ئاخور حوسێن) لەدایكبووە.
- یەكێكە لە شاعیرەكانی توركمان و كتێبێكی هەیە بە ناونیشانی (بزم اوغلان)، چاپخانەی (الجمهورية)، كەركوك، ١٩٦٨.
- ساڵی (١٩٩٠) كۆچی دوایی كردووە.

* (ناسیح غەفور رەمەزان):-

- ساڵی (١٩٤٨) لە كەركوك لەدایكبووە.
- قوناغەكانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە شاری كەركووك تەواو كردووە.

– لە هاوینی ساڵی (١٩٦٤) هاتووەتە ڕیزی پارتی دیموکراتی کوردستان.
– لە هاوینی ساڵی (١٩٦٩) بووەتە پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول.
– دەرچوی خولی یەکەمی (پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی شۆڕش)ە لە پایزی ساڵی (١٩٦٩) لە (ناوپردان).
– دوای تەواوکردنی خولەکە بووەتە مامۆستای شۆڕش، پاشان پشکنەری زانیاری (مفتیش معارف) بۆ قوتابخانەکانی سنووری ناوچەی هەورامان .
– ساڵی (١٩٧٠) وەکو هەڵبژاردەی شۆڕش چووەتە یەکێتی سۆڤێتی پێشوو بۆ خوێندن .
– لە هاوینی ساڵی (١٩٧٦) کۆلێژی پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی و یاسای نێودەوڵەتی زانکۆی (کییڤ)ی لە پایتەختی ئۆکرانییای سۆڤێتی جارانی تەواو کردووە.
– ساڵی (١٩٧٦) بروانامەی ماستەری لە پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی بەناونیشانی (پسپۆر لە پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی)و (وەرگێڕ لە زمانی روسیەوە بۆ زمانەکانی تر) وەردەگرێت.
– ساڵی (١٩٧٩) نووسینی نامەی دکتۆراکەی بە ناونیشانی (کێشەی کورد لە سیستەمی پەیوەنییەکانی نێودەوڵەتیدا لەنێوان هەردوو جەنگی یەکەم و ودووەمی جیهانیدا ) تەواو ئەکات و بە بریاری (لیژنەی باڵای بروانامەکان لە ئەنجوومەنی وەزیرانی یەکێتی سۆڤێت) لە ساڵی (١٩٨٠)دا بە پلەی زانستی دکتۆری فەلسفە لە مێژووی پەیوەنییەکانی نیودەوڵەتی و سیاسەتی دەرەوەی پێبەخشرا.
– لە (٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٩٢) لە یەکەم کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، پۆستی یەکەم وەزیری پەروەردەی هەرێمی کوردستانی پێ سپێردراو، لە کابینەی دووهەمیشدا تا هاوینی ساڵی (١٩٩٦) لە هەمان پۆستدا بوو.
– لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٤)وە تاکو (٢٥)ی تەمموزی ساڵی (٢٠٠٩) ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بوو.
– لە (١٧)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠١) تاکو (١٧)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٦) سەرۆکی فراکسیۆنی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە لە پەرلەمان.
– ساڵانی (١٩٩١-٢٠٠٤) چوارجار بەڕێوبەری پەیمانگەی کادیرانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، لەهەمان کاتدا لەبەهاری ساڵی (٢٠٠٢) تاکو ساڵی (٢٠٠٤) بەرپرسی (مەکتەبی ناوەندی دراسات و پێگەیاندنی حیزبی) پارتی دیموکراتی کوردستان بوو.
– ماوەی زیاتر لە چل ساڵە لە بوارەکانی رامیاری و کۆمەڵایەتی ووتار و لێکۆڵینەوە ئەنووسێت، بە نازناوی (ن.بێباك) پەخشان و هۆزان ئەهۆنێتەوە .

* ( ناسیح ئەفەندی - مەلا ناسیح ئەفەندی ):-

– ناوی (مەلا ناسیح کوڕی محەمەد کوڕی مەحموود مودەریس)ە.
– ساڵی (١٨٧٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ماوەیەك ڕۆیشتووە بۆ ئێران بۆ خوێندنی زانستی ئایینی و

لە دواییدا کە گەڕاوەتەوە لەلای زانا (عەلی حیکمەت ئەفەندی) ئیجازەی زانستی ئایینی وەرگرتووە.
– بووەتە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی (شاقولی)و ماوەیەك دەرسی وتووەتەوە لە مزگەوتی (نائیب)و مزگەوتی (ئۆلو جامیع) لە بان قەڵا.
– لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا کراوە بە سەرۆکی زانایانی ئایینی کەرکوك.
– لە ماوەی ژیانیدا هاورێتی گەلێك لەم زانا ئایینیانەی کردووە وەکو: (شێخ محەمەد عەلی تاڵەبانی، شێخ جەمیل تاڵەبانی، عەلی حیکمەت ئەفەندی، مەلا رەزای واعیز، مەلا مەحموودی مەزناوی، مەلا ئەحمەد ڕۆژبەیانی، مەلا ئەحمەد حەکیم، شێخ مستەفا باقی).
– ساڵی (١٩٤٢) کۆچی دوایی کردووە.

* ناسیح مەلا تەیب:-

– ساڵی ١٩٤٥ لە چەمچەماڵ لەدایکبووە.
– لە تەمەنی لاوێتیدا بووە بە پێشمەرگەی ئەیلوول و لەبەر لێهاتووی دەبێتە سەرپەل لە هێزی رزگاری.
– لە چەندین داستانی قارەمانانە رووبەرووی حەرەس قەومی و دەبابەی دوژمن بووەتەوە و لە داستانێکدا لە زەنان پاش بەرەنگاری تۆپ و تانك و دەبابە ئەیهێنشتبوو لاشەی هاورێی شەهیدی مەلا ئەحمەدی زەنانی بکەوێتە دەست دوژمن.
– لە ڕاپەڕینی چەمچەماڵ شەهید دەبێت.

* ناهیدە تاڵەبانی:-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- (ئەنفالی گەرمیان‌و رەهەندە دیمۆگراف، ئابووری، کۆمەڵایەتییەکانی)، هاوبەش، سلێمانی، ۲۰۰۲.
- (دەرامەتی سەرچاوە ئاوییەکان)، سلێمانی، ۲۰۰۸.

* (نەبەرد جاف):-

- ساڵی (۱۹٤۷) لە کەلار لەدایکبووە.
- ساڵی (۱۹٦۷) کۆلێژی سەربازی تەواو دەکات.
- ساڵی (۱۹۷۲) کۆلێژی زمانی ئینگلیزی‌و ئەدەبی فارسی تەواو دەکات.
- ساڵی (۱۹۷٤) بەشی زمانی ئینگلیزی لە کۆلێژی ئاداب لە تاران تەواو دەکات.
- ساڵی (۱۹۷۹) لەگەڵ خانەوادەکەی دەگەڕێنەوە بۆ عێراق.
- ساڵی (۱۹۸۷) چووەتە ریزی پێشمەرگەی کوردستانەوە.
- لە رۆژنامەکانی (کەیهان)و (مامۆستای کورد)و (کاروان) بەرهەمی بڵاوکردووەتەوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (هەرگیز نالێم پەشیمانم)، شیعر، نەرویج، ۱۹۸۸.
- (بارانی مەرگ)، شیعر، نەرویج، ۱۹۸۸.
- (چروستانی)، شیعر، نەرویج، ۱۹۸۸.
- (بەغدا)، چامەیەکی درێژ، بەغدا.
- لە (۹)ی شوباتی ساڵی (۱۹۹۳) بەدەستێکی موخابەراتی عێراقی لە ناو چووە.

* (نەبیل قاسم دارا):-

- یەکێکە لە شێوەکارەکانی کەرکوك.
- لەنێوان ساڵانی (۱۹۷۹-۲۰۰٦) گەلێك پێشانگای کردووەتەوە.

* (نەجات شوکر کەوسەر ئۆغلوا):-

- ساڵی (۱۹٤۹) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دبلۆمی لە زانستی پیشەسازی بەشی دارسازی تەواو کردووە.
- بەرهەمەکانی:
- (نصر الدين خوجا)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (جمهوريت)، کەرکوك، ۱۹٦۹.
- (Okul Siirleri)، شیعر بە زمانی تورکی، ۲۰۰۳.
- ئوکوما کتابی، ۲۰۰٤
- تیمیل ئوکو سوزلك، ۲۰۰٤
- ئوکول شیعرلری، ۲۰۰٤
- ئوکول شیعرلری، ۲۰۰٥
- ئوکول شیعرلری، ۲۰۰۷
- ئوگیرجیلر ایجین حیکایلر، ۲۰۰۷
- بحث حول عشيرة البيات، وەرگێران ۲۰۰٤
- من حوادث كركوك، بەرگی یەکەم، ۲۰۰٦
- صفحات من تأريخ كركوك، ۲۰۰۹
- عێراقتە ترکچی یرادللاریکیلا ئوزو، ۲۰۱۲
- تأريخ الأدب التركي في العراق، وەرگێران، ۲۰۱۲
- ادبیاتمیزن سونمیز چیراگی، ۲۰۱۲
- ئێستا سەرنووسەری رۆژنامەی (تورکمن ئیلی)یە.

* نەجدەت مستەفا ئەحمەد زەینەڵ:-

- ساڵی ۱۹٦٤ لە پریادی لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- البنفسج.
- قساوة الحب والحياة.

* (نەجدەت قاسم ئەلساڵحی - دکتۆر نەجدەت قاسم ئەلساڵحی):-

- ساڵی (۱۹٤۰) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (احتياجات محافظة بغداد من المدارس الابتدائية ذات السنوات الثلاث في خطة تعميم التعليم الابتدائي)، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی بەغدا، بەغدا، ۱۹۷٤.
- (اهداف المدرسة الابتدائية)، بەغدا، ۱۹۷۷.
- (بدائل معترضة برامج التعليم النظامي للمراة العراقية المتحررة من الامية)، بەغدا، ۱۹۸۲.
- (البعد النفسي والتربوي في تنشاة الطفل)، بەغدا، ۱۹۷۹.

- (التخطيط للمتابعة في الحملات المحلية الشاملة لمحو الأمية)، ديمەشق، ١٩٧٩.
- (التربية والعلاقات الإجتماعية في دور الحضانة او الأسرة والمجتمع)، ١٩٨١.
- (التقويم والامتحانات في مدارس اليافعين)، بەغدا، ١٩٧٧.
- (التوجية والإرشاد والخدمات الطلابية في مدارس اليافعين)، بەغدا، ١٩٧.
- (دراسة مسحة في مشكلة وحدات التخطيط التربوي في المحافظات)، بەغدا، ١٩٧٥.
- (مجالس الاباء والمعلمين)، ١٩٨٩.
- (التربية المستمرة في التراث العربي وإنعكاساتها في الوضع الحاضر)، ١٩٨٠.
- (الرضاعة جوانبها النفسية والاسرية)، ١٩٧٨.
- (المعتقدات التقليدية الشائعة لدى الأمهات العراقيات عن الحمل والولادة والرضاعة)، موسل، ١٩٨٣.

*** (نەجم سەنگاوی):-**

- ناوی (نەجم فارس ئاغا میر زۆراب)ە.
- ساڵی (١٩٤٥) لە دێی (کانی مامە)ی سەر بە ناحیەی سەنگاوی قەزای چەمچەماڵ لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٧) ماڵی باوکی بە خێزانەوە باردەکەن و دەڕۆن بۆ شاری کەرکوک.
- ساڵی (١٩٥٤) بە خێزانەوە دەگەڕێنەوە بۆ دێی (کانی مامە).
- ساڵی (١٩٥٩) لەگەڵ برا گەورەکەی دەچێتە بەغداو لە قوتابخانەی (الفيلية الاهلية) وەردەگیرێت و دوای تاقی کردنەوە لە پۆلی دووی سەرەتایی وەردەگیرێت، ساڵی دووەم دیسان تاقی کردنەوە دەکرێت و دەگوازرێتەوە بۆ پۆلی چوارەم، بەردەوام دەبێت لە خوێندن و ئامادەیی لەو قوتابخانەیە تەواو دەکات و پاشان لە بەشی دروستی ئاژەڵ لە بەغدا وەردەگیرێت و لە ساڵی (١٩٧١) دادەمەزرێت لە نەخۆشخانەی دروستی ئاژەڵ لە کەرکوک.
- چەند جارێك دەگوازرێتەوە بۆ چەمچەماڵ و ئاغجەلەر و قادر کەرەم و ڕومادی و سەنگاو، دیسان بۆ چەمچەماڵ بەهۆی بیرو باوەری نەتەوایەتییەوە.
- ساڵی (١٩٩٣) لە حکومەتی هەرێمی کوردستان خانەنشین دەکرێت.
- ساڵی (٢٠٠٠) لە ئەڵمانیا جێگیر دەبێت.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (خەباتی چەکداری و ڕامیاری نەتەوایەتی کورد ١٨٨٠-١٩٩٤)، ٢٠٠٩.

*** نەجمەدین بیرەقدار - دکتۆر نەجمەدین بیرەقدار:-**

- ساڵی ١٩٥٢ لە کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی ٢٠١٠ ماستەری بەدەستهێناوە لە کۆلێژی یاسا لە دانیمارك بە ناونیشانی (حقوق التركمان بين حق الوجود والصراع حول مدينة كركوك).
- بەرهەمەکانی:-
- تاش کۆپروو، رۆمان، ٢٠١١
- كركوك بين الحقيقة والواقع، ٢٠١١
- زمنی تانگی، رۆمان، ٢٠١٢
- الدساتير والقوانين العثمانية، نامەی دکتۆرا، ٢٠١٢
- العثمانيون حضارة وقانون، ٢٠١٣
- كركوك، شيعر، ٢٠١٤

*** (نەجمەددین حوسێن):-**

- (نەجمەدین کوڕی شێخ حوسێن نەقشبەندی)یە.
- لە کەرکوك لە ساڵی (١٨٨٦)ی زایین لەدایکبووە.
- لە تاقی لاوی دا بۆ خوێندن چووەتە (ئەستەنبوڵ) و لە پاشان هەر لەوێ کراوە بە مامۆستا لەیەکێ لە قوتابخانەکان.
- ساڵی (١٩١٣)دا لە ئەستەمبوڵ لە نووسینگەی پارێزەر (عبدولعەزیز بەگ بابان)دا ئیشی کردووە لە بواری (عثمانلي تسهيل مصالح)ی بۆ بینینی سکاڵای شەرعی و یاسایی و سزایی.
- لە دوا قۆناغەکانی خوێندنیدا پەیوەندی دەکات بە ریزەکانی کۆمەڵەی (هیڤی-هیوا) کە لە ساڵی (١٩١٢)دا دامەزراوە لەلایەن قوتابیانی کوردی ئەستەمبوڵەوە.
- هەر لە میانەی چالاکی ناوبراو لەم کۆمەڵەیەدا، کاتێك

گۆڤاری (ڕۆژی کورد) وەکو زمانحاڵی ئەم کۆمەڵەیە ئەکەوێتە دەرچوون بە هەردوو زمانی کوردی وتورکی، ناوبراو یەکێك بووە لە نووسەرە دیارەکانی بەشە کوردییەکەی ولەگەڵ دەرچوونی گۆڤاری (هەتاوی کورد) دوا بەدوای (ڕۆژی کورد) بەردەوام بووە لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی.

– کاتێ تورکە (کەمالییەکان) چوونە سەر کارو جڵەوی فەرمانڕەوایەتی تورکیایان کەوتە دەست کەوتنە ئازاردان و دەربەدەری کردنی، نەجمەددین ئەفەندی و هەندێك لە هاوڕێ شۆڕشگێڕەکانی ناچار بوون لە (٢٨)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٢) بەرەو وڵاتی (بولگاریا) لە دەستی ستەم و زوڵمی کەمالییەکان هەڵبێن ولەوێ نیشتەجێ بین.

– ئەوەی کە ڕوونە لەلای کەس و کارەکەی نەجمەددین ئەفەندی ئەوەیە کە ناوبراو تا ساڵی (١٩٢٨) لە بولگاریا بووە و ڕێوشوێنەکەی دیار بوو لە پاش ئەم مێژووە هەواڵ و سۆراغی نەزانراوە.

* (**نەجمەددین عەبدولڕەحمان بەرزنجی - شێخ نەجمەددین عەبدولڕەحمان بەرزنجی**):-

– ناوی (شێخ نەجمەددین (سابیری) کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی دووەم کوڕی شێخ مەحموودی قوتبی شۆڕیجە کوڕی شێخ عەبدولڕحمان کاشفی کوڕی شێخ عەبدولعەزیز تەیمزئابادی کوڕی شێخ محێدین کەرکوکی) یە.

- ساڵی (١٨٨١) لە دێی (شۆڕیجە) لە ناحیەی قەرە حەسەن لەدایکبووە.
- لە سەرەتادا خوێندنی ئایینی لەلای باوکی لە دێی شۆڕیجەو لە نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەم هاتووەتە کەرکوك‌و زانستە ئایینییەکانی لەلای (مەلا مەردان)و (مەلا مەجیدی قوتب) خوێندووە.
- دیوانێکی شیعری هەیە بەناوی (صابری).
- ساڵی (١٩٤٠) تووشی نەخۆشی بووەو لە ساڵی (١٩٤٤) کۆچی دوایی کردووە.

* ( نەجمەددین عەلی مەحموود هەمەوەندی ):-

- ساڵی (١٩٤٧) لە گەڕەکی (ساری کەهیە) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٥) پەیوەندی بە (جۆقەی موزیکی سوپا)ەوە کردووە.
- ساڵێك خوولی فێربوونی ئامێری (کلارنێت) لەسەر دەستی هونەرمەند (شەوکەت ڕەشید) تەواو کردووە.
- لە تیپی مۆسیقای (سولاف) وەك ئامێری تەپڵ بەشداری لەم تیپەدا کردووە.

* (نەجمەددین عەلی مەردان - دکتۆر نەجمەددین عەلی مەردان ):-

- ساڵی (١٩٣٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (رياض الأطفال في الجمهورية العراقية-تطورها ومشكلاتها واسسها التربوية)، بەغدا، ١٩٧٠.
- (دراسة تقويمية تجريبية وحدة مدرسي لتلاميذ الصف الاول الابتدائي)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (دراسة عن برامج والعاب رياض الأطفال)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (أساليب الاملاء في المرحلة الابتدائية)، بەغدا، ١٩٧٨.
- (بعض القواعد الاملائية)، بەغدا، ١٩٧٨.
- (التربية الإسلامية في المرحلة الابتدائية)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (سيكولوجية التعليم والتعامل مع أطفال دور الحضانة)، بەغدا، ١٩٨١.
- (موضوعات القراءة: التي يميل طلبة المدارس الاعدادية في مدينة بغداد إلى قرائتها)، بەغدا، ١٩٨١.
- (دراسة تجريبية وتقويمية للوحدات الدراسية، وحدة وسائل لتلاميذ الصف الرابع الابتدائي)، بەغدا، ١٩٨٢.
- (تأريخ رياض الأطفال وتطورها في الفكر التربوي)، موسڵ، ١٩٩٠.
- (تكوين المفاهيم والتعليم في مرحلة الطفولة المبكرة)، بەغدا، ١٩٩٠.
- (التنمية اللغوية للفعل)، موسڵ، ١٩٩٠.
- (سيكولوجية اللعب من مرحلة الطفولة المبكرة)، بەغدا، ١٩٩١.

* ( نەجمەددین عومەر کەریم - دکتۆر نەجمەددین عومەر کەریم ):-

- ساڵی (١٩٤٩) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- لە شاری موسڵ کۆلێژی پزیشکی تەواو کردووە.
- سەرەتا لە ڕیزەکانی یەکێتی قوتابیان‌و پاشان لە ڕێکخستنەکانی پارتیدا کاری کردووە.
- تا ساڵی (١٩٧٥) لە کوردستان‌و لە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگەدا وەك پزیشك خزمەتی کردووە.
- ساڵی (١٩٧٥)ەوە لە وڵاتی ئەمریکا ژیان بەسەردەبا.
- ساڵی (١٩٨٨ لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردی (KNX) لە باکووری ئەمریکایان دامەزراند، لە ساڵی

(١٩٩١) تا ساڵی (١٩٩٩) سەرۆکی بووە.
– لە (١٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٠) یەکەم کورد بووە لەبەردەمی سناتی ئەمریکا قسە بکات بۆ بەرگری لە ماق گەلی کوردو ئاشکرا کردنی تاوانەکانی ئەنفال و کیمیاباران.
– لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٩١) یەکەم کۆبوونەوەی فەرمی وەك کورد لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا سازداو بوو بە قسەکەری سەرەکی کورد لە میدیاکانی ئەمریکا لەسەر کێشەی کورد.
– ساڵی (١٩٩١) ڕۆڵی سەرەکی هەبوو بۆ دامەزراندنی بەشی کوردی لە ڕادیۆی (دەنگی ئەمریکا).
– ساڵی (١٩٩٦) ئنیستیتیۆتی کوردی لە واشنتون دامەزراندوەو تا ماوەیەکی چاك سەرپەرشتی کاروبارەکانی کردووە.
– لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی کرد لە لەندەن و هەڵبژێردرا بە یەکێك لەو شەست و پێنج کەسەی سەرکردایەتی و بەشداری کۆبوونەوەی سەلاحەددینی کرد لە ساڵی (٢٠٠٣).
– ساڵی (٢٠١١) بووەتە پارێزگاری کەرکوك.

*** ئەجمەدین فەقێ عەبدوڵا :-**

– ناوی (ئەجمەدین رەشید عەبدوڵا)یە.
– ساڵی (١٩٥٦) لە شاری کەرکووك لەدایکبووە.
– خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی هەر لەو شارە تەواو کردووەو پاشان لە زانکۆی بەغدا، کۆلێژی کشتوکاڵی، بەشی ئابووریی کشتوکاڵی لە ئەبووغرێب وەردەگیرێ.
– ساڵی (١٩٧٢) چووەتە ریزی یەکێتیی قوتابیان و پارتی دیموکراتی کوردستانەوە.
– ساڵی (١٩٧٣) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.
– ساڵی (١٩٧٤) بووەتە ئەندامی کۆمیتەی شاری کەرکوك و هەر لەو ساڵەشدا دەستی بە نووسینی سیاسی کردووە.
– لە ئازاری (١٩٧٤)دا، بەرێنمایی شەهاب شێخ نوری، یەکەمین لیژنەی ناوچەی نهێنیی خوێندکارانی لە کەرکوك دامەزراندو خۆی سەرپەرشتیی کرد. لەم ماوەیەدا یەکەم بڵاوکراوەی هەواڵنامەی بۆ رێکخستنەکانی کۆمەڵە لە کەرکوك دەرکرد کە دوو ژمارەی لێ دەرچووە.
– ساڵی (١٩٧٥) بۆ رێکخستنەکانی بەغدا گوێزرایەوە. لەگەڵ دەستپێکردنی گەورەترین شاڵاوی گرتن و راوەدونانی ئەندامانی کۆمەڵەدا، بۆ ماوەیەك ناچار بوو بچێتە قۆناغی خۆشاردنەوە. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا بەشدار بوو لە دامەزراندنەوەی کۆمیتەی بەغدا – خانەقینی کۆمەڵەدا.
– لە تەموزی (١٩٧٦)دا لە یەکەمین مەفرەزەی سەرەتاییدا لە گەرمیان بووە پێشمەرگە بەڵام لە کۆتایی هەمان ساڵدا رەوتی رووداوەکان و پێویستیی قۆناغەکە وا کەوتەوە کە بگەڕێتەوە بۆ ناو شارو لە رێکخستنەکاندا درێژە بە خەباتی نهێنی بدات، بە تایبەتی دەزگا ئەمنییەکان تا ئەو کاتە زانیارییان سەربارەت بە پەیوەندی کردنی بە هێزی پێشمەرگەوە پێنە گەیشتبوو.
– ساڵی (١٩٨١) کاتێك شاڵاوی دەزگا ئەمنییەکانی کەرکوك لە دژی رێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر دەستی پێکرد، لە ساڵی سێیەمی خوێندنی کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی بەغدا بوو. بەهۆی شاڵاوەکەوە وازی لە خوێندن هێنا، پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردو لەبارەگای ناوەندی کۆمەڵە لە ناوزەنگ گیرسایەوە. لەم ماوەیەدا لە دەزگای لێکۆڵینەوەی زانستیی سەر بە دەزگای رۆشنبیری کۆمەڵە کاری کرد. ئۆبەرەی بەرهەمەکانی دەزگاکە کە نامیلکەیەکە بەناونیشانی (سیاسەتی بە عەرەب کردن لە کەرکوك) ئەو نووسیویەتی.
– ساڵی (١٩٨١)و لە قۆناغی سێهەمی خوێندیندا، بەهۆی مەترسی ئەو شاڵاوی گرتنەی کە بۆسەر کۆمیتەی ئاگر (کۆرەك) لە شاری کەرکووك دەستی پێکرد. دەست لە خوێندن هەڵدگرێ و دەچێتە شاخ.
– ساڵی (١٩٨١) لە شاخ، یەکەمین لێکۆڵینەوە بەنێوی: سیاسەتی بەعەرەبکردن لە کەرکووکدا چاپ و بڵاو دەکاتەوە.
– ساڵی (١٩٨٢) لە دەستەی نووسەرانی خولی دووەمی گۆڤاری کۆمەڵە بووە.
– ساڵی (١٩٨٢) وەك ئەندامی دەستەی نووسەرانی خولی دووەمی گۆڤاری (کۆمەڵە) چوار لێکۆڵینەوەی لەو گۆڤارە دەربارەی دابەزینی نرخی دراو لە عێراق و یاسای ژمارە ٩٠و کۆلۆنیالیزم بڵاوکردەوە.
– لە بیروباوەری ئایدیۆلۆژیدا لەو بڕوایەدا بوو کە کۆمەڵەی رەنجدەران دەبێ رادیکالترو خاوەنی ناسنامەیەکی چینایەتیی رووتتر بێ. ئەمەش هانیدا وردە وردە لە کۆمەڵە دوور بکەوێتەوە.
– لە ناوەراستی ساڵی (١٩٨٢)دا لە کۆبوونەویەکدا کە لە گوندی مەلا سەفیی ناوچەی بنگرد بەسترا، لەگەڵ چەند کادیرێکدا رێکخراوێکی چەپی رادیکالتری بەناوی (بەرەی رزگاریی زەحمەتکێشان) (بەرزە)یان پێکهێنا.
– ساڵی (١٩٨٦) بەشدار بوو لە هەڵوەشاندنەوەی رێکخراوەکەو لەگەڵ چەند هاورێیەکیدا (یەکێتیی خەباتی کۆمۆنیستی) پێکهێنا.
– ساڵی (١٩٨٨) خۆی و هاورێکانی ئەم رێکخراوەشیان هەڵوەشاندەوەو لێرە بەدواوە ئەو بۆخۆی لە پابەندبوونی رێکخراوەیی چەپە رادیکالەکان کشایەوە.
– لە راپەرینی ساڵی (١٩٩١)دا یەکێ بوو لە رێکخەرانی جووڵانەوەی شوورایی. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا گەرایەوە بۆ ناو ریزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.
– ساڵی (١٩٩٢) کرایە کارگێری مەڵبەندی ٢ی رێکخستنی کەرکوك و هەر ئەو ساڵە یەکەمین رێکخراوی مەدەنیی لە بواری ماق مرۆڤ کە تایبەت بوو بەماق ئەنفالکراوەکان بەناوی (کۆمیتەی بەرگری کردن لە مافەکانی قوربانیانی ئەنفال) لە شاری هەولێر دامەزراند.
– ساڵی (١٩٩٤) کرایە ئەندامی مەکتەبی هۆشیاری و ساڵی (١٩٩٥) بووە ئەندامی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژیی کوردستان.
– ساڵی (١٩٩٦) بووە جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی

پێشمەرگە بۆ کاروباری هۆشیاریی سیاسی و ڕاگەیاندن‌و لەم سەروبەندەدا وەك سەرنووسەر سەرپەرشتیی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (پێشمەرگە)ی کرد.

– ساڵی (١٩٩٧)ەوە لە هۆڵەندا نیشتەجێ بووەو لە ساڵی (٢٠٠٣) بڕوانامەی دیپلۆم لە ژمێریاریی تەتبیقی لە زانکۆی ئیراسمۆس لەو وڵاتە بە دەست دەهێنێ.

– ساڵی (١٩٩٧) چووە هۆڵەنداو تا ساڵی (٢٠١١) لەوێ مایەوە. لەم ماوەیەدا لە هۆڵەندا بڕوانامەی دبلۆمی (PDB)ی لە بواری ژمێریاریی‌و کۆمپانیاکان لە زانکۆی ئیراسمۆس بەدەستهێنا. پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان، کرایە ئەندامی ئەکادیمیای هۆشیاریی‌و پێگەیاندنی کادیران.

– کۆمەڵێ کتێب، وتارو وەرگێڕانی لە زمانی هۆڵەندییەوە هەیە. ئێستا لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری "کەوانە" یە و سەرۆکی دەزگای خەندان ە بۆ پەخش‌و بڵاوکردنەوە.

– ساڵی (٢٠١٣) لە پاڵ کارکردنی لە ئەکادیمیای هۆشیاری، لێپرسراوەتیی بەڕێوەبردنی (دەزگای خەندان)ی گرتە ئەستۆو لە هەمان کاتدا لە گۆڤاری (کەوانە)دا وەك ئەندامی دەستەی نووسەران کاری کرد.

دیارترین بەرهەمەکانی:–

– (تونی مەرگ: هێرشەکانی ئەنفال لە بەڵگەنامەکانی ڕژێمدا)، (چاپی یەکەم ١٩٩٥)،

– (بازرگانیی چەك لە جیهاندا)، (٢٠١٢).

– (مافی بڕیاردانی چارەنووس لەنێوان تیۆری‌و پراکتیکدا)، (٢٠١٢).

*** (ئەجمەددینە کەرە – حاجی ئەجمەددینە کەرە):–**

– (ئەجمەددین کوڕی محێددین)ە، ناوبانگی دەرکردبوو بە (حاجی کەرە).

– ساڵی (١٩٠٩) لە دێی (خالۆبازیانی) سەر بە ناوچەی (قەرە حەسەن) لەدایکبووە.

– ساڵی (١٩٧١) لە مانگی نیساندا بە نەخۆشی (شێرپەنجەی گەدە) کۆچی دوایی کردووە، شەش کوڕی لە پاش بەجێماوە:– (غەفور، عەبدولوەهاب، عەبدولقادر، یوسف، سەعید گل، نورەددین).

– حاجی پیاوێکی دەوڵەمەندو خاوەن زەوی وچەم‌و باخێکی زۆر بووە، کابرایەکی بەرچاوو دڵ تێربوو، یارمەتی هەژاران‌و لێ قەوماوانی داوە لە کوژاندنەوەی گەلێ ئاگرو ئاژاوەی ناوچەکەدا بەشداری کردووە بۆ چارەسەر کردنی گەلێ گیروگرفت زۆر جار پرسیان پێکردووە.

– پەیوەندی لەگەڵ پیاوە ناودارەکانی ئەو سەردەمەدا هەبوو، حاجی ڕاست گۆو قسە لە ڕوو بوو سڵی لە کەس نەکردووەتەوە بۆ وەرگرتنی مافی خۆی.

*** ئەجمەددین نورەدین ڕەشید خەفاف:–**

– ساڵی ١٩٥٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.

– ساڵی ١٩٥٣ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٧٤ بە ناونیشانی (دفاع جوي).

– ساڵی ٢٠٠٥ خانەنشین کراوە.

*** ئەجیب ئەبتەر عومەر زەنگەنە:–**

– ساڵی (١٩٢٩) لە کەرکووك لەدایکبووە.

– ساڵی ١٩٥١ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٢٧ بە ناونیشانی تۆپ هاوێژ.

– دەرچووی (سانت هیرس)ی بەریتانییە.

– دەرچووی کۆلێژی ئەرکانی بەغداو ئەرکانی هیندییە.

– دوا پلەی لە سوپا فەریق ڕوکن بووە.

– ساڵی ١٩٨٤ کۆچی دوایی کردووە.

*** (ئەجیب گەرمیانی):–**

– ناوی (ئەجیب عەبدوڵڵا بەرغەش)ە.

– ساڵی (١٩٥٠) لە خورماتوو لەدایکبووە.

– ساڵی (١٩٧٠) پەیمانگای مامۆستایانی تەواو کردووە.

– نووسەرو چیرۆکنووسێکی بە توانای کەرکوکە.

– لە (١٤) ئابی ساڵی (٢٠٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

*** (ئەجیب یەعقوبی – دکتۆر ئەجیب یەعقوبی):–**

– ساڵی (١٩١٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.

– ئامادەیی لە ساڵی (١٩٣٠) لە لوبنان تەواو کردووە.

– لە ١٩٣٧ کۆلێژی پزیشکی لە بەغدا تەواو کردووە.

– ماجستێری لە ساڵی (١٩٤٢) بەدەستهێناوە.

– دکتۆرێکی بە ناوبانگ بوو لە برینکاری مێشکدا بە دامەزرێنەری دادەنرێت لە عێراقدا.

– لە نیسانی ساڵی (١٩٥٨) هەڵبژێردراوە بە ئائیبی کەرکوك

تا هەڵوەشانەوەی مەجلیس لە شۆڕشی تەمموزدا لە هەمان ساڵ.
– لە ئاداری ساڵی (١٩٨٠) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

* (نەجیبە ئەحمەد):-

– ناوی (نەجیبە ئەحمەد حەکیم)ە، لە بنەڕەتدا خەڵکی حەفتەغارە.
– ساڵی (١٩٥٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی (١٩٧٦) کولێژی ئاداب، بەشی زمانی کوردی لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە، ماوەیەك مامۆستا بووە لە ئامادەیی چەمچەماڵ.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی:
– (راسان)، کۆمەڵە چیرۆکی کورت، هەولێر، ١٩٩٤.
– (پەپولەکانی مردن)، چیرۆك، هەولێر، ٢٠٠٥، چاپی دووەم ١٩٩٨.
– (مامزێك لە ئاو)، شیعر، هەولێر، ٢٠٠٥.
– (گوڵدانی خاڵی)، چیرۆکی منداڵان، بە هاوبەشی لەگەڵ موژدە حەمە باقی، سلێمانی.
– (حەشری گوڵە هەرمێ)، کۆمەڵی چیرۆك، هەولێر.
– (سەردەمی بێ تاوانی)، شانۆ، قوتبەددین سدقی، وەرگێران، هەولێر.

* (نەجیبە سابیر):-

– ساڵی (١٩٢٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– کۆلێژی (ملکة عالية)ی لە بەغدا تەواو کردووەو ماوەیەك لە بواری فێرکردن کاری کردووەو لە دواییدا وازی هێناوە.
– ماوەی دە ساڵ لە بەیروت لە پەیمانگای بەیروت خوێندویەتی و ماجستێری بەدەستهێناوە لە بواری ڕێکخستنی گوڵ بە شێوازی ڕێکخستنی یابانی.
– ساڵی (١٩٧٢) چوار پێشانگای لە بەیروت کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٧٤) پێشانگایەکی لە (جەدە) کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٩) دوو پێشانگای لە تۆرنتۆ لە کەنەدا کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٣) پێشانگایەکی لە کەرکوك کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٩٣) کتێبێکی (١١٢) لاپەڕەیی دەربارەی ڕێکخستنی گوڵ بەناونیشانی (فن تنسيق الزهور)، بە چاپ گەیاندووە لە بەیروت.

* نەجیب شێخ وەهاب – دکتۆر نەجیب شێخ وەهاب:-

– ساڵی ١٩٥٥ لە داقووق لەدایکبووە.
– بەرهەمەکانی:-
– قرية الإمام، ٢٠٠٥
– مرايا، ٢٠٠٦
– رباعيات نجيب، ٢٠٠٦
– مرآة القلب، ٢٠٠٦
– خويرات، شيعر، ٢٠٠٦

* (نەدا عەسکەر):-

– ساڵی (١٩٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– دەرچوویی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانە بەشی سیرامیك لە زانکۆی بەغدا لە ساڵی (١٩٨٥–١٩٨٦).
– ساڵی (١٩٨٦) یەکەم پێشانگای تایبەتی لە هۆڵی (ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان) لە بەغدا کردووەتەوە.
– ساڵی (١٩٨٧) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (الرعاية).
– ساڵی (١٩٨٨) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (سەنتەری لاوانی کەرکوك).
– ساڵی (١٩٨٩) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (چالاکی قوتابخانەکان).
– ساڵی (١٩٩٢) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (یانەی مامۆستایان).
– ساڵی (١٩٩٤) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (یانەی بابای کەرکوك).
– ساڵی (١٩٩٦) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (الاعداد والتدريب).
– ساڵی (١٩٩٨) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (سەندیکای هونەرمەندانی کەرکوك).
– ساڵی (١٩٩٩) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (سەندیکای مامۆستایان).
– ساڵی (٢٠٠٠) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (سەنتەری بەغدا بۆ هونەر).
– ساڵی (٢٠٠١) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە هۆڵی (فیستیڤاڵی بابل).

- ساڵی (١٩٨٧) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە چین و ژاپۆن.
- ساڵی (١٩٨٩) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە قەتەرو بەحرین.
- ساڵی (١٩٩٠) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە تونس.
- ساڵی (٢٠٠١) پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە ئەزمیر لە تورکیا.
- بەشداری هەموو پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوکی کردووە.

*** نەرمین تاهیربابا:-**

- ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکوک لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- لالیء مبعثرة، ٢٠١٣
- العین الثالثة، ٢٠١٣
- قصص وقصائد، ٢٠١٤

*** (نەرمین عەلی محەمەد ئەمین - دکتۆر نەرمین عەلی محەمەد ئەمین):-**

- ساڵی (١٩٦٧) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٧) ماستەری لە بەشی شوێنەوارناسی لە فەرەنسا تەواو کردووە بە ناونیشانی (شوێنەوارە کۆنەکانی سەدەی ناوەراست لە کوردستانی عێراق).
- ساڵی (٢٠٠١) دکتۆرای لە شوێنەوارناسی بەدەستهێناوە بە ناونیشانی (دێرو کڵێسەکانی کوردستانی عێراق لە پێش و دوای هاتنی ئیسلام).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (شواهد المقبرة السلطانیة في العمادیة)، کۆری زانیاری کورد، بە هاوبەشی لە دکتۆر عیماد عەبدولسلام، ٢٠١٠.
- وەکو ئەندامی شوێنەواری لەگەڵێك لە تیمەکانی شوێنەواری فەرەنسی و چیکی لە کوردستان کاری کردووە، وەکو (کۆشکی شەمامۆك، کلك و مشك، قەڵاکانی کوردستان، قوتابخانەی قوبهان لە ئامێدی).

*** نەرمین موفتی:-**

- ساڵی ١٩٥٩ لە کەرکوک لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- جروح في شجرة النخیل، چیرۆك، ٢٠٠٧

*** (نەزەر - مام نەزەر):-**

- ساڵی (١٩٠٧) لە گوندی (برایم غولام) لە شارۆچکەی (قادر کەرەم) هاتووەتە دنیاوە.
- لە تەمەنی (١٥-١٦) ساڵییەوە شمشاڵ دەژەنێت.
- یەکێکە لە نەیژەنە بەناوبانگەکانی گەرمیان.

*** (نەزەری گەرمیانی - مام نەزەری گەرمیانی):-**

- ئەم زاتە بەناوبانگە (کوڕی مام قەیسەر کوڕی محەمەد کوڕی مام هەیاس کوڕی هوشیار)ە، بە (دەروێش نەزەرگەرمیانی یا کەرکوکی) ناسراوە، بەرەچەڵەك لە نەوەی (خەلیفە عەزیز شارەزوور)یە.
- ساڵی (١٧٨٦) لە شاری کەرکوك هاتووەتە دنیاوە.
- شاعیری گەورەی کەرکوك مام هیجری دەدەی کاکەیی کورەزای مام نەزەرە.
- مام نەزەر لە شاری کەرکوك لە گەرەکی خان ئەحمەد (گەرەکی چای) دانیشتووە، لە بیناسازیدا دەستێکی رەنگین وباڵای هەبووە.
- خانووەکانی کە دروستی کردوون مێژووی دروستکردنی وناوی خۆی لەسەر پارچە بەردێك لە سەریان هەڵکەندووە.
- مام نەزەر دەنگی ناسك و گەلێك ئاوازی خۆشی زانیووە، بۆ سروودو ئاوازەکانی بە (ئاوازی نەزەری) بە ناوبانگە، برێکیان لای هاشم کاکەیی پارێزراوە.
- مام نەزەر بێجگە لە گۆرەکەی دوو مەزارگەی هەیە یەکێکیان لە کەرکوك (گەرەکی خان ئەحمەد چای) کە لە ساڵی (١٨٨٧)ی زاپینی مەلا عەلی کوڕی تازەی کردووەتەوە.
- ساڵی (١٨٧٥) لە تەمەنی ٨٩ ساڵیدا لە گۆڕستانی (ئەبو عولوك) لە شاری کەرکوك بە خاك سپێردراوە.

* ( نەزار ئەلسەلامی ):-

- یەکێکە لە رەخنەگرو نووسەرەکانی کەرکوك.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (إضاءات)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.
- (صاحبة الجلالة)، لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانی.
- (هواجس)، کۆمەڵە چیرۆك.
- (تحفة الاوصاف في انساب الاشراف).
- (تنوير الظلام الدامس في سيرة ومأثر وكرامات آل الشيخ نامس).
- (نبراس الحقيقة في معرفة اهل التصوف والطريقة)، لێکۆڵینەوە لە تەسەوف.

* ( نەسرەدین محێدین - مام نەسرەدین محێدین ):-

- ناوی (مام نەسرەدین کوری مام محێدین داوودە)یە.
- لە گوندی (ئەلبوسەباح) لە ناوچەی داوودە لەدایکبووە، لەلای (دارا بەگ) سەرۆك خێڵی داوودە.
- مام نەسرەدین یەکێکە لەوانەی شارەزای هەیە لە مەقامی (ئەڵلاوەیسیو قەتارو خورشیدیو نای نای) بە ئامێرەکانی (زورناو نەیو باڵەبانو دهۆڵو دومبەلەك).

* ( نەسرەدین تاڵەبانی - شێخ نەسرەدین تاڵەبانی ):-

- یەکێکە لە مەقام زانەکانی شاری کەرکوك.
- بەڵام زانیاریمان نییە دەربارەی چالاکییە ئەدەبییەکانی.

* ( نەسرەت مەردان - دکتۆر نەسرەت مەردان ):-

- ناوی (نەسرەت مەردان عەلی)یە.
- ساڵی (١٩٤٨) لە قۆریە لەدایکبووە.
- چیرۆك نووسو شاعیرە، لێکۆڵینەوەو شیعری هەیە بە زمانی تورکمانیو عەرەبی.
- ماجستێری هێناوە دەربارەی کارگێڕیی گشتی لە زانکۆی ئەنقەرە لە تورکیا.
- گەلێك بەرهەمی بە پێزی هەیە لە بواری شانۆو وەرگێڕاندا لەوانە:
- (جدل الهويات).
- (irakta yonetsel egitim)، نامەی ماستەر، ئەنقەرە، ١٩٨٠.
- (قوشلار لا دوستلوق)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا، ١٩٨٣.
- (جنوح السمكة في النهر)، ١٩٨٥.
- (کون ایدن کیجه)، چیرۆك بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٦.
- (باليق صودا يان كيدر)، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغدا، ١٩٨٩.
- (مطعم القردة الحية)، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، کوەیت، ١٩٨٩.
- (شفق)، شیعر بە زمانی تورکی، کەرکوك، ١٩٩٠.
- (الصفيحة ولو يقتلون الثعبان)، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، بەغدا، ١٩٩٠.
- (محمد الفاتح)، وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، ئەڵمانیا، ٢٠٠١.
- (حانة الأحلام السعيدة)، چیرۆك، نەمسا، ٢٠٠٣.
- (Bir olmek yetmez)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (عبد الوهاب اوچی)، کەرکوك، ٢٠٠٣.
- (إغتيال قلعة كركوك)، کەرکوك، ٢٠٠٤.
- (الأحزان تكبر في الغربة)، شیعر، ٢٠٠٤.
- (هذه هي كركوك)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (إطلالة على المسرح التركماني المعاصر)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- الصحافة التركمانية في العراق بين القرنين ١٩١١-٢٠٠٦، نامەی دکتۆراە لە هۆڵەندا، ٢٠٠٨.
- (شارع في كركوك)، کۆمەڵە چیرۆك، قاهیرە، (٢٠٠٨).
- هەنگی شەهری گێتسیمسین ڤارسین، ٢٠٠٩
- اوان الورد في كركوك، ٢٠٠٩
- محفز الأحلام، چیرۆك، ٢٠١٠
- حوزن مارتیلاری، ٢٠١٠
- حانة الأحلام السعيدة، چیرۆك، ٢٠١٢
- وداعاً سيلوبي، ٢٠١٣
- (احياء كركوك ومعالمها-صبحي ساعاتجي)، وەرگێڕان، ئەستەنبول.

* ( نەسرین شاکەلی ):-

- ساڵی (١٩٦٦) لە شارۆچکەی کفری لەدایکبووە.
- لە تەمەنی (١٣-١٤) ساڵیدا دەستی بە نووسینی کورتە چیرۆك کردووە.

- هەر لە منالییەوە خولیای نیگار کێشان بووەو یەکەم پێشانگای کە تێیدا بەشداری کردووە لە شاری (سنە) بووە لە کوردستانی رۆژهەلات، لەگەل هونەرمەندان (هادی زیائەددینی، رەمزی قوتبەددین)، دوو جار بەشداری لە پێشانگای شێوەکاری کردووە لە ولاتی سوید.
- خانەی مامۆستایانی سلێمانی تەواو کردووەو ماوەی زیاتر لە دوو سال خوێندکاری بەشی نیگار کێشان بووە لە لای هونەرمەند (هادی زیائەددینی).
- بەکالۆریۆس‌و ماستەری لە زانستی پەروەردەی کۆمەلایەتی بەدەستهێناوە، ماستەرنامەکەی بە زمانی سویدی لەسەر شوناسنامەو جینۆسایدداییە.
- چیرۆك‌و شیعرەکانی وەرگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی‌و فارسی.
- بەرهەمەکانی لە گۆڤاری (پەیام)و (هەنار)و (ئایینده) بلاوکردووەتەوە بە گەلێك گۆشەی جۆراوجۆر، وەکو (دەنگەکان)، (کلاورۆژنە)، (رینیسانس)و گەلێکی تر.
- رۆمانێکی ئامادەیە بۆ چاپ.
- سالی (١٩٩٠) لە ولاتی سوید دەژێت.
- لە سالی (١٩٩٠)ەوە.

* (نەشئەت ئیبراهیم):-

- سالی (١٨٦٤) لە ماردین لەدایکبووە.
- بووەتە فەرمانبەر لە پۆستەی کەرکوك لە سالی (١٨٨٦).
- سالی (١٨٩٢) بووەتە بەرێوەبەری پۆستەی کەرکوك.
- لە (٩)ی کانوونی یەکەمی سالی (١٩٢٥) تا تشرینی دووەمی سالی (١٩٢٦) هەلبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك لە (مجلس النواب العراقي).
- لە تەمموزی سالی (١٩٢٦) تا کانوونی دووەمی سالی (١٩٢٨) بووەتە نائیبی کەرکوك لە (مجلس النواب العراقي).
- سالی ١٩٣٤ کۆچی دوایی کردووە.

* (نەشئەت حەسەن محەمەد عەبدوللا):-

- سالی (١٩٦٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوکی تەواو کردووە.
- سالی (١٩٨٧)ەوە چووەتە نێو جیهانی هونەری شێوەکارییەوە.

* (نەعیمە مستەفا-نەعەنێر):-

- ئافرەتێکی شۆرە سواری ناوچەی گەرمیانە، کە لە شۆرشەکەی ئیبراهیم خانی دەلۆدا بەشداری کردووە.
- لەگەل ئەو خەلکە راپەریوەدا بەو ناوو شۆرەت بەناوبانگی خۆیەوە توانیویەتی جلی پیاوان بپۆشێ‌و لە یەکەم رۆژی راپەریندا پەلاماری سەرای شاری کفری بدات لەو کاتەدا بنکەی سوپای ئینگلیزی لێ بووە تەنانەت لەزۆر کەسایەتی‌و پیاوانی بەسالاچووی ئەم شارەم بیستووە لە سالی (١٩١٥) دا کە هێشتا عوسمانییەکان دەسەلاتیان بەسەر ناوچەکەو شارەکەوە هەبووە هەر ئەم (نەعیمە مستەفا)یە لە بەردزێوی ئاکارو بێ رەوشتی ئەفسەرێکی عوسمانی، ئەفسەرەکەی داوەتە بەر خەنجەرو لە شاری کفریدا کوشتوویەتی.
- لەو کاتەشەوە کەراپەرینی ئیبراهیم خان کۆتایی هات

ودووبارە ئینگلیزەکان کاروباری شارو ناوچەکەیان بەزەبری هێز وچاوساغی چەند کەسێکی ئەلقە لە گوێی خۆیان گرتووەتە دەست، لە بازاری شاری کفری دوکانێکی بازرگانی کردووەتەوەو بە سیفەتێکی پیاوانە توانیویەتی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی پێبەرێوەببا، لەبەرئەوەی لە سالانی جەنگی یەکەمدا مێردەکەی کە بەرەگەز یەکێك بووە لە تورکمانەکانی کفری بەر شالاوی (سەفەربەلك) واتە (نفير عام)ی عوسمانییەکان دەکەوێ ولە بەرەکانی شەرناگەرێتەوە خۆشی بۆ یەکجارەیی لە سالی (١٩٦٣)یدا کۆچی دوایی دەکات.

* (نۆرسی کەرکوك):-

- ناوی (عەبدولرەزاق کوری عەبدوللای شارەزووری)یە بە ناوبانگە بە (نۆرس).
- سالی (١٧٦١) کۆچی دوایی کردووە.
- لە کاتی خۆی چووەتو قوستەنتینیە لەوێوە دوورخراوە بۆ کریت‌و کوتاهیەو کاری کردوو لە قەزای (توسنە)و لەوێ مردووە.
- شیعری هەیە بە زمانی عەرەبی‌و تورکی‌و فارسی‌و دیوانی هەیە بە تورکی.
- بەرهەمەکانی:
- (مبالغ الحكم).
- (رسالة خواجه عبد الله النصاري)، وەرگێرانی لە فارسییەوە بۆ تورکی.

* (نەوزاد حوسێن دەروێش - دكتۆر نەوزاد حوسێن دەروێش):-

- ساڵی ١٩٧٥لە كەركوك لەدایكبووە.
- بڕوانامەی بەكالۆریۆسی لە ساڵی (١٩٩٩ . ٢٠٠٠) بەدەستهێناوە لە بواری پەروەردەی وەرزشی لە زانكۆی سەلاحەددین بە پلەی دووەم لەسەر ئاستی كۆلێژكە.
- بڕوانامەی ماستەری لە ساڵی ٢٠٠٦ وەرگرت لە بواری (القياس والتقويم- يارييه تيميييەكان) وەرزش لە زانكۆی كۆیە، بە پلەی نایاب.
- ساڵی ٢٠١٢ بڕوانامەی (دكتۆرا)ی وەرگرتووە لە بواری (القياس والتقويم - تۆپی باڵە) وەرزش لە زانكۆی كۆیە، بە پلەی زۆر باش.
- بڕوانامەی توانستی كۆمپیوتەر لە زانكۆی كۆیە.
- بڕوانامەی توانستی ئینگلیزی لە زانكۆی كۆیە.
- بڕوانامەی توانستی وانە وتنەوە لە زانكۆی كۆیە.
- لە ساڵی ١٩٩٧یەكەم توێژینەوەی لە گۆڤاری زانكۆی كۆیە بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (بعض القياسات الجسمية وعلاقتها بدقة أداء مهارة الارسال المواجه الأمامي (التنسي) لدى لاعبات منتخب الكرة الطائرة في جامعة كويه).
- لە ساڵی ١٩٩٨ دووەم توێژینەوەی لە گۆڤاری زانكۆی كۆیە بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (بعض مظاهر الانتباه وعلاقتها بدقة اداء مهارة الاستقبال ارسال لدى لاعبات منتخب جامعة كركوك بالكرة الطائرة).
- لە ساڵی ١٩٩٨ سێهەم توێژینەوەی لە گۆڤاری زانكۆی كەركوك .بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (مظاهر الانتباه وعلاقتها بدقة التهديف ثلاث نقاط لاعبات نادي (اكاد) الرياضي بكرة السلة).
- لە ساڵی ٢٠١١ چوارەم توێژینەوەی لە گۆڤاری زانكۆی كەركوك بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (انواع السرعة وعلاقتها بدقة أداء مهارة استقبال ارسال لدى لاعبات منتخب جامعة كوية بالكرة الطائرة).
- لە ساڵی ٢٠١٢ پێنجەم توێژینەوەی لە گۆڤاری زانكۆی (قادسيه) بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (تأثير التقنيات الحديثة في قياس القوة الانفجارية وسرعة الكرة اللحظية في مهارة الضرب الساحق الخلفي للاعبي نادى شقلاوة الرياضي).
- لە ساڵی ٢٠١٣ شەشەم توێژینەوەو لە گۆڤاری زانكۆی دهۆك بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (تأثير كرات مختلفة كوسيلة تدريبية مساعدة في تطوير بعض المتغيرات الكينماتيكية ودقة التهديف لدى للاعبي ناشئي كرة القدم).
- لە ساڵی ٢٠١٣ حەوتەم توێژینەوەی لە گۆڤاری زانكۆی كۆیە بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (دراسة مقارنة لبعض مظاهر الانتباه بين لاعبي كرة القدم والكرة الطائرة لعددمن اندية اقليم كوردستان للدوري الممتاز).
- لە ساڵی ٢٠١٣ هەشتەم توێژینەوەی لە گۆڤاری زانكۆی (بەسرە) بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (بعض انواع المرونة وعلاقتها بدقة اداء بعض المهارات الأساسية لدي لاعبات منتخب جامعة كويه).
- لە ساڵی ٢٠١٣ نۆیەم توێژینەوەی لە ((مؤتمر المجلس الدولي لمنطقة الشرق الاوسط الخامس للصحة والتربية البدنية والترويح والرياضة والتعبير الحركي)) لە دەوڵەتی ئیمارات (دوبەی) بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (طول وعرض القدم وعلاقتهما ببعض المتغيرات الكينماتيكية ودقة التهديف لدى لاعبات كرة الصالات).
- دە توێژینەوەی لە گۆڤاری زانكۆی (واست) بڵاوبووەتەوە لەژێر ناونیشانی (استخلاص اختبار مطاولة القوة المميزة بالسرعة للاطراف السفلى لدى لاعبي الكرة الطائرة في اقليم كوردستان/ العراق)٢٠١٤.
- كتێبێكی میتۆدیم لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی) لەژێر ناونیشانی (دليل الأبحاث لكتابة الأبحاث في التربية الرياضية).

* لە بواری وەرزشی:
١- بۆ ماوەی سێ ساڵ ڕاهێنەری تیپی باڵە بووە لە یانەی هێرش و چەندین بڕوانامەی ناو بژێوانی وەرگرتووە.
٢- بەشداری دەیان (كۆنفرانس و وۆرك شۆپ)ی كردووە لە بواری ئەكادیمی، وەرزشیدا.
٣- ساڵی (٢٠٠٨) بووەتە سەرۆكی یەكێتی ناوەندی تۆپی پەر لە كوردستان.
٤- بەشداری پێنجەمین پاڵەوانیتی تۆپی پەڕی وڵاتانی (عەرەب)ی كردووە لە ساڵی (٢٠١٠).
٥- ڕاهێنەری تۆپی پەڕی (زانكۆی كۆیە)ی كردووە لە ساڵانی (٢٠٠٩-٢٠١٢).
٦- ڕاهێنەری تۆپی باڵەی (زانكۆی كۆیە)ی كردووە لە ساڵانی (٢٠١٣ -٢٠١٤).

* (نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد - دكتۆر نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد):-

- ساڵی ١٩٦٢ لە كەركوك لەدایك بووە.
- ساڵی ١٩٨٦-١٩٨٧ كۆلێجی ئەدەبیات- بەشی زمان و ئەدەبی عەرەبیی لە زانكۆی سەلاحەدین لە هەولێر تەواو كردووە.
- ساڵی ١٩٧٩ یەكەم بابەتی ئەدەبیی لە ڕۆژنامەی (پاشكۆی عێراق)دا بڵاوكردووەتەوە.
- ساڵانی ١٩٨٣-١٩٨٤ لەگەڵ كۆمەڵێ خوێندكاری زانكۆی سەلاحەدیندا لە هەولێر گۆڤاری (ئاسۆس)یان دەركردووە.
- ساڵانی ١٩٨٤-١٩٨٥ لەگەڵ زاهیر ڕۆژبەیانی و مارف عومەر گول دوو ژمارەیان لە گۆڤاری (نێرگز) لە كەركوك دەركردووە.
- ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨ لەگەڵ عەبدوڵڵا سلێمان مەشخەڵ و جەمال كۆشش "حەڵقەی ئەدیبانی كۆمۆنیست"یان دامەزراندووەو گۆڤاری نهێنیی "ڕابەر"یان دەركردووە،

بەدەست لەسەر کاربۆن و وەرەقەی رایز نووسیویانەتەوە و بەنهێنی دابەشیان کردووە.
– ساڵانی ١٩٩٤–١٩٩٦ لەگەڵ ژمارەیەك نووسەردا پێنج ژمارەیان لە گۆڤاری (سەراب) لە هەولێر دەرکردووە.
– ساڵی ١٩٩٢ تا ساڵی ١٩٩٨ مامۆستای زمان و ئەدەبی عەرەبی بوو لە ئامادەیی ئازادی کوران لە هەولێر.
– لەنێوان ساڵانی ١٩٩٥–٢٠١٠ لە چەندین گۆڤارو ڕۆژنامەدا کاری کردووە، لەوانە: گۆڤاری کاروان، گۆڤاری ڕامان، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ڕۆژنامەی ئاسۆ، گۆڤاری سردم العربی، ڕۆژنامەی چاودێر، گۆڤاری (إشراقات كردية).
– ساڵانی ٢٠٠٣–٢٠١٠ سکرتێرو پاشان بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (سردم العربی) بووە لە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە سلێمانی، (٢٨) ژمارەی لەو گۆڤارە دەرکردووە.
– ساڵی ٢٠٠٨ بڕوانامەی ماستەری لە بواری ئەدەب و ڕەخنەی نوێدا لە زانکۆی سلێمانی–کۆلێجی زمان–بەشی عەرەبی بەدەست هێناوە. نامەی ماستەرەکەیشی بەناونیشانی: شار لە چیرۆکەکانی جەلیل قەیسیدا– خوێندنەوەیەکی سایکۆسۆسیۆلۆژی. (بەزمانی عەرەبی).
– ساڵی ٢٠١٢دا بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی سلێمانی، کۆلێجی زمان بەشی عەرەبی بەدەستهێناوە، ناونیشانی تێزی دکتۆراکەی: گێڕانەوە لەنێوان ڕۆمان و مێژوودا لە سێینەی (وادی کوفران)ی ڕۆماننووس زوهدی داوودی– خوێندنەوەیەکی سۆسیۆمێژوویی. (بەزمانی عەرەبی).
– لە ڕێککەوتی ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی٢٠١١ بە بانگهێشتی گۆڤاری هاڤیبون، لە زانکۆی ئازادی بەرلین لە کۆنفرانسی "شەرەفنامە، ناسنامەو سەرچاوەی مێژووی کورد" بەشداری کردووەو بابەتێکی پێشکەش کرد بەناونیشانی "شەرەفنامە لە خوێندنەوەیەکی سۆسیۆمێژووییدا".
– لە ڕێککەوتی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠١٥ لە چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی ڕەوەندی کوردی لە بەرلین سیمینارێکی پێشکەش کرد بە ناونیشانی "عەلمانییەت لە هزری د.محەمەد ئەرکوندا".
– ساڵی ١٩٩١ەوە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە.
– ساڵی ٢٠١١ەوە سەرۆکی بنکەی ڕووناکبیریی گەلاوێژە.
– خاوەنی بیست کتێبی چاپکراوە لەبوارەکانی ئەدەب و وەرگێڕان و بابەتی فیکریدا.
– حاڵی حازر مامۆستایە لە کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان– بەشی کۆمەڵناسی لە زانکۆی سلێمانی.
– بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر
– ئەرکەکانی ڕێکخراوی لاوان، نووسینی: لینین، وەرگێڕانی بەناوی خوازراوی (هەڵگورد) لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی خوێندکارانی کوردستان، بالیسان، ١٩٨٤.
– شیعرییەتی دەق و هەنگوینی خوێندنەوە، (دەق و ڕەخنە)، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠١.
– کح–یری ڕەخنەیی هاوچەرخ، (کۆمەڵێ وتاری وەرگێردراو)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١.
– گفتوگۆ لەگەڵ ئەدۆنیس، منداڵی–شیعر–تاراوگە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، چاپی یەکەم– ٢٠٠١، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٨.
– ئایین و عەلمانییەت و کۆمەڵگای مەدەنی، گفتوگۆ لەگەڵ د.محەمەد ئارکۆن، سازدانی: هاشم ساڵح، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٢.
– لەنێوان بلیمەتی و شێتیدا، نووسینی: هاشم ساڵح، کتێبی گیرفان (٢٣) دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، چاپی یەکەم ٢٠٠٢، چاپی دووەم لە کتێبخانەی سۆران لە هەولێر ٢٠٠٤.
– مەملەکەتی تیشکەکان، کۆمەڵی چیرۆکی جەلیل قەیسی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، چاپی دووەم لە بڵاوکراوەکانی ڕەخنەی چاودێر، ٢٠١٤
– عەلمانییەت و ئایین: ئیسلام–مەسیحییەت–خۆرئاوا، نووسینی: د.محەمەد ئارکۆن، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، چاپی یەکەم ٢٠٠٥.، چاپی دووەم پرۆژەی شەست کتێبی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان ٢٠٠٩.
– ئیسلام و گلۆبالیزم، د.محەمەد ئارکۆن، کتێبی گیرفان (٦٦)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
– ئەزموونی خوێندنەوە، چەند لاپەڕەیەکی ڕەخنەیی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٦.
– ئیسلام و عەلمانییەت، د.محەمەد ئارکۆن، سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبیی نما، هەولێر، ٢٠٠٧.
– شوناسی تەواونەکراو، داهێنان–ئایین–سیاسەت–سێکس، نووسینی: ئەدۆنیس، لە بڵاوکراوەکانی ڕەخنەی چاودێر، سلێمانی، ٢٠٠٨.
– نوێکردنەوەی ئەقڵی عەرەبی، نووسینی: ئەدۆنیس، کتێبی گیرفان زنجیرە (١٠٥) دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٩.
– سەرەتایەك لەبارەی سۆسیۆلۆژیای مەعریفە، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٩.
– فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی و ڕەخنەیی، بەڕێوەبەرایەتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠١١.
– فەرهەنگی زاراوەکانی ئەدەب و زانستە مرۆڤایەتییەکان، ناوەندی غەزەلنوس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی، ٢٠١٥.
– ئاشنابوون بە ئەرکون، پرۆژەی سەد نامیلکەی فەلسەفی دەزگای ئایدیا بۆ فیکرو لێکۆڵینەوە، سلێمانی ٢٠١٥.
بە زمانی عەرەبی:
– نصوص كردية حديثة، قصائد وقصص مترجمة، الطبعة الاولى، دار سردم للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٩
– الطبعة الثانية، من منشورات مهرجان گەلاوێژ الثالث عشر في السليمانية، ٢٠٠٩.
– المدينة في قصص جليل القيسي، قراءة سايكو–سوسيولوجية، دار تموز
للطباعة والنشر، دمشق– سورية، ٢٠١١.
– ترجمة كتاب (سبعون نافذة متجولة)، قصائد للشاعر شيركو بيكه س، من منشورات مهرجان كلاويز السابع عشر في السليمانية، تشرين الثاني ٢٠١٣.
– ثلاثية وادي كفران للروائي الكردي زهدي الداوودي– دراسة سوسيوتاريخية، دار تموز للطباعة والنشر، دمشق، ٢٠١٤.

* (**نەوزاد شێخانی**):–

– ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– پەیمانگای مامۆستایانی تەواو کردووە.

- بەرهەمە چاپكراوەكانی:
- (بیبلۆگرافیای چالاكییەكانی كۆمەڵە لە ساڵی (٢٠٠٨))، ٢٠٠٩
- (گوڵ و ئاسك و هەنگ)، چیرۆك بۆ منداڵان، ٢٠٠٩.
- (مێرووله)، چیرۆك بۆ منداڵان، ٢٠٠٩.
- مێژووی عەشیرەتی شێخان.

*** ( نەوزاد كەدەك ):-**

- ساڵی (١٩٧٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی كردووە لە هۆڵی یانەی مامۆستایان.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای ساڵانەی هونەرمەندانی كردووە لە هۆڵی (ئەلتەئمیم) بۆ هونەری نوێ.

*** نەوزاد عوسمان عەبدوڵڵا: -**

- ناسراو بە چیا.
- لەدایكبووی ساڵی (١٩٦١)ی گەڕەكی ئیمام قاسمی كەركوك.
- قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و پیشەسازیی لە كەركوك تەواو كردووە. هەر چوار زمانی كوردی و عەرەبی و توركمانی و فارسی بە باشی زانیوە.
- ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندیی بەشۆڕشەوە كرد.
- پاش هەرەسهێنانی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥)، گەڕایەوە بۆ كەركوك.
- ساڵی (١٩٧٩)دا پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستانەوە كردو لە ماوەی نێوان (١٩٨٠-١٩٨٢)دا بەشدار بوو لە چالاكییە شۆڕشگێرییەكانی ناو شاری كەركوك.
- لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٣)دا پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە كردو لە تیپی ٢١ی كەركوك بووە پێشمەرگە.

*** ( نەوزاد یوسف رەشید ):-**

- ساڵی (١٩٦٣) لە كەركوك لەدایك لەدایكبووە.
- لە رۆمانە چاپكراوەكانی: (جێتەنگی گوڵەكان)، ٢٠٠٧.

*** ( نەوشای زەنگەنە - مەلا نەوشای زەنگەنە ):-**

- شاعیر ناوی (نەوشای كوڕی وێشتا سپی زەنگەنە)یە.
- ساڵی (١٧٨٥) لە دێی گوڵباخی نزیك قادر كەرەم لەدایكبووە.
- ساڵی (١٨٣٤) كۆچی دوایی كردووە.

*** ( نذیر ئەمین قیردار ):-**

- لە ئایاری ساڵی (١٩٥٨) بووەتە نائیبی كەركوك.
- بەڵام زانیاریمان نییە دەربارەی چالاكییە هونەرییەكانی.

*** ( نزار تاڵەبانی- دكتۆر نەزاد تاڵەبانی ):-**

- ناوی (نزار غالب كوڕی سالح كوڕی عەبدولغەنی تاڵەبانی) یە.

- ساڵی (١٩٤٨) لە كەركوك لەدایكبووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٥-١٩٧٠) كۆلێژی پزیشكی دەم و ددانی زانكۆی بەغدا بە پلەی دووەم تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٧٥) چووەتە ئینگلتەراو دكتۆرای PH.CI لە ساڵی (١٩٧٩) لە زانكۆی (شفلید) تەواو كردووە.
- ساڵی (١٩٧٩) بووەتە مامۆستا لە زانكۆی بەغدا.
- ساڵی (١٩٩٢) پلەی پرۆفیسۆری بەدەستهێناوە.
- ساڵانی (١٩٩٠-٢٠٠٧) سەرۆكی لقی نەخۆشییەكانی دەم و ددان بووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) وەك راگری كۆلێژی پزیشكی ددانی زانكۆی بەغدا هەڵبژێردرا.
- لە زانكۆكانی دەرەوە وناوەوە گەلێك پۆستی جۆراو جۆری بەدەستهێناوەو گەلێك لێكۆڵینەوەی لە بواری پزیشكیدا بەدەستهێناوە.
- بەشداری كردووە لە پێكهێنان و سەرۆكایەتی و بەشداریكردن لە چەندین كۆنفرانسی زانستی پسپۆری لە هەرێمی كوردستان و ناوەوە دەرەوەی عێراق، هەروەها بەشداری كردووە لە پێكهێنانی كۆمەڵە و دەزگای پزیشكی ددان لە عێراق و لە وڵاتە عەرەبییەكانیشدا.
- بەشداری كردووە لە ئەنجوومەنی شێرپەنجەی عێراق وەك ئەندامی چالاك، هەروەها بەرپرسی یەكەم بووە لە دەستنیشانكردنی پێشوەختی شێرپەنجەی دەم و ددان.
- ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری پزیشكی ددانی عێراق و دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ئەكادیمیای كوردستان كە لە زانكۆی سلێمانی دەردەچێت.
- ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری لەیزەری عێراق بووە.
- ساڵی (٢٠٠٨) بە یەكەم راوێژكار لە دەستەی گۆڤاری شێرپەنجەی سەرو مل (Head & Neck oncology)ی جیهانی دانرا، كە زۆربەی ئەو دەستەیە لە پسپۆرانی شێرپەنجەی سەرو مل پێكهاتبوون لە وڵاتە یەكگرتووەكانی

ئەمریکا و ئینگلتەرا.
- لە (٣٠)ی ئابی ساڵی (٢٠١٣) کۆچی دوایی کردووە.

* نزار کەرکوکی :-

- (ناوی نزار محەمەد سابیر)ە
- ساڵی ١٩٦٦ لە گەرەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٨ پەیمانگەی تەکنەلۆژی بەشی کارەبای لە شاری رومادی تەواو کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- رەنجووری سەر قەتاری شاعیرانی کەرکوك و گەرمیان، ٢٠١٢.
- میرزا خەلیل منەوەری کاکەیی، شاعیری مەزنی میللی کەرکوك و گەرمیان، ٢٠١٣.
- لەبارەی شیعر و شاعیرانی کلاسیکی کوردی کەرکوك و گەرمیانەوە، ٢٠١٤.
- شاعیرانی کەرکوك، بەرگی یەکەم، هاوبەش، ٢٠١٥.
- شاعیرانی کەرکوك، بەرگی دووەم، هاوبەش، ٢٠١٥.
- شاعیرانی کەرکوك، بەرگی سێیەم، هاوبەش، ٢٠١٥.

* ( نوعمان رەزوان کەرکوکی - حاجی نوعمان رەزوان کەرکوکی ) :-

- زانیاریمان نییە دەربارەی.
- وەکو کەسایەتی لێهاتوو و رۆشنبیر رۆڵی هەبووە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی نییە.

* ( نوعمان نالە ) :-

- ناوی (نوعمان کوری نادر کوری چادر)ە.
- ساڵی (١٨٨٢) لە دێی فەرقانی ناحیەی لەیلان لەدایکبووەو گەلێك بەرهەمی شیعری لێ بەجێماوە.

* ( نوورەددین ئەمین ) :-

- ساڵی (١٩٦٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لەنێوان ساڵانی (٢٠٠١-٢٠٠٦)، نزیکەی حەوت پێشانگای تایبەتی خۆی کردووەتەوە لە ئەڵمانیا.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٩٧-٢٠٠٦) نزیکەی نۆپێشانگای هاوبەشی لە شارەکانی ئەڵمانیا کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠١) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٣) پێشانگای تایبەتی خۆی لە ئەڵمانیا کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٤) پێشانگای تایبەتی خۆی لە ئەڵمانیا کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٥) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵەندا کردووەتەوە.
- ساڵی (٢٠٠٦) پێشانگای تایبەتی خۆی لە ئەڵمانیا کردووەتەوە.
- پێشانگا هاوبەشەکانی:
- ساڵی (١٩٩٧) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە بەلجیکا-برۆکسل.
- ساڵی (١٩٩٨) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە بەلجیکا-خینت.
- ساڵی (٢٠٠٠) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە یۆنان-ئەسینا.
- ساڵی (٢٠٠٢) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە هۆڵەندا-کۆڵن.
- ساڵی (٢٠٠٣) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە هۆڵەندا-ئینکهاوزن.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە ئەڵمانیا-فایمەر.
- ساڵی (٢٠٠٤) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە ئەڵمانیا-زوول.
- ساڵی (٢٠٠٥) بەشداری چوار پێشانگای کردووە لە ئەڵمانیا، کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری سێ پێشانگای کردووە لە ئەڵمانیا.

* ( **نورەددین جاف** ):-

- ناوی (نورەددین ئیبراهیم جاف)ە.
- سالی (١٩٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خانەی مامۆستایانی لە شاری سلێمانی لە سالی (١٩٧٨) تەواو کردووە.
- سالی (١٩٧٥) بەشداری پێشانگای سالانەی خانەی مامۆستایانی کردووە.
- سالی (١٩٧٦-١٩٧٨) بەشداری پێشانگای سالانەی خانەی مامۆستایانی کردووە.
- سالی (١٩٨٧-١٩٨٨) پێشانگای هاوبەشی لەگەل هونەرمەند حیسام حەکیم لە شاری هەولێر کردووەتەوە لە هۆلی میدیا.

* ( **نورەددین ڕەزا واعیز** ):-

- سالی (١٩٢٩) لە کەرکوك لەدایکبووە. لە هەندێ سەرچاوەکان (١٩٢٨) بە سالی لەدایکبوونی دادەنێن.
- بەکالیۆریۆسی لە یاسا بەدەستهێناوە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (جلال الدین الرومی).
- (اسرار الماسونية-جواد رفعت اتلخان)، وەرگێران لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٧، چاپی دووەم، لیبیا، ١٩٧٢.
- (الإسلام والصراط المستقيم-ليث مورغان)، وەرگێران، بەغدا، ١٩٦١.
- الجريمه، دوافعها واساليب مكافحتها)، چاپخانەی (الإرشاد)، بەغدا، ١٩٦٢.
- (تراثنا العربي الإسلامي وضرورة احيائه)، چاپخانەی (جمهوريت)، بەغدا، ١٩٦٩.
- (مسائل في الارث)، چاپخانەی (الاداب)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (مسائل في الإرشاد على ضوء كتاب الميراث من شرح اللمعة الدمشقية)، نەجەف، ١٩٧٣.
- (نظرية الظروف الطارئة في القانون المدني والفقه الإسلامي).

* ( **نورەددین عیزەت** ):-

- سالی (١٩٤٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دبلۆمی لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان بەشی شێوەکار لە بەغدا لەنێوان سالانی (١٩٦٥-١٩٦٦) تەواو کردووە.
- سالی (١٩٧٣) بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کەرکوك کردووە لە یانەی مامۆستایان لە (١-٧)ی حوزەیرانی هەمان سال.
- بەشداری کۆمەلێك پێشانگای کردووە لە عێراق و دەرەوە عێراق.
- تابلۆکانی کاریگەرە بە هێلی بەهێزو ڕەنگی شین و زەردو کەوتۆتە ژێر کاریگەری بابەتی کەلەپوری و هونەری لادێ و شێوازی واقیعی و نوێ.

* ( **نورەددین محەمەد سەعید** ):-

- سالی (١٩٥٥) لە شاری کەرکوك هاتووەتە دنیاوە، هەر سێ قوناغی خوێندنی لە شاری کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی (١٩٧٩) لە زانکۆی بەغدا لە کۆلێژی ئاداب بەشی کۆمەلناسی وەرگیرا پاشان تێزێکی پێشکەش بە زانکۆ کرد بە ناونیشانی (دەربارەی ژیانی کۆمەلایەتی لە قوشتەپە) بروانامەی ماستەری بە سەرکەوتووی بەدەستهێنا، تا بلێی دەست و دل فراوان و قسەخۆش و عەرەبی زانێکی باش بوو بۆیە هاوەلەکانی بە (بحر) ناویان دەبرد چونکە کارامەیەکی چاکی هەبوو لە زمانی عەرەبی.
- لە بواری چیرۆکدا شارەزاییەکی باشی هەبوو و کۆمەلە چیرۆکی (ولله‌م هوامش) گەواهی زیرەکی بەتوانای ئەو دەدەن لە بواری چیرۆکدا ئەم کتێبە هەر ئەوەندەی سالی (١٩٨١) لە بەغدا بلاوبووە بووە مایەی گفتوگۆو گەلێ لێکۆلینەوەی لەسەر ئاستی ولاتە عەرەبییەکان لەسەری کرا.
- جێگەی قسە وباسی نووسەرانی وەکو (کەمال لەتیف سالم)ی چیرۆکنووس و (مونەییەد ئەلبەحش)ی ڕەخنەگرو (د. عەلی جەواد)و (تاهیری ڕەخنەگر)و (عەبدولستار بەیزانی)و چیرۆکنووس وهی دیش.
- پاشان دووکتێبی بە چاپ گەیاندووە بە ناوی (ولله‌م هوامش ایضا) و (معوقات التنمية في العالم الثالث).
- لە (٢٢)ی تەمموزی سالی (١٩٨٣) نووسەر لە گەڕانەوەیدا لە هەولێرەوە بەرەو بەغدا دوای بەدەستهێنانی ئاواتی لە مێژینەی بەدامەزراندنی بە مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەددینی هەولێر لە ئەنجامی کارەساتی پێکدادانی ئۆتۆمبیل گیانی لە دەست دا.
- گەلێ چیرۆك و دەستنووس پڕبایەخی بەجێماوە.

* ( **نورەددین ناسر** ):-

- سالی (١٩٥٤) لە قەلای کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٥٦) پێشانگای هاوبەشی لەگەل هونەرمەند حەمید شەریف کردووەتەوە.
- سالی (١٩٧٣) پێشانگای هاوبەشی کردووەتەوە لەگەل حەمید شەریف.
- بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لە کەرکوك لە سالی (١٩٧٦).
- سالی (١٩٩٢) پێشانگای تایبەتی خۆی لە شاری (شوبینگ)ی سویدی کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٣) پێشانگای تایبەتی لە شاری (ئەسکلستۆنە)ی سویدی کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٤) پێشانگای تایبەتی خۆی لە شاری (فالۆنی) سویدی کردووەتەوە.
- سالی (١٩٩٦) بەشداری پێشانگای هاوبەشی کردووە لەگەل هونەرمەندانی سوید لە شاری (بیۆرسوس).
- سالی (٢٠٠١) پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆلی کتێبخانەی گشتی لە شاری (یۆتۆبۆرگ) لە سوید.
- ئێستا جێنشینە لە ولاتی سوید.

* ( نوری تاڵەبانی - دکتۆر نوری تاڵەبانی ):-

- ناوی (نوری جەمیل تاڵەبانی)یە.
- ساڵی (١٩٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە تا دوا ناوەندی لەوێ تەواو کردووە.
- بەکالۆریۆسی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە، دکتۆرای لە زانکۆی پاریس تەواو کردووە، هەر لە ساڵی (١٩٦٨) لە زانکۆکانی عێراق وانەی وتۆتەوە تا خانەنیشین کردنی لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٢)، بە هۆکاری سیاسی.
- ساڵی (١٩٩٢) یەکەم پرۆژەی دەستووری بۆ هەرێمی کوردستان ئامادە کردووە.
- گەلێك لێکۆڵینەوەی قانونی هەیە، لەگەڵ گەلێك بابەتی مێژوویی کە یەکێك لەو کتێبانە (منطقة كركوك)، ساڵی (١٩٩٩).
- یەکەم فەرهەنگی قانونی بە زمانی کوردی وعەرەبی و فەرەنسی و ئینگلیزی داناوە.
- لە ناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٤) بووە بەسەرۆکی کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان لەکوردستان.
- ماوەیەك ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بووە.
- ئێستا سەرۆکی ئەکادیمیای کوردییە لە هەولێر.
- کۆمەڵێك بەرهەمی چاپکراوو وەرگێڕاوی هەیە:
- (القانون التجاري العراقي-النظرية العامة)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٢.
- (حول مفهوم النظام الفدرالي)، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٨٧، چاپی سێیەم هەولێر ٢٠٠٥.
- (مشروع دستور اقليم كردستان العراق)، چاپی یەکەم هەولێر ١٩٩٣، چاپی دووەم هەولێر ١٩٩٣، چاپی سێیەم هەولێر ١٩٩٥.
- (منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي)، چاپی یەکەم لەندەن ١٩٩٥، چاپی دووەم ١٩٩٨، چاپی سێیەم هەولێر ٢٠٠٤.
- (جرائم النظام العراقي ضد الشعب الكردي التي تدخل ضمن المفهوم الإبادة البشرية)، ١٩٩٧.
- (شێخانی ئیرشادی تاڵەبانی و چەند ناودارێکی تری ئەم بنەماڵەیە)، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٢.
- (القاموس القانوني-كردي عربي فرنسي)، چاپی یەکەم هەولێر ٢٠٠٤.
- (فەرهەنگی قانونی، کوردی-عەرەبی-فەرەنسی-ئینگلیزی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٤، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٦، چ ٣ هەولێر، ٢٠٠٩.
- (پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستانی عێراق، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- (الفيدرالية للعراق لماذا؟)، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (الكرد دراسة سوسيولوجية وتأريخية-باسيل نيكيتين)، وەرگێران لە فەرەنسییەوە، چاپی یەکەم بەیروت، چاپی دووەم بەیرەت ٢٠٠١، چاپی سێیەم ٢٠٠٣.
- (فەرهەنگی قانوونی).
- (کەرکوك بەرەو دوا ڕۆژێکی نادیار).
- (ملف الترحيل-دراسة ميدانية عن طبيعة التعريب).

* ( نوری شەڵتاغ - مەلا نوری شەڵتاغ ):-

- بەپێی هەندێك لە سەرچاوە هونەرییەکان ئەوە پشتراست دەکاتەوە کە دەستێکی باڵای هەبووە لە خوێندنی مەقامداو یەکێك بووە لە مەقام خوێنەکانی کەرکوك، هەروەها (مەلا محەمەد تۆپاڵ) کە یەکێك بووە لە مەقام خوێنە بەناوبانگەکانی کەرکوك ئاماژە بەوە دەکات کە (مەلا نوری شەڵتاغ) یەکێك بووە لە قوتابییەکانی و خوێندنی مەقامی لەژێر دەستی ئەو فێر بووە بە تایبەتی لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکوك.

* ( نوری فەقێ ):-

- ناوی (نوری کوری محەمەد کوری عەبدوڵڵا کوری محەمەد)ە، لە ناو خەڵکیدا بە (نوری فەقێ) ناسراوە بەرەگەز لە هۆزی (مەنگوڕ)ەو بە تیرەش (بلباس)ە.

- سالی (١٩٢٧)دا لە گەرەکی بەرتەکیەی کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٣٨)دا لە تەمەنی مندالیدا لەسەر دابوونەریتی ئەو رۆژگارە لە حوجرە لە مزگەوتی (بولاق) لای مامۆستا (شێخ محەمەد کوری شێخ نەجمەدین سابیری) شاعیر نراوەتەوە بەر خوێندن، هەر لەوێ (مەولوونامە)و (گولستانی سەعدی) و (پەندەکانی عەتار)و کتێبی (ئەحمەدی) خوێندووە.
- هەر لە تەکیەی تالەبانی فێری چواردە جۆری مەقام بووە لەگەل مەقامی (قۆریات).
- سالی (١٩٤٤)دا لە چایخانەی (سەیگول) گوێی گرتووە لە مەقام خوێن مەلا ئەحمەدی بەرزاوی وئاشنایەتی یەکی زۆری بووە.
- بۆ یەکەم جار لە سالی (١٩٤٧)دا نوری فەقێ لە مالی خۆیانو دەشت ودەرا لەناو دانیشتوان وکۆری برادەران وئاهەنگ وجەژنی نەورۆزدا مەقامو گۆرانی ووتووە.
- ئاشنایەتی ئەم مەقامانەی هەبووە:- مەقامی دیوانی کە ئێستا پێی دەلێن (ئورفە) دەشت، ئای، ئای.. ئەمیان دەچێتەوە سەر مەقامی بەیات، پێنج گا کەدەچێتە سەر رەست، مەقامی شوور، ئەمە تەنها هی ناوچەی کەرکوکەو دەچێتە سەر مەقامی بەیاتو بەزۆریش لە کۆری ئاییندا دەخوێندرێت، مەقامی نیوەشەوی، مەقامی غەزەل، مەقامی خەنەبات، مەقامی مەنسووری، مەقامی ئەللاوەیسی، هەوەرها لەم ئاوازانەشدا شارەزایی هەیە (خالۆرێبوار، هەی نابێ نابێ، یارغەزال، گەوهەرێ، رەستەی خیابان، خەزێمەکەی لووێی یاقووتە.
- لەگەل ئەم مەقامزانانە مەقامی خوێندووە: (عەلی مەردان، حوسێن عەلی، شێخ قابیل تالەبانی، حەمە درێژ).
- جگە لە هونەری مەقامو گۆرانی ئارەزووی هەبووە لە وەرزش بە تایبەتی یاری (زۆرخانە) وەکو خۆی دەگێرێتەوە:- (چایخانەی چوارباخ کە دەکەوێتە خوارووی تەکیەی تالەبانییەوە لە شاری کەرکوك کە ئێستا جێگاکەی بووەتە گەراجی سلێمانی وهەولێر لەوێ لە ناوەندی چلەکانی سەدەی رابردوو یاری قورس هەلگرتنو زۆران بازیان دەکرد، کە لەو سەردەمەدا چەند زۆرخانەیەك هەبوو دوانیان لەسەر رۆخی شەقامی ئەوقاف ئێستا یەکێکیان لە گەرەکی ئیمام قاسم، ئەمیان تەنها لە رۆژانی هەینی هەبوو وەیەکێکی تر لە چوار باخ بوو کە بە سەرپەرشتی خۆم دامەزرا، یەکێکی تریش لە گەرەکی ئاخور حوسێن بوو کە تەنها لە جەژنەکان یاری تێدا دەکرا شوکر وەلی پالەوانو فەخری نووسرەت پالەوان سەر پەرشتیان دەکرد، تا پەنجاکان مابوو.
- سالی (١٩٥٣) تیپی یاری قورس هەلگرتنیان لە چوارباخ دامەزراند، دەستیان کرد بە یاری کردن کە یاری چییەکانی بریتی بوو لە:
بەکر عەبدوللا، عوسمان مەلا عەبدوللای پالەوان کە گەرەکی مەلا عەبدللا بەناوی ئەمەوە ناونراوە، مامۆستا محەمەد حاجی سەعید، (عەبوود-عیسا) غازی رەئوف، ئیبراهیم ئەسوەد، ئیسماعیل محەمەد وەهبی، مەلا محەمەد تۆپال، محەمەد عەبدولقادر، وەستا قادر محەمەدی وایەرمەن.
- سالی (١٩٥٤) تیپی وەرزش تۆپێنیشیان بە ناوی چوارباخ دامەزراند.
- سالی (١٩٥٥) لەسەر کوردایەتی فرێ دراوەتە کونجی بەندیخانەوە تا (١٣)ی تشرینی یەکەمی سالی (١٩٦٧).
- سالی (٣)ی تەممووزی سالی (١٩٤٦) لە راپەرینی گاوریاغی لە کەرکوك دژ بە رژێمی پاشایەتی بە شێوەیەکی چالاکانە بەشداری کردووە.
- سالی (٢٠٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

* (**نوری مستەفا بەهجەت**):-

- خۆیو ژنەکەی کورد بوونەو خەلکی گەرەکی ئیمام قاسمن لە کەرکوك، تابلۆیەکی هەیە کە تێیدا گەرەکەکەی خۆیان، ئیمام قاسمی، رەسم کردووە. نووری مستەفا بەهجەت دەورێکی گرنگی لەجموجۆلی شێوەکاری سالانی (١٩٣٠-١٩٦٠)دا هەبووە.

* **نوری محەمەد عەلی**:-

- لەدایکبووی سالی (١٩٤٩)ی گەرەکی شۆریجەی شاری کەرکوك. قۆناغەکانی خوێندنی تا ئامادەیی لەوێ تەواو کردووە.
- سالی (١٩٦٤) پەیوەندیی بە یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە کرد.
- سالی (١٩٦٨) بەهۆی پەرەسەندنی جموجۆلو هەلسووړانی سیاسیی لەناو شاری کەرکوك، لەلایەن دەزگای ئەمنەوە دەستگیر کرا.
- سالی (١٩٩٦) پاش دەستپێکردنەوەی شەر لەنێوان شۆرش و حکومەتی بەعس تا راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی ئازاری سالی (١٩٧٠) درێژە بە ژیانی پێشمەرگایەتی دا.
- لە قۆناغی چوار سالەی ئاشتیی (١٩٧٠ - ١٩٧٤) بووە مامۆستا لە گوندی حەساری گەورە.
- سالی (١٩٧٤) پاش دەستپێکردنەوەی شەر لەنێوان کوردو حکومەتی عێراق، پەیوەندیی بە شۆرشەوە کردو لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی شۆرشدا ئەرکی مامۆستایەتیی خۆی بەجێهێنا. پاش هەرەسهێنانی شۆرش لە سالی (١٩٧٥)، ماوەیەك لە ئێران ژیانی ئاوارەیی بەسەر برد. پاش گەرانەوەی بۆ عێراق، بۆ باشووری عێراق دوور خرایەوەو لە شاری دیوانیە بە فەرمانبەر دامەزرا.
- سالی (١٩٧٦) پەیوەندیی بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردو دواتر بووە پێشمەرگەو لە کەرتی ٤ی جەباریی سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ بووە رابەری سیاسی.
- لە ١٧ی تشرینی دووەمی سالی (١٩٨٠) لە شەرێکی دەستەویەخەدا لەگەل هێزێکی گەورەی جاشو سەرباز، لە چیای شۆراوەی ناوچەی هەمەوەند شەهید کرا.

* (**نوری یاسین هەرزانی**):-

- بەرهەمەکانی:
- (الإعلام والحرية)، هەولێر، ٢٠٠٥.
- (مقدمة في الفلكلور الكردي-دراسة انثروبولوجية إجتماعية)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (بحوث المؤتمر العلمي الاول حول مدينة كركوك للفترة ٢٥-٢٠٠٥/٨/٢٧ في مدينة السليمانية)، بەهاوبەشی، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (الكاكائية دراسة انثروبولوجية للحياة الإجتماعية)، هەولێر، ٢٠٠٧.

* ( نووشا - مەلا نووشا ):-

- خەلکی دێی گولباخە لە عەشیرەتی زەنگەنەیە.
- شیعرێکی هەیە بەناونیشانی (دار جەنگا).
- لەنێوان سالانی (١٧٨٥-١٨٣٤) بەپێی هەندێك سەرچاوە ژیاوە.

* ( نیزامەددین عەبدولحەمید ):-

- سالی (١٩٢٣)دا لە کەرکوك لەدایکبووە، بەلام هەندێ سەرچاوە هەن سالی لەدایکبوونی بە (١٩٢٩) دەست نیشان کردووە.
- ماجیستێری لە زانستی ئاییندا بەدەستهێناوە.
- بەرێوەبەری ئەوقافی موسل بووە.
- لە دوایدا بووەتە مامۆستای کۆلێژی زانستی ئیسلامی لە زانکۆی بەغدا.
- ماوەیەك مامۆستا بوو لە (سودان) ئینجا چووەتە بەریتانیا.
- ئەم بەرهەمانەی بەچاپ گەیاندووە:-
- (جناية القتل العمد في الشريعة الإسلامية والقانون الوصفي)، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زنکۆی بەغدا، بەغدا، ١٩٧٤.
- (العبادات)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (مفهوم الفقة الإسلامي)، ١٩٨٣.
- (العبادة وآثارها النفسية والإجتماعية)، ١٩٨٥.
- (أحكام النكاح)، چاپخانەی (الجامعة)، بەغدا، ١٩٨٦.
- (فقه المواريث)، بەغدا، ١٩٨٦.
- (أحكام انحلال عقد الزواج)، ١٩٨٩.
- (قل هذه سبيلي).
- (هذا او طوفان).

* ( نیزامەددین گلی ):-

- ناوی (نیزامەددین کوری عەبدولمەجید گلی)یە.
- سالی (١٩٤٤) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەکالۆریۆسی لە یاسا لە سالی (١٩٦٨) لە زانکۆی بەسرە

تەواو کردووە.
- ماوەیەك بووەتە دادوەرو لە دواییدا نامەی ماستەری لە بواری یاسادا بەدەستهێناوە، لەو بوارەدا گەلێك لێکۆلینەوەو بابەتی بلاوکردووەتەوە لە گۆڤارو رۆژنامەکان.
- ماوەیەك ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك بووە لەسەر لیستی هاوپەیمانی کوردستانی.
- سالی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە بە رووداوی هاتووچۆ.

* ( نیهاد قەساب ):-

- سالی (١٩٥٥)دا لە گەرەکی (موسەلا) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی (١٩٧٧) ئامۆژگای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووە.
- لە چەندین چالاکی هونەری مۆسیقا وەك مۆسیقاژەن بە قانون و نۆکردیۆن وئۆرگ بەشداری کردووە.

* نیهاد زەکی عەبدوللا :-

- سالی ١٩٥٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سالی ١٩٧٨ کۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو کردووە لە خولی ٥٧ بەناونیشانی (حقوقی).
- دەرچووی کۆلێژی یاسا و سیاسییە لە زانکۆی بەغدا لە سالی ١٩٧٧.
- سالی ٢٠٠٥ خانەنشین کراوە.

* ( نیهاد جامی ):-

- سالی (١٩٧٢) لە گەرەکی حەمام عەلی لەدایکبووە.
- دامەزرێنەری تیپی شانۆی ئەزموونگەری کەرکوکە.
- دامەزرێنەری گرووپی شانۆی کولتورییە.
- سەرنووسەری گۆڤاری (شانۆکار)ە.
- خاوەنی خەلاتی باشترین دەرهێنەری شانۆیی وەرگرتووە لە فیستیڤالی شانۆیی یەکەمی هەولێری وەزارەتی رۆشنبیری، سالی (١٩٩٥).

– سیانزە ساڵی وەکو دەرهێنەرو ڕەخنەگر کاری کردووە.
– بەرهەمەکانی:
– (خودی کوردی لەنێوان کەسێتی دووفاقی و تراژیدیاری ئەنفالدا)، ٢٠٠٤.
– (لە بارەی شێخ زاناوە)، بەهاوبەشی لەگەڵ زیرەك عەبدوڵلا، ٢٠٠٧.
– (ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنێتی)، ٢٠٠٧.
– (نا نومێدیەکانی شانۆ)، (٢٠٠٨).
– (ئەنتۆلۆژیای شانۆی ئەزموومگەری)، (٢٠٠٨).
– (پەراوێزەکانی شانۆ)، ٢٠٠٩.
– (شانۆی پۆست مۆدێرنیتی)، ٢٠٠٩.
– (گوتاری ڕەخنەی شانۆی کوردی)، ٢٠١٠.
– (پلەی سفری شانۆ)، ٢٠١٢.
– (نووسەرو نووسینەوەی زمان)، ٢٠١٢.

*** نازم نەجم ئەحمەد**

– ناسراو بە نازم لەدایکبووی ساڵی ١٩٦١ی گەڕەکی شۆڕیجەی شاری کەرکوك.
– بەڕیشە دەچێتەوە سەر گوندی چەم سوورخاوی ناوچەی قادرکەرەم، باوکی سەیید نەجم، تۆمارێکی کوردپەروەرانەی هەیە، لە سەرەتای بزووتنەوەی کوردایەتی لە ساڵی ١٩٦١دا پشت و پەنای پێشمەرگە بووە لە ساڵی ١٩٦٣دا لەسەر ئەم مەسەلەیە دەستگیر کراوەو لە زینداندا ئەشکەنجەیەکی درندانە دراوە بەڕادەیەك کە بەهۆی ئەشکەنجەوە تووشی نەخۆشی درێژخایەن بووە، هەرچەندە دواتر لە زیندان ئازاد کراوە، بەڵام بەهۆی کاریگەری ئەشکەنجەوە لە ساڵی ١٩٦٦دا سەری نایەوە.
– نازم بەهۆی مردنی باوکییەوە وازی لە خوێندن هێنا و لە ساڵانی دواتردا بووە شاگردی ئاسنگەر و پاش چەند ساڵێك شارەزایی تەوای لە کارەکەدا پەیدا کرد و بووە وەستای ئاسنگەری.
– لە ساڵی ١٩٨١دا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد و لە ساڵی دواتردا لە سنووری هەرێمی ٥ی قەرەداغ بووە پێشمەرگە، لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا پلەکانی بە شێنەیی بڕیوە.
– ساڵی ١٩٨٥ لە بارەگای مەلبەندی یەك کرایە فەرماندەی مەفرەزە، ساڵی ١٩٨٧ بۆ تیپی ٥١ گەرمیان گوێزرایەوەو لەوێ پلەی جێگری فەرماندەی کەرتی پێ بەخشرا و بۆ ساڵی دواتر کرایە فەرماندەی کەرت، بەشداری ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی کردووە لەوانە ئۆپەراسیۆنی هێزی پشتیوان لە کوردستانی ئێران، لە ساڵی ١٩٨٢ کە تێیدا ڕۆڵێکی کارای لە قۆڵی قەبری حوسێندا گێڕاوە، گرتنی بێتواتە ساڵی(١٩٨٣) و قەیوان– ماوەت ساڵی (١٩٨٦) و داستانی ڕزگاری ساڵی (١٩٨٧).
– لە ساڵی ١٩٨٨دا بەشدار بوو لە شەڕەکانی دۆڵی جافایەتی کە بەیەکەم شاڵاوی ئەنفال دادەنرێت، پاش کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، بە بناری قەندیل و سنووری ناوچەی باڵەکایەتی و خۆشناوەتی و دەشتی کۆیەدا گەڕایەوە بۆ گەرمیان، ئەم گەشتە ١٨ ڕۆژی خایاند، لە گەرمیان لە یەکەم شەڕدا لە پاش گەڕانەوەی لە دۆڵی جافایەتی، کە شەڕی تاڵاو و تەختەمینایە بریندار بوو، ئەم شەڕە بەشێکی بەرنامەی هێزی پێشمەرگە بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی شاڵاوی سێیەمی ئەنفال، پاش شەڕەکە بۆ تیمارکردن برایە گوندی ئاوباریك، هەرچەندە هێزەکانی عێراق بەهۆی هێرشی بەربڵاو بەکارهێنانی تۆپخانە و هەلی کۆپتەر و چەکی کیمیاییەوە ئامانجەکانیان بەدەستهێنا، ئەو لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەدا مایەوە کە بڕیاریان دابوو ناوچەکە بەجێنەهێڵن و بەشێوەی پارتیزانی درێژە بە چالاکییەکانیان بدەن.
– لە تەموزی ساڵی ١٩٨٩دا پاش ئەوەی کە بۆ ماوەی ١٥ مانگ بەشدارییەکی کارای لە چالاکییە پارتیزانییەکانی ناوچەکەدا کرد، هێزەکەی بۆ پشوو و بینینی خولی مۆدێرن کێشرایەوە سەر سنوور، لە پرۆسەی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی هێزی پێشمەرگەدا، بووە فەرماندەی کەرتی یەك لە تیپێکی بەتالیۆنی دوو کە فەرماندەکەی جەمیل هەورامی بوو، لەکاتی جێبەجێکردنی نەخشەی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١دا، لەگەڵ هێزەکانی بەتالیۆنی یەکدا، لە قۆڵی پاوەوە بۆ سنووری سەرپێل زەهاو دابەزی و لە نەخشەکەدا بەر ئەو هێزە کەوت کە ئەرکی ڕزگارکردنی باوە نوورو کەلار و کفری و خانەقینی پێ سپێردرا بوو، لەم سەروبەندەدا بەشێکی چالاکییەکانی لە قۆڵی کەلار. خانەقین هەڵسووڕاند و بارەگای لە دێی دەکا دانا، پاش ڕاپەڕین لێپرسراویەتی فەرماندەیی بەتالیۆنی قەرەحەسەنی پێ سپێردرا دواتر کرایە فەرماندەی بەتالیۆنی بەکرەجۆ و ماوەیەکیش بۆ قەڵاچۆکردنی قاچاخچێتی نێردرایە سنووری پێنجوێن.
– ساڵی ١٩٩٤ کرایە فەرماندەی فەوج لە لیوای تایبەتی کەرکوك و دواتر لە گەرمیان بووە جێگری فەرماندەی لیوای تایبەت، ساڵی پاشتر کرایە جێگری فەرماندەی لەشکری گەرمیان و پاشان لێپرسراوەتی لەشکرەکەی پێ سپێردرا.
– ساڵی ١٩٩٦ بووە جێگری فەرماندەی فەرماندەیی گەرمیان

و پاشان لێپرسراویەتی فەرماندەیەکی گرتە ئەستۆ.
– ساڵی ۲۰۰۳ لە کاتی هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق، لە سنووری جەلەولا قەرەتەپە رۆڵێکی کارای لە کۆنترۆڵکردنی ناوچەکاندا گێڕا و هەر ئەو ساڵە دوابەدوای پێکهێنانی لیوای گەرمیان لێپرسراویەتی لیواکەی پێ سپێردرا.
– ساڵی ۲۰۱۰ لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا بە ئەندامی ئەنجوومەنی ناوەند هەڵبژێردرا، بەشێکی ژیاننامەی و سەربوردەی پێشمەرگایەتی لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (نازم کەرکوکی پارتیزانە بێدەنگەکە) کە عەلی عەبدوڵڵا کاکە ئەحمەد ئامادەی کردووەو ساڵی ۲۰۱٤ لە سلێمانی چاپ کراوەو بڵاوکراوەتەوە.

*** د. نەجات عەبدوڵڵا ئەحمەد شوانی**
– ساڵی (۱۹۷۳) لە کەرکوك لەدایکبووە.
– ساڵی (۲۰۱۰) بەشداربووە لە چالاکی وێنەی قوتابخانەکان لە کەرکوك.
– ساڵی (۲۰۱۵) خەڵاتی رێزلێنانی وەرگرتووە لە چەمچەماڵ.
– ساڵی (۲۰۱٦) لە جەژنی جیهانی منداڵان لە ۱ی حوزەیران لە هۆڵی (شاکیر فەتاح)، بەشداری کردووە بە وێنە لە پێشانگای وێنەی منداڵانی چەمچەماڵ.
– بەشداری وێنەیی لە گۆڤاری:– منداڵانی باوەگوڕگوڕ، حاجیلە، گوڵەکان، کردووە.

*** نوری محەمەد عەلی**
– ناسراو بە مەلا نوری، لەدایکبووی ساڵی ۱۹٤۹ی گەڕەکی شۆڕیجەی شاری کەرکوك، قۆناغەکانی خوێندنی تا ئامادەیی لەوێ تەواو کردووە.
– ساڵی ۱۹٦٤ پەیوەندی بە یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە کرد و ساڵی ۱۹٦۸ بەهۆی پەرەسەندنی جموجۆڵ و هەڵسوڕانی سیاسی لەناو شاری کەرکوك، لەلایەن دەزگای ئەمنەوە دەستگیر کرا.
– ساڵی ۱۹٦۹ پاش دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان شۆڕش و حکومەتی عێراق، پەیوەندی بە شۆڕشەوە کرد و تا راگەیاندنی بەیاننامەی ۱۱ی ئازاری ساڵی ۱۹۷۰ درێژەی بە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، لە قۆناغی ٤ ساڵەی ئاشتی ۱۹۷۰–۱۹۷٤ بووەتە مامۆستا لە گوندی حەساری گەورە.
– ساڵی ۱۹۷٤ پاش دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کورد و حکومەتی عێراق، پەیوەندی بە شۆڕشەوە کرد و لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا ئەرکی مامۆستایەتی خۆی بەجێهێنا. پاش هەرەسهێنانی شۆڕش.
– لە ساڵی ۱۹۷٥، ماوەیەك لە ئێران ژیانی ئاوارەیی بەسەر برد، پاش گەڕانەوەی بۆ عێراق، بۆ باشووری عێراق دورخرایەوە و لە شاری دیوانیە بە فەرمانبەر دامەزرا.
– ساڵی ۱۹۷٦ پەیوەندی بە یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە کرد و دواتر بوە پێشمەرگەو لە کەرتی ٤ی جەباری سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ بووە رابەری سیاسی.
– لە ۱۷ی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۸۰ لە شەڕێکی دەستەویەخەدا لەگەڵ هێزێکی گەورەی جاش و سەرباز، لە چیای شۆڕاوەی ناوچەی هەمەوەند شەهید کرا.

*** عەمید نیزامەدین جەلال سەید حەکیم:–**
– ساڵی ۱۹۳۷ لە کەرکووك لەدایکبووە.
– ساڵی ۱۹٥۸ کۆلێژی سەربازی پاشایەتی لە بەغدا لە رۆستەمییە تەواو کردووە، لە خولی ٤٤ لە بەشی (تۆپ هاوێژ).
– ساڵی ۱۹۸۸ خانەنشین کراوە.
– ساڵی ۲۰۰٤ کۆچی دوایی کردووە.
– ماوەیەك بەڕێوەبەری (مركز السلام والرقابة النوعية) بووە لە بەغدا.

*** موقەدەم ئامیق مەعسوم محەمەد عەلی:**
– ساڵی ۱۹۲۹ لە کەرکووك لەدایکبووە.
– ساڵی ۱۹٥۱ لە کۆلێژی سەربازی بەغدا دەرچووە لە بەغدا لە خولی ۲۱ لە لە بەشی پیادە.
– لە یەکەکانی تیپی دوو لە کەرکووك کاری کردووە.
– ساڵی ۱۹۷٦ خانەنشین کراوە.
– ساڵی ۱۹۹۷ کۆچی دوایی کردووە.

*** نوری:–**
– مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی بابا رەسوڵ.
– نازناوی شیعری (نوری)یە و لە ساداتی (پیرخدری)یە.
– ساڵی ۱۸۸۳ لە گوندی ئۆمەر گومبەت لە ناوچەی تەقتەق چاوی بەژیان هەڵهێناوە.
– ماوەیەك بووەتە مەلای گوندی خدران و ماوەیەکی زۆریش لە گوند، خزمەتی ئایینی بە خەڵکی ناوچەکە کردووە، پاشان رووی کردووەتە گوندی (دوو گردکان) لە ناوچەی (قوشتەپە) هەر لەوێ قوتابخانەیەکی ئایینی گەورەی دروست کردووە، ماوەیەکیش لە ئاوایی کارێز لە ناوچەی شوان خزمەتی ئایینی کردووە، هەروەها ماوەیەکیش لە گوندی بیرەسپان مەلا بووە.
– چوار زمانی شیعری هەبووە بە کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی.
– ساڵی ۱۹۳٤ لە گوندی ئۆمەر گومبەت بە ماڵ و منداڵەوە هاتووەتە گوندی بیرەسپان لە ناوچەی ساڵەیی و نیشتەجێ بووە.
– دەستێکی باڵای هەبووە لە چارەسەری سروشتی.
– ساڵی ۱۹٤۸ لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە لە گوندی وەکاشە لەنزیك گوندی یارمجە سەر بە ناحیەی پردێ بە خاك سپێردراوە.

*** لیوا روکن (ئەوزاد محەمەد رەمزی بەرزنجی):–**
– ساڵی ۱۹٤۳ لە کەرکووك لەدایکبووە.
– ساڵی ۱۹٦۳ لە کۆلێژی سەربازی عێراق دەرچووە و کۆلێژی سەربازی سۆڤێتی (لمس) تەواو کردووە.
– ساڵی ۱۹۷۳یش کۆلێژی (ئەرکان)ی تەواو کردووە.
– ئەفسەر بووە لە فەیلەقی یەکەمی و چوارەم.

**مەلا مەجیدی قوتب و نوری نالبەند لەگەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی کەرکوك**

**نوری فەقێ**

**نوری نالبەند**

نوری فەقێ و ڕەزا کەبابچی

* نوورەددین بەها:-

- ناوی (نوورەددین بەهائەدین سالح)ە، لە سالی ۱۹۱٤ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەم شارە تەواو کردووە، سالی ۱۹٤۲ خوێندنی ئامادەییشی لە (ثانویة المرکزیة) لە بەغدا تەواو کردووە دواتر خوێندنی بە کۆلێژی ماف تەواو کردووە.
- لە ۱۸ی ئابی ۱۹٤۲ وەکو بەڕێوەبەری ناحیەی برادۆست لە لیوای هەولێر دامەزراوە، ئینجا گوێزراوەتەوە بۆ ناحیەی (دێرە حەرین) دواتریش نێردراوە بۆ ناحیەی (مەلحە - حەویجە) لە کەرکوك.
- سالی ۱۹٤٥ ڕاژەکەی گوێزراوەتەوە بۆ وەزارەتی داد، لە دواییدا کراوە بە دادوەری دادگای بەرایی ڕەواندوز، ماوەیەك گوازراوەتەوە بۆ (کۆیە)، ئینجا یاریدەدەری تێهەلچوونەوەی قەرەتەپەی پێ سپێردراوە، دواتریش بووەتە دادوەر لە دادگای بەرایی (کفری)، دوایيش گوازراوەتەوە بۆ بەرایی (حیللە).
- لە سالی ۱۹٥۹ بە جێگری سەرۆکی دادگای تێهەلچوونەوەی کەرکوك لە سالی ۱۹٦۳ بووەتە سەرۆکی تێهەلچوونەوەی موسڵ لە ٥ی شوباتی بووەتە سەرۆکی دادگای بەسرە.
- سالی ۱۹۷۱ ئینتیداب کراوە بۆ سەرۆکایەتی دادگای تێهەلچوونەوەی ناوچەی کەرکوك، دواتر لە ۱ی تەمووزی ۱۹۷۱ ئینتیدابەکەی هەلوەشێنراوەتەوە.
- هەروەها لە کاری سیاسیش لە ڕێکخستنەکانی (حیزبی دارکەر) (حیزبی هیوا) بووە.
- لە ۱۱ی تشرینی دووەمی ۱۹۸۱ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و دواتر تەرمەکەی هێنراوەتەوە کەرکوك و لەوێ بە خاك سپێردراوە.

* د. نازم:-
- سالی ۱۹٥۰ لە گوندی تۆپزاوای لای داقووق لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندیی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- سالی ۱۹٦۷ لە کۆلێژی زانست لە بەشی فیزیای زانکۆی بەغدا وەرگیراوە و لە سالی ۱۹۷۱ بە پلەی باش دەرچووە.
- هەمان سالْ لە ناوەندی ئالتوون کۆپری دواتر گواستراوەتەوە بۆ ئامادەیی کوردستان لە کەرکوك.
- سالی ۱۹۷۲ ڕۆیشتووە بۆ خوێندن لە ڕۆمانیا و لە سالی ۱۹۷۷ دکتۆرای لە فیزیای مایکرۆوەیڤ تەواو کردووە.
- سالی ۱۹۷۸ تا ۱۹۸۰ لە زانکۆی بێرمنگهام لە ئینگلتەرا مامۆستا بووە، سالی ۱۹۸۰ گەڕاوەتەوە بۆ عێراق لە بەندینخانە توند کراوە بۆ ماوەی یەك مانگ.
- لە تەمموزی سالی ۱۹۸٦ لە ناوچەی قەلاسێوکە لە ئاغجەلەر شەهید بووە.

* نورەددین عەبدولسەمەد جەراح:-
- سالی ۱۹۰۱ لە کەرکوك لەدایکبووە، سەر بە خێزانی جەراحە.
- خوێندنی ڕوشدییە و سولتانییەی لە سەردەمی عوسمانییەکان لە کەرکوك تەواو کردووە، بەلام بەهۆی هەلگیرسانی شەڕی جیهانی یەکەم و داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەکان بەناچاری واز لە خوێندن دەهێنێت.
- دەچێتە بەغدا لە بواری پۆلیسی کار دەکات تا دەگاتە پلەی معاونی پۆلیس و لە زۆربەی لیواکانی وەکو بەغدا و بەسرە و موسڵ بەعقوبە و کفری و سلێمانی و کەرکوك کار دەکات و لە سالی ۱۹٤۷ معاونی پۆلیسی دیالە بووە.

* ( هابە ):-

- ناوی تەواوی (عەبدولوەهاب مەلا بەرغەش حوسێن)ە.
- ساڵی (١٩٤٥) لە گەڕەکی پیریادی لەدایکبووە.
- لە ناوەراستی ساڵانی شەستەکانی سەدەی رابردوو بە تەواوەتی دێتە نێو جیهانی گۆرانییەوە.
- سەرەتای ساڵانی حەفتاکاندا ئەستێرەی هونەری دەدەرەوشێتەوە، بەهۆی شەیدا بوونی بەدەنگی مەقام بێژانی رەسەنی ئەم شارە وەکو شلتاغ و مەلا تەهای کەرکوکی و مەلا محەمەدی تۆپال.
- هابە زۆر بە باشی فێری مەقامات دەبێت و بەخاوەنی ستایلێکی تایبەت بە خۆی لە مەقام.
- ساڵی (١٩٩١)دا لەلایەن کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنەری هونەری بەناوبانگی تورکی گرێبەستێکی هونەری بۆ ئاهەنگێران لە شارەکانی تورکیا مۆر دەکات، لەوێ چەندین گۆرانی و مەقام ساز دەکات.
- کۆی بەرهەمەکانی نزیکەی ١٠٠٠ کاسێت و ٥٠٠ کاسێتی ڤیدۆیی تۆمارکراوە، بەشێکی کوردین..
- دوا ئاهەنگی (هابە) لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠١) دا بوو لەگەڵ هونەرمەند (ناسری رەزازی) بوو، لە شاری سلێمانی، هەر لە پاش گەرانەوەی لەو ئاهەنگە پیاوانی رژێمی بەعسی لە گۆرنراو راپێچی ئەمنی کەرکوك دەکرێ و ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری دەدەن. لە پاش تێپەربوونی چەند رۆژێك بەسەر ئازادکردنی لە بەندیخانەوە لە بەرواری (١٧)ی ئابی ساڵی (٢٠٠١) کۆچی دوایی دەکات و لە گۆرستانی (شێخ محێدین) بە خاك دەسپێدرێت.

* ( هادی کەرکوکی ):-

- ناوی (هادی ساڵح کەرکوکی)یە.
- ساڵی (١٩٧٨) لە گەرەکی موسەڵڵا لەدایکبووە.
- ساڵی (٢٠٠١)ەوە فێری خۆشنووسی (الرقعة، الديوان، الحلبي، الديواني) لەژێر دەستی (موزەفەر مەحموود) فێربووە.
- دەستێکی باڵای هەبووە لە نووسینی گەلێك خەتی سەر دەرگای مزگەوتەکانی کەرکوك.
- ئاشنایەتی خۆشنووس (داود بەکتاش) بووە و زانیاری زۆری لە بواری خۆشنووسیدا وەرگرتووە.
- بەشداری گەلێك لە پێشانگا ناوخۆیی و نێودەوڵەتیەکانی کردووە.

* ( هاشم جەباری - هاشم عەبدوڵڵا جەباری ):-

- ناوی (هاشم عەبدوڵڵا مەعروف مەحموود جەباری)یە.
- ساڵی (١٩٤٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە (١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٩) وەکو بێژەرو وەرگێر لە تەلەفزیۆنی کەرکوك کاری کردووە.
- لە (١)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٧) خانەنشین کراوە.
- جۆرەها بەرنامەی ئەدەبی و رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتی پێشکەش کردووە و ماوەیەك لە رادیۆی (عێراقی نوێ) و رادیۆی (نەوا) وەکو بەرێوەبەری کاری کردووە.
- لە (٧)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٦) یەکەم بابەتی شیعری لە رۆژنامەی (دەنگ و باس)دا بڵاوکردووتەوە.

* ( هاشم رەشاد ئاق سوو ):-

- ساڵی (١٩٤٢) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- گەلێك دیوانی شیعری هەیە، لەوانە (إنسانلیق جرجیوەسی)، بە زمانی تورکی، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٧٤.
- ساڵی (١٩٩٤) کۆچی دوایی کردووە.

* ( هاشم زەینەڵ قەرەغولی ):-

- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هونەرمەندو نووسەری کۆکەرەوەی کەلەپورە.
- هەروەها کاری دەرهێنانی کردووە لە شانۆدا.

* ( هاشم عاسی سەعید کاکەیی ):-

- ساڵی (١٩٥٩) لە شاری کەرکوك لە گەڕەکی موسەڵلا لەدایکبووە.
- قۆناخەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە شاری کەرکوك تەواو کردووە پاشان چووەتە پەیمانگای پیشەیی کارەباری بەعقوبە ولە ساڵی (١٩٧٩-١٩٨٠) تەواوی کردووە، ئەڵمانییەکان سەرپەرشتی خوێندنگاکەیان ئەکرد.
- ساڵی (١٩٧٨)وە چەندین نووسین و بابەتی هەمەجۆرو لێکۆڵینەوەی مێژوویی و کەلەپووری لە گۆڤاری (بەیان) و (رۆشنبیری نوێ)و (هاوکاری)و (کاروان)و رۆژنامەی (العراق) بڵاوکردووەتەوە.
ئەم کتێبانەی بە چاپ گەیاندووە.

- (فەرهەنگی ماچۆ، کەرکوك)، ٢٠٠٥.
- (کورد چەند بابەتێکی مێژوویی)، کەرکوك، ٢٠٠٦.
- (ئێڵبەگی جاف و پێشبینییەکانمان)، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (هۆنراوەو دیوانی شاعیرانی کوردی گۆران)، (٢٠٠٨).
- (دیوان و یاداشتی شێخ ئەحمەد شاکەلی)، ٢٠٠٩.
- (فەرهەنگی رێران یاران).
- (داستانی قەندیل قەڵا).
- (مێژووی بزووتنەوەی بابی و بەهاییەکان).
- (شەبەك لەنێوان ئایین و نەتەوەدا).
- (داستانی شیرین و فەرهاد).
- (کەرکوك لە دیدی چەند سەرچاوەیەکدا).
- (عەشقێ دەروێشانە).
- (دیوانی حەزرەتی شێخ ئەمیر).
- (کتاب حەقیقەت سەنایی موعجەم گوڵستان یاری شاکاری بەرزۆی پەری).
- (دیوانی شاعیر بەرزۆی پەری).
- (کوردەواری و لێکۆڵینەوەی گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانی)، ٢٠١٣.
- (مێژووی تایفەی کاکەیی لە کوردستاندا).
- (دیوان و یاداشتی شێخ ئەحمەدی شاکەلی، شاعیرو خواناسی دەشتی گەرمیان)، چاپی پێنجەم، ٢٠١٣.
- فەرموودەکانی مام نەزەر، ٢٠١٦.
- شەوقی و گریانی، دوو شاعیری کاکەیی گەرمیان، ٢٠١٦
- دەستنووسەکانی:-
- شەرت نامەی یاری.
- تەکوین جیهان لە ئاییینی یاری.
- مێژووی کاکەیی لە کوردستان.
- دیوانی حەزرەتی شێخ ئەمیر.
- عەشقێ دەروێشانە.

*** (هاشم قاسم ئەلسالحی):-**

- ساڵی (١٩٢٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (اونلارین حکایەلری)، چیرۆك بە زمانی تورکمانی، بەغدا، ١٩٨٤.
- (ایلك ادیملار حکایەلر)، چیرۆك بە زمانی تورکمانی، بەغدا، ١٩٧٥.
- (خاطرة دفترلندن)، چیرۆك بە زمانی تورکمانی، بەغدا، ١٩٨٣.
- (کان وکان)، بەغدا، ١٩٩٠.

*** (هاوار کاکەیی):-**

- ناوی (میکائیل کاکەیی هاوار)ە، لە داقوق لەدایکبووە.
- خاوەنی چەندین نووسینەو یەکێکە لە رۆشنبیرەکانی ناوچەی کەرکوك، زۆربەی نووسینەکانی لە گۆڤارو رۆژنامەکان بڵاودەکاتەوە.

*** (هاوڕێ کرێکار):-**

- ناوی (عەبدولرەحیم دانسان)ە.
- ساڵی (١٩٦٠) لەدایکبووە.
- گەلێك لێکۆڵینەوەی هەیە بەزمانی سویدیو کوردی لەسەر کەیسی هەڵەبجەو ئەنفال.
- ئێستا لە سوید دادەنیشێت.

*** (هانی ساحیب حەسەن):-**

- ساڵی (١٩٥٥) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:
- (الشعر الترکماني الحدیث في العراق)، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، بەغدا، ١٩٨٨.
- (ازهار القرنفل: دراسة في الشعر الحر الترکماني في العراق ١٩٥٨-١٩٨٨)، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، بەغدا، ١٩٩٣.
- (دنیا یارا-إنسان بیجاغ-إنسان صاب)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، بەغدا، ١٩٩٨.
- الألم لي، لك الأمل والعواصف للجمیع، وەرگێڕان، ٢٠٠٥
- قنادیل ترکمانیة، ٢٠٠٧

*** (هەردەوێل کاکەیی):-**

- ناوی (تالب کوری نەجمەددین کوری فەرەج)ە.
- ساڵی (١٩٤٥) لە دێی تۆبزاوە لە قەزای داقوق لەدایکبووە.
- لە هەشتاکان و نەوەدەکاندا بەرنامەی کەلەپووری هەبوو لە تەلەفزیۆنی کەرکوك وەکو پێشکەشکار و ئامادەکار.
- ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیاندووە:-
- (گوڵە نێرگزی تۆبزاوە)، ١٩٩٠.
- (کۆمەڵە شیعرێکی مەلا عەباس)، ١٩٨٤.
- (گوڵبژێرێك لە شیعری فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان)، بەشی یەکەم، ١٩٨٥.
- (گوڵبژێرێك لە شیعرەکانی سەید وەهابی کاکەیی)، ١٩٨٦.
- (دابوونەرێتی باوی کوردەکان لە ناوچەی گەرمیان)، ١٩٨٩.
- (شاعیران و ناودارانی کاکەیی)، ١٩٩٠.
- (هەنگاوی یەکەم، شیعری سەید محەمەد کاکەی)، ١٩٩٢.
- (هەڵبژاردەیەك لەشیعری فۆلکلۆری ناوچەی گەرمیان)، بەشی دووەم، ١٩٩٥.
- (دیوانی مەلا حەسەن نەوحی زەنگەنە).
- (دەرمان سازی لە دەڤەری کەرکوکدا).
- (زیندووکردنەوەی عەبدال داودەو بەرهەمەکانی).
- (تریق.. تریق پێبکەنە)، ٢٠٠٢.
- (پەندی پێشنیانو قسەی نەستەق لە ناوچەی کەرکوکدا).
- (هەڵبژاردەیەك لە شیعری فۆلکلۆری ناوچەی گەرمیان)، بەشی سێیەم، ٢٠٠٤.
- (داستانی حەسەنو حوسێن)، ٢٠٠٤.

- (ڕەنگ لە فۆلکلۆری کوردیدا)، ۲۰۰٥.
- (دیوانی مەلا فەتاحی جەباری)، ۲۰۰٥.
- (پەندی پێشنیانو قسەی نەستەقی ماچۆ).
- (دیوانی میرزا خەلیل منەوەری کاکەیی)، ۲۰۰٦.
- (چەپکێ لە شیعرەکانی ڕەشید ئاغای کاکەیی).
- (مەقامو مۆزیکی کوردی سەلاح داودە وەك نموونە)، ۲۰۰٦.
- (تۆبزاوە لە تەمەنی سەد ساڵیدا)، ۲۰۰۷.
- (داستانی خورشید خەرامان)، (۲۰۰۸).
- (پەندی پێشینیانو قسەی نەستەقی شەبەك)، (۲۰۰۸).
- (مەتەل لە ناو شەبەکدا)، (۲۰۰۸).
- (کەشکۆڵی کوردەواریی - کۆمەڵە بابەتێکی فولکلۆریی دەڤەری گەرمیانە)، ۲۰۱۳.
- (دیوانی مەلا نەجمەدین بێبەش ۱۹۱٥-۱۹۹۰)، ۲۰۱۳.
- (دیوانی مام شەوکەتی کاکەیی، چیانشین)، ۲۰۱۳.
- (هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆریی کوردیی گەرمیان)، بەرگی چوارەم، ۲۰۱٤.
- فەرهەنگی کەلەپووری (کەرەستەی مادیی دراوستکراو)، بەرگی یەکەم بە هاوبەشی، ۲۰۱٥

* (هەژار):--

- ناوی (محەمەد بەگی کوڕی سەلیم بەگی جاف)ە، نازناوی شیعری (هەژار)ە.
- خەڵکی کەلاری کۆنەو گەلێك شیعری لێ بەجێماوە.

* (هەڵەت هوشیار):-

- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (پەیوەندییە گشتییەکان)، مەحموود عەبدولعەزیز ئەلبەدر، وەرگێڕان، ۲۰۰۹.
- (پڕوپاگەندە، ئەمریکا، زایۆنی، نازی، سۆڤیتی)، ئامادەکردنو وەرگێڕان، ۲۰۱٤.

* (هەوری تاڵەبانی):-

- لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- کۆلێژی ئەندازیاری بەشی تەلارسازی تەواو کردووە.
- لە بواری هونەری تەلارسازیدا جێپەنجەی دیارە لە کوردستانو کەرکوك.

* (هەیاسی کاکەیی - کوێخا هەیاسی کاکەیی):-

- ناوی (هەیاس کوڕی زایەری زەنگەنە)یە.
- ساڵی (۱۸۹٥)ی زاینیی لە دێی عەلی سەرای لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو لە پاشا چووەتە کەرکوكو لەلای پیاوانی ئایینی خەریکی فێربوونی ڕێزمانی عەرەبیو وێژەی فارسی بووەو پاشان چەند دێی ئاوا کردووەتەوەو خزمەکانی خۆی تیا نیشتەجێ کردووەو خۆی بووەتە کوێخایانو ئەوسا خەریکی کشتوکاڵوماڵداری بووە.
- لە هۆنینەوەی هۆنراودا دەستێکی بەرزو باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ ناسكو پاراوو شیرینن.
- ساڵی (۱۹٦۹)ی زاینیی کۆچی دوایی کردووە لە دێی (زەنقر).

* (هەیاس مەحموود سەعە کاکەیی):-

- شاعیر کتێبێکی بە ناوی (من کاکەت نیم) بڵاوکردووەتەوە.
- یەکێکە لە ڕۆشنبیرانی کاکەیی کەرکوکەو ماوەیەك مامۆستای کیمیا بوو لە قوتابخانەی کاوە.

* (هیجران شێواو):-

- یەکێکە لە شاعیرەکانی شیعری نوێ لە کەرکوك.
- (سەدای ئاوە سپی)، شیعر، بەغدا، ۲۰۰۰.
- (ڕۆخانەو دیرۆکی هەسارەکان)، شیعر، کەرکوك، ۲۰۰۲.
- ساڵی (۲۰۰۹) بە کارەساتی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کردووە.

* (هیجری دەدەی کاکەیی):-

- ناوی تەواوی (مەحموود کوڕی مەلا عەلی کوڕی مام نەزەر کوڕی مام قەیسەر کوڕی مام محەمەد کوڕی مام هەیاس کوڕی مام هوشیاری کاکەیی)یە.

- ساڵی (١٨٧٧)ی زاینی لە کەرکوك لە خێزانێکی ئایینی پەروەردە لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩١١) بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەی (السلطانیة) لە بەغدا.
- بەڕێوەبەری رۆژنامەی (کرکوك) بووە کە بۆ ماوەی (٤٦) ساڵ بەردەوام بووە لە ساڵی (١٩٤٦) تا (١٩٧٢).
- هیجری دەدە شیعری بە فارسیو کوردیو تورکی بڵاوکردووەتەوە.
- دەستنووسێکی خۆی لای هاشم کاکەیی پارێزراوە کە لە ساڵی (١٩٥٠) نووسیوێتی.
- بەرهەمەکانی:
- (یادکار هجری)، دیوانێکی شیعری، بە زمانی تورکیو فارسی، چاپخانەی (ولایت)، بەغدا، ١٩١١.
- (ترجیع بندیا انتباه ملت)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (حوادث)، کەرکوك، ١٩١٥.
- (گلدستە خزعلیە)، شیعر بە زمانی فارسی، چاپخانەی (فلاح)، بەغدا، ١٩٢٢.
- (رباعیات إرشادات کائنات)، شیعر بە زمانی فارسی، چاپخانەی (فلاح)، بەغدا، ١٩٢٢.
- (مولود نبوی)، شیعر بە زمانی تورکی، کەرکوك، ١٩٣٣.
- (تحفە سلیمانی)، شیعر بە زمانی فارسی، چاپخانەی (سریان)، بەغدا، ١٩٣٥.
- کتێبی نووسیوە لەسەر مێژووی کەرکوك نادیارە.
- لە بەرەبەیانی رۆژی (١١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٢) کۆچی دوایی کردووە، لە گۆرستانی (ئەبوعولوك) لە شاری کەرکوك لە تەنیشت مامە نەزەری باپیرەی بەخاك سپێدراوە.

*** هیجران قازی ئۆغلوو:-**

- ساڵی ١٩٥٢ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:-
- حسینیلر و باشقا شعرلر، بەرگی دووەم، ٢٠٠٤
- حسینیلر وباشقا شعرلر، بەرگی سێیەم، ٢٠٠٨
- قرآن کلمة لری، ٢٠١٢

*** (هیدایەت کەماڵ بەدری - دکتۆر هیدایەت کەماڵ بەدری):-**

- لە کفری لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (خلق شعرینده عراق تورکمن اغزی دیل انجەلەمەسی)، نامەی دکتۆرا، کولێژی ئاداب، زانکۆی ئەستەمبوڵ، تورکیا، ١٩٧٩.
- (دیلیمیز-عراق تورکمن اغیزلاری)، بەغدا، ١٩٩٨.
- (مبادئ اللغة الترکیة)، بەدا، ١٩٨٦.
- (الابجدیات الترکیة عبر القرون)، بەغدا، ١٩٨٢.
- (تأریخ الروایة في الأدب الترکیة)، بەغدا، ١٩٨٥.
- (سلیمان جلبي ومولد النبي (صل الله علیه وسلم) في الأدب الترکي)، بەغدا، ١٩٨٤.
- (النشأة المسرحیة في الأدب الترکي)، بەغدا، ١٩٨٣.

*** (هیدایەت نەوجولی - حاجی هیدایەت نەوجولی):-**

- ناوی (هیدایەت حاجی عەزیز کوێخا مەحموود کوڕی کوێخا کەریم)ە.
- ساڵی (١٩٠٩) لە نەوجول لەدایکبووە.
- کەسایەتیەکی ئایینیو کۆمەڵایەتی ناسراوی خورماتوو بووە.
- ساڵی (١٩٦٤) دوورخراوەتەوە بۆ ناسرییەو دواتر بۆ هەولێرو نەیانهێشتووە بگەڕێتەوە بۆ خورماتوو، دواتر سێ ساڵی لە کەرکوك زیندانی کراوە، لە خورماتوو دەستگیراوە بەسەر ماڵو سامانیداو هەرزان فرۆش کراوە.
- ساڵی (١٩٨١) کۆچی دوایی کردووە.

*** (هیشام تاهیر بەرزنجی):-**

- ساڵی (١٩٥٢) لە کەرکوك لە سەنگاو لەدایکبووە.
- سەرەتاییو ناوەندییو ئامادەیی لە کەرکوكو داقوقو خورماتوو تەواو کردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٨ - ١٩٧١) پەیمانگای تەندروستی لە بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦٩) یەکەم هۆنراوەی بڵاوکردووەتەوە.
- لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٩ - ٢٠٠٠) گەلێك بەرهەمی چیرۆكو شیعری لە گۆڤارو رۆژنامە کوردیو عەرەبییەکان، وەکو (رۆشنبیری نوێ، بیری نوێ، بەیان، برایەتی، هاوکاری)

بڵاوکردووەتەوە.
- بەهۆی هەڵوێستی کوردایەتی بۆ ماوەی دە ساڵ سزای بەندکردنی بەسەردا سەپێندراوە، بەڵام دوو ساڵی و نیوی تێدا بردووەتەوە سەر لەنێوان ساڵانی (١٩٧٧ - ١٩٧٩) بەر لێبوردنی گشتی کەوتووە.

* (هێرۆ کوردە):-

- ساڵی (١٩٨٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێکە لە ئافرەتە شاعیرو ڕۆژنامەنووسەکانی کەرکوك.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (سووتانەکانم لە وەرزی فریندا)، ٢٠٠٧.

* (هیمەت عەزیز کاکەیی):-

- ساڵی (١٩٤٦) لە داقوق لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٩) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بواری زمانی عەرەبی لە زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
- ئەم بەرهەمانەی وەرگێڕاوە:
- (کەڵەشێر، چیرۆك، هەولێر، ١٩٩٧.
- (بەسەرهاتی دیکێك)، چیرۆکی منداڵان، وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٤.
- (مانگ، رابەندرنات تاگور، وەرگێڕان، کەرکوك، ٢٠٠٥.
- (مشەخۆرەکانی عەقڵ)، ڕۆمان، کۆلم ویلسن، وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- (ئۆراشی تارۆ، وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٨.
- (ڕەشکەکانی برسیەتی)، ڕۆمان.
- (پۆپنە زێرینە) ڕۆمان.
- (دیوانێکی تاغور).
- ١٤ چیرۆکی (پێکەوە).

* (هیمەت کاکەیی):-

- ناوی (هیمەت محەمەد عەلی کاکەیی)یە.
- ساڵی (١٩٦٠) لەکەرکوك هاتووەتە دنیاوە.
- ئەندامی کۆمەڵەی هونەرمەندانی جیهانییە.
- ئێستا لەپاریس دادەنیشێت و خەریکی کاری هونەرییە.
- ساڵی (١٩٨٢) یەکەم پێشانگای تایبەتی لەهۆڵی هونەری نوێی (التأمیم) لەکەرکوك کردووەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٣) پێشانگایەکی لەهۆڵی ڕەشید لەبەغدا کراوەتەوە.
- ساڵی (١٩٨٦) پێشانگایەکی لە هۆڵی ڕەشید لەبەغدا کراوەتەوە.
- ساڵی (١٩٩٠) لەم شوێنانە پێشانگای کردووەتەوە:-
- هۆڵی (الرواق) لەبەغدا، لە گەلەری (فورم) لە ژاپۆن، گەلەری (گۆڤۆ) لەژاپۆن، هۆڵی دەزگای (عەبدولحەمید شومان) لە ئەردەن.
- ساڵی (١٩٩٢) پێشانگای لەگەلەری (ئەتاگۆیاما) لەژاپۆن.
- ساڵی (١٩٩٣) گەلەری لەشاری جیهانی هونەر لەفەرەنسا.
- ساڵی (١٩٩٥) گەلەری (فیافرا) لەسویسرا.
- ساڵی (١٩٩٦) لە ناوەندی هونەر لەئەردەن.
- ساڵی (١٩٩٧) لەکتێبخانەی فندغدی لەفەرەنسا.
- ساڵی (١٩٩٨) لەکۆشکی عەباسی و سەنتەری ڕۆشنبیری فەرەنسا لەبەغدا.
- ساڵی (١٩٩٩) ڕێکخراوی یونسکۆ لەفەرەنسا.
- هۆڵی کۆمەڵی (هونەرەجوانەکان) لە (٣٠)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠١) لە سلێمانی.
- لەم پێشانگا هاوبەشانە بەشداری کردووە:

- ساڵی (١٩٩٠) لە ژاپۆن، ساڵی (١٩٩٣) لە بەریتانیا، ساڵی (١٩٩٥) لە نەمسا، ساڵی (١٩٩٦) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

*** (هێمن مەولود):-**

- ناوی (ئەبوبەکر مەولود رەشید)ە.
- ساڵی (١٩٦٤) لە کەرکوك لە گەرەکی تەپەی مەلا عەبدوڵڵا لەدایکبووە.
- شەشی ئامادەیی بەشی زانستی لە دواناوەندی زێوەر تەواو نەکردووە.
- ساڵی (١٩٨٧) یەکەم نووسینی لە شاخ لە گۆڤاری (دەنگی پێشمەرگە) بڵاوکردووەتەوە.
- گەلێك بابەت و لێکۆڵینەوەی لە رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) و گۆڤاری (رێبازی نوێ) و بڵاوکراوەی (رۆژنامەنووس) بڵاوکردووەتەوە.
- سەرنووسەری (رۆژنامەنووس) بووە تا کاتی داخستنی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (کەرکوك لەنێوان پیلان و خەمساردیدا)، ٢٠٠٦.
- (ئەنفال و سەگە رەشەکەو بیابان)، ٢٠١٠.
- لە ساڵی (٢٠٠٤)ەوە بۆ ماوەیەك لە (کەناڵی ئاسمانی کەرکوك) کار کردووە.

*** (هیوا دۆمان- هیوا کەریم دۆمان):-**

- ساڵی (١٩٦٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨١-١٩٨٥) بەشداری گشت فیستڤاڵەکانی پەیمانگای کردووە.
- ساڵی (١٩٨٥) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٥) بەشداری پێشانگای کردووە لەگەڵ هونەرمەند دارا ئارام.
- ساڵی (١٩٩١) پێشانگای یەکەمی لە قەڵاچوالان، رانیە، شەقڵاوە.
- ساڵی (١٩٩٥) پێشانگای دووەمی لە کتێبخانەی گشتی چەمچەماڵ.
- لە ساڵانی (١٩٩٥-١٩٩٧) بەشداری فێستیڤاڵی هونەرمەندانی یەکگرتووی کوردستان لقی کەرکوکی کردووە.
- ساڵی (١٩٩٧) پێشانگای سێیەمی لە گەلەری زاموا.
- ساڵی (١٩٩٧) پێشانگای چوارەمی لە مەڵبەندی لاوانی کەنار، دەربەندیخان.
- ساڵی (٢٠٠٤) پێشانگای پێنجەمی لە شاری کەرکوك کردووەتەوە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٥-٢٠٠٥) بەشداری (٢٠) پێشانگای هاوبەشی کردووە لە (سلێمانی، هەولێر، کەرکوك، دهۆك، کەنەدا، ژاپۆن، ئێران).
- مامۆستایە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك.

*** هیوا چیمەنی:-**

- ناوی تەواوی عەبدولرەحمان ئەحمەد کەریم.
- لەدایکبوی ساڵی (١٩٦٢)ی گوندی چیمەنی شەهیدان لەناوچەی کەرکوك.
- قۆناغی سەرەتایی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٨) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. پاش چوار ساڵ کارکردن لەناو رێکخستنەکاندا، بریاریدا پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە بکاو لەم سەروبەندەدا لە تیپی ٢١ی کەرکوك بووە پێشمەرگە.
- لە ٢١ی کانوونی یەکەمی (١٩٨٢)دا بەشداریی لەیەکەم چالاکیی پێشمەرگانەدا کرد. کاتێك هێزی پێشمەرگە هێرشی کردە سەر بازگەی کەرکوك. سلێمانی و دەستی بەسەردا گرت. ئەم چالاکییە لە کەرکوك و تەواوی ناوچەی گەرمیان دەنگی دایەوە. لەم چالاکییەدا چیمەنی، سەرەرای بەشداریی، رێپیشاندەری هێزەکە بوو بۆ گەیشتن بەبازگەکە.
- دوای ئەم چالاکییە کرایە فەرماندەی مەفرەزەو پاشتریش بووە فەرماندەی کەرت. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی لە ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکاندا کردووە لەوانە چالاکییەکانی ناو شاری کەرکوك، شیوەسوور، قەرەهەنجیرو ئۆپەراسیونە گەورەکانی لێدانی دامودەزگا نەوتییەکانی باباگورگور (١٩٨٦) و قەیوان - ماوەت (١٩٨٦).
- لە ئۆپەراسیونی گرتنی شارۆچکەی قەرەهەنجیردا، شەوی ٢١ لەسەر ٢٢ی ئازاری ساڵی (١٩٨٧) خۆی و پێشمەرگەیەکی تر بەناوی سوارە عەبدوڵڵا شەهید بوون.

مامۆستا هێمنی شاعیر، د. عیزەدین مستەفا، د. شاکر خەسباك. میهرەجانی شیعری کوردی – کەرکوك ١٩٧٣

هانی ساحیب – عینایەت ڕەفیق – عەبدولحوسین مەلا ئیبراهیم

هۆشمەند عەبدولعەزیز برای شەهید ئازاد هەورامی

هاشم کاکەیی- عەبدی کاکەیی- حەمە درێژ - هەردەوێڵ کاکەیی - محەمەد دارتاش

هاشم کاکەیی و فەلەکەدین کاکەیی

ستار ئەحمەد - هاشم کاکەیی- لەتیف هەڵمەت - نیعمەت زەحمەتکێش

ئەیوب ڕۆستەم - هاشم کاکەیی

*** هێرش فاتیح:-**

- ساڵی ١٩٦٨ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەر و ئایین پەروەر و ڕۆشنبیر لە دایکبووە، باوکی ماوەیەك لە نوگرە سەلمان بەند کراوە، باپیرانیشی لە شێخانی بەرزنجەن لەسەر تەریقەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بوونە، لەتیف حامیدی نووسەر مامیەتی و لەتیف هەڵمەتی شاعیریش خاڵێتی.
- هەر لە تەمەنی ١٨ ساڵییەوە دووچاری نەخۆشی شەکرە بووەتەوە و قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- وێنەکێشێکی باش بووە و بەردەوام گوێیەکی هەستی ناسکی مۆسیقا و گۆرانی هەبووە، بەتایبەتی لە مەقامە فارسییەکان شارەزا بووە هەر لەو ماوەیەدا ئاشنایەتی لەگەڵ هونەرمەندان نزار ئەحمەد، فەخرەدین ئەحمەد، پەیداکردووە.
- هەر لە ساڵی ١٩٩٠ەوە یەکەم گۆرانی تۆمار کردووە بەناونیشانی (دووبارە تیشکی پەرچەم) کە لە ئاواز و هۆنراوەی فەخرەدین عەوداڵە.
- ساڵی ١٩٩٢ گۆرانی (ئەی لە هاواری دەروون) تۆمار کردووە لە ئاواز و هۆنراوەی فەخرەدین عەوداڵە.
- ساڵی ١٩٩٣ گۆرانی (سروشت)ی تۆمار کردووە لە هۆنراوە و ئاوازی عەوداڵ و لە تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمار کراوە.
- هەر لە سەرەتای لاوێتیدا هەستێکی کوردایەتی بەرزی هەبووە و چەندین جار لەلایەن داروودەستەی ڕژێمی سەدامەوە دەستگیر و زیندانی کراوە لەبەر ئەوەی بە زمانی عەرەبی گۆرانی بۆ سەدام و حیزبەکەی نەچڕیوە.
- ساڵی ١٩٩٥ لە فیستیڤاڵی (اغنیە شمالیە) لە شاری کەرکوك بە ئامادەبوونی سەرۆکی ئەو کاتەی سەندیکای هونەرمەندان (داود قەیسی) پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە، بە هەمان شێوەیش لە فیستیڤاڵی بابلی جیهانیش بەشداری کردووە، بە سەرکەوتووی گۆرانی و مەقامی چڕیوە.
- ساڵی ١٩٩٧ گۆرانی (هونەر)ی لە تەلەفزیۆن تۆمار کردووە.
- هەروەها هونەرمەند (شەوکەت ڕەشید) ئاوازی بۆ (گوڵە بۆنی ژیانی) داناوە و لە تەلەفزیۆن تۆماری کردووە.
- هەروەها هونەرمەند (قادر مەردان) ئاوازی بۆ گۆرانی

(ئەکەین جەچنە پیرۆزە.. ئەمڕۆ یادی نەورۆزە) داناوە، بەڵام تۆمار نەکراوە.
- لەدوای ساڵی (٢٠٠٣)دا یەکەم هونەرمەند بووە کە سروودی بۆ کەرکوك تۆمار کردووە لە هۆنراوەی نەتیف هەڵمەت و ئاوازی چالاك سدیق، لە ساڵی ٢٠٠٤ لە فیستیڤاڵی هونەر لە شاری کەرکوك پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە.
- ئەندامی تیپی (باڵانبۆ) بووە و گەلێك گۆرانییان بۆ تۆمار کردووە.
- هەر یەك لە ڕزگار حەمە ڕەئوف و چالاك سدیق یارمەتی و ئاوازیان بۆ داناوە لە کەناڵی ئاسمانی کەرکوك.
- پێش کۆچکردنی بەرهەمێکی زۆری ئایینی تۆمار کردووە کە لە وتن و ئاوازی خۆیەتی و لە کەناڵی ئاسمانی کەرکوك تۆمار کراوە.
- لە (١٩٩٤) لەگەڵ خاتوو (شلێر ڕەمەزان) ژیانی هاوسەری پێکهێناوە و منداڵێکی هەیە بەناوی (محەمەد).
- لە ١١ی تەمووزی ٢٠١٨ کۆچی دوایی کردووە بە نەخۆشی شەکرە لە گۆڕستانی شێخ محێدین بە خاك سپێدراوە.

* هەوار فارس:-

- ساڵی ١٩٩٢ لە کەرکووك لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانە لە بەشی شانۆ.
- تاکە ڕۆژنامەنووسە کە بە شێوەیەکی مەیدانی لە کەناڵی ئاسمانیی کەرکوك دەبینرێت.

* هیمان وەوجدی مەحموود ئەمین:

- ساڵی ١٩٢٦ لە گەڕەکی ئەلماس لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە و ئامادەیی لە سلێمانی تەواو کردووە.
- کۆلێژی سەربازی لە بەغدا تەواو کردووە و لە خولی حەردان عەبدولغەفار.
- لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ لەلایەن (الحرس القومي) دەستبەسەر کراوە بە تاوانی بە ئەندام بوونی لە حیزبی شیوعی لە دوای ئەوەی ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دراوە لە بەندینخانەی نوگرە سەلمان لە ساڵی ١٩٦٤ ئازاد کراوە و گواستراوەتەوە بۆ فەرمانی مەدەنی لە (الاصلاح الزراعي) لە بەغدا.
- پێش ئەوەی بچێتە کۆلێژی سەربازی یەکێك بووە لە وەرزشوانەکانی تۆپی پێ لە یانەی سلێمانی.
- دەستێکی باڵای هەبوو لە شیعر و خوێندنەوە و خەتخۆشی کە لە خاڵییەوە (بەدیع بابە جان) فێری خەت خۆشی بووە.

* عەقید هومام عیزەدین عومەر مەندانی:-

- ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکووك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٢ کۆلێژی سەربازی لە بەغدا تەواو کردووە لە بەشی (هندسة آلية كهربائية).
- بڕوانامەی لە پەیمانگای تەکنەلۆژیا بەشی کارەبا بەدەستهێناوە.
- ساڵی ٢٠٠٥ خانەنشین کراوە.

* مەلا هەیبەت:-

- یەکێکە لە ژنە دەنگخۆشەکانی کەرکوك کە لە کۆڕی قورئان و مەولوود خوێندندا ڕۆڵی هەبوو، بەڵام کوێر بوو، لەبەر تەکیە نیشتەجێ بوونە.
- خوشکێکی هەبوو، ئەویش بەهەمان شێوە دەنگی خۆش بوو لە قورئان و مەولوودا.

*** (واحید عومەر محێددین- دکتۆر ئارام محێددین):-**

- ساڵی (١٩٦٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٨) بەکالۆریۆسی لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٩٢) بڕوانامەی ماستەری لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی بەغدا بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٥) دکتۆرای لە بواری مێژووی سیاسی هاوچەرخی کورد لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی سلێمانی وەرگرتووە.
- لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (کەرکوك) بووە.
- لە کتێبە چاپکراوەکانی (دانووستانەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردو حکومەتەکانی عێراق ١٩٢١-١٩٦٨)، سلێمانی، ٢٠٠٦.

*** (وافی):-**

- ناوی (عەبدولمەجید کوڕی ساڵح قەڵایی)یەو نازناوی شیعری (وافی)یە.
- ساڵی (١٨٧٥) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٦) کۆچی دوایی کردووە.
- ئیمامو خەتیب بووە لە مزگەوتی (حەسەن مەکی) لەسەر قەڵا.

*** (وافی):-**

- شاعیر ناوی (سلێمان کوڕی وەهبی موفتی)یە لە سەدەی نۆزدەهەمی زاینییدا ژیاوە.

*** (وەجدی مستەفا):-**

- ساڵی (١٩٦٢) لە گەڕەکی (پریادی) لەدایکبووە.
- بڕوانامەی دبلۆمی بەدەستهێناوە.
- ئەوەی مەقام زانی بەناوبانگ (مەلا محەمەد تۆپال)ە کە یەکێك بووە لە مەقام زانەکانی تەکیەی تاڵەبانی لە سەردەمی شێخ (محەمەد جەمیل قادری).
- بەرهەمەکانی:-
- دراسة حول المقامات العراقية في كركوك، ٢٠١٠
- ملا محمد تۆپاڵ قارئ المقامات العراقية في كركوك، ٢٠١٣

*** (وەحیددەین بەهائەددین):-**

- ناوی تەواوی (وەحیددەین بەهائەددین عەبدولوەهاب مەحموود محەمەد)ە.
- ساڵی (١٩٢٩) لە قەڵای کەرکوك لەدایکبووە.
- نووسەرو پەروەردکارە لە کەرکوك.
- بەرهەمەکانی:
- (خواطر هائمة)، چاپخانەی (الشمال)، کەرکوك، ١٩٦٠.
- (من أدب التركمان)، چاپخانەی (الازهر)، بەغدا، ١٩٦٢.
- (إعلام من الأدب التركي)، چاپخانەی (دار الزمان)، بەغدا، ١٩٦٥.
- (كلمات في الرصافي)، چاپخانەی (دار الزمان)، بەغدا، ١٩٦٥.
- (من الأدب العربي المعاصر)، چاپخانەی (دار الزمان)، بەغدا، ١٩٦٦.
- (نظرات في الكتب)، چاپخانەی (البصري)، بەغدا، ١٩٧٠.
- (شخصيات من الأدب المعاصر)، چاپخانەی (الضاد)، حەلەب، ١٩٧١.
- (مصطفى جواد فيلسوف اللغة العربية)، نەجەف، ١٩٧١.
- (نداء الشوق)، چاپخانەی (التضامن)، بەغدا، ١٩٧٣.
- (شيء عن خمريات حافظ جميل وزهدياته)، چاپخانەی (الجمهورية)، بەغدا، ١٩٧٨.
- (مباحث في الأدب العربي المعاصر)، بەغدا، ١٩٧٥.
- (فيليب لطف الله شاعراً وإنساناً)، چاپخانەی (بلادي)، بەرازیل، سان بادلو، ١٩٧٨.

- (كما عرفتهم من أدب الذكريات والانطباعات)، چاپخانەی (الدار العربية)، بەغدا، ١٩٧٩.
- (وجوه تركمانية في رحاب الثقافة والصحافة)، بەغدا، (٢٠٠٨).
- (في الأدب والحياة).
- من أدب المراه التركمانيه المعاصره، ٢٠١١
- عەتا تەرزی باشی، لمحات من مسيرته ومحطات في سيرته، ٢٠١١
- كركوك في مرايا هؤلاء الشعراء والأدباء، ٢٠١٣
- مصطفى جواد فيلسوف في اللغة العربية وخططي بغداد الفرد، ٢٠١٣

*** ( وەلی - مەلا وەلی ):-**

- ناوی (عەبدورەحمان وەلی)یە، مامۆستای (شلْتاغ) بووە.
- ساڵی (١٧٤٣) لە كفری هاتووەتە دنیاوە.
- ساڵی (١٨٣٠) كۆچی دوایی كردووە.
- (وەلی) كە دواتر واز لە خواردنەوەی (مەی) دێنی ودەست بە نوێژو خوا پەرستی دەكات ناونیشانی (مەلا وەلی) وەردەگرێت ناوبراو لە دوایدا دانیشتووی گەڕەكی (پیریادی) بووە.
- دەربارەی مەلا وەلی شێخ جەلال حەنەفی دەڵێت:

"..... ناوبراو هاتووەتە بەغدا گەلێ مەقام خوێنانی ئەودەمە لێ فێربوونەو لێ یانی وەرگرتووە بۆ نموونە (شلْتاغ)و (عەلی كوڕی سەفو) كە ناونیشانی شێخی مەقام خوێنانی مووسڵی هەبووە".

*** ( وەلی ئاغای كاكەیی - سەید وەلی ئاغای كاكەیی ):-**

- (سەید وەلی كوڕی سەید هەواس كوڕی سەید سەلیم كوڕی سەید حوسێن)ە، بەناوبانگە بەناوی (وەلی گەورە).
- ساڵی (١٧٨٠)ی زایینیی لە دێی (قەلْخانلوی گەورە) لە خورماتوو هاتووەتە دنیاوە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ئاماژە بە ساڵی (١٧٨٥)ی زایینیی دەكەن بۆ لەدایكبوونی.
- هەر لە منداڵییەوە خەریكی خوێندن بووەو لە پاشان چووەتە كەركوك و لەلای زانایانی ئایینیدا ڕێزمانی عەرەبی و وێژەی فارسی و ڕەوانبێژی خوێندووەو لە پاشان گەڕاوەتەوە زێدی خۆی.
- سەی وەلی یەكێ بووە لە هۆنەرانی كوردو هۆنراوەكانی گەلێ تەڕو پاراوو شیرینن و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پیاوێكی ئازاو بە جەرگ بووە بە جۆرێ ناوبانگی ئازایی ئەو بە هەموو لایەكدا بڵاوبووەتەوە تا ئەم ناوبانگەی ئەگاتە سوڵتان (عەبدولحەمیدی عوسمانی) (١٨٧٦ - ١٩٠٩)ی زایینیی ئەویش داوای لێ ئەكا كە سەرێكی لێ بداو ئەوسا (سەی وەلی)یش ڕۆیشتووەتە لای سوڵتان و چاوی پێ كەوتووەو ئەویش شمشێرێك و ئەسپێكی كوێتی پێشكەش كردووەو گەڕاوەتەوە.
- ساڵی (١٨٧٤)ی زایینیی كۆچی كردووەو لە دێی

(قەلْخانلوی گەورە) بە خاك سپێردراوە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ئاماژە بە ساڵی (١٨٧٧)ی زایینیی دەكەن بۆ كۆچ كردنی.

*** ( وەلی پاشا ):-**

- ساڵی (١٦٠٦) بووەتە والی كەركوك بەڵام ساڵی بەردەوام بوونی نازانرێت تاكو كەی بووە.

*** وەلید عەبدولكەریم مەحموود بەیاتی:-**

- ساڵی ١٩٥١ لە كەركوك لەدایكبووە.
- ساڵی ١٩٧٥ كۆلێژی سەربازی بەغدای تەواو كردووە لە خولی ٥٤ بە ناونیشانی (القوات الخاصة).

* ( وەهاب کاکەیی - سەید وەهابی کاکەیی ):-

- ئەم شاعیرە ناوی (سەید وەهاب کوڕی سەید فەتاح کوڕی سەید ئەلیاسی کاکەیی)یە.
- ساڵی (١٩٢٨) لە ئاوایی (ئەلبو محەمەد) لە شارۆچکەی (داقوق) لەدایکبووە.
- هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو پاشان ڕێزمانی عەرەبی و وێژەی فارسی خوێندووەو ئەوسا خەریکی کارو مزیاری بووە.
- ساڵی (١٩٣٥) لە گەڕەکی (تسعین-تسن) قوتابخانەی سەرەتایی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٨٥)ی زایینیی کۆچی دوایی کردووە.

* ( وریا جاف ):-

- ناوی (عیرفان حوسێن جاف)ە ناسراو بە (وریا جاف).
- ساڵی (١٩٥٦) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندی کردووە بە شۆڕشی ئەیلولەوە.
- ساڵی (١٩٧٧) بەرەو ئەمریکا ڕۆیشتووە، لە پرۆسەی ئازادییەوە گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوک.
- ئەم کتێبانەی بە چاپ گەیاندووە:
- (مێژووی ڕۆژنامەگەری پارتی دیموکراتی کوردستان ١٩٤٦-١٩٩٦)، دهۆک، ١٩٩٧.
- (کرکوک-دراسة سیاسیة إجتماعیة)، هەولێر، ١٩٩٧.
- (کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردی)، هەولێر، ١٩٩٨.
- (حەزێکی ناکام)، ڕۆمان، هەولێر، ١٩٩٨.
- (هەندێك لە چاوپێکەوتن و وتارەکانی بارزانی نەمر)،

کۆکردنەوەو ئامادەکردن، وەرگێڕان، واشنتن، ١٩٩٩.
- (بعض المقابلات واحادیث البارزاني الخالد)، کۆکردنەوەو ئامادەکردن، هەولێر ١٩٩٩.
- (مێژووی دەنگی کوردستانی عێراق)، هەولێر، ٢٠٠٢.
- (جانتا)، چیرۆك، کەرکوك، ٢٠٠٨.
- (هەموو ڕێگاکان دەچنەوە بۆ کەرکوك)، کەرکوك، ٢٠٠٩.
- (تەمەنی پەپوولەیەك)، کەرکوك، ٢٠١٣.

* ( وریا سەردار ):-

- ساڵی (١٩٧٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (مردووەکان شیعر دەخوێننەوە)، مۆنۆ دراما، ٢٠٠٩.
- (پرچی هەتاو)، ئامادەیە بۆ چاپ.
- (شاعیرە ونبووەکانی کەرکوك)، ئامادەیە بۆ چاپ.

* ( وریا شەهاب ):-

- کتێبە چاپکراوەکانی:
- (چارەنووس)، شانۆگەری، کەرکوك، ٢٠٠٢.
- (دەریایی عاشقان)، شانۆگەری، کەرکوك، ٢٠٠٢.

* وریا ڕەشید
لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٣ی گوندی قەڵا لە ناوچەی - سەنگاو، ناسراو بە وریای شێخ ڕەشید.
لە ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی - کوردستانەوە کردووەو لە ٣١ی ئابی ساڵی ١٩٨١ بووە پێشمەرگە لە هەرێمی ٥ی قەرەداغ، دواتر کراوە بە فەرماندەی مەفرەزە لە کەرتی بازیان.
- ساڵی ١٩٨٤ دوای شەهید بوونی مامە ڕیشە کرا بە فەرمانەدەی کەرتەکەی، بەشداری زۆر شەڕ و چالاکی

پێشمەرگانەی کردووە لەوانە گرتنی یەکەم ڕەبیە لە کوردستاندا کە ڕەبیەی گوندی کەڵە ڕەشە بە فەرماندەیی حەمە ڕەش کەسنەزانی لە ساڵی ١٩٨١، شارۆچکەی سەنگاو بۆ جاری دووەم، ڕەبییەکانی فەقیە حاجی و قەرەهەنجیر.
هەروەها ڕۆلیکی کارای لە چەندین شەڕدا هەبوو، لەوانە زینانەی گەرمیان کە تێیدا بریندار بوو، شاربازێر، ژاڵەی دەربەند، جەوەڵ بۆر. قەرە حەسەن، کونە کۆتر ساڵی ١٩٨٥، هەکز ساڵی ١٩٨٥، قەرەتامور، گۆشتقوت، قەرەداغ، هەروەها بەشدار بوو لە داستانی قەیوان. ماوەت کە تێیدا لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٦دا لە لوتکەی چیای حەسەن بەگ شەهید کرا.

* عەقید ویداد میدحەت ئیبراهیم داودی:-
- ساڵی ١٩٤٨ لە کفری لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٠ لە کۆلێژی سەربازی بەغدا دەرچووە لە خولی ٦٦ بە پلەی کارگێڕی.
- ساڵی ٢٠٠٥ خانەنشین کراوە.

* ( **یاسینی مەلا ئەحمەدی دەککە** ):-

- یەکێکە لە شاعیرەکان کفری.
- زانیاریمان دەربارەی ژیان و بەرهەمەکانی نییە.

* ( **یاسین عەودل - یاسین بچکۆل** ):-

- لە گەڕەکی شۆریجەی کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٨٣ بووە بە پێشمەرگە لە کەرتی چواری جەباری.
- ساڵی ١٩٨٧ کراوە بە فەرماندەی مەفرەزە، دوای ئەنفال کراوە بە فەرماندەی کەرتی پارتیزانی.
- ساڵی ١٩٩١ لە کاتی گرتنی مەرکەزی پریادی لەناو شاری کەرکوک شەهید کرا.

* ( **یاسین کوڕی مەلا مەحموود- مەلا - ماهر** ):-

- ساڵی (١٩١٩) لە دێی (بەشیر) لەدایکبووە.
- بە زمانی عەرەبی وفارسی وتورکی شیعری نووسیووە.
- ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

* ( **یالچین خەیروڵڵا بەللو** ):-

- ساڵی (١٩٦٠) لە خورماتوو لەدایکبووە.
- بەرهەمەکانی:
- (بن بورادایيم)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (عبدالوهاب اوچی)، کەرکوک، ٢٠٠٠.
- (ایکنجی واکون)، شیعر بە زمانی تورکی، چاپخانەی (عبدالوهاب اوچی)، کەرکوک، ٢٠٠١،
- لە (١٦)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٧) شەهید کراوە.

* ( **یەسو ساوك** ):-

- ساڵی (١٨٣١) لە دێی (قەڵخانڵوی گەورە) لە خورماتوو هاتووەتە دنیاوە، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٨٣٥)ی زایینیی بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێن.
- یەسو ناوی (یوسف کوڕی جەماڵی کاکەیی)یە.
- ساڵی (١٨٨٨) لە دێی (قەڵخانڵوی گەورە)وە دەگوێزنەوە بۆ دێی (هەفت تەغاری) ناوچەی (داودە) لە (خورماتوو).
- لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و لە تاق جوانی ڕۆیشتووەتە کەرکوك و لەلای زانایانی ئایینیدا خەریکی خوێندنی ڕێزمانی عەرەبی و پیتۆڵی و شەریعەتی ئیسلام بووە و پاشان چووەتە کرندو خەریکی خوێندن و فێربوونی پەرتووکی سەرئەنجام بووە، تا بە تەواوی فێری ڕێ و ڕچەی کاکەیی بووە و ئەوسا گەڕاوەتەوە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی و پاشماوەی تەمەنی بەکاری کشتوکاڵ و ماڵداری و ڕێنوێنی

خەڵك بردووەتە سەر.
- لە هۆنینەوەی هۆنراودا دەستێکی بەرزو باڵای هەبووەو هۆنراوەکانی گەلێ تەڕو پاراوو شیرینن و هەندێ لە هۆنراوەکانی لە بەیازەکان و کەشکۆڵەکاندا تۆمار کراوە.
- ساڵی (١٩٠٩) لە تەمەنی ٧٨ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆرستانی (حەواشەکان) لە دێی (عەلی سەرای) بەخاك سپێردرا، بەڵام هەندێك سەرچاوە ساڵی (١٩١١)ی زاینیی بە ساڵی کۆچ کردنی دادەنێن.
- لە پاش خۆی تەنیا کوڕێکی لێ بەجێماوە بە ناوی (چۆپان) کە دەستی شیعر نووسینی هەبووە.

* (یەعقوب زیائی):-

- ناوی (یەعقوب ئەفەندی سەبانی -ظاهر الضیاء- کوڕی ڕەسول حاوی)یە.
- ساڵی (١٨٠٤) لەدایکبووە، یەکێکە لە شاعیرەکانی کەرکوك.
- دامەزراوە بە فەرمانبەر لە مەسرەفخانە لە بەغدا لە سەردەمی والی داوود پاشا.
- دەستێکی باڵای هەبووە لە خەتخۆشیدا.
- ساڵی (١٨٣٠) کۆچی دوایی کردووە.

* (یەعکوب یوسف کویازرا):-

- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (حکیات عن الصحافة فی العراق)، بەغدا، ١٩٦٩.
- (صحافة ثورة العشرین)، بەغدا، ١٩٧٠.
- (من اهازیج وهوسات ثورة العشرین)، ١٩٧١.
- (یهود العراق: تأریخهم وأحوالهم، هجرتهم)، عەمان، ١٩٩٨.
- (انجلترا فی حیاة فیصل الاول)، عمان، ١٩٩٨.
- (ملك سووریة فیصل بن الحسین)، بەغدا، ٢٠٠١.

* (یوسف ئیبراهیم):-

- ناوی (یوسف عیزەددین ئیبراهیم)ە.
- لە (١٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٨٩١) لەبەغدا لەدایکبووە، لە خێزانێك کە لە کەرکوکەوە کۆچیان کردووە بەرەو بەغدا.
- دوای ماوەیەك گەڕاوەتەوە کەرکوك و خزمەتی دەوڵەتی عوسمانی کردووە لە کاروبارە کارگێڕییەکاندا.
- ساڵی (١٩١٨) لە (دائرة المعارف) دامەزراوە لەکاتی فەرمانڕەوایی ئینگلیزەکاندا.
- ساڵی (١٩٢٣) بووەتە بەڕێوەبەری (معارف)ی بەغدا.
- ساڵی (١٩٢٥) بڕوانامەی لە یاسا بەدەستهێناوە، لەدواییدا گوێزراوەتەوە بۆ وەزارەتی دارایی.
- ساڵی (١٩٣٦) بەشداریی وەزارەتەکەی حیکمەت سلێمانی کردووە بە وەزیری معارف تا وازلێهێنانی لە ساڵی (١٩٣٧).
- هەڵبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك لە ساڵی (١٩٣٧).
- چووەتەووڵاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٦٩).
- لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

* (یوسف حەیدەری):-

- (یوسف محەمەد کوڕی ئیبراهیم حەیدەری)یە.
- ساڵی (١٩٣٤) لە گەڕەکی (بەگلەر) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٦) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بەشی عەرەبی زانکۆی موستەنسرییە بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٥٤) لە یەکەمین ئەو کەسانە بوو کە بەشداری (جماعة کرکوك)ی کردووە.
- یەکێکە لە چیرۆك نووسەکانی کەرکوك، گەلێك بەرهەمی بە پێزی بە زمانەکانی عەرەبی و کوردی بەرهەمهێناوە و خزمەتی زمان و ئەدەبی کوردی کردووەو عەرەبی پێ ناساندووە، ئەویش لەو لێکۆڵینەوە ئەدەبیانەی کە لە ڕۆژنامەی (العراق) بڵاویکردوتەوە.
- بەرهەمەکانی وەرگێڕدراوەتەوە سەر زمانەکانی (ئینگلیزی، ئیسپانی، ڕووسی، فەڕەنسی، ڕۆمانی، ئەڵمانی، یۆغسلافی، کوردی).
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (حین یجف البحر)، کۆمەڵە چیرۆك، ١٩٦٧.
- (رجل تکرهه المدینة)، کۆمەلە چیرۆك، ١٩٦٩.
- ( لغة المزامیر)، کۆمەڵە چیرۆك، ١٩٨٦.
- (صفحات ملونة من الأدب الکردي)، ١٩٩١.
- (لمحات من الأدب الکردي)، ١٩٩٢.
- (شوارع اللیل)، کۆمەڵە چیرۆك، لە ساڵی (١٩٩٤ لە دوای کۆچکردنی چاپکراوە.
- ساڵی (١٩٩٣) کۆچی دوایی کردووە.

* یوسف ڕەشید:-

- ناوی: یوسف عەبدوڵڵا ڕەشید دەلۆیە.
- ساڵی ١٩٥٩ لە گەڕەکی شۆڕیجە لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٤ تا ١٩٧٥ سەرەتایی لە کەرکوك تەواو کردووە، ناوەندی و ئامادەییشی هەر لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٠ گەیشتووەتە وڵاتی ئیتالیا.
- ساڵی ٢٠٠٧ وەکو فەرمانبەر لە وەزارەتی تەندروستی لە شاری کۆبنهاگن کاری کردووە.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:-
- فەرهەنگی ئەناهیتا، سێ بەرگ

* (یوسف عەلی تاڵەبانی - شێخ یوسف عەلی تاڵەبانی):-

- ناوی (یوسف کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ محەمەد جەمیل کوڕی محەمەد علی کوڕی عەلی کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ مەحموودی زەنگەنە)یە.
- ساڵی (١٩٦٢) لە گەڕەکی (بولاخ) لەدایك بووە.
- ساڵی (١٩٨٤ - ١٩٨٥) کۆلێژی شەریعەی ئیسلامی لە

شانشینی عەرەبی سعودی تەواو کردووە.
- سالّی (١٩٨٦) بووەتە ئیمامو خەتیب لە مزگەوتی (تۆقات-شێخ ڕەزای واعین).
- سالّی (١٩٨٨) بووەتەو ئیمامو خەتیب لە مزگەوتی تەکیەی (تالّەبانی).

* (یوسف عیزەددین ئیبراهیم):-

- لە (١٤)ی ئەیلولی سالّی (١٨٩١) لە بەغدا لەدایکبووە.
- کوڕی (ئیبراهیم پاشای کەرکوکی)یە.
- لە ماوەی ژیانیدا گەلێك کاروباری بەڕێوەبەری بینیوە.
- لە شوباتی سالّی (١٩٣٧) هەلّبژێردراوە بە نائیبی کەرکوك.
- لە تشرینی دووەمی سالّی (١٩٧٥) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆچی دوایی کردووە.

* (یوسف کەرکوکی):-

- (مەلا یوسف کوڕی سینان کوڕی ئەحمەد کەرکوکی)یە.
- یەکێکە لە زانا ئاینییەکانی کەرکوك.
- لە دەستنووسەکانی کە بە جێماوە: (رسالة في فريضة الجمعة)یە.

* (یوسف گەرمیانی):-

- یەکێکە لە شاعیرەکانی ناوچەی گەرمیانیو لە سەدەی نۆزدەهەمدا ژیاوەو هۆنراوەی بە کوردی، شێوەزاری گۆرانی هەیە.

* (یوسف گۆران - دکتۆر یوسف گۆران):-

- ناوی (یوسف سەمەد لوتفوللا)یە.
- لەدایکبووی سالّی (١٩٦٨)ی گەڕەکی ڕەحیماوای شاری کەرکوك. هەر سێ قۆناغی خوێندنی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- سالّی (١٩٨٥) لە کەرکوك پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانەوە کرد.
- سالّی (١٩٨٩-١٩٩٠) کۆلێژی یاسای بەغدای تەواو کردووە.
- سالّی (١٩٩١) لەسەروبەندی سەرکوت کردنی ڕاپەڕیندا، لەگەلّ سەدان خێزانی کەرکوکیدا کەرکوکی بەجێهێشتو لە دهۆك گیرسایەوە.
- سالّی (١٩٩٢) پاش دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە پلەی نەقیب لە دهۆك لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی دهۆك دامەزرا.
- سالّی (١٩٩٤) دوابەدوای هەلّگیرسانی شەڕی ناوخۆ، گوێزرایەوە بۆ هەولێرو لە لەبەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتیی هەرێم کاری کرد.
- سالّی (١٩٩٦) لە سلێمانی نیشتەجێ بوو. هەر ئەو سالّە وەك لێکۆلّیار لە سەنتەری لێکۆلّینەوەی ستراتیجی کوردستان دامەزرا.
- سالّی (١٩٩٨)دا بووە سەرنووسەری گۆڤاری (کاروباری تورکیا) کە سەنتەری لێکۆلّینەوەی ستراتیجیی کوردستان بەزمانی عەرەبی چوار ژمارەی لێ دەرکردووە.
- سالّی (١٩٩٩)دا بووە جێگری سەرنووسەری گۆڤاری (کاروباری ئەورووپا) کە سەنتەر بە زمانی عەرەبی سێ ژمارەی لێ دەرکردووە. هەر هەمان سالّیش لە پالّ ئەوەی کە سەرنووسەری گۆڤاری (کاروباری ئەورووپا)بوو، بووە جێگری سەرنووسەری گۆڤاری (ئاسۆکانی ڕۆژهەلّاتی ناوەڕاست) کە

سەنتەر بە زمانی عەرەبی دەری کردووە.
- ساڵی (٢٠٠١) ئەرکی جێگری سەرنووسەری گۆڤاری (سیاسەتی نێودەوڵەتان)ی گرتە ئەستۆ کە گۆڤارێکە سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان یەکەم ژمارەی لە تشرینی یەکەمی ئەو ساڵە دەرکردووە. هەر ئەو ساڵە دوا بەدوای دامەزراندنی مەکتەبی بیرو هۆشیاری، بووە ئەندامی ئەو مەکتەبە.
- لەماوەی نێوان (٢٠٠٢ - ٢٠٠٨)دا زنجیرە لێکۆڵینەوەیەکی بە شێوەی نامیلکە بڵاوکردەوە لەوانە:-
- (دەروازەیەك بۆ تێگەیشتن لە چەمکی هاووڵاتیبوون) (٢٠٠٢).
- (کوردو تورکمانو میکانیزمی تێگەیشتنی نێوانیان)، (٢٠٠٣).
- (بیری ناسیونالیزمی تورکمانی)، (٢٠٠٤).
- (دەرکەوتنی ڕێکخراوی قاعیدە لە کوردستانی عێراق)، (٢٠٠٨).
- ساڵی (٢٠٠٣) گوێزرایەوە بۆ سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستانو تا ساڵی (٢٠٠٩) پۆستی جێگری بەڕێوەبەری گرتە ئەستۆ. لەو ماوەیەدا لە ژمارە ٣ تا ٧ سەرنووسەری گۆڤاری (سیاسەتی نێودەوڵەتان) بوو.
- ساڵی (٢٠٠٦) ئەندامی لیژنەی تایبەتی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو بۆ چاوخشاندنەوە بە پرۆژەی دەستوری هەرێمی کوردستان.
- ساڵی (٢٠٠٧) بروانامەی ماستەری لە بواری یاسای گشتی لە زانکۆی کۆیە سەبارەت بە تاوانی تیرۆر وەرگرت.
- ساڵی (٢٠١٠)دا بروانامەی دکتۆرای لە فەلسەفەی دەستور لە زانکۆی سلێمانی سەبارەت بەڕێکخستنی دەستوریانەی کۆمەڵگا فرە ئیتنیکەکانی ناو دەوڵەتە دیموکراتەکان بەدەستهێنا. هەمان ساڵ بووە بەرپرسی دەستەی ڕاوێژکارانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی لە سلێمانی.
- ساڵی (٢٠١٢) دوابەدوای دامەزراندنی سەنتەری لێکۆڵینەوەی یاسایی و سیاسیی کۆلێژی یاساو سیاسەت لە زانکۆی سلێمانی، کرایە بەڕێوەبەری ئەو سەنتەرە.
- ساڵی (٢٠١٣) لە ڕەوتی خۆئامادەکردنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ بەستنی کۆنگرەی چوارەم، لێپرسراوەتیی لیژنەی باڵای ئامادەکاریی کۆنگرەی پێ سپێردراو لە ساڵی دواتردا لە سەرسەرووبەندی پێکهێنانی کابینەی هەشتەمی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا کرایە وەزیری خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی.
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:
- (کوردو تورکمان. تێڕوانینێك بۆ میکانیزمەکانی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی نێوانیان)، مەکتەبی بیروهوشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (سەرەتایەك بۆ تێگەیشتن بە چەمکی هاووڵاتی بوون)، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- (بیری ناسیۆنالیزی تورکمانی)، سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- (دەروازەیەك بۆ تێگەیشتن لە چمکی هاووڵاتیبوون).
- (جريمة الإرهاب والمسؤولية المدنئية عنها).
- (دەرکەوتنی ڕێکخراوی قاعیدە لە کوردستانی عێراقدا)، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- ساڵی (٢٠١٤) بووەتە وەزیری خوێندنی باڵا لە کابینەی هەشتەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

* (یونس گەلۆ ئەلعەزاوی):-

- یەکێکە لە شێوەکارەکان، کە لە ماوەی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا لە گۆڕەپانی هونەری شێوەکاریدا جێپەنجەی دیارە.
- ساڵی (١٩٧٩) پێشانگای تایبەتی کردووەتەوە.

* د. یوسف زەنگەنە:-
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیو ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە، بەکالۆریۆسو چەندین ماستەرو دکتۆرای لە زانکۆی تاران و لەندەن و بەریتانیا بەدەستهێناوە.
- هەر لە سەرەتای ژیانییەوە ئارەزووی خوێندن و نووسینی هەبووە.
- چاپکراوەکانی:-
- چوارینەکانی (یوسف سدیق زەنگەنە)، بەشی یەکەم، ١٩٧٠.
- چوارینەکانی (یوسف سدیق زەنگەنە)، بەشی دووەم، ١٩٧٣.
- بازاڕی شۆڕیجە، چیرۆك و ڕووداو، ١٩٧٣.
- دەۆكو سەربەستی ئافرەت لە پەنجەرەی ئوتێل کوردستانەوە، ١٩٧٣.
- پەپوولەی باڵ شکاو، هەڵبەستو پەخشان، ١٩٧٥.
- سکاڵای کوردێکی دڵسۆز، شیعر، ١٩٧٦.
- کۆترەکەمو شۆڕشی کوردستان، ١٩٧٦.
- وازم لێبێنن دڵداری ناکەم، چیرۆکی کۆمەڵایەتی، ١٩٧٦.
- ڕەشەبای ڕقی پێشمەرگەیەکی سەرشێت، ١٩٨٥.
- ڕەشەبای ڕقی پێشمەرگەیەکی سەرشێت، چاپی دووەم، ١٩٨٦.
- ئیملا، وەرگێڕان لە فارسییەوە، ١٩٨٧.
- سۆتۆوتەتۆ، وەرگێڕان، ١٩٨٨.
- نەسرین، ٢٠٠٠.
- نەسرین تابلۆیەکی خوێناوی لە کوردستانەوە، چاپی دووەم، ٢٠١١.
- بنچینە سەرەتاییەکانی شەری پێشمەرگایەتی، ١٩٧٤.
- کیژە کوردە بەرلینییەکە، ٢٠١١.
- بێچووە چۆلەکەو ڕابەرانی کورد، ٢٠١١.
- ژن سەرچاوەی شیعر، ٢٠١١.
- کوردستان سەرزەمینێکی جادولێکراو، ٢٠١٤.
- کیژێك بەنێوی پێنج خاڵ، ٢٠١٤.
* بەرهەمە چاپنەکراوەکانی:-
- لە ڕوانگەی پێشمەرگەیەکی سەرشێتەوە، هەڵبەستی سیاسی

- وولاتی شارە زەردەواڵەکان، کورتە چیرۆك.
- مانیفیستۆی بیری کوردایەتی.
- هیچ، چیرۆکی شانۆیی.
- خەلیلە شێت.
- هێرشی تەڵەقرە یاخییەکان، شیعر.
- تەنەکەی زبڵی خوا، چیرۆك.
- هەزار کیلۆمەتری خوێن، بەسەرهاتنی کوردانی ئەنفال.
- فرمێسکەکانی شەوبۆ، شیعر.
- یەکەمین ڕاپەرینی کورد بەر لە ٤٠٠٠ ساڵ چۆن فرۆشرا.
- مەکری پیاوانی کورد، چیرۆك.
- مامۆستای دێیەکەمان، چیرۆکی شانۆگەری.
- زەردەشت و بنچینە سەرەتاییەکانی ئایینەکەی.
- زەردەشت تاوانبارکراوێکی بێتاوان.
- بەڵێ زەردەشت کوردبوو.
- کاریگەری زەردەشت لەسەر جوولەکەو ئیسلام.
- گەشت بۆ نمرە هەشت.
- ئابووری سیاسی.
- پێشەکییەك بۆ سیاسەت.
- مام ئیحسان و مەلا مستەفا بارزانی.
- لە ڕۆژژمێری شەیتانی ئەمدیوی ئاوێنەکەوە.
- پشکنەری کۆلۆمبۆ لە کوردستان، چیرۆکی شانۆیی
- بیرەوەرییەکانم.
- شارەکەم کەرکوك.
- لەپێناو مێردەکەیدا.
- تهاتف التهافتین.
- خودا لە چاوەکانی منەوە دەتابینێت.
- خۆشم ناوێی ئەی ناشیرین، ٢٠١٦.
- نەسرین تابلۆیەکی خوێناوی لە کوردستانەوە، ٢٠١٦.
- ماچی پاش مردن، ٢٠١٦.
- فرمێسکەکانی شەوبۆ، ٢٠١٦.
- کچانی چیای قەندیل و کۆبانی، ٢٠١٦.

*** یەحیا بابان**

- یەکێکە لە شانۆکارە کوردەکانی کەرکوك کە بە زمانی عەرەبی نووسینی هەبوو، ئەندامێکی گرووپەکەی جەماعەتی کەرکوك بووە دەربارەی شانۆ.

یادگار محەمەد عەبدوڵڵا

یەڵماز عیزەددین عەبدی بەیاتلی

یونس خەتات

* یونس جاف:-

- ناوی یونس ئەحمەد جافە.
- ساڵی ١٩٥٦ لە گەڕەکی ڕەحیماوای کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٠ کۆلێژی ئەندازیاری بەشی شارستانی لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٣ لە وەزارەتی نیشتەجێکردنی عێراق لە شاری ڕوومادی دامەزراوە لە بەشی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕێگای خێرا.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٦-١٩٩٠) گواستراوەتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ڕێگاوبانی کوت لە دواییدا گواستراوەتەوە بۆ (عەمارە) و بووەتە بەڕێوەبەری کۆمپانیانی (تحریر).
- هەر لە ساڵی ١٩٩١ەوە ئاوارەی شاری سلێمانی بووە تا ساڵی ٢٠٠٣ گەڕاوەتەوە کەرکوك و بەشداری دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی ڕێگاوبانی کەرکوکی بەرکەوتووە و بووە بە یەکەم بەڕێوەبەر و هەر لە ساڵی (١٩٩٥-٢٠٠٠) بەردەوام بووە.
- ئەندامی یەکەم کۆنگرەی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك بووە لە ساڵی ١٩٩٥ لە کۆنگرەی دووەمدا بەشدار بووە.
- سەرۆکی لقی یەکێتی ئەندازیارانی کوردستان لقی کەرکوك بووە.
- هەر لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥ لێپرسراوی سەنتەری ڕۆشنبیری نێل بەگی جاف بووە.
- ساڵی (٢٠٠٩-٢٠١٢) سەرۆکی کۆمەڵەی فریاکەوتنی ئاوارەکان بووە بە وەکالەت.
- لە ١٥ی شوباتی (٢٠١٢)ەوە بووە بە جێگری سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان بۆ کاروباری هونەری و بەردەوامە.

* د. یەحیا ڕەزا
- ساڵی ١٩٤٣ لە گەڕەکی شۆڕیجەی کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ئامادەیی لە سلێمانی تەواو دەکات
- ماوەیەك لە لەندەن دەخوێنێت، بەڵام خوێندنەکەی بەدڵ نابێت دەیەوێت پزیشکی بخوێنێت، ئینجا ڕوو لە چیکۆسلۆفاکیا دەکات لەوێش ساڵێك دەمێنێتەوە دوایی بۆ خوێندنی پزیشکی ڕوو لە ڕۆمانیا دەکات. کە لە دوایی دکتۆرا بەدەست دەهێنێت.
- لەدوای ڕۆمانیا دەچێتە لیبیا، کە لەوێ دەبێتە سەرۆکی نەخۆشخانەیەکی گەورە لە لیبیا.
- لەو ماوەیەندا کە لە لیبیا سەرۆکی نەخۆشخانە دەبێت، ڕۆژێك بەهۆی ڕووداوێکەوە ژمارەیەکی زۆر کەسی ئەڵمانی کە لە لیبیا کار دەکەن، بە سەختی بریندا دەبن و دەیگەیەننە نەخۆشخانەکەی د. یەحیا، بەرپرسی نەخۆشخانەکە ڕەتی دەکاتەوە بریندارەکان چارەسەر بکات، بەڵام دکتۆر یەحیا ئەمە ڕەتدەکاتەوە کە ببرێنە تەرابلوس، چونکە لە ڕێگا دەمرن، بۆیە چارەسەری خێرایان بۆ دەکات.
- دوای ئەم ڕووداوە ئەڵمانەکان پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵدا دەبەستن، تا وای لێدێت دەبێتە کەسایەتییەکی ناسراوی بەرلین و ئەڵمانیا و ناویشی دەچێتە ئینسکلۆپیدیای ئەڵمانی.
وەکو تاکە کوردێك ناوی تۆمار دەکرێت، چونکە خزمەتی ئەڵمانییەکانی کردووە لە کاتە سەختەکاندا.
- ئێستا لە یۆنان و دانیمارك و سوید و بەریتانیا و نەرویج و ئەڵمانیا و تورکیا لە جڤاتە پزیشکییەکاندا ڕاوبۆچوونەکانی بەهەند وەردەگیرێت.

* سەرچاوەکان:-
* (إعلام اليهود في العراق الحديث)، مير بەسری، (دار الوراق)، لەندەن.
* (إعلام كرد العراق)، جەمال بابان، ٢٠٠٦.
* (معجم إعلام الكرد في التأريخ الإسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها)، دكتۆر محەمەد عەلی ئەلسويركی.
* کۆمەڵێك گۆڤاری (پارش).
* (یرەوەرییەکانی ژیانی ژێر دەستی)، فوئاد تاهیر سادق، ٢٠٠٥.
* (شاعیرە ناو ونبوونەکانی کورد)، عەلی کەمال باپیر، ١٩٧٣.
* ژمارەکانی گۆڤاری (نەوشەفەق).
* ژمارەکانی گۆڤاری (شار).
* ژمارەکانی گۆڤاری (آفاق عربية).
* ئەرشیفی (ئاری بابان).
* ئەرشیفی (نوری فەقێ).
* ئەرشیفی (عارف قوربانی).
* ئەرشیفی (حەسەن بارام).
* ئەرشیفی (سەلاح شوکر).
* ئەرشیفی (هاشم عاسی کاکەیی).
* ڕۆژنامەی (باسەرە).
* ڕۆژنامەی (کەرکوکی ئەمرۆ).
* (تاريخ الأدب العربي في العراق)، بەرگی دووەم، لەنێوان ساڵانی ١٥٣٤ تا ١٩١٧، عەباس عەزاوی، لە چاپکراوەکانی (کۆڕی زانیاری عێراق).
* (بیبلۆگرافیای دوو سەد ساڵی کتێبی کوردی ١٧٨٧-١٩٨٦)، مستەفا نەریمان، ١٩٨٨.
* (فەرهەنگی نووسەرانی کورد، مستەفا نەریمان، چاپخانەی ئەسعەد، ١٩٨٦.
* (إعلام التركمان والأدب التركي في العراق الحديث، مير بصري، ١٩٩٧.
* (هوية كركوك الثقافية والادارية)، محەمەد عەلی قەرەداغی، دەزگای ئاراس، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٤.
* (وەڵامی کورد لە خەرمانی هزرو نووسینی کورد لە ماوەی ١٤٠٠ ساڵدا)، چوار بەرگ، ٢٠٠٧.
* (قناديل تركمانية من الشعر التركماني الحديث في العراق)، هانی ساحیب، ٢٠٠٧.
* (موسوعة إعلام كركوك المعاصرين)، بەشی یەکەم، عیزەددین ئەلمحەمەدی، ٢٠٠٧.
* (موسوعة الأحزاب العراقية، الأحزاب والجمعيات والحركات الشخصيات والسياسية والقومية والدينية في العراق)، دكتۆر حەسەن لەتیف ئەلزوبەیدی، ٢٠٠٧.
* (٧٠ ناوداری کەرکوك و گەرمیان)، عومەر عەلی شەریف، ٢٠٠٧.
* (مێژووی وێژەی کوردی)، بەرگی یەکەم و دووەم و سێیەم، سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، چاپی دووەم، (٢٠٠٨)، دەزگای (ئاراس).
* (مێژووی ئەدەبی کوردی)، مارف خەزنەدار، هەشت بەرگ.
* (التبر المسبوك في تراجم ادباء كركوك)، حەمید جاف، (٢٠٠٨).
* گۆڤاری (اوراق تركمانية)، ژمارە ٤.
* (تيار الشعر الشعبي التركماني -دراسة مع النماذج)، دکتۆر محەمەد مەردان، (٢٠٠٨).
* (مێژووی ناودارانی کاکەیی)، هەردوێڵ کاکەیی.
* (التاريخ والمؤرخون العراقيون في العهد العثماني)، عیماد عەبدولسەلام رەئوف، ٢٠٠٩.
* (ئەلبومێك لە شانۆی درامای کوردی)، سەردار خدر، ٢٠٠٩.
* (تاريخ علماء كركوك)، عیسمەت رەفیق ساری کەهیە، کەرکوك ٢٠١٠.
* (ئەلبوومی گەرمیان)، ساڵح هەلاج، ٢٠١١.
* (آفاق الصحافة التركمانية في كركوك حتى سنة ٢٠١٣)، ئەحمەد محەمەد کەرکوکی، ٢٠١٣.
* (معجم المؤلفين التركمان ١٧٣٠-٢٠٠٣)، حوسێن سوزلو، کەرکوك، ٢٠١٣.
* (علماؤنا في خدمة العلم والدين)، عەبدولکەریم محەمەد مودەرس، ١٩٨٣.
* بڵاوکراوەی (جەماعەت کەرکوك)، پاشکۆی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٥٨٧٩)، هەینی (١٤)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٢).
* ڕۆژنامەی (هەواڵ)، ژمارەکانی (٥٢٤)و (٥٢٥)و (٥٢٦) ساڵی (٢٠١٣).
* (بهجة الناظرين في اخبار العلماء والصالحين-تراجم نخبة مباركة من علماء وصلحاء مدينة كركوك ١٧٠٠-٢٠١٠)، ساڵح حەسەن ئەلرەیاشی.
* (مێژووی شیعرو شاعیرانی گەرمیان)، ساڵەح هەلاج، چاپی دووەم، ٢٠١٣.
* گۆڤاری (پێشکەوتن)، ژمارە (٧٣) ساڵی (١٩٢١).
* (مێژووی ئەدەبی کوردی)، عەلائەدین سوجادی، چاپی دووەم، ١٩٧١.
- گۆڤاری (وەرز)، ژمارە (٧) ساڵی دووەم، کانوونی یەکەم، ٢٠١٣.
* (کەرکوك یەکەمین شاری کوردستان)، دکتۆر سدیق بۆرەکەیی، هەولێر، ٢٠١٢.
* (پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشووردا)، محەمەد فاتیح، هەولێر، ٢٠١٤.
* (الضباط الكورد في الجيش العراقي) منذ تأسيسه عام ١٩٢١، اللواء فاروق إبراهيم شريف، ٢٠١٤، سێ بەرگ.
* ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، فەرید ئەسەسەرد، ٢٠١٣
* مێژوویەك لە یادەوەریدا، سالار رەشید، ٢٠١٥
* (معجم المؤلفين التركمان ٢٠٠٤-٢٠١٥)، حوسێن سوزلو، کەرکوك، ٢٠١٥.
* مبدعات من العراق، ملاك جميل، اغادير مهدي، شميران مردكل، ٢٠١٣، دار ميزوبوتاميا.
* علماء الكورد وكوردستان من القرن الأول الهجري للإسلام

إلى وفيات سنة ١٤٠٠هـ - ١٩٨٠م، صالح شيخو الهسنياني، مطبعة هاوار، ٢٠١٢.
* معجم المؤلفين السريان، د. صباح نوري المرزوك، هەولێر، ٢٠١٣.
* مێژووی ڕەچەڵەك و ناودارانی هۆزی گەورەی هەمەوەند، بەرگی یەکەم، مەریوان حاجی ئەحمەد واله هەمەوەندی، ٢٠١٢

# پێڕست

## * پێڕستی ناوداران و رۆشنبیران

کەرکوک شارێکی دێرین‌و کۆنەو لە نووسراوە بزمارییەکاندا باسکراوە، بەڵام بە شێوەی (ئەراپخا) ناوی هاتووە نەک بەم ناوەی ئێستای هەروەکو زۆربەی نووسەرو مێژوونووسان دووپاتی دەکەنەوە. لە سەردەمی گوتییەکاندا شاری کەرکوک بنکەیەکی سەرەکی دەوڵەتی گوتی بووە. لە سەردەمی میدییەکانیشدا لە ساڵی(٦١٥) پێش زایینی پاشای میدی (کیاخسار) شاری کەرکوکی داگیر کردووە. بەڵام لە سەردەمی دەوڵەتی ساسانیدا (٢٢٦-٦٣٧)ی زایینیی شاری کەرکوک بووەتە بەشێک لە ناوچەکانی دەوڵەتی ساسانی، ناوەکەشی لەم سەردەمەدا گۆڕاوە بۆ (گەرمەکان)، ئەمەش هەر بە مانای وڵاتی گەرمیان دێ. پاش هاتنی لەشکری ئیسلام بۆ ناوچەکە شاری کەرکوک لە ساڵی (١٦) کۆچی - (٦٣٨)ی زایینیدا بووەتە بەشێک لە دەوڵەتی ئیسلام.

دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە
2023